بسم الله الرحمن الرحيم

**ناسنامه تفسير**

........................

- ناوی تفسير: تفسير ابن الكثير بەکوردی
- وەرگێڕانی: علی حاجی عبدالله پريسی
- نۆرەی چاپ: يەکەم ۲۰۱۲
- شوێنی چاپ: تاران
- هەڵەچنی و ديزاين: ابراهيم معروف

بڵاوکار:

ناوەندی رۆشنبير بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی

﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾﴾

**ڕێدان بە ئاشكرا كردنی قسەی خراپو نابەجێ بۆ ستەم لێكراو لەگەڵ هاندانی بۆلێبوردن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ خودا هەرگیز پێی خۆش نیە هیچ كەس دەنگی بەرز كاتەوەو قسەی ناخۆش بدركێنێ. مەگین كەسێ ستەمی لێ كرابێ. عەلی كوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ گوتی: خودا پێی خۆش نیە كەسێ باسی خراپی كەسێ بكات بە دەنگی بەرز مەگین كەسێ ستەمی لێكرابێ. ڕێگە دراوە بەو ستەم لێكراوە بە ئاشكرا باسی ئەو كەسە بكات كە ستەمی لێكردوە، بەڵام ئەگەر ستەم لێكراوەكە ئارامی ببێو خۆی بگرێ ئەوە چاكترە بۆی[1] حەسەنی بەسری دەڵێت: با دەنگی لێ بەرز نەكاتەوە، باشتر ئەوەیە بڵێ: ئەی خودایە یارمەتیم بدە بۆیو حەقەكەی لێ وەرگرە بۆم[2]. لە ڕیوایەتێكی تردا هەر لە حەسەنی بەسریەوە هاتوە گوتی: ڕێگەی پێدراوە بە دەنگی بەرز باسی ئەو كەسە بكات كە ستەمی لێكردوە بەڵام زیادەڕەوی نەكات لەسەری قسەی خراپی پێ نەڵێت. عەبدولكەریمی كوڕی مالیكی جەزەری لەم ئایەتەدا دەڵێت: مەبەست پێی ئەوەیە كەسێ قسەی خراپت پێ دەڵێ، تۆش پێی دەڵێیتەوە، بەڵام ئەو بوختانی بۆ هەڵبەستی، تۆ بوختان بۆ ئەو هەڵمەبەستە. لەبەر ئەم ئایەتە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾[3] ئەو كەسانەی لە پاش ناهەقی لێكردن، تۆڵەی خۆیان دەستێننەوە خەتابار نین. ئەبوداوود ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر دوو كەسێ كە جنێو بە یەكتری ئەدەن گوناهەكەی دەكەوێتە سەر دەسپێشخەرەكەیان بەمەرجێ ستەم لێكراوەكە زیادەڕەوی نەكات)[4]. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾ خودا بیسەرو زانایە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ ئەگەر ئێوە چاكە بكەن (ئەو چاكەیەتان ئاشكرا بێ یان نهێنی) یان لە كارێكی خراپ چاو بپۆشن، بێگومان خودا هەمیشە بە توانایە

---

[1] الطبري (٣٤٤/٩).

[2] الطبري (٣٤٤/٩).

[3] الشورى (٤١).

[4] أبوداود (٤٨٩٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

بۆ لێبوردن. واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر بە ئاشكرا یان بە نهێنی چاكەتان كردبێ‌و یان لێبوردەیتان بەرانبەر ئەو كەسانەی كە خراپەیان دەربارە كردوون بوو بێ، بێگومان ئەو كارەتان لە خواوە نزیكتان دەكاتەوەو پاداشتی زۆر چاكتان ئەداتەوە، چونكە خودا زۆر لێبوردەیە بەرانبەر عەبدەكانی لەگەڵ ئەوەیشدا كە توانای هەیە سزایان بدات. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ خودا هەمیشە بە توانایە بۆ عەفوو كردن. هەربۆیە لە ڕیوایەتێكدا هاتووە: (ئەوانەی هەڵگری تەختن (العرش) تەسبیحاتی خودا دەكەن)و هەندێكیان دەڵێن: پاكو بێ عەیبی بۆ تۆ لە هێمنی‌و لەسەرخۆیت دوای زانیاریت. هەندێكی تریان دەڵێن: پاكو بێ عەیبی بۆ تۆ لە لێبوردەیت دوای تواناو دەستەڵاتت. وە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە: (هیچ سامانێك لە بەخشین كەم ناكات. هەر بەندەیەكیش لێبوردە بێ هەمیشە سەربەرزە، ئەوەی لەبەر خودا خۆ بە كەم بزانێ بێگومان خودا بەرزی دەكاتەوە)[1].

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾﴾

### بڕوا بە هەندێ لە پێغەمبەران‌و بڕوا نەبوون بە هەندێكی تریان

خودای مەزن هەڕەشە لەو جوولەكەو مەسیحیە خوانەناسانە دەكات كە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەكانی نیەو فەرق‌و جیاوازی دەكەن لە نێوان خوداو پێغەمبەرەكانیدا لە بڕوا پێكردندا. بڕوایان بە هەندێ لەو پێغەمبەرانە هەیەو بڕوایان بە هەندێكی تریان نیە. تەنیا شوێنی ئارەزووی خۆیان‌و ئەو باوو ڕەوشتەی لە باب‌و باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەكیان بە دەستەوە بێ لەو بارەیەوە. وە هیچ بیانویەكیان بە دەستەوە نیە جگە لە ئارەزوو پەرستی‌و دەمارگیری. جوولەكە (بەر نەفرەتی خوا كەون) باوەڕیان بە گشت پێغەمبەرەكان هەیە بێجگە لە عیسا (سەلامی خودای لێبێ) و موحەممەد (ﷺ) مەسیحیەكانیش بڕوایان بە گشت پێغەمبەران هەیە بێجگە لە موحەممەد كە بەڕێزترین‌و دواین پێغەمبەرە (ﷺ) سامیرەكان (السامرة) بڕوایان بە هیچ پێغەمبەرێ نیە دوای یوشع كە جێنشینی مووسای كوڕی عیمران بووە. مەجووسیەكانیش، دەڵێن: بڕوایان بە پێغەمبەرێك بووە لە خۆیان كە پێیان دەگوت زەرادەشت پاشان پەیڕەوی بەرنامەكەی نەبوون. لە ناویاندا هەڵگیرا والله أعلم. مەبەستەكە ئەوەیە هەركەسێ بڕوای نەبێ بە یەكێك لەو پێغەمبەرانە، ئەوە

---

[1] مسلم (٢٠٠١/٤).

بێگومان بڕوای بە پێغەمبەرەکانی تریش نیە. چونکە بڕواهێنان بە هەموو ئەو پێغەمبەرانە کە خودا ناردوونی بۆ سەر خەڵکی سەر زەوی واجیبەو لە مەرجەکانی بڕوا بڕوایە. هەرکەسێ بڕوای بە پێغەمبەریەتی هەر پێغەمبەرێ نەبێ لەبەر ئیرەیی (حەسودی) یان دەمارگیریو ئارەزوو پەرستی. دیارە ئەوە بڕوای بە پێغەمبەرەکانی تریش نادروستەو لێی وەرناگیرێ. بەڵکو ئەوە لەبەر دەمارگیریو ئارەزوو پەرستی مەبەستێکی تایبەتی خۆی بڕوا ناهێنێ. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ حَقًّا ﴾ ئەوانەی بە دڵ بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکانی نیە، دیارە دەیانەوێ لە نێوان خوداو پێغەمبەرەکانی جیاوازی دانێن. دەڵێن: ئێمە باوەڕ بە هەندێکیان دەکەینو هەندێکی تریان بە جێگەی بڕوا نازانین، دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن. بەڕاستی ئەوانە خوانەناسن. واتە: ئەوانە بێ دینیەکەیان دیارو ئاشکرایەو گومانی تێدا نیەو بڕواشیان بە پێغەمبەرەکانی تریش دروستو ڕەوا نیە، ئەگەر بڕوایان بوایە بەوەی کە پێغەمبەری خودان، بڕواشیان بەو کەسە دەهێنا کە بەڵگەکانی زۆر ئاشکراو بەهێزتر لە بەڵگەکانی ئەوان یان ئەگەر بەڕاستی سەیریان بکردایەو وردبونایەتەوە لە پێغەمبەریەتیەکەی هەر بڕوایان پێ دەهێنا ﴿ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ ئێمە بۆ ئەو خوانەناسانە ئازاری ئابڕوبەرمان ئامادە کردوە. واتە: وەك چۆن ئابڕوی ئەوانەی برد کە بڕوایان پێی نەبوو ئازاری بە ژانو ڕسواکەری دان. چونکە بە وردی سەیری ئەو پەیامانەیان نەدەکرد کە بۆیان هات لەلایەن خوداوەو پشتیان تێ کردو هەر خەریکی کۆکردنەوی ماڵی دنیا بوون کە زۆریش پێویستیان پێی نەبوو، یان لەبەر ئەوەی دوای ئەوەی کە زانیان پێغەمبەرە بڕوایان بە پێغەمبەریەتیەکەی نەدەکرد وەك چۆن زۆرێ لە زانایانی جولەکە حەسوودیان بە پێغەمبەر دەبرد لەبەر ئەو پەیامەی کە خودا بۆی ناردبوو دژایەتیان دەکردو بڕوایان پێ نەدەهێناو شەڕیان لەگەڵا دەکرد، هەتا خودا پێغەمبەری زاڵ کرد بەسەریانداو سەرشۆڕی دنیاو قیامەتی کردنو ئابڕوی بردن: ﴿ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾[1] چارەڕەشو زەبونیان بۆ بڕیار دراو بەر غەزەبی خوا کەوتن لە دنیاو قیامەتدا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ ﴾ ئەوانەش کە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکانی هەیەو لەناویاندا فەرقو جیاوازی

---

[1] البقرة (٦١).

ناکەن. مەبەست لەم ئایەتە لێرەدا ئوممەتی موحەممەدە (ﷺ) چونکە ئەمان بڕوایان بە هەموو کتێبەکان هەیە کە خودا ڕەوانەی کردوە، گشت پێغەمبەرانیش کە خودا ناردوونی. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾[1] ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەی لەگەڵ ئەو بڕوایان هێناوە، لێیان ڕوونە کە ئەو پەیامە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارێ بۆ لایان، هەموو بڕوایان بە خودا هەیە. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی کە پاداشتی زۆر زەبەندەو جوانو چاکی بۆ ئامادە کردوون ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ لە ڕۆژی قیامەتا خودا پاداشتیان ئەداتەوەو لە گوناهیان دەبورێو دلۆڤانە. واتە: پاداشتی چاکیان ئەداتەوە لەسەر ئەو بڕوا هێنانەیان بە خوداو پێغەمبەرەکانیو لە تاوانی ئەوانەشیان خۆش دەبێ کە تاوانیان کردوە.

﴿يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ فِي ٱلسَّبۡتِ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿١٥٤﴾﴾

**لاساری جوولەکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەوانەی ئەهلی کتێب داوات لێ دەکەن بە تایبەتی لە ئاسمانەوە بۆ بێنی. موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزیو سوودیو قەتادە گوتیان: جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد کە کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێ وەك چۆن بۆ مووسا تەورات دابەزی بە نووسراوی[2] ئیبنوجورەیج دەڵێت: داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە نامەیە لەلایەن خوداوە دابەزێنێ نوسرابێ بۆ فلانو فلانو فلان بسەلمێنێ کەئەوەی بۆی هێناون ڕاستە[3]. ئەم قسانەی دەیانگوت هەمووی بەهۆی بێ دینیو لاساریو دژایەتیو خوانەناسیانەوە بوو، وەك چۆن خوانەناسانی قورەیش لە پێش ئەماندا هەمان داوایان دەکرد، وەك لە سورەتی ئیسرادا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ

[1] البقرة (٢٨٥).

[2] الطبري (٩/٣٥٦-٣٥٧).

[3] الطبري (٩/٣٥٧).

﴿ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا﴾[1] گوتیان: بڕوات پێ ناهێنین تا لەم زەمینە کانیەکمان بۆ هەڵدەقوڵێنی. بۆیە خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡ﴾ هەر ئەوانە ئەوەیان لە مووسا دەویست، زۆر لەمەیش گەورەتر بوو. گوتیان: خوامان بە ئاشکرا پێ نیشان بدە. لە سزای ئەو بەدفەرییەدا بەر هەورە تریشقە کەوتن. واتە: لە سزای ئەو ناهەقیو ستەمکاریو سەرپێچیو لاساریەدا کە پێی هەڵسان خودا جەزرەبەی دان. ئەم ڕووداوە لە سورەتی بەقەرەدا خودای گەورە بە تەواوی ڕوونی کردوەتەوە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةً فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾[2] ئەوسایش کە بە مووساتان گوت: ئێمە بڕوات پێ ناهێنین تا بە ئاشکرا خودا نەبینین. کە هەر لەبەر چاوی خۆتان بروسکە لێیدان، دوای ئەوەی کە مردن، سەر لە نوێ زیندوومان کردنەوە، بەڵکو شوکری خودا بکەن. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ دوای ئەوە (پاش بینینی گەلێك بەڵگەی ئاشکرا) چوون بوونە گوێرەکە پەرست. واتە: دوای بینینی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە گەورەو زۆرانە لەسەر دەستی مووسادا (سەلامی خوای لێبێ) هاتە دیو لەناوبردنی فیرعەونی دوژمنیان لەگەڵ هەموو سوپاکەیدا لە دەریادا، ماوەیەکی زۆر کەم تێنەپەڕیبوون لە دەریا کە گەیشتنە کۆمەڵێ خەریکی بت پەرستی بوون بە مووسایان گوت: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٌ﴾[3] خودایەکمان وەك خوداکانی ئەوان بۆ پەیدا بکە. پاشان خودای گەورە باسی بەسەرهاتی گوێرەکە پەرستیەکەیان لە سورەتی ئەعرافو سورەتی طاهادا بە درێژی دەکات. کاتێ کە مووسا (سەلامی خوای لێبێ) چوو بۆ گفتوگۆ کردن لەلای خودای گەورەو پاشان گەڕایەوە، ئەوە کە ڕووی دابوو، ڕووی دابوو. خودای مەزن تەوبەکەی لەو کەسانە کە ئەو کارەیان کردو دایان هێنا بەو جۆرە قەبووڵ کرد، ئەو کەسانەی کە گوێرەکە پەرستیان نەکردبوو. ئەو کەسانە بکوژن کە گوێرەکەکەیان پەرست. ئەوە بوو بە کۆمەڵێکیان کۆمەڵەکەی دا بە کوشت، پاشان خودای گەورە زیندووی کردنەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنًا مُّبِينًا﴾ چاوپۆشیمان لەوەشیان کرد، بەڵگەی دەستەڵاتداریمان دا مووسا ﴿وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ﴾

---

[1] الاسراء (٩٠).

[2] البقرة (٥٥-٥٦).

[3] الاعراف (١٣٨).

بەهۆی پەیمانێ کە دایان، کێوی توورمان لەسەریان بە بەرزی ڕاگرت. واتە: ئەوەیش کاتێ بوو کە پابەند نەبوون بە بڕیارەکانی تەوراتەوە، پابەندبوونەکەیان کاتێ دەرکەوت کە مووسا تەوراتی هێنا بۆیان و خودا کێوی تووری بەسەریانەوە بە بەرزی ڕاگرت، پاشان بە زۆر پابەند کران و پابەندی خۆیان دەربڕیو سوژدەیان بردو سەیر سەرەوەی خۆیان دەکردو دەترسان کێوەکە بەسەریاندا بکەوێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم﴾[1] ئەو کاتە کێوەکەمان وەك سێبەر بەسەریاندا بەرز کردەوەو لایان وابوو بەسەریاندا دەکەوێ (گوتمان) ئەوەی داومانە پێتان بە توندی بیگرن. لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ پێمان گوتن: بە سوژدەوە لەو دەرگاوە بچنە ژوورێ. واتە: بە کردارو گفتار سەرپێچی ئەو فەرمانانەیان کرد کە بەسەریانا درابوو. ئەوانە فەرمانیان پیادرا کە لە دەرگای (بیت القدس)ەوە بچنە ژوورێ بە سوژدەوە. (کە دەچوون) دەیانگوت: (حطة) واتە: ئەی خودایە گوناهەکانمان لێ دراندو کە بەهۆی جیهاد نەکردن و کەمتەرخەمیانەوە لە جیهاد کردن تووشمان هات و سەرگەردان بوین لە بیاباندا بۆ ماوەی چل ساڵ چوونە ژوورەوە بە قنگە خشکەو دەیانگوت: (حَنْطَةٌ فِي شَعْرَةٍ) گەنمێ لەناو موویەکدا. ﴿وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ پێشمان گوتن: نابێ لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژی مەکەن. واتە: ئامۆژگاریمان کردن کە پابەند بن بەو شتانەوە کە خودا لێی قەدەغە کردون و ڕۆژی شەممەدا ڕاو نەکەن، وەك لە سوورەتی ئەعرافدا بە باشی ڕوون کراوەتەوە لەم ئایەتەوە دەست پێدەکات کە ئەفەرموێت: ﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ﴾[2] لەبارەی ئەو شارەوە وا کەوتبووە قەراخی دەریا لێیان پرسە.

﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾

---

[1] الاعراف (١٧١).

[2] الاعراف (١٦٣).

**تاوانەکانی جوولەکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی پەیمان شکاندنیان و باوەڕ نەهێنانیان بە نیشانەکانی خودا. ئەمە ئەو تاوانەن کە جوولەکەکان ئەنجامیان داوەو بووە هۆی نەفرین لێکردن و دەرکردن و دوور خستنەوەیان، لەو تاوانانە پەیمان شکاندن و پەشیمان بوونەوە لەو بەڵێنانەی کە لێیان وەرگیراو بڕوا نەکردنیان بە نیشانەکانی خودا. واتە: ئەو موعجیزەو نیشانەو بەڵگانەی لەسەر دەستی مووسادا (سەلامی خوای لێبێ) بە چاوی خۆیان دەیان بینی ڕووی ئەدا. ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ هەر بە ناهەق کوشتنی پێغەمبەرەکانیان. واتە: تاوانەکانیان ئێجگار زۆر بوو ئەوە بوو پەلاماری پێغەمبەرەکانیشیان ئەداو ژمارەیەکی زۆریان لە پێغەمبەران کوشت (سەلامی خوایان لێبێ). ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ دەیانگوت: ئێمە دڵمان داخراوە. ئیبنوعەبباس و موجاهیدو سەعدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو سوودی و قەتادەو کەسانی تریش گوتویانە: داپۆشراوە[1] ئەمە وەك قسەی ئەو موشریکانەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ﴾[2] گوتیان: ئەوەی کە تۆ بانگمان دەکەی بۆی دڵمان پۆشش (پەردەی) لەسەرە. وەك ئەوەی پاکانەی بۆ بکەن گوتیان: دڵەکانمان ئەوەی تۆ دەیڵێیت هیچی وەرناگرێ داخراوەو پەردەی بەسەردا دراوە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ﴾ هەر خودا خۆی مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا بەهۆی باوەڕ نەهێنانیانەوە. لە سورەتی بەقەرەدا لەو بارەیەوە دواین پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ بەشێکی کەمیان نەبێ، باوەڕ ناهێنن. واتە: دڵیان لەسەر خوانەناسی و لاساری و سەرپێچی و باوەڕ نەهێنان ڕاهاتووە.

**بوختان کردنیان بۆ مەریەم و بانگەشەیان بە کوشتنی عیسا و ڕاست و دروستی ئەو ڕوداوە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا﴾ لە بێ دینیان و ئەو بوختانە گەورە بۆ مەریەمیان هەڵبەست. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: تۆمەتی داوێن پیسیان دایە پاڵ[3] سوودی و جوبەیرو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تریش هەر وایان گوتووە[4]. لە ئایەتەکەیشەوە دەرئەکەوێ کە ئەوانە ئەو بوختانە گەورەیان داوەتە پاڵ مەریەم و

---

[1] الطبري (٩/٣٦٤).

[2] فصلت (٥).

[3] الطبري (٩/٣٦٧).

[4] الطبري (٩/٣٦٧).

کوڕەکەیشیو هەر بەو شێوەیەش بەو منداڵەوە سکی پڕ بووە. هەندێکیان گوتویانە لەو کاتەشا لە سوڕی مانگانەدا بووە (و هـي حـائض) بەر نەفرینی بەردەوامی خوا کەون هەتا ڕۆژی قیامەت.

﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ لەبەر ئەوەیش کە دەیانگوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان لەناو برد (کە پێغەمبەری خودا بوو) واتە: ئەو کەسەی کە خۆی بە پێغەمبەر دادەنا کوشتمان، ئەم قسەشیان هەر بۆ گاڵتە پێکردن بوو. وەك بت پەرستەکان دەیانگوت بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴾[1] ئەی ئەو کەسەی کە قورئان هاتوەتە خوار بۆ بۆت، بەڕاستی تۆ پیاوێ شێتی. لە دەنگو باسی جوولەکەکاندا هاتووە، بەر نەفرینو تۆڵەو تووڕەییو غەزەبی خوا کەون هاتووە، کاتێ کە خودای مەزن عیسای کوڕی مەریەمی ڕەوانە کرد بەو بە نیشانەوەو شارەزاییەوە. ئیرەییان (حەسوودیان) پێ برد بەوەی کە خودا کردویە بە پێغەمبەرو موعجیزەی زۆر گەورەشی پێداوە وەك چاك کردنەوەی کەسی بەڵەكو لاڵو زیندووکردنەوەی مردوو بە ئیزنی خوداو دروس کردنی وێنەی باڵدار لە قوڕو پاشان فوی پیا دەکرد دەبوە باڵدارێ بە چاو دەبینرا دەفڕی بە ئیزنی خودای مەزن. چەندین موعجیزەی تر لەم شێوەیە کە خودا پێی بەخشیبوو لە ژێر دەستیا دەهاتە دی. لەگەڵ ئەمانەدا هەموو بڕوایان پێ نەدەهێناو دژایەتیان دەکرد، بە هەموو جۆرێ ئازاریان ئەدا دریغیان لێ نەدەکرد، هەتا وای لێ هات لەو شارەدا لەگەڵیان دانەنیشتو بەجێی هێشتن لەگەڵ دایکیدا زۆر دەچوو بۆ گەشت، پاشان بەوەیش وازیان نەهێنا، بەڵکو خۆیان گەیاندە پاشای دیمەشق لەو کاتەدا، کە پیاوێکی بت پەرست بوو لە ئەستێرە پەرستان. بە خەڵکی وڵاتەکەیان دەگوت (الیونان) خۆیان گەیاندە لای، پێیان گوت پیاوێ لە (بیت المقدس)دا پەیدا بووە خەڵکی گومڕا دەکاتو سەری لێ دەشێوێنی، خراپە دەربارەی پاشاو ژێر دەستەکانی دەکات. پاشا لەوە زۆر تووڕە بوو ڕقی هەڵسا، نامەیەکی بۆ بریکارەکەی نارد لە (بیت المقدس) کە ئەو پیاوە بگرێو بیدات لە قەنارەو دڕك بکات بەسەریدا هەتا خەڵکی لە ئازاری ڕزگاریان ببێ. کاتێ نامەکە گەیشتە دەستی کاریەدەستەکەی (بیت المقدس) هەڵسا بەو کارە. لەگەڵ کۆمەڵێ لە جوولەکان ڕۆشت بۆ ئەو شوێنەی کە عیسای لێ بوو (سەلامی خوای لێبێ) خۆیو دوانزە یان سیانزە کەس بوون لە هاوەڵەکانی. هەندێکیش دەڵێن: حەڤدە کەس بوون. ئەو ڕۆژە هەینی (الجمعة) بوو دوای عەسر شەو شەممە، لە شوێنەکەیدا دەوریاندا، کاتێ عیسا (سەلامی خوای لێبێ) هەستی پێکردنو چارە نەماوە یان دێنە ژورەوە یان دەبێ ئەو بچێتە دەرەوە بۆ لایان، دەڵێت بە هاوەڵەکانی: کێ لە ئێوە (ئامادەیی تیایە) شێوەی منی بکرێ بە بەردا، ئەوە هاوەڵی منە لە بەهەشتا؟ لاوێ لە ناویاندا ئامادەیی خۆی دەربڕی.

---

[1] الحجر (٦).

وەك ئەوەی لە بۆ ئەو كارە نەشێ. دووەەم جارو سێهەم جاریش دووبارەی كردەوە، هەموو جارێك ئەو لاوە نەبێ كەس ئامادەیی ئەوە نەبوو. عیسا (سەلامی خوای لێبێ) گوتی: تۆ ئەو كەسەی، خودای گەورە شێوەی عیسای كرد بە بەریداو هەر دەتگوت خۆیەتی. كلاّو ڕۆشنەیی لە بنمیچی ماڵەكەدا كراوەو عیسا (سەلامی خوای لێبێ) خەوەنوچكەیە بردیەوە، هەر بەو شێوەیە بەرز كراوە بۆ ئاسمان وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ﴾[1] كاتێ خودای مەزن فەرمووی: ئەی عیسا من بۆ خۆمت دەبەمەوەو (بەرزت دەكەمەوە بۆ لای خۆم) لەلای خۆت جێت بەرز دەبێ. كاتێ كە بەرز كراوە. ئەو كۆمەڵە چوونە دەرەوە، ئەوانە كاتێ كە ئەو لاوەیان بینی، وایانزانی عیسایە. هەر بەو شەوە بردیانو لە قەنارەیان دا دڕكیان لەسەر سەر دانا. جوولەكەكان وایان پیشان دا كە ئەوان هەوڵی قەنارە دانیان داوە، زۆر كەیفیان بەوە بوو، چەند كۆمەڵێ لە مەسیحیەكان بڕوایان بەوە كرد لەبەر نەفامیو كەم ئاوەزیان. جگە لەوانەی كە لە ماڵەكەدا بوون لەگەڵ عیسادا (سەلامی خوای لێبێ) چونكە ئەوانە بە چاوی خۆیان بەرزبونەوەكەیان بینی. بەڵام مەسیحیەكانی تر هەر وەك جوولەكەكان وایان دەزانی ئەو كەسەی لە قەنارە درا عیسای كوڕی مەریەم بووە. هەتا گوتویانە مەریەم لە ژێری دار قەنارەی هەڵواسراوەكەدا دانیشتو دەگریا گوتراوە: ئەو كەسە قسەی لەگەڵ مەریەم دەكرد والله أعلم. ئەمە هەمووی تاقیكردنەوەی خودایە بەرانبەر عەبدەكانی، كاری خودایش هەموو پڕە لە كارزانی. خودای مەزن زۆر بە ڕوونیو ئاشكرا ئەمەی لە قورئانی پیرۆزدا كە ناردویەتی بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەكەی بە جوانی هێناوە. بە موعجیزەو نیشانەو بەڵگەی ئاشكرا پشتگیری پێدەكات كە خۆی ڕاستترین ڕاست بێژانەو پەروەردگاری گشت بونەوەرەو ئاگاداری هەموو دیارو نادیارەكانە، ئەو خودای كە شارەزای نهێنی ناو ئاسمانەكانو زەمینەو ئەوەی بوەو ئەوەی دەبێو ئەویش هەرگیز نابێ، گەر ببوایە چۆن دەبوو ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ نە ئەوان كوشتیانو، نە توانیان لە قەنارەی دەن بەڵام سەریان لێ تێكچوو بوو، واتە: كە چاویان پێی كەوت لە عیسا دەچوو (سەلامی خوای لێبێ) وایانزانی ئەوە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ﴾ ئەو كەسانەی لەناو خۆیاندا دەربارەی ئەو كێشەیە دوو دڵن هیچ زانیاریەكیان لەو بارەیەوە نیە جگە لە گومان. واتە: ئەوانە بانگەشەیان بۆ ئەوە دەكرد كە دەستەیە لە جوولەكە كوشتویانەو ئەوانەش بڕوایان پێكردن لە مەسیحیە نەفامەكان هەموو دوو دڵ بوون لەو بارەیەوەو سەرگەردانو سەر لێشێواو مابونەوە. بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ

---

[1] آل عمران (٥٥).

يَقِينًۢا﴾ بێگومان نەيان كوشتووە. واتە: قەناعەتی تەواويان نەبوو كە كوشتويانە، بەڵكو دوو دڵ و بە گومان بوون. ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ بەڵكو خودا بەرەو خۆی بەرزی كردەوە. خودا هەميشە خاوەنی دەستەڵات بووە و لە كارزانە. جێی هانايەو هيچ كەسێ دەستەڵاتی نيە بەسەريداو هەركەسێ هانای بۆ ببات بێ ئومێدی ناكاتو لە كارزانە لە هەموو ئەو شتانەی كە بڕياری ئەداو دەيكاتو دروستی دەكات. ئيبنوئەبی حاتەم ڕيوايەتی كردوە لە ئيبنوعەبباسەوە دەڵێت: كاتێ خودای گەورە ويستی عيسا بەرز بكاتەوە بۆ ئاسمان. عيسا (سەلامی خوای لێبێ) لە كانيەكی ئەو ماڵەدا بوو چوو بۆ لای هاوەڵەكانی لە حەوارييەكان كە دوانزە كەس بوون، سەری ئاوی لێ دەتكا گوتی: لەناو ئێوەدا كەسانی وا پەيدا دەبن دوانزە جار حاشا لە من دەكەن، دوای ئەوەی كە بڕوايان پێ هێنام. پاشان گوتی: كێ لە ئێوە (ئامادەيی تيايە) شێوەی من بكرێ بە بەريداو لە شوێنی من بكوژرێو لەگەڵ من بێ لە پلەكەمدا؟ لاوێ كە لە هەموويان تەمەنی كەمتر بوو هەڵسا. پێی گوت: دانيشە. پاشان لێی دووبارە كردنەوە. هەر ئەو لاوە هەڵسا. گوتی: دانيشە. پاشان پێی گوتنەوە. هەر ئەو لاوە هەڵساو گوتی ئەمن. عيسا (سەلامی خوای لێبێ) گوتی: تۆ ئەو كەسەی. شێوە عيسا كرا بە بەريدا. عيسا بەرز كراوە بەرەو ئاسمان لە كلاوڕۆژنەكەوە كە لە ماڵەكا بوو. پاشان كۆمەڵێ لە جوولەكەكان هاتن، هاوشێوەكەی عيسايان گرتو كوشتيان پاشان لە قەنارەياندا (هەڵيانواسی) هەندێ لەوانە دوانزە جا حاشان لێ كرد، پاش ئەوەی كە بڕوايان پێ دەهێنا. بوون بە سێ كۆمەڵ. كۆمەڵێكيان گوتی: خودا چەندێ مەيلی لێ بوو لەناوماندا ماوە پاشان بەرز بوە بۆ ئاسمان. ئەوانە يەعقوبييەكان بوون. كۆمەڵێكی تريان گوتی: كوڕی خودا چەندێ مەيلی لێ بوو لە ناوماندا ماوە، پاشان خودا بردييەوە بۆ لای خۆی. ئەوانەيش سەنتورييەكان (السنطورية) بوون. كۆمەڵێكی تريشيان گوتی: بەندەو پێغەمبەری خودا چەندی خودا مەيلی لێ بوو لەناوماندا ماوە، پاشان خودا بردييەوە بۆ لای خۆی. ئا ئەوانە موسوڵمانەكان بوون. دوو كۆمەڵە خوانەناسەكان پەلاماری كۆمەڵە موسوڵمانەكەيان داو كوشتيان. بەردەوام ئەم ئيسلامە كوژابووەوەو نەما بوو هەتا خودای مەزن موحەممەدی (ﷺ) ڕەوانە كرد[1]. ئەم سەنەدانە بۆ لای ئيبنوعەبباس ڕاستن. نەسائيش ڕيوايەتی كردوە لە ئەبوكورەيبەوە (ابو كريب) لە ئەبومەعاويەوە هەر بەم شێوەيە[2] چەند كەسی تريش لە زانايانی پێشينە (السلف) باسی ئەم دەكەيان كردوە كە عيسا (سەلامی خوای لێبێ) پێی گوتون: كێ لە ئێوە (ئامادەيی تيايە) شێوەی من بكرێ بە بەريداو لە جێی من بكوژرێ، ئەوە هاوەڵی منە لە بەهەشتا.

---

[1] إبن أبي حاتم (٤/١١١٠).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٤٨٩).

**هەموو مەسیحیەکان بڕوا دەهێنن بە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) پێش مردن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ لەوانەی ئەهلی کتێبن، هەرکەسێکیان (بەر لە مەرگی) بڕوا بە عیسا دەهێنێ. دیارە (عیسایش) لە ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەت لەسەری. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ دەڵێ: پێش لە مەرگی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ)[1] عەوفیش هەر وای گوتوە لە ئیبنوعەبباسەوە[2] ئەبومالیکیش لەم ئایەتەدا ﴿إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ دەڵێ: ئەوە لە کاتی دابەزینی عیسا دایە. بەر لە مردنی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) هیچ کەسێ لە ئەهلی کتێب نامێنێ مەگین بڕوای پێ هێناوە[3].

**باسی ئەو فەرموودانەی هاتوە لە بارەی دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمەوە لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەمین لە کۆتایی دنیادا بەر لە ڕۆژی قیامەتاو بانگ کردنی بۆ خوا پەرستی بە تاك و تەنیاو شەریك دانەنان بۆی**

بوخاری ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی باسی پێغەمبەراندا لە سەحیحەکەیدا لە بارەی دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمەوە گوتی: ڕیوایەت کراوە لە ئەبوهورەیرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، خەریکە کوڕی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ ناوتان. ئەوسا ببێتە دادوەرێکی دادپەروەرو خاچ (صلیب) بشکێنێ و بەراز بکوژێ و سەرانە هەڵگرێ و سامانیش ئەوەندە زۆر ببێ هیچ کەسێ وەری نەگرێ هەتا وای لێ دێ یەك سوژدە بردن بۆ خودا چاکترە بۆ ئەوان لە هەموو دنیاو ئەوەیش کە تیایەتی) پاشان ئەبوهورەیرە دەڵێ: ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾[4] موسلیمش هەر وا ڕیوایەتی کردوە[5] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ واتە: پێش لە مردنی عیسای کوڕی مەریەم.

---

[1] الطبري (٩/٣٨٠).

[2] الطبري (٩/٣٨٠).

[3] الطبري (٩/٣٨٠).

[4] فتح الباري (٦/٥٦٦).

[5] مسلم (١/١٣٥).

**ڕێگایەکی تر لە ئەبوهورەیرەوە**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لە شوێنێکدا پێی دەڵێن (فجّ الرَّوحاء) دەمرێ بەڕیوە دەبێ لە حەج یان لە عومرەدا یان هەردوویانی کۆ کردبوەوە)[١] موسلیمش هەر وا ڕیوایەتی کردوە[٢] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیزەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێ بەراز دەکوژێو خاچ لەناو دەبات (دەشکێنێ) نوێژی بۆ کۆدەکرێتەوە، ماڵ دەبەخشێ هەتا لێی وەرناگیرێو باج هەڵدەگرێ لە ڕەوحاء (الروحاء) دادەبەزێو لەوێوە حەج دەکات یان عومرە دەکات یان هەردووکیان پێکەوە) ئەبوهورەیرە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ حەنزەلە (حنظلة) وای دەزانی ئەبوهورەیرە گوتویەتی: پێش مردنی عیسا بڕوای پێ دێنن. نازانم ئەمە هەمووی فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) یان شتێکە ئەبوهورەیرە خۆی گوتویەتی[٣] ئیبنوئەبی حاتەمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە.

**ڕێگایەکی تر**

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێوە چۆنن کاتێ عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) دابەزیە ناوتان، پێش نوێژەکەتان (ئیمامەکەتان) لە خۆتان بێ)[٤] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە. موسلیمیش هێناویەتی[٥].

**ڕێگایەکی تر**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (پێغەمبەران کوڕی یەك باوکن، دایکیان جیایە، ئاینیان یەکە، وە من لە هەموو کەس بەرترم بە عیسای کوڕی مەریەم، لە نێوان منو ئەودا پێغەمبەرێکی تر نیە. بێگومان ئەو دادەبەزێ کاتێ چاوتان پێی کەوت بیناسن، پیاوێکی مامناوەندی نە کورت نە درێژ. سوورو سپی دوو پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردا بێ، وەك ئەوەی سەری ئاوی لێ بتکێو تەڕیشی پێوە دیار نەبوو، خاچ دەشکێنێو بەراز دەکوژێو سەرانە هەڵدەگرێو خەڵکی بۆ ئیسلام بانگ دەکات، لە کاتی ئەوا خودا هەرچی ئاینەکانە

---

[١] أحمد (٢/٥١٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] مسلم (١/١٣٥).

[٣] أحمد (٢/٢٩٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە، سەنەدەکەی لاوازە لەلای زوهری لەبەر لاوازی سوفیانی کوڕی حسەین بەڵام بە تەنیا ئەو نەیهێناوە ڕێگای تری زۆرە.

[٤] فتح الباري (٦/٥٦٦).

[٥] أحمد (٢/٢٧٢)، مسلم (١/١٣٦-١٣٧).

لەناوی دەباتو جگە لە ئیسلام، هەر لە کاتی ئەوا جەجاڵ لەناو دەبات، پاشان ئارامی دەکەوێتە سەر زەمین، هەتا (وای لێ دێ) شێرو وشترو پڵنگو ڕەشە وڵاخ (گاو مانگا)و گورگو مێ بەیەکەوە دەبنو منداڵان یاری بە مار دەکەنو هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێ. چل ساڵ دەمێنێتەوەو پاشان دەمرێو موسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن) ئەبوداودیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە[1].

**فەرموودەیەکی تر**

موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت هەڵناسێ هەتا ڕۆم دادەبەزێتە ئەعماق یان بیدابیق (الاعْماق بان بِدابق) دوو شوێنن سوپایەکیان لە مەدینەوە بۆ دەردەچێ لە چاکترین خەڵکی سەر زەمین لەو کاتەدا. کە بەرانبەر یەك ڕیزیان بەست بۆ شەڕ، ڕۆمەکان بە موسوڵمانەکان دەڵێن: ڕێمان بۆ چۆڵ بکەن لە نێوان ئێمەو ئەوانەی کە دیلیان لێ گرتووین شەڕیان لەگەڵ بکەین. موسوڵمانەکانیش بە ڕۆمەکان دەڵێن: نەخێر سوێند بە خوا لە نێوان ئێوەو براکانماندا ڕێ چۆڵ ناکەین. شەڕیان لەگەڵا دەکەن، سێیەکی لەشکری موسوڵمانەکان دەشکێن، هەرگیز خودا تەویەیان لێ قەبوڵ ناکات. سێیەکیشیان لێ شەهید ئەبێ لە چاکترینی شەهیدانی لای خودای گەورە. سێیەکیشیان سەردەکەون، کە بە هیچ فیتنەیێ لە ڕێ ناچنە دەرێ قوستەنتەنیە (قسطنطنية) ڕزگار دەکەن. لەو کاتەدا خەریکی دابەش کردنی تاڵان دەبنو شمشێرەکەیان بە داری زەیتوندا هەڵواسیبوو، شەیتان هاوارێ دەکات لە قوستەنتین. نەچنە دەرەوە ئەو قسەو هاواری شەیتانە پڕوپوچە (درۆیە) چونکە هێشتا دەجاڵ نەهاتوەتە دەر (کە ئەو سوپایە هاتنەوە شام دەجال دێتە دەر. خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکەنو ڕیزەکەیان ڕێك دەکەن، قامەت بۆ نوێژ ئەکرێ، لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) دێتە خوار، نوێژیان بۆ ئەکاتو ئەبێ بە ئیمامیان. کە دەجال چاوی بە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) ئەکەوێ خوێ لەناو ئاوا چۆن ئەتوێتەوە ئەویش وا ئەتوێتەوە، ئەگەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) وازی لێ بهێنایە، تا بە هیلاکدا ئەچێ ئەتوایەوە. بەڵام خودا بە دەستی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) ئەیکوژێ. خوێنەکەیان پێ نیشان ئەدات کە بەسەری نێزەکەیەوە بوو.[2] موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فورموویەتی: (شەڕ لەگەڵ جوولەکە دەکەنو کوشتاریان لێ دەکەن، تا وای لێدێت جوولەکە هەتا بەرد (هاوار دەکات) دەڵێت: ئەی موسوڵمان ئەمە جوولەکەیە وەرە بیکوژە)[3] دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] أحمد (٢/٤٠٦)، أبوداود (٤٣٢٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە، سەنەدەکانی لەسەر مەرجی موسلیمە.

[2] مسلم (٤/٢٢٢١).

[3] مسلم (٤/٢٢٣٨).

فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت هەڵناسێ هەتا موسوڵمانەکان لەگەڵ جوولەکەدا شەڕ دەکات. پاشان موسوڵمانەکان کوشتاریان لێ دەکەن، تا وای لێ دێت جوولەکە لە پشتی داروبەردەوە خۆیان دەشارنەوە، دارەکە یان بەردەکە دەڵێت: ئەی موسوڵمان ئەی بەندەی خوا ئەم جوولەکەیە لە پشتمەوەیە وەرە بیکوژە، جگە لە درەختی (غرقد) چونکە لە درەختی جوولەکەکانە).[1] ئەم فەرموودەی نەواسی کوڕی سەمعانە لێرەدا دێنین کە لەم فەرموودەیە دەچێ موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە نەواسی کوڕی سەمعان گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەیانیەك باسی دەجالی دەکرد، زۆر نزمی کردەوەو بە خراپی باسی دەکرد، زۆریش بەرزی دەکردەوەو باسی شتە شازەکانی دەکرد (خارق العادە) هەتا وامانزانی کە لەناو هەندێ باخی خورماکاندایە، کە چوین بۆ لای خورماکانەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی زانین، کە بیرمان بۆ کوێ چووە. فەرمووی: (ئیشتان چیە ئەچنە ناو دار خورماکانەوە؟) گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ بەیانی باسی دەجالت کرد. زۆرت نزم کردەوەو زۆریشت بەرز کردەوە، هەتا وامانزانی کە لەناو هەندێ لەو دار خورمایانە دایە، فەرمووی: ((دەجال هیچ نیە) ئەوەی من زۆر ترسم لێی هەیە بۆ ئێوە دەجال نیە. بێجگە لە دەجالە. ئەگەر دەجال بێتە دەرو من لەناوتانا بم من دژایەتیو بەرگری دەکەم لە باتی ئێوە. ئەگەر بێتە دەرو من لەناوتانا نەبم هەرکەسێ لە ئێوە بەرگری لە خۆی بکات. خودای گەورە وەکیلی من بێ لەسەر ئێوە. دەجال لاوێکی موو گژو لولە: چاوی وەك بۆڵە ترێ بەرز بۆتەوە، ئەوەی من پێی بچوێنم (بشوبهێنم) عەبدولعوزاری کوڕی قەتەنە (قطن) هەرکەسێ لە ئێوە بگاتە وەختی ئەوو تووشی ببێ سەرەتای سورەتی کەهف بخوێنێ (لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کۆتایی سورەتی کەهف بخوێنێ). دەجال لە نێوان شامو عێراقدا پەیدا دەبێ (دێتە دەر) ئەی بەندەکانی خودا خۆڕاگر بن، لەسەر باوەڕ بمێنن. یان شوێنی مەکەون). گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا چەندە لەسەر زەوی دەوەستێ؟ فەرمووی: (چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بە ئەندازەی ساڵێکە، ڕۆژێکی بە ئەندازەی مانگێکە، ڕۆژێکی بە ئەندازەی هەفتەیەکە. ڕۆژەکانی تری وەك ڕۆژەکانی ئێستەی ئێمە وایە، واتە ساڵێكو حەفتاو چوار ڕۆژ ئەمێنێتەوە). گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ڕۆژەی کە بە ئەندازەی ساڵێکە (ئەوانەیش کە بە ئەندازەی مانگێكو هەفتەیەکە) نوێژی ڕۆژێ بۆ ئێمە بەسە؟ فەرمووی: (نەخێر بە ئەندازەی ڕۆژەکانی تر ئەندازەی بۆ دابنێن). هاتەکە دەجال هات هەر لە بیستو چوار سەعاتدا پێنج نوێژ بکەن. گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خێراییو پەلەی لە زەویدا چۆنە؟ فەرمووی: (وەك بارانێکە کە بای لە پێشەوە بێ. بەسەر گەلێکدا بڕواو بانگیان بکات، بڕوای پێ دەهێننو وەڵامی بانگەکەی ئەدەنەوە.

---

[1] مسلم (٢٢٣٩/٤).

فەرمان بە ئاسمان دەکات باران ئەبارێنێ، فەرمان بە زەوی دەکات گیاو کشتوکاڵ ئەڕوێنێ، مەڕو ناڵاتیان ئێوری ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵ بەرزو گران پڕ کەلەکە هەڵاوساو، لە دوای ئەوە بەسەر گەلێکی تردا ئەڕواو بانگیان دەکات، وەڵامی نادەنەوە، لێیان ئەگەڕێتەوە هەژار دەبن. لە ماڵو موڵکی خۆیان هیچیان بە دەستەوە نامێنێ. بەلای کەلاوەدا ئەڕوات بە کەلاوەکە دەڵێ: چەند گەنجینەت تیایە بیخە دەرێ. گەنجینەکەی وەك پورەی هەنگ شوێنی ئەکەوێ، لە دواییدا پیاوێکی زۆر جوانو لاو بانگ دەکات بە شیر لێی ئەدا، ئەیکا بە دوو پارچەوە، نێوان پارچەکانی بە ئەندازەی تیر بگرنە نیشانە لێك دوورن. لە دوایدا بانگی دەکات بە پێکەنینو ڕووخۆشی دێتەوە لای. لەو کاتەدا کە ئەو لەسەر ئەو حاڵەیە. خودای مەزن عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) ئەنێرێ لای منارەی سپی (کە ئەمڕۆش ماوە) لە لاری ڕۆژهەڵاتی دیمەشقەوە دائەبەزێ. لەناو دوو پۆشاکدایە یەکێکیان بە زەعفەرانو یەکێکیان بە وەرس (کە گیایەکی بۆن خۆشو بە زەرد ڕەنگ کراوە دەستی ناوەتە سەر باڵی دوو فریشتە کە سەری دانەوێنێ قەتری ئاوی لێ دێتە خوارێ کە سەر بەرز دەکاتەوە وەك دانە مرواری لێی دێتە خوار، هیچ خوانەناسێ بۆنی هەناسەی ناکات مەگین دەمرێ، بۆنی هەناسەی بە ئەندازەی بینینی خۆی دەڕوات. عیسا (سەلامی خوای لێبێ) شوێنی دەججال ئەکەوێ تا بەر دەرگای شاری (لودد) کە شارێکە نزیکی قودوس، پێی دەگاتو دەینێرێ بۆ جەهەنم. لە دوایدا عیسا (سەلامی خوای لێبێ) دێتە لای گەلێ کە خوا پاراستونی لە شەڕی فیتنەی دەججال دەستی بە سەرو چاویانا ئەهێنێ، هەواڵیان ئەداتێ بە پلەیان لە بەهەشتدا. لەو کاتەدا خودا نیگا دەنێرێ بۆ عیسا (سەلامی خوای لێبێ) ئەفەرموێ: هەندێ لە بەندەکانی خۆم، دەرکردوە (دەرچواندوە) هیچ کەس توانای نیە شەڕیان لەگەڵ بکات. بەندەکانی من ببە بۆ کێوی توور، لەوێ بیانپارێزە. خودا یەئجووجو مەئجووج ئەنێرێ لە هەموو سەر بەرەو ژێرەیێ گل ئەبنەوە (دێنە خوارەوە) سەرەتایان بەلای دەریاچەی تەبەریەدا (طبرية) تێدەپەڕێ هەرچی ئاوی تێدابێ هەمموی دەخۆنەوە، دواییەکەیان بەلایدا دەڕوات دەڵێن: دیارە جارێ ئێرە ئاوی تێدا بووە. یەئجووجو مەئجووج دەوری عیساو (سەلامی خوای لێبێ) هاوەڵەکانی ئەدەن. وای لێ دێ کە سەری گایەکیان لەلا لە سەد دینار بۆ یەکێکی ئەمڕۆی ئێوە چاکتر دەبێ. عیساو (سەلامی خوای لێبێ) هاوەڵەکانی لە خوا ئەپاڕێنەوە، خودا کرمێکیان لەناو ملیاندا بۆ ئەنێرێ، بە یەك جار وەك یەك گیان ئەمرن. لە دوایدا عیساو (سەلامی خوای لێبێ) هاوەڵەکانی لە کێوی توور دێنە خوارەوە سەر زەوی (یانی بۆ دەشت) جێ بوستێ لە زەوی نیە کە لە لاشەو بۆنی پیسیان پڕ نەبووبێ. عیساو (سەلامی خوای لێبێ) هاوەڵەکانی لە خوا ئەپاڕێنەوە خودای مەزن باڵندەیەك ئەنێرێ وەك ملی وشتر گەورە ئەو لاشانە هەڵدەگرێ فڕێیان ئەدەنە ئەو جێیەی کە خوای گەورە مەیلی لێیە لە دواییدا خودا بارانێك ئەنێرێ، هیچ خانویەكو هیچ خیوەتێ نیە ڕێگری لێ بکات، خودای مەزن بەو بارانە

زەوی ئەشواتەوە میناى لێ دەكات لە دوایدا خودای گەورە فەرمان دەكات بە زەوی: درەختی میوەدار بڕوێنە، بەرەكەت بێنەرەوە عەشیرەتێكی گەورە لە هەنارێك دەخۆن، لەبەر سێبەری تێكوڵەكەیدا دائەنیشن، بەرەكەت ئەكەوێتە شیرەوە بەو جۆرە وشترێكی تازە زاو بەشی عەشیرەتێك دەكات، مانگایەكی تازە زاو بەشی دەستەیەك لەو عەشیرەتە دەكات، مەڕێكی تازە زاو بەشی خێڵێ دەكات. لەسەر ئەم حاڵەتە دەبن، خوا بایەكی بۆن خۆش ئەنێرێ، لە بن باخەڵیان ئەداو هەرچی موسوڵمان بێ ئەمرێ. خەڵكی خراپ لەڕێ لادەرو بەدفەڕ دەمێننەوە. وەك كەرگەل بە ئاشكرا لای یەكتری سواری ژن دەبن. لەسەر ئەوانە قیامەت هەڵدەسێ[1]. لەمەوبەدا دیسان لە ڕێگەی ئەحمەدەوە لەم ئایەتەدا لە سورەتی ئەنبیاء دا: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ﴾[2] هەتا كاتێ دەرگا لە یەئجوج و مەئجووج دەكرێتەوە. باسی دەكەین. ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەكانیش ڕیوایەتیان كردوە.[3] لەم چەرخانەی دوایدا لە ساڵی حەوت سەدو چل و یەك ئەم منارە سپیە بۆ مزگەوتی ئەمەوی (الجامع الاموي) دروست كرا لە بەردی داتاشراو لە جێی ئەو منارەی كە ڕووخا بەهۆی ئەو سوتاندنەی درایە پاڵ مەسیحیەكان پێی هەڵسا بن (بەر نەفرینی بەردەوامی خوا كەون هەتا ڕۆژی قیامەت) زۆری چاك كردنەوەكەی بە سامانی ئەوان بوو. بۆچوونەكان بەهێزن لەسەر ئەوە كە ئەو منارەیە عیسای كوڕی مەریەم لایدا دادەبەزێ (سەلامی خوای لێبێ).

**فەرموودەیەكی تر**

دیسان موسلیم ڕیوایەتی كردوە لە سەحیحەكەیدا لە یەعقوبی كوڕی عاسمی كوڕی عوروەی كوڕی مەسعودی سەقەفیەوە گوتی: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرم بیست كە پیاوێ هات بۆ لای گوتی: ئەم فەرموودەیە كامەیە كە باست كردوەو دەڵێیت: ڕۆژی قیامەتتا ئەوەندەو ئەوەندە هەڵدەسێ؟ گوتی: پاك و بێ عەیبی بۆ خودا یا (لا إله إلا الله) یا قسەیەكی لەم شێوەیە كردو گوتی نیازم وا بوو كە هەرگیز قسە بۆ هیچ كەسێ نەكەم. من ئەمەم گوتوە: بێگومان ئێوە پاش ماوەیەكی كە ڕووداوێكی زۆر گەورە دەبینن، ئەم ماڵە (ماڵی خودا) دەسوتێ و ئەوەو ئەوە دەبێ پاشان گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەجال لە ئوممەتی منا دەردەچێ چل دەمێنێتەوە نازانم چل ڕۆژ یا چل مانگ یا چل ساڵە، خودا عیسای كوڕی مەریەم دەنێرێ دەڵێیت عوروەی كوڕی مەسعودە، دەگەڕێ بە شوێنیداو لەناوی ئەبات (دەیكوژێ) پاشان خەڵكی حەوت ساڵ دەمێننەوە، دژایەتی لەناو دوو كەسدا نابێ،

---

[1] مسلم (٢٢٥٠).

[2] الانبياء (٩٦).

[3] أحمد (١٨١/٤)، أبوداود (٤٩٦/٤)، تحفة الاحوذي (٤٩٩/٦)، النسائي في الكبرى (١٥/٥)، إبن ماجة (١٣٥٦/٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

پاشان خودای مەزن بایەکی سارد ئەنێرێ لە لای شامەوە، هیچ کەسێ لە ڕووی زەویدا نامێنێ لە دڵیدا بە ئەندازەی گەردیلەیە چاکە هەبێ (یا باوەڕی هەبێ) مەگین گیانی دەیشێ. هەتا ئەگەر کەسێ چووبێتە ناو ناوەڕاستی کێوێکەوە دەچێتە ژورەوە بۆی تا گیانی بکێشێ). عەبدوڵڵا گوتی: ئەوەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست فەرمووی: (هەر خەڵکی خراپ ئەمێننەوە بۆ خراپە کردن. وەك مەل وانە، ئەوەندە سووك هەڵدەسنە سەر خراپە کردن، لە عەقڵی درندەدان، نە چاك دەزانن کە بیکەن و نە فەرمانیشی پێدەکەن. نە خراپ ئەزانن کە لێی لادەن و یەکێکی تریش کردی بەرگری لێ ناکەن. شەیتان بۆ ئەو کەسانە ئەچێتە شێوەی مرۆڤەوە و پێیان ئەڵێ: ئێوە بە گوێم ناکەن؟ ئەڵێ: بە چی فەرمانمان پێدەکەی؟ فەرمانیان پێدەکات بە بت پەرستن، ئەو خەڵکە لەو بت پەرستیەدا ڕۆزیان زۆر دەبێ و ژیانیان خۆش دەبێ. لە دوایدا فوو دەکرێ بە کەڵەشاخدا (صور) هیچ کەس نیە کە ببیسێ و لایەکی ملی لار نەکاتەوە و لایەکی بەرز نەکاتەوە. (بە لادا نەیێ) فەرمووی: یەکەم کەسێ کە دەیبیسێ ئەو پیاوەیە کە حەوزی وشترەکانی سواخ ئەدات، کە لێی ئاو بدات. لەناوئەچێ و هەموو خەڵکیش لەناو دەچن، لە دوایدا خوا بارانێ ئەبارێنێ وەك پرووشەی شەونم، یا وەك سێبەر. نوعمان گومانی هەیە کە عەبدوڵڵا چۆنی گوتوە: (زانایان دەڵێن: پرووشە ڕاسترە و ڕێك دەکەوێ لەگەڵ ئەم فەرموودەدا کە ئەفەرموێت: وەك مەنی پیاوانە) لاشەی مرۆڤی پێ دەڕوێت، لە دوایدا جارێکی تر فوو بە کەڵەشاخدا دەکرێت، خەڵکی هەموو ڕاست ئەبنەوە و تەماشا دەکەن، پاشان فەرمانێ ئەدرێ، ئەی خەڵکینە وەرن بۆ لای پەروەردگارتان. فەرمانێ ئەدرێ ڕایانبگرێ پرسیاریان لێ ئەکرێ، پاشان فەرمانێ ئەدرێ ئەوەی بچێتە ئاگرەوە جیایان بکەنەوە. (ئەوەی فەرمانی پێدەکرێ ئادەم پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێ) ئەفەرموێت: لە چەند چەند؟ فەرمانی پێدەکرێ لە هەر هەزارێ نۆسەدو نەوەدو نۆ. فەرمووی: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە منداڵ پیر دەکات، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە بۆ لێپرسینەوە قوڵی لێ هەڵدەکرێ و ناڕەحەتی دەست پێدەکات[1].

## سیفەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێ)

لە پێشەوە لە فەرموودەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئادەمەوە (آدم) باس کرا لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا فەرمووی: (کە چاوتان پێی کەوت بیناسن، پیاوێکی چوار شانەی بە درێژ نە کورت سوور و سپی دوو پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردایە، وەك ئەوەی سەری ئاوی لێ بتکێ، تەڕیشی پێوە دیار نیە)[2] وە لە فەرموودەکەی نەواسی کوڕی سەمعانەوە هاتووە: (لەلای منارە سپیەکەدا لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشقەوە دادەبەزێ. دوو پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردایە، دەستی ناوەتە سەر باڵی

---

[1] مسلم (٢٢٥٨).

[2] أبوداود (٤/٤٩٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە، لەسەر مەرجی موسلیم.

دوو فریشتە، کە سەری دانەوێنێ قەترەی ئاوی لێ دێتە خوارێ، کە سەر بەرز دەکاتەوە وەك دانەی مرواری لێ دێتە خوار، هیچ خوانەناسێ بۆنی هەناسەی ناکات مەگین ئەمرێ، هەناسەی بە ئەندازەی بینینی خۆی دەڕوات).[1] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوهورەیرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا، مووسام دی (سەلامی خوای لێبێ) پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کرد فەرمووی: پیاوێك بوو مامناوەندی نە قەڵەو لاواز، مووی سەری وەك بە شانە داهێنابێ ڕێكو ساف. وەك لە پیاوانی شەنۆ ئەبێ وا بوو) وە فەرمووی: (عیسام دی (سەلامی خوای لێبێ) پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کردو فەرمووی: (پیاوێکی مامناوەندی بوو نە درێژ نە کورت، نە قەڵەو نە لاواز ڕەنگ سوورو ئاڵ وەك لە حەمام هاتبێتە دەرێ، وە ئیبراهیمم دی (سەلامی خوای لێبێ) لە منداڵی ئەو من لە هەموویان زیاتر لەو دەچووم).[2] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی موجاهیدەوە لە ئیبنوعومەرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (مووساو عیساو ئیبراهیمم دی، عیسا (سەلامی خوای لێبێ) سوورو موو گژو لوولو سنگ پان بوو. مووسایش (سەلامی خوای لێبێ) گەنم ڕەنگو کەڵەگەتو مووی سەری ساف بوو لە پیاوانی زوت (الزُّطّ) دەچوو)[3]، بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە نافیعەوە گوتی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خەڵکیدا باسی دەججالی کرد فەرمووی: (خودای مەزن یەك چاو نیە، بەڵام دەججال یەك چاوە، چاوی ڕاستی وەك بۆڵە ترێ بەرز بوەتەوەو دەرپەڕیوە)[4]، موسلیم ئەم فەرموودەی بە مەرفوعی ڕیوایەت کردوە لە نافیعەوە: (خودای مەزن لە خەومدا لە لای کەعبەدا لە پڕ پیاوێکی پیشاندام گەنم ڕەنگ لە جوانترین پیاوە گەنم ڕەنگەکان کە ببینی، مووی سەری لە نێوان هەردوو شانی ئەدا داهێنرا بوو، ئاو لەسەری ئەتکا (دڵۆپەی دەکرد) هەردوو دەستی لەسەر شانی دوو پیاو دانا بوو، بە دەوری کەعبەدا (البیت) تەوافی ئەکرد، گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لێبێ) پاشان لە دوایەوە پیاوێکم چاو پێ کەوت مووی گژو لوول بوو، چاوی ڕاستی کوێر بوو، لەناو ئەو کەسانەی کە زۆر لەو بچێو من چاوم پێی کەوتبێ ئیبنوقەتەنە (ابن قطن) (ئیبنوقەتەن پیاوێك بوو لەکاتی نەفامیدا لەناو چووە) هەردوو دەستی خستبوە سەر شانی پیاوێ تەوافی بەیتی دەکرد، گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە مەسیحی دەججالە)[5] دیسان بوخاری

---

[1] مسلم (٢٢٥٣/٤).

[2] فتح الباري (٤٩٣/٦)، مسلم (١٥٤/١).

[3] فتح الباري (٥٤٩/٦).

[4] مسلم (٢٢٤٨/٤).

[5] مسلم (١٥٤/١).

ڕیوایەتی کردوە لە سالمەوە لە باوکیەوە گوتی: نەخێر سوێند بە خودا پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرمووە کە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) سوور بووە بەڵکو فەرموویەتی: (لە کاتێکدا کە من خەوتبووم تەوافم بە دەوری کەعبەدا ئەکرد لەپڕ پیاوێکی گەنم ڕەنگ (ئەسمەر)م دی، مووی سەری ساف لە نێوان دوو پیاودا دابەزی ئاو لەسەری ئەتکا (ئاو لەسەری دلۆپەی ئەکرد) گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: عیسای کوڕی مەریەمە. ڕۆشتم و لام کردەوە پیاوێکی کەڵەوکەت و موو گژو لوولم دی، چاوی ڕاستی کوێر بوو. وەك بۆڵەتریێ بەرز بوبوەوەو دەرپەڕیبوو. گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: دەججالە. نزیکترین کەسێ لەو بچوایە ئیبنوقەتەنە (ابن قطن)) زەهری گوتی: پیاوێك بووە لە فوزاعە لە زەمانی نەفامیا لەناوچووە[1] ئەمانە هەموو قسەی بوخاریە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەت لەسەریان قەتادە گوتی: لە ڕۆژی قیامەتا (عیسا) (سەلامی خوای لێبێ) دەبێتە شایەت بەسەریانەوە کە ئەو ئەو پەیامەی پێ ڕاگەیاندون لەلایەن خوداوەو بەندایەتی تەنیا بۆ خودای مەزن کردوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سورەتی مائیدە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ الى قوله ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾[2] ئەو کاتەش کە خودا فەرمووی: ئەرێ عیسای کوڕی مەریەم، تۆ گوتوتە بە خەڵکی (بێجگە لە خودا) دەبێ ئێوە منو دایکم وەك دوو خودا بپەرستن. هەتا دەگاتە بەدەستەڵات و لەکارزانە.

﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَـٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّـٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾﴾

## قەدەغە کردنی خواردنە پاك و خاوێنەکان لە جوولەکە بەهۆی ستەمکاریانەوە

خودای مەزن باسی جوولەکە دەکات کە بەهۆی ئەو هەموو ناهەقی و تاوانە گەورانەی دەیانکرد، ئەو خۆراکە چاکانەی کە لە پێشا لێیان قەدەغە نەبوو، لێیان قەدەغە رکا، لەوانەیە ئەم قەدەغە کردنە هەر خودا خۆی لەسەری دانابن لەبەر ئەوەی ئەوان کتێبی خودایان دەستکاری کردو بە ئارەزوی خۆیان

[1] فتح الباري (٦/٥٥٠).
[2] المائدة (١١٦-١١٨).

زۆر شت حەلاڵ بوو لە خۆیان حەرام دەکردو لەسەر خۆیان گران و قورس دەکرد. لەوانەیشە بڕیارێکی شەرعی بۆبێ، واتە: کە خودای گەورە چەند شتێکی لە تەوراتدا لێ حەرام دەکردن لە پێشا حەلاڵ بوە بۆیان. وەك ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾[1] هەموو جۆرە خواردەمەنیەك بۆ نەوەی ئیسرائیل حەلاڵ کراوە مەگین ئەوەی کە ئیسرائیل پێش لەوە تەوراتیان بوبێ، لە خۆیان حەرام کردبێ. لە پێشدا لە بارەی ئەم ئایەتەوە قسەمان کردوە. مەبەست ئەوەیە، هەموو جۆرە خواردەمەنیە لە پێش هاتنی تەوراتدا حەلاڵ بوە بۆیان جگە لەو خۆراکانەی کە ئیسرائیلیەکان خۆیان لەسەر خۆیان حەرام کردبوو. لە خواردنی گۆشتی وشترو شیرەکەی. پاشان خودای مەزن زۆر شتی تریشی لێ حەرام کردن لە تەوراتدا وەك لە سورەتی ئەنعامدا ئەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ ۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾[2] ئێمە هەموو زیندەوەری نینۆك دارو پیوی گاو مەڕمان لەوانە بوونە جوولەکە حەرام کرد، مەگین پیوێ کە لەسەر پشتی ئەو دووانە جێی گرتوە، یان ئەو پیوەی لەگەڵ ڕیخۆڵەکانیانە، یان ئەو پیوەی تێکەڵاوی پێستە بووە. بۆیە ئەو سزایەمان دان، ستەمکار بوون و لە ڕێگەی ئێمە دەرچوون، دیاریشە ئێمە ڕاست دەڵێین. واتە: بۆیە لێمان حەرام کردن، چونکە ئەوانە شایەنی ئەو سزایە بوون لەبەر ستەمکاری و لە ڕێ دەرچوون و دژایەتی کردن و سەرپێچی پێغەمبەرەکانیان، هەر بۆیە لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ لەسەر ئەو ناهەقیەی کە لە جوولەکەکان دەرکەوت و زۆر کەسیان لە ڕێگەی خودا لادا، لەو شتە باشانەی بۆیان حەلاڵ بوو، بێ بەشمان کردن. واتە: خۆشیان و خەڵکیشیان لە ڕێگەی ڕاست وەردەگێڕا، ئەوەیش سیفەتێکی تایبەتی خۆیان بوو کە هەر لە دێر زەمانەوە و ئێستایش پێی ناسراون. هەر بۆیە دوژمنی پێغەمبەرەکان بوون، زۆرێکیشیان لێ کوشتن. بڕواشیان بە عیساو (سەلامی خوای لێبێ) موحەممەدیش (ﷺ) نەهێنا. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ﴾ هەر وا بەهۆی سوو خواردنیان، کە پێیان گوترا بوو: مەیخۆن. واتە: خودا سوو خواردنی لێ قەدەغە کردبوون کەچی هەر دەیانخواردو لە خلکیان لە خەڵکی وەردەگرت بە چەند جۆر فێڵ و تەڵەکەیان ڕێك

---

[1] آل عمران (٩٣).

[2] الانعام (١٤٦).

دەخست سامانی ئەو خەڵکەیان بە شتی پڕوپوچ و ناڕەوا ئەخوارد، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ بە فێڵ سامانی خەڵکیان دەخوارد، ئێمەش بۆ ئەو بێ باوەڕانەیان ئازارێکی زۆر بە ژانمان ساز داوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ﴾ بەڵام زۆر زاناکانیان و بڕواداران. واتە: ئەوانەی کە خۆڕاگر بوون لەسەر ئاینەکەیان، جێ دەستیان دیارە لەو زانیاریە زۆرە پڕ بەهرەیان، لەم بارەیەوە لە پێشەوە لە سورەتی ئالی عیمراندا باس کراوە ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ عەتف کراوەتە سەر ﴿ٱلرَّٰسِخُونَ﴾ خەبەرەکەی ﴿يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ یە واتە: بڕوایان بەوەی بۆ تۆ هاتوەتە خوارو بەوەیش وا پێش تۆ ڕەوانە کراوە هەیە. ئیبنوعەبباس گوتی: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و سەعلەبەی کوڕی سەعیەو (سعية) ئەسەدو زەیدی کوڕی سەعیەو ئەسەدی کوڕی عوبەید کە هاتنە ناو ئیسلام و بڕوایان هێنا بەوەی کە موحەممەد (ﷺ) پێی ڕەوانە کرا ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ بەتایبەت ئەو کەسانە کە نوێژ بە باشی بەجێ دێنن (هەروەها زەکات دەدەن. لەوانەیە مەبەست پێی زەکاتی سامان بێ، وە هەڵیش دەگرێ زەکاتی گیان بێ (النفس) لەوانەشە هەردوکیان بێ. والله أعلم ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ئەوانەی کە بە خوداو ڕۆژی قیامەت بڕوایان هەیە. واتە: بڕوایان هەیە کە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوداو بڕواشیان بە زیندوو بونەوە هەیە دوای مردن و پاداشتی کردارەکانیش چ چاک چ خراپ. ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەوا بەو زوانە پاداشتێکی زۆر گەورە ئەدەین واتە: کە بەهەشتە.

﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّۦنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾

**نیگا (وەحی) کراوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەك کراوە بۆ ئەوانەی پێش خۆی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّۦنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا﴾ ئێمە نیگامان بۆ کردی هەروەك نووح و پێغەمبەرانی دوای ئەویشا نیگا بۆ کردن،

نیگاشمان بۆ ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوبو نەوەکانی (یەعقوب)و عیساو ئەییوبو یونسو هارونو سولەیمانو زەبوریشماندا بە داوود. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق گوتی: لە موحەممەدی کوڕی ئەبوموحەممەدەوە لە عیکرمەوە یان لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: سوکەین (سُکین)و عەدی کوڕی زەید گوتیان: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئێمە ئاگادار نین کە خودا دوای مووسا هیچ شتێکی بۆ مرۆڤ دابەزاندبێ. خودای مەزن لەسەر ئەو قسەی ئەوانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ هەتا کۆتایی ئەم ئایەتانە.[1] خودای گەورە باسی کردوە کە نیگای ناردوە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) وەك چۆن نیگای ناردوە بۆ پێغەمبەرەکانی پێش ئەمو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ هەتا دەگاتە ﴿وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾ زەبوور ناوە بۆ ئەو کتێبەی کە خودا نیگای کرد بۆ داوود (سەلامی خوای لێبێ).

## ئەوانەی لە قورئاندا ناویان هاتوە بیستو پێنج پێغەمبەرن (سەلامی خوایان لێبێ)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ پێغەمبەرانی تریشمان نارد بەسەرهاتەکانیانمان گێڕاوەتەوە بۆت، لە پێشداو پێغەمبەرانێکیش کە بەسەرهاتەکانیانمان نەگێڕاوەتەوە بۆت. واتە لە پێش ئەم ئایەتە، واتە: لە سورەتە مەککیو سورەتەکانی تریشدا. ئەمە ناوی ئەو پێغەمبەرانەیە کە لە قورئاندا ناویان هاتوە: ئادەمو نووحو ئیدریسو هودو سالحو ئیبراهیمو لووتو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوبو یوسفو ئەییوبو شوعەیبو مووساو هارونو داوودو سولەیمانو ئیلیاسو ئەلیەسەعو زەکەریاو یەحیاو عیساو ذو الکیفل لە لای زۆرینەی زانایانی تەفسیر، موحەممەد (ﷺ) گەورەی گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ). ﴿وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ﴾ پێغەمبەران کە بەسەرهاتەکانیانمان بۆ نەگێڕاوەتەوە بۆت. واتە: زۆر پێغەمبەرانی تریش کە لە قورئاندا باسیان نەکراوە.

## ڕێزی مووسا (سەلامی خوای لێبێ)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ خودا بۆ خۆی (ڕاستەوخۆ) مووسای دواندوە. ئەمە ڕێزێکە بۆ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) کە بەم شێوەیە وەسفی دەکات، بۆیە پێی دەگوترێ: (التکلیم) واتە: دوێنراو. حافیز (الحافظ) ئەبوبەکری مەردەوەیهی (المردویە) ڕیوایەتی کردوە لە عەبدولجەباری کوڕی عەبدوڵڵاوە گوتی: پیاوێ هات بۆ لای ئەبوبەکری کوڕی عەیاشو گوتی:

---

[1] الطبري (٩/٤٠٠).

بیستم لە پیاوێ ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە دەخوێندەوە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ واتە: وتەی (اللّه)ی بە مەنسوبی (منصوب) دەخوێندەوە. ئەبوبەکر گوتی: کەسێ خوانەناس نەبێ وا نایخوێنێتەوە، گوتی: خوێندمەوە بۆ ئەعمەش، ئەعمەش بۆ یەحیای کوڕی وەساب (وثاب) یەحیای کوڕی وەساب بۆ عەبدورەحمانی سولەمی، ئەبوعەبدورەحمانی سولەمی بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالب، عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش بەم شێوەیە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) خوێندوەتەوە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ واتە: وتەی (اللّه)ی بە مەرفوعی بۆ خوێندوەتەوە. ئەبوبەکری کوڕی عەیاش لەبەر ئەوە زۆر توڕە بوو لەو کەسەی بەو شێوەیە خوێندویەتیەوە، چونکە ئەو کەسە وتەو مانای قورئانی گۆڕیوە، ئەمە ڕاوبۆچوونی موعتەزیلەکانە دانی پێدانانێن و ئینکاری دەکەن کە خودا قسەی لەگەڵ مووسادا کردبێ یان قسەی لەگەڵ هیچ کەسێ لە دروستکراوەکانی کردبێ. وەك ڕیوایەت کراوە لە هەندێ لە موعتەزیلەکانەوە کە لەلای هەندێ لە زانایان بەم شێوەیە خوێندویانەتەوە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ پێیان گوتوە: ئەی کوڕی لەخناء (واتە: کوڕی بۆگەن و پیس) ئەی چی بەم ئایەتە دەکەی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾[1] کاتێ مووسا هات بۆ ئەو شوێنەی بۆمان دانابوو پەروەردگاری قسەی لەگەڵ کرد. واتە: ئەمە هیچ گۆڕین و تەفسیرێکی تر هەڵناگرێ.

## مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) نەهێشتنی بڕوبیانوە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ پێغەمبەران مژدەدەرو ترسێنەر بوون. واتە: مژدە ئەدەن بەو کەسانەی کوێڕایەڵی خوداو شوێن ڕەزامەندی ئەو دەکەون لە چاکە خوازیدا، ئەو کەسانەش ئەترسێنن کە دژی فەرمانەکانی ئەبن و بڕوا بە پێغەمبەرەکانی ناهێنن بە سزاو تۆڵەی سەخت ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ تا لە پاش پێغەمبەران ئەو خەڵکە هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نەبێ بۆ لای خوا، خودا خاوەن دەسەڵاتی لەکارزانە. واتە: خودای گەورە کتێبەکانی ناردوەو پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوە بە مژدەکان و ترساندن ڕوونیشی کردوەتەوە کە چی پێ خۆشەو لێی ڕازیەو چیشی پێ ناخۆشەو لێی ناڕەزایە، بۆ ئەوەی هیچ کەسێ هیچ بیانویەکی نەمێنێ. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ

---

[1] الاعراف (١٤٣).

وَنَخۡزَىٰ﴾[1] ئەگەر ئێمە بەر لەم قورئانە ئەوانمان بە ئازارێ لەناوبردایە، دەیانگوت: ئەی پەروەرێنمان تۆ بەر لەوە بێچارەو ڕیسوا ببین بۆچی پێغەمبەرێکی خۆت بۆ نەناردین، تا شوێن نیشانەکانی تۆ بکەوین؟ وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾[2] ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە کاتێ (بەهۆی ئاکارەکانیان تووشی بەلایەك دەبن) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنومەسعودەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەس لە خودا بە غیرەتتر نیە هەر لەبەر ئەوەیە بەدڕەفتاری حەرام کردوە چ ئەوەی بە ئاشکرا بێ یا بە نهێنی. کەس نیە پیاهەڵدانی لەلا خۆشەویستتر بێت لە خودای گەورە. هەر لەبەر ئەوەیە ستایشی خۆی کردوە، کەسیش نیە پۆزش بۆ هێنانەوەی لەلا خۆشەویستتر بێت لە خودای گەورە، لەبەر ئەوەیشە پێغەمبەرانی ناردوە کە مژدەدەرو ترسێنەر بن) وە لە وتەیەکی تردا هاتووە: (لەبەر ئەوەیە کتێبی دابەزاندوەو پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوە)[3].

﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧٠﴾﴾

ئەم ئایەتانەی پێشەوە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ پێغەمبەریەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەسەلمێنێ‌و وەڵام دانەوەی ئەو کەسانەیشە کە دان بە پێغەمبەرێتیدا نانێن لە بت پەرستان‌و ئەهلی کتێب. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَ﴾ خودا خۆی شایەت ئەدات کە ئەو قورئانە ئەو ناردویەتیە خوارەوە بۆت. واتە: با ئەوانەی حاشای لێ دەکەن لە خوانەناسان‌و بڕوایش بە تۆ ناکەن‌و دژایەتیت دەکەن هەر بڕوا نەکەن. خودا خۆی شایەتیت بۆ ئەدات کە تۆ ڕەوانە کراوی ئەوی‌و خۆی ئەو کتێبەی بۆ ناردوی کە

[1] طه (١٣٤).

[2] القصص (٤٧).

[3] فتح الباري (١٤٦/٨)، مسلم (٢١١٤/٤).

قورئـانی پـیرۆزە ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾[1] پرووپـوچ لـە ڕووی ناوەستیّ (چ ڕوویەڕوو چ پاشملە) ئەم کارزانیّ ناردویە کە هەر دەبیّ ستایش بکریّ. هـەر بۆیـە لیّـرەدا ئەفەرمویّت: ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ﴾ کە خودا بە زانستی خۆی ئەی ناردۆتە خوار. واتە: بەو زانیاریـەی کـە پێی باشە بەندەکانی لیّ ئاگادار بکات لـە ڕێـی ڕاستو بەڵگـەی ئاشـکراو جیـا کردنـەوەی ڕاسـتی لـە چەوتیو ئەوەی خـودا پێـی خۆشـەو لێـی ڕازیـەو ئـەویش کـە پێـی ناخۆشـەو لێـی ڕازی نیـە. وە ئـەو شتانەی تیایەتی لە زانینی نهێنیەکان لە ڕابوردو لـە داهـاتوداو باسـی سیفەتە پیرۆزەکـانی خـودا کـە پێغەمبەرە نەبەزو خۆڕاگرەکانو فریشتە زۆر نزیکەکانیش نایزانن مەگەر خودا خۆی ئاگاداری کردبن. وەك خـودای مـەزن ئەفـەرمویّت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾[2] نـاتوانن بـە هیـچێك لـە زانستی ئاگادار بن مەگین خودا خۆی مەیلی لیّبـیّ. وە ئەفـەرمویّت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴾[3] نـاتوانن لە زانستی ئاگادار بن. پاشان ئەفەرمویّت: ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ﴾ فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن، بـە ڕاستی ئەو پەیامەی بۆت هاتووەو نیگات بۆ کراوەو بۆت هاتوەتە خوارەوە لەگەڵ شایەتی دانی خـودای گەورە لەسەری ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾ شایەتی خودا بەسە. پاشـان خـودای مـەزن ئەفـەرمویّت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ ئەوانەی خوانەناسن ڕیّ لـە خوانەناسـان دەگرن، ڕێی لیّ ون بووی لە ڕادەبەدەر ئەوانن. واتە: ئەوانەی هەر لە دڵدا خوانەناس بوون شوێنی ڕێـی ڕاستی نەکەوتن، ڕێیان لە خەڵکیش دەگرت شوێنی بکەونو بڕوای پیّ بکەن، ئەوانە خۆیان لـە ڕێگـەی ڕاست دەرچووبوونو ونیان کردبوو. زۆریش لێی دوورکەوتبونەوە بۆیە خودای مەزن ئەفەرمویّت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ ﴾ ئەوانەی لە ڕێگـەی خـودا لایانـداو ناهـەقیان کـرد خـودا لێیان خۆش نابیّ. خودای گەورە لێرەدا باسی ئەو بڕیارەی خۆی کردوە لە بەرانبەر ئەو خوانەناسانەی کە بڕوایان نیە بە نیشانەکانیو کتێبەکەیو پێغەمبەرەکەی، بەو جۆرە ستەمیان لـە خۆشیان کـردوەو بونەتە لەمپەر لە ڕێگەی خواداو خراپە دەکەنو سنوورەکانی دەشکێنن کە خـودا لێیـان خـۆش نـابیّ. ﴿وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴾ ڕێگەشیان نیشان نادات. بەرەو چاکە بڕۆن. ﴿إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ مەگین تـەنیا ڕێـی جەهـەنم، ئەمـە ئیستـسینای مونقەتیعـە (استـثناء منقطـع). ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ

---

[1] فصلت (٤٢).

[2] البقرة (٢٥٥).

[3] طه (١١٠).

يَسِيرًا ﴾ هەر تيا دەمێننەوەو ئەمەش لای خوا ئاسانە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ ﴾ ئەی خەڵكینە، ئەم پێغەمبەرە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتوە، دەی باوەڕی پێ بێنن قازانجتانە. واتە: ئەی خەڵكینە موحەممەد (سەلامی خوای لێبێ) ڕەوانە كراوە بۆتان. ڕێنمایی‌و ئاین ڕاستی شارەزایی بە تەواوی لەلایەن خوداوە بۆ هێناون. بڕوا بێنن بەوەی كە بۆی هێناون‌و شوێنی كەون، ئەوە زۆر چاكە بۆتان. پاشان خودا ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەگەر بڕوا نەكەن، باش بزانن هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەمیندایە هی خودایە، خودا بێ نیازە لە ئێوەو لە بڕواكەشتان، هیچ زیانی پێ ناگات كە بڕوانەهێنانتان. وەك لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾[1] مووسا فەرمووی: ئەگەر ئێوەو ئەوەی لەسەر زەویدایە بڕوا نەهێنن خودا نیازی بە كەس نیەو هەر شیاوی ستایش كردنە. لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خودا زانایە واتە: ئاگاداری ئەوانەیە كە شایەنی شارەزاییە، شارەزای دەكات‌و كێش شایەنی گومرایە لە ئێوە گومڕای دەكات. ﴿حَكِيمًا﴾ لەكارزانە واتە: لە كارزانە لە گفتارو كردارو بڕیارو بەرنامەدا.

﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۖ وَلَا تَقُولُوا۟ ثَلَـٰثَةٌ ۚ ٱنتَهُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ ۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ سُبْحَـٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ ۘ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٧١﴾﴾

**ڕێ نەدان بە ئەهلی كتێب كە هەڵەڕۆیی لە ئایندا و پیاهەڵدان بە عیسای كوڕی مەریەمدا نەكەن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ﴾ ئەی كەسانی ئەهلی كتێب، هەڵەڕۆیی لە دینی خۆتاندا مەكەن. خودای مەزن ڕێگری لە ئەهلی كتێب كردوە كە هەڵەڕۆیی لە ئاینی خۆیاندا بكەن‌و زۆر بە عیسادا هەڵدەن. ئەو هەڵەڕۆیی‌و پیاهەڵدانە لەناو مەسیحیەكاندا زۆرە، چونكە مەسیحیەكان لە بارەی عیساوە (سەلامی خوای لێبێ) لە سنوور دەرچوون‌و زیاد لە پلەی خۆی بەرزیان كردۆتەوە كە خودا پێی داوە. لە پلەی پێغەمبەرێتیەوە تێیان پەڕاندوە كردویانە بە خودای خۆیان بێجگە لە خوداو چۆن خودا دەپەرستن ئاوایش عیسا دەپەرستن، بەڵكو زیادەڕەویشیان لە

[1] إبراهيم (٨).

شوێنکەوتوەکانیشیدا کردوە، بە خەیاڵی خۆیان ئەوانیش لەسەر ئاینی ئەون و دەڵێن ئەمانە بێ گوناهن (معصوم) لەناوماندا. لە هەموو شتێکدا پەیڕەویان دەکەن و هەرچی بڵێن لە قسەیان دەرناچن ئیتر ڕاست بێ یان درۆ، گومڕایی بێ یا ڕێنمایی، هەق بێ یا ناهەق بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾[1] لە بری خودا زاناو ڕەبەنەکانی خۆیان کردە خودا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لە عومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پیاما هەڵمەدەن وەك مەسیحیەکان هەڵیان ئەدا بە عیسای کوڕی مەریەمدا، بەڵکو من بەندەم بڵێن: بەندەو پێغەمبەری خودایە)[2] بوخاریش هەر بەم وتەیە ڕیوایەتی کردوە: (بەڵکو من بەندەم بڵێن: بەندەو پێغەمبەری خودا)[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پیاوێ گوتی: ئەی موحەممەد ئەی گەورەمان و کوڕی گەورەمان و چاکترینمان و کوڕی چاکترینمان. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، ئاگاتان لە قسەکانتان بێ، شەیتان سەرتان لێ نەشێوێنێ، من موحەممەدی کوڕی عەبدوللام، بەندەو پێغەمبەری خودام، سوێند بە خودا پێم خۆش نیە لەو پلەی خۆم زیاتر بەرزم بکەنەوە کە خودای گەورە بۆی داناوم)[4] بەم شێوەیە تەنیا ئەحمەد خۆی هێناویەتی پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ جگە لە ڕاست دەربارەی خوا مەڵێن (قسە مەکەن) واتە: درۆ بەدەم خواوە هەڵمەبەستن، هاوسەرو منداڵی بۆ دابنێن، خودا پاك و بێ عەیبەو دوورە لەو درۆیانەوە بۆی هەڵدەبەستن، تەنیا ئەو بە گەورەو بەرزو بڵندو خاوەن دەستەڵات بزانن، هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو هەر ئەویش پەروەردگاریە. بۆیە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ﴾ ئاشکرایە کە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خودا بووە. خودا بە فەرمانی خۆی و هەر لە نەفەسی (ڕوح) پیرۆزی خستوەتە ناو تۆڵی (ڕەحمی) مەریەم. واتە: بەڵکو ئەویش بەندەیەکە لە بەندەکانی خوداو دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوداو فەرموویە پێی: ببە بووە. پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرەکانی، وتەی خۆیە ناردویە بە جوبرەئیلدا (سەلامی خوای لێبێ) بۆ مەریەم. واتە: بەو وتەیە کە ناردویەتی بە جوبرەئیلدا (سەلامی خوای لێبێ)، بۆ مەریەم دروستی کردوە. فوی پیا کردوە لە نەفەسی (ڕوحی) خۆی. بە ئیزنی خودا خۆی و عیسا (سەلامی خوای لێبێ) پەیدا بووە. بە ئیزنی خودای مەزن. ئەو

---

[1] التوبة (٣١).

[2] أحمد (٢٣/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٥٥١/٦).

[4] أحمد (١٥٣/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە، لەسەر مەرجی موسلیم.

فوەی کرد بە باخەڵی کراسەکەیداو چووە خوارەوە تا گەیشتە ناو ڕەحمی لە جێی تۆوی باوكو دایك. هەموو شتێ دروستکراوی خوای گەورەیە. هەربۆیە بە عیسا گوتراوە: ئەو ئەو نەفەسی (ڕوحی) خودایە، چونکە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) باوکی نەبوە، تا لێی پەیدا ببێ، بەڵکو لەو وتەی خودا پەیدا بووە کە پێی فەرمووە ببە بووە. ئەو ڕوحەیشی بە جوبرەئیلدا ناردوە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾[1] مەسیحی کوڕی مەریەم لە پێغەمبەرێك زیاتر چی تر نیە، لە پێش ئەویش زۆر پێغەمبەری تر هاتوونو چوون. دایکی ئەویش ژنێکی ڕاستو دروست بوو، هەردووکیان خۆراکیان دەخوارد. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[2] نمونەی عیساش (لەلای خودا) نمونەی ئادەمە، هەر لە گڵ دروستی کردو پاشان پێی گوت: ببە (بە ئادەم) ئەویش بوو. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَٰهَا وَٱبْنَهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾[3] ئەو ژنەش کە وا شەرمی خۆی دەپاراست، ئێمە بەهۆی ڕووحی خۆمان فوومان تێکرد، خۆییو کوڕەکەی ئەویشمان کردە نیشانەی ئاشکرا بۆ هەموو خەڵکی دنیا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾[4] مەریەمی کچی عیمرانیش لە شەرمی خۆی لە کاری شورەیی پاراست. هەتا کۆتایی سورەتەکە. خودای مەزن باسی عیسا دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ﴾[5] ئەو هیچ نەبوو عەبدێك نەبێ، ئێمە چاکەمان لەگەڵ کرد. عەبدوڕەزاق گوتی: لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ وەك ئەم وتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿كُن﴾ (فکان) ببە، بوو.[6] ئیبنوئەبی حاتەم گوتی: ئەحمەدی کوڕی منائی واستی (الواسطي) گوتی: گوێم لە شاذی کوڕی یەحیا لەم ئایەتەدا: ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ دەیگوت: ئەم وتە (الكلمة) نەبوو بە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەڵکو بەو وتەیە

---

[1] المائدة (٧٥).

[2] آل عمران (٥٩).

[3] الانبياء (٩١).

[4] التحريم (١٢).

[5] الزخرف (٥٩).

[6] عبدالرزاق (١/١٧٧).

(الكلمة) بوو بە عیسا (سەلامی خوای لێبێ).[1] بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە عوبادەی كوڕی سامیتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هەركەسێ شایەتی بدات كە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوداو تاكو تەنیایەو شەریكی نیە، وە موحەممەد (ﷺ) بەندەو پێغەمبەری ئەوە. وە عیسا بەندەو پێغەمبەرو وتەو نەفەسی (روحی) ئەوە خستویەتە ناو ڕەحمی مەریەمەوە، بەهەشت ڕاستەو ئاگر ڕاستە، خودا لەسەر ئەو ئاكارەی لەسەری بووە دەیخاتە بەهەشت)[2] لە ڕیوایەتێكی تردا ئەمەی بۆ زیاد كردوە: (لە هەشت دەرگاكەی بەهەشتەوە، لە هەر كامیانەوە مەیلی لێبێ دەچێتە ژورەوە).[3] موسلیمیش هەر وا ڕیوایەتی كردوە[4]. خودای مەزن كە ئەفەرموێت: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە كە ئەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾[5] هەرچی لەناو ئاسمانەكانو زەمیندان هەمووی هی ئەون، ئەو بۆ ئێوەی ڕام هێناون. واتە: هەموو دروستكراوی خودانو لەلای ئەوەیە، ئەو (من)ە بۆ هەند (تبغیض) نیە وەك مەسیحیەكان دەیڵێن (بەر نەفرینی بەردەوامی خوا كەون) بەڵكو بۆ ئیبتیدای غایەیە (إبتداء الغاية) وەك لە ئایەتی تردا هاتوە. ئیزافەی (روح) كراوە بۆ لای خودا لە ڕوی ڕێز لێنانەوە. وەك ئیزافەی (الناقة و البیت) كراوەتە لای خودا لەم ئایەتانەدا كە ئەفەرموێت: ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ﴾[6] ئەمە وشتری خودایە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ﴾[7] ماڵی من خاوێن كەنەوە بۆ تەواف كەران. وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە: (دەچمە لای پەروەردگارم لە ماڵەكەیدا)[8] ئیزافە (دار) كراوەتە لای خودا، لە ڕووی ڕێز لێنانەوە، ئەمانە هەموو وەك یەكن، لەیەك دەچن. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ دەسا ئێوە باوەڕتان بە خوا هەبێو بە پێغەمبەرانی ئەویش بڕوا بێنن. واتە: بڕواتان هەبێ كە خودا تاكو تەنیایە نە منداڵی هەیەو نە هاوسەر. پاشیش بزانن و بێ گومان بن كە عیسا بەندەو ڕەوانەكراوی خودایە، هەربۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَرُسُلِهِۦ ۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾ مەڵێن سیانن، واتە: عیساو دایكی مەكەنە شەریكی خودا،

---

[1] إبن أبي حاتم (٦٣١٠).

[2] فتح الباري (٦/٥٤٦).

[3] فتح الباري (٦/٥٤٧).

[4] مسلم (١/٥٧).

[5] الجاثية (١٣).

[6] هود (٦٤).

[7] الحج (٢٦).

[8] البخاري (٧٤٤٠).

خودا پاكو بێ عەیبەو دوورە لەو قسانەوە ئێوە دەیڵێن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە لە سورەتی مائیدەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍۢ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌۭ وَٰحِدٌۭ﴾[1] ئەوانەی كە گوتیان: خودا سێهەمینە لە سێ كەسان، بێگومان لە دین لایانداوە. جگە لە خودای تاكو تەنیا، هیچ كەس بۆ پەرستن ناشێ. وە هەر لە سورەتی مائیدەدا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾[2] ئەو كاتەیش كە خودا فەرمووی: ئەی عیسای كوڕی مەریەم، تۆ گوتوتە بەو خەڵكە (جگە لە خودا) دەبێ ئێوە منو دایكم وەك دوو خودا بپەرستن؟ وە لە پێشەوە هەر لە سورەتی مائیدەدا ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾[3] ئەو كەسانەی گوتویانە، هەر خودا خۆی مەسیحی كوڕی مەریەمە. گاورەكان (نەفرینی خوایان لێبێ) لەبەر نەفامیو بێ دینیان نە بەرنامەیەكیان هەیەو سنورێكیان هەیە لەسەری بوەستن، سەرگەردانیەكەیان لە ڕادەبەدەرەو هەركەسەو قسەیە دەكات. هەندێكیان بڕوای وایە عیسا خودایە، هەندێ بڕوا وایە شەریكی خودایە، هەندێكی تر بڕوای وایە كوڕی خودایە، ئەوانە چەند كۆمەڵێكی زۆرنو بۆچونیان جیاوازەو قسەیان یەك ناگرێ، هەندێ لە بێژەرەكان (المتكلمین) هەستیان بەوە كردوەو گوتویانە: ئەگەر دە مەسیحی كۆ ببنەوە، دەبن بە یانزە دەستە لە ڕاوبۆچووندا.

### كۆمەڵو پارتە مەسیحیەكان

هەندێ لە زانا بەناوبانگەكانی مەسیحیەكان لای خۆیان باسیان كردوە. لەوانە سەعیدی كوڕی بەتریق (البطریق) كە بەتریكی ئەسكەندەریە بووە لە دەوروبەری چوارسەدی كۆچیدا. كە ئەوانە (مەسیحیەكان) كۆبونەتەوە لە كۆڕێكی گەورەدا بڕیاری ئەو ئەمانەتە گەورەیان دا. لە ڕاستیدا خەیانەتێكی سووكو ڕیسوایی بوو، ئەوەیشا لە كاتی قوسەنتینا (قصطنطین) بوو، كە بناغە دانەری ئەو شارە بەناوبانگە بوو. بەڵام ناكۆكیەكی ئێجگار كەوتە ناویان لە هەژمار كردن نایەت، زیاتر لە دوو هەزار قەشە بوون، بوون بە چەند بەشێكەوە، پەنجایان لەسەر قسەیە بوونو بیستیان لەسەر قسەیە، سەدیان لەسەر قسەیەو حەفتایان لەسەر قسەیەو زیاترو كەمتریش لەمانە. پاشان بۆی دەركەوت زۆر زیادیان كردوەو ژمارەیان بووە بە سێ سەد كەسو هەژدە كۆمەڵ، هەموو بڕیاریان لەسەر وتاری

---

[1] المائدة (٧٣).

[2] المائدة (١١٦).

[3] المائدة (١٧).

(نوسراوێ) دا پاشا هەڵی گرت پشتگیری لێ کردو یارمەتی دا (فەیلەسوفێکی زۆر فێڵباز بوو) هەموو ئەوانی تری لەناوبردو نەیهێشتن. ئەم نوسراوەی ئەمانی رێك و پێك کردو کلێسای بۆ دروست کردن، دەستورو کتێبی بۆ دانان، ئەو ئەمانەتەی (الامانة) بۆ دروست کردن کە منداڵە بچوکەکانیان تیا فێر دەکرد، تا بڕوای پێ بهێننو کاری پێ بکەن شوێن کەوتوی ئەمانە پێیان دەگوتن: مەلکانیە (الملكانية). پاشان کۆمەڵێکی دووەمیان داهێنا. پێیان دەگوت: یەعقوبیە (يعقوبية) پاشان کۆمەڵی سێهەمیشیان داهێنا پێیان دەگوت: نبتوریە (النبطورية) هەموو ئەم کۆمەڵانە سێ ئەقانیمەکەیان (الاقانيم) دانا لە مەسیحدا. بەڵام ناکۆك بوون لە چۆنیەتی دانانەکەیان، لە ناسوتو لاهوتا (الناسوت و اللاهوت) بە خەیاڵی خۆیان ئایا یەکیان گرتوە یان یەکیان نەگرتوە یان لەگەڵ یەکدان یان تواونەتەوە. سێ وتاریان هەبوو، هەریەکێ لەوانە ئەوی تری بە بێ دین دادەنا. ئێمە هەرسیانیان بە بێ دین دادەنێین، هەربۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡ﴾ واز لەو قسانە بهێنن کە بۆ ئێوە وا چاکترە ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾ بێگومان خودا پەرستراوێکی تەنیایە پاکو بێ عەیبی بۆ خودا کە هیچ فەرزەندێکی هەبێ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە هەر بۆ ئەوە، بۆ پێکهێنانی کاروبار هەر خۆی بەسە. واتە: هەموو موڵکی ئەوەو خۆی وەدی هێناوە، هەرچی لەناویاندایە بەندەی ئەوەو لەژێر دەستەڵاتو بڕیاری ئەوان. خودا خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، چۆن دەبێ لەو شتانەدا منداڵو هاوسەری هەبێ. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[1] داهێنەری ئاسمانەکانو زەمینەو هەرکە ویستی کارێ بکات، فەرمان ئەدا: ببە دەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا﴾ الى قوله ﴿فَرۡدًا﴾[2] گوتویانە: خودا بوەتە خاوەن فەرزەند. ئای کە قسەیەکی ڕەقتان بە دەمدا هاتووە. هەتا دەگاتە تاكو تەنیا. واتە: تاكو تەنیا دێنە لای خودا.

﴿لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ

---

[1] البقرة (١١٧).

[2] مريم (٨٨-٩٥).

وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم

مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾﴾

**نه عیساو نه فریشتەکان (سەلامی خوایان لێبێ) لەوە حاشایان نەکردوە کە بەندەیەکی خودان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ مەسیح هەرگیز حاشای نەکردوە کە بەندەیەکی خودایە، فریشتە نزیکەکانیش هەروها. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: ﴿لَّن يَسۡتَنكِفَ﴾ واتە: خۆی بە زل نەزانیوە. قەتادە گوتی: پێی شەرم نەبوە.[1] هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا﴾ هەرکەسێ بە بەندایەتی خودا ڕازی نەبێ‌و بایی هەوایی بنوێنێ هەر بەو زاونە خودا هەموو لایەك لە لای خۆی کۆدەکاتەوە. لە ڕۆژی قیامەتداو فەرمانڕەوای خۆی بە دادوەری لە نێوانیاندا بەجێدێنێ بەبێ هیچ کەم‌و کورێك‌و ناهەقی کردنێ. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦ﴾ وە ئەو کەسانەی کە خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن، سەرباری پاداشتی خۆیان، خودا زیاتر چاکەیان لەگەڵدا دەکات. واتە: بە ئەندازەی ئاکارە چاکەکانیان پاداشتیان ئەداتەوە، زیاتریش چاکەیان دەربارە دەکات بەسۆزەو چاکەو بەزەیی فراوانی خۆی ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ ئەو کەسانەش کە لە (فەرمانی) خودا لایانداوەو پیشەیان لووت بەرزی بووە. بەندایەتی خودایان نەکردوە ﴿فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ خودا تووشی جەزرەبەی بەژانیان دەکات. جگە لە خودا هیچ دۆست‌و هاوکارێکیان دەست ناکەوێ. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[2] ئەو کەسانەی (هەر لەبەر خۆ بە زل زانیان) نایانەوێ بمپەرستن، بە زەبونی دەچنە جەهەنەمەوە. واتە: زۆر بە سەرشۆڕیی‌و ڕسوایی‌و داماوی دەچنە ناو ئاگر لەباتی ئەو خۆبەزل زانی‌و مل نەدانەیانەوە بۆ خودای مەزن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ

وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾﴾

---

[1] الطبري (٤/٤٢٤).

[2] غافر (٦٠).

**وەسفی قورئان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ ئەی خەڵكینە لە پەروەردگاری خۆتانەوە بەڵگەیەكتان بۆ هاتوە. خودای گەورە لێرەدا ڕووی فەرموودەی دەكاتە هەموو خەڵكو ئاگاداریان دەكات كە بەڵگەیەكی زۆر گەورەیان لەلایەن خوداوە بۆ ڕەوانە كراوە، بەڵگەیەكی ئەوەندە بەهێزە گشت بیانویەكی بڕیوەو هیچ گومانێكی نەهێشتوەتەو ئەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا﴾ وە ڕۆشناییەكی ئاشكرامان ناردۆتە خوار بۆ ئێوە. ئیبنوجورەیجو كەسانی تریش گوتویانە: مەبەست پێی قورئانە[1]. ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ﴾ ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێناوەو خۆیان هەر بەو سپاردووە. واتە: ئەوانەی خواپەرستیو خۆسپاردنیان بە خودا پێكەوە بەستوەو لە هەموو كاروبارێكیاندا. ئیبنوجورەیج گوتی: ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوەو خۆیان پابەند كردوە بە قورئانەوە[2]، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە. ﴿فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ﴾ بەو زوانە زوو دەیانخاتە بەر بەزەیی خۆیو زیاتریش. واتە: خودا بەر بەزەیی خۆییان دەخاتو دەیانخاتە بەهەشت، چەند جاریش پاداشتیان ئەداتەوەو پلەیان زۆر بەرز دەكاتەوە بەو چاكەیە لەگەڵیان دەیكات. ﴿وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾ دەیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاستی بەرەو خۆی (واتە: ڕێگەیەكی ڕێكو ڕاستو ڕوون كە ناڕێكیو لاری تیا نیە، ئەوە سیفەتی خاوەن باوەڕە لە دنیاو لە قیامەتدا. لە دنیادا لەسەر بەرنامەی ڕێكو ڕاستو ڕێی ئاشتیو ئارامی لە هەموو بیرو باوەڕو ئاكارێكیاندا، لە قیامەتیشدا لەسەر ڕاستەڕێی خوداو بەرەو باغەكانی بەهەشت دەڕۆن.

﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿١٧٦﴾﴾

**بڕیاری (حوكمی) ئەو كەسەی دەمرێو باوكو منداڵی نییە (كە كۆتا ئایەتە هاتوەتە خوار)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ﴾ لەسەر كەسێ كە باوكو فەرزەندی نیەو كە دەمرێ پرسیاری لێ دەكەن. بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە بەرائەوە (البراء) گوتی: دوایین سورەت كە هاتوەتە خوار سورەتی بەرائەت (براءة) بووە، دوایین ئایەتیش هاتوەتە خوار

---

[1] الطبري (٩/٤٢٨).
[2] الطبري (٩/٤٢٩).

﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾ بووە[1]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ سەردانم کە من نەخۆش بووم، لە هۆش خۆم چووبووم، دەست نوێژی گرتو پاشان ئاوەکەی پرژاند بە سەرمدا، یان گوتی: ئاوەکەیان پرژاند بەسەرمدا، هۆشم هاتەوە سەر خۆم، گوتم: کەلالە نەبێ کەس میراتم لێ نابات، ئەو میراتە چۆنە؟ خودای مەزن ئایەتی فەرائیزی (الفرائض) ناردە خوارەوە[2] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە[3]. چوار سەحیحەکەی تری ڕیوایەتیان کردوە لە هەندێ لە وتەکانیادا هاتوە، (کە ئەمە ئایەتی میراتە (المیراث)) هاتوەتە خوار کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ﴾[4] مانای ئایەتەکە ئەوەیە، پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی کەلالەوە، بڵێ: خودا خۆی وەڵامتان ئەداتەوە. لە پێشەوە باسی کەلالەمان (الکللة) کردوەو چیەو لە چیەوە دەرهێنراوە، لەو (إکلیل)وە وەرگیراوە کە دەوری سەر دەگرێ لە گشت لایەکەوە. هەر بۆیە زۆرێ لە زانایان تەفسیریان کردوە بە کەسێ بمرێ نە کوڕی هەبێو نە باوك. وە هەندێ کەس دەڵێن: کەلالە ئەو کەسەیە کوڕی نیە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ ئەگەر پیاوێ هیچ منداڵی نیەو دەمرێ. بڕیاری (حوکمی) کەلالە دوو دڵیەکی بۆ عومەری کوڕی خەتاب دروست کردبوو (ڕەزای خوای لێبێ) وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە گوتویەتی: سێ (بڕیار) پێم خۆش بوو، کە پێغەمبەری خودا گفتی پێدابووین تێیاندا بیبڕینەوە: وا دیارە عومەر پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کردوەو لەبیر چوەتەوە، بە دەم پرسیارەکەیەوە بچێ، پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردوە، باپیر، کەلالە، بەشێ لە بەشەکانی سوو(الربا)[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە مەعدانی کوڕی ئەبوتەلحەوە گوتی: عومەری کوڕی خەتاب گوتی: هیچ کاتێ پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەکردوە ئەوەندەی لە کەلالەدا پرسیارم لێ کردوە، هەتا جارێك کوتایە سنگمو فەرمووی: (ئایەتە هاوینەکەت بەسە کە لە کۆتایە سورەتی نیساء دایە (النساء))[6] (بۆیە پێی دەگوترێ ئایەتی

---

[1] فتح الباري (٨/١١٧).

[2] أحمد (٣/٢٩٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (١٢/٢٦)، مسلم (٣/١٢٣٥).

[4] فتح الباري (١٢/٥)، مسلم (٣/١٢٣٥)، أبوداود (٣/٣٠٨)، تحفة الاحوذي (٦/٢٧٣)، النسائي في الكبرى (٤/٥٩)، إبن ماجة (١/٤٦٢).

[5] فتح الباري (١/٤٨)، مسلم (٤/٢٣٢٢).

[6] أحمد (١/٢٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

هاوینە چونکە لە هاویندا هاتوەتە خوارەوە) ئیمامی ئەحمەد بە کورتی هێناویەتی. بەڵام موسلیم بە درێژی هێناویەتی[1].

**باسی وشە بە پێی ماناکەی بە پشتو پەنای خودا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ﴾ ئەگەر پیاوێ مرد. لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾[2] هەموو شتێ دەمرێ جگە لە خودای گەورە. وە ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ٢٦ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾[3] هەر کێ ژیانی لەسەر زەمینە نامێنێ. هەر خودای خاوەن شکۆی بەرزو بەڕێزت دەمێنێ. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ هیچ منداڵی نەبێ. واتە: کەسێ بمرێ نە منداڵی هەبێ نە باوك. ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾، (ئەگەر مردوەکە) هەر تەنیا خوشکێکی هەبوو، نیوەی میراتەکەی دەبات. خۆ ئەگەر باوکی لەگەڵدا بویە هیچ شتێکی لە میرات بەرنەدەکەوت. چونکە زانایان بە کۆی دەنگ بێ بەشیان کردوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەو کەسەی کە منداڵی نیە بە دەقی قورئان. وە باوکیش هەر بە دەقی قورئان بە تێڕامانو وردبونەوە دیسان. چونکە خوشك نیوەی بە فەرز نادرێتێ لەگەڵ باوکدا. بەڵکو هەر بۆی نیە میرات وەرگرێ. ئیبنوجەریرو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسو ئیبنوزوبەیرەوە کە گوتویانە: کەسێ مرد کچێكو خوشکێکی لێ بەجێ مابوو خوشکەکە هیچ لە میرات نابات. بەپێی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾ گوتیان: ئەگەر کچێکی بەجێهێشت، ئەوە منداڵێکی بەجێهێشتوە ئەو کاتە خوشك هیچ نابات. جمهور دژی ئەم ڕای ئەماننو دەڵێن: کچ بە فەرز نیوە وەردەگرێ، خوشکیش بە عەسەبە (بالتعصيب) نیوەکەی تری وەردەگرێ. بە بەڵگەی تر جگە لەم ئایەتە، ئەم ئایەتە بە فەرز نیوەی بۆ داناوە، بەڵام بە عەسەبە (بالتعصيب) بەپێی ئەم فەرموودەیە کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگەی سولەیمانەوە، لە ئیبراهیمەوە لە ئەسوەدەوە گوتی: مەعازی کوڕی جەبەل بڕیاری بۆ داین لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە نیوە بۆ کچو نیوەش بۆ خوشك. پاشان سولەیمان گوتی: بڕیاری بۆ داین، بەڵام باسی پێغەمبەری (ﷺ) نەکرد.[4] دیسان لە سەحیحی بوخاری هاتوە لە هوزەیلی کوڕی

[1] مسلم (١٢٣٦/٣).
[2] القصص (٨٨).
[3] الرحمن (٢٦-٢٧).
[4] البخاري (٦٧٤١).

شورەحبیلەوە (شُرَحبیل) گوتی: پرسیان لە ئەبومووسای ئەشعەریەوە لە بارەی کچو کچی کچو خوشکەوە. گوتی: بۆ کچ نیوەیی‌و بۆ خوشکەکەی نیوەیی هەیە، (کچی کوڕەکەی بێ بەش کرد) گوتی: بچۆ لە ئیبنومەسعود بپرسە، ئەویش هاوڕای منە، لێیان پرسی‌و قسەکەی ئەبومووساشیان بۆ گێڕایەوە. گوتی: کە وا بێ من لە ڕێ لا ئەدەم‌و لەوانە نابم کە لە ڕێی ڕاستەوە بڕۆن. فەرمان بەوە دەکەم کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردوە. نیوەی ئەدەم بە کچەکەی شەش یەکی ئەدەم بە کچی کوڕەکەی‌و بە هەردووکیان (دوو سێ یەك (الثلثان)) تەواو دەکەم. سێ یەکێکیش ئەمێنێتەوە بۆ خوشکەکەی. هاتینەوە بۆ لای ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێبێ) هەواڵمان دایە بەوەی کە ئیبنومەسعود گوتی. ئەویش گوتی: کە ئەم زاناتانە لەناودایە هیچ لە من مەپرسن.[1] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾ خۆ ئەگەر خوشکەکەی بمرێ‌و هیچ منداڵی لە پاش نەبێ براکەی میراتی دەبات. واتە: براکەی هەموو ماڵەکەی دەبات، کە کوڕو باوکی نەبوو. خۆ ئەگەر باوکی مابوو براکە میراتی لێ نابات. وای دانێین کەسێکی لەگەڵدا بووە بە فەرز میراتی وەردەگرت، وەك مێرد یا برای دایکی، بەشی خۆیان پێ ئەدرێ، ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەدرێ بە براکە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (میرات بدەن بە خاوەنەکانی، ئەوەی بەجێدەمێنێت بۆ نزیکترین کەسی نێرینەیە)[2]. وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ ئەگەر مردوو پیاوێکەو دوو خوشکی لێ بەجێماوە، دوو بەش لە سێ بەشیان هەیە. وە ئەگەر لە دوو خوشکیش زیاتر بوو، بڕیارەکەی (حوکمەکەی) هەر بەو شێوەیە., ئا لێرەدا زانایان بڕیاری دوو کچیشیان وەرگرتوە، وەك چۆن کەڵك وەرگیراوە لە بڕیاری کچەکانەوە بۆ خوشکەکان لەم ئایەتەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾[3] ئەگەر ژمارەی مێینە لە دوان زیاتر بوو، دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە ئەبەن. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ ئەگەر چەند خوشك‌و چەند برایەك لە پاش مردوو بەجێ مابوون‌و مردوو منداڵی نەبوو، هەر نێرینەی دوو ئەوەندەی مێینە میراتی وەردەگرێ. ئەمە بڕیاری عەسەبەیە لە کوڕان‌و کوڕی کوڕان‌و براکان، ئەگەر نێرینەو مێینە کۆ بوونەوە، نێرینە دوو ئەوەندەی مێینەی پێ ئەدرێ. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ

---

[1] البخاري (٦٧٣٦).

[2] فتح الباري (١٧/١٢)، مسلم (١٢٣٣/٣).

[3] النساء (١١).

لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ خودا بۆتان ڕوون دەكاتەوە، نەكا لێتان تێك بچێ. خودا لە هەموو شت ئاگادارە. واتە: خودا فەرزەكانی بۆ داناونو سنوورەكانی بۆ دیاری كردوون، شەریعەتەكەیشی بۆ ڕوون كردونەتەوە بۆ ئەوەی لە ڕێی ڕاست نەترازێنو ئاگاداری هەموو كاروبارو ئاكەمەكەشیو چیش لە بەرژەوەندی عەبدەكانیەتی لە چاكەو كێش لەو كەسانە نزیكترە لە مردوەكەو شایستەی میراتی وەرگرتنە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە تاریقی كوڕی شەهابەوە گوتی: عومەر پەتێكی (كتفاً) بە دەستەوە بوو، هاوەڵەكانی پێغەمبەری خودای (ﷺ) كۆكردەوەو پاشان گوتی: ئێستا بڕیارێكی وا ئەدەم لە بارەی كەلالەوە ئافرەتان لەناو شوێنەكانی خۆیاندا (خدورهن) باسی بكەن. لەو كاتەدا مارێك لەو ماڵە هاتە دەرەوەو بڵاوەیان لێ كرد. ئەویش گوتی: ئەگەر خودای مەزن بیویستایە ئەو كارە تەواو ببێ تەواوی دەكرد[1] ئەم فەرموودە سەنەدەكانی ڕاستن، حاكیم ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوعەبدوڵڵای نیسابوریەوە (النیسابوري) لە عومەری كوڕی خەتابەوە گوتی: بم پرسیایە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سێ شت، ئەوەم پێ خۆشتر بوو لە وشتری سوور (حُمر النَّعَم): كێ جێنشینیەتی دوای خۆی؟ وە لەو كەسانەی گوتیان: دان دەنێین بە دانی زەكات لە ماڵو سامانماندا بەڵام نایدەین بە تۆ، ئایا شەڕ كردن لەگەڵیان حەڵاڵە؟ لەبارەی كەلالەیشەوە. پاشان حاكیم گوتی: سەنەدەكانی ڕاستە بە مرجی بوخاریو موسلیم، بەڵام ئەمان نەیانهێناوە.[2] ئیبنوجەریر گوتی: ڕیوایەت كراوە لە عومەری كوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە گوتویەتی: من پێم شەرمە لەم بارەیەوە ڕام جیاواز بێ لەگەڵ ئەبوبەكردا، ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: ئەوە بێجگە لە كوڕو باوكە.[3] ئەوەی كە ئەبوبەكر گوتویەتی زۆرینەی هاوەڵەكانی پێغەمبەرو (ﷺ) تابیعینو پێشەوایانی ئەم ئوممەتە لە كۆنو تازەدا هەر وایان گوتوەو قورئانیش بەڵگەیە لەسەری، وەك خودای مەزن ڕێنمایی داوە لەو بارەیەوەو ڕوونی كردوەتەوە ئەفەرموێت: ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ والله أعلم.

---

[1] الطبري (٤٣٩/٩).

[2] الحاكم (٣٠٤/٢).

[3] الطبري (٤٣٧/٩).

## سورەتی (المائدة)

## لە(مەدینە)دا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی مائیدەو کاتی هاتنە خوارەوەی

تیرمیزی ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە گوتی: دواین سورەت هاتە خوار سورەتی مائیدەو فەتح بوو[1] پاشان تیرمیزی گوتی: ئەم فەرموودە چاکو غەریبە (حسن غريب). ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: دواین سورەت هاتە خوار ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ بووە[2]. حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا (المستدرك) بە شێوەی ئەم ڕیوایەتەی تیرمیزی. پاشان گوتی: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم سەحیحە بەڵام ئەوان ڕیوایەتیان نەکردوە.[3] دیسان حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە (نُفيرْ) گوتی: حەجم کردوە (حججت) چوومە لای عائیشە پێی گوتم: ئەی جوبەیر مائیدە دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەوسا ئەم سورەتە دواین سورەتە هاتە خوارەوە، هەر حەڵاڵێکتان تیا دی، ئێوەیش حەڵاڵی کەن، هەر حەرامێکتان تیا دی ئێوەش حەرامی کەن، پاشان حاکیم گوتی: ئەم فەرموودە سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم بەڵام ئەوان ئەم فەرموودەیان نەهێناوە[4]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدیەوە لە مەعاویەی کوڕی، ئەمەی لێ زیاد کردوە دەڵێت: پرسیارم لە عائیشە کرد (ڕەزای خوای لێبی) لە (بارەی) ڕەوشتی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) گوتی: (ڕەوشتی) ئەم قورئانە بووە[5] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە[6].

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ

---

[1] تحفة الاحوذي (٨/٤٣٦)، سەنەدەکانی بەهێز نی یە لەبەر حویەیی کوڕی عەبدوڵڵا.

[2] تحفة الاحوذي (٨/٤٣٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الحاكم (٢/٣١١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الحاكم (٢/٣١١)، فەرموودەیەکی سەحیحە، لەسەر مەرجی موسلیم.

[5] أحمد (٦/١٨٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] النسائي في الكبرى (١١١٣٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ
بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن
تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ۗ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ
أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ
مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ ۙ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ﴾ ئەی کەلی خاوەن باوەڕان هەر بەڵێنێك کە ئەیدەن، پێکی بێنن. ئیبنوئەبی حاتەم گوتی: ئەعمەش (الاعمش) بۆی گێڕاینەوە لە خەیسەمەوە (خیثمة) گوتی: هەموو شتێ لە قورئاندا بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ بوو ئەوە لە تەوراتدا بە (یأیها المسکین) واتە: بە ئەی هەژارەکان هاتوە ﴿أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ﴾ ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو کەسانی تریش گوتویانە: مەبەست بە (العقود) پەیمان‌و بەڵێنە.[1] ئیبنوجەریر گوتی: کۆی زانایانی (الاجماع) لەسەرە. پاشان دەڵێ: (العهود) واتە: بەڵێن، ئەوەیە کە پەیمان ئەدەن بەیەکتری (دوو کەس یان دوو گرۆ) لەسەر هاوپەیمانی یان شتێکی تر[2] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ﴾، (العقود) واتە: بەڵێن‌و پەیمانەکان. واتە: ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان هەر بەڵێنێك کە ئەیدەن بەجێی بێنن، لەوەی کە خوا حەلاڵی کردوەو حەرامیشی کردوە، لەوەیش کە فەرزی کردوەو سنوری بۆ داناوە لە قورئاندا بە تەواوی، ناهەقی مەکەن‌و پەیمان مەشکێنن، پاشان زۆر گرنگی پێداوەو ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[3]، ئەو کەسانە کە پەیمانیان دا بە خوداو لە پاشان پاشگەز بونەوەو پەیوەندی نێوان خۆیان‌و خودایان پچڕی (کە خودا فەرمانی پێدابوون نەیپچڕێنن). هەتا دەگاتە (دوارۆژی خراپیان هەیە. زەحاك دەڵێت: ﴿أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ﴾ واتە: ئەوەی حەلاڵەو ئەوەی حەرامەو ئەوەی کە خودا بەڵێنی وەرگرتوەو لە بڕوا بە پێغەمبەرو قورئان‌و جێبەجێ کردنی ئەوبەڵێنەی کەخودا لێی وەرگرتوون لەفەرزەکان‌و لە حەلاڵ‌و حەرامدا.

---

[1] الطبري (٩/٤٥٠).

[2] الطبري (٩/٤٤٩).

[3] الرعد (٢٥). الطبري (٩/٤٥٠).

**باسی ئەوەی حەڵاڵەو ئەوەی حەرامە لە ئاژەڵەکاندا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ خواردنی گۆشتی ئاژەڵتان بۆ حەڵاڵە. کە بریتیە لە گۆشتی وشترو گاو مانگاو بزنو مەڕ ئەمە قسەی حەسەنو قەتادەو کەسانی تریشە[1] ئیبنوجەریر دەڵێت: لەلای عەرەبەکانیش ئەوە هەر وایە. ئیبنوعومەرو ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر حەڵاڵی کۆرپەلە (جنین) ئەگەر بە مردوویی بینرا لە سکی دایکیدا، کە دایکی سەر بڕا.[2] فەرموودە لەم بارەیەوە هاتوە لە سونەنەکاندا (السنن) کە ئەبوداودو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوسەعیدەوە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وشترو گاو مانگاو مەڕو بزن سەردەبڕین کۆرپەلە لە سکیاندایە، فڕێی دەدەین یان بیخۆین؟ فەرمووی: (بیخۆن ئەگەر حەزتان لێ کرد، چونکە، سەربڕینی کۆرپەلە سەربڕینی دایکیەتی). تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاکە.[3] ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (سەربڕینی کۆرپەلە سەربڕینی دایکیەتی)[4] ئەبوداود خۆی بە تەنیا هێناویەتی.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ مەگین ئەوەی کە پێتان دەڵێن (فڕێیدەن (حەرامە)) عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: مەبەست بەوە گۆشتی بەرازو خوێنو مردارەوە بوە.[5] قەتادە دەڵێت: مەبەست پێی، ئەوەی ناوی خودای لەسەر نەهێنراوەو مردارەوە بووە.[6] (والله أعلم) وا دیارە مەبەست پێی ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾[7] لەسەرتان حەرام کراوە، مردار بووەوەو خوێنو گۆشتی بەرازو هەر ئاژەڵێ لە کاتی سەربڕینیدا ناوی غەیرەز خودای لێ بێننو خنکاوو بە لێدان کوژراوو هەڵدێراوو بە شۆق لێدان مردار بوبێتەوەو ئەوەیش دڕندە لێی خواردبێ. ئەمانە هەرچەندە ئاژەڵن. بەڵام بەم هۆکارو کۆسپانە حەرام کراون. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ مەگین پێش لە گیان

---

[1] الطبري (٩/٤٥٥).
[2] الطبري (٩/٤٥٦).
[3] أبوداود (٣/٢٥٢)، تحفة الاحوذي (٥/٤٨)، إبن ماجة (٢/١٠٦٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[4] أبوداود (٣/٢٦٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[5] الطبري (٩/٤٥٨).
[6] الطبري (٩/٤٥٨).
[7] المائدة (٣).

دەرچوونی فریای کەون سەری بڕن. هەرچی لەسەر کێلەکە بەردەکاندا دادەنرێ سەردەبڕێ، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَـٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ گۆشتی ئاژەڵ حەڵاڵ کراوە بۆتان مەگین ئەوەی دەخوێنرێتەوە بەسەرتاندا (کە حەرامە) لە هەندێ کات و ساتدا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ کاتێ لە ئیحرامدان ڕاو بە حەڵاڵ مەزانن. هەندێ لە زانایان گوتویانە: مەبەست بە ئاژەڵ، ئاژەڵی ماڵیە وەك وشترو گاو مانگاو مەڕو بزن. ئاژەڵی کێویشە وەك ئاسك و گاو مانگاو کەرەکێوی و هاوشێوەیی ئەمانە. لە ئاژەڵی ماڵیدا، ئەوانەی لێ جیاکراوەتەوە لە پێشەوە باسمان کرد. لە ئاژەڵی کێویشا ڕاوکردنیان لە کاتی ئیحرامدا. وە گوتراوە: مەبەست پێی، هەرچی ئاژەڵە بۆتان حەڵاڵ کراوە لە هەموو کاتێکدا، تەنیا لە کاتی ئیحرامدا ڕاوکردن قەدەغە کراوە. بێگومان خودا وا بڕیاری داوە، خودا لە گشت شتێکدا کە فەرمان ئەدات یان قەدەغە دەکات لە کارزانە. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ خودا چۆن خۆی بیەوێ فەرمان ئەدات.

### فەرماندان بە ڕێز لێنان لە پیرۆزیەکان و مانگە حەرامەکان

پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، لەو ڕێوشوێنەی خودا بۆ ئێوەی داناوە لا مەدەن. ئیبنوعەبباس دەڵێت: مەبەست پێی دروشمەکانی حەجە[1] موجاهید دەڵێت: سەفاو مەرواو ئاژەڵی قوربانی و هەر ئاژەڵێ لە مەککە سەربڕێ لە دروشمەکانی خودایە.[2] گوتراوە: دروشمەکانی خودا قەدەغەکراوەکانیە. واتە: قەدەغەکراوەکانی خودا حەڵاڵ مەکەن، کە خودا قەدەغەی کردوون، لەبەر ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ﴾ شەڕ مەکەن لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا. مەبەست پێی قەدەغەکردنی شەڕە لەو مانگانەداو بە گەورە زانینیانەو واز هێنان لەو شتانەی کە خودا قەدەغەی کردوە تێیاندا لە پێش دەستی لە شەڕ کردن و جەخت کردنەوە لە دورکەوتنەوە لەو شتانەی حەرامن لەو مانگانەدا. وەك ئەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾[3] لێت دەپرسن: تووشی شەڕ بوون لە مانگی شەڕپەسدا چۆنە؟ بڵێ: شەڕ لە مانگی وادا گوناهێکی زۆر گەورەیە. وە ئەفەرموێت:

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ

---

[1] الطبري (٤٦٣/٩).

[2] الطبري (٤٦٣/٩).

[3] البقرة (٢١٧).

﴿أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ﴾[1] لەو ڕۆژەوە خودا ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردوە، نووسیویەتی ژمارەی مانگەکان دوازدەن، لە چواریاندا شەڕ قەدەغەیە. (دەوەستی) وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئەبی بەکرەتەوە (ابي بكرة) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایدا فەرموویەتی: (زەمان وەك خۆی دەورە دەکات لەو ڕۆژەوە خودا ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردوە ساڵ دوازدە مانگە، لە چواریاندا شەڕ قەدەغەیە. سیانیان بە دوای یەکدان: زولقاعدەو زولحەجەو موحەڕەم، ڕەجەب موزەڕیش (مُضَر) کە لە نێوانی جومادیو شەعباندایە)[2] ئەمە بەڵگەیە لەسەر بەردەوامی قەدەغەکردن هەتا کۆتایی دنیا.

**قوربانی کردن بۆ ماڵی خودا( بيت الله )**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾ هەر ئاژەڵێ ناوی قوربانی لەسەرە یان ملوانکەی (قەلادەی) لە ملدایە دەستی بۆ مەبەن (ڕێی لێ مەگرن) واتە: واز لە قوربانی کردن مەهێنن بۆ کەعبەی پیرۆز؛ چونکە ئەو قوربانی کردنە ڕێزلێنانی دروشمەکانی خودایە. وازیش لە ملوانکەی ملی قوربانی مەهێنن تا جیابکرێتەوە لە ئاژەڵەکانی تر، بۆ ئەوەی بزانرێ لەو ئاژەڵە قوربانیە بۆ کەعبەی پیرۆز؛ چونکە هەرکەسێ نیازی خراپی هەبێ لێی دوور ئەکەوێتەوە کەسێکیش چاوی پێی بکەوێ، هەوڵ ئەدات ئەویش بەو کارە هەڵسێو قوربانی بکات. بێگومان هەرکەسێ بانگەواز بکات بۆ ڕێی چاکە، بە ئەندازەی ئەو کەسە خێری دەست ئەکەوێ، بەبێ ئەوەی خێرو پاداشتی ئەو کەسە کەم بکات کە بە گوێی ئەوی کردوە. هەر بۆیە کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە زیلحەلیفە (ذى الحليفة) شەو مایەوە کە (وادي العميق)ی پێ دەڵێن، کە بەیانی هەڵسا گەڕا بەسەر هاوسەرەکانیدا کە نۆ کەس بوون. پاشان خۆی شۆریو بۆنی خۆشی لە خۆی داو دروشمی حەجو عومرەی بەجێ هێناو قوربانیەکەی وشترێکی (كثيرة تنيق على ستين) لە چاکترین شێوەو ڕەنگ بوو. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ﴾[3] دیارە هەرکەس ئەو دروشمانەی خودا دایناوە ڕێز لێ بگرێ، نیشانەیە، کە بە دڵ لە خودا دەترسێ. موقاتیلی کوڕی حەیان لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾ ملوانکە لە مل کردن حەلاڵ مەکەن، خەڵکی چەرخی نەفامی کاتێ لە وڵاتی خۆیان دەردەچوون لە غەیرەز مانگە حەرامەکاندا، کوڵكو موویان دەکردە ملوانکەو لە ملی خۆیان دەکرد، موشریکەکانی مەککەیش لە تۆکڵی داری مەککە ملوانکەیان دروست ئەکردو لە ملیان دەکرد، خۆیان پێ دەپاراست. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە دیسان ڕیوایەتی

---

[1] التوبة (٣٦).

[2] فتح الباري (١٠/١٠).

[3] الحج (٣٢).

کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێت: لەم سورەتەدا دوو ئایەت نەسخ بوتەوە، ئایەتی (القلائد)و ئەم ئایەتەشی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾[1]، ئەگەر جارێ دێنە لات، تۆ (بە ویستی خۆت) بڕیار لە نێوانیاندا بدە، یان خۆتیان لێ تێ مەگەیەنە.

### شەڕ کردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا نیازی کەعبەی پیرۆزیان هەیە حەڵاڵ مەکەن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗا﴾ ئەو کەسانەش ئازار مەدەن کە بە هیوان لە ماڵی خودا ڕۆزیو ڕەزای خوا وەدەس بێنن. واتە: شەڕ کردن لەگەڵ ئەوانەی نیازیان هەیە بێن بۆ کەعبەی پیرۆز حەڵاڵ مەکەن، ئەو ماڵەی کە هەرکەسێ چووبێتە ناوی بێ ترس بووە، هەر بەو شێوەیەش هەر کەسێ بیەوێ لە ماڵی خودا ڕۆزیو ڕەزای خودا دەس بخات بەرگری لێ مەکەنو دژایەتی مەکەنو پەلاماری مەدەن. موجاهیدو عەتاو ئەبولعالیەو موتەڕیفی (مُطرِّف) کوڕی عەبدوڵلاو عەبدوڵلای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو مەقاتیلی کوڕی حەیانو قەتادەو کەسانی تریش گوتویانە: لەم ئایەتەدا: ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗا﴾ مەبەست پێی بازرگانیە.[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە لە پێشەوە باسمان کرد کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ﴾[3] ئەگەر لە ماوەی حەجیشدا ڕۆزی لە خودا داوا بکەن هیچ گوناهتان لەسەر نیە. ﴿وَرِضۡوَٰنٗا﴾ ئیبنوعەبباس دەڵێت: بە بەلگەکانیان خودا لە خۆیان ڕازی دەکەن. عیکرمەو سوودیو ئیبنوجورەیج باسیان کردوەو دەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر حوتەمی کوڕی هیندی بەکری هاتوەتە خوار، کە پەلاماری ئاژەڵێکی مەدینەی دابوو، کە ساڵی دوایی هات بۆ عەمرە بۆ ماڵی خودا، هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ویستیان ڕێی لێ بگرن، لە ڕێگەدا کە دەهات بۆ ماڵی خودا. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗا﴾[4].

---

[1] المائدة (٤٢). الطبري (١٠/٣٣٢).

[2] الطبري (٩/٤٨٠-٤٨١).

[3] البقرة (١٩٨).

[4] الطبري (٩/٤٧٢-٤٧٥).

**ڕاوکردن حەڵاڵە هەرکاتێ لە ئیحرامدا نەمان**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ﴾ هـەرکاتێ لـە ئیحـرام لێبونـەوەو دەرچـوون ڕاوکردنتان بۆ ڕەوایە واتە: دوای ئەوەی ئیحرامتان شکاندو لێ بونەوە، ئەوی کە لێتان قەدەغە کرا بـوو بۆمان حەڵاڵ کردنەوە لـە ڕاوکـردن. ئەمـە بڕیارێکە دوای قەدەغـەکردنی. ئـەو ڕاستیەی کە لەسـەری دادەمەزرێ ئەوەیە کە بڕیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی پێش قەدەغەکردنەکە، ئەگەر واجب بـوبێ بە واجب دادەنرێ، ئەگەر موستەحب بوبێ بە موستەحبو موباح بـوبێ بـە موبـاح دادەنـرێ. ئـەوەیش دەڵێ: بۆ وجوبە. بە ئایەتی زۆر وەڵام ئەدرێتەوە، ئەویش دەڵێ: بۆ ئیباحەیە، هـەر بـە چـەند ئایـەت وەڵام ئەدرێتەوە، ئەویش گشت بەڵگەکان ڕێك دەخات ئەوەیە کە باسمان لێوە کرد والله أعلم.

**دادگەری لە هەموو کاتێکدا پێویستە**

خـــودای مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْ﴾ ڕقی کۆنیش هەڵتان نەنێ، کە نەیانهێشت بە زیارەتی کەعبەی ماڵی خودا بگـەن، کـە دەسـت درێژی بکەن، واتە: با قینی ئەو کەسانەی کە ڕێیان نەدان بچنە کەعبەی پـیرۆز لـە سـاڵی حودەیبیـەدا کە لە سنوری بڕیاری خودا دەرچنو بە ناهەقی دەست درێژی بکەنە سەریان، بەڵکو دەبێ بەو شێوەی خودا فەرمانتان پێدەکات پێ بە دادگەری لەگەڵ هەموو کەسێکیاندا بجوڵێنەوە. وەك ئەم ئایەتـەی کە بەو زوانە دێت کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾[1] دوژمنـیو قینـی دەستەو کۆمـەڵێ هـەڵتان نـەنێ، بەڕاسـتی ڕەفتـار نەکـەن بـە یەکسانیو بێ جیاوازی لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتار بکەن. واتە: با ڕقو قینتـان لـە کۆمـەڵێ واتـان لێ نـەکات واز لە دادگەری بهێنن، چونکە دادگەری ئەرکی هەموو کەسێکە بەرانبەر هەموو کەسێ لە هـەموو کـاتو سـاتێکدا. ئیبنوئـەبی حاتـەم ڕیوایـەتی کـردوە لـە زەیـدی کـوڕی ئەسـلەمەوە دەڵێـت: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) لە ساڵی حودەیبیەدا خۆی هاوەڵەکانی کـە هەنـدێ لـە موشـریکەکان نەیانهێـشت زیـارەتی ماڵی خودا بکەن، زۆر بەلایانەوە گران بـوو، کۆمـەڵێ لـە بت پەرستەکانی خـەڵکی خۆرهـەڵات نیـازی عومرەیان بوو، بە لایاندا تێپەڕین، هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) گوتیان: ئێمەیش ڕێگـە نـادەین ئەمانـە بڕۆن، وەك چۆن هاوەڵەکانی ئەمانە ڕێگەی ئێمەیان نەدا. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خـوارەوە: ﴿شَنَـَٔانُ﴾ واتـە: ڕقو قـین وەك ئیبنوعـەبباسو کەسـانی تـریش گوتویانـە.[2] پاشـان خـودای گـەورە

---

[1] المائدة (٨).

[2] الطبري (٤٧٨/٩)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

ئەفەرمويّت: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ لەسەر چاكەو پاريّزگارى (لە خوا ترسى) يارمەتى يەكترى بدەن، نەك لەسەر تاوانو دەست دريّژى. خوداى گەورە فەرمان دەكات بە عەبدە خاوەن بڕواكانى كە يارمەتى يەكترى بدەن لەسەر كارە چاكەكانو واز لە خراپەكان بيّنن. ئا ئەوە پاريّزگاريە، يارمەتى دانى لەسەر پڕوپوچو تاوانو بەزاندنى سنورەكانى خوداى ليّ قەدەغە كردوون. ئيبنوجەرير دەلّيّت: ﴿ٱلْإِثْمِ﴾ واز هيّنانە لەوەى خودا فەرمانى پيّداوە بە كردنى ﴿وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ لادانەوە لەوى خودا سنورى بۆ داناوە لە ئاينەكەتاندا. وە لادانە لەوەى كە خودا فەرزى كردوە لەسەرتان لە خۆتاندا يان لە غەيرەز خۆتاندا.[1] ئيمامى ئەحمەد ڕيوايەتى كردوە لە ئەنەسى كوڕى ماليكەوە دەلّيّت: پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) فەرموويەتى: (يارمەتى براكەت بدە ستەمكارە يان ستەمليّكراوە) گوترا: ئەى پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) ئەمە يارمەتيم داوە لەبەر ئەوە ستەمى ليّكراوە، چۆن يارمەتى ئەوە بدەم ستەمى ليّكراوە؟ فەرمووى: (دەيگرىو ڕيّگرى ليّ دەكەى لەو ستەمە، ئەوە يارمەتى دانيەتى)[2] بوخارى خۆى بە تەنيا لە فەرموودەكەى هوشەيما (هُشَيم) بەو شيّوەيە هيّناويەتى.[3] ئيمامى ئەحمەد ڕيوايەتى كردوە لە يەكيّ لە هاوەلّەكانى پيّغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموويەتى: (ئەو خاوەن باوەڕەى تيّكەلاّوى خەلّكى دەكاتو لەسەر ئازاريان خۆڕادەگرىّ، پاداشتى گەورەترە لەوەى كە تيّكەلاّوى خەلّكى ناكاتو خۆڕاناگرىّ لەسەر ئازاريان)[4] ئەبوهورەيرە دەلّيّت: پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) فەرموويەتى: (هەركەسيّك بانگى خەلّكى بكات بۆ ڕيّگاى ڕاست، ئەوە بە ئەندازەى پاداشتى ئەوانەى شويّنى دەكەون پاداشتى دەست دەكەويّت، هيچ لە پاداشتى ئەوان كەم ناكات، هەركەسيش بانگى خەلّكى بكات بۆ گومڕايى، ئەوە بە ئەندازەى تاوانى ئەوانەى شويّنى دەكەون تاوان هەلّدەگرىّو هيچ لە تاوانى ئەوان كەم ناكات)[5].

### ئەو ئاژەلاّنەى خواردنيان قەدەغەيە

خوداى مەزن عەبدەكانى خۆى ئاگادار دەكات كە خواردنى ئاژەلّى مرداربوو بەكارهيّنانى حەرامە. واتە: ئەو ئاژەلاّنەى كە مردار دەبنەوە بىّ ئەوەى سەر ببڕيّن يان ڕاو بكريّن گومانى تيّدا نيە كە زيانيان

---

[1] الطبري (٩/٤٩٠).

[2] أحمد (٣/٩٩)، فەرموودەيەكى سەحيحە.

[3] فتح الباري (٥/١١٧).

[4] أحمد (٥/٣٦٥)، فەرموودەيەكى چاكە بوخارى ڕيوايەتى كردوە لە (الادب المفرد (٣٨٨))) تيرميزى (لە (٢٥٠٧)) ئەحمەد (٢/٤٣)، ابن ماجە (٤٠٢٣) لە فەرموودەكەى ئيبنوعومەرا (حافيزيش لە (الفتح)دا (١٠/٥٤٢)و گوتى سەنەدەكانى چاكن.

[5] مسلم (٤/٢٠٦٠).

هەیە، چونکە خوێنکە لەلاشەیاندا دەمێنێتەوە، زیانیان بە لاشەو ئاینی مەردم دەگەیەنێ. کە ئەوە خودا حەرامی کردوە. بەڵام لەناو مردارەبوەکاندا ماسی جیاکردوەتەوە، کە خواردنی حەڵاڵە، سەربڕابێ یان سەر نەبڕابێ وەك یەکە. وەك ئیمامی مالیكو ئەبوداوودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنوماجەو ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوحیبان ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەریا ئاوەکەی پاك کەرەوەیەو مردارەوەبووشی حەڵاڵە) کوللەیش هەر بەم شێوەیە خواردنی بە مردارەوە بی حەڵاڵە وەك لەمەوبەدوا باسی دەکەین. ﴿وَٱلدَّمُ﴾ خوێنی ڕژێنراو وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾[1] یان خوێنی ڕژێنراو. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباسو سەعیدی کوڕی جوبەیر. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پرسیاری لێ کراوە لەبارەی سپڵەوە گوتی: بیخۆن، گوتیان: سپڵ خوێنە، دەڵێت: خوێنی ڕژێنراوتان لێ حەرام کراوە ئەبوعەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە بە مەرفوعی، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دوو مردارۆبوومان بۆ وە دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراوە، دوو مردارەوەبوەکە ماسیو کوللەیە، دوو خوێنەکەیش جگەرو سپڵە)[2] ئیمامی ئەحمەدو ئیبنوماجەو دارولقطنی (الدار القطنی) لە فەرموودەی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە کە فەرموودەیەکی لاوازە.[3] ﴿وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ﴾ گۆشتی بەراز واتە: بەرازیماڵیو بەرازی کێوی، مەبەست بە گۆشتی بەراز واتە: گشت بەشەکانی هەتا چەوریەکەیشی وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾[4] بێگومان ئەو گۆشتە پیسە. دیارو ڕوونتر ئەوەیە کە وترا گۆشت هەموو بەشەکانی تریش دەگرێتەوە، وەك لە زمانی عەرەبەوە وەردەگیرێو لەناو عەرەبدا هەر وا باوە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە، لە بورەیدەی کوڕی حەسەیبیئەسلەمیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ یاری کرد بە نەردەشیر (النَّردَشیر) (یاریەکی ناسراوە). وەك ئەوە وایە کە دەستی بە گۆشتو خوێنی بەراز چەور کردبێ)[5]. ئەگەر ئەم نەفرین لێکردنە بۆ دەست لێدانی بێ، ئەی ئەو هەڕەشەو جەخت کردنەوەیە لەسەر خواردنو سود لێ وەرگرتنی لە بەرکاهێنانی بۆ

---

[1] الانعام (١٤٥).

[2] ترتیب مسند الشافعي (٢/١٧٣)، فەرموودەیەکی مەرفوعی لاوازە، ڕاستتر ئەوەیە مەوقوفە حوکمی مەرفوعی هەیە لەبەر ((أُحِلَّ)) چونکە ئەو کەسە ئەوەی حەڵاڵ کردوە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) کە لە خواوە نیگای بۆ هاتوە.

[3] أحمد (٢/٩٧)، الدار القطنی (٤/٢٧٢)، البیهقي (١/٢٥٤)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] الانعام (١٤٥).

[5] الطبري (٩/٥٠٣).

خواردن دەبێ چۆن بێ؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گوترا گۆشت، هەموو بەشەکانی تریش دەگرێتەوە لە پیوو بەزو هەر شتێکی تر. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا کڕینو فرۆشتنی مەیو مردارەوەبوو بەرازو بتەکانی حەرام کردوە) گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی چەوری مردارەوەبوو کە ئەدرێ لە کەشتیو پێستی پێ چەور دەکرێ خەڵکی بۆ چرا بەکاری دێنن؟ فەرمووی: نەخێر، ئەویش حەرامە)[١]، وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە فەرموودەکەی ئەبوسوفیاندا کە گوتی بە هرقل پاشی ڕۆم: کە ڕێگری لێ کردوین (لە خواردنی) خوێنو مردارەوە بوو. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ وە هەر ئاژەڵێ کە لەوەختی سەربڕیندا ناوی بێجگە خوای لێ بێنن. واتە: هەر ئاژەڵێ ناوی بێجگە خودای لێ بێنرێت لە کاتی سەبڕیندا حەرامە. چونکە خودای مەزن وای داناوە کە دەبێ لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا ناوی خوای لێ بنرێ. هەرکاتێ لەوە لادراو ناوی غەیرەز خودای لێ نرا وەك بت یان زۆردار یان پەیکەر یان هەر شتێکی تعر لە دروست کراوەکانی خودا، بێگومان بە کۆی دەنگی زانایان (الاجماع) حەرامە.

وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ﴾ ئاژەڵی خنکاو. واتە: ئەو ئاژەڵەی بە خنکان مردارەوە بووە، بە ئارەزوو یان بە ڕێکەوت هەڵبزوقێو بە پەتەکەی ملی بتاشێو پێی مردار ببێتەوە ئەوەیش حەرامە. وە ﴿وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ﴾ ئەو ئاژەڵەی کە بە لێدان. بە شتی قورس کە تیژ نەبێ لێی بدرێ هەتا مردار دەبێتەوە دیسان خواردنی حەرامە. وەك ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش گوتیان: ئەوەی بە دار لێی بدرێو دەستو قاچی شل ببێو مردار ببێتەوە[٢] قەتادە دەڵێت: خەڵکی چەرخی نەفامی بە دار ئەیاندا لێی هەتا مردار دەبوەوە ئەوسا دەیانخوارد.[٣] وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە کە عەدی کوڕی حاتەم دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من پەلار یان تیر دەگرمە نێچیرو لێی ئەدات، فەرمووی: (ئەگەر بە تیژیەکەی تێت گرتو کونی کرد بیخۆ، وە ئەگەر بە پانیەکەی لێی دا ئەوە مردارەوە بوەو مەیخۆ)[٤] جیاوازی کردوە لە نێوان ئەوەی بە تیر یان بە تیری کورتو شێوە یان بە تیژیەکەیان لێی دەدرێ، حەڵاڵی کردوە، بەڵام ئەوەی بە پانیەکەی لێی دراوە بە مردارەوە بوو دادەنێو حەڵاڵی نەکردوە ئەمە هاودەنگی زانایانی لەسەرە لەلای شارەزایانی ئاینی (الفقهاء). ﴿وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ﴾ هەڵدێراو. واتە: ئەو ئاژەڵەی کە لە شوێنی بەرزو بڵندەکانەوە دەکەونە خوارو بەوە مردار دەبێتەوە ئەمەیش

---

[١] فتح الباري (٤/٤٩٥)، مسلم (٣/١٢١٧).

[٢] الطبري (٩/٤٩٦).

[٣] الطبري (٩/٤٩٦).

[٤] فتح الباري (٩/٥١٨).

حەلاڵ نیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿الْمُتَرَدِّيَةُ﴾ ئەوەیە کە لە کێو دەکەوێتە خوارەوە.[1] قەتادە دەڵێت: ﴿وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ﴾ ئەو ئاژەڵەیە دەکەوێتە ناو بیر[2] سوودی وتی: ئەو ئاژەڵەیە لە کێو دەکەوێتە خوارەوە یان دەکەوێتە ناو بیر.[3] ﴿وَٱلنَّطِيحَةُ﴾ ئەو ئاژەڵەیە کە بەهۆی شۆق لێدانی ئاژەڵێکی ترەوە مردار دەبێتەوە، خواردنی حەرامە، با شاخەکەیش بریندداری کردبێ‌و خوێنیشی لێ بڕوات‌و لە شوێنی سەربڕینیشدا برینداری کردبێ. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾ هەرچی دڕندەی کێوی دڕیویەتی. وەك شێرو پڵنگ‌و گورگ‌و سەگ. هەندێکی لێ خواردوەو بەوە مردار بوەتەوە. با خوێنیشی لەبەر چووبێ‌و لە شوێنی سەربڕینیشیدا بێ. بە کۆی دەنگی زانایان خواردنی حەرامە. هەرچەندە خەڵکی چەرخی نەفامی ئەوەی لە دەمی دڕندەی کێوی بمایەتەوە لە مەڕو وشترو گاو مانگا هەرشتێ لە تر لەمانە دەیانخوارد، بەڵام خودای مەزن ئەمەی لە بڕواداران حەرام کرد ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ مەگەر پێش لە گیان دەرچونیان فریای کەون سەریان بڕن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ دەڵێت: مەگین ئەو ئاژەڵانەی کە فریای سەربڕینی کەوتبن‌و گیانی تیا مابێ ئەوە بیخۆن.[4] هەروا لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنی بەسری‌و سوودیشەوە ڕیوایەت کراوە[5] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەلیەوە دەڵێت: ئەگەر فریای ئاژەڵی لێدراو (بە دار یا هەر شتێکی تر) هەڵدێراو بە شۆق لێدراو کەوت دەستی یا قاچی دەجولا سەرت بڕی بیخۆ.[6] هەر وایش ڕیوایەت کراوە لە تاوس‌و حەسەن‌و قەتادەو عوبەیدی کوڕی عومەیرو زەحاك‌و کەسانی تریشەوە کە گوتویانە: سەربڕاو کاتێ جوڵەی کرد، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوای سەربڕینی گیانی تیا بوە. ئەوە حەڵاڵە[7] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە (رافع بن خديج) کە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە بەیانی دەگەینە نێچیر، کێردمان پێ نیە ئایا بە قامیش سەری ببڕین؟ فەرمووی: (ئەوەی خوێنی دەڕژێنێ پێی سەربڕن و ناوی خوای لێ بێنن‌و بیخۆن جگە لە ددان‌و نینۆك، وە ئێستا باسی ئەوەتان بۆ دەکەم: ددان لەبەر

---

[1] الطبري (٩/٤٩٧).

[2] الطبري (٩/٤٩٨).

[3] الطبري (٩/٤٩٨).

[4] الطبري (٩/٥٠٢).

[5] الطبري (٥٠٤/٥٠٧).

[6] الطبري (٩/٥٠٣).

[7] الطبري (٩/٥٠٤).

ئەوە کە ئێسکە، نینۆکیش لەبەر ئەوە کێردی حەبەشیەکان بووە)[1]، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ وە هەرچیش بۆ بتەکان سەربڕا (حەرامە) موجاهیدو ئیبنوجورەیج گوتیان: ﴿ٱلنُّصُبِ﴾ ئەو بەردانەی دەوری کەعبەی پیرۆز بووە.[2] ئیبنوجورەیج دەڵێت: ئەو سێ سەدو شەست بتە بووە کە عەرەبەکان لە کاتی نەفامیاندا ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕی ئەو شوێنەی کەعبە کە ڕووبەڕووی بتەکان بۆ خوێنی ئەو ئاژەڵەیان پێ دەڕێژا، گۆشتەکەیان لەت ئەکردو دەیانخستە ئەو بتەو پەیکەرانە.[3] زۆر کەس ئەم باسەی گێڕاوەتەوە. خودا ئەو کارەی لە خاوەن باوەڕان قەدەغە کرد، خواردنی ئەو ئاژەڵانەی حەران کرد کە لەلای ئەو بتانەدا سەربڕان، هەرچەندە ناوی خوایشیان لەسەر ئەو ئاژەڵانە بهێنایە لای ئەو بتانەدا. چونکە ئەو کارەیان لەو شەریکانە بوو کە خوداو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردبوو.

## قەدەغەکردنی هەرشتێ لەسەر قوماری تیر دابەش دەکرێ

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ﴾ هەرچی لەسەر قوماری تیر دابەش دەکرێ قەدەغەیە، واتە: ئەی خاوەن باوەڕان هەرچی لەسەر تیر دابەش بکرێ حەرام کراوە لێتان. عەرەبەکان لەکاتی نەفامیدا دەیانکرد، (ئەزلام) بریتی بوو لە سێ (قەدەح) لەسەر یەکەمیان نوسرا بوو (أفعل) لە دووەمیان (لا تفعل) لە سێیەمیان (غُفل) کە هیچی لەسەر نیە. و هەندێ کەسی تریش گوتویانە: لەسەر (قەدحی) یەکەم نووسرا بو: (أمرني رَبي) لەسەر دووەم نووسرا بوو: (نهاني ربي) لەسەر سێهەم نووسرابوو بۆش (غُفل) هیچی لەسەر نیە. ئەگەر هەڵدرایەو سەهمی بیکە دەرچووایە دەیکرد، ئەگەر سەهمی مەیکە دەرچوایە نەیدەکرد. ئەگەر سەهمی بۆش دەرچوایە (غُفل) دەرچووایە دووبارەیان دەکردەوە (الاستسقام) وەرگیراوە لە دوای بەش کردنەوە بەم قومارە، وەك ئیبنوجەریر دەڵێ. ئیبنوعەبباس دەڵێت: بریتی بووە لە قەداحێ (قداح) کە کاروباریان پێ دابەش دەکرد[4] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تریش گوتویانە: گەورەترین بتەکانی قورەیش بتێك بوە پێی دەگوترا هوبەل لەسەر بیرێ (چاڵێ) دانرابوو لەناو کەعبەدا، لەناو ئەو بیرەدا دیاریەکان (الهدايا) دائەنراو سامانی کەعبەیشی تێدا بوو، حەوت شتی قوماری (أزلام)ی لەلادا بوو تێیاندا نووسرا بوو لە هەر شتێکدا گومانیان هەبوو کار بەوە بکەن، ئەوەی لەوە بۆیان دەردەچوو پابەند دەبوون پێیەوە

---

[1] فتح الباري (٩/٥٥٤)، مسلم (٣/١٥٥٨).

[2] الطبري (٩/٥١٣).

[3] الطبري (٩/٥٠٨).

[4] الطبري (٩/٥١٥).

لێیان لا نەئەدا[1] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە چووە ناو کەعبەوە ئیبراهیمو ئیسماعیلی دی وێنەیان کێشرا بوو تێیدا (ئەزلام) لەناو دەستیاندا بوو، فەرمووی: (بەر نەفرینی خوا کەون، بێگومانە ئەوانە چاك زانیویانە کە هەرگیز ئەمان نیاز گرتنەو تیروپشکیان بەم شتانە نەکردوە)[2] موجاهید لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِ﴾ دەڵێت: ئەوە تیری (سهام) عەرەبەکانو ئیسکی (کعاب) فارسو ڕۆمەکان بوە کە قوماریان پێ کردوە[3] ئەمەی کە موجاهید باسی کردوە لە ئەزلام، ئەوە بۆ قومار دانراوە، جێی تێڕوانینە، مەگەر بڵێین: ئەوانە جارێ بۆ ئیستیخارەو جارێ بۆ قومار بەکاریان هێناوە والله أعلم. چونکە خودای گەورە ئەم دوانەی لەگەڵ یەکدا هێناوە کە (المیسر)ە لە کۆتایی ئەم سورەتەدا ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾[4] ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، مەیی خۆری و قومار بازی و کێل پەرستی و گرەو لەسەر تیر کردن لە کارەکانی شەیتانن خۆتانی لێ بپارێزن، بەڵکو ڕزگارتان ببێ. شەیتان مەبەستی ئەوەیە بە مەیی خواردنو قومار ئاژاوەتان بخاتە ناو لە نوێژو یادی خودا لاتان بدات، ئەیا ئێوە دەست لەو کارانە هەڵدەگرن؟ لێرەیشدا هەر وای فەرمووە: ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌ﴾ هەرچی لەسەر قومار دابەش دەکرێ، کە هەرچی ئەمانە بکات نافەرمانی خودا دەکات. گومڕاو سەرگەردانو نەفامو بت پەرستە. خودای مەزن فەرمانی داوە بە بڕواداران هەرکاتێ لە کاروبارێکیاندا دوو دڵ بوون با (ئیستیخارە) بکەن، عیبادەتی خودا بکەنو پاشان داوای لێ بکەن یارمەتیان بدات بۆ هەڵبژاردنی ئەو کارانەی کە دەیانەوێت. وەك ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و خاوەن کتێبەکانی تری فەرموودەیش ڕیوایەتیان کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فێری ئیستیخارەی دەکردین لە هەموو کاروبارێکماندا وەك چۆن فێری سورەتێکی ئەکردین لە قورئاندا ئەیفەرموو: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە ویستی ئیشێ بکات کە نەزانێ کردنی باشە یا نەکردنی دوو ڕکات نوێژ بکات جگە لە فەرزەکان لە پاشان بڵێ: ئەی خودایە من بەهۆی زانستی تۆوە داوات لێ دەکەم شارەزام کەی لەو کارەی من دەمەوێت بیکەم خێر لە کردنیدایە یان لە نەکردنیدایە، وە بەهۆی دەستەڵاتی تۆوە داوات لێ دەکەم کە تونام بدەی بەسەر کردنیدا، وە

[1] الطبري (٩/٥١٣).
[2] فتح الباري (٦/٤٤٦).
[3] الطبري (٩/٥١٢).
[4] المائدة (٩٠-٩١).

داوات لێ دەکەم بە فەزڵ و کەرەم و گەورەیی خۆت، چونکە تۆ خاوەن توانای و من توانام نیە، وە تۆ زانیاریت هەیە (بەمەو) من زانیاریم نیە، تۆ لە هەموو کەس زاناتری لە نادیارەکان ئەی خودایە ئەگەر لە زانستی هەمیشەیی و ئەزەلی تۆدا وایە کە ئەمە چاکە بۆ دین و دنیاو بژێوی کۆتایی کارمدا باشە بۆم (ناوی کارەکە بێنێ) یان بڵێ: لە کاری ئێستاو داهاتومدا بڕیارم بۆ بدەو بۆیشم ئاسان بکە لەپاشان بەرەکەتی تێ بخە بۆم. ئەگەر لە زانستی هەمیشەیی تۆدا وایە کە ئەم کارە لە دین و دنیاو بژێوی و کۆتایی کارمدا خراپە بۆم یا بڵێ: (لە کاری ئیستاو داهاتومدا) ئەم کارەم لێ لادە، منیش لادە لە کردنی (و لە دڵمی بێنە دەر) خێر لە هەر شتێکدایە ئەوەم بۆ بڕیار بدە. پاشان بەوەی کە بڕیارت داوە بۆم ڕازیم بکە)[1] ئەحمەد بەم شێوەیە هێناویەتی. تیرمیزی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحی غەریبە.

## بێ ئومێدی خوانەناس و شەیتان لە زیان گەیاندن بە ئاینی موسوڵمانان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ﴾ ئەوا ئەمڕۆ ئەوانەی خوانەناسن لە زیان گەیاندن لە دینەکەی ئێوە بێ هیوان. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە واتە: بێ ئومێد بوون لەوەی کە واز لە ئاینەکەیان بێنن[2] عەتای کوڕی ئەبوڕیباح و سوودی و موقاتیلی کوڕی حەیان هەر وا ڕیوایەتیان کردوە.[3] هەر بەم مانایە لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان شەیتان بێ هیوا بووە کە نوێژ گەران بیپەرستن لە دورگەی عەرەبیدا، بەڵام هەوڵی ئاژاوەنانەوە ئەدات لە نێوانیاندا)[4] هەڵدەگرێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە خوانەناسان و شەیتان بێ هیوان کە هاوشێوەی موسوڵمان بێنن، لەبەر ئەو ڕەوشتانەی کە موسوڵمانانی پێ جیاکراوەتەوە کە دژی بت و بت پەرستانە، هەر بۆیە فەرمانی داوە بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە خۆڕاگرو بەهێز بن بەرانبەر خوانەناس و دژایەتی بکەن. جگە لە خودا لە هیچ کەس نەترسن ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ﴾ لە خۆم بترسن نەك لەوان، واتە: کە دژایەتیان دەکەن لێیان مەترسن لە من بترسن سەرتان دەخەم بەسەریانداو لەناویان ئەبەم و زاڵتان دەکەم بەسەریاندا، دڵخۆشتان دەکەم بە قڕ کردنیان، واتان لێ دەکەم لە دنیاو قیامەتدا لە ژووری ئەوانەوە بن.

---

[1] أحمد (٣/٣٤٤)، فتح الباري (٣/٥٨)، أبوداود (٢/١٨٧)، تحفة الاحوذي (٢/٥٩١)، النسائي (٦/٨٠)، إبن ماجة (١/٤٤٠).

[2] الطبري (٩/٥١٦).

[3] الطبري ( ٩/٥١٦).

[4] مسلم (٤/٢١٦٦).

**تەواوی ئاینی ئیسلام**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ وا لە ئەمڕۆوە دینەکەتم تەواو کردو بەبێ کەمو کوڕی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامیشم بە دینی ئێوە هەڵبژارد. ئەمە مەزنترین بەهرەکانی خودایە بۆ ئەم ئومەتە، چونکە خودای مەزن ئاینەکەی بۆ تێرو تەواو کردن. بێ نیازی کردن لە هەر دینێکی تر. هەر پێغەمبەرێکی تر، جگە لە پێغەمبەری خۆیان (ﷺ) هەر بۆیە (موحەممەدی) کردە دواین پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ مرۆڤو جنۆکە، هیچ قەدەغەیە نیە، جگە لەوەی ئەو قەدەغەی کردوە، هیچ حەڵاڵێکیش نیە جگە لەوەی ئەو حەڵاڵی کردوە. هیچ ئاینێ نیە جگە لەوەی ئەو هێناویەتی. هەرچی ئەو هەواڵی پێداوە ڕاستو دروستە، درۆو بێ بەڵێنی تێدا نیە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗا﴾[1] قسەکانی پەروەردگارت (لە بێ لایەنگیریو ڕاستیدا) تەواوو بێ کەمو کوڕین. واتە: ڕاستو دروستە لە هەواڵداو دادگەرە لە فەرماندان بە کردنو نەکردن. کاتێ ئاینەکەیان بۆ تەولو کردن، بەهرەی زۆریشی ڕژاند بەسەریاندا. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ کەواتە: ئێوەش بە ئاینی خۆتان هەڵیبژێرن. چونکە ئاینێکە خودا خۆشی دەوێتو پێی ڕازیەو بەڕێزترین پێغەمبەریشە لەناو پێغەمبەرە بەڕێزەکاندا، هەر بە ئەمیشدا بەڕێزترین کتێبی خۆیشی ناردوە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە هارونی کوڕی عەنتەرەوە لە باوکیەوە دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ ئەمەیش لە ڕۆژی حەجی (أكبر) دابوو، عومەر گریا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (چی دەتگرێنێ؟) گوتی: ئەوە گریاندمی ئێمە لە زیاد کردندا بووین لە ئاینەکەماندا، بەڵام کە تەواو بوو، هیچ شتێ نیە دوای تەواو بوون بەرەو کەمو کوڕی نەچێ. فەرمووی: (ڕاست دەکەی)[2] ئەم فەرموودە سەحیحە پشتگیری لەم مانایە دەکات کە ئەفەرموێت: (بێگومان ئیسلام بە غەریبی هات، دیسان غەریب (نامۆ) دەبێتەوەو خۆشبەختی بۆ غەریبەکان)[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە تاریقی کوڕی شەهابەوە گوتی: پیاوێکی جولەکە هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب گوتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان، ئێوە ئایەتێك لە کتێبەکەتاندا دەخوێنن، ئەگەر لەسەر ئێمەی کۆمەڵی جولەکە بهاتایە خوارەوە، ئەو ڕۆژەمان

---

[1] الانعام (١١٥).

[2] الطبري (٥١٩/٩).

[3] مسلم (١٣٠/١).

دەکرد بە جێژن، گوتی: کام ئایەت؟ گوتی: ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي﴾ عومەریش گوتی: سوێند بە خوا من ئەو ڕۆژە دەزانم کە ئەو ئایەتەی تیا هاتوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو سەعاتەیش هەر دەزانم کە تێیدا هاتوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێوارەی عەرەفە بوو لە ڕۆژی هەینیدا[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنی کوڕی سەباحەوە لە جەعفەرەوە لە عەونەوە بەو شێوەیە[2] موسلیمو تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە[3] وتەی بوخاری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە تاریقەوە دەڵێت: جوولەکەکان گوتیان بە عومەر: سوێند بە خوا ئێوە ئایەتێك دەخوێننەوە، ئەگەر لەناو ئێمەدا بهاتایەتە خوارەوە دەمانکرد بە جێژن. عومەر گوتی: من کاتی هاتنە خوارەوەی دەزانم لە کوێدا هاتوەتە خوارەوە کاتێکیش هاتە خوارەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کوێدا بوو: ڕۆژی عەرەفە بوو، سوێند بە خوا منیش لە عەرەفەدا بووم. سوفیان گوتی: من گومانم هەیە کە ئەم ئایەتە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ لە هەینیدا بووە یا نەبووە[4] گومانی سوفیان ئەگەر گومانی لە ڕیوایەتەکا بوە، ئایا عومەر هەواڵەکەی پێداوە یا نەیداوە، ئەوە ئەو خۆپارێزی (وەرعی) کردوە. خۆ ئەگەر گومانی لەوە بوبێ کە وەستانی ڕۆژی عەرەفە ڕۆژی هەینی بووە. ئەوەی کە گومانی لێی هەبووە لەلایەن سەوریە بووە، بێگومان ئەمە شتێکی زۆر ڕوونە وە جێی گومان نیە هیچ کەسێ لە خاوەنی سیرەتو مەغازیەکانو (المغازي و السير) زانایانی شەریعە ناکۆکیان نەبوە لەسەری. لەو بارەیەوە چەند فەرموودەی دەماو دەم (متواترة) هاتوە کە گومان لە ڕاستیاندا نیە. ئەم فەرموودە بە شێوەی تریش لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ڕیوایەت کراوە، والله أعلم.

### ڕێگەدان دان بە خواردنی مردارەوە بوو لە کاتی ناچاریو برسیەتیدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ هەرکەسێ ناچار بوو لە کاتی برسیەتیدا، مەبەستی گوناه کردن نەبێ (لەو گۆشتە بخوات گوناهی ناگات) بێگومان خودا خەتا پۆشو دلۆڤانە. واتە: کەسێ پێویستی بە خواردنی ئەو قەدەغە کراوانە هەبێ کە خودای گەورە باسی کردون لەبەر ناچاری، بۆی هەیە لێی بخوات، خودا لێبوردەو دلۆڤانە بۆی. چونکە خودا ئاگای لە نەداریو ناچاری عەبدی خۆیەتی، دەزانێ پێویستی بەو خواردنەیە، بۆیە چاوپۆشی لێ دەکاتو لێی دەبورێ، ئیبنوحیبان ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە بە مەرفوعی

---

[1] أحمد (٣٨/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٢٩/١).

[3] مسلم (٢٣١٣/٤)، تحفة الاحوذي (٤٠٧/٨)، النسائي (٢٥١/٥).

[4] فتح الباري (١١٩/٨).

دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا پێی خۆشە دەرفەتی (رُخصة) بەکاربهێنرێ، وەك چۆن پێی ناخۆشە لاساری بەرانبەری بکرێ)[1] وە لە مەرجی ڕێگەدانی خواردنی مردارەوە بوو ئەوە نیە کە سێ ڕۆژ بەردەوام لێی بخورێ، ئەگەر خواردن دەس نەکەوێ، وەك زۆرێ لە خەڵکی وادەزانن، بەڵکو هەرکاتێ ناچار بوو ئەو خواردنە بخوات ڕێی پێدراوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوواقیدی لەیسیەوە (ابي واقد الليثي) کە گوتویانە: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە لە زەویەکداین بەهۆی ئەو زەویەوە (ئەو شوێنەوە) تووشی برسیەتی دەبین، چ کاتێ بۆمان ڕەوایە مردارەوە بووی تیا بخۆین؟ فەرمووی: (ئەگەر بەیانی خواردنتان نەخواردو ئێوارانیش نەتانخوارد. خواردنی بەروبومی زەویتان دەس نەکەوت، ئەو کاتە مردارۆ بوو بخۆن)[2]، تەنیا ئەحمەد بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە. سەنەدەکانی ڕاستن بە مەرجی بوخاری و موسلیم. ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾ مەبەست پێی بێ فەرمانی خودا نەبێ، خودای مەزن خواردنی مردارەوە بۆی ڕەوا کردوەو لەوانی تریش بێدەنگە. وەك لە سورەتی بەقەرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾[3] بەڵام هەرکەسێ لە ناچاری و بێ ئارەزوو، هەر بەشی تێربوونی بخوات، هیچ گوناهی ناکات. خودا لێبوردەو دلۆڤانە. ئەوانەی دەڵێن ئەوەی لە سەفەردا گوناه بکات، هیچ دەرفەتێك (رُخصة) لە دەرفەتانی سەفەر نایگرێتەوە، چونکە بە گوناه دەرفەت وەرناگیرێ. ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە. والله أعلم.

﴿يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٤﴾﴾

## ڕوون کردنەوەی حەڵاڵ

کاتێ کە خودای مەزن لە ئایەتەکانی پێشودا باسی حەرامی ئەو شتە پیس و زیانبەخشانەی کرد بۆ لاشەو بۆ دین یان بۆ هەردووکیان، ئەویش کە جیای کردوەتەوە جیای کردوەتەوە لە کاتی ناچاریدا وەك ئەفەرموێت: ﴿وَقَدۡ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ إِلَّا مَا ٱضۡطُرِرۡتُمۡ﴾[4] خودا بە تەواوی باسی ئەمانەی بۆ کردوون کە خواردنیان ناڕەوایە (مەگین لە ڕووی ناچاریەوە) پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ

[1] إبن حبان (٤/١٨٢)، سەنەدەکەی باشە.

[2] أحمد (٥/٢١٨).

[3] البقرة (١٧٣).

[4] الانعام (١١٩).

﴿مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾ لێت دەپرسن: کامە حەڵاڵە بۆیان، بڵێ: خۆراکە پاکەکان حەڵاڵە بۆتان. وەك لە سورەتی ئەعرافدا باسی سیفەتەکانی موحەممەد (ﷺ) دەکات کە هەموو شتە پاکەکانیان بۆ حەڵاڵەو شتە پیسەکانیشیان لێ حەرام کراوە. موقاتیل دەڵێت: شتە پاکەکان، ئەوەی بۆیان حەڵاڵ کراوە لە هەر شتێکدا بە باشی دەزانن، ئەوە ڕۆزی حەڵاڵە. پرسیار کرا لە زوهری لەبارەی خواردنەوەی میزەوە بۆ چارەسەر دەڵێت: ئەوە لە شتە پاکەکان نیە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە.

**بڕیاری (حوکمی) ڕاوی گیانەوەری فێرکراو**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾ هەر نێچیرێ کە گیانەوەری ڕاوکەرتان کە فێری ڕاوتان کردبێ‌و ڕاتان هێنابێ. واتە: ئەو سەربڕاوانەی کە ناوی خوایان لێ براوە حەڵاڵە بۆتان لەگەڵ ڕۆزیە پاکەکانیش، ئەو نێچیرانەش کە ڕاوتان کردوە بە گیانەوەرە ڕاوکەرەکان کە فێرتان کردوون وەك سەگو پڵنگو باز هاوشێوەیان، ئەمە ڕاوبۆچوونی زۆرینەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) شوێن کەوتوانیان‌و پێشەوایانی ئیسلامیشە. لەو کەسانەی ئەوەی وەرگرتوە عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾ ئەوانەی کە فێرتان کردوون لە جانەوەرەکان‌و ڕاتان هێناون. ئەوانە بریتین لە سەگی ڕاهێنراوو بازو هەموو باڵدارێ کە فێر دەکرێن بۆ ڕاو، مەبەست بە ﴿ٱلۡجَوَارِحِ﴾ سەگی کێوی‌و پڵنگو بازو هاوشێوەکانیە[1] ئیبنوحاتەم ڕیوایەتی کردوە، پاشان گوتی: ڕیوایەت کراوە لە خەیسەمەو (خیثمة) تاوس‌و موجاهیدو مەکحول‌و یەحیای کوڕی ئەبوکوسەیرەوە (کُثیر) هەر بەو جۆرە[2]. پاشان ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە دەڵێت: بەڵام ئەوەی کە ڕاو دەکرێ لە باڵداری بازو هەر باڵدارێکی تر، هەرچی فریای کەوتی ئەوە بۆ تۆیەو بیخۆ، ئەگەر فریای نەکەوتن لێی مەخۆ[3]. منیش دەڵێم: ئەوەی لە کۆی زانایانەوە (الجمهور): ڕاو بە باڵدار وەك ڕاو بە سەگ وایە، چونکە باڵدار بە چرنوك پەلاماری نێچیر ئەدات وەك سەگ بە کەڵبە پەلاماری ئەدات، هیچ جیاوازیەکی نیە، وەك ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە دەڵێت: پرسیم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بارەی نێچیری بازەوە (هەڵۆ) فەرمووی: (ئەوەی گرتی وەریبگرەو بیخۆ)[4] ئەو گیانەوەرانەی کە ڕاویان پێدەکریا ناونران (جوارح) لە جەرحەوە هاتوە، واتە: ئیشکەرەکان وەك عەرەب دەڵێ: فلان ئیشی چاکی کردوە بۆ کەس‌و کاری، واتە: کاری زۆر چاکی بۆ

---

[1] الطبري (٩/٥٤٨).

[2] الطبري (٩/٥٤٧-٥٤٨).

[3] الطبري (٩/٥٤٥).

[4] الطبري (٩/٥٥٠).

کردون یان دەڵێن: فڵان ئیشکەری نیە، واتە: کەسێ نیە کاری بۆ بکات. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ﴾[1] (خودا) دەزانێ لە ڕۆژدا چ کارێکتان ئەنجام داوە. واتە: لە چاکەو لە خراپە. ﴿مُكَلِّبِينَ﴾ ڕاتان هێناون. هەڵدەگرێ حاڵ بێ لەو زەمیرەدا (الضمیر) کە لە ﴿عَلَّمۡتُم﴾ دایە، حاڵ بێ لەو (فاعل)ە، هەڵیش دەگرێ حاڵ بێ لەو (معمول)ە کە (الجوارح)ە هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ﴾ فێری ڕاویان دەکەن لەوەی خودا فێری کردوون. واتە: ئەو ڕاوکەرەی کە ناردی دەڕواو، کە بانگی کردەوە، بە بانگەکەی دەگەڕێتەوە ئەگەر نێچیرەکەیشی گرت بۆ خاوەنەکەیی دەیگرێ هەتا دێتە لای. بۆ خۆیی نایگرێ. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ بخۆن لەوانەی بۆتان دەگرن، ناوی خودای لەسەر بێنن، کاتێ ئەو گیانەوەرە ڕاوکەرە فێرکرابوو، نێچیری گرت بۆ خاوەنەکەی، ئەو کەسە ناوی خوای لێ هێنابوو لە کاتی ناردنیدا، ئەو نێچیرە حەلاڵە هەرچەندە کوشتبێتی بە کۆی دەنگی زانایان (الاجماع) وەك چۆن ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەری، هەر بەو جۆرە ئایەتیش لەو بارەیەوە هاتوە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من سەگی ڕاهێنراو دەنێرم ناوی خودای لەسەر دێنم فەرمووی: (کاتێ سەگە ڕاهێنراوەکەت ناردو ناوی خوات لەسەر هێنا، ئەوەی گرتی بۆ تۆیە) گوتم: ئەگەر کوشتیان؟ فەرمووی: (ئەگەر کوشتیان سەگی تر جگە لە خۆیان هاوکاریان نەکردن، بێگومان تۆ ناوی خۆت لەسەر سەگی خۆت هێناوەو لە سەگەکانی ترت نەهێناوە) گوتم: من بە تیر دەگرمە نێچیر لێی ئەدەم؟ فەرمووی: (ئەگەر بە تیر تێت گرتو کونی تێکرد بیخۆ، ئەگەر بە پانیەکەی بەری کەوت ئەوە مردارەوە بووە مەیخۆ)[2] دیسان لە بوخاریو موسلیمەوە هاتوە: (ئەگەر سەگەکەت نارد ناوی خودای لەسەر بێنە، ئەگەر (نێچیرەکەی) گجرتو بە زیندوویی فریای کەوتی سەری بڕە، وە ئەگەر پێی گەیشتی کوشتبووی بەڵام لێی نەخواردبوو بیخۆ. چونکە گرتنی ئەو سەگە سەربڕینیەتی) دیسان هەر لە ڕیوایەتێکی تردا بوخاریو موسلیم هێناویانە: (ئەگەر لێی خواردبوو تۆ مەیخۆ. من دەترسم ئەوەی گرتویەتی بۆ خۆی گرتبێتی)[3].

---

[1] الانعام (٦٠).

[2] فتح الباري (٥٢٧/٩)، مسلم (١٥٢٩/٣).

[3] فتح الباري (٥٢٧/٩)، مسلم (١٥٢٩/٣).

## ناوی خوا هێنان لەسەر ئەو ئاژەڵە ڕاوکەرانە لەکاتی ناردنیدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ ئەوەی بۆتان دەگرن لە گۆشتەکەیان بخۆن و ناوی خوای لەسەر بێنن. واتە: لە کاتی ناردنیدا بۆ نێچیرەکە، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوتی بە عەدی کوڕی حاتەم: (کاتێ سەگە ڕاهێنراوەکەت نارد ناوی خوای لەسەر بێنە، ئەوەی بۆی گرتوی بیخۆ)[1] وە لە فەرموودەکەی ئەبوسەعلەبەوە کە دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: (کاتێ سەگەکەت نارد ناوی خوای لەسەر بێنە، وە کاتێ بە (تیروکەوانەکەت) تیرت گرت ناوی خوای لێ بێنە).[2] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ دەڵێت: کاتێ کە گیاندارە ڕاوکەرەکەت نارد بڵێ: بەناوی خودا، ئەگەر لە بیرت چوو بە تاوان دانانرێت.[3] واتە: گوتراوە: مەبەست بەم ئایەتە فەرماندانە بە ناوی خوا هێنان لە کاتی خواردندا، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کچێکی کۆڵەووسی (کچی ژنێ لە مێردێکی تری) عومەری کوڕی ئەبوسەلەمەی فێردەکرد فەرمووی: (ناوی خوای لەسەر بێنەو بە (دەستی) ڕاستت بخۆو لەوەیش بخۆ کە لە لای خۆتەوەیە)[4] وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە عائیشەوە (ڕەزای خواتی لێبێ) کە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکێ گۆشتمان بۆ دێنن (خوانەناس بوون و تازە موسوڵمانن) نازانیت ئاخۆ ناوی خوایان لەسەر هێناوە یان نەیانهێناوە؟ فەرمووی: (ئێوە ناوی خوای لەسەر بێنن و بیخۆن)[5].

﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾

## حەڵاڵی سەربڕاوی ئەهلی کتێب

کە خودای مەزن باسی ئەو شتانەی کرد کە قەدەغەی کردوە لەسەر بەندە خاوەن باوەڕەکانی لە شتە پیسەکان، ئەوەیش کە حەڵاڵی کردوە بۆیان لە شتە خاوێنەکان، دوای ئەوە ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ

---

[1] فتح الباري (٩/٥٢٤).

[2] فتح الباري (٩/٥٢٧)، مسلم (٣/١٥٣٢).

[3] الطبري (٩/٥٧١).

[4] فتح الباري (٩/٤٣١)، مسلم (٣/١٥٩٩).

[5] فتح الباري (٩/٥٥٠).

أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾ وا لەمڕۆوە هەموو شتێکی خاوێنتان بۆ حەڵاڵە. پاشان باسی حوکمی سەبراوی ئەهلی کتێب دەکات لە گاورو جوولەکەکانو ئەفەرموێت: ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾ ئەو شتانە کە وا ئەهلی کتێب دەیخۆن حەڵاڵە بۆتان. ئیبنوعەبباسو ئەبوئومامەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو عەتاو حەسەنو مەکحولو ئیبراهیمی نەخەعیو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیان گوتیان: واتە: سەربڕاویان[1] زانایان هەموو یەك ڕان لەسەر ئەوە کە سەربڕاوی گاورو جوولەکە خواردنی حەڵاڵە بۆ موسوڵمانان، چونکە ئەوانیش سەبڕینیان بۆ جگە لە خودا بە لاوە حەرامە. جگە لە ناوی خودا لەسەر سەربڕاویان ناهێنن. هەرچەندە هەندێ بیروبۆچونیان هەیە لەو بارەیەوە تێیدا کە خودا پاکو بێ عەیبەو دوورە لەو شتانە. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلەوە دەڵێت: هەوانەیە پیوو بەزم بۆ شۆڕ کرایەوە لە ڕۆژی خەیبەرا منیش باوشم پیا کردو گوتم: ئەمڕۆ من لەمە بەشی کەس نادەم، کە لام کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد (پێدەکەنی)[2] زانایان ئەمەیان کردوە بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە دروستە بەکارهێنانی ئەو شتانە کە خەڵکی پێویستی پێیەتی لە خواردنو هاوشێوەی لە تالانی پێش دابەش کردنی، ئەمەیش شتێکی ڕوونو ئاشکرایەو زانایانی حەنەفیو شافیعیو حەنابیلەکان ئەم فەرموودەیان کردۆتە بەڵگە بەسەر زانایانی مالیکیەوە کە قەدەغەی خواردنی ئەو شتانەیان کردوە کە جوولەکەکان حەرامیان کردوە لە سەربڕاوەکانیاندا وەك بەزو پیوو هاوشێوەکانی، کە لێیان حەرام کرابوو. کۆی زانایان ئەم فەرموودەیان کردوە بە بەڵگە بەسەریانەوە. بەڵگەی چاکتر لەمە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە، کە خەڵکی خەیبەر مەڕێکی برژاویان بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستەکەیان ژەهراوی کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە دەستو شانی دەکرد، لێی هەڵگرتو بردی بۆ دەمی تیکەیەکی لێ کردەوە، دەستەکە هەواڵی دایە کە ژەهراوی کراوە. پێغەمبەر(ﷺ) تفی کردەوە، ئەو ژەهرە کاری لە دانەکانی پێشو خوێنبەرەکانی گەردنی پێغەمبەری خودا کرد (ﷺ) بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرور کە لەگەڵیدا بوو لێی خوارد مرد. ئەو ژنە جوولەکەی ژەهرەکەی پیا کرد بوو ناوی زەینەب بوو کوشتی. ئەو بەڵگەی کە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی لەگەڵی بوون دەستیان کرد بە خواردنی، لێیان نەپرسین ئایا ئەوەیان لێ کردوەتەوە کە بڕوایان وایە حەرامە لە بەزو پیوەکەی یان لێیان نەکردۆتەوە؟[3] وە ئەفەرموێت: ﴿وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ﴾ خواردنی ئێوەیش بۆ ئەهلی

---

[1] الطبري (٩/٧٣/٥٧٧).

[2] فتح الباري (٩/٥٥٢).

[3] فتح الباري (٩/٥٦٩).

کتێب حەڵاڵە. واتە: بۆ ئێوەش ڕەوایە کە خواردنیان بدەنێ لە سەربڕاوی خۆتان. ئەمە هەواڵ نیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بڕیارە لەلایەن ئەوانەوە دراوە. بەڵکو لەوانەیە هەواڵ بێ لەسەری ئەوەی کە فەرمانیان پێ کرابێ. بە خواردنی هەموو گۆشتێ کە ناوی خودای لەسەر هێنرا بێ. ئیتر ئەوە هی خۆیانە یان هەر ئاینێکی ترە، بەڵام یەکەم ڕوون‌و ئاشکراترە لە مانادا. واتە: ئێوەش بۆتان هەیە خواردنیان پێ بدەن لە سەربڕاوەکانتان وەك چۆن ئێوە لە سەربڕاوەکانی ئەوانتان خوارد، ئەمەیش شێوازێکە لە شێوازی پاداشت دانەوەو ڕێزلێنانی بەرانبەر. وەك پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکی خۆی کردە بەری عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول کاتێ کە مرد بەو پۆشاکەوە خستیە ناو گۆڕو ئەسپاردەی کرد، وەك چۆن ئەو کاتێ عەبباس گەیشتە مەدینە پۆشاکەکەی خۆی کردە بەری، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەوە، ئەو پاداشتەی دایەوە. بەڵام لە بارەی ئەو فەرموودەوە کە ئەفەرموێت: (خاوەن باوەڕ نەبێ هاوەڵی مەکە، لەخواترسیش نەبێ خواردنت نەخوات)[1] ئەمە هاندانە بۆ چاکەو تێکەڵاوی پیاوچاکان‌و لە خواترسان. والله أعلم.

## دروستی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی ئازادو داوێن پاك لە ئەهلی کتێب

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ ژنانی خاوەن باوەڕو ئازادو داوێن پاکیشتان بۆ حەڵاڵە. واتە: بۆتان ڕەوایە کە ژنانی خاوەن باوەڕو ئازادو داوێن پاك بخوازن‌و بیکەنە هاوسەری خۆتان، مەبەست بەم ئایەتە ژنانی داوێن پاکە کە تووشی داوێن پیسی نەبوبێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾[2] ئەوانەش با لە کەنیزانی داوێن پاك بن، نە داوێن پیس، لە ژێرەوە دۆستی نێرینەیان نەبێ. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هاوسەرگیری بەلاوە چاك نیە لەگەڵ گاورداو دەڵێ من هیچ شەریك دانانێ بە گەورەتر نازانم لەوەی کە ئەو ژنە دەڵێت پەروەردگاری ئەو عیسایە خودای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾[3] ژنانی بت پەرست مەخوازن هەتا بڕوا دێنن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبومالیکی غەفاریەوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: کە ئەم ئایەتە هاتو خوارەوە: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ ژنانی بت پەرست مەخوازن هەتا بڕوا دێنن، دەستەوسان‌و ناڕەحەت بوون هەتا ئەم ئایەتە لە دوایەوە هاتە خوارەوە: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ئەو ژنە داوێن پاکانەش کە بەر

---

[1] أبوداود (١٦٧/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] النساء (٢٥).

[3] البقرة (٢٢١).

لە ئێوە کتێبیان پێدراوە، ئەم ئایەتە، ئایەتەکەی سورەتی بەقەرەی تایبەت مەند کردوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾، خۆ ئەگەر گوترا: بە چوونە سەری ژنی ئەهلی کتێب لە گشتگیریەکدا. ئەگینا هیچ دژایەتیەك لەنێوان ئەم ئایەتەو ئایەتەدا نیە، چونکە ئەهلی کتێب جیابونەتەوە لە باس کردنیاندا لە بت پەرستان لە چەند شوێنی تردا جگە لێرە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾[1] ئەو ئەهلی کتێبانەی کە لە دین دەرچوون‌و لەگەڵ ئەوانەی بت پەرست بوون، نەدەترازان هەتا بەڵگەی ڕوونیان بۆ هات. وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟﴾[2] بەو کەسانە بوونە ئەهلی کتێب‌و بەو کەسانەش کە نەزانن بڵێ: ئایا ئێوەش وەك ئێمە خۆتان هەر بە خوا سپاردووە، جا ئەگەر خۆیان سپاردبوو، ئەوا کەوتونەتە سەر ڕێگا. وە ئەفەرموێت: ﴿إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ بەو مەرجە کە مارەییەکانیان بدەنێ. واتە: وەك ئەوان کە ئازادو داوێن پاکن ئێوەش بە ئارەزوومەندانە مارەییەکەیان بدەنێ. جابیری کوڕی عەبدوڵڵاو عامیری شەعبی‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و حەسەنی بەسری فەتوایان داوەو گوتویانە: ئەگەر پیاوێ ژنێکی مارە کرد، ژنەکە داوێن پیسی کرد پێش ئەوەی پیاوەکە بچێتە لای دەبێ لە یەکتری جیابکرێنەوە[3] ئەو مارەییەش بۆی خەرج کردوە دەگەڕێتەوە بۆی. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لێیانەوە ﴿مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ﴾ خۆشتان دەبێ داوێن پاك بن‌و نە داوێن پیس. دۆستی مێینەشتان لە ژێرەوە نەبێ. وەك چۆن پاك داوێنی بە مەرج گیراوە لە ژناندا، هەر بەو شێوەیەش بە مەرج گیراوە بۆ پیاوانیش. دەبێ ئەو پیاوەش داوێن پاك بێ، بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ واتە: ئەو داوێن پیسانەی کە خۆیان لە گوناە ناپارێزن‌و هەر بۆیان لوا دەست ئەدەنە کاری خراپ‌و داوێن پیسی ﴿وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ﴾ دۆستی مێینەشیان لە ژێرەوە نەبێ. واتە: لەو کەسانەش نەبن کە لە ژێرەوە ئەویندار دەکەن، لەگەڵ مێینە داواکاری داوێن پیسی لەگەڵدا دەکەن، وەك لە سورەتی نیسائدا لە پێشەوە باس کرا وەك یەکە.

---

[1] البينة (١).

[2] آل عمران (٢٠).

[3] الطبري (٩/٥٨٥-٥٨٦).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ۝٦﴾

**فەرماندان بە دەستنوێژ گرتن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ کردن. ئەم ئایەتە فەرمان دەکات بە دەستنوێژ گرتن لەکاتی هەڵسان بۆ نوێژ کردن. ئەم دەستنوێژە بۆ کەسێ دەستنوێژی نەبێ پێویستە، بەڵام بۆ کەسێ دەستنوێژی هەبێ سونەتە. گوتراوە: لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە فەرمان دراوە بە دەستنوێژ گرتن بۆ هەموو نوێژێ‌و واجب بووە، پاشان نەسخ بوتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە (بُرَیدة) لە باوکیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژی دەگرت: لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا دەستنوێژی گرت‌و دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو فوفوکەیداو نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کرد. عومەر پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ شتێکت کرد کە هەرگیز نەتکردوە. فەرمووی: (من ئەنقەست ئەوەم کردوە ئەی عومەر)[1] هەر بەم شێوەیە موسلیم‌و خاوەنی فەرموودەکانی تریش ڕیوایەتیان کردوە[2] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و سەحیحە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە کە فەزلی کوڕی مویەشیر بۆی گێڕاوینەتەوە دەڵێت: جابیری کوڕی عەبدوڵڵام بینی نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ دەکرد. ئەگەر میزی بکردایە یان دەستنوێژی نەمایە، دەستنوێژی دەگرت‌و بە زیادەی دەستنوێژەکەی دەستی دەهێنا بە هەردوو فوفەکەیدا. گوتم: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا، ئایا شتێکە بە بۆچوونی خۆت دەیکەی؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەرم (ﷺ) بینی دەیکرد.[3] ئیبنوماجەیش هەر وا ڕیوایەتی کردوە[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە گوتی: ئایا پێت بڵێم دەستنوێژی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بۆ هەموو

---

[1] أحمد (٥/٣٥٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (١/٢٣٢)، أبوداود (١/١٣٠)، تحفة الاحوذي (١/١٩٤)، النسائي (١/٨٦)، إبن ماجة (١/١٧٠).

[3] الطبري (١٠/١١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] إبن ماجة (١/١٧٠)، فەرموودەیەکی حەسەنەو فەرموودەی تریش پشتگیری دەکات.

نوێژێ دەستنوێژی بوبێ یان نەیبوبێ (دەستنوێژی گرتوە) لەبەر چی بووە؟ گوتی: ئەسمائی (أسماء) کچی زەیدی کوڕی خەتان لە عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلەی کوڕی ئەبوعامیرەوە (الغسیل) حەنزەلە لەکاتی غەزادا لەشی پاك نەبوو شەهید کرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فریشتەکان شۆردویانە) بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا بە دەستنوێژ گرتن بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بوبێ یا نەبوبێ، کاتێ ئەوەی بە لاوە گران بوو، فەرمانی دا بە سیواك کردن بۆ هەموو نوێژێ، دەستنوێژی لەسەر هەڵگیرا مەگین دەستنوێژی شکا بێ گرتبێتی، عەبدوڵڵا بە خۆیدا ڕای دەنینی کە دەتوانێ (بۆ هەموو نوێژێ) دەستنوێژ بگرێ (بۆیە بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژی دەگرت هەتا مرد[1] ئەبوداوودیش هەر وا ڕیوایەتی کردوە.[2] ئیبنوعومەر کە ئەمەی کردوەو بەردەوام بوە لەسەر دەستنوێژ گرتن بۆ هەموو نوێژێ، لەبەر ئەوە سونەت بووە، وەك زانایان کۆ دەنگیان هەیە لەسەری کە سونەتە. ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەرئاو هاتە دەر خواردنێکیان بۆ هێناو گوتیان: ئایا ئاوی دەستنوێژت بۆ نەهێنین؟ فەرمووی: (بێگومان من فەرمانم پێدراوە بە دەستنوێژ گرتن کاتێ کە هەڵسام بۆ نوێژ)[3] تیرمیزیو نەسائیش هەر وا ڕیوایەتیان کردوە[4] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنە. موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: ئێمە لەلای پێغەمبەر بوین (ﷺ) چووە سەر ئاو، پاشان گەڕاوە، خواردنێکی بۆ هێنرا، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا دەستنوێژ ناگری؟ فەرمووی: (لەبەر چی؟ ئایا نوێژ دەکەم تا دەستنوێژ بکرم[5]؟).

## نیەت هێنانو بسم الله کردن لە دەستنوێژ گرتندا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ دەمو چاوتان بشۆن. ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ بەڵگەیە لەسەر پێویستی نیەت (النیة) هێنان لە کاتی دەستنوێژدا، چونکە دەقەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، واتە: ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ کردن دەمو چاوتان بشۆن بۆی، وەك عەرەب گوتویانە: ئەگەر ئەمیرتان چاو پێکەوت هەڵسن. واتە: لەبەری هەڵسن. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (کردارەکان بەپێی نیەتن، هەرکەس بەپێی

---

[1] أحمد (٥/٢٢٥)، حاکم لەسەر مەرجی موسلیم بە ڕاستی داناوە.

[2] أبوداود (١/٤١)، حاکم لەسەر مەرجی موسلیم بە ڕاستی داناوە.

[3] أبوداود (٤/٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] تحفة الاحوذي (٥/٥٧٩)، النسائي (١/٨٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] مسلم (١/٢٨٣).

نیەتی خۆیەتی)[1] (واتە: هەرکەسە بەپێی نیەتی پاداشت ئەدرێتەوە) سونەتە بەر لە شۆردنی دەمو چاو ناوی خودا بهێنرێ لە دەستنوێژدا. بەپێی ئەم فەرموودەیە کە بە ڕێگەیەکی باش هاتوە لە کۆڵێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (دەستنوێژ گرتن نیە بۆ کەسێ کە ناوی خودای لەسەر نەهێنێ)[2] وە سونەتە کە هەردوو دەستی بشوات پێش ئەوەی بیخاتە ناو دەفرەکە، وە لە کاتی هەڵسان لە خەو پێویستترە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەڵسا با دەستی نەخاتە ناو دەفرەکە هەتا لە پێشدا سێ جار نەیشوات، چونکە نازانێ (لە کاتی خەودا) دەستی لە کوێدا بووە)[3] سنووری دەمو چاو لەلای زانایان لە نێوان ڕووانی مووی سەرەوەیە (سەری ڕووتاوەو ریشی درێژ ڕەچاو ناکرێ) هەتا کۆتایی چەناکە بە درێژیو لە گوێچکەوە بۆ گوێچکە بە پانی.

## دەست خستنە ناو ڕیش

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبووائیلەوە دەڵێت: عوسمانم بینی دەستنوێژی دەگرت، فەرموودەکەی باس کردو دەڵێت: سێ جار دەستی خستە ناو ڕیشی کاتێ دەمو چاوی دەشۆرد، پاشان گوتی: پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ) ئەوەی کرد کە منتان بینی کردم[4] تیرمیزیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردوە[5] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو سەحیحە. بوخاریش بە حەسەنی داناوە.

## چۆنیەتی دەستنوێژ گرتن

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە دەستنوێژی گرتوە دەمو چاوی شۆردوە پاشان مشتێ ئاوی هەڵگرتوەو ڕایداوەتە دەمو لووتی، پاشان مشتێ تری هەڵگرتوەو ئاواو ئاوای کردوە، واتە: بردویەتی بۆ لای دەستەکەی تریو دەمو چاوی پێ شۆردوە، پاشان مشتێ ئاوی هەڵگرتوەو دەستی ڕاستی پێ شۆردوە، پاشان مشتێ ئاوی هەڵگرتوەو دەستی چەپی پێ شۆردوە. پاشان دەستی (تەڕی) هێناوە بەسەریدا، پاشان مشتێ ئاوی هەڵگرتوە کردویەتی بەسەر پێی ڕاستیدا هەتا شوردویەتی، پاشان مشتێ ئاوی هەڵگرتوە پێی چەپی پێ شۆردوە، پاشان دەڵێت: ئا بەم

[1] فتح الباري (١٥/١)، مسلم (١٥١٥/٣).
[2] أبوداود (٧٥/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[3] فتح الباري (٣١٦/١)، مسلم (٢٣٣).
[4] جامع المسانيد و السنن (١٩٧/١٧)، فەرموودەیەکی باشە.
[5] تحفة الاحوذي (١٣٣/١)، إبن ماجة (١٤٨/١)، فەرمووودەیەکی باشە.

شێوەیە پێغەمبەری خودام بینیوە (ﷺ) واتە: دەستنوێژی دەگرت[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾ دەستەکانتان تا سەر ئانیشك بشۆن. واتە: دەستتان لەگەڵ ئانیشك بشۆن. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾[3]ماڵی ئەوان تێکەڵی ماڵی خۆتان مەکەن، کە تاوانێکی گەورەیە. سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە دەستنوێژ دەگرێ لە بازوییەوە دەست پێبکاتو لەگەڵ هەردوو دەستیدا بیشوات، وەك بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان ئوممەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێ ناوچاوان جوانو دەستو پێ سپین بەهۆی دەستنوێژ گرتنەوە، هەر کەسێك لە ئێوە دەتوانێ با زیاتر ناوچاوی جوان بکاتو دەستو پێی سپی بکات)[4] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: (جوانیو ڕازاوەیی لە ڕۆژی قیامەتدا لە خاوەن باوەڕدا دەگاتە ئەو شوێنەی ئاوی دەستنوێژی پێدەگات)[5]

﴿وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ﴾ دەستتان بە تەڕی بێنن بە سەرتاندا. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ڕێگەی مالیکەوە لە عەمری کوڕی یەحیای مازینەوە لە باوکیەوە کە پیاوێ گوتی بە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاسیم، کە باپیری عەمری کوڕی یەحیا بوو. یەکێکیش بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ): ئایا دەتوانی پیشانم بدەی کە چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستنوێژی گرتوە؟ عەبدوڵڵای کوڕی زەید گوتی: بەڵێ، بانگی ئاوی دەستنوێژی کرد، لە ئاوەکەی کرد بە دەستیدا، دووجار دووجار دەستەکانی شورد، پاشان ئاوی کرد بە دەمو لوتیدا سێ جار، سێ جار دەمو چاوی شورد، پاشان هەردوو دەستی هەتا سەر ئانیشکی دوو جار شۆرد، پاشان هەردوو دەستی (بە تەڕی) هێنا بەسەریدا بە پێشدا دەیبردنو بە دوایشدا، لە پێش سەریەوە دەستی پێدەکرد پاشان دەیبردنەوە بۆ پشتی سەری. پاشان وەریگێڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەیە دەستی پێکردبوون پاشان هەردوو پێی دەشۆری.[6] وە لە فەرموودەکەی (عبدخير)وە کە ڕیوایەتی کردوە لە عەلیەوە لە شێوەی

---

[1] أحمد (٢٦٨/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢٩٠/١).

[3] النساء (٢).

[4] فتح الباري (٢٨٣/١).

[5] مسلم (٢١٩/١).

[6] فتح الباري (٣٤٧/١)، مسلم (٢١٩/١).

دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وەك ئەوە[1] ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە مەعاویەو میقدامی کوڕی مەعدیبەکریبەوە (المقدام بن معديكرب) لە شێوازی دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەری خوداوە هەر بەو شێوەیە[2] ئەم فەرموودانە بەلگەن لەسەر ئەوە، کە دەبێ بە تەواوی دەست بهێنرێ بە هەموو سەردا (بە تەڕی) وەك لە مەزهەبی ئیمامی مالیكو ئەحمەددا هاتوە. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە حومرانی کوڕی ئەبانەوە دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففانم بینی دەستنوێژی دەگرت، سێ جار ئاوی کرد بە هەردوو دەستیداو شۆردنی، پاشان ئاوی لە دەمو لووتی ڕادا، پاشان سێ جار دەمو چاوی شۆرد، پاشان دەستی ڕاستی شۆرد هەتا ئانیشکی سێ جار، پاشان دەستی چەپی هەر بەو شێوەیە شۆرد، پاشان دەستی هێنا بەسەریدا، پاشان پێی ڕاستی سێ جار شۆرد، پاشان پێی چەپیشی هەر بەو شێوەیە شۆرد، پاشان گوتی: پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی وەك ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرتوەو پاشان فەرموویەتی: (هەرکەس وەك ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، پاشان هەڵسێ دوو ڕکات نوێژ بکات، دالغە لێنەدا لە نوێژەکەدا (خودا) لە هەموو گوناهەکانی ڕابردوی دەبورێت)[3] بوخاریو موسلیمیش لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانە[4] وە لە سونەنی ئەبوداوود دا هاتوە لە عوسمانەوە لە شێوەی دەستنوێژدا: یەك جار دەستی هێناوە بەسەریدا[5].

## شۆردنی هەردوو پێ واجیبە نەك دەست پێدا هێنان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ پێکانتان تا هەردوو قولەپێ (بشۆن) ﴿وَأَرْجُلَكُمْ﴾ بە مەنسوب (نَصْب) عەتف کراوەتە سەر ﴿فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ﴾ واتە: دەمو چاوتانو هەردوو دەستتان تا ئانیشكو هەردوو پێتان تا قولەپێ بشۆن ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە بە (أرجُلَكَم)ی خوێندۆتەوەو گوتویەتی: گەڕاوەتەوە بۆ (الغسل) بۆ شۆردنەکە.[6] وە ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو عوروەو عەتاو عیکرمەو حەسەنو موجاهیدو ئیبراهیمو زەحاكو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیانو زوهریو ئیبراهیمی تەیمیش (التيمي) هەر وایان گوتوە.[7] ئەمە خوێندنەوەیەکی دیارو ئاشکرایە لەسەر پێویستی (وجوب) شۆردنی

---

[1] أبوداود (٨٢/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أبوداود (٨٨/١-٨٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] عبدالرزاق (٤٤/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٣١١/١)، مسلم (٢٠٥).

[5] أبوداود (٨٠/١-٨٢)، سەنەدەکانی حەسەنە، پیاوەکانی جێی متمانەن، لە وێنەی ئەم فەرموودەیە زۆر هاتوە.

[6] الطبري (٥٥/١٠).

[7] الطبري (٥٤/١٠-٥٧).

هەردوو پێ، وەك زانایانی پێشینە گوتویانە، وە ئەم خوێندنەوەیە کە بە کەسر (الخفض) هاتوە بۆ لەیەك چوون و گونجانی دەقە، وەك عەرەبەکان دەڵێن: (جُحْرُ ضبٍّ خربٍ) وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿عَلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾[1] بەرگە نەرم ناسك سەوزو پۆشاکی ئاورێشمین لەبەریاندایە. (ئەمە خوێندنەوەی ئەعمەش و ئیبنووسابۆ (وثاب) حەمزەو کەسائیە) ئەمە لە زمانی عەرەبیدا دروستەو دیارو ئاشکرایە.

## باسی ئەو فەرموودانەی کە هاتوون لە بارەی شۆرینی هەردوو پێدا و دەبێ هەر بشورێ

لە پێشەوە فەرموودەکەی گەورەی موسوڵمانان عوسمان و عەلی و (ڕەزای خوایان لێبێ) ئیبنوعەبباس و مەعاویە و عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاسیم و میقدادی کوڕی مەعدیبەکریبەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەردوو پێی شۆریوە لە دەستنوێژ گرتنیدا جارێ یان دوو جار یان سێ جار بەپێی جیاوازی ڕیوایەتەکانیان. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەفەرێکدا کە کردمان دوا کەوت لێمان، پێمان گەیشت، نوێژ تەنگاوی کردبوین (نوێژی عەسر) واتە: وەختەکەی کەمی مابوو. ئێمەیش دەستنوێژمان دەگرت و دەستمان دەهێنا بە پێکانماندا، بە بەرزترین دەنگی بانگە دەکرد: (بە باشی و تەواوی دەستنوێژ بگرن هاوار بۆ ئەوانەی قولەپێیان ناشۆرن لە ئاگر (یان کەمتەرخەمی دەکەن لە شۆردنی پێیان))[2] دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە[3] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عائیشەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بە چاکی و تەواوی دەستنوێژ بگرن هاوار بۆ ئەوانەی کەمتەرخەمی دەکەن (یان قولەپێیان ناشۆرن) لە ئاگر) وە لە عەبدوڵلای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئەوە (جَزْء) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (هاوار بۆ ئەو کەسانە قولەپێ و ناوسکەی (ژێر) پێیان ناشۆرن لە ئاگر)[4] (واتە: ئەوانەی کە پێیان باش ناشۆرن دەچنە ناو ئاگر) بەیهەقی و حاکیم ڕیوایەتیان کردوە بە سەنەدی ڕاست. موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە: کە پیاوێ دەستنوێژی گرت، جێگەی نینۆکێکی لە پێیدا بەجێهێشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چاوی پێی کەوت فەرمووی: (بگەڕێرەوە دەستنوێژەکەت باش بکرە)[5] بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پیاوێ هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی گرت

---

[1] الانسان (٢١).

[2] فتح الباري (١/٣١٩)، مسلم (١/٢١٣).

[3] فتح الباري (١/٣٢١)، مسلم (١/٢١٥).

[4] مسلم (١/٢١٣).

[5] مسلم (١/٢١٥).

بە ئەندازەی نینۆکێکی لە پێی وازلێهێنا نەیشۆرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی گوت: (بگەڕێرەوە دەستنوێژەکەت باش بگرە)[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد سەری پێی بریسکەیەکی (سپیایەکی) پێوە دیار بوو بە ئەندازەی پەنجایی یە (درهەم) ئاوی بەرنەکەوتبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکرد دەستنوێژەکە بگرێتەوە[2] ئەبوداوودیش ڕیوایەتی کردوە بەلام ئەمەی بۆ زیاد کردوە (نوێژەکەیش بکاتەوە)[3] ئەم سەنەدە چاکو بەهێزو سەحیحە والله أعلم.

## فەرماندان بە دەست خستنە نێو پەنجەکان

لە فەرموودەکەی حومرانەوە (حُمران) لە عوسمانەوە لە شێوازی دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دەخستە ناو پەنجەکانیەوە[4] خاوەنی فەرموودەکان (السنن) لە لەقیتی (لقیط) کوڕی سەبرەوە گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی دەستنوێژم بۆ بکە. فەرمووی: (جوانو بە تەواوی دەستنوێژ بگرە دەست بخەرە نێوان پەنجەکانت زۆر چاك ئاو ڕادەرە دەمت مەگێن (کاتێ) کە تۆ بەڕۆژو بیت)[5] (واتە: کاتێ بەڕۆژوو بوی زۆر ئاو ڕامەدەرە دەمت).

## دەست هێنان بەسەر خوفا (الخفین) سونەتێکی نەگۆڕو جێگیرە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەوسی کوڕی ئەبونەوسەوە گوتی: پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ) دەستنوێژی دەگرت دەستی هێنا بەسەر نەعلەکانیدا پاشان هەڵسا بۆ نوێژ کردن.[6] ئەبوداوودیش هەر ڕیوایەتی کردوە لە ئەوسی کوڕی ئەبونەوسەوە گوتی: پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی بەناو دارو درەختی خەڵکێکدا تێپەڕی (سباط) میزی کردو دەستنوێژی گرتو دەستی هێنا بەسەر هەردوو نەعلو هەردوو پێیدا[7] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلیەوە (البجلي) گوتی: من دوای هاتنە خوارەوەی سورەتی مائیدە موسوڵمان بووم، وە من پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ) دوای ئەوەی کە موسوڵمان بووم دەستی دەهێنا بەسەر

---

[1] البیهقي (٧٠/١)، فەرموودەیەکی باشە.

[2] أحمد (٤٢٤/٣)، فەرموودەیەکی چاکو بەهێزو سەحیحە.

[3] أبوداود (١٢١/١)، فەرموودەیەکی چاکو بەهێزو سەحیحە.

[4] مجمع الزوائد (٢٣٥/١)، فەرموودەیەکی حەسەنو سەحیحە.

[5] أبوداود (١٢١/١)، تحفة الاحوذي (١٤٩/١)، النسائي (٧٩/١)، إبن ماجة (١٤٢/١)، تیرمیزی گوتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[6] أحمد (٨/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] أبوداود (١١٣/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

خوفەکانیدا[1] تەنیا ئەحمەد خۆی هێناویەتی. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە هەممامەوە (همّام) گوتی: جەریر میزی کردو پاشان دەستنوێژی گرتو دەستی هێنا بەسەر خوفەکانیدا، پێی گوترا: ئایا تۆ وا دەکەی؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ) میزی کردو پاشان دەستنوێژی گرتو پاشان دەستی هێنا بەسەر خوفەکانیدا. ئەعمەش گوتی: ئیبراهیم گوتی: ئەم فەرموودە سەرنجی ڕاکێشا بوین، چونکە موسوڵمان بوونی جەریر دوای هاتنەخوارەوەی سورەتی مائیدە بوو. ئەمە وتەی موسلیمە. وە بە دەماو دەم (التواتر) هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بە کردارو گفتار لەسەر بەردەوامی دەست هێنان بەسەر خوفدا لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ).

## فەرماندان بۆ تەیەمم کردن لە کاتی نەبونی ئاوداو بۆ نەخۆشی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ ئەگەر تووشی لەش پیسی بوون، خۆتان پاك بکەنەوە. ئەگەر نەخۆش یان ڕێبوار بوون یان یەکێکتان لەسەر پێش ئاو دێتەوە یان لەگەڵ ژنان وە یەك کەوتن‌و دەستتان بە ئاو نەگەیشت، بە تۆزی پاکی سەر زەوی دەم‌و چاوو دەستەکانی خۆتان بهەنوون (تۆزاوی کەن) ئەمانە هەموو لە تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی نیسائدا لە پێشەوە باسی لێ کراوە، پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی تەیەمومیشمان هەر باس کرد. بوخاری‌و موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەدا ڕیوایەتیان کردوە لە عائیشەوە گوتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودادا (ﷺ) کە لە سەفەرێکدا دەچووین هەتا گەیشتینە بەیدا (یا) (ذات الجیش) لەوێ ملوانکەکەم پچڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) وەستا بۆ ئەوەی بیدۆزینەوە، خەڵکەکەیش وەستان، لەو جێگەیەشدا نە ئاو هەبوو نە خۆشیان ئاویان پێ بوو، خەڵکەکە چوون بۆ لای ئەبوبەکر گوتیان: نابینی عائیشەی کچت چی کرد؟ پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەو خەڵکەی لێرە وەستاندوە (بەند کردوە) نە لەسەر ئاوێکین‌و نە ئاوێکیشمان پێیە؟ ئەبوبەکر هات‌و لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) سەری خستبوە سەر ڕانم‌و خەوی لێ کەوتبوو، گوتی: پێغەمبەرو (ﷺ) ئەو خەڵکەت بۆ لێرەدا گیر داوە، نە شوێنەکە ئاوی لێیەو نە ئاویان پێیە؟ عائیشە گوتی: ئەبوبەکر زۆر سەرزەنشتی کردم (چەندە خوا حەز بکات) خێرا خێرا سیخورمەی دەدا لە کەلەکەم منیش لەبەر ئەوەی سەری پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ڕانم بوو نەدەجولام، کە ڕۆژ بوەوە هەڵسا ئاو نەبوو بۆ دەستنوێژ گرتن، هەر بۆیە خودای گەورە ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوەو کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ کردن دەم‌و چاوتان بشۆرن (تا کۆتایی ئایەتەکە) هەموو تیەمومیان کرد. ئوسەیدی کوڕی حوزەیر (أُسید بن

---

[1] أحمد (٤/٣٦٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

حچیر) کە یەکێك بوو لە نەقیبەکان گوتی: ئەی بنەماڵەی ئەبوبەکر: ئەمە یەکەم بەرەکەت نیە کە خودا بەهۆی ئێوەوە پێی داوین. عائیشە گوتی: کاتێ وشترەکەمان هەڵسا ملوانکەکەم لە ژێریا بوو دۆزیمانەوە.[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ خودا نایەوێ بتانخاتە تەنگانەوە. لەبەر ئەوە ئاسانکاری بۆ کردوین‌و گرانی نەکردوە لەسەرتان بەڵکو تەیەمومی بۆ حەڵاڵ کردون لە کاتی نەخۆشیداو نەبونی ئاودا، بۆ ئەوەی ئاسانکاریتان بۆ بکات‌و بەر بەزەیی خۆیتان بخات. خستویەتیە جێگەی ئاو مەگەر لە هەندێ ڕوەوە نەبێ وەك لە پێشەوە ڕوون کراوەتەوە. لە کتێبی (الاحكام الكبيرا) باس کراوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەلام دەیەوێت خاوێنتان بکاتەوەو بە تەواوی چاکەتان دەربارە بکات، بەڵکو شوکرانە بژێر بن. لەسەر ئەو هەموو ئاسانکاری‌و سۆزو بەزەیی‌و لێبوردەییە بەرانبەرتان دەیکات.

### دووعای دوای دەستنوێژ گرتن

فەرموودە هاتوە بۆ هەڵنان لەسەر پاڕانەوەو دووعا کردن لە دوای دەستنوێژ گرتن، هەتا ئەو کەسەی کە پێی هەڵدەسێ خودا لە ڕیزی پاك‌و خاوێنەکان دیناون بەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزە کە فەرموویەتی. وەك ئیمامی ئەحمەدو موسلیم‌و خاوەن فەرموودەکانی تریش ڕیوایەتیان کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە گوتی: ئێمە وشترمان بەخێو دەکرد، نۆرەی من هات‌و ئێوارەیەك گێڕامنەوە بۆ مۆڵگەکەیان، گەیشتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پێوە ڕاوەستا بوو قسەی بۆ خەڵك دەکرد، گەیشتم بەو قسەیەی کە ئەیفەرموو: (هیچ موسوڵمانێك نیە کە دەستنوێژ بگرێ‌و بە باشی بیگرێت، پاشان هەڵسێ‌و دوو ڕکات نوێژ بکات، بە دڵ‌و بە گیان لەناو نوێژەکەیدا بێت، مەگین بەهەشت مسۆگەر دەبێت بۆی) گوتی: منیش گوتم: ئای ئەم مژدەیە چەند خۆش بوو، لەو کاتەدا لەبەر دەستمدا کەسێك گوتی: من چاوم لێت بوو کە ئێستا هاتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت، بە باشی‌و بە تەواوی دەستنوێژەکەی بگرێت، پاشان بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمداً عبده و رسوله) ئەوە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە کامیان بیەوێت دەچێتە ژورەوە[2]. وتەکە وتەی موسلیمە.

---

[1] فتح الباري (١٢١/٨).

[2] أحمد (١٥٣/٤)، مسلم (٢٠٩/١)، أبوداود (١١٨/١)، النسائي (٩٢/١)، إبن ماجة (١٥٩/١).

## ڕێزو گەورەیی دەستنوێژ

مالیك ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (ئەگەر بەندەی موسوڵمان (یا باوەڕدار) دەستنوێژی گرت، دەم‌و چاوی شۆرد، هەر گوناهێك بە چاو كردویەتی لەگەڵ ئاوەكەدا دەڕوات، یا لەگەڵ دوا تنۆكی ئاوەكەدا. ئەگەر دەستەكانی شۆرد هەموو ئەو گوناهانەی بە دەستی كردویەتی لەگەڵ ئاوەكەدا دەڕوات، یا لەگەڵ دوا تنۆكی ئاوەكەدا، ئەگەر قاچەكانی شۆرد ئەو گوناهانەی بەو قاچانەی بۆی چووە لەگەڵ ئاوەكەدا دەڕوات، یا لەگەڵ دوا تنۆكی ئاوەكەدا، هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناه).[1] موسلیمیش ڕیوایەتی كردوە[2] موسلیم لە سەحیحەكەدا لە ئەبومالیكی ئەشعەریەوە ڕیوایەتی كردوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پاك‌و خاوێنی بەشێكی ئیمانە (الحمد لله) تەرازو بڕ دەكان (سبحان الله و الحمد لله) نێوانی ئاسمانەكان‌و زەوی پڕ دەكەن، نوێژ ڕوناكی یە، خێر كردن ڕاستی ئیمان‌و گوێڕایەڵی بۆ خوا سەلماندنە، ئارام گرتن ڕۆشنایی یە، قورئانیش بەڵگەیە بۆت یان لەسەرت، خەڵكی هەموویان بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن بەوەش یان خۆی ڕزگار دەكات یان خۆی تیا دەبات)[3] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئیبنوعومەرەوە گوتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (خودا خێری (سەدەقەی)ماڵی بە ناهەق بە دەست هاتوو وەرناگیرێت، وە نوێژی بێ دەستنوێژیش وەرناگیرێت)[4].

﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُم بِهِ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾﴾

---

[1] الموطأ (٣٢/١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] مسلم (٢١٥/١).

[3] مسلم (٢٠٣/١).

[4] مسلم (٢٠٤/١).

## وەبیر هێنانەوەی چاکەی خودا لە ناردنی پەیام و ئاینی ئیسلام

خودای مەزن چاکەی خۆی وەبیر بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی دەهێنێتەوە کە ئەم ئاینە پیرۆزەی بۆ ناردوون و کردویەتی بە بەرنامەی ژیانیان، ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەیشی بۆ ڕەوانە کردون و بەڵێنیشی لێ وەرگرتوون کە پەیمانی بدەنێ کە شوێنی بکەون و یارمەتی بدەن و پشتیوانی لێ بکەن، هەڵسن بە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوداو ئاینەکەی بڵاو بکەنەوە، ئەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا﴾ ئەو چاکەیە لەبیر مەکەن کە خودا دەربارەی کردوون و ئەو پەیمانەتان لەبیر بێ کە لەگەڵ خواتان بەستوەو گوتوتانە: بیستمان و بەرفەرمانین. ئەمە ئەو پەیمانەیە کە بەستبویان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کاتی موسوڵمان بونیاندا وەك گوتیان: پەیمانمان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی لە خۆشیمان و لە ناخۆشیماندا، با فەرمانڕەواکانیش هەندێ لە مافەکانی بەرن بۆ خۆیان، پەیمانمان دا کە ململانێ نەکەین لەگەڵ کەسێ کە شایستەی فەرمانڕەوایی بێت، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾[1] دەی چیتانە باوەڕ ناکەن بە خودا؟ کەچی پێغەمبەریش داواتان لێ دەکات. تا بە پەروەردگاری خۆتان باوەڕ بێنن، ئەگەر باوەڕتان هەبێ ئێوە پەیمانتان پێداوە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە: ئەمە وەبیرهێنانەوەیەکە بۆ جوولەکەکان بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانانەی کە لێیان وەرگیرا کە شوێن موحەممەد بکەون و (ﷺ) ملکەچ بن بۆ پەیامەکەی.

پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە خواش بترسن. ئەمە جەخت کردنەوەو هەڵنانە لەسەر پابەند بوون بە لە خوا ترسیەوە لە هەموو کات و ساتێکدا، پاشان ئاگاداری کردوون کە ئاگای لەو شتانەیە دێت بەناو دڵیاندا لە نهێنی سرتەی دڵ و ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ هەرچی لەناو دڵیشتاندا بێ دەیزانێ.

## فەرماندان بە پابەند بوون بە دادوەرییەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ﴾ ئەی کەلی خاوەن باوەڕان بۆخوا ڕاست و دروست بن، واتە: لەبەر ڕەزامەندی خودا هەقبێژ بن، نەك لەبەر خەڵك و ناوبانگ دەرکردن ﴿شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ بە دادگەری شایەتی بدەن نەك بە ستەم و زۆر، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە گوتویەتی: باوکم خەڵاتێکی کردم. دایکم کە عەمرەی کچی

---

[1] الحديد (٨).

ڕەواحە بوو گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتی نەدات لەسەری هێنای بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا شایەتی بۆ بدات لەسەر خەلاتەکەم فەرمووی: (ئایا هەموو منداڵەکانت خەلات کردوە وەك ئەو) گوتی: نەخێر، فەرمووی: (لە خوا بترسن‌و دادوەری بکەن لە نێوان منداڵەکانتاندا) وە فەرمووی: (بەڕاستی من شایەتی نادەم لەسەر ستەم) باوکم گەڕایەوەو ئەو خەلاتەی گەڕاندەوە.[1]

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ دوژمنایەتی‌و قینی کۆمەڵێك هەڵتان نەنێ بە هەقانەت ڕەفتار نەکەن. بە یەکسانی‌و بێ جیاوازی لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتار کردن دەبێتە هۆی زیاتر نزیك بونەوە لە خۆپارێزی. واتە: دادگەر بن چونکە ئەوە دەبێتە هۆی زۆرتر نزیك بونەوە لە خوا ترسی تا وازلێهێنانی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ لە خواش بترسن چونکە لە هەر کارێ ئێوە دەیکەن خودا ئاگادارە. واتە: بەو زوانە لەو کارانەی کە ئێوە کردوتانە ئاگادارەو پاداشتتان ئەداتەوە، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێ سەندن، هەر بۆیە دوای ئەوە ئەفەرموێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٌ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەو کەسانەیش باوەڕدارو ئاکار چاکن خودا بەڵێنی پێداون کە لە گوناهیان دەبورێ‌و پاداشتێکی زۆر گەورەشیان پێ دەبەخشێ، کە بەهەشتە کە بەزەییەکە لەلایەن خۆیەوە بەرانبەر عەبدەکانی. چونکە بە کرداری خۆیان ئەو بەهەشتە وەدەس ناهێنن بەڵکو بە چاکەو فەزڵی خودا خۆیەتی. هەرچەندە هۆکاری گەیشتن بەو بەزەییە کردارەکانیانە. خودا خۆیشی ئەو کردارانەی کردوە بە هۆکار بۆ بەدەستهێنانی ئەو سۆزو بەزەیی‌و ڕێزو لێبوردەیی‌و ڕەزامەندیەی خۆی. هەموو شتێ هەر خۆی دەیکات‌و هەر بۆ ئەویشە، سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەوە.

پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَـٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ ئەوانەش کە خوانەناس بوون‌و نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ زانی، گشتیان هاوەڵی ئاگرن. ئەمەیش هەر لە دادگەری‌و لە کارزانی‌و بڕیاری خۆیەتی کە ستەم‌و ناهەقی تیا ناکات. وە هەر ئەویش دادوەرێکی ڕێك‌و ڕاست‌و لە کارزان‌و زۆر بە توانایە.

**دەست نەگەیشتنی خوانەناسان بە موسوڵمانان بەهرەیەکە لەلایەن خوداوە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، ئەو چاکەتان لەبیر

---

[1] فتح الباري (٥/٢٥٠)، مسلم (٢/١٢٤٢).

نەچێ کە خودا دەربارەی کردن. کە ئەو کاتە کۆمەڵێك لە دوژمنەکانتان ویستیان دەستدرێژیتان بۆ بکەن، خودا وای کرد کە ئەوان دەستیان پێتان نەگات. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شوێنێکدا دانیشت. خەڵکەکەیشی بڵاوەیان کردو خۆیان خستە ژێر سێبەری درەختە بەرزو گەورەکان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەکەکەی بە درەختێکدا هەڵواسی پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هات بۆ شمشێرەکەی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هەڵگرتو هەڵی کێشاو پاشان بەرەو ڕووی پێغەمبەری کردەوەو گوتی: کێ لە من دەتپارێزێ؟ فەرمووی: (خودای خاوەن دەسەڵاتو بەتوانا) پیاوە عەرەبە دەشتەکیەکە دوو جار سێ جار گوتی: کێ لە من دەتپارێزێ؟ پێغەمبەریش ئەیفەرموو: (خودا) گوتی: پیاوە عەرەبە دەشتەکیەکە شمشێرەکەی کردەوە بە لێلانەکەیدا. پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەکانی بانگ کردو دەنگو باسی عەرەبە دەشتەکیەکەی بۆ گێڕانەوە، پیاوە عەرەبەکە لە تەنیشتی دانیشتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) سزای نەدا، قەتادەیش هەر بەم شێوەیە باسی دەکات، کە کۆمەڵێ لە عەرەبەکان ویستیان پێغەمبەری خودا بکوژن (ﷺ) ئەم پیاوە عەرەبە دەشتەکیەیان نارد بیکوژێ ئەم ئایەتەی هێناوەو وای لێك داوەتەوە: ﴿ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ﴾[1] بەسەرهاتی ئەم عەرەبە دەشتەکیە (کە غەورەسی کوڕی حاریسە) (غَوْرَث بن الحارث) لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە[2] موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسارو موجاهیدو عیکرمەو کەسانی تریش دەڵێن ئەم ئایەتە لە بارەی بەنی نەزیرەوە (بني النضير) هاتوەتە خوارەوە کاتێ کە ویستیان دەسارەکە (الرص) بخەن بەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کاتێ هات بۆ لایان تا یارمەتیان بدات لە خوێنی (دية) عامیریەکاندا، کە عەمری کوڕی جەحاشیان (جحاش) کردبوو بە وەکیل لەو بارەیەوە. فەرمانیان پێدابوو بەو کارە هەڵسێو پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر ئەو دیوارەدا دانیشێنێو لەلای کۆ ببنەوەو ئەو دەسارە لە سەریەوە بخرێت بە سەریدا، خودای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد لەوەی کە گەرەکیانە بیکەن پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە، هاوەڵەکانیشی شوێنی کەوتن، خودای گەورە لەسەر ئەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ هەر لە خوا بترسن، سا هەرکەسێ باوەڕی بە خودا هەیە، خۆی هەر بە خودا بسپێرێ. واتە: هەرکەسێ خۆی بە خودا بسپێرێ، خودای بەسە بۆ هەر شتێ بیەوێت بیکات خودا دەیپارێزێ لە خراپەی خەڵکی. پاشان خودای گەورە فەرمانی دا بە

---

[1] عبدالرزاق (١٨٥/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] البخاري (٤١٣٥/٤١٣٦/٤١٣٩).

پێغەمبەر(ﷺ) کە زوو بچێتە سەریان، پێغەمبەر(ﷺ) گەمارۆی دان هەتا خۆیان دا بەدەستەوەو دەری کردن.

﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلَاةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنْتُمْ بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۚ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١٢) فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ ۙ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣) وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَىٰ أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللَّهُ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ (١٤)﴾

**بەڵێنی ئەهلی کتێبو نەفرین لێکردنیان لەسەر شکاندنی:**

کاتێ خودای مەزن فەرمانی دا بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی کە پارێزگاری لەو بەڵێنو پەیمانە بکەن کە خۆی لێی وەرگرتوون لەسەر زمانی بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) وە فەرمانیشی پێکردن لەسەر هەق هەڵسنو شایەتی ڕاستو دروست بدەن، وە ئەو چاکە دیارو نەدیارانەشی وەبیر هێنانەوە لەو هەقو شارەزاییە کە ڕێنمایی کردوون بۆی. پاشان باسی ئەوەیان بۆ دەکات کە چۆن ئەو بەڵێنو پەیمانەی لەو کەسانەی پێش ئەوان وەرگرتوە لە ئەهلی هەردوو کتێبەکە: جوولەکەو مەسیحیەکان، کاتێ بەڵێنو پەیمانەکانیان شکاند، وەبەر نەفرینی خۆی خستنو دەری کردنو دووری خستنەوە لە خۆی، پەردەیشی هێنا بەسەر دڵەکانیانداو شارەزا نەبوونو ئاینی ڕاستیان وەرنەگرت. کە ئەوە زانستی بەسوودو ئاکاری چاکە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ خودا لەگەڵ بەرەی ئیسرائیلدا پەیمانی بەست، هەر لە خۆیان دوانزە کەسمان بۆ سەرۆك هەڵبژارد. واتە: بوونە بەرپرس لەباتی هۆزەکانیان بۆ پەیمان وەرگرتن لەسەر گوێڕایەڵیو ملکەچی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیو کتێبەکەی. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش باسیان کردوە ئەمە لەو کاتەدا بووە کە مووسا

(سەلامی خوای لێبێ) ڕۆیشت بۆ شەڕی زۆردارەکان، خودای مەزن فەرمانی پێدا کە سەرکردەکان دانێ. لەسەر هەر هۆزێ سەرکردەیەك لە خۆیان دابنێ[1].

**سەرکردەکانی یارمەتیدەرەکان (الانصار) لە شەوی عەقەبەدا**

هەر بەو شێوەیەش کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانی وەرگرت لە ئەنساریەکان لە شەوی عەقەبەدا کە هاتبوون لە دوانزە سەرکردە: سیانیان لە ئەوسیەکان بوون کە بریتی بوون: ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو (أُسيد بن الحُضير) سەعیدی کوڕی خەیسەمەو ڕیفاعەی کوڕی عەبدولمونزیر و یُقال بدله: أبو الهيثم بن التَّيهان (ڕەزای خوای لێبێ) وە نۆ کەسیش لە خەزرەج کە بریتی بوون: لە ئەبوئەمامە ئەسعەدی کوڕی زورارەو سەعدی کوڕی ڕەبیعو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو ڕافیعی کوڕی مالیکی کوڕی عەجلانو بەرائی کوڕی مەعروورو عوبادەی کوڕی سامتو سەعدی کوڕی عوبادەو عەبدوڵڵای ئیبنوعەمری کوڕی حەرامو مونزیری کوڕی عەمری کوڕی حونەیس (ڕەزای خوایان لێبێ). کەعبی کوڕی مالیك لە شیعرێکیدا باسی کردوون. وەك چۆن ئیبنوئیسحاق ڕەحمەتی خوای لێبێ هێناویەتی[2] مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئەمانە سەرکردە بوون (نُقباء) بەسەر هۆزەکەیانەوە، بۆ ئەوەی ئەو فەرمانانەی پێغەمبەر ئەیدات پێیان ڕاگەیەنێت. هەر ئەوانە بوون کە بەڵێنو پەیمانەکانیان ئەدا لە برەتی هۆزەکەیان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵیو ملکەچی بۆ فەرمانەکانی. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي﴾ خودا فەرمووی: بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم، ئەگەر ئێوە لەسەر نوێژو زەکات دان هەمیشە بەردەوام بنو بڕواشتان بە پێغەمبەرەکانم ببێت. واتە: یارمەتیتان ئەدەمو پارێزگاریتان لێ دەکەمو ئاگام لێتانە، ئەگەر بڕوا بهێنن بەو پێغەمبەرانەی کە نیگاتان بۆ دەهێنن لەلایەن منەوەو ﴿وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ﴾ ڕێزیان بگرنو یارمەتیان بدەنو پشتگیریان لێ بکەن لەسەر ئەو هەقەو ﴿وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا﴾ وە ماڵی خۆتان بە دەستەوا (قەرز) بدەن بە (بەندەکانی) خودا بە شێوەیەکی چاكو جوان، واتە: ماڵ بەخشین لە ڕێی خوداو لەبەر ڕەزامەندی خودا ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ منیش کارە خراپەکانتان دەسڕمەوەو چاوپۆشیتان لێدەکەمو تۆڵەتان لێ ناسێنم. ﴿وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ﴾ دەتانخەمە ناو باغاتێك جۆباریان بە بەردا بڕوا. واتە: وەوەی لێتان قەدەغە بووە پێتان ئەدەمو ئارەزوەکانتان بۆ بەدی دەهێنم.

---

[1] الطبري (١٠/١١٣).

[2] إبن هشام (٢/٨٦-٨٧).

**پەیماندان و شكاندنی**

خـــوداى مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ هەركەسیشتان لەو لاڕێی خوانەناسی بگرێتە بەر (با بزانێ) كە لە ڕاستە ڕێ لایداوە. واتـە: هەركەسێ سەرپێچی لەم پەیمانە بكات دوای بەستن و توندو تۆڵ كردنی و سەرپێچی لێ بكات و وەك كەسێ كە هەر پەیمانی نەدابێ وا هەڵسوكەوت بكات، ئەوە لەو ڕاستە ڕێی ڕوونـە لایـداوەو بـەرەو گـومڕایی ڕۆشـتوە، پاشان خودای گەورە باسی ئەو سزایە دەكات كە تووشیان بووە لەسەر سەرپێچی كردنیان و شكاندنی ئەو بـەڵێن و پەیمانـەی كـە وا دابوویـان ئەفـەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ﴾ ئەوسا لەسـەر پەیمان شكاندنیان وەبەر نەفرینی خۆمان خستن. واتە: دوورمـان خستنەوە لـە هـەق و لـە ڕێـی ڕاسـت تەرەمان كردن ﴿وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً﴾ بە تەواوی دڵڕەشمان كردن. هیچ ئامۆژگاریەك كـاری لێ نـەدەكردن لەبـەر دڵڕەشـی و دڵڕەقیتـان ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ قسەكانی نـاوەڕۆكی پەیمانەكـەیان لـە جێـی خـۆی گـۆڕی. واتـە: بیروبۆچـونیان تێكـچووبوو. هەڵـسوكەوتیان بەرانبـەر نیشانەكانی خودا خراپ بوو. كتێبی خوایان بە ئارەزوی خۆیان لێك ئەدایەوەو مانای تریان بـۆ دادەنا. بـە پێـچەوانەی ئـەوەی كـە خـودا ڕەوانـەی كردبـوو. شـتی وایـان بـە دەمـی خـوداوە دەگـوت كـە نەیفەرمووبوو، پەنا بە خوا لەو كارەیان. ﴿وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ﴾ زۆر لەوانەی كە فێـری ئـەوان كرا بوو، لە بیر خۆیان بردبوەوە، خۆیان شتیان لەجێی دانا بـوو: واتـە: كاریـان بـەو كتێبـە نـەدەكردو حەزیان لێی نـەبوو. ﴿وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ﴾ هـەتا ئێستاش (وەك دەبینـی) خەیانـەتكاریان هـەر هەیـە مـەگین كـەمێك لەناویانـدا. واتـە: هـەر خـەریكی فێـڵ كـردن و خەیانـەت كـردن لـە خـۆت و هاوەڵەكانت. موجاهیدو كەسانی تریش گوتیان: مەبەست پێی هەوڵدانیان بووە بۆ كوشتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ)[1]، ﴿فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ﴾ سا تۆ چاویان لێ بپۆشەو بیانبەخشە. ئا ئەمەیە سەركەوتن و زاڵ بوونی ڕاستەقینە. وەك هەندێ لە زانایانی پێشینە دەڵێن، وا هەڵسوكەوتت لەگەڵدا نـەكردن كـە سەرپێچی فەرمانی خودایان كرد لەبارەی خۆتەوە، بەو شێوەیەی كە فەرمانی خودای تیا بەجێ بێنـی، ئـا بـەو شـێوەیە خۆشەویـستی لەنێوانیانـدا دروسـت بـوو لەسـەر هـەق كۆبوونـەوە، سـا بـەڵكو خـودا شارەزایان بكات. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بێگومـان خـودا چاكەكارانی خـۆش دەوێـت. یـان: چاوپۆشـی كردنـت دوای ئـەو خراپـەی بەرانبـەرت كردیـان، كـارێكی

[1] الطبري (١٣١/١٠).

چاکەو خودا پێی خۆشە. قەتادە گوتی: ئەم ئایەتە: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡ﴾ نەسخ بوتەوە بەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾[1]، شەڕ بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بە خودا بە ڕۆژی قیامەت.

**پەیمانی مەسیحیەکان و لەبیرچوونەوەی ئەو پەیمانەیان و ئەنجامەکەی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ﴾ پەیمانمان لەو کەسانەش وەرگرت کە گوتیان: ئێمە مەسیحین. واتە: پەیمانمان لەو کەسانە وەرگرت کە خۆیان بە مەسیحی دەزانن و شوێنی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) دەزانن، بەڵام وا نەبوون. ئێمە بەڵێن و پەیمانمان لێ وەرگرتن کە شوێن موحەممەد (ﷺ) بکەون و یارمەتی بدەن و پشتگیری لێ بکەن، شوێنی ئەو ڕەوشتەی ئەو بکەون کە بڕوا بوونە بە هەر هەموو ئەو پێغەمبەرانەی خودای گەورە ڕەوانەی کردوە بۆ خەڵکی سەر زەوی. بەڵام ئەوان وەك جوولەکەکانیان کرد، دژی پەیمانەکە وەستان و بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوە، لەبەر ئەوەیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ خۆیان لە چەند شتێکی لادا. ئیتر ئێمەیش کارێکمان کرد، شەڕو ئاژاوە لە نێوانیان بەردەوام بێ هەتا ڕۆژی قیامەت. وە کۆمەڵەکانی تری مەسیحیەکان هەتا ئێستا بەردەوام هەر خەریکی شەڕو ئاژاوەن لە نێوان خۆیاندا، ئەم ئەوی تر بە خوانەناس دادەنێ و نەفرین لە یەکتری دەکەن، هەر دەستەو کۆمەڵێ ئەوی تر بێ بەش دەکات وازی لێ ناهێنێ بچێتە ناو کلێساکەی. مەلکیە (الملكية) یەعقوبی بە خوانەناس سەیر دەکات و کۆمەڵ و دەستەکانی تریش هەروەها. نەستوریەو ئاریوسیەش (النسطورية و الآريوسية) هەر کۆمەڵ و ئەوی تر بە خوانەناس دەزانێ لەم دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ بەو زوانەش خودا ئاگاداریان دەکات لەو کارانەی وا دەیانکرد. ئەمە ترساندن و هەڕەشەیەکی زۆر توندو تیژە بۆ مەسیحیەکان لەسەر ئەو درۆیانەی کە دەیانکرد بە دەمی خوداو پێغەمبەرەکەیەوە. لەوەی داویانە پاڵ خودای مەزن کە دوورو پاك و بێ عەیبە لەو قسانەی ئەوان. کە فەرزەندو هاوسەریان بۆ دانا بوو، خودای مەزن تاك و تەنیایە و بێ نیازە لە هەموو شتێ و کەس لەو نەبوەو ئەویش لە هیچ کەس نەبوەو هەرگیز هیچ کەسیش نەیتوانیوە هاوتای بێت.

---

[1] التوبة (٢٩). الطبري (١٠/١٣٤).

﴿ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ
ٱلۡكِتَـٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾
يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ
بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ ﴾

**ڕوون کردنەوەی ڕاستی بەهۆی پێغەمبەرو (ﷺ) قورئانەوە**

خودای مەزن باسی خۆی دەکات، کە هەر ئەو پێغەمبەری خۆی موحەممەدی (ﷺ) ناردوە بە ڕێ نیشاندەرو ئاینی ڕاستو دروست بۆ خەڵکی سەر زەوی، بە عەرەبو عەجەمو خوێندەوارو نەخوێندەوارییەوە. ڕەوانەی کردوە بە نیشانەی ئاشکراوە ناهەق لە پڕوپوچ جیا بکاتەوە وەك ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَـٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾ ئەی ئەهلی کتێب، بێگومان ئەوەی کە هاتۆتە لاتان پێغەمبەرێکی ئێمەیە، زۆر لەو مەبەستو باسو خواسەی کە ئێوە لە کتێبی خۆتاندا شاردبوتانەوە، ئەو بۆتانی دەردەخاتو لێتانی ئاشکرا دەکاتو لە زۆریشی واز دێنێ. واتە: ئەو شتانە ئاشکرا دەکات کە گۆڕیوتانەو دەستکاریان کردوەو بە ئارەزوی خۆیان لێکیان داوتەوەو درۆیان بە دەم خواوە هەڵبەستوە لە کتێبەکەیاندا. حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا (المستدرك) ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: هەرکەسێ بڕوای نەبوبێ بە بەردەباران (الرجم) ئەوە بڕوای بە قورئان نەبوە، بەڵام ئەو کەسە بە خۆی نازانێ. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَـٰبِ ﴾ بەردەباران (الرجم) یەکێك بووە لەو شتانە کە شاردبویانەوە[1] فەرموودەیەکی حەسەنە. پاشان خودای گەورە باسی قورئانی پیرۆز دەکات کە ڕەوانەی کردوە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿كَثِيرٍۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴾ لەلای خوداوە ڕووناکیو کتێبێکی ڕوونو ئاشکرا هاتە لاتان. بەو کتێبە (کە قورئانە) خودا ئەوانەی شوێنی ڕەزای ئەو دەکەون دەخاتە سەر ڕێی هێمنی. واتە: ڕێی ڕزگاریو ئاشتیو ڕێڕەوەکانی خۆڕاگری. ﴿وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ

[1] الحاكم (٣٥٩/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ وە بە ئیزنی خۆی لە تاریکی دەریان دێنیو بەرەو ڕووناکیان دەباتو ڕێگەی ڕاستیان نیشان ئەدات. واتە: لە تیاچوون ڕزگاریان دەکاتو ڕێگەی ڕاستو دروستیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، شتە خراپەکانیان لێ دوور دەخاتەوە، شتە باشەکانیان بۆ وەدەست دێنێ، لە گومڕایی دەیانپارێزیو ڕێنماییان دەکات بۆ چاکترین ژیان.

﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾

**شەریک دانانی مەسیحیەکان بۆ خوداو خوانەناسیان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ ئەو کەسانەی کە گوتویانە: هەر خودا خۆی مەسیحی کوڕی مەریەمە لە دجین وەرگەڕاون. خودای گەورە خۆی ڕایگەیاندوەو باسی لە دین دەرچوونی مەسیحیەکانی کردوە لەوەدا کە گوتویانە عیسای کوڕی مەریەم (کە بەندەیەکە لە بەندەکانی خوداو دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی) خودایە، خودای گەورە پاکو بێ عەیبە لەو قسانە ئەوانە دەیڵێن، پاشان تواناو دەستەلاتی خۆی دەکات بەسەر هەموو شتێکدا دەکاتو هەموو وان لە ژێر دەستەلاتو توانای بەهێزی ئەودا، ﴿قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ بڵێ: ئەگەر خودا مەیلی لێبێ مەسیحو دایکی مەسیح هەرچی لە زەویدا هەیە لەناو بەرێ کێ دەستی وەبەر دەهێنا؟ واتە: ئەگەر ئەوەی بیویستایە، کێ دەیتوانی ڕێی لێ بگرێت، یان کێ دەیتوانی ئەوەی پێ بگۆڕێ. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ خاوەنیەتی ئەم ئاسمانانو زەمینە هەر خودایەو چی مەیلی لێبێ دروستی دەکات. هەر خودایە توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە. واتە: هەرچی بوەو دەبێ هەموو موڵکی خودایەو ئەو وەدیهێنەریەتی. توانای هەیە بەسەر هەر شتێکدا مەیلی لێ بێت بیکات، پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی دەیکات، ئەمە وڵامە بۆ ئەو مەسیحیانەی کە شەریکیان بۆ داناوە بەر نەفرینی خودا کەون هەتا ڕۆژی قیامەت.

**وەڵام دانەوەی ئەهلی کتێب کە دەڵێن: ئێمە فەرزەندانی خوداین**

پاشان خودای مەزن وەڵامی جولەکەو خەلەکان ئەداتەوە لەسەر ئەو درۆو بوختانەی بە دەم خوداوە هەڵیانبەستوەو ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾ جوولەکەو خەلەکان گوتیان: ئێمە فەرزەندان و دۆستانی خوداین. واتە: ئێمە دەچینەوە سەر پێغەمبەران. فەرزەندانی خودان. چاودێریان لێ دەکات و خودا ئەوانی خۆش دەوێت، وە لە کتێبەکانیاندا هێناویانە کە خودای گەورە فەرموویەتی بە عەبدی خۆی ئیسرائیل: (أنت البني بكري) ئەمەیان بە شێوەی خۆی مانا نەکردوەو گۆڕاویانە، وە زۆری لەوانەی کە موسوڵمان بوون و خاوەن ئاوەزن وەڵامیان دونەتەوە گوتویانە: ئەو دەقە لای ئەوان بە مانای ڕێزلێنان هاتوە، وەك مەسیحیەکان لە کتێبەکەیاندا هێناویانە کە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) پێی گوتن: من دەچم بۆ لای باوکم و باوکتان، واتە: دەچم بۆ لای پەروەردگارم و پەروەردگاری ئێوەیش، خۆ دیارەئەم فەلانە نەیان گوتوە ئێمە پێغەمبەرین وەك ئەوەی کە گوتویانە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) پێغەمبەرە. بەڵکو مەبەستیان ئەوە بوو کە لای عیسا خاوەنی ڕێزن و نزیکن لێیەوە. هەر بۆیە گوتویانە: ئێمە کوڕی خوداو خۆشەویستانی ئەوین. خودای گەورەیش وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم﴾ بلێ: کەوایە چۆن لەسەر گوناهەکانتان سزاتان ئەدات؟ واتە: ئەگەر وان کە خۆتان دەڵێن ئێمە فەرزەندان و دۆستانی خوداین، بۆچی ئاگری جەهەنمتان بۆ ئامادە کراوە لەسەر ئەو بێ دینی و درۆو بوختانەی بە دەم خواوە هەڵتان بەستوە؟ ﴿بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَ﴾ نەخێر ئێوەش هەر مرۆڤن وەك خەڵکی تر کە خودا دروستی کردوون. خودا خۆی فەرمانڕەوای هەموو عەبدەکانیەتی ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ هەرکەسێ خۆی مەیلی لێبێ، لێی دەبورێ و کێش مەیلی لێبێ جەزرەبەی ئەدات. هەرچی بوێت دەیکات و کەس ناتوانێ دەس لە کاری بەردا. لێپرسینەوەیشی زۆر بەپەلەیە. ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ هەر بۆ خودایە موڵکایەتی ئەم ئاسمانان و زەمینەو هەرچی لەناویاندایە. هەمووی موڵکی ئەوەو لەژێر دەستەڵات و توانای ئەودایە ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەی هەموشی هەر بەرەو لای ئەوە. فەرمانی خۆی بەجێ دێنێ لەنێوان عەبدەکانیدا بە مەیلی خۆی، دادپەروەرێکی وایە هەرگیز ستەم لە کەس ناکات.

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩﴾

خودای گەورە ڕووی قسەی دەکاتە ئەهلی کتێب لە جوولەکەو مەسیحیەکان ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا ﴾ ئەی ئەهلی کتێب، ئەوا پێغەمبەری ئێمەتان هاتۆتە لا. واتە: خودا پێغەمبەری خۆی موحەممەدی (ﷺ) ناردوە بۆیان کە دواین پێغەمبەرەو پێغەمبەری تر بە دوایدا نایەت، بەڵکو ئەم دوای هەموویان ڕەوانە کراوە، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ ناهەقتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، پاش ماوەیەك کە پێغەمبەران نەهاتوون. واتە: دوای ئەو ماوەیە کە درێژەی کێشا لە نێوان ڕەوانە کردنی پێغەمبەرو (ﷺ) عیسای کوڕی مەریەمدا (سەلامی خوای لێبێ) زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ئەو ماوەیە کە چەندێ بووە؟ ئەبوعوسمانی نەهدیی (النَّهدي) و قەتادە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن: شەش سەدساڵ بووە[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سەلمانی فارسیەوە لە[2] قەتادەوە دەڵێن: پێنج سەدو شەش ساڵ بووە[3] موعەممەر لە هەندێ لە هاوەڵەکانیەوە دەڵێت: پێنج سەدو چل ساڵ بووە[4] هەندێکی تر دەڵێن: شەش سەدو بیست ساڵ بووە. هیچ دژایەتیەك لە نێوانیاندا نیە. چونکە یەکەم کەس کە وتویەتی، شەش سەد ساڵ مەبەستی ساڵی خۆری بووە. ئەوی تر مەبەستی ساڵی مانگی بووە، جیاوازی لە نێوان ساڵی خۆری ساڵی مانگیدا، هەر سەد ساڵ سێ ساڵ جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا. هەر بۆیە خودای مەزن لە بەسەرهاتی خەڵکی ئەشکەوتەکەدا فەرموویەتی: ﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴾ سێ سەد ساڵ لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە نۆ ساڵیشیان لێ زیاد کرد. نۆ ساڵەکە بۆ تەواو کردنی ساڵی خۆری بووە کە لەلای ئەهلی کتێب دیارو ئاشکرایە. جیاوازی نێوان عیسا کە دواین پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل بووە، نێوان موحەممەد (ﷺ) لە دواین پێغەمبەری نەوەی ئادەم ئەو ماوەیە بووە کە زانایان باسیان کردوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان نزیکترین کەس لە عیسای کوڕی مەریەمەوە منم، لە نێوان منو ئەودا پێغەمبەر نەبووە)[5] ئەمە وەڵامە بۆ ئەو کەسانەی کە گوتویانە دوای عیسا (سەلامی خوای لێبێ) پێغەمبەری تر ڕەوانە کراوە پێیان دەگوت (خالدی کوڕی سینان) وەك قوزاعی (القُضائی) کەسانی تریش گوتویانە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە خودای گەورە موحەممەدی (ﷺ) نارد کە ماوەیەك بۆ پێغەمبەر ڕەوانە نەکرابوو. ئاینەکەیان

---

[1] البغوي (٢/٢٣).

[2] فتح الباري (١٠١/٣٢٤).

[3] البغوي (٢/٢٣).

[4] عبدالرزاق (١/١٨٦).

[5] فتح الباري (٦/٥٥٠).

دەستکاری کرابوون‌و بت پەرستی‌و ئاگر پەرستی‌و خاچ پەرستی زۆر بڵاوی کردبوو. خودای مەزن بە ناردنی ئەم پێغەمبەرە بەهرەو چاکەی تەواو کرد بەسەر نەوەی ئادەمدا، چونکە لەو کاتەدا مرۆڤایەتی زۆر پێویستی پێی بوو. چونکە خراپەو ستەم نەفامی‌و سەرکەش بە تەواوی لە هەموو وڵاتێکدا بڵاوەی کردبوو. جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێ لە پاشماوەی ئاینی پێغەمبەرە پێشوەکان کە لەسەر ئاینەکەیان مابونەوە لە زانایانی جولەکەو قەشەکانی مەسیحی‌و سابئیەکان. ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە لە عەیازی کوری حیماری مەجاشیعیەوە (عياض بن حمار المجاشعي) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری ئەداو لە وتارەکەیدا فەرمووی: (بێگومان پەروەردگارم فەرمانی پێداوم کە شارەزاتان بکەم لەوەی کە نەتانتزانیوەو لەوەی ئەمڕۆ منی فێر کردوە، هەر ماڵێ بەخشیومە بە عەبدەکانم حەڵاڵە. وە من عەبدەکانم هەموو دروست کردوە کەبەرەو هەق بڕۆن بەڵام شەیاتینەکان هاتوون بۆیان‌و لە ئاینەکەیان لایان داون، ئەوەی بۆم حەڵاڵ کردبوون لێیان حەرام کردن‌و فەرمانیان بۆ کردن کە شەریکم بۆ دابنێن، کە هیچ بەڵگەیەکیان نیە بە دەستەوە لەسەر ئەوە. پاشان خودای مەزن سەیری خەڵکی سەر زەمینی کردو رقی لێیان هەڵسا بە عەرەب‌و عەجەمیانەوە. مەگین کەمێ نەبێ لە پاشماوەی نەوەی ئیسرائیل. پاشان فەرمووی: (واتە: خودای مەزن فەرمووی) بێگومان من تۆم ناردوە تا تاقیت بکەمەوە (ئەوانیش) بە تۆ تاقی بکەمەوە، کتێبێکیشم بۆ ناردوی ئاو نایشۆرێتەوە. بە خەوتویی‌و بە بێداریش هەر دەیخوێنیتەوە. پاشان خودا فەرمانی پێدام کە قورەیش بسوتێنم، گوتم: ئەی پەروەردەم سەریان شکاندم (فَيَدعوه خبزة) فەرمووی: وەدەریان دەنێم وەك چۆن ئەوان تۆیان وەدەرنا غەزایان دەکەم وەك ئەوان غەزای تۆیان کرد. بژێویان پێ ئەدەم، بەو زوانە بژێویش بە تۆ ئەدەم. سوپایە بنێرە، ئێمە پێنج ئەوەی ئەوەی تۆ دەنێرین، شەڕ بکە بەوانەی گوێرایەڵیت دەکەن دژی ئەوانەی سەرپێچیت دەکەن. ئەهلی بەهەشت سیانن: خاوەن دەستەلاتێکی دادپەروەری سەرکەوتوی ماڵ بەخشین. پیاوێکی دڵۆڤانی دڵ نەرم بەرانبەر کەس‌و کارو موسوڵمانان. وە پیاوێکی داوێن پاکی هەژاری خێزانداری ماڵ بەخش. خەڵکی ناو ئاگریش پێنجن: ئەو لاوازەی کە خۆگر نیە. وە ئەوانەی کە لەناو ئێوەدا هەر شوێنکەوتەن نە کەس‌و کاریان دەوێت‌و نە سامان. وە ئەو ناپاکەی (الخائن) هەمیشە رژدە. با زۆر کەسیش بێ هەر خەیانەتی لێدەکات. وە پیاوێکە بەیانی‌و ئێوارە ناکاتەوە مەگین هەر فێڵێکت لێدەکات لە کەس‌و کارتدا لە سامانتدا، پاشان باسی چاوچنۆکی (البخيل) کرد. پاشان باسی درۆو رەوشتی ناشیرینی کرد.[1] مەبەست لە هێنانی ئەم فەرموودەیە ئەم بەشەیەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودای مەزن سەیری خەڵکی سەر زەوی کردوە

---

[1] أحمد (١٦٢/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ڕقی لێیان هەڵساوە بە عەرەب و عەجەمیانەوە بێجگە لە پاشماوەیە لە نەوەی ئیسرائیل) وە لە وتەی موسلیمدا هاتوە: (لە ئەهلی کتێب)[1] چونکە ئاین لە خەڵکی سەر زەوی تێکەڵ بوبو هەموو سەریان لێ تێکچووبوو، هەتا خودا موحەممەدی (ﷺ) نارد. ڕێگەی نیشانی خەڵکی داو خودا بەهۆی ئەوەوە لە تاریکایی دەریهێنان بۆ ناو ڕووناکیو ڕێی ڕاستو دروستو ئەم پەیامە پیرۆزە، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞ﴾ نەکا بڵێن: لەلایەن خوداوە مژدەدەرو ترسێنەرمان بۆ نەهاتوە، دەی وا مژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هاتوە. واتە: با ئەو کەسانە کە ئاینیان دەستکاری کردوەو گۆڕیویانە هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەمێنێ نەڵێن: هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە بۆ لامان مژدەی چاکەمان بداتیو بمانترسێنێ لە خراپە ئەوا مژدەدەرو ترسێنەر هات بۆتان، واتە: موحەممەد (ﷺ) ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ خودا توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا. ئیبنوجەریر گوتی: واتە: من توانای ئەوەم هەیە سزای ئەوانە بدەم کە سەرپێچیم دەکەنو پاداشتی ئەوانەش بدەمەوە گوێڕایەڵیم دەکەن[2].

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾

**مووسا (سەلامی خوای لێبێ) چاکەکانی خودا وەبیر هۆزەکەی دەهێنێتەوە فەرمانیان پێدەکات کە بچنە ناو زەویە پیرۆزەکە و یاخی بوونی هۆزەکەی لە فەرمانەکەی**

خودای مەزن باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی مووسای کوڕی عیمران دەکات (سەلامی خوای لێبێ) کە چۆن ئەو چاکانەی خودا وەبیر گەلەکەی هێناوەتەوەو لە دنیاو قیامەتدا پێی داون ئەگەر لەسەر

---

[1] مسلم (٤/٢١٩٧).

[2] الطبري (١٠/١٥٨).

ڕێی ڕاست بمێننەوەو ڕاوەستاو بن،و ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ ﴾ ئەو کاتانەش مووسا بە هۆزەکەی خۆی گوت: کەسەکانم دەبێ هەرگیز ئێوە ئەو چاکەیە لەبیر مەکەن کە خودا دەربارەی کردوون، کە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لەناو خۆتان بۆ ناردوون. هەرکاتێ پێغەمبەرێ کۆچی دوایی کردبێ، پێغەمبەرێکی تر لە جێی هاتووە لە خۆتان، لەو کاتانەی ئیبراهیمی باوکتان هاتوەو هاتوەو هەر بەو بەردەوامیش بوە: ئەو پێغەمبەرانە بانگیان کردوە بۆ لای خوداو نەوەی ئیسرائیلیان ترساندوە لە سزای ئەو، هەتا دواین پێغەمبەریان کە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێ) پاشان موحەممەدی کوڕی عەبدوللای ناردوە (ﷺ) کە لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە (سەلامی خوایان لێبێ). کە بەڕێزترین پێغەمبەرە لەناو ئەو پێغەمبەرانەدا لە پێشیەوە هاتوون. ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ چەندین پاشای لەناو خۆتاندا داناوە. عەبدوڕەزاق گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ واتە: ژن،و خزمەتچی،و ماڵی پێداون.[1] حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا (المستدرك) ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: ژن،و خزمەتچی پێداون. ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئەو شتەی بە ئێوەی داوە، بە هیچ کەس لەم دنیایەدا نەدراوە. گوتی: مەبەست پێی ئەوانەیە کە لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەوان ژیاون. پاشان حاکیم گوتی: ئەم فەرموودەیە بە مەرجی بوخاری،و موسلیم سەحیحە، بەڵام ئەوان نەیانهێناوە[2] قەتادە گوتی: ئەوان یەکەم کەس بوون کە خزمەتچیان بۆ خۆیان گرتوە.[3] وە لەم فەرموودەیەدا هاتوە: (هەرکەسێ لە ئێوە بەیانی هەڵسێ،و لاشەی تەندروست بێ،و ترسی لە گیانی خۆی نەبێ،و ڕۆزی ئەو ڕۆژەی هەبێ، وەك ئەوە وایە هەموو دنیای بۆ کۆکرابێتەوە بە تەواوی)[4] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئەو شتەی بە ئێوەی داوە، بە هیچ کەسی لەم دنیایەدا نەداوە. واتە: دنیای ئەو کاتە، چونکە نەوەی ئیسرائیل بەڕێزترین خەڵکی زەمانی خۆیان بوون لە یۆنانیەکان،و قیبتیەکان،و بەرەکانی تری نەوەی ئادەم. وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[5] ئێمە کتێب،و کارزانی،و پلەی

---

[1] عبدالرزاق (١٨٧/١).

[2] الحاكم (٣١٢/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری،و موسلیم.

[3] الطبري (١٦٣/١٠).

[4] التیرمیزی (٢٣٤٦)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[5] الجاثیة (١٦).

پێغەمبەرایەتیمان دا بە نەوەی ئیسرائیل. ڕۆزی پاكو چاكیشمان پێدان، ڕێزیشمان دان بەسەر هەموو خەڵكی دنیادا. خودای گەورە باسی مووسا دەكات (سەلامی خوای لێبێ) كاتێ كە پێیان گوت: ﴿يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[1] گوتیان: ئەی مووسا خودایەكمان وەك خوداكانی ئەوان بۆ پەیدا كە، گوتی: ئێوە هۆزێكن كە هیچ نازانن. ئەو كارەی ئەوان دەیكەن، بێ بەهرەیەو هەرچی دەیكەن بەفیڕۆیە. ئایا ئێوە دەتانەوێ جگە لە خودا پەرستراوێكتان بۆ دابنێم، كە ئەو خودایە ڕێزی ئێوەی داوە بەسەر جیهانیاندا. مەبەست لێرەدا ڕێزدانیانە بەسەر خەڵكی ئەو زەمانەی خۆیاندا. چونكە ئەم ئوممەتەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێزترە لەوانو بەڕێزترە لەلای خوداو پەیامەكەیشی تەواو ترەو بەرنامەكەیشی زۆر ڕێكترەو پێغەمبەرەكەیشی بەرچێزترەو خاوەن دەستەلاتو ڕۆزی دارترنو مالو مندالیان زۆرترەو ولاتیان فراوانترەو پایەدارتریشن خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾[2] ئا بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان كردۆتە ئوممەتێكی هەڵبژاردەی میانەڕەو. بۆ ئەوەی ببن بە شایەت لەسەر خەڵكی. وە لەم ئایەتەدا كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾[3] ئێوە چاكترین كۆمەڵن لەناو خەڵكی دنیادا سەرتان هەڵداوە. چەند فەرموودەی متەواتەرمان (المتواتر) باس كردوە لە بارەی ڕێزی ئەم ئوممەتەوە لەلای خودا. پاشان خودای مەزن باسی مووسا (سەلامی خوای لێبێ) دەكات كە نەوەی ئیسرائیل هان ئەدات بۆ جیهاد كردنو چوونە ناو (بيت المقدس) كە لە زەمانی یەعقوبی باوكیاندا لەژێر دەستی ئەواندا بووە، كاتێ كە بەخۆیی مالو مندالەكانیەوە كۆچیان كرد بۆ ولاتی میسر لە سەردەمی یووسفدا (سەلامی خوای لێبێ) پاشان لەوێ مانەوە هەتا لەگەڵ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) لێی دەرچوون، سەیریان كرد كۆمەڵێك لە عەمالیقە بەزەبرەكانی تیایەو داگیریان كردوەو خستویانەتە ژێر دەستەلاتی خۆیان. مووسا (سەلامی خوای لێبێ) فەرمانی پێكردن بچنە ناوی‌و شەڕ لەگەڵ دوژمنەكەیان بكەن، مژدەی سەركەوتنو زاڵ بوونی پێدان بەسەریاندا، بەلام ئەوان فەرمانەكەیان بەجێ نەهێناو سەرپێچیان كرد لە فەرمانەكەی، بۆیە سزا دران بە ڕۆشتن بۆ چۆڵەوانی بە سەرگەردانی هەر دەسوڕانەوەو نەیان دەزانی ڕوو لە كوێ بكەن. ماوەی چل سال. وەك تۆڵەیەك لێیان لەسەر ئەو سەرپێچیەیان لە فەرمانی خودای گەورە، خودای گەورە باسی مووسا دەكات

---

[1] الاعراف (١٣٨-١٤٠).

[2] البقرة (١٤٣).

[3] آل عمران (١١٠).

(سەلامی خوای لێبێ) کە فەرموویەتی: ﴿يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەی گەلەکەم بچنە ئەو سەر زەمینە پیرۆزەی خودا بۆ ئێوەی بڕیار داوەو بۆونوسراوە. واتە: کە خودا بەڵێنی پێدان لەسەر زمانی باوکتان یەعقوب کە موڵکی ئەو کەسانەیە کە خاوەن باوەڕە لە ئێوە.

﴿وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ﴾ بەرەو پاش مەگەڕێنەوەو واز لە جیهاد مەهێنن ﴿فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ (ئەگەر پەیمان بشکێنن) بە زیانتان تەواو دەبێ. گوتیان: ئەی مووسا، گرۆیەکی زۆردارو ملهوڕ لەوێدان، تا ئەوانەی لێ دەرنەچێ، ئێمە ناچینە ناویەوە. ئەگەر ئەوانە لەو شوێنانە بچنە دەرێ، ئەوساکە دەچینە ناوی. واتە: بیانویان بەوە هێنایەوە کە ئەو ولاتەی تۆ فەرمانمان پێدەکەی کە بچینە ناوی و شەڕ لەگەڵ خەڵکەکەی بکەین، گرۆیەکی زۆردارو ملهوڕی تیایەو زۆر بەهێزو بەتوانان ئێمە ناتوانین بەرانبەریان بوەستین و شەڕیان لەگەڵدا بکەین، هەتا ئەوانەی تیا بێت ئێمە ناتوانین بچینە ناوی و چاریان ناکەین.

### وتاری یوشعی کوڕی نون و کالبی کوڕی یوفەنا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا﴾ دوو پیاو لەوانە وا لە خوا دەترسان و بەر چاکەی خودا کەوتبوون، پێیان گوتن: واتە: کاتێ کە نەوەی ئیسرائیل سەرپێچی فەرمانی خوداو شوێنی پێغەمبەری خودا مووسا (سەلامی خوای لێبێ) نەکەوتن، ئەو دوو پیاوە هانیان ئەدان، کە بەر چاکەی خودا کەوتبوون و لەو کەسانە بوون کە لە فەرمانی خودا دەترسن و ترسی تۆڵەی خودایان هەیە. وە هەندێ بەم شێوەیە ئەم ئایەتەیان خوێندوەتەوە: ﴿قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يُخَافُونَ﴾ واتە: دوو پیاو لەوانەی خەڵکی لێیان دەترسان. لەبەر ڕێزو پلەی کۆمەلایەتیان گوتراوە: ئەو دوو پیاوە یوشعی کوڕی نون و کالبی کوڕی یوفنا بوون. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس و موجاهیدو عیکرمەو عەتیەو سوودی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و کەسانی تریشە لە زانایانی پێشینەو پاشینەش (السلف و الخلف) (ڕەحمەتی خوایان لێبێ)[1] گوتیان وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ لە دەروازەی شار بچنە ژوورەوەو هێرشیان بۆ بەرن، هەر کە پێیان خستە ئەو دیوە بێگومان سەردەکەون ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا هەیە خۆتان بە خودا بسپێرن. واتە: ئەگەر پشتتان بە خوا بەست و فەرمانی ئەوتان بەجێهێناو شوێن پێغەمبەرکەی کەوت. خودا سەرتان دەخات بەسەر دوژمنەکانتانداو زاڵتان دەکات بەسەریانداو دەچنە ناو ئەو شارەوە کە خودا بۆی نووسیون و بڕیاری داوە بۆتان.

---

[1] الطبري (١٠/١٧٦-١٧٨).

ئامۆژگاری ئەو دوو پیاوە هیچ سودێکی پێ نەکەیاندن ﴿قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُوا فِيهَا ۖ فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ گوتیان: ئەی مووسا هەتا ئەوان لەو شوێنە بن، ئێمە هەرگیز زات ناکەین بچینە ئەوێ، خۆتو پەروەردگارت بچن شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەوا ئێمە لێرە دانیشتوینو چاوەڕوانین. ئەمە سەرپێچی کردن بوو لە جیهادو گوێ نەدان بە فەرمانی پێغەمبەرەکەیانو خۆ شاردنەوە بوو لە شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن.

**وەڵامی چاکی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا**

چەند وەڵامێکی چاکو جوان بوو کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر دایانەوە بەرانبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە وتوێژی لەگەڵدا کردن لە ڕۆژی بەدردا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ قورەیشیەکاندا کە هەموو هاتبوون بۆ ڕزگار کردنی کاروانەکەیان کە ئەبوسوفیانی لەگەڵدا بوو، کاتێ کە کاروانەکەیان لەدەست چوو بیگرن، ئەو هەموو خەڵکەی قورەیش کە هاتبوون بۆ ڕزگار کردنی کاروانەکە لێیان نزیك بونەوە. ژمارەی ئەمان نزیکەی نۆسەد هەتا هەزار کەس دەبوون. بە کەلو پەلی جەنگەوە وەك تیرو شیرو قەڵغانو شمشێر، خۆیان ئامادە کردبوو. ئەبوبەکر دەستی کرد بە قسە کردنو قسەی جوانی کرد. پاشان ئەویش قسەی کرد لە کۆچەریەکان کردی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەر دەیفەرموو: (ئەی موسوڵمانەکان ڕاوێژم بۆ بکەن) ئەمەی بۆیە ئەفەرموو هەتا بزانێ ئەنساریەکان چی دەڵێن. چونکە ئەوانە زۆرینەی ئەو خەڵکە بوون لەو کاتەدا. سەعدی کوڕی مەعاز گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێی مەبەستت ئێمەیە؟ سوێند بەو کەسەی تۆی ناردوە بۆ ئێمە بە هەق، ئەگەر بماننێریتە ناو ئەو دیاریاوەو خۆت بخەیتە ناویەوە لەگەڵتدا خۆ دەخەینە ناوی یەك کەسمان لێ دوا ناکەوێ. ئێمە پێمان ناخۆش نیە ئەگەر سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمنمان بکەیتەوە، زۆر بە ئارامین لەگەڵ جەنگداو، ڕاستیشین لەکاتی بەیەك گەیشتندا، هیوامان وایە کە خودا کە شتی وات پیشان بدات لەبارەی ئێمەوە چاوتی پێ ڕۆشن بێتەوە. دەی بەڕێمانکە لەسەر خوا با بڕۆین، پێغەمبەری خودا زۆر دڵخۆش بوو بە قسەکانی سەعدو نیشانەی شادی پێوە دیار بوو[1]. ئەبوبەکری کوڕی مەردەوەیهی (مردویە) ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ بەرەو بەدر کەوتە ڕێ ڕاوێژی بە موسوڵمانەکان کرد، عومەر قسەی خۆی بۆ کردپاشان داوای ڕاوێژی لێکردن، ئەنساریەکان گوتیان: ئەی ئەنساریەکان پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەبەستی ئێوەیە. ئەوانیش گوتیان: ئەوسا ئێمە ئەوە ناڵێین کە نەوەی ئیسرائیل گوتیان بە مووسا (سەلامی خوای لێبێ): ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا

---

[1] البداية و النهاية (٣/٢٦٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

قَٰعِدُونَ﴾ تۆو پەروەردگارت بڕۆن شەڕیان لەگەڵ بکەن ئێمە لێرەدا دانیشتووین. سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە ئەگەر بمانبەیت بۆ ناو جەرگەی (بەرك الغماد) شوێنێکە لە سەروی یەمەنەوە دێین لەگەڵتدا. ئیمامی ئەحمەدو نەسائیو ئیبنوحبان ڕیوایەتیان کردوە[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە (المغازي)دا لە بەشی تەفسیرەکەیدا گوتی: میقداد لە ڕۆژی بەدردا گوتی: (ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە وا بە تۆ نالێین وەك نەوەی ئیسرائیل بە مووسایان گوت: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾ بەلکو بە فەرموو ئێمەیش لەگەڵتین)[2].

**دوعای مووسا (سەلامی خوای لێبێ) لە جوولەکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ مووسا گوتی: پەروەردگارم، تۆ دەزانی کە من دەستم هەر بەسەر خۆمو براکەمدا هەیە، ئەوانە بە قسەی من ناکەن. سا تۆ منو هۆزە لەڕێ لادەرەکەم لە یەکتری جیا کەرەوە، واتە: کاتێ نەوەی ئیسرائیل پشتیان کردە جیهاد کردن. مووسا (سەلامی خوای لێبێ) تووڕە بوو لێیان دوعای لێکردنو گوتی: ﴿رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ﴾ واتە: هیچ کەسێ لەوانە گوێڕایەڵیم ناکەن فەرمانی خودا بەجێبێنن وەڵامی ئەو بانگەی من بدەنەوە، تەنیا خۆمو هارونی برام لەگەڵە ﴿فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ عەوفی گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە: واتە: دادوەری بکە لە نێوانماندا[3] عەلی کوڕی ئەبوتەلحەیش هەر وای گوتوە لە ئیبنوعەبباسەوە[4] زەحاکیش هەر وای گوتوە، تۆ دادوەری بکە لە نێوانمانداو بڕیارمان بۆ بدە.[5] کەسانی تریش گوتویانە: لە یەکتر جیامان بکەرەوە.

**قەدەغە کردنی جوولەکە لە چوونە ناو زەویە پیرۆزەکە چل ساڵ**

﴿قَالَ﴾ خودای مەزن فەرمووی: ﴿فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوا ماوەی چل ساڵ بەشیان لەم وڵاتەدا بڕاو لە زەمیندا وێڵو سەرگەردان دەبن. کاتێ کە مووسا (سەلامی خوای لێبێ) دوعای لێکردن کە پشتیان هەڵکرد لە جیهاد کردن. خودای گەورە بڕیاری دا کە نابێ ماوەی چل ساڵ بچنە ناو ئەو زەمینە پیرۆزەو لێی قەدەغە کردن. لە چۆڵەوانیەکدا هەمیشەبە

---

[1] أحمد (٣/١٠٥)، النسائي في الكبرى (٦/٣٣٤)، إبن حبان (٧/١٠٩)، ئەم فەرموودە سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] البخاري (٤٦٠٩).

[3] الطبري (١٠/١٨٨).

[4] الطبري (١٠/١٨٩).

[5] الطبري (١٠/١٨٩).

سەرگەردانی دەسوڕانەوە، هەر چەندیان دەکرد لێی دەرنەدەچوون، شتی زۆر سەرسوڕهێنەرو غیرە سروشتیان بەسەردا هات. لەوێدا هەور کرا بە سێبەر بۆیان، گەزۆو شێلاقەیان (ڕیشۆڵەیان) بۆ دابەزێنراو دەرهێنانی ئاوی ڕۆشتوو لە بەردو چەندین موعجیزەی تریش کە خودا کردی بە پشتگیری مووسای کوڕی عیمران (سەلامی خوای لێبێ) ئا لەوێدا تەورات هاتە خوارەوەو پەیڕەو پرۆگرامیان قوبەی عەهدیاشیان (قُبةُ العهد) بۆ کرا کە پێی دەگوترا: قوبەی زەمان (قُبة الزمان).

**ڕزگارکردنی (بیت المقدس)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ چل ساڵ بە سەرگەردانی لەسەر زەویدا دەسوڕانەوە ﴿أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ﴾ مەنسوبە بە وتەی ﴿يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ کاتێ کە ماوەکە تەواو بوو، یوشعی کوڕی نون (سەلامی خوای لێبێ) لەگەڵ خۆی بردنی، یان ئەوانەی لەوان مابونەوە لەگەڵ ئەوانی تریش لە نەوەی ئیسرائیل لە کێوی دووهەمەوەو بەرەو (بيت المقدس) بردنیو گەمارۆی دا، لە ڕۆژی هەینیدا دوای عەسر ڕزگاری کرد، کاتێ کە خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچوو، یوشع ترسا لەوەی کە شەممەیان بەسەردا بێت گوتی: (بە خۆر) تۆ فەرمان پێکراویو منیش هەر فەرمان پێکراوم، مأمور ووتی: ئەی خودایە بۆم بگرە، خودا گرتی هەتا ڕزگاری کرد. خودا فەرمانی دا بە یوشعی کوڕی نون کە فەرمان بکات بە نەوەی ئیسرائیل کاتێ کە دەچنە (بيت المقدس) کەبە سوژدەوە لە دەرگاکەوە بچنە ژورەوە، ئەوان بڵێن (حطةٌ) واتە: گوناهەکانمان لێ لابەرە. ئەوەی فەرمانیان پێکرا بوو گۆڕیان، بە قنگە خشڵێ دەڕۆشتنو دەیانگوت: دەنکێك لە مویەکدا (حبةٌ في شعرة) ئەمانە هەموو لە پێشەوە لە سورەتی بەقەرەدا باس کراوە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ گوتی: چل ساڵ سەرگەردان بوون، مووساو هاروون (سەلامی خوایان لێبێ) کۆچی دواییان کرد لەو چۆڵەوانیەدا، ئەو کەسانەی دوای ئەو چل ساڵە مانەوە، یوشعی کوڕی نون ورەی خستە بەریان کاتێ کە کارەکانی مووسای گرتە دەست (سەلامی خوای لێبێ) هەر ئەویش بوو قودسی پیرۆزی ئازاد کرد هەر ئەویش بوو پێی گوترا: ئەمڕۆ ڕۆژی هەینیە. ویستیان ئازادی بکەن خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچوو، بانگی لە خۆر کرد: من فەرمانم پێکراوەو تۆیش هەر فەرمانت پێکراوە، خۆر وەستا (لە ترسی ئەوەی نەکات ئازاد کردنەکە بکەوێتە شەوی شەممەو نەوەی ئیسرائیل شەممە بگرنو بیکەنە پشوو) هەتا ئازادیان کرد. ماڵو سامانی وایان تیا بینی کە هەرگیز لە وێنەی نەبینرا بوو. نزیکیان کردەوە لە ئاگر، ئاگری تێ نەچوو. یوشع گوتی: خەیانەتکاریان لەناودایە. سەرۆکی دەستەکانی بانگ کرد کە دوانزە پیاو بوون پەیمانی لێ دەسەندن، دەستی یەکێکیان لکا بە دەستیەوە گوتی: خەیانەتەکە لەلای تۆیە دەری بێنە. سەری

گایەکی لە زێڕ دەرهێنا لە دوو چاکەی لە یاقووتو دانەکانی لە مرواری بوو لەگەڵ ئەوانەی تردا داینا کە دانرا بوو بۆ نزیك بونەوە لە خوا(العریان) ئاگری بۆتو سەتاندی (ئەو سوتاندنە نیشانەی وەرگرتنی بووە) ئەم دەقە نمونەی هەیە لە فەرموودەی سەحیحدا.

**خودای مەزن دڵنەوایی مووسا دەکات (سەلامی خوای لێبێ)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ خەم بۆ ئەم هۆزە لەڕێ دەرچوانە مەخۆ. ئەمە دڵنەوایە بۆ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) واتە: هیچ خەم مەخۆو دلگران مەبە بۆیان لەسەر ئەوەی کە بەسەرم هێنان، چونکە ئەوانە شایستەی ئەو سزایە بوون. ئەم بەسەرهاتە سەرزەنشتی جولەکەکانی لەخۆ گرتوەو باسی بێ ئابڕویی و سەرپێچیەکانیان دەکات بەرانبەر خوداو پێغەمبەرەکەی گوێ نەگرتنیان بۆ ئەو فەرمانانەی کە ئەدرێت بەسەریاندا لەبارەی جیهاد کردنەوە. چونکە زۆر لاواز بوون بەرانبەر دوژمنو نەیان دەتوانی بچن بە گژیانداو شەڕیان لەگەڵ بکەن، لەگەڵ ئەویش کە مووسا (سەلامی خوای لێبێ) خۆی لەگەڵیاندا بوو کە هەڵبژاردەی خودا بوو لەناو خەڵکی ئەو سەردەمەداو خودا خۆی وتوێژی لەگەڵدا کردبوو. بەڵێنی سەرکەوتنو زاڵ بوونیشی پێدابوون بەسەر دوژمنەکانیاندا. ئەمەیشیان بە چاوی خۆیان بینی کە خودا بە فیرعەنی دوژمنیان، چۆن سزای داو تۆڵەی لێ سەندو خۆیی و سوپاکەی لە دەریادا نوقم کرد، ئەوان سەیریان دەکرد هەتا چاویان بە تیاچوونی ڕووناك بێتەوە. زۆریشی بەسەردا تێنەپەڕیبوو، پاشان خۆیان لائەدا لە شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکی شارێ کە لە چاوی وڵاتی میسردا هەر زۆر ژمارەیان کەمترو پێویستی شەڕیشیان زۆر کەمتر بوو. ئەو کارە خراپو ناشیرنەیان بۆ هەموو خەڵکی دەرکەوت، وا سوكو ڕسوا بوون کە تاریکایی شەو هیچ شتێ داینەدەپۆشی و لە نەفامی و گومڕایی خۆیاندا سەرگەردان بوو بوون، ئەوانە دوژمنی خودا بوونو خودا ڕقی لێیان بوو. کەچی لەگەڵ ئەوەیشا دەیانگوت: ئێمە فەرزەندانو خۆشەویستانی خوداین خودا ئەو ڕوەیان ڕەش بکات کە گۆڕیی و کردی بە ڕوی بەرازو مەیمون. تووشی نەفرەتێکی وا بوون بەرەو ناو ئاگری بڵێسەدار ڕاپێچی کردنو تا هەتا هەتایە تێدا بمێننەوە، هەر واشیان بەسەر هات. سوپاسو ستایشی هەتا هەتایی بۆ خودای مەزنو باڵادەستە.

﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ
قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ
أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى

ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾﴾

**بەسەرهاتی قابیلو هابیل**

خودای گەورە باسی سەرئەنجامی ستەمو حەسوودیو زۆرداریو بێ بەزەیی دوو کوڕەکەی ئادەم دەکات کە قابیلو هابیلە کە چۆن یەکێکیان دەستدرێژی کردە سەر ئەوی تریانو کوشتی. حەسوودی پێ بردو بە ناهەق کوشتی. لەبەر ئەو بەهرەی خودا بە براکەی دابوو بەوی نەدابوو. ئەو قوربانییەی کە براکەی لەبەر ڕەزامەندی خوا کردبووی خودا لێی وەرگرت. کوژراوەکە سەرکەوتنی بەدەست هێناو تاوانەکەی لەسەر خۆی هەڵگرتو لایداو چووە ناو بەهەشت. بکوژەکەیش بە نوشوستیو دۆڕاوی هەردوو دنیا گەڕایەوە وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ﴾ هەروەها تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) دەنگو باسی ڕاستی ڕووداوی نێوان هەردوو کوڕەکەی ئادەمیان بۆ بخوێنەوە. واتە: بەسەرهاتی ئەو دوو کوڕەی ئادەم باس بکە بۆ ئەو ستەمکارو حەسوودانەی کە لە هاوەڵانی بەرازو مەیمونەکان لە جوولەکەکانو ئەوانەیش وەك ئەوانو لەوان دەچن. کە قابیلو هابیلن. چەندین کەس لە زانایانی پێشینەو پاشینە ئەم باسەیان گێڕاوەتەوە. ﴿بِٱلۡحَقِّ﴾: بەڕاستی کە ڕووداوێکی دیارو ئاشکرایەو هیچ گومانو درۆو گۆڕانو زیادیو کەمیەکی تێدا نیە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّ﴾[1] بێگومان ئا ئەمانە بەسەرهاتی ڕاستن. وە ئەفەرموێت: ﴿نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾[2] ئێمە سەرگوزشتەی ڕاستی ئەمانەت بۆ دەگێڕینەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ﴾[3] قسەی ڕاست لەسەر عیسای کوڕی مەریەم هەر ئەمەیە. لەو بەسەرهاتانەی قابیلو هابیل کە چەندین کەس لە زانایانی پێشینەو پاشینە (السلف و الخلف) باسیان کردوە، خودای مەزن ڕێگەی دا بە ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) کە کچەکانی لە کوڕەکانی مارە بکات لەبەر پێویستی ئەو کاتە. بەڵام گوتویانە: هەر سکێ دوو منداڵیان کوڕێكو کچێك. کچی هەر سکێك لە کوڕی سکەکەی تر مارە دەکردو بە پێچەوانەشەوە. خوشکەکەی هابیل ناشیرین بوو، بەڵام خوشکەکەی قابیل زۆر جوانو پێکەوتوو بوو. ویستی بیبات بۆ خۆیو نەیدات بە هابیلی برای. ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) نەیهێشت بیبات هەتا یەکی قوربانیەك نەکەن، گوتی:

---

[1] آل عمران (٦٢).

[2] الكهف (١٣).

[3] مریم (٣٤).

هەرکەسێ قوربانیەکەی لێ قبوولّ کرا، ئەو کچە بۆ ئەو بێ. قوربانیەکە لە هابیل وەرگیرا لە قابیل وەرنەگیرا، بەو شێوەی لێهات کە خودای مەزن فەرموویەتی لە قورئانی پیرۆزدا. ئیبنئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: قەدەغە کرا بوو کوڕو کچێ کە بە یەك سك لە دایك بوبن لە یەکتری مارە بکرێن، فەرمان ئەدرا کە یەکێکی تر لە براکانی مارەی بکات، هەموو سکێ کە منداڵیان دەبوو یەکێکیان کوڕ بوو ئەوی تریان کچ بوو. هەر بەو شێوەیەیان دەکرد، ئەگەر کچێکی جوانیان ببوایە، پاشان کچێکی ناشیرینیشیان دەبوو. برای کچە ناشیرینەکە گوتی: خوشکەکەتم لێ مارە بکە، منیش خوشکەکەم مارە دەکەم لێت. (قابیل) گوتی: نەخێر، من شایستە ترم بە خوشکی خۆم، یەکی قوربانیەکیان کرد. قوربانی خاوەن بەرانەکە وەرگیراو قوربانی خاوەن کشتوکاڵەکە وەرنەگیراو (براکەی) کوشت[1] سەنەدەکەی چاکە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ کاتێ هەر یەکەیان قوربانیەکیان کرد، لە یەکێکیان وەرگیراو لەوی تریان وەرنەگیرا (ئەوەی کە لێی وەرنەگیرا، هەڕەشەی لەوەی تر کرد) گوتی: من دەبێ بتکوژم، گوتی: خودا هەر لەو کەسەی قبوولّ دەکات کە لە خوا دەترسێ لە هەر کارەدا دەیکات. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبودەردائەوە (أبو الدرداء) گوتی: ئەگەر بزانم خودا یەك نوێژی لێ وەرگرتووم، لەلام خۆشەویستترە لە دنیاو لەوەی کە تیایەتی، چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾. پاشان ئەفەرموێت: ﴿لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەگەر تۆش دەستم بۆ درێژ کەی کە بمکوژی من دەست پێشخەری ناکەم تۆ بکوژم. من لە خودا(کە پەروەردگاری دنیایە) دەترسم. واتە: برا چاکەکەی کە خودا قوربانیەکەی لێ قبوولّ کرد لەبەر لە خواترسی کاتێ کە براکەی هەڕەشەی کوشتنی لێکرد بێ ئەوەی هیچ تاوانێکی هەبێ، گوتی: ﴿لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ واتە: ئەگەر تۆ دەست درێژیم بۆ بکەی‌و بمکوژی، من بەو کارە خراپەی کە تۆ پێی هەڵدەسی وەڵامت نادەمەوە، تا منو تۆ وەك یەك شەریك بین لەو تاوانەدا. ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ من لە خودا(پەروەردگاری دنیایە) دەترسم لەو کارەی کە تۆ دەکەوێ بیکەی منیش بیکەم. بەڵکو خۆم دەگرمو بە هیوای پاداشتی خودام. عەبدوڵلای کوڕی عەمر گوتی: سوێند بە خوا ئەم لە براکەی بەهێزو تواناتر بوو، بەڵام لەخواترسیەکەی ڕێی پێ نەئەدا. هەر بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (کاتێ کە دوو موسوڵمان

---

[1] الطبري (١٠/٢٢٣).

ڕووبەڕووی یەکتری بونەوە بە شمشێرەکانیان بکوژو کوژراویش لەناو ئاگردان)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمەیان بکوژە (واتە: حەقی خۆیەتی) ئەی کوژراوەکە بۆ؟ فەرمووی: (چونکە ئەمیش سور بووە لەسەر کوشتنی هاوەڵەکەی)[1]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقسەوە لە کاتی فیتنەی عوسماندا گوتی: شایەتی ئەدەم کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەمەولا فیتنە پەیدا دەبێ، ئەوەی دانیشتو تێیدا باشترە لەوەی کە هەڵساوە، ئەوەی هەڵساوە باشترە لەوەی کە دەڕوات، ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی کە پەلەی تیا دەکات) گوتی: ئایا دیت هاتە ماڵەوە بۆمو دەستی بۆ درێژ کردمو کوشتمی؟ فەرمووی: (تۆش وەك کوڕەکەی ئادەم بە)[2] تیرمیزیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە، ئەم فەرموودە، فەرموودەیەکی حەسەنە.[3] پاشان خودای مەزن لەسەر زمانی کوڕە چاکەکەی ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) ئەفەرموێت: ﴿إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ من دەمەوێ تاوانی کوشتنی منو تاوانی خۆت بێتە ملت، ئەوسا تۆ دەچیتە ئاگرو (سزای ) تاوانی ستەمکار ئەوەیە. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو زەحاكو قەتادەو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیالن کردوە.[4] ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئیتر دڵی هەڵێنا کە براکەی خۆی بکوژێ، کوشتیو کەوتە ناو ڕیزی زیانبارانەوە. واتە: دوای ئەو ئامۆژگاریو ترساندنەی براکەی کە کردی، هەر کوشتی. ئیبنوجەریر گوتی: کاتێ (قابیل) ویستی براکەی بکوژێ ملی بادا، شەیتان گیانەوەرێکی گرتو سەری نایە سەر بەردێكو بەردێکی تری هەڵگرتو کێشای بەسەریدا هەتا کوشتی، کوڕەکەی ئادەمیش سەیری دەکرد، پاشان ئەویش ئەوەی کرد بە براکەی کە شەیتان کردی[5]. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی وەهەبەوە، لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە باوکیەوە گوتی: سەری براکەی گرت بۆ ئەوەی بیکوژێ خۆی دا بە زەویداو سەرو لاشەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، نەیدەزانی چۆنی بکوژێ، شەیتان هات بۆ لایو وتی: دەتەوێ بیکوژی؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: ئەم بەردە هەڵگرەو بیدە بەسەریدا، گوتی: بەردەکەی هەڵگرتو کێشای بەسەریداو سەری شکاند، پاشان شەیتان بەپەلە هات بۆ لای حەواو وتی: ئەی حەوا، ئەوسا قابیل هابیلی کوشت. حەوایش پێی وت: هاوار بۆ تۆ کوشتن چۆن دەبێ؟ گوتی: نە

---

[1] فتح الباري (١٣/٣٥)، مسلم (٤/٢٢١٤).

[2] أحمد (١/١٨٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] تحفة الاحوذي (٦/٤٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] الطبري (١٠/١١٥-١١٦).

[5] الطبري (٤/٥٣٦).

خوادن‌و نە خواردنەوە ناخوت‌و ناشجولێ. حەوا وتی: ئەوە مردنە، شەیتان: (بەڵێ) ئەوە مردنە دەستی کرد بە هاوار کردن هەتا ئادەم هاتە لای‌و هەر هاواری دەکرد، پێی وت چیتە؟ قسەی لەگەڵ نەکرد دوو جار گەڕایەوە بۆ لای هەر قسەی لەگەڵدا نەکرد ئادەمیش وتی: هاوارو قیژە بەشی خۆت‌و کچەکانت بێ من‌و کوڕەکانیشم سەرفرازو دوور بین لێی. ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ چووە ناو ڕیزی زیانباران. لە دنیاو لە قیامەتدا، چ زیانێ لەمە گەورەترە؟ ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ گیانێ بە ناهەق ناکوژرێ مەگین یەکەم کوڕی ئادەم بەشێکی لە خوێنەکەیدا هەیە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوە کوشتنی داهێناوە)[1]. زانایانی فەرموودە، ئەم فەرموودەیان هێناوە جگە لە ئەبوداوود.[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە کە دەیوت: بەدبەختترین کەسێ لە نەوی ئادەما ئەو کەسەیە کە براکەی خۆی کوشتوە، هیچ خوێنێ لەسەر زەمیندا نارژێ، لەو کاتەوە کە براکەی خۆی کوشتوە مەگین بەشێ لەو خراپەی (کوشتنەی) پێدەگات. چونکە ئەو یەکەم کەس بوە کوشتنی داهێناوە[3] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ خـوا قەلەڕەشەیەکی نارد خەریك بوو زەوی هەڵدەکۆڵی بۆ ئەوەی پێی نیشان بدات کە چۆن لاشەی براکەی لە خاکدا بشارێتەوە واتی: هاوار لە خۆم، چۆن نەمزانی وەك ئەو قەلەڕەشە بجولێمەوەو لاشەی براکەم بشارمەوە. (بەم کردەوەی) هاتە ڕیزی پەشیمانان. سوودی‌و کەسانی تریش لە هاوەڵەکانی وتیان: کاتێ کە لاوەکە مرد (واتە: براکەی) لەو بیابانەدا بەجێی هێشت‌و نەیدەزانی چۆن بیشارێتەوە، خودا دوو قەلەڕەشی برای یەکی نارد هاتن بە یەکداو یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت‌و چاڵێکی بۆ هەڵکەندو پاشان خۆڵی کرد بەسەریدا، کاتێ (قابیل) ئەوەی دی وتی: ﴿يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِي﴾[4] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: قەلەڕەشێك هات بۆ لای قەلەڕەشێکی مردارەوەبوو، خۆڵی کرد بەسەریدا هەتا دایپۆشی، ئەوەیش کە براکەی خۆی کوشتبوو

---

[1] أحمد (١/٣٨٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٢/١٩٨)، مسلم (٣/١٣٠٣)، تحفة الاحوذي (٧/٤٣٦)، النسائي في الكبرى (٦/٣٣٤)، إبن ماجة (٢/٨٧٨).

[3] الطبري (١٠/٢١٩).

[4] الطبري (١٠/٢٢٥).

وتـــی: ﴿يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى﴾.[1] ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ﴾ چووه ڕیزی پەشیمانان. حەسەنی بەسری وتی: دوای ئەو زیانباریە خودا پەشیمانیەکەی دەرخست.

## پێش خستنی تۆڵەی ستەمو بڕینی پەیوەندی خزمایەتی

لەم فەرموودەیەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ گوناهی نیە کە شایەنی ئەوەبێ خودا تۆڵەکەی پێش بخات لە دنیادا لەگەڵ ئەوەیش کە بۆی هەڵدەگرێ لە ڕۆژی دوایدا بۆ خاوەنەکەی، لە ستەمو پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی)[2] ئەم کردارەی قابیل هەردووکیانی تیا کۆ بوەتەوە، إنا لله و إنا إليه راجعون.

﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَـٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾

## پێویستە لەسەر مرۆڤ ڕێز لە مرۆڤ بگرێ

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ بەهۆی ئەم کارەوە فەرمانێکمان بۆ سەر نەوەی ئیسرائیل نارد، کە هەرکەسێ بێتاوانێک بکوژێ (کە نە گوناهی کردبێ‌و نە خراپەی لە زەویدا لێ ڕوودابێ) وەك ئەوەیە کە گشت خەڵکی سەر زەوی لەناوبردبێ‌و هەر کەسێکیش بێتاوانێك ڕزگار بکات، وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەر زەوی لە مردن ڕزگار کردوە. واتە: بڕیارمان داو نەوەی ئیسرائیلمان ئاگادار کرد کە هەرکەسێ یەکێ بکوژێ بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ یان خراپەیەکی لە زەویدا کردبێ، کوشتنی بە حەڵاڵ بزانێ وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێ، چونکە لای خودا جیاوازی لەنێوان گیانێك‌و گیانێکی تردا نیە ﴿وَمَنْ

---

[1] الطبري (١٠/٢٢٦).

[2] أبوداود (٥/٢٠٨)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

أَحۡيَاهَا ﴾ وە کەسێ مرۆڤێ لە مردن ڕزگار بکات. واتە: کوشتنەکەی بە ڕەوا نەزانێو بڕواشی وابێ.
ئەوە هەموو خەڵکی دڵنیان لەو کەسەو ترسیان لێی نیە، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت:
﴿فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ ئەعمەشو کەسانی تریش وتیان: لە ئەبوسالحەوە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: چوومە لای عوسمان لەو ڕۆژی (کە لە ماڵەکەیدا بوو) (یوم الدار) وتم: هاتووم یارمەتیت بدەم، ئەی گەورەی موسوڵمانان شمشێر وەشاندن خۆشە (جێی خۆیەتی) وتی: ئەی ئەبوهورەیرە، ئایا پێت خۆشە هەموو خەڵکی بکوژیو منیش لەگەڵیان؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەگەر تۆ یەك پیاوت کوشت وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکت کوشتبێ، لێرە بڕۆ ئیزن دراویو پاداشت وەردەگریو تاوانبار نابی. گوتی: هاتمە دەرەوەو شەڕم نەکرد. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: ئەوە وەك ئەمەیە کە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ زیندووکردنەوەی ئەوەیە کە کەسێ نەکوژێ کە خودا کوشتنی قەدەغە کردوە. ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی لە مردن ڕزگار کردبێ. واتە: هەرکەسێ کوشتنی خەڵکی بەلاوە حەرام بێ مەگین بە هەقی خۆی، ئەوە ڕزگاری کردوە لەو کوشتنە[1] موجاهیدیش هەر وای گوتوە ﴿وَمَنۡ أَحۡيَاهَا ﴾ واتە: وازی هێنابێ لە کوشتنی[2] عەوفی گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ دەڵێت: کەسێ تەنیا کەسێکی کوشتبێ کە خودا کوشتنی حەرام کردبێ ئەوە وەك ئەو کەسە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێ[3] سەعیدی کوڕی جوبەیر گوتی: هەرکەسێ خوێنی موسوڵمانێ حەلاڵ بکات (بکوژێ) وەك ئەوەیە خوێنی هەموو خەڵکی حەلاڵ کردبێ.
ئیبنوجورەیج گوتی لە ئەعرەجەوە (الاعرج) لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ هەرکەسێ خاوەن باوەڕێ بکوژێ بە ئەنقەست، خودا وای لێدەکات جەهەنم جێگەی بێو غەزەبی لێگرتوەو بەر نەفرینی خۆی خستوەو سزایەکی زۆر گەورەیشی بۆ ئامادە کردوە. پاشان دەڵێت: ئەگەر هەموو خەڵکیشی بکوشتایە سزاکەی لەوە زیاتری نەدەکرد. ئیبنوجورەیج گوتی: لە

---

[1] الطبري (١٠/٢٢٥).
[2] الطبري (١٠/٢٣٦).
[3] الطبري (١٠/٢٣٣).

موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ گوتی: ئەگەر کەسی نەکوشتبێ، بێگومان ئەوە خەڵکی لە کوشتن ڕزگار کردوە[1].

**هەڕەشە لە هەڵەڕۆو سنوور بەزێنەکان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ پێغەمبەرانمان زۆر بەڵگەی ڕوون‌و ئاشکرایان بۆ هێنان ﴿ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان (دوای ئەم هەموو بەڵگەیە) هەڵەڕۆو سنوور بەزێن بوون، ئەمە سەرزەنشت‌و هەڕەشە کردنە لێیان لەسەر بەزاندنی سنورەکانی خودا دوای شارەزا بوونیان لێی، وەك بەنوقورەیزەو نەزیرو قینوقاع (بنو قريظة و النضير و بني قينُقاع) کە لە دەوروبەری مەدینەدا بوون، لەو جوولەکانەی کە شەڕیان لەگەڵ ئەوس‌و خەزرەجدا دەکرد، کاتێ کە شەڕ لە نێوانیاندا ڕووی ئەدا، لە کاتی نەفامیدا. پاشان کە شەڕەکە تەواو دەبوو، فیدیەی ئەو کەسانەشیان ئەدا کە دەست بەسەریان کردبوون‌و دۆستایەتیشیان دەکرد لەگەڵ ئەوانەی کە لێیان کوشتنبوون. خودای مەزن ئەو کارانەیان بە خراپ لە قەڵەم ئەدات‌و لە سورەتی بەقەرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[2] پەیمانمان لێتان وەرگرت کە: خوێنی یەکتر مەڕێژن‌و خۆتان لە زێدی خۆتان وەردەر مەنێن، پاشان دانتان بەو پەیمانەدا ناو خۆشتان شایەتی ئەدەن. لە دوای ئەوەیش هەر خۆتان بوون کوشتارتان لە یەکتری دەکرد بە پشتیوانی خەڵکی تر (بە تاوان‌و دەستدرێژی) کۆمەڵێ هەر لە خۆتانن لە وڵاتیان دەردەکەن، کە لێشتان دەست بەسەر دەکرێ هەمووتان خوێنەکەی ئەدەن، کە بۆشتان ڕەوا نیە دەریان بکەن، ئایا ئێوە بڕوا بە هەندێ لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە دەکەن‌و بڕوا بە هەندێکی ناکەن؟ هەرکەس لە ئێوە ئەوە بکات، دیارە لە ژیانی دنیادا ڕسوا دەبێ‌و لە ڕۆژی قیامەتیشدا زۆر بە توندی ئازار ئەدرێت. خودا لە هەموو کارێکیان ئاگادارە کە دەیکەن‌و بێئاگا نیە لێی.

---

[1] الطبري (١٠/٢٣٥).

[2] البقرة (٨٤-٨٥).

## سزای ئەوانەی کە دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن و خراپەکارن

خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ سزای ئـەو کەسانەی دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن و لە زەویدا هەوڵی خراپەکاری ئەدەن، کوژرانە یان لـە دار دانە یان بڕینی دەست و قاچە پێچەوانە (دەستی ڕاست و قاچی چەپ) یان لـە وڵات دوورخرانـە. مەبەست بە (المحاربة) واتە دژایەتی کردن و سەرپێچی کردن. ئەمەیش ئـەو کەسانە دەگرێتـەوە کـە خوانەناسن یان ڕێگرن، یان ترس لە ڕێگا دروس دەکەن و هەوڵی خراپەکاری ئەدەن لەسەر زەمیندا، وە هەر خراپەو تاوانێکی تریش دەگرێتەوە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عیکرمەو حەسەنی بەسریەوە کە گوتویانە: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ هـەتا دەکاتـە: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ لەسەر ئەو بت پەرستانە هاتوەتە خوار، هەرکەسێ لەوانە لـە پـێش ئـەوەی دەست بگرن بەسـەریدا تەوبەی کردبێ، ئەوە ئەم کەسە هیچ لەمانە نایگرێتەوە. ئەم ئایەتە ئـەو پیاوە موسوڵمانە ناپـارێزێ و ڕزگار ناکات لە سزای کوشتن ئەگەر کەسێکی کوشتبێ یان خراپـەی لـە زەویـدا کردبـێ یـان دژایـەتی خوداو پێغەمبەرکەی کردبێ (ﷺ) پاشان چووبێتە نـاو خوانەناسان و نـەگیرابێ، ئـەوە نابێتـە ڕێگـری بەجێهێنانی ئەو سزایەی کـە بـۆی دانـراوە[1]. (واتـە: دەبـێ ئـەو تۆڵـەی هـەر لێ بسێنرێ) ئـەبوداوودو نەسـائی ڕیوایـەتیان کـردوە لـە ڕیگـەی عیکرمـەوە لـە ئیبنوعەبباسـەوە گـوتی: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا﴾ ئـەم ئایەتـە لەسـەر بـت پەرسـتەکان هاتوەتـە خوارەوە، کەسێ لەوانە تەوبە بکات لە پێش کە دەستگیر دەکرێ، ئەوە نابێتە ڕێگری بەجێهێنانی ئەو سزای کە بۆ دانراوە.[2] ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەم ئایەتە گشتگیرە بۆ بت پەرست و هەرکەسـی تـریش کـە هەڵسابێ بەو تاوانانە، وەك بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کـردوە لـە فەرموودەکـەی ئەبوقەلابـەوە (کـە ناوی عەبدوڵلای کوڕی زەیدی جەرمی (الجرمي) بەسریە) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کە هەشت کـەس لە عوکڵ هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانیان دایە لەسەر موسوڵمان بوون. ئاوو هەوای مەدینەیان پـێ نەکەوت، نـەخۆش کـەوتن، هاواریـان بـردە لای پێغەمبـەر(ﷺ) پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: (ئایـا لەگـەڵ شوانەکەمان و وشترەکان دەچنە دەرێ شیرو میزی وشترەکان بخۆنـەوە؟) گوتیـان: بـەڵێ، چـوون و شـیرو میزەکـەیان خـواردەوەو چـاك بونـەوەو شـوانەکەی پێغەمبـەریان (ﷺ) کوشـت و

---

[1] الطبري (٢٤٤/١).

[2] أبوداود (٥٣٦/٤)، النسائي (١٠١/٧).

وشترەکانیانبرد، کە ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتەوە، ناردی بە شوێنیانداو پێیان گەین و هێنانیانەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا دەست و پێیان بڕین و چاویان کوێر کردن و فڕێ درانە بەر هەتاو تا مردن. وە لە وتەیەکی تردا هاتوە: لەبەر هەتاو فڕێ دران داوای ئاویان دەکرد ئاویان پێ نەدەدرا.[1] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی لە ئیبنوعەبباسەوە: هەرکەسێ چەك بەرزکاتەوە لە کۆمەڵێکی موسوڵمان، خەڵکی دەترساند لە ڕێگادا، پاشان گیراو پێشەوای موسوڵمانان دەستەڵاتی بوو بەسەریدا ئارەزوی خۆیەتی چی لێدەکات. مەیلی لێ بوو دەیکوژێ. مەیلی لێ بوو لە داری ئەدات، مەیلیشی لە بوو دەست و پێیان دەبڕێ.[2] سەعیدی کوڕی موسەییب و موجاهیدو عەتاو حەسەنی بەسری و ئیبراهیمی نەخەعی و زەحاك هەر وایان گوتوە. ئەمانە هەموو ئەبوجەعفەری کوڕی جوبویر ڕیوایەتی کردوە.[3] ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ سەرپشکیە (للتخيير) وەك لە قورئاندا نمونەی ئەمە هاتوە وەك لە تۆڵەی نێچیر ڕاوکردندا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا﴾[4] لە تۆڵەی ئەوەدا دەبێ دەبێ وێنەی نێچیرە کوژراوەکە کەفارەت بدات، دوو کەسی دادگەر بڕیاری لەسەر بدەن و ئەو کەفارەتە بهێنێتە ماڵی کەعبە و لەوێ بیکاتە قوربانی یان بارتەقاری ئەو نێچیرە خواردن بدات بە هەژاران یان بە ئەندازە قیمەتی ئەو نیچچیرە چەند ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت لە بارتەقای ڕزگارانەدا (الفدية): ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖۚ﴾[5] کێش لە ئێوە نەخۆشە یان سەری ئازاری هەیە، لە بارتەقای بەڕۆژوو بێ یان خێرێك ببەخشێتەوە، یان ئاژەڵێك بکاتە خێر لە هەر لەوێدا. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای مەزن ئەفەرموێت لە بارتەقای شوێندا: ﴿فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ﴾[6] دەبێ لە بارتەقای ئەوەدا خواردن بدەن بە دە هەژار لەو خواردنەی بە

---

[1] فتح الباري (١٢/١١٤)، مسلم (٣/١٢٩٦).

[2] الطبري (١٠/٢٦٣).

[3] الطبري (١٠/٢٦٢-٢٦٣).

[4] المائدة (٩٥).

[5] البقرة (١٩٦).

[6] المائدة (٨٩).

ئاسایی ئەیدەن بە خێزانی خۆتان. یان دەبێ جلو بەرگی دە هەژار بدەن، یا کۆیلەیەك ڕزگار بکەن.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ یان شار بەدەر بکرێن. هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی ئەوەیە هەوڵ بدرێ دەستگیر بکرێو تۆڵەی لێ بسێنرێ. یان لە وڵاتی موسوڵمانانندا ڕادەکاتو نامێنێ. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسو ئەنەسی کوڕی مالیكو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاكو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو زوهریو لەیسی (لیث) کوڕی سەعدو مالیکی کوڕی ئەنەسەوە. هەندێکی تریش گوتویانە: ئەو کەسە لەو وڵاتەی خۆی دەردەکرێ بۆ وڵاتێکی تر، یان کاربەدەست یان جێگرەکەی لەسەر کارەکەی دووری دەخەنەوە بە تەواوی[1] سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوشەعساءو (الشعثاء) حەسەنو زوهریو زەحاكو موقاتیلی کوڕی حەیان گوتیان: ئەو کەسە شاریەدەر ناکرێو لەسەر زەوی ئیسلامیش دەرناکرێ. هەندێکی تر گوتویانە: مەبەست بە دەرکردن لێرەدا بەند کردنە (السجن) پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەم سزایە بۆ ئەوانە ڕسوا بوونە لە دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەشیان سزادانی گەورەیە. واتە: ئەمەی کە باسم کرد لە کوشتنیانو هەڵواسینیانو بڕینی دەستو پێیان بە پێچەوانەو (ڕاستو چەپ) شار بەدەرکردنیان هەموو بۆ ڕسوا بونیانە لەناو خەڵکدا لەم ژیانەی دنیادا. لەگەڵ ئەوەیش کە خودا بۆی هەڵگرتوون لە سزای زۆر سەختو گران لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەم ئایەتە پشتگیری قسەی ئەو کەسانە دەکات کە دەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر بت پەرستان هاتوەتە خوارەوە، بەڵام کۆمەڵێ موسوڵمانان لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانی لێ وەرگرتین وەك لە ژنانی وەرگرت، کە لە هیچ شتێکدا هاوەڵ بۆ خوا دانەنێینو دزی نەکەینو داوێن پیسی نەکەینو منداڵەکانی خۆمان نەکوژین، ئازاری یەکتری نەدەین. هەرکەس پارێزگاری لە پەیمانەکەی بکات لە ئێوە پاداشتەکەی لەلای خودای مەزنە، هەرکەسێ شتێ لەمانەی توش بوو تۆڵەی لێ دەسێنرێ، ئەو تۆڵەیە بارتەقایە بۆی. هەرکەسیش خودا خۆی بۆی داپۆشی، ئەوە کارەکەی لەلای خودا خۆیەتی. مەیلی لێ بوو سزای ئەداتو مەیلیشی لێ بوو لێی دەبورێ.[2] وە لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ تاوانێ لە تاوانەکانی کرد لە دنیا، سزادرا پێی، خودا لەوە دادپەروەرترە کە سزاکەی دووبارە بکاتەوە لەسەر ئەو عەبدەی خۆی. وە کەسێ تاوانێ لە تاوانەکانی کرد لە دنیاداو خودا بۆی داپۆشیبێو چاوپۆشی لێ کردبێ. خودا لەوە خاوەن ڕێزترە کە

---

[1] الطبري (١٠/٢٦٨-٢٧٠).

[2] مسلم (٣/١٣٣٣).

سزای بداتەوە لە شتێکدا کە چاوپۆشی لێکردووە)[1]. ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی گوتی: فەرموودەیەکی حەسەنو غەریبە، پرسیان لە (الدار القطني) لەبارەی ئەم فەرموودەوە گوتی: بە مەرفوعیو مەوقوفی هاتوە بەڵام فەرفەعیەکەی سەحیحە[2] ئیبنوجەریر گوتی: لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا﴾ ئەوە ڕسواییە بۆیان لە دنیادا. واتە: شەرمەزاریو ڕسواییو سزاو تۆڵەیە بۆی لە دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لە ڕۆژی سزای گەورەیان بۆ دانراوە. واتە: ئەگەر پەشیمان نەبونەوە لەو کارەیان کردویانە هەتا دەمرن. لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانە دوای ئەو سزایە لە دنیادا دران، لەوێش سزای گەورەیان بۆ دانراوە. واتە: جەزرەبەی جەهەنم[3].

**سزای دژایەتی لادەچێ کاتێ کە ئەوانەی دژایەتی دەکەن پەشیمان ببنەوە وە پێش ئەوەی دەست بگیرێ بەسەریاندا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ ۖ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ مەگین ئەوانەی پێش لەوە دەکەونە ژێر دەستتان پەشیمان ببنەوەو تۆبە بکەن، ئێوەش باش بزانن کە لە پاش پەشیمان بونەوەیان خوا لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە. ئەم ئایەتە لەسەر قسەی ئەو کەسانەی کە وتویانە لەسەر خەڵکی بت پەرست هاتوەتە خوارەوە، ڕوونو ئاشکرایە، بەڵام لەبارەی ئەو موسلوڵمانانەی کە دژایەتیو شەڕ دەکەن، ئەگەر پەشیمان بونەوەو تەوبەیان کرد ئەوە کوشتنو هەڵواسینو دەستو پێیان نابڕێ، لە ئایەتەکەیشەوە دەردەکەوێ کە هیچ لایەکیان سزا نادرێن، هاوەڵەکانی پێغەمبەریش هەر وایان کردوە. وەك ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە شەعبیەوە وتی: حاریسەی (حارثة) کوڕی بەدری تەمیمی کە خەڵکی بەسرە بوو. خراپەو تاوانی زۆری کردبو لە زەویدا، قسەی لەگەڵ هەندێ خەڵکدا کردبوو لە قورەیشیەکان لەوانە حەسەنی کوڕی عەلیمیو ئیبنوعەباسو عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر، کە داوای لێبوردن بۆ بکەن لەلای عەلی، لێی نەبورابوو. ئەویش هاتبوە لای سەعیدی کوڕی قەیسی هەمەدانیو ئەمیش لە ماڵی خۆیدا دایناو، پاشان چووە لای ئیمامی عەلی پێی وت: ئەی گەورەی موسوڵمانان چی دەڵێیت لەبارەی کەسێکەوە کە خراپەی لەزەویدا کردوەو دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیشی کردوە، (پەشیمان بوەتەوە) ئەم ئایەتانەی

---

[1] أحمد (١/١٥٩)، تحفة الاحوذي (٧/٣٧٧)، إبن ماجة (٢/٨٦٨)، تیرمیزی گوتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[2] الدار القطني (٣/٢١٥).

[3] الطبري (١٠/٢٧٦).

بۆ خوێندەوە هەتا دەگاتە: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾ وتی: نامەی لێبوردنی بۆ نوسی. سەعدی کوڕی قەیس وتی: ئەو کەسە حارسەی کوڕی بەدر بوو. ئیبنوجەریریش ڕیوایەتی کردوە[1]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە عامیری شەعبیەوە وتی: ئەی ئەبوموسا ئەمە شوێنی پەنا هێنانی کەسێکە بۆتۆ. من فلانی کوڕی فلانی مورادیم، وە من یەکێك بوم لەو کەسانەی کە دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردوەو خراپەکاریشی لە زەویدا کردوەو پێش ئەوەی دەست بیگرێ بەسەریدا تەوبەی کردوە. ئەبوموسا هەڵساو وتی: ئەم پیاوە فلانی کوڕی فلانە، کەس دەست نەداتە ڕێی بە چاکە نەبێ، ئەگەر ڕاستی کرد، ئەوە ڕێی ڕاستگۆیانی گرتوەتە بەر. ئەگەر درۆیشی کرد، تاوانەکانی خۆی یەخەی دەگرێ، ماوەیەکی زۆر مایەوە، پاشان لەوێ ڕۆشت تاوانەکانی یەخەی گرتو خودا لەناوی دا. دیسان ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە مووسای کوڕی ئیسحاقی مەدنیەوە (المدني) کە عەلی ئەسەدی دژایەتی کردو لە ڕێگادا خەڵکی دەترساندو دەیکوشتوماڵی تالان دەکرد، پێشەوایانی ئیسلامو خەڵکی تریش دەگەڕان بە دوایدا (هەتا بیگرن) بۆ هیچ کەس نەگیرا هەتا ئەو کاتەی هاتو تەوبەی کرد. کاتێ کە گوێی لە پیاوێ بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾[2] ئەی بەندەکانی من، ئەی ئەوانەی لەبەلادان لە ئەندازە ناهەقیتان لە خۆتان کردوە، نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا بێ هیوا بن، چونکە لە هەموو گوناهێك چاوەپۆشێ، ئەو لێبوردەو دلۆڤانە. لەسەر ئایەتەکە وەستاو پاشان وتی: ئەی بەندەی خودا جارێکی تر بیخوێنەرەوە، ئەویش دووبارەی کردەوە بۆی. شمشێرەکەی کردەوە بە کێلانەکەیدا، پاشان هات تەوبەی کردو لە بەرەبەیاندا هاتە ناو مەدینەو خۆی شۆردو پاشان چووە مزگەوتی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد پاشان لەلای ئەبوهورەیرەدا لەناو هاوەڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کاتێ کە ڕۆشنی کرد خەڵکەکە ناسیانو هەڵسان بۆی، ئەمیش پێی وتن، ئێوە ناتوانن هیچ شتێکم لەگەڵدا بکەن. من هاتووم بۆ لای ئێوە، پێش ئەوەی دەست بگرن بەسەرمدا تەوبەم کردوە، ئەبوهورەیرە وتی: ڕاست دەکات، دەستی گرتو بردی بۆ لای مەروانی کوڕی حەکەم کە لەو کاتەدا فەرمانڕەوای مەدینە بوو لە زەمانی مەعاویەدا، وتی: ئەمە عەلیە هاتوەو تەوبەی کردوە. کەستان بۆی نیە هیچی بەرانبەر بکات. بۆیشی نیە بیکوژێ. وازی لێ هێنرا لەو شتانەی کە کردبویو عەفوو کرا. عەلی کە تەوبەی کرد بەرەو دەریا کەوتە ڕێ بۆ غەزا کردن لە ڕێی خوادا. خۆی گەیاندە ڕۆمەکانو کەشتیەکەی لە کەشتی ڕۆمەکان نزیك خستەوە لە دەریاداو پەلاماری

[1] الطبري (١٠/٢٨٠).

[2] الزمر (٥٣).

کەشتی ڕۆمەکانی داو چووە ناو کەشتیەکەیان، ئەوان چوونە لایەکی کەشتیەکەیانو ئەمیش لە لایەکیدا بوو، کەشتیەکەیانی بە خۆیی و ئەوانەوە لار کردەوەو هەڵی گێڕایەوە هەموویان بە یەکەوە نوقم بوونو خنکان[1].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٣٦ يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ٣٧ ﴾

## فەرماندان بە لەخوا ترسیو خۆ نزیك خستنەوە لێیو غەزا كردن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان لە خودا بترسن لێرەدا خودای گەورە فەرمان دەكات بە عەبدە بڕوادارەكانی كە لێی بترسن، كاتێ لەخواترسیو گوێڕایەڵی خرابنە پاڵ یەك مەبەست پێی وازهێنانە لەو شتانەی كە قەدەغەنو دووركەوتنەوەیە لێیان. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾ ڕێی نزیك بونەوە بەرەو خودا بگرن. سوفیانی سەوری وتی: باوكم بۆی باس كردین لە ئەبوتەلحەوە لە عەتاوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: واتە: نزیك بونەوە[2] موجاهیدو ئەبووائیلو حەسەنو قەتادەو عەبدوڵڵای كوڕی كەسیرو سوودیو ئیبنوزەیدو كەسانی تریش هەر وایان وتوە. قەتادە وتی: واتە: نزیك ببنەوە لێی بە گوێڕایەڵیو كار بەو شتانەی كە لێی ڕازیە.[3] ئیبنوزەیدیش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ ﴾[4]، ئەو كەسانەی ئەوان هانایان بۆ دەبەن. كامانیانە نزیكترن بە دوای هۆدا دەگەڕێن كە بگەن بە پەروەردگاریان. ﴿ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾ ئەوەیە كە هۆیەوە مەبەستێ بەدی دەهێنرێ وە ئەو نیشانەیشە كە لە جێگەدایە لە بەهەشتا، كە شوێنی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ماڵەكەیەتی لە بەهەشتدا. كە نزیكترین شوێنی بەهەشتی لە تەختەوە (العرش) لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە جابیری كوڕی عەبدوڵڵاوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی كاتێ گوێی لە بانگە

[1] الطبري (١٠/٢٨٤).
[2] الطبري (١٠/٢٩١).
[3] الطبري (١٠/٢٩١).
[4] الاسراء (٥٧). الطبري (٢٩١).

بلّێ: اللهم رب هذه الدعوة التامة و الصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة و الفضيلة، و أبْعَثهُ مقاماً محموداً الذي وعدتَهُ إلا حلت له شفاعتي يوم القيامة)[1] واته: (ئەی خودایە، پەروەردنەی ئەو بانگهێشتە تێرو تەواوو نوێژە بەردەوامە، وەسیلەو فەزیلە (الوسيلة و الفضيلة) ببەخشە بە موحەممەدو (ﷺ) ڕەوانەی کەرە ئەو جێگە سوپاسکراوە (المقام المحمود) کە بەڵێنت پێداوە، مەگین شەفاعەتی بۆ ڕەوا دەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا). وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (کاتێ گوێتان لە بانگنوێژ بوو (بانگی ئەدا) ئەوەی ئەو دەیڵێت ئێوەیش وەك ئەو بیڵێن، پاشان سڵاوات لەسەر من بدەن، چونکە هەرکەسێ سڵاواتێ لەسەر من بدات خودا دە سڵاوات لەسەر ئەو ئەدات، پاشان داوای وەسیلەم (الوسيلة) بۆ بکەن، چونکە وەسیلە جێگەیەکە لە بەهەشتدا بۆ هیچ کەسێ تەنیا بۆ عەبدێ لە عەبدەکانی خودا نەبێ، هیوام وایە من ئەو کەسە بم، هەرکەسێ داوای وەسیلەم بۆ بکات شەفاعەتی بۆ ڕەوا دەبێ)[2]

پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ تێبکۆشن لە ڕێی ئەودا (بچنە غەزا) بەڵکو تووشی ڕزگاری بن. کاتێ کە خودا فەرمانی پێدان کە دوورکەونەوە لە قەدەغە کراوەکانو وازی لێ بێننو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بنو ئاکاری چاك بکەن، لەگەڵ ئەوەیشدا داوایان لێ دەکات کە بجەنگن لەگەڵ دوژمنان لە خوانەناسانو ئەو موشریکانەی کە لە ڕاستەڕێ دەرچوونو لایان داوەو ئاینی ڕاستیان واز لێهێناوە، باوەڕداران هەڵدەنێ بۆ ئەو مەبەست، ئەو بەڵێنەی کە داویەتیو ئامادەی کردوە بۆ ئەو کەسانەی کە گیانی خۆیان دەبەخشن لە ڕێی ئەودا لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕزگاریو خۆشبەختی زۆر گەورەو مانەوەی تاهەتایی هەرگیز دوای نایەتو ناگۆڕێ لەناو ناچێ لە کۆشکی زۆر بەرزو بڵندو ئارامو ڕازاوەو شێوە جوانو شوێنی چاکدا هەرکەسێ لەوێدا نیشتەجێ بێ بەهرەمەندەو ناخۆشی تووشی نایەتو هەر دەمێنێو هەرگیز نامرێو جلو بەرگی پیسو چڵکن نابێو هەرگیز لاوێتی لە دەست نادات هەمیشە گەنجە.

## بارتەقا (فدية) لە خوانەناس وەرناگیرێ لە ڕۆژی قیامەتداو هەمیشەو بەردەوام لەناو ئاگردان

پاشان خودای مەزن باسی ئەوەی کردوە کە ئامادەی کردوە بۆ دوژمنەکانی لە خوانەناسان لە سزاو تۆڵەی سەخت لە ڕۆژی قیامەتداو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەو کەسانەی خوانەناس بوون، ئەگەر هەرچی لەم زەمینەدا هەیەو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێ بۆ ئەوەی

[1] فتح الباري (٨/٢٥١).

[2] مسلم (١/٢٨٨).

خۆیانی پێ بکڕنەوە بە هیوای ئەوەی لە جەزرەبەی ڕۆژی قیامەت ڕزگاتریان کات. وەرناگیرێ لێیان‌و بە هیچ ناچێ‌و ئازاری زۆر بە ژانیان هەر تووش دەبێ‌و جێگە ناگرێ بۆیان. ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ هەوڵ ئەدەن کە لەناو ئاگر دەرچن، بەڵام هەرچی هەوڵ بدەن بێ سوودەو هەرگیز ناتوانن دەرچن‌و ئازارێکی بێ بڕانەوەیان دەبێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا﴾[1] هەر کە هەوڵ ئەدەن لەو داخ‌و کەسەرو پەژارەیە دەرچن دەگێڕنرێنەوە ناوی. واتە: بەردەوام هەوڵی دەرچوون ئەدەن بۆ دەرباز بوون لەو ناڕەحەتی‌و سزا سەخت‌و بە ژانەی کە تێدان، بەڵام هەرچی دەکەن بێ سوودە، هەر کە بڵێسەی ئاگر بەرزیان دەکاتەوەو دەکەونە سەری سەرەوەی جەهەنم دەرگاوانەکانی جەهەنم بە چەکوشی ئاسنین لێیان ئەدەنەوەو دەیانگێڕنەوە ناو بنی جەهەنم. ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ سزای بەردەوامیان هەیەو هەرگیز لێی دەرناچن‌و ڕزگار بونیان نیە لێی. لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوێ لە خەڵکی ناو ئاگر دەهێنرێت، پێی دەوترێ: ئەی ئەوەی ئادەم چۆن جێگەکەی خۆت بینی؟ ئەویش دەڵێت: خراپترین جێگەیە، پێی دەوترێ: ئایا بە ئەندازەی زەوی ئاڵتون ئەدەی (ڕزگارت ببێ)؟ وتی: دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، خودایش ئەفەرموێت: درۆت کردوە، من کەمترم لە تۆ داوا کردوە لەوە، تۆ نەتکرد، فەرمانی پێدەکرێ بۆ ئاگر) موسلیم‌و نەسائی ڕیوایەتیام کردوە[2].

﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾﴾

**فەرماندان بە بڕینی دەستی دز**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ هەرکەسێ دزی بکات (نێر بێ یان مێ فەرقی نیە) لە سزای دزی کردن دەبێ هەردوو دەستیان ببڕن، کە ئەمە تەمبێ (تەنبێ) کردنە لەلایەن خوداوە، خودا خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە. خودای گەورە فەرمان‌و بڕیاری بڕینی دەستی دزی نێرینەو مێینەی داوە، دەست بڕین لە

---

[1] الحج (٢٢).

[2] مسلم (٢١٦٢/٤)، النسائي (٣٦/٦).

کاتی نەفامیشدا هەر بوە، لە ئیسلامیشدا بڕیاری لەسەر دراوە، بەڵام چەند مەرجێکی بۆ زیاد کراوە، وەك لەمەویەدوا باسی دەکەین خوا مەیلی لێبێ. وەك چۆن (القسامة و الدية و القراض) چەندین شتی تریش کە لە شەرعدا هاتوەو بڕیاری لەسەر دراوەو وەك خۆی چۆن بوە ماوەتەوەو هەندێکی لێ زیاد کراوە، ئەوەیش هەر بۆ تەواو کردنی ئەو بەرژەوەندیانەیە.

## کەی دەستی دز دەبڕێ

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا نەفرینی لە دزێك کە هێلکەیەك ئەدزێ، دەستی دەبڕێ. لەوەیش کە گوریسێ ئەدزێ، دەستیشی دەبڕێ (لەسەری))[1] دیسان بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەستی دز نابڕێ مەگین لە ڕوبعە دیناری یان زیاتر بێ)[2] موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەستی دز نابڕێ مەگین لە ڕوبعێ یان زیاتر بێ)[3] ئەم فەرموودەیە ئەو کێشەی بڕیوەتەوە دەقێکیشە کە بڕیاری لەسەر ڕوبعە دیناری داوە، نەك شتێ بە ئەندازەی ڕوبعە دیناری بێ. وە فەرموودەکەی هەشت یەکی (المجن) کە دەکاتە سێ درهەم دژایەتی لەگەڵ ئەم دەقەدا نیە، چونکە لەو کاتەدا دیناری بە (١٢) دوانزە درهەم بووە، کە هەشت یەکی ڕوبعە دیناری بووە. دەتوانرێ بەم ڕێگەیە ڕێك خرێت، ئەم بۆچونە ڕیوایەت کراوە لە عومەری کوڕی خەتابو عوسمانی کوڕی عەفانو عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو لەیسی کوڕی سەعدو ئەوازاعیو شافیعیو هاوەڵەکانیو ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی لە ڕیوایەتێکیداو ئەبوسەورو داوودی کوڕی عەکی زاهیریش هەر وا دەڵێن (ڕەحمەتی خوایان لێبێ). ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی لە ڕیوایەتێکیدا وتویانە ڕوبعە دیناری یان سێ درهەم یان بە ئەندازەیان هەرکەسێ بیدزێ دەستی دەبڕێت. بەڵام ئیمامی ئەحمەدو ئەبوحەنیفەو هاوەڵەکانی ئەبویووسفو موحەممەدو زوفەرو سوفیانی سەوریش ڕایان وا بوە کە لە دە درهەمی لێدراو (سکە) تێکەڵاو خراپ نەبوو دەست دەبڕێت. بەڵام قسەی یەکەم ڕێكو تەواوە. کە لە ڕوبعە دینارێك یان زیاتر دەست دەبڕێت. ئەمەیش لە مەسەلەی دەست بڕیندا جێی خۆیەتی. هەتا خەڵکی هەوڵی بردنیماڵی خەڵکی نەدەن، ئەمەیش زۆر ڕاستەو پڕە لە کارزانی لەلای ئەوانەی کە خاوەن ئاوەزن، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ

---

[1] فتح الباري (١٢/٨٣)، مسلم (٣/١٣١٣).
[2] فتح الباري (١٢/٩٩)، مسلم (٣/١٣١٢).
[3] مسلم (٣/١٣١٣).

﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ هەرکەسێ دزی بکات (نێر بێ یان مێ جیاوازی نیە) لە سزای دزی کردن دەبێ هەردوو دەستیان ببڕن. کە ئەمە تنبێ کردنە لە خواوە، خودا خاوەن دەسەڵاتێکی لەکارزانە. واتە: لە تۆڵەی ئەو کارە خراپەیاندا کە کردویانەو بە دەستیان ماڵی خەڵکیان بردوە. جێی خۆیەتی کە ئەو شتەی ماڵەکەیان پێ هەڵگرتوە ببڕێت، ئەمەیش تەمبێ کردنێکە لەلایەن خودای گەورەوە لەسەر ئەو کارە خراپەیان کە کردویانە. ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ﴾ خودا خاوەنی دەسەڵاتە لە تۆڵە سەندنداو ﴿حَكِيمٌ﴾ لە کارزانە لە فەرمان و بڕیارو قەدەغە کردن و شەرعیدا.

**ئەو کەسەی دزی دەکات تەوبەی لێ قبووڵ دەکرێ**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرکەسیش دوای ناهەقی کردن پەشیمان ببێتەوەو ڕێگای چاکە بگرێتە بەر خودا تۆبەی لێ قبول دەکات و خوا لێبوردەو دلۆڤانە. واتە: ئەوەی دوای دزی کردنەکەی تۆبە بکات و پەشیمانی دەربڕێ و بگەڕێتەوە بۆ لای خودا، لە نێوان خۆیی و خوادا تەوبەی ڕاستەقینە بکات. خودا لێی وەردەگرێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە کە ژنێك لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دزی کرد، ئەوانەی دزیەکەی لێ کردبوون هێنایان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ژنە دزی لێ کردووین، خزمەکانی وتیان: ئێمە بارتەقاکەی (فیدیەکەی) ئەدەین. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەستی ببڕن) وتیان: ئێمە پێنج سەد دینار ئەدەین لەباتیدا. فەرمووی: (دەستی ببڕن) دەستی ڕاستی بڕا. ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ تۆ لەم تاوانەتدا وەك ئەو ڕۆژەت لێ دێت کە دایکت تۆی بووە) (واتە: گوناهت لەسەر نامێنێ) خودای گەورە لە سورەتی مائیدەدا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] ئەم ژنە ئەو ئافرەتە مەخزومیە بوو کە دزیەکەی کردبوو. باسەکەی لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە زوهری ڕیوایەتی کردوە لە عوروەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: قورەیشیەکان دزی کردنی ئەو ژنەیان زۆر بەلاوە گرنگ بوو لە زەمانی پێغەمبەرا (ﷺ) لە کاتی غەزای فەتحی مەککەدا. وتیان: کێ لەم بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خودا بکات؟ وتیان: کێ دەتوانێ ئەوە بکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە خۆشەویستی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) ئینجا ئەو ژنەیان لای پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەیش چووە خزمەت و قسەی لەسەر کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ڕەنگی تێکچوو فەرمووی: (ئایا بۆ لابردنی سزایەك

[1] أحمد (٢/١٧٧)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە لەبەر لاوازی ئیبنولەهیعە.

لە سزاکانی خودا تکا دەکەیت؟) ئوسامە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لێبوردنم بۆ بکە لەلای خودا، کاتێ شەو داهات پێغەمبەر(ﷺ) هەڵساو وتارێکی داو سوپاسو ستایشی خودای گەورەی کردو فەرمووی: ((اما بعد) ئەوانەی پێش ئێوە تەنیا بەوە تیاچوون: ئەگەر پیاوماقوڵێك لەناویاندا دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا بەڵام کاتێ کەسێکی هەژارو بێ دەستەڵات لەناویاندا دزی بکردایە سزایان بەسەردا جێبەجێ دەکرد وە من سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم) عائیشە دەڵێ: ئەم ئافرەتە ئیتر دوای ئەوە تەوبەیەکی چاکی کردو شویشی کرد پاشان دەهات بۆ لام سەردانی دەکردم ئەگەر پێویستیەکی بوایە بەرزم دەرکردەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)[1]. وە لە وتەیەکی تری موسلیمدا هاتوە لە عائیشەوە وتی: ئافرەتێکی مەخزمی هەبوو کەلو پەلو شتومەکی دەخواشت (لە خەڵکی)و پاشان حاشای لێ دەکرد (واتە: نەی ئەدایەوە) پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بە بڕینی دەستی[2]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئایا تۆ خۆت نەتزانیوە ئەم ئاسمانانو زەمینە مولکی خودان؟ هەرکەسێ خۆی مەیلی لێبێ ئازاری ئەداتو هەرکەسیش خۆی مەیلی لێبێ لێی دەبورێ؟ خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. واتە: هەر خودا خۆی خاوەنی هەموو شتێکەو فەرمانڕەوایی تێدا دەکاتو هیچ کەس ناتوانێ دەست بخاتە کاروباریو هەرچی بوێ دەیکات.

﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا ۛ سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا ۚ وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٤١) سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَاءُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئًا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٤٢) وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ (٤٣) إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا

---

[1] فتح الباري (٧/٦١٩)، مسلم (٣/١٣١٥).

[2] مسلم (٣/١٣١٦).

ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ (٤٤)﴾

**ئاگادار كردنەوە بە خەمو خەفەت نەخواردن لەسەر هەڵسوكەوتەكانی جوولەكەی و دووڕووەكان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆت بەوانە دڵتەنگ مەكە كە بۆ لە دین وەرگەڕان پەلەیانە. ئەم ئایەتە لەسەر ئەو كەسانە هاتوەتە خوارەوە كە بەپەلە لە ئاین دەردەچنو بێ دین دەبنو گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەكەی ناكەنو هەواو ئارەزوی خۆیان پێش بەرنامەو شەریعەتی خودای مەزن دەخەن ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ﴾ بەوانە كە دێنە لاتو بە دەم دەڵێن: بڕوامان بە تۆ هێناوەو دڵیان بڕوای نەهێناوە. واتە: بە زمانیان بڕوای خۆیان ئاشكرا كردوە، بەڵام دڵیان كاوڵو چۆڵو وێرانە بڕوای تیا نیە، ئا ئەوانە دووڕووەكانن ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ هەروەها لەو جوولەكانەش خۆت تووشی خەمو خەفەت مەكە. ئەوانە دوژمنی ئیسلامو خەڵكی موسوڵمانیشن ﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ﴾ كە گوێ بۆ درۆ هەڵدەخەن. واتە: ئەوانە هەموو بە دەم درۆوە دەچنو حەزی لێ دەكەن ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ﴾ فێر بوون قسە لە خەڵكی تر دەبیسنو دەیقۆزنەوە، كە ئەوانەش هەرگیز نەهاتونەتە لای تۆ. واتە: گوێ دەگرنو دەڕۆن بە دوای قسەی خەڵكی تردا، كە هەرگیز ئەوانە نەهاتونەتە مەجلیسی تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ). وتراوە: مەبەست پێی ئەوانەن گوێ هەڵدەخەن بۆ قسەو دەیگەیەنن بەو كەسانەی كە لەلای تۆ ئامادە نابن لە دوژمنەكانت.

**جوولەكەكان قسەكان دەگۆڕنو هەوڵی خۆ لادان ئەدەن لە ڕەجم كردن لە بەسەرهاتی دوو جولەكەكەدا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾ جێگۆڕكێ بە قەسەكان دەكەن. واتە: بە مانایەكی تر لێكی ئەدەنەوە دوای ئەوەی باش لێی تێگەیشتوون، خۆیان چاك دەزانن. ﴿يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُواْ﴾ دەڵێن: فلان قسەیان بۆ كردن وەری گرن دەنا خۆتانی لێ بپارێزن. وتراوە: ئەم ئایەتە لەسەر كۆمەڵێكی جوولەكە هاتوەتە خوارەوە كە لە یەكتریان كوشتبوو، وتیان: وەرن با دادگایەكەی ببەینی لای موحەممەد (ﷺ) ئەگەر بڕیاری دا خوێن بدرێ قبوڵی بكەن، ئەگەر بڕیاری تۆڵەیشی دا گوێی بۆ مەگرن. بەڵام ڕاستیەكەی ئەوەیە كە لەسەر

ئەو دوو جولەکە هاتە خوارەوە کە داوێن پیسیان کردبوو. جوولەکەکان ئەو وتـەی تـەوراتیان گۆڕیبـوو کە لەبارەی بەردەبارانی (رجم) کردنی ئەو پیاوو ژنانەی داوێن پیسی دەکەن لە خۆیان، سەد قەمچی‌و وەستانیان لەبەر هەتاو سواری کەر کردنیان بە هەڵگەڕاوەی‌و پشتی لەیەکتری. کاتێ کە ئـەو ڕووداوە ڕوویدا دوای کۆچ کردن بۆ مەدینە. جوولەکەکان لە نێوان خۆیاندا وتیان: وەرن با دادگەریەکە ببەینە لای موحەممەد (ﷺ) ئەگـەر بڕیاری قامچی لێدان‌و وەستان لەبـەر هـەتاوی دا قبـوولی بکـەن‌و ئـەو بڕیارەی ئەو بکەنە بەڵگە لە نێوان خۆتان‌و خوادا، ئەو کاتە دیارە کە پێغەمبـەرێ لـە پێغەمبـەرەکانی خودا فەرمانی داوە لە نێوانتاندا لـەو بارەیـەوە. وە ئەگـەر بڕیاری بەردەبارانیـشی دا، ئـەوا بـە گـوێی مەکەن. چەندین فەرموودە لەو بارەیەوە هاتوە، مالیك وتی لە نافیعەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان: پیاوو ژنێ لەوان داوێـن پیسیان کردوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وتن: (چیتان هەیە لەناو تەوراتدا لـەبارەی بەردەبارانـەوە (الرجم)؟) وتیان: ئابڕوویان دەبەین‌و قامچیان لێ ئەدەین، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام وتی: درۆتان کرد. لـە تەوراتدا بەردەباران (رجم) هەیە، تەورات بێنن. تەوراتیان هێناو کردیانەوە، یەکێکیان دەستی لەسـەر ئایەتی بەردەبان داناو پێشی‌و پاشی ئایەتەکەی خوێندەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام پێی وت: دەستت هەڵبڕە دەستی بەرز کردەوە، ئایەتی بەردەبارانەکە لەژێر دەستیدا بوو. وتیان: ئەی موحەممەد (ﷺ) ڕاستی کرد، ئایەتی بەردەبارانی تێدایە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا هەردوویان (پیـاوو ژنەکـە) بەردەباران کران. پیاوەکەم بینی خۆی لار دەکردەوە بەسـەر ژنەکـەدا هـەتا لـە بـەردەکان بیپـارێزێ‌و بەری ئەم بکەوێ. بوخـاری‌و موسـلیم ئـەم فـەرموودەیان هێنـاوەو ئـەم وتـە وتـەی بوخاریـە. وەك لـە وتەیەکی تریدا وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە جوولەکەکان: (ئێوە چییان لەگەڵدا دەکەن؟) وتیان: ڕوویـان ڕەش دەکـەین‌و ئابڕوویـان دەبـەین. فـەرمووی: ﴿فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾[1] ئەگەر ئێوە ڕاستن، تەورات بێنن بیخوێننەوە. تەوراتیان هێنا وتیان بە پیاوێ لە خۆیـان (لـەو کەسـانە بوو کە لێی ڕازی بوون کوێر بوو) بخوێنە، خوێندی هەتا گەیشتە شوێنی لە تەوراتدا، دەستی نایە سەر ئەو شوێنە فەرمووی: دەستت بەرز بکەرەوە، بەرزی کردەوە، کە بـەرزی کـردەوە ئایـەتی بـەردەباران (الرجم) دەرکەوت، وتـی: ئـەی موحەممـەد بەڕاسـتی ئایـەتی بـەردەبارانی تیایـە، بـەڵام ئێمـە لـەنێوان خۆماندا دەمانشاردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بۆ دەرکردن بەردەباران (رجـم) کران[2] لـە سـەحیحی موسلیمدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژن‌و پیاوێکی جوولەکـەیان هێنایـە لای کـە داوێـن پیـسیان

[1] آل عمران (٩٣).

[2] الوطأ (٨١٩/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

کردبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆشت بۆ لای جولەکەکانو فەرمووی: (چیتان لە تەوراتدا هەیە لەبارەی کەسێکەوە داوێن پیسی کردبێ؟) وتیان: ڕوویان ڕەش دەکەینو لەبەر هەتاو دایاندەنێینو سواری (کەریان) دەکەینو ڕوویان لە یەکتری وەردەگێڕینو دەیانگێڕین. فەرمووی: ﴿فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[1] تەورات بێننو بیخوێننەوە ئەگەر ئێوە لە ڕاستگۆیانن. وتی: تەوراتیان هێناو خوێندیانەوە هەتا بەسەر ئایەتی بەردەباراندا (الرجم) تێپەڕی، ئەو لاوەی کە دەیخوێندەوە دەستی خستە سەر ئایەتی بەردەبارانەکە (الرجم) پێشەکەیو پاشەکەی خوێندەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام پێی وت، کە لەگەڵ پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) فەرمانی پێبکە با دەستی بەرز بکاتەوە دەستی بەرز کردەوە، کە دەستی بەرز کردەوە ئایەتی بەردەباران لەژێر دەستیدا بوو. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دەرکرد بۆیانو بەردەباران کران. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وتی: منیش لەگەڵ ئەو کەسانەدا بووم بەردەبارانیان کردن، من بە چاوی خۆم بینیم پیاوەکە ژنەکەی بە لاشەی خۆی لە بەردەکان دەپاراست[2] ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە وتی: کۆمەڵێ لە جولەکەکان هاتن بانگی پێغەمبەری خودایان (ﷺ) کرد بۆ قوفف (القُفّ) پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لایان لە (بیت المدارس) وتیان: ئەی ئەبولقاسم پیاوێ لە ئێمە داوێن پیسی لەگەڵ ژنێکدا کردوە، دادگری بکە، وتی: پاڵپشتێکیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) داناو لەسەری دانیشت پاشان فەرمووی: (تەوراتم بۆ بێنن) بۆیان هێنا پاڵپشتەکەی لەژێر خۆی دەرهێناو تەوراتەکەی لەسەر داناو فەرمووی: (بڕوام بە تۆ هێناوەو بەوەیش دایبەزاندووی) پاشان فەرمووی: (زاناترین کەستانم بۆ بێنن) کوڕشێکی لاویان هێنا پاشان بەسەرهاتی بەردەبارانەکەی باس کرد، وەك فەرموودەکەی مالیکی کوڕی نافیع[3] ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دادگەری کردوە بەو شێوەی کە تەورات کردویەتی، ئەمەیش لەبەر ڕێزلێنان نەبوە لەسەر ئەو شتانەی ئەوان بڕوایان وایە ڕاستە، چونکە ئەوان فەرمانیان پێکراوە کە شوێنی شەرعی موحەممەدی بکەنو لێی لانەدەن بێگومان ئەوەیش بە نیگایەکی تایبەتی بووە لەلایەن خودای مەزنەوە کە بۆی کراوە، مەبەست لە پرسیار کردنیش لێیان لەو بارەیەوە، هەتا ناچاریان بکات دان بنێن بەو تەوراتەدا کە لەبەر دەستیاندایە. کە ڕێکەوتون لەسەر شاردنەوەی لە نێوان خۆیانداو حاشا کردن لێیو کار نەکردن پێی لەو ڕۆژگارە دورو درێژەدا، کاتێ کە دانیان پێدانا لەگەڵ ئەوەیشدا دەیانزانی پێچەوانەی ڕای ئەوانە، بەڵام لادانو لاساریو حاشا کردنیان

---

[1] آل عمران (٩٣).

[2] مسلم (١٣٢٦/٣).

[3] أبوداود (٥٩٧/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

لەوەی کە بڕوایان بە ڕاستیو دروستی هەبوو لەناو ئەو کتێبەی کە لەبەر دەستیاندا بووە، لادانیان لەو بڕیارەو هێنانی بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە دادگاییان بۆ بکات. هەر لەبەر گونجانی بوو لەگەڵ هەواو ئارەزوی خۆیاندا، نەك لەبەر ئەوەی بڕوایان بە ڕاستی ئەو بڕیارە بووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان ئەدات. هەر بۆیە وتویانە: ﴿إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ﴾ ئەگەر فلان قسەیان بۆ کردن وەری گرن. واتە: لەبەر هەتاو وەستانو قەمچی لێدان قبوولْ بکەن ﴿وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا﴾ ئەگەر وا نەبوو وەری مەگرنو شوێنی مەکەون. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٤١) سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ﴾ هەرکەسێکیش خودا ویستی جەزرەبەی بۆ ببڕێتەوە (تاقی بکاتەوە) تۆ ناتوانی لە خودا بێ نیازی بکەیو هیچ کارێکی بۆ ڕێك بخەی. ئەمانە خودا نایەوێ دڵیان لە گوناهو پیسی پاك بکاتەوە لە دنیا بەشیان سوکیو ڕسواییەو لە قیامەتیش سزایان زۆر گرانو دژوار دەبێ. بۆ درۆ گوێ هەڵدەخەنو بە حەرام خواردن فێرن. واتە: فێری بەرتیل خواردنن وەك ئیبنومەسعودو کەسانی تریش دەڵێن[1] واتە: هەرکەسێ ئەمە ڕەوشتی بوبێ چۆن دڵی پاك دەبێتەوەو گوێ بۆ هەق دەگرێ. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی: ﴿فَإِن جَاءُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئًا﴾ جا ئەگەر جارێ دێنە لات، تۆ بە نێوانیان ڕابگە یان خۆیان لێ تێ مەگەیەنە. ئەگەر وازیشیان لێ بێنی، هیچ زیانێك لە تۆ نادەن. واتە: ئەگەر هاتن بۆ لات تۆش دادوەریان بۆ بکە، خۆ دیارە ئەوانە کە دێن بۆ لای تۆ دادوەریان بۆ بکەی مەبەستیان ئەوە نیە شوێنی هەق کەون. بەڵکو هەر شتێ لەگەڵ ئارەزویاندا بگونجێ شوێنی ئەوە دەکەون. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو عیکرمەو حەسەنو قەتادەو سوودیو زەیدی کوڕی ئەسلەمو عەتای خۆراسانیو کەسانی تریش دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخ بوەتەوە ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾[2] تۆیش بەپێی ئەو فەرمانەی لە خوداوە بۆت هاتۆتە خوارەوە بە کاروباریان ڕابگە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ﴾ خۆ ئەگەر تۆ بە نێوانیشیان ڕابگەی، کێشەکەیان بێ لایەنگیریو بە یەکسانی بۆ پێك بێنە. واتە: بە هەقو دادگەری

---

[1] الموطأ (٢/٨١٩).

[2] المائدة (٤٩).

کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکە، هەرچەندە ئەوانە ستەمکارن‌و لە ڕێگەی ڕاست لایانداوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ بێگومان خودا پیاوی ڕێك‌و ڕاستی خۆش دەوێت.

## زەمی نیازە خراپەکانی جوولەکەو ستایشی کتێبەکەیان (تەورات)

پاشان خودای مەزن باسی خراپی‌و نالەباری ڕاوبۆچوونەکانیان دەکات کە چۆن وازیان لەو بڕیارانە هێناوە کە بڕوایان وایە ڕاست‌و دروستەو فەرمانیان پێکراوە کە هەرگیز دەستی لێ بەرنەدەن لەو کتێبەی کە لەبەر دەستیاندایە نووسراوە. پاشان سەرپێچیان لە بڕیارەکانی کردو دەستبەرداری بوون‌و لایاندا بۆ شتێکی تر کە خۆیان لە ڕاستیدا بڕوایان پێی نیەو بە پڕوپوچی دەزانن‌و کاری پێ ناکەن. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ جا چۆن ئەوانە دێنە لات کە بە کێشەکەیان ڕابگەی، کە لەلای ئەمان تەورات هەیەو فەرمانی خودای تێدایە، کەچی پاشان لە دادوەریەکەی تۆ خۆ لائەدەن؟ بێگومان ئەوانە بڕوادار نین. پاشان خودای گەورە ستایشی تەورات دەکات کە ناردویەتی بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی مووسای کوڕی عیمران (سەلامی خوای لێبێ) ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ﴾ ئێمە کە ئەم تەوراتەمان ناردۆتە خوار، ڕووناکی‌و ڕێ نیشاندانی تێدایە. هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە هەر بەرفەرمانی خودا بوون، هەر بەهۆی ئەم (تەوراتەوە) بەسەر هەموو کاروباری ئەوانەی کە مووسایی بوون ڕاگەیشتبوون خواناسانی بە ڕاستی‌و زانا بلیمەتەکانیان ﴿بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ لەبەر ئەوەی کاری پارێزگاری کتێبی خوایان پێ سپێررا بوو، فەرمانیشیان پێدرا بوو کە دەری خەن‌و کاری پێ بکەن ﴿وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ شایەتیش بوون لەسەری (کە تەورات کتێبی خودایەو خودا لەوێدا پێی وتون:) نابێ لە خەڵك بترسن، بەڵکو تەنها لە من بترسن. ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ نەچن بەڵگەو نیشانەی من بە نرخێکی کەم بفرۆشن، هەرکەسێ بە پێچەوانەی فەرمانی خودا فەرمان بدات، ئا ئەوانە بێ بڕواو خوانەناسن. ئەم دەقە دوو ڕای لەسەرە لەمەوبەدوا باسی دەکەین.

### هۆیەکی تر لەسەر هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردۆتە خوار: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ

﴿ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ لەسەر دوو تیرەی جوولەکە، یەکێکیان زاڵ بووبوو بەسەر ئەو تیرەکەی تردا لە کاتی نەفامیدا، پاشان ڕازی بوبون لە یەکتری‌و ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەی هەر کوژراوێ دەستەڵات دارەکان کوشتویانە لە زەبوون‌و تێشکاوەکان خوێنەکەی پەنجا وەسق بێ. وە هەر کوژراوێکیش تێشکاوەکان کوشتویانە سەد وەسق (وَسْق) لە خوێنەکەیدا (خەلیل وەتویەتی وەسقێ باری وشترێکە) بەو شێوەیە مایەوە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەدینە. (هەردوو تیرەکە زەلیل بوون بە گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بە شاری مەدینە) لەو کاتەدا مووسوڵمانەکان دەستەڵاتی تەواویان نەبوو، ئەوانیش پێشێلکاریان نەو لە ڕێکەوتندا بوون. پیاوێ لە تێشکاوەکان کەسێکی لە دەستەڵات دارەکان کوشت. زاڵەکە ناردی بۆ لای تێشکاوەکە کە سەد وەسقیان بۆ بنێرن، تێشکاوەکە وتی: ئایا ئەوە هەرگیز لە دوو گەڕەکا بوە ئاینیان یەك بێ‌و لە یەك بەرەباب بن‌و یەك شاریشیان هەبێ. خوێنی هەندێکیان نیوەی خوێنی ئەوی تریان بێ. بێگومان کە ئەوەمان پێداون، ناهەقیەك بوە ئێوە لە ئێمەتا کردوە‌و لێتان ترساوین، بەڵام ئێستا کە موحەممەد (ﷺ) هاتوە، ئێمە ئەو خوێنەتان بەو شێوەیە پێ نادەین. لەوانە بوو شەڕ لە نێوانیاندا ڕووبدات، پاشان ڕێکەوتن کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەوێتە نێوانیان. پاشان تیرە دەستەڵات دارەکە کەوتە قسەو وتی: سوێند بە خوا موحەممەد دوو ئەوەندەتان بۆ وەرناگرێ لەوان‌و یەك ئەوەندە لە ئێوە وەرگرێ بۆ ئەوان. ئەوان ڕاستیان وت، کە ئەوەیان پێ ئەداین ناهەقیەکە لە ئێمەوە بوو زەلیلمان کردبوون، بە پەنهانی کەسێ بنێرنە لای موحەمەد تا ڕاوبۆچوونی ئەوتان بۆ بێنێ، ئەگەر ئەوەی پێدان دەتانەوێ بیکەنە دادوەر، ئەگەر پێی نەدان لێی دوورکەونەوە‌و ئەو قبوڵ مەکەن. بە پەنهانی چەند کەسێکیان لە دووڕووەکان نارد بۆ ئەوەی ڕاوبۆچونی پێغەمبەری خودایان بۆ وەرگرن. کاتێ کە دووڕووەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودای مەزن پێغەمبەرەکەی خۆی ئاگادار کرد لە هەموو کارەکانیان‌و مەبەستیان چی بوەو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ سوێند بە خوا لەسەر ئەوانە هاتە خوارو خودای مەزن مەبەستی ئەوانە بووە[1] ئەبوداوودیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە: ئەم ئایەتانەی سورەتی مائیدە کە ئەفەرموێت: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ لەسەر بارتەقای خوێن (الدية)ی بەنی نەزیرو بەنی قورەیزە (بني النضير و بني قريضة) هاتوتە خوارەوە، چونکە کوژراوی بەنی نەزیر ڕێزی زیاتر بوو لایان. خوێنی تەواویان بۆ ئەدا، بەڵام بەنی قورەیزە نیوەی

---

[1] أحمد (٢٤٦/١)، ئەم فەرموودەیە عەبدوڕەحمانی کوڕی زنادی تێدایە، پیاوێکە فەرموودەی لاوازە.

[2] أبوداود (٧/٤)، ئەم فەرموودەیە عەبدوڕەحمانی کوڕی زنادی تێدایە، پیاوێکە فەرموودەی لاوازە.

خوێنیان بۆ ئەدرا، لەبەر ئەوە دادوەریەکەیان هێنایە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوەو پێغەمبەری خودا ناچاری کردن کە شوێنی ڕاستی کەون لەو بڕیارەدا بارتەقای خوێنی وەك یەك لێکرد. خودا خۆی دەزانێ کامەیان بووە[1] ئەحمەدو نەسائیو ئەبوداوود هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەکەی ئیبنوئیسحاقەوە[2] عەوفیو عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە ئەم ئایەتانە لەسەر ئەو جوولەکە هاتوەتە خوارەوە کە داوێن پیسیان کرد، وەك لە پێشەوە ئەو فەرموودانە لەبارەیەوە باس کرا. هەڵیش دەگرێ هەردوو ڕووداوەکە لە یەك کاتدا ڕوویدابێو ئەم ئایەتانە لەسەریان دابەزیبێ والله أعلم. هەر بۆیە دوای ئەوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە کە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە بۆ مەسەلەی تۆڵەسەندنە (القصاص) والله أعلم. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ئەو کەسانەی پێچەوانەی ئەو فەرمانە (کە لە خواوە هاتوە) فەرمان بدەن، ئا ئەوانە بێ بڕواو خوانەناسن. بەرائی کوڕی عازیبو حوزەیفەی کوڕی یەمانو ئیبنوعەبباسو ئەبومیجلەزو (مِجلَز)و ئەبوڕەجائی عەتاریدیو عیکرمەو عوبەیدیللای کوڕی عەبدوڵلاو حەسەنی بەسریو کەسانی تریش وتویانە: ئەم ئایەتانە لەسەر ئەهلی کتێب هاتوەتە خوارەوە[3]. حەسەنی بەسری ئەمەی لێ زیاد کردەوەو وتی: ئەمە لەسەر ئێمە پێویستە (واجبة)[4] عەبدوڕەزاق وتی لە سوفیانی سەوریەوە لە مەنسورەوە لە ئیبراهیمەوە وتی: ئەم ئایەتانە لەسەر نەوەی ئیسرائیل هاتوەتە خوارەوە، خودای مەزن بەمە لەم ئوممەتە ڕازی بووە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە.[5] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەرکەسێ ئینکاری لەوە بکات کە خودا ناردویەتی بێگومان بێ دین بووە. وە هەرکەسێ بڕوای پێی ببێو فەرمانی پێ نەکات ئەوە ستەمکارو لادەرە ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە[6] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە کە موعەممەر بۆی گێڕاوینەتەوە لە تاوسەوە وتی: پرسیار لە ئیبنوعەبباس کرا لەم

---

[1] الطبري (٢٢٦/١٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] أحمد (٣٦٣/١)، أبوداود (١٦/٤)، النسائي (١٩/٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] الطبري (٣٤٧/١٠-٣٥٧).

[4] الطبري (٣٥٧/١٠).

[5] الطبري (٣٥٦/١٠).

[6] الطبري (٥٩٧/٤).

دەقەدا: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وتی: بەوە بێ دین دەبێ. ئیبنوتاوس وتی: ئەمە وەك ئەوە نیە کەسێ بڕوای بە خوداو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرەکان نەبێ. سەوری وتی: لە ئیبنوجورەیجەوە لە عەتاوە لە ئیبنوجورەیجەوە لە عەتاوە کە وتویەتی: (کفر دون کفر، و ظلم دون ظُلم، و فسق دون فسق) ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە.[1] وەکیع وتی: لە سەعیدی کوڕی مەککیەوە (المكي) لە تاوسەوە ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وتی: ئەو بێ دینیە نیە کە لە ئاین دەری بکات[2].

﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ﴾ لە تەوراتدا بڕیارمان دا بۆ ئەوانە. کە گیانێك لەباتی گیانێك چاو بە چاوو لووت بە لووت، گوێ بە گوێو ددان بە ددانە. لێرەیشدا دیسان خودای گەورە سەرزەنشتی جولەکە دەکاتو تانەیان لێ ئەدات، چونکە لەلای خۆیان لە تەوراتدا دەق هەیە کە تۆڵەی گیان بە گیانەو کەچی دژایەتی ئەو بڕیارە دەکەن بە لاساریو ئەنقەسا لە تۆڵەسەندنەوە لائەدەنو دەیگۆڕن بۆ خوێن سەندن (الفدیە) وەك چۆن دژایەتی فەرمانی دەقی تەوراتیان کرد لەلای خۆیان لە بەردەباران کرنی پیاوو ژنی داوێن پیسو گۆڕیانو ڕێکەوتن لەناو خۆیاندا لەسەر قەمچی لێدانو بەر هەتاوو سواری کەر کردنو گێڕانیو ئابڕو بردنیان بۆیە خودای گەورە لەوێدا فەرموویەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ چونکە ئەوانە حاشایان لە بڕیاری خودای گەورە کرد بە لاساریو ئەنقەست وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ چونکە ئەوانە هەقی ستەم لێکراوانیان لە ستەمکار وەرنەگرت لەو بڕیارەی کە خودا فەرمانی پێدابوون بەیەکسانیو دادپەروەری بەرانبەر هەموو کەس جێبەجێی بکەن. دژایەتی فەرمانیان کردو دەستیان دایە دەست درێژیو ناهەقی لە یەکتری کردن.

---

[1] عبدالرزاق (١/١٩١)، الطبري (٤/٥٩٥).

[2] الطبري (١٠/٣٥٥).

## پیاو بە ژن دەکوژرێ

ئیمام ئەبونەسری کوڕی سەباغ (الصباغ) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە کتێبەکەیدا بەناوی (الشامل) وتویەتی: زانایان کۆن لەسەر بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتەو هەموو پێشەوایانی ئیسلامیش هەر هەمان ڕاوبۆچونیان هەیە لەسەر ئەوەی کە پیاو بە ژن دەکوژرێ بە گشتگیری ئایەتەکەی هەروەها لەو فەرموودەی کە نەسائیو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردوە هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نامەکەی عەمری کوڕی حەزمدا نووسیوویەتی: (بێگومان پیاو بە ژن دەکوژرێ)[1] وە لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتوە: (موسوڵمانان خوێنەکانیان چوونیەکن)[2] ئەمە قسەی کۆی زانایانە (جمهور العلماء) ئەم فەرموودە سەحیحە پشتگیری لەو قسەی ئیبنوسەباغ دەکات کە ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە لەو بارەیەوە، کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە ڕەبیعی پوری خۆی ددانێکی بڕندەی (ثُنية) کەنیزەکێکی شکاند، داوای لێبوردنی لە خزمەکانی کرد قبوڵیان نەکرد، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تۆڵەسەندنە (القصاص) ئەنەسی کوڕی نەزری (النضر) برای وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ددانی بڕندەی فلانە کەس دەشکێ. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەنەس لە کتێبی خواداتۆڵەسەندنە) وتی: ئەنەسی کوڕی نەزر وتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی تۆی ڕەوانە کردوە بە هەق ددانی بڕندەی فلانە کەس نابڕێ. وتی: خزمەکانی کەنیزەکە ڕازی بوونو عەفویان کردو وازیان لە تۆڵەسەندن هێنا (دیارە ئەمەی ئەزر پێشبینیەك بوو کردی خودا پێشبینیەکەی لێ وەرگرت) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان کەسانێك هەن ئەگەر سوێندی لەسەر خودا خواردبێ خودا لێی قبوڵ کردوە)[3] لە هەردوو سەحیحەکەیشدا هاتوە[4].

## تۆڵەی زامەکان (برینەکان)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ برینەکانیش تۆڵەیان هەیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی، لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: گیان بە گیان دەکوژرێ، چاو بە چاو کوێر دەکرێ، لوت بە لوت دەبڕێت، ددان بە ددان دەردەهێنرێ، زام بە زام تۆڵەی وەردەگیرێ.[5] ئەم تۆڵە سەندنە یەکسانە لە نێوان موسوڵمانان خۆیاندا، پیاوانو ژنانیان. کاتێ بە ئەنقەست بوبێ لە گیاندا یان کەمتر لە گیان. وە

---

[1] النسائي (٨/٥٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] إبن ماجة (٢/٨٩٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٣/١٦٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٨/١٢٤)، مسلم (٣/١٣٠٢).

[5] الطبري (١٠/٣٦٠).

لە کۆیلەیشدا هەر یەکسانە ئەو تۆڵەیە لە نێوان خۆیاندا پیاوانو ژنانیان کاتێ کە ئەنقەست بوبێ لە گیاندا یان کەمتر لە گیان، ئیبنوجەریرو ئیبنوحاتەم ڕیوایەتیان کردوە.

### دەستورێکی گرنگ

دروست نیە تۆڵەی برین وەربگیرێ هەتا ئەو کەسەی برینەی لێکراوە چاك دەبێتەوە، ئەگەر تۆڵەی لێ وەرگیرا لە پێش چاك بونەوەی برینەکەو پاشان برینەکە زیادی کرد، ئیتر هیچ شتێکی بۆ نیە، بەڵگەیش بۆ ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە وتی: پیاوێ پیاوێکی بریندار کرد بە نووکی شمشێرەکەی یان بە نوکی ڕمەکەی هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی: تۆڵەم بۆ وەرگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چاوەڕوانکە هەتا برینەکەی چاك دەبێتەوە)، پاشان هاتەوە بۆ لای‌و وتی: تۆڵەم بۆ وەرگرە پێغەمبەریش (ﷺ) تۆڵەکەی وەرگرت. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەل بووم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من پێم وتی چاوەڕوانکە تۆ بە گوێت نەکردم، خودایش تۆی دوورخستەوەو (أبعد الله) شەلیەکەیشتی بەتاڵ کردوەتەوە. واتە: ئیتر هیچ هەقێکت نیە) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆڵە سەندنی قەدەغە کرد هەتا خاوەنەکەی چاك دەبێتەوە تەنیا ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی.

### مەسەلەیەك

ئەگەر ئەو کەسەی دەست درێژیەکەی کراوەتە سەر تۆڵەی لەو کەسە وەرگرت کە دەست درێژی کردوە سەرو مرد، هیچی لەسەر نیە ئەمە قسەی کۆی هاوەڵانی پێغەمبەرو تابیعینو کەسانی تریشە.

### لێبوردەیی دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناه

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ﴾ کێ لە تۆڵە (بە خێری خۆی) واز بهێنێ گوناهی پێ دەسڕێتەوەو هەڵدەوەرێ. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ﴾ وتی: هەرکەسێ بە خێری خۆی خۆش بوو لە کەسێ ئەو لێخۆشبوونە دەبێتە کەفارەتی گوناهی دەست درێژی کەرەکەو پاداشتیشی بۆ ئەو کەسەی داوای تۆڵەی کردوە. سوفیانی سەوری وتی: لە عەتای کوڕی سائیبەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە. لە ئیبنوعەبباسەوە: هەرکەسێ بە خێری خۆی تاوانی بەخشی، ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناه بۆ بریندارکەرەکەو پاداشتیشی بۆ بریندار لێکراوەکە لەلایەن خودای مەزنەوە ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ﴾ وتی: دەبێتە کەفارەتی گوناهی زام لێکراوە، ئیبنوجەریریش ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنی بەسری‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و ئەبوئیسحاقی هەمەدانیەوە هەر بەم شێوەیە. ئیمامی ئەحمەد

ڕیوایەتی کردوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (هیچ پیاوێ نیە زامێ لە جەستەیدا بکرێو ببکات بە خێری خۆی. مەگین خودا کرویە بە کەفارەتی گوناهی بە ئەندازەی ئەوەی کە کردویەتی بە خێری خۆی). نەسائیو ئیبنوجەریریش ڕیوایەتیان کردوە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ الظَّٰلِمُونَ﴾ ئەو کەسانەی بە پێچەوانەی ئەو فەرمانە (کە لە خوداوە هاتوە) فەرمان بدەن ئا ئەوانە ستەمکارن. لە پێشەوە باس کرا لە تاوسو عەتاوە کە وتیان: (کفر دون کفر، و ظُلم دون ظُلم و فسق دون فسق) واتە: کوفری دەرچوون لە ئاین نیە.

﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَىٰةِ وَءَاتَيْنَٰهُ الْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ الْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾

**باسی عیساو (سەلامی خوای لێبێ) ستایشی ئینجیل:**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَىٰةِ﴾ لە شوێن ئەوان عیسای کوڕی مەریەممان نارد، کە باوەڕی بوو بەو تەوراتەی وا پێش لە ئەو هاتبوە خوارێ. واتە: دوای پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل عیسا (سەلامی خوای لێبێ) هاتو بڕوای بوو بە تەوراتو فەرمانڕەوایشی دەکرد بەوەی تێیدا هاتبوو. ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ الْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ ئینجیلیشمان دا بە عیسا کە ڕێ نیشاندانو ڕووناکی تێدایە. واتە: ڕێنیشاندەرە بەرەو هەقو بە ڕووناکیەکەی گومانەکان لەناو دەچێو دەڕەوێتەوەو کێشەکان چارەسەر دەکات. ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَىٰةِ﴾ بڕوایشی هەیە بەو تەوراتەی وا لە پێش ئەو هاتبوە خوارێ شوێنی دەکەوێو ناکۆکیشی لەو شتانەدا نیە کە تێدا هاتوە جگە لە چەند شتێکی کەم نەبێ ڕوونی کردوەتەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل کە لەناو خۆیاندا لەسەری ناکۆک بوون. وەك خودای گەورە لەبارەی عیساوە (سەلامی خوای لێبێ) فەرموویەتی: کە وتویەتی بە نەوەی ئیسرائیل: ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾[1] (بە ئەرکی خۆمی دەزانم) هەندێ شتتان بۆ حەلاڵ کەم کە لێتان حەرام کراوە. هەر بۆیە قسەی مەشهور لەناو زانایاندا ئەوەیە کە ئینجیل هەندێ بڕیاری تەوراتی نەسخ کردوەتەوە. ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةً

[1] آل عمران (٥٠).

﴿لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ بۆ ئەوانەی لەخوا ترسن، پڕیەتی لە ئامۆژگاریو ڕشێکەی ڕاستیان نیشان ئەدات. واتە: ئینجیلمان ناردوە کە خەڵکی بترسێنی لە کاری خراپو قەدەغە کراوو ڕێ نیشاندەر بێ بۆ ئەو کەسانەی لە خوا ترسنو لە هەرشەو تۆڵەکانی خودا دەترسن. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ﴾ دەبێ ئەوانەی وا ئینجیلیان لەلایە، بەپێی ناوەڕۆکی ئینجیل (وەك خودا ناردویەتیە خوار) فەرمان بدەن. وایش خوێنراوەتەوە ﴿وَلِيَحۡكُمَ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ﴾ بە مەنسوبی (بالنصب) لەسەر ئەوەی (ئەو لامە) لامی (كي) یە. واتە: ئینجیلمان ناردوە بۆ عیسا (سەلامی خوای لێبێ) تا بە فەرمانی ئەو ئینجیلە فەرمانڕەوایی بکات لەناو ئەو گەلەی چەرخی خۆیدا. وە بە ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ﴾ بە مەجزمیش (الجزم) خوێنراوەتەوە، لەسەر ئەوەی ئەو (لامە) لامی ئەمرە، دەبێ بڕوایان بە هەموو ئەو شتانە ببێ کە لەناو ئینجیلدایە، ئەو بڕیارانەشی کە لەناویدایەو فەرمانیان پێکراوە بەجێی بێنن. وە لەو شتانەی کە تیایەتی مژدەدانە بە هاتنی موحەممەدو (ﷺ) فەرماندان بە شوێن کەوتنیو بڕوا پێ هێنانی کاتێ هات. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ﴾[1] بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب، ئێوە هەتا بەپێی تەوراتو ئینجیلو هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە، نەجوڵێنەوە، ئێوە لەسەر هیچ (ئاینێك) نین. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾[2] ئەوانە وا دەکەونە شوێن ئەم پێغەمبەرەی کە ڕاسپاردەی خوایەو نەخوێندەوارەو لە تەوراتو ئینجیلیش ناوی نووسراوە. بۆیە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ ئەو کەسانەی لەو فەرمانانەی کە خودا ناردویەتە خوار لابدەن، دیارە لە ڕێ لایانداوە. واتە: لە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان دەرچوونو ڕوویان لە پڕوپوچ کردوەو لە هەق دوورکەوتونەتەوەو وازیان لێهێناوە، لە پێشەوە باس کرا کە ئەم ئایەتانە لەسەر مەسیحیەکان هاتۆتە خوارەوە وەك لە دەقەکەوە دەرکەوتوەو دیارە.

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ

---

[1] المائدة (٦٨).

[2] الاعراف (١٥٧).

لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم
بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (٤٨) وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ
بَعْضِ مَآ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ (٤٩)
أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٥٠)﴾

## ستایش کردنی ئەم قورئانەو پیاهەڵدانی و فەرماندان بە فەرمانڕەوایی کردن پێی

کاتێ خوای گەورە باسی تەوراتی کرد کە ناردیە خوارەوە بۆ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) وەسفو ستایشی کردو فەرمانی دا کە شوێنی بکەونو بەو شێوەیەی کە خودا ڕەوانەی کردوەو باسی ئینجیلیشی کردو ستایشی کردو فەرمانیشی دا بە شوێن کەوتوانی کە فەرمانەکانی بەجێبێننو لەسەری بجولێنەوە، وەك لە پێشەوە ڕوون کرایەوە. پاشان دێتە سەر باسی قورئانی پیرۆز کە ڕەوانەی کردوە بۆ بەندەپێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ﴾ ئەو قورئانەمان بە خەلات بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، کە هەرچی تێدایە ڕاستە، بڕی بە کتێبە پێشینەکان هەیە کە ڕەوانە کراونو وەسفو ستایش کران، وە بێگومان بەو زوانە لەلایەن خوداوە قورئانیش بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) دەنێرێتە خوارەوە، هاتنە خوارەوەکەیش بەو شێوەیە کە باسی کردوەو بڕوای ئەوانە زیاتر دەکات لەلای هەڵگرانی ئەوانەی خاوەنی چاوو دڵێکی وشیارو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا بوونو پەیڕەوی شەریعەتی خودایان کردوەو بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی هێناوە وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلْ ءَامِنُوا بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾[1] بلێ: ئێوە بڕواتان پێی ببێ یان نەبێ، ئەو کەسانەی لە پێشدا (لەمە) ئاگادار بوون، هەرکاتێ بۆیان دەخوێننەوە چەناکە دەخەنە سەر زەویو سوژدە دەبەن. ئەشڵێن: پاکیو بێ عەیبی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە، بەڵێنی پەروەردگارمان وا وەدی هات ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ چاودێریانە. سوفیانی سەوریو کەسانی تریش وتویانە لە ئەبوئیسحاقەوە لە تەمیمیەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: متمانەی پێیەتی[2]. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: (المهيمن)

---

[1] الاسراء (١٠٧–١٠٨).
[2] الطبري (١٠/٣٧٨).

جێی متمانە، وتی: قورئان جێچی متمانەیە لەسەر هەموو کتێبی پێش خۆی عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو موحەممەدی کوڕی کەعبو عەتیەو حەسەنو قەتادەو عەتای خۆراسانیو سوودیو ئیبنوزەیدیش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە[2] ئیبنوجەریر وتی: قورئان جێی متمانەیە بەسەر ئەو کتێبانەی پێش خۆیەوە، هەرچی لەناو ئەو کتێبانەدا گونجاو ڕێکەون لەگەڵ قورئاندا ئەوە هەقەو هەرچیش ڕێ نەکەوتو دژایەتی کرد ئەوە پڕوپوچە. لە والیبەوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: ﴿وَمُهَيۡمِنًا﴾ واتە: شایەتی.[3] موجاهیدو قەتادەو سوودیش هەر وایان وتوە. عەوفی وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿وَمُهَيۡمِنًا﴾ واتە: دادوەرە لەسەر ئەو کتێبانەی پێش خۆی.[4] ئەم قسانە هەموو ماناکانیان لە یەکەوە نزیکە. چونکە ناوی (المهيمن) هەمووو ئەم مانایانە لەخۆی دەگرێت، ئەم قورئانە جێی متمانەو شایەتو چاودێرو دادوەرە بەسەر هەموو کتێبەکانی پێش خۆیەوە. خودای گەورە ئەم کتێبە مەزنە کە ناردویەتە خوارەوە دواین کتێبەو تەواوترینو مەزنترینو گشتگیرترین کتێبی خودایە کە هەموو چاکەکانی پێش خۆی تیا کۆکراوەتەوەو شتی زۆر تێرو تەواوی تریشی تێدایە کە لە ئەمدا نەبێ نیە. هەر بۆیە خودای گەورە کردویەتی بە شایەتو چاودێرو دادوەر بەسەر گشت کتێبەکانی ترەوە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾[5] ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوار، هەر ئێمەیشین دەیپارێزین. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئیتر تۆ بەپێی ئەوەی ناردویەتیە خوارەوە بە کاروباریان ڕابگە. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) لە نێوان ئەو خەڵکەدا دادوەری بکە بە عەرەبو عەجەمو نەخوێندەوارو ئەهلی کتێبەکانیشیانەوە، بەپێی ئەوەی کە بۆت هاتۆتە خوارەوە لەم کتێبە مەزنەداو بەوەیش کە خودا بۆی داناوی لە فەرمانی ئەوانەی پێش خۆت لە پێغەمبەران کە لە بەرنامەی تۆدا نەسخی نەکردوەتەوە دادوەری بکە[6] ئیبنوجەریریش هەر وا مانای کردوە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە مەیلی خۆی بووە، کاتێ ویستبێتی دادوەری لە نێوانیاندا کردوەو مەیلیشی لێ نەوبایە وازی لێ دەهێنانو دەیگێڕانەوە بۆ فەرمانو بڕیارەکانی خۆیان. خودای گەورە ئەم ئایەتەی

---

[1] الطبري (٣٧٩/١٠).
[2] الطبري (٣٧٧-٣٨٠).
[3] الطبري (٣٧٧/١٠).
[4] الطبري (٣٧٩/١٠).
[5] الحجر (٩).
[6] الطبري (٣٨٢/١٠).

نارده خوارەوە: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ ئیتر تۆ بەپێی ئەوەی خودا ناردویەتە خوارەوە دادوەری لە نێوانیاندا بکە، شوێن هەواو ئارەزوی ئەوان مەکەوە. خودای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ) کە دادوەری بکات بەپێی ئەوەی کە لەناو کتێبەکەی ئێمەدایە[1] واتە: قورئانی پیرۆز. ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ واتە: شوێنی هەواو ئارەزوی ئەوانە مەکەوە کە رێکەوتون لەسەری و بەهۆی ئەوەوە وازیان هێناوە لەوەی کە خودا رەوانەی کردوە بۆ پێغەمبەرەکەی، لەبەر ئەوەیە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾ مەکەوە شوێن هەواو ئارەزوی ئەوان بە لادان لەو هەقەی کە بۆت هاتوە. واتە: بەپێی ئارەزوی ئەو نەفامو بەدبەختانە مەجولێرەوە لەو هەقە لامەدە کە خودا فەرمانی پێکردوی ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا﴾ بۆ هەر کۆمەڵێك لە ئێوە رێوشوێنێکمان داناوە. ئیبنوئەبی حاتەم ریوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا﴾ وتی: رێگەیەك. وە هەر لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: رێگەو رێرەوێك[2] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە هەمووی دەکردنە یەك ئوممەت، بەڵام ویستی خوا وابوو لەو شتانەی کە پێی داون بەر تاقیکردنەوەتان بخات. ئەمە وتارێکە بۆ گشت ئوممەتەکانو ئاگادار کردنەوەیە لەسەر دەستەڵاتو توانای خودای گەورە. ئەگەر مەیلی لێ بوایە هەموو خەڵکی لەسەر یەك ئاینو شەریعەت کۆ دەکردەوەو هیچ شتێکی لێ نەسخ نەدەکردەوە، بەڵام ویستی خودا وایە بۆ هەر پێغەمبەرێ شەریعەتێکی داناوە، پاشان بە رەوانە کردنی پێغەمبەرێکی تر هەندێکی یان هەمووی نەسخ کردوەتەوە. پاشان هەموو شەریعەتەکانی نەسخ کردەوە بە ناردنی ئەو پەیامەی کە ناردی بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) کە رەوانەی کردوە بۆ سەر هەموو خەڵکی سەر زەوی بە تێکرا. و کردی بە دواین پێغەمبەری هەموو پێغەمبەران. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ﴾ واتە: خودا چەند شەریعەتێکی جیاوازی ناردوە بۆ ئەوەی عەبدەکانی تاقی بکاتەوە لەسەر ئەو شەریعەتەی بۆی داناون. پاشان پاداشتیان بداتەوەو تۆڵەیان لێ بسێنێ لەسەر گوێڕایەڵی کردنی یا لاساریو بێ گوێییان لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە کردویانە. پاشان خودای گەورە بەندەکانی هەڵدەنێ کە هەوڵی چاکەخوازی بدەنو پێش پێشینی لەسەر بکەنو ئەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ دەسا ئێوەش

---

[1] الطبري (١٠/٣٣٢).

[2] الطبري (١٠/٣٨٧).

لەسەری کاری کێبەرکێ بکەن. واتە: خواپەرستی بکەن و شوێنی پەیامەکەیشی بکەون کە هەموو شەریعەتەکانی تری پێش خۆی نەسخ کردوەتەوەو بڕوا بێنن بەم قورئانە کە دواین کتێبە خودا ناردویەتە خوارەوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾ هەموو لاتان دەگەڕێنەوە لای خوداو ئەوسا ئاگادارتان دەکات، کە لەسەرچی کێشەتان لەنێواندا پەیدا ببوو. واتە: ئەی خەڵکینە لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو زیندوو دەکرێنەوەو دێنە لای خوداو لەسەر ئەو هەقانەی کە تێیدا ناکۆك بوون ئاگادارتان دەکاتەوەو پاداشتی ڕاستگۆیان ئەداتەوە لەسەر ڕاستگۆییەکەیان و خودانەناسی ئەوانەی بڕوایان بە هەق نەبوو لە ڕێی ڕاست لایاندا بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێ سزای سەخت ئەدات. زەحاك وتی: ﴿فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ﴾ واتە: ئەی ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) کێبەرکێ بکەن لەسەر چاکەکردن. بەڵام ڕای یەکەم دیارو ئاشکرا ترە.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ تۆیش (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەپێی ئەو فەرمانەی لە خوداوە بۆت هاتۆتە خوارەوە، بە کاروباریان ڕابگەو دوای ئارەزوویان مەکەوە. ئەمەیش جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەو باسەی پێشەوە کە فەرمان کردنە بە دادوەری کردن بە قورئان و ڕێگە نەدان بە هیچ بڕیارێکی تر پێچەوانەی ئەو. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ﴾ خۆتیان لێ بپارێزە نەوەکا فریوت بدەن و لە هەندێك لەو فەرمانانەی کە لە ئێمەوە بۆی هات هەڵەت بکەن. واتە: لە دوژمنە جوولەکەکانت خۆت بپارێزە کە ڕاستیت لێ بگۆڕن لەو شتانەی کە پێت دەڵێن مەیکەو وازی لێ بێنە گوێ مەدە بە درۆو ناپاکی و خوانەناسی ئەوانە ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا لەو فەرمانانەی کە لە نێوانیاندا ئەیدەیت بە ڕاستی و دژی شەرعی خودا وەستان ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ﴾ ئەوسا بزانە کە خودا نیازی وایە لە بەرانبەر هەندێ لە گوناهەکانیان تۆڵەیان لێ بکاتەوە. سا بزانە ئەو شتانە کە ڕوو ئەدات بە دەسەڵاتی خودایەو بە کارزانی خۆی لەگەڵیان دەجوڵێتەوە کاتێ کە لە ڕێگەی ڕاست لایان ئەدات. لەبەر ئەو گوناهانەیە لە پێشدا کردویانەو کە بوەتە هۆی گومڕا بوون و سزادانیان. ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ﴾ زۆربەی زۆریشی لەو خەڵکە لە ڕێ دەرچوون. گوێڕایەڵی پەروەردگاریان نەکردو دژی هەق وەستان و بەدبەخت بوون. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾[1] هەرچەندە زۆریش هەوڵ بدەی، ئەو خەڵکە زۆربەیان بڕوا

---

[1] یوسف (١٠٣).

نـامێنن. وە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[1] ئەگـەر بکەویتـە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانە وا لەسەر زەمینەدان لـە ڕێگـەی خـودا لات ئـەدەن. موحەممـەدی کـوڕی ئیسحاق ڕیوایـەتی کـردوە لـە ئیبنوعەبباسـەوە وتـی: کـەعبی کـوڕی ئەسـەدو ئیبنوسلوباو (صلوبا) عەبدوڵڵای کوڕی سوریا (صوریا) و وەشئەس (وشأس) کوڕی قەیش بە یەکتریان وت، هەڵسن بـا بچین بۆ لای موحەممەد (ﷺ) بەڵکو فریـوی بـدەین‌و لـە ئاینەکـەی لای بـدەین هـاتن بـۆ لای‌و وتیـان: ئـەی موحەممەد (ﷺ) تۆ خۆت دەزانی ئێمە زانایان‌و پیاوماقوڵان‌و سەرکردەکانی جولەکـەین، ئەگـەر ئێمـە شوێنی تۆ کەوتین، گشت جوولەکەکان شوێنت دەکەون‌و لـە قسەی ئێمـە دەرناچـن، لـە نێـوان ئێمـەو هۆزەکەماندا کێشەیەك هەیە، دادوەریەکەیان دێنینە لای تـۆ، تـۆ دادوەریەکـەمان بـۆ بکـەو بڕیـار بـدە بەسەریاندا بۆمان. ئێمە بـڕوات پـێ دەهێـنین‌و بـە ڕاسـتت دەزانـین. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) قبـووڵی نەکرد. خودای گـەورە ئـەم ئایەتـەی لەبارەیانـەوە نـاردە خـوارەوە: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ﴾[2] ئیبنوجەریرو ئیبنوحاتەم ڕیوایـەتیان کـردوە. پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ ئایـا ئـەوان دەیانـەوێ حـوکمی زەمـانی نەفامی پێش ئیسلام زیندوو کەنەوە، کام فەرمان لە فەرمانی خوا چاکترە، لـەلای کەسانێك کـە بـڕوای تەواویان هەیە. خودای گەورە پێناخۆشی خۆی دەردەبڕێ دەربارەی ئەوانەی کـە لـە فـەرمانی بتـەوی خودا دەردەچن کە پڕە لە هەموو چاکەیەو ڕێگرە لە گشت خراپەیەو لایداوە لـە هـەموو هـەواو ئـارەزوو زاراوەیەك کەسانێ داینابێ کە بەڵگەیەکی شـەرعیان بـە دەسـتەوە نـەبێ لەلایـەن خـوداوە. وەك چۆن خەڵکی سەردەمی نەفامی فەرمانیان بـەو گـومڕایی‌و کـارە نەفامانـە داوەو بـە هـەواو ئـارەزوی خۆیـان دایان ناوە. یان وەك تەتارەکان حوکمیان پێ کردوە لە سیاسەتی پاشایەتیدا بـە فـەرمانی پاشاکەیان جەنگیز خان کە یەساقی (الیساق) بۆ دانان. کە پێك هاتبوو لـە کتێبـێ کۆمـەڵێ بڕیـار کـە لـە چـەندین یاساو ڕێسا کۆی کردبوەوەو داینا بوو. لە ئاینی جوولەکەو مەسـیحی‌و ئـاینی ئیسلام‌و ئـاینی تـریش. فـەرمان‌و بڕیـاری زۆری تیـا بـوو کـە تـەنیا بـە هـەواو ئـارەزووی خـۆی داینـا بـوو. پـاش خـۆی لـەناو کوڕەکانیدا کرابوو بە یاساو ڕێسایە کە پـێش فـەرمانی خـوداو پێغەمبـەری خودایـان (ﷺ) دەخـست. هەرکەسێ لەوانە بڕوای بەو یاساو ڕێسایە بوا، ئەوا بێ دین ئەبوو دەبوایە شەڕی لەگەڵدا بکرایـە هـەتا دەگەڕایەوە ژێر فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) چونکە هـیچ حـوکمێ جگـە لـە حـوکمی خـوداو

[1] الانعام (١١٦).

[2] الطبري (٣٩٣/١٠).

پێغەمبەرەکەی (ﷺ) قبوولْ ناکرێ کەم بێ یان زۆر. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئایا ئەوان دەیانەوێ حوکمی زەمانی پێش ئیسلام زیندوو کەنەوە. کام حوکم لە حوکمی خودا چاکترە لەلای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە. واتە: کێ لە خودا دادپەروەرترە لە بڕیاریدا بۆ کەسێ خاوەن ئاوەز بێو لە شەرعی دا شارەزا بێو بڕوای پێی بێ. چاك بزانێو دڵنیا بێ کە خودا چاکترین دادگەرەو خاوەن بەزەیی ترە بەرانبەر دروست کراوەکانی لە دیك بۆ کورەکەی خۆی، چونکە خودا ئاگاداری هەموو شتێکەو توانای بەسەریدا هەیەو لە هەموو شتێکدا دادگەرە. تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕق لێبوترین کەس لەلای خودا کەسێکە کە ڕێڕەوێکی (سنة) زەمانی نەفامی لەناو ئیسلامدا بگرێتە بەر وە کەسێکە داوای خوێنی لە کەسێ بکات بە ناهەق بۆ ئەوەی خوێنی بڕێژێ)[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبویەمانەوە هەر بەم شێوە وە بە هەندێ زیادەوە[2].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٥١) فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ ۚ فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا أَسَرُّوا فِي أَنفُسِهِمْ نَادِمِينَ (٥٢) وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ (٥٣)﴾

**قەدەغی کردنی دۆستایەتی لەگەڵ جوولەکەو مەسیحی دوژمانی ئیسلامدا**

خودای مەزن قەدەغەی کردوە لە عەبدە خاوەن باوەڕشەکانی کە دۆستایەتی ئەو گاورو جوولەکانە بکەن کە دوژمنی ئیسلامو کۆمەڵی موسوڵمانانن (نەفرینی خوایان لێ بی) پاشان فەرموویەتی کە ئەو گاورو جوولەکانە لەناو خۆیاندا دۆستی یەکترین. هەڕەشەی تۆڵە سەندن دەکات لەو کەسانەی ئەو دۆستایەتیە دەکەنو ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان مەبنە دۆستی ئەم گاورو جوولەکانە با ئەوان دۆستی یەکتر بن (هەرکەسێك لە ئێوە ببێتە دۆستیان، ئەویش لەوان دەژمێردرێ ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەوانەی لەسەر ناهەقین، خودا ڕێیان نیشان نادات. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە کە عومەر فەرمانی دا بە ئەبوموسای ئەشعەری ئەو شتانەی کە وەری دەگرێو دەیبەخشێ لە یەك

---

[1] الطبراني (١٠/٣٧٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٢/٢١٩).

چەرمدا (پێستەدا) بۆی بەرز بکاتەوە، ئەبومووسایش نووسەرێکی (کاتبێکی) مەسیحی هەبوو، ئەوەی بۆ بەرز کردەوە، عومەر سەری سوڕماو وتی: بەڕاستی ئەمە پارێزراوێکی چاکە، ئایا تۆ نامەیەکمان بۆ هاتوە لە شامەوە لە مزگەوتە بۆمان دەخوێنیتەوە؟ وتی: ئەوە ناتوانێ بۆیان بخوێنێتەوە. عومەر وتی: ئایا ئەوە لەشی پیسە؟ ئەبومووسا وتی: نەخێر، ئەوە مەسیحیە. وتی: لێم توڕە بوو کێشای بە ڕانمدا پاشان وتی: دەریکەن پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ﴾[1] وە ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەوە وتی: با هەرکەسێ لە ئێوە لەوە بترسێ کە ببێتە جوولەکە یان مەسیحی کە بەخۆیشی نەزانێ. وتی: وامانزانی مەبەستی بەو قسەیە ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ﴾[2] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ﴾ ئەو کەسانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، دەبینی کە بە پەلەن بۆ چوونە لایان. واتە: ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشەو بە گومانو دووڕوون زۆر پەلەیانە بچنە لای جوولەکەو گاورەکانو حەزیان لە دۆستایەتیانەو بە پەنهانیو بە ئاشکرایش خۆشیان دەوێن. ﴿يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ﴾ دەڵێن ئێمە دەترسین تووشی بەڵا ببین (بۆیە دۆستایەتیان دەکەین) واتە: بڕوبیانو بەو دۆستایەتیو خۆشەویستیە بەوە دێننەوە کە لەوە دەترسن خوانەناسەکان سەرکەون بەسەر موسوڵمانانادا، تا ئەمان بەو دۆستایەتیە بتوانن سوودمەند بن. ئا لەوێدا خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ﴾ هیچ دوور نیە خودا ڕۆژێ سەرتان بخات. سوودی وتی: مەبەست پێی فەتحی مەککەیە[3]. ﴿أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ﴾ سوودی وتی: واتە: دانانی سەرانە لەسەر مەسیحیو جوولەکەکان ﴿فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ﴾ ئەوسا ئەوان لەو ڕازەی لە دڵیاندایە، تووشی پەشیمانی دەبن. واتە: ئەو کەسانەی دۆستایەتی لەگەڵ مەسیحیو جوولەکەدا دەکەن لە دووڕووەکانو لە دڵیاندا شاردویانەتەوە پەشیمان دەبنەوە. دوای ئەوەی سوودمەند نەبونو هیچ زیانێکیان لێ دوور نەخستنەوەو بەڵکو زۆر بە خراپیش بەسەریاندا شکایەوە، ئابڕوویان چوو، خودا هەر لە دنیادا ئەو کارەی ئاشکرا کردن بۆ عەبدە خاوەن باوەڕەکانی دوای ئەوە کە بۆیان پۆشرا بوو. نازانرێ چ حاڵێکیان بوە، کاتێ ئەو هۆکارە ئابڕووبەرانەیان بۆ عەبدە خاوەن باوەڕەکانی خودا دەرکەوت. بڕوادارەکان سەریان سوڕما بوو کە چۆن ئەو دووڕووانە وا خۆیان پێشانیان ئەدەن کە لە

---

[1] الدر المنثور (٣/١٠٠).

[2] إبن أبي حاتم (٤/١١٥٦).

[3] الطبري (١٠/٤٠٥).

ڕێزی برواداران‌و سوێندیش دەخۆن‌و بڕوبیانون دەهێننەوە. هەموو درۆو بوختانەکانیان ئاشکرا بوو.

هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ﴾ کەسانی خاوەن باوەڕیش ئەوسا دەڵێن: ئایا هەر ئەمانە نەبوون زۆر بە توندی سوێندیان بە خوا دەخوارد کە تا سەر لەگەڵتانن؟ ئەو کارە ئەوان کردیان بەفیڕۆ چوو، دوابیەکەیشی تووشی زیان‌و ڕەنجەڕۆیی یوون.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە**

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: یەکەم هۆزێ کە پەیمان شکێنی لە نێوان خۆیان‌و پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد هۆزی بەنی قەینوقاع بوو (بني قينُقاع) عاسیم کوڕی عومەری کوڕی قەتادە بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئابلۆقەی دان هەتا دابەزین بۆ فەرمانی کاتێ کە خودا موسوڵمانانی زاڵ کرد بەسەریاندا، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول هەڵساو هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی موحەممەد چاکە لەگەڵ دۆستەکانما بکە (هۆزی بەنی قەینوقاع هاوپەیمانی هۆزی خەزرەج بوون) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێی بۆ نەگرت. دیسان وتی: ئەی موحەممەد چاکە لەگەڵ دۆستەکانما بکە. پێغەمبەر(ﷺ) هەر پشت گوێی خست. وتی: دەستی نایە ناو باخەڵی کراسەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وت: (لێم گەڕێ) پێغەمبەری خودا تووڕە بوو. هەتا گرژی بە نێوچاوانیەوە دیار بوو پاشان فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ لێم گەڕێ) وتی: نەخێر، سوێند بە خوا وازت لێ ناهێنم هەتا چاکە نەکەی لەگەڵ ئەم دۆستانەمدا کە چواردە کەسی بێ زرێ‌و قەڵغان‌و سێ سەد کەسی زرێ‌و قەڵغان پۆشن. کە پارێزگاریان لە من کردوە لە سورو ڕەشدا (واتە: لە هەموو تەنگانەیەکدا بە دەممەتوە هاتون) وازت لێ بێنم لە بەرەبەیانێکدا دروێنەیان کەی؟ (واتە: بیان کوژی) من پیاوێکم لە تۆڵە کردنەوە دەترسم، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوانە بۆ تۆ) موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: ئەبوئیسحاقی کوڕی یەسار بۆی گێڕامەوە لە عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی سامیتەوە وتی: کاتێ بەنی قەینوقاع شەڕیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کەوتە تکا کردن بۆیان، لە پێشیانەوە بوو، عوبادەی کوڕی سامیتیش دەڕۆشت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەویش یەکێ بو لە بەنی عەوفیەکانی کوڕی خەزرەج، ئەمیش هاوپەیمانی هەبوو لەگەڵیان وەك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول. (دەست بەرداریان بوو) دانیە دەستی پێغەمبەری خودا. دەست بەرداری خۆی لەلای خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەربڕی لە هاوپەیمانیان‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بێزاری خۆم دەردەبڕم لە هاوپەیمانی ئەمانە لەلای خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دۆستایەتی خوداو پێغەمبەرکەی‌و خاوەن باوەڕانم دەکەم. بێزاری خۆم

دەردەبڕم لە هاوپەیمانی خوانەناسان‌و دۆستایەتی کردنیان. ئەم ئایەتانەی سورەتی مائیدە لەسەر عوبادەو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾[1].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾

## هەڕەشە کردن لە خاوەن باوەڕان ئەگەر پاشگەز ببنەوە بە هێنانی کۆمەڵێکی تر

خودای مەزن باسی توانا‌و دەسەڵاتی گەورەی خۆی دەکات: کە بێ نیازە لە هەموو شتێ‌و باوەڕداران ئاگادار دەکاتەوە کە هەرکەسێ پاشگەز ببێتەوە لە یارمەتی دینەکەی‌و پەیامەکەی نەکاتە بەرنامەی ژیانی خۆی. خودا بەو زوانە دەیانگۆڕێ‌و کۆمەڵێکی لەوان چاکتر لە جێیان دادەنێ کە زۆر بەهێزترو چاکتر پەیڕەوی پەیامەکەی دەکەن. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَٰلَكُم﴾[2] ئەگەر پشتی تێ بکەن، کۆمەڵێکی تر بە ئێوە دەگۆڕێتەوە کە هەرگیز لە ئێوە ناچن. وە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾[3] تۆ نابینی خودای مەزن ئاسمانەکان‌و زەمینی هەر بۆ ڕاستی دروست کردوە؟ ئەگەر خۆی مەیلی لێبێ، ئێوە دەبات‌و سەر لە نوێ خەڵکێکی تر دروست دەکات. کە ئەم کارەیش لەلای خودا گران نیە. کەس ناتوانێ ڕێگری لێ بکات. لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، هەرکەسێ لە ئێوە پاشگەز لە ئاینی خۆی پاشگەز ببێتەوە. واتە: پەشیمان ببێتەوە لە هەق ڕوو بکاتە پڕوپوچ. ئەم وتارە وتارێکی گشتگیرە

---

[1] إبن هشام (٣/٥٢)، سەنەدەکەی بەهێز نی یە لەبەر ئیسحاقی کوڕی یەسار بەڵام فەرموودەی تر هاتوە پشتگیری دەکات.

[2] محمد (٣٨).

[3] إبراهیم (١٩–٢٠).

هـــەتا ڕۆژی قیامـــەت. وە ئەفـــەرموێت: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ خودا لەمەولا کۆمەڵێکی وا دێنێ، خۆشی بوێن و ئەوانیش خوایان خۆش بوێ، لە بەرانبەر خاوەن باوەڕان نەرم و نیان دەجولێنەوە و لە بەرانبەر خوانەناسان سەر بڵندو توندو تیژن. ئەمە خوڕەوشتی خاوەن باوەڕانی تەواوە کە بەرانبەر براکەی خۆی بە کەم دەزانێ و دۆستیەتی. زۆر توندو تیژە لەگەڵ دوژمنەکانیدا. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾[1] موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خودایە، ئەوانەش کە لەگەڵ ئەون لە بەرانبەر خوانەناسان توندو تیژە لەناو خۆدا دلۆڤانن. وە لە سیفەتەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ). (انه الضحوك القتال) واتە: لەگەڵ دۆستەکانی دەم بە خەندە بووە و بەرانبەر دوژمنەکانیشی توندو تیژ بووە. خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموەێت: ﴿يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾ غەزا لە ڕێی خودا دەکەن و لە تەشەری سەرزەنشت کەران ناترسن. واتە: ئەو شتانەی کە بەرانبەریان دەکرێ لەلایەن خوانەناسانەوە کۆڵیان پێ نادات لە خواپەرستی و لە بەجێهێنانی سنورەکانی و شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنانی خوداو فەرماندان بە چاکەو قەدەغە کردنی لە خراپە. هیچ کەس ناتوانێ ببێتە کۆسپ و لەمپەر لە ڕێیاندا. لۆمەی لۆمەکەران و دورکەوتنەوەی دوورەپەرێزان هیچ کاریان تێ ناکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوزەڕەوە وتی: خۆشەویستەکەم فەرمانی پێکردم بە حەوت شت: فەرمانی پێکردون بە خۆشەویستی هەژاران و نزیك بوونەوە لێیان، وە فەرمانی پێکردوم کە سەیرێ کەسێ بکەم لە خوار خۆمەوەیە، سەیرێ کەسێ نەکەم لە سەرمەوەیە. وە فەرمانی پێکردم کە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنم با پشتیش هەڵبکەن. وە فەرمانی پێکردوم کە هیچ شتی کەس داوا نەکەم، وە فەرمانی پێکردوم کە قسەی هەق بکەم با تاڵیش بێ. وە فەرمانی پێکردوم لەبەر خودا لە لۆمەی لۆمەکەران نەترسم، وە فەرمانی پێکردووم کە زۆر ئەم وتانە (لا حول و لا قوة إلا بالله) دووبارە بکەمەوە چونکە ئەم وتانە لە گەنجینەیەکان لە ژێر تەختدا (العرش).[2] وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (دروست نیە بۆ خاوەن باوەڕ کە خۆی زەلیل بکات). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا چۆن خۆی زەلیل دەکات؟ فەرمووی: (بارێ لەو مەینەتیانە (من البلاء) هەڵدەگرێ کە لە توانادا نیە).[3] ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەمە زیادە خەڵاتێکە لە خوداوە بە هەرکەسێ خۆی مەیلی

---

[1] الفتح (٢٩).

[2] أحمد (٥/١٥٩)، یەکێك لە سەنەدەکانی جێی متمانەیە.

[3] أحمد (٥/٤٠٥)، تحفة الاحوذي (٦/٥٣١)، إبن ماجة (٢/١٣٣٢)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

لێبێ پێی دەبەخشێ خودا زانایەو (لە بەخشین) زۆر دەست گوشادە. واتە: ئەوە خەلاتیکە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو ڕەوشتە چاکانەیان تیایەو خودا خۆیشی دەزانێ کێ شایستەی ئەو خەلاتەیەو کێش لێی بێ بەش دەبێ. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾ دۆستی ئێوە هەر خوداو پێغەمبەریەتیو ئەو کۆمەڵە باوەڕدارانەن کە نوێژ کەرو زەکات دەرن ڕووەو خوا لە کڕنوشدان. واتە: جوولەکە دۆستی نین بەڵکو خوداو پێغەمبەرو خاوەن باوەڕان دۆستی ئێوەن، ئەو باوەڕدارانەی کە خاوەنی ئەم ڕەوشتانەن نوێژ کەرن، کە یەکێکە لە پایە گەورەکانی ئیسلام کە بریتیە لە پەرستنی خودا بەتەنیاو شەریك دانەنان بۆی. زەکات دەرن کە هەقی خەڵکەو یارمەتیدانی هەژارو کەم دەستانە. وە مەبەست بە (الراکعون) ئەو خاوەن باوەڕانەن کە ئامادەی نوێژی فەرزەکان دەبن لەماڵەکانی خوداو نوێژەکانیان بە جەماعەت دەکەنو زەکاتەکانیشیان لە بەرژەوەندی موسوڵمانان‌دا خەرج دەکەنو دەیبەخشن.

### هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە

لە پێشەوە باس کرا کە ئەم ئایەتانە هەموو لەسەر عوبادەی کوڕی سامیت (ڕەزای خوای لێبێ) هاتنە خوارەوە کاتێ کە وازی لە هاوپەیمانی جوولەکەکان هێناو ڕازی بوو بە دۆستایەتی خوداو پێغەمبەرەکەیو خاوەن باوەڕان. هەر بۆیە خودای مەزن دوای ئەمانە هەموو ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَٰلِبُونَ﴾ هەرکەسێکیش دۆستایەتی لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خوداو ئەو کەسانە بێ کە باوەڕدارن بێگومان هەر کۆمەڵی خودا زاڵو سەرکەوتوون. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ الْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ أُولَٰٓئِكَ حِزْبُ اللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1] خودا خۆی بڕیاری داوە: بێگومان منو پێغەمبەرەکانم سەردەکەوین، خودا خاوەن توانای بەدەستەڵاتە. تۆ نابینی ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت نابێ هەرگیز ببنە دۆستی ئەوانەی دژایەتی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەن. با ئەو کەسانەش باوکیان یان فەرزەندیان یان برایان یان لە هۆزەکەی خۆیان بن. ئەمانە خودا بڕوای لە دڵیاندا جێگیر کردووەو بە

١ المجادلة (٢٠ـ٢١).

هێزێکی تایبەتی خۆی یارمەتی داون. دەیان نێرێتە باغاتێك ڕووباریان بە بەردا دەڕواو هەتا سەر هەر لەوێ دەبن، خودایان لێ ڕازی بوەو ئەوانیش لە خودا ڕازین، ئەوانە کۆمەڵی خودان، باش بزانن هەر کۆمەڵی خودا ڕزگارن. واتە: هەرکەسێ ڕازی بوبێ بە دۆستایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی‌و بڕواداران، بێگومان ئەوە ڕزگار بوە لە دنیاو لە قیامەتداو سەرکەوتوە لە دنیاو لە قیامەتیشدا هەر بۆیە خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٥٧) وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ (٥٨)﴾

**قەدەغە کردنی دۆستایەتی خوانەناسان**

ئەمە بێزاری دەربڕینە لە دۆستایەتی کردنی دوژمنانی ئیسلام وەك جوولەکەو گاوورو بت پەرستەکان کە گاڵتەو لاقرتی دەکەن بە پیرۆزیەکانی ئەم ئیسلامە پاك‌و بێگەردە تێرو تەواوە کە هەرچی خێرو بێری دنیاو دینە تێیدا کۆکراوەتەوە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان ئێوە لەگەڵ ئەو کەسانەی گاڵتە بە دینتان دەکەن‌و لە ئەهلی کتێب هەژمار دەکرێن (پێشا بۆیان هاتوە) و ئەو کەسانەی خوانەناسن. ﴿مِّنَ﴾ لێرەدا بۆ بەیانی جنسە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ﴾[1] لە چڵك‌و چەپەڵی بتەکان دوورەپەرێز بن. هەندێ خوێندویانەتەوە (والكفارِ) بە مەکسوری عەتفی کردۆتە پێش خۆی. هەندێکی تریش بە مەنسوبی خوێندویانەتەوەو کردویانە بە (معمول) بەم شێوەیان لێ کردوە ( و لا الكفارَ أولياء) واتە: نە گاوورو جوولەکەو نە خوانەناسان هیچیان مەکەنە دۆستی خۆتان. ئیبنوجەریریش بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە کە لە خوێندنەوەی ئیبنومەسعوددا هاتوە ﴿ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ﴾[2]. (من الذين أشركوا)ی خوێندوەتەوە لە جێی (الكُفارة) پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بەڕاستی خاوەن باوەڕن، دەبێ لە خوا بترسن. دوژمنانی خۆتان‌و ئاینەکەتان نەکەنە خۆتان کە گاڵتە بە ئاینەکەی ئێوە دەکەن. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ

---

[1] الحج (٣٠).

[2] الطبري (١٠/٤٣٠).

مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾[1] باوەڕداران با جگە لە باوەڕداران نەکەن بە دۆست، هەرکەس لەم فەرمانە دەرچێ، هیچ بەشی بە خوداوە نیە، جا مەگین لێیان بترسن‌و لە ناچاری پێیان بڵێن: دۆستی ئێوەین. خودا دەیەوێ هەر بە ڕاستی لەو بترسن‌و پاشەڕۆژتان هەر لای ئەوە.

## گاڵتە کردنی خوانەناسان بە نوێژو بانگدان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ﴾ هەرکاتێ ئێوە بۆ نوێژ کردن بانگ دەکەن، ئەمانە گاڵتەی پێ دەکەن، چونکە ئەمان کۆمەڵێکی بێ ئاوەزن‌و لە هیچ ناگەن. نازانن کە نوێژ کردن لە گەورەترین کارەکانەو لە مانای عیبادەت‌و شەریعەتی خودا شارەزا نین. ئەمە ڕەوشتی شوێنکەوتوانی شەیتانە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ شەیتان هەڵدێت‌و تر لێدەدات بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کاتێ بانگەکە تەواو بوو دێتەوە هەتا قامەت دەکرێت ئینجا هەڵدێتەوە، کاتێ قامەت تەواو دەبێ دێتەوە بۆ ئەوەی دالغە بۆ نوێژگەرەکە دروست بکات، پێی دەڵێت: یادی ئەمەو ئەوە بکە (شتی وا کە پێشتر لە یادیا نەبوە) تا وا لەو پیاوە دەکات نازانێ چەند ڕکاتی کردوە، ئەگەر یەکێکتان ئەوەی بینی با دوو سوژدە ببات پێش وەلام دانەوە). بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە[2] زوهری وتی: خودا باسی بانگدانی لە کتێبەکەیدا (واتە قورئان) کردوەو فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ﴾.[3]

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ هَلۡ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلُ وَأَنَّ أَكۡثَرَكُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾ قُلۡ
هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ
أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ
أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ ﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ
يَصۡنَعُونَ ﴿٦٣﴾﴾

---

[1] آل عمران (٢٨).

[2] البخاري (٦٠٢/١٢٢٢/١٢٣١)، مسلم (٣٨٩/٢٩١/١).

[3] إبن أبي حاتم (١١٦٤/٤).

## ڕقی ئەهلی کتێب لە خاوەن باوەڕان لەبەر ئەوەیە کە بڕوایان بە خوا هەیە

خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ﴾ تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەوانەی کە ئەهلی کتێبن بڵێ: ئایا هەر لەبەر ئەوە بڕوامان بە خودا هەیەو بڕوامان بەو قورئانەیە کە بۆ ئێمە ڕەوانە کراوەو بڕوامان بەوانەشی هەیە کە پێش قورئان لەلایەن خوداوە ڕەوانە کراون ئێوە ڕقتان لە ئێمەیە؟ بێگومان ئێوە زۆرتان لە ڕێ لاتانداوەو نا فەرمانن. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بەو جوولەکەو مەسیحیانە کە گاڵتە بە ئاینەکان دەکەن. ئایا هەر لەبەر ئەوە تانەو تەشەرمان لێ ئەدەن و لۆمەمان دەکەن کە بڕوامان بە خوداو بە قورئان و بەو کتێبانەشی هێناوە لە پێشەوە ڕەوانە کراون؟ بەڕاستی ئەوە جێی تانەو تەشەرو لۆمە کردن نیە، وەئ ئیستسنای مونقەتیعە (الاستثناء المنقطع) وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾[1] تەنیا بۆیە ڕقیان لەوانە بوو؛ چونکە هەر خودای خاوەن دەستەڵاتی شایەن ستایشیان پەرستبوو. وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ﴾[2] هەر لەبەر ئەوە ڕقیان لێیان بوو خودا(موسوڵمانانی) بە چاکەی خۆی بێ نیاز کردبوو (لەوان). لە فەرموودەیەکدا کە بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (تەنیا ئیبنوجەمیل لەبەر ئەوە پێی ناخۆشە (ڕقی لێیە) هەژار بوو خودا دەوڵەمەندی کرد) (بەم فەرموودەیە پێغەمبەری خودا سەرزەنشتی ئیبنوجەمیلی کرد لەسەر زەکات نەدان و بەندیشی کرد). ﴿أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ﴾ عەتف کراوەتە سەر ﴿أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: بڕوامان هێناوە کە زۆربەتان لاتان داوەو لە ڕێی ڕاست ترازاون.

## ئەهلی کتێب شایەنی خراپترین سزان لە ڕۆژی قیامەتدا

پاشان خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ: ئایا دەتانەوێ لەوانەتانە ئاگادار بکەم کە سزایان لەلای خودا لە سزای ئەوان خراپترە؟ ئەوانە ئێوەن کە ئەم ڕەوشتانەتان تێدایە کە خودای گەورە باسی کردوەو ئەفەرموێت: ﴿مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ﴾ کەسانێکن کە بەر نەفرینی خودا کەوتن و ﴿وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾ خودا غەزەبی لێ گرتن، کە هەرگیز لێیان خۆش نابێ. ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ﴾ وە هەندێکیانی کردە مەیمون و هەندێکیانی کردە بەراز، وەك لە سورەتی

---

[1] البروج (٨).

[2] التوبة (٧٤).

بەقەرەدا لە پێشەوە باس کراو لە سورەتی ئەعرافیشدا بەو زوانە زیاتر ڕوون دەکرێتەوە. سوفیانی سەوری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنومەسعودەوە وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا کرا (ﷺ) لەبارەی مەیمونو بەرازەوە، ئایا ئەمانە لەوانن کە خودا گۆڕینی؟ فەرمووی: (بێگومان خودا هیچ کۆمەڵێکی لەناو نەداوە (یان هیچ کۆمەڵێکی نەگۆڕیوە (لم یمسخ) پاشان نەوەو وەچەی لە دوا بۆ هێشتبێتەوە. وە بێگومان مەیمونو بەراز لە پێش ئەوەدا بووە).[1] موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە[2] ﴿وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ کە ئەوانە عەبدایەتی بتیان دەکرد، واتە: وایان لێهات هەندێکیان بوونە خزمەتکارو عەبدی بتەکان. واتە: ئێوە ئەی ئەهلی کتێب کە تانەو تەشەر لە ئاینی ئێمە ئەدەن کە ناسینی خودایە بە تاکو تەنیاو عیبادەت کردنیەتی بە تەنیاو نابێ هیچی تری لەگەڵدا بپەرسترێ. چۆن ئێوە قسەی ئاوا دەکەن، کەچی ئەو شتانەی کە باس کرا هەمووی لە ئێوەدا بووە؟ هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ شوێنی ئەوان لە گشت شوێنێ خراپترەو لە هەموو لەڕێ لادەرێك گومڕاتربوون. ئەمە لە بابی (باب) بەکارهێنانی (أفْعَلَ التفعیل)ە، کە لە لاکەی تریشە هاوتای نیە، وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا﴾[3] لەو ڕۆژدا شوێنو جێگەی حەسانەوەی بەهەشتیەکان باشترین (شوێنو جێگەیە).

## لە ڕەوشتی دووڕووەکان ئاشکرا کردنی بڕواو شاردنەوەی باوەڕە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَآءُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦ﴾ کاتێ دێنە لاتان دەڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە، کەچی ئەوان بە بێ دینی هاتنە ژوورو بە بێ دینیش چوونە دەرەوە. ئەمە خورەوشتی دووڕووەکانە بە ڕووکەش لەگەڵ خاوەن باوەڕەکاندانو دڵیان پڕە لە بێ دینی، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَد دَّخَلُواْ﴾ کاتێ کە دێنە لات ئەی موحەممەد (ﷺ). ﴿بِٱلۡكُفۡرِ﴾ کەچی بە بێ دینی دێنە ژوورەوە، کاتێکیش کە دەچنە دەرەوە هیچ بەهرەیەکیش لە قسەکانی تۆ وەرناگرنو پەندو ئامۆژگاریەکانیشت هیچ کاریان تێ ناکات. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦ﴾ ئەوانە بە بێ دینی چوونەتە دەرەوە. ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ﴾ خودایش لەو شتانە دەیشارنەوە ئاگادارە. واتە: خودا ئاگاداری ناو دڵیانە دەزانێ چی تێدایە. با لەناو خەڵکیشدا خۆیان بە

---

[1] مشكل الآثار (٤/٢٧٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٤/٢٠٥١).

[3] الفرقان (٢٤).

خاوەن باوەڕ نیشان بدەن‌و خۆیانی پێوەهەڵکێشن بە درۆوە، خودا ئاگاداری نهێنی‌و ئاشکراکانە لە خۆیان باشتر شارەزایانە. لەسەر ئەو کارەیان بەو زوانە پاداشتی تەواویان ئەداتەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ﴾ زۆرێك لەوانە دەبینی کە بۆ تاوان‌و دەست درێژی‌و حەرام خۆری پێشبڕکەی دەکەن. واتە: هەمیشە خەریکی گوناه کردن‌و دەست درێژی کردنن ئەسەر خەڵکی‌و ماڵی خەڵکی دەخۆن بە ناهەق ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئاکاریان زۆر ناپەسەندە. واتە: کارێکی زۆر خراپیان کرد.

## ناڕەزایی دەربڕین لە خواناسان‌و زاناکانیان لەسەر وازهێنانیان لە قەدەغە کردنی خراپە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ ئەدی بۆچی خواناسان‌و زاناکانیان لە تاوان‌و حەرامخۆری هیچ دەستیان وەبەرناهێنن؟ ئاکاریان زۆر ناپەسەندە. واتە: بۆچی خواناسان‌و زانایان دەستی ئەو خەڵکەیان لە تاوان‌و خراپەکاری نەگرت. ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: مەبەست پێی خواناسەکانیانە، کارێکی زۆر خراپیان کرد کە بەرگریان لە خراپە نەکرد[1] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: لە قورئاندا هیچ ئایەتێ نیە بە ئەندازەی ئەم ئایەتە سەرزەنشتی زانایان‌و خواناسانی جوولەکەو مەسیحیەکانی تێدا بێ، کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾[2]. وتی: لەباتی (یصنعون) بە (یعلمون) دەیخوێندەوە ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە یەحیای کوڕی یەعمەرەوە وتی: عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێبێ) وتارێکی داو سوپاس‌و ستایشی خودای کرد پاشان وتی: ئەی خەڵکینە، بۆیە گەلەکانی پێش ئێوە لەناوچوون خەریکی تاوان‌و خراپەکاری بوون، زاناو خواناسەکانیان دەستیان نەدەگرتن لە خراپەکاری، کە زۆر ڕۆچوون لە خراپەکاریدا تووشی سزاو جەزرەبە هاتن، ئێوە فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە لە پێش ئەوە، ئەوەی تووشی ئەوان هات (لە سزاو جەزرەبە) تووشی ئێوەش بێت. چاك بزانن فەرمان کردن بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە نە بژێوی دەبڕێ‌و نە مردنیش نزیك دەکاتەوە.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جەریرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کۆمەڵێ نیە لە

---

[1] الطبري (١٠/٤٥٠).

[2] الطبري (١٠/٤٤٩).

[3] كنزل العمال (٣/٦٨٣).

نێوانیاندا کەسێ هەڵسێ بە گوناه کردن، کە ئەوان خاوەن دەسەڵات ترو بە توانا تر بن‌و نەیگۆڕن (واتە: بەرگری لەو گوناه کردنە نەکەن) مەگین خودا لەلایەن خۆیەوە تووشی سزایان دەکات[١] تەنیا ئیمامی ئەحمەد بەم شێوەیە هێناوەیەتی. ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە جەریرەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (هیچ پیاوێك نیە لەناو کۆمەڵێکدا (هۆزێکدا) بێ گوناهیان لەناودا بکرێ، تواناپان ببێ بیگۆڕن، کەچی نەیگۆڕن مەگین خودا تووشی سزایەکیان دەکات پێش ئەوەی بمرن)[٢] ئیبنوماجەیش ڕیوایەتی کردوە[٣].

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًاۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾

## جوولەکەکان دەڵێن: خودا دەستی بەستراوە

خودای مەزن باسی جوولەکە دەکات (بەر نەفرینی بەردەوامی خودا کەون هەتا ڕۆژی قیامەت) کە وەسفی خودایان کردوە وتویانە کە ڕژدو چرووکە (خودای گەورە پاك‌و بێ عەیبەو دوورە لەو بوختانانەی ئەوان کردویانە) وە وتوشیانە: خودا هەژارەو ئەوان دەوڵەمەندن، وە بەم دەقە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ جوولەکەکان وتیان: خودا دەستی بەستراوە. واتە: چرووکە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: لەم ئایەتەدا: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ دەڵێن: مەبەستیان ئەوە نیە کە خودا دەستی بەستراوە بەڵکو دەڵێن: ڕژدو چرووکە، واتە: ئەوەی لەلایەتی گرتویەتی. خودای مەزن دورە لەو قسانەوە ئەوانە دەیکەن‌و پاك‌و بێ عەیبە.[٤] موجاهیدو عیکرمەو قەتادەو سوودیو زەحاکیش هەر وایان وتوە[٥] زەحاك ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خودای

---

[١] أحمد (٤/٣٦٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[٢] أبوداود (٤/٥١٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[٣] إبن ماجة (٢/١٣٢٩)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[٤] الطبري (١٠/٤٥٢).
[٥] الطبري (١٠/٤٥٣).

گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴾[1] دەستەکانت لە گەردنت توند مەکەو تەواویش والآیان مەکەوە، کە بە سەرزەنش کراوی‌و حەسرەتەوە دەمێنیەوە. واتە: خودا قەدەغەی ڕژدی‌و قەدەغەی والآیی لە ئەندازە بەدەریشی کردوە وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ﴾ ئەو جوولەکانە مەبەستیان ئەمە بووە، واتە: خودا چروکە (بەر نەفرینی خودا کەون) عیکرمە وتی: ئەم ئایەتە لەسەر فەنحاسی (فنحاص) جوولەکە هاتۆتە خوارەوە[2] (بەر نەفرینی خودا کەوێ) لە پێشەوە باس کرا کە ئەم بوە وتویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾[3] خودا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین. کە ئەو قسەی کرد ئەبوبەکری سدیق لێی دا، خودای گەورە وەلآمی ئەم قسەی دانەوە کە وتیان، بە درۆی خستنەوەو چروکی‌و ڕژدی پیسکەیی ئەوانەی دەرخست بۆ هەموو خەلکی فەرمووی: ﴿غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟﴾ دەك دەستیان کۆت‌و زنجیر کری‌و بەر نەفرین کەون بۆ ئەوەی لە دەمیان دەرچوو. هەر واشیان بەسەر هات، زۆر حەسوودو ڕژدو چروك دەرچوون‌و سەرشۆڕو ڕسوایش بوون. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ ٱلْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَـٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾[4] ئایا ئەوان بەشیان بەو ملکەوە هەیە؟ ئەگەر بیشیانبێ، ئەوەندەی تێکوڵی دەنکە خورمایە سوودیان بۆ خەلکی نیە. یان ئەوانە حەسوودی بەمانە دەبەن کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون؟ خۆ دیاریشە ئێمە بە نەوەی ئیبراهیم کتێب‌و زانیاریمان داو دەستەلآتێکی گەورەشمان پێدان. خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ﴾[5] چارەڕەشی‌و زەبونیان بۆ بڕیار درا.

**دەستی خودا زۆر گوشادن**

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ﴾ (با بزانن) دەستی خودا زۆر گوشادن، چۆن خۆی مەیلی لێبێ دەیبەخشێ. واتە: خودا خاوەنی بەهرەی بێ سنورەو زۆر

---

[1] الاسراء (٢٩).
[2] الطبري (١٠/٤٥٢).
[3] آل عمران (١٨١).
[4] النساء (٥٣-٥٤).
[5] البقرة (٦١).

بەخشندەیە، هەرچی شت هەیە گەنجینەکەی لای ئەوە، وەدیهێنراوەکانی هەر بەهرەیەکیان هەبێ هی ئەوە بەتەنیاو شەریکی نیە، هەر ئەو خودایە پێویستیمان بە هەرشتێ ببێ بۆی دروست کردوین لە کاتی شەوماندا یا لە ڕۆژماندا لە شوێنی خۆماندا یا لە سەفەرماندا وە لە هەموو کاتێکماندا. وەك فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ الْإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾[1] هەرچی لێتان خواستوە پێی داون. ئەگەر بیێنە سەر ژمارەی چاکەی خودا لە ژماردنی دادەمێنن. بەڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکارو سپڵەیە. ئایەت لە بارەیەوە ئێجگار زۆرە. ئیمامی ئەحمەد وتی: عەبدوڕەزاق بۆی گێڕاینەوە. مەعمەر بۆی گێڕاینەوە لە هەمامی کوڕی مونبەهەوە (همام بن منبه) وتی: ئەبوهورەیرە بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەستی ڕاستی (بەخشندەیی) خودا هەمیشە پڕە. بەخشینی کەمی ناکاتەوە بە خوڕەمیش لە شەوو ڕۆژدا دەبارێت، ئایا نابینن لەو ڕۆژەوە ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردوە بەخشیویەتی، ئەوەی لە دەستی ڕاستیدایە هەرگیز کەمی نەکردوە (وتی) تەختیشی (عَرشُهُ) لەسەر ئاو بوە، وە دەستەکەی تریدا گرتنە بەرز دەکاتەوەو نزمیشی دەکاتەوە) پاشان فەرمووی: (ببەخشە پێت دەبەخشرێ)[2] لە هەردوو سەحیحەکەیشدا هاتوە[3].

## ئەوەی بۆ موسوڵمانان هاتۆتە خوارەوە، خوانەناسیو لە ئەندازە لادانی جوولەکەکان زیاتر دەکات

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ ئەوەی لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لە ئەندازە لادانو خوانەناسی زۆرێك لەوانە پتر دەکات. واتە: ئەوەی کە خودا بە تۆی بەخشیوە ئەی موحەممەد (ﷺ) لە چاکە بوە بە ئێشو ئازارو کەسەر بۆ دوژمنەکانت لە جوولەکەو هاوشێوەکانیان. وەك چۆن خاوەن باوەڕەکان زیاتر بڕوایان بەهێزو پتەوتر بوەو زیاتریش فێری زانیاریو کاری چاك دەبنو خوانەناسانیش زیاتر حەسوودی بە خۆتو ئوممەتەکەت دەبەن ﴿طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ زیاتر لە ئەندازە لائەدەنو خوانەناسیان پتر دەکات. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ ۖ وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ

---

[1] إبراهيم (٣٤).
[2] أحمد (٢/٣١٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[3] فتح الباري (١٣/٤١٥)، مسلم (٢/٦٩١).

وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ﴾[1] بلێ، ئەمە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان پێ هێناوە ڕێبەرو چارەی دەردانە، ئەوانەش بڕوای پێ ناکەن، گوێ گرانن لە بیستنو چاویان لە بینینی کوێرە، هەر دەڵێی لە جێی دورەوە بانگ دەکرێن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾[2] ئێمە لەم قورئانەدا شتی وات بۆ دەنێرین کە شیفاو بەزەیی تێدایە بۆ خاوەن باوەڕانو ستەمکارانیش زیاتر پێی زیانبار دەبن. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئێمەیش ئەوا ڕکەبەریو دوژمنایەتیمان خستە ناویان هەتا ڕۆژی قیامەت. واتە: هەرگیز دڵیان لەگەڵ یەکدا یەك ناگرێ بەڵکو هەمیشە دوژمنایەتی لە نێوان دەستەو تاقمەکانیاندا هەر دەمێنێ، چونکە ئەوانە هەرگیز لەسەر هەق کۆ نابنەوە، بەردەوام دژایەتی تۆیان کردوەو بڕوایان پێ نەکردوی. وە ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ﴾ هەرکاتێ کە ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند، خودا بۆ خۆی کوژاندیەوە. واتە: هەرکاتێ شتێکیان دروست کرد بۆ ئەوەی فێڵێکت لێ بکەنو بیکەنە بیانو بچن بەگژتدا، خودا فرۆفێڵەکانی بەتاڵ کردەوەتەوەو بە زیانی خۆیان تەواو بوەو بەسەر خۆیاندا شکاوەتەوە ﴿وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ هەتا لەسەر زەمیندان هەر بەدفەڕی پیشەیانەو دەیانەوێ خراپە بکەنو خودا خراپەکارانی خۆش ناوێ. واتە: هەرکەسێ هەمیشە خەریکی خراپەکاری بێ لە زەویداو خوڕەوشتی خراپەکاری بێ خودای ڕقی لێیەتیو خۆشی ناوێ.

**ئەگەر ئەهلی کتێب کاریان بە کتێبەکەی خۆیان بکردایە، خێری دنیاو قیامەتیان دەست دەکەوت**

پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ﴾ ئەوانەی ئەهلی کتێبن، ئەگەر باوەڕیان بهێنایەو دڵیان لە خودا بترسایە، واتە: ئەگەر بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکەی بهێنایەو لە گوناه خۆیان بپاراستایەو سنورەکانی خودایان نەبەزاندایە. ﴿لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ ئەو گوناهانەی کە کردبویان لێمان دەسڕینەوەو دەمان بردنە ناو باغاتێك پڕ لە خۆشیو بەختەوەری. گەیاندمانن بە ئاواتی خۆیانو ناڕەحەتیمان لەبەردەم نەهێشتن. ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ﴾ ئەگەر ئەوان تەوراتو ئینجیلو ئەوەی لە پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتوە بە تەواوی کاریان پێ بکردایە، ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش وتیان

---

[1] فصلت (٤٤).

[2] الاسراء (٨٢).

مەبەست بە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم﴾ قورئانە.[1] ﴿لَأَكَلُواْ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ﴾ بێگومان لەلای سەریانەوەو لە (زەمینی) ژێر پێیانەوە خواردنیان بۆ دابین دەکرا. واتە: ئەگەر کاریان بەو کتێبانە بکردایە کە لەبەر دەستیاندایە کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هێنان، نەیان گۆڕییایەو دەستکاریان نەکردایە. هەر ئەو کتێبانە ڕێنماییان دەکردن بەرەو شوێن کەوتنی هەق و کاریشیان بەپێی ئەو قورئانە بکردایە کە خودا ڕەوانەی کرد بۆ موحەممەد (ﷺ)، کە کتێبەکانی خۆیان دانیان بەڕاستیدا ناوەو فەرمانیان داوە دەبێ هەر شوێنی کەوێن ﴿لَأَكَلُواْ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ﴾ مەبەست پێی ئەوەیە، خودا زۆری زۆری لە ئاسمانەوە بۆ دەناردن و لە زەویشدا بۆی دەڕواندن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾[2] خەڵکی ئەم شارانە ئەگەر خوایان بناسیایەو خۆپارێز بونایە دەروازەی بەرەکەتمان لە ئاسمان و زەمینەوە بە ڕوویاندا دەکردەوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ﴾ ئەوانە کۆمەڵێکن، هەندێکیان مام ناوەندین و زۆرینەیان بەدکارن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾[3] دەستەیەکیش لە هۆزی مووسادا هەیە ڕێنمایی دەکەن بۆ هەق و بە ڕاستیش دادوەری دەکەن. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای مەزن لەبارەی شوێنکەوتوانی عیساوە ئەفەرموێت: ﴿فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡۖ﴾[4] جا ئەوانەی لەناو ئەواندا خاوەن باوەڕ بوون، پاداشتی خۆیانمان دانێ. خودای مەزن کۆمەڵێکی لەنێوان ئەمانەدا بە مامناوەندی ناو هێناوە کە بەرزترین پلەیە لەنێوانیاندا بەڵام ئەم ئوممەتەی هەموو بە مامناوەندی ناو هێناوە (أمةً وسطاً) کە دوای ئەم پلەیە پلەی ئەوانە دێ کە لە پێشەوەن (السابقون) وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ٣٢ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ﴾[5] جا ئەوسا ئەو

---

[1] الطبري (١٠/٤٦٤).
[2] الاعراف (٩٦).
[3] الاعراف (١٥٩).
[4] الحديد (٢٧).
[5] فاطر (٣٢-٣٣).

کتێبانەمان کردە میرات بۆ ئەو عەبدانەمان کە هەڵمان بژاردن. لەناو ئەوانیشدا کەسانێك هەن غەدر لە خۆ دەکەن برێکیشیان مامناوەنجین. هەر لەوانەش کەسانێك هەن (بە ئیزنی خوا) سەبارەت بە کاری چاکە پێش کەوتوون کە ئەمە زیادەبەشێکی زۆر گەورەیە. دەچنە ناو باغاتێکەوە لەناوناچن و دەیانرازێنەوەو بازوبەندیان لە زێڕو مرواری دەبێ و پۆشاکیشیان لەوێدا لە هەورێشمە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾

## فەرماندان بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوداو بەڵێنی خودا بە پاراستنی پێغەمبەر(ﷺ)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەی پێغەمبەر هەرچی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە ڕایگەیەنە. خودای گەورە ڕووی وتاری دەکاتە بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) فەرمانی پێدەکات کە هەموو ئەو شتانە ڕابگەیەنێ کە خودا بۆی ناردوە، پێغەمبەر ئەو فەرمانانەی خودای بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی ڕاگەیاند، بوخاری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتویەتی: هەرکەسێ پێی وتی: موحەممەد (ﷺ) شتێکی شاردوەتەوە لەوەی خودا ناردویەتیە خوارەوە بێگومان درۆی کردوە. چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾[1] لێرەدا ئەم فەرموودەیە بە کورتی هێناوە بەڵام لە سەحیحەکەیدا لە چەند شوێندا بە درێژی هێناویەتی موسلیمش لە (كتاب الايمان) هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە[2] تیرمیزی و نەسائیش لە بەشی تەفسیرەکەیاندا لە هەردوو کتێبەکەیاندا هێناویانە[3] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا دیسان عائیشە وتویەتی: ئەگەر موحەممەد (ﷺ) شتێکی لە قورئان بشاردایەتەوە ئەم ئایەتەی دەشاردەوە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُۖ﴾[4]، شتێکت لە دڵی خۆتدا دەشاردەوە، کە خودا هەر ئاشکرای دەکرد. هەر لە خەڵکیش دەترسای، کەچی خودا شیاوتر بوو لێی بترسی. بوخاری وتی: زوهری وتی: پەیامەکە لەلایەن خوداوە بوەو ڕاگەیاندنەکەیشی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بوە. پێویستە

---

[1] فتح الباري (١٢٤/٨).

[2] مسلم (١٥٩/١).

[3] تحفة الاحوذي (٤٤١/٨)، النسائي في الكبرى (٣١٥/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الاحزاب (٣٧). فتح الباري (٤١٥/١٠٣)، مسلم (١٦٠/١).

لەسەر ئێمەش گەردن کەچ بین[1] ئوممەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی داوا بە ڕاگەیاندنی ئەم پەیامەو بەجێهێنانی ئەم ئەمانەتانە. پێغەمبەری خودایش (ﷺ) لە گەورەترین کۆبونەوەدا لە ڕۆژی حەجی ماڵئاوایدا (حجة الوداع) لە وتارەکەیدا ئەمەی فەرمووە کە نزیکەی چل هەزار لە هاوەڵەکانی لەوێدا بووە[2] وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە وتارەکەیدا لە حەجی ماڵئاوایدا لە عەرەفەدا فەرمووی: (بێگومان ئێوە پرسیارتان لێ دەکرێ دەربارەی من ئێوە چی دەڵێن؟) هەموویان وتیان: شایەتی ئەدەین کە بەڕاستی تۆ پەیامەکەت گەیاند، ئەرکی سەر شانی خۆت بەجێهێنا، ئامۆژگاریت کرد. ئینجا ئەویش پەنجەی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان‌و پاشان ئامـاژەی پێکرد بۆ خەڵکەکەو ئەیفەرموو: (ئەی خودا ئایا من ڕامگەیاند؟ ئەی خودایە ئایا من ڕامگەیاند؟)[3] واتە: ئەی خودا تۆ شایەت بە کە من ڕامگەیاند. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ ئەگەر وا نەکەی ڕاسپێریەکەت ڕانەگەیاندوەو پێکت نەهێناوە. واتە: ئەگەر ئەوەی کە تۆم پێ ڕەوانە کردوە ڕای نەگەیەنی بە خەڵکی، ڕاسپێریەکەت بەجێنەهێناوە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ واتە: ئەگەر ئایەتێکت بشاردایەتەوە لەوەی لەلایەن خوداوە بۆت هاتوەتە خوارەوە ڕاسپێریەکەت ڕانەگەیاندوە[4] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ خودا تۆ دەپارێزێ لە خەڵکی. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆ پەیامەکەی منت ڕاگەیاند، منیش پارێزەرو یارمەتیدەرو پشتگیری کەرم تۆم بەرانبەر دوژمنەکانت‌و زاڵت دەکەم بەسەریاندا، مەترسەو دلگران مەبە. هیچ کەسێ لەوانە ناتوانێ زیان بە تۆ بگەیەنێ‌و ئازارت بدات. پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پاسەوانی دەکرا. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) باسی کردوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەوێك خەبەری بوەوە، ئەو لە تەنیشتیدا بوو وتی: پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چیتە؟ (وا بەخەبەر هاتوی) فەرمووی: (بریا پیاوێکی باش لە هاوەڵەکانم ئێشك چیم دەبوو ئەم شەو) عائیشە وتی: لەو کاتەدا کە من بێدار بووم گوێم لە دەنگی چەك بوو (السلاح)

---

[1] فتح الباري (١٣/٥١٢).

[2] قازی سلێمان مەنسوری فوری (المنصور فوري) لە کتێبەکەیدا (رحمة للعلمين) (١/٢٦٦) باسی وتارەکەی پێغەمبەر دەکات (ﷺ) لە (حجة الوداع) دا وتی: لەو کاتەدا ژمارەی خواناسان لەسەر ئەم زەمینەدا سەدو بیست‌و چوار هەزار بوو یان سەدو چل‌و چوار هەزار بوە.

[3] مسلم (٢/٨٨٦).

[4] الطبري (١٠/٤٦٨).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) وتی: من سەعدی کوڕی مالیکم. فەرمووی: (چی تۆی هێناوە؟) وتی: هاتم پاسەوانی تۆ بم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی: گوێم لە پرخە (لرخە) پێغەمبەر بوو کە خەوتبوو.[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا ئەم فەرموودەیە هاتوە[2] وە لە وتەیەکی (لفظ) تردا هاتوە: شەوێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خەو بێدار بوەوە پاش کۆچکردنی بۆ مەدینەو دوای ئەوەی عائیشە بووە هاوسەری (ڕەزای خوای لێبێ) ئەوەیش لە ساڵی دووهەمی کۆچیدا بوو.[3][4] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا پاسەوانی دەکرا هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری لە بنمیچەکەوە (القُبَّة) دەرهێناو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە بڵاوەی لێ بکەن (بڕۆن) خودای مەزن منی پاراستوە). تیرمیزی هەر وا ڕیوایەتی کردوە، پاشان وتی: ئەم فەرموودە، فەرموودەیەکی غەریبە[5] ئیبنوجەریرو حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا (المستدرك) ڕیوایەتیان کردوە دەڵێن سەنەدەکانی ڕاستە[6] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ خودا کۆمەڵی خوانەناسان شارەزای ڕاستەڕێ ناکات. واتە: تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆ پەیامەکە ڕاگەیەنە، خودا خۆی مەیلی لە هەرکەسێ بێ شارەزای ڕاستەڕێی دەکاتو مەیلیشی لێبێ هەرکەسێ گومڕا بکات، گومڕای دەکات. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾[7] ئەرکی سەر شانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕێ، بەڵام هەرکەس خودا خۆی مەیلی لێبێ شارەزای ڕاستەڕێی دەکات. وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ﴾[8] تۆ هەر ئەوەت لەسەرە ڕابگەیەنیو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە.

﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۖ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ

---

[1] أحمد (١٤١/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢٣٢/١٣)، مسلم (١٨٧٥/٤).

[3] فتح الباري (٩٥/٦)، مسلم (١٨٧٦/٤).

[4] ڕاستتر (الصَحيح) ئەوەیە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا چووە لای عائیشە.

[5] تحفة الاحوذي (٤١٠/٨)، فەرموودەیەکی غەریبە.

[6] الطبري (٤٦٩/١٠)، الحاكم (٣١٣/٢)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[7] البقرة (٢٧٢).

[8] الرعد (٤٠).

هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٩﴾﴾

**رزگار بوون نیە بە بڕواهێنان بە قورئان نەبێ**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب، ئێوە هەتا بەپێی تەوراتو ئینجیلو هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە نەجولێنەوە، ئێوە لەسەر هیچ (دینێك) نین. واتە: ئەی ئەهلی کتێب هەتا بڕوا نەهێنن بەو کتێبانەی کە لەلای خوداوە هاتۆتە خوارەوە بۆ ئەو پێغەمبەرانە، بەپێی بڕیاری ئەوان هەڵسوکەوت نەکەن کە فەرمانیان پێکردن شوێنی موحەممەد (ﷺ) بکەونو بڕوا بێنن کە خودا ناردویەتیو لەسەر شەریعەتەکەیشی بڕۆن ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا﴾ ئاشکرایە ئەوەی لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) سەرکەشیو خوانەناسی زۆرێك لەوان زیاتر دەکات. ﴿فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ تۆ لەبەر ئەو خوانەناسانە خەمو خەفەت مەخۆ. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناو ئەوانەشی بوونە جوولەکەو سوبیەکانو فەلەکانیش هەرکامیان باوەڕی هەبێ بە خوداو ڕۆژی قیامەتو ئاکاری چاك بکات، نە هیچ ترسیان لەسەر هەیەو نە خەم دەخۆن.

﴿وَٱلصَّٰبِـُٔونَ﴾ موجاهید وتی: ئەمانە دەستەیەکن لە مەسیحیەکان. ئاگرپەستەکانیش هیچ ئایینێکیان نیە. مەسیحیەکانیش دیارن کە هەڵگری کتێبی تەوراتن. هەر کۆمەڵێ لەمانە بڕوای هێنابێ بە خوداو بە ڕۆژی دواییو پاداشت دانەوە لە ڕۆژی قیامەتداو ئاکاری چاکی کردبێ، ئەمەیش نابێ هەتا ڕێك نەکەوێ لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا کە ڕەوانە کراوە بۆ هەموو مرۆڤو جنۆکە بە موحەممەددا (ﷺ) هەرکەس بەم سیفەتانە ناسرابێ، هیچ ترسێکی لەسەر نیە بەرانبەر ئەو شتانەی کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەو شتانەیش کە وازی لێ هێناوەو پشتگوێی خستوە خەمیش ناخوات. لە سورەتی بەقەرەدا زۆر دواین لەم بارەیەوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًاۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ
فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ
عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا﴾ ئێمە بەڵێنمان لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرت‌و زۆر پێغەمبەرانمان بۆ ناردن. خودای گەورە باسی دەکات کە پەیمان‌و بەڵێنی لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرتوە لەسەر گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکانیان بن بەڵام ئەوان ئەو بەڵێن‌و پەیمانانەیان شکاندو نەیان بردە سەرو شوێنی هەواو ئارەزوی خۆیان کەوتن‌و پێش شەریعەتی خوایان خست، ئەوەی بە دڵیان بوو وەریان دەگرت، ئەویش بە دڵیان نەبوایە دژی دەوەستان‌و وەریان نەدەگرت. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾ هەرکەس لەو پێغەمبەرانە پێچەوانەی ئارەزی ئەوان شتێکی بۆ بهێنانایە هەندێکیانیان بە درۆزن لە قەڵەم ئەداو هەندێکیشیان هەر بە کوشتن لەناو دەبەن. لایان وانەبوو ئیتر بەڵایان تووش نابێ. کوێرو کەڕ بوون (نەدەیاندی نە دەیانبیست) کەچی تووشی بەڵا هاتن. لەگەڵ ئەوەیشدا کە کوێرو کەڕ بوون بەرانبەر بە هەق‌و هەقیان نەدەبیست‌و شوێن ڕێگەی ڕاستیش نەدەکەوتن ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ پاشان پەشیمان بونەوەو ئەو پەشیمانیەشی قبووڵ کردن. دیسانەوە زۆرێك لەوان کوێرو کەڕ بوون. خودایش ئەوەی کە دەیانکرد دەیبینی‌و ئاگاداریان بوو، دەیزانی کێ شایستەی ڕێ نیشاندانەو کێش شایەنی گومڕا بوونە لەوانە.

﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي
وَرَبَّكُمْۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾
لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ
لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌۖ
كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْأَيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾﴾

**لە دین وەرگەڕانی مەسیحیەکان و بانگەوازی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بۆ یەکتاپەرستی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ ئەو کەسانەی دەڵێن: خودا خۆی مەسیحی کوڕی مەریەمە دیارە لە دین وەرگەڕاون. خودای گەورە خۆی فەرموویەتی کە چەند دەستەیەك لە مەسیحیەکان بێ دینن لە (الملكية و اليعقوبية و النسطورية) وە هەرکەسێ لەو مەسیحیانەشی کە دەڵێن: کە عیسا خۆی خودایە. خودای مەزن پاكو بێ عەیبەو دوورە لەو قسانەوە ئەوانە دەیڵێن: خۆ ڕوونو ئاشکرایە کە عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لە پێش ئەوانەوە وتویەتی کە ئەو بەندەو پێغەمبەری خودایە، وە بەکەم قسەیە بە منداڵی کە لە بێشکەدا بوو کردی، وتی: ﴿وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ﴾ من بەندەی خودام، نەی وت من خودام، یا من کوڕی خودام، بەڵکو وتی: ﴿إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا﴾[1] من بەندەی خودام کتێبی بە خەڵات دامێو منی کردۆتە پێغەمبەر. هەتا دەگاتە: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾[2] هەر خودایە پەروەردگاری منو ئێوە، دەبێ هەر ئەو بپەرستن، ئەمە ڕێگەی ڕاستە. وە کاتێکیش چوو بە ساڵەوەو بوو بە پێغەمبەر هەر وای پێ وتنو فەرمانی پێکردن کە هەر خودا بپەرستن ئەویشو ئەوانیشەو شەریکی نیەو تاكو تەنیایە. هەر بیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ﴾ مەسیح وتویەتی: ئێوەی ئەی بەرەی ئیسرائیل کە کە پەروەردگاری منیشو پەروەردگاری ئێوەیشە. ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ هەرکەسێ شەریك بۆ خودا دابنێ خودا بەشی لە بەهەشت دەبڕێو جێی ئاگرەو هەرکەس ناهەقی بکات، هیچ کەس بەهانایەوە نایە. وەك خودی مەزن لە ئایەتێکی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾[3] خودا لەوانە خۆش نابێ کە بڵێن: خودا شەریکی هەیە، لەمەبەدەر هەرکەسێ خودا مەیلی لێبێ، لێی دەبورێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾[4] جەهەنمیەکان لە بەهەشتیەکان دەخوازن: لەو ئاوە یان لەو ڕۆزیە

---

[1] مريم (٣٠).
[2] مريم (٣٦).
[3] النساء (٤٨).
[4] الاعراف (٥٠).

خودا پیچی داون شتێکیشی بەشی ئێمە بدەن. دەڵێن: خودا ئەم شتانەی بەشی بێ دینان نەداوە. وە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بانگ کەرێکی نارد کە بانگەواز بکات لەناو خەڵکیداو بڵێ: (بێگومان بەهەشت جگە لە کەسی موسوڵمان ناچێتە ناوی) وە لە وتەیەکی تریشدا هاتوە: (کەسی خاوەن باوەڕ)[1] بۆیە خودای گەورە باسی عیسا دەکات (سەلامی خوای لێبێ) کە وتویەتی بە نەوەی ئیسرائیل: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾ هەرکەسێ شەریك بۆ خودا دابنێ، خودا بەشی لە بەهەشت دەبڕێو جێی ئاگرەو هەرکەسێ ناهەقی بکات، هیچ کەس بە هانایەوە نایە. واتە: لەلایەن خوداوە هیچ کەسێ بە هانایەوە نایەو هیچ کەسێ یارمەتی نادات‌و ڕزگاری ناکات لەو سزای کە تووشی هاتوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾ ئەوانەی کە وتیان: خودا سێهەمینە لە سێ کەسەکان. موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە ئەم ئایەتە لەسەر مەسیحیەکان هاتوەتە خوارەوە بەتایبەتی. سوودیو کەسانی تریش وتویانە: لەسەر ئەوانە هاتوەتە خوارەوە کە عیساو دایکیان هەردوویان بە خوا داناوە لەگەڵ خودا. خودایان بە سێهەمین خودا داناوە.[2] سوودی وتی: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ﴾[3]،[4] ئەو کاتەیش کە خودا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، تۆ وتوتە بەو خەڵکە (جگە لە خودا) دەبێ ئێوە منو دایکم وەك دوو خودا بپەرستن؟ وتی: پاکیو بێ عەیبی هەر شیاوی تۆیە (واتە: هەرگیز شتی وام نەوتوە) ﴿وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾ جگە لە خودای تاكو تەنیا هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ. خودای هەموو بونەوەرەو شەریکی نیە. پاشان خودای مەزن هەڕەشەیان لێ دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەگەر بێتو واز لەو قسانە نەهێنن (ئەوانیانە کە وا لە دین لایانداوە) تووشی ئازارێکی بە ژان دەبن. لە ڕۆژی دوایداو ڕسوایش دەبن. وە ئەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بۆچی ئەوانە پەشیمان

---

[1] فتح الباري (٦/٢٠٧).

[2] الطبري (١٠/٤٨٣).

[3] المائدة (١١٦).

[4] الطبري (١٠/٤٨٣).

نابنە بەر قاپی خوداو داوای بەخشینی لێ ناکەن؟ کە خودا لە گوناه دەبورێ‌و دلۆڤانە. ئەوەیش لە سۆزو بەزەیی‌و ڕێزی فراوانی خودای مەزنەوەیە کە لەگەڵ ئەو هەموو تاوانە گەورەو درۆو بوختان هەڵبەستنەوە بە دەمیەوە، بانگیان دەکات کە پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای‌و تەوبە بکەن، هەرکەسێ تەوبە بکات خوای لێی قبووڵ دەکات.

## عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەندەی خودایەو دایکیشی زۆر ڕاستگۆیە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ مەسیحی کوڕی مەریەم جگە لە پێغەمبەرێك هیچی تر نیە. لە پێش ئەویش زۆرێك پێغەمبەری تر هاتوون‌و چوون. واتە: ئەمیش وەك پێغەمبەرەکانی تر وایە لە پێشەیەوە هاتوون. بەندەیەکە لە بەندەکانی خوداو پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرە بەڕێزەکانی خودا. وەك لە ئایەتێکی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾[1] ئەو تەنیا عەبدێك بوو، ئێمە چاکەمان لەگەڵ کردو کردمان بە نمونەیەك بۆ بەرەی ئیسرائیل. ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ﴾ دایکی ئەویش ژنێکی ڕاست‌و دروست بوو، بڕوای بە عیسا هێناو بە ڕاستی دانا. ئەوەیش بەرزترین پلەیە بۆ مەریەم. ئەم ئایەتە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مەریەم پێغەمبەر نەبوە. ﴿كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ﴾ هەردوکیان خۆراکیان دەخوارد. واتە: هەردوکیان پێویستیان بە خواردن بوەو پاشەڕۆشیان هەبووە. ئەوانیش دوو بەندە بوون لە بەندەکانی خودا. دوو خودا نەبوون وەك دەستەیەك لە مەسیحیە نەفامەکان وایان دەزانی (بەر نەفرینی بەردەوامی خودا کەون هەتا ڕۆژی قیامەت). پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ دەبڕوانە چەند نیشانەی ئاشکرایان نیشان ئەدەین، دیسان سەریکە چۆنین لە هەق لادەدرێن. واتە: سەریکە چۆن دوای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەو ڕوون کردنەوانە بۆ کوێ دەڕۆن‌و بە چیوە پابەندن‌و بۆ چ ڕێبازێکی گومرایی دەچن؟

﴿ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾﴾

---

[1] الزخرف (٥٩).

**ڕێگری لە بت پەرستی و هەڵەڕۆیی لە ئاییندا**

خودای مەزن ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ بەرانبەر ئەو کەسانەی کە جگە لە خۆی دەپەرستن لە بت و پەیکەرو هاوشێوەیان، ڕوونی کردوەتەوە کە هیچ شتێ شایستەی ئەوە نیە بپەرسترێ. وەك ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: بەو کەسانەی کە بێجگە لە خودا دەپەرستن لە گشت بەرەکانی نەوەی ئادەم کە مەسیحیەکانیش دەگرێتەوە، ﴿أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ ئایا بێجگە لە خوا ئێوە دەچن شتانی وا دەپەرستن نە دەتوانێ زیانتان لێ بدات و نە پێی دەکرێ سوودتان پێ بگەیەنێ؟ ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ زۆر بیسەرو زۆر زانا هەر خودایە. واتە: قسەی عەبدەکانی چاك دەبیسێ و ئاگاداری گشت شتێکیشە، لەبەرچی وازتان لە پەرستنی خودا هێناوە و دەچن بێ گیانێ دەپەرستن کە زیانی بۆ خۆیی غەیرەز خۆیی و سوودی بۆ خۆیی غەیرەز خۆیشی نیە؟ پاشان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ﴾ بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب بە ناڕەوا زیادەڕۆیی لە ئاینی خۆتاندا مەکەن، مەکەونە شوێنی ئارەزوی ئەوانەش کە گومڕا بوون. واتە: لە ئەندازە دەرمەچن لە شوێن کەوتنی هەقدا، کە عیسا پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرەکان و کەچی ئێوە کردتان بە خوداو دەتانپەرست لەگەڵ خوادا، ئەوەیش کە ئێوە پێی هەڵسان بە چاو لێکەری بوو لە زاناکانتان، ئەو زانا گومڕانەی کە لە دێر زەمانەوە گومڕا بوون ﴿وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ زۆرێکیشیان گومڕا کردو خۆشیان لە ڕێی ڕاست لایاندا. واتە: لە ڕێگەی ڕاست و دروست دەرچوون بۆ ڕێگەی گومڕایی و سەرلێشێواوی.

﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾

**نەفرینی خودا لە خوانەناسانی نەوەی ئیسرائیل**

خودای مەزن باسی ئەوە دەکات کە نەفرینی کردوە لە خوانەناسانی نەوەی ئیسرائیل هەر لە دێر زەمانەوە لەو کاتەوە کە پەیامی نارد بۆ پێغەمبەری خۆی داوود (سەلامی خوای لێبێ) وە لەسەر

زمانی عیسای کوڕی مەریەمیش (سەلامی خوای لێبێ) بەهۆی سەرپێچیانەوە لە فەرمانی خوداو دەست درێژی کردنیان ئەسەر خەڵکی خودا. عەوفی وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: نەفرین کراوە لە خوانەناسانی نەوەی ئیسرائیل لە تەوراتو ئینجیلو زەبورو قورئاندا. پاشان باسی چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان کردوە لەکاتی خۆیداو فەرمووی: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۝٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ ﴾ ئەو کۆمەڵەی لە بەرەی ئیسرائیل کە لە دین لایاندا، لەسەر زمانی داودو عیسای کوڕی مەریەم نەفرینیان لێ کرا. چونکە فەرمانی خوایان بەجێنەهێناو پیشەیان دەست درێژی بوو، ئەو ڕەفتارە نالەبارە وا دەیانکرد، بەرگریان لە یەك نەکرد. واتە: هیچ کەسێکیان بەرگریان لەوی تر نەدەکرد لەو تاوانو خراپەکاریانە کە دەیکرد، پاشان خودای گەورە زەمی کردون لەسەر ئەوەی کە وازیان لە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە هێنابوو. خاوەن باوەڕان دەترسێنن کە نەکەن ئەمانیش وەك ئەوانە بکەنو ئەفەرموێت: ﴿ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ ئای چ کارێکی زۆر خراپیان کرد.

## چەند فەرموودەیەك لەبارەی فەرماندان بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە

فەرموودە لەبارەی فەرماندان بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە زۆرە، بەڵام ئێمە لێرەدا چەند فەرموودەیەك باس دەکەین بەپێی پێویست. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە (الیمان) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دەبێ فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە یان بەو زوانە خودا سزایەکتان بۆ دەنێرێ لەلایەن خۆیەوە، پاشان لێی دەپاڕێنەوە، وەلامتان ناداتەوە)[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوەو وتویەتی ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی حەسەنە.[2] موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە (الخُدري) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی با بە زمانی (بیگۆڕێ) ئەگەر نەیتوانی بە دڵی (واتە: پێی ڕازی نەبێ) ئەوە لاوازترینی بڕوایە)[3] ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە لە عورسەوە (العُرس) واتە ئیبنوعومەیرە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خراپە (تاوان) لە زەویدا کرا ئەوەی ئاگاداری لەو خراپەیە بوو پێی ناخۆش بوو (یان جارێکی تر وتی: ناڕەزایی خۆی دەربڕی (لەو خراپەیە)) ئەوە وەك ئەو کەسە حیسابی بۆ دەکرێ لەو شوێنە بووە. بەڵام ئەو کەسەی کە لەوێ نەبوەو ڕازی بوە بەو خراپەیە وەك

---

[1] أحمد (٥/٣٨٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي (٦/٣٩١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] مسلم (١/٦٩).

ئەو کەسە وایە کە ئامادەی خراپەکە بووە)[1]. دیسان ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵکی لەناوناچێ هەتا بروبیانو دێننەوە بۆ خۆیان (لە زۆری خراپەو تاوان کردنیان))[2] ئیبنوماجە ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵساو وتارێکی داو لە وتارەکەیدا فەرمووی: (ئاگادار بن، با ڕێزگرتنی خەڵکی وانەکات لە کەسێ ڕێگری لێ بکات هەق بڵێ ئەگەر دەیزانی) وتی: ئەبوسەعید گریاو وتی: سوێند بە خودا ئێمە چەند شتمان بینی، ڕێزلێنان ڕێگری لێ کردین.[3] وە لە فەرموودەیەکی تردا لە ئەبوسەعیدەوە وتی: پێغەمبەری خودا فەمووی: (چاکترین جیهاد وتەیەکی هەقە لەلای خاوەن دەستەڵاتێکی زۆردار (ستەمکار))[4] ئەبوداوودو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە بەم شێوازە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بۆ موسوڵمان ناشێ خۆی زەلیلو ڕیسوا بکات)، وترا: چۆن خۆی ڕیسوا دەکات؟ فەرمووی: (دەچێتە ژێر بەڵاو نارەحەتی، سەرئەنجام بۆی هەڵناگیرێو توانای نامێنی)[5] هەر بەم شێوەیە تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی وتی: ئەم فەرموودەیە حەسەنو سەحیحو غەریبە[6].

**زەمی دووڕووەکان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ تۆ زۆر لەوانە دەبینی دەبنە دۆستی خوانەناسان. موجاهید وتی: مەبەست پێی دووڕووەکانە. ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ چەند خراپە ئەو توێشوەی پێش خۆیان خست. مەبەست پێی دۆستایەتی دووڕووەکانە بۆ خوانەناسانو وازهێنانیانە لە دۆستایەتی خاوەن باوەڕان، دوودڵی لە دڵیاندا دروست کردو بەهۆی ئەو دووڕوویانەوە خودا لێیان تووڕە بوو، تووڕەیەکی بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت کە زیندویان دەکاتەوە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ کە ئەنجامەکەی ئەوە بوو خودا لێیان تووڕە بوو. وە ئەفەرموێت: ﴿وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ﴾ هەر لە سزادا دەمێننەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

---

[1] أبوداود (٤٣٤٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] أبوداود (٤٣٤٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] إبن ماجة (٤٠٠٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] أبوداود (٤/٥١٤)، تحفة الاحوذي (٦/٣٩٥)، إبن ماجة (٢/١٣٢٩)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[5] أحمد (٥/٤٠٥-١٤)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[6] تحفة الاحوذي (٦/٥٣١)، إبن ماجة (٢/١٣٣٢)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

پاشــان خــودای گــەورە ئەفــەرموێت: ﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾ ئەگەر ئەوانە بە خوداو پێغەمبەرو هەرچی بۆ ئەو هاتۆتە خوار، بە دڵ باوەڕیان بوایە، دۆستی ئەمانە نەدەبوون. واتە: ئەگەر ئەمانە بەڕاستی بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرو قورئان بوایە، ئەوی کردیان لە دۆستایەتی ئەو خوانەناسانە لە ژێرەوە کە کردیانو دەستیان دایە دژایەتی خوداو پێغەمبەرو ئەو قورئانەی بۆی هاتە خوارەوە. ﴿وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ بەڵام زۆر کەس لەوان لە فەرمانی خودا لایانداو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەشیان نەکردو دژایەتی قورئانیشیان کە خودا ناردبووی.

﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾﴾

### هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە

سەعیدی کوڕی جوبەیرو سودیو کەسانی تریش وتویانە: لەسەر شاندێك کە نەجاشی ناردی بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە. تا قسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ببیستنو ڕەوشتەکانی ببینن، کاتێك کە چاوی پێ کەوتو قورئانی بەسەردا خوێندن موسڵمان بوونو گریانو ملیان کەچ کرد. پاشان گەڕانەوە بۆلای نەجاشی ئەوەیان بۆگێڕایەوە.[1] عەتای کوڕی ئەبوڕیباح وتی: ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە خەڵکی حەبەشە، کاتێك موسڵمانە کۆچکەرەکان چوونەلایان لە حەبەشە موسڵمان بوون. قەتادە وتی: ئەوانە کۆمەڵێك بوون لەسەر ئاینی عیسای کوڕی مەریەم بوون، کاتێك کە موسڵمانیان بینیو موسڵمان بوون مینجەمینجیان نەکرد.[2] واتە: بێ دوودڵی خێرا بڕوایان هێنا. ئیبنو جەریر وتی: ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە لە وەسفی ئەوکەسانەدا کە ئەم ڕەوشتەیان تێدابووە. لە حەبەشەبوبێت یان لە هەرشوێنێکی تر وەکویەکە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

[1] الطبری (١٠/٤٩٩/٥٠٠).

[2] الطبری (١٠/٥٠١).

ﭐلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ ﴾ بێگومان جووەکان شەریك دانەران بۆ خودا لە دوژمنە سەرسەختەکانن بەرامبەر ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە خودانەناسی جولەکە لەبەر لاساری‌و بێ دینی‌و دژایەتی هەق‌و بەکەم زانین هەستاون بە سوکایەتی کرد بە هەڵگرانی زانیاری کە پێغەمبەرانن (سەلامی خودایان لێبێت) هەربۆیە زۆرێك لە پێغەمبەرەکانیان کوشت. ویستیان پێغەمبەری خوداش (ﷺ) بکوژن. چەندجاریش هەوڵی کوشتنیاندا. ژەهریان بۆکردە خواردن‌و جادوویان لێکرد، هاوڕێنەکانی خۆیانیان لە موشریکەکان لێ کۆکردەوە. بە نەفرینی بەردەوامی خودا بکەون هەتا ڕۆژی قیامەت. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ﴾ ئەوکەسانەش کەوتیان: ئێمە مەسیحین زیاتر بڕوادارەکانیان خۆشدەوێت. واتە: ئەوانەی کە خۆیان بە مەسیحی دادەنێن‌و شوێنکەوتەی عیسان(سەلامی خودایان لێبێت) و لەسەر پەیڕەوی ئینجیلن، ئەوانە بەگشتی خۆشەویستی ئیسلام‌و موسڵمانان لە دڵیاندایە ئەمەش لەبەرئەوەیە کاتێك لەسەر دینی عیسا بوون سۆزو بەزەیی لە دڵیاندابووە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗ ﴾[1] دڵۆڤانی و بەزەیشمان خستە دڵی شوێنکەوتوانی. وە لە کتێبەکەیاندا هاتووە، کەسێك کێشای بە ڕوومەتی ڕاستدا ڕوومەتی چەپیشی تێکە. شەڕکردن لە ئاینیاندا ڕەوانەبووە هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴾ چونکە هەندێکیان قەشەن‌و گۆشەگیرن خۆبەزلزانن. واتە: تیایانە قەشەن، کە وتارخوێن‌و زاناکانیانە(الرهبان) کۆی (راهب)ە واتە: خوداپەرست لە(راهبة) وە هاتووە واتە: ترس. وەك (راکب و رکبان فرس و فرسان) ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حامیەی کوڕی ڕیئابەوە وتی: گوێم لە موسڵمان بوو پرسیاری لێکرا لەم دەقەدا کە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا ﴾ وتی: ئەوانە ئەو گۆشەگیرانەن کە لە پەرستگەو کەلاوەدا خوداپەرستیان کردووە. سەلمان وتی: ئەم دەقەم خوێندەوە ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ ﴾ بۆ پێغەمبە خودا (ﷺ) ئەویش بەم شێوەیە بۆی خوێندمەوە ﴿–ذالك بأن منهم صديقين وركباناً– ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴾[2] وەسفەکەیان ئەوەدەگەیەنێت کە زانست‌و خوداپەرستی‌و خۆبەکەم زانینیان تێدایە، پاشان وەسفیشی بەوە کردوونکە ملکەچ‌و دادوەرو

---

[1] الحديد (٢٧).

[2] الطبراني (٦/٢٦٦).

شوێنکەوتووە هەقیشن. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ کاتێك گوێ دەگرن لەوانەی کە لە خوداوە بۆ پێغەمبەر ڕەوانەکراوە، دەیانبینیت ئەسرین لە چاویان دەوەڕێت چونکە لە ڕاستیەکە دەگەن، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئەوا باوەڕمان هێنا، سا تۆش ناومان لەگەڵ شایەتاندا بنوسە. واتە: لەگەڵ ئەوانەی کە شایەتی لەسەر ڕاستی ئەمە دەدەن‌و بڕوایان پێی هەیە.ئەمە وەسفی ئەو مەسیحیانەیە کە لە قورئاندا باسیان هاتووە وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾[1] لەناو ئەهلی کتێبیش کەسانی وا هەن کە بڕوای بە خودا هەیە بەوقورئانەی کە بۆ ئێوە هتەخوارو بەوکتێبەی کە بۆ خۆیان ڕەوانەکراوەو کڕنوش بۆ خودا دەبەن. وە هە ر ئەوانەن کە خودای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ﴾ ئەوکەسانەی کە لەپێش هاتنی قورئان، ئێمە کتێبمان پێدان، باوە ڕیان بە قورئان هەیە. کاتێك بۆیان دەخوێنن دەڵێن: بڕوامان پێی هێناو بێگومان ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، بەرلەوەش کە بێتەخوا رەوە ئێمە قبولمان کردووە. هەتا دەگاتە ﴿لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ﴾[2] خۆشمان لە نەزانان نایە. هەربۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لەبەرامبەر ئەوقسانەدا ئەوانە وتیان: خودا دەیانباتە باخاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوات‌و هەتاسەر هەر تیادەبێت. واتە: لەپاداشتی ئەو بڕواهێنان‌و داننانیان بەوڕاستیەدا هەر دەمێننەوە لە بەهەشتداو هەرگیز لێی دەرناچن‌و نەمانیان بەسەردانایات ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ پاداشتی ئاکارچاکان هەروادەبێت. واتە: لە شوێنکەوتنیاندا بۆ ڕاستی‌و ملکەچیان بۆی لە هەر شوێنێکداو لە هەرکوێ‌و لەگەڵ هەرکەسێکدابێت. پاشان خودای گەورە دێتەسەر باسی ژیانی بەدبەختان‌و دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوکەسانەش کە خودانەناسن‌و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی، دیا رە جەهەننەم جێگەیانە. واتە: هەرگیز لێی نایەتەدەرەوە.

---

[1] ال عمران (١٩٩).

[2] القصص (٥٢ –٥٥).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾

**گۆشەگیری (رهبانیة) لە ئیسلامدا نیە**

عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە لەسەر کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) کە وتیان: ژن ناهێنین‌و واز لە ئارەزووی دونیا دەهێنین‌و هاتوچۆدەکەین لە زەویدا وەك چۆن گۆشەگیرەکان دەیانکرد، ئەوهەاڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بەشوێنیاندا، ئەو هەواڵەی بۆ باسکردن، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵام من ڕۆژی دەگرم‌و ڕۆژیش دەشکێنم‌و نوێژدەکەم‌و دەخەوم‌و ژنیش مارەدەکەمن هە رکەسێك پابەندبێت بە سوننەتی منەوە، ئەوە لە منە هە رکەسێکیش پابەندنەبێت بە سوننەتی منەوە، ئەوە لە من نیە)[1]، ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردووەو ئیبنو مەردەویهی لەڕێگەی عەوفیەوە لە ئیبنو عەبباسەوە هەر بەمشێوەیە ڕیوایەتی کردووە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا ڕیوایەت کراووە لە عائیشەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کە چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پرسیاریا ە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد (ﷺ) لەبارەی عیبادەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەکلتی نهێنیدا. هەندێکیان وتیان: گۆشت ناخۆم، هەندێکیان وتیان: ژن ناهێنم، هەندێکیان وتیان: لەسەرجێگا ناخەوم، ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) فە رمووی: (حاڵی ئەوانە چۆنە یەکێکیان ئەوەو ئەوە دەڵێت، من ڕۆژی دەگرم‌و ڕۆژیش دەشکێنم، دەخەوم‌و هەڵدەستم‌و گۆشتیش دەخۆم‌و ژنیش مارەدەکەم‌و هەرکەسێك لە سوننەتی من لابدات ئەوە لە من نیە)[2]، خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، ئەوشتانەی خودا بۆ ئێوەی حەڵاڵ کردووەو پاك‌و باشن، خۆتانی لێ بێبەش مەکەن، لە ئەندازەش دەرمەچن، خودا ئەوانەی خۆش ناوێت کە لە ئەندازە دەردەچن. واتە: زیادەڕۆیی مەکەن‌و تەنگ لەخۆتان هەڵمەچنن، ئەوانەی خودا بۆتانی حەڵاڵ کردووە لە خۆتانی قەدەغەمەکەن‌و لە خواردنی حەڵاڵیشدا زیادەڕۆیی مەکەن، بەڵکو بەپێی پێویستی خۆتان بەهرەی لێ وەربگرن. لەسنور دەرمەچن تێیداوەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ﴾[3] خواردن‌و بخۆن‌و بخۆنەوە و لە

[1] الطبری (١٠/٥١٨).

[2] فتح الباری (٩/٥)، مسلم (٢/١٠٢٠).

[3] الاعراف (٣١).

ئەندازە دەرمەچن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا﴾[1] ئەوانەش کە لەکاتی ماڵ بەخشیندا، نە یەکجاری دەست بڵاون، نە تەواویش دەس قوچاون،هەر لەو ناوەندەدا، ماون. خودای مەزن بەرنامەیەکی ڕاستو دروستی داناوە لەنێوان زیادەڕۆیی و دەست قوچاواندا لە بەخشیندا هەربۆیە فەرموویەتی: ﴿لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾ دەسا ئێوە لەو بژێوەی خودا بۆتانی داناوە، لەوەی کە پاکو حەڵاڵە بخۆنو ترسیشتان لەو خودایەبێت کە باوەڕتان پێی هەیە. لە هەموو کاروبارێکتاندا شوێن مەرجەکانو ڕەزامەندی خودا بکەونو وازبێنن لە یاخی بوونو نافەرمانی خودا.

﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ (٨٩)﴾

**سەرزارەکی لە سوێندا (اللغو في اليمين)**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ﴾ خودا بە سوێندی سەرزارەکیو دوور لە مەبەست بە گوناهبارتان دانانێت. لەپێشەوە لە سورەتی (البقرة) دا قسە لەسەر سوێندی سەرزارەکی کرا پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. کە بریتیە لەوەی پیاوێك قسەیەك بکات بەڵام قسەکەی بە سەرزارەکی بێت لە دڵیەوە نەیەت، وەك نەبەخودا، بەڵێ بەخودا.

**بارتەقای (کەفارەتی) سوێند**

بەڵگە لەسەر کەفارەتی سوێند ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَ﴾ بەڵام سوێندێك لە ناخی دڵتانەوەبێتو نەیبەنەسەر بە گوناهبارتان دادەنێت ﴿فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ﴾ لە بارتەقای ئەوە خواردن بدەن بە دە هەژار. واتە: ئەوەی نەدا رە لە هەژارانو بژێوەکی بەشی ناکات ﴿مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ﴾ لەوخواردنەی بە ئاسایی دەیدەن بە خێزانی خۆتانز ئیبنو عەبباسو سەعیدی کوڕی جوبەیر وتیان: لەوخواردنەی بەرێكو پێکی

[1] الفرقان (٦٧).

دەیدەن بە خێزامی خۆتان.[1] عەتای خۆراسانی وتی: لە چەشنی ئەوخواردنەی کە دەیدەن بە خێزانی خۆتان.[2] ﴿أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ﴾ یان دەبێت جلوبەرگی دە هەژار بدەن. واتە:هەریەکێك لەو هەژارانە دەبێت جلو بەرگێکی وای پێ بدرێت کە بشێت نوێژی پێوەبکات، پیاوبێت یان ژن هەرکەسێك بەپێی خۆی، والله أعلم. عەونی لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: بۆ هەر هەژارێك عەبایەك یان بالاپۆشێك لاشەی داپۆشێت[3] موجاهید وتی: لای کەمی پۆشاکێك، لای زۆریش بە ئارەزووی خۆت.[4] حەسەنو ئەبوجەعفەری باقرو عەتاو تاوسو ئیبراهیمی نەخەعیو حەمادی کوڕی ئەبوسولەیمانو ئەبومالك وتیان: پۆشاك پۆشاك واتە: هەرییەکی پۆشاکێك.[5] ﴿أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ یان کۆیلەیەك ڕزگاربکەن. دەبێت ئەوکۆیلەیەش بڕواداربێت. وەك فەرموودەکە ی عەمری کوڕی حەکەمی ئەسلەمیدا کە لە کتێبی مۆتەئی (الموطأ) مالیكو موسنەدی شافیعیو سەحیحی موسلیمدا هاتووە باسی کردووە کە ئازادکردنی کۆیلەیەکی لەسەربووە، کەنیزەیەکی ڕەش پێستی لەگەڵ خۆی هێنا، پێغەمبەری خودا فەرمووی بە کەنیزەکەکە: (خودا لەکوێیە؟) وتی: لە ئاسمانە، فەرمووی: (من کێم؟) وتی: پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (ئازادی بکە ئەوە بڕوادارە)[6]، ئەمە سێ شتە لە بارتەقای سوێندشکاندا هەریەکێکیان بەجێ بهێنرێت دروستە بە ڕای کۆی زانایان بەڵام بە ئاسانترینیان دەست پێ دەکرێت خواردن سوكو ئاسانترە لە پۆشاك وەك چۆن پۆشاك سوكو ئاسانترە لە کۆیلە ئازادکردن، لەخوارەوە بەرزدەبێتەوە بۆ سەرەوە، خۆ ئەگەر کەسێك توانای ئەم سێ شتەی نەبوو، ئەوە سێ ڕۆژ بەڕۆژی دەبێت لە کەفارەتەکەیدا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ﴾ کەسێك کە ئەمانەی نەبوو، با سێ ڕۆژ بەڕۆژی بێت. ئوبەی کوڕی کەعبو ئیبنو مەسعودو هاوەڵەکانی بەم شێوەیە ئەم ئایەتەیان خوێندووەتەوە ﴿فصيام ثلاثة أيام متتابعات﴾[7] واتە: سێ ڕۆژ ڕۆژی گرتن بەدوای یەکدا. ئەمە نەبووە بە قورئانێکی متەواتر بەڵام کەمترینە لەوەی خەمی کەسێك بێت یان تەفسیری یەکێك بێت لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە حوکمی مەرفوعدایە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا

---

[1] الطبری (١٠/٥٤١).

[2] الطبری (١٠/٥٣١).

[3] الطبری (١٠/٥٤٧).

[4] الطبری (١٠/٥٤٥).

[5] الطبری (١٠/٥٤٦).

[6] الموطأ (٢/٧٧٦)، والرسالة (٧٥)، مسلم (١/٣٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] الطبری (٥/٣١).

حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ﴾ ئەمە قەرەبووی سوێندتانە کە بە ئەنقەست خواردبێتان. سوێندی خۆتان بپارێزنو بەجێی بێنن ئیبنو جەریر وتی: واتە بێ قەرەبوو واز لە سوێندەکانتان نەهێنن[1] ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ ئاوا خودا نیشانەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاکو شوکری بکەن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾﴾

### قەدەغەکردنی مەیخۆری و قوماربازی

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان شەراب خۆریو قوماربازیو کێل پەرستیو گرەو لەسەر تیرتەقاندن، پیسنو لەکارەکانی شەیتانن، خۆتانی لێ بپارێزن بەڵکو ڕزگارتان بێت. خودای گەورە خواردنی ئارەقو قوماری قەدەغەکردووە لە عەبدەخاوەن باوەڕەکانی، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە گەورەی موسڵمانانەوە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کە وتویەتی: شەترەنج یەکێکە لە قومارەکان، دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەتاو موجاهیدو تاوسەوە سوفیان وتی: یان دووکەس لەوان وتیان: هەموو جۆرە قوماربازیەك هەر قومارە هەتا یاریکردن بە هێلکەو گوێزش[2] وە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: (الميسر) واتە: قومار[3] زەحاك لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: (الميسر) واتە: قومار[4] لەکاتی نەفامیدا قوماریان دەکرد هەتا هاتنی ئیسلام خودای گەورە ئەو ڕەوشتە ناشیرینەی لێ قەدەغەکردن.

---

[1] الطبری (١٠/٥٦٠/٥٦٢).

[2] الطبری (٤/٣٢٢/٣٢٣).

[3] الطبری (٤/٣٢٥).

[4] الطبری (٤/٣٢٤).

**تەفسیری ﴿وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ﴾**

ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو عەتاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن‌و کەسانی تریش وتویانە: (الانصاب) ئەو بەردەبووە کە قوربانیەکانیان لەلای سەردەبڕی، بەڵام (الازلام) ئەو بە ردەبووە کە پڕشی ئاگری لێ دەبووەوەو بەشیان پێ دیاری دەکرد، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾ پیسن‌و لەکاری شەیتانن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: بێزراوەو لە کرداری شەیتانە[1] سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: گوناهە[2] زەیدی کوڕی ئەسلەم وتی: خراپەو لە کرداری شەیتانە[3] ﴿فَاجْتَنِبُوهُ﴾ خۆتانی لێ بپارێزن. زەمیرەکەی (الضمیر) دەگەڕێتەوە بۆ (الرجس) واتە: وازی لێ بێنن ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو ڕزگارتان ببێت ئەمە بۆ هاندانە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ شەیتان مەبەستی ئەوەیە، بە شەراب خواردن‌و قومار ئاژاوەتان بخاتەناو لەیادی خوداو نوێژ لاتان بدەن. ئایا ئێوە دەست لەوکارانە بەدەدەن؟ ئەمەش هەڕەشەو ترساندنە لەوکەسانەی کە وازناهێنن.

**باسی ئەوفەرموودانەی لەبارەی حەرامکردنی مەیەوە هاتووە**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: مەی سێ جار حەرم کراوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشتە مەدینە، ئەوخەڵکە مەیان دەخواردەوەو (پارەی) قوماریان دەخوارد پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا کرد (ﷺ) لەبارەیانەوە، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾[4] لەبارەی شەراب‌و قومارەوە پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: تاوانیان گەورەیەو بۆ خەڵکیش سودیان هەیە. هەتا کۆتایی ئایەتەکە. خەڵکی وتیان حەرام نەکراوە لێمان، بەڵکو خودا دەفەرمووێت: ﴿فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ لەسەر ئارەق خواردن بەردەوام بوون هەتا ڕۆژێك لەوڕۆژانەدا، پیاوێکی کۆچەری نوێژی دەکرد، لە نوێژی مەغریبدا پێشنوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد، لە قورئان خوێندنەکەیدا تێکەڵی دەکرد، خودای گەورە ئایەتێکی

[1] الطبری (١٠/٥٦٥).
[2] الطبری (٤/٣٣٠).
[3] الطبری (١٠/٥٦٥).
[4] البقرة (٢١٩).

توندتری ناردەخوارەوەو فەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾[1] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، بە سەرخۆشی نزیکی نوێژ مەبنەوە، هەتا تێ دەگەن چی دەڵێن. هەر خەڵکی ئارەقیان دەخواردەوە، هەتا کەسی وایان دەهات بۆ نوێژ بەشەو خواردبوویەوە پاشان خودا ئایەتێکی توندتری ناردەخوار لەوەی پێشوو فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَـٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَـٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، وتیان کۆتایمان پێ هێنا پەروەردگارمان. ئەو خەڵکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەسانێك لەڕێگەی خودا کوژران، کەسانێکیش لەسەرجێگەی خۆیان مردن. ئارەقیان خواردووەو (پارەی) قوماریشیان خواردووە، خوداش بە پیسی و کاری شەیتان دایناون. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ﴾ بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکارچاکن لەسەرئەوەی کە لەپێشدا خواردوویانە گوناهیان نایەتەسەر. تا کۆتایی ئایەتەکە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر قەدەغەبکرایە لێیان ئەوانیش وازیان لێدەهێنا، وەك ئێوە وازتان لێی هێنا)[2] تەنیا ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودەیەی هێناوە. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە کە وتی: کاتێك ئایەتی قەدەغەکردنی مەی خواردن هاتەخوارەوە وتی: ئەی خودایە لەبارەی ئارەقەوە ڕوونکردنەوەی ئاشکراو تەواومان پێ بدە، ئەم ئایەتەی سورەتی (البقرة) هاتەخوارەوە ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ ﴾[3] لەبارەی قومارو شەراب پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: تاوانیان گەورەیە. عومەر بانگکراو بۆی خوێندرایەوە، پاشان وتی: ئەی خودایە لەبارەی مەیەوە ڕوونکردنەوەی ئاشکراو تەواومان پێ بدە. پاشان ئەم ئایەتەی سورەتی (االنساء) هاتەخوارەوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ ﴾[4] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، بە سەرخۆشی نزیکی نوێژ مەبنەوە. بانگبێژەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك وتی: (حی الصلاة) بانگی کردسەرخۆشەکان نزیکی نوێژ مەبنەوە. عومەر بانگکراو بۆی خوێندرایەوە، دیسان وتی: ئەی خودایە لەبارەی مەیەوە ڕوونکردنەوەی ئاشکراو تەواومان پێ بدە. پاشان ئەم ئایەتەی سورەتی (المائدە)

---

[1] النساء (٤٣).

[2] النساء (٤٣).

[3] البقرة (٢١٩).

[4] أحمد (٣٥١/٢) سەنەدەکانی لاوازە.

هاتەخوارەوە، عومەر بانگکراو بۆی خوێندرایەوە کە گەیشتە ئەوشوێنەی کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ ئایا ئێوە دەست لەوکارە بەردەدەن؟ عومەر وتی: کۆتایمان پێی هێنا کۆتایمان پێی هێنا[1] ئەبوداودو تیمیزیو نەسائی هەر بەمشێوەیە ڕیوایەتیان کردووە[2] تیرمیزیو عەلی ئیبنولمدینی ئەم فەرموودەیان بە ڕاست داناوە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە لە وتارێکدا لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئەی خەڵکینە ئەوسا زانن لەم پێنجەدا قەدەغەکردنی مەی دابەزیووە: ترێو خورماو هەنگوینو گەنمو جۆ. (الخمر) ئەوەیە کە عەقڵ لەسەرخۆی ناهێڵێتو تێکی دەدات[3]. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: حەرامکردنی مەی دابەزی، ئەوکاتە لەناو مەدینەدا لە پێنج خواردنەوەدابوو، یەکێك لەوانە خواردنەوەی شەرابی ترێ بوو[4].

### فەرموودەیەکی تر

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە وتی: من مەیم دەگێڕا بۆ ئەبوعوبەیدەی کوڕی خەڕراجو ئوبەیی کوڕی کەعبو سوهەیبی کوڕی بەیزاء و چەند هاوەڵێکی لە ماڵی ئەبوتەڵحە هەتا خەریك بوو مەیە سەرخۆشی دەکردن، یەکێك لە موسڵمانەکان هاتو وتی: ئایا نەتانزانیوە کە مەی حەرام کراوە؟ وتیان: یا چاوەڕوان بکەینو بپرسین، وتیان: ئەی ئەنەس ئەوەی لە دەفتەرەکەتدا ماوەتەوە بیڕێژە، سوێند بەخودا جارێکی تر نەگەڕانەوەسەری، ئەوەیش جگە لە خورماو فەریکە خورما(البسر) زیاترنەبوو ئەوە لەوکاتەدا شەرابی ئەوان بوو.[5] لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەنەسەوە هاتووە کە وتی: من مەیگێڕی ئەوکۆمەڵەبووم لەوڕۆژەدا کە حەرامکرا لە ماڵی ئەبوتەڵحە مەیەکەیان جگە لە گوشراوی خورماو فەریکە خورما نەبوو، واتە: لەودووانەبوو. لەوکاتەدا جاڕچیەکە جاڕیداو وتی: وەرنەدەرو چاوەڕوان بن، لەوکاتەدا جاڕچیەکە جاڕیدا: ئەوسا بزانن کە مەی حەرامکرا، دەگەڕان بەناو کۆڵانەکانی مەدینەدا. وتی: ئەبوتەڵحە پێی وتم: بڕۆدەرەوەو بیڕێژە، منیش لارم کردەوە، وتیان: یان هەندێکیان وتیان: فڵانو فڵان کوژران مەیەکە لەناو سکیاندایە، وتی: خودای مەزن ئەم ئایەتی ناردەخوارەوە ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ

---

[1] أحمد (٥٣/١) فەرموودەیەکی مورسەلە.

[2] أبوداود (٧٩/٤) تحفة الاحوذي (٤١٧/٨)، النسائي (٢٨٦/٨) فەرموودەیەکی مورسەلە.

[3] فتح الباری (١٢٦/٨)، مسلم (٢٣٢٤/٤).

[4] فتح الباری (١٢٦/٨).

[5] أحمد (١٨١/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ﴾[1] بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاكارچاكن لەسەرئەوەی كە لەپێشدا خواردوویانە گوناهیان نایەتەسەر. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە وتی: لەوكاتەدا كە پیاڵەی مەیم دەگێڕا بۆ ئەبوتەڵحەو ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاحو ئەبودوجانەو مەعازی كوڕی جەبەلو سەهلی كوڕی بەیزاء هاتەسەریان ئەوی كردبوو بۆ ئەوشەرابە لە ئاوێتە گوشراوی خورماو فەریكە خورمایە كە بیخۆن. گوێم لە جاڕچییەكە بوو جاڕیدەداو دەیوت: ئەوسا بزانن كە مەی حەرامكراوە. وتی: نە كەس هاتەلامانو نە كەسیش لەناومان دەرچوو هەتا مەیەكانمان ڕژاندو دەفرەكانمان شكاندو هەندێكمان دەستنوێژی گرتو هەندێكی تر خۆی شۆری، هەندێكمان بۆنی خۆشمان لەخۆمان دا، لەلای ئوممو سولەیم و پاشان ڕۆیشتین بۆ مزگەوت لەوكاتەدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی بۆ ئەوە چی دەڵێت كە مردووەو مەی خواردووەتەوە؟ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾ پیاوێك بە قەتادەی وت تۆ لە ئەنەسی كوڕی مالیكت بیستووە؟ وتی: بەڵێ، وە پیاوێك بە ئەنەسی كوڕی مالیكی وت: تۆ لە پێغەمبەری خودا بیستووە (ﷺ)؟ وتی: بەڵێ، یان وتی: كەسێك بۆیگێڕامەوە كە هەرگیز درۆی نەكردووە، و ئێمەش هەرگیز درۆمان نەكردووەو ناشزانین درۆچییە[2] وە لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەدا خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ بەرفەرمانی خودابنو بەرفەرمانی پێغەمبەربن لە سەرپێچیش خۆتان بپارێزن، ئەگەر لە فەرمان دەرچن، ئەوەندە بزانن كە پێغەمبەر جگە لە پێ ڕاگەیاندن هیچی تری لەسەرنیە.

### فەرموودەیەكی تر

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بە دە شێوە نەفرین لە مەی كراوە: لە مەی خۆی، لەوكەسەی كە دەخواتەوە، لەوەی كە دەیگێڕێتو دەردخواردی خەڵكی دەدا، لەوەی دەیفرۆشێتو لەوەی دەیكڕێتو لەوەی دەگوشێتو لەوەی بۆ دەگوشرێتو لەوەی هەڵیدەگرێتو لەوەیش بۆی هەڵدەگرێت دەبرێت بۆیو لەوەش كە نرخەكەی

[1] فتح البارى (١٣٣/٥)، مسلم (١٥٧/٣).
[2] الطبرى (٥٧٨/١٠).

دەخوات)[1] ئەبوداودو ئیبنوماجەش ڕیوایەتیان کردووە[2] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا دەرچوو بۆ میربەدو (المِربَد) منیش لەخزمەتیدا دەرچووم، لەخزمەتیدابووم لەلای ڕاستیەوەبووم، ئەبوبەکر هاتو خۆی دواخستو چووەلای ڕاستیو منیش چوومەلای چەپی، پاشان عومەر هاتو خۆم لادا بۆ ئەو چووەلای چەپی، پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشتە میربەد لەوکاتەدا لە کوڵانێکدا لەسەر ڕێگەی میربەدبوو ئارەقی تێدابوو. ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بانگی کردمو کە کێردێکی بۆ بێنم، هەتا ئەوڕۆژە نەمزانی کێرد چۆنە، فەرمانیدا دەفری ئارەقەکەیان لەتوپەت کرد، پاشان فەرمووی: (نەفرەت لە ئارەق لەوەوی کە دەیخواتەوەو ئەوەی دەگێڕێتو ئەوەی دەرخواردی خەڵکی دەدات، ئەوەی دەیکرێتو ئەوەی دەفرۆشێت، ئەوەی هەڵیدەگرێتو ئەوەی هەڵیدەگرن بۆیو بۆیدەبات، ئەوەش کە نرخوکەی دەخوات)[3].

### فەرموودەیەکی تر

بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە سەعدەوە وتی: لەبارەی مەیەوە چوار ئایەت هاتەخوارەوە پاشان ئەم فەرموودەیەی بۆ باسکرد وتی: پیاوێکی ئەنساری خواردنێکی دروستکردو بانگی کردین، مەیمان خواردەوەو سەرخۆش بووین، پێش ئەوەی حەرام بکرێت، شانازیمان دەکرد لەناو خۆماندا، ئەنسارییەکان وتیان: ئێمە بەڕێزترین، قورەیشیەکان وتیان: ئێمە بەڕێزترین، پیاوێکی ئەنساری تەلەزمەدارێکی هەلگرت دای بە لووتی سەعداو کونی تێکرد لەپێشدا لووتی سەعد هەر لەت بوو. ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ﴾ هەتا دەگاتە ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردووە[4].

### فەرموودەیەکی تر

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە وتی: ئەم ئایەتەی قورئان کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ لە تەوراتدا هاتووە خودای مەزن هەقی ناردووە بۆئەوەی ڕوپوچی پێ لابەرێت، گاتەوگەپو دەهۆڵو زوڕناو سەماو پێ کوتان بە زەویداو بلوێرو دەفو سەمتورو عودو شیعری پێ بەتاڵ بکاتەوە (مەبەست بە شیعر، شیعری ناڕەوایە) مەی تاڵە بۆ ئەوکەسەی دەیخوات.

---

[1] أحمد (٢/٢٥) فەرموودەیەکی لاوازە بە مەرفوعی هاتووە.

[2] أبوداود (٣٦٧٤)، ابن ماجه (٣٣٨٠).

[3] أحمد (٢/٧١) فەرموودەیەکی لاوازە بە مەرفوعی هاتووە.

[4] البهقي (٨/٢٨٥)، مسلم (١٧٤٨).

خودا سوێندی خواردووە بە توناو دەستەڵاتی خۆی، هەرکەسێك بیخواتەوە دوای ئەوەی کە حەرامی کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا تینوی دەکات، هەرکەسێکیش وازی لێ بێنێت دوای ئەوەی کە حەرامی کردووە لەناو (حضيرة القدس) دا پێی نۆش دەکات.[1] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکای ڕاستن.

### فەرموودەیەکی تر

شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) وتی: مالیك هەواڵی پێداین لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێك لە دونیا مەی خواردبێتەوە پاشان لێی پەشیمان نەبووبێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا لێی بێبەش کراوە)، بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە[2] وە دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو سەرخۆشکەرێك مەیە، هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە، هەرکەسێك مەی خواردبێتو مردبێتو بەردەوام بووبێت تەوبەی نەکردبێت لێی، لە ڕۆژی دوایی دا لێی ناخوات)[3]، لە عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشامەوە وتی: لە عوسمانی کوڕی عەفانم بیست دەیوت: (دووربکەونەوە لە مەی چونکە مەی دایکی گشت پیسیەکانە، پیاوێك لەناو گەلانی پێش ئێوەدا خەریکی خوداناسی بوو دوورکەوتبووە لە خەڵکیو، ئافرەتێکی فریودەر حەزی لێکرد، کەنیزەی خۆی نارد بەدوایداو پێی وت: داوات لێ دەکەین کە شایەتیەکمان بۆ بدەیت، لەگەڵی چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکە لە هەر دەرگایەك چووە ژوورەوە دەرگاکەی داخست، هەتا گەیشتەلای ژنێکی جوان منداڵێكو کوپێك مەی لەلابوو، ئافرەتەکە وتی: سوێند بەخودا من بۆ شایەتیم بانگ نەکردی، بەڵکو بۆ ئەوە بانگم کردی کە لەگەڵم ڕابوێریت، یان ئەم منداڵە بکوژیت یان ئەم مەیە بخۆیتەوە، پیاڵەیەك مەی دایە، پیاوەکە وتی: هی تریشم بدەرێ، دەستی لێ هەڵنەگرت هەتا لەگەڵ ئافرەتەکە ڕایبوارد و منداڵەکشی کوشت. سا دووربکەونەوە لە مەی، چونکە مەیو بڕوا هەرگیز لەگەڵ یەك کۆنابنەوە، مەگین خێرا یەکێکیان ئەوەی تریانی وەدەرناوە)، بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە[4] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی ڕستە، ئەبوبەکری کوڕی دنیا ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (ذم المسكر)دا بە مە رفوعی بەڵام بە مەوقوفی ڕاسترە والله أعلم. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: کاتێك کە مەی حەرام کرا هەندێك کەس وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاوەڵەکانمان ئەوانەی کە مردوون مەی یان دەخوارد، خوادی مەزن ئەم ئایەتەی نارد ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. وە کاتێك قیبلە

---

[1] ابن أبي حاتم (١١٩٦/٤) فەرموودەیەکی مەوقوفەو سەنە سەنەدەکانی سەحیحن.

[2] مسند الشافعي (١٧٦٣)، البخاري (٥٥٧٥)، مسلم (٢٠٠٣).

[3] مسلم (٢٠٠٣).

[4] البيهقي (٢٨٨/٢٨٧/٨) ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

کوێژرایەوە، هەندێك کەس وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو برایانەمان کە مردن، ئەوانە نوێژیان بەرەو قودس دەکرد؟ خوادی مەزن ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە[1]: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾[2] خودا ئەو بڕوایەی کە هەتانە بەزایەی نادات. وە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَوْا وَآمَنُوا ثُمَّ اتَّقَوْا وَأَحْسَنُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ بۆ ئەوانەی کە بوونەتە خاوەن باوەڕو ئاکارچاکن لەسەر ئەمەی کە لەپێشدا خواردوویانە گوناهیان نایەتەسەر، ئەگەر ئێستا خۆپارێزبن و بڕوایان بە خودا هەبێت و ئاکارچاك ڕەچاوبکەن، لە دوارۆژیشدا خۆیان لە گوناه بپارێزن و لەسەر باوەڕیان بمێنن و چاکەبکەن، خودا چاکەکارانی خۆشدەوێت. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتم (واتە: وتی بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود): (تۆ لەوانەی) موسلیمش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە. تیرمیزی و نەسائیش لەڕێگەی ئەوە ڕیوایەتیان کردووە[3].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ وَمَنْ عَادَ فَيَنْتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ ﴿٩٥﴾﴾

## قەدەغەکردنی کوشتنی نێچیر لەماڵی خوداو لە ئیحرامدا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، خودا دەربارەی ئەو نێچیرەی کە بەدەستان یان بە ڕمەکانتان ڕاوی دەکەن تاقیتان دەکاتەوە. والیبی لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا وتی: ﴿تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ﴾ واتە: نێچیری لاوازو بچوك، خودا عەبدەکانی تاقی دەکاتەوە لەکاتی ئیحرام پۆشیندا، هەتا ئەگەر بیانەوێت بە دەستیشیان بیانگرن، خودا قەدەغەی کردووە لێیان کە نزیکیان بکەونەوە.[4] موجاهید وتی: ﴿تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ﴾ واتە:

---

[1] أحمد (٢٩٥/٧) فەرموودەیەکی باشە (جید).

[2] القرة (١٤٣)

[3] مسلم (١٩١٠/٤)، تحفة الاحوذي (٤١٩/٨)، النسائي في الكبرى (٣٣٧/٦).

[4] الطبری (٥٨٤/٦).

نێچیری بچووك بەچکەکەشی بەدەستان مەکوژن‌و ﴿وَرِمَاحُكُمْ﴾ نێچیری گەورەش بە ڕمەکانتان مەکوژن لە ئیحرامدا[1] موقاتیلی کوڕی حەیان وتی: ئەم ئایەتە لە عومرەی حودەیبیەدا هاتەخوارەوە، لەوکاتەدا کە ئاژەڵی کێوی‌و باڵندەو نێچیری بچووکیش لەوسەفەرەیاندا دەوری دان، لە هیچ کاتێکدا شتی وا بەوشێوە نەبینراوە، خودای مەزن کوشتنی قەدەغەکردن لەوکاتی ئیحرامەیاندا ﴿لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾[2] هەتا بزانێت کێ بەنهێنی لێی دەترسێت. واتە: خودا تعاقیتان دەکاتەوە بەو نێچیرەی کە دەوری داونەو سەفەرەیاندا کە دەیانتوانی بە دەست بیانگرن یان بە ڕمەکانیان بە نهێنی‌و بە ئاشکرا بیانکوژن. تا گوێڕایەڵیان دە ربکەوێت‌و کێ بەرفەرمانە لە نهێنی‌و ئاشکرادا لێیان. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾[3] ئەوکەسانەی بە نهێنی لە پەروەردەیان دەترست لێ خۆشبوون‌و پاداشتی گەورەیان هەیە. لێرەدا خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ هەرکەسێك لەوسنورەی کە بۆی دیاریکراوە دەربچێت بەشی ئازاری بەژانە. سوددی و کەسانی تریش وتویانە: واتە دوای ئەم ئاگاداری‌و هەڕەشەیە لە سنوور دەربچێت‌و دژایەتی فەرمانی خوداو شەرعەکەی بکات بەشی ئازاری بەژانە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْتُلُواْ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ، هەتا ئێوە لە ئیحرامدان، نابێت هیچ نێچیرێك بکوژرێت، ئەمە لەلایەن خوداوە حەرام کراوە کە نێچیر بکوژرێت لەکاتی ئیحرامدا، وە قەدەغەشی کردووە کە بیدەنە یەکتری. هیچ نێچیرێکی لێ جیاناکرێتەوە مەگین ئەوەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە دایکی موسڵمانانەوە عائیشە (ڕەزای خودای لێبێت) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج لەڕێکە دەرچووەکە دەکوژرێن لە ماڵەوەدابێت یان لە حەرەمدابێت: قەلەڕەش، قەلەباچکەو، کۆلارەو دووپشك‌و مشك‌و سەگی هار)[4]، لە ئیبنو عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج گیانەوەر لە حەرەمدا کوشتنیان تاوان نیە، قەلەباچکەو کۆلارەو دووپشك‌و مشك‌و سەگی هارە)[5] بوخاری‌و موسلیمش هێناویانە[6] ئەیوب لە

[1] الطبری (١٠م٥٨٣).
[2] الدر المنثور (١٨٥/٣).
[3] الملك (١٢).
[4] البخاری (٣٣٤)، مسلم (١١٩٨).
[5] الموطأ (٣٥٦/١) فەرموودەیەکی سەحیحە.
[6] فتح الباری (٤٢/٤) مسلم (٨٥٨/٢).

نافیعەوە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە هە ر بەم شێوەیە[1] ئەیوب وتی: وتم بو نافیع، ئەی مار؟ وتی: مر هیچ گومانی تێدانیەو ناکۆکی نیە لە کوشتنیدا[2] گورگو درندەو پڵنگ خراونەتەپاڵ سەگی هارەوە. چونکە ئەمانە زیانیان پترە لە سەگ یان سەگ بۆ ئەمانەش بەکاردێت والله أعلم. لە ئەبوسەعیدەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پرسیاری لێکراوە لەوانەی کە ئەوکەسانەی لە ئیحرامدان دەکوژن؟ فەرمووی: (مارو دووپشکو لەڕێ لادەرەکان قەلەباچکە دەردەکرێت ناکوژرێت، سەگی گەزەندەو کۆلارەو درندەی پەلاماردەر) ئەبوداودو ترمیزیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنە[3].

## تۆڵەی کوشتنی نێچیر لە حەرەمدا یان لە ئیحرامدا

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ هەرکەسێك لە ئێوە بە ئەنقەست نێچیرێك بکوژێت لە ئیحرامدا، لە تۆڵەی ئەوەدا دەبێت هاوشێوەی نێچیرە کوژراوەکە بدات. موجاهید وتی: مەبەست بە ئەنقەست لێرەدا ئەوەیە، کەسێك نیازی کوشتنی ئەو نێچرەی کردووە، بەڵام لەیادی نەماوە لە ئیحرامدایە[4] بەڵام ئەوکەسەی دەیەوێت بە ئەنقەست نێچیر بکوژێت لە یادیشیەتی کە حەرامە، ئەمە کارەکەی گەورەترە لەوەی کە کەفارەتی بدات، ئیحرامەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەوە قسەیەکی زۆر سەیرە کە کۆی زانایانی لەسەرە دەڵێن: ئەوەی بە ئەنقەستو ئەوەی بە لەیادچوونیش نێچیرێك دەکوژێت وەکویەکن لە کەفارەتدان. الزهری وتی: قورئان بەڵگەیە لەسەر کوشتنی ئەنقەستو سونەتیش کەفارەتی داناوە بۆ کەسێك لەبیری بچێت.[5] مانای وایە قورئان بووەتە بەڵگە لەسەرئەوەی کە دەبێت کەفارەت بدرێت لە کوشتنی نێچیردا بە ئەنقەستو گوناهباربوونی ئەوکەسەش. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ﴾ هەتا سزای ئەوکردەوەی خۆی بچێژێت، خودا لە کاری ڕابووردوو چاودەپۆشێت هەرکەسێکیش تێ هەڵبچێتەوە، خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوەز لە فەرموودەدا هاتووە لە بڕیارەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) بڕیارەکانی هاوەڵەکانیشیداکە دەبێت کەفارەتی کوشتنی نێچیری بە هەڵەش بدرێت. وەك چۆن قورئان بووە بەڵگە لەسەر کەفارەتی کوشتنی نێچیری ئەنقەست. دیسان کوشتنی نێچیرلەنابردنە،

---

[1] النسائي (١٩٠/٥).

[2] فتح الباری (٤٤/٦).

[3] أبوداود (٤٢٤/٢)، تحفة الاحوذی (٥٧٦/٣)، ابن ماجە (١٠٣٢/٢) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] الطبری (٨/١١).

[5] الطبری (١١/١١).

لەناویردنیشی پارێزراوە لەکاتی ئەنقەستو لەبیرچووندا، ئەوکەسەی بە ئەنقەست دەیکوژێت تاوانبارە.

بەهەڵەداچوو تاوانبارنیە. وە لەم ئایەتەدا ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ باتەقای وەك ئەو نێچیرەیە کە کوژراوە لە ئاژەڵ، ئەمە بەڵگەیە بۆ واجب بوونی کەفارەت لەوێنەی ئەوەی ئەوکەسە کوشتوویەتی لەکاتی پۆشینی ئیحرامدا. ئەگەر وێنەی هەبوو لە ئاژەڵیماڵیدا، وەك هاوەڵەکان بە هاوشێوە بڕیاریان لەسەرداوە لە ئاژەڵدا. ئەوان بڕیاریان داوە لەباتی وشترمرغ (نعامە) وشترێك، لەباتی مانگایەکی کێوی مانگایەكو وە لەباتی ئاسکێك بزنێك بدرێت، بەڵام ئەگەر ئەو نێچیرە هاوشێوەی نەبوو ، ئیبنو عەبباس بڕیاری داوە بە نرخەکەیو هەڵدەگیرێت بۆ مەککە (واتە: لەوێ دەدرێت بە خەڵك)، بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دووکەس لە خۆتان عادل ئەو بڕیارەبدەن (کە چ ئاژەڵێك بەرامبەر نێچیرەکەیە)، واتە: بڕیاربدەن کە چی باتەقای ئەو نێچیرەیە یان نرخەکەی لەوانەی کە هاوشێوەیان نیە، وە دەبێت دوو پیاوی دادوەر لە موسڵمانان ئەو بڕیارەبدەن. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە جەریری جەبەلیەوە وتی: من لە ئیحرامدا بووم ئاسکێکم کوشت ئەوەم بۆ عومەر باسکرد، وتی: دووپیاو لە براکانت بێنە با بڕیاربدەن بەسەرتدا، عەبدوڕەحمانو سەعدم هێنا بڕیاری سابرێنێکی پڕمویاندا لەسەرم لەبارتەقایدا.[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە تاریقەوە وتی: ئەربەد کەوت بەسەر ئاسکێکدا کوشتی لەوکاتەدا لە ئیحرامدابوو، چوو بۆلای عومەر هەتا بڕیاری بەسەردا بدات، عومەر پێی وت: تۆش بڕیارم لەگەڵدا بدە، بڕیاری گیسکێکیاندا لەسەری، داروئاوی کۆکردبووەوە پاشان عومەر وتی: ﴿يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾[2]. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ﴾ ئاژەڵێك بهێنێتە ماڵی کەعبەو لەوێ بیکاتە قوربانی، مەبەست ئەوەیە لەوێدا سەرببڕێت گۆشتەکەی دابەش بکرێت بەسەر هەژارانی حەرەمدائەم کارەش بەم شێوەیە ڕای هەمووی لەسەرە ﴿أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾ یان لە کەفارەتی ئەو نێچیرە خواردن بدات بە هەژاران یان بە ئەندازەی چەندڕۆژ دانێن بەڕۆژی بێت. واتە: ئەوکەسەی لە ئیحرامدایە لەجێی ئەو نێچیرە ئاژەڵی دەست نەکەوت، یان ئەو نێچیرە کوژراوە لە وێنەی دەست نەکەوت، بە ئەندازەی ئەو نێچیرە خواردان بدات بە هەژاران یان چەند ڕۆژێك دانێن بەڕۆژی بێت. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾ لە کەفارەتی ئەو نێچیرەدا ئاژەڵێك لەوێنەی بهێنێتە ماڵی کەعبەو لەوێدا بیکاتە قوربانی یان بە ئەندازەی

[1] الطبری (١١/٢٧).
[2] الطبری (١١/٢٦).

ئەو نێچیرە خواردن بدات بە هەژاران یان بە ئەندازەی ئەو نێچیرە چەندرۆژێك دانێن بەرۆژی بێت. ئەگەر ئەوکەسەی لە ئیحرامدایە هەر نێچیرێکی کوشت بەپێی ئەو نێچیرە بڕیاردەدرێت بەسەریدا ئەگەر ئاسکێکی کوشت یان لەشێوەی ئاسکێکی کوشت دەبێت مەڕێك لە مەککە سەربڕێت، ئەگەر نەیبوو، خواردنی شەش کەس بدات، ئەگەر نەیتوانی سێ ڕۆژ بەڕۆژی بێت. ئەگەر گاکێوی کوشت یان لەشێوەی گاکێوی کوشت دەبێت گایەك سەربڕێت ئەگەر نەیتوانی دەبێت خواردنی سی هەژار بدات، ئەگەر نەیتوانی بیست ڕۆژ بەڕۆژی بێت. ئەگەر وشترمرغێکی کوشت یان کەرێکی کێوی یان لەوشێوەیە دەبێت وشترێك سەربڕێت ئەگەر نەیتوانی خواردنی سی هەژاران بدات، ئەگەر نەیتوانی سی ڕۆژ بەڕۆژی بێت. ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردووە. ئیبنو جەریر ئەمەی بۆ زیادکردووە: خواردنەکە مشت مشت بێت تێریان بکات.[1] ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ﴾ تا سزای ئەم کردەوەی خۆی بچێژێت. واتە: ئەم کەفارەتەمان لەسەردانا، تا سزای ئەو سەرپێچیەی کە کردوویەتی وەربگرێت ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾ خودا لەکاری ڕابووردوو چاودەپۆشێت. واتە: ئەوەی لە زەمانی نەفامیدا ئەوکارەی کردبێت، موسڵمانێکی چاك بێتو شوێنی شەرعی خودا تاوان نەکاتو خودا چاوپۆشی لە ڕابووردووی دەکات پاشان دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ﴾ هەرکەسێك تێ هەڵچێتەوە، خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە. واتە: ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ خودا خاوەن دەستەڵاتو تۆڵەسێنە. ئیبنو جەریر وتی: بە عەتام وت: ﴿وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ﴾ واتە چی؟ وتی: ئەوەی لە ئیسلامدا بەوکارە هەستاوە خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کەفارەت بدات، وتی: وتم ئایا لەوگەڕانەوەیدا سزای ئەو زانینەی لێ دەسێنرێت؟ وتی: نەخێر، ئەوە تاوانێکە لەنێوان خۆیو خودای گەورەدا ئەوتاوانەی کردووە، بەڵام دەبێت کەفارەتەکەی بدات.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو کۆی زانایانی پێشینە وتویانە: خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە بەو کەفارەتە[3] زانایانی پاشینەش دەڵێن: هەرکەسێك کاتێك لە ئیحرامدا نێچیرێکی کوشت کەفارەتی دەکەوێتەسەر، جیاوازی نیە لەنێوان یەکەمو دووەمو سێیەم دا. با هەرچەندێك دووبارەببێتەوە، بە هەڵە کوشتبێتی یان بە ئەنقەست وەکویەکە. ئیبنو جەریر لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ وتی: خودا خۆی دەفەرموێت دەستەڵاتی زۆر بەهێزە، هیچ زۆردارێك دەستەڵاتی نابەزێنێتو بەریشی لێ

---

[1] الطبری (١١/٣١).

[2] الطبری (١١/٤٨).

[3] الطبری (١١/٥٠).

ناگرێت لە تۆڵەسەندندا لەوکەسانەی کە بیەوێت تۆڵەی لێ بسێنێت چونکە وەدیهێنراوەکان خۆی وەدیهێناون‌و فەرمان فەرمانی ئەوەو هێزو دەسەڵات هەر هی ئەوە ﴿ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ وتی: خودا خاوەن تۆڵەی زۆرتوندە لەوکەسانەی لاساری دەکەن‌و لێی یاخی دەبن[1].

﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾﴾

**حەڵاڵکردنی ڕاوی دەریا بۆ ئەوانەی لە ئیحرامدان**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ ڕاوو خواردەمنی دریا بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە، ئێوەو ڕێبواران دەتوانن بیانکەنە بژێوی خۆتان. سەعیدی کوڕی موسەییب‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش لەم ئایەتەدا ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ﴾ وتیان: واتە ئەوەی ڕاودەکرێت لە دەریادا بەتازەیی[2]. ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾ خواردنیشی کە هەڵدەگیرێت بەسوێری‌و وشک کراوە (واتە: هەر حەڵاڵە). ئیبنو عەبباس لە ڕیوایەتێکی مەشهوردا وتی: (صیدە) ئەوەی بە زیندوویی لە دەریادا دەردەهێنرێت ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾ ئەوەش بە مردوویی لای دەدات. (واتە: هەر خواردنی حەڵاڵە)، هە ر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئەبوبەکری سەدیق‌و زەیدی کوڕی سابیت‌و عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو ئەبوئەیوبی ئەنساری‌و (ڕەزای خودایان لێبێت) عیکرەمەو ئەبوسەلەمەی کوڕی عەدوڕەحمان‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و حەسەنی بەسریەوە وتیان: ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ واتە: ئێوەو ڕێبواران دەتوانن بیانکەنە بژێوی خۆتان ﴿وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ جەمعی (سیار). عیکرەمە وتی: بۆ ئەوکەسانەی لەسەر دەریان‌و ڕێبوارن[3] کەسانی تریش جگە لەمە دەڵێن: تازەکەی بۆ ئەوکەسانەیە کە ڕاوی دەکەن لەسەردەریاکە. وە خواردنی ئەوەی کە مردووە لێیان ڕاوکراوە خوێی پێوەیەو وشک کراوە توێشوە بۆ ڕێبواران‌و ئەوانەی لە دەریاوە دوورن. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو سوددی‌و

---

[1] الطبری (١١/٥٧).

[2] الطبری (١١/٥٩).

[3] الطبری (١١/٧١).

کەسانی تریشەوە[1] ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوپایەکی نارد بەرەو کەناری دەریا، ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحیان کردە بەرپرسیان، کە سێ سەد کەس بوون من یەکێك بووم لەناویاندا، وتی: دەرچووین هەر بەڕێوەبووین خواردنمان بەرەو تەواوبوون دەچوو، ئەبوعوبیدە فەرمانی دا بە کۆکردنەوەی خواردنی ئەو سوپایەو هەمووی کۆکردەوە، خواردنەکە هەمووی خورمابوو، هەموو ڕۆژێك کەمە کەمە پێی دەداین هەتا تەواوبوو، یەکی دەنکەخورمایەکمان بەرکەوت، وتم: دەنکەخورمایەك چ پێویستیەك دووردەکات؟ وتی: کاتێك تەوابوو هەستمان بە نەمانی کرد. وتی: پاشان گەیشتینە دەریا نەهەنگێکمان دیت وەك تەپۆلکە وابوو. هەموو سوپاکە هەژدەشەو لێی خوارد، پاشان ئەبوعوبەیدە فەرمانی دا بە داچەقاندنی دوو پەراسوو لە پەراسووەکانی پاشان فەرمانی دا وشترێکیان برد بەژێریاندا تێپەڕی‌و بەریان نەکەوت.[2] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[3] مالیك ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کرد (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئێمە سواری کەشتی دەبین لە دەریاداو کەمێك ئاو لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین ئەگەر دەستنوێژی پێ بگرین تینومان دەبێت، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (دەریا ئاوی پاك کەرەوەیەو مردارەوەبووشی حەڵاڵە)[4]، ئیمامی شافیعی‌و ئەحمەدیش ئەم فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە لەگەڵ چوار خاوەن فەرموودەکانی تردا، بوخاریش بە ڕاستی داناوە، تیرمیزی‌و ئیبنو حیببان‌و کەسانی تریش هە ر بە ڕاستیان داناوە ڕیوایەت کراوە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بەوشێوەیە[5].

## قەدەغەکردنی ڕاوکردنی نێچیری وشکانی

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ﴾ ڕاوی وشکانیش هەتا لە ئیحرامدابن قەدەغەیە، واتە: لەکاتی ئیحرامدا ڕاوکردن قەدەغەیەئەگەر کەسێك لە ئیحرامدابوو بە ئەنقەست نێچیرێکی کوشت تاوانبارەو پێی دەبژێردرێت، یان بە هەڵە کوشتی پێی دەبژێردرێت‌و نابێت لێی بخوات، چونکە وەك مرارەبوو وایە بۆی، وە بۆ ئەوکەسانەش هەروایە کە لە ئیحرامدان‌و ئەوانەش

---

[1] الطبري (٧٣/٧٢/١١).

[2] الموطأ (٩٣٠/٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (١٥٢/٥)، مسلم (١٥٣٥/٣).

[4] الموطأ (٢٢/١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسند الشافعي (٢٥)، أحمد (٢٣٧/٢)، أبوداود (٨٣)، الترمذي (٦٩)، ابن ماجه (٣٨٦)ن النسائي (٥٠/١)، ابن خزيمة (١١١)، ابن حبان (١١٩).

کە ئیحرامیان نەپۆشیوە. بەڵام ئەگەر کەسێك ئیحرامی نەپۆشیوە نێچیرێکی کوشت، کردیە دیاری بۆ کەسێك کە ئیحرامی پۆشیوە . ئەگەر ئەوکەسەی ئیحرامی نەپۆشیوە نیازی وابوو بۆ ئەوکەسەی بکوژێت لە ئیحرامدایە، نابێت ئەوکەسە لێی بخوات، لەبەر فەرموودەکەی سەعبی کوڕی جەسام کە کەرەکێویەکی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ)کە لە ئەبواء یان بیوەددان بوو بۆیگێڕاوە، کاتێك کە بە نێوچاوانیەوە شتێکی دیت فەرمووی: (ئێمە بۆت ناگێڕینەوە لەبەرئەوەنەبێت کە من لەئیحرامدام)، ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[1] بە زۆر وتە هاتووە، وتیان: مەبەست ئەوەیە، پێغەمبەر (ﷺ) وایزانی ئەمە بەتایبەتی لەبەرئەو ڕاوی کردووە، بۆیە وەری نەگرت، بەڵام ئەگە ر نیازی نەبووبێت دروستەبۆی لێی بخوات بەپێی فەرموودەکەی ئەبوقەتادە کە کەرەکێویەکی ڕاوکرد لەوکاتەدا لە ئیحرامدا نەبوو قەدەغەنەکرا هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئیحرامدابوون، ڕاوەستان لە خواردنی پاشان پرسیان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا کەسێك لەناو ئێوەدا هێمای کرد بۆی یان هاوکاری کرد لە کوشتنیدا؟) وتیان: نەخێر، فەرمووی: (بیخۆن)، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) لێی خوارد، ئەو بەسەرهاتە دیسانلە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە بە زۆر وتە.[2] (ئیبنو کەسیر ئەم ئایەتانەی هێناوە (٩٦-٩٧-٩٨-٩٩) زۆرینەی ئایەتی یەکەمی تەفسیرکردووە هەتا ئێرە، بەڵام وادیارە تەفسیری ئایەتەکانی تری لەبیرچووە، هەربۆیە ئەم پیاوە دەڵێت: بەباشم زانی ئەم کەموکورتیە تەواویکەم بە هێنانی تەفسیری تەبەری بەکورتیو بە دەستکاریەوە بە یارمەتی خودای مەزن).

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ لەو خودایە ترستان هەبێت کە لەلای ئەو کۆدەکرێنەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی خەڵکینە لە خودا بترسنو خۆتان بپرێزن بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی کە دەیدات بەسەرتاندا لە فەرزەکانی، وە لەوشتانەی کە قەدەغەی کردووە لەم ئایەتانەدا کە ناردویو بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە قەدەغەکردنی مەیو قومارو سەربڕینی ئاژەڵ لەسەر بتەکانو گرەو بە تیرکردنو کوشتنی ئاژەڵی کێوی لەوکاتەی کە لە ئیحرامدان. بێگومان کەوا ڕۆژێك دەگەڕێنەوە بۆلای خودا، لەسەر ئەو تاوانەتان تۆڵەتان لێ دەسێنێت. پاداشتی چاکەو گوێڕایەلیتان دەداتەوە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿جَعَلَ اللَّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِّلنَّاسِ﴾ خودا بیت الحرامی کردووەتە هۆی پێکهێنانی کاری خەڵك. ئەوانەی کە ناتوانن کارەکانی خۆیان بەجێ بێننو خاوەن دەستەڵاتێك بێت ڕێ لە ستەمکاران بگرێت کە دەستدرێژی نەکەنەسەر لاوازو بێ دەستەڵاتەکانو خراپەکان لە چاکەکانو ستەمکار لە ستەملێکراو جیابکاتەوە ﴿وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ وَالْهَدْيَ

---

[1] فتح الباری (١٨٢٥/٢٠٣٧)، مسلم (٨٥٠/٢).

[2] فتح الباری (٥٢٨/٩)، مسلم (٨٥٢/٢).

وَٱلْقَلَٰٓئِدَ﴾ هەروەها مانگە حەرامەکان و قوربانیە دیاری نەکراوەکان و قوربانیە دیاریکراوەکانی کردووەتە هۆی پێکهێنانی کاری خەڵکی، تاوەکو بەم شێوەیە بەهرە لەیەکتری وەربگرن. ئەگەر شتێکی تریان دەست نەکەوت، وە کردوویەتی بە نیشانەیەك بۆ ئاینەکەیان و بەڕێکردنی کارەکانیان وە خودای گەورە ماڵی کەعبە و مانگە حەرامەکان و قوربانیە دیاری نەکراوەکان و قوربانیە دیاریکراوەکانی کردووەتە هۆی ڕاوەستانی کاروباری دین و دونیای ئەوکەسانەی کە ڕێز لەم شعائیرانە دەگرن لە عەرەبەکان. باش بزانن کەعبەی پیرۆز هەمووی حەرەمە. خودا ناوی هێناوە بە (حرام) لەبەر قەدەغەکردنی ڕاوی نێچیرو بڕینی داروردەخت و شتی تر وەك چۆن کەعبە و مانگە حەرامەکان و قوربانیە دیاری نەکراوەکان و قوربانیە دیاریکراوەکانی کردووەتەمایەی مانەوە و جێبەجێکردنی کاری عەرەبەکان لەکاتی نەفامیدا، وە ئێستاش لە ئیسلامدا بووە بە هێماو شوێنی حەج و قوربانی و قیبلە بۆ نوێژکەران ﴿ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ ئەمە بۆ ئەوەیە تا بزانن هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەمیندان، خودا دەیزانێت و ئاگاداری خودا هەموو شتێکە. هیچی لێ ون نابێت و ئاگادی لە هەموو کاروبارو کردارێکتانە و هەژماری کردووە بۆتان هەتا چاکەکارتان پاداشت بداتەوە لەسەر چاکەکانی و خراپەکانیشتان سزابدات لەسەر کارە خراپەکانی ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ دەبێت ئەوەش بزانن کە خودا لە سزاداندا توندوتیژە و هەر خوداشە کە لە گوناهتان دەبورێت دلۆڤانە. واتە: بزانن کە پەروەردگارتان هەرچی لە ئاسمان و زەمیندایە دەیزانێت و هیچی لێ ون نابێت لە کارەنهێنی و ئاشکراکانتان و تۆڵەی زۆر توندوتیژە بۆ ئەوکەسانەی لاسارن و لێی یاخین. وە زۆر لێبوردەشە لە گوناهی ئەوکەسانەی کە پەشیمان دەبنەوە و تەوبەدەکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبن، وە دلۆڤانە بەرامبەر ئەو گوناهانەی کە لە پێشدا کردوویانە دوای پەشیمان بوونەوە و تەوبەکردنیان لەوتاوانە ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ﴾ ئەوەی لەسەر پێغەمبەرە تەنیا ڕاگەیاندنی فەرمانی خودایە، خودا بۆخۆی لەوشتانەی کە ئێوە ئاشکرای دەکەن، لەوشتانەش کە دەیشارنەوە ئاگادارە. ئەمە خۆی هەڕەشەیەکی توندە لەلایەن خوداوە لە عەبدەکانی کە دەفەرموێت ڕاگەیاندن نەبێت هیچ شتێك لەسەر پێغەمبەرەکەمان نیە کە ناردوومانە بۆتان، واتە: ئیشی ئەو گەیاندنی ئەوپەیامەیە، پاشان پاداشتی چاکە و تۆڵەسەندن لەسەرتاوان لەسەر ئێمەیە. ئەوەی گوێڕایەڵە و پەیامەکەی ئێمە وەردەگرێت و ئەوەش کە پشتگوێی دەخات و وەری ناگرێت لای ئێمە شاراوەنیە، بۆیە هەرکەسێك کاری چاك بکات بە ئاشکراو بە زمانیش دانی پێدابنێت لە ئێوە ئێمە پێی دەزانین وە هەرچیش بشارنەوە لە دڵتاندا لە بێ دینی و دینداری و لە بڕوای تەواو یان گومان و دووڕوویی، خودا هیچی لێ پەنهان نابێت هەرچی لە ئاسمانەکان و لە

زەمیندایە هەر هی ئەوە، پاداشت و تۆڵەسەندن بەدەست خۆیەتی. هەر ئەو شایەنی ئەوەیە کە گوێڕایەی بکرێت و سەرپێچی لە فەرمانەکانی نەکرێت و گشت کەسێك لێی بترسێت.

﴿قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ ۚ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ ﴿١٠٢﴾﴾

خودای مەزن دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿قُل﴾ ئەی موحەممەد بڵێ: ﴿لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ﴾ پاك و پیس وەکویەك نین با زۆری پیسیەکەش بۆت سەرسوڕهێنەربێت. واتە: ئەی مەردوم کەمی حەڵاڵی بەسود زۆرچاکترە لەوەی حەرامێکی زیانبەخش. وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: ئەوەی کەمەو پێویستی دەردەکات چاکترە لەوەی کە زۆرەو سەرقاڵت دەکات[١]، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ کەواتە ئەی دڵ وشیاران هەر لە خودا بترسن بەڵکو ڕزگاربن. واتە: ئەی خاوەن بیروهۆشە ڕاست و ڕێکەکان، دووربکەونەوە لە حەرام و وازی لێ بێنن ڕازی ببن بە حەڵاڵ بەستانە، هەتا لە دونیاو قیامەتدا ڕزگاربن.

### زەمی پرسیارکردن بەبێ سود

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان لەوشتانە پرسیارمەکەن کە بۆتان ڕوون بکەنەوە پێی تووشی دلگرانی دەبن. ئەمە خۆی دەردانێکە لەلایەن خوداوە بۆ عەبدە خاوەن باوەڕەکانی، کە ڕێیا پێنادات پرسیار لەوشتانە بکەنکە لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای ئەو پرسیارانەدا هیچ سودێکی نیە. لەوانیە کاتێك ئەوشتانەیان بۆ دەرکەوت پێیان ناخۆش بێت و حەزنەکەن گوێیان لێبێت. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتارێکیدا هەرگیز گوێم لە وتاری وا نەبووە، فەرمووی تێیدا: ئەگەر ئەوەی من دەیزانن دەیزانم کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، وتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕووی خۆیان داپۆشی کەوتنەن بیرو تاسەکردنەوە، پاوێك وتی: باوکی من کێیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فلانەکەسە) ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە کە دەفەرمووێت

[١] أحمد (١٩٧/٥) سەنەدەکانی لاوازە.

﴿لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ﴾[1] لەباسێکی تردا بوخاری ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە. موسلیم و ئەحمەدو تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ وتی: کەسێك بۆیگێڕاینەوە کەمالیکی کوڕی ئەنەس بۆیگێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) پرسیریان لێ کرد، هەتا ئەوەندە پرسیاریان لێ کرد، ڕۆژێك هاتەلایان و کەوتەسەر مینبەرو فەرمووی: ئەڕۆ پرسیارم لە هیچ شتێك لێ ناکەن مەگین بۆتان ڕوون دەکەمەوە، هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ترسان لەوەی کارێکی هەبێت کە هاتووە، منیش کە لام نەدەکردەوە بەلای ڕاستو بەلای چەپدا مەگین دەمبینی هەمووی بەکراسەکەی سەری داپۆشیبوو دەگریان پیاوێك هەستا کە هەر پێی دادگرت بە ناوێك جگە لەناوی باوی خۆی بانگ دەکرا، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باوکم کێیە؟ فەرمووی: (باوکی تۆ حوزافەیە) وتی: پاشان عومەر هەستای وتی: ڕازین خودا پەروەردگارمانەو بە ئیسلام ئاینمانەو موحەممد پێغەمبەرەو پەنادەگرم بە خودا لە شەڕی فیتنەکان. وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (هەرگیز وەك ئەم ڕۆژەم نەدیوە لە خێرو لە شەڕدا، وێنەی بەهەشتو جەهەننەممو بۆ کرا هەتا هەردووکیانم بینی لەدوای ئەو دیوارەوە)[3]، بوخاریو موسلیم ڕیواتیان کردووە لە ڕێگەی سەعیدەوە.[4] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: کۆمەڵێك لە خەڵکی هەبوون بۆ گاڵتەپێکردن پرسیریان لە پێغەمبەری خودا دەکرد، پیاوێك دەیوت: باوکم کێیە؟ پیاوێك وشترەکەی گوم بووبوو دەیوت: وشترەکەم لە کوێیە؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی لەسەریان ناردەخوارەوە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە[5]. تەنیا بوخاری خۆی ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەلی یەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾[6] خودا حەجی ماڵی کەعبەی داناوە لەسەر خەڵکی بۆ هەرکەسێك کە توانای ڕۆیشتنی هەبێت بڕوات بۆی. وتیان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا لە هەموو ساڵێکدا؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێ دەنگ

---

[1] فتح الباری (١٣٠/٨).

[2] فتح الباری (٣٢٦/١١)، مسلم (١٨٣٢/٤)، أحمد (١٨٠/٣)، تحفة الاحوذي (٤٢١/٨)، تحفة الاشراف (٤١٣/١).

[3] الطبری (١٠٠/١١).

[4] فتح الباری (٤٧/١٣)، مسلم (١٨٣٤/٤).

[5] فتح الباری (١٣٠/٨).

[6] ال عمران (٩٧).

بوو، وتی: پاشان وتیان: ئایا لە هەموو ساڵێکدا؟ دیسان بێ دەنگ بوو، وتـی: پاشـان وتیـان: ئایا لـە هـەموو سـاڵێکدا؟ فـەرمووی: نـەخێر، ئەگـەر بموتایـە بـەڵێ واجـب دەبـوو، ئەگـەر واجبـیش بووایـە نەتاندەتوانی. خودای گەورە ئەم ئایەتـەی ناردەخوارەوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾ ئیبنـو ماجـەو تیرمیـزی هـەر بـەم شێوەیە ڕیوایـەتیان کـردووە.[1] لـە ئایەتەکـەوە دەردەکەوێت پرسیارکردن لـە ئەوشتانەی کاتێك ئەوکەسـە پرسیارەکەی زانـی پێـی نـاخۆش بـوو، باشتروایە ئەو پرسیارە نەکاتو وازی لێ بێنێت. پاشان خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ ﴾ ئەگەر پرسیارەکەتان هـەڵگرن بـۆ ئەوکاتـەی کـە قورئـان دێتـەخوارەوەو وەڵامەکەتان دەدرێتەوە. واتە: ئەگەر پرسیر لەم شتانە بکەن کە ڕەوانەکراوە بۆتان، کاتێك کە قورئان هاتەخوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆتان ڕوون دەکاتەوە، ئـەوە لای خـودا زۆر ئاسانە. پاشـان دەفەرموێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا﴾ خـودا لەوپرسیارە نابەجێیانـەی ئێـوە چاپۆشـی کـردووە کـە لەپێـشدا کردووتانـە ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ خـودا لـە گوناه دەبورێـتو لەسـەرخۆیە. مەبەسـت لێرەدا ئەوەیـە: پرسیار لەوشتانە مەکەن کە لە پێشدا کردووتانە خـودا چاوپۆشـی لـێ کـردوون. لەوانەیـە بـەهۆی ئـەو پرسیارکردنەوە ئەوشتەیان لەسـەر تونـدو گـران بکرێـت. لـە فـەرموودەی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـاتووە: (گەورەترین تاوانی موسڵمان ئەوەیە کە پرسیار لە شتێك بکات حەرام نەبێت لـە پرسیاکردنەکەی ئـەو حـەرام بکرێـت)[2]، وە لـە فەرموودەیـەکی تـری سـەحیحدا هـاتووە لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: (لێم گەڕێن لەوەی وازم لێهێناوە بۆتان چونکە ئەوانـەی پـێش ئێـوە لەبـەر پرسـیرکردنی زۆریانو ناکۆکیان لەسەر پێغەمبەرەکانیان لەتاوچوون)[3] وە لە فەرموودەیەکی تری سەحیحدا هاتووە: (بێگومان خودای مەزن فـەرزەکانی دانـاوە لەدەسـتی خۆتـان دەری مەکـەن، چـەند سنورێکی دانـاوە مەیبەزێنن، چەند ئایەتێکی قەدەغەکردووە سنورەکانی مەشکێنن، لە چەند شتێکیش بێ دەنـگ بـووە لـەبیری نەچـووە بـەزەیی پێتـان هاتووەتـەوە لەبارەیـەوە پرسـیارمەکەن)[4] پاشـان خـودای مـەزن دەفەرموێت: ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴾ کەسانێك لـەپێش ئێوەدا ئـەم جۆرە پرسیارانەیان کردو هەر لەبەر ئەو پرسیارانە، لەڕێگەی خودا لایاندا. واتە: چەند کەسێك لـەپێش

---

[1] أحمد (١/١١٣)، الترمذی (٣٠٥٥)، ابن ماجه (٢٨٨٤) بەمشێوە سەنەدەکانی غەریبە.

[2] البخاری (٧٢٨٩)، مسلم (٢٣٥٨).

[3] مسلم (٤/١٨٣١).

[4] البیهقي (١٠/١٢)، الدار قطن (٤/٢٩٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئێوەدا ئەم پرسیارە نارەوانەیان کردو وەڵامیان درایەوە، کەچی بڕوایان پێ نەکردو سودیان لێ وەرنەگرت، چونکە ئەوانە ئەو پرسیارانەیان بۆ شارەزابوون نەبوو بەڵکو بەشێوەی گاڵتەو لاساریو بێ دینی دەیانکرد.

﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ (١٠٣) وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ (١٠٤)﴾

## تەفسیری ئەو ئاژەڵانەی ناویان هاتووە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ﴾ خودا سەبارەت بە (بەحیرە) و (سائیبە) و (وەصیلە) و (حام) هیچ بڕیارێکی نەداوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە وتی: (بەحیرە) ئەو وشترەبوو کە شیرەکەی قەدەغەکرا بۆ ستەمکاران، هیچ کەسێك شیرەکەی نەدەدۆشی. (سائیبە) ئەو وشترەبوو کە دەیانهێشتەوە بۆ خوداکانیان هیچ شتێکی لێ بارنەدەکرا. ئەبوهورەیرە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی:(عەمری کوڕی عامیر خوزاعیم دیت لەناو ئاگردا ڕیخۆڵەی خۆی ڕادەکێشا یەکەم کەس بوو (سائیبەی) داهێنا). (وەصیلە) وشترێك بوو یەکەمو دووەم سکی مێینەبووایە، دەیانهێشتەوە بۆ کاربەدەستە ستەمکارەکانیان ئەگەر یەکەم سكو دووەم سکی بەدوای یەکدا مێینەبووایەو نێرینە لەنێوانیان نەهاتایە. (الحام) وشترێك بوو لە پشتی ئەو ژمارە دیاریکراوە (دە سك) پەیدابووایە، کە سکەکانی تەواودەکرد وازیان لێ دەهێنا بۆ خاوەن دەستەڵاتە ستەمکارەکانو دەیانبەخشی لە بارلێنانو هیچ شتێکیان لێ بارنەدەکرد ناویان لێنابوو حامی (الحامي)[1] موسلیمو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (یەکەم کەسێك کە (سائیبە) ی هێشتەوەو بتەکانی پەرست ئەبوخوزاعە عەمری کوڕی عامیر بوو، وە من بینیم لەناو ئاگردا ڕیخۆڵەی خۆی ڕادەکێشا)[3]، تەنیا ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە بەم شێوەیە. ئەم عەمرە کوڕی لوحەی کوڕی قەمەعەیە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی خوزاعەکە پشتیان لە کەعبەی پیرۆز کرد دوای جورهم وە یەکەم کەسێك بوو کە ئاینی ئیبراهیمی خەلیلی گۆڕیو بتی هێنا بۆ حیجاز، بانگی بت پەرستانی کرد کە ئەوبتانە بپەرستنو خۆیانی پێ نزیك بخەنەوەو ئەمە بەرنامەی چەرخی نەفامیەی بۆ

---

[1] فتح الباري (١٣٣/٨).

[2] مسلم (٢١٩٢/٤)، النسائي في الكبرى (٣٣٨/٦).

[3] أحمد (٤٤٦/١) سەنەدکانی لاوازە بەڵام فەرموودەی تر پشتگیری لێ دەکات.

دامەزراندن لەو ئاژەڵانەداو لە شتی تریشدا. وەك خودای گەورە لە سورەتی (الانعام) دا باسی كردووە لەم ئایەتەدا ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا﴾[1] لە (بەروبوومی ئەو كێڵگەو ئاژەڵانەی كە خودا بەدیهێناوە بەشێكیان بۆ خودا دانا. هەتا كۆتایی ئایەتەكان لەوبارەیەوە. لەبارەی بەحیرەوە، عەلی كوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێبێت): ئەو وشترەبوو كە پێنج سكی بكردایە، چاوەڕوانیان دەكرد ئەگەر نێریووایە سەریان دەبڕی، پیاوان لێیا دەخوارد بەڵام ژنان لێیان نەدەخوارد، خۆئەگەر مێینەبووایە گوێیەكانیان دەبڕی‌و دەیانوت: ئەمە بەحیرەیە[2] سوددی‌و كەسانی تریش هەر وایان وتوە.[3] لەبارەی سائیبەوە موجاهید وتی: ئەوە لە مە ڕدایە، وەك ئەوەی باسكراوە لە بەحیرەدا تەنیا جیاوازیەكەی ئەوەیە كە ئەو مەڕە دەبووایە شەش سكی بكردایە، ئەگەر حەوتەمی نێربووایە یان دوونێربووایە سەریان دەبڕی، پیاوەكانیان لێیا دەخوارد بەڵام ژنانەكانیان لێیان نەدەخوارد.[4] موحەممەدی كوڕی ئیسحاق وتی: سائیبە ئەو وشترەبوو كە مێینەی بووە نێرینەی لەنێواندا نەبووە هێشتوویانەتەوە، (سُبیت) كەس سواری نەبووەو تووكی لێنەكراوەتەوەو شیرەكەشی نەدۆشراوە مەگین بۆ میوان. ئەبو ڕەوق وتی: ئەگەر پیاوێك دەربچووایەو پێویستیەكەی تەواوبووایە (مەرامەكەی بەجێ بهاتایە) لە ماڵەكەی وشترێكی دەهێشتەوە یان هە رشتێكی تری دادەنا بۆ خاوەن دەستەڵاتەكان، سوددی وتی: ئەگەر پیاوێك لەوانە مەرامەكەی بەجێ بهاتایە یان لە نەخۆشیەك چاك بووایەتەوە یان ماڵەكەی زۆربووایە هەندێك لە ماڵەكەی دەهێشتەوە بۆ بتەكان. هەركەسێك دەستی بۆ ببردایە بە سزایەك سزایان دەدا لە دونیادا. لەبارەی وەصیلەوە عەلی كوڕی ئەوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە: بریتی بوو لەو مەڕەی كە حەوت سكی بكردایە، لە حەوتەمدا چاوەڕوانیان دەكرد ئەگەر نێرەبووایە یان مێیەكە بمردایە هەر پیاو هاوبەش دەبوو ژن هاوبەش نەبوو تێیدا. ئەگەر مێینەبووایە دەیانهێشتەوە، خۆئەگەر نێرو مێیەك بە یەك سك بووایە هەردووكیان دەهێشتەوەو دەیانوت: خوشكەكەی گەیاندویەتی حەرامی كردووە لێمان، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە.[5] عەبدوڕەزاق وتی: موعومەر هەواڵی پێداین لە زوهریە لە سەعیدی كوڕی موسەیبەوە (ولا وصيلة) وتی: وەصیلە لە وشتردا ئەوەبوو كە یەكەم سك‌و دووەم سكی مێینەبووایە نێرینە لەنێوانیان

[1] الانعام (١٣٦).
[2] الطبری (١١/١٢٩).
[3] الطبری (١١/١٣٠).
[4] الطبری (١١/١٢٨).
[5] ابن أبي حاتم (٤/١٢٢٢).

ئەماتایە گوێیان دەبڕیو دایان دەنا بۆ بتەکانیان[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەسەوە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: وەصیلە لە مەڕدا ئەگەر دە بەچکەی مێینەی ببووایە بە پێنج سك، دووبەچکە دووبەچکە لە یەك سکدا پێیان دەوت وەصیلەو وازی لێ دەهێنرا، دوای ئەوە هەرچی تری ببووایە نێرینە یان مێینە دەدرا بە پیاوان ژنان لێی بێبەش دەبوون، ئەگەر بمردایە پیاوو ژن هاوبەش بوون تێید. بەڵام حامی، عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەگەر پیاوێك وشترەنێرەکەی دە بەچکە لە پشتی ببووایە دەوترا: (حامە) وازی لێ بێنن[2] ئەبورەوق و قەتادەش هەر وایان وتوە. عەلی کوڕی ئەوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە: وشترێکی نێرینە ئەگەر بەچکەکەی بەچکەیەکی ببووایە دەیانوت: ئەمە پشتی پاراستووە، هیچ شتێکیان لێ بارنەدەکردو تووکیشیان لێ نەدەکردەوە، پاوەنیشیان لێ قەدەغەنەدەکرد تێیدا بلەوەڕێت لە هەموو حەوزێك ئاوی دەخواردەوە، با ئەو حەوزەش هی خاوەنەکەی نەبووایە[3] لەم فەرموودەیەدا ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لەڕێگەی ئەبوئیسحاق سەبیعیەوە لە ئەبو ئەحوەصی جوشمیەوە لە باوکیەوە لە مالیکی کوڕی نەزلەوە وتی: هاتمەلای پێغەمبەر (ﷺ) بە جلوبەرگێکی ڕزیوو شڕەوە، فەرمووی پێم: (ئایا سامانت هەیە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (لە چ جۆرە سامانێك) وتی: وتم لە هەموو جۆرە سامانێك، لە وشترو مەڕو وڵاخی سواریو کۆیلە. فەرمووی: (کاتێك خودا سامانی پێدایت با پێتەوە دیاربێت) پاشان فەرمووی: (وشترەکەت بەچکە دەکات گوێیان تەواون؟) وتی: وتم بەڵێ، ئایا وشتر هەر بەوشێوەیە نابێت؟ فەرمووی: (لەوانەیە تۆ موس هەڵبگریتو گوێی هەندێکیان ببڕیو بڵێت: ئەمە بەحیرەیە، وە گوێی هەندێکی تریان لەت بکەیتو بڵێت ئەمە قەدەغەکراوە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (شتی وامەکە، بیگومان هەر سامانێك خودا پێی داوی بۆ تۆ حەڵاڵە)، پاشان فەرمووی: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ﴾ بەحیرە، ئەو ئاژەڵەیە کە گوێی دەبڕێت، ئەوپیاوە نە ژنەکەیو نەکچەکانیو نە خانەوادەی سود لە خوریو تووكو شیرو مووەکەی وەناگرێت. خۆئەگەر مردارەوەبووایە هەموو هاوبەشن تێیدا[4] بەڵام سائیبە، ئەو وشترانەبوو کە دەیانهێڵایەوە بۆ خوداکانیان دەچوون بۆلایانو بۆیان دادەنان. وەصیلەش ئەو مەڕەبەە کە شەش سکی دەکردو ئەگەر سکی حەوتەمی بکردایە گوێی دەبڕاو شاخیان دەبڕیەوەو پێیان دەوت: گەیشتووە (وصلت) سەریان

---

[1] عبدالرزاق (١٩٦/١).

[2] الطبری (١٢٩/١١).

[3] ابن أبي حاتم (١٢٢٥/٤).

[4] ابن أبي حاتم (١٢٢٠/٤) سەنەدەکانی بەهێزە.

نەدەبڕی، لێی نەدەدراو بچووایەتەسەر هەر حەوزێك ڕێگری لێنەكراوە. هەر بەمشێوەیە تەفسیری ئەمانە كراوە لەم فەرموودەیەدا، ئیمامی ئەحمەدیش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت كردووە لە سوفیانی كوڕی عویەینەوە لە ئەبوزەعراوە عەمری كوڕی عەمرەوە لە مامیەوە (عمە) ئەبونەحوەسی كوڕی مالیكی كوڕی نەزلەوە لە باوكیەوە بەم شێوەیە. بەلاّم ئەم تەفسیرەی تێدانیە والله أعلم[1]، پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بەلاّم خودانەناسەكان (كە زۆربەیان بێ ئاوەزن) درۆ بۆ خودا هەڵدەبەستن. واتە: خودا ئەم شتانەی دانەناوە، نزیك بوونەوەشی نیە لەلای، بەلاّم موشریكەكان خۆیان ئەو درۆیەیان هەڵبەستووە، كردوویانە بە بەرنامەی خۆیانو ئەو ئاژەڵانەیان بەوجۆرە لێكردووە بە خەیاڵی خۆیان پێی نزیك دەبنەوە، ئەوكارەیان مەرامی نەهێنانەدی، بەڵكو بووەهۆی بەدبەختیو چارەڕەشییان ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُوا۟ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ ئەگەر پێیان بوترێت كە: وەرن بەرەولای ئەوەی خودا نادوویەتەخوارو بێن بەرەولای پێغەمبەر، دەڵێن: ئێمە هەر ئەو ئاینەمان بەسە كە بابو باپیرەكانمان لەسەری بوون. واتە: ئەگەر بانگ بكرانایە بۆلای ئاینی خوداو بەرنامەكەیو ئەوەی لەسەری داینناونو واز لەوشتانەش بێنن كە حەرمی كردوو، دەیانوت: تەنیا ڕێگەی بابو باپیرانمان بەسە شوێنی بكەوین. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ كە بابو باپیرانیشیان هیچ شتێكیان نەدەزانیو ڕێگەی ڕاستیان بەدی نەكرد. واتە: لە هەق تێنەدەگەیشتنو نەشیان دەزانیو ڕێگەی ڕاستیان نەدەدۆزیوە، كەوایە چۆن شوێنیان دەكەون، كەسێك لەوانە نەفام گومڕاترنەبێت شوێنییان ناكەوێت.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾﴾

### فەرماندان بە چاكسازی لە خۆدا هەتا گومڕایان زیان نەگەیەنن

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان هۆشتان بەخۆتانەوەبێت ئەگەر ئێوە بەڕاستی لەگەڵ خودابنو شارەزابن، لەڕێ لادەر زیانتان پێ ناگەیەنن، هەموولایەكیشتان دێنەوەبەر قاپی خودا، ئەوسا ئاگادارتان دەكات كە ئاكارتان چۆن بووە. خودای گەورە فەرمان دەكات

[1] أحمد (١٣٦/٤) تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەكی حەسەنی سەحیحە.

بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە چاکسازی لە خۆیاندا بکەن، هەوڵی چاکەبدەن بەپێی دەستەلاتو توای خۆیان، ئاگاداریان دەکات کە هە رکەسێك کاروباری خۆی ڕێك بخات خراپەی خراپەکاران لە خەڵی زیانی پیّ ناگەیەنێت. با ئەوکەسە خراپە دووربێت یان نزیك بێت لێی، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە قەیسەوە وتی: ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خودای لێبێت) هەستاو سوپاسو ستایشی خودای گەورەی کرد، پاشان وتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾ بەلام ئێوە دایدەنێن لە شوێنێکدا کە جێی خۆی نیە، واتە: وەکو خۆی چۆنە وەها ماناکەی ناکەن (من بیستم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەیفەرموو: (بێگومان کاتێك کە خەڵکی خراپەیان بینیو نەیاندەگۆڕی زۆر نزیکە خودای مەزن سزایان بەسەردا داباڕێنێت)) وتی: گوێم لیّ بوو ئەبوبەکر دەیوت: ئەی خەڵکینە نەکەن درۆبکەن، بێگومان درۆکردن دوورە لە باوەڕەوە[1].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنۡ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسۡتَحَقَّآ إِثۡمٗا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجۡهِهَآ أَوۡ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيۡمَٰنُۢ بَعۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾

**شایەتیدانی دووکەسی جێی بڕوا لەکاتی وەسیەت کردندا**

ئەم ئایەتە پیرۆزە بڕیارێکی بەڕیزو زۆر بەدەگمەنی تێدایە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، کاتێك یەکێك لە ئێوە تووشی مەرگ دێتو دەیەوێت وەسیەت بکات، با لە خۆتان دووکەس (جێگەی بڕوابن) بێنو لێی ئاگاداربن ﴿مِّنكُمۡ﴾ واتە: لە موسڵمانان. ﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾ یان دووکەسی تر لە وەسیەت ئاگاداربکەن. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە

[1] أحمد (١/٥) تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

وتی: ﴿أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ واتە: جگە لە موسڵمانان. واتە: ئەهلی متێب.[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ ئەگەر لە سەفەردابوون و تووشی بەڵای مەرگ هاتن. ئەم دوو مەرجەش کە دروستە ئەهلی کتێب شایەتی تێدا بدەن و لەکاتێکدادەبێت کە موسڵمانان دەست نەکەوێت. ئەم شایەتیەش دەبێت هەر لە سەفەردابێت و لە وەسێتیشدابێت وەك شورەیمی قازی ئاماژەی پێکردووە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە شورەیمەوە وتی: شایەتی گاوڕو جوولەکە دروست نیە جگە لە سەفەر، لەکاتی سەفەریشدا دروست نیە لەکاتی وەسێتدانەبێت.[2]

﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ﴾ هەتا دوای نوێژ ڕایانگرن. عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: واتە نوێژی عەسر[3] سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو عیکرەمەو ئیبنو سیرین هەر وایان وتوە. زوهری وتی: واتە نوێژی موسڵمانان[4] مەبەست ئەوەیە ئەم دوو ئایەتە دوای نوێژی عەسر دەهێنرێن کاتێك کە خەڵکی کۆدەبێتەوەبە ئامادەبوونی ئەو خەڵکە ﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ﴾ ئەگەر لەو دووشایەتە بەگومان بوون، ئەوسا دەبێت سوێند بخۆن بە خودا. واتە: ئەگەر بەگومان بوون کە خیانەتیان کردووەو درۆدەکەن ﴿لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا﴾ ئێمە دینمان بە ماڵی دونیا نافرۆشین. موقاتیلی کوڕی حەییان وتی: ﴿ثَمَنًا﴾ واتە: باوەڕەکەمان بە نرخێکی کەمی دونیای دواکوتاو لەناوچوو نافرۆشین. ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ با ئەوکەسەی بە سوێندەکەی ئێمە شتێکی دەست دەکەوێت خزمیشمان بێت، خۆمان تووشی گوناه ناکەین. ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ﴾ وە شایەتی خوداش ناشارینەوە. شایەتیەکە بروانەلای خودا لەبەر ڕێزگرتن لێی بە مەزن گرتنی کارەکە ﴿إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ﴾ (ئەگەر وامان نەکرد) بێگومان ئێمە پێی تاوانباردەبین. واتە: ئەگەر هەرشتێکی وامان کردو گۆڕیمان یان بەتەواوی شاردمانەوە بێگومان تووشی گوناه دەبین. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا﴾ ئەگەر دەرکەوت دووشایەتەکەی پێش خۆیان تاوانبارکردووە. واتە: ئەگەر دەرکەوت و زانراو ئاشکرابوو دوای لێکۆڵینەوەئەو دووشایەتە کە وەسیەتەکەیان لەلاکراوە خیانەت و درۆیان کردووە لەوماڵەی کە وەسیەتکەرەکە وەسیەتی بۆ کردوون ﴿فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ﴾

---

[1] ابن أبي حاتم (١٢/١٢٢٩).

[2] الطبري (١١/١٦٣/١٦٤).

[3] الطبري (١١/١٧٢).

[4] الطبري (١١/١٧٤).

(ئەوسا دووشایەتی تر) کە لەودووانە نزیکتر لە مردووکەبن. واتە: کاتێك ئەوە بەلێکۆڵینەوە دەرکەوت بە هەواڵی ڕاست کە خیانەتیان کردووە، با دووکەسیر تر لە کەس‌وکاری ئەو مردووە کە میراتەکەیان بۆدەبێت لە میراتگرەکانی تۆ نزیکتربن لە مردووەکەوە ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَـٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَـٰدَتِهِمَا﴾ بێنە پێش سوێند بخۆن کە: بەخودا ئەم شایەتیە ئێمە دەیدەین لە شایەتی ئەم دووانەی پێشوو ڕاسترە. واتە: ئەو قسەیەی ئێمە ڕاسترو تەواوترە کە دەڵێین: ئەوانە خیانەتیان کردووە لە شایەتیەکەی ئەوان لەپێشەوە دایان ﴿وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ﴾ ئەگەر لە ڕاستی لابدەین کە وتومانە ئەوانە خیانەتکارن ﴿إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ ئێمە لە ناهەقیکارانین. واتە: ئەگەر درۆمان بۆ هەڵبەستن، ئەم سوێند خواردنە بۆ میراتگرەکانەو قسەی هەر قسەی ئەوانە لەو حاڵەتەدا، وەك چۆن کەس‌وکاری کوژراو کاتێك کە بکوژەکەی نیشانەیەکی پێوەدەرکەوت، خاوەن هەقەکان سوێند دەدرێن لەسەر پیاوکوژەکە، ئەویش هەرچی لایە دەبێت بیگێڕێتەوە بۆیان. وە لە بەشی (بابی) قەسامەدا بڕیاری لەسەر دراوە لە شەرعدا. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَـٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ﴾ بەم شێوەیە بۆ باش دەرکەوتنی ڕاستی نزیکترە. واتە: شەرعیەتی ئەم بڕیارە بەم شێوەیە جێی خۆیەتی کە سوێندانی ئەم دووشایەتە نەسرانیەیە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَـٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ کە دەترسن بە سوێندی ئەوانی دیکە، ئەو سوێندەی کە خواردوویانە بەسەریاندا بدرێتەوەو لێیان هەڵوەشێنێتەوە. ئەوەی پاڵی پێوەنان کە ئەم شایەتیە بەم شێوەیە بدەن، ڕێزگرتنی ئەو سوێنەبوو بە خوداو چاودێری خودا بەسەریانەوەو ترسیان لەوەی کە ئابڕویان نەمێنێت لەناو خەڵکدا ئەگەر سوێندەکە بگەڕێتەوە بۆ کەس‌وکاری مردووەکەو سوێند بخۆن‌و ئەوانیش سوێند بدرێن لەسەرئەوەی کە دەیڵێن. لەبەرئەمەیە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَـٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ دەبێت لە خودا ترستان هەبێت‌و چی دەبیستن بیگرنە گوێ، خودا کۆمەڵی لەڕێکە دەرچووان هەرگیز شارەزای ڕاستەڕێ ناکات. واتە: لە هەموو کاروبارێکتاندا لە خودا بترسن‌و گوێڕایەڵ بن خودا ئەوانەی لە فەرمانی دەردەچن‌و شوێنی شەریعەتەکەی ناکەون شارەزای ڕاستەڕێی ناکات.

﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾﴾

**پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێبێت) لەبارەی گەلەکانیانەوە پرسیاریان لێ دەکرێت**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ ڕۆژێك خودا هەموو پێغەمبەرەکانی خۆی کۆدەکاتەوەو دەفەرمووێت: بڵێن:چۆن بە دەنگتانەوە هاتن؟ (پێغەمبەرانیش) دەڵێن: ئێمە هیچ ئاگادریمان نیە، هەر تۆ لە هەموو نەدیاران ئاگاداری. ئەمە پرسیارێکە کە خودای گەورە لە پێغەمبەرانی دەکات (سەلامی خودایان لێبێت) لە ڕۆژی قیامەتدا لەبارەی گەلەکانیانەوە کە چۆن هاتن بەدەنگ پێغەمبەرەکانیانەوە کە بۆیان ڕەوانەکرا. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾[1] بێگومان ئێمە پرسیاردەکەین لەوانەی پێغەمبەرمان بۆ ناردوون وە لەوانەش کە بە پێغەمبەری ڕەوانەمان کردوون. وە دەفەرمووێت: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾[2] سوێند بە پەروەردگارت، لە هەمووان دەپرسینەوە، لەسەر ئەوکارانەی کە دەیانکرد. وەلامی پێغەمبەران ئەمەیە ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾ ئێمە هیچ نازانین. موجاهیدو حەسەنی بەسریو سوددی وتیان: لەترسو گرانی ئەوڕۆژە وایان وتووە[3] عەبدوڕەزاق وتی: سەوریو ئەعمەشو موجاهید وتیان: خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡ﴾ پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێبێت) دەترسنو دەڵێن: ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾[4] ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتیان کردووە.[5] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ دەڵێن بە خودای مەزن: ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە جگە لەو زانیاریەی کە تۆ لە ئێمە چاکتر لێی ئاگاداری[6] ئیبنو جەریر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووەو دەڵێت ئەو وەلامەیان لە شەرمو ئەدەبەوەیە لەگەڵ خودای گەورەدا، واتە: بەرامبەر بە ئاگاداری تۆ کە هەموو شتێکی داگرتووە ئێمە هیچ شتێك نازانین. هەرچەندە ئێمە وەلامان درایەوەو ئاگاداریشین کێ بە دەنگمانەوە هاتووە، بەلام

---

[1] الاعراف (٦).
[2] الحجر (٩٢- ٩٣).
[3] الطبری (١١/٢١٠).
[4] عبدالرزاق (١/٢٠١).
[5] الطبری (١١/٢١٠).
[6] الطبری (١١/٢١١).

لەناو ئەوانەدا (لەوانەیە شتی شاراوە هەبێت ئێمە لێی ئاگادارنین) هەر بە ئاشکراییەکەی دەزانین شارەزای ناودڵی نین. تۆ خۆت باش ئاگاداری هەمووشتێکی، زانیاریمان بەرامبەر بەزانیاری تۆ، وەك ئەوە وایەکە هیچ نەزانین ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ هەر تۆ لە هەموو نهێنیەکان ئاگاداری.

﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي
ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَۖ وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ
ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ
وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ
(١١٠) وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ (١١١)﴾

**وەبیرهێنانەوەی بەهرەکان بۆ عیسا (سەلامی خودای لێبێت)**

خودای مەزن باسی ئەو بەهرانەی خۆی دەکات کە دای بە بەندەو پێغەمبەری خۆی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خودای لێبێت) منەت دەکات بەسەریدا بەهۆی ئەو هەموو موعجیزە گەورەو دەرئاسایانەی لە ژێر دەستیدا هێنایەکایەوەو دەفەرموویت: ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ﴾ (ئەوکاتەت لەبیربێت) کە خودا فەرمووی: عیسای کوڕی مەریەموەبیر خۆتی بێنەوە چەندم چاکە دەربارەت کرد. کە دروستم کردی لە دایکێك بەبێ نێرینە (پیاو) و تۆم کردووە بە نیشانەیەك و بەڵگەیەکی بتەو لەسەر دەسەڵات و توانای خۆم لەسەر هەموو شتێك ﴿وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾ (وە چەندم چاکە) دەربارەی دایکیشت کرد. لەوکاتەدا تۆم کردە نیشانە لەسەر پاك داوێنی لەبارەی ئەو بوختانەوە ئەو ستەمکارە نەفامانە دابوویانەپاڵی ﴿إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ من گیانی هەرەپیرۆزم ناردە یارمەتیت (کە جوبرەئیلە (سەلامی خودای لێبێت)) وە تۆم کردە پێغەمبەرو بانگخواز بۆلای خودا هە ر لە منداڵیتداو بە گەورەییش، بە منداڵی زمانتم هێنایە دوان، شایەتیت لەسەر پاك داوێنی دایکت دت لە هەموو شورییەك، دانت دانا بە بەندایەتی کردنی منداو باسی ئەو پەیامەشت کرد کە بۆم ناردووی خەڵکت بانگ کرد بۆ پەرستنی من، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا﴾ لەسەر بێشکەوبە گەورەییش دەتتوانی خەڵك بدوێنیت. واتە: هەر بە منداڵی بانگی خەڵکت دەکرد بۆلای خودا، چونکە دواندنی خەڵکی لە گەورەییدا کارێکی سەرسوڕهێنەرنیە. پاشان دەفەرموویت: ﴿وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ من لەلایەن خۆمەوە فێری

کتێبو کارزانیو تەوراتو ئینجیلم کردی. ئەو تەوراتەی کە ڕەوانەکرا بۆ عیسای کوڕی مەریەم کە وتو وێژی لەگەڵداکرا. ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِي﴾ ئەوکاتەشت لەبیربێت کە لە قوڕ بە ئیزنی من شێوەی مەلێکت دروستکرد ﴿فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي﴾ فووت پێداکردو بە ئیزنی من بوو بە باڵدارێكو دەفڕی. واتە: وێنەکەی دروست دەکەیت وەك شێوەی باڵدارێك بە ئیزنی من، ئەوکاتە دەبێت بە باڵدارێکی گیانلەبەر کە فووت پێداکرد دەفڕێت بە ئیزنی خوداو وەدیهێنانی ئەو ﴿وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِي﴾ تۆ کوێرەکانی زکماكو نەخۆشیی بەڵەکیت دەکردەوە بە ئیزنی من. لە سورەتی (آل عمران) دا لەپێشدا باسی کرا لێرەدا پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە ﴿وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي﴾ وە بە ئیزنی من مردووشت زیندوو دەکردەوە. واتە: بانگت دەکردن لە گۆڕەکەیان هەڵدەستانەوە بە ئیزنی خوداو تواناو دەستەڵاتو مەیلی خودا خۆی. ﴿وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەوکاتانەش کە پاش ئەو هەموو نیشانە ئاشکرایەی کە پێم دابووی، هاتیەناو بەرەی ئیسرائیل، نەمهێشت زیانت پێ بگەیەنن، ئەوکەسانەی کە بڕوایان پێت نەهێنا، دەیانوت: ئەو نیشانانە هەمووی جادووی ئاشکرانو هیچی تر نین. واتە: ئەو بەهرانەی من وەبیرخۆت بێنەوە کە تۆم پاراست لە نەوەی ئیسرائیل کاتێك کە چوویتە ناویان ئەو هەموو بەڵگەیەت نیشاندان لەسەرئەوەی کە تۆ پێغەمبەریو ئەو پەیامەش کە بۆت هێناون لەلایەن خوداوەیە. بڕوایان پێ نەکردووی تاوانباریان دەکردی کە تۆ جادووگەری، هەوڵیاندا بۆ کوشتنو هەڵواسینت بە داردا. ڕزگارم کردی لە دەستیانو بەرزم کردیەوە بۆلای خۆمو لە پیسیو چەپەڵی ئەوان خاوێنم کردیتەوەو لە شەڕی ئەوان ڕزگارم کردی ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەم منەتەی خودا لە ڕۆژی قیامەتدا هەر بەدی دێت. وە بەشێوەی ڕابووردوو خودا ئەم دەقەی هێناوە کە بەڵگەیە لەسەر ڕوودانیو گومانی تێدانیە، ئەمەش لە نهێنیە شاراوەکانە کە خودا پێغەمبەرەکەی خۆی موحەممەد (ﷺ) لێ ئاگادارکردووە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى﴾ ئەوکاتەش من (هەر بەهێمای تەبایی خۆم) حەواریەکانم تێگەیاند: دەبێت بڕواتان بە من هەبێتو بە پێغەمبەرەکەی منیش باوەڕبکەن. ئەمەش هە منەتێکی ترە کە خودای مەزن دەینێتەسەر عیسا (سەلامی خودای لێبێت) کە حەواریەکانی کردە یارمەتیدەری. وتراوە مەبەست بەم نیگایە هێمایەکی تایبەتی خودا خۆیەتی، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِ﴾[١] بە دایکی مووسامان ڕاگەیاند: شیری بدەرێ. مەبەست لەم نیگایە هێمایەکی تایبەتی خودا خۆیەتی بەڕای گشت زانایان، نەك دابەزینی نیگا بۆیان، وەك خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ۞ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗا﴾[٢] خودا هەنگی ڕاسپارد کە: کێوان و داران و لەوشوێنانەی هەڵی دەبەستن شوێنی ژینی خۆت هەڵبەستە. پاشان لە هەموو بەروبوومێك بژێویت بمژە و بە ملکەچی ڕێگەی ڕاهێنەری خۆت بگرەبەر. حەسەنی بەسری وتی: خودای گەورە بەوشێوەیە ڕایسپاردووە، سوددی وتی: خودا ئەوەی خستووەتە ناودڵیان و حەواریەکان وتیان: ﴿ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ﴾ خودایە تۆ شایەتبە کە بڕوامان پێ هێناو هەر ملکەچی فەرمانی تۆین.

﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۞١١٢ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۞١١٣ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۞١١٤ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۞١١٥﴾

**باسی ناردنی خوان**

ئەمە بەسەرهاتی خوانەکەیە کە سورەتەکەش ناونراوە بە ناویەوە پێی دەوترێت: (سورەتی مائیدە) ئەو خوانەیە کە خودای مەزن منەت دەکات بەسەر بەندەو پێغەمبەری خۆیدا عیسا (سەلامی خودای لێبێت) کاتێك کە وەڵامی داواکەی دایەوە بە ناردنی ئەو سفرەیەو کردیە بەڵگەیەکی تەواو گەورە بۆ دەستەڵات و توانای خۆی بەسەریانەوەو فەرمووی: ﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ کاتێك حەواریەکان وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا پەروەردگارکەی تۆ لەدەستی دێت کە خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێت؟ (المائدة) ئەو سفرەیەیە کە خواردنی لەسەر دادەنرێت. هەندێك لە زانایان وتیانە: ئەوانە داوای ئەو خوانەیان کرد چونکە زۆر هەژارو کەم دەست بوون، داوایان کرد لە عیسا (سەلامی خودای لێبێت) کە هەموو ڕۆژێك

---

[١] القصص (٧).

[٢] النحل (٦٨- ٦٩).

خوانێکمان بۆ دابەزێت هەتا لێی بخۆن‌و خۆیانی پێ بەهێزبکەن بۆ خوداپەرستی ﴿قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕواتان بە خودا هەیە لێی بترسن. واتە: عیساش (سەلامی خودای لێبێت) وەڵامی دانەوەو پێی وتن: لە خودا بترسن‌و داوای ئاوها مەکەن. لەوانەیە ئەو داوایە ببێتە بەڵایەك بۆتان. پشت بە خودا ببەستنلە گەڕان بەشوێن ڕۆزیدا ئەگەر لە خودا دەترسن. ﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا﴾ وتیان: ئێمە دەمانەوێت لە خوانێکی ئاوا بخۆین. چونکە ئێمە زۆر پێویستمان بەوخوانەیە لێی بخۆین‌و ﴿وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ دڵمانیابین، واتە: کاتێك چاومان بەوخواردنە کەوت کە بۆ ئێوە ئێمە هاتووە پێی دڵنیادەبین ﴿وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا﴾ باوەڕدەکەین کە هەرچی پێمانت وت ڕاستە. واتە: پتر بڕوات پێ دەکەین‌و شارەزاتریش دەبین لە پەیامەکەت ﴿وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ ئێمە شایەتی دەدین کە ئەوخوانە نیشانەیەکە لەلایەن خوداوە، بەڵگەشە لەسەر پێغەمبەریت‌و ڕاستی ئەو پەیامەی کە پێی هاتووی ﴿قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا﴾ عیسای کوڕی مەریەم وتی: ئەی خودای پەروەردگارمان لەو ئاسمانەوە تۆ خوانێکمان بۆ بەڕێ بکە. کە بۆ ئەوەڵ‌و دواییشمان جێژنێك بێت. سوددی وتی: واتە ئەوڕۆژەی کە ئەوخوانەت تێدانادروە بیکەینە جەژنێك بۆ خۆمان‌و ئەوانەی دوای ئێمەش دێن.[1] سوفیانی سەوری وتی: واتە بیکەینە ڕۆژێك نوێژی تێدابکەین.[2] ﴿وَءَايَةً مِّنكَ﴾ نیشانەیەك بێت لەلایەن تۆوە. واتە: بەڵگەیەك بێت بیکەینە ننیشانەی دەستەڵاتی خۆت لەسەر هەموو شتێك‌و قەبوڵکردنی داواکەی منیش هەتا بڕوام پێ بکەنلە گەیاندنی پەیامەکەدا ﴿وَٱرۡزُقۡنَا﴾ لە ڕۆزی بێبەشمان مەکە. خەمڕەوێن بێت‌و بێ ئەرك‌و ماندی بوون. ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ تۆ چاکترین ڕۆزیدەری. ﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ خودا فەرمووی: من بۆ ئێوەی بەڕێ دەکەم، هەرکەسێك لەدواییدا حاشابکات، جەزرەبەیەکی وای دەدەم کە تا ئێستا لەناو خەڵی دونیا هیچ کەسێکم ئاوا جەزرەبە نەدابێت. واتە: هەرکەسێك لە ئوممەتەکەت بڕوای پێنەکات‌و دژایەتی بکات سزایەکی وای دەدەم هیچ کەسێك سزای ئەوهای نەدرابێت لەوچەرخەی ئێوەدا. وەك ئەم ئایەتە کە

---

[1] الطبري (١١/٢٢٥).

[2] الطبري (١١/٢٢٥).

خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾[1] ڕۆژێـك کـە قیامەت دێت (فـەرمان دەدرێـت) دەسـتەو بەسـتەی فیرعـەون زۆر بەتونـدی بخەنـە ژێـر جەزرەبە. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2] دیارە ئەوکەسانەی دووڕوون لەپلەی هـەرە بەرەوژێری ئاگردان. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە وتی: بێگومـان سـێ کەس لەڕۆژی قیامەتدا توندترین سزایان بۆهەیە لـە خـەڵکی: دووڕووەکـان، کەسـێکیش بووبێتـەوە بـە خودانەناس لە خوانەکانو (أصحاب المائدە) ئالی فیرعـەون.[3] دیسان ئیبنـو ئـەبی حاتـەم ڕیوایـەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: بە عیسای کوڕی مەریەمیان وت (سەلامی خودای لێبێت): داوابکە لە خـودا خوانێکمـان لـە ئاسمانـەوە بـۆ بـەڕێ بکـات، وتـی: فریـشتەکان بەخوانێکـەوە دابـەزین کـە هەڵیانگرتبوو، حەوت نەهەنگو حەوت کولێرەی لەسەربوو لەبەردەستیاندا دایاننا، دوایین کەسیان لێـی خوارد وەك چۆن یەکـەم کەسـیان لێـی خـوارد[4] ئیبنـو جـەریر ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئیـسحاقی کـوڕی عەبدوڵلاوە.کە خوانەکە دابەزی بۆ عیسای کـوڕی مەریـەم (سـەلامی خـودای لێبێـت) حـەوت کـولێرەی لەسەربوو لەگەڵ حەوت نەهەنگ بـەئارەزووی خۆیـان لێیـان دەخـوارد. وتـی: هەنـدێکیان لێیـان دزیو وتیان: لەوانەیە سبەینێ دانەبەزێت. پاشان هەڵگیرا[5] ئەم نیشانانەو چەندین شتی تـریش جگـە لەمانـە بەڵگەن لەسەرئەوەی کە ئەم خوانە هاتووەتەخوارەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل لە ڕۆژەکانی عیسای کـوڕی مەریەمدا (سەلامی خودای لێبێـت) لەسـەر داواکـەی کـە خـودا لێـی قبـوڵکرد. وەك دەقـی ئـەم ئایەتـە بەئاشکرا لە قورئانی پیرۆزدا بەڵگەیە لەسـەری ﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ﴾ خـودای مـەزن فـەرمووی: من بۆئێوەی بەڕێ دەکەم.

## ڕووداوێکی مێژوویی سەیر

مێژووناسان گێڕاوێتیانەوە کە مووسای کوڕی نەسیر کە بریکاری ئەمەویـەکان بـووە لـە ئـازادکردنی وڵاتی مەغریبدا خـوانێکی ڕازاوەی لـە گەوهـەرو مـرواری بینـی، ڕەوانـەی کـرد بـۆ مـەلیکی موسـڵمانان وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك بناغەدانـەرو دروسـتکەری مزگـەوتی دیمەشـق خوانەکـە بـەڕێوەبوو کۆچـی دوایی کرد، هێنایان بۆ براکەی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك کە بوو بە جێنشین (خەلیفە) دوای ئـەو.

[1] غافر (٤٦).

[2] النساء (١٤٥).

[3] الطبري (١١/٢٣٣).

[4] الطبري (٥/١٣٢)، ابن أبي حتم (١٢٤٦).

[5] الطبري (٥/١٣٤).

خەڵكی كە چاویان پێی كەوت زۆر سەرسام بوون لەو هەموو مرواریو دڕو گەوهەرە بەنرخەی (پێی دروستكرابوو) وتراوە: ئەوخوانە هی سولەیمانی كوڕی داود بووە(سەلامی خودای لێبێت) والله أعلم....

﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾﴾

**عیسا (سەلامی خودای لێبێت) حاشا لە بپ پەرستیو شەریك دانان دەكات بۆ خوداو دان بە یەكتاپەرستی دادەنێت (التوحید)**

دیسان خودای مەزن لێرەدا ڕووی قسەی دەكاتە بەندەو پێغەمبەری خۆی عیسای كوڕی مەریەم (سەلامی خودای لێبێت) لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئامەدەبوونی ئەوانەی كە خۆیو دایكیان كردبووە دوو خودا بێجگە لە خودا دەیانپەرست ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوكاتە كە خودا فەرمووی: ئەرێ عیسای كوڕی مەریەم، تۆ وتوتە بەو خەڵكە (لەبری خودا) دەبێت ئێوە منو دایكم وەك خودا بپەرستن؟ ئەمە هەڕەشەیەكە لە مەسیحیەكان سەرزەنشت كردنیانە لەبەردەم ئەو هەموو خەڵكەدا وەك قەتادە وتیو ئەم ئایەتە دەكاتە بەڵگە بۆ قسەكەی وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾[1] ئەمڕۆ ڕۆژێكە ڕاستەكان ڕاستیەكەیان بەهرەیان پێ دەگەیەنێت ﴿قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ﴾ وتی: پاكیو بێ عەیبی هەر شیاوی تۆیە من بۆم نیە شتێك بڵێم كە بە هیچ شێوەیەك هەقی من نیە ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ﴾ ئەگەر ئەم قسەیەم بكردایە خۆت دەتزانی ئەی پەروەردگارم، چونكە هیچ شتێكت لێ ناشاردرێتەوە. هەربۆیە وتی: ﴿تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ﴾ ئەوەی لە دڵمدایە تۆ دەیزانیت، تەنیا منم كە دەربارەت هیچ نازانم، هەر تۆ لە هەموو نەدیاران ئاگاداری. هیچم پێ نەوتون جگە لەوەی كە تۆ فەرمانت پێ داوم. وتم: خودا بپەرستن كە پەروەردگاری منو ئێوەشە. واتە: من هەر ئەوەم پێ

[1] المائدة (١١٩).

وتوون، ﴿وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡ﴾ وە من شايەتو چاودێربووم بەسەريانەوە هەتا لەناوياندا بووم. واتە: من شايەت بووم لەسەر كردارەكانيان كاتێك من لەناوياندابووم ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ لەوكاتەدا منت بۆ خۆت ردەوە، تۆ خۆت ئاگاداريان بووی، ديارە خۆت لە هەموو شت ئاگاداری. ئەبو داودی تيالیسی ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە نێوانماندا هەستاو ئامۆژگاریەكی كردینو فەرمووی: (ئەی خەڵكینە، بێگومان ئێوە كۆدەكرێنەوە لەلای خوادی مەزن بە پێی پەتیو ڕووتیو خەتەنە نەكراوی ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥ﴾[1] هەروەك پێشوو دروستمان كردن دیسان دروستی دەكەینەوە. وە یەكەم كەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا جلوبەرگی دەكرێت بە بەردا ئیبراهیمە، ئەوسا بزانن، كە پیاوێك دەهێنرێت لە ئوممەتەكەم بەرەو لای چەپ دەربردرێن منیش وتم هاوەڵی منن، دەوترێت: تۆنازانی دوای تۆ چیان كردووە منیش هەر ئەوە دەڵێم كە ئەو عەبدە چاكەو وتویەتی: ﴿وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ دەوترێت: لەوكاتەی تۆ لایان نەماوی ئەوانە هەڵگەڕاونەتەوەو پشتیان هەڵكردووە)[2] بوخاریش ڕیوایەتی كردووە لەم ئایەتەدا[3] ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئەگەر بدەیت ئازاریان بدەیت، عەبدی خۆتن، ئەگەر بشتەوێت لێیان خۆش بیت، خۆت دەزانیتو هەر خۆت خاوەن دەسەڵاتو لەكارزانی. ئەم دەقە مەیلو دەسەڵاتی گەڕانەوەتەوە بۆلای خودای گەورە، چونكە خودا مەیلی لە هەرشتێك بێت دەیكات، هەرچی بكات پرسیاری لێ ناكرێت، بەڵام غەیرە ئەو ئەوپرسیارەیان لێ دەكرێت. حاشاكردن لە مەسیحیەكانیش ئەوە دەگەیەنێت كە درۆیان بەدەم خۆیانو پێغەمبەرەكەیانەوە هەڵدەبەستو هاوەڵو هاوسەرو منداڵیان بۆ دادەنا كە خودای گەورە باڵادەستو پاكو بێ عەیبەو دوورە لەوقسانەوە ئەوانە دەیكەن. وە لە فەرموودەیەكدا هاتووە: كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) شەوێك هەتا بەیانی هەر ئەم ئایەتەی دەوتەوە (دووبارەدەكردەوە).

---

[1] الانبياء (١٠٤).

[2] مسند الطيالسي (٣٤٣) فەرموودەيەكی سەحيحە.

[3] فتح الباري (٨/١٣٥).

﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌۢ ﴿١٢٠﴾ ﴾

## لە ڕۆژی قیامەت دا جگە لە ڕاستگۆیی هیچ شتێك سودی نیە

خودای گەورە وەڵامی بەندەو پێغەمبەری خۆی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خودای لێبێت) دەداتەوە کە لەوکاتەدا حاشادەکات لەوقسانەی کە مەسیحیە بێ دینە درۆزنەکان هەڵیان بەستووە بەدەم خوداو پێغەمبەرەکەیەوە، ویستو ئارەزوو لەبارەیانەوە دەگەڕێنێتەوە بۆلای خودا، ئا لەوێدا ﴿ قَالَ ٱللَّهُ ﴾ خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژێکە ڕاستەکان ڕاستیەکەیان بەهرەیان پێ دەگەیەنێت. زەحاك لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکە یەکتاپەرستەکان سود لە یەکتاپەرستیەکەیان وەردەگرن. ﴿لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ ئەوانە باخاتێکیان بۆ دەبێت جۆباریان بە بەردادەڕواتو هەتاسەر هەر لەوێ دەبن. (لێی دەرناچنو لەناویش ناچن) ﴿رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ خودا لێیان ڕازی بووەو ئەوانیش لە خودای خۆیان ڕازین ئائەوەیە سەرکەوتنی گەورە. وەك لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾[1] ڕەزامەندی خودا لە هەموو شتێك گەورەترە. ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ ئەوە سەرکەوتنی گەورەیە،ئەوسەرکەوتنە گەورەی کە هیچ سەرکەوتنێك لەمە گەورەترنیە. وەك لە ئایەتێکی تردا خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴾[2] دەبێت بۆ پاداشتی وەها خەبات بکەن، ئەوکەسانەی خەباتکارن. وە دەفەرموێت: ﴿وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ﴾[3] با بۆ شتی وا پێکەوە کێبڕکێ بکەن (پێش پێشێن بکەن) پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌۢ ﴾ ئاسمانەکانو زەمینو هەرچی لەناویاندا هەیە (هەموو) موڵکی خودایەو هەر خودایە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. واتە: خودا وەدیهێنەری هەموو شتێکەو خاوەنیەتیو فەرمانەکانی خۆی تێدا جێبەجێ دەکاتو دەستەڵاتی بەسەریدا هەیە. هەموو شتێك موڵکی ئەوە لەژێر زەبرو تواناو مەیلی ئەودایە بێ وێنەیەو بریکارو هاوتاو بابو منداڵو هاوسەری نیە، هیچ پەرستراوێكو پەروەردگاریەك نیە جگە لەو. ئیبنو وەهب وتی: لە حویەیی (حُيَي) کوڕی عەبدوڵلام

---

[1] التوبة (٧٢).

[2] الصافات (٦١).

[3] المطففين (٢٦).

بیست کە دەیگێڕایەوە لە عەبدوڕەحمانی حوبلیەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە وتی: دواین سورەت هاتەخوارەوە سورەتی مائیدەبوو[١].

## تەفسیری سورەتی (الانعام)

## لە مەککە هاتووەتەخوارەوە

### ڕێزی سورەتی ئەنعام و کاتی هاتنەخوارەوەی

عەوفی و عیکرەمەو عەتا لە ئیبنو عەبباسەوە وتیان: ئەم سورەتی ئەنعامە لە مەککە هاتەخوارەوە.[٢] تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەم سورەتی ئەنعامە هەمووی بەیەکەوە لە شەودا لە مەککە هاتووەتەخوارەوە، حەفتا هەزار فریشتە بەدەوریدا تەسبیحاتیان دەکرد[٣] سوددی لە موڕەی کوڕی عەبدوڵڵاوە وتی: سورەتی ئەنعام هاتەخوارەوە حەفتا هەزار فریشتە بەڕێیان دەکرد[٤].

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾﴾

### سوپاس و ستایش بۆ خودا لەسەر گەورەیی و تواناو مەزنی دەستەڵاتی

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خودایەك كە ئاسمان و زەمینی دروستکردووەو تاریکی و ڕووناکیشی وەدی هێناوە. خودای گەورە ستایشی خۆی دەکات و پەسەندی دەدات لەسەر دروستکردنی ئاسمان و زەمین و کردوویەتی بە جێگەو شوێنی عەبدەکانی. ڕووناکی و تاریکیەکانی وا لێکردووە بەسودبن بۆ بەندەکانی لە شەوو ڕۆژیاندا، وتەی ﴿ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ بەکۆی هێناوەو وتەی ﴿وَٱلنُّورَ﴾ ی بەتاك هێناوە چونکە بەڕێزترە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ﴾[٥] بە ڕاست و چەپدا.وە لە کۆتایی ئەم سورەتەشدا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ

---

[١] الترمذی (٣٠٣٦).

[٢] الدر المنثور (٣/٢٤٣).

[٣] الطبرانی (١٢/٢١٥).

[٤] الدر المنثور (٣/٢٤٣).

[٥] النحل (٤٨).

بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾[١] ئەمەیە ڕێگەی ڕاستی من، ئێوە هەر بەوڕێگەیەدا بچن، مەچنەسەر ڕێگاکانی تر، نەوەکو لە ڕێگەی ئەو دوورتان بخاتەوە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾ ئەوکەسانەش کە بڕوایان بە پەروەردگاریان نەبووە، دێنو لەپاشان شەریکی بۆ دادەنێن. واتە: لەگەڵ هەموو ئەمانەدا هەندێك لە عەبدەکانی حاشادەکەنو هاوبەشی بۆ پەیدادەکەنو هاوسەرو منداڵیشی بۆ دادەنێن، خودای مەزن پاکو بێ عەیبەو دوورە لەوشتانەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ ئەوخودایەی کە ئێوەی لە قوڕ دروستکردووە. واتە: باوکیان ئادەم، کە لە ڕەگەزی ئەونو لەلای ئەوەوە دەرچوونو بڵاوەیان کردووە بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا ﴿ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا﴾ پاشان کاتێکی دیاریکردووە (بۆ مردن)، سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا﴾ واتە: مردن. ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی.[٢] هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو عیکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن قەتادەو زەحاکو زەیدی کوڕی ئەسلەمو عەتیەو سوددی موقاتیلی کوڕی حەیانو کەسانی تریشەوە جگە لەمانە[٣] وە ئیبنو عەبباسو موجاهیدەوە دیسان ڕیوایەت کراوە ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ واتە: ماوەی دونیا[٤] ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ واتە: تەمەنی مەردوم هەتا کاتی مردن، وەك ئەوەی لەم ئایەتەدا وەرگیرابێت کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ﴾[٥] هەر (خودا) خۆیەتی بەشەودەتانمرێنێتو دەشزانێت لە ڕۆژدا چیتان کردووە. مانای ﴿عِندَهُۥ﴾ واتە: جگە لەو هیچ کەسێك نایزانێت. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّى لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾[٦] زانینی تەنیا لەلای پەروەردگاری منە، خۆی نەبێت کەس ناتوانێت کاتەکەی ئاشکرابکات. ئەم ئایەتەش کە دەفەرمووێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكۡرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾[٧] لێت دەپرسن، ڕۆژی قیامەت کەی دێت؟ تۆ چۆن لەبارەیەوە

---

[١] الانعام (١٥٣).

[٢] الطبری (١١/٢٥٧).

[٣] الطبری (١١/٢٥٦/٢٥٨).

[٤] الطبری (١١/٢٥٦).

[٥] الانعام (٦٠).

[٦] الاعراف (١٨٧).

[٧] النازعات (٤٢– ٤٤).

دەدوێیت؟هەر پەروەردگاری تۆ کاتەکەی دەزانێت. ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾ کەچی ئێوە دیسان هەر دوودڵن. سوددیو کەسانی تریش دەڵێن: واتە ئێوە هەر دوودڵن لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە.[1] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ لە ئاسمانو زەمیندا خودا هەر ئەوەو لە نهێنیو ئاشکرتان ئاگادارەو هەرکارێك بکەن دەیزانێت. واتە: هەر بانگ لەوی دەکرێتو هەر ئەو خودایە لە ئاسمانو زەویدا، واتە: تەنیا هەر ئەو شایەنی بەندایەتیو پەرستنو بەتەنهاناسینە بۆ ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەمیندانو پێی دەڵێن: (الله) لە خۆشیو ناخۆشیدا هەر داوا لەو دەکەن جگە لەوانەی کە خودانەناسنو لە مرۆڤو لە جنۆکە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ﴾[2] هەر ئەوە لە ئاسمانەکاندا خودایەو لە زەمینشدا هەر خودایە. واتە: هەر ئەو خودای ئەوانەیە کە لە ئاسمانەکانو زەمیندان. وە هەر خودایە نهێنی ئاشکرتان دەزانێت ﴿وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ هەرکارێك بکەن دەیزانێت. واتە: ئاگاداری گشت کارێکتانە لە چاکەو لە خراپەی.

﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴿٦﴾﴾

**لاساری بت پەرستان هەڕەشەکردن لێیان لەسەری**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ هەر نیشانەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوەبێتو بێتەلایان، مەگین هەر حاشای لێ دەکەنو ڕووی لێ وەردەگێڕن. خودای گەورە باسی ئەو بت پەرستە بێ باوەڕە لاسارو یاخیانە دەکات. هەرچەندە بەڵگەو نیشانەو موعجیزە بێنێت بۆیان لەسەر تاکو تەنیایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرە بەڕێزەکان ئەوانە هەر ڕووی لێ وەردەگێڕنو سەیری ناکەنو گوێی پێنادەن. خودای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ کاتێك ئەم ڕاستیەشیان بۆ هات بڕوایان پێ نەدەکرد. بەمزوانە ئەوانە ئاگادارەبن لەوشتانەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد. ئەمە خۆی

---

[1] الطبري (١١/٢٦٠).

[2] الزخرف (٨٤).

هەڕەشەیەکە لێیان زۆر توندە لەسەر بڕوانەهێنانیان بەو ڕاستیە، دەبێت هەر وەڵامی ئەو بێ باوەڕەیان پێ بگاتو ئەنجامو ئاکامەکەی وەربگرنو بیچێژن، پاشان خودای مەزن ئامۆژگاریان دەکاتو دەشیان ترسێنێت لەوەی کە تووشی سزاو بەڵایەکی دونیاش ببن وەك چۆن تووشی هاوشێوەکانیان هات لە گەڵ پێشووەکان. کە لەمان زۆر بەهێزتربوونو ژمارەشیان لەمان زیاترو خاوەن منداڵو سامانی زۆرتریش بوون. سوودیان لە زەوی وەرگرتو ئاوەدانیان کردەوە. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾ ئایا ئەوانە نازانن کە ئێمە لەپێش ئەواندا چەندین بەرەمان قڕکرد؟ئەو دەستەڵاتەش لەم زەمینە بەوانمان دابوو، بەمان نەداوە لە ماڵو منداڵو دەستەڵاتی فراوانو دەوڵەمەندیو لەشکری زۆر بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا﴾ وە لە ئاسمانەوە بە لێزمەو ڕەهێڵە پەیتا پەیتا بارانمان بۆ باراندن ﴿وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ ڕووبارەکانمان والێکرد کە بەژێر کۆشكو باخەکانیاندا دەڕۆیشت. واتە: بارانی زۆرمان بۆ باراندنو کانیاوەکانیان زیادی کردو کەم کەم ماوەدرانو بۆیان شل کرا. ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ کەچی ئەوەندە تاوانیان کرد قڕمان کردن. واتە: بەهۆی گوناهەکانیانەوە کە دەیانکرد لەناومان بردن ﴿وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ لەپاش ئەوان گەلی ترمان دامەزراند. واتە: ئەوانەی پێشوو ڕۆیشتن، وەك دوێنێ ڕابووردو کردمانن بە چیرۆك لەجێی ئەوان بەرەیەکی ترمان هێنا تاکو تاقیان بکەینەوە، دەستیاندایە هەمان کاری ئەوان، ئەمانیش وەك ئەوانەی پێشوو قڕیان تێخستن، کەواتە ئەی خەڵکینە بترسن لەوەی کە تووشی ئەوانە هات تووشی ئێوەش دەبێت. ئێوە لای خودا لەوانە خاوەن دەستەڵاتدارترنین، ئەو پێغەمبەرەش کە بڕواتان پێنەکرد بەڕێزترە لە پێغەمبەرەکەی ئەوان، لەبەرئەوەیە ئێوە لەپێشترن بۆ سزاو زووتر تۆڵەلێسەندن، ئەگەر بەر سۆزو چاکەی خودا نەکەون.

﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٧ وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ الْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ۝٨ وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ۝٩ وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ۝١٠ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ۝١١﴾

**زەمی ئەوخوانەناسە لاسارانەو ڕازی نەبوونیان بەوەی کە پێغەمبەران لە مرۆڤ بن**

خودای مەزن باسی بت پەرستانو سەرکەشیو خۆ بەزلزانیان دەکات بەرامبەر بە هەق. شانازیان بە خۆیانەوە دەکردو دژایەتی ئاینی خودایان دەکردو دەیانوت: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ ئەگەر ئێمە لەسەرکاغەز نامەیەکمان بۆتۆ ئەی محەممەد(ﷺ) بناردایەتە خوارەوەو دەستیان لێی بدایە، واتە: بە چاوی خۆیان بیان دیتایە کە دەهاتەخوارەوە دەستیان لێ بدایە ﴿لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەوانەی خودانەناسنو هەر دەیانوت: بێگومان ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا باسی خۆ بەزلزانیان دەکات بەرامبەر شتە هەست پێکراوەکانیشو دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾[1] ئەگەر دەگایەکیان لە ئاسمانەوە بۆ بکەینەوەو خەریکی سەرکەوتنێ بن، بێگومان دەڵێن: ئێمە چاومان بەستراوەو دیارە جادوومین لێکراوە. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴾[2] ئەگەر ببینن پارچەیەك لەم ئاسمانە دادەکەوێت، دەڵێن: ئەمە هەورێکی بەسەریەکدا کەوتووە. وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ وە دەڵێن: بۆچی خودا فریشتەی نەناردەخوارەوە بۆی. ئەگەر ئێمە فریشتەمان بناردایە، بێگومان کارلەکار دەترازاو هیچ مۆڵەتیان پێ نەدەدرا. واتە: ئەگەر لەسەر ئەوحاڵەتەی کە تێدابوون فریشتەمان بناردایە، سزایان لەلایەن خوداوە بۆ دەهات وەك دەفەرموێت: ﴿ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴾[3] ئێمە فریشتە نانێرین مەگین بە هەق، جا ئیتر مۆڵەتیان نادەین. وەك دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾[4] ئەوڕۆژەی ئەوان فریشتەکان بە چاوی خۆیان دەبینن، هیچ مژدەیەکمان لەلانیە کە بیدەین بە تاوانباران. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾ خۆ ئەگەر فریشتەمان بناردایە، هەردەبوو جلوبەرگی پیاوێکی لەبەربکەین، ئەو جلوبەرگەی ئەوان لەبەریان دەکرد ئەویش لەبەر بکردایە. واتە: ئەگەر فریشتەیەکمان لەگەڵ

---

[1] الحجر (١٤–١٥).

[2] الطور (٤٤).

[3] الحجر (٨).

[4] الفرقان (٢٢).

پێغەمبـەرێکی مـرۆڤ ڕەوانەبکردایـە، دەبووایـە لەشـێوەی پیاوێـك بووایـەو ئـەوان بتـوانن قـسەی لەگەڵدابکـەن‌و سـودیان لـێ وەرگـرن لـەوەی پێیـان دەدات ئەوکاتـەش گومانیـان لـەو پەیامـە بـۆ پەیدادەبوو، وەك چۆن گومانیان هەیە لـە وەرگرتنـی پـەیامێك کـە مـرۆڤ بۆیـان دێنێـت. وەك خـودای گـــەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴾[1] بلێ: ئەگەر فریشتە بەدڵنیایی لەم زەمینـەدا بڕۆیشتنایە، دیـارە ئێمـە لـە ئاسمانەوە پێغەمبەرێکی فریشتەمان بۆ دەناردن. لە میهرەبانی خودا خۆیەتی لـە هـەموو چینێکدا لـە دروستکراوەکانی لە خۆیان بۆ ڕاسپاردوون هەتا یەکتری بانگ بکەن‌و بتوانن سود لە یـەکتری وەربگـرن لـە قـسەکردن‌و پرسیارکردندا. وەك خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾[2] خودا منەت دەکـات بەسـەر باوەڕدارانـدا، کـە هەر لە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ نـاردوون، نیشانەکانی خودایـان بەسـەردا دەخوێنێتـەوەو بـە خـاوێنی ڕایان دەگرێت. زەحاك لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەگەر فریشتەیان بۆ بهاتایە، لەوێنەی پیـاودا نـەبێت بۆیان نەدەهات، چونکە ئـەوان نـەیان دەتـوانی سـەیری فریـشتە بکـەن کـە لـە ڕووناکیـە[3]، ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾ واتە: لێمان دەشێواندن وەك چـۆن خۆیـان لـە خۆیـان دەشـێواند. والـیبی لـە ئیبنو عەبباسەوە وتی: واتە لێمـان دەگـۆڕین. پاشـان خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ بـە گـەلێك لـە پێغەمبـەرانی پێش تۆ، گاڵتەکراو گاڵتەکاران تووشـی کارەکـەی خۆیـان بـوون. ئەمـە لێرەدا دڵدانـەوەی پێغەمبـەرە (ﷺ) لە بەرامبەر ئەوکەسانەی کـە هۆزەکـەی بڕوایـان پـێ نـەدەکرد، بەڵێنیشە لەلایـەن خـوداوە بـۆ پێغەمبەرو (ﷺ) باوەڕداران بە سەرکەوتن‌و پاشەڕۆژی چاك لـە دونیـاو لـە قیامەتـدا. پاشـان خـودای مەزن دەفـەرمووێت: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ بلـێ: ئێـوە لەسـەر ئـەم زەمینـەدا بگـەڕێن، تـا بزانن دواڕۆژی بـێ باوەڕەکـان بـەکوێ گەیـشت. واتـە: بەخۆتانـدا بچنەوەو سەیربکەن بزانن گەلەپێشووەکان چیان بەسەرهات، کە بڕوایان بـە پێغەمبەرەکـەیان نـەهێناو

[1] الاسراء (٩٥).
[2] ال عمران (١٦٤).
[3] الطبری (١١/٢٦٨).

دژایەتیان کردن کە تووشی چ سزاو تۆڵەیەکی سەخت بوون هەر لە دونیادا، ئەوش کە بۆیان هەڵگیراوە لە سزای بەژان لە ڕۆژی قیامەتدا. وە چۆن خودا پێغەمبەرەکان و بەندە خاوەن باوەڕەکانی ڕزگارکرد.

﴿قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ
فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ
﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ
أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ مَّن يُصۡرَفۡ
عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾﴾

## هەر خودا خۆی وەدیهێنەرو خاوەنی ڕۆژی و بەهرەکانە پێویستە ملکەچی بۆبکرێت

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەمیندایەماڵی کێیە؟ بڵێ: هەمووی هی خودایە، خودا لەسەر خۆی نوسیووە کە دەبێت خاوەن بەزەیی بێت. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمین و ئەوەش کە لەناویاندایە خۆی خاوەنیەتی و لەسەر خۆشی نوسیووە کە سۆزداربێت بەرامبەر دروستکراوەکانی، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان کاتێك کە خودا خەڵکی دروستکرد لەلای خۆی نامەیەکی نوسیووە لەسەرووی تەختەوە (فوق العرش) بێگومان بەزەییم زاڵ بووە بەسەر تورەییمدا)[1]. ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ سوێند بە خودا هەمووتان لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکاتەوە کە گومان لە هاتنیدانیە. ئەم (لامە) لامی سوێندە. خودای گەورە سوێندی بە گیانی پیرۆزی خۆی خواردووە کە عەبدەکانی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا کە ڕۆژی قیامەتە گومانی تێدانیە لەلای عەبدە خاوەن باوەڕدارەکانی، بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان پێی نیەو حاشای لێ دەکەن هەمیشە ڕاڕاو دوودڵن ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوکەسانە خۆیان دۆڕاندووە، ئەوە ئەوکەسانەن کە بڕواناهێنن بە ڕۆژی قیامەت و لە خراپی ئەوڕۆژە ناترسن. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ هەرچی لە شەوو ڕۆژدا ئارامی گرتووە ئەوخاوەنیەتی، واتە: ئەوەی بەسەر زەمین و ئاسمانەوە بگەڕێت هەمووی بەندەی ئەوەو ئەو دروستی کردووە لەژێر توناو دەستەڵاتی ئەودایەو ئاگای لێیانە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ هەر

---

[1] فتح الباری (١٣/٣٩٥)، مسلم (٤/٢١٠٧).

خۆی بیسرو زانایە. قسەی عەبدەكانی دەبیستێتو ئاگاداری هەڵسوكەوتو نهێنیەكانی نێو دڵیانە.

پاشان خودای مەزن دەفەرموێت بە عەبدو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) كە بە یەكتاپەرستیو پەیامە ڕێكەكەی خۆی ڕەوانەی كردووەو فەرمانی پێداوە كە بانگی خەڵكی بكات بۆ سەر ڕاستەڕێ.

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ بڵێ: ئایا دەتانەوێت جگە لە خودا هیچ كەسی تر بە سەروەری خۆم بزانم، كە ئاسمانانو زەمینی وەدیهێناوە؟ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایەكە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ﴾[1] ئایا ئێوە دەتانەوێت جگە لە خودا شتێكی تر بپەرستن؟ واتە: جگە لە خودا هیچ كەس مەكەنە سەروەری خۆتان، ئەو خودایەی كە تاكو تەنیایەو شەریكی نیەو وەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەمینە، كە لە پێشدا بەم شێوە نەبوو ﴿وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ﴾ ڕۆزی بە زیندەوەر دەداتو لە بژێوی بێ نیازە. وەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ﴾[2] هەربۆیە جنۆكەو مرۆڤم دروستكرد، تاكو بم پەرستن، من هیچ ڕۆزیم لەوان ناوێت، خواردنیشم لەوان ناوێتو وە هەندێك ئەم ئایەتەیان بەم شێوەیە خوێندووتەوە (وهو يُطعم ولا يَطعم) بە فەتحی (یائەكە) واتە: خۆی ناخوات. لە فەرموودەیەكدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: پیاوێك لە ئەنساریەكانی خەڵكی قوباء پێغەمبەری (ﷺ) بانگ كرد بۆ سەر خواردنێك ئێمە لە خزمەتیدا چووین، كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) خواردنەكەی خواردو هەردوو دەستی شۆری فەرمووی: (سوپاس بۆ ئەو خودایە ڕۆزیدەرەو پێویستی بە بژێوی نیە. منەتی كردووە بەسەرماندا شارەزای ڕێی كردووینو خواردنی پێ داوینو لە خواردنەوەشی پێ نۆش كردووین. لە ڕووتی دایپۆشین وە بە گشت تاقیكردنەوەیەكی چاك تاقیمان دەكاتەوە. سوپاس بۆ خودا (غير مودٌ ربي، ولا مكافياً ولا مكفورٍ ولا مستغنياً عنه) سوپاس بۆ ئەو خوادیەی كە ڕۆزی داین لە خواردنو خواردنەوەوی پێ نۆش كردین، دایپۆشین لە ڕووتیو لە گومرایی ڕێی نیشانداینو لە كوێری بینینی پێ بەخشین. وە ڕیزی لێ ناین بەسەر زۆرێك لەوانەی دروستی كردن بە ڕێزێك زیاتر. سوپاس بۆ خودا پەروەردگاری گشا دونیا)[3]

﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بڵێ: فەرمان بەمن درا كە یەكەمین كەسم ملكەچ بكەم تۆ هەرگیز لەوانە مەبە

[1] الزمر (٦٤).

[2] الذاريات (٥٦– ٥٧).

[3] النسائي في الكبى (٨٢/٦) فەرموودەیەكی سەحیحە.

شەریك بۆ خودا دادەنێن. بڵێ: ئەگەر نافەرمانی خودای پەروەردگارم بکەم لە ئازاری ڕۆژە هەرە دژوارە پڕ مەترسیەکە دەترسم. واتە: لە سزای ڕۆژی قیامەت دەترسم. ﴿مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ﴾ ئەوڕۆژە خودا لە هەرکەسێك وازبێنێت ئەوە دیارە وەبەر بەزەیی خۆی خستووە ئەوەش ڕزگاریەکی ئاشکرایە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَ﴾[1] کێ لە ئاگر لابدرێت و ببرێتە بەهەشت ڕزگاری بووە. ڕزگاربوون واتە: بەدەستهێنانی قازانج و تووشی زیان نەبوون.

﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٨﴾ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُۘ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾﴾

### هەر خودا زیان گەیەنەرو سودگەیەنەرو زاڵە

خودای مەزن بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: کە هەر خۆی خاوەنی سودگەیاندن و زیان گەیاندنە وە هەر خۆی کاروباری خەڵك بە مەیلی خۆی بەڕێ دەکات، کەس بۆی نیە دەست لە فەرمانەکانی وەربدات و بڕیاری بگێڕێتەوە ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ ئەگەر خودا بەڵایەکت بەسەربێنێت، جگە لە خۆی کەس ناتوانێت لەسەری لاببات، وە ئەگەر چاکەیەکت بەسەر بێنێت دەستی دڕوات و، هەر خۆیەتی هەمووکارێکی پێ دەکرێت. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾[2] هەرکاتێك خودا دەرووی چاکەی لەڕووی مەردوم بکاتەوە، کەس ناتوانێت بیبەستێت (جگە لە خۆی) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خودایە هیچ بەربەستێك نیە لەوەی کە تۆ بەخشیووتە، بەخشەریش نیە لەوەی کە تۆ ڕێگریت لێکردووە, وە هیچ خاوەن دەسەڵاتێك لای تۆ دەسەڵاتەکەی سودی پێ نادات دەسەڵات

---

[1] ال عمران (١٨٥).

[2] فاطر (٢).

هەر لەلای خۆتە)[1] هەربۆیە خودای مەزن لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ هەر خودایە لەسەر هەموو عەبدەكانی دەستی دەڕوات. واتە: ئەو خودایەی كە گەردنەكان بۆی نەوی دەبێت و زۆرداران بۆی زەلیل دەبێت و سەری بۆ شۆڕدەكات و زاڵە بەسەر هەموو شتێكدا، هەموو دروستكراوەكان بەرفەرمانیەتی و خۆیان بە كەم دەزانن بەرامبەر گەورەیی و پایەبەرزی و توانادەستەڵاتی. هەربۆیە خۆیان بە لاوازو زەبوون سەیردەكەن لەبەر وەستیداو لەژێر فەرمان و بڕیاری ئەودان. ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ هەر خۆی لەكارزان و ئاگاداره. لەكارزانە لە كردارەكانیداو ئاگادارە بە جێی و شوێنی هەموو شتەكان، كەسێك شایەنی پێ بەخشین نەبێت پێی نابەخشێت پاشان دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ﴾ بڵێ: شایەتیدانی كێ لە هەموو شایەتیدانێك گرنگترە؟ بڵێ: خودا شایەتە لەنێوان من و ئێوەدا. واتە: خودا ئاگای لەوەیە كە من بۆم هێناون و لەوەش كە ئێوە پێتان وتووم، ﴿وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ ئەم قورئانە ئەو بە خەڵات بۆمنی ناردەخوارەوە، تا بەهۆی ئەو ترس وەبەر ئێوە بێنم و هەركەسیش كە پێی دەگات. واتە: ترس وەبەرهێنەرە بۆ هەركەسێك كە پێی دەگات. وەك ئەم ئایەتە كە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[2] هەركەسێكیش لەو كۆمەڵانە بڕوای پێنەكات جێی لەناو ئاگردا بۆ ئامادەكراوە. ڕەبیعی كوڕی ئەنەس وتی: دەبێت هەركەسێك شوێنی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كەوتووە بەوشێوەیە بانگی خەڵكی بكات كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) كردوویەتی، وە بەوشێوەیەش خەڵك بترسێنێت كە ئەو ترساندویەتی ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ﴾ ئێوە شایەتی دەدەن كە لەگەڵ خودا چەند خودایەكی تریش هەیە (ئەی بت پەرستەكان)؟ بڵێ: من شایەتی نادەم. وە لە ئایەتێكە تریشدا خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ﴾[3] ئەگەر ئەوان شایەتیان دا، تۆ شایەتی لەگەڵیان مەدە ﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ بڵێ: خودا هە ر یەكێكەو منله شەریكدانانی ئێوە دوورو بێزارم.

---

[1] فتح الباری (٢/٣٩٧).

[2] هود (١٧).

[3] الانعام (١٥٠).

**ئەهلی کتێب پێغەمبەر (ﷺ) دەناسن وەك چۆن فەرزەندەکانی خۆیان دەناسن**

خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ﴾ ئـەهلی کتێـب هەروەك کوڕەکانی خۆیان باش دەناسن، پێغەمبەریش (ﷺ) وادەناسن. پاشان خـودای گـەورە باسـی ئەهلی کتێب دەکاتو دەفەرمووێت: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەوەی تۆ پێی ڕەوانەکراوی ئەوانە دیزانن‌و شارەزان لێی وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن بەهۆی ئـەو دەنگو باسانەوە کە لـە پێغەمبەرە پێشووەکانەوە پێیان گەیشتووە، چونکە هەموو پێغەمبەرەکان موژدەیان داوە بە هـاتنی موحەممەد (ﷺ) وە باسی خوڕەوشت‌و شارەکەی‌و ئەو شوێنەی کە کۆچی بۆکردووەو وە باسـی خوڕەوشتی ئوممەتەکەشـی بـۆکردووە. هەربۆیـە دوای ئـەوە دەفـەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی خۆیان دۆڕاندووە بڕواناکەن. بەم فەرمانە ڕوون‌و ئاشکرایە کە پێغەمبەران (سەلامی خودایـان لێبێت) موژدەیان پێداوەو هـە ر لـە دێـر زەمانـەوەو ئێستاش مـەردومیان لـێ ئاگادارکردووە. پاشـان خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ﴾ کـێ لەوکەسـانە ستەمکارترن کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن یان بە نیشانەکانی خـودا باوەڕناکـەن؟ واتـە: کـەس لەوانە ستەمکاترنیە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستێت‌و بانگەشەشی بۆدەکات کە خـودا ڕەوانـەی کردووە، خوداش نەیناردووە وە کەسیش لەوانە ستەمکارترنیە کە بـڕوا بـە نیـشانەو بەڵگـەکانی خـودا ناکـات ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ دیـارە هەرکەسێك ستەمکاربێت ڕزگـاری نابێت. واتـە: ئـەم دووجـۆرە مەردومە ئەوانەی دەڵێن خودا ناردونی‌و درۆدەکەن‌و خودا نەیناردون‌و ئەوانەش کە بڕوا بە نیـشانەکانی خودا ناکەن لە هەمووکەس ستەمکارترن‌و هەرگیز ڕزگاریان نابێت.

﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن
قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْهُم مَّن
يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ
يُجَـٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ ۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ
أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾﴾

**بت پەرستەکان پرسیاریان لێدەکرێت لەسەر بت پەرستیەکەیان**

خـودای مـەزن باسـی بـت پەرسـتەکان دەکـات‌و دەفـەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ ڕۆژی قیامەت کە گشتیان کۆدەکەینەوە، بەوکەسانەی کە شەریکیان بۆ خودا دانابوو، بێجگە

لە خودا دەیانپەرستن لێیان دەپرسینو پێیان دەڵێن: ﴿أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ کوا ئەو شەریکانەی کە بە خەیاڵی خۆتان بە شەریکی خوداتان دانابوو. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە لە سورەتی قەسەس دا دەفەرموویت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾[١] ئەورۆژەی بانگیان دەکاتو دەفەرموویت: کوا شەریکەکانم وەك ئێوە خەیاڵتان دەکرد؟ خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ﴾ جا ئەوکاتە هیچ بیانویەکیان نامێنێت. عەتای خوراسانی وتی: کاتێك تووشی ئەو بەڵایە هاتن هیچ بیانویەکیان نامێنێت ﴿إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[٢] دەڵێن سوێند بە خودای پەروەردگارمان ئێمە هەرگیز هیچ شتێکمان نەکردووەتە شەریکی ئەو. خودای مەزنیش دەفەرموویت: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ بڕوانە چۆن درۆ لەگەڵ خۆشیان دەکەن، ئەو شتانەش کە ئەوان بە درۆ دەیانوت، لەناوچوونو لێیان ون بوون. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُواْ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾[٣] کوان ئەوانە دەتانوت: شەریکی خودان، بێجگە خودا دەڵێن: لەبەرچاومان ونن، خۆ ئێمە لە پێششدا (لە دونیادا) بێجگە خودامان نەدەپەرست، خودا ئاوا خودانەناسان گومڕادەکات.

### بەدبەخت بەهرە لە قورئان وەرناگرێت

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا﴾ کەسی وایان لەناودایە گوێت بۆدەگرێت، بەڵام ئێمە پەردەیەکمان بەسەر دڵیانداوە کە لێت تێنەگەن، گرانیشمان خستووەتەناو گوێیان کە (نەبیستن) و هەر نیشانەیەکیش ببینن باوەڕناکەن. واتە: دێن تا گوێ لە خوێندنی قورئان بگرن، بەڵام هیچ بەهرەیەکی لێ وەرنگرن چونکە خودا پەردەی بەسەر دڵیان کێشاوە هەتا لەو قورئانە شارەزانەبنو قورسیەکیشمان لەسەر گوێیان داناون تاکو بەهرە لە شتی باش وەرنەگرن، وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً﴾[٤]

---

[١] القصص (٦٢).

[٢] الطبری (١١/٢٩٩).

[٣] غافر (٧٣– ٧٤).

[٤] البقرة (١٧١).

وێنەی ئەوخودانەناسانە وەك وێنەی ئەو ئاژەڵانەیە كە دەنگ دەدرێ، جگە لە خورپین‌و چرپینێك هیچ نابیستن. ئەو خودانەناسانە هەرچەندە نیشانەو بەڵگە ببینن بڕوای پێناكەن، چونكە ئەوانە تێگەیشتنیان نیەودان بە هەق دانانێن. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ ﴾[1] ئەگەر خودا بیزانیایە خێرێكیان لەبارەدایە، كارێكی دەكرد ببیستن. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴾ كەسانی واش هەیە دێنەلات مشت‌ومڕت لەگەڵ دەكەن (لەسەر هەق بە شتی پڕوپوچ) ئەوانەی خودانەناسان دەڵێن: ئەمە جگە لە چیرۆكی پێشینان هیچی ترنیە. واتە: ئەمەی كە تۆ هێناوتە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) لە كتێبی پێشینە وەرگیراوەو هێنراوە ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ﴾ هەرئەوانە ڕێگەنادەن خەڵك بێتەلای‌و خۆشیان خۆیانی لێ دووردەگرن. واتە: ئەوانە ڕێگری لە مەردوم دەكەن كە شوێنی هەق بكەوێت‌و بڕوا بە پێغەمبەر بكەن‌و (ﷺ) گوێڕایەلی قورئان بن. ﴿وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ﴾ خۆشیان لێی دووردەكەونەوە، دوو ڕەوشتی ناشیرینیان تێدا كۆبووەتەوە. خۆیان بەهرەی لێ وەرناگرن‌و ڕێگەش نادەن خەڵك بەهرە وەرگرێت. عەلی كوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ خەڵكی دەگێڕنەوە لە موحەممەد (ﷺ) كە بڕوای پێ بێنن[2] موحەممەدی كوڕی حەنیفە وتی: خودانەناسانی قورەیش نەدەهاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگریشیان دەكرد لە خەڵكی كە بێت بۆلای[3] قەتادەوزحاك‌و موجاهیدو كەسانی تریش هەروایان وتووە[4] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾ ئەوكەسانە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكەن هەر خۆیان لەوناودەبەن. واتە: ئابەم كردارە خراپانە كە دەیكەن خۆیان تووشی لەناوچوون دەكەن‌و ئاكامەكەی هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە بەلام هەستی پێناكەن.

﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ

---

[1] الانفال (٢٣).

[2] الطبری (١١/٣١١).

[3] الطبری (١١/٣١١).

[4] الطبری (١١/٣١٢).

(٢٩) وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (٣٠) ﴾

## کاتی بینینی سزا ئاوات خواستن هیچ سودیکی نیه

خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ ئەگـەر بیـانبینی کـە لەسـەر لێـواری ئـاگر ڕاگیراون، خودای گەورە باسی ژیانی خودانەناسان دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا لـە کـەناری جەهەننـەم ڕادەگیرێنو ئەو هەموو کۆتو زنجیرەی کە لەناویـەتی لەگـەڵ ئـەو سـەختو ناڕەحەتیـەی کـە بەچاوی خۆیـان دەیبیـنن ئـا لەوکاتـەدا ﴿فَقَالُواْ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ دەڵـێن: خۆزگـە دیسان دەیانگێڕاینەوە، ئیتر بە نیشانەکانی پەروەردگارمان بڕوامان دەکردو ئێمەش لـەڕیزی بـڕواداران دەبـووین. واتـە: ئاواتـەخوازن کـە جـارێکی تـر بگەڕێنـەوە بـۆ ژیـانی دونیاتـان کـرداری چـاك بکـەنو نیشانەکانی خودا بە درۆ نەزاننو بچنەڕیزی خاوەن باوەڕانەوە. خودای مەزنیش دەفەرمووێت: ﴿بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ﴾ ڕاسـت ناکـەن، تـەنیا هـەر ئـەوەیان بـۆ ئاشـکرابوو کـە لەپێشدا لـە دڵـدا شاردبوویانەوە. واتـە: تـەنیا لەوێدا هـەر ئـەوەیان بـۆ ئاشـکرابووە کـە لـە دڵیانـدا شـاردبوویانەوە لـە خودانەناسیو لاساریو بێ دینی، ئەوە لـە دونیـادا بێـت یـان لـە ڕۆژی دوایـی وەکویەکـە وەك خـودای گـەورە کـەمێك لەمـەوپێش فـەرمووی: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ (٢٣) ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ پاشان هیچ بیانویەکیان بێجگە ئەوە کە بڵێن: سـوێند بە خـودا کـە پەروەردگارمانـە، ئێمـە هـەرگیز شـتێکمان نەکردووەتـە شـەریکی ئـەو، بڕوانـە چـۆن درۆ بەرامبەر خۆشیان دەکەنن ئەوشتانەش کە ئەوان بـەدرۆ دەیـانوت: لەناوچـوونو ون بـوون. هەڵدەگرێ ئەوانە ئەوەی کە لەناو دڵیان دەیانزانی دەرکـەوتبێت لـە ڕاسـتی ئەوپەیامـەی کـە پێغەمبـەران بۆیـان هێنان لە دونیادا، یا لە دونیادا وایان دەرخستبێت بۆ شوێنکەوتوەکانیان بە پێـچەوانەی ئـەوەوە. وەك ئەم ئایەتـە کـە خـودای گـەورە لـەبارەی مووسـاوە (سـەلامی خـودای لێبێـت) کـە وتـی بـە فیرعـەون، دەفـەرمووێت: ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ﴾[1] تـۆ خـۆت چـاك دەزانـی ئەم شتانە کەوا زەق لەبەرچاوتن هەر وەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەمـین ناردوویەتیـەخوارەوە. خـودای گەورە باسی فیرعەونو هۆزەکەی دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾[1]

[1] الاسراء (١٠٢).

وَعُلُوًّا﴾[1] هەرچەندە لە دڵی خۆیاندا هەموویان بەڕاست دەزانی بەڵام هەر بڕوایان بە نیشانەکانی نەکرد. بەڵام لەبارەی مانای (الاضراب)وە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ﴾ ڕاست ناکەن، تەنیا هەر ئەوەیان بۆ ئاشکرابوو کە لەپێشدا لە دڵدا شاردبوویانەوە. چونکە ئەوانە دوای گەڕانەوەیان بۆ دونیا لەبەرئەوە نەکردووە کە حەزو ئارەزوویان لە بڕواهێنانە بەڵکو لەترسی ئەو سزایەیە کە بەچاوی خۆیان بینیویانە، لەتۆڵەی ئەو خودانەناسیەی کە بەردەوام بوون لەسەری، داوای گەڕانەوەیان دەکرد تا لەوئاگرەی کە بینیان ڕزگاریان ببێت. بۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ﴾ ئەگەر بشگەڕاینەتەوە، ئەوکارانەی کە پێیان دەوترا مەیکەن، هەر دەیانکرد، ئەمانە هەر درۆزنن. لەوەی کە خۆزگەیان دەخواست بگەڕێنەوە تا باوەڕبێنن. وە لەوێشدا کە دەڵێن: ﴿يَـٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خۆزگە دیسان دەیانگێڕاینەوە، ئیتر بە نیشانەکانی پەروەردگارمان بڕوامان دەکردو ئێمەش لەڕیزی بڕواداران دەبووین. ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ وتیشیان: جگە لەم ژیانەی سەر دونیامان شتێکی ترنیەو ئێمە زیندوو نابینەوە. ئەگەر بشگەڕانایەوە ئەوەی پێیان دەوترا مەیکەن، هەر دەیانکرد دیسان دەیانوت: جگە لە ژیانەی دونیا نەبێت، هیچی ترنیە، جارێکی تر زیندووناکرێینەوە بۆیە دەیانوت: ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَـٰذَا بِٱلْحَقِّ﴾ ئەگەر بیانبینی لەوکاتەدا کە لەبەردەم پەروەردگاریان ڕاگیراون پێیان دەفەرموویت: ئایا ئەمەتان پێ ڕاست نەبوو؟ واتە: ئایا ئەم ڕۆژە قیامەتە بە ڕاست دەرنەچوو؟ ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ دەڵێن: سوێند بە پەروەردگارمان زۆر ڕاستە. ﴿قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ دەفەرموویت: دەئازار بچێژن بۆ ئەو خودانەناسیەی دەتانکرد ﴿أَفَسِحْرٌ هَـٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾[2] ئایا ئەمە جادووە یان کوێربوونەو نابینن؟

﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا۟ يَـٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾﴾

---

[1] النحل (١٤).
[2] الطور (١٥).

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ﴾ ئەوکەسانەی تووشی زیان بوون کە باوەڕیان نەدەکرد، دێنەبەر بارەگای خودا. خودای گەورە باسی زەرەرمەندی ئەوکەسانە دەکات کە بڕوایان نەبووەو دێنەبەر بارەگای خوداو داخ‌و خەفەت هەڵدەڕێژن کاتێك کە ڕۆژی قیامەت لەناکاو دێت بەسەریانداو پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن لە ڕۆچوونیان لەسەر ئەوکارە خراپ‌و ناشیرینانەی کە کردوویانە لە دونیادا، بۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا﴾ تا ئەوکاتەی لەپڕ قیامەتیان بەسەردا دێتدەڵێن: ئاخ‌و داخ ئێمە چەند کەمتەرخەمیمان کرد لە دونیادا، ئەوانە تاوانەکانیان هەڵدەگرن بە کۆڵیانەوەیە، ئەو زەمیرە (الضمیر) هەڵدەگرێ بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا، یان بۆ کردارەکان، یان بۆ ڕۆژی دوایی. واتە: کارەساتی ڕۆژی دوایی. ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ سا بزانە چەند بارەکەیان گران‌و نالەبارە. ئەسبات وتی: سوددی وتی: هیچ پیاوێکی ستەمکار نیە کە چووە گۆڕەکەی مەگین پیاوێکی دەم‌وچاو ناشیرینی ڕەش هەڵگەڕاوی بۆن پیس دێتەلای، جل‌و بەرگێکی پۆخڵ‌و پیسی لەبەردایە لەگەڵیدا دەچێتەناو گۆڕەکەی، کاتێك کە بینی، دەڵێت: چەند دەم‌و چاوت ناشیرینە ! (ئەویش) دەڵێ: هەر بەوشێوەیە کردارەکانت ناشیرین بوو. دەڵێت: چەند بۆنت پیسە ! دەڵێت: هەر بەوشێوەیە کردارەکانت بۆنی پیس بوو. دەڵێت: چەند جل‌وبەگەکەت پیسە ! دەڵێت: هەر بەوشێوەیە کردارەکانت پیس بوو. پێی دەڵێت: تۆ کێیی؟ دەڵێت: کردارەکانت. وتی: لەناو گۆڕەکەیدا لەگەڵ دەبێت، کاتێك ڕۆژی قیامەت زیندووکرایەوە پێی دەڵێت: من لە ژیانی دونیادا بە ئارەزو ڕابواردن هەڵم دەگرتی، تۆش ئەمڕۆ من هەڵدەگریت. وتی: سواری پشتی دەبێت دەیبات هەتا دەیخاتەناو ئاگر. خودای گەورەش دەفەرموویت: ﴿وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾[1] خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ ژیانی دونیا جگە لە گاڵتەوگەپ شتێکی تر نیەوماڵی ئەولا بۆ ئەوانەی لەخوداترس‌و خۆپارێزن زۆر چاکترە. دەی بۆچی دەبێت تێنەگەن؟

﴿قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٣٣ وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٣٤ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكَ إِعۡرَاضُهُمۡ فَإِنِ ٱسۡتَطَعۡتَ أَن تَبۡتَغِيَ نَفَقٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ سُلَّمٗا فِي

[1] الطبری (١١/٣٢٨).

ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍۢ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٣٥﴾ ۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ
يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾

**دڵنەوایی کردنی پێغەمبەر (ﷺ)**

خودای مەزن دڵنەوایی لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکات لەسەر بڕوانەکردنی هۆزەکەی‌و دژایەتی کردنی‌و دەفەرمووێت: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ﴾ ئێمە دەزانین ئەوقسانەی ئەوانە دەیکەن دەبێتەهۆی دڵتەنگیت. واتە: زۆر چاك ئاگادارین کە ئەوانە بڕوات پێناکەن. تۆش زۆر دڵگرانی‌و ئاخیان بۆ هەڵدەکێشیت، ئەم ئایەتە وەك ئەوئایەتانە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾[1] تۆ لەداخی ئەوان (ئەی موحەممەد(ﷺ)) خۆت لەناومەبە. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿لَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾[2] وەختە بەو خەمە خۆت لەناوبەریت. وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا﴾[3] ڕەنگە تۆ بۆ ئەوکەسانەی بڕوا بەم کتێبە ناکەن، خەمی وا بخۆیت خۆت لەناوبەریت. پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ خۆ ئەوانە تۆ بەدرۆناخەنەوە، لەڕاستیدا ئەو ستەمکارانە ئینکاری نیشانەکانی خودا دەکەن، بە هەموو شێوەیەك بەرەنگاری دەبنەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق بەسەرهاتێکی گێڕاوەتەوە لە زەهریەوە وتی: کاتێك ئەبو جەهل چوو گوێ بگرێت لە (قورئان) خوێندنی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی‌و ئەبوسوفیان سەخری کوڕی حەرب‌و ئەخنەسی کوڕی شەریق، هیچ کەسیان ئاگای لەوەی تریان نەبوو، هەتا بەیانی گوێیان لێ گرتووە هەتا بەرەبەیان ئەوسا هەڵساون‌و ڕۆیشتوون‌و لەڕێگەدا گەیشتوون بەیەك، هەریەکەیان لەوی پرسیووە چی تۆی هێناوە؟ هەرکەسەو باسی ئەوەی کردووە کە چی هێناویەتی، پاشان بەڵێنیان بە یەکتری داوە کە جارێکی تر نەیەنەوە، لەترسی ئەوەی نەوەکو لاوەکانی قورەیش پێیان بزانن. بە هاتنی ئەوان سەریان لێ بشێوێت. لە شەوی دووەمدا هەرسێکیان دێنەوە، هەریەکەیان وایدەزانی دووهاوەڵەکەی نەهاتوون لەبەر ئەو بەڵێنەی لەپێشدا دابوویان، کاتێك کە ڕۆژیان لێ بووەوە لە ڕێگادا بەیەك گەیشتن، سەرزەنشتی خۆیان کردو پاشان بەڵێنیان دا کە نەیەنەوە. لە شەوی سێیەمدا دیسان هاتنەوە کاتێك کە بەیانی گەڕانەوە بەڵێنیان دا کە جارێکی تر شتی وا دووبارە

---

[1] فاطر (٨).

[2] الشعراء (٣).

[3] الكهف (٦).

نەکەنەوە، پاشان لە یەکتری جیابوونەوە. ئەو بەیانیە ئەخنەسی کوڕی شەریق گۆچانەکەی هەڵگرتو پاشان چوو بۆلای ئەبوسوفیان لە ماڵەوە، پێی وت: ئەبو حەنزەلە (حنضلة) تۆ ڕات چیە لەوەی کە بیستووتە لە موحەممەد؟ وتی: ئەبو سەعلەبە، سوێند بە خودا شتی وام لێ بیستووە دەزانمو دەشزانم مەبەست چیە پێی، شتی واشم گوێ لێ بووە ماناکەی نازانمو نازانم مەبەست چیە پێی. ئەخنەس وتی: سوێند بەوەی تۆ سوێندت پێ خوارد منیش هەروام. پاشان لەلای هەستاو ڕۆیشت بۆلای ئەبوجەهل. چووەلای لە ماڵەوە وتی: ئەبوحەکەم ڕات چیە لەوەی کە بیستووتە لە موحەممەد؟ وتی: چیم بیستووە؟ وتی: ئێمەو نەوەی ڕکەبەریمان بووە لەسەر ڕێزو شانازی بەخۆکردنەوە، ئەوان دەیانبەخشیو‌ئێمەش دەمانبەخشی، ئەوان تووشی نارەحەتی هاتوونو ئێمەش هەر تووشی هاتووین، ئەوان خواردنیان داوە بە خەڵك و ئێمەش خواردنمان داوە بە خەڵك هەتا کاتێك بە ئەژنۆدا کەوتین هەر پێش پێشێنمان کردووە لەسەر ئەوشتانەی کە جێی ڕێزلێنان بووە، (ئێستاش) دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرمان هەیە لە ئاسمانەوە نیگای بۆدێت، کەی ئێمە بەمە دەگەین؟ واتە: ئێمە ناتوانین ئەمە بەدەست بێنین، سوێند بەخودا هەرگیز بڕوای پێ ناکەینو بە ڕاستی دانانێینو نایسەلمێنیت. وتی: ئەخنەس لەلای هەستاو بەجێی هێشت[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا﴾ زۆر لە پێغەمبەرانی پێش تۆ (هەروەك ئێستەی تۆ) بە درۆزن ژمێردرانو وێڕای بڕوا پێ نەکرانو ئازاردانیشی هەر خۆڕاگر مانەوە. هەتا یارمەتی ئێمەیان پێ گەیشت. ئەمە دڵدانەوەو سەرلێخۆش کردنێك بوو لەسەر ئەو بڕوانەهێنانەی گەلەکەیو فەرمان پێ کردنی بە خۆڕاگری وەك چۆن پێغەمبەرە لێبڕاوە نەبەزەکان(أولوالعزم) خۆیان ڕاگرت بەڵێنی سەرکەوتنیشی بەمە داوەك ئەوانی سەرسەختو زاڵی کردنو پاشەڕۆژیش هەر بۆ ئەوان بوو دوای بڕوانەهێنانو تووش هاتنی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجە زۆرە، لە دونیا یارمەتی درانو لە ڕۆژی قیامەتیشدا سەرکەوتن هەر بۆ ئەوانە. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڵێنی خوداش بە هیچ کەسێك ناگۆڕێت چونکە خۆی بەڵێنی سەرکەوتنی داوە بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی لە دونیاو لە قیامەتدا. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ﴾[2] بێگومان پێشتر بەڵێنمان دا بە عەبدە ڕەوانەکراوەکانمان، کە هەر ئەوان یارمەتی دەدرێن. دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەردەکەوێت. وە دەفەرمووێت: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ

---

[1] ابن هیشام (١/٣٣٧) فەرموودەیەکی مورسەلە.

[2] الصافات (١٧١- ١٧٣).

قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾[1] خـودا خـۆی بڕیـاری داوە: بێگومـان مـنو پێغەمبـەرەکانم خـودا (خـاوەن) توانـای بـە دەسـتـەڵاتە. لێـرەدا دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِي۟ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ دیـارە تـۆ دەنـگو باسـی پێغەمبەرانت زانیوە، کە چۆن یارمەتی درانو سەرکەوتن بەسەر ئەوانـەی کـە لـە هۆزەکەیانـدا بڕوایـان پیێ نەدەکرد، تۆش چاو لەوانەبکەو بەڕێگەکەی ئەواندا برۆ. پاشان خودای مەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكَ إِعۡرَاضُهُمۡ﴾ ئەگەر تۆ بەلاتەوە گرانە کە بە دەنگتەوە نەهاتوون ﴿فَإِنِ ٱسۡتَطَعۡتَ أَن تَبۡتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ سا ئەگەر لەتوانایدایە تونێلێك لەم زەمینەدا هەڵکۆڵێت یـان پەیـژەیك کە پێیدا سەرکەوێت بۆ ئاسمـان. عـەلی کوڕی ئەبوتەلحـە لـە ئیبنـو عەبباسـەوە وتـی: (النفق) واتـە: تونێـلێ، بەوتونێڵەیـددا بـڕۆی ﴿فَتَأۡتِيَهُم بِـَٔايَةٍ﴾ بەڵگەیـەك بـۆ ئەمانـە بـێنی یـان ئەگـەر لەتواناتدایـە پەیژەیەك بێنیت سەرکەویت پێیدا بەڵگەیەکیان بۆ بێنیت لەم بەڵگەی من چاکتربێت کە من بۆم هێناون بۆیان بێنە[2] قەتادەو سوددیو کەسانی تریش هە ر وایان وتووە[3] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمۡ عَلَى ٱلۡهُدَىٰۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە، هـەموویانی شـارەزای ڕاستەڕێ دەکرد، ئیتر نابێت تۆ لەڕێزی نەزانان بیت. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا﴾[4] ئەگـەر خـودا مـەیلی لـێ بووایـە، هەرچی لەم زەمینەدایە تێکڕا باوەڕیـان دەهێنـا. عـەلی کوڕی ئەبوتەلحـە لـە ئیبنـو عەبباسـەوە لـەم ئایەتـەدا ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمۡ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ وتـی: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) زۆر بەتەنگەوەبوو کـە هەموو خەڵکی بڕوابێننو شوێنی بکەون لەسەر ڕاستەڕێ بڕون. خودای گەورەش ئاگاداری کردووە، کە جگە لەوانەی کە خودا لەپێشدا لە کتێبی یەکەمدا بـە بەختـەوەر باسـی کـردووە، باوەڕنـاهێنن.[5] ﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَ﴾ هەر ئەوانە گوێت لـێ دەگرن کە دەبیسـتن. واتـە: بێگومـان ئەوانـە گـوێ بـۆ بانگەوازەکەت دەگرن. وەك لەم ئایەتـەی تـردا کە خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا

---

[1] المجادلة (٢١).

[2] الطبري (١١/٣٣٨).

[3] الطبري (١١/٣٣٨).

[4] يونس (٩٩).

[5] الطبري (١١/٣٤٠).

وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾[1] ئەوانەی بەدڵ زیندوون لە خودایان بترسێنێتو قسەی خودا دەربارەی خودانەناسان بەجێ بگات. وە دەفەرموویت: ﴿وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ مردووەکانیش خودا زیندوویان دەکاتەوەو پاشان بۆلای خۆی دەگەڕێتەوە. مەبەست پێی خودانەناسانە چونکە ئەوانە دڵیان مردووە، بۆیە خودا وەك لاشەی مردوو ناوی هێناون. خودای مەزن کە دەفەرموویت: ﴿وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ ئەمە لەشێوەی گاڵتەو سوکایەتی پێکردنو بەسەردا خورینە.

﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾﴾

## بت پەرستان داوای نیشانە دەکەن

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ دەڵێن: بۆچی نیشانەیەکی لەیەن پەروەردگاریەوە بۆ نەهاتووەتەخوارەوە. واتە: شتێکی دەرئاسا (غەیرە سروشتی) بەوشێوەیەی ئەوان دەیانەوێت داوای دەکەن وەك خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴾[2] وتیان: بڕوات پێ ناهێنین تا لەم زەمینەدا کانیەکمان بۆ هەڵدەقوڵێنیت ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بڵێ: خودا توانای هەیە هەر نیشانەیەك (خودا مەیلی لێبێت) بینێرێت، بەڵام ئەوانە زۆربەیان نەزانن. واتە: هەر خودا خۆی توانای هەیە، بەڵام لەکارزانی خودا خۆیەتی ئەو شتە دوادەخات، ئەگەر ئەو نیشانانە بنێرێت بەپێ داوای خەڵك دوای ئەوەی کە بڕوانەهێنن، زۆر سزایان دەدات، وەك چۆن سزای گەلەپێشووەکانیدا. وەك خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾[3] ئێمە کە نیشانەکانمان نەدەنارد، هەر بۆ ئەوەبوو پێشینەکان بە درۆیان دەزانی. وشترێشمان بە ئاشکرا دا بە سەموود، کەچی ناهەقیان لەگەڵ کرد،

---

[1] یس (٧٠).

[2] الاسراء (٩٠).

[3] الاسراء (٥٩).

ئێمە هەر بۆ ترس وەبەرنان نیشانەکان دەنێرین. وە دەفەرموویت: ﴿إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَـٰقُهُمْ لَهَا خَـٰضِعِينَ﴾[1] ئەگەر ئێمە مەیلمان لێبێت نیشانەیەکیان لە ئاسمانەوە بۆ دەنێرین کە ملیان لەبەری کەچ بکەن.

## مەبەست بە ئوممەت چیە

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَـٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ هەر زیندەوەرێك لە زەویدا دەگەڕێتو هەر مەلێك بەباڵ دەفرێت هەموویان کۆمەڵانێکی وەك ئێوەن. موجاهید وتی: ﴿أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ واتە: کۆمەڵێکن وەك ئێوە، هەر کۆمەڵەو بەناوی خۆی ناسراوە[2] قەتادە وتی: مرۆڤ کۆمەڵێکن، جنۆکە کۆمەڵێکن[3] سوددی وتی: ﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ واتە: دروستکراوێکی وەك ئێوە.[4] ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن شَىْءٍ﴾ ئێمە لەناو ئەم کتێبەدا هیچ شتێکمان لەبیرنەچووە. واتە: هەموزانیاریەکەیان لەلای خودایە، هیچێك لەو کۆمەڵانەی لەبیرناچێت لە ڕۆزیو بەڕێوەبردنیان لە زەوی یان لە دەریادا وەك یەك ئاگای لێیانە وەگ دەفەرموویت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِى كِتَـٰبٍ مُّبِينٍ﴾[5] لەم زەمینە هەرشتێك دەجولێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خودایە، دەزانێت بنکەی لەکوێیەو لە کێدا خۆی حەشارداوە. هەمووی لە نوسراوی دیاریدایە (اللوح المحفوظ). واتە: ناوەکانیانو ژمارەیانو جێو شوێنیانی دیاری کردووە، ئاگای لە جوڵەجوڵو جێو شوێنیانە. وە لە ئایەتێکی تردا خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾[6] زۆر گیانلەبەر هەن ڕۆزی بۆ خۆیان هەڵناگرن، خودا بەوانو بە ئێوەش ڕۆزی دەدات هەر ئەوە بیسەرو زانایە. پاشان لێرەدا دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمانە گشتی لەلای پەروەردگاری خۆیان کۆدەکرێنەوە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ وتی: (حشر

---

[1] الشعراء (٤).

[2] الطبری (١١/٣٤٥).

[3] الطبری (١١/٣٤٥).

[4] الطبری (١١/٣٤٥).

[5] هود (٦).

[6] العنكبوت (٦٠).

واتە: مردن وتراویشە: (حشرها) واتە: ڕۆژی زیندووکردنەوەی کە ڕۆژی قیامەتە. وەك خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ﴾[1] هەرکاتێك گیانلەبەرانی کێوی کۆکرانەوە. عەبدورەزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە لەم ئایەتەدا ﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ﴾ وتی: خەڵکی هەموو کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا زیندەوەرو ئەوەی دەڕوات بە زەویداو باڵدارو گشت شتێك کۆدەکرێنەوە، دادپەروەری خودا لەوڕۆژەدا بەو ئەندازەیە، هەقی گیانلەبەری شاخدار بەسەر کوڵەوە (بێ شاخەوە) ناهێڵێتو پاشان دەفەرموویت: ببنەوە بە خۆڵ. ئا لەوڕۆژەدا خودانەناس دەڵێت: ﴿يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا﴾[2] ئای خۆزگە گڵ بوومایە[3].

### خودانەناس کەڕو لاڵەو لە تاریکیدا خوول دەخوات

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمّٞ وَبُكۡمٞ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ﴾ ئەوکەسانەی نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی، کەڕو لاڵنو لە تاریکیدا خوول دەخۆن. واتە: وێنەیان لە نەفامیو نەزانیو بێ ئاوەزیدا وەك کەڕێك وایە کە هیچ نەبیستێتو لاڵێك کە هیچ قسەنەکات لەگەڵ ئەوەشدا لە تاریکستانێکدابێت هیچ نەبینێت. ئەمە چۆن ڕاستەڕێ دەگرێتەبەر یان ئەوەی کە تێی کەوتووە لێی دێتەدەر وەك خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ۝١٧ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾[4] ئەمانە بەوێنەی کەسانێك چوون، کە خەریکی هەڵکردنی ئاگرێك بوون، هەر کە ڕۆشنایی ئاگر دەوروبەری ڕۆشن کردن، خودا ڕووناکیەکەی بردنو لە تاریکاییەکی وادا وێڵی کردن هیچ ڕووناکیەکیان نەدەبینی، کەڕن، کوێرن، لاڵن، ناتوانن بگەڕێنەوە. وە لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموویت: ﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾[5] یان وەك لە تاریکستانێك لە زەریایەکی بێ پەیدا شەپۆل لەسەر شەپۆل دایپۆشێت لەلای ژوورشی هەوربێت، تاریکایی لەسەر تاریکایی هەرکاتێك دەستی خۆی دەرخات لەوانەیە هەر

---

[1] التكوير (٥).

[2] النبأ (٤٠).

[3] الطبري (١١/٣٤٧).

[4] البقرة (١٧– ١٨).

[5] النور (٤٠).

نەیبینێت، هەرکەسێك خودا ڕووناکی نیشان نەدات هیچ ڕووناکیەکی دەست ناکەوێت. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ کەسێك خودا بیەوێت گومڕای بکات دەیکاتو کەسێکیش بیوێت بیخاتەسەر ڕاستەڕێ دەیخات. بە مەیلی خۆی هەرچی خۆی بیەوێت دەیکاتو کاروباری دروستکراوەکانی لەژێردەستی خۆیدایە.

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾

**بەڵگەهێنانەوە لەسەر بت پەرستان کە لەکاتی سزادا تەنیا داوا لە خودا دەکەن**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ بلێ: ئەگەر خودا بەڵایەکتان بۆ بنێرێت یان ڕۆژی قیامەتتان بەسەردا بێنێت ئایا ئەوکاتە جگە لەخودا هاناتان بۆکەسی تر دەبەن؟ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن (ڕاستی بڵێن) خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەر خۆی ئارەزووی لە هەرشتێك ببێت دەیکاتو دەستەڵاتدارە بەسەر دروستکراوەکانیداو کەس بۆی نیە دەست بخاتە کاریو هیچ فەرمانێك لەبارەی دروستکراوەکانیەوە بگۆڕێت، بەڵکو خودا تاکو تەنیایەو شەریکی نیەو داوای لێ بکرێت بۆ کەسێك مەیلی لێبێت داواکەی لێ وەردەگرێت. واتە: جگە لە خودا داوا لەکەس مەکەن کە دەزانن ئەونەبێت کەسی تر ناتوانێت ئەو سزایەتان لەسەر لاببات. هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ﴾ نەخێر، ئەوسا هەر هانا بۆ خودا دەبەن، ئەگەر خودا خۆی مەیلی لێبێت بەڵاتان لەسەر لادەباتو ئەوشتانەتان لەبیردەچێتەوە کە (ئێستا) بە شەریکی خودایان دەزانن، واتە: لەکاتی تەنگانەدا جگە لە خودا هانا بۆ هیچ کەسێکی تر نابەنو بتەکانو ئەوانەی کردبوتان بە شەریکی خودا بەجێتان دەهێڵنو دەڕۆن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ

إِلَّآ إِيَّاهُ﴾[1] هەرکاتێك لەناو دەریادا تووشی ناڕەحەتیەك هاتن، هەموو ئەوانەی کە هاواریان لێ دەکەن ون دەبن جگە لە خودا. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ﴾ ئێمە بۆ سەر هەر گەلانێك لە گەلانی پێشوتر (پێغەمبەرمان) ڕەوانکردووە، تووشی هەژاریو تەنگانەو دەست کورتیو نەخۆشیو ئێشوئازار کردووە بۆئەوەی لێمان بلاڵێنەوەو گەردنکەچ بکەن. وە دفەرمووێت: ﴿فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟﴾ دەبێت بۆچی کە بەلاشمان بەسەرهێنان لەبەرمان نەپاڕانەوە؟ واتە: دەبووایە کە تووشی ئەو نەخۆشیو هەژاریەمان کردن هانایان بهێنایەو لێمان بپاڕایەنەتەوە ﴿وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ بەلام(لەجیاتی ئەوەی دڵیان داچلەکەتێتو نەرم بێت) ڕەق بوو. ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ شەیتانیش کارەکانی وا لەبەر ڕازاندبوونەوە لەسەر خودانەناسیو لاساریو تاوانباری خۆیان هەر بەردەوام بوون ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ﴾ کاتێك ئەو هەموو ئامۆژگاریانەیان (کرا) لەبیریان چوو، واتە: پشگوێیان خستو لەبیرخۆیان بردەوە، وەك ئەوەی هەر نەیان بیستبێت ﴿فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟﴾ دەرگای بەختەوەریمان گشتی بۆ کردنەوە هەتا کەوتنە خۆشیو شادیو لە هیچ شتێك کەمیان نەبوو، ئەمەش مۆڵەتدانو دەست لێ شلکردنێك بوو لەلایەن خوداوە، پەنادەگرین بە خودا لە پلانو نەخشەکانی. هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ ئەوسا لەپڕو ناکاوێك بەرتوڕەیی خۆمان خستنو هەموو بێ هیوا مانەوە لە هەموو چاکەیەك والیبی لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: (مبلس) واتە: بێ هیوا. حەسەنی بەسری وتی: هەرکەسێك خودا دەرووی لێ کردبێتەوەو وای نەزانی کە خودا تاقی دەکاتەوەو پلانو نەخشەی بۆداناوە، ئەوکەسە بۆچوونو تێڕوانینی نیە. وە هەرکەسێك نەداری ڕووی تێکردو وای نەزانی کە خودا تاقی دەکاتەوە، ئەوکەسە بۆچوونو تێڕوانینی نیە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە پلانو نەخشەیە (خودا) بۆ ئەمانەی داناوە، پێویستیەکانیان پێدراوە پاشان لێیان وەرگیراوەتەوەو تۆڵەیان لێ سەندراوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە[2] ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾

---

[1] الاسراء (٦٧).

[2] الدر المنثور (٣/٢٧٠)، ابن أبي حاتم (٤/١٢٩١).

ئیتر ئەوکەسانەی کە پیشەیان هەر ناهەقی بوو، دوابڕاو بوونو سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری هەموو دونیا.

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغۡتَةً أَوۡ جَهۡرَةً هَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۖ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلۡعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٤٩﴾﴾

خودای مەزن دەفەرموویت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿قُلۡ﴾ بلێ: بەو خودانەناسە یاخیانە ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ﴾ پێم بڵێن ئەگەر خودا هەستی گوێو سۆمای چاوتان لێ بسێنێت، وەك چۆن پێی دان ئاواش لێتان بسێنێتەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ﴾[1] ئەوە (خودا) کە ئێوەی وەدیهێناوەو گوێو چاوو دڵی دانێ. هەڵدەگرێت مەبەست پێی وەرنەگرتنی سودبێت لێیان، سودی دینی. بۆیە دەفەرموویت: ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ لەسەر دڵەکانیشتان مۆر دابنێت. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ﴾[2] یان خاوەنی ئەم گوێو چاوانەتان پێیە؟ وە دەفەرموویت: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ﴾[3] بزانن خودا دەبێتە لەمپەر لەنێوان مرۆڤو دڵیدا. پاشان دەفەرموویت: ﴿مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِ﴾ کێ دەتوانێت جگە لە خودا بتانداتەوە. ئەگەر لێی سەندنەوە، کەس ناتوانێت خودا خۆی نەبێت پێتان بداتەوە. بۆیە دەفەرموویت: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ دەبڕوانە ئێمە چۆن نیشانەکان بۆ ئەوان شی دەکەینەوە. واتە: زۆر بەچاکی نیشانەکان ڕوونو ئاشکراو شی دەکەینەوە کە هەموو بەڵگەن لەسەرئەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بشێت بۆ پەرستن جگە لە خودا. ئەوشتانەی بێجگە لە خودا دەیپەرستن هەموو پڕوپوچو سەرلێشێوان نەبێت شتێکی ترنیە ﴿ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ﴾ هێشتا هەر خۆیانی لێ لادەدەنو پشتی تێ دەکەن دوای ئەم ڕوونکردنەوەیەو دەبنە لەمپەر لەڕێی

---

[1] الملك (٢٣).

[2] يونس (٣١).

[3] الانفال (٢٤).

خەڵکدا کە شوێنی بکەوێت. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً﴾ بلێ: بە من بڵێن: ئەگەر بەڵای خودا لەپڕێكو ئاگاتان لەخۆتان نەبێت بدات بەسەرتاندا ﴿أَوْ جَهْرَةً﴾ یان بەشێوەیەکی ئاشکرا ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ جیا لەوانەی کە ناهەقی دەکەن کێ قڕدەبێتو تێدادەچێت؟ واتە: تەنیا ئەوستەمکارانە لەناودەچن کە شەریك بۆ خودا دادەنێن ئەوانەی خودایان پەرستووەو شەریکیان بۆ دانەناوە ڕزگاریان دەبێتو هیچ خەمو خەفەتێکیان نیە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾[1] ئەوکەسانەی بڕوایان بەخودا هێناوەو بڕواکەیان تێکەڵی ناهەقی نەکردووە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ هەر پێغەمبەرێك دەنێرین پێی دەسپێرین کە مژدەدەرو ترسێنەربێت. واتە: مژدەبدەن بە عەبدە خاوەن باوەڕەکان بە چاکەو ترسێنەریش بن بۆ خودانەناسان بە تۆڵەی گرانو بەڵای سەخت. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ﴾ هەرکەسێك بڕوای هێناو ئاکارچاك بوو. واتە: بە دڵ بڕوای هێنا بەوەی کە پێغەمبەران هێناویانەو ئاکاری چاکیشی کرد بەشوێنکەوتنیان ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە هیچ ترسی لەسەرەو نە هیچ خەمێکی دێتەبەر. واتە: لەبارەی ئەوشتانەوە کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوەو ئەوشتانەش کە لە دونیادا بەجێیان هێشتووەو لە دەستیان چووەو ماوەتەوە، خودا خۆی ئاگای لەوشتانەیە کە لە دوایان بەجێماوەو دەیپارێزێت بۆیان. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ ئەوانەی نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دادەنا لە سزای ئەو نافەرمانیە گرفتاری ئازاردەبن، واتە: تووشی سزادەبن بەهۆی بڕوانەکردنیان بەوپەیامانەی کە پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێبێت) بۆیان هێنانو دەرچوونیان لە فەرمانو گوێڕایەڵی خوداو هەستانیان بە شکاندنی ئەو سنورانەی کە خودا قەدەغەی کردبوو لێیان.

﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

[1] الانعام (٨٢).

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ
(٥٣) وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ
عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٥٤) ﴾

**پێغەمبەر (ﷺ) خاوەنی گەنجینەکانی خودانیەو شتی نادیاریش نازانێت**

خودای مەزن دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: من بە ئێوەم نەوتووە خاوەنی گەنجینەکانی خودا منم نەشم وتووە لە نهێنیەکانیشی ئاگادارم. بۆشم نیە دەست لەوکارانە بدەم چونکە ئەوانە پەیوەندی خودای گەورەوەیە، هەرشتێك خودا ئاگادارم نەکات من هیچی لێ نازانم ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ﴾ پێشم نەوتوون کە من فریشتەم. بەڵکو ئادەمیەکم لە ئادەمیەکانو نیگام بۆ دەکرێت لەلای خودای مەزنەوە بەو نیگایە رێزی لێ گرتووم کردوویەتیە بەهرەیەك بەسەرمەوە هەربۆیە دەفەرموێت: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴾ تەنها من شوێنکەوتەی ئەوەم کە خودا پێی راگەیاندووم. بستێكو کەمتر لە بستێکیش لێی دەرناچم ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾ ئایا کوێرو چاوساغ وەك یەکن؟ واتە: ئەوەی شوێنی هەق کەوتوەو شارەزاکراوە لێیو ئەوەش کە ئەو رێگەیەی ون کردووەو گومرابووە وەك یەکن؟ ﴿أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴾ دەی بۆچی بیرناکەنەوە؟ ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[1] ئایا کەسێك بڕوای وابێت ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتووەتەخوارەوە هەمووی راستە، وەك ئەوکەسەیە کە کوێربێت. ئەم بیرکردنەوەیە (تێرامانە) هەر بۆ خاوەن ئاوەزانە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ ﴾بەم قورئانە تۆ ئەوانە بترسێنە، کە لەرۆژی کۆبوونەوە لەبارەگای پەروەردگاریان دەترسنو جگە لەو نە دۆستیان هەیەو نە تکاکار. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بەم قورئانە ئەوکەسانە بترسێنە، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴾[2] کە

---

[1] الرعد (١٩).

[2] المؤمنون (٥٧).

لەترسی پەروەردگاریان تووشی لێوە لەرزێ دەبن ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ﴾[1] وە لە پەروەردگاریان دەترسنو لە خراپەو سەختی لێپرسینەوە دەترسن. واتە: ئەوکەسانەی کە دەترسن لە ڕۆژی قیامەت لەبەردەم پەروەردگاریاندا کۆبکرێنەوە، جگە لە خودا هیچ کەسێك نیە هاناو لاڵەی لابکرێتو لە سزای خودا ڕزگاریان بکاتو ئەگەر مەیلی لێبێت سزایان بدات. بەو قورئانە بترسێنە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو لە خودا ترسن. واتە: لەم ڕۆژە بیانترسێنە کە هیچ دەستەلاتدارێکی تێدانیە جگە لە خودای مەزن. تا کاربکەن بۆ ئەوڕۆژە بەشێوەیەکی وا کە خودا لە سزای خۆی ڕزگاریان بکاتو بەچەندین جار پاداشتی گەورەیان بداتەوە لەسەر ئەوکارەیان.

**ڕێگەنەدان بە پێغەمبەر (ﷺ) کە هاوەڵە کەم دەستو هەژارەکان دەربکات لەدەوری خۆی، فەرمان پێدانی بە ڕێزلێنانیان کاتی هاتنیان بۆلای**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ ئەوکەسانە دەرمەکە هەموو شەوێكو ئێواران هانادەبەنەبەر پەروەردگاریان بۆ ڕەزامەندی ئەو هەوڵدەدەنو خۆیان ماندودەکەن. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەو هەژارو لاوازانە لەخۆت دوورمەخەرەوە، بەڵکو بیانکە بە هاودەمو کەسەنزیکەکانی خۆت. وەك خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾[2] هەر تۆ لەگەڵ ئەوانەبە بەیانیانو ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو تەنیا ڕەزای ئەویان دەوێتو چاو لەوانە وەرمەگێڕە بۆ ژیری پڕ زەرقو بەرقی ئەم دونیایە، گوێ لەکەسێك مەگرە کە نەمانهێشت دڵی یادی ئێمە بکاتو لە هەرشوێنێك ئارەزووی خۆیو کاری لەڕادەدەرچوون کەوتووە. ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾ واتە: خەریکی خوداپەرستینو لە خودا دەپاڕێنەوە. ﴿بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ﴾ سەعیدی کوڕی موسیب موجاهیدو حەسەنو قەتادە وتیان: مەبەست پێی نوێژە فەرزەکانە. ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾[3] پەروەردگارتان فەرموویەتی: لیم بپاڕێنەوە بەدەنگتانەوە دێم. واتە: داواکەتان لێ وەردەگرم ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ واتە: مەبەستیان

---

[1] الرعد (٢١).

[2] الكهف (٢٨).

[3] غافر (٦٠).

بەوکارانەیە تەنیا ڕەزامەندی خودای گەورەیەو زۆر بە دڵسۆزیەوە ئەو عیبادەتو خوداپەرستیە دەکەن ﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ﴾ تۆ هیچ کارت بەسەر کاری ئەوانەوە نەبێت ئەوانیش هیچ کاریان بەسەر تۆوە نیە. وەك نووح (سەلامی خودای لێبێت) لە وەڵامی ئەوکەسانەدا وتی: کاتێك کە پێیانوت: ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ﴾[1] وتیان: چۆن بڕوات پێدەکەین؟تۆ هەر هەژارو نەدارەکان شوێنت کەوتوون. وتی: من چوزام ئەوان لەپێشدا چیان دەکرد؟ لێپرسینەوەیان تەنیا لەسەر پەروەردگارمە ئەگەر بزانن‌و تێبگەن. واتە: لێپرسینەوەیان لەلای خودای مەزنەو من هیچ کارێکم بەسەر ئەوانەوە نیە وەك چۆن ئەوان هیچ پەیوەندیەکیان بەسەر منەوە نیە. ﴿فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەگەر تۆ ئەمانە دەربکەیت، غەدرێکە لە خۆتی دەکەی. ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ ئێمە ئاوا دەمانەوێت هەندێك لەوان بە هەندێکیان تاقی بکەینەوە. واتە: بە یەکتری تاقیمان کردنەوە ﴿لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا﴾ هەتا بڵێن: چۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی بەر چاکەی خۆی خستووە. چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) زۆربەی شوێنکەوتووەکانی لەسەرەتای هاتنیەوە لە کەسە هەژارو کەم دەستەکان بوون لە ژنان‌و پیاوان‌و بەندەو کەنیزەك. لە پیاوە گەورەکان شوێنی نەکەوتن چەندکەسێك نەبێت. وەك چۆن هۆزەکەی نووح بە نووحیان وت: ﴿مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾[2] وەك ئێمە دەت بینین ئەمانە شوێنی تۆ کەوتوون‌و هەژارو کەم دەست‌و بێ ئاوەزن. وەك چۆن هیرەقل پاشای ڕۆمەکان پرسیاری کرد لە ئەبوسوفیان لەوپرسیارانەی کە لێی دەکرد پێی وت: ئایا پیاوە گەورەکان شوێنی دەکەون یان هەژارو کەم دەستەکان لە خەڵکی؟ ئەبوسوفیان وتی: هەژارو کەم دەستەکان. وتی: ئەوانەی شوێنکەوتەی پێغەمبەرانن، مەبەست ئەوەیە بت پەرستەکانی قورەیش گاڵتەیان دەکرد بەوکەسانەی بڕوایان هێنابوو لە هەژارەکانیان‌و دەستەڵاتیان بەسەر هەرکەسێکیان دا ببووایە ئازاریان دەداو دەیانوت: ﴿أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا﴾ چۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی بەر چاکەی خۆی خستووە. واتە: خودا ئەمانەی شارەزانەکردووە بۆ چاکە ئەگەر وابووایە ئەمان پێشی ئێمە

---

[1] الشعراء (١١١– ١١٣)

[2] هود (٢٧).

نەدەکەوتن لە چاکەداو ئێمەی وازلێ نەدەهێنا. وەك وتیان: ﴿لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ﴾[1] ئەگەر هیچ شتێکی باشی تێدابووایە، پێش لە ئێمە بۆی نەدەچوون وەك لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾[2] هەرکاتێك نیشانە دیارەکانی ئێمەیان بۆ دەخوێندرێتەوە خودانەناسان بە خاوەن باوەڕان دەڵێن: کام لا ماڵی خۆشترەو دیوەخانی لەبارترە؟ خودای گەورەش لە وەڵامی ئەوەدا دەفەرمووێت: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا﴾[3] ئای کە چەند بەرەمان لەپێش ئەوانەدا لەناوبرد کە لەوانە کەلوپەلی ناوماڵیان ڕێکترو بە دیمەن لەمان جوانتربوون. خودای گەورە لە وەڵامی ئەمانەدا کە وتیان: ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ﴾ دەفەرمووێت: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ﴾ ئایا خودا لەوان باشتر سوپازگوزاران ناناسێت؟ کە بە گوفتارو دڵو دەروونیان شوکرانەبژێرن، هەربۆیە یارمەتیان دەدات شارەزایان دەکات بۆ سەر ڕێگای بەختەوەریو لە تاریکایی دەریان دێنێت بۆ ڕووناکی بە ئیزنی خۆی دەیانخاتەسەر ڕاستەڕێ. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾[4] ئەوانەی لەڕێگەی ئێمەدا چوونە غەزا، ئێمەش ئەوانە بەڕێگەی خۆمان دەبەینبێگومان خودا لەگەڵ چاکەکارانە. وە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە: (بێگومان خودا نەسەیری ڕوخسارتان دەکاتو نەسەیری ڕەنگتان دەکات، بەڵکو سەیری دڵتانو کارەکانتان دەکات)[5]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ﴾ کاتێك ئەوانە دێنەلات کە بە نیشانەکانی ئێمە بڕوادارن پێیان بڵێ: دڵنیاین. واتە: ڕێزیان لێ بگرەو وەڵامی سڵاوەکەیان بدەوەو مژدەشیا بدەرێ بە سۆزو بەزەیی فراونی خودا بۆیان. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ پەروەردگارتان هەر خۆی لەسەر خۆی نوسیووە بەر بەزەیی خۆیتان بخات. واتە: لەسەر خۆی داناوە وەك ڕێزلێنانو چاکەو منەتکردنی بەسەرتاندا کە بەر بەزەیی خۆیتان بخات. ﴿أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ﴾ بێگومان خودا هەرکەسێك لە

---

[1] الاحقاف (١١).

[2] مريم (٧٣).

[3] مريم (٧٤).

[4] العنكبوت (٦٩).

[5] مسلم (١٩٨٧/٤).

ئێوە لە نەزانی خۆی کارێکی خراپ لێی ڕوویدات پاشان پەشیمان ببێتەوەو ئاکاری چاك بکات. واتە: لەوگوناهانە پەشیمان ببێتەوە کە کردوویەتی وازی لێ بێنێتو جارێکی تر نەگەڕێتەوەسەری دوای ئەویش کاری چاك ئەنجام بدات ﴿فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خودا لە گوناهەکانی دەبورێتو دلۆڤانە.

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك کە خودا خەڵکی دروستکرد لە کتێبەکەیدا لەسەر خۆی نوسیووە لەلای خۆی دایناوە لەسەر العرش کە بێگومان بەزەیی من زاڵە بەسەر تورەیمدا)[1]، لە هەردوو سەحیحەکەدا ئەم فەرموودەیە هاتووە[2].

﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾﴾

**پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەی بتەوی بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی کە بانگەوازی بۆدەکات، پاداشتو سزاش بەدەستی خودایەو بەدەستی ئەو نیە**

خودای مەزن دەفەرموێت: وەك لەپێشەوە بەچاکی ڕوونمان کردەوەو چەندین بەڵگەو نیشانەمان هێنایەوە بۆ شارەزابوون لەسەر ڕێی ڕاستو زەمی لاساریو مشتومڕو سەرپێچیمان کرد ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئێمە ئاوا نیشانەکانی خۆمان بەتەواوی بۆ شی دەکەینەوە، کە خەڵکی پێویستی پێیەتی ﴿وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ وە دەمانەوێت ڕێگەی تاوانبارانیش ڕوون ببێتەوە، واتە: ڕێگەی تاوانباران ئەوانەی کە دژایەتی پێغەمبەرانیان دەکرد بەتەواوی دەربکەوێت. وە بەم شێوەیەش خوێندراوەتەوە (وليستبين سبل المجرمين) واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) یان ئەوکەسەی قسەت بۆدەکرێت. بەتەواوی ڕێگەی تاوانبارانت بۆ دەردەکەوێت. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ﴾

---

[1] أحمد (٢/٣١٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری (١٣/٢٩٥)/ مسلم (٤/٢١٠٧).

بلێ: من ڕێم پێ نەدراوە کە ئەوشتانە بپەرستم کە ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خودا، واتە: بلێ: هەرگیز من بەئارەزووی ئێوە ناکەم ئەگەر بێتو شوێن ئارەزووی ئێوە بکەوم، دیارە ڕێگەم ون کردووەو لە ڕاستەڕێ لامداوە. ﴿قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ بلێ: وا من لەلایەن پەروەردگارمەوە بەڵگەی بتەوم پێدراوە. واتە: شارەزام لەوپەیامەی کە لەلایەن خوداوە بۆم ڕەوانەکراوە ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِ﴾ کەچی ئێوە بڕواتان پێ نەکرد. واتە: بڕواتان بەوپەیامە ڕاستە نەکردکە لەلایەن خوداوە بۆم هاتووە. ﴿مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ﴾ ئەوەی ئێوەش بۆی بەپەلەن، هیچی لەدەستی مندا نیە. واتە: سزا. ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ فەرمان هەر فەرمانی خودایە. واتە: گشت فەرمانێك بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە. ئەگەر مەیلی لێبێت ئەوەی داوای دەکەن زوو بۆتان دەنێرێت، مەیلیشی لێبێت دوای دەخات بۆتان خودا خۆی باش دەزانێت چی دەکاتو لەکارزانە لە فەرمانەکانیدا ﴿يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ خودا خۆی ڕاستیتان بۆ باس دەکات، چاکتر لێ کجیاکەرەوەش هەر خۆیەتی، چاکترین فەرماندەرە لە بڕیارەکانیدا لەنێوان عەرەبەکانیدا. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ بلێ: ئەگەر ئەوشتەی داوای دەکەنو بەپەلەن بۆی بەدەست من بووایە، کاری نێوان منو ئێوە هەر زوو دوایی دەهات. واتە: ئەوەی هەقە بەسەرتان بێت زوو بەسەرم دەهێنان ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ﴾ هەر خودا ستەمکاران باشتر دەناسێت. ئەگەر بوترێت: ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەدا چۆن یەك دەخەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عائیشەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کە بە پێغەمبەری خودای (ﷺ) وت: ئایا ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژی وات بەسەردا هاتووە کە سەختتربێت لە ڕۆژی ئوحود؟ فەرمووی: (دەردەسەری زۆرم بەسەردا هاتووە لە هۆزەکەتەوە، سەختترین شت کە بەسەرم هاتووە لێیان ڕۆژی عەقەبەبوو چوومەلای ئیبنو عەبدویالەیلی کوڕی عەبدوکیلال داواکەی جێبەجێ نەکردم، ڕۆیشتم خەفەت دایگرتمو ئاگام لەخۆم نەما تا قەرنول سەعالیب –شوێنێکە لە نزیکی مەککە– بەئاگاهاتمەوە کە سەرم بەرزکردەوە هەورێکم بینی سێبەری بۆ کردبووم کە سەیرم کرد جوبرەئیلی لەناودابوو، بانگی لێکردمو وتی: خودای مەزن قسەی هۆزەکەتی بیست کە پێیان وتیو چیان وەڵام دایتەوە ئەوا فریشتەی کێوەکانی بۆ ناردوویت تا فەرمانی پێ بکەیت چیت دەوێت پێیان بکەیت، فەرمووی: فریشتەی کێوەکان بانگی کردمو سەلامی لێ کردم، پاشان وتی: ئەی موحەممەد(ﷺ) خودا قسەی هۆزەکەتی بیست کە پێیان وتی، منیش فریشتەی کێوەکانم پەروەردگارت ناردوومی بۆلای تۆ تا چیت دەوێت بەرفەرمانتبم؟ ئەگەر بتەوێت

هەردوو کێوەکەی مەککە دەهێنمەوە بەسەریاندا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو ئەوەم دەوێت کە خودای گەورەهەر لە پشتی خۆیان کەسانێکیان لێ بخاتەوە خودای تاکو تەنیا بپەرستن‌و هیچ شتێك نەکەنە شەریکی)[1]، ئەمە وتەی موسلیمە. خودای گەورە سزادانی ئەوانەی خستە بەردەم پێغەمبەر (ﷺ) تا لەڕەگو ڕیشە دەریان بێنێت، پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی بۆ خواستن‌و داوای دواخستنی سزای بۆ کردن، سا بەڵکو لە پشتی ئەوانە کەسانێك بێن کە هەرگیز شەریك بۆ خودا دادەنێن، کەواتە ڕێك خستن چۆنە لە نێوان ئەم فەرموودەیەو ئەم ئایەتە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وەڵامەکەی خودا باشتر دەیزانێت. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەگەر ڕوودانی سزا بەدەستی ئەو بووایە، لەوکاتەدا کە داوایان دەکرد دەیهێنا بەسەریاندا. خۆ فەرموودەکە ئەوەی تێدانیە داوای هاتنی سزایان لێ کردبێت، بەڵکو فریشتەی کێوەکان ئەوەیان خستووەتە بەردەمی، ئەگەر بیەوێت ئەو دووکێوەیان بەسەردا بهێنێتەیەك. کە دووکێون لە باکورو باشوری مەککەدا، لەبەرئەوەبوو داوای دواخستنی سزای بۆکردن‌و داوای نەرم‌ونیانی کرد لەگەڵیان.

**جگە لە خودا هیچ کەسێك لە غەیب (نهێنیەکان) نازانێت**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ کلیلی هەموو نهێنیەکان هەر لای ئەوە (واتە: خودا) جگە لە خۆی هیچ کەسێك ئاگای لێ نیە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە لە باوکیەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کلیلەکانی نهێنی (غەیب) پێنجن هیچ کەسێك ئاگای لێ نیە جگە لە خودا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ﴾[2] زانستی ڕۆژی قیامەت لای خودایە، بارانیش ئەو دەیبارێنێت‌و دەشزانێ منداڵدانی سکپڕان چی تێدایە، کەس نازانێت کاری سبەی ڕۆژێ چیەو کەس نازانێت لە کام سەرزەمین دەمرێت، خودا زاناو ئاگادارە)[3] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ هەرچی لە وشکایی‌و دەریادایە دەیزانێت. واتە: خودا ئاگای لە هەموودروستکراوەکانە چ لە زەویدابێت یان لە دەریا هیچ شتێکی لێ پەنهانی نابێت لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا با بە ئەندازەی گەریلەیەکیش بێت ﴿وَمَا تَسْقُطُ

---

[1] فتح الباري (٣٦٠/٦)، مسلم (١٤٢٠/٣).

[2] لقمان (٣٤).

[3] فتح الباري (١٤١/٨).

مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا ﴾ هەر گەڵایەك لە شوێنێك بێت، بێ ئاگاداری ئەو ناوەڕێت، هەتا ئاگای لە جوڵەی بێ گیانەكانیشە ئیتر بەرامبەر گیاندارەكان چۆن بێت بەتایبەتی خاوەن ئەركەكان وەك جنۆكەو ئادەمی. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي ٱلصُّدُورُ ﴾[1] خودا دەزانێت كێ چاوی خیانەتی هەیەو چی لە دڵدا شاردووەتەوە. وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ هەرچی دانەوێڵەیەو لە تاریكایی زەویدایەو هەرچی تەڕە یان وشكە گشتی لەناو دەفتەرێكی ئاشكرایە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾﴾

**گیانی عەبدەكان بەدەستی خودایە بەر لە مردن و پاش مردنیش**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ هەر (خودا) خۆیەتی بەشەو هەستان لێ دەسێنێت و دەشزانێت لە ڕۆژیشدا چیتان كردووە. واتە: خودا لە شەودا دەتان مرێنێت، مەبەست پێی مردنی بچووكە وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ﴾[2] كاتێك خودا فەرمووی ئەی عیسا من تۆ دەمرێنم و بەرزت دەكەمەوە بۆلای خۆم. وە دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾[3] ئەوانەی كاتی مردنیان دێت و ئەوانەش كە لە خەودان و نەمردوون، خودا گیانیان ڕادەگرێت، جا ئەوگیانەی كە بڕیاری مەرگیان دراوە هەر ڕادەگیرێت، ئەوەی تریش تا وەختێكی دیاریكراو دەهێڵێتەوە. لەم ئایەتە باسی هەردوو مردنەكەی كردووە، مردنی گەورەو مردنی بچووك. وە لێرەدا باسی هەردوو مردنەكەی كردووە، مردنی گەورەو مردنی بچووك دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ هەر خوا

[1] غافر (١٩).

[2] ال عمران (٥٥).

[3] الزمر (٤٢).

خۆیەتی بەشەو هەستان لێ دەسێنێت و دەشزانێت لە ڕۆژیشدا چ کارێك دەکەن.[1] ئەم ئایەتانە نیشانەی گەورەیی‌و زانستی خودا دەردەخات بەرامبەر دروستکراوەکانی لە شەوو ڕۆژیاندا لەکاتی جموجۆڵ‌و سرەوتنیاندا. وەك دەفەرموویت: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾[2] هەرکەسێك لە ئێوە بە پەنامەکی قسەبکات‌و دەنگ هەڵبڕێت یان لە شەودا خۆی پەنابدات‌و لە ڕۆژیشدا بەئاشکار بێت‌و بچێت لەلای خودا هەمووی وەك یەکە. وەك دەفەرموویت: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ ﴾[3] وە هەر لە بەزەیی خودایە شەوو ڕۆژی والێکردووە کە ئارامی تێدابگرن. واتە: لە شەوەکەیدا بحەسێنەوە ﴿وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ ﴾[4] تا چاکەی ئەوتان دەست بکەوێت. واتە:لە ڕۆژدا. وەك دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا﴾[5] شەویشمان دانا بۆ پۆشاك‌و ڕۆژیشمان کردە هۆی ژیان. هەربۆیە خودای گەورە لێرە دەفەرموویت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ هەر خودایە کە دەتانمرێنێت بە شەوو دەزانێت لە ڕۆژیشدا چیتان کردووە. ﴿ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ﴾ پاشان لە ڕۆژدا بێدارتان دەکاتەوە کە ئەمە قسەی موجاهیدو سوددی‌و قەتادەیە. پاشان خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ هەتا ماوەی دیاریکراو تەواودەبێت‌و دەگەڕێنەوەلای خۆی، ئەوسا ئاگادارتان دەکات لەوەی کە کردووتانە. واتە: هەتا هەرکەسەو ماوەی دیاریکراوی خۆی تەواودەکات‌و لە ڕۆژی قیامەتدا دەگەڕێتەوەلای خوداو ئاگاداری دەکات لەوکردارانەی کردوویەتی پاداشتی خۆی وەردەگرێت چاکە بە چاکەو خراپەش بە تۆڵەلێسەندن. ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ هەر خودا خۆی خاوەن دەستەڵاتە بەسەر عەبدەکانی دا زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هەموو ملکەچی هێزو تواناو دەستەڵاتی ئەوە ﴿وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً ﴾ پاسەوانیشتان بۆدەنێرێت. واتە: پاسەوان دەنێرێت بۆ پاراستنی لاشەی مرۆڤ، وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموویت: ﴿لَهُۥ

---

[1] الطبري (٥/٢١٢).

[2] الرعد (١٠).

[3] القصص (٧٣).

[4] النحل (١٤).

[5] النبأ (١٠- ١١).

مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ﴾[1] ئەوکەسەی لە پێشەوەو لە دوایەوە چەندین فریشتە هەیە کە بەپێی فەرمانی خودا دەیپارێزن. واتە: پاسەوانی هەیە کردارەکانی دەپارێزن‌و لەسەری هەژماردەکەن. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ﴾[2] بێگومان چەند پارێزەرتان بەسەرەوەیە. وە دەفەرموێت: ﴿إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ﴾[3] کاتێك لەلای چەپ‌و ڕاستیشەوە دوو فریشتە دانیشتوون (بۆی دەنووسن) هەرقسەیەك لە دەم دەردەچێت چاودێرێکی بەسەرەوەیە (بۆی تۆماردەکات). ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ هەتا کاتێك کە مردنیان هات. واتە: هەتا کاتێك یەکێکیان مردنی نزیك دەبێتەوەو دەکەوێتە گیان کەنشت ﴿تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا﴾ نێردراوەکانمان گیانی دەکێشن (فریشتەی گیان کێشان یانی دەکێشن). ئیبنو عەبباس‌و کەسانی تریش وتویانە: فریشتەی گیان کێشان یارمەتیدەری تری هەیە لە فریشتەکان گیانی ئەوکەسە لە لاشەی دەردێنن فریشتەی گیان کێشان کاتێك کە گیانی گەیشتە بنەقاقەی گیانی دەکێشێت[4] ﴿وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ درێغی لەفەرمانی خودا ناکەن. واتە: لە پاراستنی گیانی مردووەکە، بەڵکو پارێزگاری لێ دەکەن هەتا دەیگەیەننە ئەوشوێنەی کە خودای مەزن داینـاوە. ئەگەر لە پیاوچاکان بوو ئەوا لە عیلییندا ئەگەر لەبەدفەرانیش بوو ئەوا لە سیجیلیندا پەنا بە خودای مەزن لەوشوێنە. ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ﴾ پاشان دەیاگێڕینەوە بۆلای خودا، کە سەروەری ڕاستەقینەی هەموویانە. با بزانن فەرمان هەر بە دەستی ئەوەو زووتر لە هەر حیسابگرێکیش لە هەموویان دەپرسێتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بێگومان فریشتەکان دێنەسەر مردوو، ئەگەر ئەوپیاوە کەسێکی چاك بوو، دەڵێن: ئەی گیانە پاکەکە وەرەدەرەوە، تۆ لە لاشەیەکی پاکدابوویت‌و بەرێزەوە وەرەدەر مژدەت لێبێت بە حەسانەوەو بۆنی خۆش‌و پەروەردگاریە کە تووڕەنیە. بەردەوام ئەمەی پێ دەوترێت هەتا دێتەدەر، پاشان بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان‌و داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمانی بۆدەکەن. دەوترێت: ئەوە کێیە؟ دەوترێت:

---

[1] الرعد (١١).

[2] الانفطار (١٠).

[3] ق (١٧– ١٨).

[4] الطبری (١١/٤١٠).

فڵانە کەسە، دەوترێت: بەخێرهاتی گیانی پاك‌و چاك، تۆ لە لاشەیەکی پاکدابوویت بەرێزەوە بچۆژوورەوە. موژدەت لێبێت بە حەسانەوەو بۆنی خۆش‌و پەروەردگاریە کە تووڕەنیە. بەردەوام ئەمەی پێ دەوترێت هەتا دەیگەیەننە ئەوئاسمانەی کە خودای مەزن لەوێدایە. ئەگەر ئەوپیاوە کەسێکی خراپ بوو، (فریشتەکان) دەڵێن: وەرەدەر ئەی گیانی پیس، کە لە لاشەیەکی پیسدابوویت. وەرەدەر بە ڕیسوایی موژدەبێ لێت بە ئاوەکوڵ‌و کێم‌و زووخ، هەر بەوێنەی ئەمە دووبارە، بەردەوام ئەمەی پێ دەوترێت، هەتا دەردەچێت، پاشان بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، داوای کردنەوەی بۆدەکەن دەوترێت: ئەوە کێیە؟ دەوترێت: فڵانە کەسە، دەوترێت: بەخێرنەیەت ئەم گیانە پیسە، کە لە لاشەیەکی پیسدابووە، بگەڕێوە بە ڕیسوایی، بێگومان دەرگاکانی ئاسمان لە تۆ ناکرێتەوە. لە ئاسمانەوە ڕەوانەدەکرێت پاشان دەڕوات بۆ گۆڕ. پیاوەچاکەکە دادەنیشێندرێت ئەوقسانەی پێ دەوترێت کە لەپێشدا لە فەرموودەکەی پێشوودا پێ وترا. پیاوەخراپەکەش دادەنیشێندرێت هەرقسەی پێ دەوترێت کە لەپێشدا لە فەرموودەکەی ئەوەلدا پێ وترا)[1]، وە لەوانەشە مەبەست بەم ئایەتە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ پاشان دەیانگێڕنەوە بۆلای خودا، واتە: هەموو دروستکراوەکان لە قیامەتدا، خودا بە دادپەروەری خۆی بڕیاریان بەسەردا دەدات. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾[2] بڵێ: بێگومان ئەوەی لەپێشدا هاتوون ئەوانەشی لە دوایی هاتوون، بە کۆمەڵ کۆدەکرێنەوە بۆ کاتێك کە ڕۆژێکی دیاریکراوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَحَشَرْنَـٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ هەموویان کۆدەکەینەوە، بێ ئەوەی کەسیانی لێ دەربکەین. هەتا دەگاتە ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾[3] پەروەردگارت ناهەقی لە هیچ کەسێك ناکات. هەربۆیە خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَـٰسِبِينَ﴾.

﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَـٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾

**باسی چاکەو ڕێزی خوداو هێزو زەبروزەنگی**

---

[1] أحمد (٢/٣٦٤)، هەیسەمین لە (المجمع) دا دەڵێت پیاوەکانی پیاوی ڕاستن.

[2] الواقعة (٤٩– ٥٠).

[3] الكهف (٤٧– ٤٩).

خودای مەزن منەت دەکات بەسەر عەبدەکانیدا کە لێقەوماوەکانی ڕزگارکردوون لە تاریکایی وشانیو دەریادا، واتە: ئەوانەی کاتێك کە تووشی سەرسامیو سەرلێ شێوان دەبن لە بیاباندا لە شەپۆلی یەك لەدوای یەکی دەریادا لەگەڵ ڕەشەبایەکی توندا، ئا لەوێدا تەنیا هاوار لە خودا دەکەنو هانا هەر بۆ ئەو دەبەن کە شەریکی نیە وەك خودای گەورە لەم ئایەتانەدا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ﴾[1] هەرکاتێك لە دەریادا تووشی فەرتەنەیەك هاتن هانا بۆ هەرکەسێك ببەن، ون بووە جگە لەو، واتە: جگە لە خودا. وە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّىٰ إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾[2] هەر خوا خۆیەتی لەناو دەریاو لەسەر وشکانی دەتانگێڕێت، هەرکاتێك لەناو کەشتیدان بایەکی باش دەیانبات پێی دڵخۆشن، تا بای زۆر توند هەڵدەکاتو لە هەموولایەکەوە شەپۆلیان بۆدێتو چاك دەزانن کە هەموو دەوریان گیراوە، بەوپەڕی بڕوای پاکەوە لە خودا دەپاڕێنەوە دەڵێن: ئەگەر تۆ لەمە ڕزگارمان بکەیت لە سوپاسگوزاران دەبین. وە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾[3] یان ئەوکەسە چاکترە لە تاریکیو وشکانیو دەریا لەڕێ شارەزاتان دەکاتو هەرئەویشە ئەوبارانە دەنێرێت کە مزگێنی خێروبێری ئەویان پێیە؟ ئایا هیچ پەرستراوێك لەگەڵ خودا هەیە؟ خودا زۆر لەوە بەرزترە لەوەی کە دەیکەنە شەریکی ئەو. وە لەم ئایەتە پیرۆزەشدا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَانَا مِنْ هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ بڵێ: کێ ڕزگارتان دەکات لە تاریکیو وشکانی دەریا؟ کە ئەو کەسێکە بە نهێنیو بە ئاشکرا لێی دەپاڕێنەوە (دەڵێن) ئەگەر خودا ئەمجارەش ڕزگارمان بکات، هەر شوکرنەبژێری ئەودەبین. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ بڵێ: خودا ڕزگارتان دەکات لەوتەنگانەو لە هەموو بەڵایەکی تریش، کەچی ئێوە شەریکی بۆدادەنێن. پاشان ئێوە کەوتنە خۆشگوزەرانی هاوار لە پەرستراوی تر دەکەن لەگەڵ خودادا. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَىٰ أَن يَبْعَثَ

---

[1] الاسراء (٦٧).

[2] یونس (٢٢).

[3] النمل (٦٣).

عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ ﴾ بەڵێ: خودا توانای هەیە کە لەلای سەروتانەوە یان لەلای ژێر پێتانەوە ئازارتان بۆ بنێرێت. وەك لە سورەتی ئیسرائیشدا (الاسراء) دەفەرمووێت: ﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ۙ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴾[1] پەروەردگارتان لە بەرامبەر ئێوە دلۆڤانە، گەمیەکان لە دەریادا بۆ دەخاتەگەڕ تا بەهۆیەوە ڕۆزی خۆتان دەست بکەوێت. هەرکاتێك لەناو دەریادا تووشی گرفتێك هاتن هانا بۆ هەر کەسێك بەرن ون بووە جگە ئەو هەرکە ڕزگاری کردن و چوونەوە سەر وشکانی ئاوڕی لێ نادەنەوە، مرۆڤ زۆر ئەمەك نەناسە. ئایا لەوە دڵنیان کەلە وشکانیەکە ڕۆ ناچن یان ڕەشەبا لەگەڵ زیختان لێ هەڵناکات، ئەوسا کەستان دەسنەکەوێت فریاتان بکەوێت؟ یان لەوە دڵنیان جارێکی تر ڕێتان لەوێ ناخاتەوە، ئەوسا بایەکی بەهێزترتان لێ هەڵبکات و لە تۆڵەی پێ نەزانینتان نوقومتان بکات؟ پاشان کەستان دەست نەکەوێت، کەلە بەرامبەر ئێمە یارمەتیتان بدات؟ بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴾ ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە وتی: کاتێك کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ ﴾ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: پەنا دەگرم بە ڕەزای تۆ ﴿ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ ﴾ فەرمووی: پەنا دەگرم بەڕەزای تۆ ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ساناو ئاسانترە)[2] هەر بەم شێوەیەش لە کتێبی توحیدا (التوحيد) ڕیوایەتی کردووە[3] نەسائیش دیسان لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە[4].

**فەرموودەیەکی تر**

---

[1] الاسراء (٦٦– ٦٩).

[2] فتح الباری (١٤١/٨).

[3] فتح الباری (٤٠٠/١٣).

[4] النسائی فی الکبری (٣٤٠/٦).

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودادا (ﷺ) هاتینەوە بەلای مزگەوتی بەنی مەعاویەدا تێپەڕین، چووە ژورەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، ئێمەش لەگەڵیدا نوێژمان کرد، زۆر لەپەروەردگاری پاڕایەوە، پاشان لای کردەوە بەلاماندا و فەرمووی:(سێ داوام لەپەروەردگارم کرد، دوانیانی پێدام و یەکێکیانی لێ وەرنەگرتم، داوام لەپەروەردگارم کرد کە ئوممەتەکەم بە وشکە ساڵی لەناو نەبات، پێی دام، داوام لێکرد کە ئوممەتەکەم بەخنکاندن لەناو نەبات، ئەویشی پێدام، داوام لێکرد لەنێوان خۆیاندا یەکتری لەناو نەبەن پێی نەدام)، تەنیا موسلیم خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە لە کتێبی فیتنەدا[1].

### فەرموودەیەکی تر

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە خەبابی کوڕی ئەرەتتەوە لە مەولای بەنی زوهرە وە کە ئامادەی غەزای بەدر بووە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وتی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا (ﷺ) هەموو شەوەکە نوێژم کرد، هەتا بەری بەیانی. پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەلامی دایەوە لە نوێژەکەی، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم شەو نوێژێکی وات کرد، نەم بینیوی نوێژی وەك ئەم نوێژەت کردبێت. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ، ئەوە نوێژی داوا و ترس بوو داوای سێ شتم لەپەروەردگاری مەزنم کرد لەو نوێژەدا، دوانیانی پێداوم و یەکێکیانی لێ وەرنەگرتم داوام لەپەروەردگارم کرد کەلەناومان نەبات بەوەی کە ئوممەتە پێشوەکانی پێ لەناو برد، پێی دام، داوام لە پەروەردگارم کرد، دوژمنێك لەغەیرە خۆمان بەسەرماندا زاڵ نەکات، پێی دام، داوام لەپەروەردگارم کرد کە نەمانکاتە چەند دەستەو تێکمان بەردا لێی وەرنەگرتم)[2]، نەسائیو ئیبنو حیبان و تیرمیزیش لە(الفتن)دا ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە.[3] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعًا﴾ یان بتانکاتە چەند دەستەو بچن بەگژ یەکدا. واتە: چەند کۆمەڵێکی دژ یەکتری والیبی لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: واتە: واتان لێدەکات شوێن ئارەزوتان بکەون[4]. موجاهیدو کەسانی تریش هەروایان وتووە[5]، لەچەندین ڕێگاوە لە فەرموودەکەی مەرویەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: (بەو زووانە ئەم ئوممەتە جیا دەبێتەوە، دەبێت بە حەفتاوسێ

---

[1] أحمد (١/١٧٥)، مسلم (٢٨٩٠).

[2] أحمد (٥/١٠٨) فەرموودەیەکی باشە (جید).

[3] النسائی (٣/٢١٧)، ابن حیان (٩/١٧٩)، تحفة الاحوذی (٦/٣٩٥)، أحمد (٥/١٠٨).

[4] الطبری (١١/٤٢٠).

[5] الطبری (١١/٤١٩).

کۆمەڵ هەموویان لەناو ئاگردان جگە لە یەکێکیان)[1]، ﴿وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ تا هەندێکتان بەهەندێکی ترتان ئازار بدات. ئیبنو عەبباس و کەسانی تریش وتویانە واتە: هەندێکتان زاڵ بکات بەسەر هەندێکتاندا سزای بدات و بیکوژێت.[2] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ﴾ دەبڕوانە چۆن نیشانەکان دەگۆڕین (لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر)، واتە: جار لەدوای جار نیشانەکان ڕوون و ئاشکرا دەکەین و تەفسیری دەکەین ﴿لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە تێ بگەن. واتە: هەتا تێبگەن و بیر لە نیشانەو بەڵگەکانی خودا بکەنەوە.

﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾﴾

### بانگەواز ڕێنیشاندانە بەبێ ناچارکردن

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ﴾ هۆزەکەت (واتە قورەیش) باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد هەر ئەو ڕاست و دروستە. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەوقورئانەی کە تۆ پێی ڕەوانەکراوی هۆزی قورەیش بڕوایان پێ نەکرد کە هەر ئەوقورئانە ڕاست و دروستە دوای ئەو ڕاستێکی تر نیە ﴿قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾ بڵێ: خۆ من بەرپرسی ئێوە نیم، واتە: من چاودێرو پارێزگارنیم بەسەرتانەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾[3] بڵێ: هەق هەر ئەوەیە کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە، کێ بڕوای پێ دەکات، بیکات و کێش بڕواناکات با نەیکات. واتە: من هەر گەیاندنم لەسەرەو ئێوەش هەر بیستن و گوێڕایەلیتان لەسەرە. هەرکەسێك شوێنی من بکەوێت بەختەوەری دونیاو قیامەتە. وە هەرکەسێك دژایەتیم بکات لە دونیاو لە قیامەتدا بەدبەخت و ڕەنجەڕۆیە. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ﴾ هەر باس و هەواڵێك جێگەی خۆی هەیە. ئیبنو عەبباس و کەسانی تریش وتویانە: هەموو هەواڵێك ڕاستی و دروستی هەیە. واتە: هەر دەنگ و باسێك جێگەی خۆی هەیە، با دوای ماوەیەکیش بێت. وەك خودای مەزن لە

[1] أبو داود (٥/٥)، تحفة الاحوذی (٧/٣٩٩)، ابن ماجة (٢/١٣٢٢) تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.
[2] الطبری (١١/٤٢١).
[3] الکهف (٢٩).

ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ﴾[1] بێگومانە پاش ماوەیەك دەنگو باسی ڕاستی ئەوەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ﴾[2] بۆ هەر کارێك کاتێکی تایبەت هەیە کە نوسراوە. بێگومان ئەمە هەڕەشەو ترساندنە، هەر بۆیە لەپاشان دەفەرمووێت: ﴿وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ زۆر زوو ئاگادار دەبن.

**ڕێ نەدان بەدانیشتن لەگەڵ ئەوانەی کە دەربارەی نیشانەکانی خودا خراپ دەدوێن**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦ﴾ هەرکاتێك ئەوانە دەبینی دەربارەی نیشانەکانمان خراپ دەدوێن، ڕوویان لێ وەرگێڕە، تا باری قسە دەگۆڕن‌و قسە لە شتێکی تر دەکەن. واتە: کاتێك بڕوایان بەنیشانەکانی ئێمە نەدەکردو گاڵتەیان پێ دەکرد. لایان دامەنیشن هەتا قسەکانیان دەگۆڕن‌و دەچنە سەر قسەو باسێکی تر. ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ئەگەر وای لێهات شەیتان لەبیری بردیەوە. مەبەست لێرەدا هەموو کەسێکە لەم ئوممەتە کە دەبێت دانەنیشێت لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا کە نیشانەکانی خودا لەجێی خۆی دانانێن‌و دەیگۆڕن. خۆ ئەگەر کەسێك لەبیرچوو لەگەڵیان دانیشت ﴿فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هەرکاتێك وەبیرت هاتەوە ئیتر لەگەڵ ستەمکاران دامەنیشە. هەر بۆیە لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (هەڵەو لەبیر چوون‌و ئەوەی ناچارکراون لەسەری، لەسەر ئوممەتی من هەڵگیراوە)[3]، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡ﴾[4] لەم قورئانەدا بۆتان هاتووەتەخوار: هەرکاتێك گوێتان لێ بوو ئایەتەکانی خودا بڕوایان پێ ناکرێت‌و گاڵتەیان پێ دەکرێت، ئێوە نابێت لەگەڵیاندا دابنیشن، دەنا ئێوەش ئەوکاتە وەك ئەوانن. واتە: هیچ جیاوازیەکتان نیە لەگەڵ ئەوانەدا ئەگەر لەگەڵیاندا دانیشن‌و ڕازی بن بەوەی ئەوان دەیڵێن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ﴾ ئەوانەی لەخودا ترسن‌و خۆ پارێزن، هیچ ئۆباڵی ئەوانەیان

---

[1] ص (٨٨).

[2] الرعد (٣٨).

[3] ابن ماجه (١/٦٥٩) سەنەدەکەی بەهێزنیە.

[4] النساء (١٤٠).

لەسەر نیە، واتە: کاتێك کەلێیان دوور کەوتنەوەو لەگەڵیان دانەنیشتن لەو قسەو گاڵتە کردنەیاندا، ئەو کاتە تۆباڵی ئەوانەیان لەسەر نیەو گوناهی ئەوانە ڕزگاریان بووە ﴿وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ بەڵام دەبێت ئامۆژگاری ناڵەبارەکان بکەن بەڵکو لەخودا بترسن واتە: کە فەرمانەکانمان پێداون ڕوویان لێ وەرگێڕن، بۆئەوەیە بەڵکو لەوکاتەدا بیربکەنەوە لەوکارە خراپەیانو بەخۆیاندا بچنەوە، بەڵکو لەوە بترسنو جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ ئەوکارەیان.

﴿ وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَا ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُوا بِمَا كَسَبُوا ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾ تـۆ واز لەوانە بهێنە کە دینەکەیان بە گاڵتەوگەپ گرتووەوژیانی دونیا بەتەواوی لە خشتەی بردوون. واتە: گوێیان مەدەرێو وازیان لێ بێنەو ماوەیەك فەرامۆشیان بکە، بێگومان ئەوانە بەرەو سزای سەخت دەڕۆن. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَذَكِّرْ بِهِ﴾ بەم قورئانە بیریان خەوەو بیانترسێنە لە تووڕەیی‌و سزای بەژانو تۆڵەی توندی خودا لە ڕۆژی قیامەتدا. پاشان دەفەرموێت: ﴿أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ هەرکەسێك بکەوێتە زیندانی بێ دەرەتانی کردەوەی خۆی. واتە: تا گیرۆدەی کردارەکان نەبێت. زەحاك وتی: لە ئیبنو عەبباسو موجاهیدو عیکرمەو حەسەنو سوددیەوە کە وتوویانە: ﴿تُبْسَلَ﴾ واتە: خۆی بەرەو لەناوچوون نەبات[1] والیبی لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ﴿تُبْسَلَ﴾ واتە: ئابڕوی نەچێت[2] قەتادە وتی: زیندانی نەکرێت[3]، مورە و ئیبنو زەید وتیان: نەگیرێت[4]، کەلبی وتی: ﴿تُبْسَلَ﴾ واتە: سزا نەدرێت. هەموو ئەم قسەودەربڕینانە لەیەك نزیکن لە مانادا پوختەکەی خۆدانەوەدەستە بۆ لەناوچوونو خۆگرتنە لە چاکەو بوونە بارمتەی کرداری خۆ. وەك خودای گەورە

---

[1] الطبری (١١/٤٤٣).
[2] الطبری (١١/٤٤٤).
[3] الطبری (١١/٤٤٣).
[4] الطبری (١١/٤٤٣).

دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ۝٣٨ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾[1] هەموو کەسێك کردەوەی بارمتەی خۆیەتی. جا مەگین هاوەڵانی دەستی ڕاست. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ جگە لە خودا هیچ کەسێك بە هانایەوە نایەتو هیچ کەسێکیش تکای بۆناکات ﴿وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ﴾ هەرچی ماڵی دونیای هەیە هەمووی بدات لە قەرەبووی خۆیدا لێی وەرناگیرێتو قەبوڵ ناکرێت. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾[2] ئەوانەی کە خودانەناس بوونو هەرچی بە خودانەناسی مردوون، هەرکەسێکیان ئەگەر بەپڕی ئەم زەمینە زێڕیش (ئاڵتوون) بە بارمتە بدات هەرگیز بەهرەی پێ ناگەیەنێت. لێرەشدا خودای گەورە هەروا دەفەرمووێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾ ئەوانە بەهۆی ئەوکارەی کە کردوویانەو بڕوایان بەخودا نەبووە لە جەهەننەم دەرناچن ئاوی کوڵاو دەخۆنەوەو جەزرەبەی بەژانیان هەیە.

﴿قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٧١ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ۝٧٢ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ۝٧٣﴾

### وێنەی ئەوکەسانەی دەگەڕێنەوە بۆ خودانەناسی دوای بڕاهێنان و ئاکاری چاك

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ بڵێ: ئایا دەتانەوێت لەبری خوا هاوار بۆ شتانێك بەرین نە زەرەرێکمان لێ دەدەن نە قازانجیان بۆمان هەیەو لە پاش ئەوەی شارەزای ڕستەڕێکە بووین، سەرلەنوێ پاشگەزبینەوە؟ سوددی وتی: بت پەرستەکان بە موسڵمانەکانیان وت، شوێن ڕێگەی ئێمە بکەون، واز لە ئاینی موحەممەد بێنن

---

[1] المدثر (٣٨– ٣٩).

[2] ال عمران (٩١).

خوداى مەزن ئەم ئايەتەى ناردەخوارەوە ﴿ قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ ايا پاش ئەوەى شارەزاى ڕاستەڕێگە بووين جارێكى تر پاشگەزببينەوە؟ هەروەك ئەوەمان بەسەردێت كە شەيتان خەڵەتانديەتى‌و لەسەر زەوى سەرگەرادانن. خوداى مەزن دەفەرمووێت: نمونەى ئێوە كە پاشگەزبنەوە دواى باوەڕهێنان، وەك نمونەى پياوێك وايە لەگەڵ كۆمەڵێكدا دەرچووە بەڕێگەيەكدا، ڕێگە ون دەكات و شەياتينەكان خەڵەتاندوويانە‌و لەسەر زەوى سەرگەردانن، هاوەڵەكانى كە لەسەر ئەو ڕێگەيەن بانگى دەكەن بۆلاى خۆيان پێى دەڵێت: وەرەبۆلاى ئێمە، ئێمە لەسەر ڕێگەين. ئەويش ڕازى نابێت بچێتەلايان، ئەوە نمونەى ئەوكەسەيە شوێنى، شەياتين دەكەوێت دواى ئەوەى كە موحەممەدى ناسى (ﷺ) موحەممەديش ئەوكەسەيە بانگى خەڵك دەكات بۆ ئەو ڕێگەيە، ئەو ڕێگەيەش هەر ئيسلامە، ئيبنو جەرير ڕيوايەتى كردووە[١] خوداى گەورە دەفەرمووێت: ﴿ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَـٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ ﴾ هەروەك ئەوەمان بەسەردێت كە شەياتين خەڵەتانديەتى لەسەر زەوى سەرگەردانە. ئا ئەوەيە خەڵەتێنەرو فريودەر، كە بەناوى خۆى‌و باواكى‌و باپيريەوە بانگى دەكەن ئەويش شوێنيان دەكەوێت وادەزانێت شتێكى باشى كردووە، كەچى فڕێياندواەتە شوێنێكەوە كە تياىچێت، لەوانەشە خورابێت، يان لە بيابانێكى چۆڵدا لە شوێنێكدا فڕێياندواە لەتێنودا خنكاوە، ئەمە نمونەى ئەكەسانەيە وەڵامى ئەوپەرستراوانە دەدەنەوە كە جگە لە خوداى گەورە دەيپەرستن، ئيبنو جەرير ڕيوايەتى كردووە[٢] ﴿ لَهُۥٓ أَصْحَـٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ﴾ هەندێك هاوەڵى واى هەيە كە پێى دەڵێن: وەرەلامان لەڕێگەت شارەزادەكەين. هەربۆيە خوداى گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ﴾ بڵێ: ڕێى ڕاست هەر ڕێگەى خودايە، وەك لە ئايەتێكى تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ﴾[٣] هەركەسێك خودا شارەزاى كردبێت، كەس ناتوانێت لەڕێگەى خودا لايبدات. وە دەفەرمووێت: ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾[٤] هەرچەندە هەوڵ بۆ شارەزابوونيان بدەيت، گومڕاكان خودا ڕێگەيان نيشان نادات‌و كەسيش بەهاناياتەوە نايات. پاشان خوداى گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ

---

[١] الطبري (١١/٤٥٢).

[٢] الطبري (١١/٤٥٢).

[٣] الزمر (٣٧).

[٤] النحل (٣٧).

ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ فەرمانمان پێدراوە خۆ بدەینە دەست پەروەردگاری جیهان. واتە: بە دڵسۆزی پاکی تەنیا عیبادەتی خودا بکەین کە شەریکی نیە، ﴿ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ﴾ فەرمووشیەتی دەبێت نوێژبکەین‌و ترسیشمان لە خودا هەبێت لە هەموو هەڵس‌و کەوتێکدا ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ ئەوە خودایەی کە هەمووتان لەلای کۆدەکرێنەوە، لەڕۆژی قیامەتدا ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾ هەر ئەویشە بەڕاستی، ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەوەش کە لەناویاندایە دروستی کردووە ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ﴾ هەر ڕۆژێك بۆ دروستبوونی شتێك بفەرموێت ببە، دەبێت. واتە: ئەوڕۆژی قیامەتەی کە خودای گەورە دەفەرموێت ببە، دەبێت لەچاوترکانێکداو کەمتریش. (الیوم) مەنصوبە لەبەرئەوەی کە عەتف کراوە بۆ ﴿وَٱتَّقُوهُ ﴾ بەم شێوەیەی لێ دێت: (واالتقوا یوم یقول کن فیکون) یان عەتف کراوە بۆ ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾ واتە: (خلق یوم یقول: کن فیکون) لێرەدا باسی درەستبوونی یەکەم‌و دووبارەکردنەوەشی کردووە ئەمە شتێکی باشە. یان عەتف کراوە بۆ فیعلێکی نادیار بەم شێوەیە: (واذکر یوم یقول کن فیکون). پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ ﴾ قسەی ڕاستەو موڵك‌و دەستەڵاتیشی هەر هی خۆیەتی.

**باسی فووکردن بە کەڵەشاخدا**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ﴾ ئەوڕۆژەی کە فوو بە کەڵەشاخدا دەکرێت، هەڵدەگرێت ئەم دەقەر بەدەل بێت لەم دەقە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ﴾ وە هەڵیش دەگرێت زەرف بێت بۆ ئەم دەقە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ﴾ وەك ئەم ئایەتە ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾[1] لەوڕۆژەدا فەرمانڕەوایی بۆ کێیە؟ هەرر بۆ خودای تاك‌و تەنیای بەسەر هەموو شتدا زاڵە. ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێت: ﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴾[2] ئەوڕۆژەی فەرمانڕەوایی بەڕاستی بۆ خودایەو بۆ کۆمەڵی خودانەناسان ڕۆژێکی پڕ تەنگانەیە. مەبەست بە ﴿ٱلصُّورِ﴾ ئەو کەڵەشاخەیە کە ئیسرافیل(سەلامی خودای لێبێت) فوور پێدادەکات. موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری

---

[1] غافر (١٦).

[2] الفرقان (٢٦).

خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (بەڕاستی ئیسرافیل (سەلامی خودای لێبێت) کەڵەشاخەکەی بە دەمیەوە گرتووەو تەوێڵی خۆی نەوی کردووەو چاوەڕوانە کەی فەرمانی پێ بکرێت فووی پێدابکات)[1]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. لە عەبدوڵلای کوڕی عەمر وتی: عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) (الصور) چیە؟ فەرمووی: (کەڵەشاخێکە فووی پیادەکرێت)[2].

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾﴾

### ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) ئامۆژگاری باوکی کرد

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) ئامۆژگاری باوکی دەکرد کە بت پەرستی نەکات‌و وازی لێ بێنێت‌و سەرزەنشتی دەکرد، وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً﴾ بیر لەوکاتەش بکەوە کە ئیبراهیم بە ئازەری باوکی خۆی وت: ئایا تۆ بۆچی ئەم بتانە دەپەرستی؟ تۆ بتێك دەپەرستی بێجگە لە خودا ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ من تۆش‌و گەلەکەت دەبینم لە گومڕاییەکی ئاشکرادان و لەڕێ لاتانداوەو سەرتان لێ شێواوە نازانن بەرەو کوێ دەچن‌و بەڵکو لەسەرگەردانی‌و نەفامیدا خوول دەخۆن. ئەوندەش نەفامی‌وگومڕاییەکەتان ئاشکرایە. گشت خاوەن ئاوەزێکی تەندروست هەستی پێدەکات. خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ

---

[1] الطبری (٥/٢٣٨).

[2] تحفة الاحوذي (١١٧/٧)، أحمد (١٦٢/٢). فەرموودەیەکی حەسەنە.

لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَـٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴾[1] ئەی موحەممەد (ﷺ) لەم کتێبەدا (کە قورئانە) باسی ئیبراهیمش بکە کە لە کارو وتاریدا ڕاستوێژ بووە و هەم پێغەمبەریش بووە. ئەوکاتە بە باوکی خۆی وت: باوکە بۆ شتێکی وا دەپەرستیت، نە دەبیستێت‌و نە دەبینێت‌و هیچ قازانجێك بەتۆ نادات. باوکە: ئەوەی من دەیزانم تۆ نایزانی، شوێنم بکەوێت شارەزای ڕاستەڕێت دەکەم. باوکە شەیتانپەرست مەبە، شەیتان لە فەرمانی خودا سەرپێچی کرد. باوکە من لەوە دەترسم لە خوداوە تووشی ئازاربیبیت‌و ببیت بە دۆستی شەیتان. ئازەر وتی: ئایا ئەی ئیبراهیم تۆ بێزاری لەوانەی دەیانپەرستم؟ ئەگەر دەست لەمە هەڵنەگریت بەردبارانت دەکەم‌و تا ماوەیەکی درێژیش لەلام برۆ. ئیبراهیم(سەلامی خودای لێبێت) وتی: سەلام لەسەر تۆ بێت، لە پەروەردگارم دەخوازم لێت ببورێت‌و ئەو لەگەڵ من میهرەبانە. من لە ئێوەو لەوانەش جگە لە خودا لەبەریان دەپاڕێنەوە، دوور دەگرم‌و دەپاڕێمەوە لە پە روەرندەم. بەڵکو لە بانگکردنی پەروەردگارم تووشی چارەڕشی نەبم. ئیبراهیم(سەلامی خودای لێبێت) لەماوەی ژیانیدا داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی دەکرد، بەڵام کاتێك کە لەسەر بت پەرستی مردو بەتەواوی بۆی دەرکەوت کە بەبێ دینی مردووە، حاشای لێکردو ئیتر داوای لێخۆشبوونی بۆنەکرد وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴾[2] کە ئیبراهیم داوی لێخۆشبوونی بۆ باوکی کرد، تەنیا بۆ بەجێهێنانی بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، بەڵام کاتێك کە سوور زانی دوژمنی خودایە، ئیتر هیچ خۆی تێنەگەیاندا لە فە رموودەیەکی سەحیحدا هاتووە کە ئیبراهیم دەگات بە ئازەری باوکی لە ڕۆژی قیامەتدا، ئازەر پێی دەڵێت: ئەمڕۆ لە قسەت دەرناچم‌و بەگوێت دەکەم، ئیبراهیمش دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئایا بەڵێنت پێنەدام کە تۆ سەرشۆڕم نەکەیت لەڕۆژی زیندووبوونەوەدا، چ سەرشۆڕیەك لەمە سەرشۆڕترە لە باوکم کە بێ بەشە لە بەزەیی تۆ، وتراوە: ئەی ئیبراهیم سەریری ئەوە بکە لە دواتەوە، کەمتیارێکی پیسی بینی بە چوارپەل هەڵگیراو فڕێدرایە ناو ئاگر[3].

## دەرکەوتنی نیشانەکانی یەکتاپەرستی (التوحید) لە ئیبراهیمدا (سەلامی خودای لێبێت)

---

[1] مريم (٤١– ٤٨).

[2] التوبة (١١٤).

[3] فتح الباری (٦/٤٤٥).

خـــودای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ هـــەر بەوشێوەیەش، ئێمە نیشانی ئیبراهیممان کە دەستەڵاتی هەموو شتێك لە ئاسمانو زەمینـدا بەدەسـت کێـە. واتـە: بۆمـان ڕوونکـردەوە لـە ڕێگـەی ئـەو بەڵگانـەوە بـۆ وردبوونـەوە لـە دەسـتەڵاتی وەدیهێنەرەکەیانو تاكو تەنیایی خـودای مـەزن لـە خاوەنیـەتیو دروستکردنیدا. کـە هـیچ پەرستراوو پەروەردگاریەك نیە جگە لە خودا خۆی. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾[1] ئـەی موحەممـەد (ﷺ) بڵـێ: سـەیریکەن چـی لـە ئاسمانـەکانو زەمینـدا هەیـە. وە دەفـــەرموێت: ﴿ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴾[2] ئایـــا ئەمانـــە سەیری پاشو پێشەوەی خۆیان نەکردووە، لەم ئاسمانو زەمینەدا؟ ئەگەر ئێمە بمانـەوێت وادەکـەین زەمین قوتیان بدات یان چەند پارچەیەکی ئاسمانیان بەسەردا دەخەینەخوار، لەمەدا نیشانەیەك هەیە بۆ هەربەندەیەك کە بیەوێت بگەڕێتـەوە، پاشـان دەفـەرموێت: ﴿وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴾ تـا لـە ڕیـزی بـاوە ڕداره ڕاسـتەقینەکان بێـت. ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴾ کە شەوی بەسەرداهاتو تاریکداهات، ئەستێرەیەکی بەدی کرد وتـی: ئەمـە پەروەردگارمـە هـەر کـە لەبەرچـاو ئـاوابوو، وتـی: هەرچـی ئاوابێـت مـن خۆشـم ناوێـت. قـەتادە وتـی: دەیزانـی کـە پەروەردگاری ئەو هەر بووەو هەردەبێتو نەمانی بەسـەردا نایـات[3] ﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ وەختێك کە دیـتی مـانگ هـەڵهات، وتـی: ئەمە پەروەرێنمە، کە ئەویش لەبەرچاونەما، ئەگـەر پـەروەرێنی (ڕاسـتەقینە) خـۆی شارەزام نـەکات، منیش لە گومڕایان دەبم ﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُ ﴾ کاتێك کە دیـتی وا خـۆر لە کەل سەردەردێنێت، وتی: ئەمە پەروەرێنمە، ئەمە لەوانەی ترب گەورەترە. واتـە: لـە ئەسـتێرەو لـە مـانگ گـەورەترەو زۆر ڕووناکتریشە ﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴾ کـە خـۆریش ئـاوابوو وتـی: گەلەکـەم بەڕاسـتی مـن لەوبتانـەی ئێـوە

---

[1] یونس (١٠١).

[2] سبأ (٩).

[3] الطبری (١١/٤٨٠).

دەیانکەنە هاوبەشی خودا بێزارمو تەکیمەوە. واتە: یەکتاپەرستمو عیبادەتیشم هەر بۆ ئەو خودایەیە کە وەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەمینە کە لە پێشدا وت نەبوونو لە بت پەرستی دوورەپەرێزمو پوودەکەمە یەکتاپەرستی. هەربۆیە خودای مەزن لەسەر زمانی ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) دەفـــــــــەرمووێت: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ وا من بەپاکی پووم کردە ئەوکەسەی کە ئاسمانانو زەمینی دروستکردووەو لەوانە نیم شەریکی بۆ پەیدادەکەن.

**ئەمە شوێنی ڕووبەڕووبوونەوەیە بەرامبەر بت پەرستان**

لەڕاستیدا ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) لەم جێگایەدا ڕووبەڕووی گەلەکەی بووەتەوەو پڕوپوچی ئەوشتانەی گەلەکەی بۆ ڕوونکردونەتەوە لە پەرستنی پەیکەرو بتەکان، لەجێگای یەکەمدا لەگەڵ باوکیدا ڕووبەڕووبووەتەوە، هەڵەکانی دەخستەبەر چاویان لە پەرستنی بتەکانی سەرزەوی لەوێنەی فریشتەی ئاسماندا، تاکو تکایان بۆبکەن لەلای دروستکەری گەورە، ئەوانەی خۆیان لەوە بەسوكو ڕیسواتردەزانی کەڕاستەوخۆ ئەو خودایە بپەرستن، بەڵکوبەهۆی پەرستنی فریشتەکانەوە خۆیان نزیك دەکەنەوەلێی. هەتا تکایان بۆبکەن لەلای خودا کە ڕۆزیان بداتو سەریان بخاتو هەرشتێکی تریش کە پێویستیان پێیەتی. وە لێرەشدا هەڵەو گومڕاییەکانی بۆ ڕوونکردونەتەوە لە پەرستنی پەیکەرەکان، وەك پەرستنی حەوت ئەستێرە گەڕۆکە سەرسوڕهێنەرەکان کە بریتین لە مانگو خۆرو عوتاریدو مەریخو زوهرەو موشتەرىو زوحەل. ڕووناکترینو بەڕێزترینیان لەلای ئەوان خۆربووە، پاشان مانگ پاشان زوهرە. ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) یەکەمجار تێی گەیاندون کە ئەم زوهرەیە بۆئەوە ناشێت بپەرسترێت، چونکە خۆی ناگەڕێت بەڵکو ماوەیەکی کەمی بۆدیاریکراوە تێیدا بڕوات. ناتوانێت بەلای ڕاستو چەپیدا بڕواتو هیچی بەدەستی خۆی نیە، بەڵکو ئەستێرەیەکە لەو ئەستێرانە کە خودا بە ڕووناکی دروستی کردووە. خودا خۆی لەکارزانی هەرەمەزنە خۆی دەزانێت لەبەرچی وا دروستی کردووە. لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێتو پاشان دەڕوات بەرەو خۆرئاواو لەبەرچاو ون دەبێت. پاشان لە شەوی دوایشدا بەهەمان ئێوە دەست پێدەکاتەوە. شتی ئاوا بۆ پەرستن ناشێت. پاشان گواستیەوە بۆ مانگ. ئەوشتانەی لەودا ڕوونی کردەوە بەهەمان شێوە لەبارەی مانگیشەوە ڕوونی کردەوە. پاشان چووەسەر خۆر هەر بەوشێوەیە. کاتێك خودایەتی ئەم سێ ئەستێرەیەی هەڵوەشاندەوە کە لە هەموو ئەستێرەکانی تر ڕووناکتربوون بەچاو ببینرێن. بە بەڵگەی تەواو پێی سەلماندن ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ﴾ وتی: گەلەکەم بەڕاستی من لەوبتانەی کە دەیانکەنە هاوبەشی خودا بێزارمو هەرگیز نایانپەرستمو بە خودایان نازانم. ئەگەر خودا هەرچی فروفێڵی ئەوانە بەکاری بێنن هیچ مەوەستن ﴿إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ وا من ڕووم‌کردە ئەوکەسەی کە ئاسمانانو زەمینی دروستکردووە و لەوانە نیم شەریکی بۆ دادەنێن. بەڵکو وەدیهێنەری ئەوانە دەپەرستم کە بەڕێوەیان دەباتو ڕامی هێناونو هەموو شتێك بەدەستی ئەوەو هەر ئەو خوداو پەروەردگارو خاوەنیشیانە. وە لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ

ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[1] پەروەردگارتان ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکان‌و زەمینی لە شەش ڕۆژدا دروستکرد، پاشان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی العرشی دامەزرا، بە شەوو ڕۆژ دادەپۆشرێت‌و ڕۆژیش بەپەلە دەکەوێتە شوێنی شەو، خۆرو مانگ‌و ئەستێرەکانی بەدیهێناوەو هە ر لەژێر فەرمانی ئەودان، دروستکردن‌و ڕاگەیشتن هەر بۆ ئەوە، پاك‌و بێ عەیبە پەروەردگاری گشت جیهان. وە لەبارەی ئیبراهیمەوە (سەلامی خودای لیبێت) خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾[2] لەمەوپێشیش ئیبراهیمان لەکارەکانی شارەزاکرد، هەمیشە ئاگامان لێ بووە. لەوکاتەدا کە بە باوك‌و هۆزەکەی وت ئەم پەیکەرانە چین کە ئێوە دەیپەرستن؟ لێرەدا دە ردەکەوێت کە ئیبراهیم (سەلامی خودای لیبێت) ڕووبەڕووی باکی‌و هۆزەکەی بووەتەوە کە خەریکی بت پەرستی بوون. وازی لێ نەهێناون‌و بەردەوام ئامۆژگاری کردوون کە دەست لە بت پەرستی هەلگرن.

﴿وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا ۚ فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾﴾

خودای گەورە باسی ئیبراهیمی خەلیل(سەلامی خودای لیبێت) کاتێك کە هۆزەکەی مشت‌ومڕیان لەگەڵدا کرد لەبارەی ئەوەی کە پێی دەوتن دەبێت تەنها هەر خودا بپەرستن، ئەوانیش ڕووبەڕووی دەبوونەوەو داوایان لەو دەکرد دژی بتەکانی ئەوانەوەستێت وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ﴾ هۆزەکەی کێشەو شەڕیان پێ دەفرۆشت، ئیبراهیم وتی: ئێوە چۆن لەبارەی من لەبارەی خودایەکەوە کێشەو مشت‌ومڕدەکەن کە ئەو منی شارەزاکردووە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەو. هەر ئەویش ڕێنماو ڕێ نیشاندەریش بووە بۆ سەر ڕێگای ڕاست. من بەڵگەی تەواوم بەدەستەوەیە لەلایەن ئەوەوە ئیتر چۆن گوێ بەوقسە پڕوپوچ‌و خراپانەی ئێوە دەدەم ﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا﴾ هیچ ترسێکم لەوانە نیە کە دەیانکەنە

---

[1] الاعراف (٥٤).

[2] الانبیاء (٥١– ٥٢).

شەریکی ئەو، هەرشتێك پەروەردگارم مەیلی لێبێت هەروا دەبێت. لەوبەڵگانەی کە دەبێتە پوچەڵکردنەوەی قسەکانی ئێوە، ئەوبتانەی ئێوە دەیانپەرستن ناتوانن هیچ شتێك بکەن‌و من لێیان ناترسم‌و هەر گوێشیان پێ نادەم، ئەگەر توانای هەر فرۆفێلێکیان هەیە ددەی پێیان بڵێن، با درێغی نەکەن دژی من بیکەن، هیچ نەوەستن. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا﴾ ئەم دەقەئیستسنای مونقەتیعە واتە: جگە لە خودا هیچ کەسێك قازانج‌و زیان بەکەس ناگەیەنێت ﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ زانیاری پەروەرنەدی من هەموو شتێك دەگرێتەوە، واتە: زانیاری خودا دەوری هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێکی شاراوەی لێ ون نابێت ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ ئایا ئێوە بیرناکەنەوە؟ واتە: پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن‌و نازانن کە ئەوبتانە شتێکی پرپوچن، شوورەیی ناکەن کە دەیانپەرستن. ئەم بەڵگەیە وێنەی ئەو بەڵگەیە کە پێغەمبەری خودا هود (سەلامی خودای لێبێت) هێنایەوە بۆ هۆزەکەی خۆی عاد، وەك خودای مەزن لە کتێبەکەیدا واتە لە قورئاندا باسی کردووە دەفەرموێت: ﴿قَالُوا يَـٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا أَنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1] وتیان: ئەی هود تۆ هیچ بەڵگەت لە خوداوە بۆنەهێناوین، هەر بەقسەی تۆش ئێمە لە پەرستراوەکانمان هەڵناگرین، برواش بە تۆ ناهێنین. ئێمە هەر ئەوەندە دەڵێین رەنگە هەندێك لەوانەی ئێمە دەیانپەرستین تووشی گرفتێکیان کردبێت، هود فەرمووی: خودا بە شایەد دەگرم، ئێوەش هەر شایەد بن من دوورم لەوەی کە ئێوە دەیپەرستن. جگە لە خودا، هەمووتان فێڵم لێ بکەن‌و مۆڵەتم مەدەن. من خۆم سپاردووە بەو خودایە کە پەروەردگاری من‌و پەروەردگاری ئێوەشە، هەرشتێك دەجوڵێتەوە هەموو شتێك بەدەستی ئەوە بێگومان رێگەی پەروەردگارم راستەرێیە. لێرەداخودای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم(سەلامی خودای لێبێت) دەفەرموێت: ﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا﴾ من چۆن دەبێ لەوبتانە کە ئێوە دەیانپەرستن بترسم؟ کە ئێوە ناترسن‌و ئەوبتانە بە شەریکی خودا دەزانن‌و هیچ بەڵگەیەکی بتەوتان بۆ نەهاتووەتەخوارەوە. ئیبنو عەبباس‌و کەسانی تریش لە زانایانی

[1] هود (٥٣– ٥٦).

پێشینە دەڵێن: ﴿سُلْطَٰنًا﴾ واتە: بەڵگە[1]، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾[2] ئایا ئەوان شتانی وا بەشەریکی خودا دادەنێن، کە ئاینێکی وایان بۆ دانابن کە خودا ڕێگای پێنەداوە. وە دەفەرموێت: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾[3] تەنیا ئەوانە چەند ناوێکن کە ئێوەو باب‌و باپیرانتان، ئەونەیان پێ ناوناون‌و خوداش هیچ بەڵگەی بتەوی لەبارەی ئەوانەوە نەناردووە. پاشان دەفەرموێت: ﴿فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ دەی کەواتە کام لەم دوودەستەیە زیاتر شیاوی نەترسانە. واتە: کام دەستەو کۆمەڵ ڕاسترە، ئەوەی کە ئەوەی پەرستووە کە قازانج‌و زیانی بەدەستە یان ئەوەی شتێکی پەرستووە نە قازانجی هەیەو نە زیان بەبێ بەڵگەش. کام لەمانە پتر شیاوەی نەترسانە لە سزای خودا لە ڕۆژی قیامەت؟ خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ئەوکەسانەی بڕوایان بەخودا هێناوەو بڕواکەیان تێکەڵی ناهەقی نەکردووە، دڵنیاین بۆ ئەوانە، شارەزای ڕێی خودا ئەوانەن. واتە: ئەوەکەسانەی بەصاکی‌و دڵسۆزی عیبادەتیان بۆ خودا کردووە بە تەنیا شەریکیان بۆ دانەناوە لە هیچ شتێکدا، ئایا ئ ەوانە دڵنیان لە ڕۆژی قیامەتداو شارەزای ڕێگای خودان لە دونیا قیامەتدا.

**ناهەقی زۆر گەورە شەریك دانانە بۆ خودا**

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە وتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ ئەوانەی بڕواکەیان تێکەڵی ناهەقی نەکرد. هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: جا کێمان ناهەقی لەخۆی نەکردووە؟ ئەم ئایەتەهاتەخوارەوە[4]، ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[5] بێگومان شەریك بۆ خودا بڕیاردان ناهەقیەکی زۆر گەورەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە وتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ ئەوە زۆر لەسەر خەڵکی گران بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کێ لە ئێمە ناهەقی لەخۆی نەکردووە؟ فەرمووی: (بێگومان ئەوە بەوشێوە نیە ئێوە لێی تێدەگەن، ئایا گوێتان لە قسەی عەبدەچاکەکە

---

[1] الطبری (۱۱/٤٩١).

[2] الشوری (۲۱).

[3] النجم (۲۳).

[4] فتح الباری (۸/١٤٤).

[5] لقمان (۱۳).

نەبووە کە وتی: ﴿لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ بێگومان ئەو شەریك دانانەیە)، واتە: ئەوە شەریك دانانە بۆ خوداو ناهەقیەکی گەورە لەخۆکردنە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ﴾ ئەمانە چەند بەڵگەیەك بوون، کە دابوومان بە ئیبراهیم کە بەرمبەر هۆزکەی خۆی ڕابووەستێت. موجاهیدو کەسانی تریش وتوویانە مەبەست بەو بەڵگەیە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ﴾ من چۆن دەبێت لەوبتانەی ئێوە دەیانپەرستن بترسم؟ کە ئێوە ناترسن‌و ئەوبتانە بە شەریکی خودا دادەنێن‌و هیچ بەڵگەیەکی بتەوتان بۆ نەهاتووەتەخوارەوە. بێگومان خودای مەزن ڕاستی فەرمووە دڵنیایی پێ بەخشی‌و شارەزاشی کرد وەك دەفەرمووێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ پاشان دوای ئەمانە هەموو خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ ئەمانە چەند بەڵگەیەك بوون کە دابوومان بە ئیبراهیم بەرامبەر بە هۆزەکەی خۆی ڕابووەستێ، هەرکەسێك ئێمە مەیلمان لێبێت پلەی ڕێزلێنانی بەرزدەکەینەوە بێگومان پەروەردگارت لەکارزان‌و ئاگادارە. واتە: لەکارزانە لە کردارو گفتاریدا. ئاگای لەوانەشە کە شارەزایان دەکات یان گومڕایان دەکات. با بەڵگەو نیشانەشی بۆ ناردبێت‌و نیشانیشی دابێت. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾[1] ئەوکەسانەی وتەی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتەدی ئیتر بڕواناهێنن با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێت هەتا ئازاری بەژان بەچاوی خۆیان دەبینن. هەربۆیە خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ زۆر لەکارزان‌و زانایە.

﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ

[1] یونس (٩٦– ٩٧).

عِبَادِهِۦۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكْفُرْ
بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ قُل لَّآ
أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾

**بەخشینی ئیسحاق و یەعقوب بە ئیبراهیم( سەلامی خودایان لێبێت ) لەکاتی پیریدا**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَۚ كُلًّا هَدَيْنَاۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا﴾ ئێمە ئیسحاق و یەعقوبمان هەر بەو خەڵات کرد هەموو لەشمان شارەزای ڕێی خۆمان کرد خودای گەورە باسی ئەوەدەکات کە ئیسحاق و یەعقوبی بەخشی بە ئیبراهیمی دوای ئەوەی کە لە تەمەندا بەساڵداچووبوو خۆی و خێزانەکەشی سارا خاتوون نائومێدبوون لە منداڵ. ئەو فریشتانەی دەچوون بۆ سەر هۆزی لووت هاتنەلای ئیبراهیم، مژدەی ئیسحاقیان دا بە خۆی و هاوسەرەکەی، هاوسەرەکەی سەری لەوە زۆر سوڕماو ﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ﴾[1] ژنە وتی: وای لەمن، ئاخۆ منی پیرێژن منداڵم دەبێت و ئەم هاوسەرەشم پیرەمێردە؟ بەڕاستی شتێکی سەیرە. وتیان: ئایا فەرمانی خودات پێ سەیرە؟ خێزانی ئەم ماڵە بەزیی و پیتی خوداتان بەسەردا برژێت پایەبەرزی و پیاهەڵدان هەر لەخۆی دەوەشێتەوە. واتە: هەر خودا شایەنی سوپاس و ستایشە. فریشتەکان مژدەیان دا بە ئیبراهیم و هاوسەرەکەی بە وەچە لە دوای خۆیان و وەچەکانیش دەبنە پێغەمبەر وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[2] مژدەی ئیسحاقیشمان پێدا کە دەبێتە پێغەمبەرێکی شیاو لایەق. ئەمە لە مژدەو لە بەهرەش گەورەترە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾[3] ئێمە مژدەمان دا بە ئیسحاق لەدوای ئیسحاق بە یەعقوبیش. واتە: ئەم منداڵەتان کە ئیسحاقە، منداڵێکی لەچیانی خۆتاندا پێدەدەین کە یەعقوبە. چاو و دڵتان پێی شاد دەبێت، وەك چۆن بە ئیسحاق چاو و دڵتان شادبوو. چونکە شادبوون بە منداڵی منداڵ زیاترە بۆ مانەوەی وەچەو بنەماڵە. لەبەرئەوەی منداڵی پیاوێکی بەساڵاچوو لەگەڵ ژنێکی تەمەن درێژ گومان دەکرێت نەبێتە وەچەی دواڕۆژ لەبەر لاوازی و کەم توانایی. مژدەکە وادرا کە دوای ئیسحاق ئەویش منداڵێکی دەبێت بەناوی یەعقوب کە مانای وەچەو بەرە دەگەیەنێت، ئەمەش

---

[1] هود (٧٢- ٧٣).

[2] الصافات (١١٢).

[3] هود (٧١).

پاداشتێك بوو بۆ ئیبراهیم(سەلامی خودای لێبێت) لەلایەن خودای بالآدەستەوە، كاتێك كە وازی لە هۆزەكەی هێناو لێیان دووركەوتەوەو بەجێی هێشتن لە وڵاتەكەیان‌و ڕۆیشتن بۆ خوداپەرستی لەسەر زەویدا. خوداش لەجێی هۆزو كەس‌وكارەكەی پاداشتی دایەوەو قەرەبووی بۆ كردەوەو منداڵی چاكی پێ بەخشیله پیشتی خۆی‌و لەسەر ئاینەكەی، هەتا چاوی لێیان ڕووناك ببێتەوە. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا﴾[1] جا كە ئەوانەی وەلاناو وازی لەوشتانە هێنا كە ئەوان بێجگە لە خودا دەیانپەرست، ئیسحاق‌و یەعقوبمان دایەو گشتمان كردن بە پێغەمبەر. وە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا﴾ پاشان دەفەرموێت: ﴿وَنُوحًا هَدَيْنَا﴾ لەپێش ئەواندا نووحیشمان بەرەوخۆمان ڕێ نیشانداو وەچەی چاكمان بە ئەویشدا.

## تایبەتمەندی نووح‌و ئیبراهیم (سەلامی خودایان لێبێت)

هەریەكێك لەم پێغەمبەرانە(سەلامی خودایان لێبێت) تایبەتمەندیەكی خۆی هەیە، بە نیسبەت نووح پێغەمبەرەوە(سەلامی خودای لێبێت) خودای مەزن كاتێك كە خەڵكی سەر زەمینی هەموو خنكاند بێجگە لەوانەی كە بڕوایان پێی هێنا. ئەوانیش، ئەوكەسانەبوون كە لە كەشتیەكەدا لەگەڵی بوون‌و خودای گەورە هەر وەچەكانی ئەوی هێشتەوە. ئەم خەڵكە هەموو لە نەوەی ئەون. ئیبراهیمی خەلیلش(سەلامی خودای لێبێت) خودا هیچ پێغەمبەرێكی لەدوای ئەو نەناردووە مەگین لە وەچەی ئەوە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾[2] پێغەمبەرو كتێبیشمان كردە بەشی نەتەوەی ئەو. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾[3] ئێمە نووح‌و ئیبراهیمشمان نارد، پلەی پێغەمبەرایەتی‌و كتێبشمان دا بە نەتەوەكەیان وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَٰنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾[4] ئەوانە لەو پێغەمبەرانەن كە بەرچاكەی خودا كەوتن. لە ڕەگەزی باوكە ئادەم بوون. ئەوانەش لەگەڵ نووحدا هەڵمانگرتن‌و لەتۆرەمەی ئیبراهیم‌و ئیسرائیل‌و ئەوكەسانەی خۆمان شارەزامان كردن‌و هەڵمان بژاردن،

---

[1] مريم (٤٩).

[2] العنكبوت (٢٧).

[3] الحديد (٢٦).

[4] مريم (٥٨).

هەرکاتێك نیشانەکانی خۆیانیان بەسەردا خوێندرایەوە، دەمەوڕوو دەکەوتنە زەوی بۆ سوژدەو بەکۆ دەگریان. وە لێرەشدا لەم ئایەتەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ﴾ واتە: لەناو وەچەی ئەویشدا داودو سولەیمانیشمان شارەزاکرد زەمیرەکە لە ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ نووح، چونکە نزیکترین کەسە وەك دیارەو هیچ کرفتێکی تێدانیە[1] ئیبنو جەریرش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە. گەڕانەوەی زەمیرەکە بۆ ئیبراهیم لەبەرئەوەیە کە باسەکە لەبارەی ئەوەوەیە، بەڵام لووت (سەلامی خودای لێبێت) کێشەی لەسەر دروست دەکات. چونکە لە وەچەی ئیبراهیم نیە. بەڵکو برازایەتی کوڕی مارانی کوڕی ئازەرە. مەگەر بەشێوەی زاڵ بوون بگوترێ‌و بخرێتە ناو وەچەی ئیبراهیمەوە. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾[2] ئایا ئێوە ئاگاتان لێ بوو، کە لەگەڵیاندا یەعقوب بە ڕۆڵەکانی خۆی وت: لە دوای من چی دەپەرستن؟ وتیان: هەرچی تۆ پەرستووتە دەیپەرستین کە باب‌و باپیرانی تۆ، ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاقیش هەر ئەوەیان پەرست، خودای تاك‌و تەنیایە‌و ئێمەش خۆمان بەو دەسپێرین. ئیماعیل(سەلامی خودای لێبێت) مامی یەعقوب بووە چووەتە ڕێزی باب‌و باپیرانیەوە لەبەر نزیکی لێیانەوە وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ۝٣٠ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴾[3] فریشتە گشت سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس، ملی نەدا لەگەڵ سوژدەبەرەکان بێتز ئیبلیس خراوەتەناو فەرمانی فریشتەکانەوەبۆ سوژدەبردن، لەسەر بێ گوێیەکەی زەمی کراوە، چونکە وەك ئەوانە سەیرکراوە. چییان لەگەڵدا کراوە ئەمیش لەگەڵیان کراوەلەبەر نزیکی لێیانەوە. ئەگینا ئەو لە جنۆکەیە‌و سروشتی لە ئاگرە‌و فریشتەش لە ڕووناکیە وە لە باسی عیسادا(سەلامی خودای لێبێت) لە وەچەی ئیبراهیمە یان نووحە لەسەر ڕایەکی تر، بەڵگە هەیە کە منداڵی کچ دەچێتە ڕێزی وەچەی پیاو، لەبەرئەوە عیسا(سەلامی خودای لێبێت) خراوەتەپاڵ ئیبراهیم بەهۆی دایکیەوە، چونکە باوکی نەبووە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حەربی کوڕی ئەبی ئەسوەدەوە وتی: حەجاج ناردی بۆلای یەحیای کوڕی یەعمەر پێی وت: هەواڵم پێدراوە کە تۆ دەڵێیت حەسەن‌و حوسەین لە نەوەی پێغەمبەرن(ﷺ) لە قورئاندا شتی وات دیوە. من هەر لەسەرەتای

---

[1] الطبری (١١/٧٠٥).

[2] البقرة (١٣٣).

[3] الحجر (٣٠– ٣١).

قورئانەوە هەتا کۆتایی خوێندوومەتەوە ئەم دیوە؟ وتی: ڕاست دەکەی[1]، هەربۆیە پیاوێك وەسیەتی کرد بۆ وەچەکانی یان شتێکی وەقف کرد لەسەر وەچەکانی یان پێی بەخشین. منداڵی کچیش دەگرێتەوەو بەری دەکەوێت. بەڵام ئەگەر پیاوێك دای بە کوڕەکانی یان وەقفی لەسەرکردن، ئەوا هەر تایبەتە بە کوڕەکانیەوەو کوڕی کوڕەکانیەوە لە پشتی خۆی. پاشان خودای گەورە دەفەرموویەێت: ﴿قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لەناو وەچەی ئەودا داودو سولەیمانو ئەیوبو یوسفو مووساو هارونمان خستەسەر ڕێگا، ئێمە ئاوا پاداشتی باش بە کارچاکان دەدەینەوە. هەروەها زەکەریاش یەحیاو عیساو ئەلیاسیش هەموویان لە پیاوچاکان بوون. ئیسماعیلو ئەلیەسەعو یونسو لووتیش هەروەها. هەموویانمان لە خەڵکی سەرزەوی، زیاتر ڕێزلێناون. ﴿وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ لە بابو باپیرو منداڵو براکانیان، هەندێکمان هەڵبژاردنو شارەزای ڕێی ڕاستمان کردن. ئەو هەڵبژاردنە هەموولایەکیانی گرتەوە لە بابو باپیانو وەچەو براکانیان. هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾.

## بت پەرستی هەموو کردارەکانی مەردوم لەناودەبات هەتا هی پێغەمبەرانیش

پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ ئەم شارەزایی کردنە لەلای خوادیە، بۆ هەرکەسێك لە بەندەکانی کە مەیلی لێبێت، بەرەوخۆی ڕێی نیشان دەدات. واتە: ئەوەی کە دەستیان کەوتووە بە یارمەتیو ڕێنمایی خودایە ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ خۆ ئەگەر شەریکیان بۆ خودا پەیدابکردایە کردوەیان هەموو بەفیڕۆدەچوو، ئەم بەتوندگرتنی کاری بت پەرستیو گرنگی پێدانی تەواوی پێ دەردەخاتو هەڕەشەیەکی گەورەیە لەوکەسانەی کە شەریك بۆ خودا دادەنێن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾[2] ئێمە بە تۆو ئەوانیش کە بەرلەتۆبوون، ڕامانگەیاند، هەرکەسێکی تر بپەرستی کارەکانت بەفیڕۆدەچێت. ئەمە مەرجێکە، ئەم مەرجەش مانای

---

[1] الدر المنثور (٣/٣١١).

[2] الزمر (٦٥).

ئەوەنیە کە بێتەجێ، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾[1] بڵێ: ئەگەر خودا فەرزەندی بێت، من یەکەمین کەسێکم کە دەیپەرستم. وەك ئەم ئایەتەش: ﴿لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ﴾[2] ئەگەر ئێمە بمانویستایە کاری هەوەنتە هەڵبژێرین هەر لای خۆمان هەڵمان دەبژارد. ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾[3] ئەگەر خودا بیویستایە منداڵی بۆ خۆی دابنایە لەوخەڵکەی دروستیان دەکات بە مەیلی خۆی هەڵی دەبژارد. پاکی‌و بێ عەیبی بۆ ئەوە هەر ئەوە خودای تاك‌و تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ﴾ ئەوانە کەسانێك بوون کە کتێبی خۆمان پێداون‌و لەکارزانێدا ڕامان هێنان‌و کردمانن بە پێغەمبەر. واتە: ئەوبەهرانەمان پێ بەخشین وەك بەزەیی‌و سۆزێك بۆ مەردوم لەلایەن ئێمەوە ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰؤُلَاءِ﴾ ئەگەر ئەمانە بڕوایان پێ نەکەن. واتە: بە پێغەمبەریەکەیان. هەڵیشی دەگرێت زەمیرەکە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شێ شتە، کتێب‌و لەکارزانی پێغەمبەرێتی. مەبەست بە ﴿هَٰؤُلَاءِ﴾ خەڵکە مەککەیە، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباس‌و سەعیدی کوڕی موسیب‌و زەحاك‌و قەتادەو سوددی‌و کەسانی تریشە[4] ﴿فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ ئێمە ئەوکارە دەدەینە کۆمەڵێکی وا کە بڕوایان پێیان هەبێت‌و بێ بڕوانەبن پێی. واتە: ئەگەر ئەوانەی کە بڕوای پێ ناکەن لە قورەیشیەکان‌و کەسانی تریش لەسەر زەمیندا لە عەرەب‌و عەجەم‌و خەڵکی ئاینەکانی تریش، ئێمە ئەوکارە دەسپێرینە گەلانی تر. واتە: کۆچەری‌و ئەنسارەکان‌و شوێنکەوتوانی ئەوان هەتا ڕۆژی قیامەت ﴿لَّيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ بێ بڕواش نابن پێی‌و حاشا لە هیچ شتێکی ناکەن‌و تەنیا پیتێکی ناگێڕنەوەو بڕوایان بە هەمووی دەبێت چ ئایەتی (محکم) بێت یان (متشابە) بێت داوامان وایە لە خودا ئێمەش لەگەڵ ئەوانەدا کۆبکاتەوە بەڕێزو کەرەم‌و چاکەی خۆی. پاشان خودای گەورە ڕوودەکاتە پێغەمبەرو عەبدی خۆی موحەممەد (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوانە، ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران لەگەڵ ئەوانەی کە خرانەپاڵیان لە باب‌و باپیرو وەچەو براکانیان کە

---

[1] الزخرف (٨١).

[2] الانبياء (١٧).

[3] الزمر (٤).

[4] الطبری (١١/٥١٥/٥١٦).

ئەمانیش وەك ئەمان ﴿الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ﴾ کەسانێك بوون خودا ڕێنموونی کردن، هەر ئەوانەش شایەنی ئەو ڕێنماییە بوون کەسی تر شایەنی نەبوون ﴿فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ تۆ هەر لە شوێنی ئەوان بڕۆ. کاتێك ئەمە فەرمانێك بێت بە پێغەمبەر(ﷺ) کرابێت، ئوممەتەکەش بەدوای ئەودا دەڕۆن لەوشتانەی کە فەرمانیان پێ دەکاتو دادەنێت. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لەم ئایەتەدا کە موجاهید پرسیاری کردووە لە ئیبنو عەبباس ئایا مەبەستت ئەوانەیە کە لە (ص) سوژدەدان؟ وتی: بەڵێ، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ﴾ هەتا دەگاتە ﴿فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ پاشان فەرمووی ئەویش لەوانە، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەمەی بۆ زیادکراوە لە موجاهیدەوە وتی: وتم بە ئیبنو عەبباس وتی: پێغەمبەرەکەشتان (ﷺ) لەوکەسانەیە کە فەرمانی پێدراویە لە شوێنی ئەوان بڕوات[1]، پاشان خودای گەورەدەفەرموێت: ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: خۆ من هیچ پاداشتێکم لێتان ناوێت. واتە: لە گەیاندنی ئەم پەیامەدا بە ئێوە هیچ شتێکم لە ئێوە ناوێتو داوای هیچتان لێ ناکەم ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَالَمِينَ﴾ ئەو قورئانە تەنها هەر ئامۆژگاریەکە بۆ هەموو خەڵکی دونیا وە ڕێنماییە لە وێڵیەوە بۆ شارزەاییو لە سەرگەردانیەوە بۆ ڕێی ڕاست لە خودانەناسیەوە بۆ بڕواهێنان.

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾﴾

## ئادەمیەتی پێغەمبەرو ناردنی قورئان بۆی (ﷺ)

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ وەك پێویستە خودا بناسرێت، نەیانناسی، کە پێغەمبەرەکەی خۆی بۆ ناردن. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو عەبدوڵلای کوڕی کەسیر وتیان: ئەم ئایەتانە لەسەر قوڕەیش هاتەخوارەوە[2]، وتراویشە: لەسەر جوولەکە هاتووەتەخوارەوە ﴿إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ﴾ ئەوکاتەی وا وتیان: خودا هیچ شتێکی بۆ هیچ ئادەمیەك نەناردووە. وەك خودای

[1] فتح الباری (١٤٤).
[2] الطبری (١١/٥٢٤).

گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ ﴾[1] ئایا مەردوم سەریان سوڕماوە، پیاوێکمان هەر لەناو خۆیاندا ڕاسپاردووە کە: خەڵکی بترسێنێت. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ إِلَّا أَن قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴾[2] تەنیا بیانووی ئەوخەڵکە (کە شارەزاییان بۆهاتو بڕوایان پێ نەکرد) ئەمەیە کە دەڵێن: چۆن خودا ئادەمەیەك بە پێغەمبەر دەنێرێت؟ بڵێ: ئەگەر فریشتە بەڵنیایی لەم زەمینە بڕۆیشتنایە، ئێمە لە ئاسمانەوە پێغەمبەری فریشتەمان بۆ دەناردن. لێرەشدا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ﴾ خودای مەزنیش دەفەرمووێت: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ﴾ بڵێ: ئەی کێ ئەو کتێبەی ناردووە کە مووسا هێنای ڕووناکیو شارەزایی بوو بۆ مەردوم؟ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ)بڵێ بەوکەسانەی کە ملْ نادەنو دەڵێن هیچ کتێبێك لەلایەن خوداوە نەنێرداوە ﴿الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ﴾ کێ ئەو کتێبەی ناردووە کە مووسا هێناویەتی؟ ئەو تەوراتەی کە چاك زانیوتانەو هەمووکەسێك دەزانێت، کە خودا ناردوویە بۆ عیسای کوڕی عیمران کە ڕووناکیو شارەزایی بوو بۆ خەڵکی. بە ڕووناکیەکەی هەموو گیروگرفتێکی خۆتان پێ چارەسەر دەکرد، لە گومانە ناڕەواکان خۆتان پێ دەپاراستو شارەزادەکرد. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ کتێبێك کە پەڕەپەڕەی دەکەنو بەشێکی کەمی نیشانی خەڵکی دەدەنو بەشی زۆری دەشارنەوە. واتە: تەورات هەموو پەڕەپەڕەدەکەن لە کتێبە ئەسلیەکەدا نوسیوتانەو بە ئارەزووی خۆتان دەیگۆڕنو مانای دەکەنو دەڵێن: ئەمە لەلایەن خوداوە هاتووە. واتە: لە تەوراتدا هاتووە کە خودا ناردوویەتی. کەچی ئەوەی ئێوە دەیڵێن لەلایەن خوداوە نەهاتووە. هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ﴾ بەوکتێبە شتانێکتان پێ فێرکرا کە نەخۆت نە باب‌و باپیرانتان نەتاندەزانی. واتە: کێ ئەم قورئانەی ناردووە؟ هەر خودایە کە ئێوەی تێدا شارەزاکردووەو ئاگاداری کردوون لە هەواڵی لەمەوپێشو ئەوشتانەش کە لەمەوبەدوا دێت، کە ئێوەو باب‌و باپیرانیشتان هیچیان لەوبارەیەوە نەدەزانی. ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو

[1] یونس (٢).

[2] الاسراء (٩٤- ٩٥).

عەبباسەوە وتی: بڵێ: هەر خودا ناردوویەتی ﴿ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ تۆ ئیتر وازیان لـێ بێنـە بـا بەگاڵتەکردنەوە خۆیان خەریك بکەن. واتە: وازیان لێ بێنە با لە نەفامیو گومڕایی خۆیاندا بڕۆن. هـەتا لەلایەن خوداوە مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوکاتە دەزانن ئایا پاشەڕۆژ بۆ ئـەوان بـووە یـان بـۆ عەبدە لەخوداترسەکان. پاشان خودای مەزن دەفـەرموویت: ﴿(٩١) وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾ ئەم قورئانەشمان بۆ تـۆ بـە خـەڵات نـاردووەو موبارەکەو ئەوانەشـی لەلای ڕاستە کە لـە پێشدا ڕەوانـەکراون. تـا تـۆ بـەهۆی ئـەم قورئانـەوە خـەڵکی مەککەو دەوروبـەری بترسێنێت لەو عەرەبانەو ئەوخەڵکانەی تریش لە نەوەی ئادەم لـە عـەرەبو عەجـەمی پـێ بترسـێنێت. وەك لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموویت: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾[1] بڵـێ: خەڵکینە بزانن من خـودا نـاردومی بـۆ ئێـوە هـەمووتان بەگشتی. وە دەفـەرموویت: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[2] تا بەهۆی ئەم قورئانەوە ترس بخەمەبەر ئێوە هەرکەسێکیش کە پێی دەگات. وە دەفـەرموویت: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ﴾[3] هەرکەسێکیش لەوکۆمەڵانە بـڕوای پـێ نـەکات جێـی لـە ئـاگر خـۆش کـراوە. وە دەفــەرموویت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾[4] مەزنایەتیو پایەبەرزی بۆ خودایە ئەم قورئانەی بۆ عەبدی خۆی ناردەخواری، تـا ببێتـەهۆی تـرس بـۆ هەموو خەڵکی جیهـان. وە دەفەرموویت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾[5] بەوکەسـانە کـە بوونـە ئـەهلی کتێـبو بەوکەسانەش کە نەزانن، بڵێ: ئایا ئێوەش وەك ئێمە خۆتـان هـەر بـەخودا سپاردووە؟ ئەگـەر خۆیـان سـپاردبوو، ئـەوا کەوتوونەتەسـەر ڕێگـا، ئەگـەر ڕوویـان لـێ وەرگێڕای، تـۆ هـەر ئەوەنـدەت لەسـەرە ڕاییەگەیەنێت. خودا خۆی شارەزای عەبدەکانیەتی. لە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە کە پێغەمبـەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێدراوە، بە هیچ کەسێك لە پێغەمبەرەکانی تر نەدراوە لـە پـێش مندا) یەکێك لەوانـەی باسـی کـرد فـەرمووی: (پێغەمبـەری وا هـەبوو ڕەوانـەدەکرا بـۆ گەلەکـەی خـۆی

---

[1] الاعراف (١٥٨).
[2] الانعام (١٩).
[3] هود (١٧).
[4] الفرقان (١).
[5] ال عمران (٢٠).

بەتایبەتی، (بەلام) من ڕەوانەکراوم بۆ هەموو خەڵکی بەگشتی)[1] هەربۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە قیامەت هەیە، دیارە باوەڕی پێ دێنن. واتە: هەموو ئەوانەی بڕوایان بە خوداو ڕۆژی قیامەت بووە. بڕواشیان بەوکتێبە پیرۆزەش هەیە، کە بۆ تۆ هاتووەتەخوارەوە ئەی موحەممەد (ﷺ) (کە ئەم قورئانەیە) پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانە پارێزگاری لە نوێژەکانیشیان دەکەن. واتە: نوێژە فەرزەکان بەتەواوی بەجێ دێنن لەکاتی خۆیدا.

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾﴾

**هیچ کەسێك لەوە ستەمکارترنیە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستێ و دەڵێ نیگام بۆ هاتووە**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ کێ لەوکەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خوداوە بکات؟ بڵێت: لە خوداوە نیگام بۆ هاتووە، هەرگیز هیچ نیگایەکی لە خوداوە بۆ نەهاتووە، یان بڵێت: من لەوێنەی ئەوانەی کە خودا ناردویە دەتوانم بۆتان بنێرم؟ عیکرەمەو قەتادە وتیان: ئەم ئایەتە لەسەر موسەیلەمەی درۆزن هاتەخوارەوە[2]، واتە: هیچ کەسێك لەوستەمکارانەی کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێت و هاوبەش و منداڵی بۆ بڕیاربدات و بڵێت خودا ڕەوانەی کردووە بۆ سەر خەڵکی و ڕەوانەشی نەکردووە. وە بڵێت: ئەویش دەتوانێت وەك خودا نیگبنێرێت و دژایەتی ئەوقورئانەی پێ بکات کە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا﴾[3] هەرکاتێك نیشانەکانی ئێمەیان بۆبخوێننەوە، دەڵێن: ئەگەر حەزمان بکردایە ئێمەش وەك ئەمەمان دەوت.

---

[1] فتح الباری (٥١٩)، مسلم (١/٣٧٠).

[2] الطبری (١١/٥٣٣/٥٣٥).

[3] الانفال (٣١).

**ژیانی ئەم ستەمکارانە لەکاتی مردن و ڕۆژی قیامەت دا**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ﴾ خۆزگە لەکاتی گیان کێشاندا تۆ ستەمکارانت بدیتایە. واتە: لەکاتی سەختی و پێگیران و گرانی ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ کە فریشتە لێیان ڕاساوەتەوە کە لێیان بدەن وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي﴾[1] وتی: ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژبکەی کە بمکوژی. وە دەفەرمووێت: ﴿وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ﴾[2] دەست و زمان دەخەنەکار بۆ ئازاردانتان. زەحاك و ئەبوسالح وتیان: ﴿بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ واتە: بەدەست و زمان ئازارتان دەدەن[3]، وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾[4] ئەگەر ببینی کاتێك کە خودانەناسان فریشتە گیانیان دەردێنن و دەکێشن بە دەم و چاو و پشتیاندا. هەربۆیە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ فریشتە لێیان ڕاساوەتەوە کە لێیان بدەن هەتا گیانیان لە لاشە دێتەدەرەوە. بۆیە پێیان دەڵێن: ﴿أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ﴾ گیانتان لە لاشە دەربکەن. ئەوە بۆ خودانەناسانە لەکاتی گیان کێشاندا فریشتەکان مژدەی سزای سەخت و جەزرەبەدان و کۆت و زنجیرو جەهەننەم و دەستەوەو ملەجەڕێ کردن و لێدانی فریشتەکان هەتا گیانی لە لاشە دەردێنن و پێیان دەڵێن: ﴿أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾ گیانتان لە لاشەتان بێنەدەر، وا ئەمڕۆ لە تۆڵەی ئەوەی کە درۆتان بەدەم خوداوە هەڵبەست. واتە: ئەمڕۆ سوکایەتیەکتان پێدەکرێت بەکەس نەکرابێت لە تۆڵەی ئەودرۆکرنەتان بەدەم خوداو ﴿وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ خۆتان بە زل دەزانی بەرامبەر نیشانەکانی خودای مەزن. لەم فەرموودەی دەماودەمدا چۆنیەتی گیان کێشانی خاوەن باوەڕو خودانەناسدا لەکاتی مردن دا هاتووە لەکاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ

---

[1] المائدة (٢٨).

[2] الممتحنة (٢).

[3] الطبری (١١/٥٣٩).

[4] الانفال (٥٠).

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ﴾[1] خودا لە دونیاو لە قیامەتدا بە قسەی بتەو بڕواداران توندو قایم دەکاتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەروەك تاکە تاکەو بە تەنیا لە پێشدا، ئێوەمان دروستکرد هەرواش دێنەوەلامان، لە ڕۆژی قیامەتدا کە زیندوودەکرێنەوە. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾[2] بە ڕیز دەخرێنە بەردەم پەروەردگارت، وەك یەکەمجار دروستمان کردوون هەر ئاوا هاتونەتەوەلامان. واتە: چۆن دروستمان کردن ئاواش زیندووتان دەکەینەوە. هەرچەندە ئێوە بڕوا بەوە ناکەنو بەدووری دەزانن. سائەمە ڕۆژی زیندووبوونەوەیەو دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ﴾ هەرچیش ئێمە پێمان دابوون لە دواتانەوە بەجێما. واتە: هەرچی بەدەستتان هێنابوو لە خزمەتگوزەرانیو ماڵو سامان لە دوای خۆتانەوە بەجێتان هێشت. وە لە فەرموودەی سەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئادەمی هەر دەڵێت: سامانەکەم سامانەکەم دەی ئایا هیچی سامانەکەت هی تۆیە، بێجگە لەوەی خواردووتەو تەواوات کردووە یان لەبەرت کردووەو دڕیوتە یان بەخشیوتە لە چاکەداو بووەتە پاشەکەوت بۆت، ئیتر بێجگە لەوە دەڕاتو بەجێی دەهێڵێت بۆ خەڵك)[3] حەسەنی بەسری وتی: ئەوەی ئادامە دەهێنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا وەك ئەوەی باری هەڵگرتبێت، خودای مەزن دەفەرمووێت: کوا ئەوەی کۆت کردبووەوە؟ دەڵێت: ئەی پەروەردگارم، کۆم کردەوەو بەجێم هێشت زۆر شتی تریش بووە. پێی دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم کامەیە ئەوەی پێشت خستووەوبۆ خۆت؟ هیچ شتێك نابینێت پێشی خستبێت. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَـٰٓؤُاْ﴾ ئەوکەسانە نابینین لەگەڵتان کە لاتان وابوو تکاکارانو بە شەریکی خۆتا زانین. ئەم سەرزەنشتو تانەدانەلێیان لەسەرئەوەی کە لە دونیادا ئەوبتانەیان کردبووە شەریکی خودا وایاندەزانی ئەوبتانە بەهرەیان پێ دەگەیەنێت لە ژیانیدا لە ڕۆژی دواییشدا دێن بەهانایانەوە ئەگەر لەوێ زیندوبوونەوە بە ڕاست دەرچوو ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ دیارە ئێستا لە یەکتری

---

[1] ابراهيم (٢٧).
[2] الكهف (٤٨).
[3] مسلم (٢٢٧٣/٤).

جیابوونەوەو هەرچی بە خەیاڵ داتان نابوو هەمووی بەهیچ دەرچوو. واتە: هۆکارەکان نەماو پڕوپوچ نەماو ڕۆیشت ئەویش بە خەیاڵ دایان نابوو بە هاواریانەوەبێت‌و ون بوو نەما. لەوکاتەدا خودای مەزن بالادەست لەلای ئەوخەڵکەدا کۆکراوەتەوە بانگیان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾[1] کوانی ئەوانەی بە خەیاڵ دەتانوت شەریکن لەگەڵ من؟ واتە: لەگەڵ خودا دەیبیانهێنن. وە پێیان دەوترێت: ﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴾[2] ئەورۆژە پێیان دەڵێن: لە کوێن ئەوانەی دەتاپەرستن، بێجگە لە خودا؟ ئایا ئەوانە دێنە هاناتان یان داوای هانادەکەن؟ بۆیە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟﴾ ئەوکەسانە نابینن لەگەڵتان کە لاتان وابوو تکاکارانن‌و بە شەریکی خۆتا زانین. واتە: دەتانپەرستن‌و بە ئەرکی خۆتان دەزانی پەرستنیان. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ ﴾ دیارە ئێستا لە یەکتری دابڕاون‌و جیابوونەتەوەو ئەوهۆکارانە نەمان ﴿وَضَلَّ عَنكُم ﴾ لێتان ون بوون‌و ڕۆیشتن ﴿مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ ئەوەی ئێوە بە خەیاڵ داتان نابوو کە تکاتان بۆ بکەن لەو بت‌و شەریکانە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾[3] لەوکاتەدا کە ئازارو جەزرەبەتان دێتەبەرچاو، ڕێبەرەکان شوێنکەوتووەکانی خۆیان حاشادەکەن‌و پەیوەندیان لە یەکتری پچڕاوە. شوێنکەوتووەکان لەوکاتەدا دەڵێن: ئای خۆزگە هەر جارێکی تر دەگەڕاینەوە سەر دونیا، وەك ڕێبەرەکانمان حاشا لە ئێمە دەکەن، ئێمەش حاشامان لەوان دەکرد، خودا ئاوا کرداری خۆیان لێ دەکاتە داخ‌و خەفەت‌و بۆ هەمیشەش هەر لەناو ئاگردا دەبن. وە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾[4] هەرکاتێك فوو بە کەڵەشاخ دا کرا، نەخزمایەتی لە نێوانیان دەمێنێت‌و نە کەسیان لەکەس دەپرسێت. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ

---

[1] الانعام (٢٢).
[2] الشعراء (٩٢- ٩٣).
[3] البقرة (١٦٦- ١٦٧).
[4] المؤمنون (١٠١).

بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾[1] ئێوە لەباتی خودا بۆیە بتەکان دەپەرستن، کە لە ژینی دونیادا ئێوە یەکترتان خۆشدەوێت، پاشان لە ڕۆژی قیامەت دا حاشا لە یەکتری دەکەن‌و نەفرین بۆ یەکتری دەنێرن، جێگەشتان لەناو ئاگر دەبێت‌و کەسیش یارمەتیتان نادات. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ ﴾[2] پێیان دەڵێن: شەریکەکانتان بانگ بکەن، بانگیان دەکەن، هیچ وەڵامیان نادەنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ ﴾ ڕۆژی قیامەت گشتیان کۆدەکەینەوە، بەوکەسانەی کە شەریکیان بۆ خودا داناوە. هەتا دەگاتە: ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾[3] ئەوشتانەش کە ئەوان بەدرۆ دەیانوت لەناوچوون.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾

### ناسینی خودا بەهەندێك لە نیشانەکانی

خودای مەزن دەفەرمووێت کەهەر خۆی دانەوێڵەو دەنکی میوە لەت دەکات. واتە: دەیقڵیشێنێتەوە لەناو خۆڵدا، بەهۆی ئەو دەنکانەوە کشتوکاڵ سەوز دەکات بەهەموو جۆرەکانیەوە لەو دانەوێڵە، وە لە دەنکی میوە، هەموو جۆرە بەرو بومێکی دەڕوێنێت هەر یەکە تام‌و بۆن‌و ڕەنگ‌و شێوەیەکی هەیە هەر بۆیە کە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ﴾ خوا دانەوێڵەو دەنکی میوە لەت دەکات. پاشان تەفسیری ئەم دەقە، بەم دەقەی دوای تەفسیر دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّ ﴾ هەر ئەویشە زیندوو لەمردوو دەردێنێت‌و مردوو لە زیندوو دەردێنێت. واتە: ڕوەکی زیندوو لە دانەوێڵەو دەنکی میوە دەردێنیت‌و کەبێ گیانەو مردووە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ وەهەر لە زەویدا وردبینەوە نیشانەی

---

[1] العنكبوت (٢٥).

[2] القصص (٦٤).

[3] الانعام (٢٢– ٢٤).

تێدایە بۆیان بەمردوویی ئێمە زیندوومان کردەوەو دانەوێڵەمان لێ بەرهەم هێناون ئەوان لێی دەخۆن.
هەتا دەگاتە ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1]
پاكو بێ عەیبی هەر بۆ ئەو خودایە، کە جووتەی هەموو شتێکی وەدی هێناوە، چ لەوانەی لەم سەر زەمینە دەڕوێنو چ لەخۆیانو چ لەوانەشی کەنایزانن. زانایانی تەفسیر ئەم ڕستانەیان تەفسیر کردووە هەر کەسەو بەپێی بۆچوونو لێکدانەوەی خۆی بەڵام هەموویان ماناکەیان لەیەکەوە نزیکە. هەندێك وتوویانە: پەلەوەر لە هێلکە دەردێنێتو بە پێچەوانەشەوە. هەندێکی تر وتویانە: منداڵی چاك لەکەسی بەدفەرەوە دەخاتەوەو بەپێچەوانەشەوە چەندین بۆچوونو ڕای تریش لەم ڕستانە کە ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوەو لێی وەردەگیرێت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ ئەوە خودای ئێوەیە، دەسا ئێوە چۆن لەڕێگا لادەدرێن؟ واتە: وەدی هێنەری ئەو شتانە ئەو خودایە کە شەریکی نیە. کەواتە چۆن لەهەق لادەدەنو بەرەو پڕو پوچ دەچنو لەگەڵ خودادا شتی تر دەپەرستن
﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا﴾ هەر ئەوە تاریکایی شەوگار لادەداتو سپێدەی بەرە بەیانتان بۆ دەخاتە ڕوو، شەویشی بۆ پشوودان داناوە. واتە: هەر خودایە تاریکاییو ڕووناکی دروست کردووە. وەك لەسەرەتای سورەتەکەدا دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾[2] خودا تاریکاییو ڕووناکی وەدی هێناوە. واتە: خودای پاكو بێ عەیب تاریکایی شەو شەق دەکات لەبەرەبەیانداو دونیا ڕووناك دەکاتەوە خۆر هەڵدێتو تاریکایی دەڕواتو نامێنێت، شەوگار بەو ڕەشاییو تاریکیو نوتەکیەوە دەڕواتو ڕۆژ بەو تیشكو ڕووناکیەوە دێت. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾[3] ڕۆژ بەشەو دادەپۆشێتو ڕۆژیش بەخێرا دەکەوێتە شوێنی شەو. خودای مەزن دەستەڵاتی خۆی ڕوون کردوەتەوەو دەرخستووە لە دروستکردنی ئەم هەموو دژە یەكو لەیەك جیاوازەدا. کە گشتی بەڵگەیە لەسەر دەستەڵاتی تەواو گەورەی ئەو، تاریکایی شەو لادەداتو سپێدەی بەرەبەیان دەردەخات. لەبەرامبەری ئەویشدا دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا﴾ شەویشی داناوە بۆ پشوودانو ئارامو تاریکی کردووە هەتا هەموو شتێك تیایدان پشوو بدات، وە دەفەرکووێت: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ۝١

---

[1] یس (٣٣-٣٦).
[2] الانعام (١).
[3] الاعراف (٥٤).

﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾[1] سوێند بەو شەوە کاتێك هەموو شتێك دادەپۆشێت، بەڕۆژەش کاتێك ڕووناك دەبێتەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا (٣) وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾[2] سوێند بەڕۆژەش کە خۆر تیا دەردەکەوێ، بەوشەوەش کە خۆر دادەپۆشێت. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗا﴾ خۆرو مانگی بۆ ژمارەی ئێوە دانا. واتە: بەشێوەیەکی وردو بە ئەندازەیەکی ڕێکو تەواو دەڕواتو هەژماردەکەنو ناگۆڕێنو تێك ناچێت. بەڵکو هەریەکەیان شوێنێکی خۆیان هەیەو پێیدا دەڕۆن لە هاوینو زستان دا. بەوهۆیەوە جیاوازی نێوان شەو ڕۆژ پەیدادەبێت بە درێژبوون یان بە کورت بوونەوە. وەك دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ﴾[3] ئەوخوادیەی کە خۆری کردە تیشدەرو مانگی تریفەدار کردو چەند قۆناغی بۆ دیاری کرد. وە دەفەرموێت: ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾[4] نەخۆر توانای ئەوەندەی هەیە بگات بە مانگ. نە شەویش پێشی ڕۆژ دەکەوێت هەمووشیان لە ئاسمانێکن مەلەدەکەن وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾[5] خۆرو مانگو ئەستێرەکانی بەدیهێناوەو لە ژێر فەرمانی ئەودان. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ خودا خاوەن دەسەڵاتی زانا ئەم کارەی کردووە. واتە: هەمووشتێك بە بڕیاری خودای خاوەن دەسەڵات ڕۆیشتووە کە ڕێگری نیەو کەس ناتوانێت دژایەتی بکات، ئاگاداری گشت شتێکەو کەمتر لە گەردیلەیەکیش لێی ون نابێت نە لە ئاسمانەکانو نە زەمیندا ئاگای لێیەتی، زۆرجار کە خودای مەزن باسی دروستکردنی شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی کردووە کۆتاییەکەی بە دەسەڵاتو زانایی خۆی هێناوە وەك لەم ئایەتەدا فەرمووی، وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێت: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ (٣٧) وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾[6] بۆ ئەوانە، شەویش یەکێکە لە نیشانەکان، ئێمە ڕۆژی لێ دادەڕنین لەناکاو تاریکاییان بەسەردادێت.

---

[1] الليل (١-٢).

[2] الشمس (٣- ٤).

[3] يونس (٥).

[4] يس (٤٠).

[5] الاعراف (٥٤).

[6] يس (٣٧- ٣٨).

خۆریش بەرەو بنكەی خۆی لە گەڕاندایە كە لە خاوەن دەستەڵاتی زاناوەیە، ئەو فەرمانی پێداوە.
كاتێك كە خودای گەورە باسی دروستكردنی ئاسمانەكانو زەمینو ئەوەی تیایاندایە كردووە لەسەرەتای سورەتی (حم)ی سوجدەدا پاشان دەفەرموێت: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾[1] ئاسمانی دونیامان بە چراكان ڕازاندەوەو پاراستمان. خاوەن دەستەڵاتی زانا بڕیاری ئەوكارەی داوە. پاشان لێرەدا خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ هەر ئەویشە ئەستێرەكانی بۆ خستوونەتەڕوو، تا بەوانە لە تاریكی وشكانیو دەریادا ڕێ دەربكەن هەندێك لە زانایانی پێشینە وتویانە: هەركەسێك بێجگە لەو سێ شتە بڕوای بەم ئەستێرانە ببێت هەڵەی كردووەو درۆی بەدەم خوداوە كردووە، بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمانو كەرەسەی ڕاونانی شەیاتینەكانو بە خستنەڕووی ئەوانە لە تاریكایی وشكانیو دەریا ڕێ دەربكرێت ﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ﴾ ئێمە بۆ كەسانێك زانان، نیشانەكانمان بەڕوونی شیكردووەتەوە. واتە: نیشانەكانمان بەتەواوی ڕوونكردووەتەوە بۆ ئەوكەسانەی خاوەن ئاوەزو زانانو هەق دەناسنو لە پڕوپوچ خۆیان بەدوور دەگرن.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾﴾

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞ﴾ هەر ئەویشە ئێوەی لە تەنیا كەسێك وەدیهێناوە، لە دوای ئەوە لە شوێنێك كۆی كردوونەتەوەو دایمەزراندون. واتە: لە ئادەم (سەلامی خودای لێبێت) ئێوەی وەدیهێناوە. وەك لە ئایەتێكی تریشدا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗ﴾[2] ئەی خەڵكینە لە پەروەردگاری خۆتان بترسن، كە هەر ئەوە ئێوەی لە یەك كەسەوە خستووەتەوەو هاوسەرەكەشی هەر لەوكەسە خستووەتەوە، لەو دووانەوە پیاوی زۆرو ژنی زۆری وەدیهێنا. ئیبنو مەسعودو ئیبنو

---

[1] فصلت (١٢).

[2] النساء (١).

عەبباس‌و ئەبو عەبدوڕەحمانی سولەیمی‌و قەیسی کوڕی ئەبوحازم‌و موجاهیدو عەتاو ئیبراهیمی نەخەعی‌و زەحاك‌و قەتادەو سوددی‌و عەتای خۆراسانی‌و کەسانی تریش وتویانە: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ﴾ واتە: لەناو منداڵداندا. ﴿وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ زۆرینەی زانایانی پێشینە دەڵێن: پشت(صلب)[1] ئیبنو مەسعودو کۆمەڵێکی تریان بە پێچەوانەوە وتویانە. دیسان ئیبنو مەسعودو دەستەیەکی تر وتویانە: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ﴾ واتە: لە دونیا کۆی کردوونەتەوەو ﴿وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ واتە: کاتی مردن جێگیری دەکات‌و دادەمەزرێنێت. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ بۆ ئەوکەسانەی تێ دەگەن نیشانەکانمان ڕوون‌و شیکردووەتەوە. واتە: بۆ ئەوانەی لە قسەی خودا تێ دەگەن‌و ماناکەی دەزانن. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ هەر خۆیەتی لە ئاسمانەوە ئاوی بارانی بۆ ئێوە باراند. بە ئەندازەو ئاوێکی پیرۆزەو هۆی بژێوی‌و ژیان‌و ئاودێری گشت دروستکراوێکە، بەزەییە لەلایەن خوداوە. بۆ وەدیهێنراوەکانی ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ﴾ هەموو ڕووەکمان پێ ڕواند. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ﴾[2] هەموو زیندەوەرێکمان لە ئاو دروستکردووە ﴿فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا﴾ ڕووەکی سەوزمان تێدا ڕواند. واتە: کشتوکاڵ‌و درەختی سەوزو پاشانیش دانەوێڵەو بەروبوومیشمان لێ وەدیهێنا. بۆیە دەفەرموێت: ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ وە لەو دانەوێڵە، دانەی لەسەریەك کەڵەکەبوومان (وەك گوڵەگەنم‌و جۆ) وەدیهێنا ﴿وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ﴾وە لە دار خورما لەچەند پەلێکی هێشوی پڕو شۆڕەوە بوومان وەدی هێنا. وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ﴿قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ﴾واتە: ئەو دار خورما کورتەی کە پەلەکانی بەهێشوەکانیەوە شۆڕ بوەتەوە بۆ زەوی[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە. ﴿وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ﴾ لەگەڵ باغاتێك لە ڕەز. واتە: باغاتی ڕەزی لێ دەردەهێنین ئەم دووجۆرە میوەیە لە چاکترین میوەیە لەلای خەڵکی حیجاز. وە لەوانەشە لەچاکترینی میوەش بن لە گشت جیهاندا، وەك چۆن خودای مەزن منەت دەکات بەسەر بەندەکانیداو پێیان دەفەرموێت: ﴿وَمِن

---

[1] الطبری (١١/٥٦٥/٥٧٠).

[2] الانبياء (٣٠).

[3] الطبری (١١/٥٧٦).

ثَمَرَاتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ﴾[1] وە لە بەرهەمی دارخورماو ڕەزەکانیشی سەرخۆشکەرو بژێوی باش دروست دەکەن، ئەمە لە پێش حەرامکردنی مەیدا بووە. وە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ ﴾[2] هەر لە زەوی چەندین باخی خورماو ڕەزی ترێمان وەدیهێناوە. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ وە زەیتونو بنەهەناری هاوێنەی لە یەکترجیامان بەرهەم هێناوە. قەتادەو کەسانی تریش وتویانە: هاوێنە لە گەڵاو شێوەداو زۆرێك لە یەکترو جیا لە بەرهەمو دیمەنو تامو ڕەنگدا[3]، ﴿ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ﴾ وەختێك میوەیان پێدەگات سەیری بکەن. بەڕای کوڕی عازیبو ئیبنو عەبباسو زەحاكو عەتای خوراسانیو قەتادەو کەسانی تریش وتویانە ﴿وَيَنْعِهِۦٓ﴾ واتە: کە پێگەیشت.[4] واتە: بیر لە دەستەڵاتی وەدیهێنەرەکانی بکەنەوە کە لە نەبوونەوە درستی کردوون، دارێك بوو، بوو بە ڕەزەتریو چەندین شتی تریش لەم جۆرە کە خودای مەزن دروستی کردوون لە هەمەڕەنگو شێوەو تامو بۆن. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ﴾[5] لەم زەمینەدا زۆر پارچە لەلای یەکتری دا هەیە، هەروەها باخاتی ڕەزو کشتوکاڵو داری خورمای ئی یەکترو لە یەك جیاش، هەموو لە یەك ئاو ئاودەدرێنو پاراودەبن بەڵام ڕێزی هەندێکیان دەدەین بەسەر هەندێکیاندا لە خواردن دا. هەربۆیە لێرەدا خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ بێگومان لەوانەدا زۆر نیشانەی خودا هەیە بۆ کەسانێك کە بڕوایان بە خودا هەیە. واتە: ئەی خەڵکینە بەڵگە زۆرن لەسەر دەستەڵاتی تەواوی خودای کە وەدیهێنەری ئەم شتانەیەو بەزەیی ئەو دەردەخات، بۆ ئەوکەسانەی کە بڕوایان پێی هەیەو شوێنی پێغەمبەرانی دەکەون (سەلامی خودایان لێبێت).

﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾

---

[1] النحل (٦٧).

[2] یس (٣٤).

[3] الطبری (١١/٥٧٨).

[4] الطبری (١١/٥٨٢).

[5] الرعد (٤).

**زەمی بتپەرستان**

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ﴾ لە جنۆکە شەریکیان بۆ خودا دادەنا، کە خوا خۆی دروستی کردبوو. بە خەیاڵی خۆیان دەبێت کوڕو کچی هەبێت، بەبێ زانیاری. خودا پاكو بەرزترە لەوباسانەی ئەوان دەیکەن. ئەمە وەڵامە بۆ ئەو بت پەرستانەی کە لەگەڵ خودادا شتی تریان پەرستووەو کردوویانن بە شەریکی لە پەرستن دا، خودای مەزن پاكو بێ عەیبو بەرزترە لەوشتانەی کە دەیکەنەپاڵی. خۆ ئەگەر پێیان بوترێت: چۆن دەستاندایە جنۆکەپەرستی کاتێك ئێوە هەر خریکی بت پەرستی بوون؟ لە وەڵام دا دەڵێن: بۆیە پەرستوویانن مەگین لەبەر گوێڕایەڵیو فەرمانی ئەوان بووە. وەك ئەم ئایەتانە کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾[1] ئەوانە لەباتی خودا هانا دەبەنە چەند بتێك خۆیان ناوی مێینەیان لێ ناون، دیارە ئەوان هەر هانادەبەنەبەر ئەو شەیتانەی کە سەرپێچیی کردووەو دەرکراوە. خودا نەفرینی لێکردووەو ئەویش لە وەڵام دا وتویەتی: شەرت بێت لە عەبدەکانی تۆ بۆ خۆم جیابکەمەوە گومڕایان دەکەمو بە ئاواتو خەیاڵی درۆینە سەرگەرمیان دەکەم، فەرمانیان پێ دەدەم گوێچکەی ئاژەڵەکان ببڕن، فەرمانیشیان پێ دەدەم کە شێوەو بچمی ئەوشتانەی کە خودا دروستی کردووە بیگۆڕنو تێکی بدەن جا هەرکەسێك خودا نەیەوێتو لەگەڵ شەیتان ببێتە دۆست، دیارە چەندێك زیانمەند دەبێت. بەڵێنیان پێ دەداتو دەیانخاتەسەر ئارەزوو. ئەوبەڵێنەی کە شەیتان بەوانی دا فریودان نەبێت شتێکی تر نیە. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموویێت: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي﴾[2] ئایا ئێوە شەیتانو تورەمەی ئەو، بێجگە لە من دەکەنە دۆستی خۆتان. ئیبراهیمیش(سەلامی خودای لێبێت) بە باوکی وت: ﴿يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا﴾[3] ئەی باوکە، شەیتانپەرست مەبە،

[1] النساء (١١٧– ١٢٠).

[2] الكهف (٥٠).

[3] مريم (٤٤).

شەیتان لە فەرمانی خوا سەرپێچی کرد. ئەم وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾[1] ئاخر ئەی نەوەی ئادەم، من لەپێش دا پەیمانم لەگەڵ نەبەستن کە شەیتانە نەپەرستن. هەر تەنیا خۆم بپەرستن، کە ڕێگەی ڕاست هەر ئەمەیە، فریشتەکانیش لە ڕۆژی قیامەت دا دەڵێن: ﴿سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴾[2] خودایە هەر تۆی پاكو بێ عەیبی، هەر خۆت گەورەی هەموومانی ئێمە ئەوانە ناناسین. بەڵكو ئەوانە جنۆکەیان دەپەرستو بەشی زۆریان باوەڕیان بەمان نەهێنابوو. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ﴾ لە جنۆکەکان شەرکیان بۆ خودا دانابوو، کە خوا خۆی دروستی کردوون. کە خودا خۆی دروستی کردوون چۆن هاوبەشی بۆ دانەنێنو لەگەڵی دا دەیپەرستن. وەك خودای گەورە لە زمانی ئیبراهیمەوە دەفەرموویێت: ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾[3] وتی: ئاخۆ ئێوە شتێك دەپەرستن هەر خۆتان دایدەتاشن، کە هەر خودایە ئێوەشو کردەوەتانی وەدیهێنا. واتە: هەر خودا خۆی خەڵکی دروستکردووە، دەبێت هەر بەتەنیاش بپەرسترێت، تاكو تەنیایەو شەریکی نیە. پاشان خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بە نەزانی خۆیان وا خەیاڵ دەکەن، دەبێت کوڕو کچی هەبێت. لێرەدا خودا ئاماژە بە گومڕایی دەکات کە ڕێگایان ون کردووەو بە خەیاڵی خۆیان وا دەزانن کە خودا منداڵی بۆ خۆی داناوە. وەك جوولەکە دەڵێن عوزەیر فەرزەندی خودایەو وە ئەوکەسانەش لە مەسیحیەکان کە دەڵێن عیسا کوڕی خودایەو بت پەرستەکانی قورەیش دەڵێن فریشتەکان کیژی خودان، خودای گەورە پاكو بێ عەیبەو بڵندەو دوورە لەوشتانەوە کە ناهەقیکاران دەیڵێن. واتە: خودانەناسان بوختانو درۆیان کردووەو خۆیان ئەوقسانەیان هەڵبەستووە وەك زانایانی پێشینەوتویانە. بۆیە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ خودا پاكو بەرزترە لەوباسانەی ئەوان دەیکەن. کەواتە خودا زۆر پیرۆزو پاكو بێگەردو گەورەترە لەونەفامو گومڕایانە باسی دەکەنو بە خەیاڵی خۆیان دەڵێن کە خودا کوڕو کچو هاوبەشی هەیە.

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾﴾

---

[1] یس (٦٠- ٦١).

[2] سبأ (٤١).

[3] الصافات (٩٥- ٩٦).

**ماناى داهێنەر (البديع)**

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ داهێنەرى ئاسمانو زەمینە. واتە: دروستکەرو وەدیهێنەرو داهێنەرى ئاسمانەکانو زەمینە، بەبێ ئەوەى لە وێنەى پێشوییان بچێت وەك موجاهیدو سوددى وتویانە هەر لەم وتەوە(البدعة) ناونراوە بە بیدعە[1] چونکە لەپێش دا وێنەى نەبووە. ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ چۆن دەبێت مندالى هەبێت؟ ﴿وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞ﴾ کە هیچ ژنى نەهێناوە. واتە: بێگومان مندالٚ خستنەوە لەنێوان دوو شت دا دەبێت کە بۆ یەکترى بشێن. خۆ دیارە هیچ شتێك بۆ خودا ناشێتو لەناوناچێت لە دروستکراوەکانى، چونکە ئەو وەدیهێنەرى هەموو شتێکەو نە ژنى هەیەو نە مندالٚ. وەك خوداى گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴾ تاکو دەگاتە ﴿ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴾[2] وتویانە: خودا بووەتە خاوەن فەرزەندە. ئاى کە قسەیەکى ڕەقتان بەدەم دا هاتووە. هەتا دەگاتە: هەموویان ڕۆژى قیامەت، تاکو تەنیا دێنەلاى ئەو خوداى گەورە بەجوانى ڕوونى کردووەتەوە کە هەر خۆى هەموو شتێکى دروستکردووەو ئاگاشى لە هەموو شتێکە، چۆن دەبێت ژنى هەبێت لە دروستکراوەکانىو بۆى بشێت، کە ئەو خودایەکە وێنەى نیە، کەواتە چۆن دەبێت مندالٚى ببێت. خوداى گەورە پاكو بێ عەیبەو زۆر بەرزترە لەوەى کە ئەوخودانەناسانە دەیلێن.

﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾

**هەر خودا پەروەردگارتانە**

خوداى مەزن دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ﴾ هەر خودایە ئێوەى پەروەردەکردووە. واتە: ئەوکەسەى کە هەمووشتێکى دروستکردووە، مندالٚو ژنى نیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُ﴾ جگە لەو هیچ شتێك بۆ پەرستن نابێت، هەموو ئەو دروستى کردووە، دەبێت بەندایەتى ئەو بکەن. واتە: تەنیا ئەو بپەرستن کە شەریکى نیەو دان بە یەکتاپەرستى ئەو دابنێن، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو نە باوكو نە مندالٚو نە ژنى هەیە. بێ وێنەو بێ هاوتایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ﴾

---

[1] الطبرى (٢/٥٤٠).

[2] مريم (٨٨– ٩٥).

هەر خوا خۆی سەرپەرشتی هەمووشتێك دەكات. واتە: هەر خۆی پارێزەرەو چاودێرەو هەمووكارەكان بەڕێوەدەباتو بژێویشیان دەدات بە شەوو بە ڕۆژ ئاگای لێیانەو كاروباریان بەڕێ دەكات.

## بینینی خودا لە ڕۆژی قیامەت دا

﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ﴾ بە چاو نابینرێتو هەموو بینەرێك دەبینێت. واتە: لە دونیا خودا نابینرێت، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت دەبینرێت. وەك بە هەواڵی دەماودەم پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هاتووە لە چەند ڕێگاوە لە كتێبە سەحیحو سوننەنو موسنەدەكان دا. وەك مەسروق لە عائیشەوە(ڕەزای خودای لێبێت) كە وتویەتی: هەركەسێك وتی موحەممەد (ﷺ) پەروەردگاری بینیوە، بێگومان درۆی كردووە. لە ڕیوایەتێكی تردا: درۆی بەدەم خوداوە كردووە، چونكە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ﴾[1] وە لە فەرموودەی سەحیح دا هاتووە لە فەرموودەیەكی ئەبوموسای ئەشعەری دا (ڕەزای خودای لێبێت) بە مەرفوعی: (بێگومان خودا ناخەوێتو خەوتنیش بۆ ئەو نیە، تەرازوو بەرەوخوار دەكاتو بەرزیشی دەكاتەوە. كرداری ڕۆژی بۆ بەرزدەكرێتەوە پێش شەو، ویشی بۆ بەرزدەكرێتەوە پێش ڕۆژ پەردەی لە ڕووناكیە یان ئاگرە ئەگەر لایبدات ڕووناكی ڕووی تا ئەوشوێنەی كە چاوی پێكەوتووە لە دروستكراوەكانی سوتاوە)[2]، وە لە كتێبە پێشینەكان هاتووە: خودای گەورە كاتێك كە مووسا داوای بینینی كرد، پێی فەرموو: ئەی مووسا بێگومان هیچ زیندوویەك نیە من ببینێت كە بینیمی مەگین مردووە. هیچ وشكێكیش نیە بێ گیان كە بینیمی مەگین لەناوچووە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾[3] كە (خودا) خۆی بۆ كێوەكە دەرخست، هەر بەجارێك كێوەكەی وردوخاش كرد. مووسا بەبێ هۆش كەوت، وەختێك هاتەوەسەرخۆی وتی: پاكیو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە. پەشیمانم، من لە خاوەن باوەڕاندا یەكەمین كەسم. دانپێدانەنانی ئەم دەقە بۆ ئەو بینینە تایبەتیە ئەوەناگەیەنێت كە لە ڕۆژی قیامەت نابینرێت، چۆن مەیلی لێبێت خۆی نیشانی عەبدە خاوەن باوەڕەكانی دەدات. هەربۆیە دایكی موسڵمانان عائیشە (ڕەزای خودای لێبێت) داندەنێت بە بینینی خودای مەزن دا لە ڕۆژی قیامەت داو دانپێدانانێك لە دونیادا بەڵگەش بەم ئایەتە دەهێنێتەوە ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ﴾ ئەوەی كە

---

[1] فتح الباري (٤٧٢/٨)، مسلم (١٥٩/١)، تحفة الاحوذي (٤٤١/٨)، النسائي في الكبرى (٣٣٥/٦)، مسلم (٤٩/٦).

[2] مسلم (١٦٢/١).

[3] الاعراف (١٤٣).

هەستی پێ ناکرێت کە مانای بینینی خودایە بەوشێوەیەی خۆی، بێگومان ئەوە ناشێت نە بۆ ئادەمی نە بۆ فریشتە نە بۆ هیچ دروستکراوێکی تر ﴿وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ﴾ ئەو هەموو بینەرێك دەبینێت. واتە: ئاگای لێیەتی‌و بەوشێوەیەی خۆی دەیناسێت چونکە دروستی کردووە وەك دەفەرمووە ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾[1] ئایا کەسێك وەدیهێنەرە چۆن نازانێت؟ وردبین‌و ئاگادار هەر خۆیەتی. لەوانەیە دەستەواژەی بۆ بینین کردبێت بۆ بینەران وەك سوددی لەم ئایەتەدا وتی: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ﴾ هیچ شتێك ئەو نابینێت ئەو هەمووشت دەبینێت. ئەبولعالیە وتی: ﴿ٱللَّطِيفُ﴾ واتە: وردبینە لە دەرهێنانی دا، ﴿ٱلْخَبِيرُ﴾ ئاگادارە بەشوێنەکەی. والله أعلم.. ئەمە وەك ئەوەیە کە خودا لە باسی لوقمان دا کە لەوبارەیەوە قسە بۆ کوڕەکەی دەکات دەفەرمووێت: ﴿يَـٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾[2] کوڕی خۆم، کردەوەیەك بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك بێت لەسەر زەمین لەناوبەردێك دا یان لەناو ئاسمانەکان بێت خودا دەهێنێتەدەر، خودا هەمووشتێکی لێ دیارەو ئاگادارە.

﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾﴾

**تەفسیری (البصائر)**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾ ئێوە لە پەروەردگارتانەوە چاوی دڵ‌و چەندین بەڵگەی ڕوونتان پێدراوە. (الصائر)بریتیە لەوبەڵگە ڕوون‌و ئاشکرایانەی لە قورئاندایەو پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی هاتووە ﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ﴾ هەرکەسێك بە چاوی دڵ شت ببینێت بە قازانجی خۆیەتی. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرمووێت: ﴿مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾[3] هەرکەسێك شارەزای ڕێ ببێت، شارەزایی بۆ خۆیەتی، هەرکەسێکیش لەڕێ دەرچێت هەڵەبوونەکەی لە دژایەتی خۆیەتی. کاتێك کە باسی چاوی دڵی دەکات دوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن

[1] الملك (١٤).
[2] لقمان (١٦).
[3] الاسراء (١٥).

عَمِيَ فَعَلَيْهَا﴾ هەرکەسێکیش چاوی دڵی نابینایە زیانەکەی هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾[1] بێگومان چاو کوێرنابن، ئەودڵانە کوێردەبن کە جێگەیان لەناو سینەکانە. پاشان دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾ من چاودێری ئێوە نیم. واتە: من پارێزەرو پاسەوانی ئێوە نیم، بەڵکو تەنیا ڕاگەیەنەرم خودا مەیلی خۆیەتی هەرکەسێك شارەزابکات دەیکاتو هەرکەسێکیش گومڕابکات دەیکات. ﴿وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئێمە ئاوا نیشانەکان جۆراوجۆرو ڕوون دەکەینەوە. واتە: چۆن نیشانەکانمان لەم سورەتەدا شیکردەوە لە باسی یەکتاپەرستیو ناسینی خودا بە تەنیا کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، هەر بەوجۆرەش نیشانەکان ئاشکرادەکەینو شی دەکەینەوە لە هەموو شوێنێکدا لەبەر بێ ئاگایی نەفامەکان با هەر ئەو موشریكو خودانەناسو بێ باوەڕانە هەر بڵێن ئەی موحەممەدفێرکراویو خوێندووتەو لەپێشینەکانت وەرگرتووە، لەئەهلی کتێب. ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاكو کەسانی تریشە[2] تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی کەیسانەوە بیستم لە ئیبنو عەبباسەوە دەیوت: خوێندووتەو کێبرکێو مشتومڕت پێکردووە.[3] ئەمە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای مەزن باسی درۆکردنو لاساریان دەکاتو دەفەرموویێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾[4] خودانەناسەکان وتیان: ئەمە هەمووی درۆی خۆیەتیو کەسانی تر لەمەدا یارمەتیان داوە، ئاشکرایە هەرچی وتیان درۆیەو ناهەقی دەکەن. وتیان: ئەمە چیرۆکی پێشینانن، هەموو ئێوارانو بەیانیان بۆی دەڵێنو لەبەری دەنوسێتەوە. دیسان خودای مەزن باسی درۆو بوختانەکانیان دەکاتو دەفەرموویێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ﴾[5] ئەو هەر ڕامامو هەڵی سەنگاند، ئەی بمرێت چۆنی بۆچوو؟ دیسان

---

[1] الحج (٤٦).
[2] الطبری (١٢/٢٧)
[3] الطبرانی (١١/١٣٧).
[4] الفرقان (٤–٥).
[5] المدثر (١٨– ٢٥).

ئەزێت کە چۆنی بۆچوو؟ لەپاشاندا سەیری کرد، ئەوسا ڕووی گرژکردو ترش هەڵگەڕا لەپاشان پشتی هەڵکردو فیزی نواند. ئەوسا وتی: ئەم قورئانە جادوویەکە کە لە کۆنەوە دەیگێڕنەوە، بێ‌و نەبێ ئەمە هەر وتەی مرۆڤە. پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرموویێت: ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ هەتا ڕوونیان بکەینەوە بۆ ئەوانەی کە تێ دەگەن. واتە: تا ڕوونیان بکەینەوە بۆ ئەوکەسانەی کە هەق شارەزادەبن‌و شوێنی دەکەون‌و پڕوپوچش دەناسن‌و لێی دووردەکەونەوە کارو فەرمانەکانی خودا پڕ لەکارزانیە لەبارەی ئەوانەی کە گومڕایان دەکات‌و ئەوانەش کە ڕێی ڕاستیان بۆ ڕوون دەکاتەوە. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموویێت: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾[1] زۆری پێ گومڕادەکات‌و زۆریشی پێ شارەزادەکات. وە دەفەرموویێت: ﴿لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[2] هەتا وابکات ئەوەی شەیتان خستوویەتە ناویەوە، ببێتە بەڵایەك بۆ ئەوانەی دڵیان نەخۆشەو دڵیان ڕەقە. هەتا دەگاتە: ئەوانەی بڕوایان هەبووە بێگومان خودا شارەزای ڕاستەڕێی کردوون وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾[3] ئێمە بێجگە لە فریشتە کەسمان نەکردووە بە کاربەدەستی ئاگر، بۆیە ژمارەکەشمان واداناون تا خودانەناسان تاقی بکەینەوە، ئەوانەش کە کتێبیان پێدراوە هیچ گومانیان نەمێنێت‌و ئەوانەش باوەڕدارن، باوەڕیان زیادبکات، ئەوکەسانەش کە کتێبیان پێدراوەو باوەڕدارانیش، دوودڵ نەبن. تا ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایەو ئەوانەش خودانەناسن بڵێن: خودا لەم نمونەنیشاندانە چی ویستووە؟ئاوا خودا هەرکەسێك بیەوێت گومڕای دەکات‌و کێش بیەوێت شارەزای دەکات‌و سەربازەکانی پەروەردگاری تۆش (بێجگە لە خودا) کەس ژمارەیان نازانێت. باسی (جەهەننەم) تەنیا بۆ بیرەوەری مرۆڤە. وە دەفەرموویێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾[4] ئێمە لەم قورئانەدا شتی وای بۆ دەنێرینکە شیفاو بەزەیی

---

[1] البقرة (٢٦).

[2] الحج (٥٣– ٥٤).

[3] المدثر (٣١).

[4] الاسراء (٨٢).

تێدایە بۆ خاوەن باوەڕان و ستەمکارانیش زیاتر پێی زیانباردەبن. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾[1] بلێ: ئەمە بۆ کەسانێکە باوەڕیان پێی هێناوە شارەزابن و چارەسەری نەخۆشیەکانە. ئەوانەش بڕوای پێ ناکەن، گوێ گرانن لە بیستن و چاویان کوێرە لە بینینی، ئەوانە هەر دەڵێیت لە جێی دوورەوە بانگ دەکرێن. چەندین ئایەتی تریش لەمبارەیەوە هاتووە هەموو بەڵگەن لەسەرئەوەی کە خودای گەورە قورئانی ناردووە ڕێ نیشاندەربێت بۆ لەخواترسان و ئەوەی مەیلی لێبێت بەوقورئانە گومڕای دەکات و ئەوەیش مەیلی لێبێت هەر بەوقورئانە شارەزای دەکات.

﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾﴾

**فەرماندان بە شوێنکەوتنی نیگ (الوحی)**

خودای مەزن فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی و (ﷺ) ئەوانەش شوێن ڕێگەی ئەو کەوتوونکە شوێنی ئەونیگایە بکەون کە ناردوویەتی و دەفەرمووێت: ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ هەر نیگایە لە پەروەردگارتەوە بۆت دێت بەجێی بگەیەنە. واتە: پێی هەڵسەو شوێنی ئەوە بکەوەو ئاکاری چاك بکە، چونکە ئەوەی بۆت دێت لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، هەر ئەوە ڕاست و دروستەو گومانی تێدانیە. ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ جگە لەو کەس بۆ پەرستن ناشێت، تۆ واز لەوانەبێنە کە شەریك بۆ خودا دادەنێن. واتە: لێبوردەبەو چاوپۆشیان لێ بکەو خۆڕاگربە بەرامبەر ئازاردانیان، هەتا خودا خۆی ڕێگای سەرکەوتنت بۆ واڵادەکات و سەرتدەخات و زاڵت دەکات بەسەریاندا، بشزانە، ئەوەش لەکارزانی خۆیەتی کە گومڕایان دەکات. ئەگەر بیویستایە هەموو خەڵکی شارەزادەکردو لەسەرڕێی ڕاست کۆی دەکردنەوە ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟﴾ ئەگەر خودا بیویستایە شەریکیان بۆ دانەدەنا. واتە: بەڵکو بە مەیل و لەکارزانی خۆیەتی ، هەرشتێکی دەوێت یان هەڵیدەبژێرێت. بۆ هیچ شتێك پرسیاری لێ ناکرێت، بەڵکو ئەوان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ ئێمە تۆمان نەکردووە بە چاودێرو پارێزەر بەسەریانەوە. واتە: تۆ بەرپرسیاری کردارو گفتاری ئەوان نیت ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ تۆ بەرپرسیاری ئەوان نیت لە ڕۆزی دان و کاروباریاندا.

---

[1] فصلت (٤٤).

تەنیا تۆ ڕاگەیاندنت لەسەرە. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾[1] تۆ ئامۆژگاری بکە، تەنیا تۆ ئامۆژگاریت لەسەرە. تۆ خاوەن دەسەڵات نیست بەسەریانەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾[2] تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەر لێپرسینەوەت لەسەر ئێمەیە.

﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾﴾

**قسەی خراپ بە بتەکانی ئەوان مەڵێن، تا ئەوانیش قسەی خراپ بەرامبەر خودا نەکەن**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ قسەی خراپ لەبارەی ئەوانە مەکەن کە داوای یارمەتی بێجگە لە خودا دەکەن، چونکە ئەوانە نەزانن، لەوانەیە لەبەر دژایەتی خۆیان قسەی خراپ بەرامبەر خودا بکەن. خودا گەورە لێرەدا ڕێگەنادات بە پێغەمبەرەکەی و (ﷺ) خاوەن باوەڕان کە قسەی خراپ دەربارەی بتەکانی بت پەرستەکان بکەن. هەرچەندە بەرژەوەندیشی تێدابێت. چونکە خراپەی لەوە گەورەتری لێ پەیدادەبێت. چونکە بت پەرستەکانیش لەبەرامبەردا قسەی خراپ بە خودای باوەڕداران دەکەن. ئەو خودایە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو. وەك عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا وتی: موشریکەکان وتیان: ئەی موحەممەد، ئەگەر وازدەهێنن لە قسەی خراپ وتن بە پەرستراوەکانمان باشە، ئەگەرنا ئێمەش قسەی خراپ بەرامبەر پەروەردنەکەی تۆ دەکەین. خودای مەزن لێی قەدەغەکردن کە قسەی خراپ بڵێن بە بتەکانیان ﴿فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾[3] لەوانەیە لەبەر دژایەتی خۆیان، قسەی خراپ دەربارەی خودا بکەن، چونکە ئەوانە نەزانن. عەبدوڕەزاق وتی لە موعەمەرەوە (معمر) لە قەتادەوە: موسڵمانەکان قسەی خراپیان دەوت بە بتی خودانەناسان ئەوانیش قسەی خراپیان بە دژایەتی بەرامبەر خودا دەکرد، چونکە نەزان بوون. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾[4] وە هەر لەم شێوەیە (وازهێنان لە بەرژەوەندی لەبەر خراپەیەکی لەوە گەورەتر) لە فەرموودەی سەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەری خودا

---

[1] الغاشية (٢١– ٢٢).

[2] الرعد (٤٠).

[3] الطبری (١٢/٣٤).

[4] عبدالرزاق (٢/٢١٥).

(ﷺ) فەرموویەتی: (نەفرین لێکراوە کەسێك قسەی خراپ بە باوكو دایكی وتبێت)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن پیاو قسەی خراپ بە دایكو باوكی دەڵێت؟ فەرمووی: (قسەی خراپ بە باوكی پیاوێك دەڵێت، ئەویش قسەی خراپ بە باوكی ئەو دەڵێت، قسە بە دایكی پیاوێك دەڵێت، ئەویش قسە بە دایكی ئەو دەڵێت)[1]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾ ئا بەوجۆرە ئاكاری هەموو كۆمەڵێكمان لەبەرچاویان ڕازاندووەتەوە. واتە: وەك چۆن خۆشەویستی بتەكانمان لەبەرچاو ڕازاندووەتەوە پشتیگریانو بەرگریان لێ دەكەن هەر بەوجۆرەش گومڕایمان لەلای كۆمەڵە پێشووەكانیش ڕازاوەكردبوو، كارەكانی خودا هەموو پڕن لەكارزانی هەرچی خۆی مەیلی لێبێت دەیكاتو هەڵی دەبژێرێت ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ پاشان هەر دێنەوە بەردەستی پەروەردەیان، ئەوسا ئاگاداریان كردووە كە چیان كردووە. پاداشتیان بە چاكە یان بە تۆڵە دەداتەوە.

﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾﴾

## بت پەرستان سوێند دەخۆن پاش هاتنی موعجیزە بڕوادەهێنن

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ بەگشت هێزیانەوە سوێندیان دەخوارد. واتە: موشریكەكان زۆر بەتوندی سوێندیان دەخوارد ﴿جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾ هەر تەنیا نیشانەیەكیان لە خوداوە بۆ بێتەخوارەوە، بڕوادەهێنن ﴿قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: نیشانەكان هەر لەلای خودایە. واتە: بڵێ بەوكەسانەی كە داوای نیشانەت لێ دەكەن. لەبەرئەوەیە كە زۆر بێ دینو لاسارو سەرپێچیكەرن، بۆ ئەوەنیە كە ڕێنمایی بكرێنو شارەزابن. وە پێیان بڵێ: سەرچاوەی ئەو نیشانانە لەلای خودا خۆیەتی، مەیلی لێبێت بۆتان دەنێرێتو مەیلیشی لێبێت پشتگوێتان دەخات. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئێوە نازانن ئەی خاوەن باوەڕان ئەگەر ئەوبەڵگانەش بێنن هەر باوەڕناهێنن. واتە ئەی خاوەن باوەڕان دیارە ئێوە زۆر پێتان خۆشەو زۆر هەوڵدەدەن كە بڕوابێنن، بزانن ئەوانە ئەگەر نیشانەكانیشیان بۆبێت هەر بڕواناهێنن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئێمە دڵو

---

[1] فتح الباری (١٠/٤١٧).

چاوی ئەوانە لەکاردەخەین، وەك چۆن ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد. عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا وتی: کاتێك موشریکەکان دانیان نەنا بەقورئانداو دڵیان دانەمەزرا لەسەر هیچ شتێكو هیچ شتێکیان وەرنەگرت[1] واتە: ئێمەش دڵیانمان وەرگێڕا. موجاهیدو لەم ئایەتەدا وتی: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ﴾ واتە بەربەستێك لەنێوان ئەوانو بڕوادا دادەنێین، هەر نیشانەیەکیان بۆبێت بڕوای پێ ناهێنن وەك چۆن لەجاری یەکەمدا بۆمان دانان. عیکرمەو عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم هەروایان وتووە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێبێت) وتی: خودای گەورە هەواڵی داوە کە عەبدەکانی چیان وتووە پێش ئەوەی بڵێنو کردارەکانی باس کردون پێشی ئەوەی بیکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾[2] جگە لە خودا کە هەموو شتێك دەزانێت کەس ناتوانێت لەوانە ئاگادارت بکات. وە دەفەرمووێت: ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَـٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾[3] نەکات ئەوسا کەسێك بڵێت: ئەی بەداخەوە، من لەفەرمانبەری خودا درێغیم کرد هەتا دەگاتە خۆزگە بگەڕامایەوەو بچومایەتە ڕێزی ئاکار چاکانەوە. خودای گەورە باسی کردووەو فەرموویەتی، ئەگەر ئەوانە بشگەڕانایەتەوە بۆ دونیا هەر ڕێی ڕاستیان نەدەگرتەبەر. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ﴾[4] ئەگەر بشگەڕانایەتەوە ئەو کارانەی کە پێیان دەوترا مەیکەن، هەر دەیانکرد. ئەمانە هەر درۆزنن. وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئێمە چاوو دڵیان لەئاست هەق وەردەگێڕینو لەکاریان دەخەین. وەك چۆن لەسەرەتاوە بڕوایان نەهێنا. واتە: ئەگەر ڕانایەتەوە بۆ دونیا بەربەستی لەنێوان ئەوانو ڕێی ڕاستدا پەیدا دەبوو. وەك چۆن جاری یەکەم بەربەستمان دانا لەنێوان ئەوانو بڕوا هێناندا کەلە دونیا بوون[5] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ﴾ ئێمەش لەسەرکەشی خۆیاندا دەیانهێڵینەوە. ئیبنو عەبباسو سوددی وتیان: لەبێ دینی خۆیاندا دەیانهێڵینەوە. ئەبولعالیەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو

---

[1] الطبری (٤٤/١٢).
[2] الفاتر (١٤).
[3] الزمر (٥٦-٥٨).
[4] الانعام (٢٨).
[5] الطبری (٤٥٨٢).

قەتادە وتیان: لە گومڕایی خۆیاندا دەیانهێڵینەوە. ﴿يَعْمَهُونَ﴾ واتە: سەرگەردان بن. ئەعمەش وتی واتە: یاری بکەن. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو ئەبولعالیەو ڕەبیعو ئەبومالیكو كەسانی تریش وتویانە واتە: لەبێ دینی خۆیاندا بێنو بچن.

﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾﴾

**بڕواهێنان بە مەیلی خودایە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾ فریشتەشمان بناردایەو مردوەكانیش قسەیان لەگەڵ بكردنایەو هەموو شتمان لە ڕووبەڕووی ئەوانەوە كۆكردایەتەوە، هەر باوەڕیان نەدەهێنا، مەگەر خوا مەیلی لێ بوایە، بەڵام زۆربەیان نەزان بوون. خودای گەورە باسی ئەو خوانەناسانە دەكاتو ئەفەرموێت: ئەگەر ئێمە وەڵامی ئەو داوای ئەوانەشمان بدایەتەوە كە ڕەش هەڵدەگەڕانو سوێندیان دەخواردو دەیانگوت ئەگەر نیشانەیەكیان بۆ بهاتایە بڕوایان پێ دەكرد بەڵام درۆیان كرد، ئێمە فریشتەمان بۆ ناردن كە هەواڵی ئەو پەیامەیان لەلایەن خوداوە بداتێ كە بڕوا بێنن بەو پێغەمبەرانە وەك خۆیان داوایان كرد، كەچی گوتیان: (أو تأتي بالله والملئكة قُبلاً) یان خوداو چەند فریشتەیەك بێنەو ڕووبەڕوومان بكە. وە وتیان: ﴿لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ﴾[1] هەتا ئەو بەڵگانە بە پێغەمبەرانی خودا دراون بە ئێمەش نەدرێن هەرگیز بڕوا ناهێنین. ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾[2] ئەوانەی كە بە هیوا نین بە دیداری ئێمە بگەن، گوتیان: بۆچی فریشتەمان نەهاتە لا؟ یان پەروەردگاری خۆمان نەدی؟ بێگومان ئەوانە تووشی دەردی خۆ لەبایی بوونو سەربزێوی هاتوونو فیزێكی وایان لێ پەیدا بووە كە ئەوسەری دیار نەبێ. ﴿وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا﴾ واتە: ئەگەر مردویش قسەی لەگەڵ بكردنایەو هەموو شتمان لە ڕووبەڕووی ئەوانەوە كۆكردایەتەوە هەواڵیان پێ بدانایە كە ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە ڕاستە (هەر باوەڕیان نەدەهێنا). هەندێ بە (قِبَلًا) خوێندویانەتەوە. واتە: ڕووبەڕوو بونەوەو چاو پێكەوتن. وەك عەلی كوڕی ئەبوتەلحەو عەوفی ڕیوایەتیان كردوە لە

[1] الانعام (١٢٤).

[2] الفرقان (٢١).

ئیبنوعەبباسەوە[1]، عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو قەتادەیش هەر وایان گوتوە.
موجاهیدئەڵێ: ﴿قُبُلًا﴾ واتە: پۆل پۆلو گەل دوای گەل.[2] یانی: هەرچی کۆمەڵو گەلانە یەك بەدوای یەکدا بێنو پیشانیان بدەنو هەواڵیان بدەنێ کە ئەوەی ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە ڕاستە بڕوایان نەدەهێنا ﴿مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ هەر باوەڕیان نەدەهێنا، مەگەر خوا مەیلی لێ بوایە. واتە: بێگومان شارەزایی بوون هەر لەلایەن خوداوەیە نەك لەلای ئەوانەوە. خودا خۆی مەیلی لە هەر کێ بوو شارەزای دەکاتو مەیلی لە هەر کەسێکیش بوو گومڕای بکات گومڕای دەکات، هەرچی بوێ دەیکات، هیچ کەس بۆی نیە دەس لە کاری بەرداو لە گشت کەس دەپرسێتەوە، چونکە ئاگادارو کاربەجێو خاوەن دەستەڵاتو هێزو توانایە. وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[3] ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن، جا با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێ. تا ئازاری بەژان بە چاوی خۆیان دەبینن.

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾﴾

**هەموو پێغەمبەرێ دوژمنێکی هەبووە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ﴾ ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێکمان (لە نێو شەیتانەکانی مرۆڤو جنۆکە) دانا. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئێمە وەك چۆن دوژمنێکمان بۆ تۆ داناوە، ئاوایش دوژمنمان بۆ گشت پێغەمبەرەکانی تری پێش تۆش دانا، دژایەتیت دەکەنو دەچن بەگژتدا، ئەوە دلگرانت نەکات. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟﴾[4] زۆر لە پێغەمبەرانی پێش لە تۆش، هەروەك ئێستەی تۆ بە درۆزن ژمێراون، وێڕای باوەڕ پێنەکرانو ئازاردانیش. وە ئەفەرمووێت: ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا

---

[1] الطبري (١٢/٤٩).
[2] الطبري (١٢/٤٠-٥٠).
[3] يونس (٩٦-٩٧).
[4] الانعام (٣٤).

مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴾[1] ئەوانەی کە بە تۆ دەڵێن: بە پێغەمبەرانی پێش تۆش هەر وتراوە، بێگومان پەروەردگارت دەتوانێ لە گوناهکاران ببورێو بۆشی هەیە ئازاری بەژانیان بدات. وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾[2] هەر وا بوە، ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێکمان (لە تاوانباران) بۆ دانان. وەرەقەی کوڕی نەوفەل بە پێغەمبەری خودای (ﷺ) گوت، هیچ کەسێ نەبوە وەك ئەمەی تۆی هێنابێ، کە هێناویەتی دژایەتی کراوە. ﴿شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ﴾ بەدەلە لە ﴿عَدُوًّا﴾ واتە: دوژمنیان هەبوە لە شەیتانەکانی مرۆڤو جنۆکە. شەیتان: هەرکەسێکە لە هاوێنەکانی خۆی جیاکردبێتەوە بە خراپەکاری. تەنیا شەیاتینەکان دژایەتی پێغەمبەران دەکەن لە شەیتانەکانی مرۆڤو جنۆکە (خودا ڕوویان ڕەش کاتو بەر لەعنەتی خوا کەون) عەبدوڕەزاق گوتی: موعەممەر بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ﴾ گوتی: لەناو جنۆکەدا شەیاتین هەیەو لەناو مرۆڤیشدا شەیاتین هەیە، یەکتری ئاگادار دەکەن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ هەندێك لەوان (بۆ فریودان) قسەی ڕازاوەو درۆیان بە هەندێکی تریان ڕادەگەیاند. بەو قسە لوسو ڕازاوانە هەندێ لە گوێگرە نەفامەکانیان لە خشتە دەبردو فریویان ئەدانو بە گوێیان دەکردن ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ﴾ پەروەردگارت ئەگەر حەزی بکردایە، ئەو کارەیان بۆ نەدەکرا. واتە: ئەوانە هەموو بە فەرمانو بڕیاری ئەوەو بە مەیلو ویستی خۆیەتی. کە هەموو پێغەمبەرێ دەبێ دوژمنێکی لەوانە هەبێ. ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ لێیان گەڕێ با هەر درۆ هەڵبەسن. گوێ مەدەرە ئازاردانیان هەر پشت بە خوا ببەستە لە دژایەتی کردنیاندا، تەنیا خودا بەسە بۆ تۆ سەرت دەخات بەسەریاندا ﴿وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ﴾ با بە دڵ گوێی بۆ ڕاگرنو ئیبنوعەبباس ئەڵێ: با حەزیشی لێ بکات.[3] ﴿أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ دڵی ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە. سوودی ئەڵێ: با خوانەناسان دڵیان پێوە بێو ﴿وَلِيَرْضَوْهُ﴾ پەسەندیشی بکەن. واتە: خۆشیان لێی بێو بشیانەوێ[4] ئەوانەی کە بەگوێیان دەکەن، ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە. وەك

---

[1] فصلت (٤٣).
[2] الفرقان (٣١).
[3] الطبري (١٢/٥٨).
[4] الطبري (١٢/٥٩).

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ۝١٦١ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ۝١٦٢ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾[1] سا وا ئێوەو ئەوانەی دەیانپەرستن، ناتوانن بەرانبەر بە خودا(کەس) گومڕا بکەن. مەگەر ئەوەی دەچێتە ناو دۆزەخەوە. وەك لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ۝٨ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾[2] قسەتان یەك ناگرێتەوە، لە قورئان دەتەکێتەوە، هەرکێ تەکێنراوەتەوە. لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾ هەر کارێ دەیکەن با بیکەن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە. هەر دەسکەوتێ بە دەس دێنن با بە دەستی بێنن[3]، سوودیو ئیبنوزەید وتیان: هەر کردارێ کە کردویانە با هەر بیکەن[4].

﴿ أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا ۚ وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ۝١١٤ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ۝١١٥ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بڵێ بەوانەی کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو بێجگە لەو دەپەرستن ﴿ أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا﴾ ئایا ڕەوایە جگە لە خودا دادوەرێکی تر هەڵبژێرم؟ هەر ئەویش ئەم کتێبەی دوور لە هەموو کەمو کوڕییە بۆ ئێوە ناردە خوارەوە. واتە: ئەی جوولەکەو گاورەکان ئایا ڕەوایە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا جگە لە خودا دادوەرێکی تر هەڵبژێرم؟ ﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ﴾ ئەوانەی کتێبمان پێداون چاك دەزانن کە خەڵاتەو لە پەروەرندەی تۆوەیەو گشتی ڕاستە. واتە: ئەو مژدانەی کە لەبارەی تۆوە دراوە (کە لایانە) لەلایەن پێغەمبەرەکانی پێشەوە هەموو ڕاستن ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ کەوایە تۆ هەرگیز لە دوودڵان مەبە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَاءَكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾[5] گەر تۆ لەوەی بۆمان ناردویتە خوارەوە بە گومانی، سا بپرسە لەو

---

[1] الصافات (١٦١-١٦٢).

[2] الذاريات (٨-٩).

[3] الطبري (١٢/٥٩).

[4] الطبري (١٢/٦٠).

[5] يونس (٩٤).

کەسانەی پێش تۆ لە کتێبیان دەخوێند، هەرچی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە بێ شك ڕاستەو لە ڕیزەی دوودڵان مەبە. ئەمە مەرجە مەرجیش پێویست نیە بێتەدی. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ قسەکانی پەروەردگارت (لە ڕاستیو بێ لایەنگریدا) تەواو بێ کەمو کوڕین قەتادەئەڵێت: ئەوەی وتویەتی ڕاستەو دادپەروەریشە لەوەی کە بڕیاری داوە[1]، ڕاست دەڵێ لە هەواڵیداو دادپەروەرە لە داوایدا، هەرچی ئەو فەرموویەتی هەقەو گومانی تێدا نیە، هەرچیش ئەو فەرمانی پێدەکات ئەوە تەواوو ڕشێکە، لەوە ڕێكو ڕاستتر نیە. وە هەر شتێ ئەو قەدەغەی کردوە، خراپو پڕوپوچە، بێگومان خودا تەنیا شتی خراپ قەدەغە دەکات. وە ئەفەرموێت: ﴿يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[2] هانی چاکەیان دەداتو ناهێڵێ خراپە بکەن. تا کۆتایی ئایەتەکە. ﴿لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ کەس ناتوانێ قسەکانی بگۆڕێ. واتە: هیچ کەسێ ناتوانێ ڕێ لە بڕیارەکانی بگرێ نە لە دنیاداو نە لە قیامەتیشدا. ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ﴾ زۆر بیسەری قسەی عەبدەکانیەتی. ﴿الْعَلِيمُ﴾ زۆر زانایشە بە هەڵسوکەوتیانو هەرکەسەو بە کرداری خۆی پاداشت ئەداتەوە.

﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ (١١٦) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (١١٧) ﴾

**زۆرینەی خەڵك لە گومڕایدان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەگەر بکەویتە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانە وا لەم سەر زەمینەدان لە ڕێگەی خودا لات ئەدەن. خودای گەورە لێرەدا باسی حاڵی زۆرینەی خەڵکی سەر زەمین دەکات لە نەوەی ئادەم کە گومڕان وەك لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ ﴾[3] بەر لەوانیش زۆربەی زۆری پێشینەکانیان گومڕا بوون. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾[4] هەرچەند زۆریش هەوڵ بدەی، ئەم خەڵکە زۆربەیان بڕوا ناهێنن. واتە: ئەم خەڵکە لەسەر گومڕایی خۆیان بەردەوامنو واز ناهێنن، هەرچەندە ئەو کارەی خۆشیان بە ڕاست نازانن، بەڵام هەر لە گومانی

---

[1] الطبري (١٢/٦٣).

[2] الاعراف (١٥٧).

[3] الصافات (٧١).

[4] يوسف (١٠٣).

پڕوپوچ و درۆینەدا دێن و دەچن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ چونکە هەموو بە شوێن خەیاڵدا دەرشۆن و هەر خەریکی پڕوپوچن، (الخرص) واتە: بە گۆترە دانان. لەوانە بە گۆترە دادانی خورمای تەڕی دارخورما. واتە: مەزەنە کردنی ئەو خورمایەی کە بە دارخورماکەوەیە. ئەمانە هەموو بەپێی بڕیارو مەیلی خودای گەورەیە ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ پەروەردگارت زۆر لە خۆت باشتر دەزانێ کێن ئەوانەی لە ڕێی خودا لایانداوە (بەرەو ئەوێ دەیانبات). ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ﴾ لە تۆ باشتر دەزانێ کێ ڕێگەی ڕاستی گرتووە (بەرەو ئەوێ دەیانبات) هەرکەسە و ئامادە کراوە بۆ ئەوەی کە بۆی دروس کراوە.

﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾﴾

**حەڵاڵ بوونی ئەو ئاژەڵانەی بەناوی خودا سەردەبڕێن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾ دەسا ئێوە ئەگەر بڕواتان بە خوداو نیشانەکانی هەیە لە گۆشتی ئاژەڵێ بخۆن کە لەکاتی سەربڕینیدا ناوی خودای لەسەر هێنراوە. ئەمە ڕێ پێدانێکە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ خاوەنباوەڕان، کە لەو ئاژەڵە سەربڕاوانە بخۆن کە ناوی خودا لەسەر هێنراوە کەواتە ئەو ئاژەڵانەی کە ناوی خودایان لەسەر نابرێ خواردنیان ڕەوا نیە، وەك خوانەناسانی قورەیش خواردنی ئاژەڵی مردارۆ بویان بەلاوە ڕەوا بوو. وە ئەو ئاژەڵەیش لەسەر بت و پەیکەرو هەر شتێکی تر سەردەبڕێ خواردنی حەڵاڵ نیە، پاشان خودای گەورە فەرمانی داوە کە لەو ئاژەڵانە بخۆن کە ناوی خودای لەسەر براوە لە کاتی سەربڕینیداو ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ بۆچی ئێوە خۆتان لە گۆشتی ئەوانە دەپارێزن کە ناوی خودایان لەسەر دێ؟ کە هەر خودا بە تەواوی باسی ئەمانەی بۆ کردوون کە خواردنیان ناڕەوایە. واتە: ئەوەی کە حەرامە بۆی ڕوون و ئاشکرا کردوون. هەندێ ﴿فَصَّلَ﴾ یلن بە موشەدەدەی خوێندوەتەوەو هەندێکیشی بە سووکی خوێندوەتەوە، هەردووکیان بە مانای ڕوون کردنەوەو ئاشکرا کردن هاتوون. ﴿إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ مەگەر لە ڕووی ناچاریەوە بێ. ئەو کاتە بێگومان لە هەر کوێدا دەستتان کەوت ڕەوانیە بۆتان بیخۆن. پاشان خودای گەورە باسی نەفامی موشریکەکان دەکات لەو بۆچوونە خراپانەیاندا لەسەر بە ڕەوا کردنی خواردنی مردارۆبوداو ئەوانەیش

که ناوی غەیرەز خودایان لەسەر دەبرێو ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ﴾ زۆر لەوانە هەر بە ئارەزوی خۆیانو لە نەزانی، مەردم لە ڕێگە لادەدەن، خودا خۆی ئاگادارترە لەو کەسانەی لە ئەندازە دەردەچنو زیادەڕەوی دەکەن. واتە: خودا ئاگادار ترە لە درۆو بوختانو دەست درێژی کردنیان.

﴿وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾ لە تاوانی بە ئاشکراو نهێنی دەس کۆتاکەنو خۆ بپارێزن. موجاهید ئەڵێت: واز بێنن لە گوناه بە نهێنیو بە ئاشکرا.[1] قەتادە لەم ئایەتەدا ﴿وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾ دەڵێت: واتە: واز لە تاوانی پەنهانیو ئاشکراو کەمو زۆریش بێنن[2].

وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾[3] بلێ: پەروەردگارم کاری خراپی بە ئاشکراو بە نهێنی حەرام کردوە. بۆیە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ﴾ ئەوانە وا خۆیان تووشی تاوان دەکەن، سزای تاوانیان وەردەگرن. واتە: ئەو تاوانەی وا دەیکەن بە ئاشکرا یان بە نهێنی بیکەن وەك یەکە، هەر سزای لەسەر وەردەگرن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە نەواسی کوڕی سیمعانەوە گوتی: پرسیم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بارەی تاوانەوە، فەرمووی: (تاوان ئەو شتەیە کە دڵی داگرتویو پێت ناخۆشە خەڵکی لێی ئاگادار بن)[4].

﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾

**قەدەغە کردنی خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی ناوی خودایان لەسەر نابرێ لەکاتی سەربڕینیدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ﴾ هەر ئاژەڵێ لە کاتی سەربڕینیدا ناوی خودای لەسەر نەبرێ، نابێ لە گۆشتەکەی بخۆن (ئەگەر بیخۆن) ئەوە لە ڕێگە لادانە. ئەم ئایەتە کراوە بە بەڵگە لەسەر حەرامی خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی سەردەبرێو ناوی

---

[1] الطبري (١٢/٧٣).
[2] الطبري (١٢/٧٢).
[3] الاعراف (٣٣).
[4] مسلم (٤/١٩٨٠).

خودای لەسەر نابرێ. با ئەو کەسەیش موسوڵمان بێ، وەك لە ئایەتی ڕاودا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ﴾[1] بخۆن لەو نێچیرانەی کە ئەوانە بۆتان دەگرن (بەڵام کاتێ بەرەڵای دەکەن) ناوی خودای لەسەر بێنن. پاشان لەم ئایەتەی پێشەوەدا جەختی لەسەر دەکاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ واتە: لە ڕێگە لادانە ئەگەر ناوی خودای لەسەر نەبرێ. هەندێ دەڵێن ئەم زەمیرە دەگەڕێتەوە بۆ خواردنەکە. هەندێکیش دەڵێن زەمیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەربڕینەی بۆ غەیری خودایە. وە ئەم فەرموودانەش بەڵگەن لەسەر فەرماندان بە (بسم الله) کرد لەکاتی سەربڕینو ڕاو کردندا، وەك ئەم دوو فەرموودەی عەدی کوڕی حاتەمو ئەبوسەعلەبە ڕیوایەتیان کردوە: (ئەگەر سەگە فێرە ڕاوەکەت ناردو ناوی خودات لەسەر هێنا ئەوەی کە بۆی گرتوی بیخۆ)[2]، ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە. وە فەرموودەکەی ڕافعی کوڕی خەدیج کە تێدا هاتوە: (هەرچی خوێن بڕژێنێو ناوی خودای لەسەر ببرێ بیخۆن)[3]، ئەم فەرموودەش لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە. فەرموودەکەی ئیبنومەسعودیش: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە جنۆکە: (هەموو ئێسکێ (پێشەیە) ناوی خودای لەسەر هێنرابێ بۆ ئەوە بۆ ئێوە)[4] موسلیم ڕیوایەتی کردوە. وە فەرموودەکەی جوندەبی کوڕی سوفیانی بەجەلیش کە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێ (ئاژەڵی) سەربڕیوە پێش ئەوەی نوێژ بکات (واتە: نوێژی جەژنی قوربان) با دانەیەکی تر سەربڕێ. ئەوەیش سەری نەبڕیوە کاتێ نوێژمان کرد با ناوی خوای لێ بێنێو سەری بڕێ)[5] لە هەردووو سەحیحەکەدا ئەم فەرموودەیە هاتوە.

**نیگای (وەحی) شەیتان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ شەیاتینەکان دنەی دۆستانی خۆیان دەدەن تا کێشەتان لەگەڵ بکەن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوئیسحاقەوە ئەڵێت: پیاوێ گوتی بە ئیبنوعومەر موختار دەڵێ نیگای بۆ دێ؟ ئیبنوعومەر گوتی: ڕاست دەڵێو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾[6] وە لە

---

[1] فتح الباري (٩/٥٢٤)، مسلم (٣/١٥٢٩)، فتح الباري (٩/١٣٧)، مسلم (٣/١٥٣٢).

[2] فتح الباري (٩/٥٤٦)، مسلم (٣/١٥٥٨).

[3] مسلم (١/٣٣٢).

[4] المائدة (٤).

[5] فتح الباري (٩/٥٤٦)، مسلم (٣/١٥٥١).

[6] إبن إبي حاتم (٤/١٣٧٩).

ئەبوزەمیلەوە گوتی: لەلای ئیبنوعەبباس دانیشتبووم، موختاری کوڕی ئەبوعوبەید هاتبوو بۆ حەج پیاوێ هات بۆ لای گوتی: ئەی ئیبنوعەبباس، ئەبوئیسحاق دەڵێ ئەمشەو نیگای بۆ هاتوە. ئیبنوعەبباس ئەڵێت: ڕاست دەڵێ. وتی: منیش ڕامکردو گوتم، ئیبنوعەبباس دەڵێ ڕاست دەڵێ. پاشان ئیبنوعەبباس گوتی: دوو جۆر نیگا هەیە، نیگای خوداو نیگای شەیتان، نیگای خودا بۆ موحەممەدە (ﷺ) نیگای شەیتانیش بۆ دۆستەکانیەتی. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ﴾[1] لە عیکرمەیشەوە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ تا دەگاتە ﴿لِيُجَٰدِلُوكُمۡ﴾ گوتی: شەیاتینەکان نیگا دەکەنە لای دۆستەکانیان، ئەوەی خۆتان کوشتوتانە دەیخۆن بەڵام ئەوەی خودا دەیکوژێت نایخۆن؟ وە لە هەندێ لە قسەکانی ئیبنوعەبباسدا هاتوە دەڵێت: ئەوەی ئێوە کوشتوتانە ناوی خودای لەسەر براوە، بەڵام ئەوەی مردار بۆتەوە ناوی خودای لەسەر نەبراوە.[2] سوودی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدائەڵێت: موشریکەکان دەیانگوت بە موسوڵمانەکان: چۆن ئێوە دەڵێن شوێن ڕەزامەندی خودا کەوتون کەچی ئەوەی خودا کوشتویەتی نایخۆنو ئەوەی خۆتان دەیکوژن دەیخۆن؟ خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ﴾ ئەگەر بە گوێتان کردن (مردارۆ بوتان خوارد) ﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ بێگومان شەریکتان بۆ خودا داناوە.[3] موجاهیدو زەححاکو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە هەر وایان گوتوە[4].

### پێش خستنی قسەی هەر کەس بەسەر ئەوەی خودا دایناوە شەریك دانانە بۆی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ ئەگەر بە گوێتان کردن بێگومان شەریکتان بۆ خودا داناوە. واتە: کاتێ لە فەرمانو بەرنامەی خودا لاتان دا بۆ قسەی کەسێ تر بێجگە لەو، دیارە قسەی غەیرەز ئەوتان پێش خستوە. ئا ئەوە خۆی شەریك دانانە بۆ خودا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾[5] لە بری خودا زاناو قەشەکانی خۆیان کردە خوا. تیرمیزی ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە عەدی کوڕی

---

[1] الطبري (٨٦/١٢).
[2] الطبري (٨١/١٢).
[3] الطبري (٨١/١٢).
[4] الطبري (٨٠/١٢).
[5] توبة (٣١).

حاتەمەوە کە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیانپەرستوون پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ، پەرستویانن)، ئەوانە حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکردن و حەلاڵیشیان بۆ حەرام دەکردن ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن، ئەوە پەرستنی ئەوانە بۆیان)[1]، واتە: بۆ زاناو قەشەکانیان.

﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾

**وێنەی خوانەناس و خواناس**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ﴾ ئایا کەسێ کە مردوو بوو ئێمە زیندوومان کردەوەو ڕووناکیەکمان خستە پێشی و لەناو خەڵکدا بگەڕێ. ئەمە نمونەیەکە خودا هێناویەتەوە بۆ خاوەنباوەڕ کە وەك مردویەك وا بوە، واتە: لە گومڕایی و تیاچوون و سەرگەردانیدا بووە، خودا دڵی زیندوو کردوەتەوە بە باوەڕو ڕێی نیشانداوەو یارمەتی داوە شوێنی پێغەمبەرەکەی بکەوێ و چۆن هەڵسوکەوت بکات لەو پێناوەدا ﴿نُورًا﴾ واتە: ئەو قورئانە وەك عەوفی و ئیبنوئەبی تەلحە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنو عەبباسەوە[2]. سوودی ئەڵێت: ﴿نُورًا﴾ مەبەست پێی ئیسلامە[3]. هەردوو ماناکە ڕاستن. ﴿كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ وەك کەسێکە کە لە ناو تاریکیدایەو هیچ دەرەتانێکی نیە؟ وە ناتوانێ خۆی دەرباز بکات و هیچ شوێنێ نیە ڕووی تێ نەکات. لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (خودا دروس کراوەکانی لە تاریکیەوە دروس کرد پاشان ڕووناکی خۆی بۆ ناردن، هەرکەسێ ئەو ڕووناکیەی بەرکەوت ڕێگای دەرکرد، وە هەرکەسێ بەرێ نەکەوت وێڵ و گومڕا بوو).[4] وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[5] خودا دۆستی خاوەنباوەڕانە و لەناو تاریکستانەوە دەیانبات بەرەو ڕووناکی، دۆستی خوانەناسانیش هەر تاغوتە، لە ڕووناکی دەریان دەکەن بەرەو ڕووی تاریکستان بەڕێیان دەکەن. ئەوانە دەچنە ناو ئاگرو

---

[1] تحفة الاحوذي (٤٩٢/٨).
[2] الطبري (٩١/١٢).
[3] الطبري (٩١/١٢).
[4] أحمد (١٧٦/٢)، فەرموودەیەکی باشە (جید).
[5] البقرة (٢٥٧).

تا سەر لەوێدا دەبن، وە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1] ئایا کەسێ دەمو ڕوو بە زەویدا دەخشێ چاکتر بە ڕێگە دەڕوات یان ئەو کەسەی بە ئاسایی بەسەر ڕاستە ڕێدا دەڕوا؟ وە ئەفەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ ۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾[2] نمونەی ئەم دوو دەستەیە وەك نمونەی کوێرو کەڕو بیسەرو بینا وان ئایا ئەمانە وەك یەکن؟ دەی بۆچی پەند وەرناگرن؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾[3] کوێرو چاوساغ وەك یەك نین، تاریکاییو ڕوناکیش وەك یەك نین. بەر سێبەرو گەرمای بەتینیش وەك یەك نین. گیانلەبەرانو بێ گیانیش هاوێنە نین، خودا مەیلی لە هەرکەس بێ دەیبیسێت، تۆ ناتوانی دەنگت بگاتە ئەوانە کە خراونەتە ناو گۆڕەوە. تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ترس وەبەر خەڵکی بێنی. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ هەر وا ئەو کەسانەی کە خوانەناسن کارەکانیان لەبەر چاوی خۆیان جوان دەکات. واتە: ئەو حاڵەی کە تێدان لە نەفامیو گومڕاییو سەرلێشێواوی بە چاك دەزانن. فەرمانو بڕیاری خودای گەورە خۆیەتیو هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خۆی بە تەنیاو شەریکی نیە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ ۘ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾﴾

### سەرکردە تاوانکارەکانو فڕوفێڵیانو پاشەڕۆژیان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا ﴾ هەر وا تاوانکارانی هەر شارێکمان کردوەتە خاوەندەسەڵات تا لەوێدا خەڵك فریودەن. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) وەك چۆن لە شارەکەی تۆدا تاوانبارانمان کردوەتە خاوەن دەسەڵاتو هێزو بانگخواز بۆ سەر بێ دینیو ڕێگری ڕێی خوداو بۆ بەربەرەکانیو دژایەتی کردنت، هەر بەو شێوەیەش

---

[1] الملك (٢٢).

[2] هود (٢٤).

[3] فاطر (١٩-٢٣).

پێغەمبەرەکانی پێش تۆشمان وا تاقی کردوەتەوە، بەڵام لە دوایدا ئاکامەکەی هەر بۆ ئەوان بوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا ئەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ﴾[1] هەر وا بوە ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێکمان لە تاوانباران بۆ دانان. وە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا﴾[2] هەر کە ویستمان شارێك قڕ کەین، دەوڵەمەندی خۆشگوزەرانەکانی ئەوان دنە دەدەین بۆ بەدفەڕیو خراپەکاری. وتراوە: واتە: فەرمانمان پێکردون کە گوێڕایەڵ بن، بەڵام ئەوان گوێیان پێ نەداوە، ئێمەش قڕمان تێ خستوون. گوتراویشە: فەرمانمان دانێ بە فەرمانێکی قەدەری، بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿لِيَمْكُرُوا فِيهَا﴾ تا خەڵکی لەوێدا فریودەن. وە ئەفەرموێت: ﴿أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا﴾ ئیبنوئەبی تەلحە ئەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە وتویەتی: خراپەکارانمان لەوێدا زاڵ کردو سەرپێیان تێدا کرد ئێمەش بە سزا لەناومان بردن. موجاهیدو قەتادە وتیان: ﴿أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا﴾ واتە: سەرکردە تاوانبارەکانی ئەو شارە[3] منیش دەڵێم خودای گەورەش لە چەند ئایەتی تریشدا هەر وای فەرمووە: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾[4] تا ئێستا هەر کەسێکمان لە پێغەمبەرانی خۆمان ناردوەتە هەر ئاوەدانیەك لە ئێمەیان بترسێنێ، هەر ئەوانەی کە لەوپەڕی خۆشیدا ژیاون گوتویانە: بەو شتانەی ئێوە پێی ڕاسپێراون باوەڕ ناکەین، گوتوشیانە: ئێمە ماڵو منداڵمان لە ئێوە زیاترەو هەرگیز تووشی ئازار نابین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ﴾[5] هەر بەو شێوەیە بەر لە تۆش هەر پێغەمبەرێکمان ناردۆتە هەر ئاوەدانیەك کە لە ئێمەوە ترسیان وەبەرنێ. هەر خۆشگوزەرانەکانی ئەوانە، وتوویانە: باب و باپیرانمان لەسەر ئاینێك ڕۆیشتوون ئێمەش پەیرەوی ئەوانین. مەبەست بە (مکر) لێرەدا بانگ کردنیانە بۆ گومڕایی و بە قسەو ئاکاری لووس و ڕازاوە، وەك خودای گەورە باسی

---

[1] الفرقان (٣١).

[2] الاسراء (١٦).

[3] الطبري (١٢/٩٤).

[4] سبأ (٣٤-٣٥).

[5] الزخرف (٢٣).

گەلی نووح دەكاتو ئەفەرموێت: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكۡرࣰا كُبَّارࣰا﴾[1] فێلیان كرد بەلام فێلێكی گەورە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰۤ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ یَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ یَقُولُ ٱلَّذِینَ ٱسۡتُضۡعِفُوا۟ لِلَّذِینَ ٱسۡتَكۡبَرُوا۟ لَوۡلَاۤ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِینَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِینَ ٱسۡتَكۡبَرُوا۟ لِلَّذِینَ ٱسۡتُضۡعِفُوۤا۟ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَـٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَاۤءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِینَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِینَ ٱسۡتُضۡعِفُوا۟ لِلَّذِینَ ٱسۡتَكۡبَرُوا۟ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّیۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَاۤ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥۤ أَندَادࣰا﴾[2] ئەگەر تۆ ئەو ناهەق پیشانەت بدیایە كە لە بەرانبەر پەروەردگاری خۆیانەوە ڕاگیراون، هەندێكیان ئاوڕ لە هەندێكیان ئەدەنەوەو قسە دەكەن. ئەوانەی بێ دەسەلات بوون، بە دەستلاتدارەكانی خۆیان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبونایە بڕوامان دەهێنا. خاوەن دەستەلاتەكانیش بەبێ دەستەلاتەكانی خۆیان دەڵێن: ئایا ئێمە بووین نەمانهێشت ئێوە بە ڕێی ڕاستدا بڕۆن، پاش ئەوەی كە ڕێ نیشاندەرتان هاتە لا؟ بەڵكو خۆتان تاوانبار بوون. ئەوسا بێ دەستەلاتەكان لە وەلامی ئەواندا (كە خاوەندەستەلات بوون) دەڵێن: ئێوە بە شەوو ڕۆژ هەر فریوتان دەداینو كە دەبێ خوانەناسینو چەندین هاوتای بۆ پەیدا كەین، پاشان خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا یَمۡكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمۡ وَمَا یَشۡعُرُونَ﴾ لە ڕاستیشدا هەر فێڵ لە خۆیان دەكەنو هەستی پێ ناكەن. واتە: سەرئەنجامی ئەو فریودانو گومڕاكردنەی ئەوانەی كە گومڕا دەكەن هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، تاوانی خۆیانو ئەو خەڵكەش دەكەوێتە سەر شانی ئەوان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَیَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالࣰا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡ﴾[3] باری گرانی خۆیانو باری گرانی خەڵكی تریش (لەگەڵ باری گرانی خۆیان) هەڵدەگرن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِینَ یُضِلُّونَهُم بِغَیۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا سَاۤءَ مَا یَزِرُونَ﴾[4] تاوانی ئەوانەش هەڵگرن كە بەبێ زانست، ئەوان لە ڕێیان لادەدەن، ئای چەندە بارێكی نالەبارەو خراپە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَاۤءَتۡهُمۡ ءَایَةࣱ قَالُوا۟ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَاۤ أُوتِیَ رُسُلُ ٱللَّهِ﴾ هەركاتێ بەڵگەیەكیان بوبێ، دەڵێن: ئێمەش تا وەك پێغەمبەرانی خوا، ئەو بەڵگانەمان بۆ نەیە، ناتوانین بڕوا بێنین. واتە: كاتێ كە بەڵگەو نیشانەیەكی بەهێزیان بۆ دێ دەڵێن: ئێمە بڕوا ناهێنین هەتا فریشتە لەلایەن خوداوە پەیامان بۆ نەهێنێ. وەك چۆن بۆ پێغەمبەرەكانی تر

---

[1] نوح (٢٢).

[2] سبأ (٣١-٣٣).

[3] العنكبوت (١٣).

[4] النحل (٢٥).

هاتوه. وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا لە بارەیانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾[1] ئەوانەی بە هیوا نین بە دیداری ئێمە بگەن دەڵێن: بۆچی فریشتەمان نەهاتە لا؟ یان پەروەردگاری خۆمان نەدی؟ خودای مەزنیش لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ خودا خۆی باشتر دەزانێ چ كەسێ بۆ پێغەمبەرێ هەڵبژێرێ. واتە: خودا خۆی چاكتر دەزانێ لە كوێدا پەیامی خۆی دەس نیشان دەكات و كێش لە بەندەكانی بۆ ئەو پەیامە دەشێ. وەك خودای گەورە لەبارەی ئەو خوانەناسانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾[2] وتیان: بۆ ئەم قورئانە بۆ پیاوێكی گەورەی ئەم دوو شارە نەهاتە خوار؟ ئایا ئەوانە بەزەیی پەروەردگاری تۆ دابەش دەكەن؟. مەبەستیان ئەوە بوو بۆچی ئەم قورئانە بۆ پیاوێكی گەورەو بەڕێزو مەزن لەبەرچاوی ئەوان لەم دوو شارەدا (مەككەو تائیف) نەهاتە خوار. چونكە ئەوانە ئەوەندە حەسوودو ستەمكارو خۆبەزل زان و لاسار بوون پێغەمبەریان بە شایستەی ئەو پەیامە دانەدەنا. وەك خودای گەورە باسی پێغەمبەر(ﷺ) دەكات و ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾[3] هەركە تۆیان چاو پێكەوت، دەتكەنە گاڵتەجاڕی خۆیان: ئا ئەمەیە كە خودا ڕایسپاردوە؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ﴾[4] هەر كاتێ خوانەناسەكان تۆ دەبینن، گاڵتەی خۆیان بە تۆ دەكەن (دەڵێن) ئایا ئەمە باسی بتەكانی ئێوە دەكات؟ كەچی خۆشیان لە یادی خودای دەهەندە حاشا دەكەن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾[5] بە زۆرێ لە پێغەمبەرانی بەر لە تۆ گاڵتە كراوە، گاڵتەكەران تووشی كارەكەی خۆیان بوون.

**خوانەناسان دان دەنێن بە بەرزیو پلەو پایەی ڕەچەڵەكی پێغەمبەردا (ﷺ)**

---

[1] الفرقان (٢١).

[2] الزخرف (٣١-٣٢).

[3] الفرقان (٤١).

[4] الانبیاء (٣٦).

[5] الانبیاء (٤١).

بێگومان خوانەناسان دانیان ناوە بە ڕێزو شکۆو ڕەچەڵەکو پاکی بنەماڵەو پەروەرشی کەرو بنەڕەتیداو ئەو فریشتەش کە دێتە لایو شایەتیشیان داوە لەسەر دەستپاکیو دڵسۆزیو سەر ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) لەناویاندا لە پێش ڕەوانەکردنی. تا ئەوە بوو کە بە موحەممەدی ئەمین ناویان دەهێنا لەناو خۆیاندا. سەرۆکی خوانەناسان ئەبوسوفیان دانی بەوە داناوە کاتێ کە هەرقل پرسیاری لێکرد: ڕەچەڵەکی چۆنە لەناوتاندا؟ وتی: ئەو خاوەنی بنەماڵەیە لەنێوانماندا. وتی: ئایا ئێوە گومانتان لێی بووە کە درۆ بکات پێش ئەوەی ئەو قسانە بکات؟ وتی: نەخێر. (پاشای ڕۆم ئەم فەرموودەیەی بە درێژی کردوەتە بەڵگە لەسەر پاکی ڕەوشتەکانیو ڕاستی پێغەمبەریەکەیو دروستی ئەو پەیامەی کە پێی هاتوە). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە واسلەی کوڕی ئەسقەعەوە(ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا لە منداڵی ئیبراهیمدا ئیسماعیلی هەڵبژارد، وە لە بەنی ئیسماعیلدا بەنی کەنانەی هەڵبژارد وە لە بەنی کەنانەیشدا قورەیشی هەڵبژارد وە لە قورەیشدا بەنی هاشمی هەڵبژارد وە منیشی لە بەنی هاشمدا هەڵبژارد).[1] موسلیم خۆی بە تەنیا ئەم فەرموودەی هێناوە[2] وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێ) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە چاکترین سەدەی نەوەی ئادەمدا سەدە لە دوای سەدە ڕەوانە کرام، تا (گەیشتمە) ئەم سەدەیە کە نێرراومو ئەمن تێیدام).[3] خودای گەورەهەڕەشە لەو خوانەناسە فریودەرانە دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ زۆری پێ ناچێ ئەوانەی تاوانبار بوون لەلای خوداوە سووکیو ئازارێکی توندیان تووش دەبێ (ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندو دژوارە لەو کەسانەی کە فیزیان کردوەو خۆیان بە دوور گرتوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی خوداو ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون، کە تووشی سزایەکی زۆر توند دەبنو هەمیشە لەلای خودا سووکو ڕیسوان بەهۆی ئەو فیزەوە کە کردویانە لە دنیادا خودا لە ڕۆژی قیامەتدا زەبوونو سەرنەویان دەکاتو وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[4] ئەو کەسانەی کە (هەر لەبەر خۆبەز زانین) نایانەوێ بمپەرستن بە زەبوونی دەچنە ناو جەهەنەمەوە. واتە: سووکو ڕیسواو زەلیلن. ﴿بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ﴾ لەبەر فێڵبازیو دەغەڵیان. لەبەر ئەوی فێڵ کردن زۆر جار شاراوەیەو دیار نیە، ئەوانەی کە پێی هەڵدەسن ڕووبەڕووی سزای توند دەکرێنەوە لەسەری لە

---

[1] أحمد (٤/١٠٧).
[2] مسلم (٤/١٦٨٢).
[3] فتح الباري (٦/٦٥٣).
[4] غافر (٦٠).

ڕۆژی قیامەتدا لەلایەن خوداوە ﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا﴾[1] پەروەردگارت ناهەقی لە هیچ کەس ناکات.
وەك ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾[2] لەو ڕۆژەدا کە نهێنی دەرکەوتن. هەموو شاراوەکان ئاشکرا دەکرێ. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا ئالایە لەسەر قنگی هەموو ناپاکێ هەڵدەکرێ (دادەمەزرێ) دەگوترێ: ئەمە ناپاکی فلانی کوڕی فلانی کوڕی فلانە)[3] مەبەست پێی ئەوەیە، چونکە ناپاکی شتێکی نادیارەو خەڵکی لێی ئاگادار نابن، لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێ بە ئالایەکی هەڵکراو بەسەر خاوەنەکەیەوە بەوەی کە کردویەتی.

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٥﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ هەرکەسێ خوا مەیلی لێبێ، بۆ خۆی ڕێگەی نیشان دەداتو بۆ بڕوا بە ئیسلامەتی دڵی گوشاد دەکات. واتە: خودا ڕێگەی ئیسلامەتی بۆ سووكو ئاسان دەکاتو دڵ گوشاد دەبێ پێی. بۆیە ئەمانە نیشانەن لەسەر چاکە وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾[4] ئایا کەسێ خودا دڵی بۆ ئیسلام گوشاد کردوەو دیارە بەر تیشکی بەزەیی پەروەردگاری خۆی کەوتوە (کەی دەبێ وەك ئەوانە بێ کە دڵڕەقن)؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾[5] بەڵام خودا خۆشەویستی بڕوا بە دینی دا بە ئێوەو ئەوەی لە دڵتاندا شیرینو ڕازاوە کرد، بێ باوەڕیو لە ڕێ لادانو سەرپێچی لەلاتان ناشیرین کردوە، لە ڕێ شارەزا ئەوانەن. ئیبنوعەبباس لەم ئایەتەدا: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ وتی: ئەفەرموێت: (دڵی فراوان دەکات بۆ یەکخواپەرستیو بڕوا بوون بە خۆی)[6].
ئەبومالیكو کەسانی تریش هەر وایان وتوە. ئەوەیش ڕوونو ئاشکرایە. پاشان خودای گەورە

[1] الكهف (٤٩).
[2] الطارق (٩).
[3] فتح الباري (٦/٣٢٧)، مسلم (٤/١٣٦١).
[4] الزمر (٢٢).
[5] الحجرات (٧).
[6] الدر المنثور (٣/٣٥٦).

ئەفەرمویت: ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ کێش مەیلی لێبێ گومڕای بکات هێندە نەفەس تەنگی دەکات، وەك بەرەو ئاسمان سەرکەوێ وایە، (ضَيْقًا) بە مەفتوحی (ضاد)ەکەو ساکنی (یاء)ەکە خوێنراوەتەوەو زۆرینەش یائەکەیان بە موشەدەدیو مەکسوری خوێندوەتەوە، ﴿ضَيِّقًا﴾ وەك (هَيْنء هيِّن) وە هەندێ ﴿حَرَجًا﴾ یان بە (حَرِجاً) بە فەتحی (حاء)کەو کەسری (ڕاء)کە) خوێندۆتەوە. سوودی وتی: بەمانی (آثم) بە گوناهبار هاتوە. بەلام ئەوانەی بە (حَرَجاً) خوێندویانەتەوە بە فەتحی (حاء)و (را)ئەکە ئەوەیە کە دڵی هیچ ڕێنمایە وەرناگرێو هەر شتێ بەسوود بێ بۆ باوەڕی کاری تێ ناکاتو ناچێتە ناوی. عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) لە پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی پرسی (مُدلج) ناوی شوێنێکە، گوتی: (الحَرَجَة) کامەیە؟ پیاوەکە گوتی: ئەو درەختەیە لەناو درەختەکاندا نە خاوەنو نە دڕندەو نە هیچ شتێ نایگاتێ. عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: دڵی دووڕوویش هەر وایە هیچ شتێ لە چاکەی پێناگات.[1] ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ وەك بەرەو ئاسمان سەرکەوێ. ئەوەندە بەلایەوە گرانە (ڕێی ڕاست بگرێتە بەر) سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: ﴿يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ واتە: هەر ڕێگەیە دەگرێتە بەر مەگەر ئەو ڕێگەیە بە بەرزو هەڵەت دەزانێ.[2] حەکەمی کوڕی ئەبان گوتی: لە عیکرمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت: وەك چۆن نەوەی ئادەم ناتوانێ بەرەو ئاسمان سەرکەوێ هەر بەو شێوەیەش ناتوانێ یەکخواپەرستیو بڕوا بخاتە دڵی خۆی تا ئەو کاتەی کە خودا دەیخاتە ناو دڵی[3] ئیمام ئەبوجەعفەری کوڕی جەریر دەڵێت: ئەمە نمونەیەکە خودا هێناویەتەوە بۆ دڵی خوانەناس لەسەر زۆر گرانی گەیشتنی بڕوا بە دڵی وەك ئەوە وایە کە چۆن زۆر گرانەو ناتوانێ بەرەو ئاسمان سەرکەوێ هەروەهایش توانای وەرگرتنی بڕوای نیەو بە دەستەوەسانە، چونکە لە تواناو دەستەڵاتی ئەودانیە[4].

وە لێرەیشدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ خودا ئاوا ئەو کەسانەی بڕوا ناهێنن تووشی ڕسوایی دەکات. ئیبنوجەریر گوتی: وەك چۆن خودا مەیلی لێبێ کەسێ گومڕا بکات دڵی زۆر تەنگ دەکات، هەر بەو شێوەیەش خودا شەیتان

---

[1] الطبري (١٢/١٠٤).

[2] الطبري (١٢/١٠٥).

[3] الدر المنثور (٣/٣٥٦).

[4] الطبري (١٢/١٠٩).

زاڵ دەکات بەسەر ئەو کەسەو هاوشێوەکانیدا. ئەوانەی کە نایەنەوێ بڕوا بە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بێنن. شەیتان گومڕایان دەکاتو لە ڕێگەی خودا لایان ئەدات[1] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێت: (الرجس) واتە: شەیتان[2] موجاهید ئەڵێت : (الرجس) واتە: هەر شتێ کە هیچ چاکەیەکی تێدا نەبێ.[3] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: (الرجس) واتە: سزا.

﴿وَهَٰذَا صِرَاطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ (١٢٦) ۞ لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٢٧)﴾

کاتێ کە خودای گەورە باسی ڕێبازی ئەو گومڕانەی کرد کە لە ڕێگەکەی ئەو لایانداو بوونە ڕێگری ئاینەکەی، دێتە سەر باسی بەڕێزی ئەو پەیامەی کە بە پێغەمبەرەکەیدا ڕەوانەی کردوە کە ئاینێکی هەقو ڕێنمایە بۆ سەر ڕێی ڕاستو ئەفەرموێت: ﴿وَهَٰذَا صِرَاطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا﴾ ئەم ڕێگەیە ڕێی پەروەرندەی تۆیە ﴿مُسْتَقِيمًا﴾ مەنسوبە لەسەر حال واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەم پەیامەی کە بە تۆمان داوەو ئاگادارمان کردوی لێی بریتیە لەم قورئانە کە هەر ئەمە ڕێی ڕاستی خودایە ﴿قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ﴾ نیشانەکانمان بە باشی ڕونکردۆتەوە. واتە: بە چاکی ڕوونو ئاشکرامان کردوەو تەفسیرمان رکدوە. ﴿لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوانەی لە ئامۆژگاری بەهرە دەبەن. واتە: بۆ ئەوانەی کە خاوەن ئاوەزو تێگەیشتننو فەرموودەی خوداو پێغەمبەرەکەی وەردەگرن. ﴿لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەو خاوەنباوەڕانە لە پەروەردگاری خۆیانەوە شوێنەکەیان، شوێنی هێمنایەتی دەبێ. کە بەهەشتە لە ڕۆژی قیامەتدا. بۆیە خودای گەورە وەسفی بەهەشتی کردوە بە شوێنی هێمنایەتی بۆیان، چونکە ئەوانە بێ ترس بوون لەو ڕاستە ڕێگەی کە ڕێچکەی پێغەمبەران بوو گرتبویانە بەر. وەك چۆن ڕزگاریان بوو لە بەڵاو خوارو خێچی بێ دینی، بەو شێوەیەش چوونە شوێنی هێمنایەتی ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم﴾ تەنیا ئەویش دۆستیانە. واتە: پارێزەرو هاوکارو پشتگیریانە. ﴿بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ لە بەرانبەر کارەکەیان. یانی: لە پاداشتی ئەو ئاکارە چاکانەی کە کردویانە هاوکاری کردونو بەهەشتی پێ بەخشیون لە چاکەو لێبوردەیی خۆی.

---

[1] الطبري (١٢/١١٠).
[2] الطبري (١٢/١١١).
[3] الطبري (١٢/١١١).

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەی موحەممەد(ﷺ) لەوەی بۆیان دەگێڕیتەوەو دەیانترسێنی پێی باسی ئەوەیش بکە ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ لەو ڕۆژەدا کە هەمووان کۆ دەکاتەوە. واتە: جنۆکەو هاوەڵەکانی لەو مرۆڤانەی کە دەیانپەرستن لە دنیاداو هانایان بۆ دەبردن و بە گوێیان دەکردن و بە قسەی لووس و فریودەر یەکتریان لە خشتە دەبرد ﴿يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ﴾ ئەی کۆمەڵی جنۆکە ئێوە زۆرینەی مرۆتان کردبوە پەیڕەوی خۆتان. شێوازی دەقەکە ئەوە دەگەیەنێ کە هەندێکی باس نەکرابێ. واتە: گومڕاو سەرلێشێواوتان کردبوون. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا ئەفـــــەرموێت: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَـٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ﴾[1] ئـــەی نـــەوەی ئادەم من لە پێشدا پەیمانم لەگەڵ نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن؟ ئەو بە ئاشکرا دوژمنتانە. هەر تەنیا خۆم بپەرستن، کە ڕێگەی ڕاست هەر ئەمەیە کۆمەڵێکی زۆری لە ئێوە لە ڕێ لادا، ئایا هێشتا هەر تێ ناگەن؟ پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ﴾ دۆستەکانیان لە بەرەی مرۆڤ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان لە یەکتری بەهرەمان بردوە. واتە: بەو شێوەیە وەڵامی خودای گەورە ئەدەنەوە. حەسەن گوتی: بەهرە وەرگرتنیان لە یەکتری، هەر ئەوە بووە، جنۆکە فەرمانی داوەو مرۆڤیش پێی هەڵساوە.[2] ئیبنوجورەیج گوتی: پیاوێ لە کاتی نەفامیدا کە لە زەویەکدا دادەبەزی دەیگوت: هانام بە گەورەی ئەم شیوە. ئەوە بەهرە وەرگرتنەکەیان بووە. لە ڕۆژی قیامەتدا پاکانە دەکەن[3] بەڵام بەهرە وەرگرتنی جنۆکە لە مرۆڤ، وەك باس کراوە، ئەوەیە کە جنۆکە بەدەستی دەهێنێ لە مرۆڤ لە ڕێز لێنان و هانا بۆ بردنیان، جنۆکەکان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە بوینە ڕێگر لەبەر مرۆڤو جنۆکەدا. ﴿وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا﴾ تا گەیشتینە ئەو مۆڵەتەی کە بۆت دیاری کردین (سوودی گوتی: واتە مردن) ﴿قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ﴾

---

[1] یس (٦٠-٦٢).

[2] الدر المنثور (٣/٣٥٧).

[3] الطبري (١٢/١١٦).

فەرمووی: ئەوسا جێگەی هەتا هەتاییتان ئاگرە. واتە: ئێوەو ئەوانیش شوێنو جێتان هەنر ئاگرە لەگەڵ دۆستەکانتان ﴿فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ مەگەر خودا(بە مەیلی خۆی) بۆتان بگۆڕێ پەروەرندەت لەکارزانو ئاگادارە.

﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾﴾

**هەندێ لە ستەمکاران دەخەینە ژێر دەستی یەکتر**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ هەر بەو شێوەیە هەندێ لە ستەمکاران (بەهۆی کارێ کە دەیکەن) دەخەینە ژێر دەستەڵاتی هەندێکیان. موعەمەر لە قەتادەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدائەڵێت: خودا هەندێ لە ستەمکاران دەخاتە ژێر دەستەڵاتی هەندێکیانو شوێنی یەکتری دەکەون لەناو ئاگردا.[1] عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم ئایەتەدا ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا﴾ دەڵێت: مەبەست پێی ستەمکارانی مرۆڤو جنۆکەیە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾[2] هەرکەسێ پشت لە یادی خودا هەڵکات، هاودەمێکی شەیتانی لێ پەیدا دەکەین کە هەمیشە لێی جیا نەبێتەوە. وە گوتی: واتە: ستەمکارانی جنۆکە زاڵ دەکەین بەسەر ستەمکارانی مرۆڤدا.[3] یەکێ لە شاعیرەکان وتویەتی:

وما من يد إلا يدُ الله فوقها و لا ظالم إلا سيُبلى بظالم

واتە: هیچ دەستێ نیە مەگەر دەستی خودا بەسەریەوەیە، وە هیچ ستەمکارێکیش نیە مەگەر بە ستەمکارێکی تر بەو زوانە تاقی دەکرێتەوەو تووشی بەڵا دەبێ. مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە، وەك چۆن ئەو مرۆڤە دۆڕاوانەمان خستە ژێر دەستەڵاتی ئەو دەستە جنۆکەیەو گومڕایان کردن؛ هەر بەو شێوەیەش وا بە ستەمکاران دەکەین هەندێکیان زاڵ دەکەین بەسەر هەندێکیانداو لەناویان دەبەینو تۆڵەیان لێ دەسێنین بە یەکتری لە بری ئەو ستەمو تاوانەی کە پێی هەڵساون.

﴿يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾﴾

---

[1] عبدالرزاق (٢/٢١٨).

[2] الزخرف (٣٦).

[3] الطبري (١٢/١١٩).

**سەرزەنشت كردنی مرۆڤو جنۆكە بە پرسیاركردن لە بارەی ناردنی پێغەمبەرانو دانانیان بە رەوانە كردنی پێغەمبەراندا (سەلامی خوایان لێبێ)**

دیسان لێرەدا خودای گەورە سەرزەنشتی خوانەناسانی مرۆڤو جنۆكە دەكات لە رۆژی قیامەتدا، لێیان دەپرسێو خۆشی باشتر دەزانێ ئایا پێغەمبەران پەیامەكانی ئەویان گەیاندوە پێیان؟ ئەمە پرسیارێكە بۆ دانپیانان وەك ئەفەرموێت: ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ﴾ ئەی كۆمەڵی جنۆكەو مرۆڤ ئایا پێغەمبەرێكتان هەر لە خۆتان بۆ نەهات دیارە پێغەمبەران هەر لە مرۆڤ بوون، جنۆكە لە خۆیان پێغەمبەریان نەبوە. وەك موجاهیدو ئیبنوجورەیجو زۆرێ لە زانایانی پێشینەو پاشینەش وتویانە[1] بەڵگە لەسەر ئەوە كە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) هەموو لە مرۆڤن ئەم ئایەتانەیە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾[2] ئێمە نیگامان بۆ كردوی وەك چۆن نیگامان كرد بۆ نوحو بۆ پێغەمبەرانی دوای ئەو (هەتا دەگاتە ئەو ئایەتە) كە ئەفەرموێت: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾[3] هەموو پێغەمبەری مژدەدەرو ترسێنەر بوون، تا لە پاش پێغەمبەران ئەو خەڵكە هیچ بەڵگەیەكیان لەلا نەبێ بۆ لای خودا. وە خودای گەورە لە بارەی ئیبراهیمەوە ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ﴾[4] پێغەمبەریو كتێبیشمان كردە بەشی نەتەوەی ئەو، واتە: ئیبراهیم. هیچ كەسێ لە مەردم نەیوتوە: كە پێغەمبەران لە پێش ئبراهیمدا لە جنۆكە بووە. پاشان بە هاتنی ئەو پێغەمبەریەتی لەناو جنۆكەدا نەماتوە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾[5] لە پێش تۆدا هەر كەسێكمان بۆ پێغەمبەری ناردوە: هەموو خواردنیان خواردوەو لەناو بازاڕان گەڕاون. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾[6] پێش لە تۆش هەر پیاوانمان لە خەڵكی شارەكان (لەلایەن خۆمان) تێكەیاند.

---

[1] الطبري (١٢/١٢٢).

[2] النساء (١٦٣).

[3] النساء (١٦٥).

[4] العنكبوت (٢٧).

[5] الفرقان (٢٠).

[6] يوسف (١٠٩).

دیارە جنۆکەیش لەمەدا دواکەوتەی مرۆڤن وەك خودای گەورە لەبارەیانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِيٓ إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَءَامِنُوا بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُولَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾[1] هێندێکیش لە جنۆکەمان ناردە لای تۆ کە گوێ لەم قورئانە بگرن، کاتێ هاتن وتیان: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، وەختێ بیستیان هاتنەوە ناو خێڵەکەیان و ترسی خوایان وەبەر نان، وتیان: خزمینە کتێبێکیان بۆ خوێندینەوە لە پاش موسا ڕەوانە کراوە، بە کتێبەکانی پێشوش بڕوای هەیە، هان بۆ ڕاستی دەدات و شارەزایش دەکات بۆ ڕاستە ڕێ. خەڵکینە وەرن بە دەنگ ئەم کەسەوە بچن کە بانگ بۆ خودا دەکات و بڕوای پێ بکەن، لە گوناهتان خۆش دەبێ و لە ئازاردانی بە ژانتان دەپارێزێ. هەرکەسێکیش بە دەنگ ئەو کەسەوە نەچێ (کە بەرەو خودا بانگ دەکات لەم زەمینە دەرەتانی دەست ناکەوێ و غەیرەز خودا هیچ کەس بەهانایەوە نایەت. دیارە ئەوانە لە گومڕایەکی ئاشکرادان. لەم فەرموودەیە کە تیرمیزی و کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردوە هاتوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سورەتی (الرحمانی) بەسەر خوێندن کە ئەم ئایەتانەی تێدایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ الثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾[2]، بەو زوانە لێتان دەپرسینەوە ئەی گرۆی مرۆڤ و جنۆکە. دەی ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەیشدا ئەفەرموێت: ﴿يَٰمَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا﴾ ئەی کۆمەڵی جنۆکە و مرۆڤ. مەگەر پێغەمبەرانێکتان هەر لە خۆتان بۆ نەهات، کە نیشانەکانی بەسەر ئێوەدا بخوێنن و بتانترسێنن لەو ڕۆژەی کە تێیدان؟ گوتیان: بەڵێ شایەتی لە خۆمان ئەدەین. واتە: دانی پێدادەنێین کە نێرراوەکانت پەیامەکانی تۆیان پێگەیاندووین و ترساندوویانین لەو ڕۆژەی کە لە بەردەم تۆ ڕادەوەستێنرێین و ئەو ڕۆژەش هەر دێ ﴿وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ژیانی دنیا هەڵیخەڵەتاندن شایەتیان لەسەر خۆیاندا. واتە: لە ژیانی دنیادا زیادەڕەوی زۆریان کردو بە جوانیەکانی فریویان خواردوە هەڵخەڵەتان و شوێن ئارەزوی خۆیان کەوتن و بڕوایان بە پێ

---

[1] الاحقاف (٢٩-٣٢).

[2] الرحمن (٣١-٣٢). تحفة الاحوذي (١٧٧/٩)، فەرمودەیە لاوازە و زۆر بەهێز نیە.

غەمبەران و ئەو نیشانانەی کە بۆیان هێنان نەهێنا بۆیە لەناوچوون ﴿أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ﴾ بێگومان ئەوان خوانەناس بوون. واتە: لە دنیادا بڕوایان بەو پەیامانە نەبوو کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) بۆیان هێنا بوون.

﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ﴾ بۆیە ئەمەمان ڕاگەیاند کە بزانن پەروەردگارت لە ناهەقی هیچ شارێکی قڕ نەکردوە خەلکەکەی بێ ئاگا بوبێ. واتە: بیانومان نەهێشتەوە بۆ مرۆڤ و جنۆکە بە ناردنی پێغەمبەران و ڕەوانە کردنی کتێبەکان هەتا هیچ کەسێ تووشی ناهەقی نەبێ کە ئاگادار نەکرابێ، هەر بۆیە هیچ گەلێکمان سزا نەداوە مەگەر دوای ئەوەی کە پێغەمبەرانمان بۆ ناردن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[1] هیچ کۆمەلێك نەبوە کە ترسی وەبەرهێنەریان بۆ نەچوبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[2] بۆ ناو هەموو گەلێك پێغەمبەرێکمان نارد کە خوا بپەرستن و لە شەیتان دوورەپەرێز بن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[3] سزا لەلای ئێمەوە نیە تا پێغەمبەرێ نەنێرین. وە ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا﴾[4] هەر کاتێ کە تاقمێکی تێ دەهاوێژن دەرگاوانەکان جەهەنم پێیان دەڵێن: ئایا ئێوە ترسێنەرتان نەهاتە لا؟ دەڵێن: بەڵێ ترسێنەر هاتبوە لامان ئێمە باوەڕمان پێ نەکرد. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا﴾ بۆ هەر کەسێك چەند پلەو پایە هەیە (بەرانبەر بە کرداری خۆی) واتە: بۆ هەرکەسێ کە کارێ دەکات لەبەر ڕەزامەندی خوداو خراپەیە دەکات چەند پلەو پایە هەیە لەبری ئەو کارەدا کە دەیکات، خودای گەورە ئاگاداری دەکاتەوە لێی و پاداشتی ئەداتەوە لەسەری. ئەگەر چاك بوو بە چاکە

[1] فاطر (٢٤).
[2] النحل (٣٦).
[3] الاسراء (١٥).
[4] الملك (٨-٩).

پاداشتی ئەداتەوەو ئەگەر خراپیش بوو سزای ئەدات لەسەر ئەو خراپەیە. منیش دەڵێم: هەڵدەگرێ ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾ هەرکەسێ چەند پلەو پایەی هەیە بەرانبەر بە کرداری خۆی لە خوانەناسانی مرۆڤو جنۆکە. واتە: هەرکەسەیان چەند پلەو پایەی هەیە لەناو ئاگردا بەپێی کردارەکەی. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ﴾[1] بۆ هەموو دوو چەندانە. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ﴾[2] ئەوانەی خوایان نەناسیو ڕێگەی خودایان بەربەست کرد لە جەزای ئەو بە بدفەرپەدا کە دەیانکرد (قات لەسەر قات) هەر ئازاریان زیاتردەکەین. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ پەروەرندەت لەوەی دەیکەن بێ ئاگا نیە. ئیبنوجەریرئەڵێت: واتە: (هەموو کردارەکانیان ئەی موحەممەد(ﷺ) خودا لێی ئاگادارە هەژماری دەکاتو لەلای خۆی هەڵیدەگرێ بۆیان، کاتێ هاتنە بەر دەستیو لەبەر دەمیدا ڕاوەستێنران تۆڵەیان لێ دەسێنێ لەسەری[3].

﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾

**هەڕەشە کردن بە لەناوبردنیان ئەگەر لاساریان کرد**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ﴾ پەروەردگارت (ئەی موحەممەد) بێنیازو دلۆڤانە، ئەگەر مەیلی لێبێ ناتانهێڵێو لە پاش ئێوەش حەز بکات چینێکی تر لە شوێنی ئێوە دادەنێ. واتە: لە هەموو ڕوویەکەوە بێنیازە لە هەموو کەس، بەڵکو هەموو کەسێ بەردەوام پێویستی بە ئەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بەزەیی بە بەندەکانیدا دێتەوە وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[4] بێگومان

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] النحل (٨٨).

[3] الطبري (١٢/١٢٥).

[4] الحج (٦٥).

خودا بۆ ئەم خەڵکە زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە. خۆ ئەگەر هەر سەرپێچیو لاساریتان کرد، مەیلی لێ بوو لەناوتان دەباتو خەڵکێکی تر لە جێگاتان دادەنیو بە فەرمانی خودا هەڵسوکەوت دەکەن ﴿كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ﴾ هەر وەك ئێوەی لە نەوەی کەسانی تر خستەوە. واتە: خودا توانای بەسەر ئەوەدا هەیەو زۆر سووكو ئاسانە لەلای وەك چۆن گەلە پێشوەکانی لەناو بردو گەلانی تری بەدوایاندا هێنا. هەر بەو شێوەیەش توانای لەناوبردنی ئەمانەی هەیەو لای ئاسانە کەسانی تر لە جێگایان دابنێ. وەك خودای گەورە لە چەند ئایەتی تردا ئەفەرمووێت: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا﴾[1] ئەی خەڵکینە، ئەگەر خوا مەیلی لێبێ هەمووتان لەناو دەباتو کەسانی تر لە جێگەی ئێوە دادەمەزرێنێ. خودا ئەو کارەی لە دەس دێ. وە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ (١٥) إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ (١٦) وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾[2] ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو داماون، هەر خودایە بێنیازو سوپاسکراوە. ئەگەر حەز کات هەمووتان لە بەین دەباتو سەر لە نوێ، دەستەیەکی تر دێنێ. ئەمەیش لای خودا دژوار نیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم﴾[3] خودا لە هەموو کەس بێنیازە، ئێوە هەژارو داماون، ئەگەر پشتیشی تێ بکەن، ئێوە بە چینێکی تر دەگۆڕێتەوە، کە هەرگیز لە ئێوە نەچن. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: لە یەعقوبی کوڕی عوتبەوە کەئەڵێت: لە ئەبانی کوڕی عوسمانم بیست لەم ئایەتەدا ﴿كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ﴾ واتە: هەروەك ئێوەی لە نەوەیەکی کەسانی تر خستوەتەوە.ئەڵێت: (الذرية) بە تەشدید نەکردنی (یای) (الذرية) واتە: ڕەگەز، بەڵام بە تەشدید کردنی (یای) (الذرّية) واتە: وەچە.[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ هەر بڕیارێ بۆتان درا (بێگومان هەر بەڵێنێکتان پێ دەدرێ) هەر دێت، ئێوە هەرگیز لە دەس خودا دەرناچن. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) هەواڵیان بدەرێ ئەو بەڵێنەی کە پێیان ئەدرێ لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە هەر دێتو گومانی تێدا نیەو لە دەستی خودا دەرباز نابن، بەڵکو خودا

[1] النساء (١٣٣).
[2] فاطر (١٥-١٧).
[3] محمد (٣٨).
[4] الدر المنثور (٣/٣٦١).

دەتوانێ زیندوتان بکاتەوە دوای ئەوەی کە دەبن بە خۆڵو ئێسكو پروسكتان دەڕزێ. بەلای خوداوە زۆر ئاسانەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ ئەی گەلەکەم، هەرچی لە دەستتان دێ دریغی مەکەن. وا منیش هەر وا خەریکی کاری خۆمم، لە ئاکامدا تێدەگەن. ئەمە هەڕەشەو بەڵێنێکی زۆر توندو تیژە، ئەگەر هەر بەردەوام بن لەسەر ئەو کارەی خۆتان وا بزانن لەسەر ڕێی ڕاستن. وە منیش لەسەر بەرنامەو کاری خۆم هەر بەردەوام دەبم. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾[1] بەو کەسانەش کە باوەڕیان نیە بڵێ: هەرچی لە دەستتان دێ بیکەن. وا ئێمەش کاری خۆمان دەکەین. چاوەڕوانیش بن وا ئێمەش چاوەڕوانین. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ واتە: لەلایەن خۆتانەوە[2] ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بەو زوانە تێدەگەن کە ئەنجامی (باشی) ئەو دنیا بۆ کێ دەبێ. هەر چۆنێك بێ، خودا ستەمکاران ڕزگار ناکات. واتە: دیاری ئەدا ئەو دنیا بۆ منە یان بۆ ئێوە. خودای گەورە بەڵێنەکەی خۆی بەجێهێنا بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) واتە: لەو ولاتەدا جێگیری کردو کردیە فەرمانڕەوا بەسەر ئەو کەسانەوە کە دژایەتیان دەکردو مەککەی بۆ ئازاد کردو سەری خست بەسەر ئەو کەسانەدا لە هۆزەکەی کە بڕوایان پێ نەدەکردو شەڕیان لەگەڵ دەکرد. هەموو دوورگەی عەرەبی خستە ژێر فەرمانڕەوای ئەو بە یەمەنو بەحرەینیشەوە ئەمانە هەموو لە ژیانی پێغەمبەر خۆیدا (ﷺ) پاشان ولاتانی تریش ڕزگار کرا. لە دوا کۆچ کردنی لە سەردەمی خەلیفەکانی تردا (ڕەزای خوا لە هەموویان بێ) وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾[3] خودا خۆی بڕیاری داوە: بێ گومانە منو پێغەمبەرەکانم سەر دەکەوین، خودا(خاوەن) توانای بەدەستەلاتە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[4] بێگومانە: ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەو کەسانەی کەوا بڕوایان هێناوە

---

[1] هود (١٢١-١٢٢).
[2] الطبري (١٢/١٢٩).
[3] المجادلة (٢١).
[4] غافر (٥١-٥٢).

لە ژیانی ئەم دنیایەداو لەو ڕۆژەش کە شایەتەکان ڕاست دەبنەوە یارمەتی ئەدەین. ئەو ڕۆژەی کە ستەمکاران پاکانەیان سوودیان پێ ناگەیەنێ و گشتیان بە نەفرین کراون و نالەبارترین شوێنیان هەیە.

وە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾[1] لە زەبوردا (کە لە پاش تەورات هات) نووسیوومانە: ئەم زەمینە هەر بۆ عەبدە چاکەکانی ئێمە دەمێنێ.

﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالْأَنْعَامِ نَصِيبًا فَقَالُوا هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَائِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَائِهِمْ ۗ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾﴾

**باسی هەندێ لە کارو کرداری بتپەرستان**

ئەمە گلەیی و زەمە لەلایەن خوداوە لەو بتپەرستانەی کە شتی تازەیان داهێناو دەستیان دایە بێدینی و بتپەرستی، هاوبەشیان بۆ خودا داناو کردیانە شەریکی لە بەشدا. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالْأَنْعَامِ نَصِيبًا فَقَالُوا هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَائِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَائِهِمْ ۗ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ لە بەروبوومی ئەو کێڵگەو ماڵاتانەی کە خودا بەدی هێناوە بەشێکیان بۆ خوا دانا. جا بە خەیاڵ وتیان: ئەمە بەشی خودایەو ئەمەیش هی بتەکانمانە. خۆ ئەوەی بتەکانیان نەدەگەییە لای خودا. بەڵام ئەوەی خودا دەچووە لای بتەکانیان، خراپ دادوەری دەکەن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەو عەوفی ئەڵێن: لە ئیبنوعەبباسەوە: کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: دوژمنانی خودا ئەگەر کشتوکاڵیان بکردایەو بەروبومێکیان هەبوایە، بەشێکیان دادەنا بۆ خوداو بەشێکیشیان بۆ بتەکانیان دادەنا. ئەو کشتوکاڵ و بەروبومەی کە دایان دەنا بۆ بتەکان هەژماریان دەکردو پارێزگاریان لێ دەکرد. خۆ ئەگەر بەشێکی بکەوتایەتە سەر بەشی خودا، دەیانگەڕاندەوە سەر بەشی بتەکانیان. یان ئەو ئاوەی کە دایان نابوو بۆ بەشی بتەکان، ئەگەر بەشی لای خودای ئاودێر بکردایە، ئەو بەشەشیان دادەنا بۆ بتەکان. بەڵام ئەگەر شتێ لەو کشتوکاڵ و بەروبومە بکەوتایە تێکەڵاوی بەشی بتەکانیان دەکردو دەیانگوت: ئەمە هەژارەو نەیاندەگەڕاندەوە بۆ ئەو بەشەی کە بۆ خودایان دانابوو. وە ئەگەر ئەو ئاوەی کە دایان دەنا بۆ خودا بڕۆشتایە بۆ ئەو بەشەی کە بۆ بتەکان دانرابوو ئاودێری بکردایە وازیان لێ دەهێنا بۆ بتەکانیان. وە هەندێ لە ماڵاتەکانیشیان قەدەغە کردبوو

---

[1] الانبیاء (١٠٥).

(نەیاندەهێشت هیچ کەسێ بەکاریان بێنێ) دایان نابوون بۆ بتەکانیان (وەك بەحیرەو سائبەو وصیلەو حام) بە خەیاڵی خۆیان بۆ نزیك بونەوە لە خودا قەدەغەیان کردبوون. خودای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا﴾ واتە: لە بەروبومی ئەو کێڵگەو ماڵاتانەی کە خودا دروستی کردوە بەشێکیان بۆ خودا دانا.[1] موجاهیدو قەتادەو سوودیو کەسانی تریش هەر وایان گوتوە.[2] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم ئایەتەدائەڵێت: هەر شتێ لە سەربڕاو کە دایدەنێن بۆ خودا هەرگیز لێی ناخۆن تا ناوی پەرستراوەکانیانی لەگەڵدا نەهێنن، بەڵام ئەوانەی بۆ پەرستراوەکانیانە ناوی خودای لەسەر ناهێنن. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند تا گەیشتە: ﴿سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾[3] واتە: بەشێکی خراپەکە بەشی دەکەن، بێگومان ئەوانە هەر لە سەرەتاوە بە هەڵە دابەشیان کرد، چونکە هەر خودای گەورەپەروەردگارو خاوەنو وەدیهێنەری گشت شتێکەو هەموو شتێ هی ئەوە ئەو خاوەنیەتی لەژێر دەستی ئەو دایەو هەڵی دەسورشێنێ بە مەیلی خۆیو هیچ پەرستراوو پەروەردگارێك نیە غەیرەز ئەو، پاشان کاتێ کە دابەشیان کرد ناهەقیان تێدا کردو لە ئەندازە دەرچوون تێدا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ﴾[4] کچان بۆ خودا دادەنێن (کە ئەو لەو شتانە پاکە) بۆ خۆشیان چی ئارەزوودەکەن. وەئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنۡ عِبَادِهِۦ جُزۡءًاۚ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ مُّبِينٌ﴾[5] فەرزەندیان لە بەندەکانی خۆی بۆ دانا. بەڕاستی مرۆڤ بە ئاشکرا پێ نەزانە. وە ئەفەرموێت: ﴿أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ۝٢١ تِلۡكَ إِذٗا قِسۡمَةٞ ضِيزَىٰٓ﴾[6] ئاخۆ منداڵی ئێوە نێرەو خودایش کچی هەیە؟ ئەگەر وابێ بەشکردنێ ناڕەوایە.

﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ۝١٣٧﴾

[1] الطبري (١٢/١٣١-١٣٢).
[2] الطبري (١٢/١٣٣).
[3] الطبري (١٢/١٣٤).
[4] النحل (٥٧).
[5] الزخرف (١٥).
[6] النجم (٢١-٢٢).

**شەیتان کوشتنی منداڵی جوانی ڕەوا کرد بۆ بتپەرستان**

خـــودای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ بتـە دانـانی هـاوەڵ دانـەر بـۆ خـودا، وایانکرد کە زۆرێك لە هاوبیرەکانیان کوشتنی فەرزەندی خۆیان بە لاوە جوانو ڕەوا بێ، هەتا لـەناویان ببەنو ئاینەکەیان لێ تێکەڵو پێکەڵ بکەن. واتە: وەك چۆن شـەیاتینەکان وایـانکرد بـەو بتپەرسـتانەو لایـان شـیرین کردبوون کـە بەشـێ لـەو کێڵگـەو مـەڕو ماڵاتـەی کـە خـودا وەدی هێنـا بـوو دابنـێن بـۆ بتەکانیان، هەر بەو شێوەیە بۆیان جوانو ڕەوا کردبوون لەبەر نەبونیو هەژاری منداڵی خۆیان بکوژنو کـچی خۆیـان زیندەبەچـاڵ بکـەن لەبـەر شـورەییو نـەنگی، عـەلی کـوڕی ئەبوتەلحەئـەڵێت: لـە ئیبنوعەبباسـەوە گـوتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾ واتـە: هاوبیرەکانیـان کوشـتنی منداڵـەکانیان لـەلا جـوان کـردن[١] موجاهیدئـەڵێت: هاوکارەکانیان واتە: شەیاتینەکان فەرمانیان پێ دەدان کە منداڵەکانیان زیندەبەچاڵ بکەن لە ترسی هەژاری.[٢] سوودی ئەڵێت: شەیاتینەکانیان فەرمانیان پێ دەدان کە کچەکانیان بکوژن ﴿لِيُرْدُوهُمْ﴾ بۆ ئەوەی لەناویان بەرن یـان ﴿وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ ئاینەکـەیان لێ تێکـەڵو پێکـەڵ بکـەنو لێیان بشێوێنن.[٣] خودای گەورە پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە، ئەوانە ئاوایان نەدەکرد، واتە: هەر شتێ کە ڕوو ئەدا بە ویستو مەیلی خودای گەورەیەو خۆی بڕیاری داوە، لە کارزانی هەر لە خۆی دەوەشێتەوە پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی دەیکات، بەڵکو ئەو خەڵکەیە کە پرسیاریان لێ دەکرێ. ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ لێیان گەڕێ هـەر بوختـانێ دەکـەن بـا بیکـەن. دووربە لە خۆیانو کرداریان، بەو زوانە خودا دادوەری لە نێوان تۆو ئەواندا دەکات.

﴿وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾﴾

---

[١] الطبري (١٣٦/١٢).
[٢] الطبري (١٣٦/١٢).
[٣] الطبري (١٣٧/١٢).

## هەندێ لەو ئاژەڵ و ماڵاتانەی بتپەرستان قەدەغەیان دەکرد

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ هەر بە خەیاڵ دەیانگوت کە: ئەم ماڵات و کێڵگە قەدەغەن بێئیزنی ئێمە هیچ کەس نابێ تامیان بکات. ئەم ماڵاتەش کەس نابێ سواری پشتیان بێ. هەندێ ماڵاتیشیان هەیە، لە کاتی سەربڕیندا ناوی خودای لەسەر ناهێنن و درۆ بە دەم خوداوە دەکەن، خودا لەسەر ئەو درۆ هەڵبەستنەیان تووشی سزایان دەکات. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێت: (الحجر) وماتە: قەدەغەی ئەو ماڵاتەی کە کردبویان وەك (وصيلة) یان قەدەغەکردنی ئەو ماڵاتانەی کە حەرامیان کردبوو.[1] موجاهیدو زەححاك و سوودی و قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم و کەسانی تریش هەر وایان وتوە.[2] وە قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ﴾ ئەڵێت: ئەمە قەدەغەیەك بوو کە شەیاتینەکانیان بۆیان دانابوون لەسەر ماڵاتەکانیان کە ئەمە زبری و توندیەکە، کە لەلایەن خودای گەورەوە نەبوە. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: ﴿حِجْرٌ﴾ ئەو ماڵاتانە بوو کە قەدەغەیان کردبوو بۆ پەرستراوەکانیان[3] سوودی ئەڵێت: ﴿لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ﴾ دەڵێن: قەدەغەیەو نابێ کەس لێی بخوات مەگەر کەسێ کە خۆمان حەزکەین بیخوات[4] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾[5] بڵێ: ئایا سەیری ئەو ڕۆزیتانە کردوە کە خودا بۆی ناردون؟ بە ڕەواو ناڕەوا دابەشتان کردوە؟ بڵێ: خودا ڕێی پێدان یان درۆ بە ناوی خوداوە دەکەن. یان ئەفەرموێت: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾[6] خودا سەبارەت بە (بەحیرە)و (سائیبە)و

[1] الطبري (١٢/١٤٣).
[2] الطبري (١٢/١٤٣).
[3] الطبري (١٢/١٤٣).
[4] الطبري (١٢/١٤٣).
[5] يونس (٥٩).
[6] المائدة (١٠٣).

دەربارەی (حام)و (وەصیلة) هیچ بڕیارێکی نەداوە بەڵام خوانەناسەکان (کە زۆربەیان بێ ئاوەزن درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن). سوودی ئەڵێت: ئەو ماڵاتانەی کە سەرپشتی قەدەغە کرابوو ئەمانە بوو (بەحیرە)و (سائیبە)و (وەصیلە)و (حام) بوو، بەڵام ئەو ماڵاتانەی کە ناوی خودایان لەسەر نەدەهێنا ئەوانە بوون کە لە دایك دەبوون یان سەریان دەبڕین. ئەبوبەکری کوڕی عەییاشی گوتی: لە عاسیمی کوڕی ئەبونەجودەوە گوتی: ئەبووائیل پێی وتم: ئایا دەزانی چی لەم ئایەتەدایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا﴾ وتم: نەخێر، وتی: ئەوە (بەحیرەیە) کە حەجیان لەسەر پشتی نەدەکرد[1] موجاهید ئەڵێت: هەندێ وشتریان هەبوو ناوی خودایان لەسەر نەدەهێنا لە هیچ کارو فەرمانێکیاندا، نە لە سوار بوونی پشتیدا، نە لە دۆشینیدا، نە لە بارکردنیدا وە نە لە کاتێکدا لە بەرزایەکدا بونایە، وە نە لە هەر کارێکدا بیانکردایە[2] ﴿ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ﴾ درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن، هەندێ ئەو شتانە دەخەنە پاڵ ئاینو شەرعی خودا. بێگومان خودای گەورە ڕێی پێ نەداوەو ڕازی نیە بەو کارەی کە دەیکەن ﴿سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ خودا لەسەر ئەو درۆ هەڵبەستنەیان بەو زوانە تووشی سزایان دەکات.

﴿وَقَالُواْ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ﴾ دەیانووت: هەرچی لە سکی ئەو ئاژەڵانەدایە بۆ فەرزەندی نێرینەی ئێمەیەو بۆ ژنانمان ناڕەوایە، ئەگەر مردارەوەش بێ هەموان تێیدا هاوبەش دەبن عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَقَالُواْ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا﴾ ئەڵێت: مەبەست پێی شیری ئەو وشترانە بووە کە قەدەغەیانکردبوو لە ژیانیان کە لێی بخۆنەوە، تەنیا دەبو نێرینە شیرەکەیان بخۆن. وە ئەگەر مەڕێ بەرخێکی (بێچویەکی) نێری ببوایە،

---

١- (بەحیرە): وشترێك بوو پێنج سکی بکردایەو پێنجەم نێر بوایە. ئەو کاتە گوێچکەیان لەت دەکردو بەرەڵایان دەکرد.
٢- (سائیبە): وشترێك بوو کە دە تا دوانزە سکی بکردایە هەموو مێینە بوایە. ٣- (وەصیلة): وشترێك بوو یەکەمو دووەم سکی مێینە بوابە. ٤- (حام): وشترێکی نێر بوو کە لە پشتی ئەو دە سك پەیدا ببوایە.

[1] الطبري (١٢/١٤٤).

[2] الطبري (١٢/١٤٥).

سەریان دەبڕی، تەنیا پیاوان لێیان دەخوارد ژنان بۆیان نەبوو لێی بخۆن. خۆ ئەگەر بێچوەکە مێینە بوایە وازیان لێ دەهێناو سەریان نەدەبڕی. ئەگەر مردارۆبوویش بوایە هەموو هاوبەش بوون تێیدا. خودای گەورە ئەوەی لێ قەدەغە کردن[1] ئەبوئیسحاقی سەبیعی وتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوهوزەیلەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ووتی: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا ﴾ مەبەست پێی شیرەکەیان بووە[2] سوودیش هەر وای گوتووە[3] شەعبی ئەڵێت: بەحیرە جگە لە پیاو کەسی تر شیرەکەی نەدەخوارد، ئەگەر لێیان مردار ببوایەتەوە پیاوو ژن بەیەکەوە لێیان دەخوارد. عیکرمەو قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتوە. موجاهید لەم ئایەتەدا ﴿ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ﴾ ئەڵێت: مەبەست پێی سائیبەو بەحیرەیە[4] ئەبولعالیەو موجاهیدو لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: وتیان: ﴿سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ﴾ بەو زوانە خودا سزای ئەو قسە (درۆیانەیان ئەداتەوە[5] هەر بەم شێوەیە خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَـٰذَا حَلَـٰلٌ وَهَـٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴾[6] بە درۆ زمانتان نەگەڕێ، کە ئەمە ڕەواو ئەوە ناڕەوایە. هەر بۆ ئەوە درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن ئەو کەسانەی درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن ڕزگار نابن. گوزەرانێکی کەمە. ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ ﴾ بێگومان خودا لەکارزانە لە کردارو گفتارو بەرنامەو بڕیاریدا ﴿عَلِيمٌ ﴾ دانایە بە کرداری عەبدەکانی لە چاکەو خراپە. بەو زوانە پاداشتی تەواویان ئەداتەوە.

﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾

---

[1] الطبري (١٢/١٤٦).
[2] الطبري (١٢/١٤٧).
[3] الطبري (١٢/١٤٨).
[4] الطبري (١٢/١٤٨).
[5] الطبري (١٢/١٥٢).
[6] النحل (١١٦-١١٧).

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾ ئەو کەسانە (وا لەبەر گەوجی و نەزانی) منداڵانی خۆیانیان کوشت زیانبار بوون و ئەو بژێوەی کە خودا پێی دابوون حەرامیان کردو درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن: دیارە ڕێیان لێ تێکچوەو شارەزا نین. واتە: ئەوانەی ئەو کارانە دەکەن لە دنیاو لە قیامەتدا زیانبارن لە دنیادا بە کوشتنی منداڵەکانیان ەزیانبار دەبن، ڕۆژی دەکەن لە بەرانبەریان لە یارمەتی دانیان لەو سامانەی خودا پێی داون، هەندێ شتیان پێ ڕەوا نابینن کە هەر خۆیان بە ئارەزو دایانهێناوە بێ بەشیان کردون لێی. وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا خراپترین شوێنیان دەبێ بەهۆی ئەو درۆو بوختانەی بە ناوی خوداوە دەیکەن، وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ ﴾[1] ئەوانەی درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن ڕزگار نابن. ڕابواردنێکی کەمە لە دنیادا، لە دواییدا دەگەڕێنەوە بۆ لامان، لە پاش ئەوە لە سزای حاشا کردنیان بە توندی ئازاریان دەدەین. حافیز ئەبوبەکری کوڕی مەردەوەیهی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی: ئەگەر حەز دەکەی لە نەفامی عەرەب تێبگەی، لە سەرەوەی ئایەتی(١٣٠) سورەتی ئەنعامەوە (قورئان) بخوێنەوە کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾ بوخاریش بە تەنیا لە کتێبی (مناقب قریش) لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی[2].

﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾﴾

---

[1] یونس (٦٩-٧٠).

[2] فتح الباري (٦/٦٣٦).

**هەر خودایە کە بەروبوم و دانەوێڵە و ماڵاتی وەدیهێناوە**

خودای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە خۆی وەدیهێنەری گشت شتێکە لە کشتوکاڵو بەروبومو مەڕو ماڵاتو ئاژەڵ کە ئەو بتپەرستانە بەو بۆچوونە خراپو ناڕەوانە هەڵسوکەوتو ڕەفتاری تێدا دەکەنو دابەشیان کردوە هەندێکیان بە ڕەواو هەندێکی تریان بە ناڕەوا داناوە. بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ هەر ئەویشە باغاتی وەدیهێناوە، هەندێکیان داربەستی دەوێتو هەندێکیان داربەستی ناوێ. دارخورماو کشتوکاڵو کێڵگەی وەدیهێنا، کە لە خواردندا لە یەك جیان. زەیتونو دارهەناریشی دروست کردوە کە بە ڕواڵەت وەك یەكنو لە تامو ڕەنگدا جیاوازن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە: ئەڵێت: ﴿مَّعْرُوشَٰتٍ﴾ داری (ئەستوور). وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە (المعروشات) ئەوەی خەڵکی کەپرو هەرزاڵی لێ دەکەن. (و غير معروشات) ئەو بەروبومانەیە کە لە دەشتو کێودا دێنە دەر[1] عەتای خۆراسانی: لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: (معروشات) ئەو دار مێوانەیە کەپرو هەرزاڵەی بۆ دەکرێ. (غير معروشات) ئەو مێوانەیە کەپرو هەرزاڵەی بۆ ناکرێ. سوودیش هەر وای گوتوە. ئیبنوجورەیج ئەڵێت: ﴿مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ واتە: لە ڕواڵەتدا لە یەك دەچن لە خواردندا لە یەك جیاوازن.[2] ﴿كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ﴾ هەرکاتێ میوەیان پێدەگات لێی بخۆن. موحەممەدی کوڕی کەعب گوتی: ﴿كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ﴾ واتە: لە ئاودارەکەیو لە ترێکەشی بخۆن.[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ بەشی خودای لێ جیا بکەنەوە (بۆ هەژاران). موجاهیدئەڵێت: ئەگەر هەژاران هاتنە لات بەشیان بدە لێی.[4] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە موجاهیدەوە ﴿وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ کە وتویەتی: لە کاتی چاندنیدا چنگێ دەدرێو لە کاتی بڕینیدا چنگێ دەدرێو وازیان لێ دێنن تا بگەڕێن بەسەر پاشماوەی ئەو بڕینەدا.[5] سەوری ئەڵێت: لە حەمادی کوڕی ئیبراهیمی نەخەعیەوەئەڵێت: هەر بەو شێوەیە چەپکێ ئالکی (عەلەفی) پێدەدرێ بۆ

[1] الطبري (١٢/١٥٦).
[2] الطبري (١٢/١٥٧).
[3] الطبري (١٢/١٥٧).
[4] الطبري (١٢/١٦٣).
[5] عبدالرزاق (٢/٤١٩).

ولاغەکەی.[1] ئیبنوموبارەك گوتی: لە شەریکەوە لە سالمەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ ئەڵێت: ئەمە لە پێش زەکاتدا بووە، چنگێ بۆ هەژارو چەپکێ بۆ ئالکی ولاغەکەی. خودای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە باخ دەڕنن و خێرو سەدەقەی لێ ناکەن. وەك چۆن باسی خاوەنەکانی ئەو باخە دەکات لە سورەتی (ن)داو ئەفەرموێت: ﴿إِذْ أَقْسَمُواْ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْاْ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُواْ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُواْ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْاْ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾[2] سوێندیان دەخوارد سبەی بەری باخەکەیان هەموو دەڕنن (ئەگەر خوا حەزکا)شیان دەگوت. کاتێ کە ئەوان خەوتبوون لەلایەن پەروەردگارتەوە بەڵایەکی بۆ داباری، ئیتر وەك زەویەکی سووتاوی ڕەش هەڵگراوی لێ هات ئەوسا بەیانی هەموو بانگی یەکتریان کرد، ئەگەر ئێوە میوە ڕنن هەر بەیانی بگەنە سەر کێڵگەی خۆتان. دەچوون بە ڕێوەو پێکەوە چپەیان دەکرد: کە نابێ ئەمڕۆ هیچ هەژارێ بێتە ناو باخەکەی ئێوە. بڕیاریان دا مەرجەکەیان بەجێ بێنن واشیان زانی دەتوانن. وەختێ چاویان بەیەکدا گێڕا گوتیان: ڕێمان لێ تێکچووە، نەخێر ئێمەین بەش براوین. بە ئاوەزترینەکەیان وتی: ئایا پێم نەگوتن بۆ پەسەنی پاکی خودا نادەن؟ وتیان: پاكو بێگەردی بۆ پەروەردەمان ئێمە ناهەقیمان کرد. ئەوسا ڕوویان کردە یەكو سەرزەنشتی یەکتریان کرد، گوتیان: هەی ماڵ وێران خۆمان ئێمە هەڵەڕێمان کرد. بەڵکو پەروەردگارمان لەوە چاکترمان بداتێ، هیوامان هەر بەو پەروەردگاری خۆمانە. ئازاری دنیا ئاوایە، گەر بزانن بێگومان ئازاری دوارۆژ دژوارترە.

**باسی زیادەڕەوی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ کارێ مەکەن کە لە ئەندازە بەدەر بێ، خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە لە ئەندازە دەردەچن. هەندێ دەڵێن: لە ئەندازە دەرمەچن لە بەخشیندا، بەخشینەکەت لە چاکە دەرچێ. ئیبنوجورەیج گوتی: ئەم ئایەتە لەسەر سابتی کوڕی

[1] الطبري (١٢/١٦٥).
[2] القلم (١٧-٣٣).

قەیسی کوڕی شەمماس هاتە خوار، دارخورمایان بۆ دەبڕی وتی: هەرکەسێ ئەمڕۆ بێتە لام خواردنی لەم خورمایە پێدەدەم، تا ئێوارە خواردنی دا بە خەڵکی هیچی لەو بەروبومە بۆ نەمایەوە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ ئیبنوجەریر ئەوەی ڕیوایەت کردوە لە ئەبوجورەیجەوە. بەڵام (والله أعلم) لە دەقی ئایەتەکەوە وا دیارە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ خواردنەکە واتە: زیادەڕەوی مەکەن لە خواردندا چونکە زیان دەگەیەنێ بە عەقڵو تەندروستی. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ﴾[1] بخۆنو بخۆنەوە زیادەڕەوی مەکەن. وە لە سەحیحی بوخاریدا بە موعەلەقی هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بخۆنو بخۆنەوەو بپۆشن بەبێ زیادەڕەویو لەخۆبایی بوون)[2].

### بەهرەو سوودی ئاژەڵ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ﴾ مالاتیش هەندێکی بۆ بار لێنانو هەندێکی بۆ کوڵکەو (موو) خوریەکەیەتی. واتە: خودای گەورە ئەو مالاتانەی بۆ وەدیهێناون هەندێکی بۆ بارهەڵگرتنەو هەندێکی تریشی بۆ کوڵكو خوریو موەکەیەتی. هەندێ دەڵێن: ﴿حَمُولَةٗ﴾ ئەو وشترانەیە کە بار هەڵدەگرن ﴿وَفَرۡشٗاۚ﴾ بێچوەکانیان. وەك سەوری ئەڵێت: لە ئەبوئیسحاقەوە لە ئەبوئەحوەسەوە لە عەبدوڵلاوەئەڵێت: ﴿حَمُولَةٗ﴾ ئەوەی باری لێ دەنرێ لە وشتر ﴿وَفَرۡشٗاۚ﴾ بەچکە وشتر. حاکم ڕیوایەتی کردوەو گوتی سەنەدەکانی ڕاستن[3] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم گوتی: (الحمولة) ئەوەیە کە سواری دەبن (الفرش) ئەوەیە کە دەیخۆنو دەیدۆشن. مەڕ باری لێ نانرێ گۆشتەکەی دەخۆنو لە خوریەکەی لێفەو ڕاخەر دروست دەکەن.[4] ئەمەی کە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتی چاکەو ئەم ئایەتانە پشتگیری لێ دەکات کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ٧١ وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ فَمِنۡهَا رَكُوبُهُمۡ وَمِنۡهَا يَأۡكُلُونَ﴾[5] ئایا هێشتا نەیاندیوە ئێمە بە دەستی توانامان مالاتمان بۆ

---

[1] الاعراف (٣١).

[2] فتح الباري (٥٧٨٣).

[3] الحاكم (٢/٣١٧).

[4] الطبري (١٢/١٨١).

[5] يس (٧١-٧٢).

بەرهەم هێنان، ئەوانە بوونەتە خاوەنیان؟ وا بۆشمان دەستەمۆ کردوون، کە دەتوانن سواریان بن‌و لێیـان بخۆن. وە ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴾[1] لە مالاتیشدا بۆ ئێوە پەندێك هەیە: لە ناو سکیان‌و لە نێوانی شیاکەو خوێنیاندا شیرێکی پاك‌و ڕوانتان دەرخوارد ئەدەن. بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە خۆش‌و بەتامە. تا دەگاتە ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾[2] لە خوری‌و بەرگن‌و موویان کەلوپەل‌و پێویستی ماڵ دابین دەکەن‌و گوزەران دەکەن تا ماوەیە.

**لەم ئاژەلانە بخۆن‌و شوێنی بەرنامەی شەیتان مەکەون تێیدا**

خودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿كُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ لەو ڕۆزیـەی کە خـودا پێـی داون بخۆن. واتە: لەو بەروبوم‌و کشتوکاڵ‌و ئاژەلانە بخۆن کە خـودا دروستی کردوە بۆتـان ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ ڕێ‌و شوێنی شەیتان مەگرنەبەر و فەرمانەکانی بەجێ مەهێنن. وەك چۆن ئەو بتپەرستانە وتیانە بەرو ئەو ڕۆزیەی خودا پێیدان لە بەروبوم‌و کشتوکاڵ لە خۆیان حەرام کرد، بە بوختان کردن بە ناوی خوداوە ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ چونکە شـەیتان بـە ئاشکرا دوژمنتانـە. وەك خـودای گـەورە لـە ئایـەتی تـردا ئەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴾[3] شەیتان دوژمنـی ئێوەیە، سا ئێوەش ببنـە دوژمنـی، ئـەو هـەر بۆیـە دارو دەستەی بـانگ دەکات، تا لە هاوەلانی ئاگر بن. وە ئەفەرموێت: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا ﴾[4] ئەی نەوەکانی ئـادەم شـەیتان نەتانخەڵـەتێنێ هـەر وەك باوك‌و دایکتانی لە بەهەشت بە دەرکردن داو جل‌و بـەرگی لێ داڕنیـن تـا شـەرمی خۆیانیـان پیـان نیـشان بـدا. وە ئەفــەرموێت: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا ﴾[5] ئایا ئێوە توخمی شەیتان‌و نەوەی جگە لە من دەکەن بە دۆستی خۆتان، کە بە ئاشکرا ئەوانە

---

[1] النحل (٦٦).
[2] النحل (٨٠).
[3] فاطر (٦).
[4] الاعراف (٢٧).
[5] الكهف (٥٠).

دوژمنتانن؟ ئای چ گوڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران. (لەباتی خودا) ئایەت لەم بارەوە لە قورئاندا زۆرە.

﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾﴾

﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ هەشت سەر مالاتی نێرو مێی دروست کردوە: مەڕو بەرانو بزنو سابرێن. بلێ: ئایا خوا نێرینەکانی حەرام کردوە؟ یان مێینەکان؟ یان ئەوەی وا لە سکی مێیەکاندا؟ بەلگەم نیشاندەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەڵێن. (چواری تریش بریتین لە) وشتری نێرو وشتری مێو چێڵو مانگا، بلێ: ئایا خوانێرینەکانی حەرام کردوە؟ یان مێینەکان؟ یان ئەوەی وا لە سکی مێیەکاندا؟ یان خۆتان ئاگادار بوون کە خودا وای ڕاسپاردوون؟ لێرەدا خودای گەورە باسی نەفامی عەرەبەکان دەکات لە پێش ئیسلامدا. لەوەی کە هەندێ مالاتیان لە خۆیان حەرام کردو دابەشیان دەکرد بە چەند جۆرەوە وەك (بەحیرە)و (سائیبە)و (وصیلە)و (حام)و چەند جۆرو ناوی تریش کە بە ئارەزوی خۆیان دایان دەهێنا لەناو ئاژەڵو مالاتو کشتوکاڵو بەروبومدا. خودای گەورەش ڕوونی کردوەتەوە کە هەر خۆی بەروبومی بە داربەستو بێ داربەست دروست کردوە لە باخەکاندا وە هەر خۆشی مالاتی بار بەرو بزنو مەڕیشی دروست کردوە، پاشان دێتە سەر باسی جۆری مالاتی سپی وەك مەڕو بەران، ڕەش وەك بزنو سابرێنو وشتری نێرو مێو چێڵو مانگا بێگومان خودا هیچێ لەمانەو لە بێچوەکانیشی حەرام نەکردوە، بەڵکو هەموو دروس کراوە بۆ ئەوەی ئادەم کە بیخواتو سواری بێو شیرەکەیشی بخواتو سوودی تریشی لێ وەربگرێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾[1] هەشت جوتیشی لە مالات بۆ ناردن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یان ئەوەی وا لە سکی مێینەکاندا؟ لە وەلامی ئەوەی کە دەیلێن: ﴿مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ

---

[1] الزمر (٦).

أَزْوَٰجِنَا ﴾[1] چی لەناو سکی ئەو ئاژەڵانە دایە بۆ نێرینەی ئێمە حەڵاڵەو بۆ ژنانمان حەرامە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بەڵگەم نیشاندەن، ئەگەر ئێوە ڕاست دەڵێن. واتە: پێم بڵێن بەڕاستی چۆن خودا ئەوەی لێ حەرام کردون کە ئێوە بە حەرامتان داناوە لەسەر خۆتان لە (بەحیرە)و (سائیبە)و (وصیلە)و (حام) عەوفی گوتی: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ﴾ ئەمە چوار جووتە. ﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ بڵێ: خوا نێرینەکانی حەرام کردوە؟ یان مێینەکان؟ خودای گەورە ئەفەرموێت هیچێ لەمانەی حەرام نەکردوە ﴿أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ یان ئەوەی وا لە سکی مێیەکاندا؟ واتە: ئایا سکی مێیەکان لە نێرو مێ پێك نایەت، بۆچی هەندێکی حەڵاڵ دەکەن‌و هەندێکی حەرام دەکەن؟ ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بەڵگەیەکم نیشان بدەن ئەگەر ڕاست دەڵێن. خودای گەورە ئەفەرموێت هەمووی حەڵاڵە[2] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا﴾ ئایا ئێوە لەوێ بوون کاتێ کە خودا وای ڕاسپاردن، خودای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکات لەسەر ئەوەی کە دایانهێناوەو هەڵیان بەستوە بۆ خواو حەرامیان کردوە لە خۆیان لەو شتانەو ئەفەرموێت:﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ساکێ لەوە ستەمکارترە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ، کە بێئەوەی بۆ خۆی زانستێکی هەبێ، هەوڵ بدات خەڵکی تریش گومڕا بکات؟ خودا کۆمەڵی ستەمکاران شارەزای ڕێگەی خۆی ناکات. واتە: هیچ کەسێ لەوە ستەمکار تر نیە یەکەم کەسێ ئەم ئایەتە بە تەواوی دەیگرێتەوە عەمری کوڕی لوحەیی کوڕی قەمەعەیە چونکە یەکەم کەس بوو کە ئاینی پێغەمبەرانی گۆڕی، وە یەکەم کەسیش بوو کە (سائیبە)و (وەصیلە)و (حامی) داهێنا. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە[3].

---

[1] الانعام (١٣٩).

[2] الطبري (١٨٧/١٢).

[3] فتح الباري (١٣٢/٨).

﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾﴾

**باسی ئەو شتانەی کە حەرامکراون**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ ئـەی موحەممـەد(ﷺ) بڵێ: لەناو ئەوانەدا کە پێم ڕاگەیەنراوە شتێکی وا پەیدا ناکەم کە خواردن لـە کەسێك حـەرام کرابێ، بێجگە لە مردارۆ بوو یان خوێنی ڕژێندراو یا گۆشتی بەراز (کە پیسە) یان (ئاژەڵێ) کە بە ناوی غەیرەز خودا سەربڕاوە. واتە: خودای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد(ﷺ) کە بڵێ بەو کەسانە ئەو ڕۆزیەی کە خودا پێی داون و درۆیان بە ناوی خوداوە کردوەو حەرامیان کردوە.

واتـە: وا نـازانم هـیچ شـتێ لـە ئاژەڵـەکان کەسـێ بیخـوات حـەرام بـێ جگـەی لەمانـە ﴿مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا﴾ یان خوێنی ڕژێندراو. قەتادە ئەڵێت: خـوێنی ڕژێـندراو حـەرام کـراوە، بـەڵام ئـەو گۆشـتەی خوێنی تێکەڵاو بووە خواردنی حەرام نیە[1] حومەیدی وتی: لە سوفیانەوە لـە عـەمری کـوڕی دینـارەوە وتی: بە جابیری کوڕی عەبدوڵلام ووت: ئەوانە دەڵێن کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) گۆشـتی کـەری ماڵی حەرام کردوە لە کاتی خەیبەردا وتی: ئەو کاتە حەکـەمی کـوڕی عـەمر ئـەوەی لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) گێڕایەوە، بەڵام ئیبنوعەبباس دانی پێدانـەناو ئـەم ئایەتـەی خوێنـد: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ﴾[2] بوخـاریو ئـەبوداوودیش ڕیوایـەتیان کـردوە.[3] ئەبوبـەکر ڕیوایـەتی کـردوە ئیبنومەردەوەیهیو حاکیم لـە موستـەدرەکەکەیدا لـە ئیبنوعەبباسـەوئەڵێت: خـەڵکی چـەرخی نەفامی هەندێ شتیان دەخواردو هەندێکیان لەبەر پیسیو چەپەڵی نەدەخوارد، خودای گەرە ئـەم پێغەمبـەرەی (ﷺ) بە کتێبەوە کە قورئانی پیرۆزە ڕەوانە کرد، ئەوی حەڵاڵە بۆی حەڵاڵ کردنو ئەوەیش حەرامـە لێی حەرام کردن، ئەوەیش لێی بێدەنگ بووە چاکەو خراپ نیە پاشان ئـەم ئایەتـەی خوێند: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ﴾ ئەمە وتەی ئیبنومەردەوەیهیە، ئـەبوداوودیش ڕیوایـەتی

---

[1] الطبري (١٢/١٩٣).

[2] الحُمَيدي (٢/٢٩٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٩/٥٧٠)، أبوداود (٤/١٦٢).

کردوه، حاکیم گوتی: ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی سەحیحە[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوه لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێت: مەڕێکی سەودەی کچی زەمعە مردار بوەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فڵانە مردار بووە واتە: ئەو مەڕە، فەرمووی: (بۆچی پێستەکەتان لێ نەکردەوە؟) (سەودە) وتی: پێستی مەڕێ بکەینەوە کە مردار بوەتەوە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ﴾ خۆ ئێوە نایخۆن، خۆشەی بکەن بەهرەی لێ وەرگرن، (سەودە) ناردی پێستەکەیان لێ کردەوەو خۆشەی کردو، کردی بە کونە (جەوەنە) لەلای مایەوە هەتا کونی تێ بوو.[2] بوخاریو نەسائیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە.[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرکەسێکیش (بە ناچاریو بەبێ ئارەزوو) لەو حەرامانە بخواو لە ئەندازەی تێر بوونی خۆی زیاتر نەخوا، بێگومان خودا بەخشندەیەو دڵۆڤانەو لێی دەبورێ. مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە وەڵامدانەوەی ئەو بتپەرستانە بوو کە ئەو شتانەیان داهێنا بوو بە ئارەزوی خۆیان وەك (سائیبەو بەحیرەو حامو وەصیلەو چەند شتی تریشیان لە خۆیان قەدەغە کردبوو، خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە ئاگاداریان بکات، کە هیچ شتێکی وا نابینێ لەوەی کە خوا بۆی ناردوە کە ئەوانە قەدەغەن، بەڵکو ئەو شتانە قەدەغەن کە لەم ئایەتەدا هاتوە وەك گۆشتی مردارۆ بوو یان خوێنی ڕژێندراو یان گۆشتی بەرازو ئەوەی بە ناوی غەیرەز خوداوە سەربڕاوە. جگە لەمانە حەرام نەکراوە بەڵکو قسەی لەسەر نەکراوەو چاوپۆشی لێ کراوە. کەواتە ئێوە چۆن دەڵێن ئەوە حەرامە، لە کوێوە ئەوەتان حەرام کردوە کە خودا حەرامی نەکردوە؟

﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ ۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾﴾

**ئەو حەڵاڵانەی لە جوولەکە حەرام کرا بەهۆی لە ڕێ دەرچونیانەوە بوو**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ﴾ ئێمە هەموو چرنوك دارێکمان (لە ئاژەڵو باڵدار) لەسەر ئەوانە بوونە جوولەکە حەرام کرد.[4] وەك وشترو ئاژەڵو مراوی

[1] أبوداود (٣٨٠٠)، الحاكم (٤/١١٥)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[2] أحمد (١/٣٢٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (١١/٥٧٧)، النسائي (٧/١٧٣).

[4] سەیری تەفسیری ئایەتی (٩٣) لە سورەتی ئالی عیمران بکە لەسەر ئەم باسە.

پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ﴾ پیوو چەوری و گاو مانگاو مەڕیشمان لەسەر حەرام کردن. سوودی ئەڵێت: ﴿شُحُومَهُمَآ﴾ واتە: چەوری ورگو چەوری هەردوو گورچیلە. جوولەکەکان دەیانووت: ئەوانە یەعقوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) حەرامی کرد، ئێمەش حەرامی دەکەین. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ﴾ مەگەر ئەوەی کە بەسەر پشتیانەوە بێت. واتە: ئەو چەوریەی کە بە دەوری پشتیانەوەیە[1] ﴿أَوِ ٱلْحَوَايَآ﴾ یان ئەو چەوریەی لەگەڵ ڕیخۆڵەکانیانە. ئیمام ئەبوجەعفەری کوڕی جەریرئەڵێت: ﴿ٱلْحَوَايَآ﴾ ئەوەی بە دەوری سکا (ورگا) کۆ دەبێتەوە کە بریتیە لە (مباعر)و (مرابض)یشی پێ دەڵێن، ڕیخۆڵەشی تێدایە. وتی: مانای قسەکە ئەوەیە لە مانگاو مەڕدا پیوو چەوریەکەیمان حەرام کرد جگە لەوەی بەسەر پشتیانەوە بێ. یان ئەو چەوریەی کە بە ڕیخۆڵەکانیانەوەیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿أَوِ ٱلْحَوَايَآ﴾ ئەوەی بە ڕیخۆڵەکانیانەوەیە، واتە (المبعر)[2] موجاهیدئەڵێت: ﴿ٱلْحَوَايَآ﴾ واتە: (المبعر و المربض) هەردوو وشەکە یەك مانایان هەیە،یانی: ئەوەی بە ڕیخۆڵەکانیانەوەیە[3]. سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکیش هەر وایان گوتوە.[4] ﴿أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ﴾ یان ئەو پوەی تێکەڵاوی ئێسقان بوە حەڵاڵمان کرد بۆان. ئیبنوجورەیج ئەڵێت: چەوری دوگ کە تێکەڵی کلێنچکی مەڕ بووە ئەوەیش حەڵاڵە وە هەموو شتێ لە چواریەك و لاتەنیشت و سەرو چاوو ئەوەی تێکەڵاوی پێستە بووە دیسان حەڵاڵە بۆیان[5] سوودیش هەر وای وتوە[6]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ﴾ بەهۆی یاخی بونیانەوە ئەو سزایەمان دان. واتە: ئەو تەنگیەمان بەسەردا هێناو بەو شێوەیە پابەندمان کردن لەبەر سەرپێچی و لە ڕێ لادانیان لە فەرمانەکانمان. وەك خودای گەورەلە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ

---

[1] الطبري (١٢/٢٠٢).
[2] الطبري (١٢/٢٠٣).
[3] الطبري (١٢/٢٠٤).
[4] الطبري (١٢/٢٠٤).
[5] الطبري (١٢/٢٠٥).
[6] الطبري (١٢/٢٠٥).

هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴾[1] بەهۆی ستەم کردنەوە لەلایەن جوولەکەکانەوە حەراممان کرد لێیان چەند خۆراکێکی پاكو خاوێن کە حەڵاڵ کرا بوو بۆیان وە بەهۆی زۆر بەرهەڵستی کردنیان لە ڕێگەی خودا. لە کۆتایی ئایەتەکەدا خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ دیاریشە ئێمە ڕاست دەڵێین. بێگومان ئێمە دادگەر بووین لەو سزایەماندا بۆیان بەو شێوەیە. ئیبنوجەریرئەڵێت: بێگومان: ئەی موحەممەد(ﷺ) ڕاستمان وت لەو هەواڵەی کە پێمان ڕاگەیاندی کە ئەوەمان لێ قەدەغە کردن، نەك وەك ئەوە کە ئەوان دەڵێن یعقوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) لە خۆی حەرام کردوە، (بۆیە ئەمانیش لە خۆیان حەرام کردوە)[2].

## فرۆفێڵی جوولەکەو لەعنەت کردنی خودا لێیان

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گوتی: هەواڵ درا بە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) کە سەمورە ئارەقی فرۆشتوە، عومەر وتی: خوا سەمورە بکوژێت! ئەی نازانێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەعنەتی خوا لە جوولەکە، بەزو پیویان لێ حەرام کرا، هەڵیان ئەکزاندو ئەیان پاڵاوتو دەیانفرۆشت) بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە[3] لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە گوتی: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست لە ساڵی فەتحدا فەرمووی: (خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فرۆشتنی مەیو مردارەوەبووو بەرازو بتی حەرام کردوە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆنە بە لاتەوە، بەزو پیوی مردارەوە بوو کەشتیو پێستی پێ ئەهەنوونو دەیکەن بە چرا؟ فەرمووی: (نەخێر ئەوە حەرامە) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەعنەت لە جوولەکە، کە خودا بەزو پیوی مردارەوەبوی لێ حەرام کردن، هەڵیان دەکرازاندو ئەیانپاڵاوتو ئەیانفرۆشتو پارەکەیان ئەخوارد)[4]. هەر شەش زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردوە[5].

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾﴾

---

[1] النساء (١٦٠).

[2] الطبري (٢٠٦/١٢).

[3] فتح الباري (٤٨٣/٤)، مسلم (٤٩٥/٣).

[4] فتح الباري (٤٩٥/٤).

[5] فتح الباري (٤٩٥/٤)، مسلم (١٢٠٧/٣)، أبوداود (٣٥٦/٣)، تحفة الاحوذي (٥٢١/٤)، النسائي (٣٠٩/٧)، إبن ماجة (٧٣٢/٢).

**خودا خاوەنی بەزەییە و تاوانبارانیش لە سزای دەرباز نابن**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ﴾ ئـەی موحەممـەد ئەگەر باوەڕیان پـێ نـەکردی، بلـێ: پەروەرنـدەی ئێـوە خـاوەنی دلۆڤانیـەکی بـەربلاوە. واتـە: ئەگـەر ئەوانەی دژایەتیت دەکەن لە جوولەکەو بت پەرستانو هاوشێوەیان. بلـێ: پـەروەردگارتان خـاوەنی بەزەییەکی ئێجگار فراوانە. ئەمە هاندانێکە بۆ وەدەس هێنانی سۆزو بەزەیی فراوانـی خـودای گـەورەو شوێن کەوتنی پێغەمبەرەکەی(ﷺ). ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ کرۆی تاوانبـارانیش لـە سزای لانادرێن. ئەمەیش هەڕەشەیە لەوانەی کە دژایەتی پێغەمبەر دەکەن کە دواین پێغەمبـەرە(ﷺ). زۆر جار خودای گەورە لـە قورئانـدا هانـدانو هەڕەشـەی بـە یەکـەوە هێنـاوە. وەك خـودای گـەورە لـە کۆتایی ئەم سورەتەدا ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] پەروەرنـدەت بـە پەلـە تۆڵە دەسێنێو هەر ئەویشە کە لە گوناهان دەبورێو دلۆڤانە. وە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾[2] گەرچـی مـەردم سـتەمکار بـن پـەروەردگارت بەخشندەیەو لە تۆڵەشدا تونـدو تیژە. وە ئەفـەرموێت: ﴿نَبِّئْ عِبَادِىٓ أَنِّىٓ أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِى هُوَ الْعَذَابُ الْأَلِيمُ﴾[3] هەواڵ بدە بە عەبـدەکانم، کـە هـەر خـۆم لـە گونـاه دەبـورمو دلۆڤـانم، سزاشم زۆر بەژانـە. وە ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾[4] بێگومان هەڵمەت بردنی پەروەردگارت زۆر توندو تیژە. ئـەو هـەر خـۆی دروسـتی دەکـاتو دوبارەشـی دەکاتەوە. هەر ئەویشە لێبوردەو میهرەبانە. ئایەت لە بارەیەوە زۆرە.

﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَآءَ اللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ
مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا
تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَٰلِغَةُ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ

[1] الانعام (١٦٥).
[2] الرعد (٦).
[3] الحجر (٤٩–٥٠).
[4] البروج (١٢–١٤).

ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ﴾

**باسی هەڵەی بتپەرستان و وەڵام دانەوەی هەڵەکانیان**

ئەمە وتوێژێکە خودای گەورە باسی کردوە، وە گومانێکە بتپەرستان دەیانەوێ بیکەنە هۆکاریێ بۆ ئەو بتپەرستیەی کە دەیانکردو ئەو شتانەی لە خۆیان حەرام دەکرد، دەیانگوت خوا خۆی ئاگای لێ بووە لەو بت پەرستیەی کە پێی هەڵساون و ئەو شتانەی کە لە خۆیان حەرام کردوە، خودا دەیتوانی بیگۆڕێ و باوەڕ بخاتە دڵمانەوە و لە خوانەناسی لامان بدات، کە نەیگۆڕیوە مانای وایە کە بە ئارەزو مەیلی ئەوە و لەو کارەمان ڕازی بووە کە کردومانە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ﴾ ئەو کەسانەی کە شەریك بۆ خوا دادەنێن، دەڵێن: خوا مەیلی لێ بوایە ئێمە و باب و باپیرانمان بتپەرستیمان نەدەکرد، هیچ شتیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد. وەك لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم﴾[1] دەڵێن: ئەگەر خوا مەیلی لێ بوایە ئێمە نەماندەپەرستن. ئایەتی (٣٥)ی سورەتی نەحل هەر وەك ئەم ئایەتە وایە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا﴾ ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر بڕوایان نەهێنا، هەتا ئەو کاتەی کە سزای ئێمەیان چەشت. واتە: هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش لەمانەش تووشی ئەو گومانە هاتن و سەریان لێ تێکچوو. چونکە بەڵگەکانیان زۆر پڕوپوچ و بێ بنەما بوو. ئەگەر وا بوایە خودا تووشی ئەو سزای نەدەکردن و قڕی نەدەخستە ناویان و پێغەمبەرانی بەڕێزی خۆی لە شوێنیان جێگیر نەدەکردو بتپەرستانی تووشی سزاو تۆڵە نەدەکرد بە دەستیانەوە، پاشان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ﴾ بڵێ: ئەگەر لە زانین شتێك شك دەبەن، بۆمان دەرخەن. واتە: ئەگەر وا دەزانن خوا لێیان ڕازیە لەسەر ئەو کارەی دەیکەن بۆمان ڕوون بکەنەوە و ئاگادارمان بکەن لێی ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ بەڵام ئێوە هەر شوێنی گومان دەکەون و هەر لەخۆوە قسە دەکەن. واتە: شوێن گومان و بیرو باوەڕی خراپ کەوتوون و بوختان بۆ خودا هەڵدەبەستن بۆ پاساوی ئەو کارە خراپەتان. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بڵێ: بەڵگەی بەهێز هەر

[1] الزخرف (٢٠).

ھی خودایە، ئەگەر مەیلی لێ بوایە ھەمووتانی دەخستە سەر ڕاستە ڕێ. واتە: لە کارزانی تەواو بەڵگەی بەقەوەت ھی خودایە لە شارەزا کردنی ھەرکەسێ و گومڕا کردنی ھەر کەسێ. ھەموو شتێ بە مەیلی خودا خۆیەتی، لەگەڵ ئەوەیشدا لە موسوڵمان ڕازیەو خوانەناسی خۆش ناوێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾[1] ئەگەر خوا خۆی مەیلی لێ بوایە ھەمووتانی شارەزای ڕاستەڕێ دەکرد. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[2] پەروەردگارت ئەگەر مەیلی لێ بوایە، خەڵکی دنیای گشتی دەکردە یەك ئاین، بەڵام بە ناتەبایی ھەر دەمێنێتەوە، مەگەر پەروەردگاری تۆ بەزەیی پێیاندا بێتەوە، کە ھەر بۆ ئەوەی دروست کردوون. بڕیاری پەروەردگارت ھەر دێتە جێ. کە جەھەنم لە جنۆکەو بنیادەم پڕ دەکەم. زەحجاك ئەڵێت: ھیچ بەڵگەیە نیە بۆ کەس کە سەرپێچی فەرمانی خودای کردبێ، بەڵام خودای گەورە بەڵگەی زۆر بەھێزی ھەیە لەسەر عەبدەکانی. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا﴾ بڵێ ئەو شایەتانەتان بێنن وا شایەتی ئەدەن: کە خودا ئەمەی حەرام کردوە. واتە: شایەتەکانتان بێنن کە ئەوەی لە خۆتان حەرام کردوە ڕاستە، بەڵام خۆ دیارە ئێوە درۆو بوختانتان بە دەمی خواوە ھەڵبەستوە لەوەدا ﴿فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ﴾ ئەگەر ئەو شایەتیەشیان دان، تۆ لەگەڵیاندا شایەتی مەدە. چونکە بێگومان کە ئەو شایەتیەی کە ئەیدەن درۆو بوختان نەبێ ھیچی تر نیە. ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ مەچۆرە سەر ئارەزوی ئەو کەسانەی کە نیشانەکانی ئێمەیان لا درۆیەو بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیەو ھاوتا بۆ پەروەردگاریان دادەنێن.

﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾﴾

---

[1] الانعام (٣٥).

[2] هود (١١٨-١١٩).

**دە ڕاسپاردەکە**

ئەبوداودی ئەودی ئەڵێت: لە شەعبیەوە لە عەلقەمەوە لە ئیبنومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێت: هەر کەسێ حەز دەکات سەیری ڕاسپاردەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکات کە مۆری خۆی لەسەرە، با ئەم ئایەتانە بخوێنێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: وەرن ئەو شتانەی پەروەرندەتان لێی حەرام کردوون من بۆتانی بخوێنمەوە. کە هیچ شتێك بە شەریکی خودا مەزانن (هەتا دەگاتە) ئەو شوێنەی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾[1] حاکم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا لە ئیبنوعەبباسەوە لە سورەتی ئەنعامدا ئایەتانێکی تۆکمە هەن (المحكمات) کە ماکن بۆ ئەم قورئانە، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێند: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ پاشان حاکم گوتی: ئەم فەرموودە سەنەدەکانی ڕاستن[2] دیسان حاکم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کێ لە ئێوە پەیمان دەداتێ لەسەر سێ شت)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی کرد بە خوێندنی ئەم ئایەتانە: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ تا تەواوی کردن‌و (فەرمووی) (هەرکەسێ ئەو پەیمانەی پاراست، ئەوە پاداشتی لەلای خودایە، هەرکەسێ کەم‌و کوڕی تیا کردن‌و خودا لە دنیا هەقی لێ سەند ئەوە تۆڵەکەیەتی وە هەرکەس خودا دوای خست بۆ ڕۆژی قیامەت، ئەوە فەرمانەکەی دەچێتە لای خودا، ئەگەر مەیلی لێبێ سزای ئەدات‌و مەیلیشی لێبێ عەفوی دەکات). پاشان وتی: سەنەدەکانی ڕاستن[3] لەبارەی تەفسیری ئایەتەکانشەوە خودای مەزن ئەفەرموێت بە پێغەمبەرو ڕاسپاردەی خۆی موحەممەد(ﷺ) ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بەو بت پەرستانەی کە غەیری خودایان پەرستوەو ئەو ڕۆزیەی کە خودا پێی دان لە خۆیان حەرام کردو منداڵەکانی خۆیان کوشت، هەموو ئەو شتانەی کە کردیان بە ئارەزوی خۆیان کردویانەو شەیتان لەلای شیرین کردن، ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ بڵێ: وەرن ئەو شتانەی پەروەرندەتان لێی حەرام کردون من بۆتانی بخوێنمەوەو ئەو شتانەتان بۆ باس کەم کە بەڕاستی خودا حەرامی کردوە، بە گۆترە نیە، بەڵکو خودا خۆی بڕیاری داوەو فەرمانی خۆیەتی‌و فەرموویەتی.

---

[1] تحفة الاحوذي (١/٤٤٦).

[2] الحاكم (٢/٣١٧).

[3] الحاكم (٢/٣١٨)، سەنەدەکەی لاوازە.

١- قەدەغەکردنی بتپەرستی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾ کە هیچ شتێك بە شەریکی خوا مەزانن. وەك ئەوەی لەم ڕستەدا شتێك حەزف کرابێ شێوازی دەقەکە بیگەیەنێ واتە: ئامۆژگاری کردوون ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾ بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ خودا ئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردوە، بەڵکو ئێوە تێبگەن. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جوبرەئیل هاتە لام، مژدەی پێدام کە هەرکەسێ مرد لە هیچ شتێکدا شەریکی بۆ خوا دانەنا لە ئوممەتەی تۆ دەچێتە بەهەشت. گوتم: ئەگەر داوێن پیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ؟ فەرمووی: ئەگەر داوێنپیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ. گوتم: ئەگەر داوێنپیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ؟ فەرمووی: ئەگەر داوێنپیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ. گوتم: ئەگەر داوێنپیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ؟ فەرمووی: ئەگەر داوێنپیسی‌و دزی‌و ئارەقیشی خواردبێ)[1]، وە لە هەندێ موسنەدو کتێبی فەرموودەدا لە ئەبوزەڕەوە هاتوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم هەرکاتێ تۆ داوام لێ بکەی‌و لێم بپاڕێیتەوە، بێگومان من لەوەی کە کردوتە خۆش دەبم، بەلامەوە گرنگ نیە ئەگەر بە ئەندازەی زەمین تاوانەوە بێیتە لام، بە ئەندازەی ئەوە بە لێبوردن دێمە لات. بەو مەرجەی لە هیچ شتێکدا شەریکم بۆ دانەنێیت. وە ئەگەر تاوان بکەی، تا تاوانەکانت دەگاتە هەور پاشان داوای لێبوردنت لێ کردم لێت بوراوم)[2]. لەم بارەیەوە بەڵگە هەیە لە قورئاندا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[3] خودا لەوانە خۆش نابێ کە هاوەڵی بۆ دادەنێن، جگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر خۆش دەبێ بۆ هەر کەسێ خۆی بیەوێت (وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئیبنومەسعودەوە: (هەرکەسێ مردبێ لە هیچ شتێکدا شەریکی بۆ خوا دانەنابێ چووەتە بەهەشت)[4]، ئایەت‌و فەرموودە لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

٢-فەرماندان بە چاکە کردن لەگەڵ دایك‌و باب

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ وە لەگەڵ دایك‌و بابی خۆتان چاکە بکەن. واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم‌و فەرمانتان پێدەدەم کە بە چاکی هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ باب‌و دایکتان. وەك

---

[1] البخاري (١٢٣٧)، مسلم (٩٤).

[2] أحمد (١٧٢/٥)، تحفة الاحوذي (٥٢٤/٩)، عن أنس، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] النساء (٤٨).

[4] مسلم (٩٤/١).

خوادی گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾[1] پەروەردگارت فەرمانی دا کە غەیرەز ئەو مەپەرستن، سەبارەت بە دایکو بابیش چاکە بکەن. هەندێ ئەم ئایەتەیان خوێندوەتەوە: (وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ) واتە: بە چاکی لەگەڵیان بجوڵێنەوە. خوادی گەورە زۆر جار کە باسی گوێڕایەڵی خۆی دەکات بە دوایدا باسی چاکەکردنیش لەگەڵ بابو دایکیش دەکات. وەك ئەفەرموێت: ﴿ءَامَنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ ۝١٤ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[2] ئەگەر هانی تۆیان دا، شتێ بکەی بە شەریکم، (کە خۆت هیچی لێ نازانی) فەرمانیان بەجێ مەهێنە لە دنیادا بە خۆشی لەگەڵیان بژیو هەر لە شوێن ئەوانە بڕۆ کە بەرەو من گەڕاونەتەوە، خوادی گەورە لێرەدا فەرمانی داوە بە چاکە کردن لەگەڵیاندا با بت پەرستیش بن. وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾[3] ئەو کاتەش پەیمانمان لە بەرەی ئیسرائیل وەرگرت: غەیرەز خودا نەپەرستنو چاکە لەگەڵ دایکو باب بکەن. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرن. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ کارێ چاکترە؟ فەرمووی: (نوێژ کردن لەکاتی خۆیدا) گوتم: دوای ئەوە چی تر؟ فەرمووی: (چاکە لەگەڵ دایكو باب) گوتم: دوای ئەوە چی تر؟ فەرمووی: (جیهاد کردن لە ڕێی خوادا) ئیبنومەسعود گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمانەی بۆ باس کردم. ئەگەر داوای زیاتریشم لێ بکردایە هەر بۆی باس دەکردم[4].

## ٣–قەدەغە کردنی کوشتنی منداڵ

خوادی گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾ لە ترسی لە برسا مردن فەرزەندی خۆتان مەکوژن. ئێمە بژێوی بە ئێوەو ئەوانیش ئەدەین. پاش ئەوەی خوادی گەورە ئامۆژگاری دا لەبارەی دایكو بابو باپیرانەوە دێتە سەر باسی چاکە کردن لەگەڵ کوڕو

---

[1] الاسراء (٢٣).

[2] لقمان (١٤ـ١٥).

[3] البقرة (٨٣).

[4] فتح الباري (١٢/٢)، مسلم (٩١/١).

کوڕەزاو کچەزا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ﴾ واتە: لە ترسی لە برسا مردن فەرزەندەکانتان مەکوژن. چونکە ئەوان شەیتا کوشتنی منداڵەکانی لەلا جوان کردبوون‌و بە دەستی خۆیان دەیانکوشتن، کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکردو لە ترسی شورەیی‌و نەنگی‌و هەندێ جاریش کوڕەکانیان دەکوشت لە ترسی هەژاری‌و لە برسا مردن، هەر بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) (وتی) کام گوناه زۆر گەورەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هاوبەش بۆ خودا دابنێی کە ئەو دروستی کردوی) وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی کە لەگەڵتدا بخوات) وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (داوێنپیسی بکەی لەگەڵ خێزانی دراوسێکەت) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ﴾[1]، ئەوانەشی جگە لە خودا هیچ شتێ تر ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کە خوا ڕژتنی خوێنی بە حەرام داناوە، مەگین بە هەق، تووشی داوێن پیسیش نابن. ﴿مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ﴾ لە ترسی لە برسا مردن. ئیبنوعەبباس‌و قەتادەو سوودی‌و کەسانی تریش وتیان: لەبەر هەژاری.[2] واتە: لەبەر ئەوەی تووشی هەژاری هاتوون منداڵەکانتان مەکوژن. وە لە سورەتی ئیسرادا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖ ﴾[3] منداڵی خۆتان لە ترسی لە برسا مردن لەناو مەبەن واتە: لەبەر ئەوەی نەکات لە دوایدا تووشی هەژاری بێن. پاشان هەر لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡ﴾ ئێمەین ڕۆزی ئەوان‌و ئێوەیش ئەدەین. لە پێشدا بە ڕۆزی منداڵەکانی دەستی پێکردوە لەبەر گرنگی دان پێیان، واتە: بەهۆی ئەوانەوە لە هەژاری خۆتان مەترسن، ئەوە لەسەر خودایە. بەلام لەم ئایەتەدا: ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡ﴾ ئێمە ڕۆزی ئێوەو ئەوانیش ئەدەین لەبەر ئەوەی هەژاریەکە لێرەدا یەخەی گرتوون، خودا دڵنیایان دەکات کە ڕۆزیان ئەدات. والله أعلم.

## ٤-بە ئاشکراو بە نهێنی خۆتان تووشی خراپە مەکەن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ﴾ بە ئاشکراو بە نهێنی خۆتان تووشی خراپە مەکەن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت:

---

[1] الفرقان (٦٨). فتح الباري (٨/٣٥٠)، مسلم (١/٩١).

[2] الطبري (١٢/٢١٧).

[3] الاسراء (٣١).

﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[1] بلێ: پەروەرندەم ئەمانەی حەرام کردوە: کاری خراپ بە ئاشکراو بە نهێنی، گوناه، بە ناهەق لە رێگە لادان، بێ هیچ بەڵگەیەك شەریك بۆ خوا دانان و قسەکردن دەربارەی خودا بەبێ زانین. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێ لە خودا بە غیرەتتر نیە، هەر لەبەر ئەوەیە کە بەدڕەفتاری حەرام کردوە چ بە ئاشکرا یان بە نهێنی بێ).[2] عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر وتی: لە وەڕڕادەوە (وَرّاد) لە خاوەنەکەیەوە (مولاء) کە موغەیرە بوو گوتی: (سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەگەر پیاوێکم لەگەڵ ژنەکەمدا بینی بە شمشێرێکی تیژ لێی ئەدەم. ئەو قسەیە گەیشت بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئایا لە غیرەتی سەعد سەرتان سوڕ دەمێنێ؟ من لە سەعد بە غیرەتترم، خودا لە من بە غیرەتترە. هەر لەبەر ئەوەیە بەدڕەفتاری حەرام کردوە ئەوانەی ئاشکران و ئەوانەیش کە نهێنین) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[3].

**٥-قەدەغە کردنی کوشتنی کەسێ کە خوا کوشتنی حەرامی کردوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ کەسیش مەکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردوە، مەگین لە ڕووی هەقەوە. ئەمە یەکێکە لەو دەقانەی کە خودای گەورە جەختی لەسەر کردوەتەوە، ئەگەر وا نەبوایە دەچوە ڕیزی خراپە و بەدڕەفتاریەوە بە ئاشکرا یان بە نهێنی. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: لە ئیبنومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوا نیە خوێنی هیچ موسوڵمانێ (بڕێژرێ) شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوداو شایەتیش بدات کە من پێغەمبەری خودام (ﷺ) مەگین بە یەکێ لەمانە: پیاوێ ژنی هێنابێ و ژنێ سووی کردبێ و داوێن پیسیان کردبێ وە کەسێ لە باتی کەسێ کە بە ناهەق کوشتبێتی وە کەسێ واز لە ئاینەکەی بێنێ و لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا بێتەوە).[4] قەدەغە و سەرزەنشت و هەڕەشە هاتوە لە بارەی کوشتنی ئەو کەسانەی کە پەیمانیان لەگەڵدا بەستراوە و دڵنیا کراونەتەوە لەو خەڵکانەی شەڕیان کردوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بە مەرفوعی: (هەرکەسێ کەسێ بکوژێ کە پەیمانی لەگەڵدا

---

[1] الاعراف (٣٣).

[2] فتح الباري (١٤٦/٨)، مسلم (٢١١٤/٤).

[3] فتح الباري (٤١١/١٣)، مسلم (١١٣٦/٣).

[4] فتح الباري (٢٠٩/١٢)، مسلم (١٣٠٢/٣).

بەستراوە (المعاهد) بۆنی بەهەشت ناچێ بەسەریدا بێگومان بۆنی بەهەشت بۆ ماوەی چل ساڵ ڕێگە ڕۆشتن بۆنی دەڕوات).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ پەیمان لێ وەرگیراوێ (المعاهد) بکوژێ لە ژێر سایەی خوداو سایەی پێغەمبەرەکەیدا بوبێ، ئەوە ئەو کەسە غەدری لە سایەی (پەیمانی) خودا کردوە، بۆنی بەهەشت ناکات، بێگومان بۆنەکەی ماوەی حەفتا پایز ڕێگە ڕۆشتن دەڕوات). ئیبنوماجەو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە. تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە.[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ خودا ئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردوە بەڵکو ئێوە تێبگەن، لە فەرمانو قەدەغەکراوەکانی.

﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾﴾

### ٦-قەدەغەکردنی خواردنی ماڵی هەتیو

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ نزیکی ماڵو دارایی هەتیوان مەکەونەوە بە شێوەیەکی جوانو چاك نەبێ تا کاتێ کە خۆی پێدەگات. عەتای کوڕی سائب وتی: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنوعەبباسەوە: خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوار: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾و ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ﴾[3] واتە: ئەو کەسانەی بە ناڕەوا ماڵی هەتیوان دەخۆن. ئەوانە هەتیویان لەلا بوو، هەڵسانو خواردنیان لە خواردنیانو خواردنەوەیان لە خواردنەوەیان جیا کردەوە وای لێ هات هەر شتێ کە بە چاکیان بزانیایە هەڵیان دەگرت بۆی تا دەیخوارد یان خراپ دەبوو، ئەو کارە زۆر ناڕەحەتی کردن، بۆیە ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کردن، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾[4] لێت دەپرسن: دەربارەی هەتیوان چۆن بین؟ بڵێ: ئەگەر بە دڵسۆزی ئاگاتان لێیان بێ کارێکی چاکە. ئەگەر لەگەڵ ئێوە دەژین، وەك براو خوشکی خۆتان بن. وتی: خواردنیان لەگەڵ خواردنو خواردنەوەیان لەگەڵ خواردنەوە یان تێکەڵاو کردن.

---

[1] فتح الباري (١٢/٢٧٠).

[2] تحفة الاحوذي (٤/٦٥٨)، إبن ماجة (٢/٨٩٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] النساء (١٠).

[4] البقرة (٢٢٠).

ئـەبوداوود ڕیوایـەتی کـردوە[1] پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ تـا کـاتیٚ خـۆی پێدەگات. مالیكو شەعبیو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینەئەڵێن: واتە: تا باڵغ دەبیٚ[2].

**٧-فەرماندان بە کێشانەو پێوانە بیٚ کەمو کوڕی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ﴾ با پێوانـەو کێشانەتان بەرانبـەر بیٚو کەمو کوڕی تێدا نەبیٚ. خودای گەورە فەرمان دەکات بە دادگەری لە کـڕینو فرۆشـتنو وەرگـرتنو دانەوەدا. وەك چۆن هەڕەشەی کردوە لە پـشت گـویٚ خـستنی دادگـەری لـەو بارەیـەوەو ئەفـەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝٣ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ۝٤ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[3] هاوار لە کەم فرۆشان، ئەو کەسانەی کە پێوانە (بۆ خۆیان) دەکەن لەسەر ماڵی مەردم بە تەواوی وەری دەگرن، بەڵام کاتیٚ کە بۆیان پێوانە یان کێشانە بکەن لێی کەم دەکەن، ئایا ئەوانە نازانن کە هەر زیندوو دەکرێنـەوە، بـۆ ڕۆژێکـە گـەورەو گران؟ ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی لەبەر بارەگای پەروەردەگـاری هـەموو دنیـا ڕادەوەسـتن. ئـەوە بـوو خودای گەورە هەندیٚ لە گەلەکانی لەناو برد بەهۆی لە کێشانەو پێوانـەدا دادگـەر نـەبوون، بـۆ خۆیـان چاکیان دەپێواو بـۆ خـەڵکی بـە کـەمو کـوڕی دەیـان پێـوا. پاشـان ئەفـەرموێت: ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ ئێمە لە توانا بەدەر هیچ ئەرکیٚ ناخەینە سەر کەس. واتە: هەرکەس هەوڵی دا بەپێی توانای خۆی بۆ بەجێهێنانی هەقو وەرگرتنی ئەگەر تووشی هەڵەیش هات دوای ئەو هەوڵو کۆششە کە ئەیدا هیچ تاوانێکی نیە.

**٨-فەرماندان بە شایەتی دانی ڕێكو پێك**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ﴾ کاتیٚ بۆ شـایەتی دان یـان بـۆ ناوبژی قسەتان کرد عەدالەتتان لەبەر چاو بیٚ، با دژی خزمی نزیکی خۆشتان بیٚ. ئەم ئایەتە وەك ئـەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ﴾[4] ئەی کۆمـەڵی خاوەنباوەڕان، بە ڕێكو پێکی هەڵسن بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی خودا، بەڕاسـتی شـایەتی بـدەن. وە

[1] أبوداود (٣/٢٩١).

[2] الطبري (١٢/٢٢٣).

[3] المطففين (١-٦).

[4] المائدة (٨).

له سورەتی نیسائدا ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾[1] ئەی گەلی خاوەنباوەڕان بە یەکسانیو بێ جیاوازی (بە دەم کاری خەڵکەوە بچن)و بۆ خودایش شایەتی بدەن. هەرچەندە شایەتی دانتان بە زیانی خۆتانو دایکو باوکتانو خزمانیشتان بێ. خودای گەورە فەرمان دەکات بە دادگەری لە کردارو گفتاردا لەگەڵ نزیکو دورداو داوا دەکات لە هەموو کەسێ کە لە گشت کاتو لە گشت شوێنێکدا هەر دادگەر بن.

### ٩-فەرماندان بە بەجێهێنانی فەرمانی خودا بە تەواوی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟﴾ پەیمانی خودا بە تەواوی بەجێ بێنن. ئیبنوجەریرئەڵێت: واتە: بەو ڕاسپاردەی کە خودا ئامۆژگاری کردون هەڵسنو جێبەجێی بکەن، بەجێهێنانیشی ئەوەیە کە گوێڕایەڵی بن لەوەی کە فەرمانتان پێدەکاتو لێتان قەدەغە دەکاتو کار بە کتێبەکەی(قورئان) سونەتی پێغەمبەرەکەی بکەن (ﷺ). ئا ئەوە بەجێهێنانی پەیمانی خودایە بە تەواوی ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ خودا ئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردوە، بەڵکو هەر لەبیرتان بێ. ئامۆژگاری لێ وەرگرنو واز بێنن لەو شتانەی لە پێش ئەمەدا دەتانکرد[2].

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾

### ١٠-فەرماندان بە گرتنە بەری ڕێی ڕاستو ڕێگری لە شوێنکەوتنی ڕێگاکانی تر

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ﴾ ئەمەیە ڕێگەی ڕاستی من، ئێوە هەر بەو ڕێگەدا بڕۆنو مەچنە سەر ڕێگای تر. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ مەچنە سەر ڕێگاکانی تر، نەکا لە ڕێگای ئەو دوورتان بخەنەوە. لەم ئایەتەدا: ﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾[3] بەردەوام بن لەسەر ئەم ئاینەو ناکۆك مەبن تێیدا. وە لە شێوەی ئەم ئایەتانەدا گوتی: خودا فەرمانی داوە بە خاوەن باوەڕان کە لەناو کۆمەڵی موسوڵماناندا بنو دوورکەونەوە لە دوبەرەکیو ناکۆکی، ئاگاداریشی

---

[1] النساء (١٣٥).

[2] الطبري (١٢/٢٢٥).

[3] الشورى (١٣).

کردوون کە گەلە پێشوەکان بەهۆی دوبەرەکیو ناکۆکیان لەبارەی ئاینی خوداوە لەناو چوون[1] موجاهیدو کەسانی تریش هەر وایان وتوە[2]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێڵێکی ڕاستی کێشا پاشان فەرمووی: (ئەمە ڕێگەی ڕاستی خودایە) پاشان چەند هێڵێکی بە لای ڕاستو بە لای چەپدا کێشاو فەرمووی: (هیچ ڕێگایە لەم ڕێگایانە نیە مەگین شەیتانێ بەسەریەوەیە خەڵکی بۆ بانگ دەکات)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾[3] حاکمیش ڕیوایەتی کردوەئەڵێت: سەنەدەکانی ڕاستن.[4] ئیمامی ئەحمەدو عەبدی کوڕی حومەید ڕیوایەتیان کردوە، بەڵام وتەکە، وتەی ئیمامی ئەحمەدە لە جابیرەوە ئەڵێت: لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوین، هێڵێکی ئاوای لەبەردەمی خۆیدا کێشاو فەرمووی: (ئەمە ڕێگەی خودایە) دوو هێڵی لەلای ڕاستیەوەو دوو هێڵیشی لەلای چەپیەوە کێشاو فەرمووی: (ئەمەیش ڕێگەی شەیتانە) پاشان دەستی لەسەر هێڵی ناوەڕاست داناو ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾[5] ئیمامی ئەحمەدو ئیبنوماجەو بەزار لە کتێبی فەرموودەکانیاندا هێناویانە[6] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە کە پیاوێ وتی: بە ئیبنومەسعود: ڕێگەی ڕاست کامەیە؟ وتی: موحەممەد(ﷺ) کە بەجێی هێشتین لەم سەریەوە بۆ لاکەی تری لە بەهەشتدایە، لای ڕاستیەوە ئەسپێکی تیژڕەو لای چەپیەوە ئەسپێکی تیژڕەو هەیە، لەوێدا چەند پیاوێ هەرکەسێ بەلایاندا چوو بانگی دەکەن، هەر کەسێ لەو ئەسپانەی وەرگرت دەیبات بۆ ناو ئاگر. وە هەر کەسێ سەر ئەم ڕێگەی گرت دەیبات بۆ بەهەشت. پاشان ئیبنومەسعود ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾[7] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (خودا نمونەی ڕێگەی ڕاست دێنێتەوە هەردوو لای ئەو ڕێگە دوو دیواری هەیە کە چەند دەرگای تێدایە، بەسەر دەرگاکانەوە

---

[1] الطبري (٢٢٩/١٢).

[2] الطبري (٢٢٩/١٢/١٣).

[3] أحمد (٤٦٥/١)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[4] الحاكم (٣١٨/٢)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[5] أحمد (٣٩٧/٣)، عبدُ أبن حُميد (٣٤٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[6] إبن ماجة (١١)، حەسەنە.

[7] الطبري (٢٣٠/١٢).

پەردەی ناسك هەیە، وە لەسەر دەرگای ڕێگاکە بانگخوازێ بانگ دەکات ئەی خەڵکینە وەرن بچنە ناو ڕێگەی ڕاست پەرتو بڵاو مەبن. بانگخوازێ تر لەسەری ئەو ڕێگە بانگ دەکات، ئەگەر کەسێ بیەوێ یەکێ لەو دەرگانە بکاتەوە، دەڵێ: هاوار لە تۆ نەیکەیتەوە، ئەگەر کردتەوە لێی دەرناچی. ڕێگاکە ئیسلامە دوو دیوارەکەشی سنوورەکانی خودایە، دەرگا کراوەکانیش قەدەغەکانی خودایە، ئەم بانگخوازە لەسەری ڕێگەکەیە کتێبی خودایە، ئەو بانگخوازەش کە لە سەرەوەی ئەو ڕێگەیە، ئامۆژگاری کەرێکی خودایە لەناو دڵی هەموو موسوڵمانێکدا)[1] تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە[2]، تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو غەریبە. لە کۆتایی ئایەتەکەدە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ئێوە هەر بەو ڕێگا بچنو مەچنە سەر ڕێگاکانی تر، نەوا لە ڕێگای ئەو دورتان بخەنەوە، خوا ئەوانەی بە ئێوە ڕاسپاردوە بەڵکو خۆتان بپارێزن بۆیە خودا ڕێگەکەی کردوە بە یەك ڕێگە، چونکە هەق یەکە، وە هەر بۆیەش ڕێگاکانی تری کۆ کردوەتەوە لەبەر پەرتو بڵاویو فرە ڕێچکەییان. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[3] خودا دۆستی کۆمەڵی خاوەنباوەڕانە و لەناو تاریکستانەوە دەیانبات بەرەو ڕووناکی، دۆستی خودانەناسانیش هەر تاغوتە، لە ڕووناکی دەریان دێنن، بەرەو ڕووی تاریکستانیان بەڕێ دەکەن، هاوەڵی ئاگرنو هەر تێیدا دەمێننەوە.

﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِي أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾﴾

### ستایش کردنی تەوراتو قورئان

کە خودای گەورە باسی قورئانی کردو فەرمووی: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴾ بە دوایدا دێتە سەر ستایشی تەوراتو ئەو پێغەمبەری کە پێیدا ڕەوانە کراوەو ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ کتێبیشمان دا بە مووسا. زۆر جار کە خودای مەزن باسی قورئان دەکات باسی تەوراتیشی

---

[1] أحمد (١٨٣/٤)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[2] تحفة الاحوذي (١٥٢/٨)، النسائي في الكبرى (٣٦١/٦)، باشە (جيد).

[3] البقرة (٢٥٧).

لەگەڵدا دێنێ وەك ئەم ئایەتە كە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةٗۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٞ مُّصَدِّقٞ لِّسَانًا عَرَبِيّٗا ﴾[1] لە پێش ئەمیش كتێبی مووسا پێشەواو بەزەیی بوو، ئەم قورئانە ئەوەیی بە ڕاست زانیوەو بە زمانی عەرەبیە. وە هەر لەم سورەتەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗاۖ وَعُلِّمۡتُم مَّا لَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنتُمۡ وَلَآ ءَابَآؤُكُمۡۖ قُلِ ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ ﴾[2] بڵێ: ئەی كێ ئەو كتێبەی ناردوە كە مووسا هێنای و ڕووناكی و شارەزایی بوو بۆ خەڵكی؟ كتێبێ كە پەرە پەرەی دەكەن و بەشی كەمی نیشانی خەڵكی ئەدەن و بەشی زۆری دەشارنەوە، بەو كتێبە چەند شتتان پێ فێر كرا نە خۆتان و نە باب و باپیرانتان نەتان دەزانی، بڵێ: هەر خودا ناردویە، تۆ ئیتر وازیان لێ بێنە با بەكاڵتە كردنەوە خۆ خەریك كەن، ئەم قورئانەشمان بە خەڵات بۆ تۆ ناردوە. خودی گەورە لەم ئایەتانەدا دێتە سەر باسی بتپەرستان و ئەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓ ﴾[3] بەلام وەختێ ئەم ڕاستیەیان لەلایەن ئێمەوە بۆهات، وتیان: بۆچی ئەوەی بۆ مووسا هاتوە بۆ ئەم نەهات؟ وە ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۖ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ﴾[4] ئایا ئەوەی كە لە پێشدا بە مووسا درا ئەمان حاشایان لێ نەكرد؟ گوتیان: ئەمە دو جادوون كە پشتی یەكتریان گرتوەو وتیشیان: ئێمە بڕوا بە هەمووی ناكەین. واتە: (بڕوا بە قورئان و تەوراتیش ناكەین) خودای گەورە باسی جنۆكەیش دەكات كە لەبارەی قورئان و تەوراتەوە قسەیان كردوەو وتویانە: ﴿يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ ﴾[5] ئەی هۆزو كەسەكانمان بەڕاستی ئێمە گوێمان لە كتێبێك بوو كە لە پاش مووسا هاتوەتە خوارەوە كتێبەكانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ خەڵكی شارەزا دەكات بۆ ڕێی ڕاستی. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ ﴾ تا چاكەمان بەرانبەر ئەو كەسە كە ڕێگای چاكەی گرتوەتە بەر، بێ كەم و كوڕی تەواو بێ. واتە: ئەو كەسەی كە ئەو كتێبەمان پیا

---

[1] الاحقاف (١٢).

[2] الانعام (٩١-٩٢).

[3] القصص (٤٨).

[4] القصص (٤٨).

[5] الاحقاف (٣٠).

ڕەوانە کرد هەموو شتێکی چاکمان بێ کەم‌و کوڕی‌و بە تەواوی تیا باس کرد بۆی بەپێی پێویستی پەیامەکەی. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ ﴾[1] دەربارەی هەر کارێك لەو تەختانەدا هەموو شتمان بۆ نووسی ﴿عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ ﴾ لە پاداشتی ئەو کارە چاکەی‌و گوێڕایەڵی‌و بەجێهێنانی فەرمانەکانمان. وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴾[2] ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نیە؟ وە ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴾[3] ئەوسا خودا بە چەند وشە ئیبراهیمی تاقی کردەوە کە ئەویش بەجێی هێنان. فەرمووی دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دنیا. وە ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾[4] لەوانیشدا چەند کەسێکمان کردە ڕشێبەر، کە هەر بە فەرمانی خۆمان ڕێنمایی خەڵکی بکەن، چونکە توانای خۆڕاگریان تێدا بوو، بە تەواوی باوەڕیشیان بە نیشانەکانمان هێنا بوو، پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ وە ڕوون کەرەوەی هەموو شتێك بێ‌و ببێتە هۆی نیشاندان‌و بەزەیی خوا، بەڵکو بە دیداری پەروەردەیان بڕوا بکەن. لێرەدا خودای گەورە ستایشی تەورات دەکات کە ڕەوانەی کردوە بۆ مووسا (سەلامی خوای لێبێ) پاشان دێتە سەر ستایشی قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ ئەم کتێبە پیرۆزو پڕ لە پیتەشمان ناردوەتە خوار، هەمووتان پەیرەوی لەو بکەن‌و ترستان لە خوا هەبێ، بەڵکو بەزەیی پێیاندا بێتەوە. خودای مەزن داوا لە خەڵکی دەکات کە شوێن قورئان کەون‌و هانی عەبدەکانی ئەدات کە بچن لێی وردبنەوەو کاری پێ بکەن‌و بانگی خەڵکی بۆ بکەن‌و وە بە پیت‌و بەرەکەت وەسفی دەکات بۆ ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون‌و کاری پێ دەکەن لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا چونکە قورئان پەیوەندی بتەوی خودایە لەگەڵ عەبدەکانیدا.

---

[1] الاعراف (١٤٥).

[2] الرحمن (٦٠).

[3] البقرة (١٢٤).

[4] السجدة (٢٤).

﴿أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾﴾

**قورئان بەڵگەی خودایە بەسەر خەڵکەوە**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ﴾ نەچن بڵێن کتێب هەر بۆ دوو کۆمەڵی بەر لە ئێمە هاتۆتـە خوارەوەو ئێمە هیچ ئاگامان لە زانستی ئەوان نەبوە. ئیبنوجەریر ئـەڵێت: واتـە: ئێمە ئـەم کتێبـەمان ناردە خـوارەوە تـا نـەڵێن: ﴿إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا﴾ وەك ئـەم ئایەتـەیش کـە ئەفـەرموێت: ﴿وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾[1] ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کاتێ بـەهۆی کردارەکانیانـەوە تووشی بەڵایـە بن، بڵـێن: پەروەردگارمان تۆ بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ نەناردین، تا پەیڕەوی لە نیشانەکانی تـۆ بکەینو لـە ڕیزی بـاوەڕداران بـین.[2] ﴿عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا﴾ بـۆ دوو کۆمـەڵی پـێش لـە ئێمـە. عـەلی کـوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە مەبەست پێی گاورو جوولەکەیە[3]. موجاهیدو سوودیو قـەتادەش هەر وایان وتوە.[4] ﴿وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ﴾ ئێمە هیچ ئاگامـان لـە زانسـتی ئـەوان نـەبوە. واتە: ئێمە لە قسەی ئەوانە تێ نەدەگەیشتین، چونکە ئەوانە بە زمانی ئێمە نەئەدوان، سەرقاڵی ئیشی خۆمان بوینو نەمان دەزانی ئەوان خەریکی چین. وە ئەفـەرموێت: ﴿أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ﴾ یاخۆ بڵێن: ئەگەر ئێمەش وەك ئەوان کتێبمان بۆ بهاتایە، دیارە شارەزایمان لـەوان زیاتر دەبوو. واتە: بیانویان براوەو نـاتوانن هـیچ بڵـێن. وەك ئـەم ئایەتـە خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ﴾[5] بـە تونـدی سـوێندیان دەخوارد کە: سوێند بـە خـوا، ئەگـەر ئێمـە ترسـێنەرێك لەلایـەن خـوداوە بێتـە لامـان، زیاتر لـە هـەر

[1] القصص (٤٧).
[2] الطبري (١٢/٢٣٩).
[3] الطبري (١٢/٢٤٠).
[4] الطبري (١٢/٢٤١).
[5] فاطر (٤٢).

کۆمەڵێکی تر ڕێگەی خودا دەگرینە بەر. بۆیە خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ ئەوا ئێستا لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی زۆر ئاشکراو شارەزاییو بەزەییتان بۆ هاتوە. واتە: ئەوەتا لەلایەن خوداوە لەسەر زمانی موحەممەد کە پێغەمبەرێکی عەرەبە(ﷺ) قورئانی پیرۆزتان بۆ هاتوە، باسی حەڵاڵو حەرامی تێدا کراوەو شارەزاییە بۆ دڵەکانو بەزەیی خودایشە بۆ ئەو عەبدانەی کە شوێنی دەکەونو فەرمانەکانی بەجێ دێنن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ﴾ ئایا دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ کە بە نیشانەکانی خوا بڕوا ناکات لە فەرمانەکانی خۆی لائەدا؟ ئەو کەسانەی لەم کتێبە خۆیان لائەدەنو بە نیشانەکانی باوەڕ ناکەن زۆر بە توندی سزایان دەدەین لەسەر ئەو لادانەیان. سوودی ئەڵێ: هەرکەسێ بەهرە وەرنەگرێ لەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتیو شوێنی نەکەوێو واز لە بتپەرستی نەهێنێ لە نیشانەکانی خودا خۆی لابداتو خەڵکیش لە ڕێگە لابداتو ببێتە لەمپەریش لە ڕێگەیدا تووشی سزای زۆر سەختو گران دەبێ بەو کارەی. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو قەتادەئەڵێن: ﴿وَصَدَفَ عَنْهَا﴾ واتە: پشتی تێ بکات.

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾

**خوانەناسان چاوەنواڕی قیامەت یان نیشانەکانی دەکەن**

خودای گەورە هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە بڕوایان پێی نیەو دژایەتی پێغەمبەرەکەی دەکەنو نیشانەکانی بە ڕاست نازانن‌و بونەتە لەمپەر لە ڕێگەکەیدا ئەفەرموێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا﴾ ئایا ئەوان چاوەڕوانی چ شتێك دەکەن جگە لەوە کە فریشتەیان بێتە لا، یان پەروەردگاری تۆ (خۆی) بێتە لایان، یان هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگاری تۆیان بۆ بێ؟ ئەو ڕۆژە کە ئەم جۆرە نیشانانە بێتە لایان بڕواهێنان بەهرەیان بۆ نادات. بێگومان هەندێ نیشانە لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت دێت بەڵام کاتێ ئەو خەڵکە ئەو نیشانانەیان بینی بڕواهێنان هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێ وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدائەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێ تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت،

کاتیٚ خەڵکی بینیان هەرچی لەسەریەتی (لەسەر زەمینە) بڕوای هێناوە) ئەوە ئەو کاتەیە ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ﴾[1] هەرکەسیٚ لە پێشدا بڕوای نەهێنابیٚ، بڕوا هێنان بەهرەیان بۆ نادات. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتیٚ سیٚ (نیشانە) دەرکەوت هیچ کەسیٚ باوەڕەکەی سوودی پیٚ ناگەیەنیٚ، کە پێشتر بڕوای نەهێنابیٚ، یان هیچ خێرو چاکەیەکی نەکردبیٚ لەگەڵ باوەڕەکەیدا. هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوەو جەجاڵو گیانەوەرەکەی زەمین (دابة الارض))[2] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە بەڵام ئەم دووکەڵیشی لەگەڵدایە.[3] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەمری کوڕی جەریرەوەئەڵێت: سیٚ کەس لە موسوڵمانان لە مەدینە لەلای مەروان دانیشتبوون، گوێیان لیٚ بوو کە مەروان باسی سیٚ نیشانەی دەکردو دەیوت: یەکەم نیشانە جەجاڵە، وتی: هەڵسانو چوون بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، ئەوەی بیستبویان لە مەروان لەبارەی ئەو نیشانانەوە بۆیان گێڕایەوە. (ئەمیش) وتی: مەروان هیچ شتێکی نەوتوە، من لەبەرم بووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (یەکیٚ لە نیشانەکان کە دەردەکەویٚ هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، هاتنە دەری گیانەوەرەکەی زەمین لە چێشتەنگاودا. هەرکامیان پێش ئەوەیان بوو، ئەوی تریشی بەدوادا دیٚ). پاشان عەبدوڵڵا وتی: (کە خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو) وا دەزانم دەرکەوتنی خۆر لە خۆرئاواوە یەکەمیانە. چونکە خۆر هەرکاتیٚ ئاوابوایە دەچووە ژێری تەخت (العرش) سوژدەیەکی دەبردو ئیزنی دەخواست بۆ گەڕانەوە، ئیزن ئەدرا کە بگەڕێتەوە، تا کاتیٚ کە خودا فەرمان ئەدا کە لە خۆرئاواوە هەڵبیٚ، ئەو کارە دەکات کە کردویەتی، دەچێتە ژێری تەخت (العرش) سوژدەیەك دەباتو ئیزن دەخوازیٚ بۆ گەڕانەوە، هیچ وەڵامێکی نادرێتەوە، هەتا ماوەیەك لە شەو دەڕوا کە خوا مەیلی لێبیٚ بڕوا، ئیتر دەزانیٚ ئەگەر ئیزن بخوازیٚ بۆ گەڕانەوە فریای هەڵاتن ناکەویٚ، دەڵێت: پەروەردگارم! خۆرهەڵات زۆر دوورە (من لي بالناس) چی بکەم بەو خەڵکە، تا کاتیٚ کە ئاسۆ وەك بازنەیەکی لێدیٚ داوای ئیزن دەکات بۆ گەڕانەوە، پێی دەوتریٚ: لە شوێنی خۆتدا هەڵبیٚ. لە شوێنی خۆیدا هەڵهات بەسەر خەڵکدا لە خۆرئاوایە. پاشان عەبدوڵڵا ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ﴾[4] موسلیمو ئەبوداوودو

---

[1] فتح الباري (١٤٧/٨).

[2] الطبري (٢٦٥/١٢).

[3] أحمد (٤٤٥/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] أحمد (٢٠١/٢)، سەحیحە.

ئیبنوماجەیش لە کتێبەکانیاندا هێناویانە.[1] ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ﴾ هەرکەسێ لە پێشدا بڕوای نەهێنابێ بڕوا هێنان هیچ سودێکی بۆی نیە. واتە: ئەگەر خوانەناس لەو ڕۆژەدا بڕوای هێنا لێی وەرناگیرێ بەڵام ئەگەر بڕوادار بوبێ لە پێش ئەوەداو ئاکار چاك بوبێ ئەوە خێرو بێرێکی زۆر گەورەیە بۆی. خۆ ئەگەر چاکەکار نەبوبێ لەو کاتەدا تەوبە بکات، تەوبەکەی لێ وەرناگیرێ وەك فەرموودەکان لە پێشدا ئامازەیان پێکردوە. وە خودای گەورەش لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا﴾ یان ئاکاری چاکی نەبوبێ لە پێشدا، لەو ڕۆژەدا هیچ کارێکی چاکی لێ وەرناگیرێ. ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ بڵێ: ئێوە چاوەڕێ بن ئەوا ئێمەش چاوەڕێین. ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە لەو خوانەناسانەی کە بڕوا هێنان و تەوبە کردن دوادەخەن بۆ ڕۆژێ کە تەوبە کردنیان هیچ سودێکی نیە بۆیان. ئەم وەرنەگرتنی باوەڕو تەوبەیە لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ و ڕۆژی قیامەت و نیشانەکانی نزیك بوەتەوەو دەرکەوتوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ﴾[2] ئایا ئەوان چاوەڕێن کتوپڕ ئێستە قیامەتیان بەسەردا بێ؟ وا ئێستاتا نیشانەکانی پەیدا بووە، کە ڕۆژی قیامەتیان بەسەردا هات، ئیتر کەی بیر دەکەنەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا﴾[3] کاتێ بینیان بەڵای ئێمەیان هاتە سەر، دەڵێن: بڕوامان بە خودای تاك و تەنیا هەیە، لەو شتانەی کە دەمانکوت شەریکی خودا حاشا دەکەین. پاش بینینی سزای ئێمە بڕوا هێنانیان هیچ قازانجی پێ نەگەیاندن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾﴾

### زەم و گلەیی لە ناکۆکی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ ئەو کەسانەی ئاینەکەیان بەشی بەشی کردوەو دەستەی لێکتر

[1] مسلم (٤/٢٢٦٠)، أبوداود (٤/٤٩٠)، إبن ماجة (٢/١٣٥٣).

[2] محمد (١٨).

[3] غافر (٨٤–٨٥).

جیاوازیان پێکهێناوە، تۆ لە هیچ شتێکدا لەوان نیت. بێگومان کاری ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا. لە دواییدا ئاگاداریان دەکاتەوە لەو کردەوەی کردویانە. قەتادەو موجاهیدو زەحهاكو سوودی ئەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر گاورو جولەکەکان هاتوەتە خوار[1]، عەوفی وتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ چونکە گاورو جولەکە لە پێش هاتنی پێغەمبەردا (ﷺ) ناکۆکی کەوتبوە نێوانیان، کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کرا ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوار: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ﴾[2] ئاشکرایە ئەم ئایەتە هەموو کەسێ دەگرێتەوە کە دژایەتی ئاینی خودای کردبێو جیاوازی تێدا دروست کردبێ، بێگومان خودا پێغەمبەری خۆی ناردو ڕێنماییو ئاینی ڕاستیشی لەگەڵدا نارد، تا بەسەر هەموو دینێکدا زاڵی بکات، یەك بەرنامەی هەیەو هیچ جیاوازیو ناکۆکیەکی تێدا نیە، هەرکەسێ ناکۆکی تێدا کرد ﴿وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ دەستەی جیا جیای لێ دروست کرد، وەك ئەو خەڵکە گومڕاو ئارەزوو پەرستانەی کە ئاینەکانیان بەشی بەشی کردبوو بە ئارەزوی خۆیان. خودای گەورە پێغەمبەرەکەی بە دور گرتوە لەوەی ئەوانە کردویانەو خەریکی بوون، ئەم ئایەتە کە لێرەدا هاتوە، وەك ئەم ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾[3] ڕێگەیەکی لە دینداری بۆ ئێوە داناوە کە ڕایسپارد نوحیش هەر لەسەر ئەو ڕێگە بڕوا، هەر ئەمەشمان بە فەرمان بە تۆ ڕاگەیاند کە بە ئیبراهیمو مووساو عیساشمان ڕادەسپارد. کە هەر لەسەر ئەم دینە بنو جیاوازی تێدا مەکەن. وە لەم فەرموودەیەدا هاتوە: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران کوڕی ئەك باوکنو دایکیان جیایەو ئاینیان یەکە)[4]، ئا ئەوە ڕێگای ڕاستە کە پێغەمبەران پێی هاتوون کە بریتیە لە خواپەرستیو شەریك دانەنا بۆیو پابەند بوون بە پەیامی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) کە دواین پێغەمبەرە. هەرچی پێچەوانەی ئەوە بێ گومڕاییو نەفامیو ئارەزوو بازیە. کە پێغەمبەران لێیەوە دوورن، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ تۆ لە هیچ شتێکدا لەوان نیت، بێگومان کاری ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا لە دوایدا ئاگاداریان دەکاتەوە لەو کردەوەی کە کردویانە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ

---

[1] الطبري (١٢/٢٦٩-٢٧٠).

[2] الطبري (١٢/٢٦٩).

[3] الشورى (١٣).

[4] فتح الباري (٦/٥٥٠).

ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾[1] ئەوانەی بڕوایان هێناو ئەوانەی جوولەکەو سووبیی‌و مەسیحی‌و مەجووسی‌و ئەو کەسانەش شەریك بۆ خودا دادەنێن، دیارە خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بڕیار ئەدات لە نێوانیاندا (لە یەکتری جیایان دەکاتەوە).

﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾﴾

**یەك چاکە بە دە ئەوەندە، یەك خراپەیش بە ئەندازەی خۆی پاداشت وەردەگرێ:**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ هەرکەسێك چاکەیەك بکات، دە ئەوەندەی چاکەی لەگەڵ دەکرێتەوە، کەسێکیش خراپە بکات، بە ئەندازە خراپەکەی سزا ئەدرێ‌و کەس ناهەقی لێ ناکرێ. ئەم ئایەتە تەفسیری ئەو ئایەتەیە کە بە کورتی هاتوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا﴾[2] هەرکەسێ چاکەیەك بکات، لەوە چاکتر چاکەی لەگەڵ دەکرێتەوە. چەندین فەرموودە هاتوە کە ماناکەیان وەك مانای ئەم ئایەتە وایە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی لەو فەرموودانەوە کە لەلایەن خودای گەورەوە دەیگێڕێتەوە: (بێگومان پەروەردگاری گەورەتان زۆر بە بەزەییە، کەسێ بیەوێ چاکەیەك بکات‌و نەیکرد، چاکەیەکی بۆ نووسراوە، خۆ ئەگەر کردی دە چاکەی بۆ نووسراوە تا حەوت سەد چاکە تا چەند جاری زۆرتریش، وە هەرکەسێ بیەوێ خراپەیەك بکات، ئەگەر نەیکرد، چاکەیەکی بۆ نووسراوە، خۆ ئەگەر خراپەکەی کرد، یەك خراپەی بۆ نووسراوە یان خودای گەورە بۆی دەسڕێتەوە، لەلای خودا هیچ کەسێ بە هیلاك ناچێ، مەگەر کەسێ خۆی خۆی بە هیلاك ببات)[3]، بوخاری‌و موسلیم‌و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە[4] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای گەورە ئەفەرموێت: هەرکەسێ کارێکی چاکی کردبێ دە ئەوەندەی دەدرێتێ‌و زیاتریش، وە هەرکەسێ کارێکی خراپی کردبێ سزاکەی بە وێنەی ئەو خراپەیە کە کردویەتی یان لێی بوراوە. وە کەسێ بە پڕی زەوی تاوانی کردبێ، پاشان پێم گەیشت لە هیچ شتێکدا شەریکی

[1] الحج (١٧).
[2] النمل (٨٩).
[3] أحمد (١/٢٧٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[4] فتح الباري (١١/٣٣١)، مسلم (١/١١٨)، النسائي في الكبرى (٤/٣٩٦).

بۆ دانەنابم، بە وێنەی ئەوە لێی خۆش دەبم، هەرکەسێ بستێ لێم نزیك ببێتەوە باڵێ لێی نزیك دەبمەوە، هەرکەسێ باڵێ لێم نزیك بێتەوە شا باڵێ لێی نزیك دەبمەوە. هەرکەسێ بە ڕۆشتن هاتە لام بە ڕەوت (هەروەلە) دەچمە لای)[1]، موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە[2] بزانە ئەوانەی کە واز لە خراپە دەهێنن‌و نایکەن دەکرێن بە سێ بەشەوە: جاری وا هەیە ئەو کەسە لەبەر خوا وازی لێ دێنێ، ئەمە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ لەسەر وازهێنانی لەو خراپە لەبەر ڕەزای خوا، ئەمە بە کردەوەو نیازە بۆیە لە فەرموودەدا هاتوە کە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ وەك لە هەندێ فەرموودەی سەحیحدا هاتوە ئەفەرموێت: بێگومان ئەو کەسە وازی هێناوە لەبەر من، واتە: لەبەر ڕەزای من. بەشی دووهەم: جاری وا هەیە وازی لەو خراپە هێناوە لەبەر ئەوەی لە بیری چوەتەوەو هۆشی بەلای ئەو خراپەوە نەماوە، ئەوە نە بۆی دەنوسرێ بە چاکەو نە خراپەیشی لەسەر دەنوسرێ. چونکە نە نیازی چاکەی بوەو نە خراپەیشی کردوە. جاری واش هەیە، لەبەر تەمەڵی‌و لاوازی‌و بێ هێزی وازی هێناوە، دوای هەوڵ‌و کۆششێکی زۆرو گەڕان بە دوای ئەو شتانەدا کە نزیکی دەکەنەوە لەو خراپە. ئەمە وەك ئەو کەسە وایە کە خراپەکەی کردبێ. وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەگەر دوو موسوڵمان بە شمشێر بەرانبەر یەك وەستان (دایان لە یەکتری) بکوژو کوژراو هەردووکیان دەچنە ناو ئاگر)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوا بکوژەکە هەقی ناو ئاگری هەیە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: (بێگومان ئەویش سوور بووە لەسەر کوشتنی هاوەڵەکەی).[3] تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە لە ئەبومالیکی ئەشعەریەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نوێژی هەینی دەبێتە کەفارەتی گوناهی ئەو ڕۆژانە کە لە نێوانی خۆی‌و ئەو هەینیەی کە بە دوایدا دێت‌و زیاد کردنی سێ ڕۆژیش، چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾)[4] لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ سێ ڕۆژوی لە هەموو مانگێ گرتبێ، ئەوە هەموو ساڵەکەی گرتوە) ئیمامی ئەحمەدو نەسائی‌و ئیبنوماجەو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی ئەمەی بۆ زیاد کردوە: (بۆ پشتگیری ئەوە خودا ئەم ئایەتەی لە قورئاندا ڕەوانە کردوە: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ یەك ڕۆژ بە دە ڕۆژ)، پاشان گوتویەتی: ئەم فەرموودە، فەرموودەیەکی چاکە[5] فەرموودە لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، ئەوەی لێرەدا باس کرا بەسێتی.

---

[1] أحمد (١٥٣/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٢٠٦٨/٤).

[3] البخاري (٧٠٨٣/٦٧٧٥/٣١).

[4] الطبراني (٢٩٨/٣).

[5] أحمد (١٤٦/٤)، تحفة الاحوذي (٤٧٠/٣)، النسائي (٢١٨/٤)، إبن ماجة (٥٤٥/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٦١) قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ (١٦٣)﴾

**هەر ئیسلام ڕاستە ڕێیە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: پەروەردگاری خۆم، خستومیەتە سەر ڕاستە ڕێگە، سەر دینێ کە پایەدارە، ئاینی ئەو ئیبراهیمە وا لە ناهەق لایداوە هەرگیز هیچ شەریکێکی بۆ خوا بڕیار نەداوە. خودای گەورەفەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە کە باسی ئەو بەهرانە بکات کە خودا پێی داوە لە شارەزا کردنی بۆ سەر ئەو ڕێگە ڕاستەی کە هیچ لارو خێچیەکی تێدا نیە، پایەدارەو بەردەوامەو ئاینی ئەو ئیبراهیمەیە وا لە ناهەق لایداوە هەرگیز هیچ شەریکێکی بۆ خوا دانەناوە، ئەم ئایەتە، وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ﴾[١] چ کەسێکی وا هەیە ئاینی ئیبراهیم بخاتە لاوە. مەگەر (کەسێ) هەر خۆی گەوج بکات. وە ئەفەرموێت: ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ ۚ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ﴾[٢] بەو شێوە (کە پێویستە) بچنە غەزا لە ڕێی خودا، ئەو هەر خۆی ئێوەی هەڵبژاردوە، لەم ئاینەشدا تووشی نارەحەتی نەکردون هەر ئاینی ئیبراهیمی باوکتانە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٢٠) شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ (١٢١) وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ (١٢٢) ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾[٣] ئیبراهیم پێشەوایەکی بەرەو هەق ڕۆشتبوو، بەرفەرمانی خودا بو، نە لە ڕیزی ئەوانە بوو کە شەریك بۆ خودا دادەنێن، چاکەی خودای لەبەرچاو بو، خواش بۆ خۆی هەڵبژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی کرد. لە دنیا بەهرەمان دایەو لەو دنیاش لە پیاو چاکانە. پاشان بە تۆمان ڕاگەیاند ئەی موحەممەد(ﷺ) کە پەیڕەوی ئاینی ئیبراهیمی بەرەو هەق ڕۆشتوو بە، ئەو شوێنکەوتەی ئەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خوا دادەنێن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێویستە نەکراوە لەسەری کە شوێنی ئاینی ئیبراهیم بکەوێ، لەبەر ئەوەی کە

[١] البقرة (١٣٠).
[٢] الحج (٧٨).
[٣] النحل (١٢٠-١٢٣).

ئیبراهیم لەو تەواوترە تێیداو بەو کارە هەڵساوە زۆر بە چاکیو بۆی تەواو کراوە بە شێوەیەکی وەها کە هیچ کەسی پێش لەو، ئەو کارەی بە تەواوی بەجێ نەهێناوە. لەبەر ئەمەی کە موحەممەد(ﷺ) دواین پێغەمبەرەو، بەڕێزترین مندالی ئادەمە بە گشتیو خاوەنی ئەو پلەو پایە سوپاسکراوەیە (المقام المحمود) کە خەڵکی ئارەزوی دەکەن تا ئیبراهیمی خەلیلیش (سەلامی خوای لێبێ). ئیمامی ئەحمەد وتی: یەزید بۆی گێڕاینەوە، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق هەواڵی داینێ لە داوودی کوڕی حوسەینەوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی: وتیان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کام ئاین لەلای خودای گەورە خۆشەویستترە؟ فەرمووی: (ئاینی ئیسلامە کە ئاینی لێبوردنە (الحنيفية البسمحة))[1].

## فەرمان کردن بە پاکیو دڵسۆزی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ﴾ بڵێ: من نوێژ کردنمو پێکهێنانی ڕێوشوێنی حەج کردنمو ژینو مەرگم بۆ خودایە، کە پەروەرندەی دنیا هەر خۆیەتی، هیچ شەریکی نیە، فەرمانی وا بە من داوە. خودای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەو بتپەرستانەی غەیرەز خودا دەپەرستن وە ئاژەڵ سەردەبڕشن بە ناوی بێجگە لە خوا بڵێ کە ئەو دژی ئەوانە لەو کارەدا دەیکەن. نوێژ کردنی هەر بۆ خودایەو سەربڕینیشی هەر بۆ ئەوە هیچ شەریکی نیە ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾[2] سا تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) هەر بۆ پەروەردگاری خۆت نوێژو قوربانی بکە. واتە: بە دڵسۆزیەوە نوێژو قوربانیەکەت بکە، ئەوەبوو موشریکەکان بتیان دەپەرستو قوربانیان بۆ دەکردن. خودای گەورە فەرمانی دا کە دژایەتیان بکەنو ئەوەی ئەوانە خەریکین ئەمان نەیکەنو بە پێچەوانەی ئەوانەوە بە پاکیو بە دڵسۆزیو لێبڕانی تەواوە ڕوو بکەنە خودایگەورە. موجاهیدئەڵێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي﴾، (النسك) واتە: سەربڕین (قوربانی) لە حەجو عەمرەدا. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دوو بەران قوربانی کرد لە جەژنی قوربانیدا، کاتێ کە سەری دەبڕین ئەیفەرموو: (ڕووی خۆم کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانەکانو زەمینی وەدی هێناوە (بە پاکیو دڵسۆزی) بەرەو هەق دەڕۆم، وە من لە بتپەرستان نیمو نوێژو قوربانی کردنمو ژینو

---

[1] أحمد (١/٢٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الكوثر (٥).

مەرکم بۆ خودایە پەروەردگاری دنیا هەر خۆیەتی، هیچ شەریکی نیە وا فەرمان بە من دراوە، وە من یەکەم کەسم لە ڕیزی موسوڵماناندا)[1].

## ئاینی گشت پێغەمبەران تەنیا ئیسلام بووە

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: من لە ڕیزی یەکەمم لە موسوڵماناندا. قەتادەئەڵێت: واتە: من لە ڕیزی یەکەمم لەم ئوممەتەدا[2]، وەك لە پێشیشدا خودای گەورە فەرموویەتی کە گشت پێغەمبەرانی بەر لە پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازەکەیان بۆ ئیسلام بووە کە سەرچاوەکەی پەرستنی خودایە بە تەنیاو شەریك دانەنانە بۆی. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾[3] بەر لە تۆش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد، کە: هیچ پەرستراوێك بێجگە لە من نیەو هەر تەنیا من بپەرستن. وە خودای گەورە باسی نووح پێغەمبەرمان بۆ دەکات کە بە گەلەکەی دەڵێ: ﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾[4] ئەگەر پشتم لێ هەڵکەن من داوای هیچ پاداشتێکم لێ نەکردوون، پاداشتم لەلای خودایە، فەرمانم پێکراوە من لە موسوڵمانان بم. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾[5] کێی وا هەیە کە واز لە ئاینی ئیبراهیم بێنێ؟ جا مەگەر هەر خۆی گەوج بکات. ئێمە ئەومان لەم دنیا هەڵبژاردوەو لەو دنیاشدا وا لە ڕیزی پیاوچاکاندا. وەختێ پەروەرندەت پێی وت: وەرە خۆ بە من بسپێرە وتی: وا خۆم دایە دەستی پەروەردگاری هەموو دنیا. ئیبراهیم بە کوڕەکانیو بە یەعقوبیشی ڕایسپارد: کوڕەکانم خوا ئەم ئاینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردوە، بە موسوڵمانی نەبێ مەمرن. یوسف (سەلامی خوای لێبێ) دەفەرموێ: ﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ

---

[1] الحاكم (٢/٤٦٧).
[2] الطبري (١٢/٢٨٥).
[3] الانبياء (٢٥).
[4] يونس (٧٢).
[5] البقرة (١٣٠-١٣٢).

تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾[1] ئەی پەروەردگارم لەم ولاتە تۆ دەستەلاتت پێداوم و فێرت کردم چۆن خەونەکان لێکدەمەوە، وەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمینی؟، لەسەر بڕوای تەواو بە خۆت بم مرێنەو بمگەیەنەوە بە پیاوچاکان. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾[2] مووسا بە گەلەکەی خۆی وت: گەلەکەم ئەگەر باوەڕتان بە خودا هەیەو ملکەچی فەرمانی ئەون، سا پشتتان هەر بەو ببەستن. وتیان: خۆمان بە خوا سپارد، ئەی پەروەردگاری هەمووومان، مەمانخەرە بەر ئازارو ئەشکەنجەی گرۆی ستەمکاران. بە بەزەیی خۆت ڕزگارمان کە لە گرۆی خوانەناسان. وە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ ﴾[3] ئێمە کە ئەم تەوراتەمان ناردوەتە خوار، ڕووناکی و ڕێنیشاندانی تێدایە، ئەم پێغەمبەرانە حوکمیان پێکرد کە موسوڵمان و ملکەچ بوون، بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون هەروەها زانا خواناسەکان و زانا شەرع زاناکانیش حوکمیان پێ دەکرد. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي قَالُوا آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴾[4] ئەو کاتەشی من (بە ئیشارەتی تایبەتی خۆم) حەوارییەکانم تێگەیاند، دەبێ بڕواتان بە من هەبێ و بە پێغەمبەرەکەی منیش هەر بڕواتان هەبێ، وتیان: خوایە تۆ شایەت بە، کە بڕوامان پێ هێنای و هەر ملکەچی فەرمانی تۆین. خودای گەورە ئاگاداری داوە کە پێغەمبەرەکانی بە ئیسلامەتی ڕەوانە کردوە بەڵام جیاوازیان هەبووە تێیدا بەپێی ئەو شەریعەتە تایبەتیانەی خۆیان کە هەندێکی هەندێکی تری نەسخ دەکاتەوە. تا ئەو کاتەی کە هەموویان بە شەریعەتەکەی موحەممەد(ﷺ) نەسخ بونەوە. وە ئەم شەریعەتەی ئەم هەتا هەتایە نەسخ نابێتەوە، بەردەوام پایەدار دەبێ و نیشانەو ئاڵاکانی بەرزو شەکاوە دەبێ تا ڕۆژی قیامەت، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە گرۆی پێغەمبەران کوڕانی پیاوێکین و دایکانمان جیایەو ئاینمان یەکە).[5] کە بریتیە لە پەرستنی خودا بە تەنیاو شەریکی نیە. ئەو شەریعەتەی کە هێناویانە وەك جۆری دایکەکان وابێ، برای دایکی بە پێچەوانەی ئەمەوەیە،

---

[1] یوسف (١٠١).

[2] یونس (٨٤-٨٦).

[3] المائدة (٤٤).

[4] المائدة (١١١).

[5] فتح الباري (٦/٥٥٠).

یەك دایكیان هەیەو لە چەند باوكێكن. والله أعلم. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) كاتێ هەڵساوە بۆ نوێژو (الله أكبر) كردوەو پاشان فەرمویەتی: (ڕووم كردە ئەو كەسەی كە ئاسمانەكانو زەمینی دروست كردوە بە دڵپاكی وە لەوانەیش نیم كە شەریكی بۆ دادەنێن نوێژو قوربانیو ژینو مەرگم بۆ خودایە، پەروەردگاری ئەم دنیا)، (ئەی خودایە تۆ فەرمانڕەوای جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێ نیە، تۆ پەروەردگاری منی، من بەندەی تۆم نامەقیم لە خۆم كردوە دان دەنێم بە تاوانەكانمدا، لە گشت گوناهەكانم خۆش بە، جگە لە تۆ هیچ كەسێ لە تاوانەكان خۆش نابێ. شارەزام كە بۆ چاكترین ڕەوشت، هیچ كەسێ كەس شارەزا ناكات بۆ چاكترین ڕەوشت جگە لە تۆ، لە ڕەوشتە خراپەكان لام بدە، هیچ كەسێ لە ڕەوشتە خراپەكان لام نادات جگە لە تۆ، گەورەو پایەبەرزی داوای لێبوردنت لێ دەكەمو دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ)[1] پاشان فەرموودەكەی بە تەواوی گێڕایەوەو ئەو شتانە كە ئەیفەرموو لە ڕكوعو سوجودو شایەتوماندا باس كرد. موسلیمیش لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردوە[2].

﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾﴾

## فەرماندان بە پاكیو دڵسۆزی پشت بەستن بە خوا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بەوانەی كە شەریك بۆ خوا دادەنێن (ئێوەش وەرن بە پاكیو دڵسۆزی بەندایەتی بۆ خوا بكەنو پشتی پێ ببەستن ﴿أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا﴾ ئایا چۆن جگە لە خوا كەسێكی تر بە پەروەردگار بزانم؟ ﴿وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾ كە هەر ئەوە پەروەردگاری هەموو شت. هەر ئەویشە پارێزگاریو چاودێریم دەكاتو كارەكانم بۆ فەراهەم دێنێ. واتە: تەنیا خۆم بە ئەو دەسپێرمو بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، چونكە خودا پەروەردگارو فەرمانڕەوای هەموو شتێكەو خاوەنبڕیارو وەدیهێنانە. لەم ئایەتەدا خودای گەورە فەرمان دەكان بە عەبدەكانی كە بە پاكیو دڵسۆزی پشت بە خوا ببەستن، وە لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەیش فەرمانی دابوو بە عەبدەكانی كە تەنیا خوا بپەرستنو شەریكی بۆ دانەنێن. ئەم بەندایەتی كردنو پشت بە خوا بەستنە زۆر جار لە قورئاندا لەگەڵ یەكتردا هاتوون. وەك ئەم ئایەتەی كە خودای گەورە پێ نیشانی عەبدەكانی ئەدات كە

[1] أحمد (١٠٢/١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.
[2] مسلم (٥٣٤/١).

بڵێن: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾[1] خودایە تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین. وە ئەفەرموێت: ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ﴾[2] تەنیا هەر ئەو بپەرستن و خۆتان بەو بسپێرن. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا﴾[3] بڵێ: ئەوە ئەو خوای بەخشندەیەیە باوەڕمان پێ هێناوەو خۆمان هەر بەو سپاردوە. وە ئەفەرموێت: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾[4] پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە جگە لەو هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ. هەر ئەو بکە بە بریکاری خۆت.

### هیچ کەس باری گرانی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ﴾ هەرکەسێ کارێکی خراپ بکات هەر خۆی سزاکەی وەردەگرێ. هیچ کەس باری گرانی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ. ئەمە باس و هەواڵی قیامەتە کە لەو ڕۆژەدا خودا پاداشت و سزای ئەو خەڵکە ئەداتەوە لەسەر کردارەکانیان، ئەوەی چاکە بە چاکە و ئەوەیش خراپە بە تۆڵە لێ سەندن. باری گرانی کەس بە کۆڵی کەسدا نادات، ئەمەیش لە دادگەری و کارزانی خودای گەورەیە بەرانبەر بەندەکانی، وەك لە ئایەتی تردا ئەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَدۡعُ مُثۡقَلَةٌ إِلَىٰ حِمۡلِهَا لَا يُحۡمَلۡ مِنۡهُ شَيۡءٞ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰٓ﴾[5] ئەگەر بێتو بارگرانێك لە کەسێکی تر بپاڕێتەوە بارەکەی لەگەڵدا هەڵگرێ (با خزمی نزیکیشی بێ) هیچ لەو بارەی هەڵناگرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا وَلَا هَضۡمٗا﴾[6] لەوە ناترسێ کە ستەمی لێ بکرێ و نە لە پاداشتی کەم بکرێتەوە. زانایانی تەفسیر وتویانە: واتە: خودا ناهەقی لە هیچ کەسێ ناکات و تاوانی هیچ کەسێ ناخاتە سەر کەسێکی تر وە لە پاداشتی هیچ کەسێکیش کەم ناکاتەوە. وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ۝٣٨ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ﴾[7] هەموو کەسێ لە بارمتەی کردەوەی خۆیدایە، مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست واتە: هەموو کەسێ گیرۆدەو بارمتەی کرداری خراپە خۆیەتی، بێجگە لە هاوەڵانی دەستی ڕاست کە بەرەکەتی ئاکارە چاکەکانیان وەچە و خزمەکانیشیان

---

[1] الفاتحة (٥).

[2] هود (١٢٣).

[3] الملك (٢٩).

[4] المزمل (٩).

[5] فاطر (١٨).

[6] طه (١١٢).

[7] المدثر (٣٨-٣٩).

دەگرێتەوەو بەهرەی لێ وەردەگرن. وەك لە سورەتی توردا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِيٍٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾[1] ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وەچەشیان چوونە سەر باوەڕی ئەوان، ئێمە وەچەی ئەوانیش وەك خۆیان دەبەینە بەهەشت لە پاداشتی کردوەیان هیچ کەم ناکەینەوە، هەموو کەسێ بارمتەی کاری خۆیەتی. واتە: وەچەکانیان دەبەینە لای ئەوان لە بەهەشتداو وەك ئەوان پلەیان بەرز دەکەینەوە، با ئەوانیش لە کردەوەدا وەك ئەوان نەبوبن، لەبەرئەوەی وەچەکانیان بڕوایان هەبوە. ئەو پیاوە گەورە پلە بەرزانە هیچ لە کردەوەکانیان کەم ناکەینەوە هەتا لەگەڵ وەچەکانیاندا هاوسەنگیان بکەین، ئەوانەی کە پلەیان لەوان کەمترە، خودا پلەیان بەرز دەکاتەوە بۆ لای باوکەکانیان بەهۆی بەرەکەتی کردەوەکانیانو ڕێزو منەتی خودا خۆی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ پاشان جێی گەڕانەوەی هەمووتان وا لەلای پەروەردگارتان، ئەوسا ئاگادارتان دەکات کە لەسەر ئەو شتانەی کە لەگەڵ یەك ڕێك نەدەکەوتن، ئێوە کاری خۆتان بکەنو ئێمەش لە کاری خۆمان بەردەوامین، ئێوە دێننو ئێمەش هەر دێنن، ئێمەو ئێوەش ئاگادار دەکرێین، هەرکەسەو بە کردارەکانیەوەو ئەوەیش کە لەسەری ناکۆك بووین لە ژیانی دنیادا، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ﴾[2] بڵێ: هەر گوناهێ ئێمە بیکەین، کەس لە ئێوە ناپرسێتەوە، ئێوەش هەر کارێ بکەن کەس لە ئێمە ناپرسێتەوە. تۆ بڵێ: پەروەردگارمان لەگەڵ یەك کۆمان دەکاتەوە، پاشان لە نێوانماندا بڕیار ئەدات بە هەقو دادوەریمان دەکات، هەر ئەویشە لەو ڕۆژەدا بڕیار بەدەستوزانا.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾﴾

### خودا خەڵکی کردە جێنشینی زەمینو پلە جیاواز لە یەکتری تا تاقیان بکاتەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ﴾ (خودا) هەر بۆ خۆشی ئێوەی کردە جێنشینانی (سەر زەمین) کە ئاوەدانی بکەنەوە، وەچە دوای وەچەو چەرخ دوای چەرخو دوایینە دوای پێشینە، ئەمە قسەی ئیبنوزەیدو کەسانی تریشە، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خودای

---

[1] الطور (٢١).

[2] سبأ (٢٥-٢٦).

گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِي ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴾[1] خۆ ئەگەر مەیلمان لێ بوایە چەند فریشتەیەکمان لە ئێوە وەدیدەهێناو دەمانکردن بە جێنشین لەسەر زەمین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ﴾[2] دەتانکاتە جێنشین لەم سەر زەمینە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[3] من دەمەوێ جێنشینێ لەسەر زەمین دیاری بکەم. وە ئەفەرموێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾[4] دوور نیە پەروەردگاتان دوژمنات لەناو بەرێ ئێوە بکاتە جێنشین لەم زەمینەداو بروانێ ئێوە چی دەکەن.

پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ﴾ هەندێکتانی بەرانبەر بە هەندێکی تر، چەند پلە بردە سەرەوە، واتە: هەندێکتانی لە هەندێکی تر جیا کردوەتەوە لە ڕۆزیو کۆتایی تەمەنو ڕەوشت چاکیو ڕەوشت خراپیو وێنەو شێوەو ڕەنگدا، بڕیارەکانی بەجێیە لەوەدا. وەك لە ئایەتی تردا ئەفەرموێت: ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾[5] ئێمە بژێویمان لە نێوانیادا دابەش کردوە لە ژیانی دنیاداو پلەی هەندێکمان بەسەر هەندێکی تردا بەرز کردوەتەوە، بۆ ئەوەی هەندێکیان ئەوانی تریان خزمەت بکەنو کاری بۆ بکەن، وە ئەفەرموێت: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾[6] دە بڕوانە! چۆن هەندێکمان لە چاو هەندێکیان بەرز کردوەتەوە بێگومان پلەو پایەکانی پاشەڕۆژ بۆ بڕواداران گەورەترو زێدەترە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ لەو شتانەی کە پێیداون تاقیتان دەکاتەوە. دەوڵەمەند تاقی دەکاتەوە بە ماڵو سامانەکەی، لێی دەپرسێ تا چەندێ سوپاسی خوای لەسەر کردوە. هەژاریش لەسەر هەژاریەکەی تاقی دەکاتەوە لێی دەپرسێ هەتا چەندێ خۆگر بووە. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان

[1] الزخرف (٦٠).
[2] النمل (٦٢).
[3] البقرة (٣٠).
[4] الاعراف (١٢٩).
[5] الزخرف (٣٢).
[6] الاسراء (٢١).

دنیا سەوزو شیرینە، خودایش ئێوەی کردۆتە جێنشین تێیدا سەیر دەکات ئاخۆ چی دەکەن، خۆتان لە دنیا بپارێزنو، خۆشتان لە ژنان بپارێزن، چونکە لە ڕاستیدا یەکەمین فیتنەی (نەوەی ئیسرائیل) بەهۆی ئافرەتەوە بووە).[1] ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ﴾ پەروەردگارت بە پەلە تۆڵە دەسێنێو هەر ئەویشە کە لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە. ئەمە خۆی ترساندنو هاندانیشە کە لێپرسینەوەو تۆڵەسەندنی بە پەلەیە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە سەرپێچی خوداو دژایەتی پێغەمبەرەکانی دەکەن، وە لێبوردەیشە بەرانبەر ئەوانەی کە گوێڕایەڵینو شوێنی پێغەمبەرەکانی دەکەون لەوەی کە بۆیان هێناون لەو بەسەرهاتانەی کە بۆیان باس کردوونو ئەو فەرمانانەشی کە ئەیدەن بەسەریاندا. زۆر جار خودای گەورە کە باسی لێبوردنی کردوە بە دوایدا هەڕەشەیشی کردوە وەك ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾[2] هەرچەندە خەڵکی ستەمکار بن پەروەردگارت بەخشندەیەو لە تۆڵەیشدا توندو تیژە. وە ئەفەرموێت: ﴿نَبِّئْ عِبَادِىٓ أَنِّىٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٤٩ وَأَنَّ عَذَابِى هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ﴾[3] هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر خۆم لە گوناهان دەبورمو دلۆڤانم. سزاشم زۆر بە ژانە. چەندین ئایەتی تریش هەر بەم شێوەیە باسی هاندانو هەڕەشە کردنی تێدایە، جارێ هانی بەندەکانی ئەدات بۆ خواناسیو باسی بەهەشتیان بۆ دەکات، جارێ تر بانگیان دەکات بۆ لای خۆیو دەیانترسێنی بە باسی ئاگرو سزاو تۆڵە لێ سەندن لێیانو باسی ڕۆژی قیامەت، جاری وایش هەیە باسی هەردوکیان بەیەکەوە دەکات. بۆ ئەوەی هەرکەسە بەپێی خۆی سوود لە هەردوو لایەنەکە وەرگرێ. خودای گەورە لەو کەسانەمان دانێ کە گوێڕایەڵیان کردوە لە فەرمانەکانیداو وازیان هێناوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردوەو هەڕەشەی کردوە لە بارەیەوە. ئەوەیش ، فەرموویەتی بە ڕاستیان زانیوە، بێگومان خودا نزیکەو نزا قبوڵ کەرەو گەورە و زۆر بەخشندەو میهرەبانە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە بە مەرفوعی، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر بڕوادار بیزانیایە خوا چەندە سزای لایە، هەرگیز حەس بەتەمای بەهەشتەکەی نەدەبوو. ئەگەر بێباوەڕیش بیزانیایە خوا چەندە ڕەحمی بەلاوەیە، هەرگیز کەس لە بەهەشتەکەی بێ ئومێد نەدەبوو، خودا سەد ڕەحمی دروست کردوە، یەك ڕەحمی لەنێوان دروست کراوەکانیدا داناوە لەناو یەکدا بەکاری دێنن، نەوەدو نۆکەی تری لەلای خودا

---

[1] مسلم (١/٥٣٤).

[2] الرعد (٦).

[3] الحجر (٤٩–٥٠).

خۆیـەتی)، تیرمیـزی ڕیوایـەتی کردوەوئـەڵێت: فەرموودەیـەکی چاکە. موسلیمیش ڕیوایـەتی کردوە[1] دیسان لە ئەبوهورەیرەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (کاتێ خودا خەڵکی دروست کرد لە کتێبەکەیدا لەسەر خۆی نوسیوەو لای خۆی دانراوە کە: بێگومان بەزەیی من زاڵە بەسەر توڕەیی و قینمدا)[2].

## تەفسیری سورەتی (الاعراف)

## لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الٓمٓصٓ﴾ (ألیف، لام، میم، صاد) لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا ئەوەی پەیوەندی بەم پیتانەوە بوو باسی لێکرا ﴿كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ کتێبێکە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە، واتە: لەلایەن پەروەردگارتەوە. ﴿فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ﴾ خۆت تووشی دڵتەنگی مەکە کە بتپەرستان بڕوا ناهێنن، موجاهیدو قەتادەو سوودی ئەڵێن: گومانت لێی نەبێ[3] وتراویشە: تۆ خۆت نارەحەت مەکە لە گەیاندن و ترساندنی خەڵکی پێی وە لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾[4] تۆش ئەی موحەممەد(ﷺ) وەك پێغەمبەرە لێبڕاوە نەبەزەکان سوربە لەسەر کارەکەت و خۆڕاگر بە. هەر بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿لِتُنذِرَ بِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی ئەو خوانەناسانە بەو قورئانە بترسێنی و ﴿وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئامۆژگاریش بێ بۆ ئەوانەی بڕوای پێ دێنن. پاشان خودای گەورە ڕووی قسەی دەکاتە ئەم خەڵکی دنیایەو ئەفەرموێت: ﴿ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانە کراوەتە خوارەوە شوێنی کەون. واتە: شوێن هەڵسوکەوتی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە (ﷺ) کە بە کتێبێکەوە لەلایەن پەروەردگارو فەرمانڕەوای گشت شتێکەوە هاتۆتە خوارەوە. ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ جگە لە خوا شوێنی

---

[1] أحمد (٢/٣٣٤)، تحفة الاحوذي (٩/٥٢٧)، مسلم (٤/٢١٠٩).

[2] مسلم (٤/٢١٠٧).

[3] الطبري (١٢/٢٩٦).

[4] الاحقاف (٣٥).

سەرپەرستانی دیکە مەکەون. واتـە: لـەوەی کـە پێغەمبـەران بۆیـان هێنـاون دەرمەچـنو بـڕۆن بۆ لای شتانی تر بێجگە لە خودا. ئەگەر واتان کرد ئەوە لە فەرمانی خودا لاتان داوە بۆ لای فـەرمانی غـەیرەز خوا. ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ ئێوە زۆر کەم پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن. وەك لەم ئایەتانەدایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾[1] هەرچـەندە زۆریـش هـەوڵ بدەی ئـەم خەڵکـە زۆربـەیان بـڕوا نـاهێنن. وە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[2] ئەگەر بکەویتە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانە وا لەم سەر زەمینـەدان لـە ڕێگـەی خـوا لات ئـەدەن. وە ئەفـەرموێت: ﴿وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ﴾[3] بەشـی زۆریـان بـڕوا بـە خـوا ناهێنن، هەر دەیانەوێ شەریکی بۆ دابنێن.

﴿وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ۝٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ۝٥ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٦ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ۝٧﴾

### حاڵو گوزەرانی ئەم شارانەی قڕیان تێ خرا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ﴾ ئێمە خـەڵکی چـەندین شارمان قـڕ تێ خست. بەهۆی دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکانمانو بڕوا پێ نەکردنیان، بۆیە خودا ڕسـوای کـردن لـە دنیـاداو زەلیلـیو سەرشۆڕی قیامەتیشیان بەسـەردا دێنـێ. وەك خـودای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا ئەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾[4] بە زۆرێك لە پێغەمبەرانی پێش لە تۆ گاڵتە کراو گاڵتـە کـەران تووشـی کارەکـەی خۆیـان بـوون. وە ئەفـەرموێت: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ﴾[5] چەند شارمان لـە ستەمکاران قـڕ تێخست، داریـان بەسـەر بـەردا درا

[1] يوسف (١٠٣).

[2] الانعام (١١٦).

[3] يوسف (١٠٦).

[4] الانعام (١٠).

[5] الحج (٤٥).

دەوری چاڵاویان (بیریان) چۆڵ کرا، کۆشکی بتەویان تێکدرا. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾[1] چەند شارمان قڕ تێخست (کە خەڵکەکەی) بە خۆشگوزەرانی خۆیان سەرخۆش ببوون، ئەمەیش ماڵەکانیانە کە لە دوای ئەوان (کەمێك نەبێ) کەسیان لێ نیشتەجێ نەبووەو هەر بۆ خۆمان ماوەتەوە. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَجَآءَهَا بَأْسُنَا بَيَٰتًا أَوْ هُمْ قَآئِلُونَ﴾ ئێمە خەڵکی چەندین شارمان قڕ تێخست، وەختێ نیشانەی غەزەبی ئێمەیان بەسەرداهات، لە شەودا بوو یان نیوەڕۆ (لە پشودا بوون) واتە: هی واین بوو کاتێ ئەو سزایان بەسەردا هات شەو بوو یان لە کاتی نیوەڕۆدا، (کە کاتی پشودانە لە ناوەڕاستی ڕۆژدا) هەردوو کاتەکە بێ ئاگایی‌و ڕابواردنە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾[2] ئایا خەڵکی ئەو شارانە نەترسا بوون کە لە شەودا بەڵای ئێمەیان تووش ببێ‌و ئەوان لە قوڵایی خەودا بن؟ یان ئایا خەڵکی ئەو شارانە نەترسا بوون کە لە دەمی چێشتەنگاوداو لە گەرمەی یاری کردندا ئێمە تووشی بەڵایان کەین. وە ئەفەرموێت: ﴿ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِى تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾[3] ئاخۆ ئەوانەی بە فێڵبازی خەریکی بەدفەڕی بوون، بێ باکن لەوەی کە خوا نوقمی زەویان ناکات. یان لە شوێنێکەوە کە هەر بیریشی لێ ناکەنەوە ئازارێکیان بۆ نابارێ؟ یان لە ڕێی هاتۆچۆیاندا بیانگرێ‌و نەتوانن خۆیان دەرباز بکەن؟ یان لە کاتی ترسدا بیانگرێ؟ سا هەر پەروەردەی تۆیە وا دڵسۆزو دڵۆڤانە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ کە دەیانبینی ئێمە غەزەبمان لێ گرتوون، هەر ئەوەندەیان بۆ دەما بڵێن: ئێمە ناهەقیمان لە خۆمان کردو دانیان بە تاوانی خۆیاندا دەنا. وەك کە ئەفەرموێت: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ﴾[4] چەند شارمان وێران کرد، چونکە ئەوانەی کە تێدا بوون ستەمکار بوون (تا دەگاتە) ﴿خَٰمِدِينَ ﴾ واتە: دامان مرکاندن. ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ

---

[1] القصص (٥٨).

[2] الاعراف (٩٧-٩٨).

[3] النحل (٤٥-٤٧).

[4] الانبياء (١١).

وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومـان ئێمـه پرسیار دەکـەین هـەم لەوانـەی پێغەمبـەرمان بۆ ناردوون هـەم لەوانەشی بە پێغەمبەری ناردنمان. وەك ئەم ئایەتانە کە ئەفـەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾[1] هـەر ئـەو ڕۆژە بانگیـان دەکـاتو پێیـان دەڵـێ: چـۆن بـە دەنـگ پێغەمبەرەکانتانـەوە نەچــوون؟ وە ئەفــەرموێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾[2] ڕۆژێ کە خوا هەموو پێغەمبەرەکانی خۆی کۆ دەکاتەوەو ئەفـەرموێ: ئایا چـۆن هـاتن بـە بانگتانەوە؟ دەڵێن: ئێمە هیچ ئاگاداریەکمان نیە، هەر تۆ لە هەموو نەدیاران ئاگاداری. خـودای گـەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیار لەو پێغەمبەرانە دەکات کـە چیان وەڵامـی ئـەو پێغەمبەرانـەیان داوەتـەوە، پرسیاریش لەو پێغەمبەرانە دەکات لەسەر گەیاندنی پەیامەکانی، بۆیە عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی: لە ئیبنوعەبباسـەوە لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتـەدا ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ دەڵێت: (پرسیار لە پێغەمبەران دەکرێ) لەسـەر ئـەوەی کـە گەیاندویانـە[3] ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ ئەوسا ئێمە کە دەزانین هەمووی بە تەواوی بۆ گشت لا باس دەکـەینو هـەرگیز لێیـان بـێ ئاگا نین. ئیبنوعەبباس لەم ئایەتەدا: ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ دەڵێت: لە ڕۆژی قیامەتدا کتێب دادەنرێ هەرچیان کردوە باسی دەکـات.[4] ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـودای گەورە عەبدەکانی ئاگادار دەکات کە چیان گوتوەو چـیان کـردوە، لـە زۆرو کـەم، چـونکە خـودا خـۆی شـایەتە لەسـەر هـەموو شـتێ هیچی لێ ون نیـەو بـێ ئاگـایش نیـە لـە هـیچ شـتێك، بـەڵکو ئاگـای لـە شاراوەکانی ناو دڵو هەستی چاوەکانە ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[5] هەر گەڵایەك لە هەر شـوێنێك بـێ زانینـی ئـەو نـاوەرێ، هەرچی دەنکە لە تاریکی زەویداو هەرچی تەڕە یان وشکە گشتی لەناو دەفتەرێکی ئاشکرایە.

---

[1] القصص (٦٥).

[2] المائدة (١٠٩).

[3] الطبري (٣٠٦/١٢).

[4] الطبري (٣٠٨/١٢).

[5] الانعام (٥٩).

﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾﴾

**باسی هەڵسەنگاندنی کردارەکان**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ﴾ هەڵسەنگاندنی بەڕاستی لەو ڕۆژەدا ڕوونـەدات ئـەو کەسـانەی تـای تـەرازوویان گـران بێـت، ئەوانـە ڕزگارەکـانن، ئـەو کەسانەشـی کردوەیان لە هەڵسەنگاندندا سـووك بێـت، زەرەریـان لـە خۆیـان داوە، غـەدریان لـە نیشانەکانی ئێمە کردوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتـە وایـە کـە خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾[1] ڕۆژی.قیامەت چەندین تەرازوو بەرانبەر دەخەینە کار، ئەوسا بە ئەندازەی سەنگی تۆمێ وردیلـەی دانە خـەردەلیش دەخەینـە ڕوو ناهـەقی لـە کـەس نـاکرێ، بەسـە ئێمـە ژمێریـاری کردەوەکانتـان بـین. وە ئەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[2] خودا بە سەنگی مێروولـەی زەردی وردیلەش ناهـەقی لە هـیچ کـەس ناکات. بـەڵام بەرانبـەر بـە هـەر چاکەیەك بیکەن، دوو ئەوەندە پـاداش ئەداتـەوەو سـەرەڕای ئـەو پـاداش دانەش، خـەڵاتی گـەورەیان هەیـــە. وە ئەفـــەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ﴾[3] هەرکەسـێ تـای تەرازووی قورس بوو، تووشی ژیانی خۆی بووە، هەرکەسێکیش لە کێشانە سووکی هێنـا، ئـەوە شـوێنی (هاویە) یە، چۆن زانیوتە لە (هاویە) مەبەس چیە؟ ئاگرێکی زۆر بە تەوژمـە (گەرمـە). وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾[4] هەرکاتێ کە فوو بە کەڵەشاخدا کرا، نە خزمایەتی لە نێوان دەمێنێ‌و نە کەسیان لـە کـەس دەپرسـێ، هەرکەسـیش

---

[1] الانبياء (٤٧).

[2] النساء (٤٠).

[3] القارعة (٦-١١).

[4] المؤمنون (١٠١-١٠٣).

کێشانەی گرانتری بێ، ئەوە دیارە لە ڕیزی ڕزگارەکانە. هەرکەسیش لـە کێشانە کـەمی هێنـا، ئەوانـە دۆڕاوەکانن و لە جەهەنمدا دەمێننەوە تا هەتایە. ئەوەی لە تەرازودا دادەنرێ لە ڕۆژی قیامەتدا هەنـدێ دەڵێن کردارە یا ئەو کردارە عەرەزیش (عرض) بێ، مەگەر خودای گەورە دەیکاتـە شێوەو قـەبارە لـە ڕۆژی قیامەتـدا. بەغـەوی وتـی: لـە شێوەی ئەمـە ڕیوایـەت کـراوە لـە ئیبنوعەبباسـەوە[1]، وەك لـە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە کە سورەتی (بەقەرە)و (ئالی عیمـران) لـە ڕۆژی قیامەتـدا وەك دوو پەڵـە هەور یا وەك دوو سێبەر یا وەك دوو پۆل لە باڵندە کە باڵیان کردوەتەوە دێن[2]، دیسان لەم بارەیەوە لە فەرموودەی سەحیحدا باسی قورئان هاتوە، کە دێت بۆ لای هاوەڵەکەی لە وێنەی لاوێکی ڕەنگ زەردی لاواز پێی دەڵێ: تۆ کێیت؟ دەڵێت: من ئەو قورئانەم کە شەوەکەتم بە بێداری هێشتەوەو ڕۆژەکـەتم بـە تینویەتی هێشتەوە[3] وە هەر لەم بارەیەوە لە فەرمودەکەی بەراء دا هاتوە لە باسی پرسیاری گۆڕەوە: (کە لاوێکی شێوە جوانی بـۆن دێتـە لای ئـەو خاوەنبـاوەڕە، خاوەنباوەڕەکە پێـی دەڵـێ: تـۆ کێـیت؟ دەڵێـت: مـن کـردەوە چـاکەکەتم)[4]، بـە پێـچەوانەشەوە باسـی خوانـەناس و دووڕوویـشی کـردوە. لـە فەرموودەدا هاتوە کە کتێبـی کردەوەکـان دەکێشرێ وەك لـە فـەرمودەی پـسوڵەکەدا لـە بـارەی ئـەو پیاوەی کە دەهێنـرێ نـەوەدو نۆ تۆمارگـەی لـە تـای تـەرازویەکدا بـۆ دادەنـرێ هـەر تۆمارگـەیـەك بـە ئەندازەی ئەوەی چاو بڕ بکات دەبێ، پاشان ئەو پسوڵەیە دەهێنرێ کە (لا إله إلا الله) تێدایە، پیاوەکـە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەم پسوڵەیە چیە لەگەڵ ئەم تۆمارگانـەدا؟ خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: تـۆ ناهەقیت لێ ناکرێ، ئەم پسوڵەیە لـە تـای تەرازوەکـەدا دادەنـرێ. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: (تۆمارگەکان سووك بوون و پـسوڵەکە قـورس بـوو)[5] تیرمیـزیش هـەر بـەم شـێوەیە لـە سـەحیحەکەیدا هێناویەتی. خاوەن کردەوەیش دەکێشرێ وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: (لە ڕۆژی قیامەتـدا پیـاوێکی قەڵەو دەهێنرێ لەلای خوا قورسایی باڵە مێشولەیەکی نیە)، پاشان ئەم ئایەتـەی خوێنـد: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا﴾[6]، [7]ڕۆژی قیامەتیش هیچ سەنگێکیان بۆ دانانێین. لە مناقبی عەبدوڵڵای کوڕی مەسـعودا هاتوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرمووێت: (ئایا سەرتان سوڕ دەمێنێ لە دوو لاقی باریکی عەبدوڵڵا!

---

[1] البغوي (٢/١٤٩).

[2] مسلم (١/٥٥٣).

[3] إبن ماجة (٢/١٢٤٢)، حاکم بە سەحیحی داناوە لەسەر مەرجی موسلیم.

[4] أحمد (٤/٢٨٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] تحفة الاحوذي (٧/٣٩٥).

[6] الكهف (١٠٥).

[7] فتح الباري (٨/٢٧٩).

سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو دوو لاقە لە تەرازودا لە ئوحود قورسترن)[1]، دەکرێ ئەم نیشانانە بخرێنە لای یەك، تا ئەمانە هەموو ڕێك دەرچێ، جارێ کردەوەکان کێشانە دەکرێو جارێ ئەوەی تێیدا هەڵگیراوەو جارێکی تریش ئەوەی کارەکانی کردوە دەکێشرێ، والله أعلم.

﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾﴾

**گشت بەهرەکانی ئاسمان و زەوی بۆ مەردمە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ ئێمە ئێوەمان لەم زەویە جێ کردەوە، هەر لەوێشدا بژێویمان بۆ برینەوە، کەمێکتان شوکرانە بژێرن. خودای گەورە منەت دەکات بەسەر عەبدەکانیدا کە ئەوەی بۆ ڕەخساندون زەوی ببێ بە شوێنی نیشتەجێیان، گەژو ڕووبارو جێو ڕێی بۆ وەدی هێناون تێیداو شتە بەسودەکانیشی بۆ ڕەوا بینیون، هەوریشی بۆ ڕام هێناون بۆ دەرهێنانی بژێوی بۆیان لە زەویدا. وە هۆی گرتنە بەری دەس خستنی ڕۆزیشی بۆ ئاسان کردونو بازرگانی تێدا دەکەنو گشت هۆکارەکان دەگرنە بەر بۆی. لەگەڵ ئەوەیشدا زۆربەیان کەم سوپاسو ستایشی خوای لەسەر دەکەن وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾[2] خۆ ئەگەر بەهرەکانی خوا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێن، بەڕاستی مرۆڤ زۆر ناهەقیکارو سپڵەیە.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾

**بەسەرهاتی سوژدە بردنی فریشتەکان و خۆ بەگەورە زانینی شەیتان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ ئێمە ئێوەمان دروست کردو لە پاشان وێنەمان کێشان، پاشان بە فریشتەمان گوت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەمویان سوژدەیان برد شەیتان (ئیبلیس) نەبێ، ئەو لە ڕیزی سوژدەبەران خۆی جیا کردەوە. خودای گەورە نەوەی ئادەم ئاگادار دەکاتەوە لەو پلەو پایەیە کە لەبەر پلەو ڕێزی ئادەمی باوکیانەوە (سەلامی خوای لێبێ) پێیان دراوەو باسی دوژمنایەتی دوژمنەکەیانی بۆ کردون کە شەیتانەو ئەو حەسودیەی کە پێچاویەتە دڵی بۆ خۆشیانو باوکیشیان

---

[1] أحمد (٤٢٠/١)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[2] إبراهیم (٣٤).

ئادەم. تا خۆیانی لێ لادەن و شوێن ڕێگاکەی نەکەون. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾[1] کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: من مرۆڤم لە قوڕە ڕەشەی ترشاوی وشکەڵاتوو دروس کردەوە. هەر کاتێ ڕێكو پێکم کردو لە گیانی خۆم فووم پێدا کرد، دەبێ یەکسەر سوژدەی بۆ بەرن، فریشتەکان هەموو تێکڕا سوژدەیان بۆ برد جگە لە ئیبلیس ملی نەدا لەگەڵ سوژدە بەرەکان بێ. چونکە کاتێ خودای گەورە بە دەستی خۆی لە قوڕێکی بتەو جێر ئادەمی دروست کرد (سەلامی خوای لێبێ) شێوەی وەك مرۆڤێکی ڕێكو پێك پێکهێنا لە گیانی خۆی فووی پێداکرد، فەرمانی دا بە فریشتەکان سوژدەی بۆ بەرن بۆ ڕێز لێنان لەو کارەی خودای گەورە، هەموویان گوێڕایەڵ بوون و ملیان بۆ کەچ کرد جگە لە شەیتان ملی نەدا لەگەڵ سوژدەبەرەکان بێ. لە پێشەوە قسە لەسەر شەیتان کرا لە سورەتی بەقەرەدا. بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست پێی ئادەمە (سەلامی خوای لێبێ) کە بە جەمع هێناویەتی لەبەر ئەوە ئادەم باوکی گشت ئادەمیانە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت بە نەوەی ئیسرائیل لە زەمانی پێغەمبەردا(ﷺ). ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾[2] هەورمان کردە سێبەر بەسەرتانەوەو گەزۆو مەلی شەیلاقەشمان بۆ ناردن. مەبەست پێی لێرەدا ئەو باب و باپیرانەیان بوە لە زەمانی مووسادا (سەلامی خوای لێبێ) ژیاون، بەڵام لەبەر ئەوەی مننەتێك بووە بەسەر باب و باپیرانیانەوە کە ئەوان ئەسڵن، وای لێ هاتوە، وەك ئەوە بۆ وەچەکانیان بوە، ئەمە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾[3] ئێمە مرۆڤمان لە قوڕێکی خۆشە کراو دروست کرد. مەبەست پێی لێرەدا ئادەمە کە دروست کراوە لە قوڕی خۆشە کراو، وەچەکەیشی لە تنۆکی ئاو دروست کراوە. ئەمەش ڕاستە چونکە مەبەست بە ﴿خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾ جنسی مرۆڤە. نە کەسێکی دیاری کراو. والله أعلم.

﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾

خوای گەورە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾ کە فەرمانم پێدای، لەبەرچی تۆ سوژدەت نەبرد؟ وتی: من لەو چاکترم، منت لە ئاگر دروست

[1] الحجر (٢٨-٢٩).

[2] البقرة (٥٧).

[3] المؤمنون (١٢).

کردو ئەووت لە قوڕ دروست کردوە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ﴾ واتە: چی تەنگاوی کردیو زۆری پێ هێنایی‌و ناچاری کردی کاتێ کە فەرمانم پێدای سوژدە بەری ئەم قسەیە، قسەی ئیبنوجەریرە زۆر بەهێزو چاکە والله أعلم. وە ئەو قسەی شەیتانە (لەعنەتی خوای لێبێ) ﴿أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ لەو بەهانەیە بوو لە تاوانی گەورەترە، چونکە سەرپێچی لەو فەرمانە کرد، بەلایەوە وا بوو کە فەرمان ناکرێ بە کەسێکی پەسەند سوژدە بەرێ بۆ کەسێکی ناپەسەند. واتە: چۆن دەبێ من لەو چاکترم فەرمانم پێدەکەی سوژدە بۆ ئەو ببەم؟ پاشان ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو لە ئادەم چاکترە، لەبەر ئەوەی ئەم لە ئاگر دروست کراوەو ئاگر بەڕێزترە لەوەی ئادەمی لێ دروست کراوە کە قوڕە. ئەو خوا خراپ بۆ کردوە سەیری سەرچاوەی توخمەکەی کردوە، سەیری ئەو ڕێزە گەورەیەی نەکردوە، کە خودای گەورە بە دەستی خۆی ئادەمی دروس کردوەو لە گیانی خۆیشی فووی پێدا کردوە. چونکە ئەو پێوانەیە ئەو کردویەتی پێوانەیەکی زۆر خراپە بەرانبەر دەقێك کە خودا گەورە ئەفەرمووێت، ﴿فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد، ئەو لە نێوان ئەو فریشتانەدا خۆی تەرە نەکردو سوژدەی نەبردو بێ هیوا بوو لە ڕەحمەتی خواو تووشی هەڵە بوو، خوا ڕووی ڕەش کرد بەو پێوانەی کە کردی. بانگەشەکەی ئەوە بوو کە ئاگر بەڕێزترە لە قوڕ، بێگومان قوڕ سەنگین‌و هێمن‌و نەرم‌و نیان‌و خۆڕاگرترەو شوێنی ڕووەك‌و نەش‌و نما کردنی‌و چاکە کاریە. ئاگریش کاری سوتاندن‌و زەبرو زەنگ‌و پەلە پەلە. هەر بۆیە شەیتان ڕەگەزەکەی خەیانەتی لێ کرد، ئادەمیش ڕەگەزەکەی بەهرەمەندی کرد، پەشیمان بووەوەو گەڕایەوەو زەلیلی خۆی دەرخست‌و ملی کەچ کردو سەری دانەنواند بۆ فەرمانی خودای گەورە و دانی نا بە تاوانەکەیداو دوای تەوبەو لێخۆشبوونی کرد. لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (فریشتەکان لە ڕوناکی دروست کراون، ئیبلیس لە بڵێسەی (ئاگری) بێ دووکەڵ دروست کراوە. ئادەمیش لەوە دروس کراوە کە بۆتان باس کراوە)[1] واتە: لە قوڕ.

### یەکەم کەس کە پێوانەی کرد ئیبلیس بوو

ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنەوە لەم ئایەتەدا: ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ﴾ منت لە ئاگر دروست کردوەو ئەویشت (واتە ئادەم) لە قوڕ دروس کردوە. وتی: شەیتان پێوانەی کرد، ئەو یەکەم کەس بوو

[1] مسلم (٤/٢٢٩٤).

پێوانەی کرد[1] سەنەدەکانی ڕاستن، ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوسیرینەوە، وتی: یەکەم کەسێ پێوانەی کرد ئیبلیس بوو. خۆرو مانگیش کە پەرستراوە هەر بە پێوانە بوە[2] سەنەدەکانی ئەمیش ڕاستن.

﴿ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ ﴾

خـودای گـەورە بـە فـەرمانێکی (قـەدەری و کـەونی) گفتوگـۆ لەگـەڵ ئیبلـیس دەکـات و ﴿ قَالَ ﴾ ئەفـەرموێت: ﴿فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ لێـرە بـڕۆرە خـوارەوە، لـەم شـوێنەدا بـۆت نیـە بەسەر کەسدا فیز بنوێنی، واتە: بەهۆی سەرپێچیت لە فەرمانی منو دەرچوونت لە گوێڕایەڵیم، تۆ ئیتر بۆت نیە فیز بنوێنی بەسەر کەسدا لێرەدا. زۆرێ لە زانایانی تەفسیر دەڵێن: ئـەو زەمـیرە لـە ﴿فِيهَا﴾ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەهەشتە. هەڵیش دەگرێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو پلەو پایەی کە شەیتان تێیدا بـوو لـە (مەلەکوتی ئەعلا) دا: ﴿فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ سا دەرچۆ لەم شـوێنەدا، تـۆ لـە سـووكو ڕسـوایانی. خودای گەورە بە پێچەوانەی نیازیەوە سەودای لەگەڵدا کرد، پاداشتیشی بە دژی مەبەستیەوە دایـەوە. ئا لەو کاتەدا ئەم بەر لەعنەتیە هەستی کرد (چی لە خۆی کردوە) داوای مۆڵەتی لە خودای گەورە کـرد تا ڕۆژی قیامەت ﴿ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ شەیتان وتـی: تـا ڕۆژی قیامـەت دێ، مـاوەم بـدە. ﴿قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾ خودای گەورەش فەرمووی، وا تۆ لە ماوە دراوەکانی. خودای گەورە داواکـەی قبـوڵ کرد، دیارە خودا لەوەداو (لە هەر شتێکدا بیـەوێ بیکـات) مـەیلو ئـارەزوی خۆیـەتیو کـەس ناتوانێ دژایەتی بکاتو لەبەریدا بوەستێو دەس بخاتە فەرمانیو لێپرسینەوەشی زۆر پەلەیە.

﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾

خودای گەورە باسی شەیتان دەکات کاتێ مۆڵەتی پێدرا ﴿إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تـا ڕۆژی قیامـەت، دڵنیـا بوو دەسـتی دایـە لاسـاریو سەرپێـچی کـردو ﴿ قَالَ﴾ وتـی: ﴿فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ چونکە لە ڕێت لادام، منیش بۆیان دادەنیشم، ڕاستە ڕێی تۆیان لێدەگرم. ئیبنوعـەبباس ئـەڵێت: چـۆن گومڕات کردم[3]، کەسانی تریش وتویانـە: چـۆن لـەناوت بـردم منـیش دادەنیـشم بـۆ ئـەو عەبدانـەی کـە

---

[1] الطبري (١٢/٣٢٨).
[2] الطبري (١٢/٣٢٨).
[3] الطبري (٣٣٢).

دروستت کردون لە وەچەی ئەو کەسەی لەبەر ئەو منت دور خستەوە راستە رێی تۆیان لێدەگرم، واتە: رێی هەق‌و ڕزگاری. لایان ئەدەم لەو ڕێگەیە بۆ ئەوەی تۆ نەپەرستن‌و بە تەنیات نەزانن لەبەر ئەوەی کە تۆ منت گومڕا کرد، موجاهید وتی: ﴿صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: ڕێگەی ڕاستی تۆ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سبرەی کوڕی ئەبوفاکیهەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەیفەرموو: (بێگومان شەیتان بە چەند ڕێگا لە ڕێگاکانی خۆی دانیشتوە بۆ ئەوەی ئادەم، بۆی دانیشتوە لە ڕێگەی ئیسلامداو دەڵێ: ئایا تۆ موسوڵمان دەبی‌و واز لە ئاینی خۆت‌و باب‌و باپیرانت دێنی؟ فەرمووی: بە گوێی نەکردوەو موسوڵمان بوە. فەرمووی: لە ڕێگای کۆچ کردنەوە بۆی دانیشوە دەڵێ: ئایا تۆ کۆچ دەکەی‌و زەوی‌و ئاسمانەکەت بەجێ دێڵی؟ بێگومات وێنەی کۆچەری وەك ئەو ئەسپە وایە کە پەتی بۆ شل کرابێ تا بلەوەڕێ. بە گوێی نەکردوەو موسوڵمان بوە پاشان لە ڕێگەی جیهادا بۆی دانیشتوە، کە جیهادی گیان‌و ماڵە، پێی دەڵێ: شەڕ دەکەی تا بکوژرێیت ژنەکەت بدرێ بە شوو سامانەکەت دابەش بکرێ، فەرمووی: بە گوێی نەکردوەو جیهادی کردوە. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ)پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێ لەوانە ئاوای کرد، ئەوە پێویستە لەسەر خوا کە بیخاتە بەهەشت، وە ئەگەر کوژرا پێویستە لەسەر خوا کە بیخاتە بەهەشت، ئەگەر خنکا (لە ئاودا) پێویستە لەسەر خوا بیخاتە بەهەشت، وە ئەگەر وڵاغەکەی خستی‌و ملی شکا پێویستە لەسەرخوا کە بیخاتە بەهەشت)[1]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ﴾ پاشان لە پێش‌و پاشەوە بۆیان دەچم. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ﴾ تووشی گومانیان دەکەم بە ڕۆژی دواییان ﴿وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ هانیان ئەدەم بۆ دنیایان ﴿وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ فەرمانی ئاینەکەیان لێ دەشێوێنم ﴿وَعَن شَمَآئِلِهِمۡ﴾ گوناهەکانیان لا ئارەزومەند (شیرین) دەکەم.[2] مەبەست پێی هەموو ڕێگاکانی خێرو شەڕە، ڕێیان لێ دەگرێ لە چاکەو خراپەیان لا خۆشەویست دەکات. حەکەمی کوڕی ئەبان گوتی: لە عیکرمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡ﴾ پاشان لە پێش‌و پاشەوە بۆیان دەچم، ڕاست‌و چەپیشیان لێ دەگرم. شەیتان نەیوتوە لە سەریشیانەوە، چونکە لە سەریانەوە ڕەحمەت دێت.[3] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ﴾ جا دەبینی زۆربەیان شوکور نەکەن.

---

[1] أحمد (٤٨٣/٣)، سەنەدەکانی خراپ نی یە.

[2] الطبري (٣٣٨/١٢).

[3] الطبري (٣٤١/١٢).

وتی: یەکخواپەرست نەبن[1] ئەمە قسەی شەیتانە خەیاڵو بۆچوونێ بوو کردی. بەڵام لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا ڕێدەکەوێ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴾[2] شەیتان کە گومانی سەبارەت بەوان ڕاست گەڕا، شوێنی کەوتن، هەر کۆمەڵێ لە باوەڕدارەکانیان مان. شەیتان نەیدەتوانی بەسەریاندا زاڵ بێ، تەنیا بۆ ئەوە بوو بزانین کێ بڕوای بە قیامەت هەیەو، کێش لەواندا لێی دوودڵە، پەروەردەت چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا. هەر بۆیە لە فەرموودەکەی پەنا گرتن بە خوا (الاستعاذة) لە زاڵ بوونی شەیتان بەسەر مرۆڤ لە هەموو لایەکیەوە هاتووە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی: هیچ کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) وازی لەم دوعایانە نەهێناوە لە کاتی بەیانیو شەویدا: (ئەی خودایە من داوای لەش ساغیت لێدەکەم لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا، ئەی خودایە من داوای لێبوردنو تەندروستیت لێدەکەم لە ئاینمداو لە دنیامداو لە کەسو کارمداو لە ماڵمدا، ئەی خودایە عەیبەکانم داپۆشە، دڵنیام کە لە ترسەکانم. ئەی خودایە پارێزگاریم لێ بکە لە پێشەوەو لە پاشمەوە، لەلای ڕاستمەوەو لەلای چەپمەوە، لە سەریشمەوە، پەنا دەگرم لە گەورەیی تۆ کە لەناو بچم بە ڕۆچونم بە ناخی زەویدا)، وەکیع ئەڵێت: من تحتي، واتە: بە ڕۆچونم بەناو زەویدا.[3] ئەبوداوودو نەسائیو ئیبنوماجەو ئیبنوحیبانو حاکیم ڕیوایەتیان کردوە،[4] حاکیم ئەڵێت: سەنەدەکانی ڕاستن.

﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾

خودای گەورە جەخت لەسەر نەفرەت لێکردنو دەرکردنو دورخستنەو تەرە کردنی شەیتان دەکات لەو شوێنەی کە (مەلەئی ئەعلا) بووە. ﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ﴾ فەرمووی: لێرە بڕۆ دەرێ زەمکراو ترۆ کراو دەبن. ئیبنوجەریر ئەڵێت: (المذموم) واتە: ناو زراو. (المدحور) واتە: دور خراوەو دەرکراو[5]، عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: (المزؤوم و المذموم) ئەوەی ئێمە

---

[1] الطبري (١٢/٣٤٢).
[2] سبأ (٢٠-٢١).
[3] أحمد (٢/٢٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[4] أبوداود (٥/٣١٥)، النسائي (٨/٢٨٢)، إبن ماجة (٢/١٢٧٣)، إبن حبان (٢/١٥٥)، الحاكم (١/٥١٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[5] الطبري (١٢/٣٤٢).

بیزانین هەر یەك شتە[1] سوفیانی سەوری وتی: لە ئەبوئیسحاقەوە لە تەمیمیەوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَدْحُورًا﴾ وتی: واتە: بێزارو قێزەون[2] عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: بچوكو قێزەون[3]، سوودی ئەڵێت: دوورخراوەو دەرکراو.[4] قەتادەئەڵێت: نەفرەت لێکراو بێزراو[5] موجاهیدئەڵێت: شاربەدەرو دەرکراو[6] ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: ﴿مَذْءُومًا﴾ شار بەدەر کراو ﴿مَدْحُورًا﴾ بە سوك سەیر کراو[7] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی شوێنی تۆ دەکەون جەهەنمتان لێ پڕ دەکەم. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾[8] ئەڵێت: بڕۆ سا هەر کەسێ لەوان شوێنی تۆ بکەوێ، سزای هەمووتان دۆزەخەو سزایەکی پڕ بە پڕە. هەرکەسێ تۆ پێی دەوێری بانگی بکەو هانی بدەو بە سوارو پیادەی خۆتەوە بکە سەری‌و ببە بە هاوبەش لە ماڵ‌و سامانەکانیاندا، بەڵێن بدە پێیان، بەڵێنی شەیتان تەنیا هەر خەڵەتاندنە، تۆ بەسەر بەندەکانی مندا هیچ دەستەلاتێکت نیە، پەروەردگارت بریکاریانە (وەکیلیانە) بەسیانە.

﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ﴿٢١﴾﴾

---

[1] الطبري (٣٤٤/١٢).
[2] الطبري (٣٤٤/١٢).
[3] الطبري (٣٤٣/١٢).
[4] الطبري (٣٤٣/١٢).
[5] الطبري (٣٤٣/١٢).
[6] الطبري (٣٤٣/١٢).
[7] الطبري (٣٤٤/١٢).
[8] الاسراء (٦٣-٦٥).

خـوداى گەورەئەفـەرموێت: ﴿وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا﴾ ئەی ئادەم تۆش و ژنەكەشت لە بەهەشت نیشتەجێ بن، لە هەر كوێدا هەرچی دەخۆن بە ئارەزوی خۆتان بیخۆن، هەر نزیكی ئەو دارە مەكەون، دەنا ئێوە لە ناهەقیكاران دەبن. شەیتان كەوتە بن كلێشەیان تا ئەو ئەندامەیان كە داپۆشرا بوو بێنێتە بەر چاویان، خودای گەورە باسی ئەوە دەكات كە رێیدا بە ئادەم و (سەلامی خوای لێبێ) هاوسەرەكەی حواو بچنە ئەو بەهەشتەو لە گشت بەروبومەكانی بخۆن جگە لە یەك دار نەبێ، لە پێشەوە لە سورەتی بەقەرەدا لەو بارەیەوە دواین. لەو كاتەوە شەیتان حەسوودی پێ بردن، هەوڵی ئەدا بە فێڵ و تەڵەكە كەوتە بن كلێشەیان، بۆ ئەوەی ئەو ژیانە خۆش و ئەو بەهرە زۆرەی كە پێیان درا بوو نەی هێڵێ و ئەو جلو بەرگە چاكەی كە پۆشابویان لەبەریان داكەنێ. ﴿وَقَالَ﴾ درۆو بوختانی كرد وتی: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ﴾ خودا كە نەیدەهێشت لەو دارە نزیك ببنەوە، هەر لەبەر ئەوە بوو كە ئێوە نەبنە فریشتەیان هەمیشە هەر لە بەهەشتدا بمێنن. ئەگەر ئێوە لەو دارەتان خوارد بێگومان ئەو دوو شتە بەدەس دێنن واتە: (دەبنە فریشتەو هەمیشەیش لەناو بەهەشتدا دەمێننەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ﴾[1] شەیتان گوتی: دەتەوێ داری هەرمانت پێ بڵێم و مولك و دەستەڵاتی هەر دوایی نەیە؟ ﴿وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ سوێندی بۆ هەردوكیان خوارد كە: من بە دڵ ئامۆژگاریتان دەكەم. وە من لە پێش ئێوەدا لێرەدا بوم و شارەزای ئەم شوێنەم. واتە: بە خوا سوێندی بۆ خواردن كە هەرچی دەڵێ ڕاست دەكات. تا هەڵیخەڵەتاندن، دیارە خاوەنباوەڕ دەخەڵەتێنرێ بە سوێند خواردن بە ناوی خوا، واتە: بڕوا دەكات بەو سوێنە، قەتادە ئەڵێت لەم ئایەتەدا: سوێندی خوارد بە خوا كە من لە پێش ئێوەدا دروس كرام وە من لە ئێوە شارەزا ترم، شوێنی من بكەون و شارەزاتان دەكەم.

﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾

---

[1] طه (١٢٠).

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ فریوی دانو تەماحی خستە بەریان لە دوای ئەوەی لە بەری دارەکەیان چەشت، عەیبو عاریان کەوتە دەر، هەوڵیان دا بە گەڵای بەهەشت دایپۆشن پەروەردگار بانگی کردن، ئاخر من بە ئێوەم نەگوت توخنی ئەم دارە مەکەون؟ پێشم نەگوتبوون بە ئاشکرا شەیتان دوژمنی ئێوەیە؟ وتیان: ئەی پەروەردگارمان، ناهەقیمان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبوریو بەزەییت پێماندا نەیە، بێگومان لە زیانبارانین. لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) پیاوێکی بالاّ بەرز بووە وەك دارخورمایەکی بەرز، قژی سەریشی زۆر بووە، کاتێ کە ئەو کارەساتەی بەسەردا هاتو تووشی ئەو هەڵەیە بوو، عەیبو عاری خۆی لێوە دەرکەوت، کە ئەوسا نەیدەبینی، هەڵسا ڕابکات لەو بەهەشتە، دارێ لە دارەکانی بەهەشت گیرایە سەری، وتی بە دارەکە: بەرم بدەکە، ئەویش وتی: من بەرت نادەم، پەروەردگاری بانگی کرد: ئەی ئادەم لە من ڕادەکەی؟ وتی: ئەی پەروەردگارم من شەرم لە تۆ دەکەم.[1] ئیبنوجەریرو ئیبنومەردەوەیهی لە چەند ڕێگاوە ڕیوایەتیان کردوە لە حەسەنەوە لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە مەرفوعی[2] بەلام بە مەوقوفی سەنەدەکانی ڕاستترە. لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾ هەوڵیان دا بە گەڵای بەهەشت خۆیان دایپۆشن. وتی: گەڵای هەنجیر بووە.[3] موجاهیدئەڵێت: هەوڵیان دا بە گەڵای بەهەشت وێنەی جلو بەرگ خۆیان داپۆشن[4] وەهەبی کوڕی مونەببیە لەم دەقەدا کە ئەفەرموێت: ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا﴾ تا جلو بەرگی لەبەرزدا داڕنین، وتی: پۆشاکی ئادەمو حەوا ڕوناکیەك (نور) بوو بەسەر عەیبیانەوە، ئادەم عەیبی حەوای نەدەبینیو حەوایش عەیبی ئادەمی نەدەبینی، کاتێ کە لەو دارەیان خوارد عەیبو عاریان کەوتە دەر[5] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە بە سەنەدێکی ڕاست. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە قەتادەوەئەڵێت: ئادەم وتی: ئەی پەروەردگارم چۆنە بەلاتەوە ئەگەر پەشیمان

---

[1] الطبري (١٢/٣٥٤).

[2] الطبري (١٢/٣٥٢).

[3] الطبري (١٢/٣٥٤).

[4] الطبري (١٢/٣٥٣).

[5] الطبري (١٢/٣٥٥).

بومەوەو داوای لێبوردنم کرد. فەرمووی: ئەو کاتە دەتخەمە بەهەشت. بەڵام شەیتان داوای تەوبەی لە خوا نەکرد، بەڵام داوای ماوە پێدانی لێکرد، هەریەکێ لەوانە داوای چی کرد خوا پێی دا[1] زەححاك لەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ناهەقیمان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبوریو بەزەییت پێماندا نەیە، بێگومان لە زیانبارانین. وتی: ئەو وتانە بوو کە ئادەم لەلایەن پەروەردگاریەوە پێی گەیشت[2].

﴿قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾﴾

**دابەزینیان بۆ سەر زەوی**

﴿قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ خودا فەرمووی: دەسا هەر ئێستا هەموتان داگەڕێنە خوارێو ئێوە دوژمنی یەکترین. وتراوە مەبەست بە ڕووی ئەم وتەیە ﴿ٱهْبِطُوا۟﴾ دابەزن، ئادەمو حەواو شەیتانو مارە، هەشیانە باسی ماری نەهێناوە. والله أعلم. دیارە مەبەست بە (العداوة) دوژمنایەتی ئادەمو شەیتانە. هەر بۆیە خوادی مەزن لە سورەتی (طە) فەرموویەتی: ﴿ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا﴾[3] هەردوکتان سەر بەرەو ژێر دابەزنە خوارێ. حەوا لەگەڵ ئادەمەو ماریش، ئەگەر باسەکەی ڕاست بێ لەگەڵ شەیتانایەو زانایانی تەفسیر باسی ئەو شوێنانەیان کردوە کە هەریەکەیان دابەزیوە تێیدا، بەڵام پوختەی ئەو باسانە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ ئیسرائیلیات، خودا خۆی دەزانێ ڕاستە یا نا. خۆ ئەگەر لە دیاری کردنی ئەو شوێنانەدا سودێك هەبوایە بۆ مەردم لەبارەی کاروباری دینو دنیاوە بێگومان خودای گەورە باسی دەکرد لە کتێبەکەیداو پێغەمبەریش (ﷺ) هەر باس دەکرد. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ تا ماوەیەك جێگاو شوێنی ژیانتان لە زەوی دابێ. واتە: جێگاو ئاوەدان کردنەوەی زەویتان پێدراوە تا کاتێکی دیاری کراو، قەڵەم نوسیویەتیو قەدەر ئاماری کردوەو ڕیزیش کراوە لە کتێبی یەکەمدا. ﴿قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾ فەرمووی: لەوێدا دەژینو لەوێش دەمرن، هەر لەوێش دەردەهێنرێن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەیە وایە کە دەفەرموێت:

---

[1] عبدالرزاق (٢/٢٢٦).

[2] الطبري (١٢/٣٥٧).

[3] طه (١٢٣).

﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾[1] لە زەوی وەدیمان هێنان، دیسان دەتانخەینەوە ناوی‌و جارێکی تر هەر لەوێ دەرتان دێنینەوە. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە زەمینی کردە زێدی پێغەمبەر ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) لە ژیانی دنیادا، ژین‌و مردن‌و گۆڕیشیان هەر لەوێیە وە هەر لەوێشدا زیندوو دەکرێنەوە بۆ ڕۆژی قیامەت، کە خودا لە یەکەمین کەسەوە تا دواین کەسیان تێیدا کۆ دەکاتەوە، هەرکەسەو بەپێی کردارەکانی پاداشتی خۆی وەردەگرێ.

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾

**ناردنی جل‌و بەرگ‌و پۆشاکی جوانیش لەگەڵیدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم ئێمە جل‌و بەرگی وامان دانێ کە عەیب‌و عارتان داپۆشێ‌و جوانیشتان کات، چاکتر لەویش پۆشاکی خۆپارازتنە، ئەمەیش یەکێ لە نیشانەکانی خوایە بەڵکو بیر بکەنەوە. خودای گەورە مننەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا کە جل‌و بەرگ‌و پۆشاکی جوانی پێداون، ئەم جل‌و بەرگە کە لێرەدا باس کراوە بۆ داپۆشینی عەیب‌و عارە، (الريش) پۆشاکی خۆ جوان کردنی دەرەوەیە. یەکەمیان بۆ پێویستی‌و ناچاریەو دووهەم بۆ پۆشاکی دەرەوەو خۆ ڕازاندنەوەیە. ئیبنوجەریر ئەڵێت: (الريش) لە زمانی عەرەبیدا، پۆشاک‌و کەل‌و پەل‌و ئەو پۆشاکانەیە کە لە سەرەوە لەبەر دەکرێ‌و دیارە[2] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ واتە: لە خوا بترسێ عەیبی داپۆشێ ئا ئەوەیە پۆشاکی خۆ پاراستن[3].

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

**ترساندن لە فیتنەی شەیتان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ

---

[1] طه (٥٥).

[2] الطبري (١٢/٣٦٤).

[3] الطبري (١٢/٣٦٨).

لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ئەی فەرزەندەکانی ئادەم، شەیتان نەتانخەڵەتێنێ، هەروەك باوك و دایکتانی لە بەهەشت بە دەرکردن داو جلو بەرگی لێ داڕنین تا شەرمی خۆیانیان پێیان نیشان بدات، شەیتان و دەستەو بەستەکەی لەلایەکەوە دەتان بینین کە ئێوە ئەوان نابینن، ئێمە شەیاتینەکانمان کردۆتە دۆستی ئەوانەی بڕوایان بە خوا نیە. خودای گەورە لێرەدا نەوەی ئادەم دەترسێنێ لە شەیتان و دارو دەستەکەی، ئەو دوژمنایەتیەی کە لە دێر زەمانەوە لەگەڵ باوکی ئادەمیزاد ئادەمە (سەلامی خوای لێبێ) کردویەو هەوڵی دا تا دەری کرد لەو بەهەشتەی کە شوێنی خۆشگوزەرانی بوو بۆ شوێنی شەکەتی و ماندویی، وە بووە هۆی دەرخستنی شەرمی کە لە پێشدا داپۆشرا بوو لێی، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە دوژمنایەتیەکی ئێجگار گەورەی هەیە لەگەڵ ئادەم و ئادەمیاندا ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴾[1] ئایا ئێوە توخمی شەیتان و نەوەکانی، بێ من دەکەن بە دۆستی خۆتان کە بە ئاشکرا دوژمنتانن؟ ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە کە ستەمکاران دەیکەن.

﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ هەر کاتێ کارێ خراپی ئابڕوبەریان لێ ڕوودەدا، دەڵێن: باب و باپیری خۆمان دیوە کە هەر ئاوایان کردوەو خودا فەرمانی پێداوین ئاوا بکەین. موجاهید ئەڵێت: بتپەرستەکان بە ڕووتی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕانەوەو دەیانگوت: دەسوڕێینەوە وەك چۆن دایکمان ئێمەیان بووە، ئەو ژنانە شتێ یان پارچە پەتێکی پانی (قەیاسە) دەنایە سەر عەیبی و دەیوت:

اليوم يبدو بعضُه أو كلّه　　　وما تبدا منه فلا أُحلّهُ

واتە: ئەمڕۆ کە هەندێکی یان هەمووی دەرەوە بێ، لەوە زیاتر بە حەڵاڵی نازانم دەرکەوێ[2]، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ منیش

---

[1] الكهف (٥٠).

[2] الطبري (١٢/٣٧٧).

دەڵێم: عەرەبەکانی جگە لە قورەیش نەدەگەڕان بە دەوری کەعبەدا بەو جلو بەرگەی کە لەبەریاندا بوو. ئەوەیان وا لێك ئەدایەوە کە ئەوان تەواف ناکەن بە جلو بەرگێکەوە کە سەرپێچی خوایان پێوە کردوە. بەڵام قورەیشیەکان کە حومسیان پێ دەووتن: ئەوانە بە جلو بەرگی خۆیانەوە تەوافیان دەکرد. هەرکەسێ جلو بەرگێکی لە حومسیەکان بخواستایە، تەوافی پێوە دەکرد. وە هەرکەسێ جلو بەرگێکی تازەی پێ بوایە تەوافی پێوە دەکردو پاشان فرێی ئەدا کەس بۆی نەبوو بیکاتە ماڵی خۆی. هەرکەسیش پۆشاکی تازەی نەبوایە لە حومسیەکانیش نەخواستایە بە ڕووتی تەوافی دەکرد. زۆرترین ئەو شتانەی کە تەوافیان بە ڕووتی دەکرد بە شەوا دەیانکرد. ئەمەیش شتێك بوو خۆیان دایان هێنا بوو بۆ خۆیانو شوێنی بابو باپیرانیان کەوتبوون لەو کارەیاندا، بڕوایان وا بوو کە کاری بابو باپیرانیان بە فەرمانی خودا بوەو خودا ڕێی پێداون. خودای گەورەیش بێزاری دەربڕی لەو کارەیانو فەرمووی: ﴿وَإِذَا فَعَلُوا فَٰحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾.

**خودا بۆ کاری پیس فەرمان نادات، بەڵکو فەرمانی بە دادپەروەری و دڵسۆزی داوە**

﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! (ﷺ) بڵێ بەو کەسانەی کە ئەو قسانە دەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ پەروەردگارم فەرمان بۆ کاری پیسو خراپ نادات، واتە: ئەو کارەی کە ئێوە دەیکەن خراپو بەدڕەوشتیە خودا فەرمان بەو کارە ناکات. ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئایا ئێوە بە زمانی خوداوە شتێك هەڵدەبەستن کە نایزانن؟ واتە: ئەو قسانە ئەدەنە پاڵ خودا، کە خۆتان نازانن چەندێ ڕاستە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: پەروەردگارم فەرمان بە دادوەری ئەدات، لە هەموو مزگەوتێکدا ڕووتان بەرەو خوا بکەنو بە دڵێکی پاك لێی بپاڕێنەوەو بیپەرستن. واتە: فەرمانی پێداون کە ڕێك ڕاوەستن لە شوێنی خۆیدا، کە بریتیە لە شوێن کەوتنی ئەو پێغەمبەرانەی پشتگیریان لێ کراوە بە موعجیزەکان. وە گوێڕایەڵی ئەو هەواڵانە بن کە لەلایەن خوداوە باسیان کردوە بۆتان، ئەو یاساو ڕێسانەش کە پێی هاتوون بەجێی بێننو بە پاکی خواپەرستی بکەن، چونکە خودای گەورە هیچ کردارێ وەرناگرێ تا ئەو دوو پایەی تیا نەبێ. دەبێ ڕاست بێو لەگەڵ شەرعدا ڕێکەوێ وە دەبێ پاك بێو شیرکی تیا نەبێ.

**مانای دروست بوون و گەڕانەوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ وەك لە پێشدا ئێوەی دروست کرد، بەو شێوەیە دەگەڕێنەوە بۆ لای. ڕای جیاواز هەیە لەسەر مانای ئەم دەقە کە خودای گەورە فەرموویەتی.

ئیبنوئەبی ئەجیج ئەڵێت: لە موجاهیدەوە ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ ئەڵێت: دوای مردنتان زیندوتان دەكاتەوە[1] حەسەنی بەسری ئەڵێت: وەك لە پێشدا لە دنیا ئێوەی دروست كرد، هەر بەو شێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا بە زیندوی دەگەڕێنەوە.[2] قەتادەئەڵێت: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ لە پێشدا دروستی كردن، ئەوان هیچ نەبوون، پاشان ڕۆشتن دیسان دەیانگێڕێتەوە[3] عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم ئەڵێت: یەكەم جار لە پێشدا چۆن دروستی كردن، لە دوایشدا هەر بەو شێوەیە دەیانگێڕێتەوە[4] ئیبنوجەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە، ئەم فەرموودەی كە ئیبنوعەبباس ڕیوایەتی كردوە پشتگیری لە ڕاكەی دەكات، كە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناوماندا هەڵساو ئامۆژگاریەكی كردین ئەیفەرموو: (ئەی خەڵكینە بێگومان ئێوە كۆ دەكرێنەوە بە پێی پەتیو بە ڕووتی قووتیو خەتەنە كراوی ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾[5] هەروەك لە پێشدا دروستمان كردن، دیسان پاش (مردن) دروستان دەكەینەوە، بەڵێنێكە لە ئێمەوەو هەر دەیكەن)[6] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتوە.[7] عەلی كوڕی ئەبوتەلحەئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە: لەم ئایەتەدا: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ﴾ وەك لە پێشدا ئێوەی دروست كرد هەمووتان بۆ لای ئەو دەچنەوە. دەستەیەكیانی شارەزای ڕێگە كردوەو دەستەیەكیش هەر شیاوی گومڕا بوونن. وتی: هەر لە سەرەتاوە خودای گەورە نەوەی ئادەمی بە خاوەنباوەڕو ئەوی تریشی بە خوانەناس دروست كردوە. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾[8] هەر ئەویشە كە ئێوەی وەدیهێناوە. هێندێكتان باوەڕتان پێ نەهێناوە هێندێكیشتان باوەڕتان پێ هێناوە. پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا دەیانگێڕێتەوەو زیندویان دەكاتەوە، وەك چۆن لە سەرەتاوە كۆمەڵێكی بە خوانەناسیو كۆمەڵێكی بە خوانەناس وەدی هێناوە.[9] منیش

---

[1] الطبري (١٢/٣٨٥).
[2] الطبري (١٢/٣٨٥).
[3] الطبري (١٢/٣٨٥).
[4] الطبري (١٢/٣٨٥).
[5] الانبياء (١٠٤).
[6] الطبري (١٢/٣٨٦).
[7] فتح الباري (٦/٤٤٥)، (٨/١٣٥)، مسلم (٤/٢١٩٤).
[8] التغابن (٢).
[9] الطبري (١٢/٣٨٢).

دەڵێم: ئەم قسەیە فەرموودەکەی ئیبنومەسعود پشتگیری لێدەکات لە سەحیحی بوخاریدا. سوێند بەوەی جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەسی واتان هەیە کاروکردەوەی بەهەشتی دەکات تا لە نێوان ئەو بەهەشتدا ئەندازەی گەزێکی دەمێنێ، کەچی نوسراوەکەی پێش دەکەوێت‌و کاروکردەوەی دۆزەخیی دەکات‌و دەچێتە دۆزەخ، هەروەها کەسی واشتان هەیە کاروکرداری دۆزەخیی دەکات، تا بە ئەندازەی گەزێکی دەمێنێ‌و نوسراوەکە پێشی دەکەوێت‌و کاروکردەوەی بەهەشتی دەکات‌و دەچێتە بەهەشتەوە)[1]، منیش دەڵێم، دەبێ نێوان ئەم ئایەتەو ئەم فەرموودەیە یەکخرێ (ئەگەر ئەمە مەبەستە لەم ئایەتەدا)، کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾[2] تۆ هەر ڕوو لەم ئاینە بکەو هەر بەرەو هەق هەنگاو بنێ دینێکی بنەڕەتیەو لە سروشتدا خوا ئەو خەڵکەی هەر بۆ یەکتاپەرستی وەدیهێناوە. ئەوەی لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو منداڵێك کە لە دایك دەبێت لەسەر سروشتی پاك لە دایك دەبێت، پاشان دایك‌و باوکی یا دەیکەن بە جوولەکە یان مەسیحی یان مەجووسی)[3]، وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عەیازی کوڕی حیمارەوە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن ئەفەرموێت عەبدەکانم دروست کردوە بەرەو هەق هەنگاو بنێن شەیاتینەکان هاتوون بۆیان هێناون لە ئاینەکەیان و لایان داون)[4]، شێوە یەکخستن لەم فەرموودەیەدا بەم جۆرەیە کە خودا دروستی کردون بۆ ئەوەی بڕواداریان هەبێ‌و لە حاڵی دووهەمدا خوانەناس، هەرچەندە خەڵکی وا دروست کردوە. هەموو بیناسن‌و بە تەنیا بیپەرستن‌و بزانن کە جگە لەو هیچ پەرستراوێ نیە وەك چۆن پەیمانی لێوەرگرتون لەو بارەیەوە، کردویەتی بە سروشتیان لەگەڵ ئەوەیشدا بڕیویەتیەوە، هی وایان هەیە بەدبەخت دەبێ‌و هی واشیان هەیە بەختەوەر دەبێ. ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾[5] هەر ئەویشە کە ئێوەی وەدیهێناوە، هێندێکتان باوەڕتان پێ نەهێناوەو هێندێکیشتان بە بڕوایە. وە لەم فەرموودەیەدا هاتوە: (هەموو خەڵکی کە بەیانی دەکاتەوە (هەڵدەسێ) فرۆشیاری گیانی خۆیەتی ئازادی دەکات یان گوناهباری دەکات)[6]، بڕیاری خودا

---

[1] فتح الباري (١١/٤٨٦).
[2] الروم (٣٠).
[3] فتح الباري (٣/٢٩٠)، مسلم (٤/٢٠٤٧).
[4] مسلم (٤/٢١٩٧).
[5] التغابن (٢).
[6] مسلم (١/٢٠٣).

براوەتەوە لە دروست کراوەکاندا، چونکە ئەوە ﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾[1] بۆ هەموو شت ئەندازەی داناو ڕێی نیشان داوە ﴿ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾[2] ئەو کەسەیە کە بە هەموو وەدیهێنەرێکی خۆی گشت پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشانداوە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: (هەرکەسێ لە ئێوە لە دەستەی خۆشبەختان بێت ئەوا بەرەو کاری خۆشبەختان دەڕوات ئەوەیش دەستەی بەدبەختان بێت ئەوە بەرەو هەق کاری بەدبەختان دەڕوات)[3]، هەر بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾ دەستەیەکیانی شارەزای ڕێگە کردوەو دەستەیەکیشی هەر شیاوی گومڕا بوونن. پاشان خودای گەورە هۆکارەکەی باس دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ کە ئەوانە لە بری خودا لەگەڵ شەیاتین بوونە دۆست، لایان وایە هەر خۆیان شارەزان. ئیبنوجەریر ئەڵێت: ئەمە ئاشکراترین بەڵگەیە لەسەر هەڵەیی ئەو کەسانەی کە دەڵێن خودا سزای هیچ کەسێ نادات خەریکی گوناهێکەیان گومڕاییە کە بڕوای پێیەتی مەگەر کاتێ کە بزانێ گوناهەو گومڕاییە هەر بەردەوام بێ لەسەری، هەر بیەوێت دژایەتی فەرمانی پەروەرندەی بکات لە کارەکەیدا. بەپێی ئەم قسەیە بێ ئەو کاتە هیچ جیاوازیە نامێنێ لە نێوان دەستەی ئەو گومڕانەی، کە گومڕا بوونو وا دەزانن هەر ئەوان شارەزان لەگەڵ ئەو دەستەی کە شارەزای ڕێگە کراوە، بێگومان خودای گەورە. ناوی هەردوو دەستەکەی هێناوەو بڕیارەکانیشی ڕوون کردونەتەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا[4].

﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾﴾

**فەرماندان بە خۆ ڕازاندنەوە لەکاتی چوون بۆ مزگەوتدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم، کاتێ دەچن بۆ نوێژ کردن جلو بەرگی جوان لەبەر بکەن، ئەم ئایەتە پیرۆزە وەڵامە بۆ ئەو بتپەرستانەی کە بە ڕووتو قووتی تەوافیان بە دەوری کەعبەدا دەکرد. وەك موسلیمو نەسائیو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیان کردوە، ووشەکە ووشەی ئیبنوجەریرە لە فەرموودەکەی شوعبەوە، لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە، لە

[1] الاعلى (٣).
[2] طه (٥٠).
[3] فتح الباري (٣/٢٦٧)، مسلم (٤/٢٠٣٩).
[4] الطبري (١٢/٣٨٨).

موسلیمی بەتینەوە لە سەعدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنوعەبباسەوە:ئەڵێت: بتپەرستەکان تەوافیان دەکرد بە دەوری کەعبەدا بە ڕوتی، پیاوان بەڕۆژو ژنان بە شەو. ژنەکە لەو کاتەدا دەیگوت:

اليوم يَبُدو بعضُه أو كلّهُ          و ما بدا منه فلا أُحله[1]

واتە: ئەگەر ئەمڕۆ هەندێکی یان هەمووی دەرکەوێ، لەوە زیاتر بە حەڵاڵی نازانم دەرکەوێ. عەوفی ئەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ کاتێ دەچن بۆ نوێژ کردن جلو بەرگی جوان لەبەر بکەن. وتی: پیاوان تەوافیان دەکرد بە دەوری کەعبەدا بە ڕووتی، خودا فەرمانی پێدان کە جلو بەرگ لەبەر بکەن. مەبەست بە (الزينة) لێرەدا جلو بەرگە. ئەو جلو بەرگەی کە عەیبیانی پێ داپۆشن، زیادتر لەمە پۆشاکی جوانیو خۆ ڕازاندنەوەیە. خودای گەورە فەرمانی پێکردن لە هەموو نوێژێکدا کە دەچنە مزگەوت خۆیان داپۆشن.[2] موجاهیدو عەتاو ئیبراهیمی نەخەعیو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو سوودیو زەححاكو مالیك هەر وایان گوتوە، لە زوهەریەوە،[3] وە هەندێکی تریش لە زانایانی پێشینە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێن: ئەم ئایەتەیە لەسەر ئەو بتپەرستانە هاتوەتە خوارەوە کە بە ڕووتی تەوافیان دەکرد بە دەوری کەعبەدا. لەم ئایەتەو ئەو فەرموودانەی کە لە مانای ئایەتەدا هاتوون، سونەتە خۆ جوان کردن لە کاتی نوێژدا بە تایبەتی لە ڕۆژی هەینیو لە ڕۆژی جەژنداو بۆنی خۆ خۆش کردنو سیواك کردن، چونکە ئەمانەش لە خۆ جوان کردنەکانەو تەواوکەریەتی. لە چاکترینی جلو بەرگ، جلو بەرگی سپیە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە بە مەرفوعی ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە جلو بەرگەکانتاندا سپی لەبەر بکەن، چونکە لە چاکترین جلو بەرگەکانتانەو مردووەکانتانی پێ کەفن بکەن. چاکترین چاو ڕژتنتان بە کل ڕژتنە (الإثمد) چونکە چاو سافو لووس دەکاتو مویش دەڕوێنێ)[4]، ئەم فەرموودە سەنەدەکانی چاکن، پیاوەکانی لەسەر مەرجی موسلیمە، ئەبوداوودو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە[5].

## قەدەغەکردنی زیادڕەوی لە خۆراكو پۆشاکدا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ خواردن بخۆنو بخۆنەوەو لە ئەندازە دەرمەچن، خودا ئەوانەی خۆش ناوێ لە ئەندازە دەردەچن. بوخاری ئەڵێت: لە

---

[1] مسلم (٢٣٢٠/٤)، النسائي في الكبرى (٣٤٥/٦)، الطبري (٣٩٠/١٢).

[2] الطبري (٣٩١/١٢).

[3] الطبري (٣٩٢/١٢-٣٩٤).

[4] أحمد (٢٤٧/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] أبوداود (٣٣٢/٤)، تحفة الاحوذي (٧٢/٧)، إبن ماجة (٢٦٤/١)، حەسەنە.

ئیبنوعەبباسەوە، هەرچی ئارەزو دەکەی بیخۆو هەرچی ئارەزوو دەکەی لەبەری بکە بەلام دوو ڕەوشت بە هەڵەتان نەبات زیادەڕەوی‌و لە خۆبایی بوون.[1] ئیبنوجەریرئەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەبدولأعلا بۆی گێڕاینەوە، موحەممەدی کوڕی سەور بۆی گێڕاینەوە، لە موعەممەرەوە لە کوڕی تاوسەوە لە باوکیەوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: خودا خواردن‌و خواردنەوەی حەڵاڵ کردوە ئەگەر زیادەڕەوی یان خۆ لە بایی بونی تیا نەبێ[2] سەنەدەکانی ڕاستن. عەتای خۆراسانی ئەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ وتی: واتە: لە خواردن‌و خواردنەوەدا.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبەوە ئەڵێت: لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست ئەیفەرموو: (ئەوەی ئادەم هیچ دەفرێکی پڕ نەکردوە خراپتر بێ لە ورگی چەند پارویە بەسە بۆ ئەوەی ئادەم کە پشتی خۆی پێ بگرێ (يقمن صلبه) ئەگەر هەر خواردی (کردی) سێ یەکی بۆ خواردن‌و سێ یەکی بۆ خواردنەوەو سێ یەکیش بۆ خۆی)[4]، ئەسائی‌و تیرمیزیش ڕیوایەتیان کردوە[5] تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی چاکە. لە ڕەنوسێکی تردا وتویەتی، چاک‌و ڕاستە، ئیبنوجەریر ئەڵێت: خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ بێگومان خودا ئەو کەسانەی خۆش ناوێ لە ئەندازەی خۆیان دەردەچن لە حەلاڵدا یان لە حەرامدا، وە ئەو کەسانەش زیادەڕەوی دەکەن لەو شتانەی کە حەلاڵ یا حەرام کراوە، حەلاڵێ حەرام دەکەن‌و حەرامێ حەلاڵ دەکەن. بەڵکو پێویستە ئەوەی خوا حەلاڵی کردوە بە حەلاڵی بزانن‌و ئەوەیش خوا حەرامی کردوە بە حەرامی بزانن. ئەوە ئەو دادپەروەریی یە کە فەرمانی پێکردوە[6].

﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: کێیە جل‌و بەرگی جوان‌و خشڵ‌و بژێوی پاکی (کە خودا بە عەبدەکانی خۆی داوە) لای وایە حەرامە؟

---

[1] فتح الباري (١٠/٢٦٤).

[2] الطبري (١٢/٣٩٤).

[3] أحمد (٤/١٣٢)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[4] تحفة الاحوذي (٧/٥١)، النسائي في الكبرى (٤/١٧٨)، باشە (جید).

[5] الطبري (١٢/٣٩٤).

[6] الطبري (١٢/٣٩٥).

بلێ: ئەمانە شایانی ئەو کەسانەن کە لە ژیانی دنیادا بڕوایان بە خوا هێناوەو ڕۆژی قیامـەت بەتایبـەتی هەر بۆ ئەوانە، ئێمە ئاوا نیشانەکان بۆ ئەوانەی کە زانا بن ڕۆشن دەکەینەوە. خودای مەزن وەڵامی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە هەر شتێ لە خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگ هەر لە خۆیانەوە قەدەغە دەکەن بێ ئەوەی خودا بڕیاری لەسەر دابێ، بۆیە ئەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ) بلێ بەو بتپەرستانەی کە هەر لە خۆیانەوە شت حەرام دەکەن بە ئارەزوی پیسی خۆیان کە خودا ئەو شتانەی دروست کردوە بۆ ئـەو کەسانەی کە بڕوایان بە خوا هەبوەو لە ژیانی دنیـادا پەرستویانە، با بـت پەرستانیش تێیدا بەشدار بوبن لەبەر خۆشەویستیان بۆ دنیا، بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا هەر بۆ خاوەنباوەڕانە بەتایبـەتیو هـیچ خوانەناسێ ناتوانێ هاوبەشیان بێ. چونکە بەهەشت قەدەغە کراوە لە خوانەناسان.

﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٣٣) ﴾

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ بلـێ: پـەروەردگارم تـەنیا ئەمانـەی حەرام کردوە: کاری خراپ بە ئاشکراو بە نهێنی، بە ناهەق لـە ڕێگـە لادانو گونـاه. بـە هـیچ بەڵگەیـەك شەریك دانان بۆ خوداو قسە کردن دەربارەی خودا بەبێ زانـین. ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردوە لـە عەبدوڵلاوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێ لە خوا بە غیرەتتر نیە هەر لەبـەر ئەوەیە کـە بـەدڕەفتاری حـەرام کـردوە بـە ئاشـکراو بـە نهێنـی. هـیچ کەسیش نیـە لـە خـودا مـەدحو پیاهەڵدانی لەلا خۆشتر بـێ)[1]، لـە هـەردوو سەحیحەکەیشدا هـاتوە[2] لـە پێشەوە باسـی بـەدڕەفتاریو ئەوەی پەیوەندی هەیە پێیەوە، بە نهێنیو بە ئاشکرا لە سورەتی ئەنعامـدا بـاس کـرا پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە. سوودی ئەڵێت: (الاثم) گوناه (البغي) دەست درێژی کردنـە سـەر خـەڵکی بـە ناهەق.[3] موجاهیدئەڵێت: (الاثم) گشت سەرپێچیەکان، خودا باسی کردوە کە دەسـت درێژیکـەر دەسـت درێژیەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.[4] (الاثم) بە کورتی: ئەو تاوانەیە کە پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە کـە کردویەتی. (البغي) واتە: دەست درێژی کردنە سەر خـەڵکی، خـودا هـەردوویانی حـەرام کـردوە. ﴿وَأَن

---

[1] أحمد (١/٣٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٩/٢٣٠)، مسلم (٤/٢١١٤).

[3] الطبري (١٢/٤٠٣).

[4] الطبري (١٢/٤٠٣).

تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾ واتە: شەریك دابنێین بۆ خودا لە پەرستندا بە بێ بەلگە. ﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ شت بلێین لە بارەی خوداوە وەك ئەوەی کە خودا منداڵی هەیە کە هیچ زانیاریەکتان لەو بارەیەوە نیە جگە لە درۆو بوختان کردن. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَـٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ﴾[1] لە چلكو پیسی بتەکان دوورەپەرێز بن، لە درۆش خۆ بپارێزن.

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى ۙ فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ بۆ مەرگی هەر گەلێ وەختێ هەیە ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ ئەگەر وەختی مردنیان هات، ئەساتێ دەکرێ پێش کەون و ئەساتێکیش دوا دەکەون. پاشان خودای گەورە ئەوەی ئادەمی ئاگادار کردۆتەوە ترساندوویەتی کە بەو زوانە پێغەمبەران دەنێرێتە لایان و باسی نیشانەکانی ئەویان بۆ دەکەن، مزگێنیان پێ ئەدەن و دەشیان ترسێنن و ئەفەرموێت: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى ۙ فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم، هەر کاتێ کە پێغەمبەرانێ لە خۆتان دێتە لاتان، تا نیشانەکانی منتان بۆ باس بکەن، ئەوانەتان خۆ پارێزن و ئاکاری چاك دەکەن. نە ترسێکیان لەسەری هەیەو نە خەم دەخۆن. ئەو کەسانەشی نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ زانیوەو بە خۆ بەزل زانی ڕوویان لێ وەرگێڕا ئەوانە کۆمەڵ و یاری ئاگرن و هەرگیز لێی دەرناچن. واتە: ئەوانەی خۆ پارێزو ئاکار چاك بوون و وازیان لە قەدەغەکراوەکان هێناو هەڵسان بە بەجێهێنانی خوا پەرستیەکان نە ترسیان هەیەو نە خەفەت دەخۆن. بەڵام ئەوانەی نیشانەکانی خودایان لە دڵیاندا بە درۆ زانیوەو لەبەر خۆ بەزل ولنی پێی هەڵنەساون و کاریان پێ نەکردوە، هەتا هەتایە لەناو ئاگردان.

[1] الحج (٣٠).

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ ۚ أُولَٰئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ الْكِتَابِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا وَشَهِدُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾

**ئەو بتپەرستە بوختان چیانە، چی لە چارەیان نوسرابێ دێتە ڕێیان، دۆستەکانیان خۆیان لێ ون دەکەن لە کاتی مردندا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ ۚ أُولَٰئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ الْكِتَابِ﴾ کێ لەوانە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن. یا بە نیشانەکانی بڕوا ناکەن؟ ئەوانە چی لە چارەیاندا نوسرابێ دێتە ڕێیان. موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی ئەڵێت: ﴿أُولَٰئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ الْكِتَابِ﴾ ئەوانە چی لە چارەنوسیاندا نوسرابێ دێتە ڕێیان لە کردارو ڕۆزیو تەمەنیان.[1] ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتوە[2] ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ﴾[3] ئەوانەی درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن ڕزگار نابن (ڕابواردنێکی کەمە لە دنیادا، لە دوایدا دەگەڕێنەوە بۆ لامان لە پاش ئەوە، لەبەر ئەوەی بڕوایان نەهێنا بە توندی ئازاریان ئەدەین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾[4] ئەو کەسانەی بڕوا ناهێنن، بڕوا نەهێنانیان غەمبارت نەکات، هەموو دێنە لای خۆمان، پاشان هەواڵیان ئەدەینێ چیان کردوە، خودا ئاگای لە ناوی دڵەکانیش هەیە. وا دەکەین کەمێ ڕابوێرن. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ تا ئەو کاتەی کە فریشتە لەلای ئێمەوە دێتە لایان بۆ گیان کێشان‌و دەپرسن: کوان ئەوانەی جگە لە خوا هاناتان بۆ دەبردن؟ خودای گەورە باسی ئەوە دەکات

---

[1] الطبري (١٢/٤١٣).

[2] الطبري (١٢/٤١٣-٤١٤).

[3] يونس (٦٩-٧٠).

[4] لقمان (٢٣-٢٤).

کاتێ کە فریشتە گیانی بت پەرستەکان دەکێشێ دیانترسێنن و گیانەکانیان بەرەو ئاگر دەبەن، پێیان دەڵێن: کوان ئەوانەی کردبوتان بە هاوبەشی خودا لە ژیانی دنیادا، هاوارتان لێ دەکردن و جگە لە خودا دەتانپەرستن. بانگیان بکەن با ڕزگارتان کەن لەمەی کە تووشتان هاتوە ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾ دەڵێن: خۆیان لێ ون کردین، بە هیوای هیچ خێرو بێرێکیان نین ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾ پاشان هەر خۆیان شایەتی لە خۆیان ئەدەن کە خودایان نەناسیوە.

﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٣٩﴾﴾

### مشتومڕی خەڵکی ناو ئاگرو نەفرەت کردنیان لە یەکتری

خودای گەورە باسی ئەو قسانە دەکات کە بتپەرستەکان دەیکەن، ئەوانەی کە درۆ بە دەم خوداوە دەکەن و بڕوا بە نیشانەکانی ناکەن ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم﴾ دەفەرموێ: لەگەڵ ئەو کەلانەی وا پێش ئێوە لەناوچون. هەمان ڕەفتاری ئێوەیان بوو ﴿مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِ﴾ لە مرۆڤو جنۆکە بڕۆنە ناو ئاگرەوە. ئەم ڕستەیە هەڵدەگرێ بەدەل بێ لە ﴿فِيٓ أُمَمٖ﴾ هەڵیش دەگرێ ﴿فِيٓ أُمَمٖ﴾ واتە: لەگەڵ گەلاندا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَا﴾ هەر ئوممەتێك دەچێتە ناو ئاگر دوعای شەڕو نەفرین لە هاوڕەوشتانی دەکات. وەك خودای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەری ئیبراهیمی خەلیل فەرموویەتی: ﴿ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ﴾[1] پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا حاشا لە یەکتری دەکەن. وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِذۡ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2] لەو کاتەدا کە ئازارو سزایان دێتە بەر چاو، ڕێبەرەکان لە پەیڕەوەکانی خۆیان حاشا دەکەن، پەیوەندیان لە یەکتر پچڕاوە. شوێن کەوتوان دەڵێن: ئای خۆزگە هەر جارێکی تر دەگەڕاینەوە سەر دنیا، تا وەك

[1] العنكبوت (٢٥).

[2] البقرة (١٦٦-١٦٧).

ڕێبەرەکانمان کە حاشامان لێ دەکەن ئێمەش حاشامان لەوان بکردایە، خودا ئاوا کردەوەی خۆیان لێ دەکاتە داخو خەفەت لێیان، بۆ هەمیشەش هەر لەناو ئاگردا دەبنو لێی نایەنە دەر. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ﴾ وەختێ هەموویان لەوێدا کۆ بونەوە پەیرەوانیان سەبارەت بە پەیرەوانیان کە لە پێش ئەواندا چونەتە ناو ئاگرو سزایان سەختو گرانترە لەمان، سکاڵای خۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبەنە لای خوا لێیان، چونکە ئەوانە بوون کە گومڕایان کردنو لە ڕێگەی ڕاست لایانداون دەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابًا ضِعۡفًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەوان سەریان لێ شێواندین، دوو ئەوەندە لە ئاگردا ئازاریان دە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ﴾[1] ئەو ڕۆژەی دەمو چاویان لە ئاگردا ئەم دیو ئەودیوی پێدەکرێ، دەڵێن: خۆزگە بەرفەرمانی خودا بوینایەو گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بکردایە. دەشڵێن: ئەی پەروەردگارمان، شوێن ئاغاو گەورەکانی خۆمان کەوتین، ئەوان ئێمەیان گومڕا کرد. ئەی پەروەردگاری هەموومان، دوو سەرە ئازاریان بدە. ﴿قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ﴾ بۆ هەموو دوو چەندانە بەڵام ئێوە پێ نازانن. دیارە هەر وامان کردووەو هەر کەسە بەپێی خۆی سزامان داوە. ئەم دەقە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ﴾[2] ئەوانەی خوایان نەناسیو ڕێگەی خوایان بەربەست دەکرد، قات لەسەر قات هەر ئازاریان پتر دەکەین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡ﴾[3] باری گرانی خۆیانو باری گرانی خەڵکی تریش (وەك باری گرانی خۆیان) هەڵدەگرن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾[4] لە تاوانی ئەو کەسانەش هەڵدەگرن کە بە بێ زانست ئەوان لە ڕێیان لا ئەدەن. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ﴾ ڕێبەرەکان بە پەیرەوەکانیان دەڵێن: ئێوە

---

[1] الاحزاب (٦٦-٦٨).

[2] النحل (٨٨).

[3] العنكبوت (١٣).

[4] النحل (٢٥).

هیچتان لە ئێمە زیاتر نیە، سوودی ئەڵێت: ئێوەش گومڕا بوون وەك چۆن ئێمە گومڕا بووین.[1] ﴿فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ دە بچێژن ئازاری ئەو كارانەی وا كردوتانە. ئەم حاڵەی كە خودا باسی كردوە لە بارەیانەوە لە كاتی كۆكردنەوەیاندایە لە ڕۆژی قیامەتداو ئەفەرموێت: ﴿(٣١) قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ (٣٢) وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾[2]

خاوەن دەستەڵاتەكان بە بێ دەستەڵاتەكان دەڵێن: ئایا ئێمە بووین نەمانهێشت ئێوە بە ڕێی ڕاستدا بڕۆن دوای ئەوەی ڕێنیشاندەرتان هاتە لا؟ بەڵكو ئێوە هەر خۆتان تاوانبار بوون. ئەوسا بێ دەستەڵاتەكان لە وەڵامی ئەواندا كە خاوەن دەستەڵات بوون دەڵێن: ئێوە بە شەوو ڕۆژ هەر فێڵتان لێ دەكردین كە دەبێ خوانەناسین و چەندین هاوتای بۆ پەیدا كەین، كاتێ بینیان ئێمە خوانەناسان بۆ ئازاردان زنجیریان لە مل دەكەین و ڕایان دەكێشین بۆ لێپرسینەوە، بە دڵ پەشیمان دەبنەوە، دیارە هەموو كەسێ بەرانبەر كردەوەی خۆی سزا ئەدرێ.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ (٤٠) لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ (٤١)﴾

### بێبڕوایان دەرگاكانی ئاسمانیان لێ ناكرێتەوەو هەرگیز ناچنە بەهەشت

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەوانە وا نیشانەكانی ئێمەیان بە درۆ زانیوەو بە فیزەوە لەوانە ڕوویان وەرگێڕا دەروازەكانی ئاسمانیان بۆ ناكرێتەوە. موجاهیدو سەعیدی كوڕی جوبەیر ئەڵێن و عەوفی و عەلی كوڕی ئەبوتەلحەش ڕیوایەتیان كردوە لە ئیبنوعەبباسەوە كە مەبەست بەم ئایەتە: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: هیچ كردەوەیەكی چاك و هیچ دوعایەكیان لە ئاسمانەوە بەرز نابێتەوە.[3] سەوریش لە لەیسەوە لە عەتاوە لە

[1] الطبري (١٢/٤٢٠).
[2] سبأ (٣٢-٣٣).
[3] الطبري (١٢/٤٢٢-٤٢٣).

ئیبنوعەبباسەوە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە.[1] زەححاك ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: مەبەست پێی دەرگاکانی ئاسمان لەسەر ڕۆحەکانیان ناکرێتەوە[2] سوودیو کەسانی تریش هەر وایان وتوە.[3] ئەم فەرموودەیە کە ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) پشتگیریان لێ دەکات کە باسی کێشانی گیانی لە دین لادەرەکانی کردوە. کە بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان فەرمووی: ڕۆحەکان بەرز دەکەنەوە، تێپەڕ نابن بەلای هیچ کۆمەڵێکدا لە فریشتەکان مەگین دەڵێن: ئەم گیانە پیسە کێیە؟ (ئەمانیش) دەڵێن: فلانە کەسە بە ناشیرین ترین ناوێ کە بانگی کراوە پێی ناوی دەهێنن. هەتا دەیگەیەننە ئاسمان داوای کردنەوەی دەرگاکانی دەکەنەوە. بۆی ناکرێتەوە. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ﴾[4]. ئەبوداوودونەسائیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردوە.[5] ئیبنوجورەیج لەم ئایەتەدا: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ﴾ گوتی: دەرگاکانی ناکرێتەوە نە لەسەر کردارەکانیانو نە لەسەر ڕۆحەکانیان[6] ئەمە کۆکردنەوەیەکی تێدایە لە نێوان هەردوو قسەکەی پێشوودا والله أعلم ﴿وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ ناچنە ناو بەهەشتەوەتا وشتر بە کونی دەرزیدا نەچێ ئێمە ئاوا سزای تاوانباران ئەدەین. ئیبنومەسعود گوتی: (الجمل) واتە بەچکەی وشتر. وە لە ڕیوایەتێکدا هاتوە هاوجووتی وشتری مێینە.[7] موجاهیدو عیکرمە وتیان لە ئیبنوعەبباسەوە ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە دەخوێندەوە: (حتى يلج الجُمَّلُ في سمِ الخياط) بە زەمی (الضم) جیمەکەو بە تەشدید کردنی میمەکە واتە: گوریسی قایم بەناو کونی دەرزیدا[8] ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ ڕایەخەکەیان (ئاگرە) لە جەهەنەمداو هالاوی ئاگریش دایپۆشیون. ئەوانەی ناهەقی دەکەن ئاوا سزایان ئەدەین. موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی ئەڵێت: ﴿لَهُم مِّن

---

[1] الطبري (١٢/٤٢٢).
[2] الطبري (١٢/٤٢٢).
[3] الطبري (١٢/٤٢٢).
[4] الطبري (١٢/٤٢٤)، فەرموودەیەکی چاکە، پیاوەکانی جێی بروان، ڕێگەو بەڵگەیش زۆرن لەسەری.
[5] أبوداود (٥/١١٤)، النسائي (٤/٧٨)، إبن ماجة (١/٤٩٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[6] الطبري (١٢/٤٢٣).
[7] الطبري (١٢/٤٢٨).
[8] الطبري (١٢/٤٣١).

جَهَنَّمَ مِهَادٌ﴾ واتە: ڕایەخیان ئاگرە ﴿وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ واتە: لێفەیان هالاوی ئاگرە[1] زەححاك و سوودیش هەر وایان وتوە[2].

﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾

**باسی چارەنوسی پیاوچاکان و گوزەرانیان**

دوای ئەوەی خودای گەورە باسی حاڵی بەدبەختانی کرد، دێتە سەر باسی حاڵی خۆشبەختان و ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناو ئاکاری چاکیان کردوە، (کە هیچ کەسیش ئەرکی لە توانا بەدەری ناخەینە سەر) ئەوانە دەبرێنە بەهەشت و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن. واتە: ئەوانەی بە دڵ بڕوایان هێناوەو ئاکاری چاکیش بە ئەندامەکانی لەشیان بەجێ دێنن ئەمانە دژی ئەو خوانەناسانەن کە بڕوایان بە نیشانەکانی خوا نیەو خۆیان بە زل دەزانن و سەری بۆ نەوی ناکەن. خودای مەزن ئاگادارمان دەکاتەوە کە بڕوا هێنان و ئاکاری چاك کردن پێی ئاسانە هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ﴾ کینەمان لە سینەیانا، داماڵیوەو لە بەهەشتدا جۆباریان بەبەردا دەڕوا. واتە: کینەو حەسوودی لە دڵیان دەردەکەین وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وەختێ باوەڕدار لە ئاگر ڕزگاری بوو لەسەر پردێ لە نێوان بەهەشت و جەهەندا ڕادەگیرێن، هەر ستەمێکیان لە یەکتری کردبێ لە نێوان خۆیاندا لە دنیادا لێیان دەسێنرێ، تا ئەو کاتەی پاك دەبنەوەو دەڕۆن و ئیزن ئەدرێن بۆ چوونە ناو بەهەشت، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەرکەسێ لەوانە شوێنەکەی خۆی لە بەهەشتدا چاکترشارەزایە لەوشوێنەی کە لە دنیادا تێیدا بووە)[3]، سوودی لەم ئایەتەدا: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ﴾ گوتی: کە خەڵکی بەهەشت کاتێ ڕەوانە دەکرێن

---

[1] الطبري (١٢/٤٣٦).

[2] الطبري (١٢/٤٣٦).

[3] فتح الباري (٥/١١٥).

بۆ بەهەشت لە دەرگاکەیدا درەختێ دەبینن لە ڕیشکی دارەکەدا دوو کانی هەیە کە ئاویان خواردەوە لە یەکێکیان هەرچی کینە هەیە لە سینەیاندا دادەماڵێ، ئەوەیە ئاوە پاکەکە (الشراب الطهور) بەوەی تریان کە خۆیانیان لێ شۆردوە لە چارەیان تەڕو تازەیی و خۆشگوزەرانی دەبینی، قژ بڕی و چڵکنیان هەرگیز پێوە نابینی.[1] نەسائی و ئیبنومەردەوەیە ڕیوایەتیان کردوە، لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو خەڵکی بەهەشت شوێنی خۆی لە ئاگردا دەبینیێ و دەڵێ: ئەگەر خودا شارەزای نەکردمایە لەناو ئاگردا دەبووم دەبێتە سوپاسگوزاری بۆی. هەموو خەڵکی ئاگر شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینیێ و دەڵێ: ئەگەر خودا شارەزای بکردمایە (لەناو ئاگردا نەدەبووم) دەبێتە داخ و خەفەت بۆی)[2]، هەر بۆیە کاتێ بوونە میراتگری خەڵکی ناو ئاگر لە بەهەشتدا، بانگ دەکرێن ئا ئەو بەهەشتەی کە بوونە میراتگری بەهۆی ئەو کردەوانەوە بووە کە کردوتانە. واتە: بەهۆی کردارەکانتانەوە ئەو بەزەییەتان بەدەست هێناو چوونە بەهەشت وە بەپێی کردارەکانتان شوێنی خۆتان وەرگرت، لەبەر ئەوە پێویستە لەم بارەیەوە پشت بەم فەرموودەیە ببەسترێ کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کار بکەن چونکە کەس کردەوەی خۆی نایباتە بەهەشت)، گوتیان: تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (تەنانەت منیش مەگەر خوا بە میهرەبانی و ڕێزی خۆی بمپۆشێ).[3]

﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُوا۟ نَعَمْ ۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾﴾

## خەڵکی جەهەنم بەشیان هەر داخ و پەژارەیە لەناو ئاگردا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُوا۟ نَعَمْ﴾ بەهەشتیەکان بانگی جەهەنمیەکان دەکەن. ئەوا ئێمە ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان پێیداوین جێبەجێ بوو، ئایا ئێوەیش (وەك هەڕەشەتان لێکرابوو) هەر وا دەرچوو؟ وتیان: بەڵێ. خودای گەورە باسی ئەو وتوێژە دەکات لەنێوان خەڵکی بەهەشت و خەڵکی جەهەنمدا کە چۆن بەهەشتیەکان بە تانەو تەشەرو سەرزەنشت کردنەوە قسە لەگەڵ جەهەنمیەکان دەکەن کاتێ هەرکەسە چووە شوێنی خۆی. وەك چۆن خودای گەورە لە سورەتی (سافافاتدا) باسی ئەو کەسە

[1] الطبري (١٢/٤٣٩).
[2] النسائي في الكبرى (٦/٤٤٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[3] فتح الباري (١١/٣٠٠)، مسلم (٤/٢١٧٠).

دەكات كە وتووێژ لەگەڵ هاوڕێەكی دەكات كە خوانەناس بووە لە دنیـادا. ئەفـەرموێت: ﴿فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾[1] ئینجا خۆی سەیری كرد لە ناوەڕاستی جەهەنمدا هاوەڵەكەی خۆی دی. وتی: بە خودا هەر وەخت بو لەناوم بەری. ئەگەر چاكەی پەروەرندەم نەبوایە منیش وەك تۆ لەوێدا دەبووم. تۆ بزانە كە ئێمە تازە نامرین، جگە لە مردنی پێشومان، هیچ ئازاردانیشمان نیە. بەرپەرچی قسەی هاوەڵەكەی ئەداتەوە كە لە دنیا كردبوی‌و سەرزەنشتی دەكات لەسەر ئەو چارەنووسەی كە تووشی بووە لەو سزاو جەزرەبەیە. هەر بەو شێوەیەش فریشتەكان سەرزەنشتی دەكەن‌و پێیان دەڵێن: ﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾[2] ئەمە ئەو ئاگرەیە كە بڕواتان نەدەكرد هەبێ، ئایا ئەمە جادووە یان ئێوە كوێر بوون‌و نابینن؟ بچنە ناوی هەڵبكەن یا هەڵنەكەن وەك یەكەو هەر بەهۆی ئەو كارانەی كە كردووتانە سزا ئەدرێن. هەر بەو شێوەیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرزەنشتی كوژراوەكانی بیرەكانی ڕۆژی بەدری دەكردو بانگی دەكرد: (ئەی ئەبوجەهلی كوڕی هیشام‌و ئەی عوتبەی كوڕی ڕەبیعەو ئەی شەیبەی كوڕی ڕەبیعە (ناوی سەرەكانیانی برد)، ئایا ئەوەی پەروەرندەكەتان بەڵێنی پێدان دەستتان كەوت؟ بێگومان من ئەوەی پەروەرندەم بەڵێنی پێدام بەڕاستی وەدەستم هێنا). عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا تۆ قسە لەگەڵ كۆمەڵێكدا دەكەی كە بۆنیان كردوە؟ فەرمووی: (سوێنی بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوە لەوانە باشتر گوێتان لەو قسانە نیە كە من بۆیان دەكەم بەلام ناتوانن وەڵام بدەنەوە)[3]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا﴾ جارچـیـە لـە نێوانیاندا جاڕی دا، دەك هەرچی ستەمكارە بەر نەفرینی خوا كەوێ، ئەو كەسانەی دەبنە لەمپەر لە ڕێی خوداو دەیانەوێ ئەو ڕێگا وا نیشان بدەن‌و بڕواشیان بە ڕۆژی دوایی نیە. واتە: دەبنە لەمپەر لە ڕێی خەڵكیدا بۆ ئەوەی شوێنی ڕێگەی خوداو بەرنامەكەی‌و ئەوەی پێغەمبەران پێی هاتوون نەكەون، وە دەیانەوێ ئەو ڕێگەیە لارو نارێك بێ تا هیچ كەس شوێنی نەكەوێ ﴿عِوَجًا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ﴾ وە ئەوانە بڕواشیان بە ڕۆژی دوایی نیەو چونە بەر بارەگای خودا نیە واتە: حاشای لێ دەكەن‌و بەڕاستی

---

[1] الصافات (٥٥-٥٩).

[2] الطور (١٤-١٦).

[3] مسلم (٢٢٠٣/٤).

نازانن، بۆیە گوێیان لێ نیە هەر خراپەیە بە دەمیاندا بێ یا هەر کارێ بکەن چونکە ترسیان لەوە نیە کە لێپرسینەوەیان لەسەری دەکرێ یان تۆڵەیان لێ دەسێنرێ، ئەوانە خراپترین کەسن لە کردارو گفتاردا.

﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌۚ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَىٰهُمْۚ وَنَادَوْاْ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْۚ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

**ئەعرافو خەڵكی ئەعراف**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌۚ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَىٰهُمْۚ وَنَادَوْاْ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْۚ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴾ لە نێوانیاندا پەردەیەك هەیە، پیاوانێك هەن لەسەر ئەعراف ڕاوەستاون. هەموو كەسێ بە سەرو سیما دەناسن. بانگی ئەو بەهەشتیانە دەكەن، كە هێشتا نەچوونەتە نێو ئەو بەهەشتە، بەڵام بەتەمان بچنە ناوی‌و دەڵێن: سڵاوتان لێبێ. كاتێ خودای گەورە باسی وتووێژی ئەهلی بەهەشتی كرد لەگەڵ ئەهلی جەهەنم، ئاگادارمان دەكات كە لە نێوان بەهەشت‌و جەهەنمدا دیوارێ هەیە، كە بەربەست‌و ڕێگرە بۆ گەیشتنی خەڵكی ناو ئاگر بۆ ناو بەهەشت. ئیبنوجەریرئەڵێت: ئەو دیوارەیە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾[1] لەو كاتەدا شوورەیەك لە نێوانیاندا دەبێتە ڕێگر دەرگای هەیە لە ژوورەوەی بەزەیی یەو لە دەرەوەی سزایە. ئا ئەوە ئەعرافە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ﴾[2] پاشان بەو سەنەدەی خۆی ڕیوایەت دەكات لە سوودیەوە كەئەڵێت: ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ ﴾ هەر ئەو شورەیە ئەعرافە[3] موجاهیدئەڵێت: بەربەستێكە لە نێوان بەهەشت‌و ئاگردا كە شوورەكەی دەرگای هەیە[4] ئیبنوجەریرئەڵێت: ئەعراف جەمعی عورفە هەموو بەرزایەك لە زەویدا لەلای عەرەبەكان پێی دەڵێن عورف. هەر بۆیە بە پاپۆكەی كەڵەشێر دەڵێن عورف لەبەر بەرزیەكەی. سوودی ئەڵێت: بۆیە (الاعراف) ناویراوە بە عورف، چونكە ئەوانەی سەری ئەو خەڵكە دەناسن.[5] ئەوانەی ئەعراف كۆمەڵێكن چاكەو خراپەیان یەكسانە، حوزەیفەو ئیبنوعەبباس‌و ئیبنومەسعودو كەسانی تریش لە زانایانی پێشینەو پاشینەش وتویانە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە حوزەیفەوە ئەڵێت: پرسیاری لێ

---

[1] الحدید (١٣).

[2] الطبري (٢٤٩/١٢).

[3] الطبري (٤٤٩/١٢).

[4] الطبري (٤٥١/١٢).

[5] الطبري (٤٤٩/١٢).

کرا لەبارەی ئەو کەسانەی ئەعرافەوە وتی: ئەوانە کۆمەڵێکن چاکەو خراپەیان یەکسانە، خراپەکانیان دایناون ناهێڵێ بچنە بەهەشت. چاکەکانیشیان دوای خستون کە بچنە ئاگر، لەوێدا ڕاوەستاون لەسەر ئەو شوورەیە تا خودا فەرمانی خۆی ئەدا لە نێوانیاندا[1]، موعەممەر وتی لە حەسەنەوە کە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴾ هێشتا نەچوونەتە ئەو بەهەشتە بەڵام بەتەمان‌و وتی: سوێند بە خوا ئەو هیوایە کە خراوەتە ناو دڵیان لەبەر ئەوەیە کە خوا دەیەوێت ڕێزێکیان لێ بگرێ[2]، قەتادەئەڵێت: خودا ئاگاداری کردون لە شوێنەکەیان لەو بەتەمایی یە.[3] پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کاتێ کە ئاوڕ لەو کەسانە ئەدەنەوە کە جەهەنمین، دەڵێن: ئەی پەروەرندەمان، لە گرۆی ستەمکاران دوورمان بگرە. زەحاک ئەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە: کە پیاوانی ئەعراف کاتێ سەیری خەڵکی ئاگریان کردو باش ناسینیان دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لە ڕیزی کۆمەڵی ستەمکاران دامان مەنێ[4].

﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ﴾ ئەوانەی وان بەسەر ئەعرافەوە پیاوانێك بانگ دەکەن کە بە نیشانەی تایبەتیدا دەیانناسن. خودای گەورە باسی خەڵکی سەر ئەعراف دەکات کە تانەو تەشەر لە گەورە پیاوانی موشریکەکان ئەدەن کە لەناو ئاگردان، بە شێوەو بیچمیاندا دەیانناسن. ﴿قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴾ پێیان دەڵێن: کۆمەڵەکەتان‌و خۆ بە زل زانینەکەتان بە کەڵکتان نەهات‌و لە سزا لای نەدان بەڵکو پاشەڕۆژتان ئا بەم شێوەی لێهات کە تووشی ئەم سزایەو چەرمەسەرێیە بوون ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ﴾ هەر ئەوانە نین کە ئێوە سوێندتان دەخوارد، بەر بەزەیی خوا ناکەون؟ بڕۆنە بەهەشت‌و نە هیچ ترستان لەسەر هەیەو نە خەم دەخۆن. عەلی کوڕی

[1] الطبري (١٢/٤٥٣).
[2] عبدالرزاق (٢/٢٣٠).
[3] الطبري (١٢/٤٦٥).
[4] الطبري (١٢/٤٦٣).

ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێت: مەبەست بە ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ﴾ پیاوانی ئەعرافە[1].

﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾﴾

**خۆشگوزەرانی بەهەشت قەدەغەیە بۆ خەڵکی جەهەنم**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ جەهەنمیەکان داوا لە بەهەشتیەکان دەکەن، لەو ئاوە یا لەو ڕۆزیە خودا پێیداون شتێکیش بەشی ئێمە بدەن. سوودی ئەڵێت: ﴿مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ واتە: لەو خواردنەی کە خوا پێیداون.[2] خودای گەورە باسی زەلیلی خەڵکی جەهەنم دەکات، کە داوا دەکەن بەهەشتیەکان لەو خواردنو خواردنەوەی کە دەیخۆن بەشیان بدەن، بەلام بەهەشتیەکان وەلامیان نادەنەوە. سەوری ئەڵێت: لە عوسمانی سەقەفیەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم ئایەتەدا وتی: کەسی وا هەیە داوا دەکات لە باوکی لە برایو پێی دەڵێ کە سووتا لەو ئاوە بەشی بدات، پێیان دەڵێن: وەلامیان بدەنەوە ﴿قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[3] دەڵێن: خوا ئەم شتانەی لە خوانەناسان حەرام کردوە. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم گوتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: خودا خواردنو خواردنەوەی بەهەشتی حەرام کردوە لە خوانەناسان[4] پاشان خودای گەورە باسی خوانەناسان دەکات کە هەمیشە خەریکی تێرکردنی ئارەزوەکانیان لە خواردنو خواردنەوەو ڕابواردنو گەمەو گاڵتەو لەخۆبایی بوون بە دنیاو شتە ڕازاوەکانی دنیاو وازیان هێناوە لەو شتانەی فەرمانیان پێکراوە کە بۆ ڕۆژی دوایی بکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ﴾ ئەو کەسانەی ئاینەکەیان هەر بە گاڵتەو گەپ دەزانیو ژیانی دنیا فریوی دان. بۆیە ئەمڕۆ ئەوان لە بیری

---

[1] الطبري (١٢/٤٦٩).
[2] الطبري (١٢/٤٧٣).
[3] الطبري (١٢/٤٧٤).
[4] الطبري (١٢/٤٧٤).

خۆمان دەبەینەوە، هەر چۆنێ ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لە بیر خۆیان بردبۆوەو لە نیشانەکانی ئێمە حاشایان کرد واتە: سەودایان لەگەڵدا دەکەین بە سەودای کەسێ کە لەبیری بردونەتەوە، چونکە خودا هیچی لێ ون نابێو لە دەستی دەرناچێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾[1] لە کتێبێکدایە پەروەردگارم نە هیچی لێ ون دەبێو نە هیچیشی لەبیر دەچێ. بەڵکو خودا لە بابی موقابەلەدا ئەمەی فەرمووە. وەك ئەفەرموێت: ﴿أَيْدِيَهُمْۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾[2] خودایان لە بیر بردەوەو خوداش ئەوانی لە بیر کرد. وە ئەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾[3] هەر وەك تۆ نیشانەکانی ئێمەت بۆ هاتو لەبیر خۆت بردەوە، ئەمڕۆش تۆ لە بیر دەچیەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾[4] وا ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین هەروەك ئێوە تووشی هاتن ئەمڕۆتان نەدەهاتە بیر. عەوفی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا﴾ دەڵێت: خودا لە چاکەدا لە بیری کردن بەڵام لە خراپەدا لە بیری نەکردن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: وازی لێ دەهێنین وەك چۆن ئەوان دیداری ئەمڕۆژەیان پشت گوێ خست. موجاهیدئەڵێت: وازیان لێ دەهێنین لەناو ئاگردا. سوودی ئەڵێت: لە بەزەیدا پشت گوێیان دەخەین وەك ئەوان چۆن دیداری ئەم ڕۆژەیان پشت گوێ خست. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەفەرموێ بە عەبدەکانی: (ئایا هاوسەرم پێ نەدا؟ ئایا ڕێزم لێ نەگرتی؟ ئایا ئەسپو وشترم بۆ دەستەمۆ نەکردی مۆڵەتم نەدای کە سەرکردە بیو بە ئارامی دانیشی؟ دەڵێت: بەڵێ، ئەفەرموێت: ئایا وات دەزانی کە تۆ تووشی دیدەنی دێیت؟ دەڵێت: نەخێر، خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ئەمڕۆ ئێمەش تۆ لەبیر دەکەین وەك چۆن تۆ منت لەبیر کرد)[5].

﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٖ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدٗى وَرَحْمَةٗ لِّقَوْمٖ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥۚ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُواْ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعْمَلُۚ قَدْ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾﴾

---

[1] طه (٥٢).

[2] التوبة (٦٧).

[3] طه (١٢٦).

[4] الجاثية (٣٤).

[5] مسلم (٤/٢٢٧٩).

**ڕێگە نادرێ بە بتپەرست پاكانە بكات**

خودای گـەورە ئـەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئێمـە كتێبێكمان بۆ ئەوان هێناوە، كە بە زانستەوە ڕوونمان كردۆتەوە ڕێنمونیو بەزەیە بۆ كۆمەڵێ كە بـڕوا بێـنن. خـودای گـەورە باسـی ئـەوە دەكـات كـە هـیچ بروبیانویـەكی بـۆ بتپەرسـتان نەهێـشتوەتەوە پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردونو كتێبـی پێـدا نـاردونو هـەموو شـتێكی پێـدا ڕوونو ئاشـكرا كردۆتـەوە بۆیان. وەك ئەفەرموێت: ﴿كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ﴾[1] كتێبێكە بەڵگەكانی بتەو كـراونو لـە پاشـان شی كراونەتەوە. وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ كە بە زانستەوە شیمان كردوەتـەوە. وە لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ﴾[2] خوا بە زانستی خۆی ئەمەی بۆ تۆ ناردوەتە خـوار. مەبەست لێرەدا ئەوەیە، كاتێ خودا باسی ئەو كارەساتو زیانەی كە تووشی خوانەناسان دێت لە ڕۆژی قیامەتدا دەكات باسی ئەوەیشی كردوە كە هەرچی كۆسپو گرێ هـەبووە لای بـردوە لـە ڕێگەیانـدا لـە دنیادا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردنو كتێبیشی پێدا ناردون بۆیـان. وەك ئەفـەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[3] هەتا پێغەمبەریش نەنێرین سزا لەلای ئێمەوە نیـە. هـەر بۆیـە ئەفـەرموێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ۚ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ﴾ ئایا ئەمانە هەر بۆ ڕۆژە دەڕوانن. كە هەرچی لەم كتێبەدایە بە چاوی خۆیان ببینن؟ ئەو ڕۆژەی كە ئاكام ڕوون دەبێتەوە، ئەو كەسانە وا لە پێشدا ئـەم ڕۆژەیان لـەبیر خـۆ بردبـوەوە. ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ﴾ واتـە: ئایا چاوەڕوانی ئـەو ڕۆژە دەكـەن كـە بەڵێنیان پێدراوە لە سزاو ئەشكەنجەو بەهەشـتو ئـاگر. موجاهیـدو كەسـانی تـریش ئەمـەیان وتـوە[4]، ئیبنـو عـەبباس ئـەڵێت: ﴿يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ﴾ واتـە: ڕۆژی قیامـەت[5] ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ﴾ ئـەو كەسانە لە پێشدا ئەمەیان لە بیر خۆ بردبوەوەو كاریان پێ نەدەكرد لە دنیادا دەڵێن: ﴿قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ﴾ دیـــارە هەرچـــی پێغەمبەرەكانی خودا وتیـان بـە ڕاسـت گـەڕا، ئایا ئێستە كـەس دەبێتـە تكاكارمـان؟ یا خـۆ دیسان

---

[1] هود (١).
[2] النساء (١٦٦).
[3] الاسراء (١٥).
[4] الطبري (٤٧٩/١٢).
[5] الطبري (٤٧٩/١٢).

بگەڕێینەوە سەر دنیا، ڕەوشتی خۆمان بگۆڕینو ئاکاری باشتر ڕەچاو کەین؟ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾[1] ئەگەر بیانبینی کە لەسەر لێواری ئاگر ڕاگیراون، دەڵێن: خۆزگە دیسان دەیانگێڕاینەوە، ئەوسا بە نیشانەکانی پەروەرندەمان بڕوامان دەکردو ئێمەش لە ڕیزی باوەڕداران دەبووین. ڕاستیش ناکەن، تەنیا هەر ئەوەیان بۆ ئاشکرا بووە کە لەوەو پێش لە دڵدا دەیانشاردەوە. ئەگەر بشگەڕانایەوە، ئەو کارانەی کە پێیان دەوترا مەیکەن هەر دەیانکرد، ئەمانە هەموو درۆزنن. وەك خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾ ئەمانە خۆیان دۆڕاندوەو ئەو درۆی کە هەڵیاندەبەست بە فیڕۆ چوو. واتە: زیانیان لە خۆیان دا بە چوونە ناو ئاگرو مانەوەیان تێدا هەتا هەتایە. وە ئەوانەی جگە لە خوا دەیانپەرستن لێیان ون بوونو تکایان بۆ ناکەنو یارمەتیان نادەنو لەو ئاگرەیش ڕزگاریان ناکەن کە تێی کەوتوون.

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾

**دروست بوونی بونەوەر لە شەش ڕۆژدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ پەروەردگارتان خودایەکە ئاسمانەکانو زەمینی لە شەش ڕۆژدا دروست کرد. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە بونەوەری بە ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەویش لە نێوانیاندایە بە شەش ڕۆژ دروست کرد. وەك لە چەند ئایەتی تریشدا هەر باسی کردوە لە قورئاندا. ئەو شەش ڕۆژەیش: ئەك شەممە دوو شەممە سێ شەممە چوار شەممە پێنج شەممەو هەینیە. هەموو لەو ڕۆژانەدا دروست بوون، دروس بوونی ئادەمیش هەر لەو ڕۆژانەدا بوو (سەلامی خوای لێبێ) ڕای جیاواز هەیە لەسەر ئەم ڕۆژانە ئایا هەریەکێ لەو ڕۆژانە وەك ئەو ڕۆژانە وایە کە هەستی پێ دەکرێو دەیزانین یان هەر ڕۆژێ لەوانە بە ئەندازەی هەزار ساڵە وەك موجاهیدو ئیمامی ئەحمەد وتویانە[2]، زەحاکیش هەر وا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، بەڵام ڕۆژی شەممە، دروس کردن ڕووی نەداوە تێیدا، چونکە ڕۆژی حەوت هەمە. هەر لەوەیشەوە ناوی (سبت)ی لێنراوە چونکە لە ڕۆژەکانی تر بڕاوە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە

[1] الانعام (٢٧-٢٨).

[2] الطبري (٤٨٢/١٢).

لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی گرتم و فەرمووی: (خودا خۆڵی لە ڕۆژی شەممەدا دروست کرد، وە کێوەکانی لە ڕۆژی یەکشەممەدا دروست کرد. لە ڕۆژی دووشەممەدا درەختی تێدا دروست کرد، وە مکروهی لە سێ شەممەدا دروست کرد. ڕووناکیشی لە ڕۆژی چوارشەممەدا دروست کرد، وە لە ڕۆژی پێنج شەممەدا گیاندارانیشی دروست کرد، ئادەمیشی ڕۆژی هەینی دوای عەسر دروست کرد، دواین دروست کراو بوو لە دواین کاتدا لە کاتەکانی هەینیدا لە نێوان عەسردا تا شەو داهات)[1].

## مانای (الاستواء) دامەزران

لە بارەی ئەم دەقەوە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ پاشان چووە سەر تەختی (العرش) فەرمانڕەوای خەڵکی ئا لێرەدا قسەیەکی ئێجگار زۆریان هەیە، ئێرە شوێنی ئەوە نیە بە درێژی لەسەری بڕۆیت. بەڵکو ئێمە لەم بارەیەوە ڕێچکەی پێشینە چاکەکان دەگرینە بەر وەك مالیك و ئەوزاعی و لەیس و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی کەسانی تریش لە پێشەوایانی موسوڵمانان لە کۆن و تازەدا. ئەویش تێپەڕاندنیەتی وەك چۆن هاتوە بە بێ چۆنیەتی و لە یەکچوون و لە کارخستن، ئەوانەی کە لە یەك چوون بە بیریاندا دێ بەرانبەر بە خودا ڕاست نیە و هیچ شتێ لە دروس کراوەکانی لە خوا ناچێ. ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾[2] هیچ شتێك بە وێنەی خوا نیە، هەر خۆی بیسەر و بینایە. بەڵکو مەبەست پێی هەر ئەوەیە کە پێشەوایانی ئیسلام گوتویانە لەوانە: نوعەیمی کوڕی حەمادی خوزاعی مامۆستای بوخاری ئەڵێت: هەرکەسێ خودا بچوێنێ بە دروس کراوەکانی بێ دین بووە. وە هەرکەسێ ئینکاری ئەو وەسفانە بکات کە خوا وەسفی خۆی پێکردوە بێگومان بێ دین بووە چونکە ئەوەی کە خودا وەسفی پێکردوە و پێغەمبەرەکەی کردویەتی لە یەك چوون نیە. هەرکەسێ ئەوە بسەلمێنێ بۆ خوا کە لەو ئایەتە ڕوون و ئاشکراو ئەو هەواڵە ڕاست و دروستانەدا هاتوە بەو شێوەی کە شایستەی پایە بەرزی خودای مەزنە و نەرێ لە کەم و کوڕیەکان بکات بەرانبەر بە خودا ئەوە ئەو کەسە ڕێگەی شارەزایی گرتوەتە بەر.

## شەو و ڕۆژ لە نیشانەکانی خودان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا﴾ ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێ و ڕۆژیش بە خێرا دەکەوێتە شوێنی شەو. تاریکی شەو ڕووناکی ڕۆژ لادەبات و ڕووناکی ڕۆژیش تاریکی شەو لادەبات هەریەکەیان بە پەلە شوێنی ئەوی تر دەکەوێ و لێی دواناکەوێت، بەڵکو ئەم ڕۆشت ئەو دێت بە دوایدا.

---

[1] أحمد (٢/٣٢٧)، مسلم (٢١٤٩).

[2] الشورى (١١).

بە پێچەوانەشەوە، وەك ئەفەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾[1] بۆ ئەوانە شەویش یەك لە نیشانەكانی ئێمە ڕۆژی لێ دادەڕنین و لەناكاو تاریكاییان بەسەردا دێ، خۆریش بە ڕەوینەی خۆی لە گەڕاندایە، كە لە خاوەن دەسەڵاتی زاناوەیە. ئەو فەرمانی پێداوە. مانگیش ئێمە بۆمان دانا بە چەند قۆناغدا تێپەڕێ، تا وای لێ دێ وەك پەلی كۆن و وشكەڵی داری دێتە بەر چاو، نە خۆر توانای ئەوەندەی هەیە بگا بە مانگ و نە شەویش پێش ڕۆژ دەكەوێ هەمووشیان لە ئاسمانێكدا مەلە دەكەن. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ﴾ واتە: لیی ون نابێ و ساتێ لیی دوا ناكەوێ بەڵكو بەردەوام بە دواوەیەتی بە بێ هۆكارێ لە نێوانیاندا بێ هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ ڕۆژیش بە خێرا دەكەوێتە شوێنی شەو، خۆر و مانگ و ئەستێرەكانیش هەر لە ژێر فەرمانی خودان. واتە: هەموو لە ژێر دەسەڵات و فەرمان و ویستی ئەودان. هەر بۆیە لێرەدا ئاگاداری ئەدات و ئەفەرموێت: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ بزانن وەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە ﴿تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ پاك و بێگەردە خودایە كە پەروەردەی گشت جیهایە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا ﴾[2] پاك و بێگەردە ئەو خودای چەند خولگەی لە ئاسمانا دامەزراندوە، وە لەم دوعایەدا كە بە مەرفوعی ڕیوایەت كراوە لە ئەبودەرداوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خودایە هەرچی موڵكە هەر بۆ تۆیە و هەموو سوپاسێ هەر بۆ تۆ ڕەوایە. هەرچی بڕیارە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ لای تۆ، داوای گشت چاكەیەكت لێدەكەم پەنات پێدەگرم لە گشت خراپەیەك).

﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾

---

[1] يس (٣٧-٤٠).

[2] الفرقان (٦١).

**هاندان بۆ پاڕانەوە لە خوا**

خودای گەورە ڕێنمایی عەبدەکانی دەکات بۆ پاڕانەوە لێی کە هەر ئەوە خێری دنیاو قیامەتیانی تیایە. ئەفەرموێت: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً﴾ بە نهێنیو بە سەرکزی نزاو پاڕانەوە لە پەروەردگارتان بکەن. واتە: بە زەلیلیو سەرکزیو نهێنی لە خوا بپاڕێنەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ﴾[1] بە پاڕانەوەو ترسەوەو بە بێ دەنگ یادی پەروەردگارت بکە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوەئەڵێت: خەڵکی بە پاڕانەوەو نزاوە دەنگیان بەرز کردەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خەڵکینە لەسەرخۆ بن، خۆ ئێوە بانگی کەسێ ناکەن کەڕو نادیار بێت، ئەو کەسەی بانگی دەکەن بیسەرو نزیکە)[2]، ئیبنوجەریرئەڵێت: ﴿تَضَرُّعٗا﴾ بە زەلیلیو سەرکزیەوە عیبادەتی بکەن ﴿وَخُفۡيَةً﴾ بە ترسو لەرزو دڵنیایەکی ڕاستو ڕەوانەوە خودا بە تاکو تەنیاو پەروەردگاری خۆتان بزانن، ئەوەی لە نێوان خۆتانو خوادایە با بە ئاشکراو لەبەرچاو نەبێ.[3]

**قەدەغە کردنی زیادەڕەوی لە پاڕانەوەدا**

ڕیوایەت کراوە لە عەتای خۆراسانیەوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە لە ئەندازە دەردەچن، گوتی: لە داواو پاڕانەوەدا نەك لە شتی تردا[4] ئەبومیجلەز وتی: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ واتە: داوای پلەکانی پێغەمبەران ناکات[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبونەعامەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل گوێی لە کوڕەکەی خۆی بوو دەیوت: ئەی خودایە داوای کۆشکی سپیت لێدەکەم لەلای ڕاستی بەهەشتەوە کاتێ کە چوومە ناویەوە. وتی: کوڕم داوای بەهەشت لە خوا بکەو پەنای پێ بگرە لە ئاگر. بەڕاستی من بیستومە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (کۆمەڵێ دەبن لە ڕێگە دەردەچن لە پاڕانەوەو خۆ پاك ڕاگرتندا)[6]، ئیبنوماجەو ئەبوداوودیش هەر وا ڕیوایەتیان کردوە[1] ئەم فەرموودە سەنەدەکانی چاکەو خراپ نیە والله أعلم.

---

[1] الاعراف (٢٠٥).

[2] فتح الباري (١١/١٩١)، مسلم (٤/٢٠٧٦).

[3] الطبري (١٢/٤١٥).

[4] الطبري (١٢/٤٨٦).

[5] الطبري (١٢/٤٨٦).

[6] أحمد (٥/٥٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

**قەدەغە کردنی خراپە لە زەویدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا﴾ خراپەش مەکەن لەم زەمینە دوای باش بوونی خودا خراپەکاری قەدەغە کردوە لەم سەر زەمینەدا، دوای چاکی تووشی نەهامەتی بکەی، خۆ ئەگەر کارەکان بە ڕێکیو ئاسانی دەڕۆیشت پاشان خراپەکاری ڕوویدا، ئەوە زۆر خراپترە لەسەر خەڵکی بۆیە خودای گەورە ئەوەی قەدەغە کردوەو فەرمانی داوە بە عەبدەکانی کە بیپەرستنو مانای پێبەرن بە ترسو لەرزەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًا﴾ بە ترسەوەو بە هیوای تووش بوونی چاکەوە لە خوا بپاڕێنەوە. واتە: لە ترسی تۆڵەکانی خوای گەورەو بە هیوای وەرگرتنی ئەو پاداشتە زۆرانەشی کە دایناوە بۆ بەندە چاکەکانی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بە ڕاستی بەزەی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە. واتە: بەزەی خوا ئامادە کراوە بۆ ئەو چاکەکارانەی کە گوێڕایەڵی فەرمانیەتیو واز لە قەدەغە کراوەکان دێنیّ. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾[2] بەزەییم هەموو شتێکی داگرتوە، چاکەی ئەوانە دەنوسم لە خراپە خۆ دەپارێزن. فەرموویەتی (قريب) نەی فەرمووە (قريبةٌ) چونکە (الرحمة) مانای پاداشتی لە خۆ گرتوە یان ئیزافە کراوە بۆ لای خودا خۆی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ مەتەری وەڕاق وتی: پەیمانەکانی خودا جێبەجێ دەکەن بە گوێڕایەڵی کردنی. چونکە ئەو بڕیاری داوە کە بەزەیی لە چاکەکارانەوە نزیکە، ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە[3].

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾﴾

**لە نیشانەکانی خودایە کە باران دەبارێنیو بەرووبوم دەردێنیّ**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦ﴾ وە ئەو (خودا) زاتێکە پێش باران بارین (کە بەزەییێکە لە خۆیەوە) بایەکتان بە مزگێنی بۆ هەڵدەکات. کاتێ کە

---

[1] إبن ماجة (٢/٢١٧١)، أبوداود (١/٧٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الاعراف (١٥٦).

[3] إبن أبي حاتم (٥/١٥٠١).

خودای گەورە باسی ئەوەی کرد کە ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کرد. وە هەر خۆیشی کار بەدەست‌و فەرمانڕەواو خاوەندەستەڵات‌و ڕاهێنەریەتی، شارەزایشی کردوین کە چۆن لێی بپاڕێینەوە، چونکە مەیلی لە هەر شتێ ببێ دەیکات، ئاگاداریشی داوە کە هەر خۆی ڕۆژی دەرەو هەر خۆشی لە ڕۆژی قیامەتدا مردوان زیندوو دەکاتەوە. وە هەر ئەویشە هەورەکان بڵاو دەکاتەوە لە پێش ئەو هەورانەی کە بارانیان هەڵگرتوە، وە هەندێ (نُشراً) یان بە (بُشراً) خوێندوێتەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ ﴾[1] یەکێك لە نیشانەکانی ئەو (خودا) ئەمەیە کە با ینی مزگێنی دەر دەبینرێ. ﴿بَيْنَ يَدَىْ﴾ واتە: لە نێوان باراندا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾[2] هەر ئەویشە پاش بێ هیوا بوون لە باران، باران دەبارێنێ‌و دڵۆڤانی خۆشی بڵاو دەکاتەوە، هەر ئەوە بۆ گەورەیی دەشێ‌و هەر پەسەندی بدرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَـٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾[3] سەیری بەزەیی خوا بکە، زەوی دوای مردنی زیندوو دەکاتەوە، هەر ئەو زیندوکەرەوەی مردوانیشە. هەر خۆیشی توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا﴾ کاتێ ئەو بایانە هەوری بار گرانیان بەرز کردەوە. واتە: لە زۆری ئەو ئاوەی کە تیایەتی قورس دەبێ‌و لە زەوی نزیك دەبێتەوەو تاریك دەبێ ﴿سُقْنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ﴾ بەرەو وڵاتێکی مردوو دەیخەینە ڕێ‌و ئاوی پێ دەنێرینە خوارەوە. واتە: بەرەو زەویەکی وشك‌و مردوو دەڕوا کە هیچ سەوزیەکی تیا نیە. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَـٰهَا﴾[4] هەر سەیری زەوی بکەن (نیشانەی تێدایە بۆیان، بە مردویی ئێمە زیندوومان کردەوە. بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بە ئاوەکەی هەموو جۆرە بەروبومی زەمین دەڕوێنین هەر بەو جۆرەش مردوو زیندوو دەکەینەوە. دوای ئەوە دەبێ بە ئێسکی پزیو لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە بارێنێ دەبارێنێ لە ئاسمانەوە چل ڕۆژ دەبارێ بەو ئاوە لاشەکان دەڕوێنێتەوە لە گۆڕەکانیانەوە. وەك چۆن دانەوێڵە لە زەویدا دەڕوێتەوە. ئەم مانایە لە

---

[1] الروم (٤٦).

[2] الشورى (٢٨).

[3] الروم (٥٠).

[4] يس (٣٣).

قورئانـدا زۆرە خـودا نمونـەی زینـدو کردنـەوەی زەوی دوای مردنـی، بـۆ زیندوکردنـەوەی قیامـەت دێنێتەوە، هەر بۆیە ئەفـەرموێت: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ بـەڵکو ئێـوە بیر لەوانە بکەنـەوە. خـودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦ﴾ زەوی خاکی باش بە ئیزنی ڕاهێنەری خۆی ڕوەکی باش دەڕوێنێ. واتە: زەوی پاك خێرا بـەروبومی لێ دەڕوێت. وەك خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾[1] وە ڕواندی بە ڕوواندنێکی چاك. واتـە: زۆر بـە چـاکی پـەروەردەیکرد. پاشان خودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ﴾ زەوی خراپ هەر دڕكو داڵی بێ کەڵکی لێ دەڕوێت، بەم شـێوەیە نیشانەکانمان بـۆ ئـەو کەسـانە بـاس دەکەین کە سوپاس گوزارن. موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن: زەوی خـراپو خوێیـاویو هاوشـێوەی.[2]

بوخاری ڕیوایەتی کـردوە لـە ئەبوموسـای ئەشـعەریەوەئەڵێت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (نمونەی منو ئەو زانیاریو شارەزاییەی کە خودا منی پێ ڕەوانـە کـردوە، وەك بـارانێکی زۆر وایـە کـە دەبارێتە سەر زەوی، هەندێ لەو زەویە پاکـەو ئـاوی بارانەکـە وەردەگـرێ گیـاو پوشـی زۆر ئـەڕوێنێ، هەندێکی تری وشکە بەڵام ئەو بارانە ئەگرێتە ناو خۆی. خودا بە ئاوی ئەو زەویە قـازانج دەگەیـەنێ بـە خەڵك ئەیخواتەوە، ئاژەڵی پێ ئاو ئەدەنو کشتوکاڵی پێ دەکەن. هەندێکی تر لـەو زەویانـە کـە بـاران لێی ئەدا زەویەکی سافو لووسی تەختە. ئاو ناگرێتە نـاو خۆیـەوە. گیـا نـاڕوێنێ، ئـەوە وەك نمونـەی کەسێکە کە لە دینی خوا شارەزا ببێ، ئەوەی خودا منی پـێ نـاردوە سـوودی پـێ بگەیـەنێو بیزانـێو خەڵکی فێر بکات. وە نمونەی ئەو کەسەیشە کە سەری بۆ هەڵنابڕێ یان ڕێنمایی خوا قەبوڵ ناکات کە من پێی ڕەوانە کراوم)[3].

﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ
عَظِيمٖ ٥٩ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٦٠ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي
رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦١ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦٢﴾

---

[1] آل عمران (٣٧).

[2] الطبري (١٢/٤٩٧).

[3] فتح الباري (١/٢١١).

**بەسەرهاتی نووح و گەلەکەی (سەلامی خوای لێبێ)**

لە سەرەتای ئەم سورەتەدا خودای گەورە بەسەرهاتی ئادەم پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێبێ) ئەوەیش پەیوەندی هەبوو بەو بەسەرهاتەوە باس کردوە، دوای ئەوە لێرەدا دێتە سەر باسی بەسەرهاتەکانی پێغەمبەرەکانی تر (سەلامی خوایان لێبێ) یەك لە دوای یەك، لە سەرەتاوە دێتە سەر باسی نووح (سەلامی خوای لێبێ) کە یەکەم ڕەوانە کراو بووە بۆ سەر خەڵکی سەر زەمین دوای ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) ناوی (نووحی کوڕی لامك کوڕی متوشَلَخ کوڕی أخْنُوخ) کە ئیدریس پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێ) وەك گوتویانە. کە یەکەمین کەس بوە بە قەڵەم نوسیویەتی (کوڕی بُرد کوڕی مهلیل کوڕی قنین کوڕی یانش کوڕی سیث کوڕی ئادەم) (سەلامی خوای لێبێ) ئیبنوئیسحاق و کەسانی تریش لە پێشەوایانی ڕەچەڵەك ناسی هەر وایان گوتوە. عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و کەسانی تریش لە زانایانی تەفسیر گوتویانە: یەکەم جار بوە بتپەرستراوە، کۆمەڵانێ لە پیاوچاکان کە مردون کەس و کارەکانیان مزگەوتیان لەسەر دروست کردون و وێنەی ئەوانەیان کێشاوە لەناویاندا بۆ ئەوەی ژیانی ئەو پیاوچاکانە و (عیبادەتەکەیان) لە بیر نەکەن، تا ئەوانیش وەك ئەو پیاوچاکانە عیبادەت بکەن، کە زەمانە زۆری بەسەردا تێپەڕی پەیکەزیان لە شێوەی ئەو وێنانە دروست کرد. دەستیان کرد بە پەرستنی ئەو بتانە و بە ناوی ئەو پیاوچاکانەوە ناویان لێنان وەك (ودُّ و سُواعُ و یغوث و یعوق و نسر) کاتێ کارەکە گەورە بوو، خودای گەورە نوح پێغەمبەری پێغەمبەری ڕەوانە کرد (سەلامی خوای لێبێ) فەرمانی پێکردن کە تەنیا خودا بپەرستن کە شەریکی نیە وەك ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئێمە نووحمان ڕاسپاردە لای هۆزەکەی وتی: ئەی هۆزەکەم دەبێ ئێوە بەندایەتی خوا بکەن، کە بێجگە ئەم ئێوە خودایەکتان نیە، من لەو ڕۆژەتان دەترسم کە ئازاردانی دژواری تێدایە. کاتێ هاتنە لای شەریکتان بۆ دانابێ ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ پیاوە گەورەکانی گەلەکەی (لە وەڵامی ئەودا) وتیان: گومانی تێدا نیە کە تۆ لە گومراییەکی ئاشکرادا دەبینین. کە تۆ بانگی ئێمە دەکەی واز لە پەرستنی ئەم بتانە بێنین کە باب و باپیرانی خۆمان دیوە هەر ئاوا پەرستویانە. ئەمەیە ڕەوشتی بەدفەڕان، پیاوچاکان بە گومڕا سەیر دەکەن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾[1] کە چاویان پێیان دەکەوت، دەیانوت: ئەمانە گومڕان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ

---

[1] المطففين (٣٢).

قَدِيمٌ ﴾[1] ئەوانەی خوانەناسن، بە خاوەنباوەڕان دەڵێن: ئەگەر هیچ شتێکی باشی تێدا بوایە، بەر لە ئێمە بۆی نەدەچوون، ئێستا کە پێی نەگەیشتوون، دەڵێن: ئەمە درۆیەکی لە مێژینەیە. چەندین ئایەتی تریش لەم بارەیەوە هاتوە. ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَـٰلَةٌ وَلَـٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ دەڵێت: کەسەکانم من گومڕا نیم، ڕاسپاردەی پەروەردگاری هەموو دنیام، کە خاوەنی هەموو شتێکە ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ ڕاسپاردەکانی پەروەردگارم بە ئێوە ڕادەگەیەنمو ئامۆژگاریتان دەکەمو ئەوەی سەبارەت بە خودا من دەیزانم، ئێوە ئاگاتان لێی نیە. ئەمە کاری پێغەمبەرە دەبێ گەیەنەرو قسە ڕەوانو ئامۆژگاری کەرو زانا بێ بە ناسینی خودا. هیچ کەسێ لە دروسکراوەکانی خوا پێی ناگات لەم ڕەوشتانەدا وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵەکانی لە ڕۆژی عەرەفەدا، چونکە زیاتر لە هەموو کاتێ بەو زۆریە کۆ دەبونەوە: ئەی خەڵکینە ئێوە بەرپرسیارن بەرانبەر بە من، ئێوە چی وەڵام ئەدەنەوە؟ وتیان: شایەتی ئەدەین کە تۆ ڕاتگەیاندو بەجێت هێناو ئامۆژگاریت کرد پەنجەی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو پاشان گێڕایەوە بۆ لای ئەوانو فەرمووی: (ئەی خوایە تۆ شایەت بە، ئەی خوایە تۆ شایەت بە)[2].

﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾

خودای گەورە باسی نووح پێغەمبەر دەکاتو کە بە هۆزەکەی وتوە: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ ئایا ئێوە پێتان سەیرە ئامۆگاریەك لەلای پەروەردگارتەوە هات بۆ پیاوێك هەر لە خۆتان، تا بتانترسێنێو خۆ بپارێزن بەڵکو بکەونە بەر بەزەیی؟ واتە: سەرتان سوڕ نەمێنێ لەمە، جێی سەرسامیش نیە کە خودا نیگا بکاتە لای پیاوێ کە لە خۆتانە، ئەمە سۆزو بەزەییە بۆتانو چاکەیە لەگەڵتان، بۆ ئەوەی بتانترسێنێو خۆ بپارێزن لە تۆڵەی خواو شەریکی بۆ دانەنێن ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾ بڕوایان پێ نەهێناو دژایەتیان دەکرد چەند کەسێکی زۆر کەمیان نەبێ بڕوای پێ نەکرد وەك لە شوێنێکی تردا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ﴾ ئێمە خۆیو ئەوەی لەگەڵ ئەو چوونە کەشتیەکە ڕزگار کرد. وەك لە ئایەتێکی تریشدا

---

[1] الاحقاف (١١).

[2] مسلم (٢/٨٩٠).

ئەفەرموێت: ﴿فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَصْحَـٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾[1] ئێمە خۆی و ئەوەی لە کەمیەکەدا بوون ڕزگار کرد. ﴿وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ﴾ ئەوانەشمان لە ئاودا خنکاندا کە نیشانەکانی ئێمەیان پێ درۆ بوو. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا﴾[2] بەهۆی گوناهەکانیانەوە بە ئاو خنکان، ئەوسا خرانە ناو ئاگر، ئیتر جگە لە خوا یاریدەدەریان دەست نەدەکەوت، پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ﴾ ئەوانە (لە دڵدا) کوێر بوون. بەرانبەر بە هەق و نەیاندەبینی و شارەزایش نەدەبوون لێی. پاشان خودای گەورە لەم بەسەرهاتەدا ڕوونی کردۆتەوە کە تۆڵەی سەندوە لە دوژمنەکانی بۆ دۆستەکانی و پێغەمبەرەکەی و خاوەن باوەڕانی ڕزگار کردوە، دوژمنەکانی لەناو بردون لە خوانەناسان. وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ﴾[3] بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژەشی کە شایەتەکان ڕاست دەبنەوە یارمەتی ئەدەین. ئەمە سروشتی خودایە بەرانبەر بەندەکانی لە دنیاو لە قیامەتدا، دواڕۆژ هەر بۆ لە خوا ترسانە تیایاندا، دەستەڵات و سەرکەوتن هەر بۆ خواناسانە وەك چۆن هۆزی نووح بە خنکان لە ئاودا لەناوچوون و نووح و هاوەڵە بڕوادارەکانی ڕزگاریان. ئیبنووەهەب ئەڵێت: ئیبنوعەبباس وتی: ئەوانەی لەگەڵ نووحدا ڕزگاریان بوو لە کەمیەکا هەشتا کەس بوون. یەکێ لەوانە جورهومە کە زمانەکەی عەرەبی بووە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە، بە موتەسلیش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە بە واتایەکی تر.

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَـٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾﴾

[1] العنكبوت (١٥).
[2] نوح (٢٥).
[3] غافر (٥١).

**بەسەرهاتی هوودو (سەلامی خوای لێبێ) ڕەچەڵەکی گەلی عاد**

خودای گەورە ئەفەرموێت: وەك چۆن نووحمان نارد بۆ سەر گەلەکەی، هەروایش براکەیان کە هوود پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێ) نارد بۆ گەلی عاد ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ براکەیان کە هوودە (سەلامی خوای لێبێ) نارد بۆ گەلی عاد. وتی: ئەی خەڵکینە ! بەندایەتی خوا بکەن، جگە لەو ئێوە خودایەکتان نیە، چیتانە لە خوا ناترسن؟ موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: ئەمانە بەرەی عادی کوڕی ئیرەمی کوڕی عەوسی کوڕی سامی کوڕی نووحن. منیش دەڵێم: ئەمانە عادی یەکەمن کە خوا باسی کردون بەرەی عادی کوڕی ئیرەمن کە لە خانوی ئەستونداری فراواندا لە وشکایدا دەژیان. وەك خودای گەورەئەفەرموێت:﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾[1] خۆ دیت پەروەردگارت چی کرد بە هۆزی عاد، بەرەی ئیرەم خاوەنخانوی ئەستوندار، ئەو ماڵانەی وێنەیان لە شارانیش دروست نەکرا بوو. ئەوەیش بەهۆی بەهێزیو توندو تیژیانەوە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾[2] کاتێ هۆزی عاد بە ناڕەوا خۆیان لەو سەر زەمینەدا بە زل زانی، دەیانوت: کوا؟ کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ نەیاندیبوو ئەو خودای ئەوانی دروست کردوە زۆر لەوان بەهێزترە؟ ئەوان بڕوایان بە نیشانەکانمان نەبوو.

**شوێنەوارەکانی هۆزی عاد**

جێو شوێنی هۆزی عاد لە یەمەن بوو لە ئەحقاف کە چەند کێوێکی لماویە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە ئەبوتوفەیلەوە عامیری کوڕی واسلەوە وتی: بیستم لە عەلی دەیوت بە پیاوێکی حەزەرەمەوتی ئایا کۆمەڵە لمی سورو قوڕە ڕەشەت دیوە کە داری ئیرەكو تاوگی زۆری تێدا بێ لە فلان ناوچەو فلان ناوچە لە حەزەرەمەوت. ئایا چاوت پێی کەوتوە؟ وتی: بەڵێ ئەی گەورەی موسوڵمانان، سوێند بە خوا تۆ بە شێوەیە وەسفت کردوە وەك پیاوێ کە چاوی پێی کەوتبێ، گوتی: نەخێر، بەڵام باسی لێوە کراوە. پیاوە حەزەرەمەوتیەکە وتی: لەبەرچی هەواڵی دەپرسی ئەی گەورەی موسوڵمانان؟ وتی: گۆڕی هوود پێغەمبەری لێیە (سەلامی خوای لێبێ)[3] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە. ئەمە خۆی بۆ خۆی سوودێکی هەیە. کە جێو شوێنی هۆزی عاد لە یەمەن بووە، هوودیش (سەلامی

---

[1] الفجر (٦-٨).

[2] الفصلت (١٥).

[3] الطبري (١٢/٥٠٧).

خوای لێبێ) لەوێ ئەسپەردە کراوەو لە بەڕێزترین کەسی هۆزەکەیەتی لە ڕەچەڵەکدا. چونکە پێغەمبەران کاتێ خودا ڕەوانەی کردون لە بەڕێزترین هۆزدا ڕەوانەی کردون. بەڵام هۆزەکەی چۆن بەهێزو توانا هاتبوون بەو شێوەیەش دڵڕەق‌و زبر بوون. لە هەموو گەلەکانی تر زیاتر بێ بڕوا بوون‌و هەقیان بە ڕاست نەدەزانی. هەر بۆیە هوود (سەلامی خوای لێبێ) بانگی کردن بۆ ناسینی خوا بە تەنیا کە شەریکی نیەو بۆ پەرستنی‌و ترسان لێی.

**ئەوەی لە نێوان هوودو (سەلامی خوای لێبێ) هۆزەکەیدا ڕوویدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ﴾ پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی کە خوایان نەدەناسی وتیان: ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ ئێمە تۆ بە نەفام دەزانین‌و پێمان وایە تۆ لە درۆزنانی. واتە: ئێمە وادەزانین تۆ سەرت لێ شێواوە کە پێمان دەڵێیت واز لە بەندایەتی ئەم بتانە بێنن‌و وەرن بۆ عەبدایەتی خوا بەتەنیا، وەك چۆن پیاوە گەورەکانی قورەیش بەلایانەوە سەیرە لە بانگ کردنیان بۆ پەرستنی خودایە بە تەنیاو دەڵێن: ﴿أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ﴾[1] چۆن دەیەوێ لە جێی ئەو هەموو بتانەی دەیانپەرست، هەر خودایەك بپەرستن؟ پێغەمبەر هوود وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ وتی: ئەی خەڵکینە !من نەفام نیم، پێغەمبەرێکم، پەروەردگاری هەموو دنیا ڕایسپاردووم. واتە: ئەوەی ئێوە دەیڵێن وا نیە، بەڵکو من لەلایەن ئەو خودایەوە کە دروس کەری هەموو شتێکەو خاوەن‌و پەروەردگاری هەموو شتێکە بەڕاستی هاتووم بۆ لای ئێوە ﴿أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ﴾ پەیامەکانی پەروەردگارم بە ئێوە ڕادەگەیەنم من بۆ ئێوە ئامۆژگاری کەرێ دروستکارو جێ بڕوام. ئەمە ئەو ڕەوشتانەیە کە پێغەمبەران بەهرەمەندن پێی ڕاگەیاندن‌و ئامۆژگاری‌و جێ متمانە. ﴿أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ﴾ ئاخۆ ئێوە پێتان سەیرە ئامۆژگارییەك لەلای پەروەردگارتانەوە هات بۆ پیاوێك هەر لە خۆتان، تا بتانترسێنێ؟ واتە: پێتان سەیر نەبێ کە خودا پێغەمبەرێ ڕەوانە بکات بۆتان لە خۆتان‌و بتانترسێنێ لە ڕۆژەکانی خوداو چونە خزمەتی بەڵکو دەبێ سوپاسی خودا بکەن لەسەرئەوە ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ﴾ لە بیرتان بێ پاش هۆزی نووح ئێوەی لە جێیان دامەزراند. واتە: بەهرەکانی خودا لە یاد مەکەن کە وای لێ کردن لە نەوەکانی نووح بن‌و ئەوانی تری هەموو بەهۆی بڕوانەهێنانیان‌و دژایەتی کردنی بانگەوازەکەی لەسەر

---

[1] ص (٥).

زەمیندا لەناو برد ﴿وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ﴾ وە بەژن و باڵای زۆرتریشی پێتان بەخشی. واتە: وای لێ کردن باڵا بەرزتر بن لە فەرزەندانی ڕەگەزی خۆتان. وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای گەورە لە بەسەرهاتی تالوتدا ئەفەرموێت: ﴿وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ﴾[1] زانست و قەڵافەتی لە ئێوە زیاتر پێداوە ﴿فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ دەسا ئێوەش هەموو ئەو چاکانەی خواتان لە بیر بێ بەڵکو ڕزگار بن.

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٧٢﴾﴾

خودای گەورە باسی یاخی بوون و سەرکەشی و لاساری و مل نەدانی هۆزی عاد دەکات بەرانبەر بە هوود(سەلامی خوای لێبێ)، ئەفەرموێت: ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ وتیان: هاتوی پێمان بڵێیت تەنیا خوا بپەرستن و لەو خودایانە واز بێنن کە باب و باپیرانمان پەرستویانن؟ ئەگەر تۆ ڕاست دەڵێیت، بە هەرچیمان دەترسێنی درێغی مەکە. وەك خوانەناسانی قورەیش دەیانگوت: ﴿ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾[2] ئەوساش وتیان: ئەی خودایە ئەگەر بە ڕاستیە و لەلایەن تۆوە هاتوە وە بەر بەردەبارانمان دە یان ئازارێکی بە ژانمان بۆ بنێرە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تریش وتویانە: ئەوانە چەند بتیان دەپەرست. بتێ ناوی سوواء بوو بتێ ناوی سەموود بوو بتێ ناوی هەباء بوو بۆیە هوود(سەلامی خوای لێبێ) وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌ ﴾ دەڵێت: بێگومان ئێوە تووشی ئازار و توڕەیی پەروەردگارتان هاتوون. واتە: لەبەر ئەم قسەتانە کە دەیکەن تووشی سزای سەخت دەبن. ئیبنوعەبباس ئەڵێت: ﴿رِجۡسٞ﴾ واتە ڕق و تووڕەیی[3] ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ

---

[1] البقرة (٢٤٧).

[2] الانفال (٣٢).

[3] الطبري (١٢/٥٢٢).

وَءَابَآؤُكُم﴾ جا چۆن ئێوه چەند شتێ كه خۆتانو باب‌و باپیرانتان ناوتان لێ ناون مشت‌و مڕم لەگەڵدا دەكەن، كردوتانن بە خودای خۆتان نە سوودتان پێ دەگەیەنن‌و نە زیانیشتان لێ ئەدەن‌و هیچ بەڵگەشتان بە دەستەوە نیە لەلایەن خواوە لەسەر پەرستنیان. هەر بۆیە هوود (سەلامی خوای لێبێ) وتی: ﴿مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ﴾ هیچ بەڵگەیەكی بتەوتان لە خواوە بۆ نەهاتوە، چاوەنۆڕ بن ئەوا منیش لەگەڵ ئێوە چاوەنۆڕم. ئەمە هەڕەشەیەكی زۆر توندو تیژە لەلایەن ئەم پێغەمبەرەوە لە هۆزەكەی خۆی.

## چارەنووسی هۆزی عاد

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾ ئێمە لە چاكەو بەزەیی خۆمانەوە هوودو هاوڕێكانی هەموومان ڕزگار كردو ئەو كەسانەش كە نیشانەكانی ئێمەیان بە درۆ داناو بێ بڕوا بوون، بە تەواوی بنەبڕمان كردن. خودای گەورە لە شوێنی تریشدا شێوەی لەناوبردنەكەی باس كردون لە قورئاندا كە گڕە بای بێخێری بۆ ناردن هەموو شتێكی لەناو بردو وەك پێشەی پواوی لێ كرد وەك لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ۝٦ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ۝٧ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ﴾[1] هۆزی عادیش بە بایەكی زۆر بەهێز لەناو چوون. ماوەی حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بە بێ وچان ناردیە سەریان. لاشەیان لێ كەوتبوو، دەت وت كۆتەرەی دار خورمای پواوو ناو زڕاون. ئایا تۆ پاشماوەیەكیان دەبینی؟ كاتێ كە یاخی‌و لەخۆبایی بوون خودا بە بایەكی زۆر توندو بەهێز قڕی تێخستن، پیاوی هەڵدەگرتن‌و بەرزی دەكردەوە بەسەردا ئەیدا بە زەویدا مێشكی دەپرژاو پەرش‌و بڵاو دەبوە پێیدا. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ﴾[2]. لاشەیان لێ كەوتبوو دەت گوت كۆتەرەی دار خورمای پواوە. موحەممەدی كوڕی ئیسحاق ئەڵێت: ئەمانە لە یەمەن نیشتەجێ بوون لە نێوان عەمان‌و حەزرەمەوتدا. لەگەڵ ئەوەیشدا دەستیان دابوە خراپەكاری‌و زاڵ بووبون بەسەر خەڵكەكەیدا، بەهۆی ئەو هێزە خودا پێی دابوون. خاوەنی چەندین بت بوون بێجگە لە خوا دەیانپەرست. خودای گەورە هوودی بۆ ناردن (سەلامی خوای لێبێ) لە بنەماڵەیەكی چاك‌و بەڕێز بوو لە نێوانیاندا، داوای لێ كردن كە خودا بە تەنیا بناسن، هیچ پەرستراوێكی

---

[1] الحاقة (٦–٨).

[2] الحاقة (٧).

لەگەڵیدا نەپەرستنو دەستیش هەڵگرن لە ناهەقی کردن لە خەڵکی، بە گوێیان نەکردو بڕوایان پێ نەهێنا. وتیان کەس لە ئێمە بەهێزتر نیە، چەند کەسێکی کەم نەبێ شوێنی نەکەوت. بڕواکەشیان ئاشکرا نەدەکرد. وەختێ کە عاد ملیان نەدا بە فەرمانی خوداو بڕوایان نەکرد بە پێغەمبەرەکەیو دەستیان دایە خراپەکاریو زۆرداریو لە هەموو شوێنێکی بەرزدا کۆشکی گەورە دروس دەکەنو هەر خەریکی کاری پڕوپوچن هوود (سەلامی خوای لێبێ) قسەی لەگەڵدا کردنو پێی وتن: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾[1] ئایا ئێوە لە هەر جێگایەکی بەرز کۆشکی گەورە دروس دەکەن، کە هەر خەریکی کاری پڕوپوچن؟ کۆشکو قەڵای زۆر بتەویش دادەڕێژن، لاتان وایە هەر دەمێنن؟ هەرکاتێ پەلاماریش ئەدەن، ملهوڕانە هێرش دەکەن، سا لە خوا بترسنو لە گوێم بکەن. ئەوانیش وەڵامی هوود (سەلامی خوای لێبێ) ئەدەنەوە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا يَـٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوٓا أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[2] وتیان: ئەی هوود تۆ هیچ بەڵگەت لەخواوە بۆنەهێناوین هەر بە قسەی تۆش، ئێمە لە پەرستراوەکانمان دەس بەرنادەین، بڕوایش بە تۆ ناهێنین، ئێمە هەر ئەوەندە دەڵێین: ڕەنگە هێندێك لەوانەی دەیانپەرستین تووشی شتێکیان کردبێ. وتی: خوا بە شایەت دەگرم، ئێوەش هەروەها شایەت بن، لە ئەوەی ئێوە دەیپەرستن بەرکەنارم (دورم) بێجگە لە خوا، سا هەمووتان فێڵم لێ بکەنو مۆڵەتیشم مەدەن. من خۆم سپارد بەو خوایە کە پەروەرندەی منیشو پەروەرندەی ئێوەیشە، هەر شتێ دەجوڵێتەوە ژیانو بژێوی لەسەر ئەوەو ڕێگەی پەروەردگارم ڕاستە ڕێیە[3].

### بەسەرهاتی ڕەوانەکرانی عاد

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حاریسی بەکریەوەئەڵێت: ڕۆشتم نارەزای خۆم دەربڕم لەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە عەلای کوڕی حەزرەمی تێپەڕیم بەلای زوبەدەدا لەو کاتەدا پیرەژنێکی تەمیمی بە تەنیا خۆی لەوێدا بوو، پێی وتم: ئەی بەندەی خوا پێویستیەکم هەیە تا لای پێغەمبەری

---

[1] الشعراء (١٢٨_١٣١).

[2] هود (٥٣–٥٦).

[3] الطبري (١٢/٥٠٧).

خودا(ﷺ) ئایا تۆ پێی دەگەیەنی بۆم؟ وتی: لەگەڵ خۆمدا هێنامو گەیشتمە مەدینە لەو کاتەدا مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، هەر لەو کاتەدا ئاڵایە دەشەکایەوەو بیلالیش شمشێرەکەی کردبوە شانیو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو (ﷺ) وتم: ئەم خەڵکە بۆ چی کۆ بونەتەوە؟ وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت عەمری کوڕی عاس ڕەوانە بکات بۆ شوێنێ. وتی: دانیشتمو چووە شوێنی خۆی، ئیزنم لێ خواست کە بچمە خزمەتی، ئیزن دراموچوومە ژورەوەو سڵاوم کرد، فەرمووی: ئایا لە نێوان ئێوەو لە نێوان تەمیمدا شتێ هەیە؟ وتم: بەڵێ، لە شەڕێکدا زاڵ بوین بەسەریاندا، تێپەڕیم بە لای ژنێکدا لە بەنی تەمیم کە بە تەنیا خۆی لەوێدا بوو، داوای لێ کردم کە بیهێنم بۆ لای تۆ، ئەوەتا لەبەر دەرگاکەیە. ئیزنی داو هاتە ژورەوە. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر بە لاتەوە باشە لە نێوان ئێمەو لە نێوان تەمیمدا بەربەستێ دانێیت با لە دەهناء بێ پیرەژنەکە زۆر تووڕەو ناڕەحەت بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆ کوێ (يُضْطَرُّ مُضطرُّكَ؟) وتی: وتم: نمونەی منیش وەك ئەوەی پێش وایە کە وتی: معزى حملت حتفها) ئەم پیرەژنەم لەگەڵ خۆم هێنا نەمزانی دەبێتە دوژمنم. پەنا دەگرم بە خوداو بە پێغەمبەرەکەی کە من وەك نێرراوەکانی عاد بم! پێی وتم: نێرراوی عاد کامەیە؟ (پێغەمبەر لەو زیاتر شارەزای ئەو باسە بوو، بەڵام هەڵی دەنا کە بەردەوام بێ لەسەر قسەکەی)، وتم: هۆزی عاد تووشی گرانیە هاتن، شاندێکی خۆیان نارد کە پێیان دەگوت: قەیل بەلای مەعویەی کوڕی بەکردا تێپەڕی مانگێ لەلای مایەوە عارەقی باشی ئەدایەو دوو کەنیزەیش گۆرانی بۆ دەگوت پێیان دەگوتن (الجراوتان) کە مانگەکە کۆتایی هات ڕۆشت بۆ کێوەکانی مەهرەو وتی: ئەی خودایە تۆ خۆت دەزانی کە من نەهاتوم بۆ لای نەخۆشێ چارەسەری بکەم، وە نەهاتوم بۆ لای دەس بەسەرێ کە ئازادی بکەم، ئەی خودایە باران ببارێنە بۆ عاد، کە بارانت بۆ نەباراندوە، چەند پەڵە هەورێکی ڕەش بە لایدا تێپەڕی، بانگەوازێکی لێوە کرا دەیگوت: هەڵبژێرە: سەیری هەورەکەی کرد هەوری ڕەشیشی تیا بوو، بانگێکی لێوە کرا: دەی ها بیبە. هەموو لە بەین چوونو کەسیان لێ دەرنەچوو. وتی: ئەوەی بۆم باس کراوە، بایەکیان بۆ ڕەوانە کرا بە ئەندازەی ئەوەی کە بەم ئەنگوستیلەی مندا بڕوات، هەتا هەموو تیا چوون، ئەبووائل وتی ڕاستی گوتوە. پیاو یان ئافرەت کاتێ کە ڕەوانە بکرانایە لێیان بە شاندێ، دەیانوت: وەك شاندەکەی عاد مەبن ئیمامی ئەحمەدیش هەر وا ڕیوایەتی کردوە لە موسنەدەکەیدا[1].

تیرمیزیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە. نەسائیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردوە[2].

---

[1] أحمد (٤٨٢/٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي (١٦١/٩)، النسائي في الكبرى (١٨١/٥)، إبن ماجة (٩٤١/٢)، حەسەنە.

﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ
مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا
قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ
قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ
﴿٧٦﴾ فَعَقَرُوا۟ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾﴾

## جیٚو شویٚنی هۆزی سەموودو ڕەچەڵەكیان

زانایانی تەفسیرو ڕەچەڵەك ناسی گوتیان: سەموود كوڕی عاسیرە كوڕی ئیرەمی كوڕی سامی كوڕی نووحە (سەلامی خوای لیٚبیٚ) كە برای جەدیسی كوڕی عاسیرە، هۆزی تەسمیس هەر بەو شیٚوەیەن، ئەمانە هەموو لە بنەماڵە عەرەبەكانی عاریبەن لە پیٚش ئیبراهیمی خەلیلدا (سەلامی خوای لیٚبیٚ) هۆزی سەموود لە دوای هۆزی عاد هاتوون. شویٚنەكانیان بەناوبانگە لە نیٚوان حیجازو شامدان ڕوەو ئەو شویٚنە، كە پیٚی دەڵیٚن (وادي القُرى) و دەوروبەری. پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) تیٚپەڕی بەلای دیٚهاتو شویٚنەكانیاندا، كاتیٚ كە دەڕۆشت بۆ تەبوك ساڵی نۆی كۆچی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعومەرەوە گوتی: كاتیٚ پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) بەو خەڵكەوە لە تەبوك دابەزی لە نزیك شویٚنیٚكدا حیجریان پیٚ دەوت، لەلای خانوەكانی سەموودا. خەڵكەكە دەستیان كرد بە ئاو هیٚنان لەو بیرانەی كە هۆزی سەموود ئاویان لیٚ دەخواردەوە. هەویریان لیٚ كردو قازانیان لیٚ نایە سەر ئاگر. پیٚغەمبەری خودا فەرمانی پیٚكردن كە قازانگەكان بڕیٚژنو هەویرەكەیش بە ئالك بدەن بە وشترەكان، پاشان شویٚنەكە پیٚ گواستنەوە بۆ سەر ئەو بیرەی كە وشترەكە ئاوی لیٚ دەخواردەوە، لیٚشی قەدەغە كردن بچنە ئەو شویٚنانەی كە ئەو هۆزانە تیٚیدا سزا درابوون. پاشان فەرمووی: (من دەترسم لەوەی ئیٚوەش وەك ئەوان تووشی سزا ببن مەچنە سەریان).[1] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە ئەڵیٚت: پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) كە لە حیجر بوو فەرمووی: (نەچنە لای

---

[1] أحمد (١١٧/٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

ئەوانەی کە سزا دراون، ئەگەر چوون بە گریانەوە بچنە سەریان، ئەگەر نەگریان نەچنە لایان نەکا ئێوەیش وەك ئەوانە تووشی سزا ببن)[1]، ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە.[2]

**بەسەرهاتی پێغەمبەر سالح و (سەلامی خوای لێبێ) سەموود**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا﴾ بۆ لای هۆزی سەموودیش سالحی برای خۆیانمان بەڕێ کرد. ﴿قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ وتی: ئەی گەلەکەم! عبادەتی خودا بکەن جگە لەو ئێوە خودایەکتان نیە. گشت پێغەمبەران بانگی خەلکی دەکەن کە تەنیا خوا بپەرستن کە شەریکی نیە، وەم خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[3] بەر لە تۆش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، رامان سپارد، هیچ پەرستراوێك جگە لە من نیەو هەر تەنیا من بپەرستن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[4] بۆ ناو هەموو کۆمەلێك پێغەمبەرێکمان بەڕێ کرد کە خوا بپەرستن‌و لە شەیتان دوورە پەرێز بن.

**هۆزی سەموود داوای وشترێکیان کرد لە بەردێ بێتە دەر، وشترێ هاتە دەر**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ ئەوا لەلایەن پەروەردگارتانەوە، ئەم وشترەتان بە نیشانە بۆ هاتوە. لێی گەڕێن با لە زەوی خوادا بلەوەڕێ هیچ زیانێکتان بۆی نەبێ، دەنا تووشی ئازاری زۆر بە ژان دەبن، لە بیرتان بێ پاش هۆزی عاد ئێوەی کردە جێنشین‌و لەسەر زەمین دایمەزراندن، لە پێ دەشتەکانی کۆشکتان بەرز کردەوەو لە کێوەکانیشدا

---

[1] أحمد (٢/٧٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٤٣٦)، مسلم (٤/٢٢٨٦).

[3] الانبياء (٢٥).

[4] النحل (٣٦).

خانووتـان تاشـی، بـەهرەکانی خواتـان لـە بـیر بـیّو پـیّ دامـەگرن لەسـەر بەدفـەڕی لـە زەویـدا. سـەر گەورەکانی هۆزەکەی (ئەوانەی لەخۆبایی بوون لای کەم دەستو هەژارەکانو ئەوانەی بڕوایان هێنا بوو گوتیان: ئایا ئێوە پێتان وایە سالّح لەلای پەروەرندەیەوە ڕاسپێردراوە؟ وتیـان: ئێمـە باوەڕمـان بـەوە هێناوە کە پێی ڕەوانە کراوە. خـۆ بـەزل زانـەکان وتیـان: ئێمـە لـەوەی کـە بڕواتـان پـیّ هێنـاوە بڕوا ناکەین. کاتیّ کە پێغەمبەر سالّح (سەلامی خوای لێبیّ) پێی گوتن: ئەم نیشانەتان لەلایەن خـوداوە بـۆ هاتوە لەسەر ئەو پەیامەی کە مـن بـۆم هێنـاون، چـونکە ئەوانـە بـوون کـە داوایـان لـە سـالّح کـرد کـە نیشانەیەکیان بۆ بێنیّ، پێشنیاریان کرد لەو بەردە ڕەقەی کە خۆیان دیاریـان کـردوە، بـەردێکی تـەنیا بوو لە ناوچەی حیجر کاتیبەیان پیّ دەگوت. داوایان لیّ کرد لەو بەردە وشترێکی وا بیّ سکی دە مانگو بێچوەکەشی لە سکیدا بجولیّ. سالّح (سەلامی خوای لێبیّ) بەلێنو پـەیمانی لیّ وەرگرتن: ئەگـەر خـودا وەلامی داواکەی دانەوەو داواکەی لیّ قبولّ کردن، بڕوای پیّ بهێننو شوێنی بکـەون، کـاتیّ ئـەو بـەلێنو پەیمانەیان پێدا لەسەر ئەوە. سالّح (سەلامی خوای لێبیّ) هەلّسا بـۆ نوێژەکـەیو پاڕایـەوە لـە خـودای گەورە، بەردەکە کەوتە جولانەوە پاشان درزی بردو وشترێکی سكّ پڕ بە ژانەوە بێـچوەکەی لـە سـکیدا دەجولا، هاتە دەر لێی. چۆن داوایان کردبوو. ئا لەو کاتەدا سەرۆکی هۆزەکەیان کـە نـاوی: جونـدەعی کوڕی عەمر بوو ئەوانەیش لەگەلّی بوونو بە قسەیان دەکرد هەموو بڕوایان هێنا. گەورە پیاوانی هـۆزی سەموود ویستیان باوەڕ بێنن، زەئوابی کوڕی عەمری کوڕی لەبیب نەیهێشت باوەڕ بێنن. وە حوباب کە خاوەنی بتەکان بوو. وە ڕەبان کوڕی سەمعەری کوڕی جەلمەس و جوندەعی کـوڕی عـەمر ئامۆزایـەکی هەبوو پێیان دەوت (شەهابی کوڕی خەلیفەی کوڕی مەخلات کوڕی لەبیدی کـوڕی جـواس)، ئەمانـە لـە گەورە پیاوانو پیاوە بەڕێزەکانی هۆزی سەموود بوون. ویستی باوەڕ بێنیّ، ئـەو کۆمەلّـە نەیانهێـشتو ئەویش بە گـوێی کـردن، لـەو بارەیـەوە پیـاوێکی خـاوەن بـاوەڕی هـۆزی سـەموود کـە پێیـان دەوت: مەهوشی کوڕی عەنەمەی کوڕی زەمیل (ڕەحمەتی خوای لێبیّ) ئەم شیعرانەی وت:

و كانت عَصبةٌ من آل عَمْرو — الى دين النبي دَعَوا شَهاباً

عزيز ثمود كُلهم جميعاً — فَهَمَّ بأن يُجيبَ فلَو أجابا

لأصبَح صالحٌ فينا عزيزاً — و ما عَدَلوا بصاحبهم ذُوَاباً

و لكنّ الغُدَاة من آل حجر — تولّوا بعد رُشْد دنَاباً

واتە: کۆمەلّیّ لە ئالی عەمر شیهابیان بانگ کـرد بـۆ ئـاینی ئـەم پێغەمبـەرە، کـە بـەڕێزترینی گـشت پیاوەکانی سەموود بوو، خەریك بوو باوەڕ بێنیّ، ئەگەر باوەڕی بهێنایە، سـالّح (سـەلامی خـوای لێبـیّ) دەبووە بەڕێزترین کەس لە نێوانماندا و نەیان دەگۆڕیەوە بە زوئوابی هاوەلّیان، بەلام گومڕایی ئالی حجر دوای ئەوەی شارەزا بوون ملیان نەداو بوونە گورگ. ماوەیەك وشترەکەو بێچوەکەی لـە ناویانـدا بـوو،

ڕۆژێ ئەو ئاوی بیرەکەی دەخواردەوە، ڕۆژێکیش وازی لێ دەهێنا بۆ ئەوان. ئەو ڕۆژەی ئاوەکەی دەخواردەوە ئەوانیش شیرەکەیان دەخوارد دەیان نۆشی هەرچی دەفریان بوو بە ئارەزوی خۆیان لێیان پڕ دەکرد وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ﴾[1] پێیان بڵێ کە ئاوەکە لە ناویاندا بەش کراوە هەرکەسە لە نۆرەی ئاوی خۆی ئامادە بێ. وە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ هَٰذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾[2] ئەمە وشترێکە، کە نۆرە ئاوێکی هەیەو ئێوەیش نۆرە ئاوێکتان هەیە لە ڕۆژێکی دیاری کراودا. کە دەچوە دەرەوە بۆ هەندێ لەو شیوانە لە ڕێگایەکەوە دەچوو لە ڕێگایەکی ترەوە دەگەڕایەوە لەبەر گەورەیی، ئاوو خواردنێکی ئێجگار زۆری دەخواردو دەخواردەوە (وەك باس کراوە) گیانەوەرێکی زۆر گەورەو دیمەنێکی ناوازەی هەبوو. کاتێ کە تێپەڕییایە بە لای ئاژەڵو ماڵاتەکانیاندا، دەترسانو ڕایان دەکرد لێی. کە ئەم حاڵە درێژەی کێشا بێ باوەڕیەکەیان هەر زیادی دەکرد بەرانبەر ساڵح (سەلامی خوای لێبێ) بڕیاریان دا وشترەکە بکوژن. بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژێ ئاوەکە بەرن بۆ خۆیان، گوتراوە: هەموو ڕێکەوتن لەسەر کوشتنی. قەتادەئەڵێت: هەواڵم پێدراوە کە ئەو کەسەی وشترەکەی کوشت گەڕا بەسەر هەموویانداو گشتیان ڕازی بوون بە کوشتنی، هەتا دەگەڕا بەسەر منداڵانو ژنانیشدا لە ماڵەکانیاندا.[3] منیش دەڵێم: ئەمە دیارو ئاشکرایە، چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾[4] جا باوەڕیان پێ نەکردو سەریان بڕی، ئەوسا کە پەروەردگاریان، بەهۆی گوناهەکانیانەوە، بەڵایەکی ناردە سەریان، هەمووی ڕێکی زەوی کردن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا بِهَا﴾[5] وشتریشمان بە ئاشکرا دا بە سەموود، کەچی ناهەقیان لەگەڵ کرد. پاشان خودای گەورەلێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَعَقَرُوا النَّاقَةَ وَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ لە فەرمانی خودای خۆیان وازیان هێناو وشترەکەیان پەل پەل کرد (کوشت)، وتیان: ساڵح ئەگەر ڕاستە پێغەمبەری، چۆنت هەڕەشە لێ کردین بەجێی بێنە. کوشتنی وشترەکەی خستە گەردنی گشت هۆزەکە، ئەوەیش نیشانەی ئەوەیە کە هەموویان ڕازی بون بەو کارە والله أعلم.

---

[1] القمر (٢٨).

[2] الشعراء (١٥٥).

[3] الطبري (٥٣٧/١٢).

[4] الشمس (١٤).

[5] الاسراء (٥٩).

**کوشتنی وشترەکە**

ئیبنوجەریرو کەسانی تریش لە زانایانی تەفسیر وتویانە هۆکاری کوشتنی وشترەکە کە ژنێك بوو لە خۆیان ناوی عەنیزی کچی غەنەمەی کوڕی مەجلەز بوو پێیان دەوت ئوموغەنەم پیرەژنێکی خوانەناس بوو، یەکێك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی سالح (سەلامی خوای لێبێ) کیژی جوان‌و سامانی زۆریشی هەبو، هاوسەرەکەیشی زوئابی کوڕی عەمر بوو کە یەکێك بوو لە سەرگەورەکانی سەموود، ژنێکی تریش ناوی سەدوفی کچی مەحیا کوڕی دهری کوڕی مەحیا بوو. خاوەن بنەماڵەو سامان‌و جوانیش بوو، هاوسەری پیاوێکی موسوڵمانی سەموودی بوو لێی جیا بوەوە. ئەم دوانە دەگەڕان بە شوێن کەسانێکدا کە بە گوێیان بکەن وشترەکەیان بۆ بکوژێ سەدوف ناردی بە شوێن پیاوێکدا ناوی حەباب بوو. پێی وت ئەگەر ئەو وشترە بکوژێ شوی پێدەکات بەڵام حەباب ڕازی نەبوو. پاشان ئامۆزایەکی هەبوو ناوی مەسدەعی کوڕی مەهرەجی کوڕی مەحیا بوو ناردی بە شوێنیدا، ئەو داواکەی قەبوڵ کرد. عنیزەی کچی غەنەمیش ناردی بە شوێن قەداری کوڕی سالفی کوڕی جوندەعدا کە پیاوێکی کورتە بالای ناشیرین بوو، خەڵکی دەیانگوت زۆڵەو لەو باوکە نیە کە دەڵێن کوڕی ئەوە، کە سالیفە، بەڵکو هی پیاوێکی ترە ناوی سەهیادە بەڵام لەلای سالیف لە دایك بووە. عەنیزە پێی ووت: هەر کچێکت دەوێ لە کچەکانم پێت ئەدەم بەو مەرجەی ئەو وشترە بکوژی. ئیتر لەو کاتەوە قەداری کوڕی سالف‌و مەسدەعی کوڕی مەهرەج هەڵسان‌و هەوڵیان دا چەند کەسێکی تریان گومڕا کرد لە هۆزی سەموود حەوت کەس بە گوێیان کردن‌و لەگەڵیان چوون. بوون بە نۆ کەس. ئەوانە بون کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾[1] لەو شارەدا نۆ کەس (نۆ دەستە) هەبوون کە خراپەیان لە زەویدا دەکردو بە هیچ جۆرێ چاکەیان نەدەکرد. ئەمانە سەرۆکی هۆزەکانیان بوون، ئەو هۆزە خوانەناسەیان هەبوو بەلای خۆیاندا ڕاکێشاو هاوکاریان کردن بۆ کوشتنی وشترەکە. دەرچوون‌و چاودێری وشترەکەیان دەکرد کاتێ کە لای ئاوەکە لاچوو، لە بنی بەردێکدا قەداری کوڕی سالیف چوو بووە بۆسە بۆی لە ڕێگەکەیدا، مەسدەعیش لە بنی بەردێکی تردا بۆی دانیشتبوو، بە لای مەسدەعدا وشترەکە تێپەڕی تیرێکی لێ دا کێشای بە ماسولکەیەکی ڕانیدا، ئوموغەنەم واتە: عونەیزە دەرچوو داوای لە کچەکەی خۆی کە ئافرەتێکی زۆر جوان بوو کە ڕووی خۆی دەرخات بۆ قەدار هەڵی دەناو، ئەویش زۆری هێنا بە وشترەکە بە شمشێرەکەی دای لە دەماری پشتی‌و کێشای بە زەویداو کەوت‌و دەینالاند وەك ئاگاداریەك بۆ بێچوەکەی پاشان قەدار دای لە گەردنی‌و سەری بڕی. بێچوەکەی ڕایکرد تا خۆی گەیاندە کێوێکی بەرزو گەورە چووە سەر بەردێك کە

---

[1] النمل (٤٨).

دەنگێکی لەوە دەهات[1]، عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوەلە موعەمـەرەوە لـەو کەسانەی کە لـە حەسـەنی بەسرییان بیستوە کە (بێچوەکە) وتی: ئەی پەروەردگارم دایکم لە کوێیە؟ وتراوە: سێ جار ناڵە ناڵی کردوەو پاشان چوەتە ناو بەردێو لـە ناویـدا ون بـووە. وتراویشە: شـوێنی ئـەمیش کـەوتوەو لەگـەڵ دایکیدا سـەری بڕیـوە.[2] والله أعلم. کـە ئـەو کارەیـان ئـەنجام داو لێبونـەوە لـە سـەربڕینی وشترەکە، هەواڵەکە گەیشتە ساڵح (سەلامی خوای لێبێ) هات بۆ لایان هەموو کۆبوبونەوە کاتێ کە چاوی کـەوت بە وشترەکە گریـاو فـەرمووی: ﴿تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ﴾[3] سێ ڕۆژ لە ماڵی خۆتاندا ڕاببوێرن، ئەمە بەڵێنی (خودایەو) بێ درۆیە.

**هەوڵی بەدفەڕان بۆ کوشتنی ساڵح و سەرەتای سەرهەڵدانی سزاو پاشان دابـارینی سـزا بـۆ هـۆزی سەموود**

ڕۆژی چوار شەممە بوو وشترەکەیان کوشت، کە ئێوارە داهات ئەو نۆ کەسـە بڕیاریـان دا کـە سـاڵح (سەلامی خوای لێبێ) بکـوژن. وتیـان: ئەگـەر ڕاسـتی کردبـێ ئـەوا پـێش خۆمـان خستوە خـۆ ئەگـەر درۆیشی کردبێ ئەوا خستومانەتە لای وشترەکەی ﴿قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ﴾[4] وتیـان: ئێـوە سـوێند بخـۆن، ئێمـە ئەمشەو خـۆیو ماڵو منداڵیشی لەناو دەبەین، بە خوێنگرانیشی دەڵـێن: کـە ئـەو خێزانـە کـوژراون ئێمـە ئاگامـان لێ نـەبوە ڕاستیش دەکەین، خەریك بوون کەتنێ بگێڕن، ئێمەش کەتنی خۆمان پێکردن، بـێ ئـەوە هەسـتی پـێ بکەن. سا سەیرکە، سەرئەنجامی کەتنەکەیان بە کوێ گەیشت. کاتێ کە بڕیـاری کوشـتنی ساڵحیان دا (سەلامی خوای لێبێ) لەسەری ڕێکەوتن بە شەو بـۆی هـاتن هـەتا ئـەو پێغەمبـەرەی خـودا لەناوبـەرن، خودای گەورە بەردی بۆ ناردنو بەردەبارانی کردن لە پێـشداو بـەر لـە هۆزەکـەیان. دەسـتەڵاتو پلـەو پایە بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیەتی وای لێهات ڕۆژی پێنج شەممە کە ئەو ڕۆژە یەکەم ڕۆژ بوو لەو ڕۆژانەی هۆزی سەموود چاوەڕوانیان دەکرد، ڕوویان زەرد هەڵگەڕا بوو وەك چۆن ساڵح (سـەلامی خـوای لێبـێ) بەڵێنی پێدابون. وە لە ڕۆژی دووهەمدا لـە ڕۆژەکـانی چـاوەڕوانی کـە ڕۆژی هـەینی بـوو ڕوویـان سـوور هەڵگەڕا، وە لە ڕۆژی سێهەمدا لە ڕۆژەکانی خۆشیان کە ڕۆژی شەممە بوو ڕوویان ڕەش هەڵگەڕا، کاتێ

---

[1] الطبري (١٢/٥٣١).

[2] عبدالرزاق (٢/٢٣١).

[3] هود (٦٥).

[4] النمل (٤٩-٥١).

ڕۆژیان کردەوە لە ڕۆژی یەکشەمەدا، دانیشتبوون‌و چاوەڕوانی بەڵاو سزای خوایان دەکرد، پەنا بە خوا لەو سزایە، نەیاندەزانی چیان بەسەردێ‌و چۆن سزایان بۆ دادەبارێ، خۆر هەڵهات نەعرەتەیەکیان لە ئاسمانەوە بۆ هات لەگەڵ زەمین لەرزەیەکی زۆر توند لە ژێریانەوە، گیانیان دەرچوو کۆتایی بە ژیانیان هات لە یەك کاتدا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ زۆر بە توندی بومەلەرزەیەکیان بۆ هات، هەر لەناو ماڵەکانیاندا هەموو مردن. واتە: لە هۆش خۆیان چوون‌و گیانیان تێدا نما، هیچ کەسێ لای لێ نەکردنەوە، نە گەورە نە بچوك، نە نێر نە مێ. دەڵێن: جگە لە کچێ کە لە جێگەدا کەوتبوو، کە ناوی کەلبە کچی سەلق پێشیان دەوت (الذُّرَيْعة) کە خوانەناس بوو زۆر قینیشی لە سالح بوو (سەلامی خوای لێبێ) کاتێ ئەو سزای بە چاوی خۆی بینی قاچەکانی کرایەوە (واتە: چاك بوە، هەڵساو زۆر بە پەلە ڕۆشت، چوو بۆ ئاوەدانیە لە شوێنە ئاوەدانەکان، ئەوەی چاوە پێی کەوتبوو بۆی گێڕانەوەو چیش بەسەر هۆزەکەیدا هاتوە. پاشان داوای ئاوی کرد کە بیخواتەوە. کاتێ ئاوەکەی خواردەوە گیانی دەرچوو.[1] زانایانی تەفسیر وتویانە لە نەوەی سەموود هیچ کەسیان نەما جگە لە سالح‌و (سەلامی خوای لێبێ) ئەوانەی شوێنی کەوتن (ڕەزای خوایان لێبێ) تەنیا پیاوێ نەبێ کە ئەبو ڕیغالیان پێ دەوت، لەو کاتەدا کە ئەو بەڵایە بەسەر سەمووددا هات ئەو لە مەککە بوو تووشی ئەوە نەبوو. دوای چەند ڕۆژێ گەڕایەوە بەرەو ئەوێ، بەردێ لە ئاسمانەوە بۆی هات‌و کوشتی. عەبدوڕەزاقی کوڕی موعەمەر وتی: ئیسماعیلی کوڕی ئومەیە بۆی باس کردم کە پێغەمبەر(ﷺ) بەلای گۆڕی ئەبوڕیغالدا تێپەڕی فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەمە کێیە؟ وتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن. فەرمووی: (ئەمە گۆڕی ئەبوڕیغالە پیاوێك بوو لە هۆزی سەموود، لەو کاتەدا لە حەرەمی مەککەدا بوو، حەرەمی خوا پاراستی لە سزای خودا، کاتێ کە دەرچوو ئەوەی تووشی هۆزەکەی بوو، ئەمیش تووشی هات. ئا لێرەدا نێژراوەو چڵێ ئاڵتوونیشی لەگەڵدایە لەناو گۆڕەکەیدا. ئەو خەڵکە دابەزین‌و بە شمشێرەکانیان گەڕان بۆی چڵە زێڕەکەیان دەرهێنا)[2]. عەبدوڕەزاق لەموعەممەر ئەویش لە زوهەریەوە وتی: ئەبوڕیغال باوکی سەقیفە[3].

﴿فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾﴾

[1] الطبري (١٢/٥٣٤).

[2] عبدالرزاق (٢/٢٣٢).

[3] عبدالرزاق (٢/٢٣٢).

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴾ ساڵح لەوان دوور کەوتەوە گوتی: ئەی گەلەکەم من پەیامەکانی خودام پێگەیاندن، زۆریش ئامۆژگاریم کردن، بەلام ئێوە ئامۆژگاری کارانتان خۆش ناوێ. ئەمە خۆی سەرزەنشت کردنێ بوو لە ساڵحەوە (سەلامی خوای لێبێ) بۆ هۆزەکەی، کاتێ خودا لەناوی بردن بەهۆی دژایەتی کردنو یاخی بونیان بەرانبەر بە خوداو حەقیان قەبوڵ نەبوو پشتیان لە ڕێی ڕاست دەکردو بەرەو گومڕایی ملیان دەنا. دوای ئەوەی کە لەناوچوون ساڵح (سەلامی خوای لێبێ) قسەی لەگەڵدا دەکردن وەك سەرزەنشت کردنو تانە لێدانیان (دەیگوت زۆر ئامۆژگاریم کردن، بەلام ئێوە ئامۆژگاری کارانتان خۆش ناوێ)، ئەوان ئەو قسانەیان دەبیست، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە سەرکەوت بەسەر خەڵکی بەدردا (سێ ڕۆژ لەوێدا ماوە پاشان فەرمانی دا کە وڵاغەکەی بۆ ئامادە کەن دوای سێ ڕۆژ لە کۆتایی شەودا سواری بوو پاشان ڕۆشت تا چووە سەر بیرەکان، بیرەکانی بەدر ئەیفەرموو: (ئەی ئەبوجەهلی کوڕی هیشام ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ئەی شەیبەی کوڕی ڕبیعە وە ئەی فلانی کوڕی فلان. ئایا ئەوەی کە پەروەردگارتان بەڵێنی پێدان دەستتان کەوت بەڕاستی من ئەوەی پەروەردگارم بەڵێنی پێدام بەڕاستی دەستم کەوت)، عومەر پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ چۆن قسە لەگەڵ کەسانێ دەکەی کە بۆنیان کردوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو خودایە کە گیانی منی بەدەستە ئێوە چاکتر گوێتان لەوە نیە کە من دەیڵێم. بەلام ناتوانن وەڵام بدەنەوە)[1]، ساڵحیش هەر وای وت بە هۆزەکەی: ﴿لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ﴾ من پەیامەکانی خودام پێگەیاندنو ئامۆژگاریم کردن، هەر بۆیە فەرمووی: ﴿وَلَـٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّـٰصِحِينَ﴾ بەلام ئێوە ئامۆژگاری کارانتان خۆش ناوێ.

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ ﴾

**بەسەرهاتی لووت (سەلامی خوای لێبێ) و هۆزەکەی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾ لووتیشمان نارد، (وذكر لوطاً) واتە باسی لووتیش بکە کاتێ بە هۆزەکەی خۆی وت: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ئێوە کاری ئەوەندە شورەیی دەکەن، بەر لە ئێوە کەس لە دنیا نەیکردوە؟ ئێوە بۆ خۆ ڕەحەت کردن

[1] فتح الباري (٧/٣٥١)، مسلم (٤/٢٢٠٣).

لە بری ژنان پەلاماری پیاوان ئەدەن، بێگومـان ئەنـدازەتان دەرکـردوە. لـووت (سـەلامی خـوای لێبـێ) کوڕی هارانی کوڕی ئازەرە، برازای ئیبراهیمی خەلیلە(سـەلامی خـوای لێبـێ) لەگـەڵ ئیبراهیمـدا بـڕوای هێناو لەگەڵیشی چوو بۆ سـەر زەمینـی شـام، خـودای گـەورە نـاردی بـۆ سـەر خـەڵکی سـەدومو ئـەو دێهاتانەی دەوری، بانگی کردن بۆ لای خوداو فەرمانی پێکردن کە چاکە بکـەنو واز لـەو کـارە خـراپو ناڕەواو بەدفەڕیانە بێـنن کـە خۆتـان داتـان هێنـاوەو کـەس لـە پـێش ئێـوە لـە نـەوی ئـادەم لـە دنیـا نەیکردوە. کە پەلاماردانی پیاوانە بۆ ڕابواردن لە باتی ژنان، ئەمە شتێکە کە نەوی ئـادەم خـوی پێـوە نەگرتوەو ئالودەی نەبوەو بە خەیاڵیشیاندا نەهاتوە. تا خەڵکی سەدوم بەوە هەڵسان نەفرینی خوایـان لێبێ. هەر بۆیە لووت (سەلامی خـوای لێبـێ) پێـی وتـن: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ عـەمری کـوڕی دینار لەم ئایەتەدا: ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ دەڵێت: لە پێشدا هیچ نێرێ سـواری نێـرێ تر نەبوە. واتە: نێر سێکسی لەگەڵ نێردا نەکردوە. هەتا ئەو کاتەی هۆزی لووت کردیان.[1] واتـە: وازتـان هێنا لە ژنانو ئەوەی خوا دروسـتی کـرد بـوو بۆتـان لێیـان چـوون بـۆ پیـاوان، ئەمـەیش زیـادەڕەوی و نەفامیە کە ئێوە دەیکەن. چونکە دانانی ئەو شتەیە کە لە شوێنی خۆیدا نیە. هـەر بۆیـە لـە ئایـەتێکی تردا لـووت (سـەلامی خـوای لێبـێ) ئەفـەرموێت: ﴿قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾[2] ئەوانـە کیـژەکانی منن، چیتان دەوێ وەرن لەگەڵیان بیکەن. ڕێنمایی کردن بۆ لای کچەکانی خۆی، پۆزشیان بۆ هێنایەوە کە ئارەزویان لە کچەکانی نیـە ﴿قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾[3] وتیـان: خـۆت ئەمەت زانیوە، هیچ کارێکمان بە کچەکانی تۆ نیە، دیارە بۆ خۆشت دەزانی چیمان دەوێ. واتە: خـۆت باش زانیوتە کە ئێمە کارمان بە ژنانەوە نیە حەزیشیان لێ ناکەین، وە چاکیش دەزانی کـە مەبەسـتمان میوانەکانتە.

﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾﴾

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ هۆزەکەی لووت وەڵامیان هەر ئەوەندە بوو: لـە شـاری خۆتـان دەریـان کـەن، ئەمانە کەسانێکن کە دەیانەوێ بە پاکو خاوێنی بژین! واتە: وەڵامی لووتیـان نەدایـەوە، تـەنیا ئـەوە

[1] الطبري (١٢/٥٤٨).

[2] الحجر (٧١).

[3] هود (٧٩).

نەبیٚ کە بڕیاری دەرکردنو دوور خستنەوەی خۆیو ئەو کەسانەشیان دا کە لەگەڵی بوون، خودای گەورە ئەمانی بە سەلامەتی دەرکردو، هۆزەکەشی لە شوێنی خۆیاندا لەناو بردو بنەبڕ کرد بە سەرشۆڕیو ڕسوایی. قەتادە لەم ئایەتەدائەڵێت: ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ ئەمانە کەسانێکن دەیانەویٚ بە پاكو خاوێنی بژین، وتی: بە بێعەیب عەیبداریان کردبوون[1] واتە: پاك داوێنیەکەی ئەوانیان بە عەیب دانابوو. موجاهید ئەڵێت: ئەوانە کەسانیٚ بوون خۆیان پاكو خاوێن ڕادەگرت لە پاشی پیاوانو پاشی ژنان[2]، هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە[3].

﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ﴾ ئیتر خۆیو کەسو کاریمان ڕزگار کرد. هیچ کەس لە هۆزەکەی بڕوایان پیٚ نەهێنا جگە لە کەسو کارەکەی خۆی وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا ئەفەرموێت: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾[4] ئەوسا باوەڕدارانمان لیٚ دەرکرد ئێمە جگە تەنیا ماڵێك خواناسێکمان تێدا دەس نەکەوت ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ هەر تەنیا ژنەکەی نەبیٚ ئەو کەوتە شوێن بەجێماوانو باوەڕی نەهێنا بە لووت (سەلامی خوای لێبیٚ) لەسەر دینی هۆزەکەی مایەوە، یارمەتی هۆزەکەی ئەدا دژی لووت (سەلامی خوای لێبیٚ) ئاگاداری کردن بە هاتنی ئەو میوانانە بۆ ماڵیان بەو هێمایانەی کە لە نێوان خۆیو هۆزەکەیدا دایاننابوو. هەر بۆیە کە فەرمان درا بە لووت (سەلامی خوای لێبیٚ) لە شەودا کەسو کارەکەی دەرکاتو ژنەکەی پێیان نەزانیٚ تا لەگەڵیان دەرنەچیٚ لەو شارە. هەندیٚ دەڵێن: لەگەڵیان دەرچوو کاتیٚ سزاکە هات لای کردەوە ئەوەی تووشی هۆزەکەی هات تووشی ئەویش بوو. ڕاستتر ئەوەیە کە لە شارەکە دەرنەچوو لووتیش (سەلامی خوای لێبیٚ) ئاگاداری نەکردو لەگەڵ هۆزەکەی مایەوە. هەر بۆیە لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: لەوانە بوو کە ماوە، هەندیٚ دەڵێن: لەوانە بوو کە لەناوچوو. ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ بارانێکمان بۆ

---

[1] الطبري (١٢/٥٥٠).
[2] الطبري (١٢/٥٥٠).
[3] الطبري (١٢/٥٥٠).
[4] الذاريات (٣٥-٣٦).

ناردن، ئەمما باران. ئەم ئایەتە بەم ئایەتانە تەفسیر کراوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾[1] قوڕی خڕی وەك بەردمان، باراند بەسەریاندا بە دوای یەکداو بەبێ ناوبڕ. لەلای پەروەردگارت هەموو نیشانە کرابوون، بەلای ئەوە دەربارەی ستەمکاران هیچ دوور نیە. بۆیە لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾ دە بڕوانە پاشەڕۆژی ئەو تاوانبارانە چۆن بوو. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) سەیری پاشەڕۆژی ئەوانە کە، کە دەس کۆتا ناکەن لە بێ گوێی خوداو بڕوا بە پێغەمبەرەکەی ناکەن چۆن دەبێ. ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداوودو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێکتان بینی هەڵسا بە کاری هۆزی لووت کار کەرو کار تیا کراو بکوژن (فأقتلوا الفاعل و المفعول به))[2].

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾﴾

**بەسەرهاتی شوعەیبو (سەلامی خوای لێبێ) مەدیەن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ بۆ (مەدیەنیش) شوعەیبمان نارد، کە ئەویش هەر لە خۆیان بوو. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: ئەمانە لە نەوەی مەدیەنی کوڕی مەدیانی کوڕی ئیبراهیمە شوعەیب کوڕی میکیلی کوڕی یەشجنە دەڵێن: بە سریانی ناوی (یثرون)ە[3]. منیش دەڵێم: مەدیەن بۆ ئەو هۆزەو بۆ ئەو شارەیش بەکار هێنراوە کە لە نزیکی مەعانە لە ڕێگەی حیجازەوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ﴾[4] کە هاتە سەر ئاوی مەدیەن کۆمەڵێ لە خەڵکەکەی بینی ئاو هەڵدەگۆزن. ئەمانە خاوەن دارستانەکانن کە بەو زوانە خوا مەیلی لێبێ باسی دەکەین ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ

---

[1] هود (٨٢-٨٣).

[2] أحمد (١/٣٠٠)، الترمذي (١٤٥٦)، أبوداود (٤٤٦٢)، إبن ماجة (٢٥٦١)، لە حەسەن دەچێ.

[3] الطبري (١٢/٥٥٤).

[4] القصص (٢٣).

وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ وتی: ئەی گەلەکەم خودا بپەرستن، جگە لەو ئێوە خودایەکتان نیە، نیشانەیەکی ئاشکراشتان لای پەروەردگارتانەوە بۆ هاتوە، با پێوانەو تەرازوتان بەرانبەر بێ‌و لە ماڵی خەڵك مەدزنەوە لە زەویشدا (دوای ئاوەدانکردنی) بەدفەڕی مەکەن. ئەگەر بڕواتان بە خودا هەبێ ئەمە بۆ ئێوە باشترە. ئەمە بانگەوازی گشت پێغەمبەران بوە. ئەی خەڵکینە لەلایەن خواوە نیشانەی ئاشکرام بۆ هێناون لەسەر ڕاستی ئەو پەیامە کە بۆم هێناون، پاشان ئامۆژگاری کردن کە با پێوانەو تەرازویان بەرانبەر بێ‌و لە ماڵی خەڵك نەدزنەوە. واتە: خەیانەت لە ماڵی خەڵکی نەکەن، کەمیان بدەنێ لە کێشانەو پێوانەداو فێڵیان لێ بکەن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ هاوار بۆ تەرازوو بازان. تا دەگاتە: ﴿لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[1] ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندو تیژە، داوامان لە خودایە بمان پارێزێ لێی. پاشان خودای گەورە دێتە سەر باسی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ) کە پێی دەوترا: (خطيب الانبياء) لەبەر ڕەوانبێژی لە ئەو ئامۆژگاریە چاکەکانی.

﴿ وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا وَاذْكُرُوا إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ وَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ (٨٦) وَإِن كَانَ طَائِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُوا بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَائِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا فَاصْبِرُوا حَتَّىٰ يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ (٨٧) ﴾

شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ) داوای لە هۆزەکەی کرد کە سەرە ڕێگە لە خەڵکی نەگرن‌و ئازاری خەڵکی نەدەن چ ئازاری لاشەیی بێ یان ئازاری دەروونی وەك خودای مەزن ئەفەرموێت لەسەر زمانی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ): ﴿ وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ ﴾ لەسەر هەموو ڕێگایەکدا دامەنیشن بۆ ترساندنی خەڵك. واتە: هەڕەشەی کوشتن لە خەڵکی بکەن ئەگەر ماڵەکانی خۆیان بە ئێوە نەدەن. سوودی‌و کەسانی تریش وتویانە: ئەوانە ڕێگر بوون (كانوا عشارين)[2]، ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن: ﴿ وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ ﴾ واتە: هەڕەشەیان لەو خاوەنباوەڕانە دەکرد کە شوێنی شوعەیب دەکەوتن (سەلامی خوای لێبێ)[3] ڕای یەکەم بەهێزترە

---

[1] المطففين (١-٦).

[2] الطبري (١٢/٥٥٧).

[3] الطبري (١٢/٥٥٧).

چونکە ئەفەرموێت: ﴿بِكُلِّ صِرَٰطٍ﴾ لەسەر هەموو ڕێگایەکدا. بۆ دووهەمیش ئەفەرموێت: ﴿وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە لە ڕێگەی خودا لایاندەن، ڕێگای ئەویان بە لارو چەوت نیشان بدەن ﴿وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ﴾ لە بیرتان بێ ئێوە کەم بوون زۆری کردن. واتە: لەبەر ئەوەی کەمو بێدەستەلات بوون، زۆری کردنو بوونە خاوەندەستەلات. بەهرەکانی خودا لە بیر مەکەن کە پێی داون ﴿وَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ سەیرکەن پاشەڕۆژی بەدفەڕان بە کوێ گەیشت. واتە: لەگەڵ نەتەوە پێشوەکان کە چیان بەسەرهات لە سزاو تۆڵەی گرانی خودای گەورە لەبەر سەرپێچی کردنیان لە فەرمانەکانی خوداو بڕوا نەهێنانیان بە پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێبێ) پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ ئەگەر هەندێك لە ئێوە بڕوای هێناوە بەو شتانەی کە منی پێ سپێراوەو هەندێکیشتان بڕوایان پێ نەهێناوە، خۆ ڕابگرن تا خوا بۆ خۆی لە نێوانماندا دادوەری بکات، خۆشی چاکترین دادوەرە. بێگومان خودا پاشەڕۆژی لە خوا ترسانی تۆمار کردوەو بنەبڕ کردنی خوانەناسانیشی هەر تۆمار کردوە.

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾ پیاوماقوڵانی هۆزی (شوعەیب) کە لەخۆبایی بووبوون وتیان: ئێمە تۆشو ئەوکەسانەش کە لەگەڵ تۆ باوەڕیان هێناوە، لە شاری خۆمان دەردەکەین، یان دێنەوەسەر ئاینی ئێمە، ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خودای گەورەوە، کە بە چ شێوەیەك ئەو خودانەناسانە بەرەنگاری پێغەمبەرەکەی شوعەیبو ئەوانەی لەگەڵی بوون لە خاوەن باوەڕان بوونەتەوە، هەڕەشەیان لە خۆیو ئەوانەی لەگەڵی بوون دەکردن بە دەرکردن لە شارەکەیان یان ناچارکردنیان بە گەڕانەوە بۆ سەر ئاینەکەی ئەوانو ئەوەی ئەوانە دەیکەنو بەبێ ئەوانیش لەگەڵیاندا بیکەن. ڕووی قسەیان لەگەڵ

شوعەیب بوو، بەڵام مەبەستیان شوێنکەوتووەکانیشی بووە، ئەوانەی کە لەگەڵی بوون لەسەر ئەو ئاینە. خودای گەورە لەسەر زمانی شوعەیب دەفەرمووێت:﴿أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ﴾ وتی: ئەگەر حەزیش نەکەین. واتە: ئاخۆ ئێوە هەڵدەستن بەوکارە ئەگەر ئەوەی ئێوە ئێمەی بۆ بانگ بدەن حەزیشی لێ نەکەین، ﴿قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا﴾ شوعەیب وتی: ئەگەر بێینەوەسەر دینی ئێوە لەپاش ئەوەی کە خودا ڕزگاری کردین لێی، درۆمان بەدەم خوداوە هەڵبەستووە. بەو هاویەشانە دایدەنێن لەگەڵیدا، ئەمە قسەی شوعیبە بەڵام بەناوی خۆیو شوێنکەوتووەکانیەوە کردوویەتی، ﴿وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا﴾ ڕەوانیە بۆ ئێمە جارێکی تر بگەڕێینەوەسەر ئەو ئاینە، مەگین پەروەردگارمان مەیلی لێبێت. ﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾ زانستی پەروەردگارمان هەموو شتێکی گرتووەتەوە. ﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ خۆمان بە خودا سپاردووە، واتە: لە خەموو کارو فەرمانێکدا کە پێی هەڵدەستین یان وازی لێ دێنین، ﴿رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ﴾ ئەی پەروەردگارمان تۆ لە نێوان ئێمەو هۆزەکەماندا دادوەری بکە بە هەق، سەریشمان بخە بەسەریاندا، ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ﴾ چاکترین دادوەر هەرخۆتی. هەرگیز ستەم لەکەس ناکەیت.

﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ دیسان دەستەڵاتدارانی هۆزەکەی (ئەوانەی لە دین لایاندابوو) وتیان: ئەگەر شوێن شەعەیب بکەون بێگومان تووشی زەرەردەبن. خودای مەزن باسی زۆر بێ دینیو لاساریو مل نەدانی ئەمانە دەکات. کە چۆن لە گومراییدا ڕۆچوونو هەمیشە ئارەزوویان لە لەخراپەو سەرپێچی بوون هەربۆیە سوێندیان دەخوارد وەك خودای گەورە فەرموویەتی دەیانوت:﴿لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ ئەگەر شوێنی شوعەیببکەون بێگومان تووشی زیان دەبن. بۆیە خودای گەورە دوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ ئیتر بەهۆی ئەو بومەلەرزەوە کە بە توندی لێیدان. هەموو لە ماڵی خۆیاندا لەناوچوون. خودای گەورە لێرەدا فەرموویەتی ئەوانە بومەلەرزە لێی دان، وەك

چۆن شوعەیبو هاوەڵەکانی شوعەیبیان توشی دڵەلەرزەکردو هەڕەشەیان لێکردن کە دەریان دەکەن لە شارەکەیان. وەك لە سورەتی (هود) دا باسی کردونو فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾[1] کە فەرمانی ئێمە هات، لە بەزەیی خۆمانەوە شوعەیبو هاوەڵەبڕوادارەکانی کە لەگەڵی بوون ڕزگارکرد. نامەقیکارانیش نەعرەتەیەکی وا لێیدان کە هەموویان دەمو ڕووگیانیان دەرچوو. باسەکەلەوێدا ئەوە دەگەیەنێت والله أعلم.... کاتێك کە خودانەناسەکان گاڵتەیان بە شوعەیب کردو دەیانوت: ﴿يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ﴾ شوعەیب ئایا نوێژەکەت هانت دەدات ئێمە واز لەوشتە بێنینکە بابو باپیرانمان دەیانپەرستن، یان وەك خۆمان دمانەوێت لە سامانی خۆماندا دەستکاری نەکەین؟ ئەو نەعرەتە لێی دان بێدەنگی کردن. خودای گەورە لە سورەتی (الشعراء) دا ئەفەرموێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾[2] ئیتر باوەڕیا نەمێنا پێی، تا لە ڕۆژێکی هەوردا سزادران، لەو ڕۆژەدا ئەو سزایە زۆر گەورەبوو. ئەو سزایە هەر لەبەرئەوەبوو کە ئەوانە لەنێوان قسەکانیانداەیانوت بەشوعەیب ﴿فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[3] دەی ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت چەند پارچەیەکمان لە ئاسمان بەسەردا بخەرەخوارێ. خوداش فەرموویەتی لە ڕۆژێکی هەوردا تووشی ئەو سزایەهاتن، ئەو سزانەیان هەموو بەسەرداهات، یەکێك لەوسزایانە ﴿فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِ﴾ هەور دایگرتن کە هەورە بروسکەو کڵپەو چەخماخەی ئاگری زۆر گەورەبوو، پاشان نەعرەتەی بەهێز لە ئاسمانەوەو زەمین لەرزەی زۆر توندیش لە خوارەوە گیانی کێشانو هەناسەی لێ بڕینو لاشەکانی کپ کردنەوە. ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ هەموو لەماڵی خۆیاندا لەناوچوون. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەوکەسانەی قسەکانی شوعیبیان بە درۆدانا، وا لەناوچوون دەتوت هەرلەوێدا نەبوون، ئەوانە وا قسەکانی شوعەیبیان بە درۆ دەزانی، هەرخۆیان زیانباربوون. واتە: کاتێك کە تووشی ئەو بەڵایەبوون وەك ئەوەی کە هەرگیز لەو شوێنەدا نەژیابن کە ویستیان پێغەمبەر شوعەیبو هاوەڵەکانی تێدا دەربکەن. پاشان خودای مەزن لە بەرامبەر

---

[1] هود (٩٤).
[2] الشعراء (١٨٩).
[3] الشعراء (١٨٧).

ئەو قسەی ئەواندا کە وتیان دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ واتە: ئەوانەی قسەی شوعەیبیان بە درۆزانی هەرخۆیان زیانباربوون.

﴿فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾﴾

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ ئەوسا شوعەیب ڕووی لێ وەرگێڕان، واتە: کاتێك تووشی ئەو بەڵاو چارەڕەشیو سزاسەختە بوون شوعەیب پشتی تێکردنو سەرزنشتی کردن ﴿وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ﴾ وتی: ئەی گەلەکەم من پەیامەکانی پەروەردگارم بە ئێوە ڕاگەیاندو ئامۆژگاریشم کردن. واتە: ئەو پەیامەی کە پێم سپێردرابوو، پێم ڕاگەیاندن، هیچ خەمو خەفەتێکتان بۆناخۆم، چونکە ئێوە بڕواتان نەهێنا بەوەی کە من بۆم هێنان، هەربۆیە شەعەیب (سەلامی خودای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ﴾ دەسا چۆن خەم دەخۆن بۆ ئەوانەی خودانەناس بوون؟

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩٥﴾﴾

**تاقیکردنەوەی گەلە پێشووەکان**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان بۆ هەر کۆمەڵێك ناردووە بە نەخۆشیو فەقیری تاقیمان کردوونەتەوە خودای گەورە لێرەدا باسی گەلەپێشووەکانی کردووە کە پێغەمبەرانی بۆ ناردوونو تاقی کردوونەتەوە ﴿بِٱلۡبَأۡسَآءِ﴾ بە تووشبوونی نەخۆشیو دەردو پەتاو ﴿وَٱلضَّرَّآءِ﴾ وە بە هەژاریو دەست کورتیو شتی تریش لە گیانوماڵیاندا، ﴿لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ﴾ بەلکو بپاڕێنەوە. واتەك بەلکو ملکەچ بنو بلاڵێنەوەو بپاڕێنەوە لە خودای باڵادەست هەتا ئەوەی تووشیان هاتووە لەسەریان لابەرێت، وتەکە ئەوە دەگەیەنێت خودا تووشی تاقیکردنەوەی کردن بە ناخۆشی بۆئەوەی بپاڕێنەوە، بەڵام ئەوان هیچ شتێکیان بەجێ نەهێنا لەوەی کە خودا داوای لێکردن، پاشان ئەو حاڵەی لێ گۆڕین بە ژیانێکی خۆشو خۆشگوزەرانی، بۆئەوەی دیسان لەوەشدا تاقیان بکاتەوە بۆیە ئەفەرموویت: ﴿ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ﴾ پاشان ناخۆشیمان بە خۆشی بۆ گۆڕینەوە، تا هەمووشتیان زۆربێت، واتە:

ژیانمان گۆڕی و لە تاتوقڕی و هەژاریەوە بۆ خزمەتگوزاری و وە لە نەخۆشی و دەردو پەتاوە بۆ تەندروستی و لەش ساغی و لە فەقیریەوە بۆ دەوڵەمەندی بۆئەوەی سوپاس و ستایشی خودای لەسەربکەن، واتە: خودا ماڵ و منداڵی زۆری دانێ هەتا شوکری بکەن. بەڵام ئەوان شوکری خودایان نەکرد، کاتێك شتێك زۆر ببێت دەوترێت: (عفاء الشيئ) پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ﴾ وتیان: باب و باپیرانیشمان تووشی خۆشی و ناخۆشی بوون. خودای گەورە دەفەرمووێت: تاقیمان کردنەوە بەمەیش و بەوەیش بۆئەوەی بپاڕێنەوەو بپاڕێنەوە بۆلای خودا، بەڵام هیچیان کاری تێنەکردن. نە بەنەخۆشی و فەقیری وازیان هێناو نە بەدەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی وازیان هێنا بەڵکو وتیان: باب و باپیرانیشمان تووشی خۆشی و ناخۆشی لەدێرزەمانەوە هاتوون، وەك چۆن ئێمە ئێستا توشیی خۆشی و ناخۆشی هاتووین ئەم زمانە دێت و دەڕوات، جارێك خۆشیەو جارێکیش ناخۆشیەو. دیارە ئەوانە ژیرنەبوون و هەستیان بەو تاقیکردنەوەی خودا نەکرد کە دابووی بەسەریاندا. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ئەمەش بە پێچەوانەی حاڵی بڕوادارانەوە بووە کە هەمیشە لە خۆشی و ناخۆشیدا هەر خۆڕاگرو سوپاسگوزاربوون وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خاوەنباوەڕ جێی سەرسوڕمانە خودا هیچ بڕیارێکی بەسەردا نەداوە مەگین (ئەوبڕیارە) چاکبووە بۆی، ئەگەر تووشی ناخۆشیەك بووبێت ئارامی گرتووە، ئەوە چاکبووە بۆی، وە ئەگەر تووشی خۆشیەك بووبێت سوپاسی (خودای) کردووە، ئەوە چاکبووە بۆی)[1]، کەواتە خاوەن باوەڕ ئەوکەسەیە کە تێدەگات لەوشتانەی کە خودا تاقی دەکاتەوەپێی لە خۆشی و ناخۆشیدا، بۆیە لە دوای ئەم ڕەوشتەخراپەی خودانەناساندا خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذْنَـٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئیتر لەپڕ (بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن) گرتمانن، واتە: لەپڕ گرتمانن و تۆڵەمان لێ سەندن هیچ ئاگایان لەخۆیان نەبوو، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (مردنی لەپڕ بەزەییە بۆ خاوەن باوەڕو گرتنێکی بەداخ و بەکەسەرە بۆ خودانەناس)[2].

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾﴾

---

[1] مسلم (٢٢٩٥/٤).

[2] احمد (١٣٦/٦) سەنەدەکانی زۆر لاوازە.

**خێروبێر لەگەڵ باوەڕدایەو زەبروزەنگیش لەگەڵ خودانەناسیدایە**

خودای گەورە باسی کەم باوەڕی ئەم شارانە دەکات کە پێغەمبەرانی بۆناردن وەك دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَـٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾[1] بۆچی هیچ شارێك نەبوو کە خەڵکەکەی بڕوابێنن تا ئەوکاتەی کە بڕواکەیان سودیان پێ بگەیەنێت، جگە لە هۆزەکەی یونس؟ کە کاتێك بڕوایان هێنا، سزای ئابڕووبەرمان لە دونیادا لێ نەدان و هەتا ماوەیەك ژیانێکی خۆشمان پێدان، واتە: هیچ شارێك بەتەواوی بڕوایان نەهێناوە جگە لە هۆزی یونس، دوای ئەوەی بە چاوی خۆیان سزاکەیان بینی بڕوایان هێنا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾[2] ناردمانە ناو سەدهەزار یان زیاتر، هەموو بڕوایان پێ هێناو تا ماوەیەك ژیانێکی خۆشمان پێدان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ﴾[3] تا ئێستا هەر پێغەمبەرێکمان ناردووەتە هەرشارێك بیانترسێنێت لە ئێمە هەر ئەوانەی لەوپەڕی خۆشیدا ژیاون وتویانە: بەوشتانەی ئێوەی پێ ڕاسپێردراون باوەڕناکەین. لێرەشدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟﴾ خەڵکی ئەم شارانە ئەگەر خۆیان بناسیایەو خۆپارێزبوونایە، واتە: بە دڵ بڕوایان بهێنایە بەوەی کەپێغەمبەران بۆیان هێناون و بە ڕاستیان بزانیایەو شوێنی بکەوتنایەو خۆپارێزش بوونایە هەستانایە بە خوداپەرستی کردن و وازیان لەوشتەحەرامانە بهێنایە ﴿لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ دەروازەی بەرەکەتمان لە ئاسمان و زەمینەوە بە ڕوویاندا دەکردەو. واتە: بارانمان لە ئاسمانەوە بۆ دەباراندن و ڕوەکیشمان بۆ سەوزدەکردن ﴿وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ بەڵام ئەوان نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆزانی لە سزای ئەم کارەیان گرتمانن. واتە: بڕویان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد، ئێمەش سزامان دان و لەناومانبردن بەهۆی ئەوکارانەی کە پێی هەستان لە تاوان و خراپەکاری. پاشان خودای گەورە دەیانترسێنێت و هەڕەشەیان لێ دەکات لەسەر سەرپێچی کردنیان لە فەرمانەکانی و بوێریان بەرامبەر هەڕەشەکانی دەفەرموێت: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ﴾ ئاخۆ خەڵکی خودانەناس (ئەو شارانە نەترسابوون) ﴿أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ﴾ کە لە

[1] یونس (٩٨).

[2] الصافات (١٤٧– ١٤٨).

[3] سبأ (٣٤)

شەودا بەلاو سزای ئێمەیان تووش ببێتو ئەوان لە گەرمەی خەودابن؟ ﴿أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ ئەو شارنشینانە ئایا نەترسابوون کە لە دەمی چێشتەنگاوداو لە گەرمەی گەمەکردندا ئێمە تووش بەلایان بکەین؟ واتە: لەکاتی سەرقاڵیو بێئاگاییاندا تووشی بەلایان بکەین ﴿أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ﴾ ئایا لەوە دڵنیابوون لە مەکری خودا ڕزگارن؟ واتە: ئایا لە بەلاو سزاو دەستەلاتی خوداو دڵنیان‌و ناترسن لەکاتی بێئاگاییاندا بیانگرێت؟ ﴿فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾ خۆ جگە لە زیانباران کەس لە مەکری خودا هەستی هێمنی ناکات. بۆیە حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) وتی: باوەڕدار بەکردار خوداپەرستی دیکاتو دەشترسێت، کەچی پیاوێکی ترسنۆکی لەدینلادەر کە خەریکی گوناهو تاوانە هێمنەو باکی نیە.

﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێبێت) لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ﴾ ئەوکەسانەی ئەو زەمینەیان (دوای نەمانی خەڵکەکەی) بە میرات بۆ دەمێنێتەوە بەوەیان نەزانیووە، وتی: ئایا بۆمان ڕوون نەکردوونەتەوە، ئەگەر بمانەوێت بەو گوناهانەی کە دەیکەن تۆڵەیان لێ دەکەینەوە؟ موجاهیدو کەسانی تریش هەروایان وتووە[1] ئیبنو جەریریش لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: خودای گەورە دەفەرموێت بەوانەی کە لەسەر زەمین دایاندەنێت (دوای ئەوانەی کە لە پێش ئەماندا تێیدا ژیاوەن‌و لەناوی بردن)، ئایا بۆمان ڕوون نەکردنەوە، کەچی ئەمانیش شوێن ڕەوشتی ئەوان کەوتن هەرچی ئەوانەکردیان ئەمانیش کردیان‌و خۆیان بەزل دادەنێن بەرامبەر پەروەردگاریان، ﴿أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ بە گوناهێك کە دەیکەن‌و مەیلیان لێبێت تۆڵەیان لێ دەکەینەوە. واتە: چیمان کرد بەوانەی پێش ئەوان بەوانیش دەکەین ﴿وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ مۆریش دەنێین بەسەر دڵیاندا، ﴿فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ کە هەر نەتوانن ببیستن. واتە: کە نەتوانن سود لە ئامۆژگاری وەبیرهێنانەوە وەربگرن[2]، منیش دەڵێم: دیسان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا

---

[1] الطبري (١٢/٥٨٠).

[2] الطبري (١٢/٥٧٩).

قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴾[1] مەگـەر بۆیـان دەرنەکـەوتووە (لەپێش ئەوان) هەر لەو شوێنەی ئەوان تێدا دێن‌ودەچن، چەند بەرەمان لەناوبرد، هەر لەمەدا بۆ ئەوانەی ژیرن زۆر بەڵگە هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴾[2] ئاخۆ ڕاستەقینەی بۆ ئەوان دەرنەخست ئەو بەرەی مرۆڤەی کە لەناو ماڵەکانیانداده‌خولانەوەو.ئێمە هەموومان قڕکردن؟ لەمەدا زۆر نیشانە هەیە ئایا نابیستن؟ وە ئەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾[3] ئایا هەر ئێوە نەبوون لە پێشدا سوێندتان دەخوارد کە هەرگیز لەناوناچن؟ ئاخری هەر چوونە شوێنی ئەوانە کە ناهەقیان لە خۆیان دەکرد. وە ئەفەرمووێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴾[4] چەندین گەلمان پێش ئەمانە قڕتێخست ئایا هەست بە هیچیان دەکەیت، یان نوزەو سرتەیان لێ دەبیستیت. واتە: ئایا کەسێك لەوانە دەبیستیت یان دەبینیت؟ چەندین ئایەتی تریش لەم بارەیەوە هاتووە لەسەر دابەزینی بەلا بەسەر دوژمنەکانی خوداداو بەخشینی بەهرکانی بەسەر دۆستەکانیدا.

﴿تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾﴾

خودای گەورە بەسەرهاتی هۆزی نوحو هوودو سالحو لووتو شوعەیبی بۆ پێغەمبەرەکەی (محمد(ﷺ)) باسکردو باسی قڕکردنی خودانەناسانو ڕزگارکردنی خاوەنباوەڕانی کرد، کە بیانووی نەهێشتنی بەوەی کەڕاستی بۆ ڕوونکردنەوە بە بەڵگەی تەواو لەسەر زمانی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەربێت) ﴿تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئێمە هەندێك لە بەسەرهاتی ئەو شارانەت بۆ باس دەکەین،بێگومان پێغەمبەرەکانیان بە نیشانەی ئاشکراوە هاتنەلایان لەسەر ڕاستی ئەوەی کە بۆیان هێناونە وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ

[1] طه (١٢٨).

[2] السجدة (٢٦).

[3] ابراهيم (٤٤- ٤٥).

[4] مريم (٩٨).

﴿نَبۡعَثَ رَسُولٗا﴾[1] تا پێغەمبەر نەنێرین لەلای ئێمەوە سزانیە. وە ئەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَۖ مِنۡهَا قَآئِمٞ وَحَصِيدٞ ١٠٠ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾[2] ئەمانە چەند هەواڵێك بوون لەو شارانە کە بۆ تۆی دەگێڕنەوە هەندێك لەوانە هەر هەن‌و هەندێکیشیان لەناوچوون. ناهەقیمان لێ نەکردن، ناهەقیمان لێ نەکردن بەڵام ئەوان ناهەقیان لە خۆیان کرد. لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُ﴾ وەك ل پێشدا بڕوایان بە خودا نەبوو، هەروا بێباوەڕ مانەوە، بائەکە(الباء) سەببیە، واتە: باوەڕیان نەهێنابەوەی کەپێغەمبەرەکانیان پێی هاتن، لەبەرئەوەی لەسەرەتاوە بڕوایان بەو هەقە نەبوو کە هاتەلایان. ئەمە بۆچوونێکی چاکە ئیبنوعەتیە وتویەتی، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٠٩ وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾[3] ئێوە نازانن ئەگەر نیشانەشیان بۆبێت باوەڕناکەن. هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد (ئێمەش) دڵو دیدەی ئەوان لەکاردەخەین، بۆیە لێرەدا ئەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٠١ وَمَا وَجَدۡنَا لِأَكۡثَرِهِم مِّنۡ عَهۡدٖۖ وَإِن وَجَدۡنَآ أَكۡثَرَهُمۡ لَفَٰسِقِينَ﴾ ئاوا خودا مۆردەنێت بەسەر دڵی لەدین لادەراندا. زۆربەی ئەوانەمان نەدیت کە پەیمانی خودا بەجێ بێنن، زۆرینەشیان لە ڕێزی لەڕێ لادەران بوون. واتە: زۆربەی ئەوانەمان بینی یاخی‌و لەڕێ لادەربوون‌وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا نەبوون، ئەو پەیمانەی کە لێ وەرگرتن ئەو سروشتەبوو کە لەسەری وەدی هێنابوون ئەوکاتەی کە هەر لە پشتی باوکیاندابوون دانیان پێدانابوو کە هەر خودا پەروەردگارو سەروەریانەو هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو شایەتیشیان لەسەرخۆیان دابوو پێی، کەچی دژایەتیان کردو وازیان لێی هێناو پشت گوێیان خست، لەگەڵ خودا شتی تریان پەرست. بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی عەقلی یان شەرعیان بە دەستەوەبێت، سروشتی دروستیش بە پێچەوانەی ئەوەیە، پێغەمبەرە بەڕێزەکانیش لە ئەوەڵیانەوە تا دوایین کەسیان کە هاتوون ئەویان قەدەغەکردووە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: (هەر لەدایکبوویەك لەدایك دەبێت لەسەر سروشتی پاك (بە موسڵمانی) لەدایك دەبێت دایكو باوکیان دەیانکەن بە جوولەکەو گاورو ئاگرپەرست)[4]، وە لە سەحیحی موسلیمش

---

[1] الاسراء (١٥).

[2] هود (١٠٠- ١٠١).

[3] الانعام (١٠٩- ١١٠).

[4] فتح الباری (٣/٢٩٠)، مسلم (٤/٢٠٤٧).

هاتووە: (من بەندەکانم دروستکرد بەرەو ڕاستی بڕۆن، شەیتینەکان هاتوونەتەلایان لە ئاینەکەیان لایانداون، ئەوەی حەلاڵم کردبوو بۆیان لێیان حەرام کردن)[1].

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾﴾

**بەسەرهاتی مووساو فیرعەون**

خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ﴾ پـاش ئـەو پێغەمبەرانەی کە لە پێشەوە باسمانکرد وەك نووحو هوودو سالحو لووتو شوعەیب (سەلامی خودایان لەسەربێتو لەسەر هەموو پێغەمبەرانی تریش) بە چەند نیشانەی ئاشکرا مووسامان ناردەسەر فیرعەونو (کە پاشای میسر بوو لە زەمانی مووسادا) سەرزلەکانی هۆزەکەی ﴿فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بەلام ئەوان بە نیشانەکان بڕوایان نەهێنا و ناهەقیان کرد، سا بڕوانە پاشەڕۆژی ئەو بەدفڕانە چۆن بوو. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾[2] هەرچەندە لە دڵی خۆیاندا هەموویان بە ڕاست دەزانی، خۆبەزلزانیو ناهەقی بوونەهۆی حاشاکردنیان، سا بڕوانە پاشەڕۆژی بەدفەڕەکان چی لێ هات. واتە: ئەوانەی بوونە لەمپەر لەڕێی خوداو بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی نەهێنا، سەیرکە چیمان بەسەرهێنان هەموومان خنکاندنو هیچمان نەهێشتن لەبەرچاوی مووساو هۆزەکەی، ئا ئەمە چاکترین پەندە بۆ فیرعەونو هۆزەکەیو چاکترین شیفاش بوو بۆ دڵی دۆستەکانی خودا کە مووساو خاوەنباوەڕانی هۆزەکەی بوون.

﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾﴾

خودای گەورە باسی ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا دەکات(سەلامی خودای لێبێت) لەگەڵ فیرعەون و دەمبەست کردنی بە بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا بە ئامادەبوونی فیرعەون خۆییو هۆزەکەی لە قیبتەکانی میسرو دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ مووسا وتی: ئەی فیرعەون

---

[1] مسلم (٤/٢١٩٧).

[2] النمل (١٤).

من ڕاسپاردەی ئەوکەسەم کە پەروەردگاری گشت دونیایە. واتە: ئەوکەسە منی ناردووە کەوەدی هێنەری هەمووشتێکەو پەروەردگارو سەروەریشیەتی. ﴿حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ وا ڕەوایە کە هیچ شتێك نەڵێم بە ناوی خوداوە جگە لە هەقو ڕاستی، لەبەرئەوەی من چاك لە بەرزی و بڵندی شارەزام. ﴿قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ لە پەروەردگارتانەوە نیشانەم بۆهیناون، واتە: من بەڵگەیەکی ڕاستم لەلایەن خوداوەپێ دراوە کە نیشانەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی کە پێی هاتووم بۆتان. ﴿فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ کەواتەنەوەی ئیسرائیل لەگەڵ من بنێرە. واتە: لە دیلیو زەبروزەنگی خۆت ڕزگاریان بکە. وازیان لێبێنە با پەروەردگاری تۆو خۆیان بپەرستن، چونکە ئەوانە لە نەوەی پێغەمبەرێکی بەڕێزن کە ئیسرائیلە، واتە یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی خەلیلی ڕەحمانە. ﴿قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ وتی: ئەگەر بەڕاستیتەو هیچ نیشانەیەکت لەگەڵ خۆت هێناوە، نیشانی بدە. واتە: فیرعەون وتی: من بەڕاستت نازانم لەوەی کە دەیڵێیتو ئەویش کە داوای دەکەیت گوێی پێنادەم. ئەگەر بەڵگەیەکت بە دەستەوەیە دەری بخە با چاومان پێی بکەوێو ئەگەر ڕاست دەکەیت لەسەرئەوەی کە وتووتە.

﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

### عەساکەی مووساو دەستەسپییەکەی

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾ مووسا عەساکەی فڕێدا، کەچی لەپڕ بوو بە مارێکی ئاشکرا. عەلی کوڕی ئەبوتولحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾ مەبەست پێی ماری نێرە.[1] سوددیو زەححاکیش هەروایان وتووە[2] وە لە فەرموودەکەی فوتوندا کە یەزیدی کوڕی هارون ڕیوایەتی کردووە لە ئەسبەغی کوڕی زەیدەوە لە قاسمی کوڕی ئەبوئەیوبەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئینو سەعیدەوە،ئەڵێت: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ ﴾ عەساکەی فڕێدا بەو بەمارێکی گەورەو دەمی کردەوەو بە پەلە بەرەو فیرعەون (چوو)، کاتێك فیرعەون بینی مارەکە بەرەو ئەو دەڕوات لەسەرتەختەکەی کەوتە خوارەوەو هاواری برد بۆ مووسا کە لێی دووربخاتەوە، ئەویش دوور خستەوە لێی[3]. سوددیش هەرلەم ئایەتەدا ﴿فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾

---

[1] الطبری (١٣/١٦).

[2] الطبری (١٣/١٥/١٧).

[3] الطبری (١٣/١٦).

وتی: ﴿ثُعْبَانٌ﴾ ماری نێرە، دەمی کردەوە لێوی خواری لە زەویدابوو لێوی سەرەوەشی لەسەر دیواری کۆشکەکەبوو، پاشان بەرەو فیرعەون ڕۆیشت بیگرێت، کاتێك کە چاوی پێ کەوت زۆر لێی ترساو ڕاپەڕی‌و بایەکی لێ بووەوە، هەرگیز شتی وای بەسەرنەهاتبوو لە پێش ئەودا، هاواری کردو وتی ئەی مووسا بیگرە، ئەوا من باوەڕت پێ دەکەم‌و نەوەی ئیسرائیلشت لەگەڵدا دەنێرم، مووسا (سەلامی خودای لێبێت) گرتی‌و عەساکە وەکو خۆی لێهاتەوە.[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴾ دەستی خۆی لە باخەڵیەوە دەرهێنا لەبەرچاوی ئەوانەی سەیریان دەکرد سپیەکی بەبێ خەوش دەرکەوت. واتە: دەستی دەرهێنا لە باخەڵیدا، دوای ئەوەی خستیەناوی بووە دەستێکی سپی درەوشاوە نە بەڵەك بوو نە نەخۆشیش بوو، وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾[2] دەستت بخە باخەڵت کەدەرتهێنا بە سپیەکی (وەك چۆڕی شیر) بێ زیان دیاری دەدا. ئیبنو عەبباس لە فەرموودەکەی فوتوندا ئەڵێت: ﴿مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ واتە: بەڵەك نیە، پاشان خستیەناو باخەڵی گەڕاوەتەوەسەر ڕەنگی پێشووی[3] موجاهیدو کەسانی تریش هەروایان وتووە[4].

﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾

**قسەی هۆزی فیرعەون لەبارەی مووساوە، دەیانوت جادووگەرەو پێکهاتن لەسەر دژایەتیکردنی بە جادووگەران**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ﴾ پیاوماقوڵانی گەلی فیرعەون وتیان. واتە: پیاوەگەورەو کاربەدەستەکانی هۆزی فیرعەون ئەوانەی کە هاوڕابوون لەسەر قسەی فیرعەون دوای ئەوەی ترسەکەی ڕەویەوەو چووەسەر تەختی وڵاتەکەی بە بە پیاوماقوڵانی دەوری خۆی وت: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ ئەمە جادووگەرێکی زۆرزانە. ئەوانیش هەمان قسەی ئەویان کردو یەك ڕابوون کەوتنە وتوێژ لەوبارەیەوەو چی بکەن‌و چۆن هەوڵبدەن بۆ کوژاندنەوەی ڕوشنایی‌و کپ کردنەوەی وتاری مووساو ئاشکردا کردنی درۆو بوختانی بە خەیاڵی خۆیان، ترسیان لەوەبوو کە خەڵکی بەهۆی

---

[1] الطبري (١٣/١٥).

[2] النمل (١٢).

[3] الطبري (١٣/١٧).

[4] الطبري (١٣/١٨).

جادووەکەیەوە شوێنی بکەون و مووسا سەربکەوێت بەسەریانداو لە وڵاتەکەی خۆیان دەریان بکات و پەرتەوازەبن. کەچی ئەوەی ئەوان لێی دەترسان تێی کەوتن وەك خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾[1] بە فیرعەون و هامان و لەشکرەکانیان ئەوشتانە نیشان بدەین کە لێی دەترسان.

﴿قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾﴾

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ﴾ وتیان: تۆ خۆی و براکەی گلّ بدەوە، دەستەیەکی کۆکەرەوەش بنێرە بۆ شارەکان. جادووگەرانی زۆرزان بێنن بۆ وڵات. ئیبنو عەبباس ئەڵێت: ﴿أَرْجِهْ﴾ واتە: دوای بخە[2] یانی: کۆمەڵێك خەڵك بنێرە بە ناوچەو شارو دێهاتەکاندا تا گشت جادووگەرەکانت بۆ کۆبکاتەوە لە وڵاتداو بۆت بێنێ، جادووگەری لە سەردەمی ئەواندا زۆر دەکراو باوبوو، هەندێك لەوانە بڕوایان وابوو وە هەندێکی تریان گومانیان وابوو ئەوەی مووسا هێناوێتی لە شێوەی جادووگەری و چاوبەستی جادووگەرەکانی خۆیانە، هەربۆیە جادووگەرەکانیان لێ کۆکردەوە تا بەرەنگاری ببنەوە بە وێنەی ئەوشتانەی کە مووسا پێشانیان دەداتو دەری دەخات بۆیان. وەك خودای گەورە باسی فیرعەونی کردووەو ئەفەرموویت: ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ﴾[3] دەبێت ئێمەش جادوویەکت بۆ (بەکار) بێنین وەك ئەوەی خۆت. جا شوێن و کاتێك لە نێوان ئێمەو خۆتدا دابنێ، نە ئێمەو نە تۆ خۆمانی لێ نەبوێرین. با شوێنێکی تەخت بێت، مووسا وتی: کاتی دیاریکراوتان ڕۆژی خۆڕازاندنەوەبێت لە کاتی چێشتەنگاوداخەڵکی کۆبکرێنەوە، فیرعەون کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت فێڵی خۆی (گشت) کۆکردەوە پاشان هاتەوە.

﴿وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾﴾

---

[1] القصص (٦).

[2] الطبری (١٣/٢٢).

[3] طه (٥٨- ٦٠).

**کۆبوونەوەی جادووگەران و ڕووبەڕوو بونوەیان لەگەڵ مووسادا و کردنی پەت و دار و دەستەکانیان بە مار**

لێرەدا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴾ جادووگەرەکان لە فیرعەون کۆبوونەوە وتیان: ئەگەر ئێمە سەرکەوتین تۆ دەبێت خەڵاتمان بکەیت. فیرعەون وتی: بەڵێ، ئێوە بێگومان لە نزیکەکانی خۆم دەبن. خودای گەورە باسی ئەو مەرجانە دەکات فیرعەونو ئەو جادووگەرانە کە بانگی کردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی مووسالەسەری ڕێکەوتن، ئەگەر سەکەوتنیان بەدەستهێنا بەسەر مووسادا (سەلامی خودای لێبێت) کە لەلای خۆی دایانبنێتو پاداشتێکی زۆر چاکیشیان بداتێ، فیرعەون بەڵێنی پێدان کە هەرچی داوابکەن پێیان بداتو لە زۆر نزیکەکانی خۆشی دەبن، ئەو پەیمانەیان لەگەڵ فیرعەون بە یەکتری دا (نەفرینی خودای لێبێت).

﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ﴾

ئەمە ڕووبەڕووبونەوەیەك بوو لەلایەن جادووگەرەکانەوە بەرامبەر مووسا (سەلامی خودای لێبێت) وەك لە قسەکانیەوە دەردەکەوێت ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ﴾ وتیان: مووسا تۆ دەیهاوێژی یان ئێمە بیهاوێژین، واتە: پێش تۆ. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴾[1] یان ئێمە پێش تۆ بیهاوێژن. مووسا (سەلامی خودای لێبێت) وتی: ئێوە بیهاوێژن لەپێشدا، وتراوە لە کارزانی مەدائیەوە (خودا باشتر دەزانێت) کە خەڵکی کارەکەی ئەوان ببینن‌و باش دڵی بدەنێ کاتێك کە ترس‌و بیم دایگرتن لەو چاوبەستو جادووەی ئەوان، ئەو هەقە کە هات بەو ڕوونیو ئاشکرایە دوای ئەو هەموو داواکردن‌و چاوەڕوانیەیان بۆی، زۆرتر کاریان لێ دەکاتو دەچێتە دڵیانەوە، هەرواش بوو، بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٍ ﴾ مووسا وتی: ئێوە بیهاوێژن، ئەوانەی ئەوان فرێیاندا چاوی خەڵکەکەیان پێ خەڵەتاندو لێیان ترسان‌و جادووی زۆر گەورەیان کرد. چاوبەستیان لەو خەڵکە کرد، خەڵکەکە وایاندەزانی ئەوەی ئەو جادووگەرانە کردوویانە شتێکی ڕاستەو چاوبەستو خەیاڵ نیە. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ

[1] طه (٦٥).

ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾[1] مووسا لە دڵی خۆیدا کەمێك ترسا، وتمان: هیچ ترسێکت نەبێت تۆ سەرتریت، ئەوەوی لە دەستی ڕاستدایە بیهاوێژە، هەرچی ئەمان کردوویانە قووتی دەدات، ئەوەی ئەوانە کردوویانە فێڵو تەڵەکەی جادووگەرانە، جادووگەران لە هەرکوێیەك بن سەرناکەون. لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: پەتی قایمو داەستی درێژیان فرێدا، مووسا (سەلامی خودای لێبێت) ئەو جادووەی ئەوانی بینی وا هات بە دڵیدا کە پەلاماری دەدەن[2].

﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾

## زاڵبوونی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) و بڕواهێنانی جادووگەران

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ﴾ خستمانە دڵی مووساوە کە: عەساکەت بهاوێژە، هەر لەوێدا هەموو جادووگەریەکانی ئەوانی ماشیەوەو هەڵی لووشی، ئیتر کە ڕاستر هاتەڕوو ئەوەی ئەوان کردیان هەڵوەشایەوە، هەر لەوێدا تێکشانو بە کزیو زەبوونی دامان. جادووگەرکان گشت کڕنووشیان برد. خودای گەورە لێرەدا باسی ئەوە دەکات کە نیگای کردەلای بەندەو پێغەمبەری خۆی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) کە لەو ڕووداوە گەورەدا هەقو ناهەقی لەیەك جیاکردووەتەوە بە فەرمانی خۆی، بەوەی کە بە دەستیەوەیە بیهاوێژێت واتە: عەساکەی. تا ئەوەی کە جادووگەران فڕێیانداوە لە پەتو دار (بە خەیاڵی خۆیان بە ڕاستیان دەزانی کە پڕوپوچ نەبێت هیچی تر نەبوو) هەڵی لووشێت. ئیبنو عەبباس ئەڵێت: عەساکە وای لێهات بەلای هیچ دارو پەتێك تێنەدەپەڕی مەگین هەڵی دەلووشی. جادووگەرەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەم شتە لە ئاسمانەوەیە و جادوونیەو خۆیان خستەسەر سوجدە. ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ وتیان: وا بڕوامان هێنا بە ڕاهێنەری گشت دونیا، پەروەردگاری مووساو هاروون. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: عەساکە وای لێکرا شوێنی ئەو پەتو دارانە دەکەوت یەك لەدوای

---

[1] طه (٦٧- ٦٩).

[2] الطبري (٢٨/١٣).

یەك هەتا وای لێهات هیچ پەت و دارێك لەو شیوەدا نەما کە فرێدرابێت، پاشان مووسا گرتیەوە بووەوە بە عەساکە بە دەستیەوە وەکو خۆی، جادووگەرەکان سوجدەیان بردو وتیان: بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری هەموو دونیا. پەروەردگاری مووساو هاروون. وتیان: ئەگەر ئەمە جادووگەریبووایە سەرنەدەکەوت بەسەرماندا[1]. قاسمی کوڕی ئەبو بەززە وتی: خودا مووسای (سەلامی خودای لێبێت) ئاگادارکرد کە عەساکەت بهاوێژە، ئەویش هاویشتیو عەساکە بووە مارێکو دەمی کردەوەو پەتو دارەکانی هەڵ لووشی، جادووگەرەکان لەوکاتەدا چوون بەسوجدەدا سەریان بەرزنەکردەوە هەتا بەهەشتو ئاگرو پاداشتی خەڵکەکەیان بینی[2].

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾

**هەڕەشەی فیرعەون لە جادووگەران دوای بڕواهێنانیان، وەلامی ئەوان بۆ فیرعەون**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ فیرعەون وتی: پێش ئەوەی من ئیزنتان بدەم، ئێوە چوون بڕواتان پێ هێنا؟ ئێوەی فێڵباز لەم شارەدا ویستووتانە فێڵێك بکەن تا خەڵکەکە لێ دەربکەن. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە چۆن فیرعەون هەڕەشەی لە جادووگەرەکان کرد کاتێك کە بڕوایان بە مووسا(سەلامی خودای لێبێت) هێناو چۆن خودا فروفێڵی فیرعەونی بۆ خەڵکی دەرخست. فیرعەون پێیان دەڵێت وەك خودا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا﴾ ئێوەی فێڵباز لەم شارەدا ویستووتانە فێڵێك بکەن تا خەڵکەکەی لێ وەدەرنێن. واتە: زاڵبوونی بەسەرتاندا وەك لەم ڕۆژەدا بێگومان بە ڕاوێژو ڕەزای خۆتان بووە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾[3] دەرکەوت کە ئەو گەورەتانەو فێری جادووگەری کردون. فیرعەون خۆی چاك دەیزانیو ئەوەش تۆزێك ئاوەزی هەبێت دەزانێت ئەوقسەیەی فیرعەون زۆر پڕوپوچە، چونکە مووسا کاتێك لە مەدیەنەوە هات یەکسەر بانگی فیرعەونی کرد بۆلای خوداو موعجیزەگەورەکانی بە بەڵگەی تەواوەوە پیشانی فیرعەوندا لەسەر ڕاستی ئەوەی کە هێناویتی، لەوکاتەدا فیرعەون ناردی بە شوێن

---

[1] الطبری (١٣/٣٠).
[2] الطبری (١٣/٣٠).
[3] طه (٧١).

شارو ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی خۆیدا، هەرچی جادووگەر هەیە لە هەر شوێنو جێگایەك لە وڵاتی میسردا بۆی کۆبکەنەوە، ئەو جادووگەرانەی کە خۆیو داروودەستەکەی هەڵیاندەبژاردو دەیانهێنایەلای و بەڵێنی پاداشتی گەورەی دەدانێ، بۆیە ئەو جادووگەرانە لە هەموو کەس زیاتر حەزیان لەو پاداشتەو نزیکبوونەوە لە فیرعەون دەکرد. مووسا (سەلامی خودای لێبێت) هیچ کەسێك لەوانەی نەدەناسیو چاوی پێیان نەکەوتبوو وە لەگەڵیشیان کۆنەبووبووەوە. فیرعەونش ئەوەی دەزانی، بەڵکو ئەو قسەیەی بۆ پەردەپۆشو خەڵەتاندنی ئەو خەڵکە نەفامو نەزانەی ژێردەستەلاتی خۆی دەکرد. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ﴾[1] بەم قسانە گەلەکەی خەڵتاندو ئەوانیش بەگوێیان کرد. بێگومان کۆمەڵێك بڕوایان پێکرد کە دەیوت: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾[2] من پەروەردگاری هەرە پایەبەرزتانم. ئەوانە لە نەفامترینو گومڕاترین خەڵکی خودابوون. سوددی لە تەفسیرەکەیدا بە سەنەدێکی مەشهورنەڵێت: لە ئیبنو عەبباسو ئیبنو مەسعودو کەسانی تریشەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەم ئایەتەدا ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ﴾ وتویانە: مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لەگەڵ سەرۆکی جادووگەرەکان بەیەك گەیشتن، پێی وت: ئایا ئەگەر من زاڵبووم بەسەر تۆدا، بڕوام پێ دەهێنیو شایەتی دەدەی لەسەرئەوەی کە من پێی هاتووم ڕاستە؟ جادووگەرەکە وتی: بەیانی جادوویەکی وات بۆ دێنم هیچ جادوویەك زاڵ نابێت بەسەریدا، سا سوێند بە خودا ئەگەر سەرکەوتی بەسەرمدا، بەبێ چەندوچوون بڕوات پێ دەکەمو شایەتیش دەدەم کە تۆ ڕاستی، لەو ساتەدا فیرعەون سەیری دەکردن. دەڵێن: بۆیە فیرعەون ئەوەی کە وتی: وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا﴾ تا خەڵکەکەی لێدەربکەن[3]. واتە: فیرعەون وتی: بە جادووگەرەکان، ئێوەکۆبوونەوە لەگەڵ مووسا بۆئەوەی دەوڵەتێك بۆ خۆتان دروست بکەن تا سەرۆكو پیاماقەڵان لەم وڵاتە وەدەرنێنو کاروباری وڵاتەکە بگرنەدەست ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ سا بەمزوانە تێدەگەن. واتە: دەزانم چیتان بەسەردێنم. پاشان هەڕەشەکەی خۆی ڕوون دەکاتەوە دەڵێت وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ پێچەوانە دەستو پێیەکانتان دەبڕم، لێشتان ڕوون بێت هەمووتان لە قەنارە دەدەم. واتە: دەستی لای ڕاستی ئەوکەسەو قاچی چەپیان بەپێچەوانەوە، وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ

---

[1] الزخرف (٥٤).
[2] النازعات (٢٤).
[3] الطبري (٣٣/١٣).

ٱلنَّخۡلِ﴾[1] بە کۆتەرەی دارخورماکاندا هەڵتاندەبەستم. ئیبنو عەبباس وتی: فیرعەون یەکەم کەس بوو خەڵکی لەقەنارەداو یەکەم کەسیش بوو دەستو قاچی بە پێچەوانەوە بڕی.[2] قسەی جادووگەرەکانیش کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ وتیان: ئێمە دەچینەوە بۆلای پەروەردگاری خۆمان. واتە: زۆر بەچاکی دەزانین کە بۆلای پەروەردگاری خۆمان دەگەڕێینەوە، جەزرەبەو تۆڵەی خودا لە سزاو تۆڵەی تۆ سەختترە لەسەرئەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی ئەمڕۆ، ئەو جادووەی تۆ بەناچاری پێمان دەکەیت زۆر گەورەترە لە لەو سزایەی کە دەماندەیت. ئەمڕۆ ئێمە خۆڕادەگرین لەسەر ئەو سزایەی تۆ، بۆئەوەی لە سزای خودا ڕزگارمان ببێت. بۆیە وتیان: ﴿وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾ هەربۆیە ڕقت لە ئێمە هەڵساوەو سزای ئێمە دەدەیت، چونکە کاتێك نیشانەکانی پەروەردگاری خۆمان بۆهات، تەواو بڕوامان پێهێنا، ئەی خودای پەروەردگارمان خۆڕاگرمان بکەو بە باوەڕی پاکەوە بمانمرێنە. واتە: بمانکە بە شوێنکەوتی پێغەمبەرەکەت مووسا (سەلامی خودای لێبێت) پاشان بە فیرعەونیان وت وەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ٧٢ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ٧٣ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ٧٤ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ﴾[3] هەرچییەکت لەدەست دێت درێغی مەکە، تۆ هەر لە ژیانی ئەم دونیا دەستت دەڕوات. ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێناوە، لە هەڵەکانمان ببورێتو لەو جادوو گەورەیەشمان خۆشبێت، کە تۆ بە سەرەتا سەپاندین، خودا چاکترەو هەر دەمێنێت، هەرکەسێك بە تاوانباری بچێتەلای پەروەردگاری، دیارە بەشی جەهەننەمە (نەمر و نەژی) تێدادەبێت. هەرکەسێکیش خاوەنباوەڕو ئاکارچاك بێتو بچێتەلای، ئەوانە سەرلەبەیانی جادووگەریوون، سەرلەئێوارەکەی بوونە شەهید[4].

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ١٢٧ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ

---

[1] طه (٧١).
[2] الطبری (٣٤/١٣).
[3] طه (٧٢ – ٧٥).
[4] الطبری (٣٦/١٣).

ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾﴾

**هۆزی فیرعەون هانی فیرعەونیان دەداو ئامادەیی فیرعەون بۆ کوشتنی نەوەی ئیسرائیلو هاواربردنی نەوەی ئیسرائیل بۆلای مووسا (سەلامی خودای لێبێت) بەڵێنی مووسا بە یارمەتی خودا بۆیان**

خودای گەورە باسی فیرعەونو هۆزەکەی دەکات کە چەند داخ لە دڵو ئارەزوومەندی سزادانی مووساو (سەلامی خودای لێبێت) قەومەکەی بوون. وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ سەرگەورەکانی هۆزەکەی فیرعەون وتیان: چۆن تۆ لە مووساو هۆزەکەی وازدەهێنی، ولاتت لێ بشێوێنینو دەست لە خۆتو پەرستراوەکانی تۆ بەربدەن. واتە: لە ژێردەستەکانت بشێوێنن‌و بانگیان بکەن بۆ پەرستنی پەروەردگاریانو واز لە تۆ بێنن. بە خودا جێی سەرسوڕمانە، ئەوانە وایان لێهاتووە دەترسن لە خراپەکاری مووساو هۆزەکەی، لەڕاستیدا فیرعەونو هۆزەکەی خراپەکارن بەلام هەستی پێناکەن بۆیە دەڵێن: ﴿وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾ وتی: پەرستراوەکەیان وەك ئیبنو عەبباس دەڵێت (مانگا) بووە. ئەوانە کاتێك مانگایەکی جوانیان چاوپێ بکەوتایە فیرعەون فەرمانی پێ دەکردن کە بیپەرستن، هەربۆیە سامیری پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دەرخستن کە بۆڕەی لێوەدەهات.[1] فیرعەون وەلامی ئەو پرسیارەی دانەوە ﴿قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴾ وتی: بەوزوانە کوڕەکانیان دەکوژین‌و ژنەکانیشیان بۆ خزمەت دەهێڵینەوە، ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵین. ئەمە دووەم جارە فیرعەون ئاوایان بەسەردێنێت، پێش لەدایکبوونی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) جەزرەبەی زۆریدان، نەکا پەیدابێ، کەچی بەپێچەوانەی نیازو بۆچوونی فیرعەون دەرچوو. ئەمجارەش هە بەپێچەوانەی نیازی فیرعەونەوەبوو کە ویستی نەوەی ئیسرائیل سەرنەوی بکاتو زاڵ بێت بەسەریاندا. خودا مووساو هۆزەکەی سەرخستو فیرعەونی سەرنزم کردو لووتی چەقاند بە قوڕداو خۆیو سوپاکەی خنکاند. کاتێك فیرعەون کۆڵی نەدا لەو خراپەیە بەرامبەر نەوەی ئیسرائیل ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْ﴾ مووسا بە هۆزەکەی خۆی وت: هەر پشت بە خودا ببەستن‌و خۆڕاگرین، بەڵێنی پێدان کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوان دەبێت. ﴿إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ

---

[1] الطبری (١٣/٣٨).

لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓا۟ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾ ئەم زەمینە هی خودایە، بۆ هەرکەسێك خۆی حەزبکات لە عەبدەکانی پێی دەبەخشێتو دوارۆژیشی بۆ ئەوکەسانەیە کە لە خودا دەترسان. وتیان: پێش ئەوەی تۆ بێیت چەوسابینەوە، کە تۆش هاتووی هەروا دەمانچەوسێنیتەوە. مووسا ئاگاداری کردن کە ئەم حاڵەیان دەڕواتو نامێنێت دەچنە ژیانێکی تر. ﴿قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ مووسا وتی: لەوانەیە ڕۆژێك بێت پەروەردگارتان دوژمنتان لەناوبەرێتو ئێوە بکاتە جێنشینلەم زەویەداو بڕوانێت ئێوە چۆن دەکەن. ئەمە هاندانێك بوو لەلایەن مووساوە (سەلامی خودای لێبێت) بۆ نەوەی ئیسرائیل کە بەردەوام بن لەسەر شوکری خودا لەکاتی دابارینی بەهرەکانی بەسەریانداو نەمانی سزاو مەینەتەکانیان لەسەریان.

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَـٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَـٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾﴾

**تاقیکردنەوەی هۆزی فیرعەون بە قاتوقڕی**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ ﴾ کارێکمان کرد کە لایەنگرەکانی فیرعەون بکەونە قاتوقڕیەوە. واتە: بکەونە ساڵی قاتوقڕی بەهۆی کەمی کشتوکاڵەوە ﴿وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ داهاتیان کەمتر دەستکەوێت. موجاهید وتی: ئەمە جگە لەوە[1] ئەبو ئیسحاق وتی لە رجای کوڕی حەیوەوە داری خورما تەنها یەك بەرهەمی دەدا[2] ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ بەڵکو بیر لە خۆیان بکەنەوە. ﴿فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَـٰذِهِۦ﴾ ئەگەر تووشی خۆشیو چاکەبوونایە دەیانوت: کاری خۆمانە ئەم پیتو بەرەکەتە ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾ وە ئەگەر تووشی بەڵاو نەهامەتی بهاتنایە دەیانوت: ئەو شوومی مووساو هاوەڵەکانیەتیو ئەو پەیامەی کە پێی هاتوون. خوداش دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَـٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ خۆ دیارە ئەگەر چاکەو خراپەیە لە خوداوەیە.

---

[1] الطبری (١٣/٤٦).

[2] الطبری (١٣/٤٦).

عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ دەڵێت: ئەو نوشوستیانەی بەسەریاندێت لە خوداوەیە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن[1].

﴿وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾﴾

**یاخی بوونی هۆزەکەی فیرعەون و تۆڵە لێسەندنیان بە چەند نیشانەوە**

ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خودای گەورەوە کە باسی یاخی بوونی هۆزی فیرعەون و لاساری و لەخۆبایی بوونیان بەرامبەر بە هەق و بەردەوام بوونیان لەسەر پڕوپوچ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ دەیانوت: هەر نیشانەیەکمان بە نیازی جادوولێکردن نیشان بدەن، ئێمە بڕوات پێ ناهێنین و دەیگێڕینەوە و وەری ناگرین لێت و ئەوەش کە پێی هاتووی هەر قبوڵمان نیە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ﴾ پاشان ئێمە چەند نیشانەی ئاشکرامان ناردەسەریان کە بریتی بوون لە لافاو و کوللە و ئەسپێ و خوێن و بۆق، بەڵام ئەوان دەمارزلیان نواند و کۆمەڵێکی تاوانباربوون. لە ئیبنو عەبباسەوە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ﴾ واتە: بارانێکی زۆر کە کوستوکاڵ و بەرووبوم نوقم بکات و لەناوی بەرێت. وە لە ڕیوایەتێکی تدا هاتووە هەر لە ئیبنو عەبباسەوە واتە: مردنی زۆر. موجاهیدئەڵێت: واتە: ئاوو چاوەقوڵە لە هەموو حاڵەتێکدا[2]، بەڵام کوللە دیارو ناسراوە کە خوراوە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو یەعفورەوە وتی: پرسیم لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفا لەبارەی کوللەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەوت غەزامان کرد کوللەمان دەخوارد.[3] ئیمامی شافیعی و ئەحمەد و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردووە لە فەموودەیەکی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە باوکیەوە لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)

---

[1] الطبری (١٣/٤٨).

[2] الطبری (١٣/٥٠).

[3] فتح الباری (٩/٥٣٥)، مسلم (٣/١٥٤٦).

فەرموویەتی: (دوو مردارەوەبوو وە دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ كراوە: ماسیو كوللەو جگەرو سپڵ)[1]، ئیبنو ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا وتی: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ ﴾ وتی: ئەو كوللانە بزماری دەرگاكانیان دەخواردو وازیان لە تەختە دەهێنا[2] بەڵام ﴿وَالْقُمَّلَ﴾ ئیبنو عەبباس وتی: واتە فڕەكە لەناو گەنم دێتەدەر[3] دیسان لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ﴿وَالدَّمَ﴾ ئەو كوللە بچوكانەیە كە باڵیان نیە[4] موجاهیدو عیكرەمەو قەتادەش هەر وایان وتووە. حەسەنو سەعیدی كوڕی جوبەیر وتیان: ﴿وَالْقُمَّلَ﴾ گیانەوەرێكی ڕەشی بچكۆلەیە[5] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە وتی: كاتێك مووسا (سەلامی خودای لێبێت) هات بۆلای فیرعەون پێی وت: نەوەی ئیسرائیلم لەگەڵدا بنێرە، فیرعەون نەینارد، خودای مەزن لافاوی بۆناردن، واتە بارانی بەسەردا باراندن لەوەی كە سزایەك بێت وتیان بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت): داوامان بۆبكە لە پەروەردگارت ئەم بارانەمان لەسەر لاببات بڕوات پێ دێنینو نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین. مووسا (سەلامی خودای لێبێت) داوای بۆكردنو خودا بارانەكەی لابرد لەسەریان كەچی بڕوایان نەهێناو نەوەی ئیسرائیلیشی لەگەڵدا نەنارد، لەو ساڵەدا شتێكی بۆ سەوزكردن لەپێش ئەودا شتی وای بۆ سەوزنەكردبوون لە كشتوكاڵو بەروبوومو لەوەڕكە. پاشان وتیان: ئەمە ئەوشتەبوو ئێمە خوازیاری بووین. خودا كوللەی بۆناردنو دای بەسەر لەوەڕگەكەدا، كاتێك بینیان خەریكە لەوەڕگەكەیان دەخوات، زانیان كە هیچی كشتوكاڵەكەشیان ناهێڵێت، وتیان: ئەی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) داوامان بۆبكە لە پەروەردگارت ئەم كوللەیەمان بۆ لابەرێت بڕوای پێ دەكەینو نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین، مووسا (سەلامی خودای لێبێت) داوای بۆكردن لە پەروەردگاری كوللەكەی لەسەرلابردن، بڕوایان پێی نەهێناو نەوەی ئیسرائیلیشی لەگەڵدا نەنارد. دەغڵودانیان ڕنیەوەو كوتایانو لە ماڵدا كۆیان كردەوە، وتیان: دەغلودانەكەمان كۆكردەوە. خودا ئەسپێی بۆناردن كە گیانەوەرێكی بچوك بوون دەغڵودانەكە هەڵی دەهێنا، پیاوێك دە كیسی دەبرد بۆ ئاشجگە لە سێ فەقیزی لەگەڵ خۆی نەدەهێنایەوە، وتیان: ئەی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) داوامان بۆبكە لە پەروەردگارت ئەم ئەسپێیەمان لەسەرلابەرێت بڕوات پێ دێنینو نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین. مووسا (سەلامی

---

[1] مسند الشافعي (٢/١٧٣)، أحمد (٢/٩٧)، ابن ماجه (٢/١٠٧٣) فەرموودەیەكی مەوقوفە.

[2] الطبري (١٣/٦٨).

[3] الطبري (١٣/٥٤).

[4] الطبري (١٣/٥٤).

[5] الطبري (١٣/٥٥/٤٩٨).

خودای لێبێت) داوای لە پەروەردگاری کرد، خودا لەسەری لابردن، لە دواییدا ڕازی نەبوون نەوەی ئیسرائیلی لەگەڵدا بنێرن. کاتێك کە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لەلای فیرعەون دانیشتبوو گوێی لە قیڕەی بۆق بوو. مووسا (سەلامی خودای لێبێت) بە فیرعەونی وت: ئاخۆ خۆتو هۆزەکەت تووشی چی دێن لەمەوە؟ وتی: لەوانەنیە ئەمەش فێڵ بێت؟ نەگەیشتنە ئێوارە، وای لێهات هەرکەسێك کە دادەنیشت هەتا چەناگەی بۆق دایدەگرت کاتێك کە دەیویست قسەبکات بازی دەدایە ناودەمی، وتیان بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) داوامان بۆبکە لە پەروەردگارت ئەم بۆقانەمان لەکۆڵ بکاتەوە بڕوات پێ دێنینو نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین، داوای کرد لە پەروەردگاری لەکۆڵی کردنەوە کەچی بڕوایان پێ نەهێنا، پاشان خودا خوێنی بۆناردن، لە هەر بیرو ڕووبارێكو لە هەرشتێك کە ئاویان تێدا هەڵدەگرت ئاویان دەخواردەوە، خوێنی تەڕو تازەیان دەبینی. سکاڵایان بردەلای فیرعەونو وتیان: ئێمە گیرمان خواردووە بەدەست ئەم خوێنەوە، خواردنەوەمان نەماوە، فیرعەون وتی: بێگومان مووسا جادووی لێکردوون، وتیان: لە کوێوە جادووی لێکردوون، کە ئێمە هیچ ئاو شك نابەین لەناو دەفرەکانماندا جگە لە خێنی تەڕنەبێت. هاتن بۆلای مووسا (سەلامی خودای لێبێت) وتیان: ئەی مووسا داوامان بۆبکە لە پەروەردگارت ئەم خوێنەمان لەسەرلابەرێت، بڕوات پێ دێنینو نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین. داوای لە پەروەردگاری کردو لەسەری لابردن، بڕوایان پێ نەهێناو نەوەی ئیسرائیلیان لەگەڵدا نەنارد. هەر بەم شێوە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباسو سوددیو قەتادەو کەسانی تریشەوە لە زانایانی پێشینە کە ئەمەیان باسکردووە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار (ڕەحمەتی خودای لێبێت) وتی: دوژمنی خودا فیرعەون گەڕایەوە کاتێك کە جادووگەرەکان بڕوایان هێنا بە تێکشکاویو دەستەوەستانی، وازی هەرنەهێنا لەسەر خودانەناسیو خراپەی خۆی هەر بەردەوام بوو، خودای مەزن یەك لەدوای یەك نیشانەی بۆنارد، تووشی قاتوقڕیو لافاوی کرد، پاشان کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێنی بۆنارد کە چەند نیشانەی ئاشکرابوون، لافاوی بۆنارد، ئەو ئاوەی کە لەسەر زەوی هەڵساو پاشان تێیدا وەستاو نەیانتوانی زەوی بکێڵنو هیچیان لەدەست نەدەهات هەتا وایان لێهات تووشی گرانیو برسێتی هاتنو چارەیان نەما، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ لەپاش ئەوەی کە بەڵایانەیان بینی، وتیان: مووسا لە پەروەردگارت بپاڕێوە (وەك پەیمانی بە تۆ داوە) ئەگەربێت بەلامان لەسەرلابەرێت، شەرتە باوەڕت پێ بکەینو نەوەی ئیسرائیلیشت لەگەڵ بنێرین. مووسا لە پەروەردگاری پاڕایەوە بەڵاکەی لەسەر لابردن، بەڵام وەفایان بە هیچ شتێك نەکرد لەوەی کە وتیان، پاشان خودای گەورە کوللەی بۆناردنو دارەکانی خوارد، وەك

پێمگەیشتووە، هەتا بزماری دەرگاكانیشی خواردن كە ئاسن بوو وایان لێهات خانوو ماڵەكانیان ڕووخاو كەوت. دیسان قسەكانی پێشوویان كردەوە، مووسا داوای بۆكردن لە پەروەردگاری كە ئەوەیان لەسەلاببات، كەچی وەفایان بە هیچ شتێك لەوقسانەی خۆیان نەكرد. خوداش ئەسپێی بۆناردن. بۆیانگێڕاومەتەوە كە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) فەرمانی دا ئەسپێكە بڕوات بۆلای گردێكی لمین هەتا بە عەساكە لێی بدات چووبووەلای گردێكی لمینی زۆر گەورەو بە عەساكەی پێیداكێشاو ئەسپێیەكی زۆر دەرچوو بۆیان هەتا وای لێهات ماڵو خواردنەكانی داگیركرد، ئۆقرەو خەوی لێ هەلگرتن، كاتێك كە زۆری بۆهێنان دیسان ئەوقسانەی پێشوویان كردەوە، مووسا پاڕایەوە لە پەروەردگاری لەسەری لابردن. كەچی وەفایان بە هیچ شتێك لەوقسانەی خۆیان نەكرد، پاشان خودا بۆقی بۆناردن. ماڵو خواردن دەفرەكانیان پڕبوو لە بۆق، هیچ كەسێك جلوبەرگێك یان خواردنێكی لانەدەدا مەگین دەیبینی بۆق داگیری كردووە، كاتێك كە ئەو بۆقانە هەراسانی كردن، دیسان ئەوقسانەی پێشوویان پێ وتەوە. داوای كرد لە پەروەردگاری لەسەری لابردن، كەچی وەفایان بە هیچ شتێك لەوقسانەی خۆیان نەكرد، خودا خوێنی بۆناردن، وای لێهات ئاوەكانی هۆزی فیرعەون بوو بەخوین، هیچ ئاوێكیان نەدەخواردەوە لە بیر یان لە ڕووبار یان لە هەردەفرێكدا مەگین ئەو ئاوە دەبوو بەخوێنی تەڕو تازە[1].

﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ ﴾

**نقومبوونی هۆزەكەی فیرعەون لە دەریاداو جێگیربوونی نەوەی ئیسرائیل لەو زەویە پیرۆزەدا**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾ ئەوسا تۆڵەمان لێ كردنەوە لە دەریادا نقومان كردن. چونكە ئەوانە نیشانەكانی ئێمەیان بە درۆداناو هەمیشە لێیان بێ ئاگابوون. خودای گەورە لێرەدا باسی فیرعەونو دارودەستەكەیمان بۆدەكات كە كاتێك دەستیان كردە سەرپێچیو یاخی بوون دوای ئەو هەموو نیشانە یەك لەدوای یەكانەی كە بۆیان دەهات، بە خنكاندن لەناو دەریادا تۆڵەی لێ سەندن، ئەو دەریایە كە خودا لەتی كرد بۆ مووساو گەلەكەی كە لەگەڵی بوون، پاشان فیرعەونو لەشكرەكەشی بەدوای ئەواندا پێدابرد،

[1] الطبری (١٣/٦٣).

کاتێك کە بەتەواوی چوونەناوی ئاوەکە دای بە سەریاندار هەموو خنکانو هیچیان لێ دەرنەچوو، لەبەرئەوەی نیشانەکانی خودایان بە درۆدەزانی هەمیشە لێی بێ ئاگابوون. پاشان خودای گەورە دێتەسەر باسی نەوەی ئیسرائیل کە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئەو وڵاتەی بەرەکەت تێ خستبوودا بەوانەی چەوسابوونەوە. واتە: نەوەی ئیسرائیل. حەسەنی بەسری قەتادە لەم ئایەتەدا وتیان: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا﴾ ئەوسا ئێمە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئەو وڵاتەمان. وتیان: مەبەست پێی شامە کە بەرەکەتمان تێ خستبوو دابەوانەی چەوسابوونەوە. پاشان دەفەرموویێت: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟﴾ بەڵێنی هەرەپیرۆزی پەروردگارت (بێ کەموکوڕی) دەربارەی بەرەی ئیسرائیل هاتەجێ، لەبەر خۆڕاگرییان. موجاهید و ئیبنو جەریر وتیان ئەم ئایەتە وەك ئەو ئاتە وایە کە دەفەرموویێت: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ﴾[1] بڕیاماندا ئەوانەی لەوزەمینەدا چەوسابوونەوە منەت بنێین بەسەریانداو بیانکەین بە پێشەوای خەڵك لە دواییشدا بۆخۆیان بمێننەوە. لەوزەویەدا جێگایان بۆ خۆش بکەینو بە فیرعەونو هامانو لەشکرەکانیشیان ئەوشتانە نیشان بدەین، کە ئەوان لێیان دەترسان. پاشان خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ﴾ هەرچی فیرعەونو گەلەکەی دایاننناو بەرزیان کردەوە هەموومان لێ تێكوپێکدان. واتە: ئەوەی فیرعەونو هۆزەکەی دروستیانکرد لە کۆشكو تەلارو کێڵگە وێرانمان کرد.

ئیبنو عەبباس ئەڵێت: ﴿يَعْرِشُونَ﴾ واتە: ئەوەی دروستیان کرد لە خانوو تەلار[2].

﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۚ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾﴾

---

[1] القصص (٥- ٦).

[2] الطبری (١٣/٧٨/٧٩).

**پەڕینەوەی نەوەی ئیسرائیل لە دەریادا و داواکردنیان لە مووسا کە پەرستراوێکی بەرجەستەیان بۆپەیدابکات**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾ نەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە. ئەوسا تووشی هۆزێك هاتن هەر خەریکی پەرستنی بتەکانیان بوون. وتیان: مووسا خودایەکمان وەك خوداکانی ئەوان بۆپەیدابکە. وتی: ئێوە هۆزێکن لە هیچ نازانن. خودای گەورە لێرەدا باسی قسەی ئەونەفامانەی نەوەی ئیسرائیل دەکات کە وتویانە بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لە دەریاکە پەڕینەوە ئەو هەموو نیشانەو دەستەلاتە گەورەی خودایان بە چاوی خۆیان بینی. ﴿فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ﴾ کە تووشی هۆزێك هاتن هەر خریکی پەرستنی بتەکانیان بوون. هەندێك لە زانایانی تەفسیر دەڵێن ئەوانە لە کەنعانیەکان بوون. هەندێکە تر وتوویانە: لە لەخمیەکان بوون.ئیبنو جەریرئەڵێت: ئەوانە چەند بتێکیان دەپەرست لە شێوەی مانگادابوو، هەرئەوەش بوو کاری تێکردن‌و بووەهۆی ئەوەی پاشان گوێرەکەکەیان پەرست. وتیان بە مووسا ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾ مووسا خودایەکمان وەك خوداکانی ئەوان بۆپەیدابکە، مووسا وتی: بەڕاستی ئێوە هۆزێکی نەفامن[1] واتە: لە گەورەیی‌و دەستەلاتی خودا شارەزانین، کە پاك‌و بێعەیبەو هاوتاو هاوێنەی نیە. ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئەوکارەی ئەوانە دەیکەن، بێ بەهرەیەو بەفیڕۆیەو بەتاڵە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو واقیدی لەیسیەوە کە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەککە دەرچوون بەرەو حونەین. خودانەناسەکان دارێکی تاوگیان (سدرة) هەبوو لای مانەوەو چەکەکانیان پێدا هەڵدەواسی، پێیان دەوت: زاتول ئەنوات وتی: ئێمەش بەلای ئاوێکی سەوزی گەورەدا تێپەڕین، وتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆش تاوگێك (ذات الانواط) بۆ ئێمە دابنێ، وەك ئەوان چۆن تاوگیان هەیە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە وەك ئەوەتان وتووە کە هۆزی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) وتیان بە مووسا: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾).

---

[1] الطبری (١٣/٨٠).

﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ﴾

## وەبیرهێنانەوەی بەهرەکانی خودا بۆ نەوەی ئیسرائیل

خودای گەورە لەسەر زمانی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ وتی: ئاخۆ ئێوەدەتانەوێت جگە لە خودا پەرستراوێکی ترتان بۆ پەیدابکەم، کە هەر خودا خۆی ئێوەی لەم دونیایە لە خەڵکی بەڕێزتر کردووە؟ لەبیری مەکەن کە ئێمە ڕزگارمان کردن لەفیرعەون و داروودەستەکەی، کە ئێوەیان زۆر بەسەختی سزادەداو کوڕەکانتانی دەکوشت و ژنەکانتانی بۆ خزمەت دەهێشتەوە، ئەوبەلآیەتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە زۆر گەورەبوو. مووسا(سەلامی خودای لێبێت) بەهرەکانی خودای وەبیر نەوەی ئیسرائیل هێنایەوە، لە ڕزگاکردنیان لەدیلیو ژێردەستەییو زەبروەنگی فیرعەون و ئەوژیانە مەینەتیو پرچەوساوەیەی کە تێیدابوون پاشان چۆن گۆڕا بە ژیانێکی پڕ بەختەوەری بۆیان و ڕزگاریان بوو لەودوژمنەی کە بە چاوی خۆیان دیتیان چۆن خنکان و ڕیسواو زەبوون بوو. وەك لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة) دا تەفسیری کرا.

﴿ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾

## ڕۆژو گرتنی مووسا خۆخەریك كردنی بە خودا پەرستیەوە تا چل شەو

خودای گەورە منەت دەکات بەسەر نەوەی ئیسرائیلدا کە ڕێ نیشانداون بەهۆی قسەکردنیانەوە لەگەڵ مووسا (سەلامی خودای لێبێت) تەوراتیشی بە دیاری داپێی، کە چۆن هەڵس وکەوت و بەرنامەی ژیانی تێدا ڕوونکردووەتەوە بۆیان. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ﴾ لەگەڵ مووسادا بەڵێنی سی شەومان دان، دەی تریشمان بۆخستەسەر. بەم چەشنە ماوەی بەڵێنی پەروەردگاری بووە چل شەو. زانایانی تەفسیر دەڵێن ئەو سی ڕۆژە بەڕۆژی بوو کە تەواوی کرد بە توێکڵی دارسیواکی کرد، خودای گەورە فەرمانی پێکرد دە ڕۆژی تری بخاتەسەرو بیکاتە ژل شەو. کاتێك کە بەڵێنەکە تەواوبوو مووسا بڕیاری ڕۆیشتنی دا بەرەو کێوی توور

وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ﴾[1] ئەی بەرەی ئیسرائیل لەژێر چنگی دوژمنەکانتان ڕزگامان کردن، بەڵێنشمان دانێ (لەلای ڕاستی کێوی توور) بگەنەلامان. ئا لەوکاتەدا مووسا هاروونی برای لەلای نەوەی ئیسرائیل لەجێی خۆی هێشتەوە (سەلامی خودایان لێبێت) ئامۆژگاری کرد کە بەچاکە مامڵەبکاتو نەهێڵێت خراپەکاری ڕووبدات، ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ بە هاروونی برای خۆی وت: تۆ لەناو هۆزەکەمدابەو لەجێی من بمێنەوەو هەر کاری چاك بکەو لەدوای خراپەکاران مەچۆ. ئەمە تەنیا ئاگاداریو وەبیرهێنانەوەبوو بۆ هاروون، ئەگەرنا هاروون (سەلامی خودای لێبێت) پێغەمبەرێکی مەزنو بەڕێزی خودابوو (سەلامی خودا لەسەر ئەوو گشت پێغەمبەران بێت).

﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣﴾

## داواکردنی مووسا کە پەروەردگاری ببینێت

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ کاتێك مووسا لەکاتی دیاریکراودا هاتو پەروەردگاری قسەی لەگەڵ کرد. لێرەدا خودا باسی مووسا دەکات، کە لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبوو لەلایەن خوداوە قسەی لەگەڵ کرا، مووسا داوای کرد لە خودا کە خۆی نیشان بداتو ببینێت ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي﴾ وتی: ئەی پەروەردگاری من دەمەوێت تۆ ببینم، فەرمووی ناتوانی بمبینیت، بەڵام لەو گەژە بڕوانە، ئەگر لە شوێنی خۆی نەبزووت ئەوسا دەتوانی بمبینیت. پیتی (لن) بۆ جەختکردنەوەیە بۆ نەبینینی خودا لە دونیادا، چونکە فەرموودەی زۆر ڕیواتکراوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە بڕواداران خودای مەزن دەبینن لە ڕۆژی قیامەتدا. وەك لەم ئایەتەدا لە سورەتی (القيامة) دا دەیانهێنین ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾[2] لەو ڕۆژەدا زۆر ڕوو هەن گەش دەکەن، چاودەگێڕن بەرەو پەروەردگاری خۆیان. وەك لە کتێبە پێشووەکاندا هاتووە، خودای گەورە فەرموویەتی بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت): (بێگومان هیچ زیندوویەك نامبینێت مەگین وە هیچ وشكو ڕەقێکیش

---

[1] طه (٨٠).

[2] القيامة (٢٢– ٢٣).

نامبینێت مەگین سەروژێربووە)[1] بۆیە خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ کە خۆی بۆ کەژەکە دەرخست، بەجارێك کەژەکەی پرپش پرپش کردن ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەم ئایەتەدا ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ﴾ فەرمووی: خودای گەورە فەرمووی: (ئابەو شێوەیە) واتە: لایەك لە پەنجەتوتەی دەرهێنا[2]، تیرمیزیش هەروا ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، پاشان وتی: ئەمە فەرموودەیەکی چاكو ڕاستەو غەریبە[3] حاکمیش ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی حەممادی کوڕی سەلەمەوە هە ر بەم شێوەیەو وتی: ئەمە فەرموودەیەکی سەحیحە لەسەر شەرتی موسلیم، بەلام بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە[4]، سوددی لە عیکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ﴾ واتە: بەئەندازەی پەنجەتوتەیەك نەبێت نیشانی نەدا ﴿جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾ وای لێکرد کێوەکە وردوخاش بوو، واتە: بوبە بە خۆڵ. ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ مووسا بەبێ هۆش کەوت، هۆشی بەخۆی نەما[5] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە کە ئیشارەتێك لێرەدا هەیە بەڵگەیە لەسەر بێهۆشبوونی مووسا ئەویش ئەو دەقەیە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّآ أَفَاقَ﴾ وەختێك مووسا هاتەوەسەرخۆی. دیارە هاتنەوەسەرخۆ ڕوونادات مەگین کەسێك نەبێت لەهۆش خۆی بچێت ﴿قَالَ سُبْحَـٰنَكَ﴾ مووسا وتی: پاکیو بێعەیبی هەر بۆتۆیە، واتە: ئەوخودایە ئەوەندە پاكو گەورەو بێعەیب و پایە بڵندە دوورە لەوەی کە هیچ کەسێك بتوانێت ببینێت، خۆئەگەر ببینێت کتوپڕ مردووە. ﴿تُبْتُ إِلَيْكَ﴾ مووسا وتی: پەشیمانم. موجاهیدئەڵێت: پەشیمانم لەوەی کە داوای بینینم کردی ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾من لە خاوەنباوەڕاندا یەکەمینم بێگومان کەس تۆ نابینێت. موجاهیدو ئیبنو عەبباس وتیان: واتە من یەکەمینم لە نەوەی ئیسرائیل. ئیبنو جەریرش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ من لە خاوەنباوەڕان یەکەمینم کە دەڵێم ئەی خودایە هیچ کەسێك تۆ نابینێت. پاشان خودای مەزن

---

[1] البداية والنهاية (٣/١١٢).

[2] أحمد (٣/١٢٥)، ترمذي دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبی سەحیحە.

[3] تحفة الاحوذي (٨/٤٥١) فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبی سەحیحە.

[4] الحاكم (٢/٣٢٠) فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبی سەحیحە.

[5] الطبرى (١٣/٩٧).

دەفەرمووێت: ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ مووسا بەبێ هۆش كەوت، لەسەر ئەم ئایەتەش ئەبوسەعیدو ئەبوهورەیرەش فەرموودەیان ڕیوایەت كردووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموودەكەی ئەبوسەعید بوخای لە سەحیحەكەیدا لێرەدا ڕیوایەتی كردووە ئەڵێت: پیاوێكی جوولەكە هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) درابوو لە دەموچاوی، وتی: ئەی محمد (ﷺ) پیاوێك لە هاوەڵەكانی ئەنساریەكانت كێشای بە ڕوومدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بانگی بكەن)، بانگیان كرد، فەرمووی: (بۆچی كێشاوتە بە دەموچاویدا؟)، پیاوەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من تێپەڕیم بەلای ئەم جوولەكەیەدا دەیوت: سوێند بەوكەسەی كە مووسای هەڵبژاردووە لەناو خەڵكیدا، وتی وتم: بەسەر محمدیشدا (ﷺ) تووڕەیی گرتمی‌و پێمداكێشا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە نێوان پێغەمبەراندا هەڵمەبژێن چەنكە خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا بێ هۆش دەكەون، من یەكەمین كەسم دێمەوەسەرخۆ، كاتێك دەزانم لەگەڵ مووسادا پێكەوەین، (و خۆی بە ستوونێك لە ستوونەكانی تەختەوە –عەرشەوە– ) گرتووە، نازانم لەپێش مندا هۆشی هاتووەتەوە یان چاوپۆشی لێكراوە بەهۆی لەهۆش چوونەكەی كێوی توورەوە)[1]، بوخاری لە زۆر شوێندا لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە، موسیمش لە فەرموودەی پێغەمبە رانداو ئەبوداودیش لە كتێبی (السنة) لە سونەنەكەیدا ڕیوایەتیان كردووە[2] فەرموودەكەی ئەبوهورەیرەشی ئیمامی ئەحمەدو بوخاری‌و موسیم هەر بەوشێوە ڕیوایەتیان كردووە[3].

﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾﴾

**خودا مووسای هەڵبژاردو ئەلواحەكانی دایە (سەلامی خودای لێبێت)**

خودا لێرەدا باسی مووسا دەكات ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي﴾ دەفەرمووێت ئەی مووسا من لەناو خەڵكی زەمانی خۆتدا هەڵمبژاردی بە پەیامەكانم‌و قسەكردنم (لەگەڵت ڕاستەوخۆ) بێگومان محمد (ﷺ) بەڕێزترینی منداڵی ئادامە هەر لە یەكەمین كەسیانەوە هەتا دواین كەس، لەبەرئەوەیە خودای گەورە بەتایبەتی كردوویەتی بە دواین پێغەمبەر كە پەیامەكەی بەردەوام دەبێتهەتا ڕۆژی قیامەت‌و شوێنكەوتوانیشی زۆر دەبێت لە شوێنكەوتوانی پێغەمبەرەكانی تر

---

[1] فتح الباری (٨/١٥٢).

[2] البخاری (٢٤١٢/٣٣٩٨/٣٨/٤٦/٦٩١٧/٧٤٢٧/٦٥١٨)، مسلم (٢٣٧٤)، أبوداود (٤٦٦٨).

[3] أحمد (٢/٢٦٤)، فتح الباری (١٣/٤٥٥)، مسلم (٤/١٨٤٤).

(سەلامی خودایان لێبێت) هەموو. دوای ئەو بەرێزترین و بەقەدرترینیان ئیبراهیمی خەلیلە (سەلامی خودای لێبێت) پاشان عیسای کوڕی عیمرانە (سەلامی خودای لێبێت) کە خودا قسەی لەگەڵداکرد.

بۆیە خودای گەورە پێی فەرموە ﴿فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ چیم پێداوین وەریگرەو لە سوپاسگوزاران بە. واتە: شتێك داوامەکە کە توانات ناشکێت بەسەریدا پاشان خودای گەورە ئاگاداری کردووە فەرموویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾ دەربارەی هەمووکارێك و ئامۆژگاری بۆ گەلەکەی هەموو شتمان (بێ کەموکوڕی) بۆنوسی و بۆمان خستەسەر لەوح (پارچەدار بان پارچەبەرد) وتراوە: لەوحەکان لە گەوهەر بووە. خودای گەورە ئامۆژگاری و فەرمانەکانی لە حەڵاڵ و حەرام بۆڕوونکردووەتەوە، لەسەر ئەولەوحانە بۆی نوسیووە. تەوراتیش لەو لەوحانە پێکهاتووە. کە خودای گەورە فەرموویەتی تێیدا: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ﴾[1] لەپاش ئەوەی چین و بەرەکانی پێشوومان قڕتێخست، ئەو کتێبەمان (واتە تەورات) دا بە موسا کە بۆ مەردوم ببێتەهۆی چاوڕوونی. وتراوە: خودا ئەلواحەکانی پێش تەورات داوە بە موسا (والله أعلم). پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا﴾ موسا ئاگات لەوانەبێت و توند بیانگرەفەرمان بدە بە هۆزەکەت با هەر چاکەکەیان وەربگرن. سوفیانی کوڕی عویەینە وتی:ئەبوسەعید بۆی گێڕامەوە لە عیکرمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: فەرماندرا بە موسا کە توندتر لەوەی فەرماندراوە بە هۆزەکەی بیگرێت.[2] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَأُو۟رِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ من زوو پێشانتان دەدەم جێگەو ڕێگەی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن بەرەو کوێیە. واتە: بەوزوانە پاشەڕۆژی ئەوانەی سەرپێچیان کردووەو لە فرمانەکانی من دەرچوون دەیبینن، کە چۆن لەناوچوون و قڕیان تێخرا.

﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِىَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾﴾

---

[1] القصص (٤٣).

[2] الطبري (١٣/١١٠).

## بێبەشکردنی فیز زلان لە نیشانەکانی خودا

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ بەم زوانە ڕووی ئەوانە وا بە هەق لەسەر زەمین فیزدەنوێنن، لە نیشانەکانی خۆم وەردەگێڕم. واتە: ئەو بەڵگەو نیشانانەیان لێ قەدەغە دەدەکەم کە دەبنەهۆی شارەزابوونیان لەسەر گەورەیی خۆم‌و بڕیارەکانم‌و دڵی ئەو فیز زلانە وەردەگێڕم کە گوێڕایەلیم ناکەن‌و فیزدەنوێنن بەسەر خەڵکیدا لەسەر زەمیند بە ناهەق. واتە: وەك چۆن فیزیان نواند بە ناهەق بەسەر خەڵکیدا، هەر بەو نەفامیەیان خودا ڕەزیلی کردون. وەك فەرموویەتی: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾[1] هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد (ئێمەش) دڵ‌و دیدەی ئەوان لەکاردەخەین. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾[2] وەختێك ئەوان خۆیان لادا، خوداش دڵی ئەوانی لادا. سوفیانی کوڕی عوێینە لەم ئایەتەدا ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ وتی: تێگەیشتن لە قورئانیان لێ دادەماڵرێت‌و بەوزوانە لە نیشانەکانی خۆم وەریان دەگێڕم[3]، ئیبنو جەریر وتی: ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەم وتارە بۆ ئەم ئوممەتەشە.[4] منیش دەڵێم (واتە ئیبنو کەسیر دەڵێت) ئەمە بە مەرج نەگیراوە لەسەر وەم ئوممەتە، بەڵکو مەبەستی ئیبنو عوێینە ئەوەبووە کە ئەمە بۆ هەموو ئوممەتێکە هیچ جیاوازی نیە لە نێوان یەکێك‌و یەکێکی تردا والله أعلم.... پاشان دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا﴾ بەشێوەیەك کە هەر نیشانەیەك ببینن بڕوای پێناکەن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[5] ئەوکەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتەدی، ئیتر باوەڕناهێنن، جا با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆبێت، هەتا ئازاری بەژان بەچاوی خۆیان دەبینن. لێرەدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا﴾ یان ئەگەر ڕێی ڕاست ببینن پێیدا ناچن، بەلام ئەگەر ڕێگای گومڕایی ببینن دەیگرنەبەر. واتە: ئەگەر ڕێگەی ڕاستیان بۆدەرکەوت، واتە ڕێگەی ڕزگاری ناگرنەبەر،

---

[1] الانعام (١١٠).

[2] الصف (٥).

[3] الطبری (١٣/١١٢).

[4] الطبری (١٣/١١٣).

[5] یونس (٩٦– ٩٧).

بەڵام ئەگەر ڕێگەی لەناوچوونو گومڕایان بینی پێیدا دەڕۆن، پاشان چارەنووسیان دەگێڕێتەوە بۆ ئەم حاڵەیان کە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ﴾ چونکە ئەوان نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆزانیو هەرگیز سەرنجیان نەدانێ. واتە: بە دڵ بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نەبوو، کاریشیان بە هیچ شتێکی نەدەکرد کە تێیدابوو. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ ئەوکەسانەی نیشانەکانی ئێمەو ڕۆژی قیامەتیان بە درۆدانا، کارەکانیان بەفیڕۆچوو. واتە: ئەوکەسەی ئەوەی کردووە لەوانو بەردەوامە لەسەری تا دەمرێت کارەکەی بەفیڕۆچووە. ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئایا جگ لە بەرامبەری کردەی خۆیان سزادەدرێن؟ واتە: تۆڵەیان لێ دەسێنین بەپێی ئەو کردارانەی لەپێش خۆیاندا کردوویانە ئەگەر چاکەیان کردبێت بە چاکەو ئەگەر خراپەشیان کردبێت بە خراپە، واتە: چی بڕوێنن ئەوە دەدورنەوە.

﴿ وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ (١٤٨) وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا قَالُوا لَئِنْ لَمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (١٤٩)﴾

**بەسەرهاتی پەرستنی گوێرەکە**

خودای گەورە باسی سەرلێشێواوی ئەوکەسانە دەکات لە نەوەی ئیسرائیل گمڕابوون بەهۆی پەرستنی ئەو گوێرەکەوە کە سامیری بۆی دروستی کردن لە خشڵی قیبتەکان کە لێیان خواستبوون. لەو خشڵە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆدروستکردن، پاشان مشتێك خۆڵی لەژێر سمی ئەسپەکەی جوبرەئیلی(سەلامی خودای لێبێت) کرد بەسەریدا، بوو بە پەیکەری گوێرەکەیەك هەر دەیبۆڕاند، (الخوار) واتە: بۆڕەی مانگا، دوای ڕۆیشتنی مووسا بەدەم ئەو بەڵێنەی پەروەردگاریەوە کە پێی دابوو ئەمەیان کرد، خودای گەورە مووسای لەسەر کێوی توور ئاگادار کردووە لەوکارەیان ﴿قال فانا قد فتنا قومك من بعدك وأظلهم السامری﴾[1] فەرموویەتی: پاش تۆ ئێمە هۆزەکەتمان تاقیکردەوە، سامیری لایدان لەڕێ. زانایانی تەفسیر ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی ئەم گوێرەکەوە، ئایا بووە خێنو گۆشتو قۆڕاندی، یان هەر خشڵەکەبوو هەوا پێیدا دەڕۆیشتو قۆڕەی لێوەدەهات وەکو مانگا، دوو ڕایان هەبووە والله أعلم.. وتراوە کە کاتێك گوێرەکە دەیقۆڕاند بەدەوریدا هەڵدەپەڕینو پێی تاقیکرانەوەو سەریان لێ شێواو وتیان ئەمە پەرستراوی ئێوەو مووسایە، مووسا لەبیری چوو، خودای گەورە

---

[1] أحمد (٢٧١/١) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

دەفەرمووێت: ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴾[1] ئایا ئەوانە تابینن، نە وەلامێکیان دەداتەوەو نە زیانێکی بۆ ئەوان هەیەو نە قازانج. وە لەم ئایەتەدا لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ﴾ لەپاش مووسا هۆزەکەی(لە خشلی خۆیان) گوێرەکەیەکیان دروستکردهەر دەیبۆڕاند، ئایا نەیاندیت ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵدا ناکاتو ڕێگایان پێ نیشان نادات؟ خودای گەورە بێزاری خۆی دەردەبڕێت لەسەرئەو گومرابوونەیانو بێئاگاییان لە وەدیهێنەری ئاسمانو زەمینو پەروەردگارو سەروەری گشت شتێك کە پەیکەری گوێرەکەیان لەگەڵ ئەودا پەرستووەکە قوڕەی لێوەدێت نە قسەیان لەگەڵدا دەکاتو نە ڕێگەی چاکیشیان نیشان دەدات. بەڵکو چاوەکانی داپۆشیون بە کوێریو نەفامیو گومرایی. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا قَالُوا لَئِنْ لَمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا ﴾. کاتێك تەواو پەشیمانی دایگرتنو دیتیان سەریان لێ شێواوە وتیان:ئەگەر پەروەردگارمان بەربەزەییەی خۆیمان نەخاتو لە گوناهە کانمان نەبورێت ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ ئێمە لە زیانبارانین. هەندێت بە (ترحمنا) یان حوێندووەتەوە لەباتی (یرحمنا)، ﴿مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ واتە: لە فەوتاوانو لەناوچووانین. ئەمەدانپێنانێك بوولەلایەن ئەوانەوە بەتاوانەکانوپەناهێنان بۆلای خودای گەورە.

﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰ إِلَىٰ قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِنْ بَعْدِي ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى الْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ابْنَ أُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ اسْتَضْعَفُونِي وَكَادُوا يَقْتُلُونَنِي فَلَا تُشْمِتْ بِيَ الْأَعْدَاءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٥١﴾﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰ إِلَىٰ قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِنْ بَعْدِي ﴾ مووسا وەختێك گەڕایەوە ناو هۆزەکەی، بە تووڕەییو دڵ پڕیەوە پێی وتن: لە دوای من چەند جێ نشینی خراپ بوون. خودای گەورە باسی مووسا (سەلامی خودای لێبێت) دەکات، کاتێك کە گەڕایەوە لە موناجاتەکەی لەلای پەروەردگاری گەورەی کە زۆر تووڕەو دڵگران بوو. ئەبودەرداء وتی: (الاسف) واتە زۆر تووڕە، بە هۆزەکەی وت: بەڕاستی کارێکی زۆر خراپتان کردووە کە گوێرەکەتان پەرستووە

---

[1] طه (٨٩)

دوای ئەوەی من ڕۆیشتمو بەجێم هێشتن ﴿أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡ﴾ ئاخر بۆچی پەلەتان کرد تا فەرمانی پەروەردگارتان پێدەگات؟ واتە: پەلەتان کرد هەتا من دەگەڕێمەوە لاتان، ئەوکاتەم لەلایەن خوداوە دیاریکرابوو ﴿وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِ﴾ لەوحەکانی فڕێداو قژی براکەی ڕاکێشا بەرەوخۆی، ئەمە بەلگەیە لەسەرئەوەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە دەفەرموێت: هەواڵ وەك بەچاوبینین نیە[1]. لەم فەرموودەوە دەردەکەوێت بۆیە لەوحەکانی فڕێدا چونکە زۆر تورەبوو لە هۆزەکەی، ئەمە قسەی زۆرینەی زانایانی پێشینەو ئەوانەی دوای ئەوانیشە ﴿وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِ﴾ مووسا قژی براکەی ڕاکێشا بەرەوخۆی، ترسا لەوەی هاروونی برای نکوڵی کردبێت لە قەدەغەکردنیان لەو گوێرەکە پەرستیە، وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي﴾[2] مووسا وتی: هاروون کە دیتت ئەوانە لە ڕێ لایاندا چی نەیهێشت تۆ، شوێنم بکەوی؟ ئایا تۆش لە فەرمانی من سەرپێچیت کرد، وتی: ئەی کوڕی دایکم ڕیشم مەگرەو قژم ڕامەکێشە من لەوەترسام کە بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە نێوان منو بەرەی ئیسرائیل لەسەرقسەم ڕانەوەستای. وە لێرەدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هاروون وتی: ئەی کوڕی دایکم هۆزەکەم هێزیان لێ سەندم خەریك بوو بمکوژن (دڵی) دوژمنان بە من خۆش مەکەو منیش لەگەڵ ناهەقیکاران دامەنێ. واتە: من وەك ئەوان سەیرمەکەو مەخەرەپاڵ ئەوان. بۆیە وتی: دڵی دایکم تا زیاتر دڵی نەرم بکاتو کاری تێ بکات، ئەگینا برای دایکیو باوکی بوون، کاتێك مووسا (سەلامی خودای لێبێت) بێ تاوانی هاروونی برای بۆ دەرکەوت (سەلامی خودای لێبێت) وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي﴾[3] هاروون لەپێشدا پێی وتن: ئەی هۆزەکەم ئێوە بەم گوێرەکە هەڵخەڵەتاون پەروەردگارتان دە هەندەی بژێویتانە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ دەی وەرن شوێنی من بکەونو فەرمانی من بەجێ

---

[1] أحمد (١/٢٧١) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] طه (٩٢- ٩٤).

[3] طه (٩٠).

بێـنن. دوای ئـەوە ﴿قَالَ﴾ مووسـا وتـی: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ ئەی پەروەردگاری من، لە خۆمو براکەم ببورەو بەر بەزەیی خۆتمان بخە، تۆ لـە گشت بەزەییان دڵسۆزتری. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە لە ئیبنـو عەبباسـەوە وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (ڕەحمـەتی خـودا لـە مووسـا بەچـاوبینینی وەك هەواڵـدان نیـە، کاتێـك پەروەردگاری هەواڵی دا بە مووسا کە هۆزەکەی دوای خۆی تاقیکراوەتەوە، لەوحەکانی فڕێ نەدا بەڵام کاتێك بە چاوی خۆی بینینی (پەیکەری گوێرەکە دەپەرستن) لەوحەکانی فڕێدا)[1].

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾﴾

لـەبارەی ئـەو غەزەبەشـەوە کـە نـەوەی ئیسرائیل تووشـیان هـات لـە پەرستنی ئـەو گوێرەکـەدا، ئەوەبوو خودا تەوبەی لێ قبوڵ نەکردن تا یەکتریان کوشت، وەك لە سورەتی (البقرة) دا لـە پێشەوە باسـکرا کـە دەفـەرمووێت: ﴿فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾[2] پەشـیمانی لـەلای پـەروەردگارتان دەربـبڕن سـا وەرن یـەکتر بکـوژن، لـەلای پەروەردگارتان ئەم کارە بۆتان چاکترە، کـە تەوبـەی لـێ قبـوڵ کـردن، هـەر ئەویشە لـە پەشیمانان خۆشدەبێتو دلۆڤانـە. لێرەشدا دەفـەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوکەسانەی کە بوونە گوێرەکەپەرست، بەر غەزەبی پەروەردگاریان کەوتنو لـە ژیـانی دونیـادا زەلیـل دەبـنو بـە سـوكو ڕیـسوایی دەمێننـەوە ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ﴾ هـەر بـەو شێوەیە سزای درۆ هەڵبەستان دەدەین، هەرکەسێك هـەر بیدعەیـەك دابهێنێـت خۆی تووشـی غـەزەبی خودا دەکات، بێگومان ڕیسوای ئەو بیدعەو سەرپێچی کردن لەو پەیامەی خودا پەیوەنـدە بـە دڵیـەوەو وا بەسەرشـانیەوە. وەك حەسـەنی بەسـری دەڵێـت: بێگومـان ڕیـسوای بیدعـە وا بەسەرشـانیانەوە بـا هێستر زۆر بەچاکی هەڵیانگرێتو غاربداتو یان بویشی تەقەی سمی بێت (لە ژێریاندا) ئەییوبی ختیانی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو قیلابـەی جەرمیـەوە کـە ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـد ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ﴾ بەوشیوەیە سزای درۆهەڵبەستان دەدەین، وتی: سوێند بە خودا ئەم ئایەتە بۆ هەموو درۆهەڵبەستێکە

---

[1] ابن ماجه (٢/٣٨٠).

[2] البقرة (٥٤).

تا ڕۆژی قیامەت.[1] سوفیانی کوڕی عویەینە وتی: هەموو خاوەن بیدعەیەك ڕیسوایە[2]. پاشان خودای گەورە عەبدەکانی وشیارکردووەتەوە و ڕێنمایی کردون کە تەوبەی عەبدەکانی قبوڵ دەکات لە هەر گوناهێك کە کردوویانە با ئەو گوناهەش خودانەناسی یان شەریك دانان یان دووڕوویی یان دووبەرەکیو ناکۆکی نانەوەش بووبێت. بەمەرجێك تەوبەبکات لێی، بۆیە دوای ئەم بەسەرهاتە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِهَا وَآمَنُوا﴾ ئەوکەسانەش ئاکاریان خراپ بووە، پاشان پەشیمان ببنەوەو بڕوا بێنن (ئەی محمد(ﷺ)) فروستادەی تەوبەو پێغەمبەری ڕەحمەت ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ پەروەردگارت لە گوناهەکانیان دەبورێتو دلۆڤانە. واتە: دوای پەشیمان بوونەوەیان لە گوناهەکانیان دەبورێت. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە لەوبارەیەوە، واتە: لە پیاوێك داوێن پیسی بکات لەگەڵ ژنێکداو پاشان مارەی بکات، ئەمیش ئەم ئایەتی خوێند ﴿وَالَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِهَا وَآمَنُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ عەبدوڵا دەجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە، نە فەرمانی پێ کردن بیکەنو نە قەدەغەشی کرد لێیان[3].

﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الْأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴿١٥٤﴾﴾

## مووسا کە توڕەییەکەی دامردەوە لەوحەکانی هەڵگرتەوە

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ﴾ کاتێك مووسا توڕەییەکەی نیشتەوە، واتە: کاتێك توڕەییەکەی هێدی بووەوە لە هۆزەکەی ﴿أَخَذَ الْأَلْوَاحَ﴾ ئەو لەوحانەی کۆکردەوە کە لەکاتی توڕەییدا فڕێیدا کە هۆزەکەی بینی خەریکی گوێرەکەپەرستین (توڕەییو دڵگرانیەکەشی هەر لەبەرخاتری خودابوو)، ﴿وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ کە تێیاندا ڕێ نیشاندانو بەزەیی بوو بۆ ئەوانەی لەخوداترسن. زۆر لە زانایانی تەفسیر دەڵێن، کاتێك کە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لەوحەکانی فڕێدا، لەوحەکانی شکاند، پاشان دوای توڕەبوونەکەی کۆی کردنەوە، لەبەرئەوە هەندێك لە زانایانی پێشینە دەڵێن:لەناو لەوحەکاندا ڕێ نیشاندانو بەزەیی بینی. قسە زۆرکراوە لەبارەی ئەم لەوحانەوە وتویانە هەتا ئێستا پارچەی ئەو لەوحانە لە گەنجینەدا

---

[1] الطبری (١٣/١٣٥).

[2] الطبری (١٣/١٣٦).

[3] الدر المنثور (٣/٥٦٦).

ماوەنەتەوە، لەلای پاشاکانی نەوەی ئیسرائیل بووە لە دوایدا کەوتونەتەدەست دەوڵەتی ئیسلامی. خودا خۆی دەزانێت ئەم قسەیە ڕاستە یان ڕاست نیە. بەڵام بەڵگەی تەواو لەسەر شکانی لەوحەکان کاتێك کە مووسا فرێیدان، ئەوەیە کە ئەو لەوحانە لە گەوهەری بەهەشت بووە. خودای گەورە فەرموویەتی کاتێك کە مووسا هەڵی گرتنەوە، دوای ئەوەی کە فرێیدان ڕێ نیشاندانو بەزەیی تێدا بینین بۆ ئەوانەی لەخوداترسن ﴿هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ وتەی (الرهيبة) مانای گەردنکەچیش دەگەیەنێت.

﴿ وَاخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَاتِنَا ۖ فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا ۖ إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَاءُ وَتَهْدِي مَن تَشَاءُ ۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا ۖ وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ (١٥٥) ﴾

**ڕۆیشتنی حەفتا کەس لە نەوەی ئیسرائیل بۆ خزمەت پەروەردگاریان و خودا لەوێ مراندنی**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَاتِنَا ۖ فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا ﴾ مووسا حەفتا کەسی لە هۆزەکەی دەست نیشان کرد کە بێنە دیدەنی ئێمە، کاتێك بوومەلەرزە دایگرتن، مووسا وتی: ئەی پەروەردگارم، ئەگەرمەیلت لێبووایە هەرلەپێشدا ئەوانو منیشت لەناودەبرد، ئایا بەوکارەی کە بێ ئاوەزان لە ئێمە کردویانە هەموومان لەناودەبەی؟ عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنو عەبباسەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، خودا فەرمانی دا بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) کە حەفتا کەس لە هۆزەکەی هەڵبژێرێت، مووساش حەفتا کەسی لە هۆزەکەی هەڵبژاردو لەگەڵ خۆی بردنی هەتا لە پەروەردگاریان بلاڵێنەوە، کاتێك کە پاڕانەوە لە خودا وتیان: خودا شتێکمان بدەرێ کە بە هیچ کەسێکت نەدابێت لە پێش ئێمەداو بە کەسیش نەدەی لەدوای ئێمە، خودای گەورە داواکەیانی پێ ناخۆش بوو، بومەلەرزە لێیدان ﴿قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ﴾[1] سوودی وتی: خودای گەورە فەرمانی دا کە هەندێك خەڵکی لە نەوەی ئیسرائیل بباتەلای هەتا پەشیمانی خۆیان لە پەرستنی ئەوگوێرەکەیە دەربڕنو کاتێکی بۆ دیاری کردن، ﴿ وَاخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلًا ﴾ مووسا حەفتا کەسی لە هۆزەکەی دەست نیشان کردو لەگەڵ خۆی بردنیو تا پەشیمانی خۆیان دەربڕن، کاتێك کە گەیشتنە ئەو شوێنە وتیان: بڕوات پێ ناکەین هەتا خودا بە ئاشکرا نەبینین، چونکە تۆ قسەت لەگەڵدا کردووە،

---

[1] الطبری (١٣/١٤١).

دەی نیشانی ئێمەشی بدە، لەوێدا بومەلەرزە لێیدان‌و هەموو مردن، مووسا هەڵساو دەستی کردەگریان‌و لە خودا دەپاڕایەوەو دەیوت: پەروەردگارم من چی بڵێم بە نەوەی ئیسرائیل کە پێیان گەیشتم کە تۆ پیاوەچاکەکانت لەناوبردون؟ ﴿رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰيَ﴾ ئەی پەروەردگارم ئەگەر بتویستایە لە پێشدا ئەوان‌و منیشت لەناودەبرد[1] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لە نەوەی ئیسرائیل حەفتا کەسی دەست نیشان کرد لە چاکترین‌و چاکترین کەس، وە وتی بەرەو خودا بچن‌و پەشیمانی دەربڕن لەسەر ئەوکارەی کە کردووتانەو داوای لێبوردنی لێ بکەن بۆ ئەوکەسانەش کە بەجێتان هێشتوونلە هۆزەکەتان‌و ڕۆژوبگرن‌و خۆتان جل‌وبەرگەکانتان بە پاک‌و خاوێنی ڕابگرن. بەرەو تووری سینا بەڕێی کردن بۆ ئەو دیدارەی کە پەروەردگاری بۆی دیاری کردبوون، چونکە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) نەیدەتوانی بێت بۆلای مەگین بە ئیزنی خودا خۆی‌و ئاگاداری ئەونەبێت. حەفتاکەسەکە (وەك بۆیان گێڕاوەمەتەوە) بە مووسایان وت: داوامان بۆبکە کە گوێ بیستی قسەی پەروەردگارمان بین، مووسا وتی: داواتان بۆدەکەم، کاتێك مووسا (سەلامی خودای لێبێت) لە کێوەکە نزیك کەوتەوە، عەمودێك هەور دای بەسەریداو کێوەکەشی گشت داپۆشی، مووسا چووەناو هەورەکەو بەوخەڵکەی وت ئێوەش نزیك ببنەوە، کاتێك مووسا قسەی لەگەڵ خوداکرد ڕووناکیەکی درەوشاوە بەردەم و چاوی کەوت کە هیچ کەسێك لە نەوەی ئادەم نەیدەتوانی بۆی بڕوانێت، پەردەیەك لەبەردەمیدا دادرایەوە، خەڵکەکە کە نزیك بوونەوەو چوونەناو هەورەکەو سوجدەیان برد، گوێیان لێ بوو کە خودا قسەی لەگەڵ مووسا دەکردو دەیفەرموو ئەوەبکەو ئەوە مەکەو فەرمانی پێ دەکردو قەدەغەشی لێ دەکرد، کاتێك ئەوفەرمانانەی مووسا دای بەسەر مووسادا تەواوبوو، لەسەری ڕەویەوەو لاچوو، پیاوەکان هاتن بۆلای‌و وتیان: ئەی مووسا بڕوات پێ ناهێنین تا خودا بەئاشکرا نەبینین، بومەلەرزە لێی دان‌و گیانیان دەرچوو هەموو مردن، مووسا (سەلامی خودای لێبێت) هاواری دەکردەخوداو لێی دەپاڕایەوەو دەیوت: ﴿رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰيَ﴾ ئەی پەروەردگارم ئەگەر بتویستایە لە پێشدا ئەوان‌و منیشت لەناودەبرد. ئەوانە بێ ئاوەزوبوون. ئایا ئەوانەی لە نەوەی ئیسرائیل لە دوامەوە ماون لەناودەبەیت.[2] ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو قەتادەو ئیبنو جەریرئەڵێن : ئەوانە بومەلەرزە دایگرتن چونکە هۆزەکەیان تا ئەوکاتە خەریکی گوێرەکەپەرستی بوون پێیان نەوتبون ئەو گوێرەکیە مەپەرستن.[3] ئەم قسەیە لە

---

[1] الطبری (١٣/١٤٠).

[2] الطبری (١٣/١٤٠).

[3] الطبری (١٣/١٤٣/١٤٤).

قسەی مووسا دەکات کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِیَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ﴾ ئایا تۆ هەموومان لەناودەبەین بەهۆی ئەوەی کە ئاوەزەکانمان کردوویانە، ئەمە تەنیا تاقیکردنەوەیەکی خۆتە ﴿تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِی مَن تَشَآءُۖ﴾ بە مەیلی خۆت کەسانێك گومڕا دەکەیتو هەندێکیش بەرەوخۆت شارەزا دەکەیتەوە. ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوعلیەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو کەسانی ترشە لە زانایانی پێشینەو پاشینە[1] جگە لەم مانایە هیچ مانایەکی تری نیە. مووساس دەفەرموویت: ئەی خودایە فەرمان هەر فەرمانی تۆیەو بڕیار هەر بڕیاری تۆیە، هەرچی مەیلت لێبووە بووە، مەیلی خۆتە هەرکەسێك گومڕادەکەیتو هەرکەسێکیش ڕێ نیشان دەدەیت، هەرکەسێك تۆ گمڕاتکرد کەس ناتوانێت ڕێ نیشان بداتو هەرکەسێکیش تۆ ڕێت نیشاندا کەس ناتوانێت گومڕای بکات. وە هەرکەسێك تۆ شتت لێ گرتەوە کەس ناتوانێت پێی بدات. وە هەرکەسێکیش تۆ شتێکت پێ بەخشی کەس ناتوانێت ڕێگری بێت، هەرچی مولکە هەموو هی تۆیە، هەموو بڕیارێك هەر لە تۆوەیە، وەدیهێنەرو فەرمانڕەوا هەرتۆی ﴿أَنتَ وَلِیُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَیۡرُ ٱلۡغَـٰفِرِینَ﴾ گەورەمان تۆی، بمانبورەو بەزەییت پێماندابێتەوە باشترین لێبوردە هەر تۆی. (الغفر) واتە: چاوپۆشینو چاوپۆشی کردن لە گوناه. (الرحمة) واتە: بەزەیی ئەگەر لەپاڵ داپۆشین دانرا، مەبەست پێی جارێکی ترو لەمەوبەدوا تووشی ئەو گوناهانەی نەکاتەوە ﴿وَأَنتَ خَیۡرُ ٱلۡغَـٰفِرِینَ﴾ باشترین لێبوردە هەر تۆی. هیچ کەسێك لە گوناه نابورێت جگە لە تۆ، ﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِی هَـٰذِهِ ٱلدُّنۡیَا حَسَنَةً وَفِی ٱلۡـَٔاخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَیۡكَۚ﴾ لەم دونیاو لە قیامەتیش چاکەمان بۆ بنوسە، ئێمە هاتینەوەلای تۆ. بەشی یەکەمی ئەم پاڕانەوەیە بۆ لێبوردن بوو لە گوناه، بەلام ئەم بەشە بۆ وەدەست هێنانی نیازو مەبەستە ﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِی هَـٰذِهِ ٱلدُّنۡیَا حَسَنَةً وَفِی ٱلۡـَٔاخِرَةِ﴾ واتە: لە دونیاو لە قیامەت چاکەمان بۆ بنوسەو بۆمان هەلگرە. لەپێشدا لە سورەتی(البقرة)دا تەفسیری (الحسنة) کرا. ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَیۡكَۚ﴾ ئێمە هاتینەوە بۆلای تۆو گەڕاوەتینەوەو پاشگەزبووینەوە. ئیبنو عەبباسو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو ئەبوعایەو زەححاکو ئیبراهیمی تەمیمیو سوددیو قەتادەو کەسانی تریش هەروایان وتووە[2] لە زمانیشدا هەر وا هاتووە.

---

[1] الطبری (١٣/١٥٠).

[2] الطبری (١٣/١٥٤/١٥٥).

﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٦﴾﴾

**بەزەیی خودا نوسراوە ئەو خوداناسانەی خۆپاك ڕاگرو بڕوادارن بە نیشانەكانی خوداو پێغەمبەرانی (سەلامی خودایان لێبێت)**

خودای گەورە خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە لەمەدا كە ئەفـەرموێت: ﴿إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ﴾ ئەمەش هەر تاقیكردنەوەی خۆتە، بەم ئایەتەو دەفەرموێت: ﴿عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖ﴾ هەركەسێك ئازاربدەم مەیلی خۆمە، بەزەییشم هەموو شتی داگرتووە. واتە: ئـەوەی مـەیلم لێبێت دەیكەمو هەر بڕیارێكیش بمەوێت نەیدەم، هەر كارێك دەیكـەم پـڕە لـە دادپـەروەریو كـارزانی. هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو پاكو بێعەیبە. كە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖ﴾ واتـە: بـەزەیی خـودا زۆر گـەورەو گشتگیرو فراوانـە. وەك خـودای گـەورە خـۆی باسـی ئـەو فریشتانە دەكات كە تەختیان (عەرشیان) هەلگرتووە كە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا﴾[1] ئەی پەروەردگاری هەموومان، دیارە بەزەییو زانینت هەموو شتی داگرتووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە جوندوبەوە كە كوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییە ( ڕەزای خودای لێبێت) وتی: عەرەبێكە دەشتەكی هاتو وشترەكەی یەخد (أناخ) و بەستیەوە پاشان لەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێـژی كرد، كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەكەی تەواوكرد پیاوەكە چووەلای وشـترەكەیو وشـترەكەی بـەرداو پاشـان سـواری بـوو، پاشـان بـە دەنگـی بـەرز وتـی: ئـەی خودایـە بـەزەییت بـە منـدا بێتـەوەو بـە موحەممەدیشدا، هـیچ كەسـێك مەكـە بـە هاوبەشـی ئـەم بەزەییـەی ئێمـە. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئێوە دەڵێن ئەمە گومڕاترە یان وشترەكەی، ئایا قوێتـان لـێ نـەبوو چـی وت؟) وتیـان: بەڵێ، فەرمووی: (بەڕاستی بەزەییی فروانی خودای پاوەنو سنووردار كـردووە، چـونكە خـودای گـەورە سەد بەزەیی وەدی هێناوە، یەك بـەزەیی ناردووەتـەخوارەوە دروسـتكراوەكانی پێـی بەهرەمەنـدن لـە مرۆڤ و جنۆكـەو گیانلەبـەر نـەوەدونۆ بەزەییـشی لـەلای خـۆی هێـشتووەتەوە ئایا ئێوە دەڵێن: ئـەو گومڕاترە یان وشترەكەی؟)[2] ئەبوداودیش ڕێوایەتی كردووە[1] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایـەتی كـردووە

---

[1] غافر (٧).

[2] أحمد (٣١٢/٤) سەنەدەكانی لاوازە.

لە سەلمانەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودای گەورە سەد بەزەیی هەیە، لەوانە بەزەییەکە کە خەڵکی لەناو خۆیاندا بەکاری دێنن، وە بەو بەزەییە درەندەکان سۆزیان بۆ بێچوەکانیان هەیە، نەوەدونۆ بەزەییەکەی تری دواخستووە بۆ ڕۆژی قیامەت)[2]. موسلیمش ڕیوایەتی کردووە[3]

پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ چاکەی ئەوانە دەنوسم لە خراپە خۆپارێزن، واتە: بەزەیی خۆمیان بۆ مسۆگەر دەکەم وەك منەتێك بەسەریانەوەو چاکەیە لەگەڵیان لەلایەن خۆمەوە. وەك لە ئایەتێکە تردا فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾[4] خودا لەسەر خۆی نوسیووە کە دەبێت خاوەن بەزەیی بێت ﴿لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوانەی کە خۆپارێزنو خاوەن ئەو ڕەوشتانەن، ئەوانەش ئوممەتی محمدن(ﷺ)، ﴿لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ واتە: ئەوانەی خۆپارێزن لە بتپەرستیو گوناهە گەورەکان ﴿وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکات دەدەن. وتراوە: زەکاتی گیان وتراویشە: زەکاتیماڵو سامان، هەڵیشی دەگرێت گیانو ماڵیش بێت، چونکە ئەم ئایەتە لە مەککە هاتووەتەخوارەوە ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَـٰتِنَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانە کە بڕوایان بە بەڵگو نیشانەکانی ئێمە هەیە.

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَـٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾

### سیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرە

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ﴾ ئەوانە وا دەکەونە شوێن ئەو پێغەمبەرەی کە سپاردەی خودایە و نەخوێندەوارەو لە تەوراتو ئینجیلش دەبینن ناوی نوسراوە لەلای خۆیان. ئەمە سیفەتی محمدە(ﷺ) لە کتێبی پێغەمبەرەکاندا هاتووە مژدەیان داوە بە گەلەکانیان بە هاتنی، فەرمانیشیان پێداوەن کە شوێنی بکەون، هەتا ئێستاش سیفەتەکانی لە کتێبەکانیدا هەیەو زاناو قەشەکانیان

---

[1] أبوداود (١٩٧/٥) سەنەدەکانی لاوازە.

[2] أحمد (٤٣٩/٥) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٢١٠٨/٤).

[4] الانعام (١٢).

دەیزانن. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو سەخری عوقەیلیەوە وتی: پیاوێك لە عەرەبی دەشتەكی بۆیگێڕامەوە وتی: لە ژیانی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) وشترێكی شیردەرم لەگەڵ خۆم هێنا بۆ شاری مەدینە، كاتێك كە مامەڵەكەم تەواوكرد، وتم دەبێت بچمەلای ئەم پیاوەو گوێبیستی بم، وتی: پێم گەیشت لە نێوان ئەبوبەكرو عومەردابوو بەیەكەوە دەڕۆیشتن شوێنیان كەوتم هەتا چوونەلای پیاوێكی جوولەكە، تەوراتی كردبووەوەو دەیخوێند بۆئەوەی دڵی خۆی پێ بداتەوە لەسەر كوڕێكی لەكاتی مردنیدا، كوڕێكی زۆر جوان و پێكەوتوبوو. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوێندتت دەدەم بەوكەسەی تەوراتی ناردووە ئایا لەم كتێبەتدا سیفەتو هاتنی منت بینیوە؟) بەسەری ئاماژەی بەم شێوەیە كرد، واتە: نەخێر، كوڕكەی وتی: بەڵێ، سوێند بەوكەسەی تەوراتی ناردووە ئێمە سیفەتو هتنی تۆ دەزانین لە كتێبەكەماندا وە من شایەتی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوداو شایەتیش دەدەم كە تۆ پێغەمبەری خودای، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو جوولەكەیە هەستێنن لەلای براكەتان پاشان خۆی كفنەكەی بۆ كردو نوێژیشی لەسەركرد)[1]، ئەم فەرموودەیە چاكو بەهێزە نمونەی لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەنەسەوە[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە وتی: موسەنا بۆیگێڕاینەوە لە عەتای كوڕی یەسارەوە وتی: گەیشتم بە عەبدوڵلای كوڕی عەمر، پێم وت: باسی سیفەتی پێغەمبەری خودام (ﷺ) لە تەوراتدا بۆبكە، وتی: بەڵێ سوێند بە خودا وەسف كراوە لە تەوراتدا وەك لە قورئاندا وەسف كراوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ شَـٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَـذِيرًا ﴾[3] ئەی پێغەمبەر ئێمە بۆیە ناردوومانی، شایەتو مزگێنی دەرو ترسێنەر بیت. قەڵابیت بۆ نەخوێندەواران (واتە عەرەبەكان) تۆ بەندەو پێغەمبەری منی ناوم نای موتەوەكیل، توندوتیژو دڵڕەق نیە، قاڵەقاڵكەر نیە لە بازاڕەكاندا، پاداشتی خراپە بە خراپە ناداتەوە، بەڵكو لێبوردەیەو چاوپۆشیكەرە. خودا نایمرێنێت تا ئەو نەتەوە لارو وێرەی پێ ڕاست دەكاتەوەو دەڵێن: (لا اله الا الله) وە ئەو دڵەداخراوو گوێ كەڕو چاوكوێرانەی پێ دەكاتەوە. عەتا وتی: گەیشتم بە كەعب پرسیارم لێكرد لەوبارەیەوە پیتی جیاوازی نەبوو جگە لەوەی كەعب بە زمانی خۆی وتی: (قلوباً غلوفياً و اذاناً صمومياً و أعيوناً عمومياً)[4] بوخاریش ڕیوایەتی كردووە لە سەحیحەكەیدا[5] ئیبنو جەریر باسی فەرموودەكەی عەبدوڵلای كوڕی عەمری كردووەو پاشان وتی: لە قسەی زۆرێك لە زانایانی پێشینەدا وتەی تەورات بەكارهێنراوە

[1] أحمد (٥/٤١١) فەرموودەیەكی بەهێزە.

[2] فتح الباری (٣/٢٩٥).

[3] الاحزاب (٤٥).

[4] الطبری (١٣/١٦٤).

[5] فتح الباری (٤/٤٠٢).

بۆ هەموو کتێبەکانی ئەهلی کیتاب. لە هەندێك فەرموودەشدا هاتووە وەك ئەوە. والله أعلم.... پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ هانیان دەدات لەسەرچاکەو ناهێڵێت خراپەبکەن. ئەمە سیفەتی ئەم پێغەمبەرەیە(ﷺ) لە کتێبە پێشوەکانداو ژیانی هەر بەم شێوەیە بووە، بەردەوام فەرمانی داوە بە چاکەو بەرگری کردووە لە خراپە. وەك عەبدوڵای کوڕی مەسعودئەڵێت : کاتێك گوێت لە خودایە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی خاوەنباوەڕن، باش گوێبیستی ببە، بێگومان ئەوە چاکەیەکە فەرمانی پێ دەدرێت یان خراپەیەکە قەدەغەی دەکرێت، لەوە گرنگترو مەزنتر ئەوەیە کە خودا بۆ ئەوەی ناردووە کە فەرمان بدرێت بە پەرستنی ئەو بە تەنیا کە شەریکی نیەو قەدەغەکردنی پەرستنی هیچ شتێکی ترجگە لەو، وەك چۆن لەپێش ئەودا گشت پێغەمبەرەکانی ناردووە بۆئەوەی تەنیا ئەو بپەرسترێت. وەك خودا خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[1] بۆ ناو خەموو گەلێك پێغەمبەرێکمان نارد کە خودا بپەرستن‌و لە شەیتان دوورەپەرێزبن. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾ شتەپاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات‌و شتەحەرامەکانیان لێ قەدەغەدەکات. واتە: ئەوشتانەی کە حەرامیان کردبوو لە خۆیان بۆیان حەڵاڵ دەکات وەك: (النجائر والسوائب والوصائل والحام) گەلێك شتی تریش کە لەسەرخۆیان گران‌و تەنگ کردبووەوە، وە شتەحەرامەکانیان لێ قەدەغەدەکات، عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: وەك گۆشتی بەرازو سووخواردن‌و زۆر خواردنی تریش کە حەرام بوون‌و حەڵاڵیان کردبوو بۆ خۆیان کە خودا قەدەغەی کردبوو لێیان.[2] ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ وە ئەو بارەگران‌و کۆت‌و زنجیرانەش کە بەسەریانەوەبوو لادەبات. واتە: هاتووە بۆ ئاسانکاری‌و لێبوردەیی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەو دووکەسە (مەعازو ئەبوموسای ئەشعەری) کاتێك کە ناردنی بۆ یەمەن: (مژدەبدەن‌و ڕاومەنێن‌و ئاسانکارین‌و قورس مەکەن‌و تەبابن‌و ناکۆك مەبن)[3]، یەکێك لە هاوەڵەکانی کە ناوی ئەبوبەرزەی ئەسلەمی وتی: من لەگەڵ پێغەمبەری خودابووم (ﷺ) ئاسانکاریەکانم بینیوە، ئەو گەلانەی پێش ئێمە تەنگی‌و گرانی لەناو شەریعەتەکانیاندا هەبووە خودای مەزن کارەکانی فراوان‌و ئاسان کرد لەسەر ئەم ئوممەتە، هەربۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:

---

[1] النحل (٣٦).

[2] الطبری (١٣/١٦٦).

[3] فتح الباری (٥/١٨٨).

(بێگومان خودا چاوپۆشی کردووە لەم ئوممەتەی من لەوەی کە دێت بە دڵیاندا ئەگەر نەیڵێن یان نەیکەن)[1]، وە فەرموویەتی: (لەسەر ئوممەتی من (تاوانی) هەڵەو لەبیرچوونو ناچارکردن هەڵگیراوە)[2]، بۆیە خودای گەورە ڕێنومایی ئەم ئوممەتەی کردووە کە بڵێن ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾[3] ئەی پەروەردگاری هەموومان، ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو یان تێیدا بەهەڵەچووبین، لێمان مەگرە، ئەی پەروەردگاری هەموومان، ئەرکی ئەوەندە گرانمان مەخەسەرشان وەك ئەوانەی پێش ئێمە لەسەریان بوو، ئەی خودای هەموومان وامان پێ مەسپێرە کە لە توانامان بەدەربێت، تۆ هە ر خۆت لێمان ببورەو بەر بەزەیی خۆتمان بخەو بمانبەخشە، هەموو کاروبارێکی ئێمە بەدەستی تۆیەو سەریشمان بخە بەسەر ئەوانەی خودانەناسن. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە خودای گەورە دوای هە ر داوایەك لەم داوایانە فەرموویەتی: ئەوا کردم، ئەوا کردم، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ﴾ ئەوانەی بڕوایان پێ کردووەو بە ڕێزەوە لێیان ڕوانیوەو یارمەتیان داوە ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ دوای ئەو ڕووناکیە چوون کە لەگەڵ ئەو ڕەوانەکراوە. واتە: ئەو قورئانەو ئەو تەنکایەی کە پێی هاتووە خەڵکی لێ ئاگادارکردووە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانەڕزگارەکانن. واتە: لە دونیاو لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾

**گشت پەیامی پێغەمبەرمان موحەممەد(ﷺ) بۆ هەموو جیهانە**

خودای گەورە بە پێغەمبەرو ڕاسپاردەی خۆی موحەممەد(ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾ ئەی خەڵکینە بزانن من خودا ڕای سپاردووم بۆلای ئێوە هەمووتان. ئەمە وتارێکە بۆ سوورو ڕەشو عەرەبو عەجەم، ئەمەش ڕێزو قەدرو گەورەییە بۆ

---

[1] فتح الباری (٩/٣٠٠).

[2] ابن ماجه (١/٦٥٩) فەرموودەیەکی بەهێزنیە.

[3] البقرة (٢٨٦).

پێغەمبەر(ﷺ) کە دواین پێغەمبەرە ڕەوانەکراوە بۆ هەموو خەڵکی وەك خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾[1] بڵێ: خودا شایەتە لە نێوان منو ئێوەدا، ئەم قورئانە ئەو بە خەڵات بۆ منی ناردەخوارەوە، تا بەهۆی ئەوقورئانەوە ترس وەبەر ئێوە بنێمو هەرکەسێکیش کە پێی دەگات. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ﴾[2] هەرکەسێك لەو کۆمەڵانە بڕوای پێ نەکات، جێی لە ئاگر بۆخۆشکراوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ﴾[3]
بەوکەسانەش کە بوونەتە ئەهلی کتێبو بەوکەسانەش کە نازانن بڵێ: ئاخۆ ئێوە وەك ئێمە خۆتان بە خودا سپاردووە؟ جا ئەگەر خۆیان سپاردبوو، ئەوا کەوتوونەتەسەر ڕێگا، ئەگەر ڕوویان لێ وەرگێرای، تۆ هە ر ئەوەندەت لەسەرە ڕایگەیەنیت. ئایەت لەمبارەوە زۆرە فەرموودەش زۆر زۆرە لەمبارەیەوەو لە ژمارەنایات. ئەوە شتێکە ئاشکرایە لە ئاینی ئیسلامدا پێویستە بزانرێت کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕاسپاردەی خودایە بۆ هەموو خەڵکی، بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردووە لە ئەبودەرداءەوە(ڕەزای خودای لێبێت) وتی: لە نێوان ئەبوبەکرو عومەردا (ڕەزای خودایان لێبێت) دەمەقاڵێیەك ڕوویدا، ئەبوبەکر قینی عومەری هەڵساند، عومەر بەتوڕەییەوە لەلای هەستاو ڕۆیشت، ئەبوبەکر دوای کەوت داوای لێکرد کە لێی ببورێت، عومەر لێی نەبووراو دەرگاکەی خۆی بە ڕویدا داخست، ئەبوبەکر هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبودەرداء وتی: پێغەمبەر(ﷺ) توورەبوو، ئەبوبەکریش سوێندی دەخواردو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من زیاتر ناهەقیم کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئێوە هاوەڵەکەم واز لێدێنن بۆمن؟ من وتم ئەی خەڵکینە من ڕاسپاردەی خودام بۆلای ئێوە هەمووتان، ئێوە وتتان: درۆدەکەیت، ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەیت)[4] تەنیا بوخاری خۆی ئەم فەرموودەیەی هێناوە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە بە مەرفوعی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێ بەخشراوە کە هیچ پێغەمبەرێك لەپێش من پێس نەبەخشراوە، بە شانازیشەوە نایڵێم، نێردراوم بۆ خەڵکی هەموو سوورو ڕەش، یارمەتی دراوم بە ترس (خستنەدڵی دوژمن) بەڕێوەڕۆیشتنی مانگێك، تالانیو دەستکەوتم بۆ حەڵاڵ کراوە کە بۆ هیچ کەسێك لەپێش مندا حەڵاڵ نەکراوە، زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت پاكو

---

[1] الانعام (١٩).
[2] هود (١٧).
[3] ال عمران (٢٠).
[4] فتح البارى (١٥٣/٨).

خاوێنکەرەوە، شەفاعەتیشم پێ بەخشراوە دوام خستووە بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەو (شەفاعەتەش) بۆ ئەوکەسەیە کە لە هیچ شتێکدا شەریك بۆ خودا دانەنێت)[1]، سەنەدەکانی زۆرباشە.

﴿الَّذِى لَهُۥ مُلْكُ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ ئەوخودایەی مولکایەتی ئاسمانەکانو ئەم زەمینەش هەر هی ئەوە، لەخۆی بەدەر هیچ شتێك بۆ پەرستن ناشێت. گیان دەبەخشێتو گیان دەسێنێت. سیفەتەکانی خودای گەورە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) ئەویە کە دەفەرموێت: ئەوکەسەی کە منی ناردووە، هەر خۆی وەدیهێنەری گشت شتێکەو پەروەردگارو سەروەریەتی، هەموو فەرمانێك لە دەستی ئەودایەو گیان دەبەخشێتو گیان دەردەکاتو بڕیار هەر بڕیاری ئەوە ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ﴾ دەسا ئێوە بە خوداو ڕاسپاردەکەی کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە بڕوابێنن. ئاگاداری کردوون کە ئەو پێغەمبەری خودایە ڕەوانەکراوە بۆ ئەوان پاشان فەرمانی پێدان کە شوێنی بکەونو بڕوای پێ بێنن ﴿ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ﴾ ئەوپێغەمبەرە نەخوێندەوارەی بەڵێنتان پێ دەداتو مژدەتان دەداتێ بە هاتنی لە کتێبە پێشوەکاندا چونکە ئەو سیفەتانە لە کتێبەکانی ئەواندا بەو شێوەیە هاتبوو. هەربۆیە خودای مەزن فەرموویەتی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ﴿ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ﴾. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ کە ئەویش خۆی بڕوای بە خودا هەیەو هەرچیش خودا فەرموویەتی بڕوادەکات. شوێنی بکەون بەڵکو شارەزای ڕێگابن. واتە: قسەکەی ڕاستی کردارەکەی دەسەلمێنێت کە بڕوای هەیە بەوەی کە بۆی نێردراوە لەلایەن پەروەردگارەوە، ئێوەش ڕێگەی ئەو بگرنەبەرو بەشوێنیدا بڕۆن بەڵکو شارەزای ڕێگەی ڕاست ببن.

﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾﴾

**خودا باسی هەندێك لە نەوەی ئیسرائیل دەکات کە ڕێنمایی دەکەنو بە ڕاستیش دادوەری دەکەن**

خودای گەورە لێرەدا باسی هەندێك لە نەوەی ئیسرائیل دەکات کە پەیڕەوی هەقنو دادوەریشی پێ دەکەن، دەفەرموێت: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ﴾ واتە: دەستەیەکیش لە هۆزی مووسادا هەیە، بە ڕاستی ڕێنمایی دەکەنو بە ڕاستیش دادوەری دەکەن. ئایەت لەمبارەوە زۆرە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ

---

[1] أحمد (٣٠١/١). فەرموودەیەکی سەحیحە.

وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾[1] ئەهلی کتێب هەموو وەکویەك نین، کۆمەڵی وایان تێدایە کە ڕوو بە خـودا دەوەسـتن‌و بـە شـەودا ئایـەتی خـودا دەخوێننـەوەو سـوجدەی بۆدەبـەن. وە ئەفـەرمووێت: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾[2] لـەناو ئـەهلی کتێبـیش کەسانی وا هەن کە بڕوای بە خودا هەیەو بەو قورئانەی بۆ ئێوە هاتەخوارو بەو کتێبەی کە بۆ خۆیان ڕەوانەکراوە، ملکەچن بۆ خوداو نیشانەکانی خودا بە نرخێکی کەم نافرۆشن، ئەوانە پـەروەردگاریان پاداشتی کاریـان دەداتـێ، بێگومـان خـودا لێپرسینەوەی خێرایە. وە ئەفـەرمووێت: ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ (٥٢) وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ (٥٣) أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا ﴾[3] ئەوکەسانەی پێش هاتنی قورئان، ئێمە کتێبمان پـێ داون، باوەڕیان بە قورئان هەیە، کاتێك بۆیان دەخوێننەوە دەڵێن: بڕوامان پێ هێناو بێگومان ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، بەڕلەوەش بیتەخوارەوە هەر موسسڵمان بووین. ئەوانە لەبەرئەوەی خۆڕاگربـوون دووجـار پاداشـتیان پـێ دەدرێـت. وە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا (١٠٨) وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴾[4] ئەوکەسانەی لەپێشدا (لەمە) ئاگادارکرابوون، هەرکاتێك بۆیان دەخوێننەوە چەناگە دەخەنـە سەزەوی‌و سوجدە دەبەن، دەڵێن: پاکی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە، بەڵێنی پەروەردگارمان وا وەدیهات، دەمەوڕوو خۆیان دەخەن بەسەر زەویداو دەگرین‌و ئەمەش خۆبەکەم زانینیان زیاتردەکات.

﴿ وَقَطَّعْنَاهُمُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ إِذِ اسْتَسْقَاهُ قَوْمُهُ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (١٦٠) وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا حِطَّةٌ

[1] ال عمران (١١٣).

[2] ال عمران (١٩٩).

[3] القصص (٥٢– ٥٤).

[4] الاسراء (١٠٧– ١٠٩).

وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ
يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٢﴾﴾

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ
قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ
مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ
وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ وَكُلُواْ
مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ وَقُولُواْ حِطَّةٞ وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ﴾ ئەوانەمان بە دوانزە دەستە بەش بەش کردو ئەوکاتەش هۆزەکەی مووسا داوای ئاوی خواردنەوەیان لە مووسا کرد، ئێمە مووسامان تێگەیاند کە : بە دارعەساکەی دەستت لەو بەردە بدە، دوانزە کانی لە بەردەکەوە هەڵقوڵێن، هەردەستەیەك جێ خواردنەوەی ئاوی خۆی ناسیەوە، هەوریشمان لەلای سەریانەوە کردە سێبەر، گەزۆشمان لەگەڵ شیلاقە (پیشۆڵە) بۆ ناردن: بخۆن لەوشتە پاکانەی کردوومانەتە بژێوتان، هیچ غەدرێکمان لێ نەکردن. بەڵام خۆیان غەدریان لە خۆیان کرد ئەوکاتەش کە پێیان وترا: لەو شارە نیشتەجێ بن و لە هەرلایەك هەرچی دەتانەوێت بیخۆن، بڵێن: نزای ئێمە بۆ سڕینەوەی تاوانەکانمانەو لە دەرگاوە کە دەچنە ژوور سوجدە بەرن، هەر هەڵەیەك کە کردووتانە دەتانبەخشێت، بۆ ئەوانەی ئاکارچاکن پاداشتی زیاتریش دەدەین. ئەوسا ناهەقیکارانیان ئەو قسەیەی پێیان وترابوو، گۆڕییانە بارێکی دیکە. ئێمەش لەسەر ئەو ناهەقیکردنەیان، بەڵایەکمان لە ئاسمانەوە بۆ ناردن. تەفسیری ئەم ئایەتە لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة) دا بە تەواوی کراوە کە سورەتێکی مەدەنیە، وەك ئەم سیاقە مەکیە، ڕوونیشمان کردووەتەوە کە جیاوازی چیە لە نێوان ئەم سیاقەو ئەوی تردا کە پێویس ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە.

﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾

**بێ فەرمانی کردنی جوولەکە لە ڕۆژی شەممەدا**

ئەم ئایەتە درێژەدانە بەو ڕووداوەی کە خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾[1] ئێوە لە حاڵی ئەوانەتان ئاگاداربوونو کە لە ڕۆژی شەممەدا لە فەرمانی خودا لایاندا. پێمان وتن: مەیموونی ترۆکراوبن. لێرەشدا خودای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ﴾ دەربارەی ئەوشارەی وا کەوتبووە قەراغی دەریا لێیان بپرسە. واتە: لەو جوولەکانەی کە لەلاتن بەسەرهاتی ئەو هاوەڵانەیان بپرسە کە بێ فەرمانی خودایان کرد، کە چ بەڵایەك تووشیان هات لەسەر ئەو دەستدرێژیو کردارەخراپو بێ فەرمانیو فرۆفێڵانەیان ئەوانەش بترسێنە لە شاردنەوەی ئەو سیفەتانەی تۆ کە لە کتێبەکانیادا دەیبینن، نەوەکو ئەوانیش تووشی ئەو بەڵایە ببن کە براو پێشینەکانیان تووشیان هات لەو شارەدا، ئەو شارەش ئیلەی پێ دەڵێن کە لەسەر کەناری دەریای قەلزەمە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: لە ئەبوداودی کوڕی حوسەینەوە لە عیکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ﴾ وتی: شارێکە پێ دەوترێت: ئیلە لە نێوان مەدیەنو تووردایە.[2] عیکرەمەو موجاهیدو قەتادەو سوددیش هەر وایان وتووە[3] ﴿إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ ﴾ کە لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژیان دەکردو نافەرمانی خودایان دەکرد تێیدا. کە ئامۆژگاری کردبوون ڕاوەماسی نەکەن ﴿تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا ﴾ چونکە لە ڕۆژی شەممەدا ماسیەکان سەرئاودەکەوتن. زەححاك لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ﴿شُرَّعًا ﴾ واتە: سەرئاو دەکەوتن.[4] ﴿وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم ﴾ ڕۆژێك کە شەممە نەبوایە دیاریان نەبوو ئێمە ئاوا تاقیان دەکەینەوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: واتە ئێمە تاقیان

---

[1] البقرة (٦٥).

[2] الطبري (١٣/١٨٠).

[3] الطبري (١٣/١٨٠/١٨١).

[4] الطبري (١٣/١٨٣).

دەکەینەوە ماسیەکانیان بۆ دەخەینە سەرئاو دەریان دەخەین کە لەو ڕۆژەدا لێیان قەدەغەکراوەو لە ڕۆژەحەلاڵەکانیشدا لێیان دەشارینەوە کە ڕاویان بکەن ﴿كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ ئەوکەسانەی لە ڕێگەی خودا لادەدەن ئێمە ئاوا تاقیان دەکەینەوە. واتە: بەهۆی لادانیانەوە لە فەرمانی خودا.[1] بەتتە ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهرەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرمووێت: (کارێك مەکەن کە جوولەکەکان کردیان، قەدەغەکراوەکانی خودایان حەلاڵ کرد بە هەندێك فروفێڵ)[2] ئەمەش پشتگیریەکی چاکە.

﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ۙ اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (١٦٤) فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ (١٦٥) فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ (١٦٦)﴾

## گۆڕینی وێنەیان بە مەیمون و ڕزگاربوونی ئەوانەی بەرگریان کردو ئەوانەش کە بێ دەنگ بوون

خودای گەورە باسی ئەم شارە دەکات کە بوون بە سێ دەستەوە، دەستەیەك ئەوەی لێی ئاگادارکرابوون نەیکەن و کردیان، بە فروفێڵ هەستان بە ڕاوکردنی ئەو ماسیانە لە ڕۆژی شەممەدا، وەك لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة) باسکرا، دەستەیەکی تر بەرگریان لەوە کردو نزیکی نەبوونەوە. دەستەیەکی تریشیان بێ دەنگ بوون و ڕاوەماسیان نەکردو بەرگریشیان لێ نەکرد، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ۙ اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ دەستەیەکیش لە خۆیان وتیان: بۆچی ئێوە دەربارەی کەسانێك کە خودا دەیەوێت قڕیان بکات، یان بە توندی ئازاریان بدات بە ئامۆژگاریەوە خەریکن؟ واتە: وتیان بەوانەی کە نارەزاییان دەربڕی پێیان وتن: ﴿مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾ تا لای پەروەردگارتانەوە تووشی شەرمەزاری نەبین. کە بەڵێنی لێ وەرگرتووین فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەلکو ئەوانیش بترسن. واتە: شایەت بەو بەرگری کردنەی ئێمە بترسن لەوەی کە خەریکن دەیکەن و وازبێنن و بگەڕێنەوە بۆلای خوداو تەوبەبکەن، کاتێك تەوبەیان کرد خودا لێیان دەبورێت و بەزەیی دێتەوە پێیاندا، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ کاتێك ئەو ئامۆژگاری کردنەیان لەبیرخۆیان بردەوە،

---

[1] الطبري (١٣/١٨٣).

[2] الزفاف (١٩٢) سەنەدەکانی حەسەنە.

ئەوكەسـانەمان ڕزگـاكرد كـە دژی خەراپـە وەسـتان، زۆر بەتونـدی ئـازا ری ئەوانەشمانـدا كـە ناهەقیكاربوونو لە ڕێگەی ڕاست لایاندابوو. واتـە: كاتێك ئەوانەی ئـەو كارەیان كردو ئامۆژگاریـان وەرنەگرت سزایەكی زۆر توندمان دان ﴿بِعَذَابٍ بَئِيسٍ﴾. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ڕزگاربوونی ئەوانەی كە بەرگریان كردو بەڵگەشە لەسەر لەناوچوونی ستەمكاران، باسی ئەوانەشی نەكردووە كە بێدەنگ بوونو بەرگریان نەكردووە. چونكە پاداشت لە شێوەی كردارە، ئەوانە شایەنی وەسفكردن نەبوون تـا وەسـف بكـرێن، كـارێكی زۆر خراپیـشیان نـەكردبوو تـا زەم بكـرێن. ئیبنـو عـەبباس لـەم ئایەتـەدا ئەفەرمووێت: نـازانم ئایـا ئەوانـەی كـە وتیـان: ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ﴾ ڕزگاریـان بـوو یـان نـا؟ عیكرەمە وتی: بـەردەوام لەگـەڵی بـووم تـا تـێم گەیاند كـە ئـەوانیش ڕزگاریـان بـوە، فـەرمانی دا دوو پۆشاكی ئەستوریان لەبەركردم.[1] خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ﴾ لەم ئایەتەوە وەردەگیرێت كە ئەوانەی ماونەتەوە ڕزگاریان بووە ﴿بَـِٔيسٍۭ﴾ بەقسەی موجاهید واتە زۆر توند[2]، وە لە ڕیوایەتێكی تردا واتە بەژان. قەتادە وتی بەئێش.[3] ئەم مانایانـە هـەموو لەیەكـەوە نـزیكن والله أعلـم.. پاشـان خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ﴾ كاتێك كە هەر ئەوكارەیان كرد كە پێیان وترابوو مەیكەن. وتمان ببنە كۆمـەڵێك مـەیمونی ترۆكراو. واتە: سوكو ڕیسواو بێ نرخ.

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾﴾

**زەلیلی بەردەوام بەشی جوولەكەیە**

خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئەوكاتەشت لەبیربێت ئەی موحەممەد(ﷺ) كە پـەروەردگاری تـۆ ڕایگەیاند: كـە تـا ڕۆژی قیامـەت ستەمكاری وەهایـان دەنێرێتەسـەر و بەتونـدی ئازاریـان دەدەن. ﴿تَأَذَّنَ﴾ لەسـەر وەزنـی (تَفَعَّلَ) یە لە ئیزنەوە (الإذن) هاتووە. موجاهید ئەفەرمووێت : واتە أعلم،یانی: بزانـە. كەسـانی تـریش وتویانە: فەرمانە، وتەكە ئەوندە بەهێزە مانای سوێندیش دەگەیەنێت، هەر لەبەرئەوەیە لامـی ﴿لَيَبْعَثَنَّ﴾

---

[1] الطبری (١٣/١٨٧).
[2] الطبری (١٣/٢٠٢).
[3] الطبری (١٣/٢٠٢).

عَلَيْهِمْ﴾ی پێوە لکاوە، واتە: ستەمکاری وا دەنێرێتەسەر جوولەکە ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ تا ڕۆژی قیامەت بەتوندی سزایان بدەن بەهۆی سەرپێچیو دژایەتی کردنی پەیامو فەرمانەکانی خوداو فێڵ کردنیان لەوشتانەی کە قەدەغەی کردبوو لێیان. وتراوە: مووسا (سەلامی خودای لێبێت) حەوت ساڵ سەرانەی لەسەردانان. هەندێکە تر دەڵێن: سێنزە ساڵ سەرانەی لەسەردانان. مووسا (سەلامی خودای لێبێت) یەکەم کەس بووە سەرانەی داناوە. پاشان کەوتونەتە ژێردەستی پاشاکانی یۆنانو کوشدانیو کلدانیەکان، دوای ئەوانیش مەسیحەکانیش زاڵبوون بەسەریانداو بە زەلیلی لەژێر دەستیاندابوونو سەرانەشیان لێ دەسەندن، پاشان ئاینی ئیسلام هاتو لەژێر چاودێریو سایەی پێغەمبەردا (ﷺ) بوون باجو سەرانەیان دەدا. عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: بە زەلیلی دەژیانو سەرانەشیان لێ دەسەندرا[1]، عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: (المسكنة) واتە: سەرانەدانو ئەوانەش کە بەتوندی سزایان دەدەن تا ڕۆژی قیامەت موحەممەد(ﷺ) و ئوممەتەکەی ئەوە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئیبنو جورەیجو سوددیو قەتادەش هەروایان وتووە، عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە وتی: واچاکە کە عەرەبی دەشتەکی ڕەوانەبکرێت بۆ سەرانە سەندن[2]، منیش دەڵێم (واتە: ئیبنو کەسیر) دوایین کا ری ئەوانە ئەوەیە کە شوێن دەجاڵ دەکەونو دەبنە یارمەتیدەری، موسڵمانان لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا (سەلامی خودای لێبێت) دەیانکوژن، ئەوەش لە ئاخری زەماندا دەبێت. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارت بەپەلە تۆڵە دەسێنێتو هەر بۆخۆشی لە گوناه دەبورێتو دلۆڤانە، واتە: تۆڵە لەوکەسانە دەسێنێت کە سەرپێچی دەکەنو دژی پەیامەکەین. لەوکەسانەش خۆشدەبێت کە دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە ئەمە لە بەشی (باب) نزیك خستنەوەی بەزەییە لەگەڵ تۆڵەسەندا. بۆیە خودای گەورە زۆر کە هانی دەداتو دەشترسێنێت تا بێهیوایی زۆری نەبێتو دڵەکان هەمیشە لەنێوان ئومێدو ترسدا ژیان بەسەربەرن.

﴿وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ

---

[1] الطبری (١٣/٢٠٥).

[2] عبدالرزاق (٢/٢٤٠).

ٱلْأَخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾﴾

**بڵاوکردنەوەی نەوەی ئیسرائیل لەسەر زەمیندا**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ لە زەویدا کردمانن بە چەندین دەستەی لێکتر جیا، هەندێك لەوان بەچاك دەرچوون و هەندێکی تریان وەك ئەوان نەبوون، بە خۆشی و بە ناخۆشی تاقیمان کردنەوە، بەڵکو بگەڕێنەوە. خودای گەورە باسی نەوەی ئیسرائیل دەکات کە کردنی بە چەند دەستەو کۆمەڵەوە لەسەر زەمیندا بڵاوی کردنەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموویت: ﴿وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا﴾[1] لەپاش ئەویش بە نەوەی ئیسرائیلمان وت: نیشتەجێبن لەم وڵاتەو هەرکاتێکیش قیامەت هات، ئەوسا هەمووتان پێکەوە کۆدەکەینەوە. ﴿مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ﴾ هەندێك لەوان بەچاك دەرچوون و هەندێکی تریان وەك ئەوان نەبوون وەك جنۆکە دەڵێن: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾[2] لەناو ئێمەشدا کارچاك هەیەو هەشمانە وانیە، ئێمەزۆر ڕێگەمان وەبەرگرتبوو ﴿وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: تاقیمان کردنەوە بە خۆشی و ناخۆشی و بە ترس و هیواو بە لەش ساغی و گیروگرفت ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تاکو بگەڕێنەوە. پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ﴾ دوای ئەوان جێنشینانێکی بەدفەڕ هاتنە جێگەیان کە میراتگری تەورات بوون، کە هەر بۆ دەستکەوتی دونیا تێدەکۆشان. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە دوای ئەوان نەوەیەکی تر جێگای گرتنەوە چاك و خراپێشیان تێدابوو. بەڵام دەستەیەکیان کە خێریان تێدانەبوو بوونە میراتگرو خوێنەری ئەو کتێبە کە تەوراتە، موجاهید لەم ئایەتەدا ﴿يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ﴾ کە هەر بۆ کۆکردنەوەی دونیا هەوڵیان دەدا ئەڵێت: دەستیان بە هەرشتێك بگەیشتایە لە دونیادا هەڵیاندەگرت حەرام بووایە یان حەڵاڵ بووایە، بەهیوای لێبوردنیش بوون. ﴿وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ﴾ دەیانوت: ئێمە هر زۆر زوو عەفوو دەکرێین، ئەگەر

---

[1] الاسرء (١٠٤).

[2] الجن (١١).

جارێکی تریش دەستیان لە شتێك گیربووایە، هەڵیاندەگرت.[1] قەتادە لەم ئایەتەدا ﴿يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ﴾ وتی: سوێند بە خودا جێگرێکی زۆر خراپ بوون ﴿وَرِثُوا الْكِتَابَ﴾ کە بوونە میراتگری ئەم کتێبە دوای پێغەمبەرەکانیان، لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ﴾[2] لەدوای ئەوان کەسانێك بوونە جێگیریان کە نوێژیان دەفەوتاندو شوێن ئارەزووی خۆیان دەکەوتن.ئەڵێت: ﴿يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا﴾ واتە: بەهیوان خودا لێیان ببورێت زۆر لەخۆباییو خۆیانی پێوە هەڵدەنێن ﴿وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ﴾ هیچ شتێك سەرقاڵی نەدەکردنو نەدەبووە ڕێگر لە ڕێیاندا لەسەر ئەوە. هەر شتێکیان دەستکەوتایە بەپەلە دەیانخواردگوێیان لەوەنەبوو حەرامە یان حەڵاڵە[3] سوددی لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ﴾ تا دەگاتە ﴿وَدَرَسُوا مَا فِيهِ﴾ئەڵێت: نەوەی ئیسرائیل هیچ دادوەرێکیان دانەدەنا مەگین بەرتیلی وەردەگرت لە دادوەریەکەیدا، پیاوەباشەکانیان کۆبوونەوەو پەیمانیان لە یەکتری وەرگرت، پێی دەوترا: بۆچی بەرتیل وەردەگری لە دادوەریەکەتدا؟ دەیوت: بەومزوانە لێم دەبورێت. ئەوانەی تر لە نەوەی ئیسرائیل تانەو تەشەریان لێ دەدا لەسەر ئەوکارەی کە کردوویەتی، کاتێك بمردایەو یان لابخرایەو کەسێکی تر لەجێی دابنرایە لەوکەسانەی کە تانەو تەشەری لێ دەدا لەسەرئەوەی کە بەرتیل وەردەگرێت، دەیوت: ئەگەر دەستکەوتی دونیا دەستی ئەوانەش بکەوتایە وەریاندەگرت[4] خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ﴾ ئایا لەوکتێبەدا پەیمان لەوان وەرنەگیرا، لە ڕاستی بەولاوە دەربارەی خودا(هیچی تر) نەڵێن؟ خودای گەورە ئەوکارەی ئەوانی پێ ناخۆشەو پەیمانیشی لێ وەرگرتون کە ڕاستی ئاشکرابکەن بۆ خەڵکیو نەیشارنەوە وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾[5] ئەوسا خودا بەڵێنی لەوکەسانە سەند کە کتێبیان بۆ هاتووە،کەبەمەردومی

---

[1] الطبری (١٣/٢١٢).

[2] مریم (٥٩).

[3] الطبری (١٣/٢١٣).

[4] الطبری (١٣/٢١٣).

[5] ال عمران (١٨٧).

ڕابکەیەنن‌ونەیشارنەوە،کەچی ئەوان لە پەیمانەکە پاشگەز بوونەوە و بە نرخێکی کەم فرۆشتیان، ئای کە مامەڵەیەك خراپیان کرد. ئیبنو جورەیج لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدائەڵێت: ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ﴾ واتە:ئایا لەوکتێبەدا پەیمان لەوان وەرەگیرا لە ڕاستی بەولاوە لەبارەی خوداوە (هیچی تر) نەڵێن؟ ئەوەی لە تەوراتدا هەبووە خوێندوویانەتەوە. ئەڵێت: ئەو گوناهانەی کە بە هیوان خودا عەفوویان بکات بەردەوام خەریکن دەیکەن‌و تەوبەشی لێ ناکەن[1]، پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ ماڵی ئەولا بۆئەوانەی خۆپارێزن زۆر باشترە هێشتا ئێوە تێناگەن؟ خودای گەورە هانیان دەدا بۆ وەدەستهێنانی باشترین پاداشت‌و دەشیان ترسێنێت لە سزای سەختی خۆی. واتە: پێیان دەڵێت ئەوەی لای منەو پاداشتی من زۆر چاکترە بۆ ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە قەدەغەکراوەکانی‌و واز لە ئارەزووەکانی نەفسیان دێنن‌و ڕوودەکەنە پەرستنی پەروەردگاریان ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ واتە: بۆچی تێناگەن؟ ئایائەوانە ئەوەی لای منە دەگۆڕنەوە بە دەستکەوتێکی کەمی دونیا، عەقڵیان نیە بیانگێڕێتەوە لەو هەڵەشەیی دونیا ویستیەی تێیدان. پاشان خودای گەورە دێت بە وەسف‌و باسی ئەوکەسەی کە پابەندە بە کتێبەکەیەوە، واتە: قورئان، کە پاڵی پێوەدەنێت کە شوێن پێغەمبەرەکەی (موحەممەد(ﷺ)) بکەوێت، وەك تێیدا نوسراوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾ ئەوکەسانەی دەستیان بە تەوراتەوە گرتووەو نوێژدەکەن، ئێمە پاداشتی ئەوانەی ئاکارچاکن ون ناکەین.

﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾﴾

### بەرزکردنەوەی کێوی توور بەبان سەری ئەو جوولەکانەوە لەمەڕ یاخی بوونیان

خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ئەوکاتـە کـە کێوەکـەمان وەك هـەور (چـەتر) بەسـەریاندا بەرزکردەوەو لایان وابووهەر بەسەریاندا دەڕوخێت (وتمان) ئەوەی داومانە پێتان توند بیگرن، هەرچی تێدایە لەبیرتان بێت بەڵکو خۆتان بپارێزن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنـو عەبباسـەوەئەڵێت: ﴿نَتَقْنَا

---

[1] الطبری (١٣/٢١٥).

﴾ واتە: بەرزمان کردەوە. ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ﴾[1] بەهۆی پەیمانێك کە دایان کێوی توورمان لەسەر ئەوان بە بەرزی ڕاگرت[2]. سوفیانی سەوری لە ئەعمەشەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: فریشتەکان کێوی توورِیان بەرزکردەوە بەسەریانەوە، خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ﴾ قاسمی کوڕی ئەبو ئەییوب لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: پاشان مووسا (سەلامی خودای لێبێت) بەرەو زەویە پیرۆزەکە بردنیو لەوحەکانی هەڵگرت دوای ئەوەی ڕقەکەی نیشتەوە، فەرمانی پێدان بەوەی کە خودا فەرمانی پێدابوو کە لە ئەرکەکانیان ئاگاداریان بکات بەلایانەوە گران بوو، ملیان نەداو دانیان پێ دانەنا. هەتا خودا(کێوی تووری) بەسەریانەوە ڕاگرت ﴿كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ﴾ وەك هەور، وتی: فریشتەکان بەسەریانەوە ڕایانگرت. نەسائی بەدرێژی ڕیوایەتی کردووە[3].

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾﴾

**باسی ئەوپەیمانەی کە وەرگیرا لە نەوەی ئادەم**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ کاتێك پەروەردگاری تۆ لە پشتی نەوەی ئادەم وەچەی بەرهەم هێنا، خۆیان شایەتیان لەسەر خۆیاندا، خوا فەرمووی مـن پەروەردگارتان نیم؟ وتیان: بەڵێ ئێمە لەوە ئاگادارین. خودای گەورە باسی ئەوەدەکات کە هەر لەپشتی نەوەی ئادەم تیرەو تایەفەی وەدیهێناوەو شایەتیشیان داوە کە خودا پەروەردگارو سەروەریانە. جگە لە خودا هیچ پەرستراوێك نیە بۆ پەرستن بشێت، لەسەر ئەو سروشتەش وەدیهێناون. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾[4] تۆ هەر ڕوو لەم ئاینە بکەو هەر بەرەو هەق هەنگاوبنێ، ئاینێکی بنەڕەتیەو لە سروشتدا خودا ئەوخەڵکەی هەر بۆ یەکخواپەرستی وەدیهێناوە،

---

[1] النساء (١٥٤).

[2] الطبری (٢١٨/١٣).

[3] النسائي في الكبری (٣٩٦/٦).

[4] الروم (٣٠).

کاری خوداش گۆڕینی بەسەردا نایات. لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە ئـەبوهورەیرەوە (ڕەزای خـودای لێبێـت)ئـەڵێت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (هـەر منـداڵێك لـەدایك دەبێـت لەسـەر سروشـتی (پـاك) لـەدایك دەبێـت، پاشـان دایـكو باوكیـان دەیانكەنـە جوولەكـە یـان مەسـیحی یـان ئاگرپەرست (مەجوسی) هەروەك ئاژەڵێك بەچكەیەكی تێرو تەواوی دەبێت، ئایا هەست بە هیچ بڕوایەك دەكـەین تێیـدا؟)[1] وە لـە سـەحیحی لـە عـەیازی كـوڕی حیمـارەوە وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (خـودای گـەورە دەفـەرمووێت مـن بەنـدەكانم دروسـتكردووە بـەرەو هـەق هـەنگاوبنێن، شەیتانەكەان هاتوونەتەلایانو لە ئاینەكەیان لایانـداون، ئـەوەی حـەڵاڵم كردبـوو بۆیـان حـەرامیان كـرد لێیان)[2]، چەند فەرموودە هاتووە لەسەر وەرگرتنی پەیمان لە پـشتی نـەوەی ئـادەم (سـەلامی خـودای لێبێت) جیاكردنەوەیان بۆ هاوەڵانی لای ڕاستو هاوەڵانی لای چەپ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كـردووە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویـەتی: (دەوترێـت بـە پیاوێكی خەڵكی ناو ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا، چۆنە بەلاتـەوە ئەگـەر هەرچـی لەسـەر زەویدایـە هـی تـۆ بووایە ئایا لەباتی ڕزگاربوونی خۆتدا دەتدا؟ وتی: دەڵێت بەڵێ، خودای گەورە دەفەرمووێت: مـن لـەوە كەمترم لە تۆ داواكرد، لەپشتی ئادەمدا پەیمانم لە تۆ وەرگرت كە هیچ شەریكم بۆ دانەنێیت، تۆ قبوڵت نەكردو هـەر شـەریكت بـۆ دانـام)[3]، لـە هـەردوو سەحیحەكەشدا ئـەم فەرموودەیـە هـاتووە.[4] تیرمیـزی لەبارەی ئەم ئایەتـەوە لـە تەفـسیرەكەیدا ڕیوایـەتی كـردووە لـە ئەبوهورەیرەوەئەڵێت : پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (كاتێك خودا ئادەمی دروستكرد دەستی هێنا بە پشتیدا، هەموو مرۆڤ كە ئەو وەدیهێنەرێتی لە نەوەی ئادەم تا ڕۆژی قیامەت لە پشتی كەوتەخوارە، پاشان لە نێوان هەردووچـاوی هەركەسێك لەوانـەدا تروسـكەیەكی لـە ڕووناكی دروسـتكرد، پاشـان نیشانی ئـادەمی دا، وتـی: ئـەی پەروەردگارم ئەوانە كێن؟ فەرمووی: ئەوانە نەوەكانی تـۆن، پیـاوێكی تێـدا بیـنێ، ئـەو تروسـكەی لـە نێوان هەردووچاویدابوو سەرنجی ڕاكێشا وتی: ئەی پەروەردگارم ئەوە كێیە؟ خودای مـەزن فـەرمووی: ئەوە پیاوێكە لە دواییەكانی نەوەكانت پێی دەوترێت داود، (ئادەم) وتـی: ئـەی پـەروەردگارم تەمـەنت چەند بۆ داناوە؟ فەرمووی: سەست ساڵ، وتی: ئەی پەروەردگارم، ئەوا من چل ساڵ لـە تەمـەنی خـۆم بەخشی پێی، كاتێك كە تەمەنی ئادەم تەواوبوو، فریشتەی گیان كێشان هاتەلای (ئادەم) پێی وت: ئایا چل ساڵ لە تەمەنم نەماوە؟ (فریشتەكە) وتی: ئەی نەتبەخشی بە كوڕەكـەت داود، وتـی: ئـادەم دانـی

---

[1] مسلم (٢١٩٧/٤).

[2] فتح الباری (٢٩٠/٣)، مسلم (٢٠٤٧/٤).

[3] أحمد (١٢٧/٣) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] فتح الباری (٤١٩/٦)، مسلم (٢١٦٠/٤).

پێدانەناو نەوەکەشی دانی پێدانەنا، ئادەم لەبیری چووبوو، نەوەکەشی لەبیری چوبوو، ئادەم هەڵەی کردو نەوەکەشی هەڵەی کرد)، پاشان تیرمیزی وتی: ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی چاك و ڕاستە، ئەبوهورەیرەش بەشێوەیەکی تریش ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)[1] حاکمیش لە موستەدرەکەید ڕیوایەتی کردووەئەڵێت: لەسەر مەرجی موسلیم فەرموودەیەکی ڕاستە، بەڵام بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان نەکردووە.[2] ئەم فەرموودانەو هاوشێوەیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خودای گەورە نەوەی ئادەمی لە پشتی ئەو وەدەرهێناوەو خەڵکی بەهەشتیشی لە خەڵکی ئاگر جیاکردووەتەوە.

پاشان فەرموویەتی: ﴿وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ﴾ واتە: خۆیان شایەتیان لەسەر خۆیان دا، فەرمووی من پەروەردگارتان نیم؟ وتیان: بەڵێ، واتە: کە دروستی کردن شایەتیان دا لەوبارەیەوەو بە حاڵو بە قسەش وتیان،شایەتی جاری وا هەیە بە قسەیە وەك خودا ئەفەرمووێت: ﴿قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا﴾[3] وتیان: بەڵێ شایەتی لە خۆمان دەدەین، جاری واش هەیە بە زمانی حاڵە وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِ﴾[4] مزگەوتی خودا ئاواکردن بۆ بتپەرستان نەشیاوە، خۆیان دەڵێن: خودا ناناسین، واتە: حاڵیان شایەتە لەسەر خۆیان لەسەر ئەوە، نەك ئەوان ئەوەیان بە دەم وتبێت، هەر بەوشێوەیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ﴾[5] بێگومان خۆی لەسەر ئەوە شایەتە، پرسیاریس جاری وا هەیە بە قسەیە یان بە زمانی حاڵە وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلۡتُمُوهُۚ﴾[6] هەرچیتان لێ داواکردووە پێی داون، زانایان دەڵێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خودا ئەو شایەتیەی کردووە بە بەڵگە بەسەریانەوە لەو بت پەرستیانەیاندا، خۆ ئەگەر ئەوە ڕووی بدایە وەك هەندێك کەس دەڵێن، ئەوکاتە هەمووکەسێکیان وەبیری دەهاتەوە، بۆئەوەی ببێتە بەڵگە بەسەریەوە. خۆ ئەگەر دەڵێن هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ) بەسەبۆی لەسەر بوونی، وەڵامەکەی ئەوەیە، بێگومان خودانەناسان لە بتپەرستان، بڕواناکەن بە هەموو ئەوشتانەی کە پێغەمبەران بۆیان هێناون

---

[1] تحفة الاحوذي (٤٥٧/٨) فەرموودەیەکی غەریبە.

[2] الحاكم (٣٢٥/٢).

[3] الانعام (١٣٠).

[4] التوبة (١٧).

[5] العاديات (٧).

[6] ابراهيم (٣٤).

لەمبارەیەوەو لە هەموو شتێکی تریشدا، ئەمە خۆی بەڵگەیەکی سەربەخۆیە لەسەریان‌و بەڵگەشە لەسەر ئەوە کە ئەو سروشتەش خۆی بەڵگەیە لەسەریان کە خودا دروستی کردوون کە دان پێدانانە بە یەکخواپەرستی هەربۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَن تَقُولُوا﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا نەڵێن: ﴿إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە بێ ئاگابووین لەمە (واتە لەم یەکخواپەرستییە)، ﴿أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ یان نەڵێن: ئەوکەسانە وا لە پێشدا شەریکیان بۆ خوا دانا، باب‌و باپیریانمان بوون‌و ئێمە نەوەی دوای ئەوانین، ئایا ئێستا لەسەر کاری ناهەقان ئێمە لەنادەبەیت؟ نیشانەکان ئەوها ڕۆشن دەکەینەوە بەڵکو بگەڕێنەوە.

﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴿١٧٧﴾﴾

**بەسەرهاتی بەلعەمی کوڕی باعورا (الباعوراء) وێنەی ئەو زانایەی کە لە زانیاریەکەی خۆی لادات**

عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێبێت) لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا﴾ دەنگ‌و باسی ئەوکەسەشیان بۆ بخوێنەوەکە نیشانەکانی خۆمان پێبەخشیبوو، خۆی لێ لادان. وتی: ئەوە پیاوێك بووە لە نەوەی ئیسرائیل پێیان دەوت بەلعەمی کوڕی باعورا[1] هەر بەم شێوەیە شوعبەو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە مەنسورە[2] سەعیدی کوڕی ئەبو عوروبە لە قەتادەوە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ئەوکەسە سەیفی کوڕی ڕاهب بووە. قەتادەو کەعب وتیان: پیاوێکی خەڵکی بەلقاء بووە ناوی هەرەگەورەی خودای دەزانی لە بەیتول موقەدەس دادەنیشت لەگەڵ بەهێزەکاندا عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێبێت)ئەڵێت: ئەوە پیاوێکی خەڵکی یەمەن بوو پێیان دەوت: بەلعەم خودا

---

[1] عبدالرزاق (٢/٤٤٣).

[2] الطبری (١٣/٢٥٣).

ئایەتەکانی خۆی پێدا بەڵام ئەو وازی لێ هێنان[1] مالیکی کوڕی دینارئەڵێت: یەکێك بوو لە زاناکانی نەوەی ئیسرائیل نزای لێ قبوڵ دەکرا، لەکاتی تەنگانەو نارەحەتیدا پێش خۆیاندەخست، مووسا پێغەمبەر(سەلامی خودای لێبێت) ناردی بۆلای پاشای مەدیەن بانگی بکات بۆلای خودا، پاشان مەدیەن لای خۆی ڕایگرتو بەخششی دایە، بەلعەم وازی لە ئاینەکەی مووسا هێناو شوێن ئاینەکەی ئەو کەوت، سوفیانی کوڕی عویەینە لە حوسینەوە لە عیمرانی کوڕی حارسەوە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ئەوکەسە بەلعەمی کوڕی باعورا بووە[2]موجاهیدو عیکرەمەش هەر وایان وتووە[3] سەقیف ئەڵێت: ئەوپیاوە ئومەیەی کوڕی سەلت بووە. بەڵام ئەوەی کە بەناوبانگە لە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەو پیاوەبووە لە پێشینەکان لە زەمانی نەوەی ئیسرائیلدا وەك ئیبنو مەسعودو کەسانی تریش لەزانایانی تر پێشینە وتویانە[4]. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لەئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: ئەوە پیاوێك بووە لە شاری خاوەن هێزەکان بەلعەمیان پێ دەوت ناوە هەرەگەورەکەی خودای دەزانی[5]. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: کاتێك مووسا دابەزیەناو خاوەن هێزەکان (الجبارين) ئامۆزاو هۆزەکەی بەلعەم، هاتنەلای بەلعەم پێیان وت: مووسا پیاوێکی توندوتیژەو لەشکرێکی زۆری لەگەڵدایە، ئەگەر سەربکەوێت بەسەرماندا لەناومان دەبات داوابکە لە خودا مووساو ئەوەی لەگەڵیدایە لە کۆڵمان بکاتەوە، بەلعەم وتی: ئەگەر من داوابکەم لە خودا کە مووساو ئەوەی لەگەڵیدایە لەکۆڵمان بکاتەوە دینو دونیام لەدەست دەچێت، کۆڵیان لێ نەدا هەتا دۆعای لێ کردن، خودای گەورەیش ئەوەی کە پێی دابوو لێی سەندەوە بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ﴾ خۆی لێ بواردن، ئەوسا شەیتان وەدی خۆیداو کەوتەناو ڕیزی گومڕایان[6] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ ئێمە ئەگەر بمانویستایە لەمانەوە پایەبەرزیمان دەدایەوە، بەڵام ئەو هەرخۆی بە زەمینەوە چەسپاندو پەیڕەوی ئارەزووی خۆی بوو. واتە: لە پیسی‌و چەپەڵی دەمانپاراستو پلەمان بەرزدەکردەوە بەهۆی ئەو نیشانانەوە کە پێمان بەخشیبوو. بەڵام ئەو خۆی لکاند بە زەمینداو ڕووی

---

[1] الطبری (٢٦١/١٣).
[2] الطبری (٢٥٣/١٣).
[3] الطبری (٢٥٤/١٣).
[4] الطبری (٢٥٣/١٣).
[5] الطبری (٢٥٨/١٣).
[6] الطبری (٢٦٠/١٣).

کردە جوانی ژیانی دونیاو خۆی خەریك کرد بە خۆشیو ئارەزووی خۆیەوەو سەری لێ شێواندو لەخۆی بایی بوو وەك چۆن کەسانی تریش جگە لەو لەخۆیان بایی بوون بەهۆی کەم ئارەزووی بەرچاوتاریکیانەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە سالمی کوڕی نەزرەوە ئەڵێت: کە باسی کردووە کە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) کاتێك چووەتەناو زەوی نەوەی کەنعانەوە لەسەر زەمینی شامدا، هۆزەکەی بەلعام هاتن بۆلای بەلعامو پێیانوت: ئەوە عیسای کوڕی عیمرانە وا بەنەوەی ئیسرائیلەوە هاتو دەرمان دەکات لە زێدی خۆمانداو دەمانکوژێتو نەوەی ئیسرائیل جێگیردەکات تێیدا، ئێمە هۆزی تۆینو شوێنمان نامێنێت، تۆ پیاوێکی نزات گیرایە، برۆ دۆعایان لێ بکە بەلعام وتی: هاوار بۆ ئێوە پێغەمبەری خودایەو فریشتەو خاوەن باوەڕانی لەگەڵدایە چۆن برۆمو دۆعایان لێ بکەم ئەوەی من دەیزانم لەلایەن خوداوە کە دەیزانم! واتە: ئێوە نایزانن. پێیانوت: هیچ شوێنێکمان نەماوە تێیدا بژین، بەردەوام لێی دەپاڕانەوەو هەوڵیان دەدا دڵی نەرم بکەن هەتا هەڵیان دێراو چارەڕەشیان کرد، کەرێکی هەبوو سواری بوو ڕووەو ئەو کێوەی کە لێیوە لەشکرەکەی نەوەی ئیرائیلی دەبینی کە ناوی کێوی حوسبان بوو، ماوەیەکی زۆر بە سواری کەرەکە نەڕۆیشت، کەرەکە چۆکی لە زەوی نا، بەلعام دابەزیو دەستیکرد بە لێدانی هەتا لە شوێنەکەی خۆی لایبردو دووری خستەوەو هەستا پاشان سواری بووەوە، زۆر بەسواری نەڕۆیشت دیسان چۆکی لە زەوی نایەوە پێوە، بەلعام دەستی بە لێدانی کردەوە تا لە شوێنەکەی خزاندی، خودا ئیزنی کەرەکەی دا قسەی لەگەڵ بەلعام کردو بیانووی بڕیو پێی وت: واوەیلا بۆ ,تۆ ئەی بەلعام بۆ کوێ دەچیت؟ ئایا ئەو فریشتانە نابینی لە پێشەوە، بەرەوڕووم وەستاونو دەمگێڕنەوە، دەڕۆی بۆلای پێغەمبەرێکی خوداو خاوەنباوەڕان بۆئەوەی نزایان لێ بکەیت، بەردەوام بەلعام وازی لە کەرەکە نەدەهێنا هەر لێی دەدا، خودا ڕێگەی بە کەرەکە دا کە بڕوات، بەسواری کەرەکە ڕۆیشت هەتا چووەسەر کێوی حوسبان کە دەیڕوانی بەسەر لەشکرەکەی مووساو نەوەی ئیسرائیلدا، دەستی کرد بە نزاکردن لێیان، هەر نزایەکی شەڕی لێ دەکردن خودا زمانی دەچەرخاند بەلای هۆزەکەیدا، وە هەر دۆعایەکی خێری بۆ هۆزەکە ی دەکرد زمانی دەچەرخا بەلای نەوەی ئیسرائیلدا، هۆزەکەی پێیان وت: ئەی بەلعام چی دەکەیت؟ تۆ دەپاڕێیتەوە بۆ ئەوانو نزا لە ئێمە دەکەیت، بەلعام وتی: ئەوە هیچ دەستەڵاتێکی منی تێدانیە، ئەوە شتێکە کە خودا زاڵی کردووە بەسەرمدا، وتی: زمانی هاتەدەرەوە و کەوتەسەر سینگیو بەهۆزەکەی وت: من دونیاو قیامەتم لەدەستدا، هیچ شتێك نەماوە جگە لە فروفێڵ کردن بۆتان، ئێستا فێڵو تەڵەکەیەکتان بۆ دەکەم ژنەکان کۆبکەنەوەو شتومەکیان بدەنێو پاشان ڕەوانەیان بکەن بۆناو ئەو لەشکرە تا پێیان بفرۆشن پێشیان بڵێن هیچ ڕێگریەك نەکەن لەوپیاوانەی کە دەیانەوێت داوێن پیسیان لەگەڵدا بکەن، چونکە تەنیا یەك کەسیان داوێن پیسی بکات لێیان بەستانەو کاری خۆتان تەواوکردووە، هۆزەکەی ئەو

فەرمانەیان بەجێ هێنا، کاتێك ژنەکان چوونەناو لەشکرەکە، ژنێك لە کەنعانیەکان کە ناوی کەسبا بووکچی سوری سەرۆك هۆزەکەیان بوو تێپەڕی بەلای پیاوێکدا لە گەورەپیاوانی نەوەی ئیسرائیل کە ناوی ڕەمزی کوڕی شەلوم بوو لە بنەماڵەی شەمعونی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بوو (سەلامی خودای لێبێت) کاتێك چاوی پێی کەوت سەرنجی ڕاکێشا، هەڵسا دەستی ژنەکەی گرت و هێنای بۆلای مووساو (سەلامی خودای لێبێت) وتی: من وا لە تۆ تێ دەگەم ئێستا دەڵێیت ئەمە لە تۆ حەرامە؟ مووسا وتی: بەڵێ ئەوە حەرامە لە تۆ نزیکی نەکەویتەوە، وتی: سا سوێند بە خودا لەمەدا بە گوێت ناکەم بردیەناو چادرەکەو زینای لەگەڵداکرد، خودای گەورە چاوەقوڵەکەی خستەناو نەوەی ئیسرائیل. لەوکاتەدا فەنحاس کوڕی عیزاری کوڕی هاروون کە خاوەن فەرمانی مووسابوو (سەلامی خودای لێبێت) لەوێدا نەبوو کە ڕەمزی شەلوم بەوکارە هەڵسا، کاتێك هات چاوەقوڵە قڕی خستبووەناویان، هەواڵەکەیان پێدا، نێزەکەی هەڵگرت کە هەمووی لە ئاسن دروست کرابوو پاشان چووەناو چادرەکە صیاوو ژنەکە هەردووکیان ڕاکشابوون، دانیە بەر نێزەکەی پاشان دەری هێناو بەرەو ئاسمان بەرزی کردنەوەو نێزەکەی بە دەستەوە گرتبوو بە ئانیشکی بەرەو کەلەکەی توندی کردو نێزەکەی ڕووەو پیشی خۆی هێنایەوە (فەنحاس لاوێکی عیزاری بوو) دەیوت: ئەی خودایە ئاوادەکەین بەوکەسانەی سەرپێچی تۆ دەکەن. چاوەقوڵەکە نەما، دەڵێن ئەوانەی لە نەوەی ئیسرائیل لەناوچوون لەوکاتەی زەمری زینای لەگەڵ ئەوژنەکرد تا ئەوکاتەی فەنحاس کوشتی، حەفتاهەزار کەسیان بەو چاوەقوڵەیە لەناوچوون، ئەوانەی کە کەمی دەکەنەوە دەڵێن بیست هەزار کەسیان بەو چاوەقوڵەیە مردن لەماوەی کاتژمێرێکدا لەڕۆژەدا. هەر لەوکاتەوە نەوەی ئیسرائیل لە هەموو سەربڕاوێکدا کە سەریان ببڕایە ملو باڵو چەناکەو سەرەتای هەموو سامانێکی زۆر بەنرخ و بەهایان دەبەخشی بە منداڵەکانی فەنحاس (چونکە فەنحاس یەکەم کوڕی عیزاری باوکی بوو). خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا﴾ تا دەگاتە ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ لەسەر بەلعامی کوڕی باعورا ناردووەتە خوارەوە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَث﴾ نمونەی ئەووەك نمونەی سەگێکە بۆی بچێت زمان دەردێنێت و لێشی گەڕێی هەر زمان دەردەهێنێت. زانایان ڕایان جیاوازە لە ماناکەیدا. بەپێی ئەو دەقەی کە ئیبنو ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە ئەبو نەزەرەوە کە بەلعام زمانی دەرهێناوە هەتا سەرسینگی[1] لە سەگ چووە لە زمان دەرهێناندا لە هەردوو حاڵەتەکەیدا، بۆی بچێت و وازی لێ بێنێت، وە وتویانە: مەبەست پێی نمونەی لە گومڕایداو بەردەوامی لەسەری و سودوەرنەگرتن

---

[1] الطبري (١٣/٢٦٥).

لەوبارەوەو لەو پاڕانەوەی کە وەك سەگێکە کە بۆی بچێت زمان دەردەهێنێتو وازیشی لیّ بێنیت هەر زمان دەردەهێنێت، لە هەردوو حاڵەتەکدا هەر زمان دەردەهێنێت. هەر بەوشێوە هیچ سودێك لە ئامۆژگاریو بانگ کردنی بۆ بڕواهێنان وەرناگرێت، واتە: بانگی بکەیتو بانگە نەکەیت وەکویەکە، وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾[1] ترسیان وبەر بهێنیت یان ترسیانوەبەر نەهێنیت وەکویەکە، ئەوان باوەڕناهێنن. وە فەرموویەتی: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ﴾[2] لیّ خۆشبوونیان بۆ داوابکەی یان نەکەی بێ سودە، ئەگەر تۆ حەفتا جریش داوای بەخشینیان بۆ بکەی، خودا هەرگیز لێیان خۆشنابێت. چەندین ئایەتی تریش لەمبارەوە هاتووە. وە وتراوە: مەبەست پێی ئەوەیە، دڵی خودانەناسان و دووڕوو گومڕا بۆ شەو دوورە لەگرتنی ڕێی ڕاستو زۆر ڕاڕاو دانەمەزراوە. هەر بەم مانایە ڕیوایەت کراوە لە حەسەنی بەسریو کەسانی تریشەوە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەم چیرۆکە بەسەرهاتی ئەوانەیە کەنیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆدانا. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ): ﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ تۆ لەو تەرزە باسەیان بۆ بگێڕەوە بەڵکو بیربکەنەوە. واتە: بەڵکو نەوەی ئیسرائیل ئەوانەی ئاگایان لە حاڵی بەلعامو ئەوەی بەسەرهاتو چۆن خودا سەری لیّ شێواندو لە بەزەیی خۆی دووری خستەوە، لەبەرئەوەی ئەو بەهرەی کە خودا پێی بەخشیبوو کە فێری ئەو ناوە هەرەگەورەی کردبوو ئەگەر داوای بکردایەو داواکەی وەردەگێڕاو هەر شتێکی بویستایە پێی دەبەخشرا، کەچی ئەو ئەوناوە هەرەگەورەی لەسەرپێچی پەروەردگاریدا بەکارهێنا، بەڵکو فێڵو تەڵەکەی لە خەڵکی خوداو کۆمەڵی خاوەنباوەڕان کردکە شوێنکەوتەی بەندەو پێغەمبەری خودا مووسا بوون (سەلامی خودای لێبێت) بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیربکەنەوە، واتە: بترسن لەوەی کە وەك ئەویان بەسەربێت. چونکە خودا زانیاری داوە بەوانو لەو خەڵکەی تری عەرەبی جیاکردوونەتەوە سیفەتەکانی مووحەممەدیان(ﷺ) خستووەتە بەردەستیان، ئەو سیفەتانەی دەناسن وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، وە ئەوان ڕەواترو نزیکترین کەسن کە شوێنکەوتەی بنو هاوکاری بکەنو پشتگیری لیّ بکەن، وەك پێغەمبەرەکانیان ئاگاداریان کردوون فەرمانیان پیّ داون کە شوێنی بکەون. هەر بۆیە ئەوانەی سەرپێچی لەوشتان دەکەن کە لە کتێبەکەیدا (واتە تەورات) هاتووە

---

[1] البقرة (٦).

[2] التوبة (٨٠).

بیشارنەوەو خەڵکی لێ ئاگادارنەکەن خودا تووشی سەرشۆڕیو کەساسی دونیا و قیامەتیان دەکات.

پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾ چەند خراپە بەسەرهاتی ئەوکەسانەی کە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆزانی. واتە: چەند نمونەیەکی خراپە ئەگر بە وێنەی سەگێك سەیربکرێن کە هیچ خواستو مەبەستێکی نیە جگە لە دەستکەوتنی خواردنێك یان ئارەزوویە، هەرکەسێك لە بازنەی ڕاستیو ڕێی ڕاست دەرچوو ڕووی کردە هەوەسو ئارەزووەکانی خۆیو شوێنی کەوت، ئەوە وەك سەگی لێدێت، نمونەکەی چەند نمونەیەکی خراپە. هەربۆیە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرمووێت: (نمونەی خراپ بۆ ئێمەی خاوەننیە، ئەوەی لە بەخشین (دیاری) پەشیمان بێتەوە وەك سەگ وایە برشێتەوەو پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)[1]، ﴿وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴾ناهەقیان لە خۆیان کرد. واتە: خودا ناهەقی بەوانە نەکردووە بەڵکو خۆیان ناهەقیان لە خۆیان کردووەو پشتیان لە ڕێی ڕاست کردووەو گوێڕایەلی گەورەی خۆیان نەبوون، ڕوویان لە دونیاناو خەریکی وەدەستهێنانی ئارەزوو هەوەس بازی بوون.

﴿ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾ ﴾

خودای مەزن دەفەرموویت:﴿ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾ هەرکەسێك خودا شارەزای بکات، ڕێگەی ڕاست دەگرێتەبەرو هەرکەسێکیش گومرابکات لە ڕیزی زیانبارانە.واتە: ماڵ وێرانەو زەرەرمەندەو بێگومان ڕێی ون کردووە، چونکە خودا مەیلی لەسەر شتێك بێت دەبێتو مەیلیشی لەسەر شتێك نەبێت نابێت، هەر بۆیە لە فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی : (سوپاس هەر بۆ خودایەو ستایشو پشت بەستنو داوای لێ خۆشبوون هەر لەو دەکەین . وە پەنادەگرین بە خودا لە زیانباریو نەگریسی خۆمانو ئاکارە خراپەکانمان،هەرکەسێك خودا خۆی شارەزای بکات، هیچ کەسێك ناتونێت گومرای بکات، هەرکەسێکیش خودا خۆی گومرای بکات هیچ کەسێك بۆی نیە شارەزای بکات. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا خۆی بەتەنیاو شەریکی نیە، وە شایەتیش دەدەم کە موحەممەد(ﷺ) بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە) فەرموودەکە بەتەواوەتی ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو ماجەو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە[2].

---

[1] فتح الباري (٥/٢٨٨).

[2] أحمد (١/٣٩٢)، أبوداود (٢/٥٩١)، تحفة الاحوذي (٤/٢٣٧)، النسائي (٣/١٠٥)، ابن ماجه (١/٦٠٩) فەرموودەیەکی باشە (جید).

﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ (١٧٩)﴾

**بێباوەڕیو چارەنووس**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾ ئێمە کۆمەڵێك لە جنۆکەو مرۆڤمان بۆ جەهەننەم وەدی هێنا، واتە: ئامادەمان کردوون‌و خەڵکەکەی کاری بۆدەکەن، خودای گەورە کاتێك ویستی خەڵکی دروست بکات، زانیویەتی کە چی دەکەن پێش پەیدابوونیان، ئەوەی لای خۆی نوسیوە لە کتێبێکدا لەپێش دروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەمین بە پەنجا هەزارساڵ وەك لە سەحیحی موسلیم دا هاتووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای گەورەپەنجاهەزارساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات هەموو کا روبارەکانی دروستکراوەکانی دیاریکردووە، کاتێك کە تەختی (عەرشی) لەسەر ئاو بوو)[١] فەرموودە لەمبارەوە زۆرە، باسی قەدەر باسێکی گەو رەیە ئێرە شوێنی درێژە پێدانی نیە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ دڵیان هەیەو پێی تێناگەن، چاویان هەیەو پێی نابینن، گوێیان هەیەو پێی نابیستن. واتە: هیچ سودێك لەم ئەندامانەی کە خودا پێی داون‌و کردوویەتی بە هۆی شارەزابوونیان وەرناگرن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾[٢] گوێ‌و چاوو دڵمان بەوانیش دابوو، ئەوان لە گوێ‌و چاوو دڵیان هیچ بەهرەیەکیان وەرنەگرت، چونکە ئەوان بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەبوو. وە دەفەرموێت: ﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾ [٣] کەڕن، کوێرن، لاڵ‌و پاڵن، ناتوانن بگەڕێنەوە. ئەمە لەبارەی دووڕووەکانەوەبوو لەبارەوە خودانەناسەکانیشەوە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾[٤] کەڕن، لاڵن کوێرن، لە هیچ تێناگەن، ئەوانە تەنیا لە گرتنەبەری ڕێی ڕاست کەڕو کوێرو لاڵن. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ

---

[١] مسلم (٢٠٤٤/٤).

[٢] الاحقاف (٢٦).

[٣] البقرة (١٨).

[٤] البقرة (١٧١).

﴿لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعۡرِضُونَ﴾[1] ئەگەر خودا بیزانیایە خێرێکیان تێدایە، کارێکی دەکرد ببیستن، خۆ ئەگەر گوێبیستیشی پێ بدایان، هەر ڕوویان لێ وەردەگێڕاو خۆیان لێ لادەدا. وە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾[2] لەڕاستیدا چاویان کوێر نابێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێردەبن کە جێیۆان لەناو سینگەکانە. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمۡ لَيَصُدُّونَهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ﴾[3] هەرکەسێك پێی خۆشە لە ڕێی ڕاست کوێرایی دابێت، هاودەمێکی شەیتانی بۆ دادەنێین، ئیتر ئەو هاودەمانە لە ڕێگە لایاندەدەن، لاشیان وایە ڕاستەڕێیان دۆزیوەتەوە. پاشان لێرەدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾ ئەوانە وەك ئاژەڵن، بگرە لەوان گومڕاتریشن، ئاگایان لە هیچ شت نیە. واتە: ئەوانەی کە هەق بیست نینو لێی تێناگەنو ڕێی ڕاست نابینن، وەك ئاژەڵی کێوی وان، کە هیچ بەهرەیەك لە ئەندامەکانی هەستکردن وەرناگرن جگە لەوەی کە بە چیانی دونیادا خۆیانی پێ دەپارێزن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِي يَنۡعِقُ بِمَا لَا يَسۡمَعُ إِلَّا دُعَآءٗ وَنِدَآءٗ﴾[4] وێنەی ئەو خودانەناسانە وەك وێنەی ئەو ئاژەڵە وایە کە دەنگ دەدرێت، جگە لە خوڕینو هاوارێك هیچ نابیستن وێنەی ئەوانەش لەکاتێکدا کە بانگ دەکرێن بۆ بڕواهێنان وەك ئەو ئاژەڵانە وایە کە شوانەکانیان تێیان دەخوڕن جگە لەو دەنگە هیچ شتێکی تر نابیستنو تێناگەن چی دەڵێن، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ﴾ بەڵکو ئەوان گومڕاترن. واتە: لە ئاژەڵەکان، چونکە ئەو ئاژەڵانە لەوانەیە بەگوێی شوانەکانیان بکەن کاتێك لەگەڵیان ڕاهاتن، یا لە قسەکانیشیان تێ نەگەن، بە پێچەوانەی خودانەناسانەوە، چونکە ئەو ئاژەڵانە بەپێی سروشتی خودا لەسەری دروستی کردوون دەڕۆن یان بەو شێوەیەی خودا ڕامی هێناون هەڵسو کەوت دەکەن بە پێچەوانەی خودانەناسانەوە کە بۆ خوداناسیو یەکتاپەرستی دروستکراوە، کەچی بڕوای پێ ناکاتو شەریکی بۆ دادەنێت، هەربۆیە هە رکەسێك لە ئادەمی خوداپەرستی بکات لەو فریشتانەی هاوێنەی خۆی بەڕێزترە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوەش کە بڕوای بە خودا نیە لە مرۆڤەکان

[1] الانفال (٢٣).
[2] الحج (٤٦).
[3] الزخرف (٣٦– ٣٧).
[4] البقرة (١٧١).

ئەوا ئاژەڵەکان لەوان باشترن بۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾ ئەوانە وەك ئاژەڵن، بگرە لەوان گومڕاترن، ئاگایان لە هیچ شتێك نیە.

﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾

**باسی ناوەجوانەکانی خودا**

لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموویت: (بێگومان خودا نەوەدونۆ ناوی هەیە، سەد یەکێك کەم، هەرکەسێك هەژماری بکات دەچێتە بەهەشت خودا تاکەو حەزی لە تاکە) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[1]، واتە: لە سەحیحی بوخاریو موسلیم، تیرمیزیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە بەڵام لەدوای (حەزی لە تاکە) ئەمەی بۆ زیادکردووە: ئەو خودایەی کە هیچ پەرستروێك نیە جگە لە خۆی کە بە بەزەییو بەخشندەو پادشاو پاكو بێگەردو بێعەیبو دڵنیاکەرو بەسەر ڕاگەیشتوو دەستەڵاتدارو ناچارکەرو خۆ بەگەورەزانو دروستکەرو بەدیهێنەری جوانکارو وێنەکێشو لێبوردەو گەردنکەچکەروزۆر بەخشەرو ڕۆزیدەرو دەرووکەرەوەو زاناولێگرەوەو لە دوودەرو نزمکەرەوەو بەرزکەرەوە زەبوونکەرو بیسەرو بینەرو فەرمانڕەواو دادگەرو وردبینو شارەزاو هێدیو مەزنو لێ خۆشبوو سوپاسگوزارو بەرزی بە دەستەلاتو گەورەو پارێزەرو بژێوگەێنو لێ پرسەرەوەو سیفەت بەرزو بەڕێزو چاودێرو وەڵام گۆو فراوانو کاربەجێو خۆشویستراوو پایەبەرزو زیندووکە رەوەو ئاگادارو ڕاستو ڕەواو کاپێ سپێردراوو بەتواناو بەهێزو دۆستو سوپاسکراوو ژمێرەرو پەیداکەرو زیندووکەرەوەو ژێنەرو مرێنەرو زیندوو مشورگێرو هەبوو خاوەن پایەی بەرزو یەكو تاكو تەنیاو جێی مەبەست بەتواناو خاوەن تواناو پێشخەرو دواخەرو یەکەمینو دوایەمینو ئاشکراو پەنهانو سەرپەرشتیکەرو زۆر بەرزو چاکەکارو تەوبە وەرگرو تۆڵەستێنو لێ بوردەو میهرەبانو خاوەن مولكو خاوەن دەستەڵاتو بەخشندەو دادپەروەرو کۆکەرەوەو دەوڵەمەندو دەوڵەمەندکەرو بەرگرو زیانگەیێنو سودگەیێنو ڕووناکیو ڕێنمونیکەرو داهێنەرو هەرماو میراتگرو شارەزاکەرو ئارامگرە. پاشان با بزانرێت کە ناوەجوانەکانی خودا تەنیا نەوەدونۆ ناو نین، بەڵگەشمان ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەرگیز هیچ کەسێك تووشی خەفەتو پەژارەنابێت کە بڵێت: ئەی خودایە من بەندەی تۆم کوڕی کەنیزەکی تۆم، پێشەسەرم بەدەستی تۆوەیەو لە بڕیاردا هەر بەردەوامیو دادوەری لە فەرماندا، دادوات لێ دەکەم بە هەرناوێك کە هی تۆیەو ناوی خۆتت لێناوە یان لە کتێبەکەتدا ناردوتە یان فێری کەسێکت کردووە لە دروستکراوەکانت یان تایبەتمەنت کردووە

---

[1] فتح الباری (٥/٤١٧/١١/٢١٨)، مسلم (٤/٢٠٦٢).

بۆ خۆت لە زانیاری نهێنیدا لەلای خۆت، قورئانی گەورە بکەیتە بەهاری دڵم (واتە: بە قورئانی پیرۆز دڵم پاراوبکەیت)، وە بیکەیتە ڕووناکی سینگم و لابردنی پەژارەو دەرکردنی خەفەتم، مەگین خودا خەفەتو پەژارەکەی لادەباتو بۆی دەکات بە شادیو کامەرانی) وترا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆمان فێری نەکەین؟ فەرمووی: (بەڵێ پێویستە لەسەر کەسێك گوێی لێ بوو فێری ببێت)[1]، عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا وتی: ﴿وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ گوێ مەدەنە ئەوکەسانەی ناوەکانی هەر بە ئەنقەست بۆ دەگۆڕن. ئەمانە بەمزوانە لەسەر ئەوکارەیان سزادەدرێن. وتی: لە گومڕایی بێ باوەڕانە کە دەڵێن لات یەکێکە لە ناوەکانی خودا[2] ئیبنو جورەیج لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾ ئەڵێت: لاتیان لە ناوی (الله) وەو عوزاشیان لە عەزیزەوە داتاشیوە[3] قەتادەئەڵێت : ﴿يُلْحِدُونَ﴾ واتە: شەریکی بۆ دادەنێن لە ناوەکانیدا[4] سەرچاوەی ئیلحاد لە وتەی عەرەبەکاندا لاربوونەوەو ستەمو خوڵادانە لە مەبەست، لەو وتانە (اللحد) واتە: گۆڕپینچە لەناو گۆڕدا، لەبەر لادانو لاربوونەوەی ڕووەو قیبلە لە ئاستی چاڵەکە پێی وتراوە (اللحد).

﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ ﴾

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴾ لەوانەدا کە ئێمە دروستمان کردوون، دەستەیەك هەن بەرەولای هەق ڕێ نیشاندەرن بە هەقیش دادوەری دەکەن. واتە: لە هەندێك لە گەلاندا هەیە بە کردارو گفتار ڕوو لە هەق دەکەنو خەڵکی بۆ بانگ دەکەنو خۆشیان پێی هەڵدەستنو دادوەریشی پێ دەکەن، لە قسەی پێشیناندا هاتووە مەبەست بەم ئوممەتە کە لەم ئایەتەدا هاتووە ئوممەتی موحەممەد(ﷺ). وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم لەسەر هەق دەمێننو نابەزن، ئەوەی یارمەتیان نادات و دژایەتیان دەکات زیانیان پێ ناگەیەنێت تا قیامەت هەڵدەستێت)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (تا فەرمانی خودا بە( مردنیان) دێت ئەوان هەروادەبن) وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (ئەوکەسانە لە شامدان)[5].

---

[1] أحمد (٣٩١/١) فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[2] الطبری (٢٨٢/١٣).

[3] الطبری (٢٨٣/١٣).

[4] الطبری (٢٨٣/١٣).

[5] فتح الباری (٤٥١/١٢٣)، مسلم (١٥٢٤/٣).

﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ (١٨٢) وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ (١٨٣) ﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئەوانەی کە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆدانا، وردە وردە (بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن) بەرەو تێداچوونیان دەبەین. واتە: دە رگای ڕۆزیی و خۆشگوزەرانیان لە دونیا لێ والادەکرێت، تا لە خۆیان بایی دەبن بەهۆی ئەو ژیانەوە کە تێیدان، وایان لێ دێت خۆیان بە خاوەندەستەلات دەزانن، وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ (٤٤) فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾[١] جا وەختێك ئەو هەموو ئامۆژگاریانەیان (کە کرابوون) لەبیرچوو، هەموو دە رگای بەختەوەریمان بۆ کردنەوە، هەتا کەوتنە خۆشیی و شادی، ئەوسا لەپڕوناکاوێك بەرتورەیی خۆمان خستن و هەموو نائومێد مانەوە. ئیتر ئەوکەسانەی پیشەیان هە ر ناهەقی بوو، دوابڕاوبوون و سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری گشت جیهان، هەربۆیە خودای گەورە لێرەدا ئەفەرمووێتی ﴿ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴾ ماوەیەك مۆڵەتیان دەدەین چەنکە تەکبیرم بتەوە. واتە: ئەو ژیانەی کە تێیدان بۆیان درێژدەکەینەوە، بێگومان تەکبیرمان زۆر توندو بەهێزە.

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ (١٨٤) ﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ﴾ ئاخۆ بەبیریاندا نەدەهات هاوڕێکەیان تووشی شێتبوون نەهاتووە؟ واتە: ئەوانەی کە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نیە، بیریان نەکردووەتەوە کە موحەممەد(ﷺ) تووشی شێتی نەبووە، بەڵکو ئەو پێغەمبەری خودایە(ﷺ) بە ڕاستی هاتووەو بانگیشی بۆسەر هەق کردووە ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ دیارە ئەو لە ترسی وەبەرهێنەرێك زیاترنیە. واتە: ئاشکرایە بۆ ئەوکەسەی کە خاوەن دڵ و هۆشەو تێ دەگات و بیری لێ دەکاتەوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾[٢] هاوڕێکەشتان شێت نیە. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾[٣] بلێ: من هەر ئامۆژگاریەکتان

---

[١] الانعام (٤٤– ٤٥).

[٢] التكوير (٢٢).

[٣] سبأ (٤٦).

دەکەم، لەبەر خودا یەکە یەکەو دووان دووان ڕاوەستن‌و پێکەوە بیربکەنەوە، هاوەڵەکەتان هیچ شێتی تێدانیە، ئەو هەر تەنیا دەیەوێت لە هاتنی ئازارێکی زۆر بەژان بتانترسێنێت. واتە دەفەرمووێت: من هەر داوای ئەوەتان لێ دەکەم کە بەڕاستی‌و پاکی لەبەر ڕەزای خودا ڕاوەستن‌و دەارگیری‌و لاساری وازلێ بێنن بە کۆمەڵ‌و بە تاك تاك، پاشان بیربکەنەوە لەوکەسەی کە ئەوپەیامەی بۆ هێناون لەلایەن خوداوە ئایا شێتە یان نا، ئەگەر ئەوەتان کرد، بۆتان دەردەکەوێت کە گومانی تێدانیە موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەرێکی ڕاست‌و دروستی خودایە. قەتادەی کوڕی دەعامە وتی: بۆیان گێڕاوینەتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)لەسەر سەفا بانگی لە قورەیش کردو بنەماڵەی بنەماڵە کردبوون (واتە: هەر بنەماڵەو بەناوی خۆیەوە بانگی دەکردن) ئەی بنەماڵەی فلان‌و ئەی بنەماڵەی فلان، دەیترساندن لە بەسەرهات‌و سزاکانی خودا، یەکێك لەوانە وتی: بەڕاستی ئەم هاوەڵەتان شێتبووە شەو تا ئەم بەیانیە هاواری کردووە یان هەتا ڕۆژی کردووەتەوە، یەکێك لەوانە وتی: خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾.

﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ (١٨٥) مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (١٨٦) ﴾

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ﴾ ئاخۆ ئەوان لە داموو دەزگای پڕ شکۆی ئاسمانەکان‌و زەمین‌و هەرچی خودا دروستی کردوون ڕانەماون لەوانەیە بەمزوانە مردن یەخەیان بگرێت؟ واتە: ئەوانەی کە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نیە سەیری موڵك‌و دەستەڵاتی خودایان نەکردووە لە ئاسمانەکان‌و زەمینداو ئەوشتانەش کە لە نێوانیاندا دروستبووە، هەتا بیربکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن‌و بزانن کە ئەو دەستەڵاتە هی کەسێکە کە هاووێنەو هاوشێوەی نیەو کە سێکە کە عیبادەت‌و ئاینی پاك‌و خاوێن تەنیا شایستەی ئەوە، باوەڕی پێ بهێنن‌و پێغەمبەرەکەشی بەڕاست بزانن، خۆتان بە بەندایەتی ئەوەوە خەریك بکەن‌و وازبێنن لە شەریك بۆدانان‌و بتپەرستی‌و بترسن لەوەی کە ژیانیان بەرەو کۆتایی بڕوات‌و لەسەر ئەو خودانەناسیە لەتاوبچن‌و ڕووەو جەزرەبەو سزای بەژانی خودا مل بنێن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾ دەسا لەپاش ئەم قورئانە بە کام قسە بڕوادەکەن؟ واتە: بە چ ترس‌و هەڕەشەیەك دوای ئەو ترساندن‌و هەڕەشەی موحەممەد(ﷺ) بڕوادەکەن کە پێی هاتووە بۆیان لەلایەن خوداوە؟ وە بە چ کتێبێك لە کتێبەکانی خودا بڕوادەکەن ئەگەر بڕوا بەم قسەیە نەکەن کە موحەممەد(ﷺ) بۆی هێناون لەلایەن خودای گەورەوە. پاشان

دەفەرموویت: ﴿ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ خودا هەرکەسێك گومڕابکات، هیچ ڕێ نیشاندەرێکی دەست ناکەوێت، وازیان لێ دێنێت با هەر لە سەرکەشی خۆیاندا سەرگەردان بن. واتە: هەرکەسێك خودا ڕێی لێ بگرێت هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێنمایی بکات، با زۆریش بە خۆیدا بچێتەوە هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت، ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾[1] هەرکەسێك خودا ویستی سزای بۆ ببڕێتەوە، تۆ ناتوانی لە خودا بێ نیازی بکەیتو هیچ کارێکی بۆ ڕێك بخەیت. وەك لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموویت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْـَٔايَـٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾[2] بلێ: سەیری ئاسمانەکانو زەمین بکەن، (بزانن) چی هەیە، کەچی ئەم هەموو نیشانەو ترساندنە کارناکاتەسەر گرۆی بڕوانەهێنان.

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾

**باسی ڕۆژی قیامەتو نیشانەکانی**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ﴾ لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە لێت دەپرسن. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾[3] دەربارەی ڕۆژی قیامەت خەڵکی پرسیارت لێ دەکەن. وتراوە لەسەر قورەیشی ئەم ئایەتە هاتووەتەخوارەوە. وە وتراویشە: لەسەر دەستەیەك لە جولەکە هاتووەتەخوارەوە ڕیوایەتی یەکەم گونجاوترە چونکە ئەم ئایەتە لە مەککە هاتووەو ئەوان پرسیاریان کردبوو لەبارەی قیامەتەوەو بە دووریان دەزانی ڕووبداتو هەر بڕواشیان پێی نەبوو، وەك خودای گەورەلە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾[4] دەڵێن: ئەو بەڵێنەتان کەی دێتەدی، ئەگەر ڕاست دەکەن؟ وە دەفەرموویت: ﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ لَفِى ضَلَـٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴾[5] ئەوانەی باوەڕیان نیە بەو ڕۆژەی دێتو پەلەی هاتنی دەکەن، ئەوکەسانەش کە بڕوایان

---

[1] المائدة (٤١).

[2] یونس (١٠١).

[3] الاحزاب (٦٣).

[4] الملك (٢٥).

[5] الشوری (١٨).

هێناوەو لێی دەترسن، دەشزانن کە ئەوە ڕاستە، باش بزانن ئەوانەی کە گومانیان هەیە لە ڕۆژی دوایی زۆر لـە ڕێ دوورکەوتونەتـەوە. واتـە: تـەواو گـومڕان. ﴿أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾ کـەی وەدی دێـت؟ عـەلی کـوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: کەی دێت[1]، واتە: کەی ڕوودەداتو دوایین ماوەی دونیا کەی دێت کە سەرەتای ڕۆژی قیامەتە ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾ بڵێ: زانینی هەر تـەنیا لـەلای پەروەردێنی منە، خۆی نـەبێت کـەس ناتوانێت کاتەکـەی ئاشکرابکات. خـودای گـەورە فـەرمانی دا بـە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمووی ئەگەر پرسیارکرا لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە زانینەکەی بگێڕەوە بۆلای خـودا، چـونکە هـە ر ئـەو دەتوانێت کاتەکـەی ئاشـکرابکات، واتـە: دیاریکردنیو کـەی دەبێـت خـۆی دەزانێت هـیچ کەسێك جگـە لـەو ئـەوە نازانێـت. هەربۆیـە دەفـەرمووێت: ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ زانینی بۆ ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەمیندان زۆر گرانە. عەبدوڕەزاق لـە موعەممـەرەوە لـە قـەتادەوە لەم ئایەتـەدا ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وتـی: زانینـی قورسـە لەسـەر خـەڵکی ئاسمانـەکانو زەمـین بێگومان ئەوان نایزانن[2] موعەممەر وتی حەسەن وتی: کاتێك ڕۆژی قیۆامەت هات گرانە لەسـە ر خـەڵکی ئاسمانەکانو زەمین. زاتـە: گـەورەدەبێت لەسـەریان.[3] زەححـاك لـە ئیبنـو عەبباسـەوە لـەم ئاریەتـەدا ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەڵێت: هیچ شتێك نیە لەو دروستکراوانە مەگین تووشی ئـەو ژیانـەی ڕۆژی قیامەت دەبێت. ئیبنو جورەیج ئـەڵێت: ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتـە: کاتێـك ڕۆژی قیامـەت هـات ئاسمان لەتوپەت دەبێتو ئەستێرەکان هەڵدەوەرێنو لەناودەچنو خۆر تۆپەڵ دەکرێت و کێوەکان لـە شوێنی خۆیـان دەخزێنـرێن، ئـەوەی کـە خـودای گـەورە ئەفـەرمووێت، ئـەوە گرانیەکەیـەتی. سبوددی ئەڵێت: ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ڕۆژی قیامەت شـاراوەتەوە لەوانـەی لـە ئاسمانـەکانو زەمینـدان، هەستانەکەی نازانرێت کاتێك هەڵدەسێت فریشتە زۆر نزیکەکانیشیو پێغەمبـەرە ڕەوانەکراوەکانیشی ئاگاداری هەڵسانەکەی نین[4] ﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾ لەناکاوێکدا ئەو ڕۆژە ڕووتان تێدەکات کە هیچ ئاگـات لە خۆتان نیـە. قەتادەئـەڵێت: ﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾ خـودا بڕیـاری داوە کـە لـە پڕێکـدا ئـەو ڕۆژەدێت بەسەرتاندا. وە وتی: بۆیان گێڕاوینەتـەوە کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئەفـەرمووێت: (بێگومـان ڕۆژی

---

[1] الطبری (١٣/٢٩٤).

[2] عبدالرزاق (٢/٢٤٤).

[3] عبدالرزاق (٢/٢٤٥).

[4] الطبری (١٣/٢٩٥).

قیامەت دێت بەسەر ئەو خەڵکەدا، پیاوی وا هەیە خەریکی چاکردنی حەوزەکەیەتی، هی واش هەیە ئاژەڵو ماڵاتەکەی ئاودەدات، هی واش هەیە کەلوپەلەکەی لەناو بازاردا داناوەو خەریکی کێشانەو پێوانەیە)[1]، بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: (ڕۆژی قیامەت هەڵناستێ تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت، کاتێك هەڵهاتو خەڵکی بینیان هەموو بڕوا دێنن، ئەو کاتە هیچ کەسێك بڕواکەی سودی پێ ناگەیەنێت لە پێشدا بڕوادار نەبوبێت، یان کرداری چاکی نەکردبێت لە بڕوا هێنانەکەیدا، بێگومان کاتێك کە قیامەت دێت دوو پیاو پۆشاکەکانیان ڕاخستووە لەنێوان خۆیاندا فریای کڕینو فرۆشتنو کۆکردنەوەیان ناکەون، وە قیامەت دێت پیاوێك گەڕاوەتەوە بەشیری وشترەکەیەوە کە دۆشیویەتی لێی ناخواتەوە، وە قیامەت دێت پیاوێك خەریکی سواخدانی حەوزەکەیەتی ئاوی پێنادات، وە قیامەت دێت پیاوێك تیکەکەی بەرز کردوەتەوە بۆ ناو دەمی نایخوات)[2]، عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت لەمەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا﴾ بەشێوەیەك پرسیارت لێدەکەن وەك تۆ دەربارەیان بزانی، وتی: وەك ئەوەی کەلە نێوان تۆو ئەواندا دۆستایەتیەك هەبێت، یان تۆ هاوەڵیان بیت. ئیبنو عەبباس وتی: کاتێك خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە، وەك گرۆیەك دەیانپرسی کەوایان دەزانی موحەممەد(ﷺ) دۆستیانە. خودای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد کە زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت تەنیا لەلای خۆیەتیو تایبەتە بەخۆیەوە، خودای گەورە هیچ کەس لە فریشتە نزیکەکانو پێغەمبەرانیشی لێ ئاگادار نەکردووە[3] هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەلام زۆربەی ئەم خەڵکە ئەمە نازانن. لەبەر ئەوە کاتێك کە جوبرەئیل لە وێنەی پیاوێکی عەرەبی دەشتەکیدا هات بۆئەوەی خەڵکی فێری فەرمانی ئاینەکەیان بکات، لەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشت، وەك دانیشتنی کەسێك کە پرسیار بکات بۆ شارەزا بوون. پرسیاری لەبارەی ئیسلامەوە لێکرد، پاشان لەبارەی باوەڕەوە، پاشانیش لەبارەی ئیحسانەوە لە دوایدا وتی: کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وت: (پرسیارت لێکراو لەو بارەوە زاناتر نیە لە پرسیار کەر)، واتە: من لەتۆ باشتری لێ نازانم، وە هیچ کەسێك لەو بارەیەوە لەکەسی تر زاناتر نیە. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾[4] زانستی

---

[1] الطبری (١٣/٢٩٧).

[2] فتح الباری (١١/٣٦٠).

[3] الطبری (١٣/٢٩٨).

[4] لقمان (٣٤).

ڕۆژی قیامەت لای خودایە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە جوبرەئیل (سەلامی خودای لێبێت) پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد لەبارەی نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتەوە، ئەمیش نیشانەکانی بۆ باس کرد پاشان فەرمووی: (لەبارەی ئەو پێنج نیشانەشەوە کەهیچ کەسێك نایزانێت تەنیا نەبێت)، پاشان ئەم ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ خوێند، لەمانەدا هەموو لەدوای هەر وەڵامێکدا پێی دەفەرموو: ڕاست دەکەیت، لەبەر ئەمە هاوەڵەکان سەرسام بون لەم پرسیارکەرە، لێی دەپرسیو بڕواشی پێدەکرد، پاشان کاتێك کە ڕۆیشت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە جوبرەئیل بو هاتە لاتان فێری ئاینەکەتان بکات)، وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (لەهیچ وێنەیەکدا نەهاتووە مەگین لەو وێنەیەدا ناسیومە جگە لەم وێنەیەی)[1]، موسلیمش لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خودای لێبێت) ئەڵێت: عەرەبە کۆچەرییەکان کاتێك دەهاتنە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاریان لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە لێدەکرد، کەی قیامەت دێت؟ سەیری لاوترین کەسیانی دەکرد دەیفەرموو: (ئەگەر ئەمە بژی تا دەگاتە تەمەنی پیری قیامەتی ئێوە هەڵدەستێت)[2]، مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بەوە مردنیانە کە بەرەو بەرزەخی ماڵی دوایی دەیانبات. دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پیاوێك لە پێغەمبەری خودا پرسی (ﷺ) لەبارەی قیامەتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئەم لاوە بژی لەوانەیە پیر نەبێت تا قیامەت هەڵدەستێت)[3]، موسلیم تەنیا خۆی هێناویەتی. لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بو(ﷺ) پێش ئەوەی وەفات بکات بە مانگێك دەی فەرموو: (پرسیارم لێدەکەن لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە، بێگومان زانینی ڕۆژی قیامەت لەلای خودایە، سوێند بەخودا دەخۆم هیچ کەسێك نیە لەسەر ئەم زەمینەدا ئەمڕۆ هەناسە بدات سەدساڵ بەسەریدا تێپەڕێت)، موسلیم ڕیوایەتی کردووە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە. ئیبنو عومەر ئەڵێت: بێگومان پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەبەستی کۆتایی هاتنی ژیانی ئەو کەسانە بووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێکرا گەیشتم بە ئیبراهیمو مووساو عیسا (سەلامی خودایان لێبێت) وتووێژیان دەکرد لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە، کارەکەیان گەڕاندەوە بۆ لای ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) وتی: هیچ زانیاریەکم لەبارەیەوە نیە، پاشان کارەکەیان بردە لای مووسا (سەلامی خودای لێبێت) ئەمیش وتی: هیچ زانیاریەکم لە بارەیەوە نیە. پاشان کارەکەیان بردە لای عیسا (سەلامی خودای لێبێت) عیسا وتی:

---

[1] فتح الباری (١/١٤٠).

[2] مسلم (٤/٢٢٦٩).

[3] مسلم (٤/٢٢٧٠).

بێگومان هیچ کەسێك ئاگای لێی نیە بێجگە لە خودای گەورە ئەوەی کە پەروەردگارم بەمنی سپاردووە دەجال دەرکەوتووە دوو چڵە دارم پێیە، کاتێك کە بینیمی تواوەتەوە وەك چۆن مسی دەتوێتەوە وتی: کاتێك کەمنی بینی خودا لەناوی دەبات، تا بەردو دارو درەخت دەڵێن: ئەی موسوڵمان خودانەناسێك لەژێر مندایە وەرە بیکوژە، خودای گەورە قڕیان تێدەخات پاشان خەڵکی دەگەڕێنەوە بۆ زێدو وڵاتی خۆیان. وتی: ئالەو کاتەدا یأجوج و مەئجوج دەردەچێت و لەهەموو لایەکەوە دێن و وڵاتەکەیان داگیر دەکەن و، دەچنە هەرشوێنێك وێرانی دەکەن، بەسەر هەر ئاوێکدا بڕۆن دەیخۆنەوە. وتی: پاشان خەڵکی دێنەوە بۆ لای من و سکاڵایان لەدەست دەکەن، منیش دەڵالێمەوە لە خودا کەقڕیان تێبخات و لەناویان بەرێت هەتا وای لێدێت لەبەر بۆنی پیسیان زەوی ئۆقرەی تێدا نامێنێت واتە: ئەوەندە بۆنیان پیسە. خودای گەورە باران دەبارێنێت و لاشەکانیان ڕادەماڵێت و فڕێیان دەداتەوە ناو دەبات. ئیمامی ئەحمەد لە یەزیدی کوڕی هارون وتی: پاشان کێوەکان هەڵدەتەکێن و زەویش وەك پێست دەکشێت و یان دەبێتەوە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ فەرموودەکەی هەسەیم و وتی: کاتێك کە پەروەردگارم ئەوەی پێ سپاردم، ئەوەش کاتێك بەو شێوەیە ڕوویدا، بێگومان ڕۆژی قیامەت وەك ژنێکی سك پڕ وایە کەس و کارەکەی نازانێت کەی لەشەودا یان ڕۆژدا لەناکاو منداڵەکەیان بۆ دەخاتەوە.[1] ئیبنو ماجەش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە[2] ئا ئەم پێغەمبەرە گەورە و نەبەزو لێبڕاوانە هیچ زانیاریەکیان لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە نیەو کاتەکەی نازانن و فەرمانەکە دەگێڕنەوە بۆلای عیسا پێغەمبەرو (سەلامی خودای لێبێت) ئەویش لەبارەی نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتەوە دواوە، چونکە ئەو لە کۆتایی ئەم ئوممەتەدا دێتە خوارەوەو بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەجال دەکوژرێت و خوداش بەهۆی بەرەکەتی دوعای ئەوەوە یەئجوج و مەئجوج لەناو دەبات، عیسا باسی ئەوەی کردووە کە خودای گەورە ئاگاداری کردووە لێی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەوە وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زانیەکەی لەلای پەروەردگاری گەورە، جگە لەو هیچ کەسێك لەکاتی خۆیدا ئاشکرای ناکات. بەڵام نیشانەکانی باس دەکەم بۆتان، وەچی دەبێت لە پێش هاتنیدا لەپێش هاتنیدا فیتنەو هەرەج پێدا دەبێت)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فیتنەمان زانیوە، هەرەج چیە؟ (بە زمانی حەبەشی) فەرمووی: (کوشتن) فەرمووی: (یەکتری نەناسی دەکەوێتە ناو خەڵکی، وای لێدێت کەس کەس ناناسێت)[3]، هیچ کەسێك لە خاوەنی شەش کتێبەکە (کتێبەکانی فەرموودە) بەم شێوەیە

---

[1] أحمد (١/٣٧٥) فەرموودەیەکی بەهێزنیە بەم سەنەدانە.

[2] ابن ماجة (٢/١٣٦٥) فەرموودەیەکی بەهێزنیە بەم سەنەدانە.

[3] أحمد (٥/٣٨٥).

ڕیوایەتیان نەکردووە. تاریقی کوڕی شەهاب وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەردەوام لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە هەر ئەم قسەی دەکرد تا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾[1] واتە: دەربارەی ڕۆژی قیامەت لێت دەپرسن کەی وەدی دێت؟ نەسائیش ڕیوایەتی کردووە[2] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی باش‌و بەهێزە. ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە سەرکردەی گشت پێغەمبەران‌و دوایین پێغەمبەرەو پێغەمبەری بەزەیی‌و لێبوردن‌و داستان‌و نمونەو پێشەنگ‌و کۆکەرەوەیەکە کە خەڵکی لەبەرپێیدا کۆدەکرێنەوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ئەنەس‌و سەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خودایان لێبێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (من ڕەوانەکراوم لەگەڵ قیامەتدا ئەوها)[3] واتە: پێکەوەین (بە پەنجەی شایەتمان‌و پەنجەی دوای شایەتمانی ئاماژەی دەکرد). لەگەڵ ئەمانەدا هەموو خودا فەرمانی پێداوە کە زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت بگێڕێتەوە بۆلای خودا خۆی کاتێك کە پرسیاری لێکرا لەوبارەیەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بڵێ: تەنها هەر خودا بۆخۆی دەیزانێت، بەڵام زۆربەی ئەم خەڵکە ئەمە نازانن.

﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾﴾

**ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) غەیب نازانێت‌و توانای سودو زیانیشی بۆ خودی خۆی نیە**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بڵێ من خاوەنی قازانج‌و زیانی خودی خۆم نیم، جا مەگین خودا مەیلی لێ بێت، ئەگەر غەیبم بزانیایە بەهرەی زۆرم دەست دەکەوت‌و زیانێکم تووش نەدەهات، من هەر تەنیا ترسێنەرو مژدە دەرم بۆ کەسانێك بڕوا دەکەن. خودای گەورە فەرمان دەکات کە کارەکان بگێڕرێنیەوە بۆلای خۆی‌و پێغەمبەری خودا ڕایبگەیەنێت کە ئەو زانیاری بەو شتانە نیە کەلەمەوبەدوا ڕوودەدات‌و هیچ ئاگاداریەکی لەو بارەیەوە نیە جگە لەوەی کەخودا ئاگاداری کردووە لێی. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا

---

[1] الطبری (١٣/٢٩٢).

[2] النسائي في الكبری (٦/٥٠٦) فەرمودەیەکی بەهێزە.

[3] فتح الباری (١١/٣٥٥).

يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾[1] لە نەدیاران ئاگادارەو نهێنی خۆی بۆ کەس ئاشکرا ناکات. زەححاك لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ﴾ ئەگەر غەیبم بزانیایە ماڵی زۆرم دەست خۆم دەخست، لە ڕیوایەتێکی تردا وتی: ئەگەر شتێکم بکڕیایە دەمزانی چەندێك قازانج دەکەمو هیچ شتێکم نەدەفرۆشت قازانجی نەکردایە تێیدا ﴿وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ﴾ تووشی هەژاریش نەدەبووم[2] عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم وتی: ﴿وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ﴾ لەهەر شەڕێك کە تووشم بهاتایە خۆم لێ وەدوور دەگرت پێشی ئەوەی ڕووبداتو خۆم لێ دەپاراست[3] پاشان خودای گەورە ئاگاداری کردووین کە موحەممەد(ﷺ) تەنیا ترسێنەرو مژدەدەرە واتە: ترسێنەرە لە سزاو مژدەدەرە بۆ خاوەنباوەڕان بەبەهەشت وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا﴾[4] ئێمە بۆیە ئەم قورئانەمان بەزمانی ئاسانی خۆت ڕەوانەکرد، تا تۆ مژدەی پێبدەی بەوانەی پارێزگارن دوژمنی سەر سەختی پێ بترسێنی.

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾

**هەموو خەڵکی نەوەی ئادەمن**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ هەر ئەو ئێوەی لەیەك کەس وەدی هێناوە. خودای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە هەموو خەڵکی لە ئادەمن (سەلامی خودای لێبێت) وە هەر لەئادەم حەوای هاوسەری وەدی هاتووە، پاشان گشت مەردم لەوانەوە بڵاوەی کردووە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾[5] ئەی خەڵکینە، هەر لەنێرو مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێناوەو کردوومانن بەچەند گەلێكو چەند هۆزێك هەتا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خودا

[1] الجن (٢٦).
[2] الدر المنثور (٣/٦٢٢).
[3] الطبري (١٣/٣٠٢).
[4] مريم (٩٧).
[5] الحجورات (١٣).

پارێزگارترەکانتانن. وە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ ژنەکشی هەر لەماکی ئەو پێك هێنا کەلە سایەیدا بحەسێتەوە. واتە: لەگەڵیدا ڕابوێرێت و ئاسودە ببێت پێی. وەك خودا گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾[1] هەر لە نیشانەکانی ئەوە کە لەخۆتان هاوجووتی بۆ وەدی هێناون کە پێیان بحەسێنەوەو خۆشەویستیو بەزەیی خسوەتە ناوتان. هیچ پێکەوە ژیانێکی گیانی گەورەترو بەهێزتر نیە لە پێکەوە ژیانی گیانی پیاوو ژن. بۆیە خودای مەزن کەباسی کردووە کە جادووگەر کەم جار بەفروفێڵی توانیویەتی ژنو مێرد لەیەکتری بترازێنێت پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا﴾ وەختێك (ئادەم) لەگەڵ (دایکە حەوا) سەرجێی کرد، بارداربوو بە بارێکی سووك. ئەوە سەرەتای سکپڕی بوو، ژن هەست بە ئێشو ژان ناکات. بەڵکو ئەوە نتۆکی ئاوەو پاشان بووە خوێنێکی بەسیاگو پاشانیش بووە پارچەگۆشتێك، ﴿فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ ماوەیەك پێوەگەڕا. موجاهید ئەڵێت: بەردەوام هەڵیگرتبوو[2] ڕیوایەت کراوە لە حەسەنو ئیبراهیمی نەفەعیو سوددیەوە هەر بەم شێوەیە[3] مەیمونی کوڕی مەهران لە باوکیەوە وتی: شاردبوویەوە. ئەیووب وتی: پرسیم لە حەسەن لەم دەقەد ﴿فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ واتە: ئەگەر تۆ پیاوێکی عەرەب بوویتایە ددەتزانی ئەوە چیە؟ بێگومان ئەوە واتە بەدەوام پێوەبوو[4] قەتادەئەڵێت: ﴿فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ واتە: سکەکەی ئاشکرابوو (دەرکەوت)[5] ئیبنو جەریر وتی: واتە (ماوەیەك) بە ئاوەکەوە هەڵدەستاو دادەنیشت[6]، عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ماوەیەك کە پێوەبوو گومانی هەبوو ئاخۆ دووگیانە یان نا؟ ﴿فَلَمَّآ أَثْقَلَت﴾ کە هەستی بە قورسبوون کرد، واتە: هەستی بە قورس بوون کرد بە هەڵگرتنیەوە[7] سوددی وتی: منداڵەکە گەورەبوو لەناو سکیدا[8] ﴿دَّعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَـٰلِحًا﴾ هەردووکیان لە

---

[1] الروم (٢١).
[2] الطبری (١٣/٣٠٥).
[3] الطبری (١٣/٣٠٤/٣٠٥).
[4] الطبری (١٣/٣٠٤).
[5] الطبری (١٣/٣٠٥).
[6] الطبری (١٣/٣٠٤).
[7] الطبری (١٣/٣٠٥).
[8] الطبری (١٣/٣٠٥).

پەروەردگاریان پاڕاناوە، ئەگەر منداڵێکی چاكو تەواومان پێ ببەخشێت، ﴿صَٰلِحًا﴾ واتە: مرۆڤێکی تەواو. وەك زەححاك لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: ترسان لەوەی کە ئاژەڵێك بێت[1] ئەبوبەختەریو ئەبومالیکیش هەر وایان تووە ترسان لەوەی کە مرۆڤ نەبێت[2] حەسەنی بەسری ئەڵێت: ئەگەر منداڵێکمان پێ ببەخشێت[3] ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ لە سوپسگوزاران دەبین. ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ کە منداڵی چاكو تەواوی پێ بەخشین، لەوەی کە خودا پێی دابوون، چەند شەریکیان بۆ پەیداکرد، کە خودا زۆر بەرزترە لەوەی کە شەریکی بۆ دابنێن. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە حەسەنەوە ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا﴾ ئەمە لە هەندێك نەتەوەو ئاینەکانی تر بووە، لەلایەن ئادەمەوە نەبووەو[4] وە هەر لە حەسەنەوە وتی: مەبەست بەو ئایەتە نەوەی ئادەمە ئەونەی کە شەریکیان بۆدانا لێیان لەدوای ئادەم (سەلامی خودای لێبێت) واتە: ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا﴾[5] لە قەتادەوە حەسەن وتی: ئەوانە جوولەکەو گاورەکان بوون خودا منداڵی پێ دەبەخشێتو دەبوونە گاورو جوولەکە[6] ئەم سەنەدانە ڕاستن لە حەسەنەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کە ئەو ئایەتەی بەوشێوەیە تەفسیرکردووە، ئەم تەفسیرە لە چاکترین شایستەترین تەفسیرە بۆ ئەم ئایەتە، وە بێگومان ئەم ئایەتە مەبەست پێی ئادەمو حەوانیە، بەڵکو مەبەست پێی بتپەرستانە لە نەوەکانی. ئەمە وەك ئیستیتراد وایە باسی کەسێکەو مەبەست پێی جۆرو ڕەگەزەکەیەتی وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾[7] ئێمە ئاسمانی دونیامان بە زۆر چرا ڕازاندەوە. خۆ دیارە مەبەست بە چراکان ئەستێرەکانە کە ئاسمانی پێ ڕازاوەتەوە. ئەوە نیە کە پێی لێ دەدرێ لە جنۆکەکان. نمونەی ئەمە لە قورئاندا زۆرەو خودا خۆشی باش دەزانێت.

﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ

[1] الطبری (١٣/٣٠٦).
[2] الطبری (١٣/٣٠٦).
[3] الطبری (١٣/٣٠٦).
[4] الطبری (١٣/٣١٤).
[5] الطبری (١٣/٣١٤).
[6] الطبری (١٣/٣١٤).
[7] الملك (٥).

ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ
بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ
كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ
لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ
إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿١٩٨﴾﴾

**خودای بتپەرستان نە وەدیهێنەرەو نە یارمەتیدەرەو نە خاوەنی هیچ شتێکە**

ئەمە نارەزایی دەربڕینێکە لەلایەن خوداوە بەرامبەر بتپەرستان کە لەگەڵ خودا شتی تریان پەرستووەلەبتو هاوتاو پەیکەر، کە ئەمانە دروستکراوەو وەدیهێنراوەو پەروەردە کراوی خودایە، دەستەڵاتی هیچ شتێکیان نیە نە زیانو نە خازانج دەگەیەننو نە یارمەتی ئەوکەسانە دەدەن کە دەیانپەرستنو نە دەیانبینن، بەڵکو ئەوانە بێگیانن، ناجوڵێنو نابیستنو نابینن، ئەوانەی دەیانپەرستن لەوان چاکترن لە بینینو بیستنو ئازایەتیو بوێریدا. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾ چۆن ئەوانە دەکەن بە شەریکی خودا کە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەنو خۆیان دەبێت دروست بکرێن. واتە: ئایا هاوەڵی بۆ دادەنێن لەگەڵ ئەو پەرستراوانەدا کە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەنو هیچیشیان لەدەست نایات وەك ئەم ئایەتانە کە خودای گەورە دەفەرموێت:
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾[1] ئەی خەڵکینە، نمونەیەك هێنراوەتەوە گوێی بۆ بگرن، لە خودا بەدەر ئەوانەی هانای پێدەبەن، ئەگەر هەموویان کۆببنەوە ناتوانن مێشێك دروست بکەن، ئەگەر مێشیش شتێکیان لێ بفرێنێ، ناتوانن لێی بسێننەوە داواکارو داواکراو چەند زەبوونن خودایان بەو شێوەیەی کە پێویستە نەناسیوە، خودا زۆر بەتواناو بەدەستەڵاتە. خودای گەورە ئاگاداری داوە کە خوداکانی ئەوان هەموو کۆببنەوە ناتوانن مێشێك دروست بکەن، تا ئەگەر مێشی شتێکیان لێ بفرێنێت لە خواردنێك کە باشیش نەبێت ناتوانن لێی بسێننەوە، مێشێك ئەوە حاڵی بێتو ئەوە سیفەتی بێت چۆن دەبێت بپەرسترێت بۆ ئەوەی ڕۆزی بداتو بێت بەهاناوە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا

---
[1] الحج (٧٣- ٧٤).

يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾ واتە: ئەوانە خۆیان وەدی هێنراوو دروست کراون وەك خودای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیمی خەلیل ئەفەرمووێت: ﴿ قَالَ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ ﴾[1] وتی: ئایا ئێوە شتێك دەپەرستن کەهەر خۆتان دای دەتاشن؟ پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴾ توانایان نیە یارمەتی ئەوان بدەن‌و یاریدەی خۆشیا پێ نادرێت. واتە: ناتوانن یارمەتی ئەوکەسانە بدەن کە دەیانپەرستن‌و توانای بەرگریشیان لە خۆیان نیە ئەگەر کەسێك بەوێت لێیان بداتو بیانشکێنێت، وەك چۆن ئیبراهیمی خەلیل بتەکانی هۆزەکەی شکاندو سوكو ڕیسوای کردن. وەك خودای گەورە لەبارەیەوە ئەفەرمووێت: ﴿ فَرَاغَ عَلَيۡهِمۡ ضَرۡبَۢا بِٱلۡيَمِينِ﴾[2] پەنامەکی بە دەستی ڕاست مستێکی تێ سرەواندن (لێی دان) وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرٗا لَّهُمۡ لَعَلَّهُمۡ إِلَيۡهِ يَرۡجِعُونَ﴾[3] هەمووی پارچە پارچەکردن، بتەگەورەکەیان نەبێت، بەڵکو بێنەوە بۆلای ئەو. وەك چۆن مەعازی کوڕی عەمری کوڕجەموح‌و مەعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خودایان لێبێت) دوو لاوبوون کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتە مەدینە موسڵمان بوون، لەشەودا دایان بەسەر بتەکانی بتپەرستەکانداو شکاندیان‌و پارچە پارچەیان کردو کردیانە سوتەمەنی بۆ بێوەژنەکان تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هۆزەکەیان‌و بە خۆیاندا بچنەوە. عەمری کوڕی جەموح کە سەرۆکی هۆزەکەی بوو، بتێکی هەببوو دەیپەرست‌و بۆنی خۆشی لێدەدا، هەردووکیان بە شەو چوون‌و بتەکەیان بەسەرداخست‌و پیسیان کرد بەسەریدا، عەمری کوڕی جەموح هات‌و سەیری کرد چی بەسەر بتەکەی هاتووە، شۆردی‌و بۆنی خۆشی لێداو شمشێرێکی لەلاداناو پێی وت: بەرگری لەخۆت بکە. پاشان دووکەسەکە دایان بەسەریدا وەك جاری پێشویان لێکردەوە، ئەمیش دیسان وەك جاری پێشووی لێکردەوە، تا جارێکی تر دووکەسەکە لەگەڵ سەگێکی تۆپیودا ئاوملیان کردو بەرەو کێوێك بردیان‌و لە بیرێکدا لەوێ فرێیاندا، کاتێك عەمری کوڕی جەموح هات‌و ئەوەی بە چاوی خۆی بینی بۆی دەرکەوت ئەوەی ئەوان لەسەرین ئاینێکی پڕوپوچە. پاشان وتی: سوێند بە خودا ئەگەر خودایەکی بەتوانا بوویتایە هەردووکتان ئاوەمل نەدەکران. پاشان باوەڕی هێناو بووە موسڵمانێکی چاکو لە جەنگی ئوحودا شەهیدکرا ڕەزای خودایان لێبێت‌و بەهەشتی فیردەوس شوێنی بێت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ

---

[1] الصافات (٩٥).

[2] الصافات (٩٣).

[3] الانبياء (٥٨).

ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾
أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ
بِهَا﴾ ئەگەر ئێوەش بانگیان بکەن کە بێنەسەر ڕێگەی خودا دواتان ناکەون، بانگیان بکەن یان دەنگ نەکەن. بۆ ئێوە هەر وەکویەکە. ئەوانەی کە (لەباتی خودا) ئێوە هانایان بۆدەبەن، کۆمەڵە بەندەیەکن وەك خۆتان، دەسا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، بانگیان بکەن با وەڵامتان بدەنەوە. ئاخۆ ئەوان دەتوانن لەسەر پێ بڕۆن یان دەستیان هەیە پێی بوەشێنن یان چاوی دیتنیان هەیە، یان گوێی بیستنیان پێوەیە. واتە: ئەو بتانە هەر کەسێك بانگیان بکات گوێیان لێ نیە، بانگ بکرێن‌و بانگ نەکرێن وەك یەکە، وەك ئیبراهیم وتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا﴾[1] باوکە تۆ بۆ شتێکی وا دەپەرستی، نەدەبیستێت‌و نەدەبینێت‌و هیچ بەهرەیەك بە تۆ نادات. پاشان خودای گەورە بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە ئەوانیش وەك ئەوان دروست کراوی خودان، بەڵکو ئەوانی مرۆڤ لەوان چاکترو تێرو تەواو ترین‌و دەبیستن‌و دەبینن‌و دەستیشی دەوەشێنن، بەڵام ئەو بتانە هیچ شتێکیان لەدەست نایە ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ﴾ بڵێ: بانگی هاوبەشەکانتان بکەن، ئەوسا داوی فێڵ‌و تەڵەکەم بۆ بنێنەوەو چاوتروکانێك ماوە مەدەم، هەر چیتان لەدەست دێت درێخی مەکەن. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ گەورەی من هەر خودایە کە ئەم کتێبەی ناردووەتە خوار، هەر خۆشی سەرپەرشتی چاکان دەکات. واتە: تەنیا خودام بەسەو ئەو یارمەتی دەرو پشت‌و پەنامە، هەر ئەو گەورەمە لە دونیاو لە قیامەتداو دۆستی هەموو چاکانە دوای من. ئەمەش وەك هوود (سەلامی خودای لێبێت) کاتێك کە هۆزەکەی پێیان وت: وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾[2] ئێمە هەر ئەوەندە دەڵێن: ڕەنگە هەندێك لەوانەی کەدەیانپەرستین تووشی خراپەیان کردبی،وتی: خودا بەشایەت دەگرم، ئێوەش هەروەها شایەت بن لەوەی ئێوە دەیپەرستن بەرکەنارم. جگە لەخودا هەمووتان فێڵم لێ بکەن‌و ماوەم مەدەن. من خۆم سپارد بەو خودایە کە پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەش هەر ئەوە، هەر شتێك

---

[1] مريم (٤٢).

[2] هود (٥٤-٥٦).

دەجولێتەوە مەگین خودا دەستەڵات دارە بەسەریدا و ژیان و بژێوی لەسەر ئەوە دیارە ڕێگەی پەروەردگارم ڕاستەڕێیە وەك ئیبراهیمی خەلیل فەرموویەتی: ﴿أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ﴾[1] خۆتان و باب و باپیرانی پێشووتان، هەموویان دوژمنی منن، جگە لە پەروەردگاری هەموو دونیا، ئەوەی منی دروست کردووە هەر ئەویش شارەزام دەکات. وهەر ئیبراهیمی خەلیل دەڵێت بە باوکی و هۆزەکەی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾[2] مەگین لەو کەسەی منی دروست کردووە، کە خۆی ڕێگەم نیشان دەدات. کارێکی کرد ئەم وتارەی لەپاشی خۆی بۆ نەتەوەی هەر بمێنێت، بەڵکو بگەڕێنەوە. پاشان خودای گەورەلێرەدا دەفەرمووێت: ﴿﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟﴾ ئەو کەسانەی (جگە لەو) (واتە لە خودا) ئێوە هانایان پێدەبەن، نایەن یارمەتیتان بدەن و یاریدەی خۆشیان پێ نادرێت، ئەگەر ئێوە بەرەو ڕێی ڕاست بانگیان بکەن، گوێتان لێ ناگرن. وەك خودای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ﴾[3] ئەگەر هاواریشیان بۆ ببەن، لەکاتێکدا ئەوان هیچ نابینن. بۆیە خودا مامەڵەیان وەك کەسانێکی بێئاوەز لەگەڵدا دەکات، کە لەسەر شێوەی مرۆڤ کێشرابن، وا دەیانبینی کە تەماشادەکەن. خودای گەورەپەرستەکەی بە زەمیرێك دەربڕیوە کە بۆ کەسێکی ژیر بەکار دەهێنرێت.

﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾﴾

**فەرماندان بە لێبووردن**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ چاو بپۆشەو فەرمان بەکاری چاك بدەو واز لەو نەزانانە بێنە. عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم دەقەدا ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ﴾ئەڵێت: خودای گەورە فەرمانی داوە بە لێبوردن و چاوپۆشی کردن لەبتپەرستان تا دەساڵ و

---

[1] الشورى (٧٦-٧٨).

[2] الزخرف (٢٧-٢٨).

[3] فاطر (١٤).

پاشان فەرمانی داوە بە زبری و ڕەقی جولانەوە لەگەڵیان[1] زۆر کەس ڕیوایەتیان کردووە لە موجاهیدەوە لەم دەقەدا ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ﴾ئەڵێت: لێبوردەیی وەرگرە لە ڕەوشت و ئاکاری خەڵکی بەبێ سیخوڕی کردن[2] هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە ئەڵێت: خودا فەرمانی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ) لێبوردەیی هەڵبژێرێت لە ڕەوشتی خەڵکی[3] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووەئەڵێت: ئەوەی چاوپۆشیت لێکراوە لە ڕەوشتی خەڵکی وەر بگرە. وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە هیشامەوە لە باوکیەوە، لە براکەیەوە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە ئەڵێت: بێگومان ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ﴾ چاو بپۆشە هاتووەتە خوارەوە لە ڕەوشتی خەڵکی.[4] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە جگە لەو لە هیشامەوە لە باوکیەوە لە ئیبنو عومەرەوە[5]، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە هەر لە هیشامەوە لە باوکیەوە لە عائیشەوە کە هەردووکیان هەر بەو شێوەیان وتووە والله أعلم[6]، ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە وتیان: یونس بۆیگێڕاوینەوە، سوفیانی کوڕی عویەینە بۆیگێڕاوەتەوە لە ئوممەیەوەئەڵێت: کاتێك خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی جوبرەئیل ئەمە چیە؟) جوبرەئیل وتی: خودا فەرمانت پێدەکات کە ببوری لەوانەی ناهەقیان دەربارەت کردووە، ببەخشیت بەوانەی کە بەشیان نەدایت، ئەوەی خۆی دابڕیوە لە تۆ بەسەری بکەینەوە.[7] بوخاری لەم ئایەتەدا ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ئەڵێت: (العُرف) واتە: چاکە. پاشان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کەئەڵێت: عویەینەی کوڕی حوسنی کوڕی حوزەیفە هات و لەلای حوڕی کوڕی قەیس برازای دابەزی، حوڕ یەکێك بوو لەوکەسانەی کە عومەر لەخۆی نزیکی خستبووەوە، قورئان لەبەرەکان هاودەم و ڕاوێژکاری عومەربوون لاوبووبن یان بەساڵاچوو. عویەینە بە برازاکەی وت: ئەی برازاکەم تۆ خاوەنی ڕێزی لەلای ئەم ئەمیرە، ئیزنم بۆ وەرگرە تا بڕۆمەلای، حوڕ وتی: ئێستا ئیزنت بۆ وەردەگرم کە بچیتەلای. ئیبنو عەبباس ئەڵێت: حوڕ داوای ئیزنی کرد بۆ عویەینە، عومەر ڕێی پێدا،

---

[1] الطبری (١٣/٣٢٨).

[2] الطبری (١٣/٣٢٧).

[3] الطبری (١٣/٣٢٧).

[4] فتح الباری (٨/١٥٥).

[5] فتح الباری (٨/١٥٦).

[6] فتح الباری (٨/١٥٦).

[7] الطبری (٦/١٥٤)، ابن أبي حاتم (٥/١٦٣٨) فەرموودەیەکی لاوازە.

کاتێك کە چووەلای وتی: ئەوەتا ئەی کوڕی خەتاب سوێند بە خودا چاکو زۆرت پێ نەداوین و بە دادپەروەریش فەرمان نادەیت لەگەڵماندا، عومەر تووڕەبوو خەریك بوو لێی بدات، حور پێی وت: ئەی گەورەی موسڵمانان خودای گەورە فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ بێگومان ئەمە لە نەفامەکانە. سوێند بەخودا کاتێك ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوەعومەر لێی نەدا، زۆر پابەندبوو بە قورئانی پیرۆزەوە[1] تەنیا بوخاری خۆی ڕیوایەتی کردووە.

هەندێك لە دانایان مانای ئەم ئایەتەیان لە دوو دێردا داڕشتووە کە جینیاسیان تێدایە دەڵێت:

خُذِ العفو وأمر بالمعرف كما أمرت أعرض عن الجاهلين

ولِن في الكلام لكل الانام فستحسن من ذوى الجاه لين

واتە: چاپۆشی بکەو فەرمانبدە بە چاکە وەك فەرمانت پێدراوە واز لەو نەزانانە بێنە، لە قسەکردندا نەرمو نیان بە لەگەڵ هەموو خەڵك، لەلایەن خاوەن ڕێزو دەستەڵاتەوە نەرمو نیانی شتێکی زۆر چاکە. هەندێك لە زانایانیش وتویانە: خەڵکی دووکەسن کەسێکی چاکە، ئەوەی بۆت دەلوێت لە چاکەکانی وەرگرە، زیاد لە توانای خۆی ئەرك مەخەرە سەرشانی تەنگاوی بکات. یان کەسێکی خراپەکارە، فەرمانی پێ بکە بە چاکەکردن، ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر گومڕاییەکەی و ملی پێ نەداو وازی نەهێناو تۆیش وازی لێ بێنە. بەڵکو ئەوەی تۆ لەگەڵی دەکەیت وازی لێ بێنێت لەوکارەخراپەی. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾[2] تۆ وەڵامی خراپە بە چاکە بدەرەوە، ئێمە باشتر دەزانین ئەوان چی دەڵێن. تۆ بڵێ: ئەی پەروەردگارم! هانام بە تۆ، لە نەدانی شەیتانان.هەر هاناش دەبەمەبەر تۆ، کە ئەوان دێن بەلامەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾[3] چاکەو خراپە وەکویەك نین، تۆ هەمیشە وەڵامی چاکە بدەوە، ئەوسا کەسێك لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیك. ئەوکارەش هەر تووشی کەسانێك دەبێتکە بتوانن خۆڕاگرین، هەرکەسێکیش ئەوکارەی تووش بێت، دیارە زۆر بەختەوەرە. هەرکاتێك لە شەیتانەوە تووشی خەیاڵاتێك بوویت،

---

[1] فتح الباری (١٩٩٧/٢/١٥٥/٨).

[2] المؤمنون (٩٦– ٩٨).

[3] فصلت (٣٤– ٣٦).

گورج پەنا بە خودا ببە کە هەرخۆی بیسەری زانایە. وە دیسان لەم ئایەتە پیرۆزەشدا خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ ۚ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ هەرکاتێك لە شەیتانەوە تووشی خەیالاتێك بوویت هەر پەنا بە خودا بەرە کە خۆی بیسەرو زانایە. ئەم سێ ئایەتە لە (الاعراف) و (المؤمنون) و (السجدة) دا کە چواهەمیان نیە، لەمانەدا خودای گەورە ڕێنمایی کردووە تێیاندا کە بەرخورد لەگەڵ مرۆڤی سەرپێچیکەردا بە چاکی بکرێت، چونکە ئەو چاکە لەگەڵ کردنە وای لێدەکات کە وازبێنێت لەو لاساریە بە ئێنی خودا. هەربۆیە خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ ئەوکاتە کەسێك کە لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێنە دۆستی نزیك. پاشان خودای گەورە پەنادەبات بۆ ڕێنمایی کردن بەخۆی لە شەیتانەکانی جنۆکە، چونکە شەیتانی جنۆکە هەر لە چاکە ڕێگریت لێ ناکات، بەڵکو بەتەواوی بتکوژێتو لەناوت بەرێت، چونکە دوژمنێکی زۆر ئاشکرابووە بۆ باوکت لە پێشداو دوژمنی خۆشتە. ئیبنو جەریر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ئەڵێت: کاتێك تورەییەکت بەسەرداهات لە شەیتانەوە وای لێکردی کە ڕێگریت لێ بکات لە وازهێنانو لە نەزانیو هەڵی نایت کە بچیت بەگژیدا ﴿فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ پەنابەرە بەخودا. گوێی لێیەتی، گوێشی لە هەڵەی ئەو نەفامەشە کە دەیکات بەرامبەرت، پەنابگرە بە خودا لە خەیالاتی شەیتانو قسەی کەسانی تریش، چونکە خودا هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، ئاگادارەو دەتوانێت خەیاڵانی خراپی شەیتانو شتی تری دروستکراوەکانی خۆیت لێ دووربخاتەوە.[1] لەسەرەتای ئەم تەفسیرەدا ئەو فەرموودانەمان هێنا لەبارەی پەنابردنەوە بە خودا(الاستعاذة) لێرەدا پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِّنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَانُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي الْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾﴾

## ڕێبازی لەخوداترسان لەکاتی ڕاڕایی و دوودڵیدا

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِّنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾ ئەوکەسانەی پارێزگارن، هەرکاتێك خەیاڵی خراپیان لە شەیتانەوە تووش دەبێت، خێرا یادی خودا دەکەنو بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە. خودای گەورە باسی لەخوداترسان دەکات لەو بەندانەی کە گوێڕایەڵیان کردووە لەوشتانەی کە فەرمانی داوە بەسەریانداو وازیان هێناوە لەوشتانەش

---

[1] الطبری (٣/٣٣٢).

کە قەدەغەی کردووە لێیان. ﴿إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ کاتێك خەیاڵی خرپیان لە شەیتانەوە تووش دەبێت. هەندێکی تر خوێندویانەتەوە بە (طائف)، ئەم دوو خوێندنەوەیە بەناوبانگن. هەندێك وتویانە: یەك مانایان هەیە. هەندێکی تر وتویانە: جیاوازی لە ماناکانیاندا هەیە، هەندێك مانایان بە توڕەیی کردووەو هەندێکی تر مانایان بە کاتێکردنی شەیتان کردووە بە کەوتنو پەرکەم، هەندێك بە خەفەت خواردن بە گوناهو هەندێك بە تووشبوونی گوناهو تاوان مانایان لێکداوەتەوە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَذَكَّرُواْ﴾ واتە: یادی تۆڵەی خوداو پاداشتە چاکەکانیو بەڵێنیو هەڕەشەکانیان کردووەتەوەو تەوبەیان کردووەو پەشیمان بوونەتەوەو پەنایان بە خودا بردووەو زۆر گەڕاونەتەوە بۆلای ﴿فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾ بەرچاویان ڕوون بوەتەوە، واتە: سەقامگیربوونو بە ئاگاهاتنەوە لەوحاڵەی کە تێیدابوون.

## برا شەیتانە کانیان یارمەتیان دەدەن لە گومڕابووندا

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ﴾ برا (شەیتانە) کانیان یارمەتیان دەدەن. واتە: برا شەیتانەکانیان لە مرۆڤ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾[1] بێگومان ئەوانەی ماڵ بەفیڕۆدەدەن لە برای (شەیتانە) کانن. واتە: لە شوێنکەوتوانیو گوێگرانیو جێبەجێکەری فەرمانی شەیتانەکانن ﴿فِى يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ﴾ یارمەتیان دەدەن لەو گەمڕاییەدا. واتە: شەیتانەکان هاوکاریان دەکەنو کارئاسانیان بۆ دەکەنو ئەوخراپەیان لەبەرچاو شیرین دەکەن. ئیبنو کسیر دەڵێت: (المد) واتە: زیادبوون. واتە: کۆمەکیان دەکەن لەو گومڕاییەداو، ئەو نەفامیو بەدخویو هەڵەشەییەیان بۆ زیاتردەکەن ﴿ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ﴾ پاشان کۆتایی ناهێنن (لە گومڕاکردنیاندا) هەندێك دەڵێن: واتە بێگومان شەیتانەکان هاوکاری مرۆڤ دەکەن کە وازنەهێنن لەوکارەیانو بەردەوام بن لەسەری. وەك عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ﴾ئەڵێت: نە مرۆڤ وازدەهێنێت لەوەی کە خەریکێەتیو نە شەیتانەکانیش دەستیان لێ کۆتادەکەنو کۆڵیان لێ دەدەن[2] ﴿لَا يُقْصِرُونَ﴾ کۆڵ نادەن لەوەی کە تێیدانو خاونابنەوەو وازی لێ ناهێنن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا

---

[1] الاسراء (٢٧).

[2] الطبری (١٣/٣٣٨).

دەفەرموویت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾[1] ئایا تۆ نازانیت ئێمە شەیتانەکانمان ناردووەتەسەر خودانەناسان ختوکەو هانەهانەیان دەدەن. ئیبنو عەبباسو کەسانی تریش وتویانە: هەراسانیان دەکەنو وازیان لیٚ ناهێنن تا تووشی گوناهیان دەکەن[2].

﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾

## بتپەرستان داوای نیشانە دەکەن

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾کاتێك هیچ نیشانەیەکیان نیشان نادەیت، دەڵێن: تۆ بۆ لەخۆتەوە ڕێکی ناخەیت؟ بڵێ: من هەر لەوانە پەیڕەوی دەکەم کە لەلای پەروەردگارمەوە پێم دەگات، ئەمانە چاوڕۆشنکەرن لە پەروەردگاری ئێوەوە ڕێنیشاندەرو بەزەیین بۆ ئەوکەسانەی بەباوەڕن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا﴾ دەڵێت: ئەگەر تۆ خۆت ڕیك خستایە. جارێکی تریش دەڵێت: ئەگەر تۆ خۆت داتبهێنایەو داتبەزاندایە[3] ئیبنو جەریر لە عەبدوللای کوڕی کەسیرەوە لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ﴾ئەڵێت: ئەگەر تۆ خۆشت بتویستایە، هەندێکیش دەڵێن: ئەگەر تۆ خۆت دەرتبهێنایە[4] قەتادەو سوددیو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو ئیبنو جەریریش هەر وایان وتوە[5] مانای ئەم دەقەی کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ﴾ واتە: موعجیزەیەکی لەڕادەبەدەر وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴾[6] ئەگەر ئێمە مەیلمان لێبێت نیشانەیەکیان لە ئاسمانەوە بۆ دەنێرین کە ملیان لەبەری کەچ بکەن. ئەوانە دەڵێن بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ بۆچی هەوڵ نادەیتو داوای موعجیزە

[1] مريم (٨٣).

[2] الطبرى (١٣/٢٥٢).

[3] الطبرى (١٣/٣٤١).

[4] الطبرى (١٣/٣٤١).

[5] الطبرى (١٣/٣٤١/٣٤٢).

[6] الشعراء (٤).

لە خودا ناکەیت هەتا چاومان پێی بکەوێت بڕوای پێ بکەین. خودای گەورەش دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى﴾ بڵێ: بێگومان من هەر شوێنی ئەوە دەکەوم کە لەلای پەروەردگارمەوە پێم دەگات. واتە: من پێش خودا ناکەم لە هیچ شتێکدا. بەڵکو من شوێنی ئەوە دەکەوم کە فەرمانم پێ دەکات پێی. گێڕایەلی ئەوەم کە بۆم دەنێرێتو ناکام دەکات لێی. ئەگەر ئایەتێکی نارد قبوڵی دەکەم ئەگەر نەشی نارد من لە پێشدا داوای ناکەم مەگین خودا خۆی ئیزنم بدات لەسەری. بێگومان خودا لەکارزانی زۆرزانە. پاشان خودا ڕێیان نیشان دەدات بۆ ئەم قورئانە کە گەورەترین موعجیزەیەو ئاشکراترینو ڕاسترینو دیارترین بەڵگەیەو دەفەرمووێت: ﴿هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەم (قورئانە) بەرچاوڕۆشنیو بەڵگەیە لە پەروەردگاری ئێوەوە ڕێ نیشاندەرو بەزەییە بۆ ئەوکەسانەی خاوەنباوەڕن.

﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾﴾

**فەرماندان بە گوێگرتن لە قورئان**

خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ هەرکاتێك قورئان دەخوێندرێت گوێی لێ بگرەو بێ دەنگ بە بەڵکو بەبەزەیی بکەون. کاتێك کە خودای گەورە باسی قورئانی کردووە کە چاوڕۆشنکەرەوەو ڕێ نیشاندەرو بەزەییە بۆ خەڵکی، فەرمانیشی داوە کە گوێی لێ بگیرێت لەکاتی خوێندنیدا وەك ڕێزو مەزنی سەیرکردنێك بۆی. نەك وەك خودانەناسانی قورەیش مامەڵەی لەگەڵدا بکەن کە دەیانوت وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ﴾ گێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن قسەی بێتامی خۆتانی تێکەڵ بکەن. ئیبنو جوریر وتی ئیبنو مەسعود وتی: لە پێشدا لە نوێژدا سڵاومان لە یەکتری دەکرد کە قورئان هاتەخوارەوە فەرمووی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ ئیتر سڵاوکردنمان وازلێهێنا.

﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ﴿٢٠٦﴾﴾

**فەرماندان بە عیبادەتو یادی خودا لە بەیانیانو ئێواراندا**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ﴾ هەموو بەیانیانو ئێواران بە پاڕانەوەو ترسەوە بەبێ ئەوەی دەنگ

هەڵبڕیت یادی پەروەردگارت بکەو هەرگیز تۆ لەوانە مەبە کە بێ ئاگان. خودای گەورە فەرمان دەکات لەسەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکەیدا یادی بکرێتو عیبادەتیشی تێدابکرێتو وەك دەفەرمووێت: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾[1] هەر پەسەندیو پاکی پەروەردگاری خۆت بدە لەپێش کزنگی هەتاوداو لە دەمی ڕۆژئاوابوون. ئەم ئایەتە لەپێش ئەوەی کە پێنج نوێژەکە فەرزبکرێت لە شەوی ئیسرادا هاتووەتەخوارەوە. ئایەتێکە لە مەککە هاتووە.وە لێرەدا کە دەفەرمووێت: ﴿بِالْغُدُوِّ﴾ واتە: سەرەای ڕۆژ. ﴿وَالْآصَالِ﴾ واتە: لەکاتی ڕۆژئاوابوون. کۆی (جمع)ی (أصیل) وەك (الایمان) کۆیەکەی (یمین) بەڵام لەبارەی ﴿تَضَرُّعًا وَخِيفَةً﴾ بە پاڕانەوەو ترسەوە. واتە: یادی پەروەردگارت بکە لە دڵی خۆتدا بەهیوای بەزەییو بە ترسیشەوە، بە دەمیش بەبێ دەنگ هەڵبڕین. هەربۆیە ئەفەرمووێت:﴿وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ بێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕیت. سوننەتە یادی خودا بە هاوارو دەنگی زۆر بەرز نەکرێت، بۆیە کاتێك کە پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کردو وتیان: ئایا پەروەردگارمان نزیکە وتوێژی لەگەڵدابکەین یان دوورە هاواری لێ بکەین؟ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾[2] هەرکاتێك بەندەکام لەبارەی منەوە لەتۆ دەپرسن، من نزیکم، هەرکەسێك هانام وەبەربێنێت، بێ وەڵام نایهێڵمەوە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: خەڵکی لە هەندێك سەفەردا دەنگیان هەڵدەبڕی لە پڕانەوەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وتن: (خەڵکینە لەسەرخۆبن، خۆ ئێوە بانگی کەسێك ناکەن کەڕولاڵ بێت، ئێوە بانگی کەسێك دەکەن بیسەرو نزیکە. نزیکترە لە هەریەکێك لە ئێوە وە لە ملی وشترەکەی)[3]، مەبەست بەم فەرموودەیە هاندانە بۆ زۆر یادی خودا کردن لە هەموو بەیانیو ئێوارەیەکدا، بۆئەوەی بەندەکانی لە ڕیزی بێ ئاگایان نەبێت. هەربۆیە ستایشی ئەو فریشتنانەکراوە کە تەسبیحات دەکەن بە شەوو بە ڕۆژو وچان نادەنو ماندونابن. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ﴾ ئەوکەسانەی لای پەروەردگارتن خۆ بەزلزان نین لە پەرستنی ئەودا، هەمیشە ستایشی دەکەنو تەنها سوجدە بۆ ئەو دەبەن. بۆیە خودا بەوشێوەیە باسی کردوون تا چاویان لێ بکرێت لەو

---

[1] ق (٣٩).

[2] البقرة (١٨٦).

[3] فتح الباری (١٥٧/٦)، مسلم (٢٠٧٧/٤).

عیبادەتە زۆرو گوێڕایەڵیاندا، لەبەرئەوەیە کە سوجدەی بۆ ئێمەش ڕەوابینیوە کاتێك خودا باسی سوجدەبردنی ئەوانی کردوو بۆ خۆی. وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: (ئایا ڕیز ناوەستن وەك فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان، ڕیزەکانی یەکەم تەواودەکەنو بەدوای یەکداو پاڵدەدەن بەیەکەوە لە ڕیزدا)[1] ئەوە یەکەمین سوجدەیە کە دانراوە بۆ خوێنەرو گوێگری قورئان کە سوجدەببەن، بە ڕای گشت زانایان.

## تەفسیری سورەتی (الانفال)

## لە مەدینەدا هاتووەتەخوارەوە

سورەتی (الانفال) حەفتاوپێنج ئایەتو هەزاروشەش سەدو سیو یەك وتەو پێنج هەزارو دووسەدو نەوەدو چوار پیتە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١﴾

**مانای دەستکەوت (الانفال)**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ لە دەستکەوتی جەنگ پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: دەسکەوتی دوژمنان بۆ خوداو بۆ پێغەمبەرە. بوخاری ئەڵێت ئیبنو عەبباس ئەڵێت: ﴿ٱلۡأَنفَالُ﴾ واتە: دەستکەوتی جەنگ، پاشان ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە وتی: پرسیم لە ئیبنو عەبباس لەبارەی سورەتی (الانفال)ەوە؟ وتی: لەبارەی جەنگی بەدرەوە هاتووەتەخوارەوە[2] ئەوەی لەبارەی ئیبنو عەبباسەوە باسی کردووە، دیسان عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە کەئەڵێت: ﴿ٱلۡأَنفَالُ﴾ واتە: دەستکەوتی جەنگ، ئەم دەستکەوتە تەنیا پەیوەندی بە پێغەمبەری خوداوەیە (ﷺ) هیچ کەسێك شتێکی لەودەستکەوتەدا نیە[3] موجاهیدو عیکرمەو عەتاو زەححاكو قەتادەو عەتای خوراسانیو موقاتیلی کوڕی حەیانو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریش دەڵێن: واتە دەستکەوتی جەنگ[4] وتراوە: (النفل) ئەوشتەیە کە

---

[1] مسلم (٣٢٢/١).

[2] فتح الباری (١٥٦/٨)

[3] الطبری (٣٧٨/١٣).

[4] الطبری (٣٦٢/٣٦١/١٣).

پێشەوا دەبەخشێت بە هەندێك كەس لە دەسكەوت و هاوشێوەی دەسكەوت دوای دابەشكردنی خودی دەستكەوتەكە. وە وتراوە: ئەو پێنج یەكەیە دوای چوار بەشەكەی تر لە پێنج بەشەكە. وە وتراوە: سەرانەو دەستكەوتێكە كە لە خودانەناسان وەرگیراوە بەبێ جەنگ. وە هەر شتێك كە دەگمەنەو لێیان وەردەگیرێت دەدرێت بە موسڵمانان لە وڵاخو ئاژەڵو بەندەو كەنیزەو كەلوپەل.

### هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە سەعدی كوڕی مالیكەوەئەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمڕۆ خودا ڕزگاری كردم لە بتپەرستان، ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە، فەرمووی: (ئەم شمشێرە نە بۆ تۆیەو نە بۆ من داینێ)، وتی: دامنا، پاشان گەڕامەوە وتم: لەوانەیە ئەم شمشێرە بدات بە كەسێك وەك من هەقی خۆی پێ نەدات (دەستی پێ نەوەشێنێت) وتی: كاتێكم زانی لە پشتمەوە پیاوێك بانگم دەكات وتی: وتم لەوانەیە خودا لەبارەی منەوە شتێكی ناردبێتەوە؟ فەرمووی: تۆ داوای ئەو شمشێرەت لە من كرد، ئەو شمشێرە هی من نەبوو، بێگومان ئەوە (خودا) بەخشی بە من، ئەوە بۆ تۆ. وتی: خودای گەورەئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾[1]
ئەبوداودو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان كردووە، تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەكی چاكو ڕاستە[2].

### هۆیەكی تر لە هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبوئوسامەوە: پرسیارم لە عوبادە كرد لەبارەی دەستكەوتەوە (الانفال)؟ وتی: لەسەر ئێمە هاوەڵانی بەدر هاتەخوارەوە، كاتێك ناكۆكی كەوتە نێوانمان لەبارەی دەستكەوتەوە، ڕەوشتو بەردخودمان خراپ بوو لەسەری، خودا لە ئێمەی سەندەوەو دای بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پێغەمبەریش (ﷺ) دابەشی كرد لە نێوان موسڵماناندا بە یەكسانی[3]. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبوئومامەوەلە عوبادەی كوڕی سامیتەوەئەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووینە دەرەوەوئامادەی ڕۆژی بەدر بووم، خەڵكی بەیەك گەیشتن، واتە: شەڕ لە نێوان موسڵمانانو خودانەناسان دەستی پێكرد، خودای گەورە دوژمنی شكاند، دەستەیەك كەوتنە سەریانو ڕاویان دەنانو دەیانكوشتنو دەستەیەك ڕووی كردە لەشكرەكەو شتیان كۆكردەوە، كۆمەڵێكیش دەوری پێغەمبەریان (ﷺ) دابوو، نەوەكو لەلایەن دوژمنەكانەوە تووشی مەترسیەك ببێت. تا شەو داهاتو خەڵكەكە گەڕانەوە لای یەكتری، ئەوانەی كە تاڵانیەكەیان كۆكردبووە وتیان: ئێمە دەستمان بەسەرداگرتووەو بەشی هیچ كەسێكی تێدانیە. ئەوانەی كە

---

[1] أحمد (١٧٨/١) فەرموودیەكی سەحیحە.
[2] أبوداود (١٧٧/٣) فەرموودیەكی سەحیحە.
[3] أحمد (٣٢٢/٥) سەنەدەكانی خراپ نیە.

دەرچووبوون بەدوای دوژمندا وتیان: ئێوە لە ئێمە شایستەترنیت بەوە، ئێمە دوژمنمان لێ دوورخستنەوەو ڕاومانانو شکاندمان، ئەوانەش کە دەوری پێغەمبەری خودایان دابوو (ﷺ) وتیان: ئێوە لە ئێمە شایستەترنیت، ئێمە دەوری پێغەمبەرمان دابوو (ﷺ) ترساین لەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تووشی مەترسیەك ببێت لەلایەن دوژمنەوە، سەرقاڵ بووین پێیەوە. ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستکەوتەکەی دابەشکرد لەنێوان مسڵماناندا. کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر زەمینی دوژمندا پەلاماری بدایە دەستکەوتی چواریەك بوو کاتێك کە دەهاتەوە هەموو خەڵکی دەگەڕایەوە دەستکەوتی سێ یەك بوو، تالانی پێ ناخۆش بوو[1] وە دەیفەرموو: با خاوەنباوەڕانی بەهێز بیگێڕنەوە بۆ لاوازەکانیان. تیرمیزیو ئیبنوماجەش بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی ئەڵێت: ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی باشە[2]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ کەوایە لە خودا بترسنو پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەن. واتە: لە خودا بترسنو خۆتان بپارێزن لە کا ڕەکانتانداو پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەنو ناهەقیو دژایەتیو دەمەقاڵێ لەگەڵ یەکتری مەکەن. ئەوەی خودا پێی داون لە ڕێی ڕاستو زانیاری زۆر چاکترە لەوەی کە دژایەتی یەکتری دەکەن لەسە ری ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن. واتە: لەوەی کە دابەشی دەکات لە نێوانتاندا، بەوشێوەیەی کە خودا ویستویەتی، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) بەوشێوەیەی کە خودا فەرمانی پێداوە دابەشی دەکات بە دادگەریو ڕێكو ڕاست. ئیبنو عەبباس ئەڵێت: ئەمە تەنگهەڵچنینێکە لەلایەن خوداو پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەسەر خاوەن باوەڕان کە بترسنو پەیوەندی نێوان خۆیان چاك بکەن[3]، موجاهیدش هەر وای وتووە[4] سوددی ئەڵێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ واتە: قسە بەیەکتری مەڵێن[5] لێرەدا فەرموودەیەك باس دەکەین کە ئەبویەعلا ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو موسەنای موسڵی هێناویێتی لە موسنەدەکەیدا کە ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: کاتێك کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو کە

---

[1] أحمد (٣٢٣/٥) فەرموودیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي (٤٦٨/٨)، ابن ماجه (٩٥١/٢) فەرموودیەکی حەسەنە.

[3] الطبری (٣٨٤/١٣).

[4] الطبری (٣٨٤/١٣).

[5] الطبری (٣٨٤/١٣).

سەیرمان کرد پێدەکەنێت هەتا ددانی پیرۆزی دەرکەوت. عومەر وتی: چی پێی کەناندی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دایكو باوكم بە قوربانت بێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دوو پیاو لە ئوممەتەکەم لەبەردەستی پەروەردگاری گەورەو پاكو بێعەیبدا بەچۆکدا هاتن، یەکێکیان وتی: ئەی پەروەردگار! ئەم ناهەقیەم لەم برایە بۆ وەرگرەوە، خودای گەورە فەرمووی: ئەو ناهەقیەی براکەت بدەرەوە کە لێت کردووە، ووتی: ئەی پەروەردگار! هیچ شتێك لە چاکەکانم نەماوەتەوە، وتی: پەروەردگار با لەباتی من لە تاوانەکانم هەلگرێت)، وتی: چاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاوی پێدا هاتەخوار بەگریانو پاشان فەرمووی: (بێگومان ئەوە لە ڕۆژێکی زۆر گەورەدایە، ڕۆژێکە خەڵکی پێویستی بەوەیە کەسێك لەباتی ئەوان هەندێك لە تاوانەکانی بگرێتە ئەستۆ خۆی. خودای گەورە دەفەرمووێت بەو داواکارە: چاوت بەرزبکەرەوەو سەیری ئەو باخانە بکە، سەری بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگار چەند شارێك دەبینم لە زیوو چەند کۆشکێك لە زێڕ کە ڕازاوەتەوە بە مرواری، ئەمە بۆ چ پێغەمبەرێکە؟ ئەمە بۆ چ ڕاستگۆیەکە؟ ئەمە بۆ چ شەهیدێکە؟ خودای گەورەدەفەرمووێت: ئەمە بۆ ئەوکەسەیە نرخەکەی بدات. وتی: ئەی پەروەردگار کێ ئەوە وەدەست دێنێت؟ فەرمووی: تۆ دەتوانێت وەدەستی بێنیت. وتی: چۆن ئەی پەروەردگار؟ فەرمووی: خۆش ببیت لە براکەت. وتی: ئەی پەروەردگار! ئەوا من لێی خۆش بووم، خودای گەورە فەرمووی: دەستی براکەت بگرەو بیخەرە بەهەشت)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە خودا بترسنو نێوان خۆتان چاك بکەن، بێگومان خودای گەورەئاشتەوایی دەخاتە نێوان خاوەنباوەڕان لە ڕۆژی قیامەتدا).

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾

## نیشانەکانی بڕوادارە ڕاستگۆیەکان

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ خاوەن بڕوا ئەو کەسانەن هەر کەناوی خودا برا دڵیان ترسی لێ دەنیشێتو کەنیشانەکانی ئەویان بۆ دەخوێنن بڕوایان بەهێز دەبێتو بەتەواوی خۆیان بە پەروەردگاریان دەسپێرن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێن: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ وتی: دووڕووەکان هیچ شتێك لەیادی خودا ناچێتە دڵیان لەکاتی بەجێ هێنانی فەرزەکاندا، وە بڕوایان بەهیچ نیشانەیەکی خودا نیەو خۆیانی پێ ناسپێرنو

کاتێکیش دیارنەبن نوێژ ناکەنو زەکاتیش لەماڵەکانیان دەرناکەن. خودای گەورە باسی کردوونو فەرموویەتی ئەوانە بڕوادارنین. پاشان وەسفی خاوەنباوەڕانی کردووەو ئەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ فەرزەکانیان بەجێ هێناوە ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾ دەفەرموویێت بڕوایان زیاتر دەبێت ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ بەتەواوی خۆیان بەخودا دەسپێرنو هیوایان بەکەسی تر نیە[1]. موجاهیدئەڵێت: ﴿وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان دادەچڵەکێتو دەترسن[2] سوددیو کەسانی تریش هەروایان وتووە، ئەمە نیشانەی بڕواداری ڕاستە ئەو بڕوادارەی کە کاتێك یادی خودای کرد ترس لەدڵی دەنیشێت.[3] واتە: لەخودا دەترسێت فەرمانەکانی بەجێ دێنێتو دور دەکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾[4] ئەو کەسانەی کاتێك کاری خراپ دەکەن، یان ناهەقی لەخۆ دەکەن خودا لەبیر نابەنەوەو لەبەری دەپاڕێنەوە لەخەتاکانیان ببورێت، بێجگە لەخوداش کێ گوناهان دەبورێت؟ جا ئەوانە لەهەر کارێك کەزانیویانە هەڵەیە، پێ داگرنین، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموویێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ۝٤٠ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾[5] بەلام کەسێك لە گەورەیی پەروەردگاری خۆی ترساوەو لە ئارەزووی دڵی خۆی وازی هێناوە، دیارە بەهەشت شوێنی ئەوە. هەر بۆیە سوفیانی سەوری وتی: بیستم لە سوددی لەم ئایەتەدا ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دەیوت: ئەوە پیاوێکە دەیەوێت ناهەقیەك بکات، یان گەرەکیە گوناهێك بکات، پێی دەوترێت: لەخودا بترسە، دڵی ڕادەچڵەکێتو دەترسێت.

### کاتێك ئایەتەکانی قورئان خوێنرا بڕوا زیاد دەکاتو بەهێز دەبێت

خودای گەورەدەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾ کە نیشانەکانی ئەویان بۆ دەخوێنرێت، بڕوایان بەهێزتر دەبێت، وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا مَآ

---

[1] الطبری (٣٨٦/١٣).

[2] الطبری (٣٨٦/١٣).

[3] الطبری (٣٨٦/١٣).

[4] ال عمران (١٣٥).

[5] النازعات (٤٠-٤١).

أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾[1] کاتێك سورەتێك دێتە خوار، هی وایان لەناو دایە، دەڵێت: کێتان بڕوای پێبتەو تر بووە؟ جا ئەوانەی بڕوایان بەخودا هێناوە باوەڕیان بەهێزتر دەبێتو خۆشحاڵ دەبن. بوخاریو کەسانی تریش لەپێشەوایان ئەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر بەهێزبوونو زیادبونی باوەڕو جیاوازی لەدڵەکاندا. ئەمەش ڕاو بۆچونی زۆرینەی ئەم ئوممەتەیە، بەڵکو زۆرێك لە پێشەوایانی ئەم ئوممەتە دەڵێن کۆی زانایانی ئەم ئوممەتەی لەسەرە، وەك شافیعیو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو ئەبو عوبەیدە، وەك لەسەرەتای شەرحی بوخاریدا ئەوەمان بەباشی ڕوون کردووەتەوە. سوپاسو ستایش هەر بۆ خودای گەورە.

### باسی خۆ سپاردن بەخودای گەورە

﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ خۆیان بە پەروەردگاریان دەسپێرن. واتە: بەتەمای کەس نین بێجگە لە خودا، تەنیا مەبەستیان خودایەو هانا نابەنە بەر کەس بیجگە لەو، داوای پێویستیەکانیان هەر لەو دەکەن، دڵیان بەو خۆشەو دەزانن مەیلی لەهەر شتێك بوبێت بووە، مەیلیشی لەهەر شتێك نەبوبێت نەبووە، هەر خودا خۆی دەستەڵاتدارە لە موڵکەکانیانو شەریکی نیە، کەس دەستی وەرناداتە فەرمانیو لێپرسینەوەی خێرایە، هەر بۆیە سەعیدی کوڕی جوبەیرئەڵێت: خۆ بەخودا سپاردن کۆی بڕوایە.

### باسی کارەکانی خاوەنباوەڕان

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ ئەوانەن کە نوێژ دەکەنو لەو بژێویەی بەشمان داون دەبەخشن. خودای گەورە ئاماژە بەوە دەکات لەسەر ئاکارەکانیان دوای ئەوەی کە باسی بیرو باوەڕی کردوون. ئەم کردارانەش هەموو جۆرە چاکەکان دەگرێتەوە، لەوانە بەجێهێنانی نوێژەکانی خودای گەورەیە، قەتادە وتی: بەجێهێنانی نوێژ، واتە: پارێزگاری کردن لە کاتەکانیو دەستنوێژو کڕنوشو سوجدەکانی[2] موقاتیلی کوڕی حەیان ئەڵێت: جێبەجێکردنی نوێژ، واتە: پارێزگاری لە کاتەکانیو دەستنوێژهەڵگرتنی پاکو تەواو ڕکوعو سوجدەی ڕێكوپێكو خوێندنی قورئان تێیداو شایەتومانو سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەمە بەجێهێنانی نوێژە.[3] ماڵ بەخشین لەو بژێوەی خودا پێی بەخشیون. زەکات دان گشت هەقەکانی تری خەڵکی دەگرێتەوە لە فەرزو

---

[1] التوبة (١٢٤).

[2] ابن أبي حاتم (٣٧/١).

[3] ابن أبي حاتم (٣٧/١).

سوننەتەکان، چونکە هەموو خەڵك خودا بژێویدەریانە، خۆشەویسترینیان لەلای خودا بەسودترینیانە بۆ بەندەکانی.

**باسی ڕاستی باوەڕ**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ ﴾ ئەوانە بڕوادارانی ڕاستەقینەن. واتە: ئەوانەی کە هەڵدەستن بەم ڕەوشتانە خاوەنباوەڕی ڕاستو تەواون.

**بەرووبوومی باوەڕی تەواو**

خودای گەورەدەفەرمووێت: ﴿لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ ﴾ لەلای پەروەردگاریان پلەو پایەی چاکیان هەیە. واتە: شوێنو جێگەو پلەو پایەی پەسەندیان دەبێت لەو باخانەدا. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ هُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴾[1] (چاکەکاران خراپەکاران) بۆ هەموویان خودا چەند پلەی داناوە، خودا خۆی چاودێرە بەوەی کە دەیکەن. ﴿وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴾ لێ خۆشبوونو بژێوی پەسەندیان هەیە. واتە: لە تاوانەکانیان دەبورێتو ڕێزیشیان لێ دەگرێت لەسەر چاکەکان. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرمووێت: (بێگومان خەڵکی (علیین) ئەوانەی لە خواری ئەوانەوەن دەیانبینن وەك چۆن ئێوە ئەو ئەستێرەیە دەبینن کە بەرەو ئاوابوون دەچێت لە ئاسۆی ئاسماندا)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە پلەو پایەی پێغەمبەرانە جگە لەوان کەس پێی ناگات. فەرمووی: (بەڵێ سوێند بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە پیاوانێکن باوەڕیان بە خودا هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیوە)[2] پێیان دەگەن. وە لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی ئەحمەدو زانایانی تری فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوعەتیەوە لە ئیبنو ئەبی سەعیدەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خەڵکی بەهەشت خەڵکی پلەوپایە بەرزەکان دەبینن، وەك چۆن ئێوە ئەستێرە دەبینن بەرەو ئاوابوون دەچێت لە ئاسۆی ئاسماندا، وە ئەبوبەکرو عومەریش لەوکەسانەن، ئەو چاکەیان بەرکەوتووە)[3].

﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ۝٦ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ

---

[1] ال عمران (١٦٣).

[2] فتح الباری (٦/٣٦٨)، مسلم (٤/٢١٧٧).

[3] أحمد (٣/٦١)، أبوداود (٤/٢٨٧)، تحفة الاحوذي (٨/١٤٢)، ابن ماجه (١/٣٧) فەرموودەیەکی لاوازە.

أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾
لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾ ﴾

**شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) مایەی چاکەیە بۆ باوەڕداران**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ
﴿٥﴾ يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى
ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ
وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ هەروەك ئەوەی
پەروەردگارت (بە ڕاستی) تۆی لە ماڵی خۆت هێنایەدەر هەندێکیشلە باوەڕداران ناڕازی بوون، لەپاش ڕاستی ڕوونبوونەوەش، ئەوان کێشمەت لەگەڵ دەکەن، وەك بە ئاشکرا ببینن کە بەرەو مردنیان ڕاپێچ دەکەی، ئەوس خودا بەڵێنی پێدان کە یەکێك لەو دوو کۆمەڵە بۆ ئێوەیە، ئێوە هەر ئارەزووتان بوو دەستە بێ دەسەڵاتەکە بۆ ئێوە بێت. خوداش دەیەوێت ووتەکانی خۆی بەڕاست دەربچێت و خودانەناسان بنەبڕ بکات. تا ڕاستی سەقامگیر بکات و پووچ و چرووك لەناو بەرێت، هەرچەندە تاوانبارەکان حەزی لێ ناکەن. تەبەری وتی: زانایانی تەفسیر ڕایان جیاوازی لەهۆکاری هێنانی ئەم کافە (الکاف) لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ﴾ هەندێکیان دەڵێن: وەك لێچوونێك لەنێوان ئەم دوو ڕوداوەدا هاتووە بۆ ڕێکخستنی خاوەنباوەڕان، تا لەخودای خۆیان بترسن و ناکۆکی لەنێوان خۆیاندا نەهێڵن و گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بن (ﷺ) ئەمە مانای ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: وەك ئەوکاتەی ئێوە کە ناکۆك بوون لەناو خۆتاندا لەسەر دەستکەوت و هەرکەسە بۆخۆی کۆ دەکردەوە، خودا لە دەستی ئێوەی سەندەوە و دای بە پێغەمبەری (ﷺ) ئەویش بە دادو یەکسانی دابەشی کرد، ئا ئەوە لەبەرژەوەندی تەواوی ئێوە بوو، هەر بەو شێوەیەش کاتێك کە حەزتان لەدەرچوون و ڕوو بەڕووی دوژمنی چەکدار نەدەکرد (ئەوانە دەرچوون و ڕۆیشتن بۆ یارمەتی دانی ئاینەکەیان و وەدەست هێنانی کاروانە بازرگانیەکەی قورەیش)، ئەوەش سەرەنجامی ئەو حەز نەکردنەتان بوو لەو شەڕە، بەڵام خودا بڕیاری داو بەو هۆیەوە خودا ئێوەو ئەوانی ڕوو بەڕووکردەوە بەبێ ئەوەی کات دیاری بکرێت، هەتا ببێتە هۆی شارەزایی و ڕێنمایی و یارمەتی و سەرکەوتن بۆتان. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن

تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾[1]
غەزاتان لەسەر نوسراوە، هەر چەندە خۆشتان لێی نایە، لەوانەیە حەز لەشتێك نەكەن بەڵام (ئەو شتە) بەخێر بگەڕێت بۆتان لەوانەشە ئاوات بۆ شتێك بخوازن كە ئاكامەكەی باش نەبێت، خودا(خۆی) دەزانێت و ئێوە سەری لێ دەرناكەن ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴾ سوددی ئەڵێت: هەندێك لە باوەڕداران حەزیان نەدەكرد ڕوو بەڕووی بتپەرستان ببنەوە ﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ ﴾ لەپاش ڕاستی ڕوون بوونەوەش ئەوان كێشەت لەگەڵ دەكەن. هەندێك لە زانایانی تەفسیر دەڵێن: لەبارەی دەستكەوتەوە پرسیارت لێ دەكەن و مشتومڕت لەگەڵدا دەكەن. وەك چۆن لە ڕۆژی بەدردا كردیان لەگەڵتدا. وتیان: تۆ دەرت كردووین بۆ كاروانەكە، كەچی فێری جەنگت نەكردوین تا خۆمانی بۆ ئامادە بكەین؟ ﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾ خودا دەیەوێت ووتەكانی خۆی بەڕاست دەربچێت. واتە: خودا دەیەوێت ئێوەو ئەو كۆمەڵەی كە دەستەڵاتدارو شەڕ كەرن ڕوو بەڕوو بكاتەوە بۆ ئەوەی زاڵ بن و سەركەون بەسەریاندا، ئاینەكەی دەركەوێت و ووتەی ئیسلام بەرز ببێتەوەو سەركەوتوو بێت بەسەر ئاینەكانی تردا. خودا خۆی ئاكامی شتەكان باشتر دەزانێت و چاكتر كارەكانتان بۆ پێك دێنێت.

هەرچەندە بەندەكان پێچەوانەی ئەوەیان حەز لێیە كە دێتە ڕێیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ﴾[2] موحەممەدی كوڕی ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیستی كە ئەبو سوفیان لەشامەوە دێت موسوڵمانانی بۆ ئامادە كردو فەرمووی ئەوە كاروانەكەی قورەیشە كەماڵ و سامانی ئەوانیشی تێدایە، بڕۆن بۆی بەڵكو ئەمە خودایە بكەوێتە دەستی ئێوە، خەڵكی خۆیان ئامادەكرد، هەندێكیان پێیان باش بوو هەندێكیشیان بەلایانەوە گران بوو، چونكە وایان نەدەزانی كە پێغەمبەری خودا(ﷺ)تووشی شەڕ دەبێت. كاتێك ئەبو سوفیان نزیكی حیجاز بووەوە هەوڵی دەدا دەنگو باس كۆبكاتەوە، بگەیشتایە بەهەر ڕێبوارێك پرسیاری لێدەكرد، لەترسی ئەوەی نەكا خەڵكی تووشی شتێكی بكەن، هەتا هەواڵێكی چاكی دەستكەوت لەهەندێك ڕێبوارەوە كە موحەممەد(ﷺ) هاوەڵەكانی ئامادەكردووە بۆ خۆی و كاروانەكەی. بۆیە هەوڵی خۆپاراستنی داو زەمزەمی كوڕی عەمری غەففاری بەكرێ گرت و ڕەوانەی كرد بۆ لای خەڵكی مەككەو فەرمانی پێدا كە بچێتە لای قورەیش و ئاگاداریان بكات كە فریایی ماڵ و سامانەكەیان بكەون و هەواڵیان بداتێ كە موحەممەدو (ﷺ)

---

[1] البقرة (٢١٦).

[2] البقرة (٢١٦).

هاوەڵەکانی ڕێیا لە کاروانەکەی گرتووە زەمزەمی کوڕی عەمر بەپەلە خۆی گەیاندە مەککە. پێغەمبەری خوداش لەگەڵ هاوەڵەکانیان دەچوون هەتا گەیشتنە شیوێك کە پێی دەوترا زەخران لەوێش دەرچوو کەمێکی مابوو لەناوچەکە دەربچن دەبەزینو هەواڵیان دایە کە قورەیش بەڕێوەن بۆ ئەوەی نەیەڵن بەر کاروانەکەیان بگیرێت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕوێژی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کردو هەواڵی قورەیشی پێدان. ئەبو بەکر هەستاو قسەی چاکی کرد، عومەر هەستاو قسەی باشی کرد، پاشان میقدادی کوڕی عەمر هەستاو وتی: بڕۆ بۆ ئەوەی کە خودا فەرمانی داوە پێت، ئێمە لەگەڵتاین سوێند بەخودا، ئەوەت پێ ناڵێین کە نەوەی ئیسرائیل وتیان بە مووسا (سەلامی خودای لێبێت) ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾[1] کەواتە خۆتو پەروەردگارت بچن شەڕیان لەگەڵ بکەن وا ئێمە لێرە دانیشتووین بەڵکو خۆتو پەروەردگارت بچن شەڕ بکەن ئێمەش لەگەڵ ئێوەین دەجەنگین، سوێند بەو کەسەی کەتۆی بەهەق ناردووە ئەگەر تۆ ئێمە بەری بۆ بیرکولغوماد شارێکی حەبەشیەکانە ئێمە لەگەڵتاین دواناکەوین تا پێی دەگەیت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وت: زۆر باشەو دووعای خێری بۆ کرد، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ( ئەی خەڵکینە گوێم بۆ بگرن (ئاگاتان لێم بێت))، بێگومان مەبەستی ئەنساریەکان بوو، چونکە ئەوانە ژمارەیەکی زۆر بوون لەو خەڵکە، کاتێك کە پەیمانیان لەگەڵ بەست لە عەقەبە وتیان: ئێمە لەژێر سایەی تۆ دانین تا دێیتە لای ئێمە، کاتێك کە گەیشتیە لامان تۆ لە سایەی ئێمەدای پارێزگاریت لێدەکەین وەك چۆن پارێزگاری لە ماڵو منداڵی خۆمان دەکەین. پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەوە دەترسا کە بەئەرکی خۆیانی نەزانن یارمەتی بدەن جگە لەو دوژمنەی کە هێرش بکاتە سەر مەدینە. وە ئەوەشیان لەسەر نیە کە بیانبات بۆ بەر هیچ دوژمنێك لە وڵاتی خۆیاندا. کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی فەرموو. سەعدی کوڕی مەعاز پێی وت: بەڕاستی ئێمە بڕوامان بەتۆ کردو بەڕاستمان زانیتو شایەتیشمان دا کە ئەوەی تۆ پێی هاتوی هەر ئەوە هەقەو لەسەر ئەوەش پەیمانو بەڵێنی خۆمان پێداوی کە گوێڕایەڵو مل کەچ بین. فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕۆ بەرەو ئەوەی کە خودا فەرمانی پێکردووی. سوێند بەو کەسەی کە تۆی ڕەوانەکردووە بەو ڕاستیە، ئەگەر بەرەو ئەو دەریایە بمانبەیت لێی بدەی ئێمە لەگەڵتا لێی دەدەین، یەك کەس لەئێمە لێی دواناکەوێت، بەڵکو خودا ئەوەت پیشان بدات لە ئێمەوە چاوت پێی ڕوون بێتەوە. بە پشتو پەنای خودا بەڕێمان بکە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو بەقسەکانی سەعدو پێی گەشایەوە، پاشان فەرمووی: (بەپشتو پەنای خودا بڕۆنو مژدە بێت لێتان بێگومان خودا بەڵێنی یەکێك لەم دوو کۆمەڵەی پێداوم، سوێند بەخودا وەك ئەوەی من ئێستا سەیری

[1] المائدة (٢٤).

شوێن کەوتنی (مردنی) ئەو کۆمەڵە بکەم وایە)[1]، عەوفیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە هەر بەم شێوەیە[2] سوددیو قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینەو پاشینەش هەروایا وتووە[3] وتەکانی ئەوانمان کورت کردوەتەوەو بە ڕیوایەتەکەی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق کۆتایمان پێ هێناوە.

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾

## هانا بردنی موسوڵمانان و بەهانا چوونی خودا بۆیان و ناردنی فریشتە بۆیان

کاتێك کە هاناتان بۆ پەروەردگارتان برد، خوداش هات بە هاناتانەوە،فەرمووی: ئەوا بەشوێن یەکدا هەزار فریشتە دەنێرم بۆ یارمەتیتان. بوخاری لە کتێبی (المغازی) یەکەیدا لەوبەشەدا کە خوای گەورەدەفەرمووێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ﴾ تا دەگاتە ئەوشوێنەی کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: دیمەنێکم بینی لە میقدادی کوڕی ئەسرەدەوە هاوەڵیەکەی ئەوم لەلا خۆشەویستربوو لە هەرشتێکی تر لە جێگەیدا (لە هەموو دونیادا کە پێی بگۆڕمەوە) کە هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای لە بتپەرستەکان کرد، میقداد وتی: ئێمە وەك ئەوە ناڵێین کە گەلی مووسا وتیان: ﴿اذهب أنت وربك فقاتلا﴾ تۆ خۆتو پەروەردگارت بچن شەڕیان لەگەڵدا بکەن. بەڵکو ئێمە شەڕدەکەین لەلای ڕاستەوەو لەلای چەپتەوەو لەبەردەستتداو لە دواشتەوە، وتی: پێغەمبەرم (ﷺ) بینی ڕووی درەوشایەوەو قسەکەی پێ خۆش بوو[4] پاشان ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی: (ئەی خودایە داوات لێ دەکەم بەڵێنو پەیمانی خۆتە، ئەگەر ویستت لێبێت (ئەکم کۆمەڵە لەناوبەریت) ناپەرستریێت)، واتە: لەسەر ئەم ئاینە کەس ناتپەرستێت. ئەبوبەکر دەستی پێغەمبەری گرتو وتی: بەستە، هاتەدەرو هەر دەیفەرموو: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾[5] بەمزوانە ئەو کۆمەڵە لە شەڕ دەشکێتو پشت هەڵدەکەنو ڕادەکەن. نەسائیش ڕیوایەتی کردووە.[6] پاشان خوای گەورەدەفەرمووێت: ﴿بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ

[1] الطبری (١٣/٣٩٩).
[2] الطبری (١٣/٤٠٣).
[3] الطبری (١٣/٤٠٢/٤٠٥).
[4] فتح الباری (٧/٣٣٥).
[5] القمر (٤٥).
[6] فتح الباری (٧/٣٣٥)، النسائي في الكبرى (٦/٤٧٧).

﴿مُرۡدِفِينَ﴾ ئەوا بەشوێن یەكدا هەزار فریشتە دەنێرم. واتە: هەندێك بەشوێن هەندێكیدا، وەك هاروونی كوڕی عەنتەرە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: ﴿مُرۡدِفِينَ﴾ واتە: بەشوێن یەكدا.[1] عەلی كوڕی ئەبوتەلحە ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەبباسەوەئەڵێت: خودا یارمەتی نارد بۆ پێغەمبەرەكەی و(ﷺ) خاوەنباوەڕان بە هزار فریشتە، جوبرەئیل بە پێنج سەد فریشتەی قەلغان پۆشەوەو میكائیلیش بە پێنج سەدی قەلغان پۆشەوە.[2] ئیمام ئەبوجەعفەری كوڕی جەریرو موسلیم فەرموودەیەكەیان ڕیوایەت كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لە عومەرەوە.[3] ئەم دەقەی تێدایە: لەوڕۆژەدا پیاوێك لە موسڵمانەكان ڕایكرد بەشوێن یەكێك لە بت پەرستەكاندا لە پشتیەوەبوو، لەناكاو لە سەریەوە گوێی لە شەقەی قامچیەكو دەنگی ئەسپ سوارێك بوو، سوارەكەش دەیوت: حەیزوم هەڵمەت بەرە، كە سەیری بت پەرستەكەی كرد لەپشت كەوت، تەماشای كرد لووتی زامداربووەو هەڵدڕاوە بە ئەندازەی بەكەوتنی قامچیەك كە هەموو ئەوانە سەوز هەڵگەڕابوون، دوایی ئەنساریەكە هاتەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بۆگێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ڕاست دەكەیت ئەوە یا رمەتیو پشتگیری فریشتەكانی ئاسمانی سێهەم لەوڕۆژەدا حەتایان كوشتووەو حەفتاشیان دەست بەسەركردووە)[4]، بوخاری لە بەشی (ئامادەبوونی فریشتەكان لە بەدردا) ڕیوایەتی كردووە لە ڕەفاعەی كوڕی ڕافعی زورەقیەوە، كە خەڵكی بەدر بوو وتی: جوبرەئیل هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: چۆن سەیری خەڵكی بەدر دەكەن لە ناو خۆتاندا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە چاكترینی موسڵمانانن یان قسەیەكی بەوشێوەیەی كرد: (جوبرەئیل) وتی: ئەوانەش لە فریشتەكان ئامادەبوون هەروەهان[5] تەنیا بوخاری خۆی هێناویەتی. وە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی بە عومەر كاتێك وتوێژی لەگەڵدا كرد لەبارەی كوشتنی حاتبی كوڕی بەلقەعەوە: (بێگومان ئەو (حاتەب) ئامادەی بەدربووە تۆ چوزانیت لەوانەیە خودا ئاگاداربوو بێت بەسەر خەڵكی بەدرداو فەرموو بێتی: هەرچی دەكەن بیكەن من خۆش بووم لێتان[6] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡ﴾ خودا ئەو بەڵێنەشی هە ربۆیە پێدان، تا مژدەیەك بێت بۆتانو دڵەكانتان پێی ئارام بگرێت. ئەگینا

---

[1] الطبری (١٣/٤١٢).
[2] الطبری (١٣/٤٢٣).
[3] الطبری (١٣/٤٠٩)، مسلم (٣/١٣٨٣).
[4] مسلم (٣/١٣٨٤).
[5] فتح الباری (٧/٣٦٢).
[6] فتح الباری (٧/٣٥٥)، مسلم (٤/١٩٤١).

خودا توانای هەیە سەرتان بخاتبەسەر دوژمنەکانتانداو دڵەکانتان ئۆقرەبگرێت پێی سەرکەوتنیش تەنیا هەر لەلای خوداوەیە، هەربۆیە دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ یارمەتیش هەر لە خوداوەیە. وەم لە چەند ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ﴿٥﴾ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ﴾[1] هەرکاتێك تووشی ئەو بێ باوەڕانە بوون لە ملیان بدەن، پاش نجڕنجڕکردنیان شەکەتیان دەن، ئەوسا یان هەر بە چاکە ئازادیان بکەن، یان بەرخوێنیان لێ بسێنن، تا شەڕ کۆتایی پێ دێت، ئەگەر خودا بیویستایە بۆ خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن. بەڵام ویستی بە یەکتری تاقیتان بکاتەوە، ئەوکەسانەش کە لە ڕێی خودادا کوژران کردەوەکانیان بەفیڕۆنادات. بەمزوانە ڕێگەیان پێ نیشان دەداتو کاروباری ژیانیان بۆ چاك دەکات. دەشیانخاتە ئەو بەهەشتەی کە پێشەکی بۆی باس کردوون. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[2] ئێمە ئاوا لەناو خەڵکدا زەمانە وەستاو دەست پێدەکەین، تا خودا خاوەنباوەڕان بناسێتو کەسانێکیش بۆ شایەتی لە نێوانتاندا هەڵدەبژێرێت. خودا ناهەقیکارانی خۆشناوێت. هەتا خودا باوەڕداران هەڵاوێرێتو بێ باوەڕان لەناوبەرێت. ئەمە بڕیا ری شەرعی خودایە کە بێباوەڕان دەبێت جیهادبکرێن بە دەستی خاوەنباوەڕان. هەربۆیە خودای گەورە ئەو گەلە پێشوانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردووە تۆڵەی لێ سەندنو تووشی بەڵای گشتگیری کردوون وەك چۆن هۆزی نوح بە تۆفانو باوباران لەناوبردو عادی یەکەمیشی بە ڕەشەبا لەناوبرد، سەمودیش بە دەنگی بەرز و هۆزی لووتیش بە ڕۆچوون بە زەمینداو هەڵگەڕانەوەو بەردەبارانە بە قوڕی سواوی ڕەشو هۆزی شوعەیبیش بە هەورو هەمووی لەناوبردن. کاتێك کە خودای گەورە مووسای ڕەوانەکردو فیرعەونی دوژمنیو هۆزەکەی لەناوبرد بە خنکاندن لە دەریادا پاشان تەوراتی بۆ مووسا نارد، فەرمانی جەنگی لەگەڵ خودانەناساندا لە تەوراتدا پێدائەوبڕاوە لە ئاینەکانی تریشدا بەردەوام هەرمایەوە لە دوای مووساش. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ﴾[3] لەپاش

---

[1] محمد (٤- ٦).

[2] ال عمران (١٤٠- ١٤١).

[3] القصص (٤٣).

ئەوەی چین‌و بەرەکانی پێشومان قرتێخستنێمە ئەو کتێبەمان دا بە مووسا کە بۆ مەردووم ببێتەهۆی چاورۆشنی. کوشتنی خودانەناسان بە دەستی خاوەنباوەڕان چاکترین سوکایەتی پێکردنە، زۆر باشیش دڵی خاوەنباوەڕان ئاودەخواتەوەو پێی دادەمرکێت. وەك خودای گەورە دەفەرموێت بە خاوەنباوەڕانی ئەم ئوممەتە: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴾[1] ئێوە بچن بەگژیاندا، خودا هەر بەدەستی خۆی ئەوان تووشی ئازار دەکات‌و ژێریان دەخات‌و سەرتان دەخات بەسەریانداو کارێك دەکات دڵ خاوەنباوەڕان ئارام بگرێت. هە ربۆیە کوشتنی گەورەپیاوانی قورەیش بە دەستی ئەو دوژمنانەکە بە چاوی سوك سەیریان دەکرن‌و زۆر داخ‌و کەسەربوو بۆیان‌و دڵخۆشیش بوو بۆ کۆمەڵی خاوەنباوەڕان. بێگومان کوژرانی ئەبوجەهل لە ململانێی جەنگ‌و گەرمەی شەڕدا گەورەترین سوکایەتیە بۆی لە مردنی سەرجێگەی بە نەعرەتە یان بە هەورە تریشقە یان هەر شتێکی تر. وەك چۆن ئەبولەهەب بە نەخۆشی زیپکە (عەدەسە) مرد (لەعنەتی خودای لێبێت) نەخۆشیەکە وەك چاوەقوڵە وایە، بەشێوەیەك کە هیچ کەسێك لە خزمەکانی نەیتوانی لێی نزیك بێتەوە. بەڵکو لەدوورەوە ئاویان بۆ هەڵدەداو بە بەردباران لە گۆڕەکەیدا دایانپۆشی. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ﴾ خودا خاوەنی دەسەڵاتە. واتە: دەسەڵات هەر بۆ خودایەو سەریەرزی بۆ پێغەمبەرو (ﷺ) بڕوادارانە لە دونیاو لە قیامەتدا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ﴾[2] بێگومان ئێمە پێغەمبەران‌و ئەوکەسانەی کە بڕوایان هێناوە لە ژیانی ئەم دونیایەداو لەوڕۆژەدا کە شایەتان ڕاست دەبنەوە یارمەتی دەدەین ﴿حَكِيمٌ﴾ لەکارزانە. لەوەی کە بڕیا ری داوە شەڕبکرێت دژی خودانەناسان، لەگەڵ ئەوەشدا دەیتوانی لەناویان ببات‌و قڕیان تێبخات بە هێزو دەسەڵاتی خۆی، پاکی‌و بێعەیبی هەر بۆ خودا خۆیەتی.

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِى رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّى مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ

---

[1] التوبة (١٤).

[2] غافر (٥١).

بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾
ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾

**موسڵمانان لە ڕۆژی بەدردا خەویان لیٚ کەوت**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویٚت: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴾ ئەوکاتەشـــــتان لەبیربیٚت وا ئەو سوکەخەوەی لەلای خۆیە هیٚنا بەسەرتاندا کە بووەهۆی دڵنیایتان. بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن تا خاویٚنتان بکاتەوەو خەیاڵی شەیتانتان لیٚ دووربخاتو دڵگەرمتان بکاتو لە مەیدانی جەنگدا پیٚیەکانتان سەقامیربکات. خودا فریشتەی تیٚگەیاند کە : خۆشم لەگەڵ ئیٚوەدام، غیرەت وەبەر خاوەنباوەڕان بیٚنن. منیس ترس وەبەر خودانەناسان دیٚنم، سا ئیٚوە لە ملیان بدەنو هەموو سەرەپەنجەکانیشیان بپەڕیٚنن. چونکە ئەوانە بەهەڵستی خوداو پیٚغەمبەر وەستاون. هەرکەسیٚك دژی خوداو پیٚغەمبەربیٚت، خودا بەتوندی سزای دەدات. خودای گەورەباسی ئەو بەهرەی خۆی دەکات کە پیٚی دان ئەوەش هیٚنانی خەوبوو بەسەریانداو دڵنیاییەك بوو ئاسودەی کردن لەوترسەی کە چوبووەدڵیانەوە بەهۆی زۆری ژمارەی دوژمنو کەمی ژمارەی خۆیانەوە. دیسا خودا ئەوەی لەڕۆژی ئوحودیشدا بەسەرهیٚنان وەك دەفەرموویٚت: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ ﴾[1] پاش ئەوخەمە ئارامیەکی ناردەسەرتان، کە بریتی بوو لە ئۆقرەی خەولیٚ کەوتن، بەسەر هەندیٚکتاندا هات، هەندیٚکیشتان هەرتەنیا خۆی لەبیربوو، ئەبوتەلحە وتی: من یەکیٚك بووم لەوانەی کە لەڕۆژی ئوحودا خەوم لیٚ کەوت. شمشیٚرەکەم چەندجار کەوتەخوار لەدەستم، دەکەوتو هەڵم دەگرتەوە، دەکەوتو هەڵم دەگرتەوە. من سەیرم کردن ئەوانە لەژیٚر حەجەفدا ڕاکشابوون. ئەبویەعلا ڕیوایەتی کردووە لە عەلیەوە (ڕەزای خودای لیٚبیٚت) وتی: ئەشپ سوارمان تیٚدانەبوو جگە لە میقداد لەڕۆژی بەدردا، ئەگەر چاوت پیٚمان بکەوتایە کەسیٚکمان تیٚدانەبوو مەگین خەوتبوو، جگە لە پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) لەژیٚر درەختیٚکدا نویٚژی دەکردو هەر دەگریا هەتا

---

[1] ال عمران (١٥٤).

ڕۆژی کردەوە[1] لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە وتی: خەو لە جەنگدا ئارامیەکە لەلایەن خوداوە، بەڵام لە نوێژدا لە شەیتانەوەیە.[2] قەتادە وتی: وەنەوز لەسەردایەو خەو لەدڵدایە.[3] منیش دەڵێم: گومانی تێدانیەو زۆر مەشهورە کە لەڕۆژی ئوحودا خەو دایگرتن، بەڵام ئەم ئایەتە پیرۆزە لەمیانەی بەسەرهاتی بەدردا بووەو بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەوخەوە لە بەدریشدا دایگرتوون. وەك ئەوەی کە ئەوخەوە لەکاتی ناڕەحەتیدا هاتووە بەسەر بڕواداراندا، بۆئەوەی دڵەکانیان ئارامو بتەوبێت بە یارمەتی خودا، ئەمەش لە ڕێزو سۆزو بەزەیی‌و بەهرەی خودا خۆیەتی کە داویەتی بە خاوەنباوەڕان. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾[4] لەپاش تەنگانە ئاسانکاری هەیە. بۆیە لە فە رموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك کە لەوکەپرەدا لەگەڵ ئەبوبەکردا (ڕەزای خودای لێبێت) هەردووکیان دەپاڕانەوەو پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەنەوزێك بردیەوەو پاشان بە پێکەنینەوە خەبەری بووەو فەرمووی: (موژدەبێت ئەی ئەبوبەکر ئەوە جوبرەئیلە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووەو دانەکانی تەپوتۆزی پێوەیە)، پاشان کە لە کەپرەکەی هاتەدەرەوە ئەم ئایەتەی دەخوێند[5] کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾[6] بەمزوانە ئەوکۆمەڵە لە شەڕ دەشکێت‌و پشت هەڵدەکەن‌و ڕادەکەن.

### شەوی بەدر باران باری

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ بارانی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك چووە بەدر دابەزی لەنێوان موسڵمانان‌و ئاوەکەدا لمێکی زۆر هەبوو، موسڵمانەکان تووشی لاوازیەکی زۆر هاتن شەیتانیش کینی خستە دڵیان‌و دوودڵی لە نێوانیاندا دروستکرد پێی دەوتن ئێوە خۆتان بە دۆستی خودا لەقەڵەم دەدەن‌و پێغەمبەر لەگەڵتانە کەچی موشریکەکان دەستیان گرتووە بەسەر ئاوەکەداو ئێوەش بە لەشگرانیەوە نوێژدەکەن، لەپڕ خودای گەورە بارانێکی بەخوڕی بەسەردا باراندن موسڵمانەکان تێر ئاویان خواردەوەو خۆیان پاك‌و تەمیزکردو پیسی‌و چەپەڵی شەیتانی لەکۆڵ کردنەوەو لە کەیشی

---

[1] مسند أبي يعلى (٢٤٢/١) فەرموودەیەکی باشە.
[2] الطبري (٤١٩/١٣).
[3] ابن أبي حاتم (١٦٦٤/٥).
[4] الشرح (٥-٦).
[5] دلائل النبوة (٥٤/٣).
[6] القمر (٤٥).

توندوتۆڵ بوو کە بارانەکە لێی دەداخەڵکەکە بە سواری وڵاخەکانیان بەسەریدا ڕۆیشتن تا گەیشتنەلای موشریکەکان. خودای گەورە یارمەتی پێغەمبەرەکەی‌و (ﷺ) بڕوادارانی دا بە هەزار فریشتە جوبرەئیل پێنج سەد فریشتەی غەلغان پۆشەوەو میکائیلیش بە پێنج سەد فریشتەی قەلغان پۆشەوە[1] ئەم فەرموودەیە کە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار خاوەنی (المغازی) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ڕیوایەتی کردووە وتی: یەزیدی کوڕی ڕوومان بۆیگێڕامەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە وتی: خودا بارانی ناردو باراندی بەسەر پێغەمبەرو هاوەڵەکانیدا زەویەکەی بۆ ئاوڕێژ کردن، بەئاسانی بەسەریدا دەچوون باری بەسەر قوڕەیشدا توانیان نەبوو لەگەڵیدا بڕۆنز[2] موجاهیدئەڵێت: خودا بارانی بەسەرباراندن لەپێش خەولێ کەوتنیاندا، بەوبارانە تەپ‌وتۆزەکەی دامرکاندەوەو زەویەکەی پێ کوتایەوەو دڵیانی خاوێن کردەوەو پشتیانی قایم‌و توندکرد[3]، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾ تا خاوێنتان بکاتەوە پێی. واتە: دەستنوێژی پێ بگرن‌و لەش پیسی پێ دەرکەن، ئەمە خاوێنکردنەوەی دەرەوەیە ﴿وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ خەیلی شەیتانتان لێ دووربخاتەوە، ئەمەش خاوێنبوونەوەی ناوەوەیە. وەك خودای گەورە لەبارەی‌خەڵکی بەهەشتەوە دەفەرمووێت: ﴿عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾[4] پارچەی تەنك‌و سەقفی سەوزیان لەبەردایە لە هەوریشم‌و دروسی کراوە، بەزۆر بازنی زیویش ڕازاوەتەوە. ئەمە جوانی دەرەوەیانە. ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾[5] پەروەردگاریان شەرابی پاکیان پێ دەنۆشێت، پاکیان دەکاتەوە لەو دڵگرانی‌و ڕکەبەری‌و ئیرەیی کە لە نێوانیاندابووە، ئەمەش پاکی‌و جوانی ناوەوەیە ﴿وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ﴾ پەیوەندی دڵەکانتان پتەوبکات، بە ئارامگرتن‌و ڕاوەستاوو بەهێزتان بکات. ئەمەش ئازایەتی‌و لێبڕانی دڵە ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ﴾ پێیەکانتان سەقامگیربکات‌و ڕاوەستێت. ئەمەش ئازایەتی‌و بەجەرگی دەرەوەیە والله أعلم.

---

[1] الطبری (٤٢٣/١٣).

[2] الواقدی في المغازی (٥٤/١).

[3] الطبری (٤٢٥/١٣).

[4] الانسان (٢١).

[5] الانسان (٢١).

﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ (١٢) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (١٣) ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ (١٤)﴾

**خودا فەرمانی دا بەفریشتەکان کە یارمەتی خاوەنباوەڕان بدەن و لەگەڵیان بجەنگن دژی خودانەناسان**

. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ خودا فریشتەی تێگەیاند کە خۆشم لەگەڵ ئێوەدام غیرەت وەبەر خاوەنباوەڕان بێنن. ئەمەش بەهرەیەکی شاراوەیە کە خودای گەورە ئاشکرای کردووە بۆ خاوەنباوەڕان، هەتا شوکری خودای لەسەر بکەن. ئەو خودا گەورەو خاوەندەستەلاتە پاک و بێعەیبە فریشتەکانی ئاگادار کرد کە ڕەوانەی کردبوون بۆ یارمەتی پێغەمبەرەکەی و(ﷺ) ئاینەکەی و باوەڕداران کەورەی خاوەنباوەڕان بەرزیکەنەوەوغیرەت بخەنەبەریان، وە دەفەرموێت: ﴿سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ﴾ منیش ترس دەخەمە دڵی خودانەناسان واتە: ئێوەی فریشتە غیرەت وەبەر خاوەنباوەڕان بێنن تا زەبرو زەنگ بەرامبەر دوژمن بنوێنن و لەفەرمانم لانەدەن. کاری ئێوە ئەوەیە، منیش ترس و لەرزو نائومێدی دەخەمە دڵی ئەو کەسانەی کەبێ فەرمانی من دەکات و بروای بە پێغەمبەرەکەم نیە ﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ﴾ سا ئێوە لە ملیان دەن و هەموو پەنجەکانیان بپەڕێنن. واتە: بدەن لە پەنجەکانیان و بیانترسێنن و بدەن لەملیان و سەریان بڕن و دەست و قاچەکانیشیان بڕن، (فوق الاعناق) وتراوە: واتە: بدەن لەسەریان. وەوتراوە: مەبەست پێی لەمل دانە. زەححاک و عەتیەی عەوفی دەڵێن: بەلگە بۆ ئەم مانایە خودای گەورە ڕێنمایی باوەڕداران دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ﴾[1] ئیتر هەرکاتێك تووشی ئەو ئەو بێدینانە بوون لەملیان دەن، کاتێك کە کوشتاری زۆرتان لێ کردن، پاشان (دیلەکانیان) شەتەك دەن. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: خەڵکی لەڕۆژی بەدردا ئەو کوژراوانەی کە فریشتەکان دەیاندا لەملیان و پەنجەکانیان لەناو کوژراوەکاندا دەیان ناسین. نیشانەی ئەو ئاگرەی پێوەبوو کە پێی سوتابوو ﴿وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ﴾پەنجەکانیان بپەڕێنن. ئیبنوجەریرئەڵێت: واتە:ئەی خاوەنباوەڕان دەست مەپارێزن لە دوژمنەکەتان لەگشت لایەکیان بدەن، دەستیان قاچیان جومگەکانیان، لەسەر پەنجەکانیان (البنان)

---

[1] محمد (٤).

کوڕی (بنانة)[1]، عەوفی وتی لە ئیبنو عەبباسەوە: کە باسی بەسەرهاتی بەدری کردئەڵێت: ئەبو جەهل وتی: بەکوشتن مەیان کوژن بەڵکو بەدەست بیانگرن تا تێیان دەگەیەنن کە چیان کردووە بەرامبەر ئاینەکەتانو چۆن وازیان هێناوە لەلاتو عوزا. خوداش فریشتەکانی تێگەیاندو فەرمووی. ﴿أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴾ لەوێدا ئەبو جەهل (لەعنەتی خودای لێ بێت) کوژرا لەگەڵ شەستوئۆ کەسی تردا، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیتیش دەستی بەسەر کراو پاشان کوژرا. کوژراوی بتپەرستەکان بو بە حەفتاکەس. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ چونکە ئەوانە بەرهەڵستی خوداو پێغەمبەری وەستان، واتە: دژایەتی خوداوپێغەمبەرەکەی(ﷺ) وەستانو وازیان لە شوێنکەوتن و بڕوا هێنان پێیو بەرنامەکەی هێنا ﴿وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ هەر کەسێکیش دژی خوداو پێغەمبەرەکەی بێت، خودا بەتوندی سزای دەدات. واتە: خودا هەر تۆڵە دەستێنێتو زاڵ دەبێت بەسەر ئەوانەدا کە دژایەتی دەکەن. هیچ شتێکی لەدەست دەرناچێت، کەسیش لەبەر تورەیدا خۆی ناگرێت پاكو بێ عەیبی هەر بۆ خودایە هیچ پەرستراو پەروەردگاریەك نیە جگە لەو ﴿ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴾ با بیچێژن، خودانەناسان بە ئاگریش ئازار دەدرێن. ئەمە ئاماژەیە بۆ خودانەناسان واتە: بیچێژن ئەو سزاو سوکایەتی پێکردنە لەدنیاداو چاکیش بزانن کە سزای سەختیشی لەڕۆژی قیامەتدا دەچێژن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾

**قەدەغەکردنی هەڵاتن لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن و سزاکەی**

خودای گەورە هەڕەشە دەکات لەوکەسانەی کە هەڵدێن لەکاتی پەلاماردانی دوژمندا بە ئاگری جەهەننەمو دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان ئەگەر تووشی خودانەناسان بوون ئێوە لەبەریان هەڵمەیەن. واتە: کاتێك کەلێیان نزیك بونەوە ڕامەکەنو هاوەڵەکانتان بەجێ بهێڵن ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا

---

[1] الطبری (١٣/٤٣١).

لِّقِتَالٍ ﴾ هەرکەسێك لە ڕۆژێکی وادا خۆ لەشەڕ بدزێتەوە (مەگین بۆ شەڕکردن لە شوێنێکی کەوە. واتە: مەگەر لەبەر ئەوە هەڵبێن فێڵ بکەن‌و بەرامبەرەکەی وابزانێت لەترسی ئەو ڕادەکات‌و شوێنی بکەوێت، لەپڕ لێی هەڵگەڕێتەوەو بیکوژێت. لەوێدا هیچی لەسەر نیە ئەمە دەقی قسەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو سودیە.[1] زەححاك ئەڵێت: ئەگەر کەسێك پێشی هاوەڵەکانی بکەوێت‌و بیەوێت دەرفەتێك لە دوژمن بێنێت‌و لێیدا. ﴿أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ یان بۆ یارمەتی هاوەڵەکانی بڕوات، واتە: لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بڕوات بۆلای دەستەیەکی تر لە موسوڵمانان‌و یارمەتیان بدات‌و ئەوانیش هاوکاری ئەو بکەن. ئەوە دروستە بۆی با لەگەڵ دەستەیەکیشدا بێت‌و هەڵاتبێت بۆلای ئەمیرەکەی خۆی[2] یان هەڵاتبێت بۆلای گەورەی موسوڵمانان هەر دروستە بۆی. عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خودای لێ بێت) دەربارەی ئوبی کوڕی عوبەید وتی: کاتێك کە لەسەر جسر کوژرا لەسەر زەمینی فارس، چونکە سوپای مەجوسیەکان لەو ناوچەیەدا زۆر تربون، عومەر وتی: ئەگەر بەلای مندا بهاتایە من دەبووم بەکۆمەڵی ئەو. هەر بەوشێوەیە موحەممەدی کوڕی سیرین ڕیوایەتی کردووە. وە لەڕیوایەتی عوسمانی کوڕی نەهدیا هاتووە لە عومەرەوە، وتی: کاتێك کە ئەبو عوبەید کوژرا، عومەر وتی: ئەی خەڵکینە من کۆمەڵی ئێوەم. موجاهید وتی: عومەر وتی: من دەستەی گشت موسوڵمانێکم، عبدولمەلیکی کوڕی عومەیر لە عومەرەوە وتی: ئەی خەڵکینە، با ئەم ئایەتە لەخۆبایتان نەکات، ئەم ئایەتە لەڕۆژی بەدردا هاتووە من دەستەی هەموو موسوڵمانێکم، ئیبنو ئەبی حاتەم وتی: باوکم بۆی گێڕاینەوە، حەسەنی کوڕی عەبدڵلای میسری بۆی گێڕاینەوە، خەلادی کوڕی سولەیمانی حەزرەمی بۆی گێڕاینەوە، نافع بۆی گێڕاینەوە کە پرسیاری کردووە لە ئیبنو عومەرو پێی وتووە: کە ئێمە گەلێکین خۆڕاگر نین لەشەرکردندا بەرامبەر دوژمنمان. ئێمە نازانین کام دەستە دەستەی ئێمەیە پێشەواکەمان یان سوپاکەمان؟ وتی: بێگومان ئەو دەستەیە پێغەمبەری خودایە (ﷺ) منیش وتم: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ﴾ ئەگەر تووشی خودانەناسان بوون با زۆریش بن ئێوە لەبەریان ڕامەکەن. وتی: بێگومان ئەم ئایەتە لە ڕۆژی بەدردا هاتوەتە خوارەوە. نەلە پێشی بەدرەوە هاتوەتە خوارەوە نەلە پاشیەوە زەحاك لەمەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ (المحين) واتە: هەڵبێت بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی، یان: ئەمڕۆ کەسێك ڕابکات بۆلای ئەمیرەکەی یان هاوەڵەکانی ئەمیرەکەی[3] بەڵام ئەگەر هەڵاتن لەبەر هۆکارێك لەم

---

[1] الطبری (١٣/٤٣٦/٤٣٧).

[2] الطبری (١٣/٤٣٦).

[3] الطبری (١٣/٤٣٧).

هۆكارانە نەبێت ئەوە دروست نیەو حەرامەو تاوانێكە لەتاوانە گەورەكان. لەبەر ئەم فەرموودەیە كە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان كردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دوركەونەوە لەحەوت تاوانە گەورەكە)، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو تاوانەگەورانە كامانەن؟ فەرمووی: (هاوەڵ دانان بۆ خوداو جادوو كوشتنی گیانێك كە خودا قەدەغەی كردووە مەگین بەهەقی خۆیو سود خواردنو ماڵی هەتیو خواردنو هەڵاتن لە ڕۆژی پەلاماردانو تۆمەتباركردنی ژنانی ئازادی بێ ئاگای خاوەن باوەڕ)[1]، هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ خودا لەخۆی تووڕە دەكاتو جێگەی جەهەننەمەو چارەنووسی زۆر خراپە لەڕۆژی قیامەتدا.

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾﴾

**بەر خوردی خودا لەڕۆژی بەدرداو كوشتنو خۆڵ كردنە چاوی (خودانەناسان)**

خودای گەورە ڕوونی دەكاتەوە كەخۆی وەدی هێنەری كرداری بەندەكانیەتیو شایەنی سوپاسوستایشەلەگشت كارێكی چاكداكەپێی هەڵستاون، چونكە خودا خۆی سەركەوتوی كردوونو یارمەتی داون لەسەر ئەو كارانەیان هەر بۆیە دەفەرموێت: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ﴾ ئەوان ئێوە نەتان كوشتن، بەڵكو خودا كوشتنی. واتە: بەهەوڵو توانای خۆتان دوژمنەكانتان نەكوشتووە لەگەڵ زۆری ژمارەی خودانەناسانو كەمی ژمارەی ئێوە.بەڵكو خودا خۆی زاڵی كردن بەسەریانداوەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾[2] بێگومان خودا ئێوەی سەرخست لەڕۆژی بەدردا، هر چەندە ئێوەكەمو بێ هێزیش بوون. وە لە ئایەتێكی تر دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾[3] خودا لەزۆر شوێندا بەهاناتانەوە هات، ڕۆژی حونەینیش هەروەها، كەهەرچەندە بەزۆری خۆتان دەنازین، كەچی هیچ بەهرەی بۆ نەدان، ئەم زەمینە فراوانەتان لێ تەنگ هەڵات، پاشان هەموو هەڵاتنو بەرەو دوا گەڕانەوە. خودای مەزن ئاگادارمان دەكات كە سەركەوتن بەزۆری ژمارەو بە پۆشینی قەڵغانو كەرەسەی جەنگ نیە. بەڵكو

---

[1] فتح الباری (٤٦٢/٥)،مسلم(٩٢/١).

[2] ال عمران (١٢٣).

[3] التوبة (٢٥).

سەرکەوتن لەلایەن خودای گەورەوەیە وەك لە ئایەتێکدا فەرموویەتی: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[1] زۆر جار کۆمەڵێکی کەم (بەئیزنی خودا) بەسەر کۆمەڵێکی زۆر سەرکەوتوون، خودا لەگەڵ خۆڕاگرانە. دیسان خودای گەورە لەبارەی ئەو شتە خۆڵەی پێغەمبەر(ﷺ) کردی بەڕووی خودانەناساندا لەڕۆژی بەدردا کاتێك کەلە کەپرەکە هاتە دەرەوە دوای ئەو لالەو پاڕانەوەو دەرخستنی لاوازیەی بۆ خوداو خۆڵەکەی هاوێشتو فەرمووی: ئەو ڕووانە ناشیرین بوون، پاشان فەرمانی بە هاوەڵەکانی داکە بەدوای ئەوەدا پەلامار بدەن، ئەوانیش پەلاماریاندا. خودای گەورە ئەو خۆڵو لمەی گەیاندە چاوی بتپەرستەکان هیچ کەسێك نەبوو لەو خودانەناسانە کە بەشێك لەو خۆڵەی بەرنەکەوێتو نەیدەزانی چی بکات هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ﴾ کە هاوێشتت، هاوێژکەرەکە تۆ نەبووی، بەڵکو خودا هاوێشتی[2] واتە: هەر خودا خۆی ئەو خۆڵەی گەیاندوەتە چاویانو پێی متو کزو کوێر کردوون نەك تۆ (ئەی موحوممەد(ﷺ)). موحوممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا﴾ ئەو دەیەویست خاوەن باوەڕان تاقی کاتەوە بەچاکی واتە: بۆ ئەوەی خاوەنباوەڕان بەچاکی ئەو بەهرانەی خودایان بۆ دەرکەوێت کە پێی بەخشیون لەوانە زاڵ کردنیانە بەسەر دوژمنەکانیانداو لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەیانداو کەمی ژمارەی خۆیان، ئەو هەقانەی خودا لەبیر نەکەن کەهەیەتی بەسەریانەوەو بەوپێیە شوکری بەهرەکانی بکەن[3]. ئیبنو جەریریش هەروا تەفسیری کردووە. وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە (بەگشت تاقی کردنەوەیەکی چاك تاقی کردینەوە) ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا بیسەرو زانایە. لالە دەبیستێتو دەزانێت کێ شایستەی سەرکەوتنو زاڵ بوونە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ الْكَافِرِينَ﴾ بەڵێ ئاوا خودا فێڵی خودانەناسان پووچەڵ دەکات. ئەمەش ئاماژەیەکی ترە لەگەڵ ئەو سەرکەوتنەدا خودا دەستی باوەڕدارانی خست کە ئاگاداری کردن کەهەر خۆشی فرو فێڵی خودانەناسانی پووچەڵ کردەوە کارەکەیانی شکست پێهێناو تەفرو تونای کردنو سوپاسوستایش هەر بۆ خودای گەورەیە.

---

[1] البقرة (٢٤٩).

[2] الطبری (١٣/٤٤٤).

[3] الطبری (١٣/٤٤٨).

﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ وَإِن تَنتَهُوا فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَعُودُوا نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ ﴾

**وەڵامدانەوەی داوای بتپەرستان**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا ﴾ ئەی خودانەناسان ئەگەر سەرکەوتنتان دەوێت، واتە: ئەگەر داوای یارمەتیو دادوەریو فەرمانی خودا دەکەن کە ئێوەو دوژمنە بڕوادارەکانتان لەیەکتری جیابکاتەوە، وا ئەوەی کە داواتان کرد هات بۆتان. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو کەسانی تریش وتیان: لە زوهریەوە لە عبدوڵلای کوڕی سەعلەبەی کوڕی سوعیرەوە کە ئەبوجەهل لەڕۆژی بەدردا وتی: ئەی خودایە هەر کەسێکمان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بپچڕیوەو شتێکی بۆ هێناوین کە نایزانین ڕقو قینی خۆت ئەم بەیانیە بڕێژە بەسەریدا. ئەوە داوای سەرکەوتن بوو لەوەوە. خودای گەورەیش وەڵامی دایەوەو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ ﴾ ئەگەر دەتان ویست سەرکەون. وا سەرکەوتن. تا کۆتایی ئایەتەکە[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی سەعلەبەوە کە: ئەبوجەهل کاتێك کە ڕووبەڕووی ئەو خەڵکە بوەوە وتی: ئەی خودایە ئەوەمان کە پەیوەندی خزمایەتی پچڕیوەو شتێکی بۆ هێناوین کەلێی تێناگەین ڕقو قینی خۆت ئەم بەیانیە بڕێژە بەسەریدا، ئەبو جەهل ئەوەی داوا کرد[2]، نەسائی لە تەفسیرەکەیداو حاکمیش لە (المستدرك) دا هێناویانەو حاکم وتی: لەسەر مەرجی بوخاریو موسلم فەرموودەیەکی ڕاستە، بەڵام ئەوان نەیان هێناوە[3] وە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباسو موجاهدو زەحاکو قەتادەو یەزیدی کوڕی ڕومانو کەسانی تریشەوە. سوددی وتی: خودانەناسان کە دەرچون لە مەککەوە بۆ بەدر دەستیان گرت بە پۆشاکی کەعبەوەو داوای سەرکەوتنیان لەخودا کردو وتیان: ئەی خودایە پایە بەرزترین لەشکرو بەڕێزترین کۆمەڵو چاکترین هۆز سەربخە. خودای گەورەش فەرمووی ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ ﴾ واتە: خودای گەورەدەفەرمووێت: ئەوەی کە داواتان کرد سەرمخست کە موحەممەدە (ﷺ) عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم وتی: ئەوە فەرموودەی خودایە کە لەسەرزمانی ئەو خودانەناسانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ

---

[1] الطبری (١٣/٤٥٣).

[2] أحمد (٥/٤٣١). فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] النسائی فی الكبری (٦/٣٥٠)، الحاكم (٢/٣٢٨) فەرموودەیەکی حەسەنە.

ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾[1] ئەوساش وتیان: ئەی خودایە ئەگەر بەڕاستیەوە لەلایەن تۆوە هاتووە، لە ئاسمانەوە بەردەبارانمان بکە یان ئازارێکی بەژانمان بۆ بنێرە[2]. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَنتَهُواْ﴾ ئەگەر وازبێنن، لەوەی کەلەسەرین لە خودانەناسو بڕوا نەهێنان بە پێغەمبەرەکەی ﴿فَهُوَ خَيۡرٌ لَّكُمۡ﴾ ئەوە زۆر چاکە بۆتان، لە دنیاو لەڕۆژی قیامەتدا ﴿وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ﴾ ئەگەر تێ هەڵچنەوە، ئێمەش تێ هەڵدەچینەوە. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنۡ عُدتُّمۡ عُدۡنَا﴾[3] ئەگەر دەست پێبکەنەوە، ئێمەش دەست پێدەکەینەوە. واتە: ئەگەر ئێوە گەڕانەوە بۆ ئەو خودانەناسو گومڕایەی کەلەسەری بوون، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆتان وەك ئەم جارە چیمان بەسەر هێنان، دیسان بەسەرتان دێنینەوە ﴿وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـًٔا وَلَوۡ كَثُرَتۡ﴾ هیچ شتێك بەهرە بەئێوە نادات، بادەستەو بەستەتان زۆریش بن. واتە: ئەگەر هەرچی تواناتانە بیخەنە کارو هەموو کۆببنەوە، لەوانەشە پێتان نەکرێت، هیچ قازانجێکتان پێ ناگەیەنێت هەرکەسێك خودای لەگەڵدا بێت هیچ شتێك زاڵ نابێت بەسەریدا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ خودا لەگەڵ بڕوادارانە ئەوان دۆستو شوێنکەوتووی پێغەمبەرن (ﷺ).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴾

**فەرماندان بەگوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان، بەفەرمانی خوداو پێغەمبەری بنو لە هەرشتێك ئەو پێتان دەڵێتو دەیبیستن خۆ لامەدەن. خودای گەورە فەرماندەکات بەعەبدە بڕوادارەکانی کە گوێڕایەڵی خۆیو پێغەمبەرەکەی بنو دەیان ترسێنێت لەوەی کە سەرپێچی بکەنو وەك ئەو خودانەناسو لاسارانە هەڵسو کەوت بکەن بەرامبەر خودا. واتە: واز لە گوێڕایەڵیو بەجێ هێنانی فەرمانەکانی بێننو

---

[1] الانفال (٣٢).

[2] الطبری (١٣/٤٥٨).

[3] الاسراء (٨).

قەدەغەکراوەکانیشی پشت گوێ بخەن. دوای ئەوەی شارەزا بوون لەوەی کە بانگی کردن بۆی ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَالَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ ئێوە وەك ئەوانە مەبن وتویانە: گوێمان لێیە، کەچی هەر نەشیان بیستووە. ئیبنو ئیسحاق وتی: ئەوانە دوو ڕووەکانن، چونکە ئەوانە وا دەری دەخەن کە بیستویانەو بەگوێی دەکەن، بەڵام ئەوانە ڕاست ناکەن وانین[1] پاشان خودای گەورە ئاگاداری داوە کە ئەم جۆرە کەسانە لەنەوەی ئادەم خراپترین کەسو پیسترین گیانەوەرنو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ خراپترین زیندەوەران لەلای خودا ئەو کەڕو لاڵانەن کەوا هیچ تێ ناگەن. واتە: ئەو خودانەناسو دووڕووانە کەڕن لە بیستنی هەقو لاڵن لە تێگەیشتن، ئەوانە خراپترین گیانەوەرن، چونکە گشت گیانەوەرێك جگە لەوان بەرفەرمانی خودان لەوەدا، کە دروستی کردوون بۆی، بەڵام ئەمانە دروستکراون بۆ خودا پەرستی کەچی دەستیان دایە خودانەناسی، بۆیە خودا وەك ئاژەڵ ناویان دەباتو دەفەرمووێت: ﴿ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً ﴾[2] وێنەی ئەو خودانەناسانە وەك وێنەی ئەو ئاژەڵەیە کە دەنگ دەدرێت جگە لە خوڕینو دەنگ هیچ نابیستێت وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾[3] ئەوانە وەك ئاژەڵ وان، بەڵکو لەوان گومڕاترن ئاگایان لەهیچ شت نیە. وتراوە: مەبەست بەوانەی کە باسکران کۆمەڵە کەسێکن لە نەوەی عەبدودار لە قورەیشیەکان، ئەم قسەیە لە ئیبنو عەبباسو موجاهدەوە ڕیوایەت کراوە. ئیبنو جەریریش ئەمەی هەڵبژاردووە[4] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: ئەوانە دووڕووەکانن. منیش دەڵێم: هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان خودانەناسو دوو ڕووەکان لەو بارەیەوە، چونکە هەریەکێك لەوانە بێ بەشە لە تێگەیشتنی ڕاستیو ئارەزووی ئاکاری چاك، ئەگەر واش دانرێت کە تێگەیشتنیان هەیە. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ﴾ ئەگەر خودا بیزانیایە خێرێکیان تێدایە، کارێکی دەکرد ببیستن. چونکە خودا خۆی دەزانێت ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّواْ ﴾ ئەگەر واشی بکردایە ببیستن هەر ڕوویان وەردەگێڕا بە ئارەزوو لاساری خۆیانو دوای تێگەیشتنیان لێشی ﴿وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ هەر خۆیان لێی لادەدا.

---

[1] الطبری (١٣/٤٥٨).

[2] البقرة (١٧١).

[3] الاعراف (١٧٩).

[4] الطبری (١٣/٤٦٠).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

**فەرماندان بەوەڵامدانەوەی خوداو پێغەمبەر(ﷺ)**

خوودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان، هەر کاتێك خوداو پێغەمبەر داواتان لێدەکەن کارێك بکەن کە پێی ببوژێنەوە گورج پێی هەڵسن. ئەوە لە بەرژەوەندی ئێوەیە. ڕیوایەت کراوە لە ئەبو سەعیدی موعەللاوە(ڕەزای خودای لێبێت) وتی: نوێژم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بەلامدا ڕۆیشتو بانگی کردم، نەچووم بۆلای هەتا نوێژەکەم تەواو کرد پاشان چوومە خزمەتی، فەرمووی: (چی ڕێی لێ گرتی کە بێیتە لام؟ ئایا خودا نافەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ پاشان فەرمووی: پێش ئەوەی بچمە دەرەوە فێری گەورەترین سورەتت دەکەم لە قورئاندا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت کە بچێتە دەرەوە وەبیرم خستەوە فەرمووی: (الحمد الله رب العلمين) ئەوە ئەو حەوت ئایەتە دووبارە کراوەکەیە[1]، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: لە موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیرەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ وتی: واتە: خۆ ئامادە بکەن بۆ ئەو شەڕە کە خودای گەورە سەربەرزی کردن دوای زەلیلیو وە بەهێزیشی کردن پێی دوای لاوازیو پاراستنی لە دوژمنەکەتان دوای شکست پێ هێنانیان بە ئێوە[2].

**خودا دەتوانێت لەمپەر دانێت لەنێوان مرۆڤو دڵیدا**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ ﴾ چاك بزانن کە خودا دەتوانێت لەنێوان مرۆڤو دڵیدا دانێت. ئیبنو عەبباس ئەڵێت: خودا لەمپەر دادەنێت لەنێوان خاوەنباوەڕو خودانەناسداو وە لەنێوان بێ بڕوایيو بڕوادا[3]، حاکم ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدرەکەیدا بەمەوقوفیوئەڵێت: فەرموودەیەکی ڕاستە[4] موجاهدو سەعیدو عیکرمەو زەححاكو ئەبو ساڵحو عەتیەو

---

[1] فتح الباری (٨/١٥٨).
[2] ابن هشام (٢/٣٢٤).
[3] الطبری (١٣/٤٦٨).
[4] الحاکم (٢/٣٢٨).

موقاتیلی کوڕی حەیان و سوددیش هەوایان وتووە[1] وە لە ڕیوایەتێکدا لە موجاهدەوە هاتووە لەم ئایەتەدا ﴿يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ئەڵێت: بەشێوەیەك پشت گوێی دەخات کە ئارەزووی نامێنێت. سوددی وتی: خودا لەمپەر لە نێوان مرۆڤو دڵیدا دادەنێت کە ناتوانێت بڕوا بێنێتو ناشتوانێت خودانەناس بێت مەگین بەئیزنی خۆی. زۆر فەرموودە هاتووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەجێی خۆیەتی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا باس بکرێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر جار دەی فەرموو: (ئەی ئەو کەسەی دڵەکان دەگۆڕیت دڵم قایمگیربکە لەسەر ئاینەکەت) وتی: گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا بڕوامان هێناوە بەتۆو بەئەوەش پێی هاتوین، ئایا هەر ترست لێمان هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ: دڵەکان لەنێوان دووپەنجە لە لەپەنجەکانی خودای مەزندایە دەیانگۆڕێت)[2]، تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو لەبەشی قەدەردا لە جامیعەکەیدائەڵێت: فەرموودەیەکی چاکە.[3] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردووە لە نوواسیَ کوڕی سەمعانی کیلابیەوە (ڕەزای خودای لێبێت) وتی: لە پێغەمبەری خودام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: (هیچ دڵێك نیە مەگین ئەو دڵە لەنێوان دووپەنجە لەپەنجەکانی خودایە پەروەردگاری جیهان، ئەگەر مەیلی لێ بوو ڕاستی دەکاتەوە، ئەگەر مەیلیشی لێ بوو لای بدات لای دەدات) دەیفەرموو: (ئەی ئەوکەسەی دڵەکان دەگۆڕیت دڵم سەقامگیر بکە لەسەر ئاینەکەت) فەرمووی: (تەرازوو بەدەستی ڕەحمانە نزمی دەکاتەوەو بەرزیشی دەکاتەوە)[4] نەسائیو ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە[5].

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾

### ترساندن لەفیتنەی گشتگیر

خودای گەورە بەندە خاوەنباوەڕەکانی دەترسێنێت لە فیتنە واتە: لەو تاقیکردنەوەیە کە خراپەکارو غەیرە خراپەکار دەگرێتەوەو تایبەت مەندنیە بۆ خەڵکی گوناه کارە وەیان ئەو کەسە کە هەڵساوە بەو گوناهەوە، بەڵکو هەموو دەگرێتەوە کاتێك بەرگری لەوتاوانە نەکراو هەوڵی لابردنی نەدرا. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موتەڕیفەوە وتی: وتمان بەزوبەیر: ئەی ئەبو عەبدڵلا چی ئێوەی هێناوە؟ خەلیفەتات لەدەست دا کە کوژراو دوایی دێن داوای خوێنەکەی دەکەن؟ زوبەیر وتی:

---

[1] الطبری (١٣/٤٧٠/٤٧١).

[2] أحمد (١١٢/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] تحفة الاحوذی (٦/٣٤٩/٣٥٠). فەرموودەیەکی سەحیحە

[4] أحمد (١٨٢/٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] النسائی فی الکبری (٤/٤١٤)، ابن ماجة (١/٧٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ئەبوبەکرو عومەرو عوسماندا (ڕەزای خودایان لێ بێت) ئەم ئایەتەمان دەخوێندەوە ﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً ﴾ وامان دانەدەنا کە ئێمە خەڵکی ئەو فیتنەیەین تا کاتێك کە ڕوویدا لێمانو بەرپا بوو[1] وە عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لەئیبنو عەبباسەوەئەڵێت : لەم ئایەتەدا ﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً ﴾ وتی: مەبەست پێی هاوەڵانی پێغەمبەرە (ﷺ) بەتایبەتی[2] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە تەلحەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتی: خودا فەرمانی داوە بەخاوەنباوەڕان کە چاوپۆشی نەکەن لە خراپەکاری لەنێوان خۆیاندا کە ڕوویدا، ئەگینا خودا هەموویان تووشی سزا دەکات[3] ئەمە تەفسیرێکی زۆر جوانو چاکە. هەر بۆیە موجاهید لەم ئایەتەدا ﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً ﴾ وتی: ئەم ئایەتە بۆ ئێوەشە[4] زەححاكو یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیبو کەسانی تریش هەروایان وتووە. ئیبنو مەسعود وتی هیچ کەسێك نیە لەئێوە مەگین ئەو کەسە فیتنەیەك هەر دەیگرێتەوە چونکە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾[5] ئەو دارایی‌و منداڵانەی هەتانە، هۆی تاقیکردنەوەتانن. هەر کەسێکتان کە داوای پەنای کرد، با داوای پەنا لە خودا بکات لەو فیتنانەی کە هەڵخەڵەتێنو چەواشە کەرن.[6] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە. مەبەست ئەوەیە کە ئەم ترساندنە هاوەڵەکانی پێغەمبەرو کەسانی تریش دەگرێتەوە هەرچەندە ڕووی قسەکە لەوانە لەڕاستیدا، ئەو فەرموودانە کە لەبارەی ترسان لە فیتنە هاتوون بەڵگەن ڕاستی ئەو قسەیە. بۆیە لە کتێبێکی سەربەخۆدا خودا مەیلی لێ بێت ڕوون دەکرێتەوە وەك چۆن زانایانی کە بەجیا کتێبیان لەسەر نووسیوە، ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگ بێت باسی بکرێت ئەم فەرموودانەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوون، لەوانە، لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە کە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە دەبێت فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە یان بەمزووانە خودا لەلایەن خۆیەوە سزاتان بۆ دەنێرێت پاشان لێی دەپاڕێنەوەو وەڵامتان ناداتەوە)[7]، وە ئیمامی

---

[1] أحمد (١٦٥/١) سەنەدەکانی خراپ نیی یە.
[2] الطبری (٤٧٤/١٣).
[3] الطبری (٤٧٤/١٣).
[4] الطبری (٤٧٥/١٣).
[5] التغابن (١٥).
[6] الطبری (٤٧٥/١٣).
[7] أحمد (٣٨٨/٥) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لـە ئیبنـو ڕوقـادەوە ئـەڵێت: لەگـەڵ گەورەکـەمـدا دەرچـووم خـستمیانە لای حوزەیفە کە دەیگوت: ئەگەر کەسێك قسەیەکی (بەجۆرێکی) لەدەم دەربچوایە لەسەردەمی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) بە دووڕوو سەیر دەکرا، کەچی من ئەو قسەیە چوار جار لەیەکێك لەئێوە دەبیستم لەیـەك دەنیشتندا، سوێند بەخودا دەبێت فەرمان بدەن بەچاکەو بەرگری بکەن لە خراپەو هانە بدەن بەچـاکە. یان خـودا هـەمووتان بەسزایە لـەناو دەبات، یـان خـراپترین کەسـتان دەکاتـە فـەرمانڕەواتان پاشـان چاکەکانتان دەپاڕێنەوەو وەڵامیان نادرێتەوە[1] نەعمانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خودایـان لێ بێـت) وتـی: بیستم لە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: (وێنـەی ئـەوەی کـە فـەرمان دەکـات بەچـاکەو بـەرگری دەکات لە خراپە، ئەوەی نایکاتو هەڵدەستێت بەخراپە، وەك وێنـەی ئـەو کەسـانەن کـە کەشـتیەکیان هەیە دووقاتە، تیرو پشك بکـەنو هەنـدێکیان قـاتی سـەرەوە یـان سـەرکەوێتو هەنـدێکی تریـان قـاتی خوارەوەیان بەردەکەوێت، ئەوانەی لە خوارەوەن بـۆ ئـاو دەبـوو بـچوونایەتە سـەرەوە بەسـەر ئەوانـدا تێپەڕینایە، نەوەك ئەوانەی سەرەوە ئازاریان پـێ بگات، ئەوانەی خوارەوە بڵێن: بۆچی ئازارتان بـدەین بۆ ئاو؟ ئەگەر کونێك بکەینـە بەشـەکەی خۆمـان ئـاوی لێ هەڵدەکێشین یـەکێکیان تەشـوێیەك (فأساً) هـەڵبگرێت دەسـت بکـات بـەکونکردنی کەشتیەکە، ئەوانـەی سـەرەوە بـێن پێیـان بڵـێن: بـۆئی کـونی دەکەیت؟ ئەوانیش بڵێن: ئێمە ئاومان پێویستە بۆچی ئەوەندە ئازاری ئێوە بدەین بـۆ ئـاو؟ بەشـەکەی خۆمان کون دەکەین، ئەگەر وازیان لێ بێنن ئەوەی کە دەیانەوێت بیکەن هەموویان لەناودەچـن، ئەگـەر دەستیان بگرن ئەمانیشو ئەوانیش هـەموو ڕزگاریـان بـووە)[2]، بوخـاری تـەنبا خـۆی ئـەم فـەرموودەی ڕیوایەت کردووە لەبەشی (الشركة والشهادات)[3] تیرمیزیش لەبەشی فیتنەکاندا هێناویـەتی بەشـێوەیەکی تر[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کـردووە لـە ئومـو سـەلەمەوە خێزانـی پێغەمبـەر(ﷺ) وتـی: بیـستم لـە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (کاتێك گوناه تەشەنەی کرد لـەناو ئوممەتەکـەمـدا خـودا سـزای گشتگیریان لەلایەن خۆیەوە بۆدەنێرێت)، وتم: ئەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئایـا خـەڵکی پیاوچـاکیان تێدا نیە؟ فەرمووی: (بەڵێ) وتی: ئەی ئەوانە چی دەکەن؟ فـەرمووی: (ئـەوەی ئـەو خەڵکـە تووشیان دێـت ئـەوانیش تووشـیان دێـت پاشـان دەگەڕێنـەوە بـۆلای لێخۆشـبوونو ڕەزامەنـدی خـودا)[5] وە لـە فەرموودەیەکی تردا هەر ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لـە جـەریرەوە کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)

---

[1] أحمد (٥/٣٩٠) سەنەدەکانی لاوازە.

[2] أحمد (٤/٢٦٩) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٥/١٥٧/٣٤٥).

[4] تحفة الاحوذي (٦/٣٩٤).

[5] أحمد (٦/٣٠٤) فەرموودەیەکی باشە (جيد)

فەرموویەتی: (هیچ گەلێك نیە كەلە نێوانیاندا تاوان بكرێت، ئەوان دەستەڵاتدارترین لەوانەی كە ئەو كارە دەكەن، پاشان نەیگۆڕن مەگین خودا هەموویان تووشی سزا دەكات)[1] ئیبنو ماجەش ئەم فەرموودەی هێناوە[2].

﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾﴾

**ئاگاداركردنەوەی موسوڵمانان لەو ژیانەی كە تێیدا بوون لە كزیو لاوازیو پاشان چۆن بوونە خاوەنی هێزو دەستەڵات**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بیر لەو كاتە بكەنەوە كە ئێوە لەم زەمینەدا كەمێكی بێدەستەڵات بوون، ترستان هەبوو خەڵكی تر دەرتان بكەنو بێ جێو ڕێ بمێننەوە، پەنای دانو یارمەتی دانو سەركەوتنو ڕۆزی پاكو ڕەوای پێدان، بەڵكو شوكرانە بژێرین. خودای گەورە خاوەنباوەڕەكانی ئاگادار دەكاتەوە بۆ ئەو بەهرانەی كەپێی بەخشیونو ئەو چاكانەی كە لەگەڵی كردوون، كە زەمانێك بوو زۆر كەم بوون زۆری كردنو لاوازو بێ دەستەڵات بوون دەترسان بەهێزی كردنو سەری خستن، هەژارو بێ دەست بوون ڕۆزی پاكو تەمیزی دان، بۆ ئەوەی سوپاسی بكەنو مل كەچی بنو گوێ ڕایەڵی گشت فەرمانەكانی بن. ئەوە حاڵو گوزەرانی موسوڵمانەكان بوو كاتێك كە لەمەككەدا بوون، زۆر كەم بونو خۆیان دەشاردەوەو دەچەوسێنرانەوە، دەترسان خەڵكی لەگشت وڵاتێكەوە بێن بدەن بەسەریانداو دەریان بكەنو بیانگوێزن لە بتپەرستانو ڕۆمو مەجوسیەكان، چونكە ئەوانە هەموو دوژمنیان بوون، لەبەر كەمیو بێ تواناییان. بەردەوام ئەمە حاڵیان بوو هەتا خودای مەزن ئیزنی دان كۆچ بكەن بۆ مەدینەو لەوێدا پەنای دانو خەڵكەكەی بوو دڵ گوشاد كردنو دڵیان دانەوەو یارمەتیان دان لەڕۆژی بەدرداو جەنگەكانی تریشدا، هاوكاریان كردن بەسامانەكانیانو گیانی خۆیان بەخت كرد لەپێناوی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەیدا(ﷺ) قەتادە لەم ئایەتەدا ئەڵێت:﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەو ناوچەیە كە ئەم عەرەبانەی تێدا دەژیان زەلیل ترین خەڵكی خودا بوون، خراپترین ژیانیان بەسەر دەبرد هەمیشە سكیان برسی بوو، ڕووتو پێ پەتیو زۆر سەرلێشێواو بوون، ئەوەی دەژیان زۆر بە

---

[1] أحمد (٣٦٤/٤) فەرموودەیەكی باشە (جید).

[2] أحمد (٣٦٦/٤)، ابن ماجة (١٣٢٩/٢).

بەدبەختی ژیانی بەسەر دەبرد، ئەوەش دەمرد دەچوو بۆ ناو ئاگر، دەخوران و نەیان دەخوارد سوێند بەخودا هیچ کەسێك شك نابەین لەخەڵکی ئەم سەر زەمینە لەو کاتەدا شوێنیان لەمانە خراپتر بوبێت هەتا ئەو کاتەی خودا ئیسلامی هێنا، بەو ئیسلامە وڵاتەکەی دامەزراندوو ڕۆزی پـێ فـراوان کـرد بەو ئیسلامە کردنی بەفەرمانڕەوا بەسەر خەڵکیداو خودا ئەو هەموو شتەی پێدان کەبەچاوی خۆتان بینیتان، شوکرانەبژێری خودابن لەسەر بەهرەکانی، پەروەردگارتان خاوەن بەهرەو شوکری پێ خۆشە ئەو کەسانەی شوکری دەکەن هەمیشە خودای مەزن بەهرەیان بۆ زیاتر دەکات.[1]

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەو قەدەغەکردنی ناپاکی**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان لەگەڵ خوداو پێغەمبەر دەغەڵی مەکەن، ئەوشتانەش کەدەیزانن ئەمانەتن لەناوخۆتاندا خەیانەتی تێدامەکەن.وەلەهەردوو سەحیحەکەشدا بەسەرهاتی حاتبی کوڕی ئەبی بەلتەعە هاتووە کە نامەی نووسی بۆ قورەیش و مەبەستی پێغەمبەری خودای (ﷺ) تێدا باس کرد بۆیان لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا خودای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادار کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) خەڵکی نارد بەدوای نامەکەداو هێنایەوەو داوای حاتەبیشی کردو هێنایان و دانی بەوەدا نا کە کردوویەتی. تێیدا هاتووە، کە عومەری کوڕی خەتاب هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا نەدەم لەگەردنی؟ بەڕاستی ئەوخەیانەتی لەخوداو پێغەمبەرەکەی و بڕواداران کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وازی لێ بێنە ئەو ئامادەی بەدر بووە، تۆ چوزانیت لەوانەیە خودا بەچاوی بەزەیی تەماشای خەڵکی بەدری کردبێت و پێی فەرموو: چیتان دەوێت بیکەن بەڕاستی من لێتان خۆش بووم) منیش دەڵێم: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە گشتگیرەو بۆ هەموو کاتێکە، هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەکەی تایبەتە، بەڵام کارکردن بە گشتگیری وتەیە نەك تایبەتمەندی هۆکارەکە لەلای زۆرینەی زانایان، خەیانەت گشت تانە گەورەو بچوکەکانیش دەگرێتەوە لەخۆ بگرێت یان لە خەڵکی تر. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: ﴿وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ﴾ ئەمانەت، ئەو ئەرکانەیە کەخوداعەبدەکانی بەرپرسیارکردووەلەسەری،واتە: فەرزەکان. دەفەرموێت: ﴿وَتَخُونُوٓاْ﴾ واتە: ئەو

---

[1] الطبري (١٣/٤٧٨).

ئەمانەتە هەڵمەوەشێنەوەو مەیشکێنن[1]، عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید وتی: قەدەغەی کردووە لێتان کە خەیانەت لەخوداو پێغەمبەر(ﷺ) بکەن دووڕووەکان کردیان.[2] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ بشزانن ماڵو منداڵتان هۆی تاقی کردنەوەن. واتە: جێی ئەزمونو تاقی کردنەوەن بۆتان، کاتێك کە خودا پێی داون تا بزانێت شوکرانە بژێرینیو گوێ ڕایەڵی دەکەن لەسەری یان خۆتان سەرقاڵ دەکەن پێیانەوەو خوداتان لەبیردەچێتەوە، یان ئەو ماڵو منداڵە لەجێی ڕەزامەندی خودا دادەنێن؟ وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[3] ئەو دارایيو منداڵانەی هەتانن جێی تاقی کردنەوەن، خودا پاداشتی گەورەی لایە. وە دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾[4] بەخراپەو بەچاکی بێت تاقیان دەکەینەوە. وە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾[5] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان سامانو منداڵەکانتان یادی خوداتان نابێت لەبیر بەرێتەوە، ئەوانەی وا دەکەن زیانبارن. وە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾[6] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان، هەندێك لە ژنانو منداڵانی ئێوە دوژمنتانن خۆتانیان لێ بپارێزن پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بێگومان پاداشتی گەورە لای خودایە. واتە: پاداشتو بەخشندەيیو بەهەشتەکانی ئەو چاکترە بۆ ئێوە لە دارایيو منداڵ، چونکە جاری وایە منداڵەکانتان دەبنە دوژمنتان، زۆر بەشیان قازانجێکت پێ ناگەیەنن هەر خودای پاکو بێعەیب کاربەدەستو خاوەنی موڵکی دونیاو قیامەتە. پاداشتی گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لای ئەوە. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە فەرموویەتی: (سێ شت هەن هەرکەسێك تێیدا بێت بەو سیانە شیرینی ئیمان بەدەست دەهێنێت، هەرکەسێك خوداو پێغەمبەری(ﷺ) لەهەموو شت خۆشتر بووێت، هەروەها کەسێکیش

---

[1] الطبری (١٣/٤٨٥).
[2] الطبری (١٣/٤٨٣).
[3] التغابن (١٥).
[4] الأنبياء (٣٥).
[5] المنافقون (٩).
[6] التغابن (١٤).

خۆشویست تەنها لەبەرخودا خۆشی بوویت، ئینجا پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێ دینی دوای ئەوەی خودا ڕزگاری کرد لێی وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە)[1] بەڵکو دەبێت خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێشی بخات لە خۆشەویستی ماڵو منداڵو گیانیشی[2] لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ( سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك لەئێوە بڕوای (تەواو) نیە، هەتا منی لەلا خۆشەویستتر نەبێت لەگیانیو کەسو کاریو سامانیو هەموو خەڵکی)[3].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾

**لەخودا ترسی هۆکارە بۆ جیاکردنەوەی چاکەو خراپە**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، ئەگەر لەخودا بترسن، هۆی جیاکردنەوەی پاکوپیستان پێدەداتو لە خراپەتان دەبووریت. خودا خاوەنی چاکەی زۆر مەزنە. ئیبنو عەبباسو سوودیو موجاهدو عیکرمەو زەححاكو قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەیانو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿فُرْقَانًا﴾ دەروتان لێدەکاتەوە، موجاهد ئەمەی لێ زیاد کردووە خودا دەروتان لێدەکاتەوە لە دونیاو لە قیامەتدا[4]، وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿فُرْقَانًا﴾ واتە: ڕزگار دەبێت وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا دەڵێت: سەردەکەون. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: ﴿فُرْقَانًا﴾ واتە: هۆی جیاکەرەوەی نێوان هەقو ناهەقتان پێدەدرێت، ئەم تەفسیرەی ئیبنو ئیسحاق گشتگیر ترە لەوانەی پێشی خۆی، ئەو قسانەی ئەوانیش هەموو دەگرێتەوە. بێگومان هەرکەسێك لەخودا بترسێت فەرمانەکان خودا بێت بەجێ بکاتو واز لەقەدەغەکراوەکانی بێنێت، سەرکەوتوو دەبێت لە ناسینو جیاکردنەوەی هەق لە ناهەقو شتی پڕو پوچ، ئەوەش دەبێت بەهۆی سەرکەوتنو ڕزگار بوونو دەرباز بونی لەکاروباری دنیاو بەختەوەر بوونی لە ڕۆژی قیامەتداو سڕینەوەیو لابردنی گوناهەکانیو چاوپۆشی لێ کردنیو ئاشکرا نەکردنی لەلای خەڵکی. وە هۆکارێکیشە بۆ وەدەست

---

[1] مسلم (١/٦٦).

[2] مسلم (١/٦٧).

[3] فتح الباري (١/٧٥).

[4] الطبري (١٣/٤٨٩-٤٩٠).

هێنانی پاداشتی گەورە لەلای خودا. وەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾[1] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان ترستان لەخودا هەبێتو بڕوا بە پێغەمبەری ئەو بێنن، ئەوسا دووپاداشتتان دەداتەوەو ڕووناکیەکتان وە پێش دەخات، کە بەهۆیەوە بەڕێدا بڕۆنو لە گوناهتان دەبورێتو هەر خودایە خەتا پۆشو دلۆڤانە.

﴿ وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ٣٠ ﴾

**باسی ئەو پلانەی کە خەڵکی مەککە دایان ڕشت بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)**

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾ ئەوکاتە دەبو بێنە کە خودانەناسان ویستیان فێڵێکت لێ بکەن یان بەندت بکەن یان بتکوژن یان دەرت بکەن، ئەوان فێڵەکەی خۆیان کرد، خوداش پلانی خۆی بەجێ هێنا. بێگومان خودا لەهەموو پلانداناەرێك چاکتر پلان دادەنێت. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو قەتادە وتیان: ﴿لِيُثۡبِتُوكَ﴾ واتە: تا کۆتو زنجیرت بکەن[2] سوددی ئەڵێت: (الاثبات) واتە: بەندکردن لەگەڵ کۆت کردندا[3] ئیمام موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار خاوەنی کتێبی (المغازی) ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵڵای کوڕی ئەبی نەجیحەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: کەلبی بۆی گێڕامەوە لە بازانەوە کە بەندەی (أم هانئ) بووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: کۆمەڵێك لە قورەیشیەکان لە گەورە پیاوانی گشت هۆزەکان کۆبوونەوە تا بچنە شوێنی کۆڕو کۆبونەوەکەیان (دار الندوه) شەیتان لەبەرگی پیاوێکی بەتەمەندا هاتە ڕێیان، کاتێك کە چاویان پێی کەوت پێیان وت: تۆ کێیت؟ پیاوە بەتەمەنەکە وتی: من خەڵکی نەجدم بیستم ئێوە کۆبونەتەوە ویستم ئامادەی کۆبونەوەکەتان ببم، بێگومان لە ئامۆژگاریو ڕاو بۆچونی خۆم بێ بەشتان ناکەم. وتیان: بەڵێ، فەرموو، ئەویش لەگەڵیان چووە ژوورەوە، پاشان وتی: چاك ئاگاداری هەڵسو کەوتی ئەم پیاوەبن، سوێند بەخودا زۆر نزیکە بەمزوانە سەردەکەوێت بەسەرتاندا‌و هەموو کارەکانی ئێوە بگرێتە دەستی خۆی. یەکێك لەوانە وتی: بەکۆتکراوی بەندی بکەن پاشان چاوەڕوانین هاکا

---

[1] الحدید (٢٨).

[2] الطبری (٤٩١/١٣).

[3] الطبری (٤٩٢/١٣).

شتێکی بەسەرهاتو لەناو چوو وەك چۆن شاعیرەکانی پێش لەناو چوون وێنەی زوبەیرو نابیغە، ئەمیش یەکێکە وەك ئەوانە. وتی: پیاوە بەتەمەنە نەجدەییەکە (لەعنەتی خودای لێ بێت) هاواری لێ هەستاو وتی: بەخودا ئەم ئەم رایە باش نیە بۆتاو. سوێند بەخودا پەروەردگاری لە بەندیخانەکەی دەری دێنێتو دەینێرێتەوە بۆلای هاوەڵەکانی، لەوانەیە بدەن بەسەریداو لەدەستتانی بسێننو نەیەڵن هیچی لەگەڵدا بکەن. دەستەڵاتیشیان پەیداکرد لەوانەیە لەزێدی خۆتان وەدەرتان بنێن. وتیان: ئەم بەڕێزە ڕاست دەکات بیر لە چارەیەکی تریکەنەوە جگە لەمە. یەکێکی تر لەوانە وتی: لەناو خۆتاندا وەدەری بنێن ڕزگارتان دەبێت لێی. ئەگەر ڕۆیشت هەرچی بکات ئێوە تووشی زیان نابن لەدەستی لە هەر کوێیەك بێت. خراپەکانی لەبەر چاوتان نەبێت، ئێوە ئاسوودەن گیروگرفتەکەی بۆ خەڵکی ترە. پیاوە ریش سپیە نەجدەییەکە وتی: بەخودا ئەم رایەش چاك نیە بۆتان. ئایا سەیری قسەخۆشیو زمان پاراوی ناکەن، هەر کەسێك گوێ لەقسەی بگرێت دڵی ڕادەکێشێت؟ بەخودا ئەگەر واتان کرد پاشان دەچێتە ناو عەرەبەکانو لە دەوری کۆدەبنەوە پاشان ئەوانە دێنێتە سەرتان هەتا لەزێدی خۆتان دەرتان دەکاتو پیاوە ماقوڵەکانیشتان دەکوژرێت، وتیان: بەخودا ڕاست دەڵێت: بیر لە چارەیەکی تر بکەنەوە جگە لەمە. ئەبوجەهل (لەعنەتی خودای لێ بێت) وتی: بەخودا من ئامارەتان بۆ دەکەم بە چارەسەرێك، وانازانم ئێوە ڕێتان پێ بردبێت هەتا ئێستا، جگە لەمە من هیچ شتێکی تر بەچاك نازانم. وتیان: ئەوە چیە؟ وتی: لە هەموو تیرەیەك کوڕێکی لاوی خاوەن بنەماڵە هەڵبژێرن، هەرکەسەو شمشێرێکی تیژی بدرێتە دەست پاشان هەموو بەیەکجار لێی بدەن، کە کوژرا خوێنەکەی لەناو گشت تیرەکاندا بڵاوە دەکات، ئەوکاتە وانازانم کەنەوەی هاشم بتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو قورەیشدا بکەن. بێگومان کاتێك کە ئەوەیان بینی ڕازی دەبن بەخوێن وەرگرتنو ڕزگارمان دەبێت لێیو ژیانیمان لەکۆڵی خۆمان کردووەتەوە. پیاوە پیرە نەجدەییەکە وتی: بەخودا ئا ئامەیە بۆچوون (چارەسەر) قسە ئەمەیە ئەم لاوە وتی، جگە لەمە هیچ شتێکی تر بەچاك نازانم، لەسەر ئەمە بڵاوەیان کرد کە بۆی کۆبوونەوە. جوبرەئیل هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) پێی وت لەو جێگەدا نەمێنێتەوە کە تێیدا دەخەوتو ئاگاداری کردەوە لە فرتوفێڵی ئەوانە، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو شەوە لەماڵی خۆیدا نەمایەوە. ئالەو کاتەدا خودا ئیزنی دەرچوونی پێدا، پاش ئەوەی کە چووە مەدینە سورەتی ئەنفالی ناردە خوارەوە بۆیو باسی بەهرەکانی خۆیو ئەو گیروگرفتانەی بۆ کرد کەتووشی بووە ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾ وە لەسەر ئەو قسەی کە کردیان، چاوو نواڕین هاکا شتێکی بەسەر هاتو لەناو چوو وەك چۆن شاعیرەکانی پێشی لەناو چوون. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴾ یان پێت

دەڵێن: شاعیرێکەو چاوەنواڕین هاکا شتێکی بەسەر هات. ئەو ڕۆژە ئیتر ناو دەبرا بە ڕۆژی (الزحمە) واتە: ئەو ڕۆژەی کەتێیدا کۆبونەوە بۆ وتووێژو ڕادەربڕین تێیدا[1] سوددی هەروای وتووە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە موحەممەدی کوڕی جەعفەرەوە لە ئیبنو زوبەیر لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە لەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾[2].

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ ۙ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ
(٣١) وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا
بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣٢) وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ
يَسْتَغْفِرُونَ (٣٣) ﴾

## قوڕەیشیەکان وایان دەزانی کە دەتوانن وەك قورئان دابنێن

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ ۙ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ هەرکاتێك نیشانەکانی ئێمەیان بۆ دەخوێننەوە دەڵێن: بیستمان، ئەگەر حەزمان بکردایە ئێمەش وەك ئەمەمان دەوت، لەچەند بەسەرهاتێکی کۆن زیاتر هیچی تر نیە. خودای گەورە باسی بێ دینی خراپیو لاساریو کەلەڕەقیو سەرپێچی قوڕەیشی دەکات، کە چەند قسەیەکی پڕوپووچ دەکەن کاتێك کە گوێیان لە قورئانەو بەسەریاندا دەخوێرێتەوە دەڵێن: ﴿قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ﴾ ئەمەش هەر قسەیەکە دەیکەن، بێ ئەوەی هیچیان لەدەست بێت، چونکە چەند جار قورئان بەرەنگاریان بوەتەوە ئەگەر دەتوانێت تەنیا سورەتێك وەك ئەو بێنن، هەر چەندیان کردووە نەیان توانیوە، بەڵکو ئەمە قسەیەکی پڕوپوچە خۆیانو شوێن کەوتووەکانیان پێ فریو دەدەن: دەڵێن: ئەوەی ئەم قسەی کردووە نەزری کوڕی حاریش بووە (لەعنەتی خودای لێ بێت) وەك سەعیدی کوڕی جوبەیرو سوددیو ئیبنو نەجیحو کەسانی تریش وتوویانە، کاتێك کە نەزر چووە بۆ وڵاتی فارسی خێری بەسەرهاتی پاشاکانی فارسی بووە لەوێنەی ڕۆستەو ئەسفەندیاو، کە گەڕاوەتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەبینێت کە خودا ڕەوانەی کردووەو قورئان دەخوێنێتەوە بۆ خەڵکی، هەر کاتێك پێغەمبەر لە هەر مەجلیسێکدا هەستایە، نەزر لەو مەجلیسەدا دادەنیشتو بەسەرهاتی ئەو

---

[1] ابن هشام (٤٨٢/٤٨٠/١).

[2] ابن هشام (٣٢٥/٢).

پاشایانەی بۆ باس دەکردن پاشان دەیگوت: سوێندتان دەدەم بەخودا کاممان چیرۆکەکانمان خۆشترە من یا موحەممەد؟ هەربۆیە خودا هەلێکی بۆ ڕەخساند لەڕۆژی بەدردا دەست بەسەرکرا، پێغەمبەری خودا فەرمانی دا لەگەردنی بدەن لە بەردەمی خۆیدا، لە ملی درا. سوپاس بۆ خودا، ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتە: بەسەرهاتی پێشینان، کۆی (أسطورية) واتە: لە کتێبەکانی پێشینەوە وەری گرتووە، شارەزایی لێیان هەیەو بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوە، ئەمەش درۆو بوختانێکی ڕووتە، وەك خودای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٥﴾ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾[1] وتیان: ئەمانە چیرۆکی پێشینانن، هەموو بەیانیو ئێواران پێی دەڵێنو لەبەری دەنووسێتەوە. بڵێ: کەسێك ناردوویە، لە نهێنی ئاسمانەکانو زەمین ئاگادارە، بێگومان ئەو لە گوناه دەبورێتو دلۆڤانە. واتە: لەوکەسانەی کە پەشیمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆلای، هەر ئەوە کە تەوبەیان لێ قبوڵ دەکاتو چاوپۆشیان لێ دەکات.

**بتپەرستان داوای سزا دەکەن**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾ ئەوکاتەش وتیان: ئەی خودایە ئەگەر بەڕاستیەو لەلایەن تۆوە هاتووە لە ئاسمانەوە بەردەبارانمان بکە یان ئازارێکی بەژانمان بۆ بنێرە. ئەم داوایەشیان لەبەر زۆر نەفامیو لاساریو فیز زلیو بێ دینیان بوو، ئەوەش وەك ڕەخنەو گاڵتەکردنێك بو پێی، ئەگینا دەبوو لەباتی ئەوە داوای بەردەباران بکەن، بیان وتایە: ئەی خودایە ئەگەر ئەمە ڕاستەو لەلایەن تۆوە هاتووە شارەزامان بکە بۆیو یارمەتیمان بدە شوێنی بکەوین، بەڵام لەباتی ئەوەدا داوای بەردەبارانو سزای بەپەلەیان دەکرد بۆیان بێت وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِۚ وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَيَأۡتِيَنَّهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾[2] داوات لێدەکەن کە زۆر زوو وابکەیت بەڵایان بەسەر بێت، ئەگەر کاتو سەعاتی بۆ دیاری نەکرایە، سزایان بۆ دادەباری، بێگومان ئەو سزایە لەناکاوێکدا بۆیان دێتو هەر خۆشیان نازانن. ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾[3] دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان پێش ئەوەی ڕۆژی قیامەت بێت بەشی خۆمان بدەرێ. وە لە ئایەتێکی

---

[1] الفرقان (٥-٦).

[2] العنكبوت (٥٣).

[3] ص (١٦).

تــــردا دەفـــەرمووێت: ﴿سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ﴾[1] یەکێك دلوای کرد سزا بێت، بۆ خودانەناسان هیچ لەمپەرێك نایەتەڕێ، لەخودای خاوەن چەند پلـەوە. هەر بەو شێوەیە نەفامەکانی گەلە پێشوەکانیش هـەمان قسەیان کردووە، وەك هۆزی شوعەیب بە شوعەیبیان وتووە: ﴿فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[2] دەسا ئەگەر تۆ ڕاست دەڵێی، چەند پارچەیەکمان (لە ئاسمان) بەسەردا بخەرە خوارەوە. ئەمانەش دەڵێن: ﴿قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ شوعەیب لە عەبدولحەمیدەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوەئەڵێت: ئەوکەسە ئەبوجەهلی کوڕی هیشام بووە کە وتی: ئەی خودایە ئەگەر ئەمە ڕاستەو لەلایەن تۆوە هاتووە لە ئاسمانەوە بەردەبارانمان بکە یان سزایەکی بەژانمان بۆ بنێرە. ئـەم ئایەتە هاتە خـوارەوە ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردووە[3].

**بوونی پێغەمبەرو (ﷺ) تەوبەکردنی بتپەرستان دوو هۆکارن بۆ دڵنیابوون لە سزا**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ تا تۆیان لەناودابێت (ئەی موحەممەد) خودا سزایان نادات، هەتا داوای لێبوردنیش بکەن لە گوناه، خودا هـەر ئازاریـان نـادات. ئیبنـو عـەبباس ئـەڵێت: دوو (هۆکـاری) دڵنیـایی لەنێوانیانـدابوو پێغەمبەرو (ﷺ) تەوبە کردن، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت بەڵام تەوبەکردن ماوەتەوە[4] تیرمیزی ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو مووسـاوەئەڵێت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: خـودا دوو دڵنیـایی ناردووەتەخوار بۆ من لەبارەی ئوممەتەکەمەوە ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ کاتێك من ڕۆیشتم تەوبەکردن لە نێوانیاندا بەجێ دەهێڵم تا ڕۆژی قیامـەت[5] ئەم فەرموودەیەش پشتیوانی لەو فەرموودەی پێشەوە دەکات کە ئیمامی ئەحمەدو حاکم ڕیوایـەتیان کردووە لە موسنەدو موستەدرەکەیاندا لە ئەبو سـەعیدەوە کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی:

---

[1] المعارج (١-٣).

[2] الشعراء (١٨٧).

[3] فتح الباری (١٦٠/٨).

[4] الطبری (٥١١/١٣).

[5] تحفة الاحوذی (٤٧٢/٨) فەرموودەیەکی لاوازە.

(شەیتان وتی: سوێند بە شکۆمەندی تۆنەی پەروەردگار، بەردەوام بەندەکانت گومڕا دەکەم تا گیانیان لە لاشەیاندا بێت، خودای گەورە فەرموویەتی: سوێندێك بەشکۆمەندیو گەورەیی خۆم، بەردەوام لێیان خۆش دەبم تا داوای لێبوردنم لێ بکەن)[1]، پاشان حاکم وتی: فەرموودەیەکی سەحیحە[2].

﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾

**ڕێگر نیە لە سزادانی بتپەرستان دوای ئەنجامدانی کاری خراپ**

خودای گەورە دەفەرموێت حەقی خۆیانە کە سزایان بدات، بەڵام ئەو سزایەیان نادات لەبەر پیرۆزی پلەی پێغەمبەر(ﷺ) لەناویاندا، بۆیە کاتێك کە لەناویان دەرچوو، خودا تووشی سزای خۆی کرد لە ڕۆژی بەدردا، پیاوەکە ئازارو گەورەکانی گوشتن یان دەست بەسەری کردن، پاشان خودا ڕێنمایی کردن بۆ پەشیمان بوونەوە لەو گوناهانەی کەپێی ئالودەبوون لە بت پەرستیو بەدفەڕیو خراپەکاری خۆ ئەگەر ئەو خاوەن باوەڕە چەوسێنراوانەیان لەنێواندا نەبوایە کە داوای لێبوردنیان لە خودا دەکرد تووشی ئەو بەڵایە دەهاتن، بەڵام بەهۆی ئەوانەوە لەسەریان لاچوو. وەك خودای گەورە لە ڕۆژی حودەیبیەدا فەرمووی ﴿هُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَالْهَدْيَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَاءٌ مُّؤْمِنَاتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَئُوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾[3] هەر ئەوان بوون لە ڕێگای دین لایانداو بوونە ڕێگرو نەیانهێشت بچنە کەعبە (المسجد الحرام) ڕێشیان نەدا قوربانیەکەتان کە گلیان دابووەوە دەگاتە شوێنی خۆی، خۆ ئەگەر پیاوانو ژنانی خاوەنباوەڕ نەبوایە کە ئێوە نەتان دەناسین دەتان شێلان پێتان پێدا دەنان، بێ ئەوەی خۆتان بزانن (ئەگەر ئیزنمان بدانایە لەمەککەدا دژیان بجەنگن) جا بەهۆی ئەوانەوە تووشی تاوان دەبوون هەرکەسێك خودا خۆی مەیلی لێ بێت دەیخاتە بەر بەزەیی خۆی، ئەگەر لەو شوێنە لاچونایە، بێگومان خودانەناسانمان بە ئازارێکی بەژان سزا دەدات. وە لێردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ خودا چۆن ئازاریان نەدا،

---

[1] أحمد (٣/٢٩) سەنەدەکانی لاوازە.

[2] الحاكم (٤/٢٦١).

[3] الفتح (٢٥).

کە ئەوانە ڕێگەی (مسجد الحرام) یان لە زیارەتکەران گرتووە، شایستەش نین خاوەنی بن؟ خاوەنی هەر دەبێت ئەو کەسانە بن کە ترسی خودایان هەیە. بەلام زۆربەیان نەزانن. واتە: خودا چۆن سزایان نادات ئەوانە دەبنە ڕێگری خەلکی کە بچنە کەعبەی پیرۆز کەلە مەککەیەو نایەلن باوەڕداران نزیکی ببنەوە کە هەر ئەوان شایستەی ئەوەن کە بچنە ناوی نوێژی تیادا بکەنو بە دەوریدا بسوڕێنەوە. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانُوٓاْ أَوۡلِيَآءَهُۥٓۚ إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ﴾ واتە: خودانەناسان خاوەنی کەعبەی پیرۆز نین. بەلکو پێغەمبەرو هاوەلەکانی خاوەنو شایستەی ئەو شوێنەن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ وَفِي ٱلنَّارِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾[1] ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکان نەشیاوە بۆ بتپەرستان، خۆیان دەلێن: خودانەناسین هەرچی دەکەن بەفیڕۆ دەچێت تا هەتایە لەناو ئاگردان. هەر ئەوانەبۆیان هەیە مزگەوتەکانی خودا ئاوابکەن، کە باوەڕیان بەخوداو ڕۆژی قیامەت هەیەو نوێژەکان بەجێ دێننو زەکات دەرنو لەخودا نەبێت ترسیان لە هیچ کەسێك نیە، لەوانەیە ئەمانە لەڕێ نیشاندراوەکان بن. وە لە ئایەتێکی تردا خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿كَبِيرٞۚ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[2] ڕێگەی بەرەو خودا پەرستنو باوەڕ نەبون پێیو مالی خودا بەڕێز نەگرتن، دەرکردنی خەلکەکەی لەلای خودا تاوانی هەرە گەورەیە. حاکم ڕیوایەتی کردووە لە موستەدرەکەیدا لە ئیسماعیلی کوڕی عوبەیدی کوڕی ڕەفاعەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قورەیشی کۆکردەوەو فەرمووی: (ئایا کەسێکی غەیرە لەخۆتان تێدایە؟) وتیان: برازامان تێدایەو هاوپەیمانەکانمان تێدایەو بەندەکانیشمان تێدایە. فەرمووی: (هاوپەیمانەکانمان لەخۆمانو برازاکامنان لەخۆمانو بەندەکانیشمان هەر لەخۆمانن. بێگومان دۆستانی من لەنێوان ئێوەدا لەخوداترسانن)، پاشان وتی ئەم فەرموودەیە سەحیحە[3]، عورەو سوددیو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەم ئایەتەدا وتیان ﴿إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾ خاوەن دۆست دەبێت هەر ئەو کەسانەبن کە ترسی خودایان هەیە. وتیان ئەوانە موحەممەدو (ﷺ) هاوەلەکانیەتی (ڕەزای خودایان لێبێت)

---

[1] التوبة (١٧ـ١٨).

[2] البقرة (٢١٧).

[3] الحاكم (٢/٣٢٨).

موجاهید وتی: ئەوانە موجاهیدانن هەرکەسێك بن‌و لەهەرشوێنێکدا بن. پاشان خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ویستویانە لەکەعبەدا چی بکەن چۆن هەڵس‌و کەوتی تیادا بکەن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ نوێژیان لەماڵی خودادا هەر بریتی بوە لە چەپڵەو فیکەلێدان. عەبدوڵای کوڕی عومەرو ئیبنو عەبباس‌و موجاهدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو ڕەجای عەتاریدی‌و موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی‌و حوجری کوڕی عەنبەس‌و نوبەیتی کوڕی شورەیت‌و قەتادەو عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم وتیان: ﴿مُكَآءً﴾ واتە: فیکەکێشان.[1] موجاهد ئەمەی لێ زیادکردووە پەنجەکانیان دەخستە نێو دەمیان‌و فیکەیان دەکێشا[2] لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ وتی: قوڕەیشیەکان کەدەسوڕانەوە بەدەوری کەعبەی پیرۆزدا بەڕووتی‌و بەچەپڵەو فیکەلێدان دەسوڕانەوە بەدەوریدا (المكاء) واتە: فیکەکێشان، (التصدیه) واتە:چەپڵە لێدان. وەهەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو عەوفیەوە لە ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو عومەرو موجاهدو موحەممەدی کوڕی کەعب‌و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدورەحمان‌و زەحاك‌و قەتادەو عەتیەی عەوفی‌و حوجر کوڕی عەنەش‌و ئیبنو ئەبزەوە. وە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ وتی: ﴿مُكَآءً﴾ فیکەکێشان. ﴿وَتَصْدِيَةً﴾ چەپڵە لێدان. وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەبدورەحمانی کوڕی زەیدەوە وتیان: ﴿وَتَصْدِيَةً﴾ واتە: بەرهەڵستی کردنی خەڵکی لەڕێی خودای گەورەدا.[3] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ سا بیچێژن سزای سەخت بەهۆی ئەو بڕوانەهێنانەتانەوە. زەحاك‌و ئیبنو جورەیج‌و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتیان: ئەوەبو کە تووشیان هات لە ڕۆژی بەدردا لە کوشتن‌و دەست بەسەرکردن[4].

[1] الطبری (١٣/٥٢٢/٥٢٦).
[2] الطبری (١٣/٥٢٥).
[3] الطبری (١٣/٥٢٧).
[4] الطبری (١٣/٥٢٨).

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

**ماڵ خەرج کردنی خودانەناسان بۆ ڕێگری لەڕێی خودادا داخ و کەسەرەکەی هەر بۆ خۆیانە**

خـــودای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ ئەوانـەی خودانەناسن ماڵی خۆیان خەرج دەکەن ڕێگەی بەرەو خودا بگرن، ئـەو مـاڵ خـەرج کردنـەیان دەبێتـە کەسەرێك بۆیان و پاشان هەر ژێر دەکەن، بێگومـان خودانەناسان هـەموو لـە جەهـەنم کۆدەکرێنـەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: زوهری و موحەممەدی کوڕی یـەحیای کـوڕی حببـان و عـاسمی کـوڕی عومەری کوڕی قەتادەو حوسەینی کوڕی عەبدورەحمانی کـوڕی عـەمری کـوڕی سـەعدی کـوڕی مـەعاز بۆیان گێڕایەوە وتیان: کاتێك قـورەیش تووشـی شکست هـاتن لـە ڕۆژی بـەدرداو بـەدۆڕاوی گەڕانـەوە بۆمەککەو ئەبو سوفیانیش بەکاروانەکەیەوە گەڕایەوە، عەبدڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعەو عیکریمەی کـوڕی ئەبو جەهل و سەفوانی کوڕی ئومەیە لەگەڵ چەند پیاوێکدا لە قورەیش کە باوك و کوڕو برایان کوژرابوو لە بەدردا قسەیان کرد لەگەڵ ئەبو سوفیان و ئەو کەسانەی کەلـەو کاروانـە بازرگانیـەدا بەشـیان هـەبوو پێیان وتن: ئەی خەڵکی قورەیش، ئەوە سا موحەممەد تۆڵەی لێکردنەوە، پیاوە هەڵبژارەکانی کوشت بەم سامانە هاوکاریمان بکەن تا شەڕی لەگەڵ بکـەین، بـەڵکو تۆڵـەی ئەوانـەی خۆمـانی لێ بکەینـەوە، ئەوانیش بەگوێیان کردن. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی وەك ئیبنو عـەبباس دەڵێت لەسـەر ئەوانـە ئەم ئایەتانە هاتە خوارەوە کە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ ﴾ هەتا دەگاتە ﴿هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایـەت کـراوە لـە موجاهیـدو سـەعیدی کـوڕی جوبەیرو حەکەمی کوڕی عویەینەو قـەتادەو سـوددی و ئیبنـو ئـەبزەوە کە ئـەم ئایەتانـە لەسـەر ئـەبو سوفیان هاتوەتە خوار کە سامانەکەی خەرج کرد لە جەنگی ئوحوددا بۆ شەڕکردن لە دژی پێغەمبـەری خودا(ﷺ)[2] زەححاك ئەڵێت: لەسەر خەڵکی بەدر هاتووەتـە خـوار[3] هـەر جۆرێك داینێـی ئـەم ئایەتانـە گشتگیرن هەر چەندە هۆی هاتنەخوارەکەیان تایبەتیە. خودای مەزن ئاگاداری داوە کە خودانەناسان

---

[1] الطبرى (٥٣٢/١٣).

[2] الطبرى (٥٣١/٥٣٠/١٣).

[3] الطبرى (٥٣٣/١٣).

سامانیان خەرج دەکەن بۆ ئەوەی ڕێگری لەخەڵکی بکەن کە شوێنکەوتووی ڕێگەی ڕاست بن. پاشان سامانەکەیان دەڕوات و لەناودەچێت دەبێتە داخ و خەفەت بۆیان واتە: پەشیمانن کاتێك کە هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت. چونکە ئەوانە ویستیان ڕووناکی خودا بکوژێننەوەو وتەی خۆیان سەرخەن بەسەر وتەی هەقدا بەڵام خودا ڕووناکی خۆی هەر تەواو دەکات با خودانەناسانیش پێیان ناخۆش بێت. خودا خۆی یارمەتی ئاینەکەی دەدات و ئاشکرای دەکات و ڕوونی دەکاتەوە سەری دەخات بەسەر هەموو ئاینەکاندا. ئەم سەرشۆڕی و ڕیسواییە هەر لە دونیادا بۆ ئەوانەیەو وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە ئاگر سزا دەدرێن. هەر کەسێك لەوانە ژیاو نەمرد بەچاوی خۆی دەیبینێت و بەگوێی خۆی ئەوەی پێی ناخۆشە دەیبیسێت وە هەرکەسیش مرد یان کوژرا بەرەو سەرشۆڕی و ڕیسوایی تا هەتایی و جەزرەبەی بەردەوام دەڕوات. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ تا خودا پاك و پیسی لێك هەڵاوێرێ. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: خەڵکی بەختەوەر لە خەڵکی بەدبەخت جیا دەکاتەوە[1] وە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی فەرمانی خودا بەجێ دێنێت بەشەڕکردن دژی دوژمنەکانی کە خودانەناسانن جیا بکاتەوە، یان ئەوەی کە سەرپێچی دەکات و خۆی لادەداو کەم تەرخەمی دەکات هەر جیا بکاتەوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾[2]

خودا هیچ کاتێك باوەڕدارانی لە بارودۆخێکدا نەهێشتوەتەوە، لەبەرئەوەی ناپاکان لە پاکان هەڵاوێرێت. خودا ئێوە لە نادیار ئاگادار ناکات. وە دەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾[3] ئایا ئێوە لاتان وایە هەر وا سەربەخۆ دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا خەباتکاران و خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردووە. بەم پێیە مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە، بۆیە ئێوەمان تاقی کردەوە بەو خودانەناسانە کە دژتان دەجەنگن و توانامان پێداون کەماڵ خەرج بکەن و لەو پێناوەدا ببیەخشن ﴿لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ﴾ تا خودا پاك و پیسی لەیەك جیا بکاتەوە پیسەکان لەسەریەك دەنێ و بەتێکڕایی کۆیانبکاتەوەو بیانخاتە جەهەننەم، ئەوانە هەر خۆیان زیانبارن. لە دونیاو لە ڕۆژی قیامەتدا.

---

[1] الطبری (١٣/٥٣٤).

[2] ال عمران (١٧٩).

[3] ال عمران (١٤٢).

﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ
(٣٨) وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا
يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٣٩) وَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ (٤٠) ﴾

**هاندانی خودانەناسان بۆ تەوبەکردن و ترساندنیان لە خودانەناسی**

خـودای گـەورە دەفـەرمووێت بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد(ﷺ): ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ ﴾ بە خودانەناسەکان بڵێ: ئێستاش ئەگەر دەست هەڵبگرن هەرچی لە پێشدا کردوویانە لێیان دەبورێت. واتە: ئەگەر واز بێنن لەو بێ دینیو دژایەتیو لاساریەیانو بێنە ناو ئیسلامو گوێڕایەڵ بنو تەوبە بکەن هەرچی لە پێشدا کردوویانە عەفودەکرێن. لەو خودانەناسو گوناهو تاوانانەی کە کردویانە وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە لە ئەبو وائیلەوە لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێبێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك کەلە ئیسلامدا چاکە کاربێت. لەسەر ئەوکارانەی لە نەفامیدا کردونی لێی ناپرسرێتەوە، وە هەر کەسێك لە لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە لە کارەکانی سەردەمی یەکەمو دوایشی دەپرسرێتەوە)[1]، واتە: کارەکانی سەردەمی نەفامیو ئیسلامیشی لەسەر هەژمار دەکرێت. وە دیسان هەر لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئیسلام بوون پێشی خۆی دەسڕێتەوە، تەوبەکردنیش ئەوەی پێشە خۆی دەسڕێتەوە)[2]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ ئەگەریش تێ هەڵچونەوە، بەسەرهاتی پێشینەکان دیارە چی بوو. واتە: ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر ئەوکارەیان، بەسەرهاتی پێشینەکان (چاکترین) پەندە بۆیانو دیارە چیمان بەسەر هێنان. کاتێك بڕوایان نەهێناو بەردەوام بوون لەسەر لاساری خۆیان. ئێمە چارەیان دەکەین بەسزاو تۆڵە لێ سەندن.

**فەرماندان بە جەنگ بۆ کۆتایی هێنانی بێدینیو بتپەرستی**

خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ لەگەڵیان شەڕبکەن هەتا ئاژاوە نامێنێتو دین گشتی دینی خودا دەبێت. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە پیاوێك هاتو وتی: ئەی ئەبو عەبدورەحمان ئایا چی دەکەی بەوەی کە خودا

[1] فتح الباری (١٢/٢٧٧).
[2] مسلم (١٢١)، أحمد (٤/٢٠٥).

باسی کردووە لە کتێبەکەیدا ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ ﴾[1] ئەگەر دوو گرۆ لەناو باوەڕداراندا بەگژیەکدا چوون. چی ڕێگات لێدەگرێت کە شەڕ نەکەیت وەك خودا فەرموویەتی لە کتێبەکەیدا؟ وتی: ئەی برازای خۆم! سەرزەنشت بکرێم بەم ئایەتە پێم خۆشترە لەوەی سەرزەنشت بکرێم بەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا ﴾[2] هەرکەسێك هەر بە ئەنقەست خاوەنباوەڕێك بکوژێ. تا کۆتایی ئایەتەکە. وتی: خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴾ شەڕیان لەگەڵ بکەن تا ئاژاوە نامێنێت. ئیبنو عومەر وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەمان کرد، ئەکاتە موسوڵمانان کەم بوون، پیاو لەسەر ئاینەکەی تووشی تاقی کردنەوە دەبوو یان دەیانکوشت یان کۆتو زنجیریان دەکرد تا کاتێك کە موسوڵمانان زۆر بوونو تاقی کردنەوە نەما. کاتێك ئەو پیاوە بۆی دەرکەوت کە ئەوەی ئەو دەیەوێت هاوڕانیە لەگەڵی وتی: ئەی چی دەڵێن لەبارەیَ عەلیو عوسمانەوە؟ ئیبنو عومەر وتی: قسەی من لە بارەی عەلیو عوسمانەوە، عوسمان خودا لێی خۆش بوو، ئێوە حەزتان لێ نەبوو خودا لێی خۆش بووە. بەڵام عەلی خۆ دیارە ئامۆزای پێغەمبەری خودایەو (ﷺ) مێردی کچەکەیەتی، ئامازەشی کرد بەدەستی، وتی: ئەوەش کچەکەیەتی کە دەیبینن[3]، وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێبێت) هاتە دەرەوە بۆلامانو وتی: ئەمە شەڕی فیتنەیە چۆنە بەلاتانەوە؟ وە ئایا دەزانی فیتنە چیە؟ موحەممەد(ﷺ) شەڕی دژی بتپەرستان دەکرد، چونە ناو بت پەرستانەوە فیتنە بوو، شەڕی ئەو وەك شەڕی ئێوە لەسەر دەستەلآت نەبوو[4] ئەمانە هەموو بوخاری هێناویەتی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) زەححاك لە ئیبنو عەبباسەوەئەلێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴾ شەڕیان لەگڵ بکەن هەتا بت پەرستی نامێنێت.[5] ئەبولعالیەو موجاهیدو حەسەنو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو سوددیو موقاتیلی کوڕی حەیانو زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەروایان وتووە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە زوهریەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوەو زۆرێك لە زانایانمانەوە پێم گەیشتووە کە وتویانە ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ

---

[1]

[2] النساء (٩٣).

[3] فتح الباری (٨/١٦٠).

[4] فتح الباری (٨/١٦٠).

[5] الطبری (١٣/٥٣٨).

فِتۡنَةٞ﴾ تا موسوڵمان لە ئاینەکەیدا تووشی فیتنە نەبێت[1]، ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ دین گشتی دینی خودا بێت. زەححاك لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدائەڵێت: یەکتا پەرستی بەتەواوی هەر بۆ خودا بێت.[2] حەسەن و قەتادەو ئیبنو جورەیج وتیان: ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ تا بوترێت: (لا اله الا الله)[3]، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: تا یەکخوا پەرستی (التوحيد) بەتەواوی هەر بۆ خودا بێت و بتپەرستی تێدا نەمێنێت و هەرچی شتێکی تر هەیە لێی دابڕێت لە هاوتاکان.[4] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ تا بێدینی لەگەڵ دینەکەتاندا نامێنێت[5] ئەم فەرموودەیە کە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە دەبێتە شایەت بۆ ئەم قسانە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت: (فەرمانم پێدراوە لەگەڵ خەڵکدا شەڕ بکەم تا دەڵێن: (لا الە الا اللە) ئەگەر وتیان خوێن وماڵیان پارێزراوە لەلایەن منەوە، تەنیا بەهەقی خۆی نەبێت لێپرسینەوەشیان لەلای خودای گەورەیە)[6] دیسان لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو مووسای ئەشعەریەوەئەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبارەی پیاوێکەوە شەڕ بکات لەبەر ئازایەتی وە شەڕبکات لەبەر لوت بەرزی وەشەڕ بکات بۆ ڕوبینی کامەیان لەڕێی خودای گەورەدایە؟ فەرمووی: (هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی وتەی خودا بەرزو بڵند بێت ئەوە لە ڕێگەی خودای گەورەدایە)[7]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ﴾ ئەگەر وازیان هێنا (تەمێ گر بوون) واتە: لە شەڕکردن دژتان و لەو خودانەناسیەی کە دەستیان داوەتێ و کۆتاییان پێ هێنا، ئەشتان دەزانی چی لەدڵیاندایە. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ ئەوسا هەرکارێك بکەن خودا دەیبینێت. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾[8] ئەگەر پەشیمان بوونەوەو بوونە نوێژکەرو زەکاتدەر، ئەوسا دەستیان لێ هەڵگرت، خودا لەگوناه خۆش

---

[1] ابن أبي حاتم (٥/١٧٠١).
[2] ابن أبي حاتم (٥/١٧٠١).
[3] الطبری (١٣/٥٣٨/٥٣٩).
[4] ابن هشام (٢/٣٢٧).
[5] الطبری (١٣/٥٣٩).
[6] فتح الباری (١/٩٥)، مسلم (١/٥٣).
[7] البخاری (١٢٣/٢٨١٠/٣١٢٦/٧٤٥٨).
[8] التوبة (٥).

دەبێتوەدلۆڤانە. وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ ﴾[1] برای دینی ئێوەن. وە دەفەرموویت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾[2] لە کوشتنیان مەوەستن تا فیتنە لە دونیا بنەبڕ دەبێت، هەر دینی خودا دەبێت، ئەگەر ئەوان وازیان هێنا، دوژمنایەتی هەر لە دژی ناهەقانە. بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە کاتێك کە ئوسامەی کوڕی زەید شمشێری بەرز کردەوە لەو پیاوە کە وتی: (لا اله الا الله) لێیداو کوشتی، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) گێڕایەوە فەرمووی ئوسامە: (ئایا دوای ئەوەی کە وتی لا اله الا الله کوشتت؟ چی دەکەیت لە (لا اله الا الله) لە ڕۆژی قیامەتدا؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ئەوە وتی خۆی بپارێزێت فەرمووی: (ئایا دلت لەت کرد؟) بەردەوام ئەوەی دەوتەوە بەسەریدا (ئەی چی دەکەیت بە (لا الە الا الله) لە ڕۆژی قیامەتدا؟) ئوسامە وتی:ستا خۆزگەم خواست کە ئەو ڕۆژە موسولمان ببومایە)[3] پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلَاكُمْ ۚ نِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴾ ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا، با بزانن کە گەورەتان هەر خودایە، باشترین گەورەو چاکترین یاریدەدەر واتە: ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر دژایەتیو شەڕکردن، چاك بزانن کە خودا گەورەو پشتو یارمەتی دەرتانە بەسەر دوژمنەکانتاندا باشترین گەورەو چاکترین یاریدەدەرتانە.

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٤١)﴾

**بڕیاری شەرع دەربارەی ( غەنیمەت )و( فەیئ )**

خودای گەورە بە درێژی ئەوەی بڕیاری داوە بۆ ئەم ئوممەتە بەڕێزە _بەتایبەتی_ ڕوون کردوەتەوە، لە نێوان هەموو گەلە پێشوەکاندا دەسکەوتی بۆ حەلاڵ کردوە.دەسکەوتی شەڕ (الغنیمة): ئەو ماڵەیە لە خوانەناس سەنراوەو بەدەست هاتووە کە بە سواری ئەسپو وشتر موسولمانان بۆی چوون. دەس کەوتیش (الفيء) ئەوەیە کە بە ئەسپو وشتر بۆی نەچوون وەك ئەو ماڵو سامانەیە کە موسولمانانو خوانەناسان بەڕێکەوتن لەسەری پێك دێن (بدرێ بە موسولمانان) یان کەسانێ دەمرنو میراتگریان نیە، یان سەرانەو خەراج وەرگرتن لەو کەسانەی لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژینو موسولمان

[1] الاحزاب (٥).
[2] البقرة (١٩٣).
[3] مسلم (٩٦/١).

نین وە هەر شتێکی تر لە شێوەی ئەمانە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾ دەبێ بزانن هەر غەنیمەیەکتان دەس کەوت پێنج یەکی (ئەو غەنیمەیە) بۆ خوایە. ئەمە خۆی جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەو پێنج یەکە لە هەموو شتێکی زۆرو کەمدا، هەتا دەرزیی‌و دەزوویش، خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[1] هەرکەسێ ناپاکی بکات، بەخۆی ونەوناپاکیەی کردویەتی دێت لە رۆژی قیامەتدا، ئەوسا هەرکەس لەسەر کردەوەی خۆی سزا ئەدرێ‌و هیچ ناهەقیان لێ ناکرێ. وە فەرموویەتی: ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ﴾ واتە: پێنج یەکی بۆ خوداو پێغەمبەرە (ﷺ) زەححاك لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبی) ئەلێ: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پۆلێکی لە سوپارەوانە بکردایە غەنیمەتێکیان دەست بکەوتایە، دەیکردە پێنج بەش، ئەو پێنج یەکەکەشی دەکردە پێنج بەشی تر، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾هەروەهائەلێت: کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾ ئەمەکلیلی وتەیەکە ئەفەرموێ(للەمافی السموات ومافی الارض) هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە هی خودایە. بەشی خوداو بەشی پێغەمبەری (ﷺ) وا لێ کردوە، کردویە بە یەك بەش.[2] ئیبراهیمی نەخەعی‌و حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنیفەو (الحنیفة) حەسەنی بەسری‌و شەعبی‌و عەتای کوڕی ڕیباح‌و عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەو قەتادەو موغەیرەو کەسانی تریش هەر وایان گوتوە. کە بەشی خوداو بەشی پێغەمبەرەکەشی یەك بەش بووە.[3] ئەوەی حافیز ئەبوبەکری بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە پشتگیری ئەمە دەکات بە چەند سەنەدی سەحیحەوە لە عەبدوڵلای شەقیقەوە کە پیاوێکی بەلقەینەوە ئەلێ: هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە وادیلقورا بوو ئەسپێکی پیشان ئەدا، گوتم:ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بارەی غەنیمەتەوەچی ئەفەرمووی؟ فەرمووی: (پێنج یەکی بۆ خوایەو چوار بەشەکەی تری بۆ سوپایە) گوتم: هیچ کەسێ لە پێشتر نیە بۆبردنی ئەوغەنیمەتە لە کەسێکی تر؟ فەرمووی: (نەخێر، ئەو تیرەشی کەدراوە لە تەنیشتت کە دەریدێنی تۆ شایستە تر نیت پێی لە برا موسوڵمانەکەت)![4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە میقدامی کوڕی

---

[1] آل عمران (١٦١).

[2] الطبري (١٣/٥٤٩).

[3] الطبري (١٣/٥٤٨/٤٥٠).

[4] البيهقي (٦/٣٢٤)، سەحیحە.

مەعدی یەکریبی کەندیەوە، کە لەگەڵ عوبادەی کوڕی سامیت و ئەبی دەرداو حاریسی کوڕی مەعاویەی کەندیدا دانیشتن، لە نێوان خۆیاندا باسی فەرموودەی پێغەمبەری خوایان دەکرد، ئەبودەرداء گوتی بە عوبادەی کوڕی سامت: ئەی عوبادە ! قسەکانی پێغەمبەری خودا لە فلان غەزاو فلان غەزادا لە بارەی پێنج یەکەوە (چۆن بوو)؟ عوبادە گوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی پێ کردن لە غەزایەکدا، بەرەو وشترێك لە وشترەکانی غەنیمەت ، کە سەلامی دایەوە هەڵسایە سەر پێ و موویە لە نێوان هەردوو سەرپەنجەیدا هەلگرت و فەرمووی: (ئا ئەمە لە غەنیمەتی ئێوەیە، بێگومان منیش هیچمافێکم نیە تێیدا جگە لە بەشی خۆم ، تەنیا پێنج یەك نەبێ. ئەو پێنج یەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئێوە، کەواتە چ دەرزی و چ دەزوو چ زیاتریش بێ لەوە یان کەمتریش بێ لەوەبدەن و خەیانەت مەکەن، چونکە خەیانەت (ئاکامەکەی) چوونە ناو ئاگرەو نەنگو شورەییە بۆ خاوەنەکەی لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا. وە جیهادی خەڵکی (خوانەناسیش) بکەن لەبەر ڕەزای خوا چ نزیك بێ یان دوور، گوێ مەدەنە لۆمەی لۆمەکەران، سنورەکانی خودا جێبەجێ بکەن لە ئاوەدانیداو لە سەفەردا، جیهاد بکەن لە ڕێی خوادا، چونکە جیهاد دەرگایەکی گەورەیە لە دەرگا کانی بەهەشت. بە جیهاد کردن خودا داخ و خەفەت لادەبات)[1] ئەمە فەرموودەیەکی چاك و مەزنە. من لە هیچ شتێکدا لە شەش کتێبەکەدا بەم ڕێگەیە چاوم پێی نەکەوتوە[2]. بەڵام ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەکەی عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە لە باپیریەوە کەعەبدوڵلای کوڕی عەمرەئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وەك ئەوە لە بەسەرهاتەکەی پێنج یەك و ڕێگرتن لە خەیانەتدا هاتووە.[3] ئەبوداودو نەسائیش لە عەمری کوڕی عەبەسەوە ڕیوایەتیان کردوە.[4] هەرچەندە پێغەمبەری خودا(ﷺ)مافی ئەوەی هەبوو لەغەنیمەت هەندێ شت هەڵبژێرێ بۆ خۆی وەك بەندەو کەنیزەك و ئەسپ و شمشێرو شتی لەوبابەتە ، وەك موحەممەدی کوڕی سیرین و عامیری شەعبی و زۆرێك لە زانایانی بەشوێن ئەم ڕایەدا ڕۆشتوون. ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) شمشێرەکەی (زولفەقار) لە ڕۆژی بەدردا لەناو غەنیمەتەکاندا هەلگرت ئەو شمشێرەی کە ئەو خەوەی ڕۆژی ئوحودی پێوە بینی.[5] لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: (صە فییە) لە هەڵبژاردەکانی

---

[1] أحمد (٥/٣١٦)، سەنەدەکانی لاوازە.

[2] مەبەست پێی (هەردووصەحیحی مسلم وبوخاری) وچوارسونەنەکەی(ئەبوداود وتیرمزی ونەسائی وئیبن ماجە یە..وەرگێڕ).

[3] أحمد (٢/١٨٤)، أبوداود (٢٦٩٤)، فەرموودەیەکە حەسەنە.

[4] أبوداود (٢٧٥٥).

[5] أحمد (١/٢٧١)، الترميذي (١٥٦١)، حەسەنە.

غەنیمەت بوو، ئەبوداوود لە سونەنەکەیدا ڕیوایەتی کردوە[1] بەڵام بەشی خزمان، ئەوە خەرج دەکرێ بەسەر بەنی هاشمو بەنی موتەلیبدا چونکە بەنی موتەلیب پشتگیری بەنی هاشمیان کرد لە کاتی نەفامیو سەرەتای ئیسلامدا، لەگەڵیان چوونە ناو شیوەکەو لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) ڕقیان هەڵسا بۆ پاراستنیشی: موسوڵمانەکانیان لەبەر گوێڕایەڵی خوداو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی، خوانەناسەکانیشیان لەبەر لووتبەرزی عەشایەریو پیاوەتی و گوێڕایەڵیکردنی بۆ ئەبوتالب ، کە مامی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)...مانای ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ یانی هەتیوانی موسوڵمانان. ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ یانی: ڕێبوار یان: ئەوەی نیازی سەفەری هەیە بۆ ماوەیەك کە نوێژی تیا کورت دەکرێتەوە. ئەوەندەی خەرجی نەبێ لەو سەفەرەدا خەرجی بکات، بەو زوانە تەفسیری ئەوە دێ لە ئایەتی زەکاتدا لە سورەتی بەرائەتدا، خوا مەیلی لێبێ، هەر پشتو پەنایە. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ ئەگەر باوەڕتان بە خوداو باوەڕتان بەوەیش هەیە کەلە ڕۆژی یەکلاکەرەوەدا(ڕۆژی بەدر) بۆ عەبدی خۆمان ناردە خوارەوە. واتە: گوێڕایەڵی ئەو بڕیارە بن کە بۆمان داناون لە پێنج یەکی ئەو دەسکەوتانە، ئەگەر بڕواتان بە خوداو بە ڕۆژی دواییو ئەوەی هاتوەتە خوارێ بۆ پێغەمبەرەکەی. بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە، لە فەرموودەی شاندەکەی عەبدولقەیسدا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی گوتن: (فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار (شت)و قەدەغەی چوار شتتان لێ دەکەم، فەرمانتان پێ دەکەم بە باوەڕ بە خودا، ئایا دەزانن باوەڕ بە خوا چیە؟ شایەتیدانە کە هیچ پەرستراوێ ناشێ بۆ پەرستنن جگە لە خوا، موحەممەدیش (ﷺ) پێغەمبەری خودایە، بەجێهێنانی نوێژو زەکات دانو پێنج یەکیش لە دەس کەوتدا بدەن)[2] ئەم فەرموودەیە بە درێژی لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە. جێبەجێکردنی پێنج یەکی لە دەسکەوتدا لە ڕیزی باوەڕ بە خوا دا داناوە. بوخاری بەشێکی دیاری کردوە لە (كتاب الايمان) دا لە سەحیحەکەیدا گوتویەتی (بەشی )بەجێهێنانی پێنج یەك لە باوەڕەوەیە) پاشان ئەم فەرموودەی ئیبنوعەبباسی هێناوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ لە ڕۆژی جیا کردنەوەدا (واتە: جەنگی بەدر) ئەو ڕۆژەی کە دوو کۆمەڵ بە یەك گەیشت خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. خودای گەورە ئاگاداری ئەدات بەو چاکەو بەهرانەی کە داویەتی بە دروستکراوەکانی. وە بەوەی کە هەقی لە نێوان ناهەقدا پێ جیا کردەوەتەوە لە

---

[1] أبوداود (٢٩٩٤)، فەرموودەیەکی باشە.

[2] فتح الباري (١/١٥٧)، مسلم (١/٤٦).

(بەدردا) کە ناوی لێنراوە ڕۆژی جیاکردنەوە،چونکە خودا وتەی باوەڕی بەرز کردوە بەسەر وتەی پوچ و ساختەدا. ئاینی خۆی سەرخستو یارمەتی پێغەمبەرو کۆمەڵەکەی خۆی دا، عەلی کوڕی ئەبوتەلحەو عەوفی ئەڵێن لە ئیبنوعەبباسەوە: (یوم الفرقان) یانی: ڕۆژی بەدر، لە ڕۆژی بەدردا خودا هەقی لە ناهەق جیا کردەوە[1] حاکم ڕیوایەتی کردوە، موجاهیدو موقسم و عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلاو زەححاكو قەتادەو موقاتیلو کەسانی تریش گوتویانە: ئەو ڕۆژە، ڕۆژی بەدرە[2].

﴿إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ ۙ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾﴾

**هەندێ لەدرێژەی ڕووداوەکانی ڕۆژی بەدر**

خودای گەورە باسی ڕۆژی جیاکردنەوە دەکات ﴿إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا﴾ کاتێ ئێوە لای خواری (شیوەکەی) نزیك (مەدینەدا) بوون ﴿وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ﴾ ئەوانیش (موشریکەکان) لە لای سەروی (شیوەکەی) دورتر (لە مەدینە)دا دامەزرابوون لە ڕووی مەککەوە ﴿وَالرَّكْبُ﴾ کاروانەکەیشی کە ئەبوسوفیانو ئەوەی کە پێی بوو لە کەلوپەلی بازرگانی ﴿أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾ لە خوارتری ئێوە بوو. واتە: لە نزیك (سیف البحر)ەوە ﴿وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ﴾ ئەگەر بەڵێنتان بە یەکتری بدایە (ئێوەو موشریکەکان لەسەر شوێنێ) ﴿لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ﴾ بێگومان کێشەتان دەبوو لە بەڵێنەکەدا (شەڕتان نەدەکرد)، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: یەحیای کوڕی عەببادی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر قسەی بۆ کردم لە باوکیەوە لەم ئایەتەدا وتوویەتی: ئەگەر ئەوە لە کاتی دیاری کراودا بوایە لە نێوان ئێوەو موشریکەکاندا، پاشان زۆری ژمارەی ئەوانتان بزانیایەو کەمی ژمارەی خۆشتان، ڕووبەڕوویان نەدەبوونەوە ﴿وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ بەڵام دەبوو هەرچی خوا بڕیاری دابوو هەر ڕوو بدات. واتە: ئەوەی خودا مەیلی لێ بووەوە کە بیکا بە دەستەڵاتی خۆی کردی لە سەرخستنی ئیسلامو موسوڵمانانو داماوکردنی بتو بتپەرستان، بێ ئەوەی دەم ڕاستو پیاوماقوڵانی ئێوەی لێبێ. ئەوەی ویستی لێبوو بە سۆزو بەزەیی خۆی کردی[3] پێغەمبەری خوداو (ﷺ) موسوڵمانان کاتێ کە

---

[1] الطبري (١٣/٥٦١).

[2] الطبري (١٣/٥٦١-٥٦٣).

[3] إبن هشام (٢/٣٢٨).

دەرچوون مەبەستیان کاروانەکەی قورەیش بوو، بەڵام خودای گەورە لەگەڵ دوژمنەکانیاندا کەیاندنی بە یەك لە کاتێکدا کە چاوەڕوانیان نەدەکرد[1] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: یەزیدی کوڕی ڕوممان بۆی گێڕامەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ئەڵێ: کاتێ کە نزیك بوەوە لە بەدر پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبوتالبو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسو زوبەیری کوڕی عەوامی لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانیدا نارد تا هەواڵی بۆ کۆ بکەنەوە، تووشی دوو ئاوبەری قورەیشیەکان هاتن، لاوێکیان لە بەرەی سەعیدی کوڕی عاسو ئەوی تریان لە بەرەی حەجاج بوو، هێنانیان بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە چاویان پێی کەوت نوێژی دەکرد، هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێیان دەپرسین لە چ بەرەیەکن؟ دەیانگوت: ئێمە ئاوبەری قورەیشین، ئێمەیان ناردوە لەم ئاوە ئاویان بۆ ببەین. خەڵکەکە قسەکانیان پێ خۆش نەبوو وابۆی ئەچوون لەلایەن ئەبوسوفیانەوە هاتبنو دەستیان کردە لێدانیانو کاتێ کە ئازاریان ئەدان گوتیان: ئێمە لەلایەن ئەبوسوفیانەوەهاتوین، وازیان لێ هێنان، پێغەمبەری خودا کوڕنوشی بردو دوو سوژدەیشی برد پاشان سەلامی دایەوەو فەرمووی: (کاتێ ڕاستیان پێ گوتن: لێتان ئەدان، کە درۆیان لەگەڵدا کردن وازتان لێهێنان. سوێند بە خودا ئەوان لە قورەیشیەکانن ، ئادەی لە بارەی قورەیشەوە قسەم بۆ بکەن). گوتیان:ئائەوانەن کە لە پشت ئەو تەپۆڵکەوەن،تەپۆڵکە بریتی یە لەکۆمەڵێکی زۆر لمی بیابان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەو کۆمەڵە چەندێکن؟) گوتیان: زۆرن. فەرمووی: (کەرەسەو تفاقیان چیە؟) گوتیان: نازانین. فەرمووی: (چەند (وشتر) سەر دەبڕن هەموو ڕۆژێ؟) گوتیان: ڕۆژێ وا هەیە نۆ وشترو ڕۆژێ واش هەیە دە وشتر سەردەبڕن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەو کۆمەڵە لە نێوان نۆ سەد کەس تا هەزار کەس دەبن). پاشان پێی گوتن: (کێیان لەناودایە لە پیاوماقوڵانی قورەیش؟) گوتیان: عوتبەی کوڕی ڕبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو ئەبولبوختوری کوڕی هیشامو حەکیمی کوڕی حیزامو نەوفەلی کوڕی خوەیلدو حارسی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلو تەعەیمەی کوڕی عەدی کوڕی نەوفەلو نەزری کوڕی حارسو زەمعەی کوڕی ئەسوەدو ئەبوجەهلی کوڕی هیشامو ئومەیەی کوڕی خەلەفو نوبەیهو مونەبیهە کوڕانی حەجاجو شەهلی کوڕی عەمرو عەمری کوڕی عەبدی ودد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: (ئەمە مەککەیەو هەرچی جگەرگۆشەکانی خۆی هەیە بۆی هاوێشتون)[2]. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ﴾ بۆ ئەوەی لەناو بچێ ئەو کەسەی (بە لای خواوە) لەناوچووە. وە بۆ ئەوەی بژی ئەوەی (بەلای خواوە) دەژی بە

---

[1] الطبري (١٣/٥٦٦).

[2] إبن هشام (٢/٢٦٨).

بەڵگەی ئاشکراوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: واتە: ئەوەی حاشا دەکات با حاشا بکات دوای ئەو پەندو ئامۆژگاریەی کە بە چاوی خۆیان دیانو وەریانگرت. ئەوەیش باوەڕی هێنا با باوەڕ بێنیّ، لەسەر ئەو پەندو ئامۆژگاریانە.[1] ئەمە تەفسیرێکی باشەو ڕوونە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: لەبەر ئەوە لەگەڵ دوژمنەکانتاندا کۆی کردونەتەوە لە یەك شوێندا لە کاتێکی دیاری نەکراودا، تا سەرتان بخات بەسەریانداو وتەی هەق سەرکەویّ بەسەر پڕوپوچدا، بۆ ئەوەی کارەکە دەرکەویّو بەڵگەی تەواو ئاشکرا ببیّو هیچ کەس قسەی نەمێنیّو گومانی خراپ نەبات، ئەوسا ئەوەی تیا چووە با تیا بچیّ. واتە: ئەوەی بەردوامە لەسەر خوانەناسی با هەر بەردەوام بیّ، ئاگاداری ئەو کارەی خۆی بیّو بزانیّ پڕوپوچە دوای ئەو بەڵگە ئاشکرانە کە بۆی هاتوە. ﴿وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ تا ژینی هەر کەسیّ (کە بڕوا دێنیّ) بە بەڵگەی ئاشکراوە بیّو لەسەر چاوڕۆشنی بیّ، چوون باوەڕ ژیانی دەروونە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾[2] ئاخۆ کەسیّ کە مردوو بوو ئێمە زیندوومان کردەوەو ڕووناکیمان خستە پێشی بە سەربەستی لەناو خەڵکدا بوو دەسوڕایەوە، وەك کەسێکە لەناو تاریکیدایەو هیچ دەرەتانێکی نیە؟ عائیشە لە ڕووداوی بوختانەکەدا ئەڵێت :( فهلك فيّ من هلك )یانی: ئەوەی تیا چوو دەربارەی من تیا چوو، واتە: ئەوەی هەرچی گوت گوتی لە هەڵبەستنی بوختانەکەدا (تیا چوو)[3] ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا دەبیسیّو ئاگادارە. واتە: پاڕانەوەو هانا بردنو لاڵەکەتان دەبیسیّ کە لێی دەکەن ﴿عَلِيمٌ﴾ واتە: ئاگای لێتانەو دەزانیّ کە ئێوە شایستەی سەرکەوتنن بەسەر دوژمنە خوانەناسو لاسارەکانتاندا.

﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾﴾

---

[1] الطبري (١٣/٥٦٨).

[2] الانعام (١٢٢).

[3] أحمد (٦/١٩٥).

**خودا هەر كۆمەڵێكی بە كەمتر نیشان دا لە چاوی ئەوی تردا**

خـــودای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿ إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ﴾ لـــە خەونتـــدا (ئـــەی موحەممەد(ﷺ)) خوا ژمارەی ئەوانی كەم نیشان دای. موجاهیدئەڵێ: خودا ئـەوانی (موشـریكەكانی) لە خەودا بە كـەم نیـشاندا. پێغەمبـەریش بـەو شـێوەیە هـەواڵی دا بـە هاوەڵـەكانی، ئـەوە بـووە هـۆی ڕاوەستاویان[١] ئیبنوئیسحاق و كەسانی تریش هـەر وایـان گوتـوە[٢] ﴿أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ﴾ ئەگـەر زۆری ئەوانی نیشان بدانایە تێدەشكان. ﴿وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ ناكۆكیتان لـەناو خۆتانـدا لێ پەیدا دەبوو، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ﴾ بەلاَم خودا ئێوەی پاراست لەوە، كە بە كەمی ئـەوانی پیـشاندان ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ خـۆی لـە نهێنـی دلانـیش ئاگـادارە. واتـە: هەرچـی لـەناو دڵەكانتاندایـە خـودا دەیزانێ و ئاگای لێیەتی ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾[٣] خودا دەزانێ كـێ چاوی خیانـەتی هەیـەو چـی لـە دڵـدا شـاردوەتەوە. وە ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا ﴾ ئەوساش كە تووشی یەك هاتن، لەبـەر چاوتان ئـەوانی كـەمتر نیـشان دا، ئەمـەیش هـەر لەبـەر سـۆزو بەزەیی خوداوەیە پێیان كە خوانەناسانی بـە كـەمتر نیشانی خـاوەن بـاوەڕان دا. تـا هورەیـان بـەرز بێتـەوەو تـەمایان تـێ بكـەن. ئەبوئیـسحاقی سـەبیعی لـە ئەبوعوبەیـدەوە، لـە عەبـدوڵلای كـوڕی مەسـعودەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ)ئـەڵێ: بەڕاسـتی ئـەوان (موشـریكەكان) لەبـەر چـاوی ئێمـە كـەم بووبوونەوە لە ڕۆژی بەدردا، هەتا گوتم بە پیاوێ لە تەنیشتم بوو، تۆ بە هەفتا كەس نایانبینی؟ گوتی: نەخێر ئەوانە سەد كەسن، هەتا یەكێكمان لێ (بـەدیل) گرتن، پرسـیارمان لێ كـرد گـوتی: هـەزار كـەس بوین.[٤] ئیبنوئەبی حاتەم و ئیبنوجەریریش ڕیوایەتیان كـردوە. ئیبنوئـەبی حاتـەم ڕیوایـەتی كـردوە لـە عیكرمــەوە لــەم ئایەتــەدا ﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ ﴾ كـە تووشی یەك هاتن، لەبەر چاوتان ئەوانی كەمتر نیشان داو ئێوەشی كەم هێنایە بەر چاوی ئەوان.ئـەڵێ: لە یەكتری هاندان.[٥] سەنەدەكانی ڕاستە. موحەممەدی كوڕی ئیسحاق ئەڵێ: یـەحیای كـوڕی عەبـدوڵلای كوڕی زوبەیر بۆی باس كردم لە باوكیـەوە لـەم ئایەتـەدا: ﴿لِّيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا وَإِلَى ٱللَّهِ

---

[١] الطبري (١٣/٥٧٠).

[٢] الطبري (١٣/٥٧٠).

[٣] غافر (١٩).

[٤] الطبري (١٣/٥٧٢).

[٥] إبن أبي حاتم (٥/١٧١٠).

تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ئـەڵێ:یانی دەبـوو خـودا _کارێ کـە بڕیاری دابـوو_ بیهێنێتـە جـێ. کارەکـانیش هـەر دەچنەوە لای ئەو. واتە: دەبوو لە نێوانیاندا ئـەو شـەڕە ڕوو بـدات، بـۆ ئـەوەی تۆڵـە بسێنێ لەوانـەی دەیەوێ تۆڵەیان لێ بسێنێ. ئەوانەش بەهرەدار بکا کە دەیەوێ بەهرەداریان بکا لە دۆستەکانی.[1] مانای ئەوەیە خوای گەورە هەردوو لای لە یەکتری هەڵناو لەبەر چاوی یـەکتری بـە کـەم نیشانیدان، تـا تـەما بکەنە یەکتری. ئەوەش لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا بوو، کـاتێ شـەڕ دەسـتی پێکـردو خـودا پـشتگیری خاوەنباوەڕانی کرد بە هەزار فریشتە کـە بەیەکـەوە بـوون، تـا لەوێدا کۆمـەڵی خوانەناسـان، کۆمـەڵی خاوەنباوەڕانیان بـە بێهێزو لاواز دەبینـی وەك خـودای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾[2] ئەمـە بـۆ ئێـوە وانەیـەك بوو کە دوو دەستە لە خۆتان بە گژ یەکدا چوون. دەستەیەکتان بۆ خودا بەشەڕ هاتن‌و دەستەکەی تـر لە دژی خودا دەجەنگین‌و چاك دەیانبینی کە خوانەناسان دوو ئەوەندەی ئەمانن، دیارە خودا بە مەیلی خۆی هەر کەسێ خۆی بیەوێ سەری دەخات ئەمەش پەندە بـۆ ئەوانـەی خـاوەن فـامن. ئـا ئەمـە ئـەو کۆکردنەوەو یە لە نێوان ئەو دوو ئایەتەدا. بێگومان هەردوکیان هەق‌و ڕاسـتن، سـوپاس‌و ستایش هـەر بۆ خودایە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٤٥ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦﴾

**فێربوونی ڕەوشتەکانی جەنگ**

ئەمە فێرکردنێکە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ بەندە خاوەنباوەڕەکانی لەسەر ڕەوشـتی ڕووبـەڕوو بونەوەو جوامێری لە کاتی بەرەنگار بونەوەی دوژمنـدا، ئەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ﴾ ئەی کۆڕی خاوەن باوەڕان! ئەگەر لەگەڵ دوژمنان ڕووبەڕوو بن، خۆ بگرن. لە هـەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفاوە، لە پێغەمبەری خـوداوە (ﷺ) کـە چاوەڕوانی دەکرد لە هەندێ ڕۆژەکانیدا کـە تێیـدا دەگەیـشت بـە دوژمـن، هـەتا کـاتێ کـە خـۆر لار دەبـووەوە لـە ناویاندا ئەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە خۆزگە مەخوازن بکەن بە دوژمن، داوای لەش ساغی لە خودا بکەن،

---

[1] إبن هشام (٢/٣٢٨)، إبن أبي حاتم (٥/١٧١٠).

[2] آل عمران (١٣).

ئەگەریش پێیان گەیشتن خۆڕاگر بن. چاك بزانن بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) هەڵساو دیسان فەرمووی: (ئەی خودایە دابەزێنەری قورئان و جوڵێنەری هەورەکان، ئەی ڕوخێنەری حیزب و کۆمەڵە (بێباوەڕەکان) تێکیان بشکێنەو سەرمان بخە بە سەریاندا)[1] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوەئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خۆزگە مەخوازن بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن، داوای تەندروستی لە خوا بکەن، ئەگەر ڕووبەڕووشیان بونەوە خۆ ڕاگرن ویادی خودا بکەن، ئەگەرقاڵەو قیرەیان کردو دەنگیان لێوەهات، دەبێ ئێوەبێدەنگبن)[2].

## فەرماندان بە خۆڕاگری لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا

خودای گەورە فەرمانی داوە بە خۆڕاگری لە کاتی جەنگدا لەگەڵ دوژمنداو ئارام گرتن لە ڕووبەڕووبونەوەدا، ڕا نەکەن و چۆك دانەدەن و نەترسن، دەبێ یادی خودا بکەن لەو حاڵەداو لە بیری نەکەن، بەڵکو دەبێ داوای یارمەتی هەر لەو بکەن و پشت بەو ببەستن و داوای سەرکەوتنی لێ بکەن بەسەر دوژمندا وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ زۆر یادی خودا بکەن، بەڵکو ئێوە سەرکەون (ڕزگار بن). وە دەبێ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بن(ﷺ) لەو کاتەدا. ئەوەی خودا فەرمانیان پێدەکات جێبەجێی بکەن و ئەوەیش قەدەغەی دەکات لێیان وازی لێ بێنن و لە نێوان خۆیاندا ناکۆك نەبن و لە یەك جیا ببنەوە کە ببێتە هۆی تێکشکان و سەنەکەوتنیان ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی بکەن، نەچن کێشەتان لێ پەیدا ببێ و بەهۆیەوە بشکێن و هەموو هێزتان لەناو بچێ، ئەو ئامادەیەی کە هەتانە نەمێنێ، ﴿وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ خۆڕاگر بن! خودا لەگەڵ خۆڕاگرانە. بێگومان هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی جوامێری و ئازایەتی و گوێڕایەڵیدا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وێنەیان نەبووە لە هیچ سەردەم و لە هیچ گەلێکدا لە پێش خۆیانەوە، ئەوەیش بەهۆی بەرەکەتی پێغەمبەرو گوێڕایەڵی هاوەڵەکانی بووە بۆی، بۆ هەر کارێ کە پێی سپاردبن، دڵەکانی والا دەکردو هەرێمەکانیشی بە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە ڕزگار دەکرد لە ماوەیەکی کەمدا، لەگەڵ کەمی ژمارەیاندا لە چاو لەشکرەکانی هەرێمەکانی تردا، لە ڕۆمەکان و فارس و تورك و ساقالبەکان و بەربەرو حەبەشەکان و سودانیە جۆربەجۆرەکان و قیبت و تیرەو هۆزەکانی بەرەی ئادەم، زاڵ بوون بەسەریاندا، تا وتەی خودا بەرز بوەو ئاینەکەیشی سەرکەوت بەسەر ئاینەکانی تردا،

[1] فتح الباري (١٤٠/٦)، مسلم (١٣٦٢/٣).

[2] عبدالرزاق (٢٥٠/٥)، سەرەتاکەی سەحیحەو کۆتاییەکەی لاوازە.

دەسەڵاتو قەڵەم ڕەوی ئیسلامی لە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای زەویدا فراوان بوو، لە کەمتر لە سی ساڵدا، خودای گەورە لە هەموویان ڕازی بێو ئێمەیش لەگەڵ ئەواندا کۆ بکاتەوە، بەڕاستی خودا بەخشندەو میهرەبانە.

﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَـٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾

**شێوازی هاتنە دەرەوەی موشریکەکان بۆ ڕۆژی بەدر**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ ئێوە وەك ئەوانە مەبن، بۆ خۆبینیو ڕووبینی لەناو خەڵکی لە زێدەکەیان هاتنە دەرەوە. دەیانەویست ڕێگەی خودا بەربەست بکەن، خودا لە هەموو کارێکیان ئاگادارە. خودای گەورە دوای ئەوەی داوای لە خاوەنباوەڕان کرد کە دڵسۆز بن لە شەڕ کردنداو تەنیا لەبەر ڕەزای خوا بجەنگنو زۆر یادی خودا بکەن، لێرەیشدا فەرمانیان پێدەکات کە چاو لە موشریکەکان نەکەن کاتێ لە شوێنی خۆیان هاتنە دەرەوە بۆ خۆ هەڵبڕینو خۆ دەرخستنەوە بەسەر خەڵکیدا خۆیان بنوێنن. وەك ئەبوجەهل کاتێ کە پێیان گوت: کاروانەکە ڕزگاری بووە بگەڕێنەوە. وتی: نەخێر بە خوا ناگەڕێینەوە هەتا دەچینە سەر ئاوەکانی بەدرو وشتر سەردەبڕینو ئارەق دەخۆینەوەو کەنیزەکان گۆرانیمان بۆ دەڵێنو بۆئەوەی عەرەبەکان باسی مانەوەمان لێرەدا تا هەتایە دەگێڕنەوە. کەچی هەموو ئەمانە پێچەوانە بوویەوە بۆیان ، چونکە کاتێ هاتنە سەر ئاوی بەدر، بە مردوویی هاتنە سەری فڕێ درانو لول درانە ناو بەدر بە سوکیو ڕسواییو بەدبەختی لەگەڵ سزایەکی نەبڕاوەو تا هەتایە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ خودا لە هەموو کارێك کە دەیکەن ئاگادارە. واتە: خودای گەورە ئاگادارە لەوەی لە پێناویدا دێنو دەیانەوێ بیکەن. بۆیە لەسەر ئەو کارەی کە پێی هەڵسان بە خراپترین شێوە تۆڵەیان لێ سەندن.[1] ئیبنوعەبباسو موجاهیدو قەتادەو زەححاكو سوودی لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەڵێن:

---

[1] إبن هشام (٢/٣٢٩).

ئەوانە ئەو موشریکانەن شەڕیان لەگەڵ پێغەمبەردا کرد (ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا.[1] موحەممەدی کوڕی کەعب ئەڵێ: کاتێ قورەیشیەکان هاتنە دەرەوە لە مەککەوە بۆ بەدر، بە گۆرانی وتن‌و دەف لێدانەوە هاتن، خودای گەورەیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾.

## شەیتان موشریکەکانی هەڵخەڵەتاندو کارەکانی لا جوان کردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ شەیتان ئاکاری ئەوانی ئەو کاتە لەبەر جوان کردن، گوتی: ئەمڕۆ هیچ هێزێك سەرناکەوێ بەسەرتاندا، منیش جێگەی هاناتانم لە کاتێکدا هەردوو لا ڕووبەڕووی یەکتر بونەوە، پێ دزەی کردو بۆی دەرچوو. شەیتان (لەعنەتی خوای لێبێ) ئەوەی موشریکەکان بۆی دەهاتن جوان‌و ڕازاوەی کرد لەبەر چاویان بە تەماشی کردن کە ئەمڕۆ هیچ کەسێ لەو خەڵکە بەسەریاندا زاڵ نابێ.[2] بێ ترسیشی کردن لەوەی کە خێڵی بەنی بەکری دوژمنیان لە زێدی خۆیاندا پەلاماریان بدەن‌و وتی: من جێی پەناو هانای ئێوەم، ئەوەبوو خۆی لە وێنەی سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومدا نیشاندا بۆیان، کە گەورەی بەنی مودلەج بوو، دەسەڵاتداری ئەو ناوچەیە بوو. موشریکەکان هەرچیان بەسەرهات، هۆکارەکەی ئەوە بوو، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾[3] یانی: شەیتان بەڵێنیان پێ دەداو دەیانخاتە سەر ئارەزوو، ئەو بەڵێنەی کە شەیتان بەوانی دەدا، فریودان نەبێ هیچی تر نیە. ئیبنوجورەیج ئەڵێ: ئیبنوعەبباس ئەڵێ لەم ئایەتەدا: کاتێ ڕۆژی بەدر هات، شەیتان بە ئاڵاکەیەوە ڕۆشت‌و لەشکرەکەیشی لەگەڵ بتپەرستەکاندا بوو، خستیە ناو دڵی بتپەرستەکانەوە هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ، من جێی پەناتانم، کاتێ کە ڕووبەڕوو بونەوە، شەیتان سەیری یارمەتی فریشتەکانی کرد ﴿نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ خۆی گرتە دواو ڕایکرد ﴿وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ﴾ گوتی: من لەگەڵ ئێوە نیم، من شتی وام دێتە بەر چاو کە ئێوە چاوتان لێی نیە.[4] عەلی کوڕی ئەبی تەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: شەیتان هات لە ڕۆژی بەدردا بە

---

[1] الطبري (١٤/٨-٩).
[2] الطبري (١٤/١١).
[3] النساء (١٢٠).
[4] الطبري (١٤/٩).

لەشکرێکی پێکهاتوو لە شەیاتینەکان ئاڵاکەی خۆی پێ بوو، لە وێنەی پیاوێکی بەنی مودلەجدا لە شێوەی سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومدا شەیتان گوتی بە بتپەرستەکان: هیچ کەسێ سەرناکەوێ بەسەرتاندا ئەمڕۆ لەم خەڵکە، من جێی پەناو هانام بۆ ئێوە، کاتێ کە خەڵکەکە ڕیزایان بەستو پێغەمبەر(ﷺ) مشتێ لە خۆڵی هەڵگرت بەرەو ڕووی موشریکەکان هاوێشتی، بەرەو دوا گەڕانەوەو قوچاندیان. جوبرەئیلیش بەرەو ڕووی شەیتان هات، لەو کاتەدا شەیتان دەستی لە دەستی پیاوێکی بتپەرستدا بوو، دەستی بەرداو بەرەو دوای خۆیی و تاقمەکەی ڕایان کرد (هەڵیان تۆڕاند) پیاوێ پێی گوت: ئەی سوراقە ئایا تۆ نەتگوت جێی پەنای ئێمەی؟ شەیتان گوتی: من شتێ وام دێتە بەر چاو کە ئێوە چاوتان لێی نیە، ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ من لە خودا دەترسم، تۆڵەی خودا زۆر دژوارە. ئەوەیش لەو کاتەدا بوو کە فریشتەکانی بینیووە[1].

### هەڵوێستی دووڕووەکان لە ڕۆژی بەدردا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡ﴾ دووڕووان و ئەوانەی ناو دڵیان نەخۆشە، گوتیان: ئەوانە بە ئاینەکەیان خەڵەتاون عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا ئەڵێ : کاتێ ئەو خەڵکە لە یەکتری نزیک بوونەوە، خودا موسوڵمانەکانی لەبەر چاو بتپەرستەکاندا بە کەمی نیشانداو بتپەرستەکانیشی لەبەر چاو موسوڵمانەکان بە کەم نیشاندا، بت پەرستەکان گوتیان: ئەوانە بە ئاینەکەیان خەڵەتاون. لەبەر کەمی موسوڵمانەکان لەبەر چاویان ئەوەیان گوت، وایان دەزانی بەو زووانە دەیانشکێنن، گومانیان لەوەدا نەبوو. خودای گەورەیش فەرمووی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[2] هەرکەسێ خۆ بە خوا بسپێرێ، خودا خاوەن دەستەڵات و دڵۆڤانە. قەتادە گوتی: بتپەرستان دەستەیە لە خاوەن باوەڕانیان بینی کە زۆر بە توندی بەرفەرمانی خودان (بۆمان باس کرا، کە دوژمنی خودا ئەبوجەهل کاتێ کە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی چاو پێکەوت،زۆردارانەودڵڕەقانە گوتی: سوێند بە خوا دوای ئەمڕۆ هیچ کەس خوا ناپەرستێ.[3] عامیری شەعبیش ئەڵێ: هەندێ لە خەڵکی مەککە کە موسوڵمان بووبوون، هاتنە دەرەوە لەگەڵ بتپەرستەکاندا ڕۆژی بەدر، کاتێ موسوڵمانەکانیان بە کەمی چاو پێکەوت، گوتیان: ئەوانە بە ئاینەکەیان خەڵەتاون[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن

---

[1] الطبري (١٤/٧).

[2] الدر المنثور (٤/١١).

[3] الطبري (١٤/١٤).

[4] الطبري (١٤/١٣).

يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ واتە: کەسێ خۆی بە خودا بسپێرێ ﴿فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ﴾ خودا خاوەن دەسەڵاتە، هەرکەسێ خودا پەنای بێ ستەمی لێ ناکرێ، دەسەڵاتی گەورەو بەهێزە ﴿حَكِيمٌ﴾ لە کردارەکانیدا کارزانەو هیچ کارێ ناکات لە جێی خۆیدا نەبێ. هەرکەسێ شایەنی سەرکەوتن بێ، سەری دەخات، هەرکەسیش شایەنی ڕسوایی بێ ڕسوای دەکات.

﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾﴾

## لێدانی فریشتەکان لە خوانەناسان لە کاتی گیانکێشانیاندا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ ئەگەر دەتبینی کاتێ فریشتەکان گیانی خوانەناسەکان دەکێشن و لە دەموچاوو پشتیان ئەدەن و پێیان دەڵێن: دەسا دەردی بە ئاگر سووتان بچێژن. خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر چاوت لێدەبوو کە فریشتەکان چۆن گیانی خوانەناسان دەکێشن، بێگومان کارەساتێکی زۆر گەورەو گران و ترسناک و چاوەڕوان نەکراوت دەبینی. موجاهید ئەڵێ: ﴿وَأَدْبَارَهُمْ﴾ یانی: دەکێشن بە دواوەیاندا لە ڕۆژی (بەدردا)، ئیبنوجورەیج ئەڵێ: ئیبنوعەبباس ئەڵێ: کاتێ کە موشریکەکان ڕوویان کردە موسوڵمانەکان بە دەم و چاویان، موسوڵمانەکان بە شمشێرەکانیان دایان لە دەم و چاویان، کاتێ کە بەرەو دوا ڕایان کرد فریشتەکانیش دەکێشن بە پشت و دواوەیاندا.[1] ئەم دەقە قورئانیە هەرچەندە هۆکارەکەی ڕووداوی بەدرە، بەڵام هەموو خوانەناسێ دەگرێتەوە، بۆیە خودای گەورە تایبەتی نەکردووە بە خەڵکی بەدرەوە. بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾ وە لە سورەتی موحەممەدیشدا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾[2] دەبێ چۆن بن ئەو کاتەی فریشتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕووخسارو پشتیان دەسرەوێنن؟ وە لە سورەتی ئەنعامدا لە پێشەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ﴾[3] بریا وەختی گیان کێشان تۆ ناهەقیکارانت

---

[1] الطبري (١٤/١٦).

[2] محمد (٢٧).

[3] الانعام (٩٣).

بدیایە، کە فریشتەکان لێیان ڕاساونەتەوە کە: گیانیان لە لاشەیان دەرخەن‌و خۆیان ڕزگار کەن. واتە: لێیان دەراسێنەوە بە دەستیان لێیان ئەدەن بە ئیزنی پەروەرندەتان، لەو کاتەدا زۆر بە ناڕەحەتی هەناسە ئەدەن‌و گیانیان لە لاشەیان نایەتە دەرەوە، بە زۆر گیانیان دەردەهێنن تا لەو ساتەدا مژدەی سزاو تورەبوونی خودایان پێ ڕادەگەیەنن. وەك لە فەرموودەکەی بەرائدا هاتوە کە فریشتەی گیانکێشان هات بۆ لای خوانەناس لە کاتی گیان کەنشتدا بەو شێوە نەناسراوەوە دەڵێ: ئەی گیانی‌و پیس‌و بۆگەن! وەرە دەرەوە بۆ ناو گڕە باو ئاوی کوڵاوو چڕە دووکەڵ سێبەرتانە. گیانی بڵاو دەبێتەوە دەری دێنێ لە لاشەی وەك چۆن ئاسنی دڕکاوی لەناو خوری تەڕدا دێتەدەر. دەمارو ڕەگو ڕیشەی لەگەڵیدا دێتە دەر[1]. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: فریشتەکان دەڵێن بە خوانەناسان: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ ئەمە سزای ئەو کارانەن کەبەدەستی خۆتان دەتانکردن. واتە: ئەم سزایە بەهۆی ئەو کارە خراپانەیە لە ژیانی دنیادا کردتان، خودا جەزرەبەی داون‌و تۆڵەی لێ سەندوون لەسەری بەم شێوەیە. ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ خودا هەرگیز غەدر لەعەبدی خۆی ناکات. واتە: ستەم لەهیچ کەسێ ناکات لە دروستکراوەکانی، بەڵکو خودا ئەو دادگەرەیە کە ستەم لە هیچ کەسێ ناکات، پاك‌و بەرزو بڵندو پیرۆزە دوورە لە هەموو عەیبێك‌و بێ نیازەو سوپاس‌و ستایش کراوە. بۆیە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە لە موسلیمەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە ئەبوزەڕەوە ڕیوایەت کراوە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)خودای گەورە ئەفەرموێت: (ئەی عەبدەکانم من ناهەقیم لەسەر خۆم قەدەغە کردوە، وە لە ناو ئێوەیشدا هەر قەدەغەم کردوە. هەرگیز ناهەقی لە یەکتری مەکەن ئەی عەبدەکانم، بێگومان ئەوە ئاکارەکانتانە هەژماری دەکەم هەرکەسێ (لەکارنامەکەیدا) چاکەی بینی با سوپاسی خودا بکات، هەرکەسیش جگەلەوەی چاو پێکەوت، با تەنیا سەرزەنشتی خۆی بکات)[2].

﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ ۙ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٥٢﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ ۙ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ ئاکاریان هەروەك ئاکاری دارو دەستەی فیرعەون‌و ئەو کەسانەیە پێش ئەوان بوون، کە لە نیشانەکانی خودا حاشایان کرد. خودای گەورە باسی خوانەناسی قورەیش دەکات‌و ئەفەرموێت کاری ئەو بتپەرست‌و بێ

[1] أحمد (٤/٢٨٧-٢٨٨)، سەحیحە.

[2] مسلم (٤/١٩٩٤).

باوەڕانە، بەوەی تۆم پێ ناردوە ئەی موحەممەد(ﷺ) وەك كاری ئەو گەلە بێ باوەڕانەی پێشی وایە، ئەوەمان بەسەر هێنان، كە بەسەرمان هێنان هەر ئەوە دابو باوی ئێمەیە، هەر بەو شێوەیەش دەكەین لەگەڵ ئەو گەلانەی وەك ئەوانن لە هۆزی فیرعەونو ئەو گەلانەی بەر لەوانیش كە پێغەمبەرەكانی خۆیان بە درۆزن دەزانی. بڕوایان بە نیشانەكانی خودا نەدەهێنا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ خوداش لە سزای گوناهەكانیان وەبەر غەزەبی خۆی خستن. واتە: بەهۆی گوناهەكانیانەوە لەناو بردنو هیچی نەهێلان. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ خودا بەهێزو توانایە تۆڵەی ئەو زۆر توندو تیژە. هیچ كەسێ دەسەڵاتی بەسەریدا نیەو یاخیەكیش لە دەستی دەرناچێ.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ ۚ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ چونكە خودا دەرووی چاكەی لە هەر گەلێ كردبێتەوە، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆڕیبێ، هەرگیز خودا لێی نەگۆڕیوون، خوا زۆر بیسەرو زانایە. خودای گەورە باسی دادوەری خۆی دەكات لە بڕیارەكانیدا كە ئەو بەهرانەی داویەتی بە هەر كەسێ ئەو كەسە خۆی نەیگۆڕیبێ، بەهۆی ئەو گوناهانەوە كە كردویەتی لێی نەسەندوەتەوە وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾[1] خوابارودۆخ لە هیچ گەلێ ناگۆڕێ تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن، ئەگەر خودا بیەوێ گەلێ تووشی بەلا ببێ، هیچ بەربەستێك نایەتە بەرو خوداش نەبێ هیچ كەس دۆستایەتیان ناكات. پاشان ئەفەرموێت: ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ ۚ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ﴾ جا ئەوانە (وەك دارو دەستەی فیرعەونو پێشینانیان بەو دەردە چوون)، بە نیشانەی خوای خۆیان باوەڕیان نەكرد، بەهۆی گوناهەكانیانەوە لەناومان بردن، هەرچی سەر بە فیرعەونیش بوون بڕیارمان دا كە لە ئاودا بخنكێن كە هەموویان ستەمكار بوون. واتە: ئەوەی كردی بە دارو دەستەی فیرعەونو وێنەیان، كاتێ كە بڕوایان بە نیشانەكانی خودا نەكرد، قڕی كردن

---

[1] الرعد (١١).

بەهۆی تاوانەکانیانـەوەو ئـەو بەهرانـەی کـە پێـی بەخـشیبوون لـە بـاغو بـاغـاتو کـانیـاوو کـشتوکاڵو گەنجینەو پلەو پایەی بەرزو بەهرەی زۆری تریش کە پێیان درا بوو لێی سەندنەوە، خـودا ناهـەقی لێ نەکردن لەو بارەیەوە، بەڵکو خۆیان ناهەقیان لە خۆیان کرد.

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾﴾

**فەرماندان بە لێدانی توندی ئەوانەی بێباوەڕنو پەیمان دەشکێنن**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ﴾ خـراپترین زیندەوەران لـەلای خـودا ئەو کەسانەن کە خودایان نەناسیوەو هەرگیزیش بڕوا ناهێنن، ئەو کەسانەی پـەیمانت لەگـەڵ بەسـتنو لە پاشان هەموو جارێ پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوەو هیچ ترسی خوایان نیە. خودای گەورە لێرەدا ئاگادارمان دەکات کە خراپترین زیندەوەر کە بەسەر زەویدا دەگەڕێ، ئـەو کەسـانەن کە خوانەناسنو ناشیانەوێ باوەڕ بێنن، ئەوانەی کە هەر کاتێ پەیمانێکیان بەستبێ لێی پەشیمان بونەتەوە، هەر کاتێ سوێندێکیشیان خواردبێ، سوێندەکەیان شکاندوە ﴿وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ﴾ واتە: لە خـوا ناترسن لە هـەر تاوانێکـدا کـە دەیکـەن ﴿فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ جـا ئەوانەت لە جەنگدا وەگیر هێنـا لەگـەڵ ئەوانەشـی کە هـاتوون پـشتیان بگـرن (تـەفروتونایان بکـە)، ئیبنوعەبباسو حەسەنی بەسریو زەححاکو سوودیو عـەتای خۆراسـانیو ئیبنوعویەینەئـەڵێن: یانی: بیانکە بە پەند بۆ کەسانی تری دوای خۆیان[1] ماناکەی ئەوەیە، بە توندی تۆڵەیان لێ بسێنەو زۆریان لێ بکـوژە، بـۆ ئـەوەی دوژمنـەکانی تـر لـە عەرەبـەکانو جگەلـە عەرەبـەکانیش بترسـنو ببێتـە پەنـدو ئامۆژگاری بۆیان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیر بکەنەوە. سوودی ئەڵێ: بەڵکو بترسن لـەوەی کە پەیمان بشکێنن، ئەوەیان پێ بکەن کە بە ئەمانە کرا.[2]

﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾

---

[1] الطبري (١٤/٢٣-٢٤).

[2] الطبري (١٤/٢٣).

**فەرماندان بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و دانەوەی بەسەر دوژمندا پاش دەرکەوتنی ناپاکی لێیان**

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً ﴾ ئەگەر ترسای لەوەی کۆمەڵێ لەو سوێند خۆرانە (کە پەیمانت لەگەڵدا بەستون) خائن دەرچوون واتە: ئەو پەیمان و بەڵێنەی لە نێوان ئێوەو ئەواندا بوو شکاندیان ﴿فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ﴾ تۆش وەك ئەوان سوێندەکەیان بەسەردا بدەرەوە. واتە: ئاگاداریان بکە کە تۆش بەڵێنەکەیانت هەڵوەشاندوەتەوە. هەتا هەردوو لا ئاگادار بن، کە تۆ لە شەڕدای لەگەڵ ئەوان و ئەوانیش لە شەڕدان لەگەڵ تۆ. هیچ پەیمانێ لە نێوان تۆو ئەواندا نەماوەو وەك یەکن، واتە: تۆو ئەوان وەك یەکتان لێدێت لەوەدا ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾ خودا گزیکارانی خۆش ناوێ. واتە:گزیکردن ئەگەر بەرانبەر خوانەناسانیش بکرێ خوا هەر پێی ناخۆشە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سەلیمی کوڕی عامیرەوەئەڵێ: مەعاویە بەناو ئەرزی ڕۆمدا دەڕۆشت لە نێوان ئەوو ڕۆمەکاندا ماوەیە مابوو (ماوەی پەیمان بەستن) مەعاویە دەیویست لێیان نزیك ببێتەوە، کاتێ کە پەیمانەکە کۆتایی هات بدات بە سەریاندا لەو کاتەدا پیاوێکی بەتەمەن بەسەر ولاخێکەوە بوو ئەیوت:(الله اکبر،الله اکبر)، بەوەفا بن، ناپاك مەبن. بەڕاستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێ (پەیمانێکی) لە نێوان خۆیی و نێوان کۆمەڵێکدا هەبوو، نە پەیمانەکەی هەڵوەشێنێتەوە نە گرێی بدات، هەتا ماوەکەی تەواو دەبێ، یان سوێندەکەیان بەسەردا بداتەوە تا هەردولا یەکسان دەبن،ڕاویەکە ئەڵێت:) ئەو هەواڵە گەیشتە مەعاویەو بەرەو دوا گەڕایەوە.کەسەیریان کرد ئەو پیاوە بەتەمەنە عەمری کوڕی عەنبەسە بوو (ڕەزای خوای لێبێ)[1] ئەم فەرموودەیە ئەبوداوودی تەیالیسی و ئەبوداوودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنوحیبان ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی چاکو سەحیحە[2].

﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾

---

[1] أحمد (١١/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أبوداود الطيالسي (١٥٧)، أبوداود (١٩٠/٣)، تحفة الاحوذي (٢٠٣/٥)، النسائي (٢٢٣/٥)، إبن حبان (١٨٢/٧)، سەحیحە.

**فەرماندان بە خۆئامادە کردن بە پێی توانا تا دوژمنی خوای پێ بترسێنری**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَبَقُوٓا۟ ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴾ خوانەناسان وا بیر نەکەنەوە پێش کەوتوون، ئەوان ئێمە نابەزێنن. خودای گەورە بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ئەفەرموێت: خوانەناسان با وا نەزانن لە دەستمان دەرچوونو توانامان بەسەریاندا نیە بەڵکو لە ژێر زەبرو زەنگی توانای ئێمەدانو لەبەردەستمانانو هەرچیمان بوێ پێیان دەکەین لە دەستمان دەرناچن، وەك لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾[1] ئاخۆ ئەوانەی بەدکارن وا دەزانن ناکەونە بەر دەستی ئێمەو پێشمان ئەکەون ودەرباز ئەبن؟ خراپیان لێکداوەتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾[2] وا مەزانن ئەو کەسانەی خوانەناسن، دەتوانن لەم سەر زەمینە لە دەستمان ڕاکەن. جێگەی ئەوانە ئاگرەو سەرئەنجامیان زۆر خراپە. وە فەرموویەتی: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَـٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾[3] هاتوچوونو گرو فری خوانەناسان لە وڵاتان، چەواشەت نەکات وسەرت لێتێکنەدات، ڕابواردنێکی کەمەو پاشان شوێنیان جەهەنەمەو جێیان زۆر خراپو ناخۆشە. پاشان خودای گەورە فەرمان ئەدا کە چەكو کەرەسە ئامادەکەن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمندا بە پێی تواناو دەستەڵاتو ئەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ ﴾ تا بۆتان دەکرێ چەكو جبەخانەی شەڕو ئەسپی سواری پەیدا بکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوەئەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (بزانن هێز بریتیە لە تیر ئەندازی، بزانن هێز بریتیە لە تیرئەندازی)[4] موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە.[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەسپ بۆ سێ شتە، بۆ پیاوێ پاداشتە، بۆ پیاوێ پۆشاکە، بۆ پیاوێ باری گرانو تاوانە، ئەوەیان پاداشتی هەیە بۆی، پیاوێکە ئەسپەکە ئامادە ئەکات بۆ جیهاد لە

---

[1] العنكبوت (٤).

[2] النور (٥٧).

[3] ال عمران (١٩٦ـ١٩٧).

[4] أحمد (١٥٦/٤)، سەحیحە.

[5] مسلم (١٥٢٢/٣).

ڕێی خوادا،جانەگەر گوریسەکەی بۆ شل بکات لە لەوەڕگایەکدا یان باخچەیەکدا، ئەوەی بەری دەکەوێ بە درێژی ئەو گوریسە لەو لەوەڕگەو باخچەدا. بە ئەندازەی ئەوە چاکەی دەس دەکەوێ، خۆ ئەگەر گوریسەکەی بڕیو دەهاتو دەچوو شوێن پێکانیو پاشەڕۆکەی بە چاکە بۆ هەژمار دەکرێت. خۆ ئەگەر بە لای ڕوبارێکیشدا ڕۆشت لێی خواردەوە، خاوەنەکەی نەیویست ئاوی بدات، ئەوەیشی بۆ هەژمار دەکرێ، ئەوەیش بۆ ئەو پیاوە پاداشتە. وە پیاوێك (ئەسپێك) ئامادە ئەکات بۆ ئەوەی بێ نیاز بێو داوا لە خەڵکی نەکاتو هەقی خوای گەورەی لە بیر نەچێو سوپاسی خودا بکات لەسەر ئەوەی کە خودا پێی داوەو ڕێگری لە سواربوونی نەکات ئەوە بۆ ئەو پۆشاکە، وە پیاوێك ئامادەی کردوە بۆ خۆ هەڵبڕینو ڕیبایی کردنو بەکارهێنانی بۆ دژایەتی کۆمەڵی موسوڵمانان، ئەوە بۆ ئەو کەسە بارگرانیو تاوانە. وە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبارەی گوێ درێژیشەوە، فەرمووی: (هیچ شتێکم لەم بارەیەوە بۆ نەهاتوەتە خوارەوە، تەنیا ئەم ئایەتە پڕ ماناو بێ وێنەیە نەبێ کەئەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[1] واتە: ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە.[2] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.[3] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەسپ سێ جۆرە: ئەسپێك بۆ خودای ڕەحمانە، ئەسپێك بۆ شەیتانە، ئەسپێك بۆ خەڵکە، ئەو ئەسپەی بۆ خودای ڕەحمانە ئەوەیە ئامادە کراوە بۆ ڕێی خودا، ئالیکەکەیو پاشەڕۆکەیو میزەکەی (وە ئەوەی خوا مەیلی لێبێ لەبارەیەوە قسەی کرد) وە ئەسپی شەیتان ئەوەیە کە قوماری لەسەر دەکرێ یان گرەوی لەسەر دەکرێ، وە ئەسپی خەڵکیش ئەو ئەسپەیە کە مەردم ئامادەی دەکات، بە تەمای سکەکەیەتی، ئەوە داپۆشەرە بۆی لە هەژاری).[4] وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە، لە عوروەی کوڕی ئەبی جەعدی بارقیەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەسپ خێرو بێری بە ناوچاوانیەوەیە هەتا ڕۆژی قیامەت، هەم پاداشتەو هەم دەستکەوتە).[5]

﴿تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ تا دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن. واتە: لە

---

[1] الزلزلة (٧-٨).

[2] الموطأ (٢/٤١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] البخاري (٢٨٦٠)، مسلم (٩٨٧).

[4] أحمد (١/٣٩٥)، سەحیحە.

[5] فتح الباري (٦/٦٦).

خوانەناسـان. ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ﴾ جگـە لـەوانیش دوژمنتـان هەیـە ئێـوە نایانناسن، بەڵام خودا دەیان ناسێ موجاهیدئەڵێ: مەبەست پێی بەنی قورەیزەیە[1] سوودی ئەڵێت: فارسەکانە.[2] موقاتیلی کوڕی حەیان و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێن: ئەوانە دووڕووەکـانن.[3] ئـەم ئایەتـەش بەڵگەیـە لەسـەری ﴿وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡ﴾[4] لـەو عەرەبـە دەشـتەکیانەی (کـە لـە دەوروبـەری ئێوەن) هێندێکیان‌و هێندێك لە خەڵکی مەدینە دووڕوون‌و هەر بۆ دووڕوویی هاتون، تۆ ئەوانە ناناسی ئێمە زۆر باشیان دەناسین. پاشان لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ هـەر مـاڵێ لـە ڕێـی خـودا بیـدەن، خـودا دەیبژێرێتـەوەو هـیچ ناهـەقیتان لێ نـاکرێ. واتـە: هەرچـەندێ ببەخـشن لـە ڕێـی جیهـاددا، خـودا پاداشـتی تێـرو تـەواوتان ئەداتەوە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد کە خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾[5] حاڵی ئەو کەسانەی ماڵیان لـە ڕێـی خـوادا دەبەخـشن، وەك حـاڵی دەنکێکـە حـەوت گـوڵ لێ ئەدات‌و هەر گوڵەی سەد دانەی تێدایە، خودا چەند ئەوەندە پاداش ئەدات بە هەرکەس بیەوێ، خـودا چاکەی یەکجار زۆرەو زۆر زانایە.

﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٣﴾﴾

**فەرماندان بە قەبوڵکردنی ئاشتی لەگەڵ دوژمن ئەگەر داوای ئاشتی کرد**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: کـاتێ ترسـای لـە کۆمـەڵێ خەیانـەتت لێ دەکـەن، تـۆش وەك ئـەوان پەیمانەکە بدەرەوە بە سەریاندا، ئەگـەر هـەر بـەردەوام بـوون لـە شـەڕ کـردن‌و کوڵیـان نەئـەدا تـۆیش

[1] الطبري (١٤/٣٦).

[2] الطبري (١٤/٣٦).

[3] الطبري (١٤/٣٦).

[4] التوبة (١٠١).

[5] البقرة (٢٦١).

شەڕیان لەگەڵ بکە ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا﴾ ئەگەر داوای (ئاشتیان) کرد قبوڵی کە. واتە: تۆیش ئەی موحەممەد(ﷺ) پێت خۆش بێو قبوڵی بکە لێیان. بۆیە کاتێ موشریکەکان داوای ئاشتیان کرد لە ساڵی حودەیبییەدا، دوای نۆ ساڵ شەڕ کردن لە نێوان ئەوانو پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) لێی قبوڵ کردن لەگەڵ ئەو مەرجانەیشدا کە داوایان کرد. عەبدوڵلای کوڕی ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ : پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان بەو زوانە دوای من کێشەیەك یان کارێك (ڕووئەدات)،جا ئەگەر توانیت بە ئاشتی (تەواوی بکەی) بیکە).[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ وە هەر خۆت بە خودا بسپێرەو ئاشتیان لەگەڵدا بکە، چونکە خودا بەسە بۆ تۆو یارمەتی دەرتە، با نیازی گزیو فێڵیشیان هەبێ لەو شەڕ بەستەداو خۆیان بپارێزنو خەریکی خۆ ئامادەکردنیش بن. ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ هەر خۆت بە خوا بسپێرە، هەر خۆی بیسەرو زانایە ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر ویستیشیان فریوت دەن.تۆئەوەندەت بەسە کە خوات لەگەڵە. واتە: تەنیا خودات بەسە.

### وەبیر هێنانەوەی بەهرەی یەکگرتن لە نێوان دڵی خاوەن باوەڕاندا

پاشان خودای گەورە باسی بەهرەی خۆی دەکات بەسەر پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەوەی کە پشتگیری لێ کردوە بەهۆی موسوڵمانە کۆچەریو یارمەتی دەرەکانەوەو فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ خوا ئەو خوایە کە پشتگیری کردی بە یارمەتی خۆیو خاوەن باوەڕانو هۆگری خستە ناو دڵەکانیان. واتە: کۆی کردنەوە لەسەر باوەڕ هێنان پێتو گوێڕایەڵیو یارمەتی دانو پشتگیری لێ کردنت، ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەگەر هەرچی لەم سەر زەمینەدا هەیە هەمووت بدایە، نەت دەتوانی وا لێکیان کۆ بکەیتەوە، بەڵام خودا هۆگری خستە نێوانیان، دوای ئەو دوژمنایەتیو ڕقە بەرینە زۆرەی لە نێوانیاندا هەبوو، بەڕاستی پشتیوانان لە کاتی نەفامیدا شەڕی زۆر ڕوویدا لە نێوانیاندا، لە نێوان ئەوسو خەزرەجدا، وە زۆر شتی تریش کە دەبووە هۆی دروستبوونی شەڕ لە نێوانیاندا، تا خودای گەورە ئەو شەڕەی بنەبڕ کرد بە ڕووناکی باوەڕ لە نێوانیاندا. وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ

---

[1] أحمد (١/٩٠).

كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾[1] بیر لەو چاكە بكەنەوە كە خوا دەربارەی كردن، كە ئێوە دژ بە یەكتر بوون، بە دڵ كردوونی بە هۆگر، لە سایەی چاكەی ئەمەوە، بوونەتە برای یەكتر، لەسەر لێواری ئاگر بوون، هەر ئەو بوو ڕزگاری كردن، خوا ئاوا نیشانەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەكاتەوە بەڵكو ڕێگا بدۆزنەوە. لە هەردوو سەحیحەكەشدا هاتوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) كاتێ كە وتاری دا بۆ یارمەتی دەرەكان لە بارەی دەست كەوتی حونەینەوە فەرمووی پێیان: (ئەی كۆمەڵی پشتیوانان! ئایا ئەم دین ئێوە گومڕا بوون، خودا ڕێی نیشان دان بەهۆی منەوە، هەژار بوون خودا بێ نیازی كردن، وە ئێوە پەرتەوازە بوون یەكی خستن بەهۆی منەوە). پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەرچی بفەرموایە، دەیانگوت: خوداو پێغەمبەرەكەی زۆر منەتیان هەیە (بەسەرمانەوە)[2] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەڵام خودا لێكی كۆكردنەوە، هەر خۆی خاوەنی دەستەڵاتە ئەوەی خۆی بە خودا دەسپێرێ بێ ئومێدی ناكات. كارزانە لە كردارو بڕیارەكانیدا.

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ الْآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾

**هاندان لەسەر جەنگ كردن و مژدەیش بەوە كە موسوڵمانان كەمیش بن زاڵ دەبن بەسەر زۆریی لە خوانەناساندا**

خودای گەورە هانی پێغەمبەرەكەی و (ﷺ) خاوەن باوەڕان ئەدات لەسەر شەڕ كردن و ڕووبەڕووبونەوەو لێدانی دوژمنانی نزیكی خۆیان. ئاگاداریشیان دەكات كە خۆی یارمەتی دەرو پشتیوانەو هەر ئەویان بەسە كە زاڵیان بكات بەسەر دوژمنەكانیاندا، هەرچەندە دوژمنەكانیان ژمارەیان زۆر بێ و بەردەوام كۆمەكیان بۆ بێت، با ژمارەی خاوەن باوەڕانیش كەم بێ. بۆیە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! خودا بەسە بۆ تۆو ئەو باوەڕدارانەی شوێنت كەوتوون. ئەی پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] آل عمران (١٠٣).

[2] فتح الباري (٦٤٤/٧)، مسلم (٧٣٨/٢).

!هانی باوەڕداران بدە بچنە غەزا. واتە: فەرمانیان پێ بدەو هانیان بدە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هانی ئەدان بۆ شەڕ کردن لە کاتی نزیك بونەوەو ڕێز گرتنو ڕووبەڕووبونەوەیاندا بەرانبەر دوژمن. وەك لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی بە هاوەڵەکانی کاتێ کە ڕوویەڕووی بتپەرستان وەستان بەو ژمارەو کەرەسەی جەنگیانەوە: (هەڵسن بۆ بەهەشت کە پانایەکەی ئاسمانەکانو زەمینە) عومەیری کوڕی حومام گوتی: پانتایەکەی ئاسمانەکانو زەمینە؟ پێغەمبەری خودا فەرمووی: (بەڵێ) گوتی: بەخ بەخ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چی وای لێ کردی کە دەڵێیت بەخ بەخ؟) گوتی: هیوام وایە من یەکێك بم لە خەڵکەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تۆ یەکێکی لە خەڵکەکەی) ئەو پیاوە چووە پێشەوەو کێلانی شمشێرەکەی شکاندو هەندێ دەنکە خورمای دەرهێناو دەستی کرد بە خواردنی، پاشان ئەوەی پێی مابوو لە دەستی فڕێیداو گوتی: ئەگەر من ژیام هەتا ئەمانە دەخۆم ئەوە (زۆری پێ دەچێ) پاشان چووە پێشەوە شەڕی کرد هەتا کوژرا (ڕەزای خوای لێبێ).[1] پاشان خودای گەورە مژدە ئەدات بە خاوەن باوەڕانو فەرمانیان پێدەکاتو ئەفەرموێت: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بیست کەس بنو خۆڕاگر بن، تواناتان بەسەر دووسەد کەسدا دەشکێ، ئەگەر سەد کەستان خۆڕاگر بن، زاڵ دەبن بەسەر هەزار کەسدا لە خوانەناسان، چونکە ئەوان کەسانێکی بێ ئاوەزن. واتە: یەك کەس بەرانبەر دە کەس. پاشان ئەم فەرمانە نەسخ بوەوەو مژدەکەی هەرمایەوە. عەبدوڵلای کوڕی موبارەك ئەڵێت: جەریری کوڕی حازم قسەی بۆ کردم، زوبەیری کوڕی خیرەرەیت قسەی بۆ کردم لە عیکرمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ﴾ ئەوە لەسەر شانی موسوڵمان زۆر گران بوو، تا خودای گەورە فەرزی کرد لەسەریان دەبێ یەك کەس لە دە کەس ڕانەکات. پاشان ئایەت هاتە خوارو سوك کرا لەسەریان فەرمووی: ﴿ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ ئێستا خودا کە وەرەو تواناتان کەم بووە، کاری بۆ ئاسانتر کردن، ئەگەر ئێوە سەد کەس بنو خۆڕاگر بن دەرەقەتی دوو سەد کەس دێن، خۆ ئەگەر ئێوە هەزار کەسی خۆڕاگر بن (بە ئیزنی خودا) دەرەقەتی دوو هەزار دێن، خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: خودا کاری بۆ ئاسان کردن لە ژمارەو کەرەسەدا، خۆڕاگریەکەی کەم کردنەوە بە

[1] مسلم (١٥١١/٣).

ئەندازەی ئەو ئاسانكاریەی كە بۆی كردن.[1] بوخاریش ڕیوایەتی كردوە، لە فەرموودەكەی ئیبنوموبارەكەوە بەو شێوەیە.[2] موحەممەدی كوڕی ئیسحاقیش ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەبباسەوە گوتی: كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر شانی موسوڵمانان گران بوو، بەلایانەوە قورس بوو كە بیست كەس شەڕ بكات لەگەڵ دوو سەد كەسدا، سەد كەسیش لەگەڵ هەزار كەسدا، خودای گەورە ئاسانی كرد بۆیان،وئەم فەرمانەی (نەسخ كردەوە) بە ئایەتێكی ترو فەرمووی: ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ﴾ ئەگەر هاتوو (خاوەنباوەڕان) نیوەی دوژمنەكانیان بوون، بۆیان نیە لە دوژمنەكانیان ڕاكەن، بەڵام ئەگەر وا نەبوو لە سەریان واجب نیە شەڕیان لەگەڵدا بكەن، بۆیان هەیە خۆیانیان لێ لادەن[3].

﴿ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە دیلیان هەبێ، مەگەر وەختێ لەسەر زەمین بەتەواوی بوویێتە خاوەن دەسەلات، دەتانەوێ ماڵی دنیاتان دەس كەوێ، خوداش پاشەڕۆژی دەوێ، خودا خاوەن دەسەلاتو كارزانە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێ :پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی كرد بە خەڵكی لەسەر دیلەكانی ڕۆژی بەدر، فەرموی: (خودا سەركەوتوی كردون بەسەریاندا) عومەری كوڕی خەتاب هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدە لە ملیان، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لێ لادا، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) دووبارەی كردەوەو فەرمووی: (ئەی خەڵكینە ! خودا زاڵی كردون بەسەریاندا، هەرچەندە ئەوانە دوێنێ براتان بوون) عومەر هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بدە لە ملیان، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لێ لادا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دووبارەی كردەوەو هەروەك ئەوەی پێشوی فەرموو بە خەڵكی، ئەبوبەكری سدیق (ڕەزای خوای لێبێ) هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە دەبینین (وا باشە) لێیان خۆش بی، لەبریيان لێ قبوڵ بكەی،ئەڵێ: ئەو پەژارەیەی لەسەر ڕووی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)

---

[1] أبوداود (٣/١٠٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/١٦٣).

[3] البخاري (٤٦٥٢-٤٦٥٣).

ڕۆشت، عەفوی کردنو ڕزگارانەی لێ وەرگرتن.ئەڵێ: پاشان خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾[1] ئەگەر خودا ئەم ڕووداوەی پێشوتری نەنوسیایە، ئەمەی کە بە دەستتان هێنا ئازاری زۆرتان تووش دەهات. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ ﴾ئەڵێ یانی: لە (أم الكتاب)ی (یەکەمدا) هاتووە کە دەسکەوتو دیلەکان حەڵاڵە بۆ ئێوە، ﴿لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ واتە:ئەگەر وا نەبوایە لەوەی کە وەرتان گرت (لە دیلەکان) ئازاری زۆرتان تووش دەهات. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ ئەو دەسکەوتەی گرتوتانە حەڵاڵو زەلاڵە بیخۆن. هەر بەو شێوەیە عەوفی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە[2] دیسان بەو شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئەبوهورەیرەو ئیبنومەسعودو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو حەسەنی بەسریو قەتادەو ئەعمەشەوە.[3] مەبەست بە ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ ﴾ ئەگەر خودا ئەم ڕووداوەی پێشتووتر نەنووسیایە، بۆ ئەم ئوممەتە کە دەسکەوت حەڵاڵە. تووشی سزای زۆر گەورە دەهاتن بەڵگەیش بۆ ئەم وتەیە دەهێننەوە بەوەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێدراوە بە هیچ کەسێ لە پێغەمبەرانی پێش من نەدراوە: هاوکاری کراوم بە ترس (خستنە دڵی دوژمنەوە) ماوەی مانگەڕێیەك، زەمین کراوە بە مزگەوتو پاکۆکەر بۆم. دەسکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، بۆ هیچ کەسێکی تر لە پێش من حەڵاڵ نەکراوە، شەفاعەتم (تکا کردنم) پێدراوە،هەموو پێغەمبەرێك ڕەوانە کراوە بۆ گەلەکەی، من ڕەوانە کراوم بۆ خەڵکی بە گشتی)[4] ئەعمەش ئەڵێ لە ئەبوسالحەوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەسکەوت (غەنیمە)حەڵاڵ نەکراوە بۆ هیچ گەلێکی سەر ڕەش جگە لە ئێمە) بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾[5] بۆیە ئەو کاتە لەبری و فیدیەی لە دیلەکان وەرگرت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوداوودەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) (ڕزگارانەی) خەڵکەکەی سەردەمی

---

[1] أحمد (٢٤٣/٣)، فەرموودەیەکی باشە.

[2] الطبري (٦٥/١٤).

[3] الطبري (٦٥/١٤-٦٩).

[4] فتح الباري (٥١٩/١)، مسلم (٣٧٠/١).

[5] النسائي في الكبرى (٣٥٢/٦)، سەحیحە.

نەفامى لە ڕۆژى بەدردا بە چوار سەد دانا.[1] ئەم بڕیارە لە بارەی دیلەوە لە لای جەماوەری زانایان سەلماوەو شتی چەسپاوە کە ئیمام سەرپشکە چیان لێ بکات. مەیلی لێ بوویێ کوشتونی وەك بەنی قورەیزە کە کوژران. ئەگەر مەیلیشی لێبێ ڕزگارانەی بە ماڵ لێ وەرگرتون وەك بەرانبەر بە دیلەکانی بەدر کردی یان دیل بەدیلی پێکردون لەو موسوڵمانانەی کەبە دیل گیراون. وەك پێغەمبەری خودا لە باتی ئەو کەنیزەو کچەکەی کە دیلی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع بوون. گەڕاندنیەوەو لە جێی ئەوان ئەو موسوڵمانانەی وەرگرتەوە کە لەلای موشریکەکان بوون. یان ئەگەر بیەوێت ئەو دیلانە دەکاتە بەندەو کەنیزەك.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّمَن فِىٓ أَيْدِيكُم مِّنَ ٱلْأَسْرَىٰٓ إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُوا۟ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾﴾

## بەڵێندان بەو دیلانە بە پاداشتی چاك، ئەگەرخێریان تێدابێت

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی: (بەڕاستی من زانیومە کە هەندێ لە خەڵکی بەنی هاشمو کەسانی تریش بە ناچاری هاتونەتە دەر، پێویستیان بە شەڕکردن نەبووە لەگەڵماندا، هەرکەسێ گەیشتە کەسێ لەوانە (یانی بەنی هاشم) نەیکوژێ، وە هەرکەسێ گەیشتە ئەبولبەختەری کوڕی هیشام نەیکوژێ، وە هەرکەسێ گەیشتە عەبباسی کوڕی عبدولموتەلیب نەیکوژێ، چونکە ئەو بە ناچاری وەدەر نراوە). ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبە ئەڵێ، ئایا ئێمە باب‌و کوڕو براو کەس‌و کارمان بکوژین‌و واز لە عەبباس بێنین؟ سوێند بە خوا ئەگەر پێی گەیشتم بە شمشێر لەغاوی دەکەم. ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە عومەری کوڕی خەتاب: (ئەی ئەبا حەفس عومەر ئەڵێ:( سوێند بە خوا ئەوە یەکەم ڕۆژێ بووە پێغەمبەری خودا(ﷺ)کەبە(کونییە) ناوی بردوم و بە ئەی ئەبا حەفس بانگی کردم ) ، ئاخۆ بە شمشێر ئەدرێت لە ڕووی مامی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟) عومەر ووتی: ئیزنم پێ بدە، ئەدەم لە گەردنی(ئەوەی وای وتووە)، سوێند بە خوا، ئەو کەسە دیارە دووڕووە. دوای ئەوە ئەبوحوزەیفە دەیگوت: سوێند بە خودا دڵنیا نابم لەو قسەی کردمو هەمیشە لێی دەترسم مەگەر خوای گەورە (هەقی) ئەو تاوانەم لێ بکاتەوە بە شەهید بوون.ئەوەبوو لە ڕۆژی یەمامەدا شەهید کرا (ڕەزای خوای لێبێ)[2] وە هەر بەو شێوەیە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێ: کاتێ

---

[1] أبوداود (١٣٩/٣)، سەحیحە جگە لە وتەی چوار سەدەکە.

[2] أبن سعد (١٠/٤)، سەنەدەکانی لاوازە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێوارەی لێهات لە ڕۆژی بەدردا، دیلەکان قۆڵ بەس کرابوون، لە سەرەتای ئەو شەوەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) بێدار بوو هاوەڵەکانی پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چیتە وا ناخەوی؟ پیاوێکی ئەنساری عەبباسی بە دیل گرتبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نرکەو ناڵەی عەبباسی مامەم بیست بە شەتەك دراوی، ئەوەبوو خێرا بەریان دا ) ئیتر بێدەنگ بوو پێغەمبەری خوایش (ﷺ)زۆری نەبرد خەوی لێکەوت[1] ! وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، لە فەرمودەکەی مووسای کوڕی قوعبەوە ئیبنوشەهاب ئەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی گێڕامەوە هەندێ لە ئەنساریەکان ئیزنیان خواست لە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێمان پێ بدە با واز بێنین لە (فیدیەکەی) عەبباسی خوشکەزامان. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر سوێند بە خوا واز لە یەك درهەم ناهێنن لێی).[2] یونسی کوڕی بەکیر ئەڵێ : لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە لە یەزیدی کوڕی ڕوممانەوە لە عوروەوە لە زوهەریەوە لە دەستەیەکەوە کە ناوی بردوون، ئەڵێن: قورەیشییەکان ناردیان بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ڕزگارانەی دیلەکانیان، هەر هۆزەو ڕزگارانەی خۆی دا بەپێی ڕازی بوونیان. عەبباسیش گوتی: من هەر موسوڵمان بووم، پێغەمبەری خودا فەرمووی: (خودا باشتر دەزانێ بە موسوڵمان بوونی تۆ)، ئەگەر وا بوو کە تۆ دەڵێیت، بێگومان خوا پاداشتت ئەداتەوە، بەڵام حاڵە دیارەکەت دژ بە ئێمە بوو، کەواتە ڕزگارانەی خۆت‌و هەردوو برازاکەت نەوفەلی کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب‌و عەقیلی کوڕی ئەبوتالیبی کوڕی عەبدولموتەلیب‌و هاوڕێکەت عوتبەی کوڕی عەمر کە برای بەنی حارسی کوڕی فەهرە، بدە) عەبباس گوتی: من ئەوەندەم نیە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە بیدەم ، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی ئەو ماڵەی تۆو ئومولفەزل داتان پۆشیوە لە کوێیە کە پێت گوت: ئەگەر لەم سەفەرەدا تووش بووم، ئەم ماڵەی کە شاردومەتەوە بۆ کوڕەکانم: فەزڵ‌و عەبدوڵڵاو قوسەم عەبباس گوتی: سوێند بە خوا، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من چاك دەزانم کە تۆ پێغەمبەری خودای، ئەم شتەیش هیچ کەسێ پێی نەزانیوە جگە لە منو ئومولفەزل. ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بەرتان دەکەوێ لە من بیست ئەوقیەیە لەو ماڵەی کە پێم بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر، ئەوە شتێکە خودا لە تۆوە پێی داوین) ڕزگارانەی خۆیی‌و دوو برازاکەی‌و هاوکارەکەی دا. خودای گەورە ئەم ئایەتەی لەبارەیەوە ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّمَن فِىٓ أَيْدِيكُم مِّنَ ٱلْأَسْرَىٰٓ إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بەو دیلانە بڵێ کە لەبەردەستی ئێوەدان، ئەگەر خوا

---

[1] ابن سعد (٤/١٣)، بەم وتەیە لاوازە.

[2] فتح الباري (٧/٣٧٣).

بزانێ لە دڵەکانتاندا چاکەیە هەیە، چاکترتان لـەو پزگارانـەی لێتـان وەرگیراوە دەداتـیّو لێتـان خـۆش دەبێ خودا لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە. عەبباس ئەڵێ: خودا لە جێی ئەو بیست ئوقیە لـەناو ئیـسلامدا بیـست عەبـدی پێـدام هـەموویان ماڵـیان بـە دەسـتەوە بـوو کاریـان پێـدەکرد، لەگـەڵ ئـەو هیوایـەش کەچاوەڕوانم بـەر لێبـوردنی خـودای گەورەبکـەوم[1] حـافیز ئەبوبـەکری بەیهـەقی ڕیوایـەتی کـردوە لـە ئەنەسی کوڕی مالیکەوەئـەڵێ: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) مـاڵێکی لـە بەحرەینـەوە بـۆ هـات فـەرمووی: (پەرش‌و بڵاوی بکەنەوە لەناو مزگەوتەکەمدا)ئەڵێ : ئەوە زۆرترین ماڵ بوو کە هێنرابێ بـۆ پێغەمبـەری خودا(ﷺ) چوو بۆ نوێژو لای لێ نەکردەوە کاتێ کە نوێژەکەی تەواو کرد، هاتو لـەلای دانیـشت، هـیچ کەسێ نەبووە کە چـاوی پێـی کـەوتبێ و بەشـی نـەدرابێت ، لـەو کاتـەدا عـەبباس هـات گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو ماڵە بەشم بـدە، چـونکە مـن پزگارانـەی خـۆم‌و عـەقیلم داوە. پێغەمبـەری خودا(ﷺ) پێی گوت: (بیبە). ئەویش پۆشاکەکەیی لێپڕکرد پاشان ویستی هەڵی گرێ بۆی هەڵ نەگیرا گوتی: فەرمان بدە (ئەی پێغەمبەر(ﷺ)) کە یـەکێك بیـدات بەکۆڵمـدا ، فـەرمووی: ((نـەخێر)) گـوتی: خۆت بیدە بەکۆڵمدا، فەرمووی: (نەخێر)،عەبباس هەندێکی لابردو پاشان نای بەسەر شانیەوە، پاشـان ڕۆیشت، بەردەوام پێغەمبەری خودا(ﷺ) چاوی تێ بڕیوو هەتا لەبەر چاوی نەما سەری سوڕ مابوو لـە (تەماحی)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هـەتا درهـەمێ لەوێدا بـوو هەڵنەسـا[2] بوخـاریش لـە چـەند شـوێندا ڕیوایەتی کردوە لـە سـەحیحەکەیدا.[3] پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ اللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ﴾ خۆ ئەگەر بەو نیازەش بن کە خەیانەت لە تۆ بکەن، (بە قسە لەگـەڵت بن‌و بـە دڵ درۆ بکـەن) زووتـریش لەگـەڵ خـوا ڕاسـتیان نـەکردو بڕوایـان پـێ نـەهێنا. واتـە: لـە پـێش بەدریشدابەهۆی بێدینیانـەوە ناپـاك بـوون. ﴿فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ﴾ خـوا دەسـتی تـۆی زاڵ کـرد بەسـەریاندا، بەهۆی ئەو دیلانەی ڕۆژی بەدرەوە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا زانای کارزانە.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَالَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ ﴾

---

[1] القرطبي (٨/٥٢).

[2] البيهقي (٦/٣٥٦)، حەسەنە.

[3] البخاري (٤٢١/٣٠٤٩/٣١٦٥).

## کۆچەریان و یاریدەدەرەکان دۆستی یەکترین

خودای گەورە باسی جۆری خاوەن باوەڕانی کردوەو کردوونی بە دوو بەشەوە کۆچەریان کە زێدو سامانی خۆیان بەجێهێشتو دەرچوون و هاتن بۆ یارمەتیدانی ئاینی خوداو یارمەتی پێغەمبەرەکەی، گیان و سامانی خۆیان بەخشی لەو ڕێیەدا، یاریدەدەریش ئەو موسوڵمانانە بوون لە خەڵکی مەدینە، لەو کاتەدا دالدەی برا کۆچەریەکانیان داو کردنیانە هاوبەشی خۆیان لە ماڵ و سامانیاندا، یارمەتی (ئاینی) خوداو پێغەمبەرەکەیان دا، بەیەکەوە غەزایان کرد بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَـٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕن زێدی خۆیان جێهێشتوەو لە ڕێی خوادا بە گیان و ماڵ غەزایان کرد، ئەو کەسانەش دالدەیان دان و کۆمەکیان کردن، بوونە کەس و کاری یەکتر. واتە: ئەوانە بە یەکتر نزیکترن لە هەموو کەسێکی تر، هەر لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەری خوا برایەتی خستە نێوان کۆچەریان و یاریدەدەران، هەر دوو کەس بوونە برای یەک و میراتیان بەو برایەتیە لە یەکتری دەبردو ئەو برایەتیە خرا بوویە پێش برایەتی کەس و کاری، هەتا خودای گەورە ئەوەی نەسخ کردەوە بە میرات گری خزمایەتی. لە سەحیحی بوخاریدا ئەوە هاتوە لە ئیبنوعەبباسەوە[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جەریرەوە کە عەبدوڵلای بەجەلی (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کۆچەریان و یاریدەدەران ئەوانە پشتیوان و دۆستی یەکترین، ئەوانەی کەئازاد کران لە قورەیش و ئەوانەیش کە ئازاد کراون لە سەقیف دۆستی یەکترین تا ڕۆژی قیامەت)[2] (تەنیا ئەحمەد هێناویەتی) خوداو پێغەمبەرەکەی ستایشی کۆچەریان و یاریدەدرانیان کردوە لە زۆر ئایەت و فەرمودەدا وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾[3] خوا ئەوانەی هەر لە پێشدا ئاوارە بوون و لەوانەشی کە یاریدەدەر بوون لەوانەشی لە چاکەدا شوێنی ئەوانە کەوتن، ڕازی بووەو ئەوانەیشی لە خوا ڕازین، باغاتێکی بۆ ئامادە کردون جۆ باریان بە بەردا دەڕوات. وە فەرموویەتی: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ ﴾[4] خوا لە

---

[1] فتح الباري (١٢/٣٠).
[2] أحمد (٣٦٣)، فەرموودەیەکی باشە.
[3] التوبة (١٠٠).
[4] التوبة (١١٧).

پێغەمبەرو(ﷺ) ئەو کۆچەرو یاریدەدەرانە خۆش بووەکە لەو کاتە تەنگانەدا شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتن. وە فەرموویەتی: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾[1] (ئەو دەسکەوتە) بۆ ئەو هەژارە دوورە ولاتانەیە (کۆچەریانەیە) کە لە ماڵو زێدی خۆیان دەرکراون، چاوەڕوانی بەهرەو ڕەزامەندی خوانو یاریدەی خوداو پێغەمبەرەکەی ئەدەن کە ئەمانە ڕاستەکانن، ئەو کەسانەشی کە بەر لەوان لە مەدینە نیشتەجێ بوونو بە دڵ بڕوایان هێنا، حەز بەو کۆچەریانە دەکەن کە پەنایان پێ هێناون بەدلیش ئیرەیی نابەن بەوەی کە بەوان دراوە، ئەوان لە پێشتر دەزانن لە خۆیان، هەرچەند دەست تەنگیشیان هەیە. با خۆشیان پێویستیان بێ پێی ،(چاکترین شتێ گوتراوە لەم ئایەتەدا) ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا﴾ واتە: (حەسودیان) پێ نابەن لەو چاکەی کە خودا پێی داون لەسەر ئەو دەربەدەریەیان، لەم ئایەتانەوە دەرئەکەوێ کۆچەریەکان لە پێشترن لە یاریدەدەرەکان، ئەمەیش بڕیارێکە زانایان کۆ دەنگن لەسەری لە نێوان خۆیانداو کێشەیان لەسەر ئەوە.

## دۆستایەتی ئاکرێ لەگەڵ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان نەکردوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا﴾ ئەو کۆمەڵی باوەڕدارانەشی کە هەر لە شوێنەکەی خۆیان ماونەتەوەو نەهاتنە دەر، هەتا ئەوانیش (کۆچ نەکەن) نابێ دۆستایەتیان بکەن. حەمزە خوێندویەتیەوە بە (وِلتهم) بە کەسرە ئەوانی تریش بە فەتحە خوێندویانەتەوە. وەك (الدّلالة و الدّلالة) وایە. ئەمە ئەو دەستەی سێهەمەن لە خاوەن باوەڕان، ئەو کەسانەن کە بڕوایان هێناوەو کۆچیان نەکردوە. بەڵکو لە زێدی خۆیاندا ماونەتەوە لە بیابانەکانیاندا، ئەمانە هیچ بەشێکیان نیە لە دەستکەوتی شەڕدا لە پێنج یەکیشدا هەر بەشیان نیە، لەو شەڕانەنەبێت کە تێدا ئامادە بوون. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە بورەیدەی کوڕی حوسەیبی ئەسلەمیەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ : پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ فەرماندەیەکی ڕەوانە بکردایە لەگەڵ تیپێکدا یان لەشکرێکدا ئامۆژگاری تایبەتی دەکرد کە لە خوا بترسێو چاك بێت لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەش کە لەگەڵیدان، وە ئەیفەرموو: (بە ناوی خواوەو لە پێناوی خوادا بجەنگن، بجەنگێن لەگەڵ کەسێکدا کە باوەڕی بە خوا نیە، ئەگەر گەیشتی بە دوژمنەکەت لە موشریکەکان بانگیان بکەن

---

[1] الحشر (٨-٩).

بۆ سێ شت لە هەر کامێکیاندا هاتن بە دەمتەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بهێنە، پاشان بانگیان بکە بۆ سەر ئاینی ئیسلام، ئەگەر قبوڵیان کرد لێیان وەرگرەو وازیان لێ بهێنە، پاشان بانگیان بکە کە لە شوێنی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ شوێنی کۆچەران، ئاگاداریان بکە کە ئەگەر ئەوەیان ئەنجام دا ئەوا هەر مافێ بۆ کۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە، وە هەر ئەرکێ دەکەوێتە سەر شانی کۆچەران دەکەوێتە سەر شانی ئەوانیش، جا ئەگەر ئەوەیان قبووڵ نەکردو شوێنی خۆیان بەجێنەهێشت ئاگاداریان بکە کە ئەوانیش وەك عەرەبە موسوڵمانە دەشتەکیەکان وان، ئەو بڕیارەی خوایان لەسەر پیادە دەکرێ کە لەسەر باوەڕداران پیادە کراوە. بەڵام لە غەنیمەو دەستکەوتەکانی تریش هیچیان نادرێتێ، مەگەر ئەوەی شان بە شانی موسوڵمانان جیهاد بکەن، ئەگەر ئەمەشیان قبووڵ نەکرد، ئەوا داوایان لێ بکە سەرانە بدەن، ئەگەر ڕازی بوون لێیان قبوڵ بکەو وازیان لێ بهێنە. ئەگەر ڕازی نەبوون داوای یارمەتی و پشتگیری خوا بکە پاشان لەگەڵیاندا بجەنگە)[1] موسلیمیش هێناویەتی[2] بە هەندێ تریشەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڵام ئەگەر ئەوان لە بارەی ئاینەکەیان داوای یارمەتیان لە ئێوە کرد، لەسەرتانە کە ئێوە کۆمەکیان بکەن، کاتێ نەبێ لە دژی ئەوانەی لەگەڵ ئێوە هاوپەیمانن کێشەیان هەبێت، هەرچی بکەن خوا دەیبینێ. خودای گەورە ئەفەرموێت ئەگەر ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی کە کۆچیان نەکردوە داوای یارمەتیان لێ کردن لە شەڕێکدا لە پێناو ئاینی خوادا بەرانبەر دوژمنێکیان، یارمەتیان بدەن، چونکە ئەو یارمەتیدانە ئەرکی سەر شانتانە، لەبەر ئەوەی ئەوانە برای دینیتانن، مەگەر کاتێ کە داوای یارمەتیتان لێ بکەن بۆ کەسانێکی خوانەناس کە هاوپەیمانی لە نێوانتاندا هەبێ، واتە: شەڕ وەستانێ لەنێوانتاندا مۆرکرابێ تا ماوەیەك. پەیمان و سوێندەکەتان هەڵمەوەشێننەوە لەگەڵ ئەوانەی پەیمانتان پێ داون، ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوای لێبێ)[3].

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾﴾

**خوانەناسان دۆستی یەکترن، هیچ دۆستایەتەکیان لەگەڵ موسوڵماناندا نیە**

کاتێ خودای گەورە کە باسی خاوەن باوەڕانی کردوە کە دۆستی یەکترن، پەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان ئەوان و خوانەناسانی پچڕیوە. وەك حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکە کەیدا لە ئوسامەوە،

---

[1] أحمد (٥/٣٥٢)، سەحیحە.

[2] مسلم (٣/١٣٥٧).

[3] الطبري (١٤/٨٣).

لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: {ئەهلی دوو ئاین میراتی لە یەكتری نابەن، موسوڵمان میراتی لە خوانەناس نابات، خوانەناسیش میراتی لە موسوڵمان نابات پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾} بەرەی خوانەناسانیش دۆستی یەكترن، ئەگەر ئێوە (وەك من پێم گوتوون) ڕەفتار نەكەن بشێویی و خراپەی زۆر لەم سەر زەمینە پەیدا دەبێ. پاشان حاكیم ئەڵێ: سەنەدەكانی ڕاستە، بەلام بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە[1] منیش ئەڵێم: ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەكەدا لە ئوسامەی كوڕی زەیدەوە ڕیوایەت كراوە وتوویەتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (موسوڵمان میرات لە خوانەناس نابات، خوانەناسیش میراتی لە موسوڵمان نابات).[2] مانای ئەم ئایەتە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ واتە: ئەگەر موسوڵمانان دوور نەكەونەوە لە بت پەرستان و دۆستایەتی خاوەن باوەڕان نەكەن، ئەو كاتە ئاژاوە و گێچەڵ لە نێوان خەڵكیدا پەیدا دەبێ، ئا ئەوە لێكترازانی كارەكەیە و خاوەن باوەڕو خوانەناس تێكەلاو دەبێ، بەو هۆیەوە خراپەكاری تەشەنە دەكات بە گشت لایەكدا.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ مَعَكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنكُمْ ۚ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٧٥﴾ ﴾

**خاوەنباوەڕانی ڕاستەقینە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ مَعَكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنكُمْ ﴾ ئەوانەی خاوەنباوەڕن و لە ولات ئاوارە بوون و لە ڕێی خوا غەزایان كرد، ئەوانەیش پەنایان دان و كۆمەكیان كرد، خاوەنباوەڕی ڕاستن، خودا لەوانە خۆش بووە و بژێوی باش هەر بۆ ئەوانە. ئەو كەسانەش لە پاشان بڕوایان هێناو كۆچیان كردو لەگەڵ ئێوە غەزایان كرد، ئەوانەیش لە خۆتانن. دوای ئەوەی خودای گەورە باسی خاوەنباوەڕان و ئەركی سەر شانیانی كرد لە دنیادا، دێتە سەر باسی ڕاستیی باوەڕیان و پاشەڕۆژیان دەكات لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك لە سەرەتای سورەتەكەوە

[1] الحاكم (٢/٢٤٠)، فەرموودەیەكی باشە (جید).

[2] فتح الباري (٥١/١٢)، مسلم (١٢٣٣/٣).

باس کرا، ئەوانە بێگومـان بـەو زووانـە خـودا پاداشـتیان ئەداتـەوە بـە لێبـوردنو چاوپۆشـی کـردن لـە گوناهەکانیان، ئەگەر گوناهیان بووبێ، بژێویـەکی باشیـشیان ئـەدات، کـە چـاكو زۆرو پـاكو خاوێنـەو تاهەتایە بەردەوامەو نابڕێو کۆتایی نایە، هەرگیز لێی بێزارو بێتاقـەت نـابن لەبـەر جـوانیو ڕازاوەیـیو هەمەجۆری. پاشان وەسفی ئەو کەسانەشی کردوە کە لە دنیـادا لەگـەڵیان بـوون ئاکـار چـاكو خـاوەن بـاوەڕێکی ڕاسـت بـوون، کـە لـە ڕۆژی دوایـشدا هـەر لەگـەڵیانن وەك خـودای گـەورە لـە ئایـەتی تـردا فەرموویـــــەتی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾[1] خـوا لەوانـەی هـەر لـە پێـشدا کۆچـەر بوونو لەوانـەیش کـە یاریـدەدەر بـوون، لەوانـەش کـە لـە چاکەدا شـوێن ئـەوان کـەوتن، ڕازی بـووەو ئەوانیش لـە خـوا ڕازیـنو باغـاتێکی بـۆ ئامـادە کـردوون جۆباریـان بـە بـەردا دەڕوا. وە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾[2] ئەو کەسانەش کە لە دوای ئەمانە هاتوون دەڵێن: ئـەی پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان، وا پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببە. کینـەی ئەوانـەمان مەخە دڵ کە باوەڕدار بوون، ئەی پەروەردگاری هەموومان تۆی دڵسۆزو دلۆڤـانی. لـە فەرموودەیەکدا هاتووە کـە بوخـاریو موسـلیم لەسـەری هـاوڕانو بـەڵکو بـە(موتەواتـەری )هـاتووە. لـە چـەند ڕێگـەی سەحیحەوە لە پێغەمبەری خـوداوە (ﷺ)ڕیوایـەت کـراوە کـە فەرموویـەتی: (هـەر کەسـە لەگـەڵ ئـەو کەسەیە کە خۆشی ویستوە)[3] وە فەرموویەتی: (کەسێ هەر گرۆیەکی خۆش ویستوە ئەو لەوانە) وە لـە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە: (حەشری لەگەڵ ئەواندایە)[4].

### میراتی بۆ کەسو کارە

خودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ بەپێی کتێبی خوا خزم بۆ خزم لە بێگانە نزیکترە، خوا لە هەموو شت ئاگادارە. واتە: لە بڕیاری خـوادا خزم بۆ خزم لە بێگانە نزیکترە، وە مەبەست بە ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ﴾ کە خودای گـەورە فەرموویـەتی ئـەو تایبەتمەندیە نیە کە زانایـانی فـەرائیز بـەکاریان هێنـاوە بـۆ ئـەو خزمانـەی کـە بەشـی فـەرزیان نیـەو

---

[1] التوبة (١٠٠).
[2] الحشر (١٠).
[3] فتح الباري (١٠/٥٧٣).
[4] الطبراني (٣/١٩).

عەسەبە(پشت)یش نین، کە دەیکەنە بەلگە بۆ خزمایەتی وەك پوری دایكیو خالۆو پوری باوکیو منداڵی کچو منداڵی خوشكو شێوەی ئەمانە، وەك هەندێکیان وا دەزانن و ئەم ئایەتە دەکەنە بەلگەو بەلاشیانەوە ئەوە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە لەو بارەیەوە. بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە گشتگیرەو هەموو خزمان دەگرێتەوە. وەك ئیبنوعەبباسو موجاهیدو عیکرمەو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریش گوتویانە.[1] وە ئەم ئایەتە نەسخی میراتی هاوپەیمانیو (برایەتی ئاینی) کردوەتەوە کە لە سەرەتادا میراتیان لە یەکتری دەبرد،بەو پەیوەندیانە، بەم پێیە هەموو زەویلئەرحامەکان (ذوي الارحام) دەگرێتەوە بەو ناوە تایبەتیەی خۆی، ئەوەی بیٚ بەشیان دەکات لە میراتی بردن، ئەم فەرموودانە دەکاتە بەلگە: (بێگومان خودا هەقی هەموو خاوەن هەقێکی داوە، هیچ ڕاسپاردنیٚ (وَصية) نیە بۆ کەسو کار)[2] وە گوتویانە: خۆ ئەگەر خاوەن هەق ببوایە، ئەوە بەشی خۆی دەبوو لەو فەرزەی لە کتێبی خوادا ناوی براوە، بەلام کە ئەوە وا نیە، دیارە ئەو کەسە میراتگر نیە.

## تەفسیری سورەتی (التوبة)

### لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە

﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾﴾

**بۆچی (بسم الله) لە سەرەتای ئەم سورەتەوە نەنوسراوە؟**

ئەم سورەتە پیرۆزە دواین سورەت بووە کە هاتوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە ئەلیٚ: (کۆتا) ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ﴾[3] دەربارەی کەسیٚ کە باوكو فەرزەندی نیەو دەمریٚ پرسیارت لیٚ دەکەن بلیٚ: خودا ئەو وەلامەتان ئەداتەوە. وە کۆتا سورەتیش کە هاتوەتە خوارەوە سورەتی بەرائەت بووە،[4] بۆیە (بسم الله)ی نەکراوە لە سەرەتاکەیەوە، چونکە هاوەلەکانی (ﷺ) نەیان نووسیوە لە سەرەتاکەیدا لە مەسحەفی ئیمامدا. بەلکو لەمەدا شوێنی گەورەی موسولمانان عوسمانی کوڕی عەفان کەوتن (ڕەزای خوای لیٚبیٚ)، وە سەرەتای ئەم سورەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتیٚ لە غەزای تەبوك ئەگەڕایەوەونیازی حەجکردنی کرد . پاشان بیری کردەوەکە

[1] الطبري (١٤/٩٠٠).
[2] أبوداود (٣/٢٩١).
[3] النساء (١٧٦).
[4] فتح الباري (٨/١٦٧).

بتپەرستان ئەم ساڵ ئامادەی مەوسیمی حەج دەبن، بەپێی ئەو باوەی خۆیان لەسەری بوون،ودیارە بەڕووتیش تەواف دەکەن پێغەمبەر(ص) تێکەڵاوی ئەوانی پێ ناخۆش بوو،بۆیە ئەبوبەکری نارد (ڕەزای خوای لێبێ) وەك لێپرسراوی حەجی ئەو ساڵە، بۆ ئەوەی ئەو عیبادەتو قوربانیو پێویستیەکانی تری حەج فێری خەڵکی بکاتو جێبەجێی بکات و بتپەرستەکانیش ئاگادار بکات، کە دوای ئەو ساڵە ئیتر نابێ حەج بکەن. وە لەناو ئەو خەڵکەیشدا بانگەواز بکات وبڵێ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾(ئەمە) دەربڕینی بێزاریە لە خواو پێغەمبەریەوە. کاتێ کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) گەڕایەوە پێغەمبەر(ص) عەلی کوڕی ئەبوتالیبی بەدوایدا نارد، بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە لەبری پێغەمبەری خوا (ﷺ)چونکە عەلی پشتی پێغەمبەر بوو وەك لەمەودوا باسی دێتو ڕوون دەکرێتەوە.

## ڕاگەیاندنی بێزاری دەربڕین بەرانبەر بتپەرستەکان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝١ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ دەربڕینی بێزاریە لە خواو پێغەمبەریەوە، لەو شەریکدانەرانە، کە ئێوە بوونەتە هاوپەیمانیان. هەتا چوار مانگ ڕێتان هەیە لەم زەمینەدا بگەڕێن، دەبێ ئەوەندەش بزانن کە ناتوانن خۆتان لە خوا ڕزگار کەن، خودا خوانەناسان ڕیسوا دەکات.. ئەمە بێزاری دەربڕینە، واتە: لەلایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە. ئەم ئایەتە تەنیابۆ ئەو خاوەنپەیمانەیە کە پەیمانی ڕەهایان بەستوەو کاتی دیاری نەکراوە، یان پەیمانێکیان بەستوە بەڵام کەمتر بووە لە چوار مانگ، ئەوە چوار مانگەکەی بۆ تەواو دەکرێ، بەڵام ئەو کەسانەی پەیمانێکی کاتیان هەیە ، ماوەکەی تا ئەو کاتەیە کە تەواو دەبێ ماوەکەی هەرچەندێك بێت،بەبەڵگەی ئەوەی خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾[1] هەتا ماوەی پەیمانەکە تەواو دەبێ، ئێوە پەیمانیان مەشکێنن، خودا پارێزگارانی خۆش دەوێ. هەروەها بەبەڵگەی ئەوەش لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (هەرکەسێ لە نێوانی ئەوو نێوانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پەیمانێکی بەستوە، پەیمانەکەی هەتا ئەو کاتەیە (کە تەواو دەبێ)) ئەمە چاکترینو بەهێزترین قسەیە، ئیبنوجەریر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە، ڕیوایەتیش کراوە لە کەلبیو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیو کەسانی تریشەوە[2] ئەبومەعشەری مەدەنی ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیو کەسانی تریش بۆیان گێڕاینەوەئەڵێن : پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبوبەکری ناردو کردی بە لێپرسراوی

---

[1] التوبة (٤).

[2] الطبري (١٤/١٠٠–١٠٢).

(أمیر) بەجێهێنانی حەجی ساڵی نۆهەمی (کۆچی) پاشان عەلی کوڕی ئەبوتالبی نارد بە( سی) ئایەت یان چل ئایەتەوە لە سورەتی بەرائەتو خوێندیەوە بەسەر ئەو خەڵکەدا. ئەو بتپەرستانە چوار مانگ مۆڵەت دران لەو سەر زەمینە بگەڕێن. ڕۆژی عەرەفە خوێندیەوە بەسەریاندا، ماوەکەیان لە بیستی زیلحیجەوە وە دەستی پێکرد، موحەڕڕەمو سەفەرو مانگی ڕەبیعولئەوەل ولە دە ڕۆژی ڕەبیعولئاخیردا کۆتایی هات. ئایەتەکانی لە شوێنەکانی خۆیاندا بە سەردا خوێندنەوەو گوتی: دوای ئەم ساڵەی کە تێیدان، هەرگیز نابێ بتپەرست حەج بکات ونابێ بە ڕووتیش بە دەوری بەیتدا باسوڕێتەوە (تەواف بکات)[1].

﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥۚ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٌ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ ﴾

بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ ﴾ خوداو پێغەمبەری خودا لە ڕۆژی حەجی گەورەدا بە مەردم ڕادەگەیەنن. حەجی گەورە، ڕۆژی قوربانیە کە ئەو ڕۆژە بەڕێزترین ڕۆژەکانی بەجێهێنانی ئەرکەکانی حەجو دیار ترو زیاتر قەرەباڵغە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾ کە خوا لە بتپەرستان بێزارە و(هەروەها پێغەمبەرەکەشی (ﷺ) لە بتپەرستان بێزارە)، پاشان بانگیان دەکات کە تەوبە بکەن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٌ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ﴾ ئەگەر پەشیمان ببنەوە ئەوە چاکە بۆتان، ئەگەریش قبوڵی نەکەن لێتان ڕوون بێ کە لە دەستی خودا دەرناچن، واتە: ئەگەر ئێوە وازتان هێنا لەو بتپەرستیو گومراییە، ئەوە چاکە بۆتان، خۆ ئەگەر هەر بەردەوام بن لەسەری، خودا توانای هەیە بەسەرتانداو لە دەستی دەرناچن، هەرچی بوێ پێتان دەکات ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ مژدەیش بدە بەوانەی خوانەناسن بەشیان ئازاری بە ژانە. واتە: لە دنیادا ڕیسوا دەبنو دەبنە پەندو ئامۆژگاری بۆ خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتیشدا زنجیر دەکرێنو بە گورزی ئاسن لێیان ئەدرێ. بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ڕیوایەتی کردوە کە ئەبوهورەیرەئەڵێت : (ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) ناردمی لەو حەجەدا لەگەڵ ئەو بانگەواز کەرانەدا کە ناردبونی لە ڕۆژی قوربانی کردندا، لە (منی) دا بانگیان دەکردو (دەیانگوت) دوای ئەمساڵ هیچ بتپەرستێ حەج ناکاتو هیچ کەسیش بە ڕووتی بە دەوری ماڵی خوادا (کەعبەدا) ناسوڕێتەوە. حەمیدئەڵێ : پاشان پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبوتالبی (ڕەزای خوای لێبێ) بە

[1] الطبري (٦/٣٠٤).

دوایاندا نارد، فەرمانی پێکرد کە بانگەواز بکات بۆ دەربڕینی بێزاری خوداو پێغەمبەرەکەی لە بتپەرستان)،( عەلی)یش لەگەڵ ئێمەدا بانگەوازی دەکرد لەناو خەڵکی (مینا)داو لە ڕۆژی قوربانیدا و(ببراءة)ی ڕاگەیاند وئەیوت ئیتر هیچ بتپەرستێ دوای ئەمساڵ حەج ناکاتوکەسیش بە ڕووتی بە دەوری ماڵی خوادا ناسوڕێتەوە.[1] بوخاریش دیسان ڕیوایەتی کردووە کە ئەبوهورەیرەئەڵێ: ئەبوبەکر ناردمی لەگەڵ ئەوانەی جارِیان ئەدا لە ڕۆژی قوربانیدا لە مینادا، (گوتمان) هیچ بتپەرستێ دوای ئەمساڵ بۆی نیە حەج بکاتو کەسیش بە ڕووتی بە دەوری (بەیتدا) ناسوڕێتەوە، وە ڕۆژی حەجی مەزنیش ڕۆژی قوربانی سەربڕینە، بۆیە وترا (مەزن)چونکە خەڵکی دەیانگوت: حەجی بچکۆلە، لەو ساڵەدا ئەبوبەکر ئەوقسەیەی دایەوە بە سەریانداوئیتر لە ساڵی حەجی خواحافیزدا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەجی تیا کرد، هیچ بتپەرستێ حەجی نەکرد.[2] ئەمە گفتی بوخاریە لە کتێبی جیهادا. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوجەعفەرەوە، موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێبێ)ئەڵێ: کاتێ (براءة) هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبوبەکری نارد تا حەج بکات بۆ خەڵکی، گوترا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر بتناردایە بۆ ئەبوبەکر (باشتر بوو)[3]؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەسێ جێبەجێی ناکات لەباتی من مەگەر پیاوێ لە بنەماڵەی خۆم). پاشان بانگی عەلی کردو فەرمووی: (بەم بەسەرهاتەی لە سەرەتای بەرائەتەوە بچۆ دەرەوە و جاڕ بدە لەناو خەڵکیدا لە ڕۆژی قوربانیدا،کاتێك کەخەڵك لە مینادا کۆ بوونەوە:دڵنیابن خوانەناس ناچێتە بەهەشت، بتپەرست پاش ئەمساڵ نابێ حەج بکات.لەمەودوا کەس بە ڕووتی بە دەوری ماڵی خوادا ناسوڕێتەوە. هەرکەسێ پەیمانێکی لە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەیە، ئەوە ئەو پەیمانە دەمێنێتەوە بۆی تا ئەو ماوەی بۆی دیاری کراوە) عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) بە سواری وشترەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە پێی ئەوترا عەزباء دەرچوو تا گەیشتەوە بە ئەبوبەکردا لە ڕێگەکەدا، کاتێ ئەبوبەکر چاوی پێی کەوت گوتی: تۆ فەرماندەی یان فەرمان پێکراوی؟ عەلی گوتی: فەرمانم پێکراوە، پاشان ڕۆشتن ئەبوبەکر (ئەرکی) حەجی بۆ خەڵکی جێبەجێ کرد، عەرەبەکان لەو کاتەداو لەو ساڵەدا هەر لەسەر ڕێو ڕەسمی کاتی نەفامی خۆیان بوون. تا ڕۆژی قوربانی سەربڕین هات، عەلی کوڕی ئەبوتالب هەڵساو لەناو ئەو خەڵکەدا بانگەوازی بەوە کرد کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردبوو، گوتی: ئەی خەڵکینە ! بێگومان خوانەناس ناچێتە بەهەشت، وە بتپەرست حەج ناکات دوای ئەمساڵو ڕووتیش بە دەوری ماڵی خوادا ناسوڕێتەوە، وە

---

[1] فتح الباري (١٦٨).

[2] فتح الباري (١٦٨/٨).

[3] یانی ئەگەر ڕاگەیاندنی (براءة)کەشت بناردایە وەهەر ئەبوبەکر ئەوکارەشی بکردایە ،نەك یەکێکی تر(وەرگێڕ).

هەرکەسێ پەیمانێکی هەبووە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە تا ماوەی دیاری کراوی خۆیەتی. بتپەرست دوای ئەمساڵ نابێ حەج بکات، بە ڕووتیش بە دەوری ماڵی خودا(البیت) ناسوڕێتەوە، پاشان هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمە بێزاری دەربڕین بوو لە خەڵکی بتپەرست و گروپەپەیماندارەکان کە پەیمانی ڕەهایان هەبووە، وە ئەو کەسانەش کە خاوەنی پەیمانێکی دیاری کراو بوون [1].

إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤﴾

**هەرکەسێ پەیمانێکی بووەو لێی لا نەداوە، ئەوە پەیمانەکەی تا (تەواو بوونی) ماوەکەیەتی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡ ﴾ جگە بتپەرستانێ کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون و لەسەر پەیمانەکەیان لایان نەداوەو دژی ئێوە یاریدەی کەسیان نەداوە، هەتا ماوەی پەیمانەکە بەسەردەچێ، ئێوە پەیمانتان مەشکێنن و بۆیان تەواو بکەن. ئەمە جیا کردنەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی پەیمانی ڕەهایان هەیە کە ماوەکەیان بۆ دوا دەخرێ تا چوار مانگ، لەو ماوەیەدا ئازادەو بە ئارەزوی خۆی لەسەر زەویدا دەگەڕێ بۆ هەر شوێنێ دەڕوا ئارەزوی خۆیەتی دەتوانێ خۆی ڕزگار بکات، جگە لەوانەی پەیمانی کاتیان بەستووە، ئەوە ماوەکەیان تا ئەو کاتەیە کە پەیمانە دیاری کراوەکەی لەسەر بەستراوە. فەرموودەی زۆر لە پێشدا لەم بارەیەوە هێنرا، کە هەرکەسێ پەیمانێکی بووە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەوە پەیمانەکەی تا ئەو کاتەیە کە بۆی دیاری کراوە بەو مەرجە ئەو کەسە کە پەیمانەکەی بەستووە پەیمانەکەی نەشکاندبێ، یاریدەی کەسیان نەدابێ دژی موسوڵمانان، ئەوە ئەو کەسە پەیمان شکێنی لەگەڵدا ناکرێ، پەیمانەکەی تا ئەو کاتەیە کە بۆی دیاری کراوە. هەر بۆیە خوای مەزن هانی (موسوڵمانانی) داوە کە پەیمانی خۆیان بەجێبێنن بەو شێوەیەی کە دیاری کراوە.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ خوا پارێزگارانی خۆش دەوێ.

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾ ﴾

---

[1] الطبري (١٤/١٠٧).

**ئا ئەمە ئایەتی شمشێرە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ﴾ هەر کاتێ مانگە حەرامەکان (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب) تەواو بوون. موجاهیدو عەمری کوڕی شوعەیبو موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو قەتادەو سوودیو عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێن : مەبەست بە مانگە حەرامەکان، ئەو چوار مانگەیە کە ئاسانکاریان تیا کراوەو دەقی (قورئان) لەسەری هاتووە.[1] وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾[2] هەتا چوار مانگ بۆتان هەیە لەم زەمینەدا بگەڕێن. واتە: ئەوانەی شەریکیان بۆ خوا داناوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ﴾ هەر کاتێ مانگە حەرامەکان تەواو بوون. واتە: کاتێ ئەو چوار مانگە کە حەراممان کرد لێتان کە شەڕیان تێدا بکەن لەگەڵ بتپەرستانو مۆڵەتمان دان تێیدا، ﴿فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ ئەو بتپەرستان لە کوێوە دەستانکەوتن بیانکوژن، واتە: لەو سەر زەمینەداو لەو ساڵەدا، بەڵام ئەوەی مەشهورە تایبەت کراوە بە حەرامکردنی شەڕ لە حەرەمدا (لەلای کەعبەی پیرۆزدا) وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُقَـٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَـٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ﴾[3] لە دەوروبەری (مسجد الحرام)یشدا نابێ شەڕیان لەگەڵ بکەن، مەگەر ئەوان لەوێ شەڕتان پێ بفرۆشن، ئەگەر لەوێش شەڕیان پێ فرۆشتن، ئێوەیش بیانکوژن ﴿وَخُذُوهُمْ﴾ بیان گرن، واتە: دیلیان کەن، ئەگەر ویستتان بیانکوژن، گەر ویستیشتان بە دیلی بیانهێڵنەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ بەندیان کەنو بۆسەیان بۆ بنێنەوە، واتە: هەر بەوە واز مەهێنن لە هەر کوێ وەدەستتان کەوتن، بەڵکو بچن بۆیانو لە شوێنو قەلاکانی خۆیاندا دەوریان بدەنو کەمینیان بۆ دانێن لە ڕێگاکانیانداو ئەو شوێنانەی کە تێیدا دێنو دەچن، هەتا تەنگیان پێ هەڵدەچنو ناچاریان دەکەن بە کوشتن یان موسوڵمان دەبن. بۆیە خوادای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر پەشیمان بوونەوەو بوونە نوێژکەرو زەکات دەر، ئەوسا دەستیان لێ هەڵگرن، خودا لە تاوان خۆش دەبێو دلۆڤانە. بۆیە ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوای لێبێ) پشتی بەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە بەستبوو بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوانەی زەکاتیان

---

[1] الطبري (١٤/١٣٦-١٣٧).

[2] التوبة (٢).

[3] البقرة (١٩١).

نەئەدا. لەو کاتەدا شەڕ کردن لەگەڵیان حەرام کرا بوو بەو مەرجەی کە ئەو کارانە بەجێبێنن، کە چوونە ناو ئیسلامو هەڵسان بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی، وە لە سەرەوە هەتا خوار ڕێنمایی کردووە. بەڕێزترین پایەکانی ئیسلام دوای شایەتومان نوێژە، کە هەقی خودای گەورەیە پاشان زەکاتدانە، کە سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەژارانو کەم دەستان کە ئەمیش بەڕێزترین ئاکارێکە کە پەیوەندی بە خەڵکەوە هەیە، بۆیە لە زۆر شوێندا لە قورئاندا کە خودای گەورە باسی نوێژی هێناوە لەگەڵیدا باسی زەکاتیشی کردوە وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنوعومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: (فەرمانم پێدراوە کە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا شایەتی ئەدەن کە جگە لە خودا هیچ پەرستراوێکی تر نیە، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە (ﷺ) نوێژ بکەنو زەکات بدەن).[1] ئەم ئایەتە ئایەتی شمشێرە (آيةالسيف) کە زەححاکی کوڕی موزاحیم لە بارەیەوە گوتویەتی: ئەم ئایەتە هەموو پەیمانێکی نەسخ کردوەتەوە کە لە نێوان پێغەمبەرو هەر بتپەرستێ لە بتپەرستان بەسترابێ بە ماوەکەیشیەوە. عەوفی ئەڵێ : لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: بۆ هیچ بتپەرستێ لە بتپەرستان پەیمانو سایە نەماوە لەو کاتەوە ئەم ئایەتی بەرائەتە هاتوەتە خوارەوە. تەواو بوونی مانگە حەرامەکانو ماوەی ئەو کەسانە کە بتپەرست بوونو پەیمانیان بووە پێش هاتنە خوارەوەی (بەرائەت) چوار مانگ بووە. لەو ڕۆژەی کە بێزاری دەربڕین ڕاگەیەنرا هەتا دە ڕۆژی سەرەتای مانگی ڕەبیعی دواین (ربيع الآخر)[2].

﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ۝٦﴾

**کاتێ بتپەرستێك داوای پەنای کرد، پەنا ئەدرێ**

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ هەر کاتێ یەکێك لە ئەو کەسانەی بتپەرستن خۆی خستە بەر پەنای تۆ پەنای بدە، با گوتەی خوا ببیسێ. واتە: ئەو بتپەرستانەی کە فەرمانم پێکردی شەڕیان لەگەڵ بکەیو خوێنو ماڵیانم بۆ حەڵاڵ کردی کە هاتن داوای پەنایان لێ کردی لێیان قبووڵ بکە با قسەی خوا ببیسێ. واتە: قورئانیان بەسەردا دەخوێنیو هەندێ باسی فەرمانی ئاینیان بۆ دەکەیت هەتا بەڵگەی خوایان بۆ دەسەلمێنی ﴿ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ﴾ ئەوسا بیگەیەنە شوێنێ کە نەترسێ، واتە: ئەو کەسە ناترسێنرێ وئەم

[1] فتح الباري (١/٩٥)، مسلم (١/٥٣).

[2] الطبري (١٤/١٣٣).

ئەمانەشی بەردەوام ئەبێ تا دەگەڕێتەوە وڵاتو ماڵی خۆی بێ ترس ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾ چونکە ئەوانە نەزانن. بۆیە ئەو دڵنیایەمان دا بەوانە هەتا ئاگاداری ئاینی خودا ببن‌و پەیامی خوا بڵاو ببێتەوە لەناو عەبدەکانیدا. ئیبنوئەبی نجیح ئەڵێ: لە موجاهیدەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: خەڵکی دێتە لات تا ئەوەی دەیڵێیت‌و ئەوەی بۆت دێتە خوارەوە بیبیسێ، ئەبێ بێترس بێت تا دێتە لات‌و قسەی خودای گوێ لێ دەبێ، وە تا دەگاتەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتوە ئەبێ بێترس بێ.[1] ئالێرەوەیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دڵنیایی ئەدا بەوانەی دەهاتنە لای‌و داوای ڕێنمایان دەکرد یان نامەیەکیان دەهێنا، وەك لە ڕۆژی حودەیبییەدا کۆمەڵێ لەو ڕەوانەکراوانەی قورەیش هاتنە لای لەوانە: عوروەی کوڕی مەسعودو مکرەزی کوڕی حەفس‌و سوهەیلی کوڕی عەمرو کەسانی تریش کە یەك لە دوای یەك دەهاتن، هاتوچۆیان دەکرد لەسەر ئەو کێشەی لە نێوان پێغەمبەرو(ﷺ) بتپەرستەکاندا هەبوو. ئەو ڕێزگرتنە مەزنەی موسوڵمانانیان بینی کە بۆ پێغەمبەری خوایان هەیە (ﷺ) چەند بەڕێز بوو لایان، کە ئەوەیان لەلای هیچ پاشاو قەیسەرێ نەبینیبوو، کاتێ گەڕانەوە بۆ ناو هۆزەکەیان، ئەو (بەسەرهاتەیان) بۆ باس کردن. ئەوەو چەندین نموونەی تریش کە گەورەترین هۆکاری شارەزا بوونی زۆرێك بوو لەئیسلامدا ، هەرلەبەرئەوەبوو کە نێرراوەکەی موسەیلەمەی درۆزن کاتێك گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: ئایا شایەتی ئەدەی کە موسەیلەمە نێرراوی خوایە؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خودا فەرمووی: (لەبەر ئەوە نەبێ کە نێرراو ناکوژرێ ئەمدا لە ملت).[2] خودای گەورە لێدانی ملی بۆ سازاند لەکاتی میرنشینی ئیبنومەسعوددا لە کوفە. ئەو کابرایە پێی دەگوترا: ئیبنونەواحە، لە کاتی ئیبنومەسعوددا (کە میرنشینی کوفە بوو) لێی دەرکەوتبوو کە شایەتی ئەدا موسەیلەمە خاوەن پەیام بووە، ئیبنومەسعود ناردی بە شوێنیداو پێی گوت: تۆ ئێستا خۆ نوێنەری کەس نیت، فەرمانی بۆ دەرکردو درا لە ملی (بەر بەزەیی خوا نەکەوێ‌و لەعنەتی خوای لێبێ). مەبەستەکە لێرەدا ئەوەیە هەرکەسێ لە (دار الحرب)وە هات بۆ (دار الاسلام) (واتە: لە وڵاتی دژمنانی ئیسلامەوە هات بۆ وڵاتی موسوڵمانان) بۆ گەیاندنی پەیامێ یا بازرگانیەك یا ئاشتینامەیەك یان ئاگربەستێك یان هێنانی سەرانەیەك یا هەر شتێ لەو شێوازە بێ، داوای لە ئیمام یا جێگرەکەی کرد کە پەنای بدات، پەنای پێ ئەدرێت، لەبەر ئەوەی کە دێت‌و دەچێ لە (دار الاسلام)دا. هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی ترسی نامێنێ‌و وڵاتی خۆیەتی.

---

[1] الطبري (١٤/١٣٩).

[2] إبن هشام (٤/٢٤٧)، سەحیحە.

﴿كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا الَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ
الْحَرَامِ ۖ فَمَا اسْتَقَٰمُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾﴾

**جەختكردنەوە لەسەر بێزاری دەربڕین لە بتپەرستان**

خودای گەورە باسی كارزانی خۆی دەكات لەبارەی بێزاری دەربڕینو مۆڵەت دانی بتپەرستان تا چوار مانگ، پاشان لە هەر شوێنێكدا پێیان گەیشتن بە شمشێری بڕندە بەر شمشێریان دەن وەك فەرموویەتی: ﴿كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ﴾ چۆن پەیمان بۆ ئەو بتپەرستانە دەبێ لای خوداو پێغەمبەرەكەی (ﷺ)؟ واتە: چۆن هەروا وازیان لێ دەهێنریۆ بێترس دادەنیشن، كە ئەوانە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەكەی نیە، ﴿إِلَّا الَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ جگە لەو بتپەرستانەی هێشتا لەسەر پەیمان ماون كە پێكەوە لە لای ﴿الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾دا پەیمانتان بەست. یانی: لە ڕۆژی حودەیبیەدا. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَالْهَدْيَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾[1] هەر ئەوانە ئەو خوانەناسانە بوون كە بوونە لەمپەرو نەیانهێشت بچنە كەعبەو ڕێشیان نەدا قوربانیەكانتان (كە لەگەڵیان بوو) بگاتە شوێنی خۆی. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا اسْتَقَٰمُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ﴾ تا لەسەر پەیمانەكە مابن، ئێوە پەیمان شكێن مەبن. واتە: هەتا ئەوانە پابەند دەبن لەو پەیمانو گرێبەستەی لەگەڵتان بەستوون لە وازهێنان لە شەڕ لە نێوان ئێوەو ئەواندا بۆ ماوەی دە ساڵ ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ خودا پارێزگارانی خۆش دەوێ. پێغەمبەرو(ﷺ) موسوڵمانان وایان كرد، ئەو پەیمانو شەڕ وەستانە بەردەوام بوو لەگەڵ خەڵكی مەككەدا لە زیلحەجەی ساڵی شەشی كۆچیەوە هەتا ئەو كاتەی قورەیشیەكان پەیمانەكەیان شكاندو یارمەتی هاوپەیمانەكانیان دا كە بەنی بەكریەكان بوون لە دژی خوزاعەكاندا كە هاوپەیمانی پێغەمبەری خودا بوون (ﷺ) شەڕیان لەگەڵدا كردن لە حەرەمدا، دوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای كردن لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی كۆچیدا. خودای گەورە سەری خستنو مەككەی پیرۆزی بۆ ئازاد كردنو زاڵی كردن بەسەر بتپەرستاندا، سوپاسو ستایش هەر بۆ خوای گەورەیە. ئەوانەی كە موسوڵمان بوون دوای سەركەوتنو زاڵ بوون بەسەریاندا، ئازادی كردن، ناونران ئازادكراوان. كە نزیكەی دوو هەزار كەس دەبوون، ئەوەیش لەسەر خوانەناسی خۆی بەردەوام بوو لە دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوونو ڕایان كرد، ناردی بە شوێنیانداو دڵنیایی پێدانو

[1] الفتح (٢٥).

ئاسانكاری بۆ كردن هەتا چوار مانگ بۆ كوێ ئارەزویان لێیە بڕۆن. لەوانە: سەفوانی كوڕی ئومەیەو عیكرمەی كوڕی ئەبوجەهل كەسانێكی تریش بوون. پاشان خوای گەورە ڕێی نیشانداندان و زۆر بە چاكی موسوڵمان بوون. هەر خودای گەورە شایستەی سوپاس و ستایشە لەسەر هەموو شتێ كە بڕیاری لەسەر ئەداو دەیكات.

﴿كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ﴾ چۆن پەیمانێك، ئەوان هەركاتێ بزانن چارت دەكەن، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە خزمایەتی یان پەیمان بە گژتاندا دێن، هەر بە دەم دڵخۆشتان دەكەن، بەڵام نیازی خراپیان لە دڵدایە، زۆربەیان خراپ و بەدفەڕن. خودای گەورە هانی خاوەنباوەڕان ئەدات لەسەر دژایەتی كردنی بتپەرستان و بێزاری دەربڕین لێیان و بۆیان ڕووندەكاتەوە كە ئەوانە شایەنی ئەوانە نین پەیمانیان لەگەڵدا ببەسترێ لەبەر ئەوەی هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو بڕوایان بە پێغەمبەریش نیە(ﷺ) وە ئەو بتپەرستانە هەركاتێ دەستەڵاتیان پەیداكردبەسەرموسوڵماناندا نەخزمایەتی دەفامن ونەهاوپەیمانی و چاوپۆشیتان لێناكەن، هەرچی بتوانن دەیكەن ودرێغی ناكەن، عەلی كوڕی ئەبوتەلحەو عیكرمەو عەوفی ئەڵێن: لە ئیبنو عەبباسەوە(الإل) یانی: خزمایەتی(الذمة) یانی: پەیمان[1]. زەححاك وسوودیش هەر وایان گوتوە[2].

﴿اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ ۚ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ نیشانەكانی خوایان بە نرخێكی كەم فرۆشتوە. خودای گەورە لێرەدا دیسان باسی خراپی و بەدفەڕی بتپەرستان دەكات و خاوەنباوەڕان هەڵدەنێ كە بچن بە گژیاندا، واتە: شوێن كەوتنی ئایەتەكانی خودایان گۆڕیوەتەوە بە ڕابواردنێكی كەمی بێ بەهای ژیانی دنیا، ﴿فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ﴾ ئەوسا ڕێگەی خوایان بەست. واتە: بوونە ڕێگر لە

---

[1] الطبري (١٤٦/١٤).
[2] الطبري (١٤٧/١٤).

ڕێی خاوەن باوەڕاندا کە شوێنی هەق بکەون ﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝٩ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ﴾ ئەوانەی کاری خراپ زۆر دەکەن، لەسەر هیچ خاوەن باوەڕێك، هاوپەیمانیو خزمایەتی ڕەچاو ناکەن، ئەمانە هەر دەست درێژی پیشەیانە. ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ سا ئەگەر (لە بتپەرستی) وازیان هێناو نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئیتر برای دینی ئێوەن، ئێمە ئەم نیشانانەمان بۆ خەڵکێ ڕوون دەکەینەوە کە دەیزانن.لەپێشەوەئەم ئایەتەو ئایەتەکانی پێش ئەمەشمان تەفسیرکردووە.

﴿ وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ۝١٢﴾

**پێشەوایانی خوانەناسان بێ پەیمانن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ ﴾ ئەگەر لە دوای پەیمان بەستن سوێندەکەیان هەڵوەشاندەوە. واتە: ئەگەر ئەو بتپەرستانەی کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، پەیمانەکەیان شکاندو ﴿وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ﴾ تیرو تانەیان لە ئاینەکەتان دا، بە ناتەواوىو کەموکوڕی سەیریان کرد، لەم ئایەتەوە وەرگیراوە کە هەرکەسێ قسەی بە پێغەمبەری خودا گوت (ﷺ) یان توانجی لە ئاینی ئیسلام داو بە ناتەواوی زانی دەکوژرێ. هەر لەبەر ئەوەیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَقَٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ﴾ ئێوە لەگەڵ پێشەوایانی خوانەناساندا بەشەڕ بێن، ئەوانە بێ پەیمانن، بەڵکو دەستتان لێ هەڵگرن. واتە: بەڵکو واز بێنن لەو خوانەناسیو لاساریو گومڕایەی کە تێیدانو بگەڕێنەوە. قەتادەو کەسانی تریش گوتویانە: پێشەوایانی خوانەناسان وەك ئەبوجەهلو عوتبەو شەیبەو ئومەیەی کوڕی خەلەفو چەند پیاوێکی تری هەژمار کرد، ئەعمەش ئەڵێ لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە لە حوزەیفەوەئەڵێت: ئەهلی ئەم ئایەتەپاش اتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە کەس کەس شەڕی پێنەفرۆشتوون[1]. وە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە ڕیوایەت کراوە (ڕەزای خوای لێبێ) هەر بەم شێوەیە. ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەم ئایەتە گشتگیرە، هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەی بتپەرستەکانی قورەیشە، بەڵام ئەوانیشو جگە لەئەوانیش دەگرێتەوە (والله أعلم)، وەلیدی کوڕی موسلم ئەڵێت : سەفوانی کوڕی عەمر بۆی باس

---

[1] الطبري (١٥٦/١٤).

کردین لە عەبدوڕەحمانی کوڕی جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە: بەدڵنیاییەوە لە زەمانی ئەبوبەکردا بووین (ڕەزای خوای لێبێ)، قسەی بۆ ئەو خەڵکە دەکرد کاتێ کە ڕووەو شام ڕەوانەی دەکردن فەرموی: بێگومان بەو زوانە ئێوە دەگەنە کۆمەڵێ (زۆرلوتبەرزن)، بە شمشێرەکانتان لە شەیتانە گەورەکانیان بدەن، سوێند بە خوا پیاوێ لەوانە بکوژم پێم خۆشترە لەوەی کە حەفتا کەس لە جگە لە ئەوان بکوژم، چونکە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ﴾ ئیبنوئەبی حاتم ڕیوایەتی کردوە.[1]

﴿أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾﴾

**هاندان بۆ شەڕکردن لەگەڵیان و هەندێ لە سوودەکانی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ﴾ ئایا ئێوە بە گژ خەڵکانێکدا ناچن کە لە سوێند پاشگەز بوونەتەوەو نیازیان هێناوە پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خۆیان دەرکەن. ئەمەیش دیسان هاندان و هەڵنان و خۆشەویست کردنی بەگژدا چوونی بتپەرستانە کە لە سوێندەکەیان پاشگەز بوونەتەوەو ئەندێشەی دەرکردنی پێغەمبەریان (ﷺ) لە مەککە کەوتوەتە سەر، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾[2] بێتە بیرت ئەوسا خوانەناسەکان ویستیان فێڵێکت لێ بکەن یان بەندت کەن یان بتکوژن یان دەرت کەن، ئەوان بە (بەردەوام) فرووفێڵ دەکەن، خودایش لە بەرانبەر ئەواندا پیلان دەگێڕێ، خودا چاکترین پیلان گێڕە. وە فەرمویەتی: ﴿يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ﴾[3] پێغەمبەرو ئێوە لە زێدی خۆتان دەردەکەن لەبەر ئەوەی بە خودای پەروەردگارتان بڕواتان هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسۡتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ

---

[1] إبن أبي حاتم (٦/١٧٦١).
[2] الانفال (٣٠).
[3] الممتحنة (١).

﴿لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا﴾[1] هێندەی نەمابوو ئەوانە لەو سەر زەمینە بتخەنە تەنگانەوە، تاكو لەوێدا دەرت كەن وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ دەس پێشكەریش (لەو شەڕەدا) ئەوان كردیان، ئەڵێن مەبەست بەو ڕۆژە بەدرە، كاتێ كە بتپەرستەكان دەرچوو بوون بۆ یارمەتی دانی كاروانەكەیان كە كاروانەكە ڕزگاری بوو، زانیان ڕزگاری بووە، بەڵام هەر بەردەوام بوون لەسەر ڕۆشتن بەرەو ئەو شوێنە بۆ شەڕ كردن چونكە زۆر خۆبەزلزان و ملهوڕ بوون، وەك لە پێشەوە باسی لێ كرا، وە گوتراویشە: مەبەست پێی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەكەیەو شەڕ كردنیانە لەگەڵ بەنی بەكری هاوپەیمانیان لە دژی خوزاعە كە هاوپەیمانی پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ساڵی فەتحدا ڕۆیشت بۆیان‌و ئەوەی كە ڕوویدا ڕوویدا سوپاس‌و ستایش بۆ خودای گەورە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئایا لێیان دەترسن؟ هەر خوا شایستە ترە كە لێی بترسن ئەگەر ئێوە خاوەن باوەڕن. واتە: لەوانە مەترسن لە من بترسن چونكە من شایستەی ئەوەم كە بەندەكانم بترسن لە هێزو تۆڵەم، هەموو شتێ بە دەستی منە، مەیلم لە هەر شتێ بوبێ بووەو هەرچیش مەیلم لێ نەبوبێ نەبووە، پاشان بۆ ورەبەرز كردنەوەی خاوەن باوەڕان‌و دەرخستنی كارزانی خودا خۆی لەسەر ئەو جیهادەی لەسەری فەرز كردون لەگەڵ تواناییدا بۆ لەناوبردنی دوژمنەكانی بە فەرمانێ لەلایەن خۆیەوە ئەفەرموێت: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ ئێوە بچن بە گژیاندا، بە دەستی ئێوە ئەوان تووشی ئازار دەكات‌و ژێریان دەخات‌و سەرتان دەخات بەسەریانداو كارێ دەكات كوڵی دڵی باوەڕداران دابمركێ. ئەمە بە گشتی هەموو كۆمەڵی موسوڵمانان دەگرێتەوە. موجاهیدو سوودی‌و عیكرمە لەم ئایەتەدا: ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەڵێن: یانی: خوزاعە.[2] ﴿وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ﴾ ڕقی دڵیان دادەمركێ. ئەوزەمیرەشی دیسان هەربۆئەوان گەڕاندوەتەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ﴾ هەركەسێ لە گوناه دەس هەڵگرێ،خواش لێی وەردەگرێ. واتە: لە عەبدەكانی. ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا زانای لەكارزانە. واتە: دەزانێ چی بۆ عەبدەكانی دەشێ‌و كارزانە لە كردارو گفتارەكانیدا شەرعی، بێ یان كەونی بێ. هەرچی بوێ دەیكات‌و هەر

---

[1] الاسراء (٧٦).

[2] الطبري (١٤/١٦١).

بڕیارێکی بوێ ئەیدا، هەر خودا دادپەروەرو فەرمانڕەوایە کە هەرگیز ستەم ناکاتو بە ئەندازەی بچوکترن شت ون ناکات لەچاکەو لەخراپە. بەڵکو پاداشتی لەسەرئەداتەوە لە دنیاو لە قیامەتدا.

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

## یەکێ لە پەندەکانی جەنگ تاقیکردنەوەی موسوڵمانانە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ ﴾ پێتان وایە (ئەی خاوەن باوەڕان) وازتان لێ دەهێنرێو پشت گوێتان دەخەینو تاقیتان ناکەینەوە بە چەند شتێ تا خەڵکی لێبڕاوو ڕاستگۆی تێدا دەرکەوێو خەڵکی درۆزنی تیا جیا ببێتەوە؟ بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ﴾ خودایش لەوانەی لە ئێوە چوونە غەزا، جگە لە خوداو پێغەمبەرو خاوەنباوەڕان هیچ کەسێ هاوڕازیان نەبووە، ﴿وَلِيجَةً﴾ هاوڕازو جێ نهێنی. بەڵکو ئەوانە بە ئاشکراو بە نهێنی دڵسۆزی خوداو پێغەمبەرەکەی بوون (ﷺ) لێرەدا بە باسی ڕاستگۆیان وازی لە ئەو بەشەکەی تر هێناوە. خودای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾[1] ئاخۆ مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن: باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێ تووشی هیچ تاقیکردنەوەیەك نابن؟ ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانیشمان تاقی کردوەتەوە، بێگومانە خودا ئەوانەی کە ڕاستیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن، دیاری دەکات. وە فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾[2] ئایا ئێوە لاتان وایە هەر وا دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا خودا خەباتکارانو خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردوە. وە فەرموویەتی: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾[3] خودا هیچ کاتێ باوەڕدارانی لە بارودۆخێکدا (وا ئێوە تێیدا) نەهێشتوەتەوە مەگەر لەبەر ئەوەی ناپاکان لە پاکان جیا بکاتەوە. پوختەی باسەکە ئەوەیە، کاتێ کە خودای گەورە جیهادی فەرز کردوە لەسەر عەبدەکانی، ئاشکرای

---

[1] العنكبوت (٢-٣).

[2] آل عمران (١٤٢).

[3] آل عمران (١٧٩).

کردوه کە لەبەر ئەوەیە عەبدەکانی خۆی تاقی بکاتەوە تا دەرکەوێ کێ گوێڕایەڵی دەکات و کێش گوێڕایەڵی ناکات، دیارە خودای گەورە ئاگادارە لەوەی بووەو لەوەی نەبووە، ئەگەر بووە چۆن بووەو دەبێ. ئەو شتە دەزانێ پێش بوونی و لەگەڵ بوونیشیدا چی بەسەردێ. هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو وە هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لەو، هەر شتێکی بڕیار داو مۆری کرد هیچ کەسێ ناتوانێ بیگێڕێتەوە.

﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ
أَعْمَـٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ
وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ﴾

**بتپەرستان مزگەوتەکانی خودا ئاوەدان ناکەنەوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ﴾ ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی خودا بۆ بتپەرستان نەشیاوە، خۆیان دەڵێن: خوا ناناسن خودای گەورە ئەفەرموێت شتێکی نەگونجاوە کە بتپەرستان مزگەوتەکانی خودا ئاوەدان بکەنەوە کە لەسەر یەکتاپەرستی دروس کراوەو شەریکی نیە، ئەو کەسەی (مَسْجِدَالله) خوێندویەتەوە مەبەست پێی کەعبەی پیرۆزە (المسجد الحرام) کە بەڕێزترین مزگەوتە لەسەر زەمیندا، کەلە یەکەمین ڕۆژەوە دروس کراوە بۆ خواپەرستی، ئەو خودایەی کە تەنیایەو شەرکی نیە ئەم مزگەوتە ئیبراهیمی خەلیل دروستی کرد، خوانەناسان خۆیان شایەتیان لەسەر خۆیان داوەو بە کردارو گفتاریان دەریان بڕیوە. سوودیئەڵێ: ئەگەر پرسیارت کردبێ لە گاورێ کامەیە ئاینت؟ گوتویەتی: نەسرانیم. وە ئەگەر پرسیارت کردبێ لە جوولەکەیە کامەیە ئاینت؟ گوتویەتی: جوولەکەم. وە ئەگەر لە سابئیەکت پرسیبێ کامەیە ئاینەکەت؟ گوتویەتی: سابئەم. وە لە بتپەرستێکت پرسیێ گوتویەتی: بت پەرستم.[1] ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ ﴾ ئەوانە هەرچی دەکەن (بەهۆی ئەو بتپەرستیەوە) بەفیڕۆ دەچێ، هەتا سەر لەناو ئاگردا دەبن. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[2] خودا چۆن ئازاریان نەدا، کە ئەوانە ڕێگەی (مَسْجِدَ الحرام)یان لە زیارەتکەران گرتوەو، شایەنی ئەوەیش نین خاوەنی بن؟ خاوەنی دەبێ هەر ئەوانە بن کە ترسی خوایان هەیە، بەڵام زۆربەیان نەزانن.

---

[1] الطبري (١٤/١٦٥).
[2] الانفال (٣٤).

**خەڵکی خاوەنباوەڕ، ئەوان مزگەوتەکان ئاوەدان دەکەنەوە**

بۆیەخودای گەورەفەرموویەتی:﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ هەر ئەوانە بۆیان هەیە مزگەوتی خوا ئاوا بکەن کە باوەڕیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە. خودای گەورە شایەتی بڕوای داوە بۆ ئەوانەی کە مزگەوتەکان ئاوەدان دەکەنەوە، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ تیرمیزیو ئیبنومەردەوەیهی و حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتیان کردوە.[1] عەبدورەزاقیش ڕیوایەتی کردوە لەعەمری کوڕی مەیمونی ئەودیەوە ئەڵێ: گەیشتم بە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیانگوت: بەڕاستی مزگەوتەکانماڵی خودان لەسەر زەمیندا، هەقیشە لەسەر خودا کە ڕێز لەو کەسانە بگرێ زیارەتیان دەکەن. ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژەکانی بەجێهێنابێ، واتە: ئەو نوێژانەی کە گەورەترین عیبادەتی لاشەن. ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکاتیان داوە، کە بەڕێزترین کردارێکە بۆ چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، ﴿وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ ترسیان لە هیچ کەسێ نیە (لە خوا نەبێ) واتە: لە خوا نەبێ لە هیچ کەسێ ناترسن ﴿فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ لەوانەیەئەمانە لە ڕێ شارەزاکان بن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ ئەو کەسەی کە خودا بەتەنها دەزانێو بڕوای بە ڕۆژی دوایی هێناوە، بڕوای بووە بەوەی خودا ڕەوانەی کردوەتە خوارەوە ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژی کردوەو یانی: پێنج نوێژەکەی کردوە ﴿وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ لە خوا نەبێ لە هیچ کەسێ نەترساوە، واتە: جگە لە خودا کەسی تری نەپەرستوە. پاشان ئەڵێ: ﴿فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ خودای گەورە ئەفەرمووێت هەر ئەوانە لە ڕیزەی ڕزگارانن. وەك فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ): ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾[2] بەڵکو پەروەردگاری تۆ بتنێرێتە جێگایەکی پەسەند کراو. کە ئەو شوێنە جێی تکا کردن (الشفاعة)ە. هەموو (عسى)ایەك لە قورئاندا هەر دەبێ بێتە دی[3].

---

[1] تحفة الاحوذي (٣٦٥/٧)، الحاكم (٢١٢/١).

[2] الاسراء (٧٩).

[3] الطبري (١٦٧/١٤).

﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا
يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ
وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ
فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾

**ئاو بەخشینەوە بە حاجیەكان و ئاوەدانكردنەوەی ماڵی خودا(كەعبەی پیرۆز)لە بەرانبەر بڕواو جیهاد دا ڕاناوەستن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ ئاو بە حەجاج بەخشینەوەو سەرپەرشتی ماڵی خودا(كەعبەی پیرۆز) لاتان وایە لەگەڵ كاری ئەو كەسانەی بۆ خودا چوونەتە غەزاو بڕوایان هەیە بە خوداو ڕۆژی قیامەت وەك یەكن؟ لەلای خودا وەك یەك نین، خودا كۆمەڵی ناهەقیكاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێگە. عەوفی لە تەفسیرەكەیدا لە ئیبنوعەبباسەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: بتپەرستەكان ئەڵێن: سەرپەرشتی ماڵی خوداو ئاو بەخشینەوە بە حاجیان چاكترە لەوانەی كە بڕوایان هێناوەو جیهاد دەكەن، ئەوانە شانازیان بە ماڵی خوداوە دەكردو خۆیان پێوەی هەڵدەبڕی لەبەر ئەوەی خۆیان بە شایستەو سەرپەرشتیكەری دەزانی. خودای گەورەیش باسی خۆبەزلزانیو سەرپێچی ئەو بتپەرستانەی خەڵكی حەرەمی كردووەو فەرموویەتی:
﴿قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ تَنْكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ سَامِرًا تَهْجُرُونَ﴾[1]
نیشانەكانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنرایەوە هەمووتان پێ دزەتان بوو، خۆتان زۆر بە زلدەزانیو لە شەونشینی خۆتاندا، قسەی پڕوپوچو بێ ماناتان دەكرد، بەرانبەر بە قورئانو پێغەمبەر(ﷺ) خودای گەورەیش ڕێزی بڕواهێنانو جیهاد كردنی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)دا بەسەر ئەوانەدا سەرپەرشتی كەعبەی پیرۆزو ئاو بەخشینیان ئەكرد لە بتپەرستان و پێی ڕاگەیاندن كە ئەو كارەیان هیچ سودێكیان پێ ناگەیەنێ لەلای خودا لەگەڵ ئەو شەریك دانانەیان بۆی. با سەرپەرشتی ماڵەكەی ئەویش بكەنو ئاویش بە حاجیان بدەن! خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ وەك یەك نین لای خودا، خودا كۆمەڵی ستەمكاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ. واتە: خودای گەورە ئەوانەی خۆیان بە شایستەی سەرپەرشتی كردنی ماڵی خودا زانیوە، ناوی بە ستەمكار هێناون

---

[1] المؤمنون (٦٦-٦٧).

لەبەر ئەوەی بتپەرست بوون، ئەو سەرپەرشتی کردنە هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێ.[1] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدائەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر عەبباسی کوڕی عەبدولمەتەللب هاتە خوارەوە کاتێ لە ڕۆژی بەدردا بە دیل گیرا،بەموسڵمانەکانی ووت: ئەگەر ئێوە پێش ئێمەکەوتن لە موسوڵمان بوون و کۆچ کردن و جیهادا،ئەوەئێمەش سەرپەرشتی ماڵی خودامان دەکردو ئاومان ئەدا بە حاجیان و بەندمان ئازاد دەکرد. خودای گەورەیش فەرمووی: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ واتە: ئەو شتانە کردوتانە هەمووی لە کاتی بتپەرستیدا بووە. هەر شتێ لە کاتی بت پەرستیدا کردوتانە لێتان وەرناگرم،[2] زەححاک ئەڵێ: موسوڵمانان چوونە لای عەبباس و هاوەڵەکانی ئەوانەی کە بە دیل گیرابوون لە ڕۆژی بەدردا، تانەو تەشەریان لێ ئەدان لەسەر ئەوەی کە بتپەرست بوو، عەبباسیش گوتی: سوێند بە خوا ئێمە سەرپەرشتی ماڵی خودامان دەکردو بەندەمان ئازاد دەکردو کەعبەمان دادەپۆشی و ئاومان ئەدا بە حاجیەکان. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ ﴾[3] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموودەیەکی مەرفوع هاتوە پێویستە لێرەدا باس بکرێ. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پیاوێك گوتی: گوێم لێ نیە هەر کارێکی تر نەکەم دوای موسوڵمان بوونم ئەوە نەبێ کە سەرپەرشتی ماڵی خودا بکەم. یەکێکی تر گوتی: جیهاد لە ڕێی خوادا چاکترە لەوەی کە گوتتان، عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) سەرزەنشتی کردن و گوتی: لەلای مینبەری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەنگتان بەرز مەکەنەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو، بەڵام کە نوێژی هەینیمان کرد چووینە لای پێغەمبەر و لێمان پرسی، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ﴾.[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ (٢٠) يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ (٢١) خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و تووشی ئاوارەیی بوون و بۆ خودا چوونە غەزا دەستیان لە ماڵ و گیانی خۆیان هەڵگرتوە، لای خودا زۆر لە پێشترن و بە ئاواتی خۆیان دەگەن،

[1] الطبري (١٤/١٧٠).

[2] الطبري (١٤/١٧٠).

[3] الطبري (١٤/١٧٢).

[4] مسلم (١٨٧٩)، عبدالرزاق (٢/٢٦٨).

پەروەردگاریان مژدەی بەزەیی و ڕەزای خۆی و باغاتی وایان پێدەدات کە لەوێدا خۆشی تاهەتاییان دەبێ، هەتا سەر هەر لەوێ دەبن. خودا پاداشتی زۆر گەورەی لەلا هەیە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾

**فەرماندان بە وازهێنان لە دۆستایەتی بتپەرستان با کەس و کاریش بن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ ئەی گرۆی خاوەن باوەڕان، ئەگەر باب و برای ئێوە لایان وابوو بێباوەڕی لە باوەڕهێنان باشترە، ئێوە نزیکیان مەکەون و خۆشتان نەوێن، هەر کەسێ لە ئێوە خۆشی بوێن، دیارە ستەمکارە. خودای گەورە فەرمانی داوە بە دوورەپەرێزی لەو کەسانەی بڕوایان پێی نیە، با ئەو کەسانەش باوک و برا بن. قەدەغەیشی کردوە لە نزیک بوونەوە لێیان کاتێ کە ڕێزی خوانەناسیان دا بەسەر خواناسیدا، هەڕەشەیشی کردووە لەو کەسانەی کاری وا دەکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾[1] تۆ دەستت ناکەوێ ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی دوایی، ببنە دۆستی ئەو کەسانەی پێچەوانەی خوداو پێغەمبەری خودان، با ئەگەر باوکیشیان یان فەرزەندیان یان برایان یان لە هۆزەکەی خۆیان بن، کە ئەمانە خودا بڕوای لە دڵیان جێگیر کردوە بە هێزێکی تایبەتی خۆی یارمەتی داون دەیانانێرێتە باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕواو هەتا سەر هەر لەوێ دەبن. حافیزی بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی شەوزەبەوە ئەڵێ: لە ڕۆژی بەدردا باوکی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح وەسفی بتەکانی دەکرد، ئەبوعوبەیدە خۆی لە باوکی لادەدا، کاتێ کە جەڕڕاح زۆر هەڵیدەدا بەبتەکانیاندا، ئەبوعوبەیدەش ڕووی تێکردو باوکی خۆی کوشت، خودای گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەر ئەو ناردە خوارەوە: ﴿لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ

---

[1] المجادلة (٢٢).

﴿وَرَسُولَهُۥ﴾.[1] پاشان خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی کە هەڕەشە بکات لەو کەسانەی کە ڕێزی کەس‌و کارو عەشیرەتەکەی ئەدا بەسەر خوداو پێغەمبەرەکەی‌و جیهاد کردن لە ڕێی خواداو فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا﴾ بڵێ: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ئەگەر باب‌و کوڕو ژن‌و خزمەکانتان و ئەو ماڵەی پەیداتان کردوە ﴿وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ﴾ یان کەل‌و پەلی بازرگانی (دەترسن برەوی نەمێنی)و خانوبەرەی باش‌و دڵخۆشکەرەی خۆتان ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ پێ لە خواو پێغەمبەرەکەی‌و غەزا کردن لە ڕێی خوادا گرنگ ترە، ﴿فَتَرَبَّصُوا۟﴾ چاوەڕوان بن، کە خودا چیتان بەسەر دێنێ‌و تووشی چ بەڵاو سزایەکتان دەکات بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ تا فەرمان لە خوداوە دێ، ئەوانەی لە ڕێ لادەرن، خودا شارەزایان ناکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە زوهرەی کوڕی مەعبەدەوە ئەمیش لەباپیریەوە ئەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا بووین (ﷺ) کە دەستی عومەری کوڕی خەتابی گرتبوو، (عومەر) گوتی: سوێند بە خوا تۆ ئەی پێغەمبەری خودا خۆشەویست تری لەلام لە هەموو شتێ جگە لە گیانی خۆم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەسێ لە ئێوە بڕوای نیە هەتا من خۆشەویست تر دەبم لەلای لە گیانی خۆیشی) عومەر گوتی: سوێند بە خوا ئێستا لەلام لە گیانی خۆم خۆشەویست تری، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئا ئێستا ئەی عومەر).[2] بوخاری بە تەنیا ئەم فەرموودەی هێناوە.[3] ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردووە، وتەکە هی ئیمامی ئەحمەدە لە ئیبنوعومەرەوە ئەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ) ئەیفەرموو: (کاتێ کڕین‌و فرۆشتنتان کرد بە ماڵ‌و سامانەکەتانەوەو دەستتان گرت بە کلکی مانگاوەو (ڕازی بوون بە کشتوکاڵ کردن)و وازتان لە جیهاد کردن هێنا، خودا سەرشۆڕیەکتان بەسەردا دێنێ، لای نابات تا دەگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەتان)[4].

[1] البيهقي (٩/٢٧)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[2] أحمد (٤/٣٣٦)، سەحیحە.

[3] فتح الباري (١١/٥٣٢).

[4] أحمد (٢/٤٢)، أبوداود (٣٤٦٢)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾

**سەرکەوتن تەنیا بە یارمەتی خودایە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴾ خودا لە زۆر شوێندا هات بە هاناتانەوە، ڕۆژی حونەینیش هەروەها، کە هەرچەندە بە زۆری خۆتاندا دەنازین کەچی هیچ سوودی پێ نەگەیاندن. ئەو زەمینە فراوانەتان لێ تەنگ هەڵات، لە دواییدا هەموو پاشەکشەتان کردو بەرەو دوا گەڕانەوە. ئیبنوجورەیج ئەڵێ: لە موجاهیدەوە: ئەم ئایەتە یەکەم ئایەت بوو لە سورەتی بەرائەتدا کە خودای گەورە باسی ڕێزو چاکەی خۆی بکات لەگەڵ خاوەنباوەڕاندا، کە لە زۆر شوێندا لە غەزاکانیاندا لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) سەری خستوون، ئەوەیش بە یارمەتی‌و پشتگیری‌و بڕیاری خۆی بووە، نەك بە زۆری ئەوان‌و کەرەسەی جەنگی ئەوانەوە. ئاگاداریشی کردوون کە سەرکەوتن تەنیا لەلایەن ئەوەوەیەو ئیتر با ئەوان زۆر بووبن یان کەم. چونکە لە ڕۆژی حونەیندا زۆر بە زۆری خۆیاندا دەنازین کەچی ئەو زۆرییەیان هیچ سودێکی پێ نەگەیاندن‌و هەموو ڕایان کردو بەرەو دوا گەڕانەوە جگە لە چەند کەسێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) مانەوە. پاشان خودا یارمەتی‌و پشتگیری خۆی نارد بۆ پێغەمبەرەکەی‌و ئەو خاوەنباوەڕانەی کە لەگەڵی بوون، ئەگەر خودا مەیلی لێبێ بە درێژی باسی ئەمە دەکەین،ئەم باسەش بۆ ئەوەیە ئاگاداریان بکات کە سەرکەوتن‌و کۆمەکی تەنیا لەلایەن خودا خۆیەوەدێت، با ژمارەیش کەم بێ. چەند کۆمەڵی کەم سەرکەوتن بەسەر کۆمەڵی زۆردا بە ئیزنی خودا بێگومان خودا لەگەڵ خۆڕاگراندایە.

**ڕووداوی غەزای حونەین**

ڕوداوی حونەین لە شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا بوو، دوای ئازادکردنی مەککە، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوتنی مەککەی بەدەست هێناو کاروبارەکانی ڕێکخست‌و زۆرینەی خەڵکەکەی موسوڵمان بوون‌و پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئازادی کردن، هەواڵیان دایە کە هەوازن خۆیان کۆ کردوەتەوە بۆی تا شەڕی لەگەڵدا بکەن، کە سەرکردەکەیان مالکی کوڕی عەوفی نەزری بوو کە هەموو

سەقیفی لەگەڵدا بوو، وە بەنی جەشیمو بەنی سەعدی کوڕی بەکرو هەندێ لە بەنی هیلالیشی لەگەڵدا بوو کە زۆر نەبوون وە کۆمەڵێ لە بەنی عەمری کوڕی عامیرو عەوفی کوڕی عامیریش، کە ئامادە بوونو ماڵو منداڵو خێزانو بزنو مەڕەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو، واتە: هەرچیان هەبوو لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆشت بۆیان بەو سوپایەی کە لەگەڵیدا بوو لە فەتحی مەککەدا کە پێکهاتبوو لە دە هەزار کەس لە کۆچەریو ئەنساریەکانو هۆزەکانی عەرەبو ئەوانەیش لە خەڵکی مەککە کە ئازاد کابوونو موسوڵمان بوو بوون دوو هەزار کەسێ دەبوون، بەرەو دوژمن بردنی لە شیوێکدا بە یەك گەیشتن پێی دەگوترا حونەین (حنين) ئەو شوێنەی کە ڕووداوەکە ڕوویدا تێیدا لە بەرەبەیاندا بەرەو شیوەکە شۆڕ بوونەوە کە هەوازن بۆسەیان بۆ نابونەوە تێیدا، کاتێ کە چوونە ئەو شوێنە لێیان ڕاپەڕینو تیر بارانیان کردنو شمشێریان لێ هەڵکیشانو هەموو بە یەك دەست لێیان دان، بەو شێوەی کە سەرکردەکەیان فەرمانی پێدابوون ئا لەو کاتەدا موسوڵمانەکان پاشەکشەیان کردو بەرەو دوا گەڕانەوە، وەك خودای گەورە فەرموویەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی ڕاگرت کە لەو کاتەدا سواری ئەسپەکەی کەناوی شەهباء بوو، بەرەو ناخی دوژمن هەڵمەتی ئەدا، عەبباس لەگەڵی بوو دەستی گرتبوو بە ئاوزەنگی لای ڕاستیەوە، ئەبوسوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب دەستی گرتبوو بە ئاوزەنگی لای چەپیەوەو ئەسپەکەیان بارگران کرد هەتا تاونەداتە خۆی، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەنگی بەرز بانگی دەکردو داوای لە موسوڵمانان دەکرد کە بگەڕێنەوەو ئەیفەرموو: (وەرن بۆ لام عەبدەکانی خوا، من پێغەمبەری خودام) وە لەو کاتەدا ئەیفەرموو: (أنا النبي لا كذب، أنا إبن عبدالمطلب (واتە:من پێغەمبەرمو درۆ نیەو من کوڕی عەبدولموتەلبم)). نزیکەی سەد کەسێ لە هاوەڵەکانی خۆیان ڕاگرت لەگەڵی، هەندێ دەڵێن هەشتا کەس، لەوانە ئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) وە عەبباسو عەلیو فەزلی کوڕی عەبباسو ئەبوسوفیانی کوڕی حارسو ئەیمەنی کوڕی ئومولئەیمەنو ئوسامەی کوڕی زەیدو کەسانێکی تریش (ڕەزای خوایان لێبێ) پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە عەبباسی مامی کە کەسێکی دەنگ بەرز بوو، کە بە هەموو دەنگی بانگ بکاتو (بڵێ): ئەی هاوەڵانی درەختەکە! یان درەختی بەیعەتو ڕیزوان کە موسوڵمانە کۆچەریو ئەنساریەکان لە ژێریدا پەیمانیان دا کە هەرگیز لە لای ڕانەکەنو بەجێی نەهێڵن، بەردەوام عەبباس بانگی دەکردنو (دەیگوت): ئەی هاوەڵەکانی سەمورە! جارێکیش دەیگوت: ئەی هاوەڵانی سورەتی بەقەرە،وایکرد هاوەڵەکانیش دەیانگوت: ئەوا هاتین ئامادەین، خەڵکەکە لار بوونەوەو بەرەو پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕانەوە هەتا وای لێ هاتبوو کەسێك ئەگەر وشترەکەی بە گوێی نەکردایە وازی لێ دەهێناو قەڵغانەکەی لەبەر دەکردو بەجێی دەهێشتو بەرەلای دەکردو خۆی دەگەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ هەندێکیان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردن کە بە توندی پەلامار بدەن، مشتێ

لە خۆڵی هەڵگرتو پاش ئەوەی لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە یارمەتی بدات، پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە ئەو بەڵێنەی کە پێتدام بۆم بهێنەدی) پاشان ئەو خۆڵەی بەرەو خەڵکە کافرەکە هاوێشت، هیچ کەسێ نەبوو لەوانە لەو خۆڵە نەچێتە چاوی‌و دەمی، بەڕادەیەك ئەوەندە سەرقاڵی ئەکرد نەیئەتوانی شەڕ بکات، پاشان تێشکان‌و ڕایان کرد، موسوڵمانان شوێنیان کەوتن‌و بە دوایانەوە بوون و لێیان ئەکوشتن‌و بە دیلیان دەگرتن، هەر کەسێ کە دەگەڕایەوە کۆمەڵێ دیلی دەهێنایە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ). لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە فەرموودەکەی شوعبەوە. لە ئیبنوئیسحاقەوە، لە بەرای کوڕی عازیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پیاوێ پێی گوت: ئەی ئەبوعەمارە، ئایا لە پێغەمبەری خودا ڕاتان کرد ڕۆژی حونەین؟ گوتی: بەڵام پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕای نەکرد! بێگومان هەوازن گەلێکی تیر ئەنداز بوون، کاتێ ڕووبەڕوویان بوینەوەو پەلامارمان دان شکان و هەڵاتن، خەڵکەکە سەریان کردە غەنیمەت کۆ کردنەوە، ئەوانیش بە تیر هاتن پێماندا‌و خەڵکەکە هەڵاتن، بەڕاستی من پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی کە ئەبوسوفیانی کوڕی حارس جڵەوی ئەسپەسپیەکەی پێغەمبەری گرتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەیفەرموو: (أنا النبي لا كذب، أنا بن عبدالمطلب)[1] منیش دەڵێم: ئەمە ئەوپەڕی بوێری‌و ئازایەتیە، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئا لەو ڕۆژەداو لەو گەرمەی شەڕەدا کە سوپاکەی بەجێیان هێشت، پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ ئەوەیشدا سواری ئەسپێ بوو کە زۆر بە هەڵمەت نەبوو بە کاری پەلاماردان‌و زوو گەڕانەوەو ڕاکردن نەدەهات، کەچی لەگەڵ ئەمەیشدا هەر بەرەو ڕوویان غاری ئەداو بە ناوی خۆی بانگی دەکرد بۆ ئەوەی هەر کەسێ نایناسێ چاك بیناسێ (سەلات وسەلامی خوای لەسەر بێ بەردەوام‌و تا ڕۆژی قیامەت) ئەمانەش هەموو نیشانەی متمانەو پشت بەستنی بووە بە خوداو شارەزایی بووە بەوەی کە خودا هەر سەری دەخات، ئەوەی ڕەوانەی کردوە پێی تەواوی دەکات‌و ئاینەکەی خۆی سەردەخات بەسەر ئاینەکانی تردا، هەر بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ پاشان خودا دڵنیایی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆیی‌و بڕواداران ناردو زوو لەشکری دابەزاند کە (چاوت پێیان نەدەکەوت) خوانەناسانی سزا داو سزای خوانەناسەکان هەر ئەمەیە. مەبەست بەو لەشکرە فریشتەکانە. وەك ئیبنوجەریر گوتویەتی: قاسم بۆی باس کردین گوتی: حەسەنی کوڕی عەرەفە بۆی باس کردین گوتی: موعتەمەری کوڕی سولەیمان لە عەوفەوە بۆی گێڕاینەوە کە کوڕی ئەبوجەمیلەی ئەعرابیئەڵێت: گوێم لە عەبدوڕەحمان بوو کە کۆیلەی کوڕی بەرسەن بوو ئەیوت: پیاوێ کە لەگەڵ بتپەرستەکاندا بوو لە ڕۆژی حونەیندا گوتی: کاتێ ئێمەو

---

[1] فتح الباري (٨١/٦)، مسلم (١٤٠١/٣).

هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتن بە یەك لە ڕۆژی حونەیندا، تەنیا ساتێ لە بەرماندا نەوەستان، ئەڵێ: کاتێ کە چاومان پێیان کەوت بە شوێنەکەی خۆیاندا ڕاومان نان هەتا گەیشتینە خاوەن ئەسپە سپیەکە، کە ئەو کەسە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ)ئەڵێ: لەلای ئەودا چەند پیاوێکی سپی دەمو چاو جوان ڕووبەڕوومان بوونەوە پێیان گوتین ڕوو ڕەشەکان بگەڕێنەوە.ئەڵێ: ڕامان کردو سواری ملمان بوونو ئەوەمان بەسەرهات[١] کەبەسەرمان هات پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَاللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ لە دوای ئەوەیش هەر کەسێ خودا مەیلی لێبێ تەوبەی لێ قەبوڵ دەکاتو خودا لێبوردەو دڵۆڤانە. خودای گەورە تەوبەی لەو هەوازینانەی تر قەبوڵ کرد کە مابونەوە، موسوڵمان بوونو بە موسوڵمانی هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆیان گەیاندێ لە نزیکی مەککە لە جەعرانە ئەوەیش دوای بیست ڕۆژ لە ڕووداوی حونەین. لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشکی کردن لە نێوان وەرگرتنەوەی دیلەکانو ماڵەکانیاندا، ئەوانیش دیلەکانیان هەڵبژارد کە شەش هەزار دیل بوون، لە ژنو منداڵ، پێغەمبەریش پێی دانەوە، ماڵەکانیشی دابەش کرد بەسەر جەنگاوەراندا. وە هەندێ لەو کەسانەی کە لە مەککە ئازاد کرابوون لەو دەسکەوتانە بەشی چاکی دانێ، بۆ ئەوەی دڵیان لەسەر ئیسلام باش ڕابێت، هەر کەسەیان سەد وشتری دایە، یەکێ لەو کەسانەی کە سەد وشتری دایە مالکی کوڕی عەوفی نەزری بوو کردیەوە بە سەرۆکی هۆزەکەی وەك لەوەو پێش. مالیك دەستی کرد بە وەسف کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بەو هۆنراوەی کە تێیدا دەڵێ:

ما إن رأيت و لا سمعتُ بمثله — في الناس كلهم بمثل محمدِ

أوفى و أعطى للجزيل إذا إجتدى — و متى تشأ يُخبرك عماني غدِ

واتە: نەمدیوەو نەمبیستوە لەناو هەموو خەڵکیدا لە وێنەی موحەممەد(ﷺ) ئەوەندە بەوەفاو بەخشندە بێ کاتێ لە کاتی بەخشینی شتی زۆر بە نرخدا، وە هەر کاتێکیش حەزکەی هەواڵی ئەو شتانەت پێ بدات لە پاشەڕۆژدا ڕوو ئەدەن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا الۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ الۡمَسۡجِدَ الۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ اللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٨﴾ قَٰتِلُواْ الَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالۡيَوۡمِ الۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الۡحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ الۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾﴾

[١] الطبري (١٨٦/١٤).

**قەدەغە کردنی بتپەرستان لە چوونە ناو کەعبەی پیرۆز (المسجد الحرام)**

خودای گەورە فەرمانی داوە بەو خاوەن باوەڕە پاکو ئاین پاکانە کە ڕێگە نەدەن بەو بتپەرستە ئاین ناپاکانە کە بچنە ناو کەعبەی پیرۆز، وە بە هیچ شێوەیەک دوای ئەم ساڵە نزیکی ئەماڵە نەکەونەوە پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەیش لە ساڵی نۆهەمدا بووە، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەلی نارد بە هاوڕێیەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێبێ) لەو ساڵەداو فەرمانی دایە کە بانگەواز بکات لەناو بتپەرستەکاندا: کە دوای ئەم ساڵە بتپەرستان نابێ حەج بکەنو کەسیش بە دەوری کەعبەدا بە ڕووتی تەواف ناکات. خودای گەورە ئەو بڕیارەی داوەو فەرمانی پێکردوە، عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە لەم ئایەتەدا: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان ئەو کەسانەی شەریک بۆ خوا دادەنێن ناپاکن، نابێ (دوای ئەمساڵ) لە (مسجد الحرام) خۆ نزیک کەنەوە. ئەو کەسانە نەبێت کە بەندەن یان ئەهلی زیممەن[1] ئەبوعەمری ئەوزاعی ئەڵێت: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نووسی: کە نەهێڵن گاورو جوولەکە بچنە ناو مزگەوتی موسوڵمانان بۆ ئەم قەدەغە کردنەیشم شوێن ئەم ئایەتە ئەکەوم کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ عەتایش ئەڵێ: حەرەم هەمووی هەر مزگەوتە بەپێی ئەم ئایەتە کە خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا﴾ وە ئەم ئایەتە پیرۆزەیش بەڵگەیە لەسەر (پیسی) بتپەرست وەک چۆن بەڵگەیە لەسەر پاکی خاوەنباوەڕ، وە لە فەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە: (خاوەنباوەڕ (پیس) نابێ).[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئەگەر لە هەژاریش ترسان خوا بیەوێ لە چاکەی خۆی هەمووتان بێنیاز دەکات خودا زانای کارزانە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: ئەمە لەو کاتەدا بوو کە خەڵکی ئەیانووت: بازاڕمان لێ دەبڕێو بازرگانیمان لەناو دەچێ، ئەوەی کە بەدەستمان دەهێنا لە بازاڕدا لەو پێویستیانە لە دەستمان دەچێو نامێنێ. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾ واتە: خودا لە ڕێگای ترەوە جگە لەو ڕێگایە دەرووتان لێ دەکاتەوە ﴿إِن شَآءَ﴾ ئەگەر مەیلی لێبێ. هەتا دەگاتە: ﴿وَهُمْ صَـٰغِرُونَ﴾ واتە: ئەمە لە

[1] عبدالرزاق (٢/٢٧١).

[2] فتح الباري (٣/١٥٠).

جێی ئەو ترسەتان بوو لەزمانی ئەو ڕۆژیەی لە بازارەکاندا بە دەستتان دەهێنا، خودای گەورە لە جێی ئەوە لەبازاڕەکانی بڕی لە کاتی بتپەرستیدا بەمە قەرەبووی بۆ کردنەوەو سەرانەی خستە سەر ئەهلی کتێب.[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو زەححاك‌و کەسانی تریشەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ﴾ واتە: خودا دەزانێ چی بۆ ئێوە چاکە ﴿حَكِيمٌ﴾ کارزانە لەبارەی ئەوەی فەرمانی پێدەکات‌و بەوەیش کە قەدەغەی دەکات، چونکە خودا کردارو گفتاری ڕێك‌و تەواوە دادپەروەرە لە وەدیهێنان‌و بڕیارداندا‌و پاك‌و بێ عەیبە، هەر بۆیە پاداشتی دانەوە بەو سەرانە کە لە ئەهلی زیممەیان وەردەگرت لەباتی ئەوماڵەی کە لە پێشدا دەستیان دەکەوت.

## هاندان لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ ئەهلی کتێبدا تاسەرانە بدەن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ﴾ لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کە بە خوداو ڕۆژی دوایی باوەڕ ناکەن‌و هەرچی خوداو پێغەمبەری خودا بە ناڕەوایان زانیوە، ئەمان بە ناڕەوای نازانن، نایەنە سەر دینی ڕاستیش، تا ئەو کاتەی بە زەلیلی‌و بە دەستی خۆ سەرانەی خۆیان بە ئێوە ئەدەن. ئەوانە لە ڕاستیدا وەك چۆن بڕوایان نەبوو بە موحەممەد(ﷺ) باوەڕێکی تەواویشیان بە هیچ پێغەمبەرێکی ترو بەوەیش کە پێی هاتبوون نەمابوو، بەڵکو شوێن هەواو هەوەس‌و باب‌و باپیرانی خۆیان کەوتبوون، لەو کارانەدا کە پێی هەڵدەسان، نەك لەبەر ئەوەی شەرع‌و دینی خودایە، چونکە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بوایە بەوەی لەبەر دەستتاندایە بە چاکی‌و ڕاستی، ئەوە پاڵی پێوەدەنان بۆ بڕوا هێنان بە موحەممەد(ﷺ)، چونکە گشت پێغەمبەران مژدەیان داوە پێی‌و فەرمانیشیان داوە بە شوێن کەوتوەکانیان پێی، کاتێ کە هات بڕوایان پێ نەکرد، کە بەڕێزترین پێغەمبەر بووە (ﷺ) ئەوانە پابەند نەبوون بە شەرعی پێغەمبەرە پێشینەکانەوە لەبەر ئەوەی لەلایەن خوداوە ڕەوانە کراون، بەڵکو لەبەر هەواو ئارەزوی خۆیان بووە، بۆیە ئەو باوەڕەیان بە پێغەمبەرانی تر هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێ، چونکە ئەوان بڕوایان نەهێناوە بە گەورەترین‌و بەڕێزترین و تەواوترین و کۆتاترین پێغەمبەریان (واتە موحەممەد(ﷺ)) بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ ئەم ئایەتە لەسەرەتادا هات بۆ شەڕ

---

[1] الطبري (١٤/١٩٧).

کردن لەگەڵ ئەهلی کتێبدا، دوای ئەوەی بتپەرستان بەرەو کزیو لاوازی دەچوونو خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلام، دورگەی عەرەبی بەرەو ئاسایش دەڕۆشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی جەنگی دا لەگەڵ ئەهلی کتێبدا کە گاورو جولەکەکان بوون، ئەمەیش لە ساڵی نۆی کۆچیدا بوو، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادەکاری کرد بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ڕۆمەکاندا، خەڵکی بانگ کرد بۆ ئەو جەنگەو بۆی ڕوون کردنەوەو ناردی بە شوێن ئەو عەرەبانەی دەوری مەدینەیشدا هاتنە لایو لەگەڵ جەنگاوەرەکانی تردا کۆ بوونەوە نزیکەی (٣٠) سی هەزار جەنگاوەر دەبوون، هەندێ لە خەڵکی مەدینەو دەوروبەری لە دووڕووەکانی جگەلە ئەوانیش دواکەوتنو ئامادە نەبوون، ئەمەیش لە ساڵێکی قاتو قڕیو زۆر گەرمدا بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیویست بەرەو شام بڕوا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ڕۆمەکاندا، گەیشتە تەبوکو لەوێ دابەزیو نزیکەی (٢٠) بیست ڕۆژ لەسەر ئاوەکەی مایەوە، پاشان لە خودای گەورە پاڕایەوە (ئیستیخارەی کرد) بۆ گەڕانەوەو ئەو ساڵە گەڕایەوە لەبەر ناڕەحەتی ژیانو لاوازی ئەو خەڵکە. وەك لە دوایدا خوا مەیلی لێبێ باسی دێت.

### سەرانە نیشانەی زەلیلیو خوانەناسیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ تا بە زەلیلی بە دەستی خۆیان سەرانە ئەدەن، واتە: سەرشۆڕیو بێ دەستەڵاتیو بێ ڕێزیو سوكو ڕسوایی بە چاوی خۆیان دەبینن بۆیە ڕێزگرتنی ئەهلی زیمەو بەرز کردنەوەیان بەسەر موسوڵماناندا دروست نیە، بەڵکو ئەوانە زەلیلو بەدبەختو بێ ڕێزن، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەست پێشخەری مەکەن لە سڵاو کردندا لەگەڵ گاورو جوولەکەدا، وە گەر گەیشتن بە کەسێکیان لەناو ڕێگەدا ناچاری تەنگ ترین شوێنی بکەن)[1] بۆیە گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ) ئەو خاڵە بەناوبانگانەی کرد بە مەرج بەسەریانەوە بۆ زەلیل کردنو بە کەم سەیر کردنو ڕسوا کردنیان، وەك پێشەواو حافیزەکان ڕیوایەتیان کردوە لە ڕیوایەتی عەبدوڕەحمانی کوڕی غەنەمی ئەشعەریەوە،ئەڵێ: نووسیم بۆ عومەری کوڕی خەتتاب کاتێ کە ڕێکەوت لەگەڵ گاورەکانی شامدا: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئەمە نوسراوێکە بۆعەبدی خوداوە عومەری کوڕی خەتتاب گەورەی موسوڵمانان نووسراوە، لە گاورەکانی شاری فلانو فلانەوە، ئێوە کاتێ هاتن بۆمان ئێمە داوای پارێزگاریمان لێکردن لە خۆمانو ماڵو منداڵو خەڵکی میللەتەکەمان. بەو مەرجەی ئێمەیش لە شارەکەمانو دەوروبەریدا نە دێرو نە کڵێسای تازە دروس نەکەینو شوێنو پەرستگای قەشەیش دروس نەکەین، هەرچیش ڕووخا بوو چاکی نەکەینەوە، ئەوانەش

[1] مسلم (٤/١٧٠٧).

کە لەناو سنوری موسوڵماناندا هەبوون چاکیان نەکەینەوە، کڵێسەکانمان قەدەغە نەکەین لە کەسێ لە موسوڵمانان بچێتە ناوی نە لە شەو نە لە ڕۆژداو دەرگاکانیش فراوان بکەین بۆ ڕێبوارو ئەوانەی هاتوچۆی پیادەکەن، وە هەرکەسێ لە موسوڵمانان هات بەلاماندا دایبەزێنین‌و سێ ڕۆژی خواردەمەنی بدەینێ، وە لە کڵێساو ماڵەکانماندا سیخوڕ داڵدە نەدەین‌و ناپاکی لە موسوڵمانان نەشارینەوەو منداڵەکانمان فێری قورئان نەکەین‌و شەریك دانان بۆ خودا دەرنەخەین‌و کەسیشی بۆ بانگ نەکەین، بەرگری لە کەس‌و کارمان نەکەین کە بچنە ناو ئاینی ئیسلام ئەگەر مەیلیان لێی بوو، وە ڕێز لە موسوڵمانان بگرین، وە لەبەریان هەڵسین لە شوێنی کۆبونەوەماندا ئەگەر ویستیان دانیشن، وە لە هیچ جل‌و بەرگێکیاندا وەکو ئەوان نەبین لە پۆشاکی سەرو مێزەرداو لە نەعل‌وداهێنان و جیا کردنەوەی قژدا، وەك ئەوان قسە نەکەین، بە وێنەی ئەوان (کونیە) نەنێین لەخۆمان، سواری زین نەبین‌و شمشێر نەکەینە ملمان‌و هیچ جۆرە چەکێ بەکارنەهێنین‌و لەگەڵ خۆمان هەڵی نەگرین، ئەنگوستیلەکانمان بە عەرەبی هەڵنەکۆڵین‌و ئارەق نەفرۆشین، پێشی سەرمان هەڵپاچین‌و لە هەر کوێیەك بووین جل‌و بەرگی خۆمان لەبەر کەین، پشتوێن ببەستین لە پشتمان‌و خاچیش لەسەر کلیساکانمان دانەنێین، وە لە هیچ ڕێگاو بازاڕێکی موسوڵماناندا خاچ‌و کتێبەکانمان دەرناخەین‌و لە کڵێساکانماندا زەنگ بەدەنگی بەرز لێنادەین وەلەکاتی خوێندنەوەماندا لەکڵێساکانماندا دەنگ بەرز ناکەینەوە، کاتێك کە موسوڵمانان لەوێ بن . دەرنەچین بۆ نوێژی یەك شەممان‌و نوێژی جەژنی فوسح‌و دەنگمان بەرز نەکەینەوە لەگەڵ مردوەکانمانداو ئاگریان لەگەڵدا دەرنەخەین لە هیچ ڕێگاو بازاڕێکی موسوڵماناندا‌و مردووەکانمان لەنزیك قەبرسانی موسڵمانانەوە نەینێژن ، ئەو بەندانە نەکرین کە کەوتوونەتە پشکی موسڵمانانەوە ،پێویستە ڕێنمایی موسوڵمانانیش بکەین‌و لە ماڵەکانی خۆیاندا بۆیان نەڕوانین،ئەڵێ: کاتێ کە چوومە لای عومەر بە نووسراوەکەوە ئەوەی تیا زیاد کرد: لە هیچ موسوڵمانێکیش نەدەین،ئێمە ئەمانەمان بە مەرج داناوە لەسەر خۆمان‌و میلەتەکەمان لەبەرانبەر ئێوەدا ، لەسەر ئەمەیش ئەو پاراستنەمان قەبوڵ کردوە، ئەگەر ئێمە نکوڵیمان لە شتێکدا کرد لەو مەرجانە کە بەڵێنمان پێتان داوەو بڕیارمان داوە کە جێبەجێی کەین،ئەمە پەنامان بۆ نیە، بۆتان ڕەوایە ئەوەی لەگەڵ خەڵکی دوژمن‌و خراپەکاراندا ڕەوایە بیکەن لەگەڵ ئێمەیشدا بیکەن[1].

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾

[1] المحلى (٧/٣٤٦).

ﭐتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا
لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣١﴾﴾

**هاوەڵدانانی گاورو جوولەکەو خوانەناسیەکەیان بووە هۆی ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکرێت**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ﴾ جوولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، فەلەکانیش گوتیان: مەسیح کوڕی خودایە، لێرەدا خودای گەورە خاوەن باوەڕان هەڵدەنێ لەسەر شەڕ کردن لەگەڵ بتپەرستە خوانەناسەکانی جوولەکەو گاور لەسەر ئەو قسە ناشرینو درۆ گەورەیان کە هەڵیان بەستبوو بە دەم خودای گەورەوە، ئەوەبوو جوولەکەکان لەبارەی عوزەیرەوە دەیانگوت: (کە عوزەیر کوڕی خودایە) خودای گەورە لەوەی ئەوان گوتویانە دوورەو پاکو بێگەردە، گومڕایی گاورەکانیش دیارو ئاشکرایە، بۆیە خودای گەورە هەردوو دەستەکەی بە درۆ خستوەتەوە ﴿ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ﴾ ئەو قسانەی ئەوان دەیڵێن، واتە: هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە لەوەی کە دەیڵێن جگە لە درۆ هەڵبەستنو دەستکردی خۆیان. ﴿يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ﴾ وێنەی قسەی خوانەناسانی پێشوون ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴾ خوا بیان کوژێ چۆن لە هەق لادەدەن، ئەو گەلانەی کە گومڕا بوون وەك ئەمانەی کە گومڕان ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ ئیبنوعەبباس گوتی: لەعنەتی خوایان لێبێ، ﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴾ چۆن لە ڕێگەی هەق لائەدەن کە ڕوونو ئاشکرایەو بەرەو گومڕایی دەچن؟ پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ﴾ لە جێی خودا زاناو خواناسەکانی خۆیانو مەسیحی کوڕی مەریەمیان کردە خودا، ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزیو ئیبنوجەریر لە چەند ڕێگاوە ڕیوایەتیان کردوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: کاتێ کە بانگەوازی پێغەمبەری خودای پێ گەیشت، رایکرد بۆ شام، کە سەردەمی نەفامی بوو بوو بە گاور، خوشکەکەیو دەستەیە لە خزمانی بە دیل گیران، پاشان پێغەمبەری خودا ڕێزی لەخوشکەکەی گرتو ئازادی کردو گەڕایەوە بۆ لای براکەیو داوای لێ کرد کە موسوڵمان ببێو بچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەدی ڕۆشت بۆ مەدینە، عەدی لەناو هۆزەکەیدا سەرۆکی هۆزی (تەی) بوو،کوڕی حاتەمی تەی بوو، ئەو حاتەمی تائیەی کە ناوبانگی دەرکردبوو بە سەخاوەت بەخشندەیی، خەڵکی باسی گەیشتی عەدیان دەکرد، چووە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خاچێکی زیوین لە ملیدا بوو، پێغەمبەری خودا ئەم ئایەتەی خوێند:

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ عەدی ئەڵێ: وتم: ئەوانە نایان ئەپەرستن، پێغەمبەر فەرمووی: (بەڵێ ئەوانە حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکەن حەرامیشیان بۆ حەڵاڵ دەکەن، لەو حەرامو حەڵاڵەدا شوێنیان دەکەونو بە گوێیان دەکەن، ئەوە عیبادەت کردنی ئەوانەیە بۆ ئەوان) پاشان پێغەمبەری خودا فەرمووی: (ئەی عەدی چی دەڵێی؟ ئایا ئەوە ڕاوت دەنێ کە بگوترێ (الله أكبر)؟ ئایا شتێ دەناسی گەورەتر بێ لە خودا؟ چی ڕاوت دەنێ؟ ئایا ئەوە ڕاوت دەنێ کە بگوترێ (لا إله إلا الله)؟)دەی ئایا خوایەکی تر جگە لە(اللـه)شك ئەبەی؟! پاشان بانگی کرد بۆ ئیسلامەتی، ئەویش موسوڵمان بوو، شایەتومانی هەقی هێناوئەڵێ: پێخۆشحاڵیم بە نێوچاوانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەبینی! پاشان فەرمووی: (بێگومان جولەکە خەشمیان لێ گیراوەو گاوریش گومڕان)[1]، حوزەیفەی کوڕی یەمانو عەبدوڵلای کوڕی عەبباسو کەسانی تریش هەر وایان گوتوەلە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ ئەڵێن: ئەوانە شوێنیان کەوتون لەو شتانەی کە بۆیان حەڵاڵ کردون یان بۆیان حەرام کردون[2] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا﴾ فەرمانیشیان پێدرابوو جگە لە خوای تاكو تەنیا نەپەرستن، واتە: کە شتێکی حەرام کرد ئەو شتە حەرامەو حەڵاڵیشی کرد حەڵاڵە، ئەوەیش داینـاوەو بڕیاری لەسەر داوە پێی هەڵسنو جێبەجێی بکەن، ﴿لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ جگە لەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، خودا بێ عەیبەو بە دوورە لەو شتانەی بە هاوتای ئەوی دەزانن. واتە: خودا پاكو بێگەردەو دوورە لەو شەریكو هاوەڵو هاوێنەو هاوکارو منداڵو شتانە ئەیدەنە پاڵی، هیچ پەرستراوو پەروەردگارێك نیە جگە لە خۆی.

﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾﴾

**هەوڵدانی ئەهلی کتێب بۆ کوژانەوەی ڕوناکی ئیسلام**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ ﴾ دەیانەوێ بە فووی دەمیان تیشکی ڕۆشنایی خودا بکوژێننەوە، واتە: خوانەناسان لە بتپەرستانو ئەهلی کتێب دەیانەوێ ڕووناکی

[1] أحمد (٤/٣٧٨)، تحفة الاحوذي (٨/٤٩٢)، الطبري (١٤/٢١٠)، حەسەنە.

[2] الطبري (١٤/٢١٢).

ئیسلام بکوژێننەوە، ئەوەی خوا پێغەمبەری پێدا ناردوەو لەو ڕێنتماییو ئاینە هەقە لەناوی بەرن بە دەمە قڕەو درۆ هەڵبەستنی خۆیان، وێنەی ئەوانە وەك ئەو کەسە وایە کە دەیەوێ بە فووی دەمی تیشکی خۆر یان ڕۆشنایی مانگ بکوژێنێتەوە کە شتێکی نەگونجاوەو ناکرێ، هەر بەو جۆرەش ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی هاتووە دەبێ هەر تەواو ببێو دەرکەوێ، بۆیە خودای گەورە لە بەرانبەری ئەوەی ئەوان دەیانەوێو ویستویانە بیکەن فەرموویەتی: ﴿وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ خوداش خۆی بڕیاری داوە کە ئەم تیشکەی هەر سەرکەوێ جا با خوانەناسەکانیش حەز نەکەن. (الکافر)کەبەمانای داپۆشەردێت ئەو کەسەیە شتێ دەشارێتەوەو دایدەپۆشێ بۆیە شەو ناونراوە داپۆشەر (کافر)، لەبەر ئەوەی شت دادەپۆشێ، خاوەن کشتوکاڵ بە داپۆشەر ناودەبرێت چونکە دانەوێڵە دەشارێتەوەو دایدەپۆشێ لەناو زەویدا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ﴾ واتە: کە بەروبومەکەی جوتیاران دڵخۆش بکات[1].

**ئاینی ئیسلام زاڵ دەبێ بەسەر هەموو ئاینەکاندا**

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ خودا بۆ ڕێنشیاندانو ڕاگەیاندنی دینی ڕاست پێغەمبەری خۆی ناردووە، ﴿بِالْهُدَىٰ ﴾ واتە بەهیدایەت وشارەزاییەوە ناردووە،(هودا)یان: ڕابەری: ئەو هەموو هەواڵە ڕاستگۆو باوەڕەڕاست و دروستو زانستە بەسودانەیە کەپێغەمبەر(ص) هێناویەتی ،ئاینیی ڕاستەقینەش ﴿وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ بریتیە لە: ئەوکارە چاكو ڕاستە پڕ سوودانە لە دنیاو دواڕۆژدا ﴿لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴾ بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئاینەکاندا بە گشتی هەرچەندە کە بتپەرستان حەز ناکەن. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بەڕاستی خودا زەمینی کۆ کردەوە بۆم خۆرهەڵاتو خۆرئاوای، بەو زوانە موڵکی ئوممەتەکەم دەگاتە ئەوەی کە کۆی کردوە بۆم لێی).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە تەمیمی داریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کوتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) ئەیفەرموو: (بێگومان ئەم کارە دەگاتە ئەو شوێنەی شەوو ڕۆژی پێگەیوە، خودا هیچ خانویەکی قوڕو موو (توك) نابوێرێ مەگین ئەم ئاینە دەخاتە ناویو بەرشێز شکۆدار دەکاتو ڕسواییەکیش خودا بێ دین بێ کەساسو داماو دەکات) تەمیمی داری دەیگوت:

---

[1] الحديد (٢٠).

[2] مسلم (٤/٢٢١٥).

ئەوەم لە خانەوادەی خۆمدا دی، ئەوەی موسوڵمان بوو لە نێواناندا تووشی چاکەو ڕێزو شکۆداری بوو ئەوەیش خوانەناس بوو تووشی سەرشۆڕیو داماویو سەرانە دان بوو.[1]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾

**خۆپارێزی لە زانایانی خراپو عابیدە گومڕاکان**

سوودی ئەڵێ: ئەحبار زانایانی جوولەکەیەو ڕوهبانیش گۆشەگیرانی مەسیحە[2]، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ﴾[3] ئایا بۆچی خواناسانو زاناکانیان لە تاوانو حەرامخۆری جڵەوگیریان لێ ناکەن. ڕوهبان گۆشەگیرانی مەسیحیەو قەشەیش زاناکانیانە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا﴾[4] چونکە لەناویاندا قەشەو گۆشەگیرانێك هەن. مەبەست لێرەدا خۆ لادانو ئاگاداریە لە زانایانی خراپو خواپەرستە گومڕاکانە وەك سوفیانی کوڕی عویەینە ئەڵێ: ئەوەی خراپ بوبێ لە زاناکانمان، ئەو کەسە هاوشێوەیی جوولەکەی تیا بووە، وە هەرکەسیش لە خواناسانیمان خراپ بێ ئەوە هاوشێوەی مەسیحیەکانە، وە لەم فەرموودەیەدا کە ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردوە هاتووە، ئەبوسەعیدی خودەری ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان لەمەو بە دوا دەکەونە شوێن خوونەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون، بست بە بستو، گەز بە گەز بە ڕادەیەك ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزن مژەدا ئێوەش شوێنیان دەکەون) گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گاورو جولەکانن؟ فەرمووی: (ئەی کێ؟)[5]. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە: فارسو ڕۆمەکانن؟ فەرمووی: (ئەو خەڵکە کێن جگە لەوان؟)[6] بەکورتی ئاگادار کردنەوەیە لە چاولێکەریو هاوشێوەیی

---

[1] أحمد (١٠٣/٤)، پیاوەکانی پیاوی چاکن.

[2] الطبري (٢١٦/١٤).

[3] المائدة (٦٣).

[4] المائدة (٨٢).

[5] پوختەی سەحیحی موسلیم (١٠٠٢/٢).

[6] الشريعة (ص:١٨)، سەحیحە.

بوونی ئەوانە لە قسە کردنو هەڵسوکەوتیاندا، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زاناو گۆشەگیرەکانی ئەوانە، زۆریان (لە هەوانتە) ماڵی خەڵکی دەخۆنو دەبنە ڕێگریش لە ڕێی خوادا، چونکە ئەوانە دنیا دەخۆن بەهۆی دینو کاربەدەستیو پلەو پایەکانیانەوە لەناو خەڵکیدا، وەك چۆن زاناکانی جوولەکە لە چەرخی نەفامیدا خاوەن ڕێز و پلەو پایە بوون لای خەڵکی وکاری خەڵکی تەنیا ئەوە بوو کە دیاریو سەرانەیان بۆ بەرن، کاتێ کە خودا پێغەمبەرەکەی خۆی بۆ ناردن ئەوان لەسەر گومڕاییو خوانەناسیو لاساری خۆیان هەر بەردەوام بوون، بە هیوای ئەوەی ئەو کاربەدەستیو پلەو پایەیان هەر بۆ بمێنێ، خوداش بە ڕووناکی پێغەمبەریەتی ئەو سەروەریانەی کوژاندنەوەو لێی سەندنەوە لە جێی ئەوە سووكو ڕیسوای کردنو تووشی غەزەبی خودا بوون، کاتێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەوانە لەگەڵ خواردنی ئەو حەرامەدا دەبوونە ڕێگریش لە ڕێی خەڵکیدا کە شوێنی هەق بکەونو ئەو هەقەیان بەو پڕوپوچە دەشاردەوە، لەناو ئەوانەی کە شوێنیان کەوتبوون وایان دەردەخست کە بانگ بۆ چاکە دەکەن، بەڵام بەو شێوەیە نەبوون ئەوان دەریان دەبڕی ، بەڵکو ئەوانە بانگیان بۆ ناو ئاگر دەکرد، وە لە ڕۆژی قیامەتدا هەرگیز یارمەتی نادرێن.

### سزای ئەوانەی زێڕو زیو مۆڵ ئەدەن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەو کەسانەی زێڕو زیو مۆڵ ئەدەن وکۆیدەکەنەوەو لە ڕێی خوادا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بە ژانەی تووشی دێن ئاگاداریان بکە. ئا ئەمانە بەشی سێهەمن لە کاربەدەستانی خەڵکی،چونکەبە بێگومان خەڵکی هەموو قەرزاری زاناکان وخواناسانو خاوەن سامانەکانن، ئەگەر ئەوانەگەندەڵ بوون، خەڵکیش هەموو گەندەڵ دەبن، وەك ئیبنوموبارەك ئەفەرموێ:

و هل أفسد الذين إلا الملوك وأحبار سوء و رهبانها؟

واتە: جگە لە کاربەدەستانو زانایانو خواناسەکان کێ دینی خراپ کردوەو لەناوی بردووە؟ لە بارەی ماڵ مۆڵدانەیشەوە،پێشەوا مالیك لەعەبدوڵلای کوڕی دینارەوە لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە: ئەو ماڵەیە زەکاتی لێ دەرناکرێ[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی زوهریەوە لە خالیدی کوڕی ئەسلەمەوەئەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی عومەردا دەرچووین فەرموی: ئەمە لە پێش دابەزینی

---

[1] الموطأ (٢٥٦/١).

ئایەتی زەکاتدابوو، کاتێ کە ئایەتی زەکات هاتە خوار،زەکاتی کردە پاککەرەوە بۆ سامانەکان[1] عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو عیراکی کوڕی مالیکیش ئەڵێن: ئەم ئایەتە ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾[2] (واتە: سەدەقەیە لە ماڵەکانیان وەربگرە) نەسخی ئەوئایەتەی کردوەتەوە.

وە لە ستایشی کەم هەڵگرتنی زێڕو زیوو زەمکردنی زۆر کۆ کردنەوەیان، فەرموودەی زۆرهەیە، لێرەدا ئێمە هەندێکیان دێنین وەك مشتێ لە خەرواری، عەبدورەزاق ڕیوایەتی کردوە لە عەلییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (زێڕ نەمێنێ! زیو نەمێنێ!) سێ جار ئەمەی فەرموو،ئەڵێ: ئەوە لەسەر دڵی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناڕەحەت بوو، گوتیان: ئەی چ ماڵێ هەڵگرین؟ عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) گوتی: من هەواڵی ئەوەتان بۆئەهێنم، ئەڵێ : وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! بەڕاستی هاوەڵەکانت ئەوەیان بەلاوە ناڕەحەت بوو، ئەڵێن: ئەی چ ماڵێك مۆڵ بدەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زمانێکی زیکرکەرو دڵێکی سوپاس گوزارو هاوسەرێك یارمەتی کەسێکتان بدات لەسەر دینەکەی)[3]! پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ ڕۆژێ کە ئەم زێڕو زیوە بە ئاگری جەهەنم سوور دەکرێنەوەو نێوچاوان و کەلەکەو پشتیانی پێ داغ دەکرێ، دەردی ئەو شتە بچێژن کە بۆ خۆتان کۆتان کردەوە. ئەم قسەیان پێ دەگوترێ بۆ سوکایەتی پێکردن و تانە لێدان و گاڵتە پێکردن، وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾[4] ئەوسایش هەر بۆ ئازاردان ئاوەکوڵی بەسەردا کەن، دە بچێژە! تۆیەك کە لە دنیادا گەورەی خاوەن دەسەلات بووی. واتە: ئەمە بەوە، ئەمە ئەوە بوو کە کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، هەر بۆیە گوتراوە: هەرکەسێ شتێکی زۆر خۆش بوێ و پێشی خست بەسەر خواناسیدا بەهۆی ئەوشتەوە سزا ئەدرێ، ئەمانەیش لەبەر ئەوەی کۆ کردنەوەی ئەو ماڵە کە بوویان دایان بەسەر ڕەزامەندی خوادا، بەو ماڵە سزا دران. وەك ئەبولەهەب لەعنەتی خوای لێبێ کە سەرسەختانە بەردەوام دوژمنایەتی پێغەمبەری خودای دەکرد (ﷺ) ژنەکەیشی

---

[1] فتح الباري (٨/١٧٥).

[2] التوبة (١٠٣).

[3] عبدالرزاق (٢/٢٦٣).

[4] الدخان (٤٨-٤٩).

هاوکاری دەکرد لەو دوژمنایەتیەدا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا دیسان هەر هاوکاریەتی لە سزادانیدا، گوریسی سیرمە لە ملیدایە واتە: دار کۆدەکاتەوە لەناو ئاگردا دەیکات بەسەرئەبو لەهەبدا بۆ ئەوەی چاکتر جەزرەبە بخوات، بۆ ئەو کەسەی کە لە دنیادا زۆر بە سۆز بوو بۆی. وەك چۆن ئەم سامانە کە لەلای خاوەنەکانی خۆشەویسترین شت بووە، لە ڕۆژی قیامەتدا زیانبەخشترین شتە بۆیان، لەناو ئاگری جەهەندا پێی داغ دەکرێن، کە چەند گەرمە، ڕوومەتو کەلەکەو پشتیانی پێ داغ دەکرێ، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە سەبانەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ دوای خۆی گەنجینەیەکی بەجێهێشت، بۆی دەکرێ بە مارێکی کەچەڵ کە دووخاڵ لەسەری چاوەکانیەتیو شوێنی دەکەوێ ئەویش دەڵێ: هاوار بۆ تۆ، تۆ چیت؟ مارەکە دەڵێ: من ئەو گەنجینەم کە دوای خۆت بەجێتهێشت، بەردەوام دوای دەکەوێ هەتا دەستی ئەکات بە دەمیداو ئەویش دەستی ئەکرمێنێ پاشان هەموو لاشەکەشی بە دوایدا دەڕوات). ئیبنوحیبانیش ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لە فەرموودەکەی یەزیدی کوڕی سەعیدەوە بەو شێوەیە، ئەسڵی ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)[1] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ پیاوێ نیە کە زەکاتی ماڵەکەی نەدات و خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی نەکات بە پارچەی ئاگرین، لا تەنیشتو دەمو چاوو پشتی پێ داغ دەکرێ، لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا دادوەری دەکرێ لە نێوان بەندەکاندا، پاشان ڕێگای نیشان ئەدرێ یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر)[2] پاشان فەرموودەکەی بە تەواوی باس کردوە. بوخاریش لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردوە لە زەیدی کوڕی وەهەبەوەئەڵێ: تێپەڕیم بە لای ئەبوزەڕدا لە شوێنێکدا (پێیان دەگوت ڕەبزە پێم گوت: چی تۆی نارد بۆ ئەم زەمینە؟ گوتی: ئێمە لە شام بووین ئەم ئایەتەم خوێند: ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ مەعاویە گوتی لەناو ئێمەدا شتی وا نیە، بێگومان ئەمەلەناو ئەهلی کتێبدا هەیە،ئەڵێ: منیش وتم: ئەوە لەناو ئێمەو لەناو ئەوانیشدا هەیە[3].

---

[1] الطبري (٦/٣٦٣)، إبن حبان (٣٠٨)، إبن خزيمة (٢٢٥٥)، البخاري (٤٦٥٩).

[2] مسلم (٢/٦٨٢).

[3] فتح الباري (٨/١٧٣).

﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (٣٦)﴾

## ساڵ دوانزه مانگه

خودای گەورە ئەفەرمویّت: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ لەو ڕۆژەوە خوا ئاسمانەکان‌و زەمینی دروستکردوە ، لەلای خودا ژمارەی مانگەکان دوازدەن، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبی بەکرەتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری دا لەو حەجەیدا کە کردی، فەرمووی: (ئەواسا (بزانن) زەمان دەسوڕێتەوە وەك شێوەی خۆی لەو ڕۆژەی کە خودا ئاسمانەکان‌و زەمینی دروستکردوە، ساڵ دوازدە مانگە، لە چواریاندا شەڕ دەوەستێ، سێ مانگیان بە دوای یەکدا دێن، زولقاعیدەو زولحەجەو موحەڕەم، ڕەجەبەکەی خێڵی موزەڕیش کە لە نێوان دوو جەماداکەو شەعباندایە پاشان فەرمووی: (ئەمە چ ڕۆژێکە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، بێدەنگ بوو، تا وامانزانی کە بە ناوێکی تر ناوی دەبات، فەرمووی: (ئایا ڕۆژی قوربانی نیە؟) گوتمان: بەڵێ، پاشان فەرمووی: (ئەمە چ مانگێکە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن بێدەنگ بوو هەتا وامانزانی کە بەناوێکی تر ناوی دەبات، فەرمووی: (ئایا زەلحەجە نیە؟) گوتمان: بەڵێ، پاشان فەرمووی: (ئەم شارە کوێیە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، بێدەنگ بوو هەتا وامانزانی بە ناوێکی تر ناوی دەبا، فەرمووی: (ئایا بەلەدولحەرام نیە؟) گوتمان: بەڵێ، فەرمووی: (بێگومان خوێنەکانتان‌و ماڵەکانتان (وا بزانم فەرمووی) ناموسەکانتان لەسەرتان (حەرامە) وەك حەرامی ئەو ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم شارەتاندا، وە بەم زووانە دەگەنە لای پەروەردگارتان‌و پرسیارتان لە کردارەکانتان لێ دەکات، ئەوسا دوای من نەگەڕێنەوە بۆ گومڕایی، هەندێکتان بدەن لە ملی هەندێکتان، دەی وا گەیاندم؟ دەی ئەوەی لێرە ئامادەیە لە ئێوە با بیگەیەنێ بەوەی لێرە نیە، لەوانەیە ئەوەی پێی دەگات وشیار تر بێ لە هەندێ لەوانەی کە بیستویەتی)[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیرەکەیەوە موسلیمیش هەر ڕیوایەتی کردوە.[2]

---

[1] أحمد (٥/٣٧)، سەحیحە.

[2] فتح الباري (١/١٧٥)، (٦/٣٣٨)، (١٠/١٠)، مسلم (٣/١٣٠٥).

**ئەو مانگانەی شەڕی تێدا دەوەستێ (الاشهر الحُرم)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٌ﴾ لە چوار مانگیاندا شەڕ دەوەستێ، ئەمە ئەو مانگانەن کە عەرەبەکانیش لە کاتی نەفامیدا شەڕیان تیا دەوەستاند، زۆرینەیان جێبەجێیان دەکرد جگە لە دەستەیەکیان کە پێیان دەگوترا بەسل (البَسْل) کە ئەمانە لە ساڵێکدا هەشت مانگ شەڕیان دەوەستاند لەبەر ئەوەی زۆر توند ڕەو بوون و قوڵ بۆی دادەچوون، بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (سێی لە دوای یەك: بریتیە لە زولقەعیدەو زولحەجەو موحەڕڕەم، ڕەجەبی موزەڕیش کە لە نێوان دوو جەمادەکەو شەعباندایە)، بۆیە دراوەتە پاڵ موزەڕیش بۆ ئەوەی ڕاستی قسەکەی ئەوان دەرکەوێ کە مەبەست ئەو ڕەجەبەیە کە لە نێوان دوو جەماداکەو شەعبانایە، نەك ئەوەی ڕەبیعە وا دەزانن ئەو ڕەجەبەی کە شەڕی تیا دەوەستێ، ئەو مانگەیە کە لە نێوان شەعبان‌و شەوال دایە کە ڕەمەزانی ئەمڕۆئەکات، پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی کردوەتەوە کە ئەو مانگە ڕەجەبی موزەڕە، ڕەجەبی ڕەبیعە نیە، بەڵکو ئەو مانگانەی شەڕی تیدا دەوەستێ چوار مانگە: سیانیان بە دوای یەکدان‌و یەکێکیان بە تەنهایە، لەبەر بەجێهێنانی ئەرکەکانی حەج‌و عومرە، شەڕ وەستێنراوە لە پێش مانگی حەجدا کە زولقەعیدەیە چونکە ئەوان لەو مانگەدا وازیان لە شەڕ دەهێنا تێیدا، وە مانگی زولحەجەیش شەڕیان دەوەستاند، لەبەر ئەوەی دەکەوتنە بەجێهێنانی حەج‌و ئەرکەکانی حەج، دوای مانگی حەجیش مانگێکی تر شەڕیان نەدەکرد کە مانگی موحەڕڕەم بوو؛ بۆ ئەوەی بە سەلامەتی لەو مانگەدا بگەڕێنەوە بۆ ئەو وڵاتانەی کە دوور بوون ، ڕەجەب لە ناوەڕاستی ساڵدا شەڕی تیدا دەوەستا تا ئەوانەی لە دەوروبەری دورگەی عەرەبەوە دێن سەر لە مەککە بدەن‌و عومرەیشی تیدا بکەن پاشان بە سەلامەتی بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئەمە ئاینێکی ڕاستە، واتە: ئەمە ئەو بەرنامەی خوداو یاسا ڕاستەیە کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودای تێدایە لەو شتانەی کە خودا دایناوە لە مانگە حەرامەکاندا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡ﴾ لەمانەدا ناهەقی لە خۆتان مەکەن، واتە: لەم مانگە موحەڕڕەمانەدا ناهەقی لە خۆتان مەکەن، چونکە گوناهو تاوانەکەی زۆر گەورەترە لە مانگەکانی تر، وەك چۆن گوناهو سەرپێچی لەم شارەدا تاوانەکەی زیاترە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾[1] هەر کەسێك لەوێ لە ڕێ لاداو دەسدرێژی بکات ئازارێکی زۆر بە ژانی پێ دەچێژین، هەر بەو شێوەیەش مانگە حەرامەکان گوناه کردن تێیدا زۆر گەورەیە، عەلی کوری ئەبوتەلحی ئەڵێ: لە

---

[1] الحج (٢٥).

ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ﴾ تا دەگاتە: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ واتە: لە گشت مانگەکاندا ناهەقی لە خۆتان مەکەن، پاشان چوار مانگی تایبەتمەند کردوەو گوناهی تیایاندا زۆر بە گەورەتر داناوەو بە مانگی حەرامی داناون، ئاکاری چاکو پاداشتیشی بە گەورەتر هەژمار کردوە.[1] قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ئەڵێ: ناهەقی کردن لەم مانگە حەرامانەدا تاوانو خراپەکەی زۆر گەورەترە، لە تاوانو خراپە کردن لە مانگەکانی تردا، هەرچەندە ناهەقی کردن لە هەموو کاتێکدا هەر گوناهێکی گەورەیە، دیارە خودای گەورە هەر کارێ خۆی مەیلی لێبێ گەورەی دەکات،هەروەها ئەڵێت: بێگومان لە دروسکراوەکانیدا چەند هەڵبژاردەیەکی ناردووە، لەناو فریشتەکاندا چەند فریشتەیەکی هەڵبژاردووە، لەناو مرۆڤیشدا چەند نێرراوی هەڵبژاردووە، وە لەناو قسەکاندا قورئانی هەڵبژاردووە وە لەناو زەمیندا مزگەوتی هەڵبژاردووە. وە لە ڕۆژەکاندا ڕۆژی هەینی (الجمعة) هەڵبژاردووە وە لەناو مانگەکاندا مانگی ڕەمەزانو مانگە حەرامەکانی هەڵبژاردووە. وە لە شەوەکاندا شەوی قەدری هەڵبژاردوە، ئەوەی خودا ڕێزی لێ ناوە ئێوەیش ڕێزی لێ بنێن. بێگومان ڕێز گرتنی ئەو شتانە بەپێی ئەو ڕێز لێگرتنەیە کە خودا لێی ناون لەلای ئەو کەسانەی کە داناو وشیارن.

**شەڕکردن لە مانگە حەرامەکاندا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ ئەگەر ئەم بتپەرستانە بە تێکڕایی شەڕت لەگەڵدا دەکەن، ئێوەیش هەمووتان شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بزانن بێگومان خودا لەگەڵ خۆپارێزاندایە. ئاگادار بن دەستپێشخەریکردن لە شەڕکردن لە مانگە حەرامەکاندا قەدەغەیە. وەك لەم ئایەتانەدا خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ﴾[2] ئەی گەلی خاوەنباوەڕان لەو ڕێوشوێنانەی خودا بۆ ئێوەی داناوە لامەدەن، شەڕ لە مانگە حەرامەکانیشدا ڕەوا نیە. وە فەرموویەتی: ﴿الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾[3] مانگی شەڕپەس بەرانبەر بە مانگی شەڕپەس، شکاندنی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی خۆی هەیە، سا هەرکەسێ دەستدرێژی لە ئێوە کرد، ئێوەش هەر بە ئەندازەی ئەو دەستدرێژی بکەنەوە. وە

---

[1] الطبري (١٤/٢٣٨).
[2] المائدة (٢).
[3] البقرة (١٩٤).

فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ ﴾[1] هەر کە مانگە حەرامەکان برانەوە لە کوشتنی بتپەرستان دەست مەپارێزن. بەلام کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ ئەوە رێگە دانە بە خاوەنباوەڕان بە شەڕکردن دژی بتپەرستان لە مانگە حەرامەکاندا، ئەگەر دەست درێژیەکە لەلایەن بتپەرستەکانەوە بوو، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ ﴾[2] لە دەوروبەری (مسجد الحرام)یشدا نابێ شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر ئەوان لەوێ شەڕتان پێ بفرۆشن، ئەگەر لەوێش شەڕیان بۆ ئێوە هەلگیرساند ئێوەش لە کوشتنیان درێغی مەکەن، بەلام گەمارۆی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر خەلکی تائیفو بەردەوام بوونی هەتا چووە ناو مانگە حەرامەکانەوە، ئەوە لە تەواو کردنی شەڕی هەوازنو هاوپەیمانەکانیانەوە بوو لە هۆزی سەقیف، چونکە ئەوانە ئەو کەسانە بوون دەست پێشخەریان کرد لەو شەڕەدا خەلکیان کۆ کردەوەو جاڕی شەڕو کێبەرکێیان دا، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆیان، خۆیان قایم کرد لە تائیفدا، پێغەمبەر(ﷺ) رۆشت بۆیان لە پەناگاکانیان دەریان پەڕێنێ ،ئەوان دەستێکیان لە موسولمانەکان وەشاندو هەندێکیشیان لێ کوشتن، گەمارۆدانەکە بەردەوام بوو بە مەنجەنیقو شتی تریش نزیکەی چل رۆژ، لە سەرەتاوە لە مانگە حەلالەکانەوە دەستی پێکردو چووە مانگی حەرامەوەو چەند رۆژێ لەو مانگەدا بەردەوام بوو، پاشان وازی لێ هێنان، چونکە ئەوەی چاوپۆشی لێ ناکرێ لە سەرەتاوە، لە بەردەوام بووندا چاوپۆشی لێ دەکرێ، ئەمەیش فەرمانێکەو دراوەو وێنەی زۆرە والله أعلم.

﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِّيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فَيُحِلُّوا مَا حَرَّمَ اللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾

### زەمی دەستکاریکردنی شەرعی خواله رووی بیرو ڕاکانی خۆیەوە

ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە خودای گەورە زەمی بتپەرستەکانی پێدەکات، کە بە بیرورا ناپەسەندەکانیان دەستکاری شەرعی خوادەکەن، بڕیارەکانی خوایان دەگۆڕی بە ئارەزوی ناسازی خۆیان، حەلالی خوایان حەرامو حەرامیشیان حەلال دەکرد، چونکە ئەوانە توڕەییو دەمارگیریو پیاوەتیان بەو ئەندازەیە بەهێز بوو کە بتوانن ماوەی ئەو سێ مانگە کە لێیان قەدەغە کراوە

[1] التوبة (٥).
[2] البقرة (١٩١).

خواستەکانی خۆیانی تیا بەجێبهێنن لە بەگژدا چوونی دوژمنەکانیاندا، ماوەیەك پێش هاتنی ئاینی ئیسلام ئەم مانگە موحەڕڕەمەیان حەڵاڵ کردبوو دوایان خستبوو بۆ مانگی سەفەر مانگە حەرامەکەیان حەڵاڵ کردبوو. مانگە حەڵاڵەکانیشیان حەرام دەکرد، بۆ ئەوەی یەکسان بن گەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی کە خوا ڕێزی لێ نابوون. عەلی کوڕی ئەبوتەلحی ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾

(بەڕاستی ئاڵوگۆڕیو ڕاگوێزانی ئەو مانگانە، دەبێتە هۆی زیاد بوونی خوانەناسیو خوانەناسەکانی پێ گومڕا دەبن. لە ساڵێکدا شەڕ بە ڕەوا دەزانن‌و لە ساڵێکدا بە ناڕەوا، تا ژمارەی مانگە ڕەواو ناڕەواکان ئەوسا بەرانبەر ببنەوە لە دوایدا، ئەوەی خوا ڕەوای کردووە ڕەوای کەن، دیارە شەیتان ئەو کردەوە ناڵەبارەی بۆ جوان کردون، ئەوانەی خوانەناسن، خودا شارەزای ڕاستە ڕێیان ناکات). واتە: ئیبنوعەبباس ئەڵێ: ﴿ٱلنَّسِيٓءُ﴾ یانی ئاڵوگۆڕ کردن لە مانگە حەرامەکاندا، جونادەی کوڕی عەوفی کوڕی ئومەیەی کەنانی هەبووە، هەموو ساڵێ ئامادەی ئەم ڕێوڕەسمە دەبوو، نازناوەکەی ئەبوسومامە بوو. جاڕی ئەداو دەیگوت: ئەوسا ئەبوسومامە ڕەخنەی لێ ناگیرێو بێگوێیشی ناکرێ. بێگومان ئەوسا (صەفەر) یەکەمی ساڵەو ساڵێکی حەڵاڵە.ئەو ساڵەی حەڵاڵ دەکرد بۆ خەڵکی. ساڵی (صەفەر)ی داهاتووی حەرام دەکردو ئەو ساڵە موحەڕڕەمی حەرام دەکرد، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ ئیبنوعەبباس ئەڵێ: ساڵێ موحەڕڕەمیان واز لێ دەهێناو ساڵێ حەرامیان دەکرد[1] عەوفیش بە هەمان شێوە ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە[2] لەیسی کوڕی ئەبوسەلەیم ئەڵێ لە موجاهیدەوە، پیاوێ بووە لە بەنی کینانە بووە هەموو ساڵێ بە سواری کەرەکەی ئامادەی ئەم ڕێوڕەسمەدەبوو، دەیگوت: ئەی خەڵکینە ! من بێگوێیم ناکرێو جێی گازندەیش نیم، هەرچیشم گوت گەڕانەوەی نیە، ئەوسا ئێمە موحەڕڕەمان حەرام کردو (صەفەر)مان دوا خست، پاشان ساڵی دوای ئەوە دەهاتو هەمان قسەی دووبارە دەکردەوەو دەیگوت: ئەوسا ئێمە (صەفەر)مان حەرام کردوەو موحەڕڕەممان دوا خستووە. ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ڕێك بن لەگەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی کە خودا ڕێزداری کردوون‌و

[1] الطبري (١٤/٢٤٥).
[2] الطبري (١٤/٢٤٦).

ئەوەی خوا حەلاڵی کردووە حەرامی بکەن بە دواخستنی ئەم مانگە حەرامە.[1] ئەمانە ساڵێ مانگی مەحەڕڕەمیان حەلاڵ دەکردو لە بری مانگی صەفەردا، دوای صەفەر دوو ڕەبیعەکەو مانگەکانی تریان هەتا کۆتایی چۆن ڕێکخرابوونو ژمارەیانو ناوەکانیان وەك خۆیان دەهێڵرانەوە، پاشان لە ساڵی دووەمدا موحەڕڕەمیان حەرام دەکردو بە حەرام کراوی دەیانهێشتەوە بە دوایدا صەفەرو ڕەبیع و ڕەبیعەکەی تریان تا کۆتایەکەی (حەرام دەکرد) بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ واتە: لە حەرامکردنی چوار مانگ لەو ساڵەدا، بەڵام ئەوان جارێ حەرام کردنی مانگی سێهەمیان پێش دەخست لەو سیانەی کە بە دوای یەکدا دەهاتن کە مانگی موحەڕڕەم بوو، جارێکی تر دوایان دەخست بۆ مانگی صەفەر. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەم بارەیەوە قسەیەکی زۆر چاكو بەسوودی کردووەو گوتویەتی: یەکەم کەسێ کە مانگەکانی ئازو گوێز پێ کردووە لەناو عەرەبەکاندا، ئەوەی خودا حەرامی کردووە ئەو حەلاڵی کردوە، ئەوەیش خوا حەلاڵی کردوە ئەوحەرامی کردوە لە مانگەکاندا، قەلەممەس ناوێك بووە. کە ناوی تەواوی حوزەیفەی کوڕی عەبدفوقەیمی کوڕی کوڕی عەدی کوڕی عامیری کوڕی سەعلەبەی کوڕی حاریسی کوڕی مالکی کوڕی کەنانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودریکەی کوڕی ئیلیاسی کوڕی موزەڕی کوڕی نزاری کوڕی مەعەددی کوڕی عەدنان بووە. پاشان دوای خۆی عەببادی کوڕی بەو کارە هەڵساوە، پاشان دوای عەبباد کوڕەکەی کە ناوی قەلەعەو کوڕەکەی قەلەع کە ناوی ئومەییەو کوڕەکەی ئومەییە کە ناوی عەوفەو پاشان کوڕەکەی عەوف کە ناوی ئەبوسومامە جونادەی کوڕی عەوفە ئەمە دواین کوڕیان بووە لە زەمانی ئەمدا ئاینی ئیسلام هاتوە. عەرەبەکان لەسەردەمی ئەمدا کاتێ کە حەجیان تەواو دەکرد لێی کۆ دەبوونەوە وئەویش هەڵدەساو وتاری بۆ ئەدان، ڕەجەبو زولقەعیدەو زولحەجەی حەرام دەکرد لێیانو موحەڕڕەمی ساڵێکی بۆ حەلاڵ دەکردن لە جێیدا صەفەری دادەناو ساڵێکی تری حەرام دەکرد، هەتا ژمارەی مانگە حەلاڵو حەرامەکان وەك یەکیان لێ بێت،یانی ئەوەی خودا حەرامی کردوە ئەو حەلاڵی ئەکرد.[2] والله أعلم.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ

---

[1] الطبري (١٤/٢٤٦).

[2] إبن هشام (١/٤٥).

یُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِیمًا وَیَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَیْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَیْئًا وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَیْءٍ قَدِیرٌ (٣٩)﴾

**گلەیی و هەڕەشە لە نەبزوان و تەمەڵی کردن لە جیهاد کردن**

ئەم ئایەتە دەست پێدەکات بە گلەیی و سەرزەنشتی ئەوانەی کە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دواکەوتبوون لە غەزای تەبوکدا، کاتێ کە بەروبوم پێگەیشتبوو سێبەریش خۆش بوو بوو، گەرماو قرچەی هاوینیش دەمی دابوو، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِیلَ لَكُمُ انفِرُوا فِی سَبِیلِ اللَّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان! چیتانە کە پێتان دەڵێن: بڕۆن بۆ غەزا لە ڕێی خوادا، واتە: کاتێ کە بانگ کران بۆ جیهاد کردن لە ڕێی خوادا ﴿اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ﴾ تەمەڵن و لە جێی خۆ نابزوێن؟ حەزتان لە مانەوەو خۆ ماندوو نەکردن و میوەی خۆشە ﴿أَرَضِیتُم بِالْحَیَاةِ الدُّنْیَا مِنَ الْآخِرَةِ﴾ ئایا ژیانی دنیاتان لە قیامەت پێ خۆشترە؟ واتە: چیتانە ئەمەتان لەبەر ئەوە کرد کە دنیاتان لا خۆشترە لە ڕۆژی دوایی؟ پاشان خودای گەورە باسی گوێنەدان بە دنیاو بێ بەهایی ژیانی دونیا دەکات و خاوەنباوەڕان هەڵدەنێ بۆ وەدەستهێنانی پاداشتی ڕۆژی دوایی، ئەفەرموێت: ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَیَاةِ الدُّنْیَا فِی الْآخِرَةِ إِلَّا قَلِیلٌ﴾ ژیانی دنیاتان لە چاو ژیانی ئەو دنیاتان شتێکی زۆر کەم بایەخە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە مستەوردی برای بەنی ئەهرەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەم دنیا لە چاو ڕۆژی قیامەتدا وەك ئەوەیە کەسێ لە ئێوە پەنجەیەك بخاتە دەریایەکەوە، با سەیر کات بە چییەوە دەگەڕێتەوە؟)جا بە پەنجەی شایەتومانی هێمای کرد.[1] تەنیا موسلیم خۆی هێناویەتی[2] سەوری لە ئەعمەشەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَیَاةِ الدُّنْیَا فِی الْآخِرَةِ إِلَّا قَلِیلٌ﴾ئەڵێ: وەك توێشوی سوارێ وایە، واتە: لە چاو ڕۆژی قیامەتدا. پاشان خودای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە واز لە جیهادکردن دێنن و ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا یُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِیمًا﴾ ئەگەر نەچنە غەزا، لەلایەن خوداوە تووشی جەزرەبەی بە ژان دێن، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لە گەڕەکێکی عەرەب کرد کە بچن بۆ غەزا تەمەڵیان کردو نەچوون بە دەم داواکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) خودا بارانی لێ گرتنەوە

---

[1] أحمد (٢٨٨/٤)، سەحیحە.

[2] مسلم (٢١٩٣/٤).

ئەوە سزاكەیان بوو.[1] ﴿وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ كۆمەڵێكی تر دەخاتە شوێنەكەی ئێوە، واتە: بۆ یارمەتی دانی پێغەمبەرەكەیی‌و نیشتەجێ بوونی ئاینەكەی وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾[2] ئەگەر پشتی تێ بكەن ئێوە دەگۆڕێ بە كۆمەڵێكی تر كە هەرگیز وەك ئێوە نابن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗا﴾ ئێوە لەو بارەیەوە هیچ زیانێكی پێ ناگەیەنن. واتە: هیچ زیانێك بە خودا ناگەیەنن بە نەڕۆشتن‌و تەمەڵی كردنتان لە جیهاد كردن ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ خودا توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. واتە: ئێوەش نەبن خودا توانای سەركەوتنی بەسەر دوژمندا هەیە.

﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾

### خودا یارمەتیدەری پێغەمبەرەكەیەتی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ﴾ ئەگەر ئێوە یاریدەی پێغەمبەرەكەی نەدەن ﴿فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ خودا بۆ خۆی بە هانایەوە دەهات‌و پشتیوانی لێ دەكردو دەیپاراست‌و بەسی بوو، وەك چۆن هەرخۆی بە هانایەوە هات ﴿إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ وەختێ خوانەناسەكان ئەویان دەركرد، ئەو كاتەیش لە ئەشكەوتەكەدا بوون‌و پێغەمبەر(ﷺ) یەكێك بوو لەو دوو كەسە، ئەو كاتە بەهاوەڵەكەی خۆی گوت: خەمت نەبێ، ئێمە خودامان لەگەڵە،یانی: ئەمە لە ساڵی كۆچكردنی پێغەمبەردا بوو (ﷺ) كاتێ بتپەرستان هاتنە سەر ئەوەی بیكوژن یان بەندی كەن یان دووری بخەنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) رایكردو دەرچوو بە هاوڕێیەتی ئەبوبەكری كوڕی ئەبی قوحافەو پەنای برد بۆ ئەشكەوتی سەورو سێ ڕۆژ مانەوە (بۆ ئەوەی ئەوانەی دەرچووبوون دەگەڕان بە دوایدا بگەڕێنەوەو پاشان بەرەو مەدینە بكەونە ڕێ، ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) زۆر خەمی بوو كەس پێیان بزانێ‌و

[1] الطبري (١٤/٢٥٥).
[2] محمد (٣٨).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) تووشی ئازار بكات، پێغەمبەر(ﷺ) وورەی پێ ئەداو دڵنیای دەكردو ئەیفەرموو: (ئەی ئەبوبەكر تۆ گومانت چۆنە بە دوو كەس كە خودا سێهەمیانە)[1] وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە كە ئەبوبەكر بۆی باس كردوەو فەرموویەتی: گوتم بە پێغەمبەر(ﷺ) كە ئێمە لەناو ئەشكەوتەكەدا بووین، ئەگەر یەكێ لەوانە سەیری پێكانی خۆی بكردایە دەیبینین لە ژێری پێكانیەوە، فەرمووی: (ئەی ئەبوبەكر تۆ گومانت چۆنە بە دوو كەس كە خودا سێهەمیانە)[2] بوخاریو موسلیم لە هەردوو سەحیحەكەیاندا هێناویانە[3] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾ خودا ئارامیو ئاسایشی بۆ ناردە خوارەوە. گوتراوە ئەوە بۆ ئەبوبەكرە. ﴿وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا﴾ چەندین سەربازی بۆ نارد كە ئێوە نەتان دەبینین، ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ﴾ قسەی خوانەناسان ژێر كەوتو هەر قسەی خودا بەرزو لەسەرەوەیە. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: مەبەست بە قسەی خوانەناسان شەریك بۆ خوا دانانە، مەبەستیش بە قسەی خودا بریتیە لە وتەی (لا إله إلا الله)[4] وە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەبومووسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خودا كرا (ﷺ) لە بارەی پیاوێكەوە لەبەر ئازایەتی شەڕ بكات یان لەبەر دەمارگیری شەڕ بكات یان لەبەر ڕیا كاری شەڕ بكات، كام لەمانە لە ڕێی خوادایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (كەسێ شەڕ بكات بۆ ئەوەی هەر وتەی خودا بەرز بێ ئەوە لە ڕێی خوادایە)[5] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ﴾ خودا خاوەندەسەڵاتە، واتە: لە تۆڵە سەندنداو لە یارمەتی دانیانداو جێ پەنایەو هەركەسێ هانای بۆ بباتو دەس بە ئاینەكەیەوە بگرێ تووشی زیان نابێ. ﴿حَكِيمٌ﴾ كارزانە لە گفتارو كرداریدا.

﴿ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٤١﴾

---

[1] فتح الباري (٨/١٧٦).
[2] أحمد (١/٤)، سەحیحە.
[3] فتح الباري (٧/١١)، مسلم (٤/١٨٥٤).
[4] الطبري (١٤/١٤/٢٦١).
[5] فتح الباري (١/٢٦٨)، مسلم (٣/١٥١٢).

**دەبێ جیهاد لە هەموو بارودۆخێکدا بکرێ**

سوفیانی سەوری لە باوکیەوە، لە ئەبوزوحاوە موسلیمی کوڕی سەبیحەوە ئەڵێ: ئەم ئایەتە: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾ بڕۆن (بۆجیهاد) چ سووك بار بن (لەش ساغو دەوڵەمەندو دەستەڵات دار بن) چ گران بار بن (نەخۆش‌و هەژار بن) یەکەم ئایەت بوو لە سورەتی بەرائەتدا هاتە خوارەوە[1] موعتەمەری کوڕی سولەیمان ئەڵێ باوکی گوتویەتی: حەزرەمی پێی گوتوە هەندێ لە خەڵکی لەوانەیە کەسی وایان تیدا بێت نەخۆش بێ یان بە تەمەن بێ ،ئەمیش پێی دەڵێ: من خۆم تاوانبار ناکەم خودای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردوەتە خوارەوە کە ئەفەرموێت :﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾[2] خودای گەورە فەرمانی دا کە هەموو موسوڵمانان بچن بۆ غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنانی خوادا، لە ڕۆمە خوانەناسەکانی ئەهلی کتێب! فەرزی کرد لەسەر خاوەن باوەڕان کە دەبێ لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچن لە گشت بارودۆخێکدا لە خۆشی‌و ناخۆشیدا، لە تەنگانەو فەرەحیدا فەرموویەتی: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾ عەلی کوڕی زەید لە ئەنەسەوە، لە ئەبوتەلحەوە ئەڵێ: پیرو جوان، خودا بیانوی کەس وەرناگرێ،ئەوە بوو لە پاشاندا چوو بۆ شام و شەڕی کرد تا کوژرا. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە ئەبوتەلحە سورەتی بەرائەتی خوێندەوە گەیشتە سەر ئەم ئایەتە: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ پاشان گوتی: وا دەبینم پەروەردگارمان داوای دەرچوون لە هەموومان دەکات پیرو جوان، کوڕەکانم ئامادەکاریم بۆ بکەن! کوڕەکانی پێیان گوت: خودا ڕەحمەت پێ بکات تۆلە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) غەزات کردوە هەتا کۆچی دوایی کرد،وە لەگەڵ ئەبوبەکریشدا هەتا کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ عومەریشدا هەتا کۆچی دوایی کرد، ئێمە لەباتی تۆدا دەچین بۆ غەزا، قبوڵی نەکرد، سواری (کەشتی بوو) لە دەریاداو کۆچی دوایی کرد دوورگەیەکیان دەست نەکەوت تیایدا بینێژن هەتا نۆ ڕۆژ مایەوە پاشان ناشتیان تەرمەکەی هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات[3]! سوودی لەم ئایەتەدا: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾ ئەفەرموێت: دەوڵەمەندو هەژارو بەهێزو لاوازتان با بڕوات بۆ غەزا، لەو کاتەدا پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێن ئەو پیاوە میقداد بووە زۆر گەورەو قەڵەو بووە، سکاڵای بردە لای، داوای لێ کرد ئیزنی بدا، ئیزنی نەدا، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾ کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار زۆر

---

[1] الطبري (١٤/٢٧٠).

[2] الطبري (١٤/٢٦٦).

[3] إبن أبي حاتم (٦/١٨٠٢).

لەسەر شانی خەڵکی گران بوو، خودای گەورە بەم ئایەتە نەسخی کردوەو فەرمووی: ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ﴾[1] هیچ گلەیەك نیە لەسەر ئەوانەی بێ هێزو نەخۆشنو ئەوانەی کە هیچ شك نابەن خێرات بکەن، ئەگەر ئەوان بە دڵسۆزی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئامۆژگاری خەڵکی بکەن. ئیبنوجەریرئەڵێ: حیبانی کوڕی زەیدی شەرعەبی بۆی باس کردمو ئەڵێ: لەگەڵ سەفوانی کوڕی عەمردا دەرچووین کە والی حومس بوو ڕووەو ئەفسوس چووین تا جەراجیمە پیاوێکی بەتەمەنی زۆر لاوازم بینی کە برۆکانی کەوتبووە سەر چاوەکانی ئەوەندە چوو بوو بە ساڵدا خەڵکی دیمەشق بوو سواری وڵاغەکەی بوو لەگەڵ ئەوانەی دەچوون بۆ غەزا. چوومە لای و گوتم ئەی مامە! خودا مۆڵەتی تۆی داوە ئەڵێ: برۆکانی بەرز کردەوەو گوتی: ئەی برازای خۆم خودا داوامان لێ دەکات سوکبار بین یان گرانبار بین بڕۆین بۆ غەزا، ئەی نازانی ئەگەر کەسێ خودا خۆشی بوێ تاقی دەکاتەوە، پاشان دەیگێڕێتەوەو دەیهێڵێتەوە، بشزانە خودا ئەو عەبدانەی تاقی دەکاتەوە کە شوکرانە بژێرو خۆڕاگرو یادی خودا کەرنو جگە لە خودای گەورەیش هیچ کەسێکیان نەپەرستوە[2] پاشان خودای گەورە خەڵکی هەڵدەنێ بۆ ماڵ بەخشینو خۆبەخشین لەبەر ڕەزای خۆییو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بەرەو غەزا ڕێ بگرنە بەرو لە گیانو ماڵ بەخشین دریغی مەکەن، ئەگەر بزانن، ئەوە بە قازانجی خۆتانە. واتە: ئەو ماڵو گیان بەخت کردنە لە دنیاو دوارۆژدا بۆ ئێوە باشترە، چونکە ئێوە هەندێ لە ماڵی خۆتان دەبەخشن هەر لە دنیادا خودا ماڵو سامانی دوژمنەکانی دەدات پێتان لەگەڵ ئەو هەموو شتانەشدا کە لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەبەخشێ بە ڕێزو قەدرەوە. وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خودا(بەهەشتی) دەستەبەر کردوە بۆ ئەو کەسەی غەزا دەکات لە ڕێی ئەودا ئەگەر مراندی دەیخاتە ناو بەهەشت یان دەیگێڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی بەوەی کە بەدەستی هێناوە لە پاداشت یان غەنیمەت)[3] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[4] غەزاتان لەسەر نوسراوە، هەرچەندە خۆشیتان لێی نایە، ڕەنگە لە شتێ

---

[1] التوبة (٩١).

[2] الطبري (١٤/٢٦٤).

[3] مسلم (٤/١٤٩٦).

[4] البقرة (٢١٦).

حەز نەكەن بەڵام بۆتان بە خێر بگەڕێ، لەوانەیشە ئاوات بۆ شتێ بخوازن كە ئاكامەكەی باش نەبێ، خودا دەزانێو ئێوە سەری لەبەر دەرناكەن. هەر لەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە، ئەمیش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمووی بە پیاوێ: (موسوڵمان ببە) پیاوەكە گوتی: ئەگەر پێشم ناخۆش بێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر پێشت ناخۆش بێ)[1].

﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٤٢﴾﴾

**هۆی دواكەوتنی دووڕووەكانو ئاشكراكردنی فروفێڵیان**

خودای گەورە سەرزەنشتی ئەوانە دەكات كە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)دوا كەوتن لە غەزای تەبوكدا دوای ئەوەی ئیزنیان خواستو دانیشتنو نەچوون بۆ غەزای تەبووك، وایان پیشان دا كە توانای غەزایان نیە، بەڵام وایش نەبوو، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا﴾ ئەگەردەستكەوتێكی بێ ڕەنج بوایە، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: دەستكەوتێكی نزیك ﴿وَسَفَرًا قَاصِدًا﴾ و سەفەرێكی سانا بوایە، ﴿لَّاتَّبَعُوكَ﴾ بەئاسانی بەدواتدادەهاتن بۆی ﴿وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾ بەڵام ماوەی دوورو سەختیان لا گران بوو، هەتا دەگەنە شام ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ﴾ دێن سوێن دەخۆن بە خودا بۆتان كە گەڕانەوە بۆ لایان ﴿لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ﴾ ئەگەر بمان توانیایە، ئێمەش لەگەڵتان دەهاتین، واتە: ئەگەر حاڵمان وا نەبوایە لەگەڵتان دەهاتین، خودایش ئەفەرموێت: ﴿يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بە سوێند (خۆیان لەناو دەبەن) خودا دەزانێ كە ئەمانە درۆ دەكەن.

﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَن يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾﴾

---

[1] أحمد (٣/١٠٩).

**گلەییکردن لە پێغەمبەر لەسەر ئەوەی ئیزنی دان**

ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عەونەوەئەڵێ: ئایا گلەیەکتان بیستوە جوانتربێت لەم گلەییە؟ بانگ کردن بە لێبوردن لە پێش گلەییەکەدا، خودا ئەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ خودا بت بەخشێ بۆچی ئیزنت دان؟[1]. سورەیقی عیجلیو کەسانی تریش هەر وایان گوتوە[2] قەتادەئەڵێ: خودا گلەیی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد وەك دەیبیسن، پاشان ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە لە سورەتی نوردا کە ڕێی پێدا ئەگەر مەیلی لێیە ئیزنیان بدات، ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ﴾[3]،[4] هەر کاتێ بۆ کاری خۆیان هاتن ئیزنت لێ بخوازن، هەر کامێکیان ئیزن دەدەی مەیلی خۆتە. هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە عەتای خۆراسانیەوە، موجاهیدئەڵێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ئەو کەسانەی وتیان: داوای ئیزن بکەن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر ئیزنی دان دانیشن، ئەگەر ئیزنیشی نەدان هەر دانیشن[5]. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا﴾ (ڕاوەستابای) هەتا بۆت ڕۆشن بوایەتەوە کامانە ڕاستن، واتە: لە هێنانەوەی بیانوەکەیاندا ﴿وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾ درۆزنەکانیش بناسیت. خودای گەورە ئەفەرموێت: کاتێ داوای ئیزنیان لێ کردی باشتر وا بوو گوێت پێ نەدانایەو ئیزنی هیچ کەسێکیانت نەدایە کە بمێننەوەو دانیشن، تا ئەوەی ڕاست دەکاتو گوێڕایەڵیت دەکات بیناسیو جیا ببێتەوە، چونکە ئەوان هەر پێیان دادەگرت لەسەر دانیشتنو نەدەهاتن بۆ غەزا، ئەگەر ئیزنیشت نەدانایە دانیشن. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی هەر کەسێ بڕوای بە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بێ داوای ئیزن ناکات کە نەچن بۆ غەزاو دانیشن ﴿لَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَن يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾ ئەوانەی بڕوایان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت، نایەن ئیزنت لێ بخوازن تا بەماڵو گیان لە ڕێی خوا غەزا بکەن، خودا خۆپارێزان دەناسێ ﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ هەر ئەوانە دێن کە ئیزنت لێ بخوازن کە بڕوایان بە خوداو ڕۆژی دوایی نیە، واتە: بە هیوای پاداشتی خودا نین لەسەر کردارەکانیان لە ڕۆژی دوایدا،

---

[1] إبن أبي حاتم (٦/١٨٠٥).
[2] الطبري (١٤/٢٧٤).
[3] النور (٦٢).
[4] الطبري (١٤/٢٧٣).
[5] الطبري (١٤/٢٧٣).

﴿وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ لەو ناوەدا دوودڵ ماون. واتە: گومانیان هەیەلەسەر ڕاستی ئەوەی هاتووی پێی بۆیان ﴿فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ لە گومانی خۆیاندا دێنو دەچن. واتە: تۆش داماون، پێیە پێش دەخەن پێیە دوا دەخەن، پێ داگرتنیان نیە لە هیچ شتێکداو خۆڕاگر نین، ئەوانە کۆمەڵێکی سەرگەردانو تیاچوون نە بەرەو ئەم لانو نە بەرەو ئەو لان، هەرکەسێ خودا گومڕای بکات، ڕێگای بۆ نادۆزرێتەوە.

﴿وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾

**ئاشكرا كردنی حاڵی دووڕووەكان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً﴾ ئەگەر بیانویستایە دەرچن (لەگەڵتدا بۆ غەزا) خۆیان بۆ ئامادە دەكرد ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ بەلام خودا هاتنیانی پێ خۆش نەبوو ورەی لە دڵیاندا نەهێشتو دوای خستن ﴿وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ﴾ پێیان گوترا: ئێوەیش لەگەڵ بەجێماوان بەجێ بمێنن. واتە: بڕیاری خودا بوو، پاشان خودای گەورە ڕوونی كردوەتەوە كە بۆچی پێی ناخۆشە لەگەڵ موسوڵماناندا ئەوانە دەرچن بۆ غەزاو فەرمووی: ﴿لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ ئەگەر لەگەڵ ئێوەش بهاتنایە بۆ غەزا كاریان لە ئێوە تێك ئەدا. واتە: ئەوانە ترسەنۆكن ڕایان دەكردو خەڵكیشیان لە ئێوەشیان پەشیمان دەكردنەوە ﴿وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ﴾ كێشەیان بۆ دەنانەوەو ئاژاوەیان بەرپا دەكرد. دەستیان دەكرد بە قسە هێنانو بردنو كینەو دووبەرەكیان دروس دەكرد ﴿وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ﴾ هەندێكیشتان لەناودا بوو قسەكانیان لێ دەبیستن. پاشان خودای گەورە باسی ئەوە دەكات كە خۆی چاك دەیانناسێ ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خودا ئاگاداری ستەمكارانە. فەرموویەتی كە زاناو ئاگادارە بەوەی بووەو بەوەی دەبێو ئەوەش نابێو ئەگەریش ببێ چۆن دەبێ. واتە: هەندێ كەستان تیا بووە كە گوێڕایەڵیان بوون، قسەی ئەو دووڕووانەیان بە چاك دەزانیو لە قسەیان دەرنەدەچوون، چونكە ئەوانە نەیاندەزانی كە ئەوانە دووڕوون، لەبەر ئەوە لەناو موسوڵماناندا كێشەو دووبەرەكیو خراپە زۆر ڕووی ئەدا. موحەممەدی كوڕی ئیسحاق ئەڵێ: ئەوانەی كە داوای ئیزنیان دەكرد وەك هەواڵم پێ گەیشتوە لە پیاوە خاوەن ڕێزەكان بوون (لەناو مەدینەدا) لەوانە: عەبدوڵڵای

کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولو جەددی کوڕی قەیس. چونکە ئەمانە پیاوماقولانی هۆزەکەیان بوون، خودای گەورە دوای خستن، چونکە خۆی چاك دەیناسین، ئەگەر ئەوانە لەگەڵیان دەرچوونایە سەریان لە سەربازەکان دەشێواندو تووشی خراپەیان دەکردن.[1] هەر بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ ئەگەر لەگەڵ ئێوە بهاتنایە بۆ غەزا کاریان لە ئێوەش تێك ئەدا. باسی هەڵسوکەوتی ئەو دووڕووانەی کردوە کە چۆن ڕەفتار دەکەن ئەگەر دەرچونایە لەگەڵ ئەوەیشدا هەر دەرنەچوون. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾[2] ئەگەر بگێڕرێنەوە (بۆ دنیا) ئەو کارانەی کە پێیان دەگوترا مەیکەن هەر دەیانکرد ئەمانە هەر درۆزنن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾[3] ئەگەر خودا بیزانیایە خێرێکیان تێدایە، کارێکی دەکرد ببیسن، ئەگەر گوێی بیستنیشی پێ بدانایە، هەر ڕوویان لێ وەردەگێڕاو خۆیان لێ لائەدا. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾[4] ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانەمان بنوسیایە خۆتان بکوژن یان لە وڵاتتان دەرچن (کەمێکیان نەبێ) ئەو کارەیان دەکرد، لەکاتێکدا ئەگەرەوەك ئامۆژگاریان دەکرا بیانکردایە بۆ ئەوان چاك بوو، باوەڕیشیان بە خودا بتەوتر دەبوو. ئەوسا ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە پاداشتێکی گەورەمان بەوان دەبەخشی. واشمان دەکرد کە لە ڕێگەی ڕاستی ئێمە شارەزا بن، ئایەت لەم بارەیەوە زۆر هاتوە.

﴿لَقَدِ ابْتَغَوُا الْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا لَكَ الْأُمُورَ حَتَّىٰ جَاءَ الْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَارِهُونَ ﴿٤٨﴾﴾

خودای گەورە هانی پێغەمبەرەکەی ئەدا (ﷺ) لەسەر دووڕووەکانو ئەفەرموێت: ﴿لَقَدِ ابْتَغَوُا الْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا لَكَ الْأُمُورَ﴾ لە پێشیشدا پشێویان نایەوەو کاری تۆیان بە پێچەوانە نیشان ئەداوقسەکانیان (هەڵدەگێڕایەوە) واتە: بە هەموو شێوەیە بیریان دەکردەوەو ماخۆلانیان بوو کە فێڵ

---

[1] الطبري (١٤/٢٧٧).

[2] الانعام (٢٨).

[3] الانفال (٢٣).

[4] النساء (٦٦-٦٨).

له تۆو هاوەڵەکانت بکەن‌و له ئاینەکەت خەڵکی دوورەپەرێز کەن‌و بۆ ماوەیەکی زۆر کپی بکەنەوە، ئەوەش لە سەرەتای گەیشتنی پێغەمبەرەوە بوو (ﷺ) بۆ مەدینە. کە عەرەبەکان بە یەك ڕیز دژی پێغەمبەر(ﷺ) وەستابوون‌و جوولەکەو دووڕووەکانی مەدینەش دژایەتیان دەکرد کاتێ خودای گەورە لە جەنگی بەدردا سەری خست‌و وتەی خۆی بەرز کردەوە، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی‌و هاوەڵەکانی گوتیان: ئەمە ڕووداوێکە ڕووی تێ کردوین، بە سەر زاری هاتنە ناو ئاینی ئیسلام، پاشان هەر کاتێ ئاینی ئیسلام‌و موسوڵمانان سەرکەوتنێکیان بە دەست بهێنایە ئەو سەرکەوتنەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، دلگران دەبوون پێی، هەر بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ هەتا کارەکەی خودا سەرکەوت کە ئەوان پێیان ناخۆش بوو.

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٤٩﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) هەر لەناو ئەو دووڕووانەدا هەندێ لەوانە هەن، دێن پێت دەڵێن: ئیزنمان بدە با نەیەن، نەوەك تووشی گوناه ببین بەهۆی کچانی ڕۆمەوە، خودایش ئەفەرموێت: ﴿أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْ﴾ با بزانن کە هەر ئێستا کەوتونەتە ناو گوناهەوە. واتە: هەر بەو قسەی کە دەیکەن کەوتونەتە گوناهەوە. وەك موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە زوهری‌و یەزیدی کوڕی ڕوممان‌و عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرو عاسمی کوڕی قەتادەو کەسانی تریش کە گوتویانە: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو فەرمووی بە جەددی کوڕی قەیسی برای بەنی سەلیم: (ئەی جەدد! ئایا ئەم ساڵ خۆت ئامادە کردووە بۆ بەنی ئەسفەر ؟) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ئیزنم نادەی هەتا تووشی گوناه نەبم. سوێند بە خودا هۆزەکەم چاك ئاگادارن هیچ پیاوێ نیە ئەوەندەی من ئارەزووی لە ژنان بێ، من دەترسم ئەگەر ژنانی ڕۆمم بینی خۆم پێ ڕانەگیرێ لێیان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕاو پاشان فەرمووی: (ئیزنم پێدای) ئەم ئایەتە لەسەر جەددی کوڕی قەیس هاتە خوارەوە: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓ﴾ واتە: ئەوەی دەڵێ ئەو لە ژنانی ڕۆم دەترسێ کە وا نیە، ئەو گوناهەی کە تووشی دێ لە دواکەوتنی بۆ غەزا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) گەورەترە لەوەی خۆی لێ لا ئەدا.[1] هەر بەو شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو کەسانی تریشەوە کە لەسەر جەددی کوڕی

[1] الطبري (١٤/٢٨٧).

قەیس هاتوەتە خوارەوە. ئەم جەددی کوڕی قەیسە لە پیاوە هەرە ماقوڵەکانی بەنی سەلیم بووە.[1] وە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا پێی فەرموون : (ئەی بەنی سەلەمە کێ گەورەتانە؟) گوتیان: جەددی کوڕی قەیس، بەڵام بە کەسێکی چاوچنۆکی دەزانین، پێغەمبەری خودا فەرمووی: (چ دەردێ لە دەردی چاوچنۆکی (خراپترە)، بەڵام گەورەی ئێوە ئەو لاوە قژ لولە سپییەیە، کە بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرورە).[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئەوانەی خوانەناسن، جەهەنم دەورەیان لێ دەدا. واتە: ڕێگای دەرچونیان نیەو ناتوانن ڕابکەنو لێی دەرباز نابن.

﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ ٥٠ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٥١﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی: ﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ﴾ ئەگەر چاکەت بێتەڕێ، ئەوان پێیان ناخۆشە،خودای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار دەکات لە دوژمنایەتی ئەو دووڕووانە لێی، دەفەرموێ: هەرکاتێ تۆ تووشی چاکەیە ببی، واتە: سەرکەوتنێ یان دەسەڵاتێ بە دەستبێنی بەسەر دوژمنداو چەندێ خۆتو هاوەڵەکانت دڵخۆش کات، ئەوان زۆر پێی دڵگران دەبن ﴿وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ﴾ ئەگەر تووشی بەلایش بی، دەڵێن: ئێمە هەر لە پێشدا مشوری خۆمان خواردوە. واتە:ئێمە پێشتر کەشوێنی نەکەوتین خۆپارێزیمان کرد، ﴿وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ﴾ بە دڵخۆشیەوە خۆیانت لێ دوورەپەرێز دەگرن، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَا﴾ بلێ: جگە لەوەی خوا بۆی نوسیوین هیچی ترمان تووش نابێ، هەر ئەو سەروەری ئێمەیەو جێ پەنامانە ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ دەبێ خاوەنباوەڕان هەر خۆیان بە خودا بسپێرن. واتە: ئێمە هەر خۆمان بە خودا دەسپێرین ئەومان بەسە چاکترین بریکارە.

---

[1] الطبري (١٤/٢٨٧).

[2] الحاكم (٣/٢١٩)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: ئایا چاوەڕوانن جگە لە یەكێ لەو دوانەی (كە هەردوكیان باشن) شتێكی ترمان تووش دەبێ؟ واتە: شەهیدی یان زاڵ بوون بەسەر ئێوەدا، ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو قەتادەو كەسانی تریشە.[1] ﴿وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا﴾ ئەوا ئێمە چاوەڕوانین، هەر خوا خۆی یان بەهۆی ئێمەوە سزاتان بۆ بنێرێ. بە دیل بتانگرین یان بتانكوژین ﴿فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴾ دەسا ئێوە چاوەڕوان بن، ئەوا ئێمەش چاوەڕوانین. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴾ بڵێ: بە خۆشیتان بێ یان بە زۆر ماڵ ببەخشن، خوا لێتان قبووڵ ناكات، چونكە ئێوە كۆمەڵێكی لە ڕێلادەر بوون. پاشان خودای گەورە باسی ئەوە دەكات كە بۆچی لێیان وەرناگیرێ ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ ﴾ بۆیە هەرچی دەبەخشن خوا لێتان وەرناگرێ‌و ئەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ﴾ چونكە ئەوان بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەكەی نەبوو (ﷺ) نوێژیشیان بە تەمەڵی دەكەن‌و ئەو ماڵەیش كە دەیبەخشن زۆر بە نابەدڵی ئەیدەن.

﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەكەی (ﷺ): ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ﴾ سەیرت نەیە لە دارایی‌و مندالانێ كە هەیانە، وەك خودای گەورە لەم ئایەتانەی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ

[1] الطبري (١٤/٢٩٢).

عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴾[1] چاوت مەبڕە ئەو شتانەی کە داومانە بە کۆمەڵێ لەوانە، کە ئەمە هەر خۆشی ژیانی دنیایەو هەر ویستومانە تاقییان بکەینەوە، ڕۆزی پەروەردگاری تۆ چاکترو بەردەوامترە. وە فەرموویەتی: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾[2] ئاخۆ ئەوانە پێیان وایە ئێمە بە ماڵو کوڕان یارمەتیان ئەدەین، هەر بۆ ئەوە کە پەلەمانە لە چاکە لەگەڵ کردنیان؟ نەخێر ئەمانە هەستیان نییە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ خودا دەیەوێ لە دنیادا بەمانە ئازاریان بدات. حەسەنی بەسری ئەڵێ: بە زەکاتو بەخشینی لە ڕێی خودا سزایان بدات لە دنیادا.[3] ﴿وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ هەر بە خوانەناسی بمرن. واتە: (کاتێ کە دەیان مرێنێ) دەیەوێ بە خوانەناسی بیان مرێنێ، بۆ ئەوەی سزاکەیان زۆر توندو تیژ بێ، پەنا بە خوا لەو سزایە، ئەمە دەچێتە (باب)ی مۆڵەت دانەوە پێیان. کەم کەم جڵەویان بۆ شل دەکرێ لەسەر ئەو حاڵەی کە تێیدان.

﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾﴾

### باسی ترسو شڵەژانی دووڕووەکان

خودای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار دەکاتەوە لە ترسو لەرزو شڵەژانی دووڕووەکان ئەفەرموێت: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴾ بە سوێندەوە ڕەش دەبنەوەو دەڵێن: ئێمەش لە خۆتانین، درۆش دەکەن لە ئێوە نین، بەڵام ئەوان گرۆیەکی ترسەنۆکن. ئەو ترسەنۆکیە وایان لێ دەکات کە سوێند بخۆن ﴿ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا ﴾ ئەگەر شوێنێك دەست کەوێ خۆیانی تیا بشارنەوەو تیایدا بژین یان پەناگەیە یان ئەشکەوتێ لە کێوەکاندا یان کوندڕێو تونەیلێ ﴿لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴾ زۆر بە پەلە بۆی دەچن. ئیبنوعەبباسو قەتادەو موجاهید دەڵێن: ئەگەر یەکێ لەو سیانەیان دەست کەوتایە بە پەلە لێتان دووردەکەوتنەوە چونکە ئەوانە بە ناچاری تێکەڵاویتان دەکەن، لەبەر خۆشەویستیان نیە بۆتان، خوازیارن تێکەڵاویان نەکردنایە، بەڵام ناچاری وای لێکردن، بۆیە بەردەوام لە خەمو خەفەت دانو

---

[1] طه (١٣١).

[2] المؤمنون (٥٥-٥٦).

[3] الطبري (١٤/٢٩٦).

هەمیشە دلگرانن، چونکە ئیسلامو موسوڵمان بەردەوام لە سەرکەوتندایەو بەرەو دەستەڵات دەڕواو بەرز دەبێتەوە بۆیە هەر کاتێ موسوڵمانان لە خۆشیدا بن ئەوان پێی دلگرانن و حەز دەکەن تێکەڵاوی خاوەن باوەڕان نەکەن. هەر لەبەر ئەوەیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَـٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْاْ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴾.

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

## ڕەخنە و گازاندەی دووڕووەکان سەبارەت بە دابەش کردنی سەدەقەوەو تەماداربیان بۆی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ﴾ هەندێ لەو دووڕووانە ڕەخنەت لێ ئەگرێ دەربارەی دابەش کردنی سەدەقە. تاوانبارت دەکەن، با چاك بزانن کە خۆیان تاوانبارن، چونکە ئەوانە لەبەر ڕەزای خوا ئەو ڕەخنەیە ناگرن، بەڵکو لەبەر ناپاکی خۆیانە، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴾ ئەگەر بەشیان درا ڕازی دەبن ئەگەر بەشیشیان نەدرا توڕە دەبن و بۆڵە بۆڵ دەکەن. واتە: لەبەر خاتری خۆیان توڕە دەبن.

قەتادەئەڵێ: لەم ئایەتەدا: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ﴾ هەندێ لەو دووڕوانە تانەو تەشەرت لێ ئەدەن لەو دابە شکردنی سەدەقەدا، بۆمان گێڕاوەتەوە کە پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی تازە موسوڵمان دێتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) زێڕو زیوی دابەش کردووە،کابرا دەڵێ : ئەی موحەممەد(ﷺ) سوێند بە خوا ئەگەر خودا فەرمانی پێکردبی کە دادگەربی، ئەوەتۆ دادگەریت نەکردوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ! ئەی ئەو کەسە کێیە دادگەریت بۆ دەکات دوای من؟) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەمەو لە وێنەی ئەمە بترسن، بێگومان لەناو ئوممەتەکەی مندا وێنەی ئەمانە قورئان دەخوێنن لە قورقوڕاگەیان تێپەڕناکات، هەر کاتێ دروست بوون و یاخیبوون بیانکوژن، ئەوسا، هەرکاتێ وەدەرکەوتن بیانکوژن، ئەوسا هەرکاتێ وەدەرکەوتن بیانکوژن) پاشان بۆی باس کردین کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە من هیچ شتێکتان پێ نادەمو هیچ شتێکتان لێ قەدەغە ناکەم بەڵکو من گەنجینەوانم)[1].

ئەوەی قەتادە باسی کرد لەوە دەچێ کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوسەعیدەوە لە

[1] الطبري (١٤/١٤/٣٠٢).

بەسەرهاتی (ذي الخويصرة)دا کە ناوی حورقوس بووە. کاتێ کە ڕەخنەی لە پێغەمبەر(ﷺ) گرت لە دابەشکردنی دەست کەوتەکانی جەنگی حونەیندا کە گوتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ): دادگەر بە! تۆ دادگەر نیت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڕاستی ڕەنجەڕۆو زیانبار دەبم ئەگەر دادپەروەر نەبم) پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کابرای کرد کە ڕووی وەرچەرخاندو فەرمووی: (لە نەوەی ئەمە کەسانێك پەیدا دەبن هەر یەکێ لە ئێوە نوێژەکەی خۆی زۆر بە ناتەواو دەزانێ لە چاو نوێژی ئەواندا، ڕۆژویشی بە کەم دەزانێ لەچاو ڕۆژوی ئەواندا، ئەوانە لە ئاین دەردەچن وەك چۆن تیر لە لاشەی نێچیر دەردەچێ لە هەر شوێنێکدا پێیان گەیشتن بیانکوژن، چونکە ئەوانە خراپترینی کوژراون لە ژێر ڕووی ئاسماندا)[1] دوای ئەوە باسی پاشماوەی فەرموودەکەی کرد. پاشان خودای گەورە ئاگاداری کردنەتەوە لەوەی کە چی چاکە بۆیان لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾ ئەگەر ئەوانە بەو بەشە ڕازی بوونایە کە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیانداتێو بیانگوتایە: ئێمە هەر خودامان بەسەو بەم زوانە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە چاکەی خۆیان بەشمان ئەدەن، بەڕاستی ئێمە حەز لە ڕەزامەندی خودا دەکەین. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەدەبێکی گەورەو ڕازو نهێنیەکی مەزنی لە خۆی گرتوە، کە ڕازی بوونە بەو بەشەی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێی داونو تەنیا پشت بە خوا بەستنە وەك خودا خۆی فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ﴾ بیانگوتایە: خوامان بەسەو ئارەزوی ڕەزامەندی خودا خۆی دەکەین کە یارمەتیمان بدات بۆ گوێڕایەڵی پێغەمبەرو (ﷺ) بەجێهێنانی فەرمانەکانیو واز هێنان لەو شتانەی قەدەغەی کردوەو بە ڕاست وەرگرتنی ئەو هەواڵانەی بۆی باس کردوینو شوێن کەوتنی سوننەتەکانی.

﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَـٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾

### باسی خەرجەکانی (مصاريف) زەکات

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْعَـٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَـٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ زەکات دەبێ بدرێتە هەژارانو کەمدەستانو ئەو کەسانەی کۆی دەکەنەوە،و بۆ ئەو کەسانەی دڵیان ڕادەکێشرێ (بۆ خۆشەویستی ئیسلام)و ڕزگار کردنی کۆیلانو قەرزارانو لە ڕێی خوداداو ئەو ڕێبوارانەی پارەیان پێ نامێنێ لە ڕێدا. کاتێ کە خودای

[1] فتح الباري (١٢/٣٠٢)، مسلم (٢/٧٤٤).

گەورە باسی ڕەخنەو توانجی دووڕووەنەفامەکانی کرد کە ئازاری پێغەمبەریان (ﷺ) ئەدا لە دابەش کردنی سەدەقەکاندا، خودای گەورە خۆی ڕوونی کردوەتەوە کە خۆی دابەشی کردوەو بڕیارەکەی دیاری کردوەو خۆشی سەرپەرشتی دەکات، دابەش کردنەکەی نەداوەتە دەستی کەسێکی تر بێجگە لە خۆیو بەشی کردوە بەسەر ئەوانەدا کە باس کراون، بۆیە هەژارانیشی پێش خستوە لێرەدا بەسەر ئەوانی تردا، چونکە هەژاران زیاتر پێویستیان پێی هەیە لەوانی ترو زۆرتریش دەستکورتو نەدارن. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباس و موجاهیدو حەسەنی بەسریو ئیبنوزەیدو کەسانی تریشەوە کە: هەژار ئەو کەسە خۆپاکڕاگرەیە کەداوای هیچ شتێ لەخەڵکی ناکات. کەمدەستیش(المسكين) ئەوکەسەیە کەمێکی هەیەو بەشی ناکات دەگەڕێو داوا لە خەڵکی دەکات[1] قەتادەیش ئەڵێ: هەژار ئەو کەسەیە کە نەخۆشی درێژ خایەنی هەیەو کەمئەندامە. کەمدەستیش ئەو کەسەیە کە لەشی ساغە[2].

**هەژاران**

لە بارەی هەژارەوە، لە ئیبنوعومەرەوە گێڕراوەتەوە کە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سەدەقە بۆ دەوڵەمەندو کەسی بەهێزو تەندروست حەڵاڵ نیە) ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداوودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە[3].

**کەمدەستان**

وە لە بارەی کەمدەستەوە، لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)گێڕراوەتەوە کە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەمدەست ئەو کەسە نیە بەسەر خەڵکدا دەگەڕێو پارویە یا دوو پاروو خورمایە یا دوو خورمای دەست ئەکەوێ). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەمدەست کێیە؟ فەرمووی: (کەمدەست ئەوەیە کەسێ نیە پێویستی چارەسەر بکاتو کەسیش پێی نازانێ کە کەمدەستە سەدەقەی بداتێو هیچیش لە خەڵکی داوا ناکات). بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە[4].

**ئەو کارمەندانەی زەکات کۆ دەکەنەوە**

لە بارەی ئەو کارمەندانەی سەرپەرشتی سەدەقە دەکەنو دەگەڕێنو کۆی دەکەنەوە، حەقی خۆیانە بەشێکیان لەو سەدەقەیە بدرێتێ، وە نابێ ئەو کارمەندانە لە خزمانی پێغەمبەری خودا بن(ﷺ) کە زەکاتیان لێ قەدەغەیە، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عەبدولموتەلبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریسەوە، کە خۆیو فەزڵی کوڕی عەبباس ڕۆشتنو داوایان کرد لە پێغەمبەری

---

[1] الطبري (١٤/٣٠٥-٣٠٦).

[2] الطبري (١٤/٣٠٦).

[3] أحمد (٤/١٦٤)، أبوداود (٢/٢٨٥)، تحفة الاحوذي (٣/٣١٧)، تیرمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] فتح الباري (٣/٣٩٩)، مسلم (٢/٧١٩).

خـودا(ﷺ) بیانکاتـه کارمەنـدی سـەدەقە. پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (بەڕاسـتی زەکـات حـەڵاڵ نیەبۆموحەممەدو (ﷺ) کەس‌و کاری موحەممەد، بەڵکو ئەوە چڵک‌و چەپەڵی خەڵکە)[1].

**نۆ موسوڵمان (دڵڕاگیراوەکان)**

ئەو تازە موسوڵمانەیش چوار بەشن: لەوانە: هی وایان هەبوو سەدەقەی پێ ئەدرا هـەتا موسـوڵمان ببێ، وەك سەفوانی کوڕی ئومەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەسکەوتەکاتی حونەین سـەدەقەی ئەدایـە، بتپەرستیش بـوو کاتێـك کـە ئامـادەی ئـەو شـەڕە بـوو، ئومەیـە ئـەڵێ: بـەردەوام پێغەمبـەر(ﷺ) سەدەقەی ئەدامێ، هەتا وای لێ هـات بـووە خۆشەویستترین کـەس لـەلام دوای ئـەوەی کـە لـە هـەموو کەسێ زیاتر ڕقم لێی بوو.[2] ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردوە لـە سـەفوانی کـوڕی ئومەیـەوە ئـەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی حونەیندا سەدەقەی ئەدامێ، لـە هـەموو کەسـێ زیـاتر ڕقـم لێـی بـوو، بەردەوام سەدەقەی ئەدامێ، هەتا وای لێهات بووە خۆشەویستترین کەس لەلام.[3] موسلیم‌و تیرمیـزیش ڕیوایەتیان کردووە.[4] هی وا هەبوو سەدەقەی ئەدرایە بۆ ئەوەی بە چاکی موسـوڵمان ببـێ‌و دڵـی ڕابـێ. وەك چۆن سەد وشتر درا بە کۆمەڵێ لە پیاوە گەورەکانی قورەیش کـە ئـازاد کـران لـە مەککـە، کـە لـە ڕۆژی حونەیندا ئامادە بوون، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (من جاری وا هەیە بەشی کەسـێ ئـەدەم بەڵام کەسی تر هەیە لەو خۆشترم دەوێ کەچی بەشیشی نادەم، چونکە دەترسـم خـودای گـەورە بـە ڕوودا بیخاتە دۆزەخەوە)[5] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هـاتوە لـە ئەبوسـەعیدەوە ئـەڵێ: عـەلی کـوڕی ئەبوتالیب لە یەمەنەوە پارچە ئاڵتونێکی ڕەوانە کرد بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە هێشتا خۆڵەکـەی لێ جیا نەکرابوەوە. ئەمیش بەشی کرد لە نێوان چوار کەسـدا (عویەینـەی کـوڕی بـەدر ئـەقرەعی کـوڕی حـابیس‌و عەلقەمـەی کـوڕی عەلاسـە و زەیدلخـەیر) پاشـان فـەرمووی: (ڕایـان دێـنم)[6] هـی وا هـەبووە سەدەقەی پێدراوە، تا بەڵکو ئەوانەی وەك ئەون موسوڵمان ببن، هـی وا هـەبوە هاوکـاری پێـی دراوە لەبەر ئەوەی سەدەقەی دەوری خۆی کۆ دەکردەوە. یان پارێزگاری لەو ناوچانە بکات کە موسوڵمانانی تێدایە تا تووشی زیان نەبن لە سنوورەکانی ئەو ناوچەیەدا والله أعلم.

---

[1] مسلم (٧٥٢/٢).
[2] مسلم (١٨٠٦/٤).
[3] أحمد (٤٦٥/٦)، سەحیحە.
[4] مسلم (١٨٠٦/٤)، تحفة الاحوذي (٣٣٤/٣).
[5] فتح الباري (٣٩٩/٣).
[6] فتح الباري (٤٣٣/٦)، مسلم (٧٤١/٢).

### کۆیلەکان

لە بارەی کۆیلەوە ڕیوایەت کراوە لە حەسەنی بەسری‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو سەعیدی کوڕی جوبەیرو نەخەعی‌و زوهری‌و ئیبنوزەیدەوە کە مەبەست پێی ئەوانەن کە قەواڵەیان نووسیوە واتە: ئەو کۆیلەیە کە بەڵێن ئەدا بەخاوەنەکەی کەبە نرخێك خۆی ئازاد بکات، ئەگەر دای ئازاد دەبێ[1] لە ئەبوموسای ئەشعەری‌و کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە[2] ئیبنوعەبباس‌و حەسەن ئەڵێن: ئەگەر کۆیلە بە زەکات ئازاد بکرێ هیچی تێدا نیە، چونکە دەستەواژەی (الرقاب) گشتگیرترە لەوەی کە بدرێ بە قەواڵە نووس یان کۆیلەیەك بکڕێ‌و بە تەواوی ئازاد بکرێ، لە فەرموودەیەکی مەرفوعدا هاتوە کە خودا بە ئازاد کردنی هەر ئەندامێ لە ئەندامی ئەو کۆیلەیە ئەندامێکی ئەو کەسە ئازاد دەکات، کە ئازادی کردووە، هەتا بە عەیبی ئەو کۆیلەیە عەیبی ئەو کەسە ئازاد دەکات. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەو پاداشتە لە شێوەی ئەو کردارەیە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3] هەر لەباتی کاری خۆتان پاداشت ئەدرێنەوە (چاکە بە چاکەو خراپەیش بە سزادان).

### چاکەی بەندە ئازاد کردن

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدا هاتوە لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ئەڵێ: پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کارێکم پیشان بدە لە بەهەشتەوە نزیکم بخاتەوەو لە دۆزەخ دوورم بخاتەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئازادکردنی مرۆڤێك یان ئازاد کردنی گەردنێك). گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو دوانە هەر یەکێك نین؟ فەرمووی: (نەخێر، ئازاد کردنی مرۆڤێك ئەوەیە تۆ خۆت بە تەنیا ئازادی بکەی، ئازاد کردنی گەردنیش ئەوەیە کە تۆش هاوکاربیت لەدانی نرخەکەیدا)[4].

### قەرزاران

قەرزاریش چەند بەشێکن، لەوانە کەسێ بارێکی گرتبێتە ئەستۆی خۆی یان زەمانەتی قەرزێکی گرتبێتە گەردنی خۆی‌و داوای لێ بکرێ ماڵی ئەبێ بیداتەوە یان قەرزار بێ‌و نەتوانێ ئەو قەرزە بداتەوە، یان لە تاوان کردندا قەرزار بوبێ‌و پاشان تەوبەی کردبێ، ئەمانە قەرزەکەیان بۆ ئەدرێتەوە بەڵگەی ئەم باسە فەرموودەکەی قەبیسەی کوڕی موخاریقی هیلالیەکە ئەڵێ: کۆڵێکم خستبوە ئەستۆی خۆم، هاتمە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێ بکەم لە بارەیەوە، فەرمووی:

---

[1] الطبري (١٤/٣١٧).

[2] الطبري (١٤/٣١٦).

[3] الصافات (٣٩).

[4] أحمد (٤/٢٩٩)، پیاوەکانی جێی متمانەن.

(بمێنەرەوە هەتا سەدەقەمان بۆ دێ فەرمان ئەدەین بۆت خەرج بکرێ) پاشان فەرمووی: (ئەی قوبەیسە داوا کردن حەڵاڵ نیە بۆ یەکێ لەم سێ کەسە نەبێ: پیاوێ کۆڵێکی خستبێتە گەردنی خۆی، ئەوە دروستە داوا بکات هەتا لە کۆڵی دەبێتەوە پاشان واز دێنێ. وە پیاوێ تووشی برسیەتیەك دێت ساماناکەی لەناو دەچێ داوا کردنی بۆ حەڵاڵە. هەتا ژیانی بەرەو باشی دەچێ (یان فەرمووی بژێوی دابین دەبێ) وە پیاوێ هەژاری ڕووی تێدەکات و وای لێ دێ سێ کەسی خاوەن بیروڕا لەخزمی خۆی دەڵێن: فلانە کەس نەبوونی ڕووی تێکردوە، ئەمەیش داوا کردن حەڵاڵە بۆی. هەتا ژیانی بەرەو باشی دەچێ (یان فەرمووی بژێوی دابین دەبێ) جگە لەمانە داوا کردن حەرامە، خاوەنەکەی ئەو ماڵە بە حەرامی دەیخوات) موسلیم ڕیوایەتی کردوە[1] وە لە ئەبوسەعیدەوە ئەڵێ: پیاوێ لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) تووشی زەرەر بوو لە بەروبومێکدا کە کڕیبوی و زۆر قەرزار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئا! خێرێکی پێبکەن ،خەڵکی دەستیان کردەخێرکردن پێی ،بەڵام نەگەیشتە ئەوەی قەرزەکانی پێبداتەوە، پێغەمبەر(ص)فەرمووی بەوانەی قەرزیان لەلا بوو: (ئەوەی ئەیبینن وەری بگرن و جگە لەوە هیچی ترتان بۆ نیە)[2].

### لە ڕێی خوادا

لە بارەی لە ڕێی خواوە،یەکێکەلە ئەو کەسانەی کەزەکاتی پێئەشێ ئەوجەنگاوەرەیە کە هیچ بەشێکیان نیە لە دیواندا.

### ڕێبواران

ڕێبوار ئەو کەسەیە چووەتە وڵاتێ و هیچی پێ نەماوە سەفەرەکەی پێ بەڕێ بکات، زەکاتی پێ ئەدرێت بە ئەندازەی ئەوەی بەشی بکات هەتا دەگاتەوە زێدی خۆی، با خاوەن سامانیش بێ. ئەم بڕیارە ئەوەیش دەگرێتەوە کە دەیەوێ سەفەرێ بکات لە زێدی خۆیەوە، بەڵام هیچی پێ نیە لەگەڵ خۆی بیبات، ئەوەندەی لە ماڵی سەدەقە دەدرێتێ هەتا دەڕوات و دەگەڕێتەوە بەشی بکات. بەڵگەیش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتەیە و ئەم فەرموودەیشە کە ئەبوداوود و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە لەم فەرموودەی موعەمەرەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە عەتای کوڕی یەسارەوە، لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سەدەقە حەڵاڵ نیە بۆ دەوڵەمەند جگە لە پێنج کەس نەبێ: ئەوەی سەدەقە کۆ دەکاتەوە، یان ئەو پیاوەی (شتی) سەدەقەی کڕیوە بە ماڵی خۆی یان قەرزار یان کەسێ لە ڕێی خوادا غەزا بکات، یان کەمدەستێ ماڵی

---

[1] مسلم (١١٦١/٣).

[2] مسلم (٧٧٢/٣).

سەدەقەی بدرێتیو ئەویش بە دیاری بیبات بۆ دەوڵەمەندی[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت:
﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بڕیارێکە لە خوداوە، خۆی داویەتیو بڕیویەتەوەو بەشی کردوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا زاناو کارزانە، ئاگای لە کارە دیارو نەدیارەکانەو دەزانێ چی لە بەرژەوەندی عەبدەکانیەتیو کارزانە لەوەی دەیڵێو دەیکاتو بڕیار ئەداو فەرمانی پێدەکات هیچ پەرستراوو پەروەردگارێك نیە جگە لە خودا خۆی .

﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾

**یەکێ لە خووەکانی دووڕوو ئازاردانی پێغەمبەرە (ﷺ)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾ لەناو دووڕووەکاندا (دەستەیەك هەن) پێغەمبەر(ﷺ) ئازار ئەدەنو دەڵێن: هەموو شت دەبیسێ، واتە: هەر کەسێ هەر شتێکی پێ بڵێ لەناوماندا بڕوای پێ دەکات، کەسێ قسەی بۆ بکات بڕوای پێ دەکات کاتێ هاتبین بۆ لای سوێندمان بۆ خواردبێ بڕوای پێ کردوین، مانای ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسو موجاهیدو قەتادەوە[2] خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ﴾ بڵێ: کە گوێ لە چاکە دەگرێ لە قازانجی ئێوەیە.خۆ ڕاستگۆ دەناسرێتو لە درۆزن جیای دەکاتەوە ﴿يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ باوەڕی بە خوداش هەیەو بە باوەڕدارانی تریش بڕوای هەیە. واتە: بڕوای بە خاوەن باوەڕانیش هەیە ﴿وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ﴾ ڕەحمەتیشە بۆ ئەوانەی لە ئێوە بڕوایان هێناوە، بەڵگەیشە لەسەر خوانەناسان، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەو کەسانەشی کە پێغەمبەر ئازار ئەدەن تووشی ئازاری بە ژان دێن.

﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾﴾

---

[1] أبوداود (٢/٢٨٨)، إبن ماجة (١/٥٩٠)، سەنەدەکانی بەهێزە.

[2] الطبري (١٤/٢٢٦).

**یەکێکی تر لە خووەکانی دووڕوو هەوڵدانە بۆ ڕازیکردنی خەڵکی بە سوێندی درۆ**

قەتادە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ سوێندتان بە خودا بۆ دەخۆن، کە ئێوەیان لێ ڕازی بن، با ئەگەر خاوەنباوەڕن کارێکی وا بکەن خوداو پێغەمبەری خودایان لێ ڕازی بێ،قەتادە لەتەفسیری (يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ )دا ئەڵێ: بۆیان باس کردوین کە پیاوێ لە دووڕووەکان وتوویەتی: سوێند بە خوا ئەوانە لە هەڵبژاردەو بەڕێزترین کەسی ئێمەن،جا ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێ ڕاست بێ، ئەوەدیارە ئەوان لە گوێدرێژەکان خراپترن.ئەڵێ: پیاوێکیش لە موسوڵمانان گوێی لێ بوو، گوتی: (بەو پیاوە) سوێند بە خوا ئەوەی موحەممەد(ﷺ) دەیڵێت زۆر ڕاستە وە تۆش لە گوێدرێژ خراپتری، ئەڵێ: ئەو پیاوە بە پەلە قسەکەی برد بۆ پێغەمبەرو (ﷺ) بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ص) ناردی بە شوێن کابراداو بانگی کردو پێی گوت: (چی پاڵی پێوەنای کەئەوە بڵێی؟)، کابرا نەفرینی دەکردو سوێندی بە خوا دەخوارد کە وای نەگوتوە، پیاوە موسوڵمانەکەیش دەیگوت: ئەی خودایە ! ڕاستی ڕاستگۆ دەرخەو درۆزنیش بە درۆ بخەرەوە، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا﴾[1] بۆ دەبێ نەیانزانیبێ هەر کەسێ دژی خوداو پێغەمبەری خوا بوەستێ تاهەتایە لە ئاگری دۆزەخدایە، ﴿ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ ئا ئەمەیە ڕیسوایی‌و سەرشۆڕی گەورە.

﴿ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾﴾

**یەکێکی تر لە خووەکانی دووڕوو لە ئاشکرا بوونی نهێنیەکان دەترسن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴾ ئەوانەی دووڕوون زۆر ئەترسن سەبارەت بەوان سورەتێك بێتە خوارێ هەرچی لە دڵیاندایە ئاشکرای کات، بڵێ ئێوە گاڵتە بکەن، ئەوەی خۆی لێ دەپارێزن خودا هەر ئاشکرای دەکات. موجاهید ئەڵێ: ئەو قسەیە لە نێوان خۆیاندا دەکەن، پاشان دەڵێن: بەڵکو خودا ئەم نهێنیەمان ئاشکرا نەکات.[2] ئەم ئایەتە هەر لەم ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە فەرموویەتی:

---

[1] الطبري (٣٢٩/١٤).

[2] الطبري (٣٣١/١٤).

﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾[1] خۆ ئەگەر تووشی تۆش دەبن (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ئەو سەلامەی لە تۆی دەکەن، لەو سەلامە جیاوازە کە خودا لە تۆی کردوە، لە پاڵ خۆشیاندا دەڵێن: دەی بۆ لەسەر ئەم وتەیە خودا سزامان نادات؟ (دەچنە) جەهەنم بەسیانەو پاشەڕۆژیان زۆر خراپە، لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ﴾ بڵێ: گاڵتە بکەن! ئەوەی خۆتانی لێ لائەدەن خودا هەر ئاشکرای دەکاتو قورئان دەنێرێ و ئابڕوتان دەبات. وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ﴾ هەتا دەکاتە: ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ﴾[2] ئاخۆ ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، لایان وایە خودا ڕكو کینەیان ئاشکرا ناکات؟ (هەتا دەگاتە) بێگومان بە جۆری قسەکردنیش دەیانناسی خودا ئاگای لە کارەکانتانە. هەر بۆیە قەتادەئەڵێت: ئەم سورەتە ناو نراوە (ئابڕوبەر)، واتە: ئابڕوبەری دووڕووەکان.[3]

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾﴾

**یەکێکی تر لە خووەکانی دووڕوو فرۆفێڵو پاکانە کردنە بە شتی پڕوپوچ**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ﴾ خۆ ئەگەر لێشیان بپرسی: خەریکی چین؟ دەڵێن: ئێمە خەریکی گاڵتەو گەپ بووین، بڵێ: ئایا گاڵتەتان بە خواو پێغەمبەری خودا ئەکرد؟!. لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ئەڵێ: پیاوێ لە غەزای تەبوکدا لە مەجلیسێکدا گوتی: وێنەی ئەو قورئانخوێنانەی خۆمانم نەدیوە، کە ئەوەندە ئەوسن بن و ئەوەندە زماندرۆزنو ئەوەندەیش ترسەنۆك بن لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەدا، پیاوێ لەناو مزگەوتدا گوتی: درۆ ئەکەی، دیارە تۆ دووڕوویت. دەبێ هەواڵ بدەم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو (قسەیە) گەیشتە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) قورئان دەربارەی هاتە خوارەوە. عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەڵێ: من خۆم ئەو پیاوەم بینی خۆی گرتبوو بە پاشکۆی

---

[1] المجادلة (٨).

[2] محمد (٢٩-٣٠).

[3] الطبري (٢٣٢/١٤).

وشترەکەی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)وله بەرد هەڵدەکەوت، هەر دەیگوت : ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە خەریکی گاڵتەو گەپ بووین، پێغەمبەری خودایش (ﷺ) دەیفەرموو: ﴿أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴾[1] ئیبنوئیسحاق ڕیوایەتی کردوە، کە دەستەیەك لە دووڕووەکان لەوانە وەدیعەی کوڕی سابیت برای بەنی ئومەیەی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی عەوف و پیاوێکیش لە ئەشجەع کە هاوپەیکانی بەنی سەلەمە بوو. پێی دەگوترا (موخشەن) ی کوڕی حومەیر لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڕۆشتن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوتبووە ڕێ بەرەو تەبوك، بە یەکتریان دەگوت: ئاخۆ وا دەزانن شەڕو خۆگری بەنی ئەسفەر (واتە ڕۆمەکان) وەك شەڕی عەرەب وایە لەگەڵ یەکتریدا؟ سوێند بە خوا بەو زوانە دەتان بینین بە گوریس شەتەك ئەدرێن، ئەمە بۆ ئەوە بوو ترس و تۆقاندن بخەنە دڵی موسوڵمانانەوە، موخشەنی کوڕی حومەیر گوتی: سوێند بە خوا حەزم دەکرد فەرمانم پێ بکردایە هەر پیاوێ لە ئێمە سەد قامچی لێ بدرێت، نەك قورئان بێتە خوارەوە لەسەر ئەم قسەتان،ئەوە تێکنەشکێن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) (وەك پێم گەیشتوە) فەرمووی بە عەمماری کوڕی یاسر: (بگەرە ئەو کۆمەڵە بەڕاستی ئەوانە سووتان، پرسیاریان لەو قسەیە لێ بکە کە کردویانە، ئەگەر دانیان پێدا نەنا بڵێ: بەڵێ، ئەوەو ئەوەتان وتوە، عەممار چوو بۆ لایان و ئەوەی پێ گوتن، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوداو (ﷺ) داوای لێبوردنیان لێ کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر وشترەکەی بوو، وەستابوو، وەدیعەی کوڕی سابت دەستی گرتبوو بە پشتی وشترەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە خەریکی گەمەو گاڵتە بووین، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ﴾ موخشەن گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ناوی خۆم و ناوی باوکم منی وا دواخست!،جا ئەوتاکە کەسەی کە چاوپۆشی لێکرا لەم ئایەتەدا موخشەنی کوڕی حومەیر بوو.ئەویش ناوی خۆی نا عەبدورەحمان، داواشی کرد لە خودا کە بە شەهیدی بمرێ و کەسیش بە شوێنەکەی نەزانێ،ئەوەبوو لە ڕۆژی یەمامەدا شەهید کراو هیچ شوێنەوارێکی نەدۆزرایەوەو دیار نەمابوو. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ﴾ داوای لێبوردن مەکەن، ئێوە لە پاش بڕواهێنان بوونە خوانەناس. بەو گاڵتەو گەپەی کردتان ﴿إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ﴾ ئەگەر ئێمە لە هەندێکتان خۆش ببین، دەبێ

---

[1] الطبري (٣٣٣/١٤).

هەندێك ئازار بدرێن (واتە: چاوپۆشی لە هەمووتان ناكرێ، دەبێ هەندێكتان سزا بدرێن). ﴿بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ لەبەر ئەوەی تاوانبار بوون. بەو قسە خراپوپڕگوناهە.

﴿ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾﴾

**باسی هەندێ ترلەخووی دووڕووەكان**

خودای گەورە باسی خراپی دووڕووەكان دەكات كە گشت ڕەوشتێكیان پێچەوانەی ڕەوشتی خاوەنباوەڕانە، كاتێ كە باوەڕداران فەرمانیان كردوە بە چاكەو بەرگریان كردوە لە خراپە ئەوان بەرگریان كردوە لە چاكەو فەرمانیان داوە بە خراپەكاریو ئەفەرموێت: ﴿ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾ نێرو مێ لەم دووڕووانە وەك یەكن فەرمان بە خراپە دەكەن، ڕێگە لە چاكە كردن دەگرن، دەستی خۆشیان لە خێر كردن دەقوچێنن واتە: لە ماڵ بەخشین لە ڕێی خوادا، ﴿نَسُوا ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ خودایان لەبیر چوەو یادی خودا ناكەن خودایش ئەوانی لەبیر كرد، بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات. وەك ئەم ئایەتە كە ئەفەرموێت: ﴿وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾[1] پێیان وترا: وا ئەمڕۆ لەبیرتان دەكەین، وەك چۆن ئێوە تووشهاتنی ئەمڕۆتان نەدەهاتە بیر. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ ئەوانەی دووڕوویی دەكەن هەموویان لە ڕێ لادەرن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بڕیاری خودایە، دووڕووانی ژنو پیاو خوانەناسانیش دەگرێتەوە، بە تێكڕایی دەیانخاتە دۆزەخ تاهەتایە هەر تیایا دەبن، واتە: لەسەر ئەو كارانەی باس كرا كە كردوویانە لەناو جەهەنمدا هەر دەمێننەوە لەگەڵ خوانەناساندا تا هەتایە ﴿هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ كە ئەمە بۆ ئەوان بەسە بەر نەفرینی خوداش كەوتونو سزای هەمیشەییان هەیە.

---

[1] الجاثية (٣٤).

﴿كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ﴾ وەك ئەوانەی پێش ئێوە بوون، زۆر لە ئێوە بەهێزتر بوون، ماڵو منداڵیشیان لە ئێوە زیاتر بوو، ئەوانە لەو بەشەی کە بوویان کەڵکیان وەرگرت دیسان ئێوەیش، هەروا ئەوانەی پێشین، لە بەشی خۆیان کەڵکیان وەرگرت،خوای گەورە ئەفەرموێ:ئەمانەش وەك ئەوانەی پێش خۆیان تووشی سزا ئەبن لەدونیاو لە ئاخیرەتیشدا، حەسەنی بەسری ئەڵێ: ﴿بِخَلَٰقِهِمْ﴾ یانی: بە ئاینەکەیان.[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟﴾ وە ئێوەش ڕۆچوون لە پڕوپوچدا وەك ئەوان ڕۆچوون لە پڕوپوچ و درۆ کردندا. ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ﴾ ئەوانە کردەوەیان بە فیڕۆ چوو. چونکە هیچ پاداشتێکیان وەدەس نەهێنا لەسەری. چونکە کارەکەیان خراپە. ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا هەر ئەوان ڕەنجەسارن، چونکە لەو هەوڵانەیاندا هیچ پاداشتێکیان وەرنەگرت. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: (ئەمشەو) هەر لە دوێنێ شەودەچێ. ﴿كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ئا ئەوە جوولەکەکانە خۆمان وەك ئەوان لێکردوە، من نازانم! ئەوەنەبێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، بە شێوەیەك شوێنیان دەکەون، ئەگەر پیاوێ لەوان خۆی بکات بە کونی بزنمژەدا ئێوەش شوێنیان دەکەون).[2] وە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان لەمەولا دەکەونە شوێن خوونەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوە بوون. بست بە بستو گەز بە گەزو باڵ بە باڵ، تا بەشێوەیەك ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزنمژەدا ئێوەش شوێنیان دەکەون) گوتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەهلی کتێبن؟ فەرمووی: (ئەی کێن؟)[3] ئەم فەرموودەیە نمونەی لە هەردوو سەحیحەکەدا هەیە.

---

[1] الطبري (١٤/٣٤٣).(یانی سودیان لەئاینەکانیان وەرگرت وماوەیەك پێی ژیان بۆخۆیان) (وەرگێڕ).

[2] الطبري (١٤/٣٤٢).

[3] الطبري (١٤/٣٤٢).

﴿ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَاهِيمَ وَأَصْحَابِ مَدْيَنَ وَالْمُؤْتَفِكَاتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾

**ئامۆژگاریەك بۆ دووڕووەكان تا دەرس وەرگرن لەوانەی پێش خۆیان**

خودای گەورە ئامۆژگاری ئەو دووڕووانە دەكات كە بڕوا بە پێغەمبەرن ناكەن، ئەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ئاخۆ دەنگو باسی ئەوانەی لە پێش ئەوان ژیاون پێیان نەگەیوە. لەو گەلانەی كە بڕوایان بە پێغەمبەرەكانیان نەبووە ﴿قَوْمِ نُوحٍ ﴾ گەلی نووح، كە تێكڕا لەگەڵ خەڵكی سەر زەمین نوقم بوون و ئاو دایپۆشین جگە لەو كەسانەی كە بڕوایان هێنابوو بە عەبدو پێغەمبەری خۆی نووح (سەلامی خوای لێبێ) ﴿وَعَادٍ ﴾ عادیش كە چۆن لەناو چوون بە گرەبای بێ خێر كاتێ بڕوایان بە هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) نەهێنا. ﴿وَثَمُودَ ﴾ هۆزی سەموودیش چۆن بەر هەورەتریشقە كەوتن كاتێ كە بڕوایان بە سالح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) نەهێناو وشترەكەیان سەربڕی. ﴿وَقَوْمِ إِبْرَاهِيمَ ﴾ وە گەلی ئیبراهیم كە چۆن خودا ئیبراهیمی (سەلامی خوای لێبێ) سەرخست بەسەریاندا، بەو موعجیزە گەورەیە، وە پاشاكەشیان كە نەمرودی كوڕی كەنعانی كوڕی كوشی كوڕی كەنعانی بوو لەناو برد، نەفرینی خوای لێبێ ﴿وَأَصْحَابِ مَدْيَنَ ﴾ خەڵكی مەدیەنیش ئەمانە هۆزی شوعەیب بوون (سەلامی خوای لێبێ) چۆن خودا تووشی بومەلەرزەو سزای ڕۆژە هەورەكەی كردن. ﴿وَالْمُؤْتَفِكَاتِ ﴾ موئتەفیكە هۆزی لووتە كە لە مەدائین نیشتەجێ بوون. خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ﴾[1] گوندی هۆزی لووتیشی سەرەو ژێر كرد. گوتراوە: (دایكی ئاواییەكانیان كە سەدومە). مەبەست لێرەدا ئەوەیە خودای گەورە قڕی تێخستن بەهۆی بڕوا نەهێنانیان بە لووت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) لەبەر ئەو بەدڕەوشتیە پیسەی هیچ كەسێ لە پێش ئەواندا پێی هەڵنەسابوو لە دنیادا ﴿أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ كە پێغەمبەرانی ئەوان لە چەند بەڵگەی ئاشكراوە چوونە لایان ﴿فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴾ خوا ناهەقی لێ نەكردن، كە لەناوی بردن، چونكە بەڵگەی تەواوو ئاشكرای دانێ، كە ناردنی پێغەمبەران بوو بۆیان و هیچ

[1] النجم (٥٣).

بڕوبیانویەکی نەهێشتن ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ هەر خۆیان ناهەقیان لە خۆیان کرد. کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردو دژایەتی هەقیان کرد هەتا ئەوەی بەسەریان هات، بەسەریان هات لە سزاو بەرباد بوون.

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾﴾

**ڕەوشتە باشەکانی بڕواداران**

پاش ئەوەی خودای گەورە باسی ڕەوشتە پیس و خراپەکانی دووڕووەکانی کرد، دێتە سەر باسی ڕەوشتی جوان و چاکی خاوەن باوەڕان و ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾ ژن و پیاوی باوەڕدار دۆستی یەکترن، واتە: یارمەتی یەکتری دەدەن و پشتی یەکتری دەگرن وەك لەم فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەك بینا وایە، هەندێکی هەندێکی تر بە یەکەوە دەبەستێ)جا پەنجەکانی کرد بەیەکدا.[1] دیسان لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە: (نمونەی خاوەنباوەڕان لە خۆشەویستی بۆ یەکترو هاوسۆزیو بەزەیدا وەکو یەك جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی هەبوو ئەوا دەناڵێنێ لەتاو بێ خەوی و گەرمە تا).[2] وە ئەفەرموێت: ﴿يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾[3] دەبێ لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبێ، فەرمان بە چاکە بدەن و ڕێ لە خراپە بگرن. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و بەرفەرمانی خوداو پێغەمبەری خودان لەوەی فەرمانیان پێ کراوە لەوەیش لێیان قەدەغە کراوەو لەگەڵ خەڵکی خوادا بە چاکی دەجوڵێنەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُ﴾ خودا ئەمانە وەبەر بەزەیی خۆی دەخات، واتە: هەرکەسێ خاوەنی ئەم ڕەوشتانە بێ خودا بەزەیی پێدا دێتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ﴾ خودا خاوەن دەستەڵاتە، هەرکەسێ بەرفەرمانی ئەوبێ، دەسەڵاتی دەداتێ، چونکە بێگومان دەسەڵات هەر بۆ خوداو پێغەمبەران و خاوەنباوەڕانە ﴿حَكِيمٞ﴾ کارزانە لە دابەش کردنی ئەو ڕەوشتانە بۆ خاوەن

---

[1] فتح الباري (١٠/٤٦٤).
[2] فتح الباري (١٠/٤٥٢).
[3] آل عمران (١٠٤).

باوەڕان و دووڕووەکانیشی تایبەتمەند کردوە بەو ڕەوشتانەی کە لە پێشەوە باس کرا، خودای گەورە هەرچی دەکات پڕە لە کارزانی و لەجێی خۆیەتی.

﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾

### مژدە دان بە بڕواداران بە خۆشگوزەرانی هەمیشەیی

خودای گەورە باسی ئەو شتانە دەکات کە ئامادەی کردووە بۆ پیاوان و ژنانی خاوەنباوەڕ، لە چاکەو خۆشگوزەرانی هەمیشەیی و ئەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾ خودا بەڵێنی بە پیاوان و ژنانی باوەڕدار داوە باغاتێکیان خەڵات دەکات، جۆ باریان بەبەردا دەڕواو هەر لەوێدا دەمێننەوە، چەندین خانوی زۆر چاکی لەناو باغاتی عەدندا بۆ داناون. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دوو باغ (قاپەکانیان)و ئەوەی تێیاندایە لە زێڕە وە دوو باغ کاسەکانی و ئەوی تێیاندایە لە زیوە، لە نێوانی ئەو کۆمەڵەو لە نێوانی ئەوەی کە سەیری پەروەردگاریان بکەن هیچ شتێ نەماوە جگە لە پۆشاکی کیبریا بەسەر ڕووی خواوە لە باغاتی عەدندا).[1] هەر لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بۆ خاوەنباوەڕ لە بەهەشتدا چادرێك هەیە لە مرواری ناو بۆش. درێژیەکەی شەست میلە لە ئاسماندا، کەس و کاری بڕوادارەکەی تێدایە، دەگەڕێ بەسەریاندا (ئەوان هەندێکیان ئەوانی تریان نابینن))[2] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ بڕوای هێنابێت بە خواو پێغەمبەرەکەی و نوێژی کردبێ و ڕۆژوی گرتبێ، بێگومان هەقە لەسەر خودا کە بیخاتە بەهەشت، کۆچی کردبێ لە ڕێی خوادا یان لە زێدی خۆیدا مابێتەوە کە تێیدا لەدایك بووە) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا خەڵکی لێ ئاگادار نەکەین؟ فەرمووی: (بێگومان لەناو بەهەشتدا سەد پلە هەیە خودا ئامادەی کردوە بۆ ئەوانەی تێکۆشاون لە ڕێی ئەودا، نێوانی ئەو دوو پلەیە وەك نێوانی ئاسمان و زەمین وایە. کاتێ داواتان لە خودا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە (فیردەوس) سەرەوەی بەهەشت و ناوەڕاستی بەهەشتە لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت دێنە دەر، سەرەوەی عەرشی ڕەحمانە)[3] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی

[1] فتح الباري (٤٩١/٨)، مسلم (١٦٣/١).
[2] فتح الباري (٤٩١/٨)، مسلم (٢١٨٢/٤).
[3] فتح الباري (١٤/٦).

کردوه لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کاتێ سڵاواتتان دا لەسەر من داوای وەسیلەم بۆ بکەن)، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەسیلە چیە؟ فەرمووی: (بەرزترین پلەی بەهەشتە هیچ کەسێ وەدەستی ناهێنێ جگە لە یەك کەس، هیوام وایە ئەو کەسەش من بم)[1] دیسان لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا هاتوە لە سەعدی کوڕی موجاهیدی تائیەوە لە ئەبومودیللەوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی بەهەشتمان بۆ بکەو خانوەکانی چۆنە؟ فەرمووی: (خشتێکی زێڕەو خشتێکی زیوە، ڕووکەشەکەی لە میسکە. چەوو لمەکەی یاقوتو مرواریەو خۆڵەکەی زەعفەرانە، هەرکەسێ بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێتو بێزاری بەسەریدا نایەت، جلو بەرگی کۆنو داڕزاو نابێتو تافی لاویشی بەسەرناچێ)[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾ ڕەزای خودایش کە لە کشتی مەزنترە. واتە: ڕەزامەندی لێیان زۆر گەورەترە لەو نازو بەهرەیەی کە ئەوان تێدان، وەك ئیمامی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ : لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە عەتای کوڕی یەسارەوە، لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای گەورە ئەفەرموێت بە خەڵکی بەهەشت، ئەی خەڵکی بەهەشت، ئەوانیش دەڵێن: ئێمە ملکەچو گوێرایەڵی تۆین ئەی پەروەردگارمان، هەموو خێرو بێرێك لە دەستی تۆدایە، دەفەرموێت: ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئاخۆ بۆچی ڕازی نابین، ئەی پەروەردگارمان کە تۆ ئەوەندەت پێ خەڵات کردوین بە هیچ کام لە دروست کراوەکانی خۆت خەڵات نەکردوە، ئەفەرموێت: ئەی باشتر لەوەتان پێ نەدەم؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگار دەبێ لەوە باشتر چی بێت؟ ئەویش ئەفەرموێت: شایستەی ڕەزامەندی خۆمتان دەکەم، لەمەولا هەرگیز لێتان زویر نابم).[3] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەکەی مالیکەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾﴾

---

[1] أحمد (٢/٢٥٦)، ئەحمەد شاکیر بە سەحیحی داناوە.

[2] أحمد (٢/٣٠٤)، ئەحمەد شاکیر بە سەحیحی داناوە.

[3] فتح الباري (١١/٤٣٢)، مسلم (٤/٢١٧٦).

## فەرماندان بە شەڕولەگەڵ خوانەناس و دووڕوواندا وتووندی نواندن بەرانبەریان

خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە بە شەڕو توندو تیژی لەگەڵ خوانەناس و دووڕووەکاندا ڕەفتار بکات، وەك چۆن فەرمانی پێدا کە لەگەڵ ئەوانەی شوێنی کەوتون لە بڕواداران بە نەرم و نیانی هەڵسوکەوت بکات. هەواڵیشی دایە کە پاشەڕۆژی خوانەناس و دووڕووەکان لە ڕۆژی دوایدا ناو ئاگرە. ئیبنومەسعود لەم ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئەی پێغەمبەر لەگەڵ خوانەناسان و ئەوانەی دووڕوویی دەکەن بەشەڕ بەو بە توندو تیژی ڕەفتاریان لەگەڵ بکە شوێنی ئەوان دۆزەخەو دواڕۆژی دژواریان هەیە.ئەڵێ: بە دەست (واتە: بە شەڕ) بچێ بە گژیاندا، ئەگەر نەیتوانی بە توندو تیژی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و ڕوویان لێ گرژ بکات.[1] ئیبنوعەبباس ئەڵێ: خودای گەورە فەرمانی شەڕ کردنی دا دژی خوانەناسان بە شمێرو دووڕووەکانیش بە زمان و وازهێنان لە نەرم و نیانی لەگەڵیان[2] زەححاك ئەڵێ: بە شمشێر بجەنگە لەگەڵ خوانەناساندا و بە توندو تیژی ڕەفتار بکە لەگەڵ دووڕووەکاندا، ئەوە بەگژدا چوونیانە[3] موقاتل و ڕەبیعیش هەر وایان گوتوە.[4] حەسەنی بەسری و قەتادەئەڵێن: بە گژدا چوونی دووڕووەکان بە جێبەجێ کردنی حەددەکان ئەبێت بەسەریاندا[5] گوتراوە: هیچ دژایەتیە نیە لە نێوان ئەم قسانەدا، جارێ بەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، جارێی تر بەوە، بەپێی ئەو حاڵانە والله أعلم.

### هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە

ئەمەوی لەکتێبی (المغازي) یەکەیدا ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق بۆی باس کردین لە زوهریەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوەئەڵێ: کە یەکێك بوو لەو دووڕووانەی کە دواکەوت و قورئانی لەسەر هاتە خوارەوە. وە لەوانەش کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون (ﷺ) جولاسی کوڕی سوەید کوڕی سامتی، هاوسەری ئوموعومەیری کوڕی سەعد بوو، عومەیریش لەلای ئەو بوو، کاتێ قورئان هاتە خوارەوەو خودا باسی ئەوانەی کردوە کە چیان گوتوە لە دووڕووەکان جولاس گوتویەتی: سوێند بە خوا ئەگەر ئەو پیاوە ڕاستگۆ بێ لەوەدا: دەیڵێ ئێمە لە کەر خراپترین؟ عومەیری کوڕی سەعد گوێی لە قسەکەی بوو، پاشان گوتی: سوێند بە خوا ئەی جولاس، تۆ خۆشەویسترین و بەئابڕوترین کەسی لەلام، لەو کەسە

---

[1] الطبري (١٤/٣٥٨).
[2] الطبري (١٤/٣٥٩).
[3] الطبري (١٤/٣٥٩).
[4] إبن أبي حاتم (٦/١٨٤٢).
[5] الطبري (١٤/٣٥٩).

بەڕێزانەشی کە پێم باش نیە تووشی شتێکی ناخۆش ببێ. بێگومان تۆ قسەیەکت کردوە ئەگەر باسی بکەم ئەو قسەیەئابڕوم دەبات، ئەگەر بیشارمەوە ئەمفەوتێنێ بەدڵنیاییەوە یەکێکیانم لا ئاسانترە لەوی تریان، بۆیە. چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی جولاس وتبووی بۆپێغەمبەری گێڕایەوە، کاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە جولاس، دەرچوو نەوەستا تا ڕۆیشتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و سوێندی خوارد بە خوا کە ئەوەی عومەیری کوڕی سەعد وتویەتی ئەو نەیگوتوەو درۆی بۆ هەڵبەستووە ! خودای گەورەو باڵادەست ئەم ئایەتەی لەسەر ناردە خوارەوە: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ ﴾ سوێند دەخۆن بە خودا کە ئەوەیان نەدرکاندووە کەچی قسەی خوانەناسانەیان کردووە، دیارە لە پاش موسوڵمان بوون لە دین پەشیمان بوونەوە. هەتا کۆتایی ئایەتەکە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێی بێدەنگ بوو. زانایان بڕوایان وایە کە جولاس تەوبەی کردووەو زۆر بە چاکیش تەوبەی کردوەو وازی هێناوەلەوگوناهە. ئیمام ئەبوجەعفەری کوڕی جەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سێبەری درەختێکدا دانیشتبوو فەرمووی: (ئەوا ئێستا مرۆڤێ دێت بۆ لاتان بە دوو چاوی شەیتان سەیرتان دەکات، کاتێ هات هیچ قسەی لەگەڵدا مەکەن). ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوێکی چاو زاق هات و پێغەمبەری خودا بانگی کردو فەرمووی: (لەبەرچی خۆت و هاوەڵەکانت قسەم پێ دەڵێن؟) پیاوەکە ڕۆشت و هاوەڵەکانی هێناو سوێندیان بە خوا خوارد کە هیچیان نەگوتوە تا وازی لێ هێنان، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ ﴾.

## دووڕووەکان خولیای کوشتنی پێغەمبەریان (ﷺ)کەوتە سەر

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْ﴾ خەیاڵیان دابووە سەر شتێ، بۆیان نەلوا پێکی بێنن. دەڵێن: لەسەر جولاسی کوڕی سوەید هاتوەتە خوارەوە. چونکە ئەو خەیاڵی کوشتنی کوڕی ژنەکەی کەوتبووە سەری کاتێ گوتی ئەم قسەیە دەگەیەنە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەشڵێن: لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هاتوە، کە نیازی کوشتنی پێغەمبەری (ﷺ) هەبوو.[1] سوودیش ئەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر ئەو کەسانە هاتە خوار کە دەیانویست تاج بخەنە سەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، با پێغەمبەری خواش (ﷺ) ڕازی نەبێ. ڕیوایەت کراوە کە دەستەیە لە دووڕووەکان نیازی کوشتنی پێغەمبەریان (ﷺ) هەبوو، ئەوەیش لە غەزای تەبوکدا بوو، لە شەوێ لەو شەوانەدا لە کاتی ڕۆشتندا زیاتر لە دە کەس بوون، زەححاك ئەڵێ: لەسەر ئەوانە ئەم ئایەتە هاتە خوار. بەیهەقی لە کتێبی (دلائل النبوة)دا ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە (ڕەزای خوای لێبێ)ئەڵێ : ڕەشۆی وشترەکەی پێغەمبەرم (ﷺ) بە دەستەوە بوو ڕام دەکێشا عەمماریش لێی دەخوڕی، یان عەممار ڕای دەکێشاو من

[1] الطبري (١٤/٣٦٣).

لێم دەخوڕی. هەتا کاتێ گەیشتینە عەقەبە لەو کاتەدا ڕووبەڕووی دوانزە سوار بوومەوەو بەریان لێگرتین، پێغەمبەری خودا، بانگی کردنو تێی خوڕین ئەوانیش بەرەو دوا گەڕانەوەوڕایان کرد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێمان: (ئایا زانیتان کێن؟) گوتمان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوانە دەمیان هەڵواسیبوو، بەڵام زانیمان حوشترەوانن، فەرمووی: (ئەوانە دووڕووەکانن هەتا ڕۆژی قیامەت، ئایا دەزانن چیان دەویست؟) گوتمان: نەخێر، فەرمووی: (دەیانویست تەنگ بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵچنن لە عەقەبەداو هەڵی دێرن (بیخەنە خوارەوە) لەوێدا) گوتمان: بۆچی نەنێرین بۆ ناو کەسو کاریان هەتا هۆزی هەریەکەیان سەری کەسی خۆیت بۆ ڕەوانە بکات؟ فەرمووی: (نەخێر، پێم ناخۆشە عەرەبەکان لە نێوان خۆیاندا بڵێن موحەممەد(ﷺ) شەڕی بە گەلێ کرد هەتا بەهۆی ئەوانەوە خودا سەری خست، ئەو بە کوشتن پێشوازی لێکردن، پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە بە دوبەیلە لێیاندە)، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوبەیلە چیە[1]؟ فەرمووی: (پرشکێکە) لە ئاگر دەکەوێتە سەر دەماری دڵی یەکێ لەوانو بەوە لە ناو دەچێ)[2]، ئەبوتوفەیل بۆی گێڕاینەوەو گوتی: لە نێوان پیاوێك لە خەڵکی عەقەبەو حوزەیفەدا هەندێ لەو شتانە کە لە نێوان خەڵکیدا ڕوونەدا، ڕوویدا، پیاوەکە گوتی: بە خوا سوێندت ئەدەم ئەوانەی عەقەبە چەندکەس بوون؟ئەڵێ: ئەو کۆمەڵە پێیان گوت: کە داوات لێ دەکات کەواتە پێی بڵێ، گوتی: ئێمە هەواڵ ئەوەمان لایە کە ئەوانە چواردە کەس بوون،جا ئەگەر تۆ یەکێك بوویت لەوانە، ئەوا ئەو کۆمەڵە پانزە کەس بوون. وە من سوێند بە خودا دەخۆم کە دوانزە کەس لەوانە دوژمنی خوداو پێغەمبەرەکەین (ﷺ) لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا، سیانیشیان چاوپۆشی لێکراوە، گوتیان: ئێمە گوێمان لە جاڕچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەبووەو نەشمان زانیوە ئەوانە مەبەستیان چی بووە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە زەویەکدا دەڕۆشت بەردەکەی ڕەش بوو (وەك بە ئاگر سوتابێ) فەرمووی: (بێگومان ئاو کەمە، هیچ کەسێ پێشم نەکەوێ بۆ سەر ئەو ئاوە) بینی کۆمەڵێ پێشی کەوتبوون، لەو ڕۆژەدا نەفرینی لێ کردن[3] دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە عەممارى کوڕی یاسرەوەئەڵێ: حوزەیفە هەواڵی دامێ لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لەناو هاوەڵەکانمدا دوانزە دووڕووی تێدایە ناچنە ناو بەهەشتو بۆنیشی ناکەن، هەتا وشتر نەچێ بە کونی دەرزیدا: هەشت کەسیان دوبەیلە بەسە بۆلەناو بردنیان ،چرایەکە لە ئاگر لەسەر

---

[1] دوبەیلە:دوومەڵێکی گەورەیە لەناوەوەی مرۆڤدا دروست ئەبێت وئەیکوژێت (النهاية في غريب الحديث والاثر:ابن الاثير: وشەی "دبل"..وەرگێڕ).

[2] دلائل النبوة (٥/٢٦٠)، سەنەدەکانی لاوازە.

[3] مسلم (٤/٢١٤٤).

ناو شانیان دەردێ‌و (دەڕوا) تا ئەگاتە لەناو سنگیان)[1] هەر لەبەر ئەوەیە حوزەیفە پێی گوتراوە: خاوەنی نهێنی (صاحب السر) کەسی تر نایزانێ جگە لەو، واتە: کەسی تر نازانێ ئەو کۆمەڵە دووڕووە دەسنیشان بکات جگە لەو. ئەوانەیش ئەو کەسانە بوون کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) حوزەیفەی لێ ئاگادار کردو کەسی تری لێ ئاگادار نەکرد جگە لەو، والله أعلم. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ هەر بۆیەش ڕقیان هەبووە چونکە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) (خاوەنباوەڕانیان) دەوڵەمەند کردووە لە بەهرەی خۆی. پێغەمبەر(ﷺ) هیچ تاوانێکی نیە لای دووڕووەکان جگە لەوەی کە خودای گەورە دەوڵەمەندی کردوون بەهۆی ئەو بەرەکەت‌و خێرو بێرەی ئەوەوە، خۆ ئەگەر ئەو خۆشبەختیەی بە تەواوی بڕژایە بەسەریاندا، خودای گەورە بیخستنایەتە سەر ئەو پەیامەی کە پێی هاتوە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە ئەنساریەکان: (ئایا ئێوە گومڕا نەبون خودا بەهۆی منەوە خستنیە سەر ڕاستە ڕێ‌و دەستە دەستە نەبوون بەهۆی منەوە یەکی خستن، هەژار نەبوون بەهی منەوە دەوڵەمەندی کردن) پێغەمبەر(ﷺ) هەر شتێکی دەفەرموو، دەیانگوت: هەر خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خاوەن بەرەکەتی زۆرن[2] ئەم ڕستەیە کاتێ دەگوترێ، کەسێ تاوانبار نەبێ‌و دژایەتی بکرێ. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾[3] تەنیا لەبەر ئەوە ڕقیان لەوانە بوو، چونکە بروایان هەر بەخودای خاوەن دەستەڵات‌و شایەنی سوپاس هەبووە. پاشان خودای گەورە بانگیان دەکات کە تەوبە بکەن‌و بگەڕێنەوەو ئەفەرموێت: ﴿فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەگەر پەشیمان ببنەوە، هەر بە قازانجی خۆیانەو ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا، خودا لەم دنیاو لەو دنیا ئازاری بە ژانیان ئەدا، واتە: ئەگەر هەر بەردەوام لەسەر ئەو کارە خراپەی خۆیان بن، هەر لە دنیادا خودا جەزرەبەی بەژانیان ئەدا، یانی: بە کوشتن‌و خەم‌و خەفەت لەناویان دەبات، لە دوارۆژیشدا: بە سزاو سوکایەتی پێکردن‌و کەم سەیر کردن‌و ڕیسوا کردن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

﴿وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ نە کەس دۆستایەتیان لەگەڵدا دەکات‌و نە یارمەتی دەریشیان دەس دەکەوێ. واتە: هیچ کەسێ ناتوانێ بەختەوەریان بکات‌و بێت بە هاواریانەوە، تووشی خێریان بکات یان خراپەیکیان لە کۆڵ بکاتەوە.

---

[1] مسلم (٤/٢١٤٣).

[2] فتح الباري (٧/٦٤٤).

[3] البروج (٨).

﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾﴾

**یەکێکی تر لە خووە خراپەکانی دووڕووەکان داوا کردنی ماڵەو پاشان بەخیلیی کردنە لە خێرو بێر کردندا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ﴾ هەندێك لەناو ئەواندا پەیمانیان لەگەڵ خودا بەست کە: شەرتە ئەگەر خودا لە چاکەی خۆی بەشمان بدات، ئێمەش خێرو خێرات دەکەین‌و دەچینە ڕیزی پیاوچاکانەوە، کە خودا کردی‌و لە چاکەی خۆی زیادەی دانێ بەخیلیان لەسەر کردو دیسان پشتیان هەڵکردو ڕوویان وەرگێڕا. دووڕووییان هەر لە دڵدا ماوەتەوە هەتا ئەو ڕۆژەی دێنە بەر بارەگای خودا. دیسان لێرەدا خودا باسی ڕەوشتێکی تری خراپی دووڕووەکان دەکات، کە هەندێ لەو دووڕووانە پەیمانیان داوە بە خودا ئەگەر لە چاکەی خۆی دەوڵەمەندی کردن‌و بەشی دان، ئەوانیش لەو سەدەقەیە خێرو بێر دەکەن‌و دەچنە ڕیزی پیاو چاکانەوە، کەچی ئەو بەڵێنەی دایان نەیان بردە سەرو ڕاستیان نەکرد لەو قسەدا کردیان. بۆیە ئەو ڕژدی زەکات نەدانە بوو بەهۆی دامەزرانی دووڕوویی لە دڵیاندا تا ئەو ڕۆژەی دێنە بەر بارەگای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا پەنا دەگرین بە خودا لەوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ﴾ چونکە ئەوان پەیمانی خودایان شکاندو درۆیان لەگەڵ خودا کرد. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کاتێ قسەی کرد درۆ بکات، هەرکاتێ بەڵێنی دا نەیباتە سەر، ئەگەر سپاردەی لا دانرا ناپاکی لێ بکات)[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ بۆ نازانن خوا بە ڕازیان دەزانێ‌و ئاگای لە سرتەشیان هەیەو خۆی لە هەرچی نادیارە ئاگادارە. خودای گەورە ئاگادارمان دەکات کە ئاگای لە نهێنی‌و شاراوەکانە، خۆی چاکتر شارەزای دڵەکانیانە کە دەڵێن ئەگەر سامانیان دەس کەوت خێرو خێراتی لێ دەکەن‌و سوپاسی

---

[1] فتح الباري (١١/١)، مسلم (٧٨/١).

خوایشی لەسەر دەکەن. بێگومان خودا لە خۆیان شارەزا ترە لێیان، چونکە خودا لە هەرچی دیارو نادیارو ڕازو سرتەو ئاشکراو پەنهانیە ئاگادارە.

﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾

**یەکێکی تر لە خووە خراپەکانی دووڕووەکان تانەو تەشەردانە لەو خاوەنباوەڕانەی زیاتر زەکات ئەدەن و گاڵتەیش دەکەن بەوانەی کەم ئەدەن**

ئەمەیش دیسان یەکێکی ترە لە ڕەوشتە ناشیرنەکانی دووڕووەکان کە هیچ کەسێ لە تانەو تەشەریان ڕزگاری نابێ لە هەموو کاتێکدا، هەتا ئەوانەی لە ماڵی زەکاتیش زیاتر دەبەخشن هەر پارێزراو نابن، ئەگەر کەسێکیان ماڵێکی چاکیشی هێنابێ دەڵێن: ڕیا کارە، خۆ ئەگەر کەمیشی هێنا دەڵێن: خوا بێ نیازە لە سەدەقەی ئەمە، وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوەئەڵێ: عوبەیدللای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە، ئەبونەعمانی بەسری بۆی گێڕاینەوە، شوعبە بۆی گێڕاینەوە، لە سولەیمانەوە، لە ئەبووائیلەوە، لە ئەبومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێ : کاتێ ئایەتی سەدەقە هاتە خوارەوە ئێمە سەدەقەمان بە کۆڵ لەسەر پشتمان دەهێنا، پیاوێ هاتو شتێکی زۆری بەخشی (دووڕووەکان) گوتیان: ڕیا کارە، پاشان پیاوێك هاتو مەنێکی[1] کردە سەدەقە. گوتیان: خودا بێ نیازە لە سەدەقەی ئەمە، ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴾ ئەو کەسانەی تانەو تەشەر دەگرنە برواداران کە زیاتر لە زەکات خێرو بێر دەکەن و تانەش لەوانە ئەدەن، هەر ئەوەندە دەستیان دەڕوا کە دەیبەخشن.[2] دیسان موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە[3]. ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: پێغەمبەری خودا ڕۆژێ هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی و لەناویدا بانگی کرد کە سەدەقەکانتان کۆ بکەنەوە، خەڵکی سەدەقەکانیان کۆ کردەوە، پاشان لە دوای گشتی پیاوێ بە مەنێ خورماوە هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمە مەنێکە لە خورما (هێناومە) ئەم شەو تابەیانی بە گوریسێکی موویین ئاوم هەڵکیشاوە، تا دوو مەن خورمام بەدەست هێنا، مەنێکیانم بۆ خۆم داناو ئەم مەنەیشم بۆجەنابت هێناوە !!، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دایە بیڕژێنێتەناو سەدەقەکان، چەند پیاوێ گاڵتەیان پێ کردو گوتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی بێ نیازن لەوەی تۆ، ئەو مەنەی تۆهیچیان پێ ناکات، پاشان عەبدوڕەحمانی کوڕی

---

[1] مەنێك لەمەرشتێك بریتیە لە چوارمشت لەوشتە (وەرگێڕ).

[2] فتح الباري (٣/٣٣٢).

[3] مسلم (٢/٧٠٦).

عەوف ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەسێکی تر ماوە لەوانەی زەکات ئەدات؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کەسی تر نەماوە جگە لە تۆ) عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێی گوت: من سەد ئەوقیە زێڕم داناوە لەناو سەدەقەکاندا، عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) پێی گوت: ئایا تۆ شێتی؟ گوتی: من شێت نەبووم، عومەر گوتی: ئەوەی دەیڵێیت کردووتە؟ عەبدوڕەحمان گوتی: بەڵێ! سامانی من هەشت هەزارە، چوار هەزاری ئەدەم بە پەروەردگارم‌و چوار هەزاریش بۆ خۆم، پێغەمبەری خودا پێی گوت: (خودا خێرو بێر بڕێژێ بەسەر ئەوەدا هێشتوەتەوەو بەسەر ئەوەیشدا کە بەخشیوتە) دووڕووەکان تانەو تەشەریان ئەداو دەیانگوت: سوێند بە خوا ئەوەی عەبدوڕەحمان ئەیدا ڕیا کاری نەبێ هیچی تر نیە، (ئەوانە درۆزنن)، چونکە ئەوە عەبدوڕەحمان بەخشی زیاد تر بوو لە زەکات، بە ئارەزوی خۆی بەخشی. خودای گەورە قورئانی ناردە خوارەوەو پاکی‌و چاکی خۆی‌و هاوەڵە کەمدەستەکەی کە مەنێك خورمای هێنابوو دەرخست‌و فەرمووی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو کەسانی تریشەوە، ئیبنوئیسحاق ئەڵێ: ئەو کەسانەی زیاتر لە زەکات خێراتیان کردبوو لە خاوەن باوەڕان، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف چوار هەزار درهەمی دابوو بە سەدەقە، وە عاسمی کوڕی عەدی (برای بەنی عەجلان)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر باسی سەدەقەی کردبوو، هەڵی نابوون لەسەر سەدەقە دان، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هەڵسابوو چوار هەزار درهەمی هێنابوو، عاسمی کوڕی عەدیش هەڵسابوو سەد ویسق خورمای کردبوو بە سەدەقە، بۆیە دووڕووەکان تانەو تەشەریان لێ دابوون، گوتبویان: ئەمە جگە لە ڕیاکاری هیچ شتێکی تر نیە. ئەو کەسەیش کە سەدەقەی کردبوو بە هەوڵی خۆی ئەبوعەقیل (برای بەنی ئەنیفی ئەراشی) هاوپەیمانی بەنی عەمری کوڕی عەوف، مەنێك خورمای لەگەڵ خۆیدا هێنا کردیە ناو ماڵی سەدەقەوە، دووڕووەکان دەستیان کردە پێکەنین‌و گوتیان: خودا بێ نیازە لەو مەنەی ئەبوعەقیل. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ دووڕووەکان گاڵتەیان پێ دەکەن، خودایش گاڵتە بەمان دەکات‌و ئازارێ بە ژانیان دەبێ. ئەمە لە بابی موقابەلەیە لەسەر خراپی کردارەکانیان‌و گاڵتە کردنیان بە بڕواداران، چونکە پاداش لە شێوەی ئەو کردارەیانە کە پێی هەڵساون، خودایش گاڵتەیان پێ دەکات بە هەمان شێوە، بۆ پاڵپشتی لە خاوەن باوەڕان لە دنیادا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزای بەژانی ئامادە کردووە بۆ دووڕووەکان، چونکە پاداشتەکەیان لە شێوەی کرداری خۆیانە.

---

[1] الطبري (١٤/٣٨٣).

﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾﴾

**قەدەغە کردنی داوای لێبوردن بۆ دووڕووەکان**

خودای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکات کە ئەو دووڕووانە شایستەی ئەوە نین کە داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت، ئەگەر تۆ حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ بکەی خودا هەرگیز لێیان خۆش نابێ، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێ: لە عومەری کوڕی خەتابم بیست (ڕەزای خوای لێبێ) دەیگوت: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگ کرا کە نوێژی لەسەر بکات، پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسایە سەری، کاتێ لەسەری ڕاوەستا ویستی نوێژی لەسەر بکات، هەڵگەڕامەوەو لەبەر سنگیدا ڕاوەستام، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا (نوێژ) لەسەر دوژمنی خودا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی دەکەی، (ئەو کەسە) فلان ڕۆژو فلان ڕۆژ ئەو قسانەی دەکرد؟ ڕۆژەکانی دەژمارد ئەڵێ: پێغەمبەری خودایش(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد، هەتا کاتێ زۆرم گوت، فەرمووی: (عومەر خۆت لادە من سەرپشك کراوم، منیش ئەمەم هەڵبژاردوە، پێم گوتراوە ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ لێخۆشبونیان بۆ داوا بکەی یان نەکەی، بێ بەهرەیە، ئەگەر تۆ حەفتا جار داوای بەخشینیان بۆ بکەی، خودا هەرگیز لێیان خۆش نابێ. ئەگەر بزانم لە حەفتا جار زیادم بکردایە، لێی دەبورا زیادم دەکرد)وئەڵێ: پاشان نوێژی لەسەر کردو لەگەڵیدا ڕۆشتو لەسەر گۆڕەکەی ڕاوەستا هەتا لێبوونەوە لێی. عومەر گوتی: سەرم لە خۆمو بوێری خۆم سوڕمابوو بەرانبەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن،ئەڵێ: سوێند بە خوا، ماوەیەکی کەمی پێ چوو ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوار: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ﴾ هەر کەسێکیان لێ بمرێ نابێ نوێژی لەسەر بکەیو لەسەر گۆڕی ڕامەوەستە، دوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی لەسەر دووڕوو نەکردو لەسەر قەبریشی ڕانەوەستا هەتا خودای گەورە گیانی پیرۆزی بردەوە بۆ لای خۆی[1] هەر بەم شێوەیە تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوە.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ چونکە ئەوانە باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەرەکەی نەکرد، خودایش گرۆی لەڕێ لادەران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

---

[1] أحمد (٩٥)، تەفسیری إبن کثیر (٥/٤٢٦).

﴿ فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ
لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ (٨١) فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ
يَكۡسِبُونَ (٨٢) ﴾

**دووڕووەكان بەوە دڵخۆش بوون كە خۆیان لادا لە چوون بۆ غەزای تەبوك**

خودای گەورە زەمی ئەو دووڕووانە دەكات كە دوا كەوتن لە هاوەڵەكانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دڵیان خۆش بوو بە مانەوەیان دوای دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿ فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّ ﴾ ئەوانەی بەوە دڵخۆشن كە لەماڵی خۆیان مانەوەو لە هاوڕێ بوون لەگەڵ پێغەمبەری خودا خۆیان لاداو نەیان ویست كە ماڵو گیانی خۆیان لە ڕێی خوادا بەخت بكەن (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)) دەیانگوت: لەم گەرمایەدا مەچنە دەرەوە. واتە: دووڕووەكان بە یەكتریان دەگوت لەم گەرمادا مەچنە دەرەوە، چونكە ڕۆشتن بۆ غەزای تەبوك لە كاتێكی زۆر گەرمدا بوو سێبەر زۆر خۆش بوو، بەروبومیش پێگەیشتبوو، بۆیە گوتیان: ﴿لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّ﴾ خودای گەورە فەرمووی بە پێغەمبەرەكەی (ﷺ) ﴿قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ﴾ بڵێ: ئەگەر تێگەیشتنتان هەبوایە، خۆ ئاگری جەهەنم زۆر گەرمترە. واتە: ئەو ئاگری جەهەنمە كە خۆتان دەگرن لەسەری‌و لە گەرمادا دەرناچن‌و خۆتان لائەدەن، زۆر گەرمترە لە ئاگری دنیا، وەك ئیمامی مالیك ئەڵێت: لە ئەبوزینادەوە لە ئەعرەجەوە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ئاگرەی ئادەمیزاد هەڵی دەگیرسێنن بەشێكە لە حەفتا بەشی ئاگری جەهەنم) گوتیان: ئەگەر هەر ئەمەیش بوایە بەسبوو ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕاستیدا جەهەنم شەستو نۆ پلەی زیاترە لەو)[1] لە هەردوو سەحیحەكەیشدا هاتووە.[2] ئەعمەش ئەڵێ: لە ئەبوئیسحاقەوە، لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوكترین سزای خەڵكی دۆزەخ سزای كەسێكە كە جووتێ نەعلی ئاگرینی لە پێدایە مێشكی سەری پێیانەوە دەكوڵێ وەك چۆن مەنجەڵی ئاو دەكوڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، وا نابینێت كەس لەو سزای سەخت تر بێت، كەچی ئەو لە هەموویان سزای سوكترە)[3] لە هەردوو

[1] الموطأ (٢/٩٩٤)، سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٣٨٠)، مسلم (٤/٢١٨٤).

[3] الحاكم (٤/٥٨٠).

سەحیحەکەیشدا هاتوە[1] فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەم بارەیەوە زۆرە، خودای گەورەیش لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾[2] هەرگیز نابێ، ئەمە بڵێسەی ئاگرە، پێستی سەرو هەموو ئەندامی دادەڕنێ. وە فەرموویەتی: ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَـٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾[3] ئاوی زۆر گەرمیان لە سەرەوە بەسەردا دەکرێ، هەر بە ئاوە زۆر کوڵاوە، هەناویان بە پێستیانەوە دەسوتێو لادەچێ، بەر گورزی ئاسنیش ئەدرێن، هەتا بیانەوێ لە خەمو مەینەت ڕزگار ببن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، دەی ژانی ئاگر بچێژن. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ﴾[4] ئەو کەسانەی لە نیشانەکانی ئێمە حاشا دەکەن، لە دوارۆژدا بە ئاگر دەیان سوتێنین، هەر کاتێ پێستیان سووتاو برژا پێستی تریان بۆ دەگۆڕین تا ئازار زیاتر بچێژن خودای گەورە لێرەدا لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ﴾ بڵێ: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ)) خۆ ئاگری جەهەنم زۆر گەرمترە، ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایە. واتە: ئەگەر بیانزانیایەو تێگەیشتوو بوونایە لەو گەرمادا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەردەچوون، هەتا خۆیانی پێ بپارێزن لە گەرمای جەهەنم، کە زۆر زۆر لەو گەرمایە زیاترە. پاشان خودای گەورە هەڕەشە لەو دووڕووانە دەکات لەسەر ئەو کردارە ناشرینەیانو ئەفەرموێت: ﴿فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ با کەم پێ بکەنو زۆر بگرین لە سزای ئەو کارانەدا کە دەیانکرد. ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێ: ژیانی دنیا کەمە، با بە ئارەزوی خۆیان پێبکەنن تێیدا، ئەگەر لە دنیا دەرچوونو هاتن بۆ لای خودای گەورە دەست دەکەن بە گریانێ هەرگیز نابڕێتەوە.

﴿فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾﴾

---

[1] فتح الباري (١١/٤٢٥)، مسلم (١/١١٩٦).

[2] المعارج (١٥-١٦).

[3] الحج (١٩-٢٢).

[4] النساء (٥٦).

## دوڕووەکان جارێکی تر ئیزن نادرێن دەرچن بۆ شەڕ

خودای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ﴾ ئەگەر خودا تۆی لە غەزا گەڕاندەوە بۆ لای هێندێك لەوان، قەتادە ئەڵێ: بۆیان گێڕاوینەوە کە ئەو دووڕووانە دوانزە کەس بوون ﴿فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ﴾[1] داوایان لە تۆ کرد ئیزنیان بدەی بچنە غەزا، بڵێ: هەرگیز نابێ لەگەڵمان دەرچن، قەت لەگەڵ من ناچنە شەڕی هیچ دوژمنێك. وەك تەمێ کردنو سزادانێك، پاشان هۆکارەکەی ڕوون دەکاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئێوە هەر لە سەرەتاوە دانیشتنتان هەڵبژارد، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾[2] وەك ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد، ئێمەش دڵو دیدەی ئەوان لەکار دەخەین. پاداشتی خراپە هەر خراپەیە لە ئاکامدا. وەك چۆن پاداشتی چاکە هەر چاکەیە. وەك خودای گەورە لە عومرەی حودەیبییەدا فەرمووی: ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ﴾[3] هەر ئەوانە دواکەوتبوون ئێستا دەڵێن: هەر کاتێ بەرەو وڵاتانێ چوون، لێمان گەڕێن با بە شوێن ئێوەدا بێین، دەیانەوێ قسەی خوا بگۆڕن، بڵێ: هەرگیز ئێوە لە شوێن ئێمە نایەن، خودا لە پێشدا فەرموویەتی. خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ﴾ ئێستاش هەر دانیشن لەگەڵ ئەوانەی مانەوە. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: (دانیشن) لەگەڵ ئەو پیاوانەی لە غەزا دواکەوتنو مانەوە.[4]

﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾

## قەدەغە کردنی نوێژ کردن لەسەر دووڕووەکان

خودای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە بێزاری بەرانبەر دووڕووەکان دەربڕێو نوێژ لەسەر هیچ کەسێکیان نەکات کاتێ کە مردو لەسەر گۆڕیشیان نەوەستێو داوای لێخۆشبونیان بۆ بکات یان دووعایان بۆ بکات، چونکە ئەوانە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەر(ﷺ) نەبووەو لەسەر ئەو حاڵە

---

[1] الطبري (١٤/٤٠٤).

[2] الانعام (١١٠).

[3] الفتح (١٥).

[4] الطبري (١٤/٤٠٤).

مـردون، ئەمـە بڕیارێکـە گـشتیو ڕەهایـە بـۆ هەرکەسـێ زانـرا دووڕووە، هەرچـەندە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەی لەسەر عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی سەرۆکی دووڕووەکان بـووە، وەك بوخـاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوەئـەڵێ: کـاتێ عەبـدوڵلای کـوڕی ئوبـەی مـرد (کوڕەکـەی عەبـدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆشت داوای لێکرد کراسەکەی خۆیی بداتێ تاباوکی بـەو عەبایە کفن بکـات، پێغەمبـەری خـودا هەڵسا نوێـژی لەسـەر بکـات، عومـەری کـوڕی خـەتاب هەڵساو کراسەکەی پێغەمبەری خودای (ﷺ) گرتو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا نوێـژی لەسـەر دەکـەی، کـاتێ کـە پـەروەردگارت لێـی قەدەغـە کـردوی نوێـژی لەسـەر بکـەی؟ پێغەمبـەری خـودا فـەرمووی: (بێگومان خودا منـی سەرپـشك کـردوەو فەرموویـەتی: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ لێخۆشبونیان بـۆ داوا بکـەی یانەکـەی (سـوودی نیـە) ئەگـەر تـۆ حـەفتا جاریش داوای بەخشینیان بۆ بکەی، خوا هەرگیز لێتـان خـۆش نـابێ. مـن زیـاتر لـە حـەفتا جـار داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەم!) (عومەر) گوتی: ئەوە دووڕووە،ئەڵێ: نوێژی لەسەر کرد خـودا ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾ هەر کەسێکیان لێ بمرێ، نابێ نوێـژی لەسـەر بکـەیو لەسـەر گـۆڕی ڕامەوەسـتە، ئەوانـە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکەی نەبوو کە مردیشن لە ڕێلادەر بوون.[1] ڕیوایەت کراوە لە فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب خۆیەوە دیسان بەم شێوەیە[2] کە تێیدا هـاتوە:ئـەڵێ: پاشـان (پێغەمبـەر(ﷺ)) نوێژی لەسەر کردو لەگەڵی ڕۆشتو لەسەر گۆڕەکەیشی ڕاوەستا هەتا لێبوونەوە لێی،ئـەڵێ: لـە بـوێری خـۆم بەرانبـەر پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) زۆر سـەرم سـوڕما، خـوداو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) چـاکتر دەزانن،جائەڵێ: سوێند بە خوا ماوەیەکی کەم نەبێ تێنەپەڕی ئەم دوو ئایەتە هاتـە خـوارەوە: ﴿تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ﴾ دوای ئـەوە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) نوێـژی لەسـەر دووڕوو نەکردو لەسەر گۆڕیشی ڕانەوەستا هـەتا خـودای گـەورە بردیـەوە بـۆ لای خـۆی[3] تیرمیـزیش هـەر بـەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیرەکەیداو ئەڵێ: فەرموودەیەکی ڕاستە،[4] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە.[5]

---

[1] فتح الباري (١٨٤/٨).

[2] فتح الباري (١٨٥/٨).

[3] أحمد (١٦/١)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[4] تحفة الاحوذي (٤٩٥/٨)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[5] فتح الباري (١٨٤/٨).

﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾
وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ
ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾

**زەمی دواکەوتوانِ لە جیهاد**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ ماڵو منداڵی زۆریان بەلاتەوە گرنگ نەبێ، خودا دەیەوێ هەر بەمانە لە دنیا سزایان بداتو بە بێ دینی گیانیان دەرچێ. پاشان خودای گەورە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ لێیانو زەمی ئەو کەسانە دەکات کە خۆیان لە جیهاد لاداو مانەوەو گوێیان بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) نەدا بچنە غەزا، تواناشیان هەبوو خاوەن دەسەلاتو سامانیش بوون، کەچی داوای ئیزنیان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە بمێننەوەو دەرنەچن. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴾ کاتێ سورەتێ دێتە خوار کە باوەڕ بە خوا بهێننو لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا بچنە غەزا، خاوەن دەسەلاتەکانیان دێن ئیزن لە تۆ دەخوازنو دەڵێن: واز لە ئێمە بێنە، با ئێمەش لە ماڵ بمێنین وەك ئەوانەی لە ماڵ دانیشتوون. ڕازی بوون ئەو شورەییە بەسەر خۆیاندا بێننو لەناو ژناندا لەوێدا دانیشنو بمێننەوە، دوای دەرچوونی سوپاکە، ئەوانە کاتێ کە شەڕ ڕوونەدا ترسەنۆکترین کەسن خۆ ئەگەر ئاشتیش بوو، لە هەموو کەسێ قسە زۆرتر دەکەن، وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾[1] هەرکاتێ ترس دێتە بەر، دەیانبینی هەر زەق لە تۆ دەڕوانن چاویان سپی هەڵدەگەڕێ، وەك یەکێ لە ترسی مردن بێ هۆش بووبێ، وەختێ ترسیش بەسەردەچێ زمانتان لێ دەکێشنو دەست بە زمان درێژی دەکەن. خودای گەورەیش لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُۙ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ

---

[1] الاحزاب (١٩).

﴿فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾[1] ئەوانەی خاوەن باوەڕن دەڵێن: بۆچی سورەتێك نایەتە خوارەوە؟ پاشان کە سورەتێکی بتەو هاتو باسی غەزای کرد، تۆ ئەوانەی کە نەخۆشی لە دڵیاندایە دەبینی، وات سەیر دەکەن، وەك کەسێ لە ترسی مردن تووشی فێدای هاتبێ، بۆ ئەوانە وا باشترە. بەرفەرمان (گوێڕایەڵ) بوونایەو قسەی چاکیان بکردایە. خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ مۆر نراوە بەسەر دڵیاندا. واتە: بەهۆی گوێنەدانیان بە غەزا لە ڕێی خوداو دەرنەچونیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ ئەوانە هیچ تێ ناگەن، نازانن چی چاکە بۆیان هەتا بیکەن‌و چیش زیانبەخشە بۆیان هەتا دوورکەونەوە لێی.

﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾﴾

**وەسفی خاوەنباوەڕان‌و پاشەڕۆژیان**

دوای ئەوەی خودای گەورە زەمی دووڕووەکانی کرد دێتە سەر باس‌و وەسفی خاوەن باوەڕان‌و پاشەڕۆژیان لەو دنیاداو ئەفەرموێت: ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ بەڵام پێغەمبەری خوداو ئەوانەی لەگەڵ ئەودان‌و باوەڕدارن بە ماڵ‌و گیان چوونە غەزا، خۆشی‌و چاکی بۆ ئەوانەو ئا ئەوانە ڕزگاربووەکانن. خودا باغاتێکی بۆ ئەوانە ئامادە کردوە کە جۆباریان بەبەردا دەڕواو تا هەتایە تێدا ئەبن، ئەمەیە دەسکەوتی گەورە لە ڕۆژی دوایدا لە باغاتی فیردەوس‌و پلە بەرزەکاندا.

﴿وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾﴾

**باسی ئەو عەرەبانەی بیانویان هەبو هاتن داوای ئیزنیان کرد**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ﴾ عەرەبی دەشتەکی هاتون بیانوو دەهێننەوە تا ئیزنیان بدەی نەچن بۆ غەزا. باسی حاڵی خۆیان دەکەن بێ هێزو لاوازو نەخۆشن، ناتوانن دەرچن بۆ غەزا، ئەوانە هەندێ عەرەبی دەوروبەری مەدینە بوون، زەححاك ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە، ئەم ئایەتەی دەخوێند: (وجاء المعْذِرونَ) بێئەوەی(عەین‌و زالەکە) (شدّە)یان بداتێ

---

[1] محمد (٢٠-٢١).

واتە: ئەوانەی بیانویان هەیە. چونکە ئەوە دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی دانیشتن‌و درۆیان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی. واتە: ئەش هاتن داوای ئیزن بکەن خودای گەورەش هەڕەشەی سزای بە ژانیان لێ دەکات‌و ئەفەرموێت: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی خوانەناسن لەناو ئەمانەدا (بەم زووانە) تووشی سزایەکی بە ژان دەبن.

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾﴾

**باسی بەهانەی شەرعی بۆ هاوبەشی نەکردن لە جیهاددا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ لەسەر ئەوانەی بێهێزو نەخۆشن و ئەوەندە شك نابەن خێرات بکەن تاوانێك نیە، لێرەدا خوای گەورە باسی ئەو بەهانانە دەکات کە بە تاوان نازمێردرێت لەسەر ئەو کەسانەی کە بە هۆیانەوە ناچنە غەزا، هەندێ لەو بەهانانە کە هەمیشە پێیەوە گیرۆدەن، بێهێزیو لاوازیە کە هیوای چاکبوونەوەی لێناکرێت‌و جەنگیشی پێوە ناکرێت، لەوانە کوێری‌و شەلی‌و وێنەیان، یان تووشی نەخۆشی هاتوون‌و ناتوانن بچنە دەرەوە بۆ غەزاکردن لە ڕێی خوادا، یان لەبەر هەژاری توانای خۆئامادەکردنی نیە بۆ جەنگ، ئەمانە هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە، ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەگەر ئەوانە بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی دڵسۆزی بکەن و دانیشن و نەچن بۆجیهاد و دڵسۆزبن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی لەکاتی دانیشتنەکەیاندا و خەڵکی نەترسێنن و دڵیان سارد نەکەنەوە، (نەك هەر گوناهیان ناگات بەڵکو) ئەوەکارێکی چاکەلەوکاتەدائەوانەدەیکەن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هیچ گلەییەك لەسەر چاکەکاران نیە، خودا لە گوناه دەبوورێت‌و دلۆڤانە. ئەوزاعی دەڵێت: خەڵکی چوونە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە، بیلالی کوڕی سەعد لەنێوانیاندا هەڵساوسوپاس‌و ستایشی خودای کردوپاشان وتی: ئەی ئەوانەی کە کۆبوونەتەوە! ئایائێوە نین کە دان بە تاوانەکانتاندا دەنێن؟ وتیان: ئەخوا هەقە، بەڵێ، وتی: ئەی

خودایە ئێمە گوێمان لێبووە کە فەرموویەتە: ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾ ئەی خودایە دانمان ناوە بە تاوانەکانماندا لێمان خۆشبەو بەزەییت پێماندابێتەوەو بارانمان بۆ ببارێنە، هەردوو دەستی بەرزکردبووەوە خەڵکەکەیش دەستیان بەرزکردبووەوە و زۆری نەبرد بارانیان بۆ باری.[1] عەوفی دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا. ئەوەبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا کە خەڵکی بێن‌و بچن بۆ غەزا، دەستەیەك لە هاوەڵەکانی هاتن یەکێك لەوانە عەبدوڵلای کوڕی مەعقەلی کوڕی موغەففەلی موزەنی بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵمانگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(سوێند بە خوا هیچ شتێك شك نابەم هەڵتانگرم لەسەری) پشتیان هەڵکرد و دەستیان بەگریان کرد. زۆر بە لایانەوە گران بوو کە دانیشن‌و نەچن بۆ جیهاد، نە خەرجیان هەیەو نە وڵاغی سواری، کاتێك خودای گەورە ئەو سوربوونەیانی بینی لەسەر خۆشەویستی خۆیی‌و خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوەو باسی(بەهانەکەی) کرد لە کتێبەکەیدا فەرمووی: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[2].

واتە: لەسەر ئەوانەی بێهێزو لەش بەبارو ئەوانەی ئەوەندە شك نابەن خێرات بکەن، تاوانێك نیە، ئەگەر ئەوان بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی دڵسۆزبن، هیچ گلەییەك لەسەر چاکەکاران نیە، خودا لە گوناھ دەبوورێت‌و دلۆڤانە. هیچ گلەیش لەوانە ناکرێت کە هاتنە لات هەڵیانگری‌و وتت: وڵاغم نیە هەڵتان بگرێت، لە خەمباریدا فرمێسك لە چاویان دەهاتەخوارەوەو گەڕانەوە. چونکە هیچی وایان نەبوو بیبەخشن ڕێی قسە هەر لەسەر ئەوانەیە کە دەوڵەمەند بوون‌و مۆڵەتیان لێدەخواستن بەوە ڕازی بوون لەگەڵ بەجێماوەکان بن، خودا مۆری ناوە بەسەر دڵیانداو هیچ تێناگەن. موجاهد لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر بەنی موقرین لە موزەنیەکان هاتە خوارەوە.[3] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حەسەنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەڕاستی لە مەدینەدا کۆمەڵە کەسێکتان بەجێهێشتووە هیچ خێرێکتان نەکردووەو هیچ

[1] ابن أبي حاتم (٦/١٨٦٢).
[2] الطبري (١٤/٤٢٠).
[3] الطبري (١٤/٤٢١).

شیوێكتان نەبڕیوەو هیچ دەستكەوتێكتان لە دوژمن وەدەست نەهێناوە ئەوان هاوبەشتان نەبوون لەو پاداشتەدا)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾.[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە ئەنەس ڕیوایەتی كردووە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەڕاستی لەناو مەدینەدا كۆمەڵە خەڵكێك هەن، ئێوە هەر شیوێكتان بڕیبێتو هەر قۆناغێك ڕۆیشتبن حەتمەن ئەوانە لەگەڵتانبوون)، وتیان: ئەوانەی لە مەدینەن؟ فەرمووی:(بەڵێ، بەڵام(بەهانە) گەلی داونەتەوە).[2] پاشان خوای گەورە وەڵامی بڕوبیانووی ئەوانە دەداتەوە كە داوای مانەوەیان كردووەو دەوڵەمەند بوون، سەرزەنشتیان دەكاتو ئاگاداریان دەكاتەوە كە ڕازی بوون لەگەڵ ئەو ژنانەدا كە ماونەتەوە بەجێ هێڵراون لەو كۆچەدا دەفەرمووێت: ﴿وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ۖ فَإِن تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾﴾

**باسی فڕوفێڵی دووڕووەكان**

خوای گەورە باسی دووڕووەكان دەكات، كاتێك كە موسڵمانەكان گەڕانەوە بۆ مەدینە دێنو عوزرخواییان بۆ دێننەوەو دەفەرمووێت: ﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ كاتێك دەگەڕێنەوە بۆ لایان، عوزرخواییتان لێدەكەن، بڵێ: هیچ عوزری پێ ناوێت، ئێمە بڕواتان پێ ناكەین، خودا لەبارەی ئێوەوە خەبەری پێداوین، خوداو پێغەمبەری خودا كردەوەكانتان دەبینن لە پاشان دەبرێنەوە بۆ لای ئەو(خوایە) لە ئاشكراو پەنهانیەكان ئاگادارە، ئەوسا ئاگادارتان دەكات كە چ كارێكتان كردووە، واتە: ئاگادارتان دەكات لەو

[1] ابن أبي حاتم (٦/١٨٦٣)، فەرموودەیەكی مورسەلە.

[2] فتح الباري (٧/٧٣٢)، مسلم (١٩١١).

کردەوانەی کە کردووتانە لە چاکەو لە خراپە پاداشتتان دەداتەوە لەسەری. پاشان خوای گەورە باسی دووڕووەکان دەکات بۆ خاوەنباوەڕان کە دێن بۆ لایان‌و سوێندیان بۆ دەخۆن‌و غوزرخواییان بۆ دەهێننەوە کە چاوپۆشیان لێبکەن‌و سەرزەنشتیان نەکەن، وەك سوکایەتی پێکردنێك ڕوویان پێ مەدەن چونکە ئەوانە دڵ‌و دەروون و بیروبۆچوونیان پیس‌و بۆگەنەو پاشەڕۆژیان هەر لەناو ئاگری جەهەنەمە. هەر شایەنی ئەو سزا سەختەن وەك فەرموویەتی: ﴿سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ هەر کاتێك ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ لایان، سوێندتان بۆ دەخۆن بە خودا بۆ ئەوەی چاوپۆشیان لێ بکەن ئێوەش ڕوویان لێ وەرگێڕن بە ڕاستی ئەوانە پیسن‌و لە سزای کردەوەکانیان، جێگایان ناوەڕاستی جەهەنەمە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ سوێندتان بۆ دەخۆن کە ئێوە لە خۆیان ڕازی بکەن، ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن، خودا لە گرۆی لەڕێلادەر ڕازی نابێت. واتە: خودا ئەوانەی لە ڕێی خواناسی‌و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی لادەدەن و لەفەرمان دەردەچن، چونکە(الفسق) لادان‌و دەرچوونە. هەربۆیە مشك ناونراوە بە(فاسق) و لاسارو لادەر، چونکە لە کونەکەی دێتە دەرەوە بۆ لاساری‌و خراپەکاری. وتووشیانە:(فَسَقَت الرُّطَبَة) کاتێك لە گلێپکەکەی خۆی دێتە دەرەوە.

﴿ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾
وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٩٨﴾
وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ
ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٩﴾﴾

**عەرەبە دەشتەکیەکان زۆر خوانەناس‌و دووڕوون**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ عەرەبە دەشتەکیەکان بێباوەڕی‌و دووڕووییان بەهێزترەو شایستەترن کە ئەو سنوورانەی خودا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی نەزانن. خوای گەورە لێرەدا باسی عەرەبە دەشتەکیەکان دەکات لە خوانەناس‌و دووڕوو خاوەن باوەڕەکان کە خوانەناس‌و دووڕووییان زۆر بەهێزو گەورەترە لە خەڵکی تر، وە شایەنی ئەوەن کە ئەو سنوورانەی خودا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی نەزانن‌و لێی شارەزا نەبن وەك ئەعمەش دەڵێت لە ئیبراهیمەوە: عەرەبێکی دەشتەکی

لە لای زەیدی کوڕی سوحان دانیشتبوو، زەید بۆهاوەڵەکانی قسەی دەکرد کە لە ڕۆژی نەهاوەندا دەستی بریندار بووبوو عەرەبە دەشتەکیەکە وتی: بە خوا قسەکانت زۆر سەرەنجم ڕادەکێشێت، بەڵام دەستەکەت زۆر گومانم بۆ دروست دەکات. زەید وتی: چی گومانت بۆ دروست دەکات لە دەستم لەبەر ئەوەی چەپە؟. عەرەبە دەشتەکیەکە وتی: بە خوا نازانم، ئایا ڕاست دەبڕن یان چەپ؟ زەیدی کوڕی سوحان وتی: خوا ڕاستی فەرمووە: ﴿ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾.[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەباسەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی لە بیاباندا ژیا دڵی ڕەقت ئەبێت، ئەوەی شوێنی نێچیرەکەوت ئاگای لە هیچ نامێنێت، ئەوەیش هاتە لای خاوەن دەسەڵات تووشی تاقیکردنەوە دەبێت).[2] ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: چاکو غەریبە.[3] کاتێك ئەو عەرەبە دەشتەکیە ئەو دیاریەی کردە خەڵاتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) دوو ئەوەندەی دیاریەکەی خۆی پێ بەخشی هەتا ڕازی بێت، فەرمووی:(بەڕاستی ویستم دیاری وەرنەگرم تەنها لە قورەیشی یان لە سەقەفی یان لە ئەنساری یان لە دەوسی نەبێت). لەبەر ئەوەی نیشتەجێی شارەکانی مەککەو تائفو مەدینەو یەمەنن، چونکە ئەوانە ڕەوشتیان نەرمونیانترە لە عەرەبی دەشتەکی، عەرەبی دەشتەکی دڵڕەقیو زبریەکیان تێدایە.[4] ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ خودا زانای کاربزانە. واتە: باش دەزانێك کێ شایەنی ئەوەیە شارەزای باوەڕو زانیاری بکات، کاربزانە لە دابەشکردنی زانیاری و نەفامی و باوەڕ و خوانەناسیو دووڕوویدا عەبدەکانیدا، پرسیاری لێناکرێت لەوەی دەیکات لەبەر زانیاریو لەکاربزانی، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِ﴾ هەندێك لەو دەشتەکیانە هەرچی ببەخشن وادەزانن باجیان لێ سەنراوە چاوەڕوانی دەرفەتێکن کە بەڵایەکتان بەسەر بێت، بەڵا هەر بەسەر خۆیان بێت. واتە: ئەوانە ئەگەر شتێك ببەخشن لە ڕێی خوادا بە سەرانەو زەرەری دەزانن چاوەڕوانی بەڵایەکن تووشتان ببێت، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر تووشی خۆیان دێت، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ خودا بیسەرو زانایە، دووعای عەبدەکانی خۆی دەبیسێو دەزانێت کێ شایەنی سەرکەوتنەو کێش شایەنی سەرشۆڕیو ژیانە.

[1] الطبري (٤٢٩/١٤).

[2] احمد (٣٥٧/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] ابو داود (٢٧٨/٣)، تحفة الأحوذي (٥٣٢/٦)، النسائي (١٩٥/٧)، حەسەنە.

[4] النسائي (٢٨٠/٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

**هەندێك لە عەرەبە دەشتەكیەكان خواناس و هەندێ بەخشندەن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ﴾ هەر لەناو ئەو دەشتەكیانەشدا هی وا هەیە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیەو هەرچی لەم ڕێیەدا دەبەخشێت بۆ نزیكی لە خودایەو بۆ ئەمەیە كە پێغەمبەر بە نزا لەبیریان نەكات. ئەمانە لەو عەرەبانەن ستایش كراون، كە ماڵو سامانی خۆیان بەخشیوە لە ڕێی خودا بۆ ئەوەی لە خودا نزیك ببنەوە، بەو ماڵو بەخشینە، وە بە هیوای دوعای پێغەمبەریشن بۆیان. ﴿أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ﴾ با بزانن بەو زووانە نزیك دەبنەوە لە خوداو ﴿سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ دەیانخاتە بەر بەزەیی خۆی، خودا دیارە گوناه بەخشو دلۆڤانە.

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾

**ڕێزو قەدری كۆچەری و ئەنساریەكان و ئەوانەی شوێن پێی ئەوانیان گرتەبەر بە چاكی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ خودا لەوانەی هەر پێشوو ئاوارە بوون و لەوانەش كە یاریدەدەر بوون، لەوانەش لە چاكەدا شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرتووە، ڕازی بووەو ئەوانیش لە خودا ڕازین و باغاتێكی بۆ سازدان جۆباریان بەبەردا دەڕوات و تاهەتایی تێیدا دەبن و ئەمەیە دەسكەوتی گەورە. خوای گەورەباسی ڕازی بوونی خۆی دەكات لە كۆچەری و یاریدەدەرو ئەوانەی شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرتووە لە چاكەدا، خوا لێیان ڕازییە وە ئەوانیش لە خوا ڕازین، وە باغاتێكی بۆ وەدیهێناون كە پڕە لە خۆشی و خۆشگوزەرانی بەردەوام و نەبڕاوە، شەعبی دەڵێت: مەبەست بە پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچەران و یاریدەدەران: ئەوانەن كە ئامادەی(پەیمانی ساڵی حودەیبیە)بوون[1]. ئەبو موسای ئەشعەری و سەعیدی كوڕی موسەیەب و موحەمەدی كوڕی سیرین و حەسەن و قەتادە وتوویانە: ئەو كەسانەن كە ڕووەو هەردوو قیبلەكە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نوێژیانكردووە[2]. ئەوەبووخوای گەورە فەرمووی كەلە پێشكەوتووە یەكەمەكان لە كۆچەران و یاریدەدەران و ئەوانەیش بەڕێی ئەواندا ڕۆیشتوون لە چاكەدا، واوەیلا بۆ ئەو كەسانەی

---

[1] الطبري (٤٣٥/١٤).

[2] الطبري (٤٣٥/٤٣٧/٤٣٦/١٤).

ڕقیان لێیان بووەو قسەیان پێ وتوون یان ڕقیان لە هەندێکیان بووەو قسەیان پێ وتوون، بە تایبەتی گەورەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەچاکترین و بەڕێزترینیانە مەبەستم ڕاستگۆی گەورەو جێنشینی مەزن(ئەبوبەکری کوڕی قوحافەیە(ڕەزای خوای لێبێت))، چونکە ئەو دەستە دۆڕاوە لە ڕافیزەکان دوژمنایەتی بەڕێزترین هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن و ڕقیان لێیانەو قسەیان پێ دەڵێن، پەنادەگرین بە خودا لەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕافیزیانە ئاوەزیان پێچەوانەیەو دڵەکانیان وەرگەڕاوە، ئەوانە بڕوایان بە قورئان ئەبێ چی بێت؟ کاتێك کە قسە دەڵێن بەوانەی خوا لێیان ڕازی بووە. بەڵام ئەهلی سوننەت، ئەوان ڕازین لەوانەی کە خودا لێیان ڕازی بووەو قسە دەڵێن بەو کەسانەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) قسەیان پێ وتوون، وە دۆستی ئەو کەسانەن کە دۆستی خودان و دوژمنایەتی ئەو کەسانە دەکەن کە دوژمنایەتی خودا دەکەن، ئەوان شوێنپێی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەگرن بە ئارەزووی خۆیان شت دابهێنن و شوێن فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەر(ﷺ) ئەکەون نەك هەر لە خۆیانەوە چیان بوێت بیکەن، هەر ئەوانە کۆمەڵی خودان و ڕزگارن و عەبدە خاوەن باوەڕەکانی خودای گەورەن.

﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ (١٠١) ﴾

**دەشتەکیە دووڕووەکان و شاری مەدینە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ ﴾ لەو عەرەبە دەشتەکیانەی کە لە دەوروبەری ئێوەن هەندێکیان و هەندێکیش لە خەڵکی مەدینە دووڕوون و هەر بە دووڕوویی ڕاهاتوون. خوای گەورەهەواڵ دەدات بە پێغەمبەرەکەی خۆی(ﷺ) لەو عەرەبانەی دەوروبەری مەدینەو هەندێ لە خەڵکی مەدینەیش هەر دووڕوون، ﴿مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ﴾ یانی: وازیش ناهێنن و بەردەوام دەبن لەسەر دووڕوویی و لەسەری ڕاهاتوون، لەم مانایەدا کە ئەوترێ:(شیطان مَریدو مارد) وە وتراویشە:(تمرد فلان علی الله) واتە: فلان یاخی بووە لە خواو لووتی بەرزە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ﴾[1]. ئەگەر حەزمان بکردایە، دەمانهێنایە بەرچاوت ئیتر هەر بە وردبوونەوە لە بیچمیان باش دەتناسین، بەڕاستی هەر بە شێوازی قسەکردنیشیاندا دەیانناسین. ئایەتی﴿لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾

---

[1] محمد (٣٠).

ناسازینییه لەگەڵ ئەمەی کە خوا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ﴾ چونکە ئەمە لەجۆری(قیافە تناسی)یە بەو ڕەوشتانەدا کەتێیاندایە ئەکرێ بناسرێنەوە، نەك زمانی ئەوەی هەمووئەو دووڕووانەی کە لەلای ئەون ئەم دەناسێت و ناوەکانیان دەزانێت! پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەندێ لەو دووڕووانەی خەڵکی مەدینەی دەناسی کە لەگەڵیدا هەڵسوکەوتیان دەکردو بەیانیان و ئێواران دەیبینین. وەك لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە پێشەوە باس کرا: ﴿وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟﴾[1]. خەیاڵیاندابووە سەرشتێك، بۆیان نەلوا پێکی بێنن. کە پێغەمبەر(ﷺ) حوزەیفەی ئاگادار کردبوو لە چواردە یان پانزە پیاوی دووڕووی ناودار، ئەمە شتێکی تایبەتیەو ئەوە ناگەیەنێت کە پێغەمبەر(ﷺ) هەموو ناوەکان و کەسەکانی ناسیوە والله أعلم. عبدالرزاق دەڵێت: موعەمەر هەواڵی داینێ لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا وتوویەتی: ئەوە هەندێ خەڵك چییانە زۆر لەخۆیاندەکەن بۆناسینی خەڵکی و دەڵێن: فلانەکەس لە بەهەشتدایەو فلانە کەس لەناو ئاگردایە، لەکاتێکدا ئەگەربپرسی لە یەکێکیان دەربارەی خۆی دەڵێت: نازانم، دەی سوێند بەخودا تۆ لەحاڵی خۆت باشترشارەزای تا حاڵی خەڵکی، تۆ لە شتێکدا زۆر لەخۆت ئەکەی کە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێبێت) لە پێش تۆوە ئەو زۆرەیان لەخۆیان نەکردووە، پێغەمبەری خودا نوح(سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾[2]. من چوزانم کە ئەوان لە پێشدا چیان دەکرد؟ وە پێغەمبەری خودا شوعەیب(سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾[3]. من ئێشکگرو پاسەوانی ئێوە نیم. وە لێرەشدا خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾.[4] تۆنایانناسیت، ئێمە ئەیانناسین، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾ دوو جار ئازاریان دەدەین، موجاهد دەڵێت: بە کوشتن و دەستبەسەری ئازاریان دەدەین. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: بە برسیەتی و سزای ناوگۆڕ ئازاریان دەدەین. ﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ لە دواییدا دەیانخەینە بەر سزای زۆر دژوار.[5] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێت: یان لە دنیادا سزا

---

[1] التوبة (٧٤).

[2] الشعراء (١١٢).

[3] الانعام (١٠٤).

[4] عبدالرزاق (٢/٢٨٥).

[5] الطبري (١٤/٤٤٢).

ئەدرێن بەهۆی ماڵو منداڵەوە، جائەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾[1] واتە: سەیرت نەیەت لە دارایی‌و منداڵانێك کە هەیانە، خودا دەیەوێت لە دنیادا بەمانە ئازاریان بدات، ئەو گیروگرفتەی تووشیان دێت بە هۆی ماڵو منداڵەوە سزایە بۆیان. بەڵام بۆ خاوەن باوەڕ پاداشتە، بەڵام جەزرەبەی ناو ئاگریش ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدایە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ دەڵێت: واتە: ئاگر[2].

﴿وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾﴾

**باسی ئەو خاوەن باوەڕە دواکەوتووانە لە جیهاد بەهۆی تەمەڵییەوە**

دوای ئەوەی خوای گەورە باسی حاڵی ئەو دووڕووانەی کرد دواکەوتن لە غەزاو بەهۆی خوانەناسی‌و بەدگومانیانەوە، دێتە سەر باسی ئەو تاوانبارانەی کە لەبەر تەمبەڵی‌و حەز لە ئیسراحەت کردن دواکەوتن، لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەن باوەڕبوون‌و ئیسلامیشیان بە هەق دەزانی دەفەرمووێت: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هی وایش هەن دانیان ناوە بە گوناهەکانی خۆیاندا، کارێکی باش‌و یەکێکی خراپیان تێکەڵ کردووە، بەڵکو خودا تۆبەیان لێ قەبوڵ بکات، خودا لە تاوان دەبووریێت‌و دلۆڤانە. واتە: ئەوانەی دانیان بە گوناهەکانیاندا ناوەو لە نێوان خۆیان‌و خودای خۆیاندا کرداری چاکیشیان کردووەو ئەمەخراپەشیان تێکەڵاوی ئەو چاکانە کردووە، ئەوانە کەوتوونەتە ژێر سۆزو بەزەیی‌و لێبوردەیی خوداوە. ئەم ئایەتە هەرچەندە لەسەر کەسانێکی دیاریکراو هاتووەتە خوارەوە، بەڵام گشتگیرەو هەموو تاوانبارێك دەگرێتەوە کە هەڵەیان کردووەو چاکەو خراپەیان تێکەڵاو کردووە. ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿وَءَاخَرُونَ﴾ لەسەر ئەبو لوبابەو کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە خوارەوە کە لەغەزای تەبوکدا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دواکەوتن، هەندێك وتوویانە ئەبو لوبابەو پێنج کەسی تریش بوون لەگەڵی. وە وتراوە: حەوت کەسی لەگەڵ بووە، وە وتراویشە نۆ کەسی لەگەڵدا بووە، کاتێك کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزاکەی گەڕایەوە، خۆیان شەتەك دا بە کۆڵەکەی مزگەوتەوەو سوێندیان خوارد کە هیچ کەسێك نابێت بیانکاتەوە پێغەمبەری خودا نەبێت(ﷺ) کاتێك خوای گەورەئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ﴾ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەری دان‌و عەفووی کردن.[3] بوخاری

---

[1] التوبة (٥٥).

[2] الطبري (١٤/٤٤٤).

[3] الطبري (١٤/٤٣٧).

ڕیوایەتی کردووە لە سەمورەی کوڕی جوندویەوە دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێیمان:(ئەم شەو دوو کەس بەڕێیان کردم هەتا گەیاندمیانە لای شارێك بە خشتی ئاڵتونیو خشتی زیو دروست کرابوون، چەند پیاوێکمان پێگەیشت لایەکی پێکهاتەی(لاشەیان) بە چاکترین شێوە کە تۆ چاوت پێی کەوتبێت وابوو، لاکەی تریان بە ناشرینترین شێوە وابوو کە تۆ چاوت پێی کەوتبێت، پێیان وتن: بچن خۆتان بخەنە ناوە ئەو ڕووبارە، خۆیان خستە ناوی، پاشان گەڕانەوە بۆلامانو ئەو ناشیرینیەیان پێوە نەمابوو، وایان لێهات بوونە جوانترین وێنە، پێیان وتم: ئەمە بەهەشتی عەدنە ئەوەیش شوێنی تۆیە، وە وتیان: بەڵام ئەو کۆمەڵەی لایەکیان جوان بوو، لایەکیان ناشیرین بوو، کارێکی چاکیان تێکەڵاوی یەکێکی خراپ کردبوو خودا چاوپۆشی لێکردن).[1] هەر بەم شێوەیە بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە کورتی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾﴾

### فەرماندان بە وەرگرتنی زەکاتو سوودەکانی

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە سەدەقە لەماڵو سامانی موسڵمانەکان وەربگرێت، پاكو خاوێنیان بکاتەوە پێی، ئەم ئایەتە گشتگیرەو هەرچەندە هەندێ لە زانایان زەمیرەکەیان گەڕاندووەتەوە بۆ ﴿أَمْوَٰلِهِمْ﴾ واتە: بۆ ئەوانەی دانیان نا بە تاوانەکانیانداو کاری چاکیان کردبوو هی خراپیشیان تێکەڵاو کرد، بۆیە هەندێ لەوانەی کە زەکاتیان نەدەدا لە عەرەبەکانی دەوروبەری مەدینە بڕوایان وابوو کە زەکات نابێت بدرێت بە پێشەوای موسڵمانان، بەڵکو تەنها ئەو زەکات دانە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وە ئەم ئایەتەیان کردبووە بەڵگە لەسەر زەکات نەدان: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم﴾ لەو داراییەی کە هەیانە سەدەقەیان لێ وەربگرە، تا بەوە پاكو خاوێنیان بکەیتەوە. بۆیە ئەبوبەکری سیدیقو هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی ئەو بۆچوونە خراپەیان دانەوەو قوبوڵیان نەکردو شەڕیان لەگەڵ کردن هەتا ناچاریان کردن کە سەدەقە بدەن بە پێشەوای موسڵمانان وەك چۆن دەیاندا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەتا ئەوەبوو ئەبوبەکری سیدیق پێی وتن: سوێند بە خودا ئەگەر کارێکم نەدەنێ، لەڕیوایەتێکی تردا(سەرەگوریسێك) کە دەیاندا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێستا نەیدەن شەڕیان لەگەڵدا دەکەم لەسەر نەدانی.[2] ﴿وَصَلِّ

[1] فتح الباري (١٩٣/٨).

[2] فتح الباري (٢٦٤/١٣).

عَلَيۡهِمۡ﴾ نزای باشیان بۆ بکە، واتە: دوعایان بۆ بکەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، وەك ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفاوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك سەقەدەی هەر هۆزێکی بۆ بهاتایە نزای بۆ دەکردن، باوکم هات بۆ لای سەدەقەکەی خۆی بۆ هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەی خودایە خۆش ببە لە کەسوکاری ئەبی وەفا).[1] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ﴾ نزای تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)) ئارامیە بۆ ئەوان، هەندێ خوێندوویانەتەوە بە(صلواتك) بە جەمع، هەندێکیش بە موفرەد خوێندوویانەتەوە، ﴿سَكَنٞ لَّهُمۡۗ﴾ ئیبنوعەباس دەڵێت: بەزەییە بۆیان.[2] ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودای بیسەرو زانایە، بە نزاکانتو دەزانێت کێ شایەنی ئەو نزای تۆیە(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بۆ کێش دەشێت بۆی بکەی. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چۆن دەبێت نەیانزانیبێت خودا تۆبە لە عەبدی خۆی قەبوڵ دەکاتو سەدەقەشیان لێ وەردەگرێتو خودا تۆبە قەبوڵ دەکاتو دلۆڤانە؟ ئەمە خۆی هەڵنانو پاڵ پێوەنانە هەتا خەڵکی پەلە بکەن لە تەوبەکردنو سەدەقەکردندا کە هەردووکیان دەبنە هۆی سڕینەوەی گوناهو لایدەباتو نایهێڵێت، خودای مەزنیش فەرموویەتی کە هەر کەسێك تۆبە بکات لێی خۆش دەبێت، وە هەر کەسێك سەدەقە بکات لە ماڵی حەڵاڵ، گومانی تێدا نیە خودا لێی وەردەگرێت بەدەستی ڕاستیو زیادیشی دەکات بۆ خاوەنەکەی هەتا دەنکە خورمایەك بە ئەندازەی کێوی ئوحودی لێ دێت). وەك ئەو فەرموودەیەی کە لەو بارەیەوە هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەڕاستی خودا سەدەقە قبوڵ دەکاتو بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێت، گەورەیشی دەکات بۆ کەسێك لە ئێوە وەك چۆن یەکێك لە ئێوە جوانو ماینەکەی گەورە دەکات، هەتا تیکە نانێك بە ئەندازەی ئوحودی لێ دێت). بۆ سەلماندنی ئەم فەرموودەیە خوای گەورەلە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ﴾، وە فەرموویەتی: ﴿يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾[3]. خودا پیتو بەرەکەتی سوود کەم دەکاتەوەو پیتو بەرەکەتی سەدەقە زیاد دەکات. لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: بێگومان سەدەقە دەکەوێتە دەستی خوای گەورەلە پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی

[1] مسلم (٢/٧٥٦).

[2] الطبري (١٤/٤٥٧).

[3] البقرة (٢٧٦).

داواکەر پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ﴾[1].

﴿وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾﴾

**هەڕەشەکردن لە یاخیبووان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(ئەی موحەممەد بەوانە بڵێ) کار بکەن، کاری ئێوە بە زووێکی زۆر زوو لە لای خوداو پێغەمبەری‌و خاوەنباوەڕان، دیاری دەدات‌و بەو زووانە دەبرێنەوە بۆ لای زانا بە نادیاری‌و دیاران، ئەوسا ئاگادارتان دەکات کە چۆن کارێکتان کردووە. موجاهد دەڵێت: ئەمە هەڕەشەیەکە.[2] واتە: لە لایەن خوداوە بۆ ئەوانەی کە فەرمانەکانی ئەویان بەجێ نەهێناوە، کارەکانیان بەو زووانە دەخرێتە بەردەم خودای مەزن‌و پێغەمبەرەکەی‌و خاوەنباوەڕان، ئەمەیش بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا دێتەدی وەك فەرمووبەتی: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾[3] واتە: لەو ڕۆژەدا(لەبەردەمی خودا) هەمووتان نیشان دەدرێن، هیچ (کردەوەیەکی) پەنهانتان بەنهێنی نامێنێتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾[4] واتە: لەو ڕۆژەدا کە نهێنی ئاشکرا دەکرێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ﴾[5] واتە: هەرچی لەناو دڵانیشدایە زانران وە لەوانەیشە خوای گەورەهەر لە دنیایشدا ئەوە دەربخات بۆ خەڵکی. بوخاری دەڵێت: عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتێك کرداری چاکی کەسێك سەرنجی ڕاکێشان بڵێن: ﴿ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ واتە: کار بکەن، کاری ئێوە بەو زووانە لای خوداو پێغەمبەرەکەی‌و خاوەن باوەڕان دیاری دەدات.[6] لەم فەرموودەیەدا کە لەم قسەی عائیشە دەچێت، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

---

[1] الطبري (١٤/٤٦٠).

[2] الطبري (١٤/٤٦٣).

[3] الحاقة (١٨).

[4] الطارق (٩).

[5] العاديات (١٠).

[6] فتح الباري (١٣/٥١٢).

لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(نامەقتان نیە کە سەرتان سوڕنەمێنێت لە کردەوەی کەسێك هەتا چاوەڕوانی دەکەن بە چی کۆتایی پێ دەهێنرێت، بەڕاستی کەسی وا هەیە ماوەیەك لە تەمەنی(یان ماوەیەك لە ڕۆژگاری) بە کرداری چاکە بەسەر دەبات، ئەگەر بمردایە دەچووە بەهەشت، پاشان دەگۆڕێتو هەڵدەسێت بە کرداری خراپ، وە بەندەی وایش هەیە ماوەیەك لە ژیانی هەڵدەسێت بە کرداری خراپ ئەگەر بمردایە دەچووە ئاگر، پاشان دەگۆڕێت و هەڵدەسێت بە کرداری چاکە، کاتێك خودا مەیلی چاکەی بە عەبدێکی هەبێت، پێش مردنی بەکاری دەهێنێت)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن بەکاری دەهێنێت؟ فەرمووی:(یارمەتی دەدات(یُوَفِّقُهُ) بۆ کرداری چاك کردنو پاشان لەسەر ئەوە گیانی دەکێشێت).[1] تەنیا ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾

**دواخستنی فەرمانی سێ بەجێماوەکە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ هێندێکیشیان چاوەڕوانی فەرمانی خودان، جا یان سزایان دەدات، یان تۆبەیان لێ وەردەگرێت، خودا زانای کارزانە. ئیبنوعەباسو موجاهدو عیکریمەو زەححاكو کەسانی تریش دەڵێن: ئەوانە ئەو سێ کەسە بوون کە دواکەوتن واتە: لە تۆبەکردن، کە مورارەی کوڕی ڕەبیعو کەعبی کوڕی مالیكو هیلالی کوڕی ئومەییە بوون. کە نەچوون بۆ غەزای تەبوك لە ڕیزی ئەوانە بوون کە لەبەر تەمبەڵیو حەزیان لە ڕابواردنو خۆشگوزەرانیو خۆپاراستنو دانیشتنی ژێر سێبەردواکەوتن، بەدگومانو دووڕوو نەبوون، هەندێ لەوانە خۆیان بەستەوە بە کۆڵەکەیەکی مزگەوتەوە وەك ئەبو لوبابەو هاوەڵەکانی کردیان، هەندێکی تریان وایان نەکرد، ئەمانەیش ئەم سێ کەسەن کە باسیان کراوە، فەرمانی تۆبەی ئەوانە لە پێش ئەمانەدا هاتە خوارەوە، فەرمانی تۆبەکردنی ئەمانیش دواکەوت هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ﴾[2] واتە: خودا لە پێغەمبەرو ئەوانەی دەربەدەرنو ئەوانەی یاریدەدەرن خۆش بووە. وە دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ﴾[3] واتە: دەربارەی ئەو سێ کەسانەش خۆیان لە غەزا (دواخست) بەڕادەیەك ئەم زەمینە فراوانەیان لێ

---

[1] أحمد (٣/١٢٠)، فەرموودەیەکی سەحیحی مەوقوفە.

[2] التوبة (١١٧).

[3] التوبة (١١٨).

هاتەیەك.[1] وەك لەمەویەدوا باس دەكرێت لە فەرموودەكەی كەعبی كوڕی مالیكدا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ئەوانە وان لە ژێر سۆزو بەزەیی خودا، مەیلی خۆریەتی یان سزایان دەدات یان لێیان خۆش دەبێت، بەڵام دیارە بەزەیی خودا لە پێش تووڕەیدایە، ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: خودا دەزانێت كێ شایەنی تۆڵە لێ سەندنەو كێش شایەنی لێبوردنە كارزانە لە كردارو گفتاریدا هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو هیچ پەروەردگارێكیش نیە جگەلەئەو.

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

**مزگەوتی زیانبەخش و مزگەوتی خواناسی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ﴾ ئەوانەش كە مزگەوتێكیان دروست كردووە تا بیكەنە هۆی زیانو خوانەناسی و جیاوازی خستنە نێوان خاوەن باوەڕان و تا ڕوانگەش بێت بۆ ئەوانەی لە پێشوودا دژی خوداو پێغەمبەرەكەی ڕاوەستابوون. هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە، ئەوە لوو لە مەدینەدا(پێش گەیشتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ مەدینە) پیاوێكی خەزرەجی كە پێی دەوترا: ئەبو عامری ڕاهب لە زەمانی نەفامیدا بوویووبە مەسیحی، زانستی ئەهلی كتێبی خوێندبووەوە، لە كاتی نەفامیدا خەریكی خواناسی بوو، ڕێزێكی گەورەی هەبوو لەناو خەزرەجیەكاندا، كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) كۆچی كردو گەیشتە مەدینە، موسڵمانەكان لێی كۆبوونەوەو ئایینی خودا تواناى پەیدا كردو خوای گەورە لەڕۆژی بەدردا سەری خستن. ئەبو عامری لەعین زۆری پێناخۆش بوو دەستی دایە دژایەتی پێغەمبەرو(ﷺ) بە ئاشكراو ڕایكردو چوو بۆ مەككە بۆ لای خوانەناسو بتپەستانی قورەیش، هەڵینان بۆ شەڕكردن لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، كۆبووەوە لەگەڵ ئەو كەسانەی كە هاوڕای بوون لە ڕۆژی ئوحوددا لەگەڵیاندا بوو، ئەوەبوو موسڵمانان ئەوەیان بەسەرهاتو خوای گەورە تاقی كردنەوە بەڵام پاشەڕۆژ هەر بۆ لەخواترسان بوو، ئەو پیاوە لەڕێ لادەرە(ئەبو عامر) چەند چاڵێكی لە نێوان هەردوو ڕیزەكەدا هەڵكەند، پێغەمبەری خودا(ﷺ) كەوتە چاڵێكیانو ئەو ڕۆژە بریندار بوو، دانی پیرۆزی پێشەوەی لای ڕاستی خوارەوەی شكاو سەریشی شكا. لە سەرەتای پێكدادانەكەدا ئەبو عامر خۆی گەیاندە هۆزەكەی لە ئەنسارییەكان و قسەی بۆ كردنو هەڵی نان بۆ ئەوەی یارمەتی بدەنو

---
[1] الطبري (١٤/٣٦٥/٤٦٦).

هاوکاری بن، کاتێك ئەنساریەکان تێگەیشتن لە قسەکانی وتیان: خوا بەخێرت نەهێنێت بۆ لامان ئەی لەڕێلادەر ئەی دوژمنی خودا! قسەی زۆریان پێ وت، ئەویش گەڕایەوە دەیوت: سوێند بە خوا ئەم هۆزەی من دوای من تووشی شەڕ هاتوون. پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێش ئەوەی ڕا بکات(لە مەدینە) بانگی کردبوو بۆ لای خودا قورئانیشی بەسەردا خوێندبوو، بەڵام ئەو قبوڵی نەکردبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نزای لێکرد لە ئاوارەیی‌و دوورەوڵاتیدا بمرێت، ئەو نزایەی لێ گیرابوو، لەبەر ئەوەی کاتێك خەڵکی لە جەنگی ئوحود لێبوونەوەو بینیان کە ئەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵاودەبێتەوەو زیاد دەکات، ئەبو عامیری ڕاهب ڕۆیشت بۆ لای هیرقل پاشای ڕۆم داوای لێکرد یارمەتی بدات و دژی پێغەمبەر(ﷺ) بوەستێت، هیرقل بەڵێنی پێداو ڕێزی لێگرت‌و لە لای مایەوە، نامەی نووسی بۆ کۆمەڵێك لە هۆزەکەی لە ئەنساریەکان ئەوانەی کە خەڵکێکی دووڕوو بەگومان بوون، بەڵێنی پێدەدان و دڵخۆشی دەکردن بەوەی کە بەسوپایەکەوە بەو زووانە پێیان دەگات شەڕیان لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) پێدەکات‌و سەردەکەوێت بەسەریداو وازی پێ دەهێنن لەو کارەی کە خەریکیەتی، فەرمانی پێدان کە بنکەیەکی بۆ دروست بکەن، بۆ ئەوەی هەر کەسێك دێت بۆ لای ئەوان لە لایەن ئەوەوە نامەکانی جێبەجێ بکات‌و ئەو شوێنەش ببێت بە ڕوانگەیەك بۆی، کاتێك گەیشتە لایان دوای ئەوە، دووڕووەکان دەستیان دایە دروستکردنی مزگەوتێك لە نزیکی مزگەوتی (قوباء)وە دروستیان کردو ڕێکوپێکیان کردو لێبوونەوە لێی، پێش دەرچوونی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ تەبووك هاتن‌و داوایان کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە بێت بۆ لایان‌و لە مزگەوتەکەیاندا نوێژ بکات، بۆ ئەوەی ئەو نوێژەی کە تێیدا دەکات بیکەنە بەڵگە لەسەر ڕازی بوون‌و دانپیانانی پێغەمبەر(ﷺ) بەومزگەوتەدا. باسیان کردبوو کە ئەو مزگەوتەیان لەبەر خاتری بێنەوایان‌و هەژاران‌و پەککەوتووان لە شەوانی زستاندا دروست کردووە، خوای گەورە پێغەمبەری پاراست لەوەی کە نوێژی تێدا بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئێمە ئێستا لەسەر سەفەرین، بەڵام ئەگەر گەڕاینەوە). کاتێك کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەبوك گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەوەندەی نەمابوو لەنێوان ئەوو مەدینەدا ڕۆژە ڕێیەك نەبێت یان هەندێ لە ڕۆژێك، جوبرەئیل هاتە خوارەوە بۆلای و هەواڵی مزگەوتی زیراری(مسجد الضرار) پێدا. کە چ نیازێکیان پێی هەیەو بۆچی دروستیان کردووە، بۆئەوەی ببێتە جێی خوانەناس‌و جیاوازی نانەوە لە نێوان کۆمەڵی خاوەنباوەڕان لە مزگەوتەکەیاندا، مزگەوتی قوباء کە دروست کرا هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بناغەی خواناسی دروستکرا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند کەسێکی نارد بۆ ئەو مزگەوتە ڕووخاندیان پێش ئەوەی بگاتە مەدینە. وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا ئەوانە خەڵکێك بوون لە ئەنساریەکان مزگەوتێکیان دروست کرد. ئەبو عامیر پێی وتن: مزگەوتێك دروست بکەن‌و خۆتان ئامادە بکەن هەرچی تواناتان هەیە بیخەنەکارو بە هەموو چەکەکانتانەوە من دەڕۆم بۆ لای پاشای ڕۆم بە

لەشکری ڕۆمەوە دێمو موحەممەدو هاوەڵەکانی دەردەکەم، کاتێك دووڕووەکان مزگەوتەکەیان تەواو کرد هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: لێبووینەتەوە لە دروستکردنی مزگەوتەکە حەز دەکەین نوێژی تێدا بکەی‌و نزامان بۆ بکەی تا پڕخێر بێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾ هەتا دەگاتە: ﴿الظَّالِمِينَ﴾.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ﴾ سوێندیش دەخۆن، جگە لە چاکەکردن نیازێکی ترمان نەبووە. واتە: ئەوانەی کە مزگەوتەکەیان دروست کرد سوێند دەخۆن لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا هیچ نیازێکیان نەبووە جگە لە خێروبێرو بەزەیی بە خەڵکدا نەبێت. خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خودا شایەتە ئەوانە درۆزنن. نیازو مەبەستیان وا نیە، مەبەستیانە خوانەناسی‌و جیاوازی لە نێوان بڕواداراندا پەیدا بکەن. وە بیکەنە ڕوانگەیەك بۆ ئەو کەسانەی لە پێشدا لە دژی خوداو پێغەمبەرەکەی ڕاوەستابوو ئەوەیش ئەبو عامیری فاسقە کەپێی ئەوترا: ڕاهیب(نەفرەتی خوای لێبێت). پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾ هەرگیز لەوێدا نوێژ مەکە. قەدەغە کرا لەسەر پێغەمبەرو(ﷺ) ئوممەتەکەیشی شوێنکەوتووی ئەون لەوێدا هەرگیز نوێژ نەکەن.

## ڕێزی مزگەوتی قوبا و نوێژکردن تێیدا

پاشان خوای گەورە پێغەمبەرەکەی هەڵدەنێت کە نوێژ لە مزگەوتی قوبادا بکات، ئەو مزگەوتەی لە پێشدا لەسەر بناغەی خوداترسی دامەزراوە کە بریتیە لە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی‌و جێی یەکڕیزی باوەڕداران‌و بنکەو شوێنی ئیسلام‌و خەڵکەکەی بووە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ ئەو مزگەوتەی لەپێشدا لەسەر هەستی خوداترسی دامەزرابێت، لەپێشترە کە تۆ نوێژی تێدا بکەی، لەوێ پیاوی وای تێدایە حەز دەکەن بە پاکی بژین، خودا لە پاکان خۆشی دێ، باسەکە باسی مزگەوتی قوبایە هەر بۆیە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(نوێژکردن لە مزگەوتی قوبادا وەك عومرەیەك وایە).[2] وە لە فەرموودەیەکی تری سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری دەدا لە مزگەوتی قوبا بەسواری‌و بە پیادەیش.[3] وە لەم فەرموودەیەشدا هاتووە، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەرەتای گەیشتنیدا قوبای دروست

---

[1] الطبري (١٤/٤٧٠).

[2] ابن ماجه (١/٤٥٢)، الترمذي (٣٢٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٣/٨٢)، مسلم (١٣٩٩).

کردو دایمەزراند و دابەزین لەلای بەنی عەمری کوڕی عەوف، ئەوکەسەی (قبیلەکەی) بۆ دیاریکرد جوبرەئیل بوو[1] (والله أعلم). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوەیمی کوڕی ساعیدی ئەنساریەوە کە بۆی باس کردووە، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لایان لەناو مزگەوتی قوباداو فەرمووی:(خودا بە چاکی باسی پاکژیتان دەکات لە بەسەرهاتی ئەم مزگەوتەتاندا، ئەو پاککەرەوەیەو خۆتانی پێ پاك دەکەنەوەچییە؟ وتیان: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خودا هیچ شتێك نازانین ئەوەنەبێت کە هەندێ دراوسێی جولەکەمان هەن کە خۆیان بەئاو پاکدەکەنەوە کەدەچنە سەرئاو، ئێمەش وەك ئەوان خۆمان بەئاو پاك دەکەینەوە[2]. ئیبنو خوزەیمەش لە سەحیحەکەیدا ئەمەی ڕیوایەت کردووە.[3] خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ﴾ بەلگەیە لەسەر چاکی نوێژکردن لەو مزگەوتانەی لە کۆندا دروست کراون لەسەر ناسینی خودا بە تەنهاو شەریك بۆ دانەنانی، وە لەسەر نوێژکردن بە کۆمەڵ لەگەڵ پیاوچاکانو ئەوانەی هەڵدەسن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا. دەستنوێژی ڕێکوپێك دەگرنو خۆیان پاك دەکەنەوە لە هەموو شتێکی بێزلێکراوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە پیاوێکەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆکردنو (جارێکیان) سورەتی (الروم)ی تێدا خوێند، لێی تێکچوو، کاتێك کە لە نوێژەکە بووەوە فەرمووی: (ئەوەی قورئان خوێندنەکەی پێ هەڵەکردین، ئەوەبوو کۆمەڵێك لەئێوە نوێژمان لەگەڵدا دەکەن نازانن دەستنوێژ بگرن، هەر کەسێك ئامادەی نوێژ بوو لەگەڵمان با دەستنوێژ باش بگرێت).[4] ئەم فەرموودەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە پاکو خاوێنی تەواو ئاسانکاری ئەکات بۆ هەڵسان بە عیبادەت کردنو یارمەتیدەرێکە بۆڕێکوپێك کردنی عیبادەت وهاوکارێکی باشیشە بۆبەرێك و پێکی جێبەجێکردنی ئەو عیبادەتە.

﴿أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾﴾

---

[1] أبو داود (٤٤)، الترمذي (٣١٠٠)، ابن ماجه (٣٥٧).
[2] أحمد (٣/٤٢٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.
[3] ابن خزيمة (١/٤٥)، حەسەنە.
[4] أحمد (٣/٤٧١/٤٧٢)، سەنەدەکانی بەهێزە.

**جیاوازی نێوان ئەم دوو مزگەوتە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ ئاخۆ کەسێك کە بنچینەی مزگەوتەکەی خۆی لەسەر هەستی خواپەرستیو ڕەزای خودا دارِشتبێت چاکترە، یان ئەو کەسەی کە بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری جەهەنەم دانابێت؟ خودا دەستەی ستەمکاران شارەزای ڕاستەڕێ ناکات. خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ئەو کەسەی بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر زیانو جیاوازی دروست کردن لە نێوان موسڵمانانو خوانەناسانو ڕوانگەیەك بێت بۆ ئەوانەی لە پێشوودا دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەیان کردووە، بێگومان ئەوانە بناغەکەیان لەسەر کەناری کەنداوێکی فشۆڵی ڕووخەك داناوە، پاشانیش دەکەوێتە ناو ئاگری جەهەنەم، بەڕاستی خودا ستەمکاران شارەزا ناکاتو کاری خراپەکارانیش ئەنجامی باش نابێت. جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: ئەم مزگەوتەم بینی لەسەر زیان دروست کرابوو دوکەڵی لێ دەردەچوو لە زەمانی پێغەمبەری خودادا(ﷺ).[1] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ ﴾ ئەو خانووەی دروستیان کردووە هەر مایەی نیگەرانیانە، واتە: دڵیان پێی خۆش نیە بە هۆی هەڵسانیان بەو کارە ناشیرینە دڵیان پڕە لە دووڕوویی وەك چۆن گوێرەکە پەرستەکان خۆشەویستی ئەو گوێرەکە چووبووە دڵیانەوە، ﴿إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ﴾ جا مەگەر ئەو دڵانەیان کوت کوت ببێت، واتە: مەگەر بە مردنیان وەك ئیبنوعەباسو موجاهدو قەتادەو زەیدی کوڕی ئەسلەمو سودیو حەبیبی کوڕی ئەبو سابتو زەححاكو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریش[2] لە زانایانی پێشینە وتوویانە، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ خودا زانای کارزانە. ئاگای لەکرداری دروستکراوەکانی هەیەو کارزانە لە پاداشتدانەوەیاندا بەچاکە یان بەخراپە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١١﴾﴾

---

[1] الطبري (١٤/ ٤٩٣).

[2] الطبري (١٤/ ٤٩٥/ ٤٩٧).

## خودا، گیان و سامانی باوەڕدارانی کڕیوە لە جیاتیدا دەیانخاتە بەهەشتەوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾ خودا، گیانو سامانی باوەڕدارانی کڕیوەو لە باتیاندا دەیانخاتە بەهەشتەوە. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە لەگەڵ عەبدە خاوەنباوەڕەکانیدا کڕینو فرۆشێکی بەهەشتی پێداون، ئەمەیش لە سۆزو ڕێزو چاکەی خۆیەوەیە، چونکە ئەو گیانە هەر خۆی داویەتی بەو عەبدەگوێڕایەڵانەی خۆیو لە باتیدا بەهەشتی پێداون ئەو کڕینو فرۆشتنەی لێ قەبوڵ کردوون. بۆیە قەتادەو حەسەنی بەسری دەڵێن: سوێند بە خوا بە گرانترین بەها کڕینو فرۆشی لەگەڵدا کردوون.[1] شەممەری کوڕی عەتیە دەڵێت: هیچ موسڵمانێك نیە و پەیمانێك لە گەردنیاندا نەبێت، ئیتر بەجێی هێنابێت یان لەسەری مردبێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند.[2] بۆیە وتراوە: هەر کەسێکهەڵمەتێکی بردبێت لە ڕێی خوادا، ئەوە پەیمانی بە خودا داوە. واتە: ئەوپەیمانەی قەبوڵ کردووە و جێبەجێ کردوە. ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ﴾ باوەڕدارانیش لە ڕێی خودا ئەوانەن کە شەڕ دەکەنو دەکوژنو دەشیانکوژن. واتە: بکوژرێن یان بکوژن بەهەشتیان بۆ وەدەست هاتووە. بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە:(خودا دەستەبەری ئەوەیکردووە بۆ ئەوانەی دەرچوون لە ڕێگەی ئەودا، بەو مەرجەی هەرجیهادکردن لە ڕێی منداو بڕوابوونی بە پێغەمبەرانم هێنابیەتیەدەرەوە کە ئەگەرمراندی بیانخاتە بەهەشت یان بیگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە، بەو شتانەشەوە کەدەستی کەوتووە لەپاداشت یان دەسکەوتی شەڕ).[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ﴾ لە تەوراتو ئینجیلو قورئانیشدا بەڵێنی وەها دراوە، جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەو بەڵێنەو هەواڵ دانیشە کە خودا لەسەر خۆی نوسیوەو ڕەوانەشی کردووە بۆ پێغەمبەرەکانی لە کتێبە مەزنەکانیدا کە ئەو تەوراتەیە ناردوویەتی بۆ موساو ئەو ئینجیلەیە بۆ عیساو ئەو قورئانەیشە ڕەوانەی کردووە بۆ موحەممەد(سەلاتو سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت) پاشان خوای گەورەدەفەرمووێت﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ﴾ سا کێ لە خودا بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنی بە وەفاترە؟ بێگومان خودا نکوڵی لە بەڵێنیدا ناکات. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە

---

[1] الطبري (١٤/ ٤٩٩).

[2] الطبري (١٤/ ٤٩٩).

[3] فتح الباري (٦/٢٥٤)، مسلم (٣/١٤٩٦).

دەفەرموویت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾[1] جا قسەی کێ لە قسەی خودا ڕاسترە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾[2] واتە: کێ لە خودا ڕاستگۆترە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ دەسا ئێوە بەو سەودایە مزگێنی بە یەکتر بدەن کە دەسکەوتێکی زۆر گەورەتان دەسکەوتووە. واتە: مزگێنی بدەن بەو کەسانەی کە هەڵساون بە بەستنی ئەو پەیمانەو ئەو بەڵێنانەیان بەجێ هێناوە، بەو سەرکەوتنە مەزنەو ئەو بەهەشتو خۆشگوزەرانیە هەمیشەییە.

﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾﴾

**وەسفی ئەو خاوەنباوەڕانەی کە گیان و سامانی خۆیان فرۆشتووە بە خودا**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ تۆبەکارن خواپەرستن هەر پەسندی خوا دەدەن، ڕۆژوو دەگرن، بە کڕنوشو سوژدە بەرن، هانەی کاری چاك دەدەن، بەر لە ناڕەوا دەگرنو سنووری خودا دەپارێزن. مژدە بدە بەوانە خاوەن باوەڕن. ئەمە وەسفی ئەو باوەڕدارانەیە کە خودا گیانو سامانی لێ کڕیون بەم وەسفە جوانو شیرینو گەورانە. ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ﴾ تۆبەکارن لە هەموو تاوانێك وازیان لە هەموو کارێکی ناپەسەند دێنن، ﴿ٱلْعَٰبِدُونَ﴾ هەڵدەسن بە خوداپەرستی، پارێزگاری لەو خواناسیەیان دەکەن لە کردارو گفتاریاندا، پەسندی خودا دەدەن بە چاکترین وتەی پەسەندی بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلْحَٰمِدُونَ﴾ لە بەڕێزترین کارەکان ڕۆژو گرتنە، کە واز هێنانە لە گشت خۆشیەکان لە خواردنو خواردنەوەو جووت بوون لەگەڵ هاوسەردا، کە مەبەست بە گەشتوگوزار لێرەدا ڕۆژووگرتنە بۆیە فەرموویەتی: ﴿ٱلسَّٰٓئِحُونَ﴾ وەك چۆن وەسفی خێزانەکانی پێغەمبەری(ﷺ) کردووەبە(السائحات) واتە: ڕۆژوگران، هەر بەو شێوەیە کڕنووشوسوژدە بردنیش کەبریتین لە نوێژکردن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ﴾ لەگەڵ ئەمانەیشدا سودیش بە خەڵکی دەگەیەننو شارەزایان

---

[1] النساء (٨٧).

[2] النساء (١٢٢).

دەکەن بۆ خواپەرستی، ﴿ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ فەرمانیان پێ دەکەن بە چاکەکردنو ڕێگەی ناڕەواییان لێ دەگرنو خۆشیان شارەزان لەو شتانەی پێویستە بکرێن، ئەوانەیش کەناڕەوان و ئەبێ نەکرێت، ﴿وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ﴾ پارێزگاری سنوورەکانی خودایش دەکەن لەوەی حەرامو لەوەیش حەلاڵە، خۆشیان چاك دەیزانن کاری پێ دەکەن. خوداپەرستیەکی باش دەکەنو ئامۆژگاری خەڵکیش دەکەن بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ مژدەبدە بەوانە کەخاوەنباوەڕن. چونکە باوەڕ ئەوانە هەموو دەگرێتەوە، سا خۆشبەختی تەواو بۆ ئەو کەسانە ئەم سیفەتانەیان تێدایە.

﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾﴾

### ڕێگە نەدان بۆ پاڕانەوە بۆ بتپەرستان(ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوموسەیەبەوە ئەمیش لە باوکیەوە دەڵێت: کاتێك مردن یەخەی ئەبوتالبی گرت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە لای، لەو کاتەدا ئەبو جەهلو عەبدوڵڵا کوڕی ئەبو ئومەیەی لابوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەی مامە، بڵێ: لا إله إلا الله، وتەیەکە بیکەمە بەڵگەیەك بۆت لای خودای مەزن). ئەبو جەهلو عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی ئومەیە وتیان: ئەی ئەبو تالب واز لە ئاینی عەبدولموتەلیب دێنی؟ ئەبو تالب وتی: من لەسەر ئاینی عەبدولموتەلیبم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(داوای لێبوردنت بۆ دەکەم هەتا لێم قەدەغە نەکرێت بۆت، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ ڕەوا نیە بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی باوەڕدارن، داوای لێبوردن بۆ بتپەرستەکان بکەن جا با خزمی نزیکیش بن، لە پاش ئەوەی سوور دەزانن کە جەهەنەم جێگەیانە. وە وتی: ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە لە بارەیەوە: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾[1] واتە: تۆ ناتوانی کەسێك بۆ خۆت خۆشت بوێت شارەزای بکەی، بەڵام خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدات.[2] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە.[1] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە

---

[1] القصص (٥٦).

[2] أحمد (٤٣٣/٥)، سەحیحە.

سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە لە باوکیەوە، کاتێك پێغەمبەری خودا گەیشتە مەککە هاتە سەر پاشماوەی گۆڕێك و لەلایدا دانیشت و دەستیکردە قسەکردن لەگەڵیدا و هەڵسا و دڵی پڕبوو، وتمان ئێمە چاومان لێبوو چیتکرد ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی:(من ئیزنم خواست لە پەروەردگارم بۆ سەردانیکردنی گۆڕی دایکم ئەویش ئیزنی دام، وە ئیزنیشم لیّ خواست بۆ داوای لێبوردن لێی ئیزنی نەدام داوای لێبوردنی بۆبکەم). پێغەمبەر(ﷺ) نەبینراوە هیچ ڕۆژێك لەو ڕۆژە زۆرتر گریابێت.[٢] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ﴾ کە ئیبراهیم داوای لێبوردنی بۆ باوکی خۆی کرد، تەنها بۆ بەجێهێنانی بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، بەڵام کاتێك کەسوور زانی دژی خودایە، ئیترهیچ خۆی تیّ نەگەیاند و (گوێی نەدایە) بێگومان ئیبراهیم زۆر لەخواترس‌و لەسەرخۆ بوو. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ویستی داوای لێبوردن بکات بۆ دایکی خوای گەورە لێی قەدەغە کرد لەوە، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئیبراهیمی خەلیلیش داوای لێبوردنی کرد بۆباوکی) و خودای مەزنیش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ﴾.[٣] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا: داوای لێبوردنیان بۆ دەکردن هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، وازیان لە داوای لێبوردن کرد بۆمردووەکانیان، بەڵام ڕێگریان لیّ نەکرا لە داوای لێبوردن بۆزیندووەکانیکەن هەتادەمرن. پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾[٤]. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾ ئیبنوعەباس دەڵێت: بەردەوام ئیبراهیم داوای لێبوردنی بۆ باوکی دەکرد هەتا مرد. کاتێك زانی کە دوژمنی خودایە ئیتر گوێی پێنەدا، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کاتێك زانی باوکی دوژمنی خودایە.[٥] موجاهدو زەححاك‌و قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[٦] عوبەیدی کوڕی عومەیرو سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێن: ئیبراهیم لە ڕۆژی قیامەتدا خۆی بەرێی ئەکات بە باوکی کاتێك پێی ئەگات دەم‌و

---

[١] فتح الباري (١٩٢/٨)، مسلم (٥٤/١).

[٢] الطبري (٤٨٩/٦).

[٣] الطبري (٥١٢/١٤).

[٤] الطبري (٥١٣/١٤).

[٥] الطبري (٥١٩/١٤).

[٦] الطبري (٥١٩/٥١٨/١٤).

چاوی باوکی ڕەش و دووکەڵ دایپۆشیبوو، ئەڵێ: ئەی ئیبراهیم من بە گوێی تۆم نەکرد، بەڵام ئەمڕۆ بێ گوێیی تۆ ناکەم، ئیبراهیم ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئایابەڵێنت پێ نەداوم کە سەرشۆڕم نەکەی لە ڕۆژێکدا خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە، چ سەرشۆڕیە لەم سەرشۆڕییەگرانترە کە باوکم ئاوا دوور خراوەتەوە، پێی ئەوترێ: سەیری ئەوەی دواتەوە بکە، کاتێك ئەبینێ ئەوە کەمتیارێکی پیس‌و چڵکنە، (واتە: بووەبە کەمتیارێك) پاشان بە قاچەکانی ڕادەکێشرێ فڕێ ئەدرێتە ناوئاگر.[1] ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ بێگومان ئیبراهیم زۆر لەخواترس‌و لەسەرخۆ بوو. لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: ﴿لَأَوَّاهٌ﴾ واتە: زۆر نزاکەر.[2] هەر بەم جۆرە چەند شێوەیەکی تر ڕیوایەت کراوە لە ئیبنومەسعودەوە.[3] وتراویشە:(أواهٌ) زۆر دەپاڕایەوە، وە وتراوە: زۆر دڵۆڤان بووە، وە وتراوە زۆر بێگومان‌و خاوەن باوەڕ بووە، وتراویشە زۆر سوپاس‌و ستایشی خودای کردووە.

﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ يُحْيِي وَيُمِيتُ ۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾﴾

**هیچ گازندەیەك نیە دوای هێنانەوەی بەڵگە نەبێت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پاش ئەوەی خودا کۆمەڵێکی خستە سەر ڕێ، هەتا دیاری نەکات بۆیان لە چی بە پارێز بن لە ڕاستەڕێ لایان نادات، خودا هەموو شت دەزانێت. خودای گەورە باسی پیرۆزی‌و فەرمانی دادپەروەرانەی خۆی دەکات، کە هیچ کۆمەڵێك لە ڕێگە لا نادات هەتا لە پەیامی خۆی ئاگاداریان نەکاتەوەو بەڵگەی تەواویان نەداتی‌و چاك بۆیان ڕوون نەکاتەوە، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ﴾[4] واتە: ئێمە ڕێگەی بەرەو خۆمان نیشانی هۆزی سەمودیش دا، لە باتی شارەزا بوون حەزیان کرد هەر نابینا بن. موجاهد لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ﴾ دەڵێت: ڕوونکردنەوەیەکی خودایە هاتووە بۆ خاوەنباوەڕان کە واز بێنن لە پاڕانەوە بۆ ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، وە لە

[1] الطبري (١٤/٥٢١).
[2] الطبري (١٤/٥٢٣/٥٢٤).
[3] الطبري (١٤/٥٢٤).
[4] فصلت (١٧).

ڕوونکردنەوەکەشیدا بێ گوێی و گوێڕایەڵی بۆ گشتی ڕۆشنکردووەتەوە و فەرموویەتی ئەوە بکەن یان واز لەوە بێنن.[1] ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: خودا سزای نەداون لەسەر پاڕانەوەتان بۆ ئەوانەی هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو مردوون و بڕیار بدات بەسەرتاندا کەگوناهبارن، دوای ئەوەی کەئەوخوایە ڕێگەی نیشانداون و یارمەتی داون بۆ باوەڕهێنان بە خۆیی‌و پێغەمبەرەکانی، ئەگەر لە پێشەوە ڕێگری لێ نەکردبن لێی کە وازی لێ بێنن، یان پێش ئەوەی خراپی ئەو شتەتان بۆ ڕوون بکاتەوە کە مەیکەن، ئێوە بەرپرسیار نەبوون لەوەی قەدەغەی کردوە لێتان، چونکە خودا ئەوە بە گومڕایی لە قەڵەم نادات پێش ئەوەی فەرمان یان قەدەغەکردنەکە دابیەزێنێت، بێگومان خواناسی‌و گوناه لە شتێکدا دەبێ کە فەرمانی پێکرابێ یان قەدەغە کرابێ، کەسێ نیە ناوی نرێ گوێڕایەڵ یان یاخی لەشتێکدا کەهێشتا فەرمانی پێ نەکرابێ‌و قەدەغەیشی لێ نەکرابێ لەو شتە.[2] ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ خاوەن مولکی ئاسمانەکان زەمین هەر خودایە، زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ‌و جگە لە خودا دۆست‌و یاریدەدەرتان نیە. ئیبنوجەریر ئەڵێ: ئەمە هاندانێکە لەلایەن خودای مەزنەوە بۆ عەبدە خاوەنباوەڕەکانی کە دژی بتپەرستان‌و سەرۆکە خوانەناسەکان شەڕ بکەن‌و پشت ئەستور بن بە یارمەتی خودا کە خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەمینە، وە لە دوژمنانی نەترسن، چونکە خوا دۆستیانە، هیچ کەسێ دۆست‌و یارمەتی دەریان نیە جگە خودای مەزن.[3]

﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾﴾

**باسی غەزای تەبووك**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ

---

[1] الطبري (١٤/٥٣٧).
[2] الطبري (١٤/٥٣٦).
[3] الطبري (١٤/٥٣٨).

رَّحِيمٌ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ خـوا لـه پێغەمبەرو ئەوانەی کۆچەرن و ئەوانەی یاریدەدەرن و لە جەنگەکەی تەنگانەدا هەر پەیڕەوی ئەو بوون، خۆش بووە لە پاش ئەوەی هەندێك لەوان خەریك بوو دڵیان لابدات، دیسان خوای گەورەعەفوی کردن، خودا دڵسۆزی ئەوانەو لەگەڵیاندا میهرەبانە. موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن: ئەم ئایەتە لە غەزای تەبوکدا هاتوەتە خوارەوە، چونکە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی لە کاتێکی زۆر نارەحەتدا چوون بۆ ئەو غەزایە، ساڵێکی گرانیو زۆر گەرمو تەنگانە بوو، بێ خۆراكو بێ ئاویش بوون.[1] قەتادە ئەڵێ: دەرچوون بۆ شام لە ساڵی تەبوك، لە کڵپەی گەرماو تینویەتیەکی وا بوون هەر خودا خۆی دەزانێ چەندە نارەحەت بوون، زۆر تووشی مەینەتیو ئازار بوون هەتا بۆیان گێڕاوینەتەوە کە دوو پیاو خورمایەکیان لە نێوان خۆیاندا دەکرد بە دوو لەتەوە وە کۆمەڵێ خەڵك دەنکە خورمایەکیان لە نێوان خۆیاندا دەسی بە دەسی پێدەکرد، هەر یەکەیان دەیمژیو پاشان ئاوی بەسەریدا دەخواردەوە پاشان یەکێکی تر دەیمژیو ئاوی بەسەریدا دەخواردەوە، خودا لە هەموویان خۆش بوو وە لە غەزاکەیش گەڕاندنیەوە.[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە لە بارەی ئەو تەنگانەوە پرسیار کرا لە عومەری کوڕی خەتتاب، عومەر ئەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوینە دەرەوە بۆ تەبوك لە قرچە گەرمای هاویندا، لە شوێنێکدا دابەزین، تووشی تینویەتیەکی زۆر نارەحەت بووین، هەتا وامان دەزانی کە گەردنمان بەو زوانە دەقرتێنێ، هەتا کەسی وا هەبوو دەڕۆشت دەگەڕا بە دوای ئاودا کە دەگەڕایەوە وای دەزانی بەو زوانە گەردنی دەقرتێ، پیاوی وا هەبوو وشترەکەی سەر دەبڕی تەرسەکەی دەگوشیو دەیخواردەوە، ئەوەیش دەمایەوە دەیخستە سەرئاستی جگەری! ئەبوبەکری سدیق ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوای گەورەلەسەر دوعای خێر کردن ڕایهێناوی، دوعامان بۆ بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەوەت پێ خۆشە؟) ئەڵێ: بەڵێ، هەردوو دەستی بەرز کردەوە نەیگێڕانەوە هەتا ئاسمان لافاوی کردو باران باری پاشان بارانەکە لە ئاسماندا وەستاوە هەرچی دەفریان هەبوو پڕیان کرد، پاشان ڕۆشتین، سەیرمان کرد نەمان دی ئەو بارانە لە لەشکرەکە تێپەڕیبێ[3]! ئیبنوجەریر لەم ئایەتەدا: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾ واتە: پەیڕەوی ئەویان دەکرد لە ماڵ بەخشینو وڵاغی سواریو

---

[1] الطبري (١٤/٥٤٠).

[2] الطبري (١٤/٥٤١).

[3] الطبري (١٤/٥٣٩).

خواردەمەنیو ئاودا ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ﴾ واتە: پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی کۆمەڵێکیان لە هەق لابداتو گومان پەیدا بکەن لە ئاینی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو تەنگانەو ناڕەحەتیەی تووشیان بوو لە سەفەرو غەزاکەیاندا ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ﴾ پاشان عەفوی کردنو لەسەر ئاینەکەیان مانەوەو ڕاوەستان ﴿إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾[1].

﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾

**بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەی خۆیان لە غەزا لادا**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە کە یەکێك بوو لە کوڕەکانی، دەستی کەعبی باوکی ڕادەکێشا کاتێ کەکوێربوو بوو، ئەڵێ: بیستم لە کەعبی کوڕی مالیکەوە بەسەرهاتەکەی خۆی دەگێڕایەوە: کاتێ کە دواکەوت لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزای تەبوکدا(تبوك) ئەڵێ: لە هیچ جەنگێ لە جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کردویەتی هەرگیز دوانەکەوتوم جگە لە جەنگی(تەبوك) بەڵام ئەوە هەیە لە جەنگی بەدردا دواکەوتم بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) گلەیی لە هیچ کەس نەکرد کە دواکەوتبێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کە دەردەچوو لەگەڵ موسوڵمانەکان مەبەستیان کاروانەکەی قورەیش بوو، کەچی خوا لەگەڵ دوژمنەکانیان بەرەو ڕووی کردنەوە بەبێ وادەی دیاری کراو، لە ڕاستیدا من ئامادەی شەووی(عەقەبە) بووم لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) کاتێ پەیمانمان بەست لەسەر ئیسلامەتی، کە پێم خۆش نیە بیگۆڕمەوە بە جەنگی بەدر، ئەگەر چی جەنگی بەدر ناوو شۆرەتی لەناو خەڵکیدا زیاترە لەو شەوە، ئەو بەسەرهاتەش کە بەسەر مندا هات کە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دواکەوتم لە غەزای تەبوك ئەوە بوو: کە من هیچ کاتێك لەو کاتەی کە لە پێغەمبەر(ﷺ) دواکەوتم بەهێزترو بە گوڕترو دەوڵەمەندتر نەبووم، بەخوا هەرگیز لەوەو پێش دوو وڵاخی سواریم بە خۆمەوە نەدیبووە، کەچی لەو جەنگەدا هەمبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەو جەنگەی کرد کاتەکەی زۆر گەرم بوو بەرەو ڕووی ڕێیەکی دوورو بیابانێکی پانو بەرین بوویەوە، هەروەك بەرەو ڕووی لەشکرێکی ئێجگار زۆری دوژمنان دەبوویەوە، هەر بۆیە نیازو مەرامی خۆی بۆ ڕوویەڕوو بوونەوە لەگەڵیاندا ئاشکرا کرد بۆ موسڵمانان، تا خۆیان سازو ئامادە بکەن، هەر بۆیە ڕێڕەوی خۆیانی بۆ باس کردن کە بەرەو کوێ دەچن، موسوڵمانەکانیش ئەو ڕۆژە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بوون،

---

[1] الطبري (١٤/٥٣٩).

سەرژمێر نەکرابوون لە تۆمارگەکەیدا، ئەگەر یەکێك بیویستایە خۆی بشارێتەوە ون دەبوو، مەگەر وەحی خوای گەورە ئاشکرای بکردایە، پێغەمبەریش(ﷺ) لە کاتێکدا کە ئەو جەنگەی کرد میوە پێگەیشتبوو سێبەر خۆش بوو بوو، منیش زۆر حەزم لەو میوەو سێبەرە دەکرد، ئەوە بوو پێغەمبەر(ﷺ)و موسوڵمانەکان تفاقی خۆیان خست منیش سەر لە بەیانی دەستم دایە خۆ ساز کردن کەچی دەگەڕامەوەو لە دڵی خۆمدا دەمگوت: من هەر کات بمەوێ ئەتوانم خۆم ساز دەم، هەر وا بەو شێوەیە مامەوە تا پێغەمبەر(ﷺ)و موسوڵمانەکان بەڕێ کەوتن بێ ئەوەی من هیچ تفاقێکم ئامادە کردبێت، بۆ سبەینێ دیسان دەڕۆشتم تا خۆم ساز بکەم کەچی دەگەڕامەوەو هیچیشم نەدەکرد، بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە مامەوە تا سوپاکە تاویان داو دوورکەوتنەوە، بە تەما بووم بڕۆم بە دوایاندا و پێیان بگەمەوە، خۆزگە وام بکردایە، بەڵام هەریۆم ڕێنەکەوت، دوای ڕۆیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) هەر کاتێ دەچوومە دەرەوە خەفەتبار دەبووم بەوەی کەسێکم نەدەبینی وەك خۆم وا بێت مەگەر پیاوێکی بە دووڕوویی تۆمەتبار کراو، یان کەسێك کە خوا مۆڵەتی دابێت، وەکو لاوازو بێ تواناکان. پێغەمبەر(ﷺ) باسی نەکردبووم هەتا گەیشتبوە(تەبوك) لەوێ کاتێ لەناو خەڵکیدا دانیشتبوو فەرموو بووی:(کەعبی کوڕی مالیك چی لێهات؟) پیاوێك لە(بەنی سەلەمە) وتبوی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) قاتە جلەکەیی و تەماشاکردنی ئەملاو لای خۆی گیری داوە، (مەعازی کوڕی جەبەل پێی دەڵێ: خراپت گوت. بە خوا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خێر نەبێ هیچمان لێ نەدیوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بێدەنگ دەبێت، کەعبی کوڕی مالیك دەڵێ: کاتێ پێم گەیشتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە گەڕانەوەدایە لە تەبوك خەفەت دای گرتم بیرم لە درۆ دروستکردن دەکردەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: چۆن و بە چی بتوانم سبەینێ خۆم لە تووڕەیی پێغەمبەر(ﷺ) ڕزگار بکەم؟ بۆ ئەم مەبەستە کەوتمە ڕاو تەگبیرو هەر کەسێك لە ماڵ و خێزان و کەس و کارم کە بتوانێ ڕێیەکم بۆ دابنێت، کاتێ پێم وترا: وا پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتە بەرەوە هەموو خەیاڵێکم لە مێشکی خۆمدا ڕەواندەوەو، عەزمی خۆم جەزم کردو، دڵنیا بووم لەوەی کە ناتوانم بە هیچ شتێك لە دەستی ڕزگار ببم، بۆیە بڕیارم دا ڕاستگۆ بم لە خزمەتیدا، پێغەمبەر(ﷺ) سەر لە بەیانی گەیشتە ماڵەوە عادەتی وا بوو کە لە سەفەرێك بگەڕایەتەوە پێش ئەوەی بچێتە ماڵەوە سەرەتا لە مزگەوت دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان دادەنیشت بۆ پێشوازی لە خەڵك، کە ئەوەی کرد خەڵکە دواکەوتوەکان هاتن کەوتنە بروبیانوو هێنانەوە بۆی، سوێندیان بۆ دەخوارد، کە هەشتاو ئەوەندە کەس بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕواڵەتی دەرەوەی لێ قبوڵ کردن و پەیمانی لەگەڵ بەستن و، داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن، بەڵام نهێنی ناو دڵیانی دایە دەست خوا منیش هاتم، کاتێ سەلامم کرد بزەو خەندەیەك گرتی، وەك بزەو خەندەی کەسێکی تووڕە پاشان فەرمووی:(وەرە) منیش ڕۆشتم تا لەبەر دەمیدا دانیشتم، پێی فەرمووم:(چی دوایخستی؟ ئەی تۆ

وڵاخی سواریت نەکڕی؟) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، بە خوا ئەگەر من لای جگە لە تۆ لە پیاوانی دونیایی دانیشتمایا، دەمتوانی منیش بڕوبیانوو بێنمەوەو خۆم لە تورەیی تۆ قوتار بکەم، خوا دەم‌و زمانێکی وایپێداوم، بەڵام بە خودا من چاك ئەزانم، ئەگەر بێتوو ئەمڕۆ منیش درۆو دەلەسەت بۆ بێنمەوە تا لێم ڕازی بیت، ئەوا دوور نیە خوا تورەت بکات لێم، بەڵام ئەگەر قسەی ڕاستت بۆ بکەم با تورەش ببی لێم لەسەر ئەو قسانە، ئەوە بە ئومێدی سەرەنجامی باشم لە خوداوە، بە خوا من هیچ بیانویەکم نەبووە کە دواکەوتم ئەی پێغەمبەری خوا! بەخوا من هیچ کاتێ ئەوەندە بەهێزو دەوڵەمەند نەبووم، وەك ئەو کاتەی کە دواکەوتم لێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەمە ڕاست دەکات دە هەستە با بزانین خوا چ فەرمانێك دەدات لە بارەتەوە) منیش هەستام، چەند پیاوێك لە(بەنی سەلەمە) ورووژان‌و شوێنم کەوتن پێیانم گوتم: بە خوا وانازانین تۆ پێش ئەمە تا ئێستا هیچ گوناهێکت کردبێت، تۆش نەتوانی وەك دواکەوتوەکانی تر بڕوبیانوو بهێنیتەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ ئەوەندەت بەس بوو بۆ لێخۆشبوونی تاوانەکەت کە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات،. دەڵێ: بە خوا وازیان لێ نەهێنام تا خەریك بوو بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆم بە درۆ بخەمەوە، پاشان پێم گوتن: کەسیتر هەیە وەکو منی لێقەومابێت، ئەڵێن: بەڵێ، دوو پیاوی تریش وەك تۆ وان، ئەوانیش هەمان قسەی تۆیان وتوەو، وەکو تۆیان پێ وتراوە، وتم: ئەو دوانە کێن؟ ئەڵێن: یەکێکیان(مەرارەی کوڕی ڕەبیعەی عامیریە) ئەویتریشیان(هیلالی کوڕی ئومەییەی واقیفییە) باسی دوو پیاوی باشیان لا کردم کە بەشداری جەنگی(بەدر) بوو بوون، سەرمەشق بوون بۆ من، کە باسی ئەو دوانەیان بۆ کردم ڕۆیشتم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێگری کرد لە موسوڵمانەکان کە ئیتر قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسە بکەن، لەناو دواکەوتوەکاندا، خەڵکی لێمان لا گیر بوون، بەرانبەرمان گۆڕان، تا وام لێهات بێزم لە خۆم دەکردەوە، هەتا ڕقم لە زەوی دەبویەوە، وام لێهات ئەو زەویەی بەسەریدا دەڕۆیشتم بە لامەوە زەویەکەی جاران نەبوو، پەنجا شەو بەو شێوەیە ماینەوە. هەردوو هاوەڵەکەم لە ماڵەوە دۆش دامابوون، دانیشتبوون دەگریان بەڵام من لە هەردووکیان گەنجترو تۆکمە تر بووم، لە ماڵ دەردەچووم ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبووم‌و، بە بازاڕدا دەگەڕام کەس قسەی لەگەڵدا نەدەکردم، دەهاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) سەلامم لێدەکرد، لە دوای نوێژ لە جێگەکەی خۆیدا، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: بلێی لێوی جولاندبێت، بە وەڵامدانەوەی سەلامەکە؟ پاشان لە نزیکەوە نوێژم دەکرد، بە دزیەوە سەیرم دەکرد، کاتێ دەچوومە ناو نوێژەکەم سەیری دەکردم، کاتێك کە لام دەکردەوە بە لایدا، ڕووی لێم وەردەگێڕا، کاتێك ساردو سڕی موسوڵمانان درێژەی کێشا لەسەرم ڕۆیشتم تاوەکو هەڵزنام بە قەد دیواری باخێکی(ئەبوقەتادەدا) کە ئامۆزام بوو، خۆشەویسترین کەس بوو لام، سەلامم لێکرد، بەوخوا ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە! پێمگوت: ئەی ئەبوقەتادە! سوێندت ئەدەم بە خودا ئایاوا

دەزانیت کە من خودا پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ؟ دەڵێت: بێدەنگ بوو، دیسانەوە لێی پاڕامەوە هەر بێدەنگ بوو، جارێکیتر لێی پاڕامەوە، جا ئەڵێ: خواو پێغەمبەرەکەی خوا باشتر دەزانن، منیش هەردوو چاوم پڕبوون لە فرمێسك، لە دوایدا پشتم هەڵکردو بە دیوارەکەدا هەڵزنام، ئەمەو لە کاتێکدا بە بازاڕی مەدینەدا دەڕۆشتم سەیر دەکەم کابرایەکی جوتیار لە خەڵکی شام کە خۆراکی هێنا بوو لە مەدینە بیفرۆشێت، دەیگوت: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پیشان ئەدات؟ دەڵێ: خەڵکی ئاماژەیان بۆ کرد بەرەو ڕووی من، کابرا هات بۆ لام، نامەیەکی لە پاشای(غەسانەوە) پێدام، منیش خوێندەوار بووم خوێندمەوە ئەمەی تێدا بوو، وامان پێگەیشتوەتەوە کە هاوەڵەکەت، دڵی شکاندویت، خوای گەورە تۆی بە ڕسواو ماف خوراو دانەناوە، بگە بە ئێمە دڵنەوایت دەکەین، دەڵێت: منیش کاتێك خوێندمەوە وتم: ئەمەیش بەڵایەکی تر، منیش نامەکەم برد و خستمە تەنورێکەوەو سوتاندم، کاتێ چل شەو تێپەڕی لە پەنجا شەوەکەو وەحی دواکەوت. لەناکاو نێرراوی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لام ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانت پێدەدات: کە لە ژنەکەت دووركەویتەوە گوتم: تەڵاقی بدەم یان چی بکەم؟ ئەڵێ: نا بەڵکو لێی دوور کەوەرەوە، توخنی مەکەوە، دەڵێت: هەمان جوابی ناردبوو بۆ هەردوو هاوەڵەکەی دیکەم، دەڵێت: بە ژنەکەم گوت بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت لەوێبە تا بزانین خودا چی دەکات لەم بارەیەوە ! دەڵێ: ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەییە دەچێتەوە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی دەڵێت: کە هیلالی کوڕی ئومەییە پیرەو ناتوانێ خزمەتی خۆی بکات، خزمەتکاری نیە، ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم؟ فەرمووی:(نەخێر بەس با نزیکت نەکەوێ) ئەویش ئەڵێ: کورە بە خوا ئەو هیچ شتێکی پێنەماوە، بە خوا لەو ڕۆژەوە ئەم بەسەرهاتەی لێڕوویداوە هەر خەریکی گریانە هەتا ئەمڕۆ، دەڵێ: منیش هەندێ لە خزمەکانم پێیان گوتم: بریا تۆش مۆڵەتت لە پێغەمبەر(ﷺ) بخواستایە، ژنەکەت بهێنایەتەوە، ئەوەتا مۆڵەتی ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەییەی داوە کە خزمەتی بکات، گوتم: داوای مۆڵەت لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناکەم لەو بارەیەوە، نازانم ئەگەر داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، چیم پێدەڵێت؟ بەتایبەتی من پیاوێکی گەنجم؟ دە شەویش بەو حاڵە مامەوە، تا پەنجا شەومان تەواو کرد، لە سەرەتای قسە لەگەڵ نەکردنمانەوە لە بەیانی پەنجاهەمینی شەوماندا لە کاتێکدا کە من لەسەر بانەکە دانیشتبووم، لەسەر ئەو ماڵەی کە خوای گەورە دەربارەمان فەرموویەتی دڵو دەروونم تەنگ بوو بوو، زەوی بەو فراوانیەی خۆیەوە لێم هاتبوەوە یەك گوێم لە دەنگی زەلامێك بوو لەسەر کێوی(سلع)وە بەوپەڕی دەنگ بەرزیەوە هاواری دەکرد ئەی کەعبی کوڕی مالیك موژدە بێت، منیش کەوتم بە سوژدەداو زانیم خوا دەروویەکی لێکردوینەتەوە، ئەویش ئەوە بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوای نوێژی بەیانی خەڵکەکەی ئاگادار کردبوو کە خوا تۆبەی لێوەرگرتووین، خەڵکی هاتبوون مزگێنیمان بدەنێ، چەند مزگێنی دەرێك چوو بوون بەرەو دوو هاوەڵەکەی ترم،

پیاوێکیش بە سواری ئەسپێکەوە بە غار بەرەو من هات، کەسێکیش لە هۆزی(سلم) بە ڕاکردن بەرەو ڕووم هاتبوو، چوو بووە سەر کێوەکەو هاواری کردبوو، دەنگەکەم پێش ئەسپەکە پێگەیشت، کاتێ ئەو کەسەی کە گوێم لە دەنگی بوو گەشتە لام، لە خۆشیدا قاتە جلکەی خۆم بۆ داکەندو کردمە بەر ئەو، سوێند بە خوا لەو قاتە زیاترم نەبوو لەو ڕۆژەدا قاتێ جلم خواستو کردمە بەرم، پاشان چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکی دەستە دەستە پێم دەگەیشتن پیرۆزباییان لێ دەکردمو دەیانگوت: لێخۆشبوونی خوات لێ پیرۆز بێت، تاوەکو گەیشتمە مزگەوت، دەبینم پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتوەو خەڵکیش بە دەوریدا دانیشتبوون، تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا(عبیدالله) هەستا بەڕاکردن بەرەو ڕووم هاتو، تەوقەی لەگەڵ کردمو پیرۆزبایی لێکردم، بە خوا کەس لە کۆچەریەکان هەڵنەسا جگە لەو، کەعب دەڵێ: هەرگیز ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی تەلحەم لە بیرنەچوو، کەعب دەڵێ: کاتێ سەلامم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕوومەتی لە خۆشیدا دەدرەوشایەوە فەرمووی:(مژدە بێت بە چاکترین ڕۆژ کە بەسەرتدا تێدەپەڕێت، لەو ڕۆژەوە کە لە دایك بوویت) گوتم: ئەم مژدەیە لە تۆوەیە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) یا لە خواوەیە؟ فەرمووی:(نەخێر بەڵکو لە خوداوەیە) پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ دڵی خۆش بوایە ڕووخساری دەدرەوشایەوە، هەر دەتوت پارچەیەکە لە مانگ، دەڵێ: ئێمەش ئەمەمان دەزانی. دەڵێ: کاتێك لەبەر دەمیدا دانیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبێت بەشێك لە تەوبەکەم ئەوە بێت کە لە ماڵەکەم دەرچمو بیکەم بە خێر بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(هەندێك لە ماڵەکەت گل بدەرەوە بۆ خۆت ئەوە باشترە بۆت) دەڵێ: وتم: کەوابوو ئەو پشکەی لە(خەیبەر)دا بەرم کەوتوە، دەیهێڵمەوە بۆخۆم، وتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! خوا منی بەهۆی ڕاستگۆییەوە ڕزگار کرد، مەرجی تەوبەکەشم ئەوەیە کە دەبێ تا ماوم ڕاستگۆبم. جا ئەڵێ: سوێند بە خوا وا نازانم هیچ کەس لە موسوڵمانان خوا وەك من تاقیکردبێتەوە لەسەر ڕاستگۆیی، لەو کاتەوە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کردوە هەتا ئەمڕۆ. بە خوا لەو کاتەوە ئەو بەڵێنەم بە پێغەمبەر(ﷺ) داوە، تا ئەمڕۆ پێ بزانم بە ئەنقەست درۆم نەکردوە ئومێدم وایە بۆ لەمەولاش هەربمپارێزێت. خوای بالادەست ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ کە ئەمە ماناکەیەتی:(بە ڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەرو کۆچبەرانو پشتیوانانو ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتبوون لە کاتی سەغڵەتیو تەنگانەدا(هەتا دەگاتە) بە ڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆزو میهرەبانە لەگەڵیاندا، هەروەها تەوبەی

ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن، دوای ئەوەی کە زەوی بەو هەمووە فراوانیەوە لێیان تەنگ بوو بوویەوە، خۆشیان لە خۆیان بێزار بوو بوون(هەتا دەگاتە) هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن)[1] کەعب دەڵێ: بە خوا لە پاش ئەوەی خودا ڕێنمونی کردم بۆ ئیسلام هیچ نازو نیعمەتێکی بەسەردا نەڕتشتووم گەورەتر بێت لە لای من لە ڕاستگۆییم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، کە درۆم لەگەڵ نەکرد، تا منیش تیا بچم وەك ئەوانەی کە درۆیان کردو تیا چوون، خوا دەرهەق بەوانەی کە درۆیان کرد کاتێ وەحی دابەزاند خراپترین شتێ کە فەرموویێتی بە کەسێك وەك لەم ئایەتەدا هاتوە ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴾ کە ئەمە ماناکەیەتی(کە ئێوە گەڕانەوە بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن، بە خوا بۆ ئەوەی وازیان لێبهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن، جا ئێوەیش وازیان لێبهێنن و پشتیان تێبکەن چونکە بەڕاستی ئەوانە پیسن جێگایان دۆزەخە لە پاداشتی ئەو کارەی کردیان، سوێندیان بەخوادان لێیان ڕازی بن و چاوپۆشیان لێ بکەن، خۆ ئەگەر ئێوە ڕازی بن لێیان ئەوا بێگومان خوا لە کەسانی لە ئاین دەرچوو ڕازی نابێت)[2] کەعب دەڵێ: تۆبەی ئەم سیانەمان دوا خرا لەوانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بەهانەی لێوەرگرتن. کاتێ سوێندیان بۆ خوارد، بۆیە پەیمانی دانیو داوای لێبوردنی بۆ کردن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەگبیری ئێمە دوا خست تا خوای بالادەست خۆی بڕیاری تیا بدات، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّىٰ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ ئەوی کە خوا باسی فەرمووە دەربارەی دواکەوتنمان مانای دواکەوتنمان نیە لە جەنگەکە بەڵکو مانای دواخستنی دەرچوونی بڕیارە دەربارەی ئێمە بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە سوێندیان خواردو بەهانەیان هێنایەوەو ئەویش لێی وەرگرتن)[3]، ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی ڕاستەو بوخاریو موسلیمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە[4] ئەم فەرموودەیە مانای ئەم ئایەتەی بە چاکترینو ئاسانترین شێوە تەفسیر کردوە، هەر بەم شێوەیە لە چەند کەسەوە لە زانایانی

---

[1] التوبة (١١٧-١١٩).

[2] احمد (٣/٤٥٦) صەحیحة.

[3] مانای ئەم فەرموودەیە پوختەی لە سەحیحی موسلیم وەرگیراوە(وەرگێڕ).

[4] فتح الباري (٨/١٩٣)، مسلم (٤/٢١٢١).

پێشینەوە ڕیوایەت کراوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا. وەك ئەعمەش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسوفیانەوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟﴾ ئەڵێ: ئەوانە: کەعبی کوڕی مالیكو هیلالی کوڕی ئەمەییەو مەرارەی کوڕی ڕەبیع بوون. هەموویان لە ئەنساریەکان بوون[1].

### فەرماندان بەکردنی قسەی ڕاست

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ ئـەی گـەلی خاوەن باوەڕان، با ترستان لە خودا هەبێو لە گەڵ ڕاستاندا بژین. کاتێ خودای گەورە باسی ئـەو سـێ کەسە کرد کە چۆن دەرووی لێکردنەوەو ڕزگاری کردن لـەو تەنگانـەو ناڕەحەتیـەو لـە دوورەپـەرێزی موسوڵمان لێیان بۆ ماوەی پەنجا شەو بە ڕۆژەکانیشیەوە وایان لێهات لە خۆیان بێزار بوون، ئـەو سـەر زەویەیان بەو فراوانیە لێهاتە یەك واتە: لەگەڵ ئەو فراوانیەدا سەریان لێ شێوا بـوو نـەیان دەزانـی چـی بکەنو بۆ کوێ بچن، خۆیان لەبەر فـەرمانی خـوادا ڕاگرتو ملکەچـی فـەرمانی خـودا بـوونو لەسـەری ڕاوەستان هەتا خودا دەرووی لێکردنەوە، بەهۆی ڕاستیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) سەبارەت بـەو دواکەوتنەیان، چونکە ئەوانە هیچ بروبیانوویەکیان نەبوو، سزا دران ئەو ماوەیە لەسەر ئـەو دواکەوتنـە، پاشان خودا تۆبەی لێ قبوڵ کردن، ئاکامی ئەو ڕاستیەیان بە خێر دەرچوو، خـودا لێیـان خـۆش بـوو، بۆیـە خـوای گەورەفەرموویـەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ واتـە: ڕاستگۆ بن، پابەند بن بە ڕاستیەوە، لە ڕیزی ڕاستان دەبن، لە هەڵدێرەکان ڕزگارتان دەبـێ خـودا بـەو ڕاستیەتان لە کارەکانتاندا دەرووتان لێدەکاتەوەو ڕزگارتان دەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لـە عەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعودەوە(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) ئـەڵێ: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویەتی:(پێویستە لەسەرتان ڕاستگۆ بن بـە ڕاسـتی ڕاسـتگۆیی مـرۆڤ ڕێنمـونی دەکـات بـۆ چاکە، چاکەش ڕێنمونی دەکات بۆ بەهەشت، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەکاتو بـە دوای ڕاسـتیدا دەگـەڕێت تا لای خوا بە ڕاستگۆ تۆمار دەکرێ، خۆتان بپـارێزن لـە درۆ، بەڕاسـتی درۆ مـرۆڤ بـەرەو کـاری خـراپ دەبات، کاری خراپەش مـرۆڤ بـەرەو دۆزەخ دەبـات بـەردەوام پیـاو هەیـە درۆ دەکـاتو بـە دوای درۆدا دەڕوات تا لای خوا بە درۆزن لە قەڵەم دەدرێت)[2]،[3] لە هەردوو سەحیحەکەیشدا هاتوە[4].

---

[1] الطبري (١٤/٥٤٤).

[2] پوختەی سەحیحی موسلیم، لاپەڕە (٩٠١)، بەرگی دوو (٢)(وەرگێڕ).

[3] أحمد (١/٣٨٤)، سەحیحە.

[4] فتح الباري (١٠/٥٢٣)، مسلم (٤/٢٠١٢).

﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾

**پاداشتی ڕۆشتن بۆ غەزا**

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ مەدینەیی یەكان و ئەو عەرەبە دەشتەكیانەی لە دەوریانن، نەدەبوایە پێغەمبەری خوایان وەلا بنایەو خۆیان لەو هەڵاوەردایە، چونكی هەرچی لە تینویەتی و ماندویی و لە برسیەتی(كە لە ڕێی خوا تووشیان دێ)و هەر هەنگاوێكی دەیهاوێژن، خوانەناسان تووڕە دەكات و هەر دەستێ لە دوژمنی ئەوەشێن، گشتی خودا بە چاكە بۆیان دەنووسێ، خودا پاداشتی چاكەكاران ون ناكات. خودای گەورە سەرزەنشتی ئەو كەسانە دەكات كە دواكەوتن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزای تەبوكدا لە خەڵكی مەدینەو ئەو عەرەبە دەشتەكیانەی لە دەوری مەدینە بوون، كە خۆیان جیا كردەوە لێی و نەچوون بە دەمیەوە لەو تەنگانەو ناڕەحەتیەدا كە تووشی پێغەمبەرو هاوەڵەكانی هات، خۆیان بێبەشكرد لەو پاداشتە، چونكە ئەوانە هەرچی لە تینویەتی و ناڕەحەتی و برسیەتی و هەر هەنگاوێكیش دەیهاوێژن و لە هەر شوێنێ دادەبەزن و دوژمن دەترسێنن و هەر سەركەوتنێ بە دەست دێنن بەسەر دوژمنداو تووڕەیان دەكات، هەموو ئەو كارانەیان خوا بە چاكە بۆیان دەنووسێ و پاداشتی ئەو كارە چاكانەیان ئەداتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ خودا پاداشتی چاكەكاران ون ناكات. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴾[1] ئەوانە بڕوایان هێناوە و كاری چاك دەكەن ئێمە پاداشتی كارچاكان ون ناكەین.

---

[1] الكهف (٣٠).

﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾﴾

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَلَا يُنفِقُونَ﴾ هەرچەندە ماڵ دەبەخشن ﴿نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا﴾ کەم و زۆری لە هەر دۆڵ و شیوێ تێپەڕن(کە غەزا بکەن لە ڕێی خودا دژی دوژمنان، ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ﴾ خودا بۆیان دەنووسێ) ئەی فەرمووە(بِە) یانی: بەو کارەی کە پێی هەڵدەسن، چونکە ئەم کارانە ئەمان پێی هەڵساون بەرهەمی کرداری خۆیانە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ تا پاداشتی لەوە چاکتریان بداتێ. لەم ئایەتە پیرۆزەدا گەورەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەففان(ڕەزای خوای لێبێ) پشکێکی زۆرو بەشێکی گەورەی بەردەکەوێت، چونکە عوسمان(ڕەزای خوای لێ بێ) لەم غەزادا سامانێکی زۆرو مەزنی بەخشی، دیسان عەبدوڵڵا لە عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورەوە ئەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: عوسمان(ڕەزای خوای لێ بێ) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بە هەزار دینارەوە لە ناو کراسەکەیدا هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوپای تەنگانەی پێ بەڕێ بکات. ئەڵێ: کردیە چاکی پێغەمبەر(ﷺ) چاوم لێی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی هەڵی دەگێڕایەوەو ئەیفەرموو:(تووشی زیان نابێ کوڕی عەففان هەرچی بکات لەمڕۆ بەدواوە) چەندجار ئەم قسەی دووبارەئەکردەوە.[1] قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ﴾ ئەڵێ: هیچ کۆمەڵێ نییە زۆر دوور کەوتبنەوە لە کەس و کاریان لە ڕێی خوادا و زۆر زیاتر لە خواوە نزیك نەبووبنەوە[2].

﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ پێویست نییە خاوەنباوەڕان هەموو تێکڕا بچنە دەرەوە، با لەناو هەر کۆمەڵگایەك دەستەیەکیان بچنە دەرێ، تا لە دین شارەزا دەبن و کە گەڕانەوە نا هۆزەکەیان بیانترسێنن، بەڵکو خۆیان بپارێزن، ئەمە

[1] أحمد (٦٣/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الطبري (٥٦٥/١٤).

ڕوونکردنەوەیەکە لەلایەن خواوە بۆ ئەو خەڵکە لە مەدینەو ئەو عەرەبە دەشتەکیانەشی کە دەیانویست لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بچنە دەرەوە بۆ غەزای تەبووك، چونکە هەندێ لە زانایانی پێشینە ڕایان وا بوو کە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کاتێ کە پێغەمبەری خودا چووە دەرەوە، ئەوانیش لەگەڵی بچنە دەرەوە، بۆیە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا﴾[1] سووك بارین یان گران بار بن بۆ غەزا بکەونە ڕێ. وە فەرموویەتی: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ﴾ ئەم ئایەتە ئەو ئایەتەی پێشووی نەسخ کردووەتەوە، وە ئەشوترێت: ئەمە ڕونکردنەوەیەکە لەلایەن خودای گەورەوە کە کۆمەڵێ لە عەرەب نشینەکانی دەوری مەدینەو دەستەیە لە هەر هۆزێ بچنە دەرەوە بۆ غەزا، ئەگەر هەمووشیان دەرنەچوون بۆ ئەوەی ئەوانەی دەچنە دەرەوە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) شارەزای ئەو وەحیە بن کە دێتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە گەڕانەوە بۆ ناو هۆزەکەیان بیانترسێنن لە هەڵسوکەوتی دوژمن بەرانبەریان، بۆ ئەوەی بە هەردوو کارەکە هەڵسن دوای پێغەمبەر(ﷺ) هەر دەستەیە کە دەچێتە دەرەوە بۆ شارەزا بوون یان بۆ جیهاد کردن بچنە دەرەوە، بێگومان ئەو دەرچوونە فەرزی کیفایەیە لەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً﴾ دەڵێت: پێویست نیە لەسەر باوەڕداران هەموو بچنە دەرەوە بۆ جیهادو پێغەمبەر(ﷺ) بەجێ بهێڵن، ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ﴾ واتە: با لەناو هەر کۆمەڵگایەك دەستەیە بچنە دەرەوەو ئەشچنە دەرەوە بە ئیزنی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێ، ئەگەر ئەو دەستانەیش گەڕانەوە، دوای ئەوان قورئان هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی دانیشتوونو نەچونەتە دەرەوە لەگەڵ پێغەمبەردا فێری بوون، بڵێن بەوانەی کە چوونەتە دەرەوە، ئەوەی خودا ناردویە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە قورئان ئێمە شارەزای بووین، با ئەو دەستانەشی کە دەرچوون بۆ غەزا، دوای ئەوان کە خودای گەورە ناردیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەیان شارەزای بن، پاشان دەستەی تریش ڕەوانە بکرێ. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾ ئەڵێ: بۆ ئەوەی شارەزا بن و(خەڵکیش شارەزا بکەن) واتە: لەوەی خودا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی فێری بن و ئەو دەستانەیش گەڕانەوە بۆ لایان فێریان بکەن ﴿لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ بەڵکو بیانترسێنن.[2] موجاهید ئەڵێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە

---

[1] التوبة (٤١).

[2] الطبري (٥٦٧/١٤).

لەسەر هەندێ کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە چووبونە ناو دەشتەکانەوە، تووشی چاکە بوو بوون، وە کەوتبونە شوێنێکی وا کە قازانجی هەبوو بۆیان، هەرکەسیان چاو پێ دەکەوت لەو خەڵکە بانگیان دەکرد بۆ شارەزا بوون لە ئیسلام، ئەو خەڵکە پێیان گوتن: هەرچەندە سەیری ئێوە دەکەین ئێوە هاوەڵەکانی خۆتان وازلێهێناوەو هاتوون بۆ لای ئێمە؟ هەستیان بە سەغڵەتیەك دەکرد لە دڵی خۆیاندا لەسەر ئەوە، بۆیە لە دەشتەکانەوە هەموویان ڕوویان کردە(مەدینە)و چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ)، خودای گەورەیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ﴾ با لەناو هەموو کۆمەڵگایەك دەستەیەکیان بچنە دەرێ(بگەڕێن بە شوێن چاکەدا) ﴿لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ﴾ تا لە دین شارەزا دەبن و گوێبیستی ئەو قورئانەش ببن لای ئەو خەڵکەیە کە دوای ئەوان خودا ناردویەتیە خوارەوە: ﴿وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ کە گەڕانەوە ناو هۆزەکەیان(ئەو خەڵکە) بترسێنن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ﴾ بەڵکو خۆیان بپارێزن.[1] قەتادە ئەڵێ: لەم ئایەتەدا: ئەمە لە کاتێکدا بووە پێغەمبەری خودا ئەو سوپانەی ناردوە خودا فەرمانی پێداون کە بەرفەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) غەزا بکەن و دەستەیەکیان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بمێننەوە تا لە ئاین شارەزا ببن، دەستەیەکی تریش دەرچێ و بانگی هۆزەکەی بکات و بیانترسێنێ لەو کارەساتانەی خودا هێنای بەسەر گەلەکانی پێش ئەواندا.[2] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗ﴾ ئەم ئایەتە لەسەر جیهاد کردن نەهاتوەتە خوارەوە، بەڵکو کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نزای کرد لە خێڵی موزەر کە تووشی قات و قڕی ببێت، وڵاتەکەیان تووشی نەهاتی و قات و قڕی هات، هۆزی وایان هەبوو بە تەواوی بەرەو مەدینە هاتن و لەوێ نیشتەجێ بوون لە ناڕەحەتی و نەبونیدا، خۆیان بە موسوڵمان نیشان ئەدا بەڵام درۆیان دەکرد تەنگیان بە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵچنی، تووشی گرانیان کردن، خوای گەورەقورئانی ناردە خوارەوە و پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کرد کە ئەوانە موسوڵمان نین پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕاندنیەوە بۆ ناو هۆزەکانیان، هەڕەشەیشی کرد لە هۆزەکەیان ئەگەر بەو کارەی ئەوان هەڵسن، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ کە گەڕانەوە ناو هۆزەکەیان بیانترسێنن بەڵکو خۆیان بپارێزن.

[1] الطبري (١٤/٥٦٦).
[2] الطبري (١٤/٥٦٨).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾

**فەرماندان بە جیهاد دژی خوانەناسە نزیکەکان و پاشان خوانەناسانی تریش**

خوای گەورە فەرمویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ ئەی کەلی خاوەن باوەڕ، لەگەڵ ئەو خوانەناسانەی نزیکتانن شەڕ بکەن، با زەبرو زەنگتان ببینن، ئەوەش بزانن خودا لەگەڵ خۆپارێزانە. خوای گەورەفەرمانی داوە بە خاوەن باوەڕان کە بجەنگن لەگەڵ ئەو خوانەناسانەی نزیکن لێیانەوەو هاوسێیانن هەتا دێنە ناو بازنەی ئیسلامەوە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە پێشدا دەستی کرد بە شەڕ کردن لەگەڵ موشریکەکان لە دوورگەی عەرەبیدا، کاتێ لە جەنگی ئەوانە لێبوەوەو خودا سەری خست بەسەر مەککەو مەدینەو تائیف وُ یەمەنو یەمامەو حەزەرەمەوت هەجەرو خەیبەرو چەندین ناوچەی تری دوورگەی عەرەبیداو خەڵکی لە ناوچەکانی تری عەرەبیشەوە پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلام دوای ئەوە دەستی دایە جەنگ کردن لەگەڵ ئەهلی کتێبدا، خۆی ئامادە کرد بۆ غەزا کردن لەگەڵ ڕۆمەکاندا، چونکە ڕۆمەکان نزیکترین کەس بوون لە دورگەی عەرەبیەوە، وە شیاوترین کەسیش بوون کە بانگ بکرێن بۆ ناو ئیسلام، ئەهلی کتێبیش بوون، هەتا تەبوك ڕۆشت بە دوایاندا، پاشان لەبەر قاتو قڕیو هەڵسانی گرانی لە وڵاتدا گەڕایەوە، ئەوەش لە ساڵی نۆهەمی کۆچی پێغەمبەردا بوو(ﷺ) پاشان لە ساڵی دەهەمدا سەرقاڵی حەجی ماڵئاوایی بوو، پاشان مردن یەخەی پێگرت دوای حەج کردنی بە هەشتاو یەك ڕۆژ، خوای گەورەبردیەوە بۆ لای خۆی، دوای خۆی ئەبوبەکری سدیق، کە وەزیرو جێ متمانەی بوو هەڵسا بەو فەرمانەو بووە جێنشینی، ئاینەکە خەریك بوو بەرەو هەڵدێر بڕوا، خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕاوەستاوی کردو بناغەکەی بەهێز کردو ستونەکانی دامەزراند، ئەوانەلە ئیسلام دوور کەوتبوونەوە هێنانیەوە ناوبازنەی ئیسلام و یاخیەکانیشی گێڕایەوە بۆلای ئاینی ئیسلام. زەکاتی وەرگرت لەو نەفامانەی کە دەیانویست زەکات نەدەن، حەقیشی ڕوون کردەوە بۆ ئەوانەی شارەزا نەبوون. ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست بیکات، پێی هەڵسا، پاشان دەستی کرد بە ئامادەکردنی لەشکری ئیسلام بۆ سەر ڕۆمە خاچ پەرستەکانو فارسە ئاگرپەرستەکان، خوای گەورەبەهۆی بەرەکەتی ئەو نوێنەرایەتییەی ئەوەوە ئەو وڵاتانەی بۆ ئازاد کردو لووتی کیسراو قەیسەرو هەموو ئەوانەیشی دانەواند لەو خەڵکەی گوێڕایەڵیان بوون، گەنجینەکانیشیان لە ڕێی خوادا خەرج کرا، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی فەرموو بوو، تەواو کردنی کارەکەی کەوتە دەست ڕاسپاردەو جێنشینەکەی دوای خۆی فاروقی تۆبەکار، شەهیدی میحراب، ئەبوحەفس عومەری کوڕی

خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێ) کە خوای گەورەلووتی خوانەناسیو بێدینانی بە ئەو دانەواندو دووڕوو سەرکەشانی لەناو بردو دەستی گرت بەسەر ئەو ماڵو سامانانەدا لە خۆرهەڵاتو خۆرئاوایەوە، هەرچی گەنجینەکانە لە ناوچە دوورو نزیکەکانەوە بارکرا بۆلای، ئەویش بەپێی شەریعەوتی خوا دابەشیکرد بە شێوازێکی وا هەموو ڕزیبوون لێی. دوای ئەوەی بە شەهیدی مردو بە ڕێزەوە ژیا، هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆچەریانو ئەنسارەکان یەك دەنگ بوون لەسەر دانانی گەورەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان(ڕەزای خوای لێ بێ) (شەهید ناوماڵی خۆی) بە جێنشین، ئیسلامی تێرو تەواو کرد بە هەموو ناوچەکاندا بڵاوی کردەوە و خەڵکەوە و بەسەر گەردنی خەڵکەوە، پەیامی خوای گەیاندە هەموو هەرێمەکان و ئیسلام لە ڕۆژئاواو ڕۆهەڵاتی زەویدا دەرکەوت و زاڵ بوو، وتەی خودا بڵند بوو ئاینەکەیشی بڵاو بوەوە، ئەم ئاینە پاکەی خودا تەنگی هەڵچنی بە دوژمنانی خودا بە تەواوی، هەر کە سەردەکەوتن بەسەر گەلێکدا، دەچوون بۆ ئەو گەلانەی تر کە هاوسێی ئەوان بوونو دەستیان دابوە ملهوڕیو بەدکاری. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗ﴾ واتە: با خوانەناسان هێزو تواناتان ببینن کاتێ کە شەڕیان لەگەڵ دەکەن، بێگومان موسوڵمانی تەواو ئەو کەسەیە لەگەڵ برا موسوڵمانەکانیدا نەرمەو بەرانبەر دوژمنو خوانەناس زۆر بە زەبرو زەنگە. وەك خوای گەورەلە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[1] خوا لەمەولا کۆمەڵێکی وا دەخاتە ڕوو، خۆشی بوێنو ئەوانیش خوایان خۆش بوێ بەرانبەر خاوەنباوەڕان نەرمو نیانو بەهێزو توندن بەرانبەر خوانەناسان. وە فەرموویەتی: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾[2] موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەری خوایە، ئەوانەش کە لەگەڵ ئەون، لە بەرانبەر خوانەناسان توندو تیژو لەناو خۆیاندا دلۆڤانن. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ﴾[3] ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەو خوانەناسانەو ئەو دووڕووانە شەڕ بکەن، زەبرو زەنگیشیان نیشاندە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ بشزانن خوا لەگەڵ خۆپارێزانە، واتە: بجەنگن لەگەڵ خوانەناسانداو پشت بە خودا ببەستن بێگومان خوا لەگەڵتانە ئەگەر لێی بترسنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، هەر وایش بوو، خەڵکی ئەو سێ سەدەیە کە چاکترین کەسی ئەم ئوممەتە

[1] المائدة (٥٤).
[2] الفتح (٢٩).
[3] التحريم (٩).

بوون و زۆر خۆڕاگرو گوێبیستی فەرمانەکانی خودا بوون، بۆیە بەردەوام سەردەکەوتن بەسەر دوژمنەکانیانداو سەرکەوتن دوای سەرکەوتن و دوژمنانیش هەر بەرەو دابەزین و دەچوون و تووشی زیان دەبوون.، دوای ئەوەی ئاژاوەو بەلاو ئارەزوو خوازی و دژایەتی پەیدا بوو لەنێوان فەرمانڕەواکاندا، دوژمنان چاویان بڕیە سنورەکانی ئەم ولاتەو هاتن بۆ داگیر کردنی، کەسێ نەبوو بەریان لێبگرێ، لە سەرقالی کاربەدەستان بە یەکتریەوە: دوژمنان پەلاماری ناوچەکانی ولاتی ئیسلامیان داو زۆر ناوچەیان داگیر کرد، هەر بەردەوام بوون لەسەر داگیر کردن، هەتا زۆرێ لە ولاتانی ئیسلامیان خستەبندەستی خۆیان، ئاشکرایە هەموو کارێ بە دەستی خودایە چ لەمەو پێش و چ لەمەو دوایش، لە هەرسەردەمێکدا کاربەدەستانی ئیسلام هەڵسابن بە جیهادو فەرمانەکانی خوایان بەجێهێنابێ و پشتیان بە خوا بەستبێ، خوای گەورەدەروی لێ کردونەتەوەو ئەو ناوچانەیان لە دوژمن سەندوەتەوە، بەپێی ئەو گوێڕایەڵی و بەرفەرمانیەیان بۆ خودای مەزن، بێگومان خودا خۆی جێ نیازەو خاوەنی گشت شتێکە ئەگەر مەیلی لێ بێ، موسوڵمانان زاڵ دەکات بەسەر دوژمنە خوانەناسەکانیدا، وتەی خاوەن باوەڕان سەردەخات بەسەر هەموو ناوچەکاندا، چونکە هەر ئەوە زۆر بەخشندەو مەزن(سبحانە وتعالی).

﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾

## باوەڕی خاوەنباوەڕ زیاد دەکات و کەمیش دەکات، بەلام دووڕووەکان زیاتر پیس و چەپەڵ دەبن

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗا﴾ هی وایان لەناودا هەیە(واتە دووڕووەکان) تا سورەتێك دێتە خوارەوە دەڵێ: کێتان بڕوای پێ بەهێزتر بووە؟ خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ جا ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوە باوەڕیان بەهێزتر دەبێ و ئەوان مژدە بەخش و خۆش حاڵن، ئەم ئایەتە گەورەترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە باوەڕ زیاد دەکات و کەمیش دەکات، وەك چۆن زانایانی پێشینەو پاشینە ڕایان وایە، بەڵکو زۆرێ لەو زانایانە گوتویانە: زانایان یەکڕان لەسەرئەمە. لەم بارەیەوە لە سەرەتای شەرحی بوخاریدا(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بە چاکی باسی لێکراوە. پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانەیش دڵیان نەخۆشە، پیسی دێتە سەر پیسیان و بە خوانەناسی دەمرن. واتە: گومان و دوودڵیان زیاتر دەبێ

لەگەڵ ئەو گومانو دوو دڵیەی خۆشیاندا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾[1] ئێمە جگە لەم قورئانە شتی وات بۆ ڕەوانە دەکەین کە شیفاو بەزەیی تێدایە بۆ خاوەن باوەڕەکانو ستەمکارانیش زیاتر پێی زیانبار دەبن. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾[2] بڵێ: ئەمە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان پێ هێناوە ڕێبەرو چارەی دەردانە، ئەوانەش بڕوای پێ ناکەن، گوێ گرانن لە بیستنو چاویان لە دیتنی کوێرە، هەر دەڵێی لە جێی دوورو بانگ دەکرێن. ئەمەیش یەکێکە لە هۆکاری بەدبەختیان، ئەوەی دەبێتە هۆی شارەزا بونیان، دەبێتە مایەی گومڕا بوونو لەناوچونیان، وەك چۆن ئەوانەی سروشتیان خراپە کە خۆراکیان پێ دەدرێ زیاتر تێك دەچنو سوودی لێ وەرناگرنو پێی کەم دەکەن.

﴿ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾

### تاقیکردنەوەی دووڕووەکان

خوای گەورەباسی دووڕووەکان دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ ئایا ئەمانە نابینن کە ساڵانە جارێك یان دوو جار تاقی دەکرێنەوە، لە ئاکامدا نە پەشیمان دەبنەوەو نە تەمێ خواریش دەبن، واتە: نە لە گوناهـ پێشوەکانیان پەشیمان دەبنەوەو نە پەندو ئامۆژگاریش وەردەگرن لەوەی کە لەمەو بەدوا تووشیان دێ. موجاهید ئەڵێ: تاقی دەکرێنەوە بە قاتو قڕیو برسێتی[3]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ هەرکاتێ سورەتێ دێتە خوار، هێندێکیان دەڕواننە هێندێکیان، ئاخۆ کەس ئێوە دەبینێ؟ لە پاشان دەگەڕێنەوە، خوا دڵیانی وەرگێڕاوە، چونکە ئەمانە لە دەستەی بێ ئاوەزەکانن، دیسان خودای گەورە باسی دووڕووەکان دەکات، کاتێ کە سورەتێك بهاتایەتە خوارەوە

---

[1] الاسراء (٨٢).

[2] فصلت (٤٤).

[3] الطبري (١٤/٥٨٠).

بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیری یەکتریان دەکردو پشتیان دەکردە هەق و لەلای پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەسان، ئەمە حاڵی دووڕووەکان بوو لە دنیادا لەسەر هەق ڕانەدەوەستان و بەرەو ڕووی نەدەچوون و لێی تێنەدەگەیشتن وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ۝٥٠ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾[1] چیانە ڕوو وەردەگێڕن لە ئامۆژگاری(قورئان)؟ دەڵێی حوشترن و ڕاو نراون لە ترسی شێر هەڵاتوون. وە فەرموویەتی: ﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ۝٣٦ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾[2] دەی ئەو بێدینانە چیانە؟ دێنە لاتو بە مۆنێکەوە دەڕوانن، دەستە دەستە لەلای ڕاستو چەپتەوە، واتە: ئەوانە چیانە بەلای ڕاستو بە لای چەپتدا دەڕۆن و لە هەق ڕادەکەن و بەرەو گومرایی مل دەنێن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ انصَرَفُوا صَرَفَ اللَّهُ قُلُوبَهُم﴾ واتە: لە پاشان دەگەڕێنەوە، خودا دڵیانی وەرگێڕاوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾[3] وەختێ ئەوانە خۆیان لادا خودایش دڵی ئەوانی لادا. واتە: ئەوانە لە وتاری خودا تێناگەن و هەوڵیش نادەن لێی تێبگەن و حەزیش ناکەن لێی حاڵی بن، بەڵکو نایەنەوێ خۆیانی پێوە خەریك بکەن و خۆیانی لێ دوور دەگرن هەر لەبەر ئەوە ئاوایان لێهات کە لێیان هات.

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٢٨ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۝١٢٩﴾

**ڕەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) چاکەیەکی گەورەی خودایە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ پێغەمبەرێك هاتوە بۆتان، لە خۆتانە، هەر بەڵایەك بەسەرتان بێ، لای گرانە، زۆر دڵی بەلاتانەوەیە، دڵسۆزو دلۆڤانە بەرانبەری خاوەن باوەڕان. خودای گەورە منەت دەکات بەسەر باوەڕداراندا بەوەی کە پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردون لە خۆیان، واتە: لەسەر زمان و نەژادی خۆیان وەك ئیبراهیمی خەلیل فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا

---

[1] المدثر (٤٩-٥١).

[2] المعارج (٣٦-٣٧).

[3] الصف (٥).

مِّنْهُمْ ﴾[1] پەروەردگارمان هەر لە خۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرە. وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾[2] خاوەن باوەڕان بەر منەتی چاکەی خودان، کە پێغەمبەرێکی هەر لە خۆیان بۆ ناردوون. وە لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرە هەر لە خۆتانەو بە زمانی خۆتان ڕەوانە کراوە، وەك جەعفەری کوڕی ئەبوتال (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی بە نەجاشیو موغەیرەی کوڕی شوعبە ووتی بە ڕاسپاردەکەی کیسرا: بەڕاستی خودا پێغەمبەرێکی ناردوە بۆمان لە خۆمانەو ئاگاداری ڕەوشتو بنەماڵەو هەڵسوکەوتو ڕاستگۆییو ئەمانەتی ئەوین[3] پاشان ئەفەرموێت: ﴿عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ﴾ هەر شتێ ئوممەتەکەی ئازار بداتو نارەحەتی بکات بە لایەوە گرانە، وە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە:(بە ڕاستی ئەم ئاینە سانایەو شەریعەتەکەیشی گشت ئاسانەو فراوانەو تەواوە، ئاسانە لەسەر کەسێ خوای گەورەئاسانی کردبێ لەسەری)[4] ﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُم﴾ زۆر سوورە لەسەر(باوەڕ هێنان) تان، واتە: زۆر سوورە لەسەر ڕێنیشانداندانو سوود پێگەیاندنتان لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا، ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بێگومان خودا هیچ قەدەغەکراوێکی قەدەغە نەکردوە مەگین زانیویەتی کە بەو زوانە شارەزای ناو خۆتان لێی شارەزا دەبێ، با بزانێ کە من دەستم گرتوە بە پشتوێنەکەتانەوە تاخۆتان نەخەنە ناو ئەو ئاگرە وەك پەپولەو مێشو مەگەز خۆیانی تێئەخەن)[5] ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵسۆزو دلۆڤانە بەرانبەر خاوەن باوەڕان. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾[6] باڵت شۆڕ بکە بۆ ئەو خاوەنباوەڕانەی کە شوێنت کەوتوون، جا ئەگەر بە گوێیان نەکردی بڵێ: من بێزارم لەوەی ئێوە دەیکەن، هەر خۆشت بە خاوەن

---

[1] البقرة (١٢٩).
[2] آل عمران (١٦٤).
[3] أحمد (٢٠٢/١)، (٢٩١/٥).
[4] فتح الباري (١١٦/١).
[5] أحمد (٣٩٠/١).
[6] الشعراء (٢١٥-٢١٧).

دەستەڵاتی دڵۆڤان بسپێرە. وە هەر بەم شێوەیەش خوای گەورەفەرمانی داوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا، لەوەی کە بۆت هێناون لەو پەیامە گەورەو بێگەردو تێرو تەواوە ﴿فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ بڵێ: من هەر خودام بەسە جگە لەو هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾[1] پەروەردگاری خۆرهەڵاتو خۆرئاوایە، جگە لەو هیچ کەسێ بۆ پەرستن ناشێ. ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ کاری خۆم داوەتە دەست ئەو، هەر ئەویشە خاوەنی عەرشی مەزنە، واتە: هەر ئەو خودایە خاوەنو وەدیهێنەری هەموو شتێکە چونکە هەر ئەوپەروەردگاری عەرشی مەزنە کە باوبنە(السقف)ی هەموودروستکراوەکان و گشت ئەو وەدیهێنراوانەشە کەلە ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیش لەناویاندایە و لە نێوانیاندایە هەموو لە ژێر عەرشی خوادان(جل جلالە)، هەموو ملکەچیشن لەبەردەم دەستەڵاتو تواناو زانیاری ئەو خوا گەورەیەدا کە(زانستی ئەو)دەوری هەموو شتێکی داوە، بڕیاری لە گشت شتێکدا جێبەجێ دەکرێ، هەر خۆی خاوەنی هەموو شتێکە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە(ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەڵێ: دوایین ئایەت کە هاتە خوارەوە لە قورئان ئەم ئایەتە بوو: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە.[2] وە لەم فەرموودە سەحیحەدا کە زید ئەڵێ: کۆتایی سورەتی بەرائەم دۆزیەوە لەلای خوزەیمەی کوڕی سابت یان ئەبی خوزەیمە بوو، لەپێشەوەش باسی ئەوەمانکرد کە کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیان وەبیردێتەوە کە ئەوانیش لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وەك خوزەیمەی کوڕی سابت کاتێ کە خوزەیمە دەستی کرد بەخوێندنەوەی ئایەتەکە بۆیان) والله أعلم.

---

[1] المزمل (٩).

[2] فتح الباري (٨/١٩٥).

# تەفسیری سورەتی یونس

## لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓر تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الٓر تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ ئەلیف، لام، ڕا. ئەمە چەند نیشانەیەکن لە کتێبی کارزانی. لە بارەی ئەم پیتانەوە لە سەرەتای سورەتەکانەوە، قسەکراوە دەربارەیان لەسەرەتای سورەتی بەقەرەدا، ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ واتە: ئەمە ئایەتەکانی قورئانی نەگۆڕاوی پڕ کارزانیە.

### ئەم پێغەمبەرە دەبێ مژدەدەر بێ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ﴾ ئایا مەردم سەریان سوڕ دەمێنێ، پیاوێکمان هەر لەناو خۆیان ڕاسپاردوە. لەو ئایەتەدا خودا وەڵامی ئەو خوانەناسانە ئەداتەوە کە سەیر ماوەن لەوەی کە پێغەمبەرانی ناردوە لە مەردم خۆیان، وەك لە چەند ئایەتی تردا باسی گەلە پێشوەکانی کردوە کە ئەوانیش هەر وایان گوتوە: ﴿أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا﴾[1] جا چۆن مرۆڤ دەتوانن ڕێ نیشانی ئێمە بدەن؟ نوح و سالح پێغەمبەریش بە گەلەکەیان گوت: ﴿ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ﴾[2] ئایا ئێوە پێتان سەیر بوو کە ئامۆژگاریەك لەلای پەروەردگارتانەوە هات بۆ پیاوێك هەر لە خۆتان. وە باسی خوانەناسەکانی قورەیشیش دەکات کە ئەوانیش ئەڵێن: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ﴾[3] چۆن دەیەوێ لە جێی ئەو هەموو بتانەی دەیانپەرست هەر خودایەك بپەرستن؟ ئەمە زۆر شتێکی سەیرە. زەححاك ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە: کاتێ خودای گەورە موحەممەدی(ﷺ) ڕەوانەکرد بە پێغەمبەری، عەرەبەکان ناڕەزاییان دەربڕی و بڕوایان نەدەکرد. یان هەندێکیان بڕوایان نەدەکردو دەیانگوت: خودا لەوە گەورەترە کە ڕاسپاردەیەکی خۆی لە مرۆڤ بنێرێ وەك موحەممەد،

---

[1] التغابن (٦).

[2] الاعراف (٦٣).

[3] ص (٥).

ئەڵێ: خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا﴾.[1] ﴿أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾ کە خەڵکی بترسێنیو ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ مژدە بدات بەوانەی خاوەن باوەڕن: پلەی بەرزیان لەلای پەروەردگاریان هەیە؟ ڕای جیاواز هەیە لەسەر ئەمە، عەلی کوڕی ئەبوتەلحە: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەڵێ: بەختەوەرییان بۆ پێشکەوتوە لە لەوحولمەحفوزدا[2]، عەوفی ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ دەڵێت: پاداشتێکی چاکیان هەیە بەهۆی ئەوەی لە پێش خۆیانەوە ناردویانە، موجاهید ئەڵێ: ﴿أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ یانی: کردارە چاکەکان. نوێژو ڕۆژوو ماڵ بەخشینو تەسبیحاتیان. وە ئەڵێ: موحەممەدیش(ﷺ) شەفاعەتیان بۆ دەکات[3] ﴿قَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ مُّبِينٌ﴾ خوانەناسەکان ئەڵێن: ئەم پیاوە ئاشکرایە جادووگەرە. واتە: لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن لە خۆیان کە مژدەیان بداتیو بیانترسێنێ ﴿قَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ إِنَّ هَـٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ خوانەناسان ئەڵێن: ئەو پیاوە جادووگەرێکی ئاشکرایە، دیارە ئەوانە درۆزنن کە ئەوانە دەڵێن.

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾

### خودا خاوەنی بوونەوەرو پەروەردگارو هەڵسوڕێنەریەتی

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ پەروەردگارتان خودایە کە بە شەش ڕۆژ ئەم ئاسمانانو زەمینەی دروستکردوە و ئەوسا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دامەزراوەو بە کاروباری ڕادەگات، خودای گەورە دەفەرموێت کە پەروەردگاری گشت بونەوەرەو ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژدا وەدیهێناوە، ئەڵێن: وەك ئەم ڕۆژانە، گوتراویشە: هەر ڕۆژێکی هەزار ساڵی لەم ڕۆژانەیە کە ئێوە دەیژمێرن، وەك لەمەودوا باسی دێت، ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ پاشان لەسەرعەرشی فەرمانڕەوایی خۆی دامەزراند، ئەو عەرشە

---

[1] الطبري (١٥/١٣).
[2] الطبري (١٥/١٥).
[3] الطبري (١٥/١٤).

گەورەترین دروستکراوەو سەربانی هەموو شتەکانە، ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ واتە: بە کاروباری دروسکراوەکانیدا رادەگات ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[1] هەرچی هەیە لە زەمین و ئاسماندا(با لە قورسایی مێرولەی هەرە وردیلەش یان وردتر یان هەر درشت تر بێ) هیچیان لە پەروەردگاری تۆ ناشارێتەوەو وا لە کتێبی دیاری دەردا، هیچ کاتی کارەکان سەرقاڵی ناکەن و هیچ داخوازیە تووشی هەڵەی ناکات، پێداگرتنی داواکاران بێتاقەتی ناکات، بەرێوەبردنی(کاری) گەورە یان بچووك سەرقاڵی ناکات لەناوکێوەکان‌و دەریاکان، ئاوەدانیەکان‌و چۆڵەوانیەکان. ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا﴾[2] لەم زەمینە هەر شتێ دەجولێتەوە گشتی رۆزی لەسەر خوایە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[3] هیچ گەڵایەك لە هیچ شوێنێ بێ زانینی ئەو ناوەرێ، هەرچی دەنکەو لە تاریکایی زەویداو هەرچی تەرە یان وشکە، گشتی لەناو دەفتەرێکی ئاشکرادایە. دەراوردی ئەڵێ: لە سەعدی کوری ئیسحاقی کوری کەعبی کوری عەجەزەوە کە ئەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ کاروانێکی گەورەیان پێگەیشت‌و وایان دەزانی حەتمەن ئەوانە عەرەبن، پێیان گوتن: ئێوە کێن؟ ئەڵێن: لە جنۆکەین، دەرچووین لە مەدینە، ئەم ئایەتە وەدەری نایێن، ئیبنوئەبی حاتەم ئەمەی ریوایەت کردوە، پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ﴾ کێ دەتوانێ لای ئەو ببێتە تکاکار کاتێ ئەبێ بۆ خۆی ئیزنی بدات؟ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە فەرموویەتی: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾[4] کێی وا هەیە هەتا(بۆ خۆی ئیزنی نەدات) بتوانێ تکای لا بکات. وە فەرموویەتی: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾[5] لەو هەموو ئاسمانەدا چەندین فریشتە هەیە کەسیان تکای لێ ناگیرێ کەسێ نەبێت کە خودا ئیزنی بداتو تکا بۆ کەسێ

---

[1] یونس (٦١).

[2] هود (٦).

[3] الانعام (٥٩).

[4] البقرة (٢٥٥).

[5] النجم (٢٦).

بكات كە خۆی حەز كاو پێی ڕازی بێ. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥ﴾[1] تكاش لای ئەو بەهرە نادات، بۆ كەسێ نەبێ كە ئیزنی بدات. لە دوایی ئایەتەكەدا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ هەر ئەو خودایە پەروەردگاری ئێوەیە، دەسا عەبدایەتی بكەن، ئایا ئێوە هیچ بیری لێ ناكەنەوە؟ واتە: هەر تەنیا عیبادەتی ئەو بكەن كە شەریكی نیە، خۆتان چاك دەزانن كە خوای گەورەوەدیهێنەرە كەچی ئێوەی بتپەرست لە كاروبارەكانتاندا پەرستراوی تر دەپەرستن، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَهُمۡ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾[2] ئەگەر لە خۆیان بپرسی كێ ئەوانی وەدیهێنا دەڵێن: خودا. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾[3] بڵێ: ڕاهێنەری حەوت ئاسمانەكانو ڕاهێنەری تەختی هەرە مەزن كێیە؟ دەڵێن: گشتی هی خوایە، بڵێ: دەی بۆچی هیچ ترستان نیە؟ ئایەتی پێش ئەم ئایەتەو ئایەتی دوایش هەر وایە.

﴿إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٤﴾﴾

### گەڕانەوەی هەموو بۆ لای خودایە

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ بەڵێنی خودا ڕاستە، ئێوە هەموو بەرەو ئەو دەگەڕێنەوە، ئەو لە پێشدا وەدی دەهێنێو پاشان دەیگەڕێنێتەوە. خودای گەورە باسی ئەوە دەكات كە هەموو دروستكراوەكان لە ڕۆژی قیامەتدا دەگەڕێنەوە بۆ لای، هیچی بەجێ ناهێڵێ، وەك چۆن لە سەرەتادا دروستی كردن وایش دەیانهێنێتەوە، وەك لە ئایەتێكی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾[4] خۆی ئەو خەڵكە وەدی دێنێو دواجاریش دەیهێنێتەوە كە بۆ ئەو ئاسانتریشە ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ تا ئەوانەی باوەڕدارنو كردەوەی چاكیان بووە(بێ جیاوازی) پاداشتی خۆیان بداتێ، بە تەواویو دادوەرانە، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ

---

[1] سبأ (٢٣).
[2] الزخرف (٨٧).
[3] المؤمنون (٨٦-٨٧).
[4] الروم (٢٧).

يَكۡفُرُونَ ﴾ ئەوانەش کە خوانەناس بوون،(لە سزای ناسوپاسیدا) ئاوی زۆر گەرم دەخۆنەوەو جەزرەبەی بە ژانیان دەبێ، واتە: بەهۆی خوانەناسیانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا چەندەها جۆر سزایە ئەدرێن وەك گرە باو ئاوە کوڵاو چرە دووکەڵ سێبەریانە ﴿ هَٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ ۝٥٧ وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ ﴾[1] با لەوێدا ئاوە کوڵاو کێمو زووخاو بخۆنەوە، هەر لەو جۆرە جەزرەبانە، چەندین وێنەی تریش هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ۝٤٣ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ﴾[2] ئەمە هەرئەو جەهەنمەیە تاوانباران بڕوایان وا نەبوو هەیە، لەناویداو لەناو ئاوەکوڵدا دەخولێنەوە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ۝٥ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ۝٦ ﴾

**هەموو شتێ شایەتە لەسەر توانای خودا**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا ﴾ هەر خۆیەتی خۆری کردە تیشکدەرو مانگی کردە تریفەدار. خودای گەورە باسی ئەو نیشانانە دەکات کە وەدیهێناوە، هەموو بەلگەن لەسەر توانای تەواوو دەسەلاتی مەزنی خۆی کە وای کردوە ئەو تیشکەی لە خۆرەوە دەردەچێ بوەتە ڕووناکیو ئەو تیشکەیش لە مانگەوە دەردەچێ کردویەتی بە ڕۆشنایی، ئەمە هونەرێکەو ئەویش هونەرێکی ترە جیاوازی دروستکردوە لە نێوانیاندا، تا لە یەك نەچن، توانای داوە بە خۆر لە ڕۆژداو تواناشی داوە بە مانگ لە شەوداو چەند قۆناغی بۆ دیاری کردووە، تا هەژماری ساڵەکانو حیسابتانی پێ بزانن، لە سەرەتاوە بە بچوکی دەردەکەوێ پاشان بە ڕووناکیو تەنەکەی زیاد دەکات هەتا بە ڕێکیو تەواوی دەردەکەوێ، پاشان دەست دەکاتەوە بە بچوك بونەوە هەتا دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەکەی پێشوی لە کۆتاییو تەواو بوونی مانگدا. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ۝٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾[3] مانگیش ئێمە بۆمان دانا بە چەند قۆناغدا تێپەڕێ، تا وای لێ دێ وەك پەلی کۆنەی وشکەڵی داری خورما دێتە بەر چاو، نە خۆر توانای وای هەیە

---

[1] ص (٥٧-٥٨).

[2] الرحمن (٤٢-٤٣).

[3] يس (٣٩-٤٠).

بگات بە مانگ، نە شەو پێش ڕۆژ دەکەوێ، هەموو لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗا﴾[1] خۆرو مانگی بۆ ژمارەی ئێوە ساز داوە. وە لەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَ﴾ وە چەند قۆناغی(بۆ مانگ) دیاری کرد، تا هەژماری ساڵەکانو حیسابتانی پێ بزانن. بە خۆر ڕۆژەکان دەزانرێو بە ڕۆشتنی مانگیش مانگەکانو ساڵەکان دیاری دەکرێ. ﴿مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ خودا بە ڕاستی ئەمانەی وەدیهێناوە. بە گاڵتە ئەمانەی دروستنەکردوە، بەڵکو خۆی دانایەو زۆر چاك دەزانێ لەبەر چیی و بۆ چیە. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا بَٰطِلٗاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2] ئێمە ئاسمانو زەویمان(ئەوەی کە لە نێوانیاندایە) بە خۆڕایی دروستنەکرد، ئەو کەسانەی وا بیر دەکەنەوە خوانەناسن، هاوار لەوانەی خوانەناسن، بۆ ئەو ئاگرەی دەچنە ناوی. وە فەرموویەتی: ﴿أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ﴾[3] ئایا ئێوە پێتان وا بوو بە گەمە دروستمان کردون، ناشتان هێنینەوە لای خۆمان؟، پایە بەرزی بۆ خودایە، کە پاشای ڕاستەقینەیە، هیچ پەرستویەکیش جگە لە ئەو نیە، هەر خۆیەتی پەروەردگاری تەختی گەورە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵگەکان شی دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە زانان. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ لە هاتوچۆی شەوو ڕۆژدا بە دوای یەکدا، کە ئەم هات ئەو دەڕواو هیچ دوا ناکەوێ. وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا﴾[4] ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێ، ڕۆژیش پەلە دەکەوێتە سەر شەو. وە فەرموویەتی: ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ﴾[5] نە خۆر توانای ئەوەندە هەیە بگات بە مانگ. وە فەرموویەتی: ﴿فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ

---

[1] الانعام (٩٦).

[2] ص (٢٧).

[3] المؤمنون (١١٥-١١٦).

[4] الاعراف (٥٤).

[5] يس (٤٠).

حُسۡبَانٗا ﴾[1] تێکوڵی شەوگار لادەدات‌و سپێدەتان بۆ دەخاتە ڕوو، شەوی بۆ ئۆقرە گرتن‌و خۆرو مانگیشی بۆ ژمارەی ئێوە دروستکردوە. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئەوەی لە ئاسمانان‌و زەمیندا دروستی کردون لەو نیشانانەن کە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی خودای مەزن. وەك لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾[2] چەندە زۆرن نیشانەکان لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا. وە فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴾[3] بڵێ: وردببنەوە بزانن لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا چی هەیە؟ کەچی ئەم هەموو نیشانەو ترساندنە کار ناکاتە سەر کۆمەڵی بڕوا نەهێن. وە فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾[4] ئایا ئەمانە لە پێشەوەو پاشەوەی خۆیان نەڕوانی، لەم ئاسمان‌و زەمینەدا؟ وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾[5] لە وەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەمینداو ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژدا، زۆر نیشانەی بتەو هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی دڵی وشیارن. وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ﴾ زۆر بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی لە تووڕەیی‌و تۆڵەو جەزرەبەی خودا دەترسن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ۝٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ۝٨﴾

**شوێنی ئەوانەی بڕوایان نیە بە ڕۆژی قیامەت جەهەنەمە**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴾ ئەو کەسانەی دیداری ئێمەیان ناوێ‌و بە ژینی دنیا ڕازین‌و لەو بارەیەوە ترسیان نیە، ئەوانەش لە بەڵگەکانمان خەبەریان نیە. خودای گەورە باسی ژیانی بەدبەختان دەکات، ئەوانەی بڕوایان بە دیداری خودا نیە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە هیوای هیچ شتێ نین لە لای خودا، ڕازین

[1] الانعام (٩٦).
[2] یوسف (١٠٥).
[3] یونس (١٠١).
[4] سبأ (٩).
[5] آل عمران (١٩٠).

بەم ژیانەی دنیا، بێ خەم ژیان دەبەنە سەر و تێیداو بێئاگان لە نیشانەکانی، حەسەنی بەسری ئەڵێ: سوێند بە خوا هەربۆیە دونیایان ڕازاندووەتەوە و گرنگی پێئەدەن، چونکە ڕازیبوون پێی، ئەوانە لە نیشانەکانی بوونەوەر بێ خەبەرن و بیری لێ ناکەنەوە، ئەرکە شەرعیەکانیش جێبەجێ ناکەن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، ئەوانەی بەهۆی کردەوەکانیانەوە ئاگر جێگەیانە لە ڕۆژی قیامەتدا، واتە: لەسەر ئەو گوناهو تاوانەو کردارە خراپانەیانەوە لە دنیادا کردویانەو بڕواشیان نەبوە بە خوداو پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی جەزرەبە ئەدرێن.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾

## پاداشتی چاك بۆ بڕواداران و ئاكار چاكانە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوون و ئاكار چاكن، بەو باوەڕەی کە هەیانە خوا ڕێگەیان نیشان ئەدات دەیانباتە ناو باغاتێك پڕ لە خۆشی و جۆباریان بە بەردا دەڕوا. خودای گەورە لێرەیشدا باسی بەختەوەران دەکات ئەوانەی بڕوایان بە خوا بوەو پێغەمبەرانیان بە ڕاست زانیوەو گوێبیستی فەرمانەکانی خودا بوون و کرداری چاکیان کردوە، خودا بەهۆی ئەو بڕوایەوە ڕێگەیان نیشان ئەدات، هەڵدەگرێ ئەو(الباء)ە سەبەبیە بێت (واتە: بەهۆی ئەو باوەڕە لە دنیا بویانە خوا ڕێگەی نیشان داون لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ سەر ڕاستە ڕێ بۆ ئەوەی ڕزگاریان ببێ و بڕۆن بۆ بەهەشت، وە هەڵیش دەگرێ ئەو بایە بائی پشتیوانی(الاستعانة) بێ، وەك موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴾ دەڵێت: ڕوناکیەکیان بۆ پەیدا دەبێ وهاوڕێ لەگەڵ ئەو ڕووناکییەدا ڕێگەدەکەن[1]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ نزایان لە بەهەشتدا هەر ئەمەیە: خودایە پاکی بۆ تۆیە، بەخێرهاتن لێکردنیان هەر سەلامە، دواین نزایان هەر ئەمەیە: سوپاس بۆ خوای ڕاهێنەری گشت جیهان. واتە: ئەمە حاڵی خەڵکی ناو بەهەشتە، ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا کە خودای گەورە

[1] الطبري (١٥/٢٨).

فەرموویەتی: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ﴾[1] ئەو ڕۆژەی کە دێنە بەر بارەگای ئەو(خودا) بەخێرهاتنیان بە(ووشەی) سەلامە. وە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا﴾[2] کە لەوێدان، نە قسەی هەرزە دەبیسن‌و نە وتارێکی ناڕەوا، ئەوەندەی سڵاو لە یەکتر دەکەن‌و وەڵامیشی پێ ئەدەنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾[3] پەروەردگاری دلۆڤانیش بە فەرمایشتی خۆی سڵاوێکیان بۆ دەنێرێ. وە فەرموویەتی: ﴿وَالْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم﴾[4] فریشتە لە هەموو لاوە دەچنە لایان(پێیان دەڵێن) سەلامتان لێ بێ. پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَٰلَمِينَ﴾ دوایین نزایان هەر ئەمەیە: سوپاس بۆ خوای ڕاهێنەری هەموو جیهان. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خودای گەورە هەمیشە سوپاسکراوەو هەمیشەیش پەرستراوە، بۆیە سوپاسی خۆی کردوە لە سەرەتای وەدیهێنانی دروستکراوەکانی بەردەوامیشە، وە لە سەرەتای کتێبەکەیداو وە لە کاتی ڕەوانە کردنیشیدا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَٰبَ﴾[5] سوپاس بۆ ئەو خوادایەی ئەم کتێبەی بۆ عەبدی خۆی ناردە خوارێ. وە فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى خَلَقَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ﴾[6] سوپاس بۆ خودایێ کە ئاسمانان‌و زەمینی دروستکردوە. وە چەندین حاڵەتی تریش کە ناکرێ لێرەدا بە درێژی باس بکرێ. هەر خودایە سوپاس کراوە لە سەرەتاو لە دوایشدا لە دنیاو لە دواڕۆژیشداو لە هەموو کاتێکدا. بۆیە لەم فەرمودەیەدا هاتووە:(خەڵکی بەهەشت فێری سوپاس‌و ستایش دەبن وەك چۆن فێری هەناسەدان دەبن)[7] ئەوە بەو شێوەیە دەبێ، لەبەرئەوەی هەموو ئەو بەهرانەی خودا دەبینن بەسەریانەوە کە چەندبارە دەبێتەوەو دیسان دەهێنرێتەوەو هەر زیاد دەکات، کە هەرگیز دوایی نایەت‌و ماوەی دیاری کراوی نیە، هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو هیچ پەروەردگارێکیش نیە جگەلەو.

---

[1] الاحزاب (٤٤).

[2] الواقعة (٢٥-٢٦).

[3] يس (٥٨).

[4] الرعد (٢٣-٢٤).

[5] الكهف (١).

[6] الانعام (١).

[7] مسلم (٤/٢١٨١).

﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ فَنَذَرُ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾﴾

**خودا وەڵامی دوعای شەڕ ناداتەوە وەك دوعای خەیر**

خوای گەورە فەرمویّت: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ فَنَذَرُ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ ئەگەر هەروەك خەڵكی لە خۆشی بە پەلەن، خوداش بۆ زیان لێدانیان بە پەلە بوایە، دیارە هەر دەمێك بوو نەدەمان، ئێمە واز لەوانە دێنین كە حەز لە دیدارمان ناكەن، با لە سەركێشی خۆیاندا سەرگەردان بمێننەوە. خودای گەورەلێرەدا باسی لەسەرخۆیی خۆڕاگری خۆی دەكات بەرانبەر عەبدەكانی كە كاتێ دوعای شەڕ لە خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان دەكەن لێیان قبوڵ ناكات لە كاتی توڕەیی‌و هەراسانیدا، چونكە خودا باشیان دەناسێ كە بە نیازی شەڕ ئەو دوعایە ناكەن، بۆیە ئەو نزایان لێ وەرناگرێ، ئەمەیش لە سۆزو بەزەیی خواوەیە، وەك چۆن كاتێ دوعای خێر بۆ خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان دەكەن لێیان وەردەگرێ. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾ واتە: هەر كاتێ خەڵكی نزای شەڕی بكردایەو خودایش وەری گرتایە قڕی دەكردن‌و لەناوی ئەدان، بۆیە نابێ نزای شەڕ زۆر بكرێ، وەك لەم فەرمودەیەدا هاتوە لە حافیز ئەبوبەكری بەزارەوە لە موسنەدەكەیدا ڕیوایەتی كردوە لە جابیرەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(نزا لە خۆتان مەكەن وە نزا لە منداڵەكانتان مەكەن وە نزا لە سامانتان مەكەن، نەوەك ئەو نزایەتان ڕێكەوتی ئەو كاتە بكات كە نزای تیادا قبوڵ دەبێ، نزاكەتان لێ قبوڵ بكات). ئەبوداودیش ڕیوایەتی كردوە[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا﴾[2] مرۆڤ چۆن حەز دەكات خێری بۆ بێ، ئاوایش دەیەوێ خراپی لێ بقەومێ، مرۆڤ هەر وا بە پەلە بووە. موجاهید ئەڵێ: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ﴾ ئەوە نزای خەڵكە لە ماڵ‌و منداڵی كاتێ كە توڕە دەبێ‌و لێی‌و دەڵێ: خوایە بەرەكەتیان تێ نەخەی‌و بێ بەشیان كە لە بەزەیی خۆت[3] ئەگەر خودا بە پەلە وەڵامیان بداتەوە لە نزای شەڕ، وەك چۆن لە نزای خێردا وەڵامیان ئەداتەوە لەناویان دەبات.

---

[1] أبوداود (٢/١٨٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] الاسراء (١١).

[3] الطبري (١٥/٣٤).

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢ ﴾

**مرۆڤ لە کاتی تەنگانەدا یادی خوا دەکات، بەڵام لە کاتی خۆشیدا لە بیری دەچێ**

خـوای گەورەنەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ ﴾ مرۆڤ کاتێ بەڵایەك یەخەی دەگرێ(لەسـەر تـەنیش یا بە ڕاکشان یان بە پێوە) لەبەرمان دەپاڕێتەوە کاتێ بەڵامان لەسـەریان لادا ﴿مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥ﴾ وەها دەڕوا هـەر وەك هیچ لەبەرمان نەپاڕابێتەوە بۆ بەڵایەك تووشی بووە. خوای گەورەباسی هەراسانیو دودڵی مرۆڤ دەکات کاتێ کە تووشی بەڵا دەبێ وەك لە ئایەتێکی تردا خودی گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ﴾[1] هەرکاتێ خراپەی تووش ببێ، ئەوە نـزاو هـاواری زۆر دەکـات. واتـە: زۆر دەپاڕێتـەوە ئەم دوو ئایەتە یەك مانایان هەیە، چونکە مرۆڤ کاتێ تووشی دڵەڕاوکەیەك بوو دڵی تەنگ دەبـێ وە زۆر دەپاڕێتەوە لەو کاتەدا، دەپاڕێتەوە لـە خـودا ئـەو بەڵایەی لەسـەر لاباتو هـەڵیگرێ، ئەمـە لـە کـاتی پاڵکەوتندا بێ یا بە دانیشتن بێ یان بە پێوە یان لە هەر حاڵەتێکدا بێ، کاتێ کە خـوا بەڵاکـەی لەسـەر لابردو دەرووی لێکـردەوە پـێ نـازانێو فیـز دەنوێنێو دەڕوا وەك ئـەوەی هیـچی لـێ نـەقومابێ ﴿مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥ﴾ واتە: دەڕوا وەك ئەوەی هەرگیز لێمان نەپاڕابێتەوە بۆ ئـەو بەڵایـەی کە بەسـەری هـاتوە. پاشـان خـودای گـەورە باسـی خراپـی ئـەو کەسانە دەکات کە ئەمـە ڕەوشـتو ڕێڕەویانـە. ئەفـەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ئـا بـەم جـۆرە کردەوەمـان ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوانەی هەڵە ڕۆن، بەڵام ئەوانەی کە خودا شارەزایی پێ بەخشیونو خستونیەتە سـەر ڕێی ڕاستو یارمەتی داونو وشیاری کردونەتەوە ئەم ئایەتـە نایانگرێتـەوە جیـا کراونەتـەوە. وەك ئـەم ئایەتـە کـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَٰتِ﴾[2] ئەوانـەی نـەبێت کـە خـۆڕاگرو ئاکـار چـاك بـوون، وەك پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی:(کـاری خاوەنبـاوەڕ جێـی سەرسوڕمانە، خودا هیچ بڕیارێکی بۆ نەداوە و ئەو بڕیارە چاك نەبوبێت بـۆی ئەگـەر تووشـی ناخۆشـی

[1] الفصلت (٥١).

[2] هود (١١).

بوبێ، خۆڕاگر بووە ئەوە خێر بوە بۆی، وە ئەگەر تووشی خۆشگوزەرانی بوبێ، سوپاسی (خوای) کردوە ئەوە خێر بوە بۆی، ئەمەیش بۆ هیچ کەسێ نابێ بۆ خاوەن باوەڕنەبێت).[1]

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ گەلێك بەرەمان(لە پێشودا) لەناو برد، کاتێ کە ستەمیان کرد، پێغەمبەران بە چەند نیشانەی دیارەوە هاتنە لایان، هەر باوەڕیان پێ نەهێنان، ئێمە ئاوا تاوانباران سزا دەدەین. لە پاش ئەوان ئێوەمان لەم سەر زەمینە جێنشین کرد کە ببینین کردەوەی ئێوە چۆن دەبێ. خودای گەورە باسی ئەو گەلە پێشوانە دەکات، کە چیان بەسەرهات کاتێ کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد لەگەڵ ئەو هەموو بەلگە بەهێزو ئاشکرانەدا کە بۆیان هێنان، پاشان خودای گەورە ئەو گەلانەی تری(دوای لەناوچونیان) لە جێیان دانا. پێغەمبەریشی بۆ ڕوانە کردن تا ببینێ چۆن گوێڕایەڵی دەکەن‌و شوێنی پێغەمبەرەکەی دەکەون. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(لە ڕاستیدا دونیا سەوزو شیرینە، خودایش ئێوەی کردۆتە جێنشین تێیدا، تەماشا دەکات داخۆ چی دەکەن، خۆتان لە دونیا بپارێزن‌و خۆشتان لە ژنان بپارێزن، چونکە لە ڕاستیدا یەکەمین بەڵای(نەوەی ئیسرائیل) بەهۆی ژنانەوە بوو).[2]

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

**باسی لاساری خوانەناسانی قورەیش**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ﴾ کاتێ بەلگە ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، ئەو کەسانەی

---

[1] مسلم (٤/٢٢٩٥).

[2] مسلم (٤/٢٠٩٨).

بە هیوای چاوپێکەوتنی ئێمە نین دەڵێن: قورئانێکی ترمان(جگە لەمە) بۆ بێنە یان بگۆڕە. خودای گەورە باسی لاساری خوانەناسان دەکات لە موشریکەکانی قورەیش، کە بڕوایان نەدەکرد بە پێغەمبەرو(ﷺ) دژایەتیان دەکرد، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی بەسەردا بخوێندنایە، کە کتێبی خوداو بەڵگەیەکی دیارو ئاشکرا بوو، پێیان دەگوت: قورئانێکی تری جگە لەم قورئانەمان بۆ بێنە، واتە: ئەمە لابەو قورئانێکمان بۆ بێنە، بە شێوەیەکی تر، یان بیگۆڕە بە بارێکی تر، خودای مەزنیش فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ﴾ بڵێ: لە توانامدا نیە کە لە خۆمەوە بیگۆڕم. واتە: ئەمە بۆ من نیە، بەڵکو من عەبدێکی فەرمانبەرو پێغەمبەرێکی ڕاگەیەنەرم لەلایەن خواوە ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ مــن هەرچی لە خواوە بۆم بێ. هەر لەوە پەیڕەوی دەکەم، ئەگەر من لە فەرمانی پەروەردگاری خۆم دەربچم. ترسم هەیە لە سزای ڕۆژە گەورەکە(واتە: ڕۆژی قیامەت).

### چەسپاندنی ڕاستی ئەم قورئانە

پاشان خوای گەورەبەڵگەیان بۆدەهێنێتەوەلەسەر ڕاستی ئەم قورئانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێناونو ئەفەرموێت: ﴿قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ﴾ بڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە بۆتانم نەدەخوێندەوە هەر فێریشی نەدەکردم، واتە: ئەوەی من بۆم هێناون، لەلایەن خوداوە ئێزن دراوم پێی. بە مەیلو ئارەزوی ئەوە، بەڵکەیش لەسەر ئەوەی کە من لە خۆمەوە نەمگوتوەو هەڵم نەبەستوە: ئێوە دەستەوسانن لە دژایەتی کردنی، وە ئێوە چاك شارەزای ڕاستگۆییو ئەمانەتی منن لەو کاتەی کە لە نێوان ئێوەدا ژیاومو پێگەیشتووم هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە ڕەوانەی کردم، ئێوە هیچ ڕەخنەیەکتان لەسەر من نەبووە تا بیکەنە بەڵگە کە بڕوام پێنەکەن، هەر بۆیە خودای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ من لە پێش ئەوەیش تەمەنێکم لەناو ئێوەدا بەسەر برد، دەی ئایا ئێوە بۆ ژیر نابنو بیر ناکەنەوە؟ واتە: ئایا ئاوەزتان نیە کە هەقی پێ بناسنو لە بەتاڵ جیای بکەنەوە؟ بۆیە کاتێ هیرقەل پاشای ڕۆم پرسی لە ئەبوسوفیانو ئەوانەی لەگەڵی بوون، لەبارەی ڕەوشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هیرقەل ئەڵێ بە ئەبوسوفیان: ئایا ئێوە تاوانبارتان کردبوو بە درۆزن پێش ئەوەی ئەم قسە بڵێ کە ئێستائەڵێ؟ ئەبوسوفیان ئەڵێ: گوتم: نەخێر، ئەبوسوفیان لەو کاتەدا سەری خوانەناسان بوو، سەرکردەی بتپەرستان بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا دانی نا بە هەقدا، مەزنی

لەوەدایە کە دوژمنان شایەتی بدەن بەوە. هیرقەل پێی گوت: من دەزانم کە ئەو(محمد(ﷺ)) کە درۆی لەگەڵ خەڵکیدا نەکردبێت، نایەت درۆ بە دەم خواوە بکات.[1]

﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ ﴾

خـــوای گەورەئەفـــەرموێت: ﴿أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەسێ یان نیشانەکانی خـودای بـە درۆ زانی؟ بێگومان تاوانباران ڕزگار نابن. واتـە: هـیچ کەسـێ لـەو کەسـە سـتەمکارترو لـووت بـەرزترو تاوانبارتر نیە کـە درۆ بـە دەم خـواوە هەڵدەبەسـێو خـۆی وا دابـنێ کـە خـوا ڕەوانـەی کـردوە، بـەڵام وانەبێو درۆ بکات، کەس لـەوە تـاوانی گـەورەترو ناهەقیەکـەی مـەزنتر نیـە، وێنـەی ئـەم کەسـانە لای کەسانی بێ ئاوەزو گەوجیش شاراوە نیە، کەواتـە چـۆن حـاڵی ئەمانـە لـە حـاڵی پێغەمبـەران دەچـێ؟ چونکە هەر کەسێ ئەم قسەی کرد ڕاست بکات یان درۆ هەر دەبێ خودای گەورە بـۆی ڕاسـت بکاتـەوە بە چەند بەڵگە لەسـەر چـاکی یـان خراپـی، کـە لـە خـۆر ئاشـکرا تـرە، بێگومـان جیـاوازی لـە نێـوان موحەممەدو(ﷺ) موسولیمەی درۆزن بۆ ئەوانەی چاویان پێی کـەوتوە ئاشـکرا تـر بـووە لـە جیـاوازی نێـوان کـاتی چێشـتەنگاو نیـوەی شـەوی زۆر تاریـک، وە لـە ڕەوشـتی هـەر یەکێکیانـەوەو لـەکردارو گفتاریانـەوە، کـە هەرکەسـێ چـاو ڕۆشـن بـێ ڕاسـتی پێغەمبـەرو(ﷺ) درۆزنـی موسـویلەمەی درۆزنو سەجاحو ئەسوەدی عەنەسی بۆ دەردەکەوێ. عەبدوڵلای کوڕی سـەلام ئـەڵێ: کـاتێ پێغەمبـەری خـودا گەیشتە مەدینە خەڵکی سڵەمینەوە منیش یەکێك بـووم لەوانـە کـە سـڵەمیەوە، کـاتێ بینیم زانیم کـە دەمو چـاوی، دەمو چـاوی پیـاوی درۆزن نیـە، ئـەڵێ: یەکـەم شـتێ کـە لێم بیست ئەیفـەرموو:(ئـەی خەڵکینە سلاو بکەن(لە یەکتری) خـواردن دەرخـواردی(یـەکتری) بـدەن، پەیوەنـدی خزمایـەتی بـەجێ بێنن، لە شەودا نوێژ بکەن کە خەڵکی نوستون بە سەلامەتی دەچنە بەهەشـت).[2] کـاتێ زمـامی کـوڕی سەعلەبە لەگەڵ هۆزەکەیدابوو کە بەنی سەعدی بـەنی بـەکر بـوون، یـەکێك لـەو قـسانەی کـە ئـەڵێ بـە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەڵێ: کێ ئەم ئاسمانەی بەرز کردوەتەوە؟ فـەرمووی:(خـودا) ئـەڵێ: کـێ ئـەم کێوانـەی دامەزرانـدوە؟ فـەرمووی:(خـودا). ئـەوەبوو گـوتی: کـێ ئـەم زەمینـەی تـەخت کـردوە؟ فەرمووی:(خودا). ئەڵێ: سـا سـوێند بـەو خودایـەی ئـەم ئاسمانـەی بـەرز کردوەتـەوەو ئـەم کێوانـەی دامەزرانـدوەو ئـەم زەمینـەی تـەخت کـردوە، خـودا تـۆی نـاردوە بـۆ هەمووخـەڵکی؟ فـەرمووی:(ئـەی خودایە(تۆ ئاگاداری) بەڵێ). پاشان پرسیاری لێ کرد لە بارەی نوێژو زەکاتو حـەجو ڕۆژوەوە، وە لـە

---

[1] فتح الباري (٨/٨٢).

[2] أحمد (٥/٤٥١).

هەر یەکێکیاندا ئەم سوێندەی دەخواردو پێغەمبەری خودایش(ﷺ) سوێندی دەخوارد. پێی گوت: ڕاست دەکەی، سوێند بەو کەسەی تۆی ڕەوانە کردوە بەڕاستی نە زیاد دەکەم لەوە بڕیاری داوە و نە کەمیشی ئەکەم. ئەم پیاوە تەنیا بەوە ڕازی بوو، بە تەواوی بڕوای بە ڕاستگۆیی پێغەمبەر کرد(ﷺ) بەوەی بینیو چاوی پێی کەوت لەو نیشانانەی کە بەڵگە بوون لەسەرڕاستگۆیی.[1] گێڕاویانەتەوە کە عەمری کوڕی عاص هاتوە بۆ لای موسەیلەمە، لە کاتی نەفامیدا هاوەڵی بوە، عەمر هێشتا موسوڵمان نەبوو، موسەیلەمە پێی ووت: هاوار بۆ تۆ ئەی عەمر، چی نێرراوەتە خوارەوە بۆ هاوەڵەکەتان،(یانی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم ماوەیەدا؟) ئەڵێ: من بیستومە هاوەڵەکانی سورەتێکی زۆر گەورەی کورت دەخوێننەوە، موسەیلەمە ئەڵێ: کامەیە؟ ئەڵێ: ﴿وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە. موسەیلەمە ماوەیە بیری کردەوەو پاشان ئەڵێ: منیش بۆم هاتوەتە خوارەوە، عەمر ئەڵێ: ئەوە کامەیە؟ ئەڵێ: (یاوبر! یاوبر! إنما أنت أذنان وصدر و سائرك حضر نقر) ئەی وەبر، ئەی وەبر(وَبْرْ، جۆرێکە لە گیانەوەر) بێگومان تۆ دوو گوێو سنگێکیو ئەوانی تریشت چاڵو کونە. ئەی عەمر چۆنی دەبینی؟ عەمر پێی گوت: سوێند بە خودا تۆ باش دەزانی کە من دەزانم تۆ درۆ دەکەی.[2] ئەگەر ئەمە قسەی بتپەرستێك بێ لە کاتێکدا کە موشریك بووە، حاڵی موحەممەدو(ﷺ) ڕاستگۆیی موحەممەدو(ﷺ) حاڵی موسەیلەمەی درۆزنو(بێ بەش لە بەزەیی خودا) درۆ کردنی موسەیلەمەی لەلا تێکەڵاو نەبوبێ، ئاخۆ ئەوانەی کە دڵیان ڕووناکو وریایەو خاوەنی ئاوەزو بیرو هۆشێکی ڕێكو ڕاستن دەبێ چۆن بێ؟ بۆیە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾[3]. کێ لەو کەسە ستەمکارترە درۆ بە دەم خواوە بکات؟ یا بڵێ من لە خواوە فەرمانم پێ ڕاگەیەنراوە، کە هەرگیز هیچ فەرمانیشی لە خواوە بۆ نەهاتوە، یان بڵێ: منیش لە وێنەی ئەوانەی خوا ناردویە دەتوانم بۆتان بنێرم، بۆیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی: ﴿أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾. هەر بەو شێوەیەش هیچ کەسێ بڕوای بەو هەقە نەبێ کە پێغەمبەران هێناویانە و بەڵگەی زۆری لەسەر هاتوە هیچ کەسێ لەوە ستەمکار تر نیە.

---

[1] أنظر زاد المعاد (٣/٦٤٧)، و أصلُ القسمةِ في البخاري (٦٣)، و مسلم (١٢).

[2] البداية و النهاية (٦/٣٢٦).

[3] الانعام (٩٣).

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

**ئەوەی بتپەرستان بە ئەماین لە پەرستراوەکانیان**

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ جگە خودا شتانی وا دەپەرستن، نە زیانیان لیّ ئەدەن‌و نە بەهرەیان بۆیان هەیە، دەشڵێن ئەمانە لای خودا بۆمـان دەبن بە تکاکار، بڵیّ: ئایا دەتانـەویّ خـوا لـە شتێك ئاگـادار بکـەن کە لـەناو ئاسمانـەکان‌و زەمیندا پێـی نەزانیون؟ خودای گـەورە بێزاری خـۆی دەردەبڕیّ لـە بتپەرستـان، ئەوانـەی لەگـەڵ خـوادا شـتی تـر دەپەرستن، وا دەزانن ئەوانە دەبنە تکاکاریان لەلای خوداو سوودیان پیّ دەگەیەنن، خودای گـەورەیش ئەفەرموێت ئەو بتانە نەسوودیان پیّ دەگەیەنن‌و نە زیانیشیان لیّ ئەدەن‌و هیچیشیان بـە دەست نیە ئەوەیش ئەوانە بەتەماین نابیّ‌و هەرگیز ڕوونادات. بۆیـە فەرموویـەتی: ﴿قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بڵیّ: ئاخۆ دەتانـەویّ خـوا لـە شتێك ئاگـادار بکـەن لـەناو ئاسمانـەکان‌و زەمیندا کە پێی نەزانیوە؟ ئیبنوجەریر ئەڵیّ: یانی: ئایا ئێوە خـودا لـە شتیّ ئاگادار دەکـەن کە ئـەو شتە لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا پێی نـەزانیوە[1] پاشـان خـوای گەورەباسـی پـاکی‌و بـیّ عـەیبی‌و پـیرۆزی خۆی دەکات کە زۆر بێزارە لەو بتپەرستی‌و خوانەناسـی ئەوانـە‌و ئەفـەرموێت: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ خودا پاکە‌و بەرزترە لەو شتانەی ئەوان دەیکەن بە شەریکی.

**ئەم بتپەرستیە داهێنراوە**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ﴾ هـەموو خـەڵکی یـەك تیرە بوون، پاشان لێك جیا بوونەوە، پاشان خودا ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەم بتپەرستیە ڕووداوێکە‌و خەڵکی دایانهێناوە، شتێکە کە نەبوە، هەموو خەڵکی لەسەر یـەك ئـاین بوون، ئـەویش ئـاینی ئیسلام بووە. ئیبنوعەبباس ئەڵیّ: نێـوان ئـادەم‌و نـووح دە سـەدە بـووە، هـەموویان لەسـەر ئیسلام(ژیانیـان

[1] الطبري (١٥/٤٦).

بەسەر بردووە)[1] پاشان جیاوازی لە نێوان خەڵکدا پەیدا بوو، بتپەرستراو شەریك پەیدا کرا بۆ خودا. خودای مەزنیش پێغەمبەرانی ڕەوانە کرد بە بەڵگەو نیشانەو ڕوونکردنەوەی بەهێزو پتەوەوە ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾[2] تا مردنی هەر کەس بە بەڵگەی ئاشکراوە بێ و ژینی هەر کەسیش بە بەڵگەی ئاشکراوە بێ. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ئەگەر لە پێشدا گفتی پەروەردگارت نەبوایە، ئەوەی کە مایەی کێشەیە لە ناویاندا ئێستە یەکالا کرابووەوە. واتە: ئەگەر لە پێشدا خودا بڕیاری نەدایە کە هیچ کەسێ سزا نادات تا بەڵگەی بۆنەنێرێت، وە خەڵکی ماوە داوە بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئەوەی لە نێوان ئەواندا کێشەیەو یەك لای ئەکردەوە، خاوەن باوەڕانی خۆشبەخت دەکردو خوانەناسانیشی تووشی ناڕەحەتی دەکرد.

﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾

### موشریکەکان داوای نیشانە دەکەن

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ دەڵـێن: بۆچـی موعجیزەیەکی لەلای پەروەردگاریەوە بۆ نەهاتوەتە خوارەوە؟ واتە: ئەو خوانەناس و بێ بڕواو لاسارانە دەڵێن: بۆچی موعجیزەیەك لەلایەن خوداوە بۆ موحەممەد(ﷺ) نەهاتوەتە خوارەوە، مەبەستیان ئەوەیە وەك چۆن خودا وشترەکەی دا بە سەموود، باکێوی سەفایان بۆبکات بە زێڕ یان کێوەکانی مەککەیان بۆ لابات، لە جێگایاندا باغات و جۆباریان بۆ وەدی بهێنێ، یان هەر جۆرێکی تر کە خوا دەتوانێ بیکات. بەڵام خودا کارزانە لە کردارو گفتارەکانیدا، وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾[3] پاکیەتی بۆ ئەو کەسەی ئەگەر مەیلی لێ بێ لەوە چاکترت دەداتێ، باغاتێکت پێ دەبەخشێ جۆباریان بە بەردا دەڕواو چەن کۆشکێکیشت بۆ دادەنێ (دیارە ئەوان قیامەتیان بە درۆ زانی، ئێمەش کوڵی جەهەنممان ئامادە کردوە بۆ هەر کەسێ کە قیامەت بە

---

[1] البداية و النهاية (١٠١/١)، و قال رواه البخاري.
[2] الانفال (٤٢).
[3] الفرقان (١٠-١١).

درۆ دەزانیٚ. وەك ئەم ئایەتەیش كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾[1] ئێمە كە نیشانەكانمان نەدەنارد، بۆ ئەوە بوو كە پێشینەكان بە درۆیان لە قەڵەم دەدان. خودای گەورە ئەفەرمویٚت بێگومان سوونەتی من لەناو دروستكراوەكانمدا وا بووە، كاتیٚ ئەوەی كە داوایان كرد پێم دان، ئەگەر باوەڕیان هێنا(ڕزگاریان بووە) بەڵام ئەگەر باوەڕیان نەهێنابیٚ، زوو تۆڵەم لێسەندوون. هەر بۆیە كاتیٚ پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشك خرا لە نێوان ئەوەی داوای دەكەن پێیان بدریٚ ئەگەر باوەڕیان هێنا(سزا نادرێن) ئەگەر بڕوایان نەهێنا سزا ئەدرێن. وە لە نێوان دوا خستنیان، پێغەمبەر(ﷺ) دواخستنیانی هەڵبژارد وەك چۆن چەند جار هێمن بوە بەرانبەریان، بۆیە خودای گەورە ڕێنمایی پێغەمبەری(ﷺ) كردوە، لە وەڵامدانەوەی ئەو شتانەی كە خوانەناسان داوایان لیٚ كردوەو فەرموویەتی: ﴿فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ﴾ بلیٚ: زانستی نەدیاری تەنیابۆ خودایە، واتە: هەموو كاروباریٚ بە دەست خودایە، هەر ئەو ئاگامی هەموو شتیٚ دەزانیٚ. پاشان خوای گەورەئەفەرمویٚت: ﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ﴾ ئەوا منیش لەگەلٚ ئێوە لە ڕیزی چاوەنواڕانم. واتە: ئەگەر ئێوە بڕوا ناكەن هەتا ئەوەی داوای دەكەن بە چاوی خۆتان نەبینن، چاوەڕوانی فەرمانی خودا بن لە بارەی منو ئێوەوە، ئەمە لەگەلٚ ئەوەیشدا چەند نیشانەی گەورەیان بە چاوی خۆیان بینیوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەوەی كە داوایان لیٚ كردوە، كاتیٚ كە ئاماژەی كردوە بۆ مانگ لە شەوی چواردەدا بوە بە دوو لەتەوە بە ئامادەبوونی خۆیان، بەشێكی مانگ لە دوای كێوەكەوە بووەو بەشێكی تری لە پێش كێوەكەوە بووە، ئەمە زۆر گەورەترە لە نیشانەكانی تری سەر زەمین لەوەی كە داوایان كردوەو لەوەیش كە داوایان نەكردوە.(خودا خۆی ئاگادارە) ئەگەر بیزانیایە ئەمانە داوای ئەوەی لیٚ دەكەن بۆ شارەزا بوونو زیاتر دامەزراو بونیانە وەڵامی ئەدانەوە، بەڵام خودا خۆی زانیویەتی كە ئەو داوایەی لیٚ دەكەن هەر لەبەر لاساریو لارە جلەویە، بۆیە هەر لەو گومانو دوو دڵیەدا هێشتونیەتەوە. وە زانیویەتی كە هیچ كەسێكیان باوەڕ ناهێنن، وەك ئەم ئایەتانە كە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[2] ئەو كەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لیٚ هاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن، جا با هەموو نیشانەیەكیشیان بۆ بیٚ، هەتا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ

[1] الاسراء (٥٩).
[2] یونس (٩٦-٩٧).

أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾[1] فریشتەکانیشمان بناردایەو مردوەکانیش قسەیان لەگەڵ بکردنایە، هەموو شتمان لە ڕووبەڕووی ئەوانەوە کۆکردایەتەوە هیچیان باوەڕیان نەدەهێنا کاتێك نەبێت کە خوا مەیلی لێ بوایە. ئەوەندە لوتیان بەرزەو خۆیان بە زل دەزانن وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾[2] واتە: ئەگەر دەرگایەکمان بۆبکردنایەتەوە لە ئاسمانەوەو ئەوان پیایدا بڕۆنە سەرەوە، ئەوسا دەیانگوت بێگومان ئێمە چاومان بەستراوە بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادومان لێکراوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ﴾[3] ئەگەر ببینن پارچەیەك لەم ئاسمانە دادەکەوێ، دەڵێن: ئەمە هەورێکی بەسەریەکدا کەوتوە. وە فەرموویتی: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾[4] ئەگەر ئێمە نامەیەکمان لەسەر کاغەز بۆ تۆ بناردایەتە خوارەوەو دەستیشیان لێ بدایە، ئەوانەی خوانەناسن هەر دەیانگوت: ببێ و نەبێ ئەمە جادوو نەبێ هیچی تر نیە! نمونەی ئەمانە زۆر کەمترن لەوەی کە وەڵامی داواکانیان بدرێتەوە. چونکە ئەوانە وەڵام دانەوەیان هیچ شودێکی نیە، لەبەر ئەوەی لەسەر لاساری و ڕکی خۆیان بەردەوامن ئەوەندە خراپەکارو بەدڕەوشتن. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾ دەسا ئێوە چاوەڕوان بن، ئەوا منیش لەگەڵ ئێوە لە ڕیزی چاوەڕوانم.

﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً مِّنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُم مَّكْرٌ فِىٓ ءَايَاتِنَا ۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا ۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ۖ مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٣﴾﴾

---

[1] الانعام (١١١).

[2] الحجر (١٤-١٥).

[3] الطور (٤٤).

[4] الانعام (٧).

## هەڵوێست گۆڕینی خەڵکی کاتێ کەسۆزێکی بەرانبەر ئەکرێت دوای ناڕەحەتییەك

خـــوای گەورەئەفــەرموێت: ﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ ﴾ وە کاتێ ئێمە دەچێژین چاکەو بەهرەیەك بەخەڵکی لەپاش زیانو ناخۆشیەك کە لێیان کەوتوە، دەستبەجێ ئەوان پیلان دەگێڕن. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات، کاتێ کە خەڵکی تووشی ناخۆشیەك کردو پاشان کەوتنە بەر بەزەیی خودا وەك بوونی(ڕۆزی) دوای نەبوونیو پیتو بەرەکەت دوای قاتو قڕیو باران بارین دوای وشکەساڵیو لەم جۆرانە، ﴿إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ ﴾ لەو کاتەدا پیلان دەگێڕن بەرانبەر نیشانەکانی ئێمە، موجاهید ئەڵێ: گاڵتە بە نیشانەکانی ئێمە دەکەنو بە درۆی دەخەنەوە.[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ ﴾[2] مرۆ ئەگەر بەڵایەك یەخەی دەگرێ(لەسەر تەنیشت یان بە ڕاکشان یان بە پێوە) لەبەرمان دەپاڕێتەوە، کاتێ بەڵامان لەسەر لابرد وەها دەڕوا هەروەك هیچ لەبەرمان نەپاڕابێتەوە. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردن(بۆ هاوەڵەکانی) دوای شوێنەوارێکی ئاسمان لە شەودا(واتە: دوای باران بارینێك لە شەودا) پاشان فەرمووی:(ئایا دەزانن ئەم شەو پەروەردگارتان چی فەرمووە؟) ئەڵێن: خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) باش دەزانن، فەرمووی:((خوا) فەرموویەتی: هەندێ لە عەبدەکانم بەیانیان کردوەتەوە باوەڕدارن پێمو هەندێکیشی حاشا دەکەن، ئەوە کە ئەڵێ: بارانمان بۆ باری بە سۆزو بەزەیی خودا، ئەوانە بڕوایان پێم هەیەو حاشا لە ئەستێرەکان دەکەن، بەڵام ئەوەی ئەڵێ: بارانمان بۆ باری بە هەڵهاتنی فلانو فلان(ئەستێرە) ئەوانە حاشا لە من دەکەنو باوەڕیان بە ئەستێرەکان هەیە).[3] خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ﴾ بڵێ: خودا بە پەلەترە لە تۆڵە لێ سەندنتان. واتە: زیاتر ماوەتان ئەداتو پەلەتان لێ ناکات، هەتا هی وا هەیە لە تاوانباران وا دەزانێ کە هەرگیز سزا نادرێ، بێگومان ئەو کەسە مۆڵەت دراوە، پاشان لەناکاو دەگیرێ نووسەرە بەڕێزەکانی ئێمە هەرچی ئەوان کردوویانە دەینوسنو لەسەری هەژمار دەکەن، پاشان دەیخەنە بەر دەمی هەرە زانا بە دیارو نەدیارەکان و ئەویش پاداشتیان ئەداتەوە لەسەر گەورەو زۆر بچووكو توێژاڵو پێستی تەنکی دەوری دەنکە خورما. پاشان خوای

[1] الطبري (٤٩/١٥).
[2] يونس (١٢).
[3] فتح الباري (٦٠٧/٢).

گەورەئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ هەر(خودا) خۆیەتی لەناو دەریاو لەسەر وشکایی دەتانگێڕێ، هەتا کاتێ لەناو کەشتی دان بایەکی خۆش دەتانبات‌و پێی دڵخۆشن، تا بای زۆر توند هەڵدەکات‌و لە هەموو لایەکەوە شەپۆلتان بۆ دێ‌و باش دەزانن کە هەموو دەوریان گیراوە. بەوپەڕی بڕوای پاکەوە لە خودا دەپاڕێنەوە: ئەگەر تۆ لەمە ڕزگارمان بکەی لە سوپاسگوزاران دەبین. واتە: هەرگیز هانا بۆ بتەکان نابەن لەگەڵیدا، بەڵکو تەنیا هەر لەو دەپاڕێنەوەو هانا بۆ ئەو دەبەن. وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾[1] هەر کاتێ لەناو دەریادا تووشی بەڵایەك هاتن، هانا بۆ هەر کەسێك بەرن، ون بووە، جگە لەو(خودا) هەر کە ڕزگاری کردن‌و چوونە سەر وشکانی، ئاوڕیشی لێ نادەنەوە، مرۆڤ زۆرسپڵەیە. وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ واتە: هەرگیز هاوەڵت بۆ دانانێین، هەر بە تەنیا عیبادەتی تۆ دەکەین لەوێدا، وەك چۆن لێرەدا بە تەنیا تۆ دەپەرستین، خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ هەر کاتێ خودا ڕزگاری کردن(بە ناهەقی) لەسەر زەوی یاخی دەبن، وەك هەر هیچ شت ڕووی نەدابێ ﴿كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ﴾[2] واتە: وەك ئەوەی هەر لەبەرمان نەپارابێتەوە بۆ ئەو بەڵایەی تووشی بووە. پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم﴾ ئەی خەڵکینە ئەم ناهەقیانە هەر زیانی بۆ خۆتانە. واتە: بێگومان تۆباڵی ئەو ستەمەی کە دیکەن دەکەوێتە سەر خۆتان‌و جگە لە خۆتان کەسی تر تووشی زیان ناکەن، وەك لەم فەرموودە سەحیحە کە هاتوە:(هیچ تاوانێ نیە شایەنی ئەوە بێ کە خودا زوو تۆڵەی بسێنێ لە دنیاداو لەگەڵ ئەوەیش خودا بۆیان هەڵدەگرێ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ خاوەنەکەی لە ناهەقی کردن‌و بڕینی پەیوەندی خزمایەتی).[3]

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بۆخۆشی ژیان لە دنیایە، کە زۆر کەم بایەخەو بێ

---

[1] الاسراء (٦٧).

[2] یونس (١٢).

[3] أبوداود (٥/٢٠٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

نرخە بۆتان. ﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ پاشان دێنەوە لای ئێمە، ئەوسا ئاگادارتان دەکەین کە چیتان کردوە، واتە: لە هەموو کردارەکانتان کە کردوتانە ئاگادارتان دەکەینەوەو هەقی خۆتانتان بە تەواوی ئەدەینێ، هەر کەسێ چاکەی بینی با سوپاسی خوا بکات هەرکەسیش شتی تری دی جگە لە چاکە با تەنیا سەرزەنشتی خۆی بکات.

﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ السَّمَآءِ فَاخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢٤) وَاللَّهُ يَدْعُوٓا إِلَىٰ دَارِ السَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ (٢٥)﴾

**نمونەی ئەم ژیانی دنیایە**

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ السَّمَآءِ فَاخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَٰمُ﴾ دیارە ژیانی ئەم دنیایە هەروەکو ئەو ئاوە وایە، لە ئاسمانەوە دەیبارێنین‌و رووەکی جۆراوجۆری ئەم سەر زەمینەی پێ دەڕوێ، ئەو شتانەی کە مرۆڤو ئاژەڵ دەیخۆن، خودای گەورە نمونەیەکی هێناوەتەوە بۆ جوانی‌و ڕازاوەیی ژیانی دنیاو بە پەلەو زوو کۆتایی هاتن‌و نەمانی؛ وەك ڕووەك‌و گژو گیا کە خودا لە زەوی دەری هێناوە، بەو ئاوەی لە ئاسمانەوە باراندویەتی، لەوانەی کە مرۆڤ دەیخوات لە کشتوکاڵ‌و بەری دارو درەخت بە جیاوازی چەشن‌و جۆرەکانیەوە، لەوانەیش کە گیانلەبەرەکانی تر دەیخۆن لە گیاو گژەو سەوزاییو شتی تر، ﴿إِذَآ أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا﴾ هەتا ئەو کاتەی زەمین ڕەنگاو ڕەنگ دەبێت، بەو جوانیە دوا کۆتایە، ﴿وَازَّيَّنَتْ﴾ خۆی ئەڕازێنێتەوە،بەوەی کە لەسەری دەڕوێ لەو هەموو گوڵ و گوڵاڵەو جوان‌و هەمە جۆرو چەشن‌و شێوەو ڕەنگە. ﴿وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ﴾ خەڵکی سەر زەوی وا دەزانن لە دەسەڵاتی ئەواندایە، واتە: ئەوانەی چاندویانەو ڕواندویانە لایان وایە کە دەتوانن لێی بکەنەوەو دروێنەی بکەن، ئا لەو کاتەدا بایەکی توندو سارد لێی بدات، کەڵاکانی وشك بکاتو بەروبومەکەی لەناوبەرێ ﴿أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ﴾ هەتا کاتێ فەرمانی ئێمەی دێتە سەر(جا بە شەو یان لە ڕۆژدا) وەکو درەو کراوی لێ دەکەین، هەروەك دوێنێ هەر نەبوبێ. واتە: دوای ئەوەی کە سەوزو جوان بوە وشك دەبێ. قەتادە ئەڵێ: ﴿كَأَن لَّمْ تَغْنَ﴾ وەك هەر خۆشی نەدیبێ، هەر بەو شێوەیە هەر کاروبارێ دوای

نەمانی وەك ئەوە وایە کە هەر نەبوبێ. بۆیە لەم فەرموودەیەدا هاتوە:(بەختەوەرترین کەسی دنیا دەهێنرێت یەك جار نوقم دەکرێ لە ئاگردا، پاشان پێی دەگوترێ: ئایا خێرو خۆشیت هەرگیز دیوە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر. وە سزا کێشترین کەسیش لە دنیا دەهێنرێت یەك جار لە بەهەشتدا نوقم دەکرێ، پاشان پێی دەگوترێ: ئایا هەرگیز ناخۆشیت بە خۆتەوە دیوە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر)[1] خودای گەورە لەبارەی تیاچوونەوە فەرموویەتی: ﴿فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ۝٦٧ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ﴾[2] لەناو ماڵانی خۆیاندا دەمودەست هەستیان لێ برا، دەتگوت هەر لەوێ نەژیاون. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئێمە ئاوا نیشانەکانمان شیدەکەینەوە بۆ ئەوانەی بیر دەکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن بەم نمونەیە کە دنیا لە دەستی خەڵکەکەی دەردەچێ‌و نامێنێ،بە پەلە لەگەڵ ئەوەیشدا پێی دەسخەڕۆ دەبن‌و وا دەزانن هەر دەمێننەوە تێیداو هەرگیز نامرن، کەچی هەرلەدەستیان دەردەچێ. بێگومان سروشتی دنیاوایە، ئەوەی بە دوایدا دەگەڕێ لە دەستی ڕادەکات. ئەوەیش نایەوێ دنیابە دوای ئەودا ڕادەکات، بۆیە خوای گەورەنمونەی دنیای هێناوەتەوە بە گژو گیای زەوی لە چەند ئایەتدا لە کتێبە پیرۆزەکەیدا و لە سورەتی کەهفدا فەرموویەتی: ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾[3] نمونەیەکیان لەسەر ژیانی دنیا بۆ بێنەوە، وەك ئاوێکە لە ئاسمانەوە دامان باراند، هەموو جۆرە ڕووەکێکی تێکەڵ‌و پێکەڵی بەرهەم هێنا، سەرەنجامیش بوو بە پووش با بڕاندو خوا بەسەر هەموو شتێکدا توانای هەیە. هەروەها لە سورەتی (زومەر)و (حدید)یشدا هەر بەو شێوەیە خودا نمونەی بۆ ژیانی دنیا هێناوەتەوە.

### هەڵنان بۆ ئەو بەهرانەی کە بەردەوامەو هەرگیز نەمانی بەسەردا نایەت

کاتێ خوای گەورەباسی دنیاو زوو لەناوچوونی کرد، خەڵك هەڵدەنێ‌و بانگیان دەکات بۆ چوونە ناو بەهەشت‌و ناوی ناوە ماڵی هێمن، واتە: دوور لە بەڵاو کەم‌و کوڕی‌و کۆسپ‌و تەگەرە. فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ خودا بۆ ماڵی هێمنی خەڵك بانگ دەکات‌و هەرکەسێ ئەو(خودا)یە خۆی حەز بکات، ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدا. لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێ هاتە دەرەوە بۆ لامان‌و

---

[1] مسلم (٤/٢١٦٢).

[2] هود (٦٧–٦٨).

[3] الكهف (٤٥).

فەرمووی:(من لە خەودا بینیم، وەك ئەوەی جوبرەئیل لەلای سەرمدا بێو میکائیلیش لە لای قاچمدا بێ، یەکێکیان ئەڵێ بە هاوەڵەکەی: نمونەیەکی بۆ بێنەوە. ئەڵێ: گوێت بگرە خوا گوێت بداتێ، تێ بگە خوا عەقڵت بداتێ، نمونەی تۆو ئوممەتەکەت وەك نمونەی پاشایەك وایە خانویەکی دروست کردبێو پاشان ماڵێکی تیا بکات پاشان خوانێکی چاك دروست بکات و دوای ئەوە نوێنەری خۆی بنێرێت خەڵکی بانگ بکات بۆسەرخوانەکەی(دەعوەتەکەی)، هەندێ لەو خەڵکە وەڵامی ڕاسپاردەکە بدەنەوەو هەندێکیشی وازی لێ بێنن، خودا(خۆی) پاشاکەیەو شوێنەکەیش ئیسلامەو خانوەکەیش بەهەشتە. وە تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) ڕاسپاردەکەی هەرکەسێ وەڵامی دایتەوە چووەتە ناو ئیسلام، هەرکەس چووە ناو ئیسلام چووەتە بەهەشت، هەرکەسیش چووە بەهەشت لێی خواردوە) ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە[1] وە لە ئەبودەردائەوە بە مەرفوعی هاتوە کە گوتوویەتی: هیچ ڕۆژێ نیە کە خۆری تێدا هەڵبێ حەتمەن لەگەڵیدا دوو فریشتە بانگ دەکەن، هەموو خەڵکی خودا دەیبیسێ جگە لە مرۆڤو جنۆکە:(دەڵێن) ئەی خەڵکینە وەرن بۆ لای پەروەردگارتان، بێگومان ئەوەی کەمو کیفایەتە چاکترە لەوەی کە زۆر و سەرقاڵکەرە). ئەشڵێ: خودا ئەوەی لە قورئاندا ناردوەتە خوارەوەو فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ﴾ ئیبنوئەبی حاتەمو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیان کردوە[2].

﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٦﴾

### پاداشتی ئاکار چاکان

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ﴾ بۆ ئەوانەی چاکە دەکەن چاکە دەکەینو زیاتریش، خودای گەورە باسی ئەو کەسە دەکات کە کاری چاکی کردوە، لە دنیادا بە باوەڕێکی بتەوو چاکەوە ژیاوە و هەڵساوە بە کاری باش، زیاتر چاکەی لەگەڵدا دەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا وەك فەرموویەتی: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾[3] ئایا پاداشتی کاری چاك چاکە دانەوەنەبێت چی ترە؟ پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَزِيَادَةٞۖ﴾ ئەوزیادەیە بریتییە لە: چەند بارەی چاکەکان، چاکە بە دە ئەوەندە هەتا حەوت سەد جارو دیسان زیاتر لەوەیش ئەو شتانەیش دەگرێتەوە کە پێیان ئەدات لە بەهەشتدا لە کۆشكو کیژی سپیو ڕەزامەندی خودایش لێیان، ئەوەیش کە بۆی هەڵگرتوون لە چاوڕۆشنیو لەمانە چاکترو گەورەترە، لەوەی کە پێیان دراوە. ئەویش ڕوانینە بۆ ڕووی پیرۆزی

---

[1] الطبري (١٥/٦١).

[2] الطبري (١٥/٦٠)، أحمد (٥/١٩٧).

[3] الرحمن (٦٠).

خودای گەورە، بێگومان ئەوە زیادەیەکە مەزنترە لە هەموو ئەو شتانەی کە پێیان دراوە، کە بە کرداری خۆیان بە دەستی ناهێنن‌و شایستەی نین، بەڵکو بە ڕێزو بەزەیی خودا خۆیەتی، تەفسیر و ماناکردنی(زیادە) بە ڕوانین بۆ ڕووی پیرۆزی خوای گەورە ڕیوایەت کراوە لە ئەبوبەکری سدیق‌و حوزەیفەی کوڕی یەمان‌و عەبدوڵلای کوڕی عەبباس‌و سەعیدی کوڕی موسەیەب‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاو عەبدوڕەحمانی کوڕی باست‌و موجاهیدو عیکرمەو عامیری کوڕی سەعدو عەتاو زەححاک‌و حەسەن‌و سوودی‌و قەتادەو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق‌و کەسانی تریشەوە.[1] لە(زانایانی) پێشینەو پاشینەوە، فەرموودەی زۆریش هاتوە لەو بارەیەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، لەو فەرموودانە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سوهەیبەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ پاشان فەرمووی:(کاتێ خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشت‌و خەڵکی ئاگر چوونە ئاگر، جاڕ چیەك جاڕ ئەدات:(دەڵێ) ئەی خەڵکی بەهەشت بەڕاستی لەلای خودا کاتێکتان بۆ دیاری کراوە دەیەوێ بۆتان جێبەجێ بکات. ئەوانیش دەڵێن: ئەوە کامەیە؟ ئایا تای تەرازوی قورس نەکردوین؟ ئایا ڕووی سپی نەکردوین‌و نەیخستوینەتە بەهەشت‌و ڕزگاری نەکردوین لە ئاگر؟(ئەڵێ) لەپڕدا پەردەیان بۆ لائەدرێت، دەڕوانن بۆخوای گەورە، سوێند بە خوا، خودا هیچ شتێکی پێ نەداون خۆشەویستر بێ لایان لەو ڕوانینە بۆیان چاوڕوونتر بۆیان).[2] هەر بەو شێوەیە موسلیم‌و کۆمەڵێکی تر لە زانایان ڕیوایەتیان کردوە.[3] پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ﴾ تۆزی ڕەش نانیشێتە سەر ڕووخساریان، لە گۆڕەپانی مەحشەردا وەك چۆن دەم‌و چاوی خوانەناسان‌و بەدفەڕان تۆزو دوکەڵ دایدەپۆشێ ﴿وَلَا ذِلَّةٌ﴾ تووشی سوکایەتیش نایەن، واتە: بە ئاشکراو بە پەنهانی سوکایەتیان بەسەردا نایە، بەڵکو بەو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾[4] خودا لە بەلای ئەو ڕۆژە پاراستنی‌و تووشی گەشەو خۆشی کردن. واتە: ڕووی جوان کردن‌و دڵیشی خۆش کردن، خوای گەورەئێمەیش بخاتە تەك ئەوانە بە ڕێزو بەزەیی خۆی ئامین.

---

[1] الطبري (١٥/٦٣-٦٨).

[2] أحمد (٣٣٢/٤).

[3] مسلم (١٦٣/١)، تحفة الاحوذي (٥٢٢/٨)، النسائي في الكبرى (٣٦١/٦)، إبن ماجة (٦٧/١).

[4] الانسان (١١).

﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾﴾

**پاداشتی خراپەی تاوانباران**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثْلِهَا﴾ ئەو کەسانەی کاری خراپیان کردوە، سزایان بە(ئەندازەی) ئەو کارە خراپەیە کە کردویانە. کاتێ کە خودای گەورە باسی ژیانی ئەو بەختەوەرانەی کرد کە چاکەکانیان دوو جار بۆ زیاد دەکرێ‌و لەوەیش زیاتر(پاداشت ئەدرێنەوە) بە دوای ئەوەدا باسی ژیانی بەدبەختانی کردوە، باسی دادپەروەری خۆی کردوە بەرانبەریان، کە بێگومان پاداشتیان ئەداتەوە بە وێنەی ئەو خراپەی کە پێی هەڵساون، زیاتر لەوە سزایان نادات. ﴿وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ﴾ ریسوایش دایان دەگرێ، بەهۆی تاوانەکانیانەوەو ترسیان لێی. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ﴾[1] کە دەیانبەنە سەر ئاگر، دەیانبینی زۆر سەر کز و داماون، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ﴾[2] پێت وا نەبێ خودا لە کردەی ستەمکاران بێئاگایە، بەڵام دەیانهێڵێتەوە تا ئەو رۆژەی کە لەوێدا هەموو چاوەکان زەق دەوەستن، لە ترساندا بە پەلە دەچن، سەرو گەردنیان رەق بووە. وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ کەسیش لە خوا نایانپارێزێ. واتە: هیچ بەربەست‌و پارێزەرێ نیە بیانپارێزێ لە سزای خودا، وەك ئەم ئایەتانەیە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾[3] خەڵکی ئەو رۆژە دەڵێ، رێگەی راکردن کوانێ؟ هەرگیز پەنایەك نیە، لەو رۆژەدا ئارامگا لای پەروەردگارتە، پاشان لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ دەڵێی رووبان چەند پارچە لە تاریکە شەو دایپۆشیون، ئەمانە هاورێی ئاگرن، تا هەتایە تێیدا دەبن(خودای گەورە لێرەدا باسی رەشی دەم‌و چاویان دەکات لە رۆژی قیامەتدا) وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ

---

[1] الشورى (٤٥).

[2] إبراهيم (٤٢-٤٣).

[3] القيامة (١٠-١٢).

أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾[1] لەو ڕۆژەدا هەندێك ڕوویان سپیە، هەندێكی تریش ڕەش داگەڕاون، ئەو كەسانەی ڕوو ڕەشی ڕۆژی قیامەتن، پێیان دەڵێن: ئێوە دوای باوەڕ هێنان چۆن ببنونە خوانەناس، سا سزا بچێژن بۆ ئەوەی كە بوونە خوانەناس، ئەوانەشی كە ڕوو سپین، بۆ هەمیشە بەر بەزەیی خودا كەوتونو تا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴾[2] ڕووی وا هەیە(لەو ڕۆژەدا) سورو سپی دیار دەدەن، دەم بە پێكەنینو شادن، هەندێ ڕووش هەیە ڕەشن، لەو ڕۆژەدا تۆزی مەینەتی لێ باریوە.

﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ وَرُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾﴾

## حاشا كردنی پەرستراوی موشریكەكان لێیان لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ﴾ لەو ڕۆژەدا كە هەموو كەسێ كۆ دەكەینەوە، واتە: هەموو خەڵكی سەر زەوی لە مرۆڤو جنۆكەو چاكەخوازو خراپەكار، وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَحَشَرْنَـٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾[3] هەموویان كۆ دەكەینەوە، بێ ئەوە كەسیان جێ بمێنێ. لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ﴾ پاشان بەو كەسانە دەڵێین كە شەریكیان بۆ خوا دانا: ئێوە لەگەڵ شەریكەكانتاندا لە جێ مەبزوێن. واتە: لە شوێن خۆتان ڕاوەستن ئێوەیشو ئەوانیش، لە شوێنێكی دیاری كراوی جیادا بن دوور لە جێگای خاوەنباوەڕان. وەك لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَٱمْتَـٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾[4] ئەی ئەوانەی تاوانبارن ئێوەش ئەمڕۆدەبێ خۆتان جیابكەنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ﴾[5] ڕۆژێ كە

---

[1] آل عمران (١٠٦–١٠٧).
[2] عبس (٣٨–٤٠).
[3] الكهف (٤٧).
[4] یس (٥٩).
[5] الروم (١٤).

قیامەت هات، ئەو ڕۆژە بەش بەش دەبنەوە. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾[1] ئەو ڕۆژە بڵاوە دەکەن. واتە: لە یەکتری جیا دەبنەوە، ئەمە کاتێ دەبێت کە پەروەردگاری پاك و بێ عەیب و مەزن هات بۆ جیا کردنەوەو ڕایکردنی(ئەو خەڵکە) هەر بۆیە ئەمە گوتراوە،[2] خاوەنباوەڕان دەپاڕێنەوە لە خوای گەورە کە بێت بۆ جیا کردنەوەو ڕایکردنیان و(دەڵێن) تا لەم شوێنەماندا کە تێیدان ڕزگارمان بکات. وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە:(ئێمە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر تەپۆلکەیەکین لە سەروو ئەو خەڵکەوە)[3] خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی ئەو فەرمانە دەکات کە ئەیدات بۆ بتپەرستان و بتەکانیان لە ڕۆژی قیامەتداو ئەفەرموێت: ﴿مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ﴾ ئێوە لەگەڵ شەریکەکانتاندا لە جێ مەجوڵێن، بەو زوانە لێکیان جیا دەکەینەوە، شەریکەکانیان قسەیان لەگەڵ دەکەن، ئێوە هەرگیز ئێمەتان نەپەرستوە. ئەو پەرستراوانە حاشایان کردوە لە پەرستنی ئەوانە بۆیان و ناڕەزایی خۆیان دەربڕیوە، وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ﴾[4] نەخێر، حاشا لە پەرستنیان دەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا﴾[5] لەو کاتەدا ڕێبەرەکان لە پەیڕەوەکانی خۆیان حاشا دەکەن، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَافِلُونَ ۝ وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَآءً﴾[6] کێ لەو کەسە گومڕاترە هانا بۆ جگەلە خوا دەبات؟ بۆ کەسێ کە تا قیامەت وڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لە پاڕانەوەیان نیە، کاتێ مەردم هەموویان کۆ دەکرێنەوە ئەوان دەبنە دوژمنیان. لەم ئایەتەدا خودا باسی پەرستراوەکان دەکات، کاتێ کە ئەو کەسانە پەرستویانن چونەتە لایان پێیان گوتون کە ئێمە ئێوەمان پەرستوە،(پەرستراوەکانیش دەڵێن) وەك خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ﴾ لە نێوان ئێمەو ئێوەدا خودا شایەت بێ بەسە، ئێمە هیچ ئاگامان لێ نەبوە کە ئێوە ئێمەتان پەرستوە. واتە: ئێمە بێ ئاگاین و نازانین کە ئێمەتان پەرستوە، بەڵکو ئێوە لە خۆتانەوە ئێمەتان پەرستوە، ئێمە

---

[1] الروم (٤٣).
[2] هنا بياض في الاصل.
[3] مسلم (١/١٧٧).
[4] مريم (٨٢).
[5] البقرة (١٦٦).
[6] الاحقاف (٥-٦).

ئاگاداری ئێوە نەبووین خوا شایەت بێ لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، کە ئێمە ئێوەمان بانگ نەکردوە کە بمانپەرستن و فەرمانیشمان پێ نەکردون، هەرگیز ڕازی نەبوین بەوەی کردوتانە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾ هەر لەوێدا هەموو کەسێ بە تاقیکردنەوەدا تێدەپەڕێ، هەر کارێ لە پێشدا کردویەتی دێتەوە ڕوو. لە وێستگەی لێپرسینەوەدا لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو کەسێ ئاگادار دەکرێ و دەزانێ لە پێشدا چی کردوە لە چاکە و لە خراپە، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾[1] لەو ڕۆژەدا کە نهێنی ئاشکرا دەبێ. وە فەرموویەتی: ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾[2] لەو ڕۆژەدا خەڵکە هەواڵی پێدەدرێ، چی لە پێشدا بەڕێ کردوەو چیشی لە دوا بەجێ ماوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾[3] بۆی دەردەهێنین (ئەو نوسراوە) لە ڕۆژی قیامەتدا بە کراوەیی نیشانی ئەدەین(پێی دەگوترێ): خۆت نامەی بخوێنەرەوە ئەمڕۆ ئیتر هەر خۆت هەژمارکەری خۆتی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَرُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾ دەیانبەنە لای خودای گەورەی بەڕاستی هەمووان. واتە: گشت و کاروبارەکان گەڕاونەتەوە بۆ لای خودای فەرمانڕەوای دادپەروەر جیای کردوەتەوەو خەڵکی بەهەشتی خستوەتە بەهەشت و خەڵکی ئاگریشی خستوەتە ناو ئاگر. ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾ هەر درۆیە هەڵیانبەستبوو بە فیڕۆ چوو، واتە: ئەوەی موشریکەکان دەیانپەرست جگە لە خوا بە درۆ هەڵیانبەستبوو لە دەستیان چوو.

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾﴾

**دانپیانانی بتپەرستان بە تاك و تەنهایی خوادا لە پەروەردگاریداو هێنانەوەی بەڵگە بەوە لەسەریان**

خوای گەورەناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ لەو بتپەرستانەی دان دەنێن بە تەنهایدا لە پەروەردگاریدا کەچی دان نانێن بە پەرستنیدا بە تەنهایی و ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ بڵێ:

---

[1] الطارق (٩).

[2] القيامة (١٣).

[3] الاسراء(١٣ـ١٤).

کێ لە ئاسمان‌و زەمینەوە ڕۆزیتان ئەدات، واتە: ئەوەی ئاوی بارانتان لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێنی‌و زەوی لەت دەکات بە تواناو مەیلی خۆی‌و دانەوێڵەی تیا ڕواند. وەك ئەفەرموێت: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ٢٧ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ٢٨ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ٢٩ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ٣٠ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا﴾[1] ئەوسا دانەوێڵەمان لێ ڕواندا، ڕەزو سەوزایش هەر بەو شێوەیە بنە زەیتون‌و دار خورمایش، دارستانی چڕو پڕو میوەو لەوەڕگەیش، ﴿أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِ﴾[2] ئاخۆ هیچ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوا هەیە. دەڵێن(نەخێر) هەر خودا خۆیەتی، وە فەرموویەتی: ﴿أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥ﴾[3] ئەی ئەو کەسە کێیە ڕۆزیتان ئەدات، ئەگەر(خودا) ڕۆزی لێ بڕین؟. لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ﴾ یان خاوەنی ئەم گوێ‌و چاوانەتان کێیە؟ واتە: ئەوەی ئەم هێزی بیستن‌و بینینەی پێداون، ئەگەر مەیلی لێ بێ، هێزەکەی لادەبات‌و لێتان دەسێنێتەوە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾[4] بڵێ: ئەوخوایە کە ئێوەی وەدیهێناوەو گوێ‌و چاوو دڵی پێداون، (کەچی) ئێوە کەمتر شوکری دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِ﴾[5] بڵێ: بە من بڵێن ئەگەر خوا هەستی گوێ‌و سۆمای چاوتان لێ بسێنێ‌و لەسەر دڵەکانیشتانەوە مۆر دابنێ، کێ دەتوانێ(جگە لە خوا) بتانداتەوە؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ ج کەسێکیش زیندوو لە مردوو دەردێنی‌و مردوو لە زیندوو دەردێنێ، واتە: بە تواناو گەورەیی‌و منەتی زۆری خۆیەتی، ﴿وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ﴾ وە کێیە بە کارەکاندا ڕادەگات؟ واتە: کێیە مولکایەتی هەموو شتێکی بەدەستە، جێی پەنایەو کەس ناتوانێ ڕێگری بێ، خۆی کاربەدەست‌و فەرمانڕەوایە کەس بۆی نیە دەست بخاتە کاری، هەرچی دەکات پرسیاری لێ ناکرێ، بەڵام ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ. ﴿يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ﴾[6] ئەوەی لە ئاسمان‌و زەمیندایە(هەموو) داوای(پێویستیەکانیان) لە خودا

---

[1] عبس (٢٧-٣١).
[2] النمل (٦٠).
[3] الملك (٢١).
[4] الملك (٢٣).
[5] الانعام (٤٦).
[6] الرحمن (٢٩).

دەکەن هەموو ڕۆژێ(خودا) بە کارێکەوە خەریکە. ئەوەی لە سەرەوەیەو ئەوەی لە خوارەوەیەو ئەوەیش تێیاندایە لە فریشتەو مرۆڤو جنۆکە هەمووی خودا خاوەنیەتی، پێویستیان بە ئەوەو بەندەی ئەونو ملکەچین ﴿فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ﴾ بێگومان گورج دەڵێن خودا، ئەوان ئەوە باش دەزانن و دانیشی پێدا دەنێن، ﴿فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ بڵێ: دەی بۆ لێی ناترسن؟ واتە: ئایا لێی ناترسن کە شتی تر لەگەڵیدا دەپەرستن بە ئارەزوو نەفامی خۆتان؟ پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ﴾ بەڵێ، هەر خوا پەروەردگاری ڕاستیتانە واتە: ئەو(خودای) کە دانتان پیا نا، بێگومان ئەو کارانە هەموو ئەو دەیکات کە پەرستراو پەروەردگاری ڕاستیتانە کە شایەنی ئەوەیە بە تەنیا عیبادەتی بۆ بکرێ، ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ﴾ لە پاش ڕاستی چی هەیە جگە گومڕایی؟ هەموو پەرستراوێ جگە لە خودا گومڕاییە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو، تەنیایەو شەریکی نیە، ﴿فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾ دەی چۆن لە ڕاستی لا ئەدرێن؟ واتە: چۆن لە پەرستنی خودا لائەدەن و دەچن عیبادەتی شتێ دەکەن جگە لەو، وە ئێوە دەزانن کە خودا ئەو پەروەردگاریەکە هەموو شتێکی وەدیهێناوەو خاوەن دەستەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئا بەم جۆرە وتاری پەروەردگاری تۆ لەسەر لە ڕێدەرەکان بە ڕاست گەڕا، کە ئەوانە بڕوا ناهێنن. واتە: لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو بتپەرستانە خوانەناس بوون بەردەوامیش بوون لەسەر بتپەرستیو عیبادەتی غەیری خودا، کەچی دانیشیان دەنا بەوەدا کە خوا وەدیهێنەرو ڕۆزی دەرو خاوەن موڵكو دەستەڵاتە خۆی بە تەنیا، ئەو خودای پێغەمبەرانی خۆی نارد بۆ ئەوەی خەڵکی هەر ئەو بپەرستن، ئا بەو شێوەیە قسەی خودا بە ڕاست گەڕا، ئەوانە بوونە جێنشینی ئاگرو بەدبەخت بوون. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾[1] ئەڵێن: بەڵێ. بەڵام بڕیاری سزا دراوە بەسەر(ئێمەی) بێ باوەڕاندا.

﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۚ قُلِ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ (٣٤) قُلْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ ۚ قُلِ اللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّي إِلَّا أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ (٣٥) وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ (٣٦)﴾

---

[1] الزمر (٧١).

ئەمە پوچەڵ کردنەوەی بانگەشەی بتپەرستانە کە غەیری خوایان دەپەرست لە بتو شتەکانی تر، ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ بلێ: ئایا لەناو ئەو شەریکانەتاندا هی وا هەیە کە لە نوێ شتێك دروست بکاتو پاشان زیندوی بکاتەوە؟(نەخێر) ئەوەی دەستی کرد بە دروست کردنی ئەم ئاسمانانەو زەمینەو ئەوەیش کە تیایەتی لە بونەوەر وەدیهێناو ئەستێرەکانی ئاسمانو زەمینی جیا کردەوەو پاشانیش ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیش لەناویاندایە لەناو دەباتو لە دوایدا ئەو خەڵکە زیندوو دەکاتەوە بە زیندوکردنەوەیەکی نوێ، خودایە تاكو تەنیایەو هەر خۆی ئەو کارانە دەکاتو شەریکی نیە ﴿يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ بلێ: خودا لە پێشدا بونەوەری دروست کردوەو دوایش زیندوی دەکاتەوە. دەی چۆن لە ڕاستی لادەدەنو دەچنە سەر ڕێی پڕوپوچ؟ پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ﴾ بلێ: لەناو شەریکەکانتذا هی وا هەیە کە ڕێبەری ڕاستە ڕێ بێ؟ بلێ: خودا بەرەو ڕاست خەڵکی شارەزا دەکات، واتە: خۆتان چاك دەزانن کە ئەوانەی کردوتانە بە شەریکی خودا، توانای شارەزا کردنی گومڕایەکیان نیە، بەڵکو ئەوەی سەرگەردانو گومڕاو دڵەکان وەردەگێڕێ لەسەر لێشێواویەوە بۆ ڕاستە ڕێ ئەو خودایە کە هیچ پەرستراوێکی تر نیە جگە لەو. ﴿أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ﴾ ئایا کەسێك کە ڕێبەری ڕاستە ڕێیە، چاکترە شوێنی کەوون یان کەسێ ڕێگە شارەزا نیە، گەر ڕێگەی پێ نیشان بدەن؟ واتە: ئایا بەندە شوێنی کەسێ بکەوێ کە ڕێگەی ڕاستی نیشان ئەدات و بووەتەکە کەسێکی چاو ساغ پاش ئەوەی کوێربووە یان شوێنی کەسێ کەوێ کەهیچ ڕێگەیەك نازانێ ئەوەنەبێ خەڵك بۆ کوێرەوەری کەپیەکەی خۆی بانگ بکات؟ وەك خودای گەورە باسی ئیبراهیمیش دەکاتو کە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا﴾[1] ئەی باوکە تۆ بۆ شتێکی وا دەپەرستی نە دەبیسیو نەدەبینیو هیچ بەهرەیەك بە تۆ نادات. وە ئەڵێ بە هۆزەکەی: ﴿أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾[2] ئایا ئێوە شتێ دەپەرستن کە هەر خۆتان دەیدەتاشن؟ کە هەر خوایە ئێوەشو کردەوەکانتانیشی وەدیهێناوە. چەندین ئایەتی تریش لەم بارەیەوە هاتوە. ﴿فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ چیتانە چۆن بڕیاری وا ئەدەن؟ واتە: چۆن وا بیر دەکەنەوە؟ چۆن خوداو دروستکراوەکانی وەك یەك سەیر دەکەنو ئەوانەتان کردوە بە هاوتای خوداو فلانو فلانتان پەرستوە؟

---

[1] مريم (٤٢).

[2] الصافات (٩٥-٩٦).

خۆزگە هەر پەروەردگارتان بە تەنیا دەزانی کە هەر ئەو کاربەدەستو فەرمانڕەواو ڕێنیشاندەرە لە گومراییەوە بۆ پەرستنی خۆی بە تەنیا، بە دڵسۆزیو پاکی هاوارتان لێ دەکردو دەگەڕانەوە بۆی ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ زۆرینەیان هەر لە شوێن خەیاڵ دەڕۆن، خۆ خەیاڵیش لە ئاستی ڕاستی هیچ ناهێنێ، پاشان خوای گەورەڕوونی دەکاتەوە کە ئەوانە هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان بە دەستەوە نیە بۆ ئەو بتپەرستیە بەڵکو هەر خەیاڵو داڵغەو دوو دڵیە کە هیچ بەهرەیەکیان پێ نادات ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ خودا لە ئاکارەکانیان ئاگادارە، ئەمە هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆر توندە، چونکە خودای گەورە ئاگاداری داوە کە بەو زوانە بە تەواوی سزایان ئەدات(واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا).

﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن
رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ
﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ
عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴿٣٩﴾ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِالْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾﴾

**بێگومان ئەم قورئانە وتەی خوایەو باسی هەندێ موعجیزەکانی قورئانیش**

ئەم باسە، باسی موعجیزەی قورئانە کە مرۆڤ ناتوانێ بە وێنەی بێنێ، نە دە سورەت نە سورەتێ، چونکە ئەو ڕەوانبێژیو پاراویو کورتیو شیرینیو واتا پڕ سوودەی لەبارەی دنیاو قیامەتەوە، تەنیا لەلایەن خوداوە نەبێ، نابێ. کە هیچ شتێ لە خوداو لە سیفەتیو لە کردارو گفتاری ناچێ، وتەی خودا هاوشێوەی وتەی دروستکراوەکانی نیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ناگونجێ ئەم قورئانە هی خودا نەبێو هەڵبەستراو بێ. واتە: وێنەی ئەم قورئانە نایەت لەلایەن خوداوە نەبێت، ئەم وتەیە لە وتەی مەردم ناچێ، ﴿وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەم قورئانە باوەڕ دەکات بەو کتێبەی کە وا لە پێشدا هاتووەو ئێستا لەبەر دەستیدایەو شایەتە بەسەریەوە، ئەو گۆڕانکاریەی کە تێیاندا کراوە ڕوونی دەکاتەوە، ﴿وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ڕۆشنکەرەوەی کتێبەکانە کە هیچ گومانی تێدا نیە لەلایەن پەروەردگاری گشت جیهانەوەیە، واتە: ڕۆشنکەرەوەی فەرمانەکانو حەڵاڵو حەرامەکانە بە چاکیو تەواوی ڕێکو پێکی گومانی تێدا نیە لەلایەن خودای هەموو جیهانەوە هاتوە ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ یان دەڵێن: خۆی هەڵی بەستوە، بڵێ: ئەگەر بە ڕاستیتانە خۆتانو هەر

کەسێکی تر(کە دەتوانن جگە لە خوا بانگی بکەن) تا سورەتێکی وەك ئەم(سورەتە) بێنن. واتە: ئەگەر بوختانتان کردو بەگومان بوونو واتانزانی ئەم قورئانە لەلای خوداوە نەهاتوەو دەڵێن درۆیە وا نیە: ئەمە لەلایەن موحەممەد خۆیەوەیە، خۆ موحەممەد وەك ئێوە مرۆڤەو وەك ئێوە دەڵێن، ئەم قورئانە خۆی هێناویەتی، دەی ئێوە سورەتێك بە وێنەی ئەوە بێنن، واتە: لە چەشنی قورئانە، یارمەتیش وەرگرن لە هەرکەسێ دەتوانن یارمەتی لێ وەرگرن لە مرۆڤو جنۆکە بۆ ئەمە. ئا ئەمە سێهەم جێگەیە لەم بەرەنگار بوونەوەدا، بێگومان خودای گەورە بەرپەرچیان ئەداتەوەو بانگیان دەکاتو ئەفەرموێت ئەگەر لەو قسانەدا کردویانە ڕاستیان کردوە کە گوتویانە موحەممەد خۆی هێناویەتی، دەی با ئەوانیش بە وێنەی ئەوە بێنن کە ئەو هێناویەتی، یارمەتیش لە هەرکەسێ وەردەگرن با وەری گرن، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی کە ئەوان هەرگیز ناتوانن ئەوە بکەنو ڕێی تێ نابەن وەك ئەفەرموێت: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾[1] بڵێ: ئەگەر مرۆڤو جنۆکە هەموو کۆ ببنەوە، وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن لە وێنەی بێنن، با هەمووشیان پشتیوانی یەکتر بن. پاشان خودای گەورە هێناویەتە سەر دە سورەت لە سەرەتای سورەتی هوود داو ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾[2] یان دەڵێن: هەڵی بەستوە، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، دەی بە یارمەتی هەرکەسێ دەستتان دەکەوێ(جگە لە خودا) دە سورەتی هەڵبەستە هەر وەك ئەم بێنن. پاشان دێتە خوارەوە بۆ یەك سورەت، وەك لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ یا دەڵێن: خۆی هەڵی بەستوە بڵێ: ئەگەر بە ڕاستیتانە خۆتانو هەر کەسێکی تر(کە دەتوانن جگە لە خودا بانگی بکەن) تەنیا سورەتێك وەك ئەم وەدی بێنن. هەر بەم شێوەیە لە سورەتی بەقەرەدا کە سورەتێکە لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە، بەرەنگاریان دەبێتەوەو ئەفەرموێت ئەگەر دەتوانن با تەنیا یەك سورەت بێنن لێی، وەڵامیشیان ئەداتەوە کە هەرگیز ناتوانن ئەوە بکەن ﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾[3] ئەگەر نەتانکرد کە هەرگیز بۆشتان ناکرێ دەی بترسن لەو ئاگرەی هەڵگیرسێنەری لەشی مرۆڤو بەردەو هەر بۆ خوانەناسەکان هەڵکراوە. ڕەوانبێژی یەکێك بووە

[1] الاسراء (٨٨).

[2] هود (١٣).

[3] البقرة (٢٤).

لە ڕەوشتەکانیان، هۆنراوەو هۆنراوە هەڵواسراوەکانیان لـە بـەرزترین پلـە بـووە لـەم بارەیـەوە، بـەڵام ئەوەی کە بۆیان هات لەلایەن خوداوە هیچ کەسێ خۆی لە بەرانبەردا نەدەگرتو توانایان بەسەریدا نەدەشکا، بۆیە ئەوەی باوەڕی هێنا، باوەڕی هێنا لێیان، لەبەرئەوەی شارەزا بوو لە ڕەوانبێژیو پرشنگداریو شرینیو خۆشو پڕ سودیو ڕازاوەیی ئەم قورئانەدا، چونکە ئەوان زاناترینو تێگەیشتوترین کەس بوون لێی، باشتر شوێنی دەکەوتنو زۆر چاك ملکەچ بوون، وەك چۆن جادووگەرەکان بەهۆی شارەزاییانەوە لە هونەری جادوو، دەیانزانی ئەمەی کە مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) پێی هەڵساوە لە کەسێکەوە ڕوونادات ئەو کەسەنەبێ کە دەبێ پشتگیری کرابێو یارمەتی دەری هەبێو ڕەوانە کرابێ لەلایەن خوداوە. ئەمە لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نیە ئەگەر خوا ئیزنی نەدات، هەروەها عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) ڕەوانە کرا لە کاتێکدا کە زانیاری پزیشکیو چارەسەری نەخۆشیەکان باوی هەبوو، کوێرو کەڕی چاك دەکردەوەو مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خودا، ئەم جۆرە کارانە هیچ پەیوەندی بە چارەسەرو دەرمان بە کارهێنانەوە نەبوو، ئەوەی شارەزا بوو لەناو خۆیاندا دەیزانی کە لەلایەن خواوەیە، بۆیە لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران نەبووە چەند نیشانەیەکی پێنەدرابێت کە لەسەر وێنەی ئەو نیشانانە خەڵکی باوەڕی هێناوە بەڵام ئەوەی کە بە من دراوە ئەم نیگایە کە خودا بۆی ناردوم، هیوام وایە من شوێنکەوتوم لەوان زیاتر بێ)[1] وە ئەفەرموێت: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ﴾ نەخێر ئەوان شتێك بە درۆ دەزانن کە هیچی لێ تێ نەگەیوون واتە: ئەوانە باوەڕیان بە قورئان نەبووەو لێی تێ نەگەیشتوونو هیچیشیان لێ نەزانیوە. ﴿وَلَمَّا يَأۡتِهِمۡ تَأۡوِيلُهُۥ﴾ بۆشیلن لێك نەدراوەتەوە، ئەو شارەزاییەیان وە دەست نەهێنا لەوەی کە تیایەتی لە ئاینی ڕاستەقینە، هەتا ئەو کاتەی کە بە نەفامیو هەڵەشەیی بڕوایان پێ نەکرد ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوانەی پێش ئەمانیش کە بڕوایان نەهێنا هەر وا بوون، سا بڕوانە دوارۆژی ستەمکاران بە کوێ گەیشت، واتە: سەیر کە چۆن قڕمان کردن لەسەر ئەوەی کە بڕوایان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانمان چونکە ستەمکارو لووت بەرزو خوانەناسو لاسارو نەفام بوون، ئەی ئەوانەی کە بێ بڕوان زۆر بترسن کە تووشی ئەو(بەڵایە) ببن کەئەوان تووشیان بووە، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يُؤۡمِنُ بِهِۦ﴾ لەوانیشدا هی وا هەیە بڕوای پێی هەیە. واتە: لە نێوان ئەوانەدا کە تۆ ڕەوانە کراوی بۆیان ئەی موحەممەد(ﷺ) هی وایان هەیە بڕوا دێنێ بەم قورئانەو پەیڕەویت

---

[1] فتح الباري (٨/٦١٩).

دەكاتو سوود وەردەگرێ لەوەی كە تۆ پێی ڕەوانە كراوی ﴿وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾ هەشیانە بڕوای پێی نیە، لەسەر ئەوە دەمرێو لەسەر ئەوەیش زیندوو دەكرێتەوە ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾ پەروەردگارت بەدفەڕان باشتر دەناسێ، واتە: خودا خۆی باش دەزانێ كێ شایەنی ڕێنیشاندانیو تا ڕێی نیشانداو كێش شایەنی گومڕاییە، تا گومڕای بكات، ئەو دادپەروەرەیە كە ستەم لە كەس ناكات بەڵكو هەركەسە شایستەی هەر چی بێ ئەوەی ئەداتێ، خوای گەورەپاكو بێ عەیبەو پیرۆزە، دوورە لە گشت كەمو كوڕیەكەوە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو.

﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾﴾

**فەرماندان بە بێزاری دەربڕین لە بتپەرستان**

خوای گەورەئەفەرموێت بە پێغەمبەرەكەی(ﷺ): ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئەگەر(ئەو بتپەرستانە) بڕوایان پێ نەهێنای ﴿فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ بڵێ: كاری من بۆ خۆمەو كاری ئێوەیش بۆ خۆتانە، ئێوە پەیوەندیتان بە كاری منەوە نیەو منیش بێزارم لەو كارەی ئێوە،دەیكەن، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾[1] بڵێ: ئەی خوانەناسەكان، ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، نایپەرستم. هەتا كۆتایی سورەتەكە. ئیبراهیمی خەلیلو پەیڕەویكەرانی ئەڵێن بە گەلە بت پەرستەكەیان: ﴿إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾[2] ئێمە لە ئێوەو لەو شتانەی(جگە لە خودا) دەیپەرستن بە دووریـن.

پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ﴾ لە ناویاندا هی وا هەیە گوێت لێدەگرن، ئایا ئەگەر هیچ تێ نەگەن تۆ دەتوانی كەڕیان تێ بگەیەنی؟ واتە: هەندێكیان ئەو قسە چاكانەتو ئەو قورئانی پیرۆزەو ئەو فەرموودە ڕاستو ڕەوانو بەسوودانەت دەبیسن، كە پڕ سوودە بۆ ئاینو لاشەو دڵەكانیان، ئەمە دەستكەوتێكی مەزنە بۆیان بەڵام ئەمەیش نە پەیوەندی بە تۆوەیەو نە بە ئەوانەوە، چونكە تۆ ناتوانی كەڕ تێبگەیەنیو وە ناتوانی ڕێ نیشانی

[1] الكافرون (١-٢).

[2] الممتحنة (٤).

ئەوانە بدەی هەتا خوا مەیلی لێ نەبێ ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لَا يُبْصِرُونَ ﴾ هەشیانە بۆت دەڕوانێ ئایا تۆ دەتەوێ(ئەو کوێرانەی کە چاوی دیتنیان نیە) شارەزا کەی؟ واتە:سەیر دەکەن و سەیری ئەو خۆشەویستیەی خودا بۆتو ئەو ڕێڕەوە جوانو ڕەوشتە مەزنو ئەو نیشانە ئاشکرانەش(لەسەر پێغەمبەریت) کە هەموو بەڵگەن بۆ ئەوانەی هۆشمەندو خاوەن دڵی ڕووناکن، ئەوانەیش دەڕوانن وەك چۆن خەڵکی تریش دەڕوانن کەچی شارەزایی بەدەست ناهێنن وەك خەڵکی وەدەستیان هێناوە، بەڵام خاوەنباوەڕان بۆت دەڕوانن بە چاوی ڕێزەوە، بە پێچەوانەی خوانەناسانەوە کە بە چاوی سووك سەیرت دەکەن، ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾[1] هەر کە تۆیان چاو پێ کەوت(ئەی موحەممەد(ﷺ)) دەتکەنە گاڵتە جاڕی خۆیان، پاشان خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەرگیز ناهەقی لە کەس ناکات، هەر کەسێ شارەزا بوبێ پێی شارەزا بووە. کوێری پێ بینا بوەو چاوە کوێرەکانو گوێ کەڕەکانو دڵە داخراوەکانی پێ کراوەتەوە خەڵکێکی تریشی پێ گومڕاو بێ دین بووە، خۆی فەرمانڕەواو کاربەدەستە لە موڵکی خۆیدا هەرچی بوێ دەیکات، هەرچی دەکات پرسیاری لێ ناکرێ، ئەوانن لێپرسینەوەیان لێ دەکرێ چونکە خودا خاوەنی زانیاریو کارزانیو دادپەروەریە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ دیارە خودا(بە هیچ شێوەیە) ستەم لە خەڵکی ناکات، بەڵام خەڵکی ستەم لەخۆیان دەکەن. لەم فەرموودەیەدا هاتوە لە ئەبوزەڕەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە ڕیوایەتی کردوە لە پەروەردگاری مەزنیەوە:(ئەی بەندەکانم: من ناهەقیم قەدەغە کردوە لەسەر خۆم، لە نێوان ئێوەیشدا قەدەغەم کردوە، ناهەقی لە یەکتری مەکەن،(هەتا لە کۆتایی فەرموودەکەدا فەرموویەتی) ئەیَ بەندەکانم بێگومان کردارەکانتانم هەژمارکردووە بۆتان، پاشان پاداشتتان ئەدەمەوە پێی، هەرکەسێ چاکەی بینی با سوپاسی خوا بکات، هەر کەسێ هەر شتێکی تری بینی، سەرزەنشتی کەس نەکات، جگە لە خۆی) موسلیم فەرموودەکەی ڕیوایەت کردوە بە درێژی[2].

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾﴾

[1] الفرقان (٤١).

[2] مسلم (٤/١٩٩٤).

**هەست کردن بە کورتی ژیانی دنیا لە کاتی حەشردا**

خوای گەورەهاتنی ڕۆژی دوایی‌و زیندوو بوونەوە لەناو گۆڕو کۆبوونەوەی گۆڕەپانی ڕۆژی وەبیر خەڵکی دێنێتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ﴾ ڕۆژێ کۆیان دەکاتەوە(هەروەك) تاوێك لە ڕۆژێکدا مابنەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾[1] ئەو ڕۆژەی کە بڕیاردراوە بێنە لامان وا دەزانن مانەوەیان هەرساتێ لە ڕۆژێکی خایاندووە (لەدونیادا). ئەم ئایەتەیش: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾[2] ئەو ڕۆژەی کە دەبینن، وا تێدەگەن جگە لە ئێوارەی ڕۆژێك یان چێشتەنگایەك نەماوەتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا﴾[3] ئەو ڕۆژە وا فوو بە کەڵەشاخدا دەکرێ، ئەو ڕۆژێ تاوانباران کۆ دەکرێنەوە، کوێرن‌و شین هەڵگەڕاون. هەندێکیان بە یەکتری دەڵێن: دە ڕۆژ نەبێ نەماونەتەوە، ئەوەی ئەوان قسەی لێ دەکەن ئێمە زیاتر ئاگادارین، ئەوەیان لە هەموویان بیرۆکەی باشتری پێیە دەڵێ: تەنیا هەر ڕۆژێك ماونەتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾[4] ڕۆژێ کە قیامەت دێ، تاوانباران سوێند دەخۆن جگە لە ساتێ نەماونەتەوە ئەم ئایەتانە هەموو بەڵگەن لەسەر کورتی ژیانی دنیا لە چاو ڕۆژی قیامەتدا، وەك خودای گەورە لەم ئایەتەیشدا ئەفەرموێت: ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلِ الْعَادِّينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[5] پێیان دەڵێ: چەند ساڵ لە زەویدا مانەوە؟ دەڵێن: ئێمە هەر ڕۆژێك یان کەمێك لە ڕۆژێ ماوینەوتەوە لە حیسابگەران بپرسە. دەڵێ: ئەگەر بتانزانیایە کەمێك نەبێ شتێکی وا نەماونەتەوە، پاشان لێرەدا خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ﴾ خۆ بە یەکتر دەناسێنن. واتە: باوك کوڕی خۆی دەناسێ‌و خزمانیش یەکتری دەناسنەوە، وەك چۆن لە دنیا یەکتریان ناسیوە، بەڵام هەرکەسەو

---

[1] الاحقاف (٣٥).

[2] النازعات (٤٦).

[3] طه (١٠٢-١٠٤).

[4] الروم (٥٥).

[5] المؤمنون (١١٢-١١٤).

بە خۆیەوە سەرقاڵە ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ ﴾[1] هەرکاتێ فوو کرا بە کەڵەشاخدا خزمایەتی نامێنێ، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا﴾[2] هاوەڵ لە هاوەڵ ناپرسێ. لێرەدا خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ﴾ بێگومان زیانبارن ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە دیداری خودا نەبوەو شارەزای ڕێگە نەبوون. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەیە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾[3] وای بۆ بێبڕوایان لەو ڕۆژەدا! چونکە ئەوانە خۆیان و کەس و کاریان تووشی زیان کردوە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە ڕاستی ئا ئەوە زیانی دیارو ئاشکرایە. هیچ زیانێ لەو زیانە گەورەتر نیە کەسێ لە خۆشەویستانی لەو ڕۆژەدا جیا بکرێتەوە، کە ئەو ڕۆژە، ڕۆژی داخ و خەفەت و پەشیمانیە، بۆ تاوانباران.

﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾﴾

**بێگومان تۆڵە دەسێنرێ لە تاوانباران، لە دنیادا بێ یان لە دواڕۆژدا**

خوای گەورەڕووی وتاری دەکاتە پێغەمبەرەکەی ئەفەرموێت: ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ﴾ ئەگەر ئێمە هەندێك لەوانەی بەڵێنمان پێداون، نیشانت بدەین، واتە تۆڵەیان لێ بسێنین، لە ژیانی تۆداو بۆ ئەوەی چاوت ڕووناك ببێتەوە بەو تۆڵەیە لێیان دەسێنین، ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ یان تۆیش ببەینەوە. ئەوان هەردێنە لامان، واتە: لە دوایدا چارەنووس و گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە، ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ﴾ ئەوسا خوا شایەتە لەسەر ئاکاریان، دوای تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)). ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ﴾ هەموو گەلێك لە مرۆڤ پێغەمبەری خۆیان بووە، کاتێ پێغەمبەرەکەیان هاتە لایان، قەتادە ئەڵێ: یانی: لە ڕۆژی قیامەتدا.[4] ﴿قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾ لە نێوانیاندا بە هەق بڕیار ئەدرێ، وەك لەم ئایەتەدا خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ

---

[1] المؤمنون (١٠١).
[2] المعارج (١٠).
[3] المرسلات (١٥).
[4] الطبري (٩٩/١٥).

رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[1] ئـەم زەمینـە بـە تیشکی پەروەردگاری خۆی ڕووناکایی تێ کەوتوەو نامەی کردار لەبەردەمیان دادەنرێو پێغەمبەرانو شایەتەکان دەهێنرێن، لە نێوانیاندا بە هەق دادوەری دەکرێ، ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ. واتە: هەموو گەلێ دەهێنرێتە لای خودا بە ئامادەبوونی پێغەمبەرەکەیو نامەی کردارەکانیان، لە چاکەو لە خراپە، دانراوەو شایەتی ئەدەن لێیان، فریشتەی پارێزەریشان هەر شایەتن لەسەریان، گەل دوای گەل، ئەم ئوممەتە بەڕێزەیش، هەرچەند کۆتا ئوممەتە لە مرۆڤەکان بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا یەکەم ئوممەتە کە خودا کارەکانیان تەواو دەکاتو بڕیاریان بۆ ئەدات، لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەفەرموێت: ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە هیچ ناهەقیان لێ نەکراوە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی:(ئێمە دواین ئوممەتین(لە دنیادا) لە قیامەتدا یەکەمینین، کە کاریشیان بۆ بڕیار ئەدرێ لە پێش هەموو خەڵکیدا)[2] ئوممەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو پلە بەرزەی پێدراوە لەبەر پلەو ڕێزی پێغەمبەرەکەیان سەلاتو سەلامی خودای لەسەر بێ بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ۚ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾﴾

**پەلە کردنی ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیەو وەڵام دانەوەیان**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ دەڵێن: ئەگەر قسەکانت ڕاستن، کەی ئەم بەڵێنە دێتە جێ؟ خودای گەورە باسی خوانەناسی ئەو بتپەرستانە دەکات کە چەندە پەلەیانە بۆ ئەو سزایە کە تووشیان بێو پرسیار دەکەن لە کاتی هاتنی پێش دابارینی بەسەریاندا، دیارە ئەو پرسیارە هیچ سودێکی نیە بۆیان، وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ﴾[3] ئەوانەی باوەڕیان نیە کەئەو ڕۆژە دێ، پەلە لە هاتنی دەکەن، ئەو کەسانەش کە باوەڕیان هێناوە، لێی دەترسن، دەشزانن

---

[1] الزمر (٦٩).

[2] فتح الباري (٦/٥٩٥)، مسلم (٢/٥٨٥).

[3] الشورى (١٨).

کە ئەوە ڕاستە، واتە: هەر دێ‌و گومانی تێدا نیە کە ڕوو ئەدات یا کاتە دیاری کراوەکەیشی نەزانن، بۆیە خودای گەورە ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کردوە کە چۆن وەلامیان بداتەوەو فەرموویەتی: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بلێ: من خۆم لە قازانج‌و زەرەری خۆشم نازانم، گەر خوا مەیلی لێ بێ، هەر کەسێ لە هەر ئوممەتێك ماوەیەکی دیاری کراوی بۆ دانراوە، من هیچ شتێ نالێم جگە لەوەی کە خودا فێری کردووم، وە من توانای هیچ شتێکم نیە لە خۆمەوە پێی هەلسم مەگەر خودا ئاگادارم بکات لێی، من تەنیا بەندەو ڕاسپاردەی ئەوم بۆ لای ئێوە، وە ئاگاداریشم کردوون لە هاتنی ڕۆژی قیامەت، کە هەر دێت، بەلام خودا ئاگاداری نەکردووم لە کاتەکەی بەلام ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۚ﴾ هەر گەلێك ماوەی دیاری کراوی(خۆی) بۆ دیاری کراوە، واتە: هەموو گەلێك ماوەیەکی هەیە لە ژیاندا کاتێ کە ماوەیەکەیان دوایی هات ﴿إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَلَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ﴾ ئەگەر ماوەیان تێپەڕی، بۆ هیچ کەس دواناکەون‌و پێش ناکەون. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ﴾[1] هەرکەسێ کاتی مردنی هات، خودا هەرگیز دوای ناخات. پاشان خودا هەواڵی داوە کە سزای خودا بەو زوانە لە پڕ دێت بۆیان، ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوۡ نَهَارٗا مَّاذَا يَسۡتَعۡجِلُ مِنۡهُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ بلێ: لە شەوێك یان ڕۆژێکدا بەلاتان لە خوداوە بۆ بێ، تاوانکاران پەلەی چی دەکەن؟ ئەگەر دواجار کەوتنە ناو بەلای خودا(کە زۆر پەلەتان بۆ دەکرد) ئەوسا بڕوا بە خوا دێنن؟ واتە: کاتێ کە ئەوانە سزایان بۆ هاتبێ گوتویانە: ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا﴾ پەروەردگاری ئێمە هەموومان بینیمان‌و بیستمان. وە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾[2] کاتێ دیتیان بەلای ئێمەیان دێتە سەر، ئەڵێن: ئێمە خودای تاك‌و تەنیا دەناسین‌و لەو شتانەی دەمانگوت: شەریکی خودان، حاشا دەکەین، پاش دیتنی سزای ئێمە، بڕوا هێنانیان قازانجی پێ نەگەیاندن، ئەمە ڕێوشوێنی خودایە، دەربارەی هەموو عەبدەکانی هەر وا بووە، لەو کاتەدا هەر ئەوانەی خوانەناس بوون زەرەریان کرد. پاشان خوای گەورەلێرەدا ئەفەرموێت:

---

[1] المنافقون (١١).

[2] غافر (٨٤-٨٥).

﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ پاشان بەوانەی کە ستەمکار بوون دەڵێن: دە بچێژن ئازاری دوایی نەهاتوو، ئایا جگە لەو کارانەی دەتانکرد سزا دەدرێن؟ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمەیان پێ دەگوترێ بە تانەو تەشەرەوە. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[1] لەو ڕۆژەدا بە پاڵ پێوەنان بەرەو ئاگری جەهەنم ڕادەکێشرێن، ئەو ئاگرەی کە بڕواتان نەدەکرد هەبێ، ئایا ئەمە جادووە یان ئێوە کوێر بوون و نابینن؟ بچنە ناوی، هەڵبکەن یان هەڵنەکەن، وەکوو یەکەو هەر بەهۆی ئەو کارانەی کە کردووتانە سزا ئەدرێت.

﴿وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ ۗ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾﴾

**ئەم قیامەتە ڕاستە**

خوای گەورە فەرموێت: ﴿وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ﴾ لێت دەپرسن (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ئاخۆ ڕاستە؟ ئایا ڕۆژی دوایی و زیندوو بونەوە لەم گۆڕانەدا، دوای ئەوەی لاشەکان دەبن بە خۆڵ، ڕاستە؟ ﴿قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ بڵێ: بەڵێ، سوێند بە پەروەردگارەکەم تەواوو ڕاستەو ناتوانن لە دەستی ڕاکەن، واتە: بونتان بە خۆڵ لای خوا گرانتر نیە لە زیندوو کردنەوەتان، وەك چۆن لە نەبوون یەکەم جار دروستی کردن، ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾[2] هەر کاتێ (خودا) هەر شتێکی بوێ پەیدا ببێ بە فەرمانی پێی دەڵێ: ببە، هەر دەس بە جێ پەیدا دەبێ. ئەم ئایەتە لەم قورئانەدا نموونەی نیە جگە لە دوو ئایەتی تر کە خودای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی سوێند بە خوا بخوا بەرانبەر ئەو کەسانەی بڕوایان نیە بە زیندوو بونەوە لە سورەتی سەبەء دا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ ﴾[3] ئەوانەی خوانانەناسن، ئەڵێن: هەرگیز ڕۆژی قیامەت بۆ ئێمە نایە، بڵێ: سوێند بە پەروەردگاری خۆم، بێ شك ڕۆژی قیامەتتان بۆ دێ وە لە سورەتی تەغابونیشدا فەرموویەتی: ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي

---

[1] الطور (١٣-١٦).

[2] يس (٨٢).

[3] سبأ (٣).

لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾[1] ئەوانەی خوایان نەناسی پێیان وا بوو هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، بلێ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم خۆم، بێگومان زیندوو دەکرێنەوە، پێشتان دەڵێن کە چ کارێکتان کردوەو ئەمەیش لای خودا ئاسانە، پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّ لِكُلِّ نَفۡسٖ ظَلَمَتۡ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لَٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۖ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ هەر کەسێ ستەمی کردبێ، ئەگەر هەرچی لە زەمیندایە ماڵی ئەو بێ لەباتی خۆیدا ئەیدات، کاتێك چاویان بە ئازار کەوت، پەشیمانی خۆیان دەشارنەوە. بە یەکسانی بە ناویاندا ڕادەکەنو هیچ ناهەقیان لێ ناکرێ.

﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٥٦﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ چاك بزانن هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدان، هەمووی هی خودان، لێشتان ڕوون بێ کە بەڵێنی خودا ڕاستە، بەڵام زۆربەیان نازانن،(خودا) خۆی ژیان ئەداو گیان دەکێشێو هەر بەرەو خۆشی دەگەڕێنەوە. خودای گەورە ئەفەرموێت کە هەر خۆی خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینەو بەڵێنیشی ڕاستەو گومانی تێدا نیەو هەر دێتە دی، وە هەر خۆی زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ هەموو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، وە هەر خودا توانای بەسەر ئەوانەدا هەیەو ئاگاداری ئەو بەشانەی لاشەیشە کە لەیەك جیا دەبنەوەو پەرشو بڵاو دەبنەوە بەسەر هەموو ناوچەکاندا لەسەر زەمینو دەریاو بیابانەکاندا.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٥٨﴾﴾

## ئەم قورئانە ئامۆژگاریو شیفاو بەزەییو ڕێنیشاندەرە

خوای گەورەمنەت دەکات بەسەر ئەو خەڵکەدا بەوەی کە ئەم قورئانەی ناردوتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەیو ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ ئەی خەڵکینە لەلایەن پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریەکتان بۆ هاتوە کە سەرزەنشتتان دەکات لەسەر خراپەو داوێن پیسی، ﴿وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ﴾ چارەی دەردی دڵانیشە، لە گومانو دوودڵیو پیسیو چەپەڵی

---

[1] التغابن (٧).

دەرونیش پاك دەكاتەوە ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ڕێنیشاندەرو بەزەییە بۆ باوەڕداران. واتە: بەهۆی ئەم قورئانەوە شارەزایی‌و بەزەیی بەدەست دێنی، ئەمەیش بۆ ئەو كەسانەیە بڕوایان پێی هەیەو ئەوەتا كە تێیدا هاتوە بە ڕاستی دەزانن‌و دوو دڵ نین لێی، وەك ئەم ئایەتە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾[1] ئێمە لەم قورئانەدا، شتی وات بۆ دەنێرینە خوارەوە، كە شیفاو بەزەیی تێدایە بۆ خاوەن باوەڕەكان‌و ستەمكارانیش زیاتر پێی زیانبار دەبن. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾[2] بڵێ: ئەمە بۆكەسانێ كەباوەڕیان پێی هێناوە، ڕێبەر و دەرمانی دەردانە. پاشان خوای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ بڵێ: لەو چاكەو بەزەییە(كە خودا دەربارەی ئێوەكردی) دڵخۆش بن، ئەمە زۆر چاكترە لەوەی كە كۆی دەكەنەوە. واتە: بەوەی لە لایەن خوداوە بۆیان هاتوە لە ڕێنمایی‌و ئاینی هەق دڵخۆش بن، چونكە ئەمە زۆر چاكترە لەوەی كە بە دەستی دێنن‌و دڵیان پێی خۆشە لەماڵ‌و سامانی دنیاوشتەجوانەكانی كەگومانی تێدانیەدەڕۆن‌و نامێنن.

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾﴾

**ئایا بۆ هیچ كەسێ هەیە جگە لە خودا یان كەسێ خوا ئیزنی بدا شتێ حەلاڵ بكات یا حەرامی بكات**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴾ بڵێ: ئایا ئەو ڕۆزیە كە خوا بۆی ناردون، سەیرتان كردوە؟ كە بە ڕەواو ناڕەوا دابەشتان كردوە؟ بڵێ: خوا ئیزنی پێدان یان بە دەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستن؟ ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو زەحاك‌و قەتادەو عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم‌و كەسانی تریش گوتویانە: ئەم ئایەتە هاتوەتە خوارەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو موشریكانەی كە(بە ئارەزوی

[1] الاسراء (٨٢).
[2] الفصلت (٤٤).

خۆیان) هەندێ شتیان حەڵاڵو حەرام کردبوو، لە((بەحیرەو سائیبە و واصیلە))[1] وەك ئەم ئایەتە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالْأَنْعَامِ نَصِيبًا﴾[2] لە(بەروبومی ئەو) كێڵگەو ماڵاتانەی كە خودا بەدیهێناوە بەشێكیان بۆ خوا دائەنا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عەوفی كوڕی مالیكی نەزلەوە ئەڵێ: هاتمە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرگێكی شڕو دڕاوم لەبەردا بوو، فەرمووی:(ئایا ماڵو سامانت هەیە) گوتم: بەڵێ، فەرمووی:(لە كام ماڵەیە؟) ئەڵێ: گوتم: لە هەموو(جۆرە) ماڵێك، لە وشترو بەندەو ولاغی سواریو مەڕ، فەرمووی:(وەختێ خودا ماڵێكی پێ بەخشیت با(بەهرەكانی) پێتەوە دیار بێ) پاشان فەرمووی:(ئایا وشترەكانت گوێیان ساغ بووەو تۆش هەڵسابی بە مووس گوێیانت بڕیبێو بڵێیت: ئەمە بوحرە، یان پێستی لەتكەی و بڵێت ئەمە صورومە و حەرامت كردبن لەسەر خۆتو خاوخێزانت؟) گوتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بێگومان ئەوەی خودا بە تۆی داوە حەڵاڵە، باڵی خودا بەهێزترە لە باڵی تۆو مووسی خودا تێژترە لە مووسی تۆ)[3] پاشان فەرموودەكەی بە تەواوی باس كرد، ئەمە فەرموودەیەكی چاكەو سەنەدەكانیشی بەهێزە. خودای گەورە ناڕەزایی خۆی دەربڕیوە لەو كەسانەی كە ئەو شتانەی ئەوحەڵاڵی كردوون حەرامی دەكەنو ئەوانەیش ئەوحەرامی كردوون حەڵاڵی دەكەن بە حەزو ئارەزوی خۆیان، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەو نیشانەیەكیان بە دەستەوە بێ. پاشان هەڕەشەیان لێ دەكات لە ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەو كارەی كە پێی هەڵساون بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەو كەسانەی درۆ بۆ خودا هەڵدەبەستن، بە گومانی ئەوان، دەبێ ڕۆژی قیامەت چۆن بێ، واتە: چۆن بیر دەكەنەوە لە ڕۆژی قیامەت، چیان بەسەردەهێنرێ كاتی گەڕانەوەیان بۆ لامان. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ﴾ دیارە خودا خاوەنی چاكەیە بۆ مەردم، ئیبنوجەریر ئەڵێ: یانی: كاتێك كە وازی لێهێناون لە دنیاداو پەلە ناكات لە تۆڵە لێسەندنیان.[4](منیش دەڵێم): لەوانەیە مەبەست بە ﴿لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ﴾ ئەو شتانە بێ كە سوود بەخشەو خودا وەدیهێناوە بۆیانو ڕێی پێداون لە دنیادا بیكەن، وە هیچ شتێكی لێ قەدەغە نەكردون ئەو شتەنەبێت كە زیان بەخشە بۆ دنیایان یا بۆ دینیان ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بەڵام بەشی

---

[1] الطبري (١٥/١١٢-١١٣).

[2] الانعام (١٣٦).

[3] أحمد (٣/٤٧٣)، (٤/١٣٦)، سەنەدەكەی باشە.

[4] الطبري (١٥/١١٣).

هەرە زۆریان شوکرانەبژێری ناکەن. بەڵکو ئەو بەهرانەی خودا پێی داون لە چاکەی خۆیەوە ئەوان حەرامی دەکەن، لەسەر خۆیان گرانی دەکەن، هەندێکی وا لێدەکەن حەلاڵ بیٚو هەندێکیشی حەرام بیٚ، ئا ئەمەیە کە بتپەرستان تێی کەوتونو کردویانە بە بەرنامە بۆ خۆیان، ئەهلی کتێبیش دایانهێناوە لە ئاینەکەیاندا.

﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾﴾

### هەموو گەورەو بچوکیٚ خودا ئاگای لێیەتی

خوای گەورەپێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئاگادار دەکات کە هەرچی خۆیو ئوممەتەکەیو خەڵکی دەیکەن خودا دەیزانیٚو ئاگای لێیەتی لە هەموو کاتو ساتو چرکەیەکدا، وە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە با لە سەنگی مێرووڵەی هەرە وردیلە یان وردتر یان درشت تر بیٚ، خودا پێی دەزانیٚو دەیبینیٚو لێی ون نابیٚو وا لە کتێبی دیارو ئاشکرادا وەك ئەم ئایەتە کە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾[1] هەموو کلیلی نهێنیو داپۆشراوەکان لەلای ئەوە، لە خۆی بەدەر هیچ کەسیٚ ئاگای لیٚ نیە، هەرچی لەناو وشکاییو دەریادایە دەیزانیٚ، هیچ گەڵایەك لە هیچی شوێنیٚ، بیٚ زانینی ئەو ناوەریٚ، هەرچی دەنکەو لە تاریکایی زەویداو هەرچی تەڕە یان وشکە، گشتی لەناو دەفتەرێکی ئاشکرایە. خوای گەورەباسی کردوە کە لە جوڵەی درەختو شتە بێگیانەکانو مەڕو ماڵاتو زیندەوەرەکانی تریش ئاگادارەو ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾[2] هەر زیندەوەریٚ لە زەویدا دەگەڕیٚو هەر مەلیٚ بە باڵ دەفڕیٚ، هەموویان کۆمەڵانێکن وەك ئێوە، ئێمە لەناو ئەم کتێبەدا هیچ شتێکمان جیا نەکردوەتەوە پاشان ئەمانە هەموو لەلای پەروەردگاری خۆیان کۆ دەکرێنەوە، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾[3] لەم زەمینە هەر شتیٚ دەجوڵێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خودایە، کاتیٚ خودا ئەمە زانیاری بیٚ

---

[1] الانعام (٥٩).

[2] الانعام (٣٨).

[3] هود (٦).

بە جوڵانی ئەم شتانە، ئەی زانیاری چۆنە بە جوڵەو هەڵسوکەوتی ئەوانەی کە ئەرکیان لەسەرەو فەرمانیان پێکراوە کە عبادەت دەکەن. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾[1] (ئەی موحەممەد(ﷺ)) هەر خۆت بە خاوەن دەستەڵاتی دلۆڤان بسپێرە، ئەو کەسەی کە تۆ دەبینێ، وا بە پێوە دەوەستی، هاتوچۆشت لەگەڵ سوژدەبەرەکاندا(لەبەر چاویەتی). بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِى شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)) لە هەر بارێکدا بیو هەرچی لە قورئان بخوێنیو هەر کارێ ئێوە بیکەن ئێمە لێتان ئاگادارین، کاتێ خەریکی ئەو کارەن، هەرچی لە زەمینو ئاسماندایە،(با لە سەنگی مێرولەیەکی هەرە وردیلەش یان وردتر یان درشت تر بێ) هیچیان لە پەروەردگاری تۆ ناشارێتەوەو وا لە کتێبی ئاشکرادا. واتە: کاتێ ئەو کارە دەکەن ئێمە ئاگامان لێتانەو دەتان بینینو گوێمان لێتانە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە جوبرەئیل لێی پرسی لە بارەی ئیحسانەوە فەرمووی:(وا خوا بپەرستی وەك ئەوەی دەیبینی، ئەگەر تۆ ئەو نابینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ).[2]

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾

### ناسینی دۆستانی خودا

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ﴾ با بزانن کە ئەوانەی دۆستی خودان هیچ ترسێکیان لەسەر نیە، خودای گەورە باسی دۆستەکانی خۆی کردووە کە ئەو خاوەن باوەڕانەن خۆیان لە گوناهـ دەپارێزن، وەك لەم ئایەتەدا پێناسەی کردون، هەر کەسێ لە خوا ترس بێ ئەوە دۆستی خودایە، ﴿لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ﴾ ناترسنو لەو نارەحەتیانەی ڕۆژی قیامەت کە تووشیان دێ، ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەمیش ناخۆن بۆ ئەو شتانەی لە دنیادا بەجێی دەهێڵن، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ)

[1] الشعراء (٢١٧-٢١٩).

[2] مسلم (٣٧/١).

فەرموویەتی:(هەندێ عەبد هەن لە عەبدەکانی خودا پێغەمبەران‌و شەهیدان خۆزگەیان لێ دەخوازن) گوترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەتا ئێمەیش خۆشمان بوێن؟ فەرمووی:(ئەوانە کۆمەڵێکن یەکتریان خۆش دەوێ(خۆشەویستیەکەشیان) لەبەر سامان‌و بنەماڵە نیە، ڕوویان ڕووناکە لەسەر مینبەرێکن لە ڕووناکی ناترسن کاتێ خەڵکی ترسان، خەمیان نیە کاتێ خەڵکی خەمبارن) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾[1].

**مەبەست لەم مژدەیە خەوبینی ڕاستە**

ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە کە گوتویەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم ئایەتەدا: ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ مژدە بۆ ئەوانە لە دنیاو لە قیامەتدا: مژدەی قیامەتمان زانیوە کە بەهەشتە، ئەی مژدەی دنیا کامەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەو خەونە چاکەیە کە عەبد دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ، کە ئەو خەونە بەشێکە لە چل‌و چوار بەش یان حەفتا بەش لە پێغەمبەریەتی).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوزەڕەوە کە گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا: ئایا پیاو کارێ دەکات کەچی خەڵکی سوپاسی ئەکەن لەسەری‌و دەست خۆشی لێ ئەکەن؟(واتە: ئەوە چیە؟) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەوە پێشخستنی مژدەی ئەو خاوەنباوەڕەیە).[3] موسلیمش ڕیوایەتی کردوە.[4] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ خەوی چاك مژدە ئەدات بە خاوەنباوەڕ. خەوی باش بەشێکە لە چل‌و نۆ بەشی پێغەمبەرایەتی، هەر کەسێ ئەو خەوەی بینی با بیگێڕێتەوە، وە هەرکەسێ جگەلە ئەوەی بینی، ئەوە لە شەیتانەوەیە بۆ ئەوەی خەمباری بکات، با سێ جار تف بکات بە لای چەپیدا،(الله أكبر) یش بکات‌و کەسیشی لێ ئاگادار نەکات).[5] کەسی تر ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت نەکردوە. گوتراوە: مەبەست پێی مژدەی فریشتەکانە بە خاوەن باوەڕان لە کاتی گیان کێشاندا بە بەهەشت‌و لێخۆشبوون(لێیان) وەك ئەم ئایەتەی کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٣٠ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي

---

[1] الطبري (١٥/١٢٠).

[2] الطبري (١٥/١٣٢).

[3] أحمد (٥/١٥٦)، سەحیحە.

[4] مسلم (٤/٢٠٣٤).

[5] أحمد (٢/٢١٩)، فەرموودەیەکی لاوازە.

ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴾[1] ئەوانەی کە گوتویانە: پەروەردگارمان خودایەو لە قسەی خۆیان لایان نەداوە، فریشتە دێنە لایان و پێیان دەڵێن: نە بترسن و نە خەم بخۆن، مژدە بێ لێتان گەیشتونەتە ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدراوە ئێمە(لە دنیاو لە قیامەتدا) دۆستی ئێوەین لە بەهەشتدا ئارەزوی هەر شتێ بکەن و چی داوا کەن ئامادەیە، ئەم میواندارییە لەلایەن گوناه بەخشی دڵۆڤانەوەیە. وە لە فەرموودەکەی برائەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) هاتووە بێگومان خاوەن باوەڕ کاتێ مردن یەخەی گرت فریشتە دێنە لای ڕوو سپی و بەرگ سپی دەڵێن: ئەی گیانی پاك وەرە دەرەوەو بحەسێرەوە بۆنی خۆش هەڵمژە، بڕۆ بۆ لای ئەو پەروەردگارەت کە تورەنییە، گیانەکە لە دەمی دێتە دەرەوە وەك چۆن دڵۆپێك ئاو لە دەمی(کەسێکەوە ئاو دەخواتەوە) دەڕژێتە خوارەوە.[2] مژدەشیان لە دوایدا ئەوەیە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾[3] ترسە هەرە گەورەکە خەمباریان ناکات، فریشتەکانیش تووشیان دەبن،(دەڵێن): ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێننتان پێدرابوو. وە فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِم بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾[4] ڕۆژێك دێ کە تۆ دەبینی مێردو ژنی خاوەن باوەڕ، تیشك دانەوەی کردەوەکانیان پێش کەوتوەو لە لای ڕاستیانەوە دەڕوا، خۆشی لە خۆتان ئەمڕۆ دەچنە ناو باغاتێکەوە جۆباریان بەبەردا دەڕواو هەروهەر، هەر تیا دەبن ئەمەیە بەهرەی زۆر گرنگ. پاشان خوای گەورەلێرەدا ئەفەرموێت: ﴿لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ گفتی خودا گۆڕینی بەسەردا نایەت، ئەمەیە دەستکەوتی مەزن. واتە: ئەمە بەڵێنی خودایەو گۆڕانی بەسەردا نایەو نکوڵی تیا ناکرێ، بەڵکو ئەوە بڕیارێکەو دراوەو گومانی تێدا نیەو هەر دەبێ بێ. لە کۆتایی ئایەتەکەدا خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ واتە: ئەمەیە دەستمایەی گەورە.

---

[1] الفصلت (٣٠-٣٢).

[2] أحمد (٢٨٧/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الانبیاء (١٠٣).

[4] الحدید (١٢).

﴿ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي
السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَمَا يَتَّبِعُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ شُرَكَاءَ إِن يَتَّبِعُونَ
إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾

**گشت دەستەڵات هی خودایە و هەر خۆشی بوونەوەر بەڕێوە دەبات و هیچ کەسی لەگەڵدا نیە**

خـــوای گەورەئەفـــەرموێت بـــە پێغەمبەرەکـــەی(ﷺ): ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ قسەی(بتپەرستان) خەمگینت نەکات، پشت بە خودا ببەستەو داوای یارمەتی هەر لە خودا بکە بۆیان. هەموو دەستەڵاتێ بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیی‌و خاوەن باوەڕانە، ﴿هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ واتە: قسەی عەبدەکانی باش دەبیسێ‌و ئاگاداری هەڵسوکەوتیانە. پاشان فەرموویەتی: ﴿ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَمَا يَتَّبِعُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ شُرَكَاءَ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ با بزانن هەرچی لە ناو ئاسمانەکان‌و زەمیندایە، هی خودایە، کەسانێکیش هانایان(جگە لە خودا) دەبەنە بەر شەریکانێ. شوێنی ئەوانە نەکەوتون، شوێن خەیاڵی خاو کەوتون، بە گومان‌و گۆترە شت دەڵێن. واتە: خودای گەورە ئەفەرموێت هەموو ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەوەی تێیاندایە هەموو هی خۆیەتی، موشریکەکان بت دەپەرستن کە هیچیان بە دەست نیە نە سوود دەگەیەنن بە کەس‌و نە زیانیشی لێ ئەدەن‌و هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە نیە کە دەیان پەرستن، بەڵکو شوێن گومان‌و خەیاڵ‌و درۆو دەلەسە دەکەون لەو کارەیاندا. پاشان ئەفـــــــــــەرموێت: ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ هەر خۆیەتی شەوی بۆ ئێوە هێناوە، کە تێیدا بحەسێنەوە، ڕووناکیشی داوە بە ڕۆژ، کە لەمەدا بەڵگە زۆرن بۆ ئەو کەسانەی دەبیسن. واتە: هەر ئەو خودایە کە شەوی بۆ بەندەکانی ڕام هێناوە هەتا تێیدا بحەسێنەوە دوای ئەو هەموو ماندوبون‌و ناڕەحەتی‌و هەڵسوکەوتەیان لە ڕۆژدا، ﴿وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾ ڕووناکیشی داوە بە ڕۆژ بۆ ئەوەی بجولێن‌و ژیان‌و بەرژەوەندی خۆیان بە دەست بهێنن‌و سەفەریشی تێدا بکەن، ئەم بەڵگەو نیشانانەی کە دیبیسن بەڵکو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن‌و بیکەنە بەڵگە لەسەر گەورەیی وەدیهێنەرو دانەرو بەڕێوەبەری ئەم نیشانانە.

﴿ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ إِنْ عِنْدَكُمْ
مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦٨) قُلْ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا
يُفْلِحُونَ (٦٩) مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا
يَكْفُرُونَ (٧٠) ﴾

**خودا پاك و بێ عەیبە و دوورە لەوەی كە هاوسەرو منداڵی هەبێ**

خوای گەورەناڕەزایی دەردەبڕێ بەرانبەر ئەوانەی كە دەڵێن منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردوە ئەفەرموێت: ﴿ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ ﴾ ئەڵێن: خودا فەرزەندی هەڵبژاردوە، خودا لەو تۆمەتانە پاكەو(دوورە) و بێ نیازە. لە هەموو شتێ جگەلە خۆی، هەموو شتێ نیازی بەو هەیە ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەكان و زەمیندایە هی خۆیەتی، واتە: چۆن دەبێ فەرزەندی لە شتێ ببێ كە خۆی دروستی كردوەو خاوەنیەتی و عەبدی ئەوە، ﴿إِنْ عِنْدَكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا ﴾ ئێوە هیچ بەڵگەیەكتان بۆ ئەم قسەیە نیە، واتە: ئێوە هیچ بەڵگەیەكتان بۆ ئەم بوختان و قسە درۆیە نیە بە دەستەوە كە هەڵتانبەستووە، ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ چۆن شتێ دەربارەی خودا دەڵێن كە نایزانن؟ ئەمە ناڕەزایی دەربڕینێكی توندو هەڕەشەیەكی گەورەو بەڵێنێكی جەخت لەسەر كراوە. وەك لەم ئایەتانەی تریشدا ئەفەرموێت:

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا (٨٨) لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا (٨٩) تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنْشَقُّ
الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا (٩٠) أَنْ دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا (٩١) وَمَا يَنْبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا (٩٢) إِنْ كُلُّ مَنْ
فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا (٩٣) لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا (٩٤) وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ
فَرْدًا ﴾[1] ئەڵێن: خودا فەرزەندی بۆ خۆی هەڵبژاردوە، ئای كە قسەی ڕەقتان بە دەمدا هاتوە لەوانەیە لەو(قسەیە) ئاسمانەكان هەڵتەكێن و زەوی شەق ببا و كێوەكان (داڕوخێن) لەسەر ئەوەی ئەڵێن خودا فەرزەندی هەیە، لە خودا ناوەشێتەوە كە هیچ فەرزەندێكی هەبێ، هەرچی لەناو ئەم ئاسمانان و زەمینەدان بە عەبدایەتی دێنە لای خودا. هەرئەو سەر حیسابی هەموویانەو هەر بە هەژمار ژماردونی، هەموویان ڕۆژی قیامەت بە تەنیا دێنە لای ئەو. پاشان خوای گەورەهەڕەشە دەكات لەو كەسانەی كە درۆو بوختانیان هەڵبەستوە بۆ خودا و گوتویانە: منداڵی هەیە! ئەوانە نە لە دنیاو نە لە قیامەتدا

[1] مريم (٨٨-٩٥).

ڕزگاریان نابێ، لە دنیادا ماوەیان ئەداتو وازیان لێ دێنێو کەمێ ژیانیان خۆش دەکات وەك ئەفەرموێت: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴾ بلێ: ئەوانەی درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن ڕزگار نابن. ﴿ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ﴾ ڕابواردنێکی کەم لە دنیادا. ﴿ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ﴾ لە دواییدا(واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا) دەگەڕێنەوە بۆ لامان ﴿ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴾ لە دوای ئەوە لە سزای حاشا کردنیان بە توندی ئازاری(بە ژانیان) ئەدەین. واتە: بەهۆی خوانەناسیو درۆو بوختان هەڵبەستنیان بە دەم خوداوە ئازاری توندو بە ژانیان ئەدەین.

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ
تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾
فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٧٢﴾
فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ
بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٧٤﴾﴾

**بەسەرهاتی نووح(سەلامی خوای لێ بێ) لەگەڵ هۆزەکەیدا**

خوای گەورەئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی نووح(سەلامی خوای لێ بێ): ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ﴾ تۆ بەسەرهاتەکەی نووحیان بۆ بخوێنەوە. واتە: هەواڵو بەسەرهاتی نووحو هۆزەکەی بگێڕەرەوە بۆ خوانەناسانی مەککە ئەوانەی بڕوات پێناکەنو دژایەتیت دەکەن کە چۆن خودا ئەوانەی خوانەناس بون لە ناویدان و قڕی تێخستن بە خنکاندنو هیچی نەهێڵان، با ئەوانیش بترسن لەوەی تووشی هۆزی نووح هات تووشی ئەوانیش ببێ لەو تیاچوونو قڕ تێکەوتنە ﴿إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەوا بە هۆزەکەی خۆی گوت: گەلۆ، ئەگەر مانەوەو وەبیر هێنانەوەی نیشانەکانی خودا گرانە بەلاتانەوە لەلایەن منەوە ﴿فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ من خۆم بە خودا سپاردوە گوێم لێ نیەو دەستبەرداری ئێوە نابم، بە لاتانەوە گران بێ یان گران نەبێ. ﴿فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ﴾ ئێوەش لەگەڵ شەریکەکانتاندا کاری خۆتان بکەنە یەك. لەو بتو پەیکەرانەی هاواریان لێ دەکەن بێجگە لە خودا ﴿ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ﴾ پاشان کارێکی وا بکەن هیچ دوودڵی تێدا

نەبێ، بەڵكو خۆتان بە تەواوی لە من هەڵاوێرن ئەگەر وا دەزانن لەسەر هەقن ﴿ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ﴾ ئەوسا پەلامارم بدەن و ماوەم مەدەن تەنیا ساتێکیش، واتە: هەرچیتان لە دەست دێ درێغی مەکەن من هیچ گوێتان پێ نادەم و لێتان ناترسم چونکە ئێوە لەسەر هیچ شتێ نین. وەك هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێ) بە هۆزەکەی خۆی گوت: ﴿إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم﴾[1] خوا بە شایەت دەگرم، ئێوەش هەروەها شایەت بن من لەوەی ئێوە دەیپەرستن بەرکەنارم جگە لە خوا، دەی هەمووتان فێڵم لێ بکەن و مەودام مەدەن، من خۆم سپارد بەو خودایە کە منی پەروەردەکردووە و ئێوەشی پەروەردەکردووە.

**ئەم ئیسلامە ئاینی(گشت) پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێ بێ)**

پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ جا ئەگەر سەرپێچیشتان کردم و پشتتان هەڵکرد لە گوێڕایەڵی خودا، ﴿فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ﴾ من داوای هیچ پاداشتێکم لێ نەکردوون. واتە: لەسەر ئەم ئامۆژگاریانەی کە دەتان کەم هیچ پاداشتێکم ناوێ لێتان. ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ پاداشتم لە لای خودایە، من فەرمانم پێدراوە ملکەچی بەر بارەگای(خودا) بم. ئەم ئیسلامە ئاینی گشت پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێ بێ) لە یەکەم پێغەمبەریانەوە هەتا دوایین پێغەمبەر، با بابەتی بەرنامە و شێوازی عیبادەتیشیان وەك یەك نەبوبێ، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[2] بۆ هەر کۆمەڵێك لە ئێوە ڕێوشوێنێکمان داناوە. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: ڕێبازێك و ڕێوشوێنێك[3]. ئەوەتا نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێ) ئەفەرموێت: ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾[4] من فەرمانم پێدراوە کە ملکەچی بەربارەگای(خودا) بم. وە خودای مەزنیش لە بارەی ئیبراهیمی خەلیلیشەوە فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم

---

[1] هود (٥٤-٥٦).

[2] المائدة (٤٨).

[3] الطبري (١٠/٣٨٨).

[4] یونس (٧٢).

مُّسۡلِمُونَ ﴾[1] وەختێ پەروەردگاری پێی گوت: وەرە خۆ بە من بسپێرە، ئەڵێ: وا خۆم دایە دەستی ڕاهێنەری هەموو دنیا، ئیبراهیم بۆ کوڕەکانی یەعقوبیش ڕاسپێری کرد: فەرزەندانم! خوا ئەم ئاینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردوە، کەوایە بە موسوڵمانی نەبێت مەمرن. وە یوسف پێغەمبەریش فەرموویەتی: ﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[2] ئەی پەروەردگارم لەم وڵاتە تۆ دەستەڵاتت پێداوم و فێرت کردوم چۆن خەونەکان لێکدەمەوە، وەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمین، هەر تۆی لە دنیاو لە قیامەت گەورەی منی، لەسەر بڕوای تەواو بە خۆت بم مرێنەو بمگەیەنەوە بە پیاوچاکان. مووسا پێغەمبەریش فەرموویەتی: ﴿يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴾[3] مووسا بە هۆزەکەی خۆی گوت: گەلۆ! ئەگەر باوەڕتان بە خوا هەیەو ملکەچی فەرمانی ئەون، سا پشتتان هەر بەو ببەستن. جادووگەرەکان ئەڵێن: وەك خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴾[4] ئەی پەروەردگارمان خۆڕاگریمان بدەیەو بە باوەڕی پاکەوە(بە موسوڵمانی) بمان مرێنە. بەلقیسیش ئەڵێ: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾[5] پەروەردگارم من تا ئێستا ناهەقیم لە خۆم کردوە لە ئێستاوە(لەگەڵ سولەیمان) خۆم ئەدەمە دەست ڕاهێنەری گشت جیهان. وە خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ ﴾[6] ئێمە کە ئەم تەوراتەمان ناردۆتە خوار ڕووناکی و ڕێ نیشاندانی تێدایە، هەموو ئەو پێغەمبەرانەی حوکمیان پێدەکرد کە موسوڵمان و ملکەچ بوون. وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ﴾[7] ئەو کاتەیش من(هەر بە هێمای) تایبەتی خۆم حەواریەکانم تێگەیان: دەبێ بڕواتان بە من هەبێ و بە پێغەمبەرەکەی منیش باوەڕ بکەن ئەڵێن: خوایە تۆ شایەت بە کە بڕوامان پێهێنای و هەر ملکەچی فەرمانی تۆین. دوایین پێغەمبەرو بەڕێزترینی

---

[1] البقرة (١٣١–١٣٢).

[2] يوسف (١٠١).

[3] يونس (٨٤).

[4] الاعراف (١٢٦).

[5] النمل (٤٤).

[6] المائدة (٤٤).

[7] المائدة (١١١).

مرۆڤایەتی(موحەممەد(ﷺ)) فەرموویەتی وەك خوای گەورەئەفەرمویّت: ﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1] من نویّژ کردنمو بەندایەتی(پیّکهیّنانی ریّوشویّنی حەج کردنم)و ژینو مەرگم بۆ خودایە، کە راهیّنەری دنیا هەر خۆیەتی خودا هیچ شەریکی نیە، فەرمان وا بە من دراوەو من یەکەمینم لە ریزی موسوڵمانان. واتە: لە موسوڵمانانی ئەم ئوممەتە. بۆیە لەم فەرموودە سەحیحەدا فەرموویەتی: (ئیّمەی کۆمەڵی پیّغەمبەران منداڵی پیاوو ژنانی جیاوازینو ئاینمان یەکە)[2] واتە: بریتیە لەپەرستنی خودا بە تەنیاکە شەریکی نیە، با شەریعەتەکەشمان جۆراو جۆر بوبیّ، مانای ئەم وتانە(اولاد علات) کە پیّغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی، ئەم پیّغەمبەرانە(هەموو) برای یەکنو لە چەند دایکیّکی جیاو یەك باوکن.

## پاشەرۆژی خراپی ئەم تاوانبارانە

خوای گەورەئەفەرمویّت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ وَجَعَلْنَاهُمْ خَلَائِفَ﴾ هەنر بە درۆزنیان دادەنا، ئەوسا خۆییو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون(لە کەشتیدا) رزگارمان کردنو کردمانن بە جیّنشین لەسەر زەمیندا. ﴿وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ﴾ ئەوانەشمان ژیّر ئاو خست کە بڕوایان بە نیشانەکانی ئیّمە نەکرد، دە بڕوانەو(بزانە) ئەوانەی ترسیّنرا بوون چیان بەسەرهات ئاکامیان بەچی گەیشت. پاشان خوای گەورەئەفەرمویّت: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ لە پاش ئەویش زۆریّ لە پیّغەمبەرانمان بە چەند نیشانانەی دیاریەوە ناردە لای گەلانی خۆیان. واتە: دوای نووح پیّغەمبەر پیّغەمبەری زۆرمان ناردە لای هۆزەکانیان بەڵگەو نیشانەی زۆریان بۆ هیّنانەوە لەسەر راستی ئەو پەیامەی کە بۆیان هیّناون ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا بِهِ مِن قَبْلُ﴾ بەڵام نەهاتنە سەر بڕوا بەو شتانەی کە لە پیّشدا بڕوایان پیّ نەهیّنابوو، واتە: ئەو گەلانەی کە لە پیّشدا بڕوایان نەهیّنا بوو بەو شتانەی کە پیّغەمبەرەکانیان یەکەم جار هاتن بۆ لایانو بۆیان هیّنان. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرمویّت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾[3] هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد(ئیّمەش) دڵو دیدەی ئەوان (وەردەگیّڕین). وە لیّرەدا خوای گەورەئەفەرمویّت: ﴿كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْمُعْتَدِينَ﴾ ئیّمە ئاوا مۆر

---

[1] الانعام (١٦٢-١٦٣).

[2] فتح الباري (٦/٥٥٠).

[3] الانعام (١١٠).

دەخەینە سەر دڵی دەستدرێژیکەران. واتە: وەك چۆن مۆری نا بەسەر دڵی ئەوانەدا بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان لەسەرتاوە هەر بەو شێوەیەش مۆر دەنێ بەسەر دڵی ئەو کەسانەشدا کە وەك ئەوانن دوای ئەوان ئەو مۆرە وایان لێ دەکات باوەڕ ناهێنن تا سزای بەژان بە چاوی خۆیان نەبینن مەبەست لێرەدا ئەوەیە خودای گەورە ئەو گەلانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردوە لە ناوی دوان، ئەوانەیش بڕوایان هێناوە نەجاتی داون، ئەمەیش دوای نووح پێغەمبەر بووە(سەلامی خوای لێ بێ) چونکە خەڵکی لە پێش نووحدا لە زەمانی ئادەمەوە(سەلامی خوایان لێ بێ) موسوڵمان بوون هەتا ئەو کاتەی دەستیان دایە بتپەرستی خودایش نووح پێغەمبەری بۆ ناردن(سەلامی خوای لێ بێ) هەر لەبەر ئەوەیە خاوەنباوەڕان لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دەڵێن: تۆ یەکەم پێغەمبەری کە خودا ڕەوانەی کرد بۆ سەر خەڵکی سەر زەمین. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: نێوانی ئادەمو نووح دە سەدە بووە، هەموویان لەسەر ئیسلامەتی بوون[1] وە خوای گەورەلە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ ﴾[2] زۆر بەرەشمان لە پاش نووح لەناو بردوە. لەم ئایەتەدا هەڕەشەیەکی گەورە هەیە بۆ موشریکەکانی عەرەب ئەوانەی کە بڕوایان بە گەورەو دوایین پێغەمبەر(موحەممەد(ﷺ)) نەدەهێنا، گومانی تێدا نیە ئەوەی تووشی ئەوانە هات کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەهێنا وەك خوای گەورەباسی کردوە لەو سزاو ئازارەی کە داونی. ئایا ئەمانە چۆن گومان دەبەن، کە ئەمان هەڵساون بە کاری خراپتر لەوان؟

﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَارُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيهِ بِآيَاتِنَا فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَكُمْ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاءُ فِي الْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾

### بەسەرهاتی مووساو فیرعەون

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا ﴾ لە پاش ئەوانە، واتە: دوای ئەو پێغەمبەرانە ﴿مُوسَىٰ وَهَارُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيهِ ﴾ مووساوهارونمان بەڕێ کرد بۆسەر فیرعەونو دارودەستەکەی. واتە: گەلەکەی، ﴿بِآيَاتِنَا﴾ بە نیشانەکانی خۆمانەوە ﴿فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾ بەلام ئەوان خۆیان

---

[1] البداية و النهاية (١٠١/١)، و قال رواه البخاري.

[2] الاسراء (١٧).

زۆر بەزل زانیو تاوانکار بوون، شوێنی هەق نەکەوتنو ملیان پێ نەدا ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ کاتێ ڕاستییان لای ئێمەوە پێگەیشت ئەڵێن: ئەمە هەر بە ئاشکرا جادووە. ئەوانە(خوا ڕوویان ڕەش کات) سوێندیشیان بە خودا دەخوارد لەسەریو چاکیش دەیانزانی ئەوەی گوتویانە درۆو بوختان بووە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾[1] هەرچەند لە دڵی خۆیاندا هەموویان بە ڕاست دەزانی، خۆ بە زلزانیو ناهەقی، بوونە هۆی حاشا کردنیان. ﴿قَالَ مُوسَىٰٓ﴾ موسا پێی گوتنو نارەزایی خۆی دەربڕی ﴿أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ﴾ وەختێ ئەم ڕاستیەتان پێگەیوە، بەمە دەڵێن جادووە؟ بێگومان جادووگەران ڕزگار نابن. ﴿قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا﴾ ئەڵێن: هەر بۆ ئەوە هاتیتە لامان، کە وەرمانگێڕی لەوانەی بابو باپیرانمان لەسەری بوون ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ودەسەلات و گەورەیی ئەم سەر زەمینە بۆ ئێوە بێ، واتە: بۆ تۆو هارون بێ ﴿وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ﴾ بەڵام ئێمە بڕوامان پێتان نیە.

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾﴾

**وتووێژی موسا لەگەڵ جادووگەرەکاندا**

خوای گەورەبەسەرهاتی جادووگەرەکانی لەگەڵ موسادا(سەلامی خوای لێ بێ) باس کرد، لەوێدا لە پێشەوە قسەی لەسەر کرا، وە لەم سورەتەو سورەتی تاهاو شوعەرایشدا هەر باس کراوە. لەبەر ئەوەی فیرعەون(لەعنەتی خوای لێ بێ) دەیویست برەو بە پڕوپەچەکەی خۆی بدات لەناو خەڵکیدا، دژایەتی ئەو(پەیامە) هەقە ئاشکرای کە موسا(سەلامی خوای لێ بێ) هێنای پێ بکات، بەو چاوبەستو جادووانەی جادووگەرەکان ڕازاندبویانەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو کارە بەسەر خۆیدا شکایەوەو ئەو مەبەستەی بە دی نەهات، نیشانەکانی خوایەتی خودا لەو کۆڕە گشتیەدا دەرکەوت، ﴿وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾[2] جادووگەران هەموو

---

[1] النمل (١٤).

[2] الاعراف (١٢٠-١٢٢).

سوژدەیان برد، ئەڵێن: وا بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری گشت دنیا، پەروەردگاری مووساو هاروون. فیرعەون وای دەزانی بەو زوانە بەهۆی ئەو جادووگەرانەوە سەردەکەوێ، بەسەر ئەوپێغەمبەرەی خوادایە کە شارەزای نهێنیەکانە، بەڵام شکستی هێناو بەهەشتی لە دەستی خۆی داو، ئاگری بۆ خۆی سازاند ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ائْتُونِي بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ فیرعەون ئەڵێ: هەموو جادوگەرە شارەزاکانم بۆ بێنن، کە جادووگەرەکان هاتن، مووسا ئەڵێ: چیتان دەوێ بیهاوێژن، مووسا بۆیە ئەمەی پێگوتن، چونکە کاتێ کە ڕیزیان بەست، بەڵێنیان لەلایەن فیرعەونەوە پێدرا بوو کە زۆر ڕێزیان لێ دەگیرێو پاداشتی گەورەشیان پێ دەدرێت، ﴿قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا﴾[1] ئەڵێن: ئەی مووسا یان بیهاوێژە، یان ئێمە پێش تۆ دەیهاوێژین،(مووسا) ئەڵێ: نا ئێوە بیهاوێژن، مووسا دەیویست سەرەتا لەوانەوە دەست پێ بکات. بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە ئەو جادووەی ئەوان ببینێ کە دەیکەن. هەتا ئەو بە دوای ئەوەدا ڕاستیەکەی خۆی دەربخاتو پڕوپوچەکەی ئەوان بەتاڵ بکاتەوە بۆیە لەو کاتەدا کە جادووگەرەکان چاوبەسیان لەو خەڵکە کرد بە جادوەکانیانو ترسیان وەبەرنان جادوویەکی گەورەیان لێ کردن. ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾[2] مووسا لەو کاتەدا لە دڵی خۆیدا کەمێك ترسا، پێمان گوت: هیچ ترسێکت نەبێ، تۆ سەرکەوتوی، ئەوەی لە دەستی ڕاستتدایە بیهاوێژە، هەرچی ئەمان کردویانە قووتی ئەدات، ئەوانەی ئەوانە کردویانە فێڵی جادووگەرانە، جادووگەران لە هەر کوێ بن سەرناکەون. ئا لەو کاتەدا کاتێ جادووگەرەکان جادووەکانی خۆیان هاوێشت ﴿ فَلَمَّا أَلْقَوْا قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ ۖ إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ اللَّهُ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ﴾ کە هاوێژتیان مووسا ئەڵێ: هەرچی ئێوە هێناوتانە جادووەو خوا پوچەڵی دەکاتەوە لێتان، خودا کاری تاوانکاران سەرکەوتوناکات.

﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾﴾

---

[1] طه (٦٥-٦٦).

[2] طه (٦٧-٦٩).

**لە هۆزی فیرعەون کەس بڕوای بە مووسا نەهێنا جگە لە چەند لاوێ**

خوای گەورەباسی ئەوە دەکات کە هۆزی فیرعەون بڕوایان نەهێنا بە مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) لەگەڵ ئەو هەموو نیشانانەو بەڵگە دیارو ئاشکرانەی بۆی هێنان و پیشانی دان، جگە لە هەندێ کەسی لاو، لە ترسی فیرعەون و دارو دەستەکەی، نەکا ناچاریان کەن و بیانگێڕنەوە سەر ئەو خوانەناسیەی کە لەسەری بوون. چونکە فیرعەون(لەعنەتی خوای لێ بێ) زۆر لاسارو زۆردار بوو، وێنەی زۆر کەم بوو لە تاوان و خراپەکاریدا، خاوەن تواناو دەسەڵاتێکی وا بوو کە ژێر دەستەکانی زۆر لێی دەترسان، عەوفی ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٍ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ جگە لە چەند تازە لاوێك لە هۆزەکەی، هیچ کەسی تر(لە ترسی ڕق هەڵسانی فیرعەون و پیاوماقوڵانی دیوانی ئەو) نەیان وێرا بڕوا بە مووسا بێنن، فیرعەون لەو سەر زەمینەدا پایە بڵندێك بوو لە ڕیزی هەڵە ڕۆیان بوو. (ئەڵێ): ئەو بەرە لاوەی کە بڕوایان هێنا بە مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) کەسانێ بوون لە نەوەی ئیسرائیل نەبوون، لە هۆزی فیرعەون خۆی بوون و لە چەند کەسێ تێنەدەپەڕین. لەوانە ژنەکەی فیرعەون و خاوەنباوەڕەکەی ئالی فیرعەون و گەنجینەوانەکەی فیرعەون و ژنی گەنجینەوانەکەی فیرعەون بوو.[1] بەڵام نەوەی ئیسرائیل وەك گوتراوە هەموویان بڕوایان بە مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) هێناوە، مزگێنیشیان داوە بە هاتنی، چونکە لە کتێبە پێشوەکانیاندا سیفەتەکانی مووسایان زانیوە مزگێنی پێدراوە کە خودا ڕزگاریان دەکات لە یەخسیری فیرعەون و سەریان دەخات بەسەریدا. بۆیە کاتێ ئەو دەنگو باسە گەیشت بە فیرعەون زۆر ترساو، بەڵام هیچ شتێکی لە دەست نەهات، کە مووسایش (سەلامی خوای لێ بێ) هات فیرعەون زیاتر دەستی کرد بە ئازاردانی نەوەی ئیسرائیل ﴿قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ﴾[2] ئەڵێن: پێش ئەوەی کە تۆ بێی ئەچەوسێنرێینەوە، کە تۆش هاتوی هەروا دەمانچەوسێننەوە، ئەڵێ: لەوانەیە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لە بەین بەرێ و ئێوە بکاتە جێنشین لەم زەویەدا سەیر کات ئێوە چۆن دەکەن. لەمەوە دەردەکەوێ کە نەوەی ئیسرائیل هەموو خاوەنباوەڕ بوون لەو سەردەمەدا.

---

[1] الطبري (١٥/١٦٤).

[2] الاعراف (١٢٩).

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾

**مووسا هۆزەکەی هەڵدەنا کە هەر پشت بە خودا ببەستن**

خوای گەورەباسی مووسا دەکات(سەلامی خوای لێ بێ) کە دەیگوت بە بەرەی ئیسرائیل: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴾ مووسا بە هۆزەکەی خۆی گوت: گەلەکەم ئەگەر باوەڕتان بە خوا هەیەو ملکەچی فەرمانی ئەون سا پشتتان هەر بەو ببەستن، واتە: خودا بەسەبۆ ئەو کەسەی کە پشتی پێ دەبەستێ. ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥ ﴾[1] مەگەر خودا بۆ بەندەی خۆی بەس نیە؟ ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ ﴾[2] هەر کەسێ خۆی بەخوا بسپێرێ ئەوی بەسە. زۆر جار خوای گەورەکە باسی خواپەرستی دەکات، خۆسپاردنیشی لەگەڵ دێنێ وەك ئەفەرموێت: ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ ﴾[3] سا هەر تۆ(ئەی پێغەمبەر(ﷺ)) هەر ئەو بپەرستەو چارەنووست بەو بسپێرە(واتە بە خودا) وە فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا ﴾[4] بڵێ: ئەوە خودای میهرەبانە و باوەڕمان پێهێناوەو خۆمان هەر بەو سپاردوە. وە فەرموویەتی: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ﴾[5] خولقێنەری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە جگە لەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێ، هەر ئەو بکە بە بریکاری خۆت. وە خودای گەورە فەرمانی داوە بە خاوەنباوەڕان کە لە هەموو نوێژەکانیاندا چەند جار بڵێن: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾[6] ئێمە هەرتۆ دەپەرستین و هەر داوای یارمەتیش لە تۆ دەکەین. بەرەی ئیسرائیل گوێڕایەڵی ئەو فەرمانەی خوایان کرد ﴿ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەڵێن: خۆمان بە خوا سپارد، ئەی پەروەردگاری هەموومان مەمانخەرە بەر ئازارو ئەشکەنجەی ناهەقیکاران. واتە: زاڵیان مەکەو سەریان مەخە بەسەرماندا، هەتا وا بزانن لەبەر ئەوە سەرکەوتون چونکە ئەوان لەسەر هەقن و ئێمە لەسەر ناهەقین، بکەونە ئازارو ئەشکەنجەمان، هەر

[1] الزمر (٣٦).
[2] الطلاق (٣).
[3] هود (١٢٣).
[4] الملك (٢٩).
[5] المزمل (٩).
[6] *الفاتحة (٥).*

بەو شێوەیش ڕیوایەت کراوە لە ئەبی میجلەزو ئەبی زوحاوە[1]. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە موجاهیدەوە ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: زاڵیان مەکە بەسەرماندا هەتا ئازارو ئەشکەنجەمان بدەن.[2] ﴿وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ﴾ بە بەزەیی خۆت ڕزگارمان کە ﴿مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ لە کۆمەڵی خوانەناسان. واتە: ئەوانەی کە بڕوایان بە هەق نیەو شاردویانەتەوە، بەڵام ئێمە بڕوامان بە تۆ هێناو خۆمان سپاردووە بەتۆ.

﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٧﴾

**فەرمان پێکردنیان بە نوێژ کردن لەناوماڵەکانی خۆیاندا**

خوای گەورەنەفەرموێت: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ مووساو براکەیمان تێگەیاند: کە ئێوە بۆ هۆزی خۆتان(لە میسردا) چەند ماڵێك بکەن بەشوێنی حەوانەوەو ماڵەکانتان ڕوو بکەنە قیبلە بە ڕێكو پێکی نوێژ بەجێ بێنن وە مژدە بدە بە خاوەنباوەڕان(بە بەهەشتو بەسەرکەوتن) خودای گەورە هۆکاری ڕزگار کردنی بەرەی ئیسرائیلی باس کردوە لە فیرعەونو هۆزەکەیو چۆنیەتی ڕزگارکردنەکەشیان لە دەستیان. ئەوە بوو خودای گەورە فەرمانی دا بە مووساو هارونی برای کە چەند خانوویەك دروستبکەن لە میسردا، وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ﴾ عەوف ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: بەرەی ئیسرائیل ئەڵێن بە مووسا، ناتوانین نوێژەکانمان بە ئاشکرا بکەین لەگەڵ فیرعەونیەکاندا خوای گەورەئیزنی دان کە لە ماڵەکانی خۆیاندا نوێژ بکەنو فەرمانیشی پێدان کە خانوەکانیشیان وا لێ بکەن ڕووەو قیبلە بێ[3] موجاهید ئەڵێ: ﴿وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ﴾ کاتێ بەرەی ئیسرائیل ترسیان هەبوو کە فیرعەون لەناو کڵێسە گەورەکاندا بیانکوژێ، فەرمانیان پێکرا کە ماڵەکانیان بکەنە مزگەوتو ڕووەو قیبلە بێ بە پەنهانی نوێژی تێدا بکەن.[4] قەتادەو زەححاکیش هەر وایان گوتوە[5].

---

[1] الطبري (١٥/١٦٩).
[2] عبدالرزاق (٢/٢٩٧).
[3] الطبري (١٥/١٧٤).
[4] الطبري (١٥/١٧٤).
[5] الطبري (١٥/١٧٣).

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ
رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت
دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾

**نزای مووسا لە فیرعەون و دارو دەستەکەی**

ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خودای مەزنەوە لە بارەی ئەو نزایەی کە مووسا کردی لە فیرعەون و دارو دەستەکەی کاتێ کە حەقیان قبووڵ نەکردو بەردەوام بوون لەسەر گومڕایی و خوانەناسی و دژایەتی کردن و ملنەدان پێی لەبەر زۆرداری و خۆ بە زل زانی و لوت بەرزی لاساری، خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ﴾

مووسا ئەڵێ: ئەی پەروەردگاری هەموومان، تۆ لە ژینی دنیادا هۆکاری ڕازاندنەوەو ماڵی دنیات دا بە فیرعەون و پیاوانی دیوەخانی، ئەی پەروەردگارمان، هەر بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا کەن(واتە: شتومەکی دنیاو خۆشیەکانی و ماڵێکی زۆرت پێداون)(لِيَضِلُّوا) بە فەتحی یائەکە واتە: ئەوانەت پێداون، کەخۆت دەزانی بڕوا ناهێنن بەو پەیامەی کە تۆ بەمندا ناردوتە بۆیان، وەك جڵەو شلکردنێك بۆیان. ئەم مانایە وەك ئەو ئایەتەوایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ هەتا لە دوایدا تاقیان بکەینەوە. هەندێکی تر خوێندویانەتەوە (لِيُضلوا) بە زەمی یائەکە واتە: بۆ ئەوەی، بەوشتانەی کە پێت داون لەوانەی کە خۆت مەیلت لێیە لە بەندەکانت تاقی بکەیتەوە، هەتا ئەوانەی کە گومڕات کردون وا بزانن کە تۆ ئەوەت پێداون لەبەر خۆشەویستی و گرنگی پێدانیانە لەلایەن تۆوە ﴿رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ ئەی پەروەردگارمان ماڵیان مەهێڵەو تەفروتونایان بکە. ئیبنوعەبباس و موجاهید ئەڵێن: یانی: سامانەکانیان لەناو بەرە.[1] زەححاك و ئەبول عالیەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێن: خوای گەورەماڵ و سامانەکانیانی کرد بە بەردی ڕازاوەو نەخش کراو، وەك ئەو شێوەی خۆی چۆن بووە.[2] وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ دڵیان زیاتر ڕەق و ڕەش بکە. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: مۆری پێدا بنێ[3] ﴿فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ باوەڕ ناهێنن هەتا جەزرەبەی زۆر بە ژان بە چاوی خۆیان نەبینن. ئەم نزایە لەلایەن مۆوساوە بوو کە لەبەر خوداو ئاینەکەی ڕقی هەڵسا لە فیرعەون و دارو دەستەکەی، کاتێ کە بۆی دەرکەوت ئەوانە خێریان تیا نەماوەو هیوای هیچ شتێکی چاکیان لێ ناکرێ. وەك چۆن

---

[1] الطبري (١٥/١٨١).

[2] الطبري (١٥/١٨٠).

[3] الطبري (١٥/١٨١).

نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێ) دوعای لە هۆزەکەی خۆی کرد ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾[1] پەروەردگارم لەم سەر زەمینە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن گیان لەبەریان لێ مەهێڵە، چونکە ئەگەر بیانهێڵی بەندەکانت گومڕا دەکەنو هەر منداڵێکیشیان ببێ تاوانبارو سپڵە دەبێ. بۆیە خوای گەورەنزاکەی مووسای(سەلامی خوای لێ بێ) قەبوڵ کرد لێیان کە هارونی برای ئامینی بۆ کردبوو، ئەفەرموێت: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ نزاتان قەبوڵ بوو، ئێوە ڕاوەستاو بن(لە فەرمان دەرمەچن) واتە: وەك چۆن نزاکەتان قەبوڵ بوو، ئێوەیش ڕاوەستاو بن لەسەر فەرمانی من. ئیبنوجورەیج ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە: ڕاوەستنو لەسەر فەرمانی من بەردەوام بن، کە بریتیە لەو خۆڕاگریە(الاستقامة)[2].

﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾﴾

## ڕزگار بوونی نەوەی ئیسرائیلو نوقومبوونی ئالی فیرعەون

خودای مەزن(لێرەدا) باسی ئەوە دەکات کە چۆن فیرعەونو لەشکرەکەی نوقم کردو خنکاندنی کاتێ نەوەی ئیسرائیل لەگەڵ مووسا لە میسر چوونە دەرەوە، وەك گوتراوە شەش سەد هەزار جەنگاوەر بوون جگە لە وەچە، خشڵو زێڕێکی زۆریشیان لە قیبتیەکان خواستبوو هەموویان لەگەڵ خۆیان بردبوو، بۆیە فیرعەون تووڕە بوو لێیان، ناردی بە شارەکەدا بۆ کۆ کردنەوەی خەڵکی، لەشکرێکی زۆری لە هەرێمەکاندا کۆ کردەوە، بە سامێکی گەورەو لەشکرێکی ئێجگار زۆرەوە چوو بە دوایاندا، بەو شێوەیەی کە خوای گەورەخۆی مەیلی لێبوو، تەنیا کەسێ لەوانەی کە خاوەن تواناو دەسەڵات بوو لێی دوا نەکەوت لە وڵاتەکەیدا، هەموو لە کاتی هەڵاتنی خۆردا پەیوەندیان پێوە کرد، ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾[3] ئەو کاتە کە هەردوو کۆمەڵ یەکتریان دی،

---

[1] نوح (٢٦-٢٧).

[2] الطبري (١٥/١٨٧).

[3] الشعراء (٦١).

هاوڕێیانی مووسا ئەڵێن: بێگومان ئێمە گیراین چونکە ئەوان کاتێ گەیشتنە کەناری دەریاکە، فیرعەون بە دوایانەوە بوو، هیچ شتێ نەمابوو جگە لەوەی ئەو دوو کۆمەڵە بێن بەیەکداو شەڕ بکەن. هاوەڵەکانی مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) پێیان دادەگرتو دەیانپرسی لە مووسا کە چۆن ڕزگار بین لەوەی کە تێی کەوتوین؟ مووساش دەیگوت: من فەرمانم پێدراوە لێرەوە بڕۆم ﴿قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ﴾[1](مووسا) ئەڵێ: نابێ هیچ بترسن، چوون پەروەردگارم لەگەڵەو بەو زوانە دەرویەکم لێدەکاتەوە. هەر کاتێ تەنگانەیە هات خودا دەروو دەکاتەوە، خودای گەورە فەرمانی دا بە مووسا کە بە عەساکەی بکێشێ بە دەریاکەدا. دای لێیو دەریاکە لەت بوو، هەر لەتێکی وەك کێوێکی گەورەی لێهات، بوو بە دوانزە ڕێگا، بۆ هەر بەرەبابێ ڕێگایەك، خوای گەورەفەرمانی دا بە هەوا زەویەکەی وشك کردەوە ﴿فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ﴾[2] ڕێگایەکی وشکیان بۆ بگرە بەر(لە دەریادا) مەترسە(فیرعەون) پێت بگاتو مەترسە(لە خنکانیش) ئاوەکە ڕێی دەکرد لە نێوان ڕێگاکاندا وەك شێوەی پەنجەرە وا بوو، بۆ ئەوەی هەریەکێ لەو کۆمەڵانە چاویان لە یەکتری بێ، بۆ ئەوەی وا گومان نەکەن کە ئەوانە خنکاون، بەرەی ئیسرائیل لە دەریاکە پەڕینەوە. کاتێ کە دواین کەسیان لە دەریاکە چوونە دەرەوە، فیرعەونو سوپاکەیشی گەیشتنە دەریاکە لە لایەکی تریەوە، سەد هەزار ڕەشی(قیبتی) لەگەڵدا بوو جگە لە ڕەنگەکانی تر. کاتێ فیرعەون ئەوەی بینی سەری لێ شێواو ترساو نەیدەزانی چی بکات، هات بە دڵیدا کە بگەڕێتەوە، بەڵام ئەستەمەو کار لە کار ترازاوە هیچ دەرفەتێکی نەماوە، قەدەر کاری خۆی کردو نزاکان قەبوڵ کرا، جوبرەئیل(سەلامی خوای لێ بێ) بە سواری ماینێکی توندو تیژەوە هاتو بە لای ئەسپەکانی فیرعەوندا ڕۆشتو پەلاماریان داو جوبرەئیلیش چووە دەریاکەو ئەسپەکانیش بە دوایدا چوون، فیرعەون هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر خۆیدا نەماو، ڕووی کردە سەرکردەکانیو پێی گوتن: ئەوەی ئیسرائیل لە ئێمە شایستە تر نین بە دەریا، هەموویان خۆیان خستە ناو دەریاکە هیچ کەسیان نەما نەچێتە ناوی، میکائیلیش بە دوایانەوە بوو، وازی لە کەسیان نەدەهێنا هەتا بەوانی دەگەیاند. کاتێ کە هەموو بە تەواوی کۆبونەوە لە دەریاکەدا، ئەوانەی لە پێشەوە بوون ویستیان لە دەریاکە دەرچن، خودای خاوەن دەستەڵات فەرمانی دا دەریاکە دایان پۆشیو نوکەیان لێ ببڕێ. کەسیان لێ دەرنەچوو، شەپۆلەکانی بەرزی دەکردنەوەو نزمی دەکردنەوە، شەپۆلەکان بە دوای یەکدا ئەیاندا بەسەر فیرعەوندا مردن دەوری داو یەخەی گرت ئا لەو حاڵەدا کە(بەسەری هات) ئەڵێ: وەك خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ

---

[1] الشعراء (٦٢).

[2] طه (٧٧).

وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ بەرەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە. فیرعەون و لەشکرەکەیشی(بۆ ناهەقی و دەست درێژی) شوێنیان کەوتن تا ئەو کاتە کە بخنکێ، ئەڵێ: من بڕوام هێنا، کە هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ، ئەوەنەبێت کە تۆرەمەی ئیسرائیل باوەڕیان پێیەتی، وە منیش لە موسوڵمانانم، باوەڕی هێنا لە کاتێکدا کە ئەو باوەڕە هیچ سودێکی نەبوو بۆی. ﴿فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[١] کاتێ بینیان بەڵای ئێمەیان دێتە سەر ئەڵێن: ئیتر خودای تاک و تەنیا دەناسین و لەو شتانەی دەمانگوت: شەریکی خودان، حاشا دەکەین، پاش بینینی سزای ئێمە، بڕوا هێنان قازانجی پێ نەگەیاندن، ئەمە ڕێوشوێنی خودایە دەربارەی گشت بەندەکانی هەر وا بووە، لەو کاتەدا هەر ئەوانەی خوانەناس بوون زەرەریانکرد. بۆیە خوای گەورەلە وەڵامی فیرعەوندا کاتێ ئەوەی گوت فەرمووی: ﴿ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ ئێستا(باوەڕ دێنیت؟) کە بێگومان لەوەو پێش سەرپێچیت کردو لە ڕیزی خراپەکاران بووی. واتە: ئا ئێستا دەڵێیت؟ کە لە پێشدا لەسەر ئەوەی لە نێوان تۆو خودای مەزندا هەبوو سەرپێچیت کردو لە ڕیزی ئەو کەسانە بووی کە خەڵکیان گومڕا دەکرد. خوای گەورەلە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ﴾[٢] کردمانن بە پێشەوایانێك کە خەڵکی بانگ دەکەن بۆ ناو ئاگر، ڕۆژی قیامەتیش هیچ کەس بە هانایانەوە نایە، ئەمەی خوای گەورەبۆی باس کردین لە بارەی فیرعەونەوە لەم ئایەتەداو ئەوەی بەسەری هات لە ڕازە نهێنیەکانە کە هەر خودای گەورە پێغەمبەرەکەی لێ ئاگادار کردوە، بۆیە ئەبوداودی تیالیسی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (جوبرەئیل پێی گوتم: ئەگەر چاوت لێم دەبوو، کە من قوڕە ڕەشەی دەریام هەڵدەگرت و دەمکردە ناو دەمی فیرعەون لە ترسی ئەوەی نەکا بەزەیی خودا فریادی کەوێ)[٣] تیرمیزی و[٤] ئیبنوجەریریش ڕیوایەتیان کردوە.[٥] تیرمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبی سەحیحە(حدیث

---

[١] غافر (٨٤–٨٥).

[٢] القصص (٤١).

[٣] مسند الطيالسي (٣٤١)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[٤] تحفة الاحوذي (٨/٥٢٦).

[٥] الطبري (١٥/١٩٠–١٩١).

غریبٌ صحیح) وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴾ ئەمڕۆ لاشەت(لە دەریادا) ڕزگار دەکەین. تا پەندێك بێ بۆ ئەوانەی لە پاش تۆ دێن، زۆری ئەم خەڵکە لە نیشانەکانی ئێمە ئاگادار نین. ئیبنوعەبباس و کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە گوتویانە: هەندێ لە بەرەی ئیسرائیل گومانیان هەبوو لە مردنی فیرعەون، خودای گەورە فەرمانی دا بە دەریا کە لاشەکەی بە تەواوی فڕێ بدات بە بێ گیان و بە قەڵغانە ناسراوەکەیەوە لە شوێنێکی بەرزی ئەو زەویەدا، بۆ ئەوەی بەچاکی بزانن کەمردوە و لەناو چووە.[1]

بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ ﴾ واتە: بەرزت دەکەینەوە لە بەرزایەکدا لەو زەویەدا. ﴿بِبَدَنِكَ ﴾ موجاهید ئەڵێ: بە لاشەت.[2] ﴿لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیە بۆ بەرەی ئیسرائیل لەسەر مردن و لەناوچونت، بەڵگەش بێ لەسەر ئەوەی کە هەر خودا ئەو خاوەن دەسەڵاتەیە کە گیانی هەموو گیانەوەرەکان بە دەستی ئەوە و هیچ کەسێ لەبەر تورەیی ئەودا خۆی ناگرێ و ناوەستێ. بۆیە هەندێ لە زانایانی پێشینە خوێندویانەتەوە(لتكون لمن خَلَقَكَ ءايةً) تابۆئەوانەی کەدوای تۆدێن ببێتەنیشانە، پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴾ چونکە زۆرێ لەم خەڵکە لە نیشانەکانی ئێمە ئاگادار نین، واتە: پەندی لێ وەرناگرن و نابێتە دەرس بۆیان. وە لە ڕۆژی عاشورادا(فیرعەون و دارو دەستەکەی) خنکان و لەناوچوون وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەدینە، جولەکەکان بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی عاشورادا، فەرمووی:(ئەم ڕۆژە چیە وا تێیدا بەڕۆژوو دەبن) ئەڵێن: ئەمە ڕۆژێکە خودا مووسای سەرخست بەسەر فیرعەوندا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئێوە لە پێش ترن لەوان بە مووسا، ئێوەیش(ئەو ڕۆژە) بە ڕۆژووبن)[3].

﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخْتَلَفُوا۟ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾﴾

---

[1] الطبري (١٥/١٩٦).

[2] الطبري (١٥/١٩٧).

[3] فتح الباري (٨/١٩٨).

## دامەزراندنی بەرەی ئیسرائیل لەو زەویەداو ڕۆزی پاك و چاك پێدانیان

خوای گەورەباسی ئەو بەهرانە دەكات كە دابووی بە نەوەی ئیسرائیل لەو بەهرە دینیو دنیاییانە وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ﴾ بەڕاستی ئێمە بەرەی ئیسرائیلمان لە شوێنێكی خۆش دامەزراند، دەڵێن: ئەو شوێنە وڵاتی میسرو شامە هەتا دەگاتە قودسی پیرۆزو دەورووبەری، بێگومان كاتێ خودای گەورە فیرعەونو لەشكرەكەی لەناو برد، دەسەڵاتی دەوڵەتی مووسەویەكان بە تەواوی جێگیر بوو لە وڵاتی میسردا، وەك خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ﴾[1] ئەوسا ئێمە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئەو وڵاتەمان(كە بەرەكەتمان پێدابوو) كردە بەشی ئەوانەی چەوسا بوونەوە. بەڵێنی هەرە پیرۆزی(بێ كەمو كوڕی) دەربارەی بەرەی ئیسرائیل هاتە جێ، لەباتی خۆڕاگرتنیان، هەرچی فیرعەونو هۆزەكەی دایان ناو بەرزیان كردەوە، هەموومان لێ تێكو پێك دان. وە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[2] ئیتر باغاتو كانیاومان پێ جێ هێشتن، لەگەڵ هەموو گەنجینەو خانوە خۆشەكان، هەر بەو شێوەیە ئەم هەموەشمان دا بە نەوەی ئیسرائیل. بەڵام دوای ئەوە بەردەوام لەگەڵ مووسادا بوون(سەلامی خوای لێ بێ) بە تەمای وڵاتی قودسی پیرۆز بوون، كە وڵاتی ئیبراهیمی خەلیل بوو(سەلامی خوای لێ بێ) مووساو(سەلامی خوای لێ بێ) ئەوانەشی كە لەگەڵیدا بوون، داوای قودسی پیرۆزیان دەكرد كە هۆزێكی تیا بوو لە عەمالیقەكان بەرەی ئیسرائیل ترسان لەوەی بە شەڕ بێن لەگەڵیاندا، لەتۆڵەی ئەم ترسنۆكییەیان خوای گەورەچل ساڵ تەفرو تونا و ئاوارەی كردن لە بیاباندا، لەوێدا هارون وەفاتی كردو پاشان مووسایش وەفاتی كرد(سەلامی خوایان لێ بێ) دوای ئەمان(نەوەی ئیسرائیل) لەگەڵ یوشعی كوڕی نون دەرچوون بەرەو قودسی پیرۆز خودای گەورە سەری خستنو قودسی پیرۆزیان كەوتە دەست ماوەیە لەم ڕۆژگارە لە ژێر دەستەڵاتیاندا بوو. پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ ڕۆزی پاكو چاكمان پێدان، واتە: ڕۆزی چاكو حەڵاڵو بەسودو ڕەوا لە سروشتو لەشەرعدا پێدان، ﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوا۟ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ

---

[1] الاعراف (١٣٧).

[2] الشعراء (٥٧-٥٩).

يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ هەتا زانستی (تەوراتیان) هاتە لا ئەوەبوو کێشەیان لێ پەیدا نەبوو، بەڕاستی پەروەردگارت بڕیار ئەدات لە نێوانیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا. واتە: هیچ گیرو گرفتێکیان نەبوو تا کێشە بکەن لەسەری، چونکە خودای گەورە بۆی ڕوون کردبونەوەو گومانی لە دڵدا نەهێشتبوون، لەم فەرموودەیەدا هاتوە:(بەڕاستی جوولەکەکان ناکۆك بوون، بوون بە حەفتاو یەك دەستە، مەسیحیەکان ناکۆك بوون، بوون بە حەفتاو دوو دەستە، بەو زوانە ئەم ئوممەتەیش دەبێ بە حەفتاو سێ دەستە، لەوانە یەکێکیان لەناو بەهەشتدایە، حەفتاو دوویان لەناو ئاگردایە)، گوترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە منو هاوەڵەکانمی لەسەرە)[1] حاکم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا بەم وتەیە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾.

﴿ فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾

### لە کتێبە پێشوەکاندا ئەم قورئانە باسی هاتووە

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ ئەگەر تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)) لەوەی بۆمان ناردویتە خوارێ بە گومانی، دەی بپرسە لەو کەسانەی بەر لە تۆ کتێبیان بۆ هاتوە، هەرچی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە بێ شك ڕاستەو لە ڕیزی دوودڵان مەبە. هەرگیز لەوانە مەبە کە نیشانەکانی خودایان بە درۆ دەزانی، ئەوساکە تۆش دەچیە ڕیزی زیانباران، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ﴾[2] ئەوانە وا دەکەونە شوێنی ئەم پێغەمبەرە کە ڕاسپاردەی خوایەو نەخوێندەوارە و لە توراتو ئینجیلیش(دەبینن) ناوی نوسراوە. پاشان دوای ئەم

---

[1] الحاكم (١/١٢٩)، سەحیحە.

[2] الاعراف (١٥٧).

زانیاریەش کە دەیزانن لە کتێبەکانیانداو وەك چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسن، ئاوا پێغەمبەریش دەناسن بەلام دەیشارنەوەو دەیگۆڕنو لە جێیدا شتی تر دادەنێنو بڕوای پێ ناکەن لەگەڵ ئەو بەلگەیەدا کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆیە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن، جا با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێ، هەتا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. واتە: باوەڕێ ناهێنن کە سوودی بێ بۆیان، بەڵکو کاتێ باوەڕ دێنن کە هیچ سودێکی نیە. بۆیە کاتێ کە مووسا نزای کرد لە فیرعەونو دارو دەستەکەی ئەڵێ: وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[1] پەروەردگارمان مالیان مەهێلەو تەفروتونایان بکە دڵیان زیاتر ڕەقو ڕەش کە، چونکە بڕوا ناهێنن هەتا جەزرەبەی زۆر بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. وەك خوای گەورەلەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٍ قُبُلًا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ﴾[2] ئەگەر فریشتەشمان بناردایەو مردوەکانیش قسەیان لەگەڵدا بکردنایە هەموو شتمان لە بەرانبەر ئەوانەوە کۆ کردایەتەوە، هێشتا باوەڕیان نەدەهێنا، مەگەرخوا مەیلی لێ بوایە، بەلام زۆربەیان نەزان بوون.

﴿فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٩٨﴾﴾

**هەر کاتێ سزا هاتبێ باوەڕ هێنان هیچ سودێکی نەبوە تەنیا بۆ هۆزی یونوس نەبێ**

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ﴾ بۆچی هیچ شارێك نەبوو کە خەلکەکەی بڕوا بێنن تا بڕواکەیان بەهرەیان پێ بگەیەنێ جگە لە هۆزەکەی یونوس؟ کە کاتێ بڕوایان هێنا، ئازاری ئابڕووبەرمان لە دنیا لێ لادان، وامان کرد کە هەتا ماوەیەك خۆشی ڕابوێرن. واتە: دەی بۆ ئەو گەلانەی پێشوو هەموو باوەڕیان نەهێنا کە پێغەمبەرانمان بۆ ناردن، بەڵکو ئەی موحەممەد(ﷺ) ئێمە لە پێش تۆدا هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ حەتمەن هۆزەکەی یان زۆرینەی هۆزەکەی بڕوایان پێ نەکردوە.

---

[1] یونس (٨٨).

[2] الانعام (١١١).

وەك خـوداى گـەورە فەرموويـەتى: ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾[1] حـەيف بۆ ئـەو بەندانـە، هـەر پێغەمبـەرێكمان بۆنـاردبن گاڵتـەو گـەپيان پێكـردوە. وە فـەرموويـەتى: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ﴾[2] پێش لەمانەش هـەر وا بـوە، هـەر كاتێ پێغەمبەرێكيان بۆ هاتووە گوتويانە: يان جادووگـەرە يـان شـێتە. وە فـەرموويـەتى: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ﴾[3] هـــەر وا بووە پێش تۆش هـەر پێغەمبـەرێكمان ناردوەتـە هـەر شـارێك لـە ئێمـە ترسيان وەبـەر بێنێ، هـەموو خۆشـگوزەرانەكانى ئەوانـە گوتويانـە: بـابو باپيرانمـان لەسـەر ئاينێك ڕۆشـتوون ئێمـەش پـەيڕەوى ئەوانين. لـەم فـەرموودە سـەحيحەدا هـاتووە:(پێغەمبـەرانم پيـشان درا، پێغەمبـەرى وا هـەبوو بەلامـدا تێدەپەڕى كۆمەڵێ خەڵكى لەگەڵدا بوو، پێغەمبەرى وا تێدەپەڕى يەك پياوى لەگەڵدا بـوو، پێغەمبـەرى وا هەبوو دوو پياوى لەگەڵدا بوو، پێغەمبەرى واش هەبوو هـيچ كەسـى لەگەڵـدا نـەبوو).[4] پاشـان باسـى زۆرى شوێنكەوتوانى مووساى كرد(سەلامى خـواى لـێ بـێ) پاشـان باسـى زۆرى ئوممەتەكەيـشى كـرد، ئەوەندە زۆر بوو كە ئاسۆى خۆرهەڵاتو خۆرئاواى گرتبوو، مەبەست ئەوەيە كە هيچ شارێك نەبووە بـە تەواوى بڕواى هێنا بێ بە پێغەمبەرەكەى لەو شارانەى لە پێشەوە بـوون جگـە لـە هۆزەكـەى يونـوس، خـەڵكى شارى نەينـەوا بـوون، بڕواكەشيان لەبـەر ئـەوە بـوو دەترسـان تووشـى ئـەو سـزايە ببن كـە پێغەمبەرەكەيان ئاگادارى كـردوون لێـى، كـاتێ بـە چـاوى خۆيـان ديـاردەكانى ئـەو سـزايان دەبـينىو پێغەمبەرەكەشيان دەرچوو بوو لە نێوانياندا، كاتێ دەستيان كرد بە هاوارو لاڵەو گريـانو پاڕانـەوە لـە خوداى گەورەو داوايان دەكرد كە ئەو سزايان لەسەر هـەڵگرێ كـە پێغەمبـەرەكـەيان ئاگـادارى كـردوون لێى، منداڵو مەڕو ماڵاتەكەشيان لەگەڵ خۆيان هێنا بوو. ئا لەو كاتەدا خودا بـەزەيى هاتـەوە پێيانـدا، سزاكەى لەسەر لابردنو دواخرا لەسەريان. وەك خـواى گەورەفەرموويـەتى: ﴿إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٍ﴾ قـەتادە لـە تەفـسيرى ئـەم ئايەتـەدا ئـەڵێ: هيچ شارێ كە خوانەناس بوبێ كاتێ كە سزاى بۆ هاتبێ پاشان بڕواى هێنابێ سوودى لـەو بـڕوا هێنانـە وەرنەگرتوەو وازى لێ نەهێنراوە جگە لـە هۆزەكـەى يونـوس، كـاتێ پێغەمبـەرەكـەيان لـە دەسـت داو

---

[1] يس (٣٠).

[2] الذاريات (٥٢).

[3] الزخرف (٢٣).

[4] فتح الباري (١٠/٢٢٤).

زانیان کە سزا دان لێیان نزیك بوەتەوە، خودا پەشیمانی(تەوبەی) خستە دڵیانەوەو جلو بەرگی زبریان لەبەرکردو دایكو بەچكەی مەڕو ماڵاتو چوار پێكانی تریشیان لە یەك جیا کردەوە(هەلاوێرا) پاشان چل شەو دەستیان کرد بە لالەو پاڕانەوە لە خودا، کاتێ خودای گەورە ئەو گەڕانەوەو پەشیمانیە ڕاستەی لێ بینین‌و دەرکەوت تەوبەیان کردوە لەوەی کردویانە ئەو سزایەی لەسەر لابردن کە نزیك بوو تووشیان ببێ، قەتادە ئەڵێ: گوتراوە کە هۆزی یونوس لە نەینەوا ژیاون کە ئەم زەوی موسڵەیەی ئێستایە[1]. هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنومەسعودو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریشەوە لە زانایانی پێشینە[2].

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

## دووره لە کارزانی خوداوە کە خەڵکی ناچار بکات بڕوا بێنن

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ ئەگەر خوا مەیلی لێ بوایە هەرچی لەم سەر زەمینەن تێکڕا باوەڕیان دەهێنا. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەگەر خوا مەیلی لێ بوایە ئیزنی هەموو خەڵکی سەر زەمینی ئەدا کە بڕوا بێنن بەوەی کە پێی هاتوی بۆیان، هەمووشیان بڕوایان دەهێنا، بەڵام ئەوەی خوای گەورەدەیکات پڕە لە کارزانی وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[3] ئەگەر پەروەردگارت مەیلی لێ بوایە، خەڵکی دنیای گشتی دەکردە یەك ئاین، بەڵام بە ناتەبایی هەر دەمێننەوە. مەگەر پەروەردگاری تۆ بەزەیی پێیاندا بێتەوە، هەر بۆ ئەوەی دروستکردوون، بڕیاری پەروەردگاریشت هەردێتەدی کە: جەهەنم لە جنۆکەو بنیادەم(هەموو) پڕ دەکەم. وە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾[4]، بۆچی خاوەنباوەڕان ئەوە نازانن ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە گشت خەڵکی شارەزای ڕاستە ڕێ دەکرد؟ هەر بۆیە خوای گەورەلێرەدا ئەفەرموێت: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟

---

[1] الطبري (١٥/٢٠٧).

[2] الطبري (١٥/٢١٠/٢٠٨).

[3] هود (١١٨-١١٩).

[4] الرعد (٣١).

مُؤۡمِنِينَ﴾ ئایا تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)) دەتەوێ ئەم خەڵکە بە زۆر بڕوا بێنن. واتە: دەتەوێ بە زۆر ناچاریان بکەی بڕوا بێنن. بێگومان ئەوە کاری تۆنیەو لەسەر تۆشنیە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذۡهَبۡ نَفۡسُكَ عَلَيۡهِمۡ حَسَرَٰتٍ﴾[1] خودا حەز کات هەر کەسێ گومڕا دەکاتو حەزیش بکات بەرەو خۆی شارەزای دەکات، کەوایە بە خەفەت خواردن بۆیان خۆت لەناو مەبە. وە فەرموویەتی: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾[2] ئەرکی سەر شانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕێ، بەڵام هەرکەسێ خودا خۆی مەیلی لێ بێ شارەزای ڕاستە ڕێی دەکات. وە فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾[3] لەوانەیە بەو خەمە خۆت لە بەین بەری، کە ئەوانە نایانەوێ بڕوا بێنن. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾[4] تۆ ناتوانی کەسێ بۆ خۆت خۆشت بوێ شارەزای کەی، بەڵام خودا کێی بوێ ڕێگەی ڕاستی نیشان ئەدات. وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ﴾[5] تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕایگەیەنی، بەڵام حیساب کردنیشی لەسەر ئێمەیە. وە فەرموویەتی: ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾[6] ساتۆ ئامۆژگاری بکە، تۆ تەنیا ئامۆژگاریکەری، تۆ خاوەن دەسەڵات نیت بەسەریاندا، چەندین ئایەتی تریش هەیە لەم بارەیەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە تەنیا خودا خۆی هەر کارێکی بوێ دەیکاتو مەیلی لە هەر کەسێ بوێ شارەزای دەکاتو، هەر کەسیش شارەزوی لێ بێ گومڕای دەکات. ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ زانیاریو کارزانیو دادپەروەری خۆی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تُؤۡمِنَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ هیچ کەسێ نەبووە بڕوا بێنێ، بەئیزنی خوا نەبوبێت خراپی بۆ ئەو کەسانە بڕیار دراوە کە تێناگەن. واتە: گومڕاو سەرلێشێوایان دەکات لە نیشانەو بەڵگەکانی شارەزا نابن کە هەر خودا دادپەروەرە لە هەموو ئەو شتانەدا، کە کێ شارەزا دەکاتو کێش گومڕا دەکات.

---

[1] فاطر (٨).
[2] البقرة (٢٧٢).
[3] الشعراء (٣).
[4] القصص (٥٦).
[5] الرعد (٤٠).
[6] الغاشية (٢١-٢٢).

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَمَا تُغْنِي ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ
إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾

**فەرماندان بە تێڕامان لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەمین**

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ بڵـێ:(ئـەی موحەممـەد(ﷺ)) سەرنج بدەن چی لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە، خودای گەورە لێرەدا ڕێنمایی عەبدەکانی دەکات کە بیر بکەنەوە لە بەهرەکانی و لەو شتانەی لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە، کە چەندە نیشانەی گەورەیان تێدایە بۆ ئەوانەی خاوەنی عەقڵن، لەو هەموو ئەستێرە ڕووناکو گەڕۆک و وەستاوو خۆرو مانگ و شەوو ڕۆژو جیاوازی نێوانیان و چوونی شەو ڕۆژ بەناو یەکداو جارێ یەکێکیان درێژ دەبێ جارێ ئەوی تریان. وە بە پێچەوانەشەوە بەرزیی و ڕازاوەیی و فراوانی و جوانی ئاسمان و ئەو بارانەی کە خودا لە ئاسمانەوە باراندویەتی و زەوی پێ زیندوو کردوەتەوە دوای مردنی و ئەو هەموو جۆرە بەروبوم و کشتوکاڵ و گوڵ و گوڵزارو ڕووەکەی تیا دەرهێناوە وە گیانەوەرێکی زۆریشی وەدیهێناوە تێیدا کە ڕەنگ و شێوەو سوودیان جیاوازەو کێوو دەشت و بیابان و ئاوەدانی و شوێنی وێرانیشی تیایە، دەریاش کە پڕە لە شتی سەرسوڕهێنەرو شەپۆلی گەورە، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕام هێنراوەو ملکەچ کراوە بۆ ئەو کەسانەی بەسەریدا دەڕۆن کەشتیەکانیان هەڵدەگرێ و بە هێواشی پێیدا تێدەپەڕن بە ڕامکردنی(خودای) خاوەن توانا، کە هیچ پەرستراوو پەروەردگارێك نیە جگەلەو، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا تُغْنِي ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ کەچی ئەم هەموو نیشانەو ترساندنە کار ناکاتە سەر ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن. واتە: هیچ شتێ کار ناکاتە سەر ئەو کەسانەی کە بڕوا ناهێنن، نە نیشانەکانی ئاسمان و زەمین، نە بەڵگەی پێغەمبەران کە هەموو نیشانەن لەسەر ڕاستیان. وەك خوای گەورەلە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾[1] ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئایا هەر چاوەڕوانی ڕۆژانێکن هەر وەك ڕۆژانی ئەوانە کە پێش لەوان بوون و نەمان؟ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئایا ئەو بێباوەڕانە چاوەڕوانی ڕۆژانێکن سزا و نوڕەیی خوایان بۆ بێت وەك ئەو ڕۆژانەی تری خودا، کە بەسەر گەلە پێشوەکاندا هات کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان

[1] یونس (٩٦).

نــــەکرد، ﴿قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ پاشان پێغەمبەرانمانو ئەوانەی بڕوایان هەیە ڕزگار دەکەین، چونکە ئەوە ئەرکی ئێمەیە کە باوەڕداران ڕزگار کەین. واتە: ئەرکێکەو خودای لەسەر خۆی داناوە. وەك ئەفەرموێت: ﴿فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾[1] بلێ: دڵنیا بن پەروەردگارتان هەر خۆی لەسەر خۆی نوسیوە بەر بەزەیی خۆیتان بخات.

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾﴾

**فەرماندان بە پەرستنی خودا بە تەنیاو خۆ سپاردن پێی**

خـوای گەورەئەفـەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بلێ: خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە ئاینی من بە گومانن، من ئەوانەی جگە لە خودانو ئێوە دەیانپەرستن، ناپەرستم، بەڵام من ئەو خودایە دەپەرستم، دەتان مرێنێو فەرمانیشی بە من داوە لە ڕیزی باوەڕداران بم. خودای گەورە دەفەرموێ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد(ﷺ) بلێ ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە ڕاستی ئەو ئاینەی کە بۆم هێناونو بتپەرستی تێدا نیەو خودا نیگای بۆ کردوم، من ئەوانە ناپەرستم کە ئێوە جگە لە خودا دەیپەرستن، بەڵکو خودا بە تەنیا دەپەرستم کە شەریکی نیە، ئەو خودایەی کە دەتانمرێنێ وەك چۆن گیانی پێداون، لە دوایشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. ئەگەر ئێوە هاوار لەو پەرستراوانەی خۆتان دەکەنو بە ڕاستیان دادەنێن، من نایان پەرستم، داوایان لێ بکەن با تووشی زیانم بکەن، چونکە ئەو پەرستراوانە نە زیان بە کەس دەگەیەننو نە سوودیشی پێدەگەیەنن، بەڵکو ئەو کەسەی کە زیانو قازانج بە دەستی ئەوە، هەر خودا خۆیەتی کە تەنیایەو شەریکی نیە، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا﴾ ڕووبکەرە ئاینی ڕاستو ڕەوان، واتە: بەپاکی هەرخودا بپەرستە بە

---

[1] الانعام (٥٤).

تەنیاو دوور کەوەلە بتپەرستی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ هەرگیز نەکەی لە ڕیزی بتپەرستان بی. ئەم ئایەتە عەتف کراوەتە سەر ئایەتەکەی پێش خۆی کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ پاشان ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ جگەلە خوا هانا بۆ شتی وا مەبە کە نە بەهرەی بۆ تۆ هەیەو نە زیانی لیّ دەبینی، ئەگەر کردت، ئەوساکە لە ستەمکارانی. خوداش ئەگەر تووشی زیانێکت بکات(جگە لە خۆی) هیچ کەسێ نیە لای بدات، ئەگەر چاکەشی لەگەڵدا کردی، کەس بەر لە چاکەی ناگرێو مەیلی لە هەر عەبدێکی بیێ تووشی ئەو چاکەیەی دەکات، هەر خۆی لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە. ئەم ئایەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چاکەو خراپەو قازانجو زەرەر هەموو دەگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە خۆی، هیچ کەسێ لەوەدا هاوکاری نیە، وە هەر خودا شایەنی پەرستنە بە تەنیاییو شەریکی نیەو لێبوردەو دلۆڤانە. واتە: بۆ کەسێ تەوبە بکات با هەر گوناهێکیشی کردبێ، هەتا ئەوەیش شەریکی بۆ داناوە، بێگومان هەر لێی خۆش دەبێ.

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ بلێ:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) خەڵکینە وا ڕاستیتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هات، هەر کەسێ ڕێگەی ڕاست بگرێتە بەر، شارەزابوونەکە بۆ خۆیەتی هەرکەسێکیش گومرا ببێ، گومرایی دژی خۆیەتی، خودای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە خەڵکی ئاگادار بکات، کە ئەوەی پێی هاتوە بۆیان لەلایەن خوداوە، هەرئەوە ڕاستەو گومانی تێدا نیە، هەر کەسێ شارەزا ببێ بەوەو شوێنی بکەوێ، قازانجی ئەو شوێن کەوتنە بۆ خۆیەتی. هەر کەسیش گومرا ببێو لێی لادات، ئاکامی ئەو گومرا بوونە هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾ وە من بریکاری(وەکیلی) کەستان نیم. واتە: من نابمە وەکیلی ئەوە کە ببنە خاوەن باوەڕ. تەنیا من ترسێنەرێکم بۆتان. شارەزا کردن بە مەیلی خوایە. ﴿وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ﴾ هەر فەرمانێ بۆت دەنێرین شوێنی کەوەو خۆڕاگرە. دەست بگرە بەوەی کە خودا ناردوویەتی بۆتو ئاگاداری کردوی لێی، خۆڕاگربە لەسەر دژایەتی ئەوکەسانەی دژایەتیت دەکەن ﴿حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ﴾

هـەتاخودا دادوەریـدەكات ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ خـودا باشـترین دادوەرە واتـە: خـودا چـاكترین دمرووكەرەوەیە بە دادوەریو كارزانی خۆی.

## تەفسیری سورەتی هود ( سەلامی خوای لێبێ )

## لە مەككەدا هاتووەتەخوارەوە

### سورەتی هودیەكێكەلەوسورەتـانەی پێغەمبەری (ﷺ) پیر كرد

ئەبوعیسای تیرمیزی ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەبباسـەوەئەڵێ: ئەبوبـەكر ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پـیر بـوی! پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (هـودو واقیعـەو مورسـەلاتو عم یتسـاءلون و إذا الشمس كویرت پیریـان كـردم)، لـە ڕیوایـەتێكی تـردا هـاتووە: (هـودو دەسـتە خوشـكەكانی پیریـان كردم)[1].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ (١) أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنَّنِي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ (٢) وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعًا حَسَنًا إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ (٣) إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٤)﴾

### ئەم قورئانەو بانگەوازی بۆ لای خودا بەتەنیا

﴿الر﴾ (الف، لام، را) لـە پێشەوە لـە سـەرەتای سـورەتی بەقـەرەدا باسـی ئـەم پیتانـەمان كـرد جـارێكی تـر پێویـست بـە دووبارەكردنـەوە ناكـا لێـرەدا، ﴿كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ﴾ كتێبێكـە ئایەتـەكانی بتـەو كـراون لـە پاشـان شـیكراونەتەوە. یـانی: وشـەكانی بتـەو داڕێـژراوەو ماناكەیـشی شیكراوەتەوە. شێوەو مانـای زۆر تـەواوە، ئـەم تەفـسیرە لـە موجاهیدو قـەتادەوە ڕیوایـەت كـراوە.[2] ئیبنوجەریریش هەمان تەفسیری هەڵبژاردوە ﴿مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ لەلایەن كاردروستی زاناوە. یـانی: لەلایەن ئەو خودای كارزانە لە گفتارو فەرمانیا، ئاگاداری ئاكـامی كارەكانـە، پاشـان ئەفـەرموێت: ﴿أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ﴾ كە نابێ هیچ بپەرستن جگـە لـە خـودا، واتـە: ئـەم قورئانـە وتـە داڕێـژراوو شـیكراوەیە هاتوەتە خوارەوە هـەتا خـودا بپەرسترێ بەتـەنیاو شـەریكی بـۆ دانـەنرێ. وەك ئـەم ئایەتانـەیش كـە

[1] تحفة الاحوذي (٩/١٨٤)، فەرموودەیەكی باشە (جید).

[2] الطبري (١٥/٢٢٧).

خــودای گــەورە فەرمویــەتی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾.[1] بەر لە تۆیش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد کە: هیچ پەرستویەك جگە لە من نیەو هەر تەنیا مـن بپەرستن. وە فەرمویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾.[2] بۆ ناو هەموو گەلێ پێغەمبەرێکمان بەڕێ کرد، کە خودا بپەرستن‌و لە شەیتان‌و هەر پەرستراوێ تر دوورەپەرێز بن، ﴿إِنَّنِي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ﴾ من لە خوداوە بۆ ئێوە ترسێنەرو مژدە دەرم. واتە: من ترسێنەرم بۆ ئێوە کە سزا ئەدرێن ئەگەر بێفەرمانی خودا بکەن، مژدە دەریشم بە پاداشت دانەوە ئەگەر بە گوێی بکەن. وەك لە فەرمودەی سەحیحا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوتە سەر سەفا بانگی لە بنەماڵە زۆر نزیکەکانی خۆی‌و پاشان لە نزیکەکانی تری قوڕەیش کرد، ئەوانیش کۆبونەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکی قوڕەیش! چۆن دەبینن ئەگەر هەواڵم پێدان کە دەستەیە سوار بەرەبەیان ئەدەن بەسەرتانا ئایا بڕوام پێ ناکەن؟) گوتیان: درۆمان لە تۆ نەدیوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان من ترسێنەرم بۆ ئێوە لەبەردەم سزایەکی سەختدا)[3].

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَيُؤۡتِ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥ﴾ لە پەروەردگاری خۆتان داوا بکەن، لێتان ببورێ‌و بشگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، تا ماوەیەکی دیاری کراو ژیانی خۆشتان بۆ دابین ئەکاو لەگەڵ خاوەن هەر چاکەیەك پاداشتی چاکەی خۆی دەداتێ. واتە: فەرمانتان پێ دەکەم کە داوای لێبوردن بکەن بۆ گوناهە پێشترەکانتان‌و پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودای مەزن لەمە بەدوایش هەر داوای لێبوردنی لێ بکەن‌و هەر بەردەوامیش لەسەری بڕۆن ﴿يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا ﴾ ژیانێکی خۆشتان بۆ دابین دەکا لە دنیادا ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَيُؤۡتِ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥ﴾ لەگەڵ خاوەن هەر چاکەیەك پاداشتی چاکەی خۆی دەداتێ لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتا، ئەمە قسەی قەتادەیە[4]. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەیە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗ ﴾.[5] هەرکەسێ

---

[1] الأنبياء (٢٥).

[2] النحل (٣٦).

[3] دلائل النبوة (١٨١/٢). فەرمودەیەکی سەحیحە بوخاری‌و موسلیم هێناویانە.

[4] الطبري (٢٣١/١٥).

[5] النحل (٩٧).

کرداری باشەو خاوەنباوەڕە (چ نێر چ مێ) هەتا دەژی، وا دەکەین بە خۆشی بژی. ﴿وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ ئەگەر پشتیشتان هەلکەن، من دەترسم سزای ڕۆژێکی گەورە یەخەتان بگرێ کە ڕۆژی قیامەتە. ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بۆ ئەو کەسانەی پشت هەڵدەکەن لە فەرمانی خودای گەورەو بڕوا بە پێغەمبەرەکەی ناکەن، سزای سەخت وەردەگرن لە ڕۆژی قیامەتاو دەرباز نابن ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەرەو خودا دەگەڕێنەوە، وە هەر خودایە دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.تۆڵە لە دوژمنەکانی دەسێنێو چاکەیش لەگەڵ دۆستەکانیا دەکا بۆ هەر کەسێ مەیلی لێبێ، هەموو خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتا جارێکی تر. ئەم شوێنە شوێنی هەڕەشەیە وەك چۆن ئایەتی پێشو شوێنی مژدەو پاداشت دانەوە بوو.

﴿أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾﴾

**خودا ئاگاداری هەموو شتێکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ تۆ بزانە کە ئەوانە سنگی خۆیان خوار دەکەنەوە تا لە خوداوە دیار نەبن، تۆ بزانە لەو کاتەدا خۆیان بە جلەکانیان دادەپۆشن ئەو دەزانێ لەبەرچی چیە دەکەن لەبەرچی ئاشکرای دەکەن، خۆی لە ڕازی هەموو دڵان ئاگادارە. ئیبنوعەبباس ئەڵێ: کەسانێك هەبوون پێیان ناخۆش بوو ڕوو بکەنە ئاسمان شەرمیان دەرکەوێ، وە لە کاتی جوتبوونیان لەگەڵ ژنەکانیشیانا. خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگەی ئیبنوجورەیجەوە لە موحەممەدی کوڕی عوببادی کوڕی جەعفەرەوە کە ئیبنوعەبباس ئەم ئایەتەی خوێند ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ﴾ واتە: سنگی خۆیان خوار دەکەنەوە تا لە خوداوە دیار نەبن. گوتم: ئەی ئەبولعەبباس مەبەست بە سنگ خوار کردنەوە چیە؟ گوتی: پیاوێ کە جوت دەبو لەگەڵ ژنەکەیا شەرمی دەکرد یان بچوایەتە سەر ئاو شەرمی دەکرد (عەیبی دەرکەوێ)، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوار ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ﴾.[1] وە لە وتەیەکی تردا هەر لە بوخاریەوە، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: کەسانێك هەبوون شەرمیان دەکردو خۆیان دەپاراست لەکاتی دەست بە ئاوگەیاندن یان جووتبوون لەگەڵ ژنەکانیاندا لە نێوان ئەوانو ئاسماندا هیچ بەربەستێك نەبێت، ئەم ئایەتە لەو بارەیەوە

---

[1] فتح الباري (٨/٢٠٠).

لەسەریان هاتە خوار.[1] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووەلە ئیبنوعەبباسەوە ﴿يَسْتَغْشُونَ﴾ یانی سەریان دادەپۆشی[2].

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾﴾

**خودای مەزن دەستەبەری بژێوی هەموو دروستکراوەکانی کردووە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ لەم زەمینە هەر شتێ دەجولێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خودایە، دەزانێ شوێنەکەی لە کوێ یەو لە کوێشا خۆی حەشار دەدا، سەر لەبەری لە نووسراوی ڕونکەرەوەدایە. خودای گەورە باسی ئەوە دەکا کە خۆی دەستەبەری ڕۆزی گشت دروستکراوەکانی دەکا لە گیانەوەری سەر زەمین بچوکو گەورە لە دەریادا بێ یان لە وشکانیدابێ، وە دەشزانێ لە چ شوێنێکایەو لە کوێشا خۆی شاردوەتەوە. واتە: دەزانێ بۆ کوێ دەچێ لەسەر زەمیناو لە کوێدا دەمێنێتەوەو نیشتەجێیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحەو کەسانی تریش گوتویانە، لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا﴾ دەزانێ لە کوێ دەمێنێتەوە، ﴿وَمُسْتَوْدَعَهَا﴾ لە کوێش دەمرێ.[3] وە ئەوانە هەموو نوسراوە لە کتێبێکا لەلای خودا، هەمووشی دیارو ڕوون کراوەتەوە تێیدا. وەك خودای گەورە لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾[4] واتە: هیچ گەڕۆکێکی گیانلەبەر نییە لە زەویدا وە هیچ باڵندەیەك نییە کە دەفڕێ بە هەردوو باڵەکەی مەگەر ئوممەتانێکن وەك ئێوە هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا پاشان ئەوانە (لە ڕۆژی دواییدا) لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.وە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[5] واتە: وە کلیلی هەموو نهێنی یەکان هەر لای خوایە کەس نایانزانێ بێجگە ئەو

---

[1] فتح الباري (٨/٢٠٠).

[2] فتح الباري (٨/٢٠٠).

[3] الطبري (١٥/٢٤١).

[4] الانعام (٣٨).

[5] الانعام (٥٩).

وە خوا دەزانێ چی لە ووشکانیو دەریادا هەیە وە هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێو هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکی یەکانی زەویدا بێتو هەر تەڕو ووشکێك هەبێت هەر هەمویان لە کتێبێکی ئاشکرادان .

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾ ﴾

**خودا ئاسمانەکانو زەمینی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە**

خودای مەزن باسی تواناو دەستەڵاتی خۆیمان بۆ دەکا بەسەر هەموو شتێکا، لەوانە دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمین لە شەش ڕۆژاو (عەرشیش)ی لەسەر ئاو بووە لە پێش دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمینا وە ئەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾ هەر ئەو خوایە کە ئاسمانەکانو زەمینی لە شەش ڕۆژا دروست کردو تەختی فەرمانڕوایی ئەو لەسەر ئاو بوو. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عیمرانی کوڕی موسەینەوە، (حصین) ئەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم مژدەیە وەرگرن ئەی نەوەی تەمیم) گوتیان: مژدەت پێداین، پێمان ببەخشە، فەرمووی: (ئەم مژدەیە وەرگرن ئەی ئەی خەڵکی یەمەن) گوتیان: ئەوا وەرمان گرت، هەواڵمان بدەرێ کە سەرەتای ئەم بڕیارە چۆن بووە؟ فەرمووی: (خودا لە پێش هەموو شتێکا بووەو تەختی فەرمانڕەوایشی لەسەر ئاو بووە، لەو لەوحە پارێزراوەدا هەموو شتێ نووسراوەو گشت شتێ باسکراوە). ئەڵێ: کەسێ هات بۆ لام وگوتی: ئەی عیمران وشترەکەت لە پەتەکەی بەربووە،ئەڵێ: منیش چووم بە دوایداو نازانم دوای من چی ڕوویدا.[1] ئەم فەرمودەیە لە سەحیحی بوخاریو موسلما هاتووە بە چەندەها وتەی تر.[2] وە لە سەحیحی موسلما هاتووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوەئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خودا ئەندازەی دروستکراوەکانی دیاریکردووە، پێش ئەوەی ئاسمانەکانو زەمین دروست بکا بە پەنجا هەزار ساڵو تەختی فەرمانڕەوایی لەسەر ئاو بووە).[3] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە لە

---

[1] أحمد (٤/٤٣١).فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٣٣٠)، مسلم (٤/٢٠٤١).

[3] مسلم (٤/٢٠٤٤).

تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا، کـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (خـودای هـەرە بـەرزی مـەزن فەرموویەتی: ببەخشن پێتان دەبەخشرێ). وە فەرموویەتی: (دەستی خودا پڕە بەخشین لێی کەمی ناکاتـەوە لێـی دەبەخـشێ بـە درێـژایی شـەوو ڕۆژ). وە فەرموویـەتی: (ئایـا ئـەزانن لـەو کاتـەوەی ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کردووە چەندی بەخشیوە، کە هـیچ کەمیـشی نـەکردووە لـەوەی کە لـە دەستیایە، تەختی فەرمانڕەوایشی لەسەر ئاوە، تەرازوشی بەدەستیەوەیە یەکێ نـەوی دەکـات‌و یـەکێ بەرز دەکاتەوە).[1] پاشان خودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ تـا تاقیتـان بکاتەوە کامتان ئاکاری چاکترە. واتە: ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کـردووە بـۆ سـوودی بەنـدەکانی، ئەوانی دروست کردووە بۆ ئەوەی بیپەرستن‌و هیچ شتێك نەکەنـە شـەریکی، ئـەوانی بـۆ گەمـە دروسـت نــەکردووە وەك فەرموویــەتی: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾.[2] واتە: ئێمە ئاسمان‌و زەوی‌و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەبێهودە دروستمان نەکردوە ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە بێباوەڕ بوون سا هاوار بۆ ئەوانەی کە بـێ بـاوەڕ بـوون لـە ئـاگری دۆزەخ. وە فەرموویــەتی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ﴾[3] واتە: ئایا ئێوە گومناتان وا بووە کە بێگومان ئێوەمان بـەبێهودە دروست کردوە وە بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟ جا بەرزو بڵنـدی بـۆ خـوای پاشـای ڕاسـت‌و ڕەوا هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو کە پـەروەردگاری عەرشـی بـەڕێزو بـەرزە. وە فەرموویـەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[4] واتە: وە من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن. ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ تـا تاقیتـان بکاتـەوە کامتـان ئاکـار چاکترە، نەی فەرمووە: کامتان کاری زۆرتری کردووە، هیچ کارێ بە چاك دانانرێ هەتا بە پـاکی‌و بـە تـەنیا بـۆ خودای گەورە نەبێ‌و لەسەر پەیڕەوی شەریعەتی ئەو نەبێ، هەر کاتێ یەکێ لەم مەرجانەی تێدا نەبوو، ئەوە ئەو کارە بە فیڕۆ چووەو بەتاڵ بوەتەوە.

[1] فتح الباري (٨/٢٠٢).
[2] ص (٢٧).
[3] المؤمنون (١١٥-١١٦).
[4] الذاريات (٥٦).

**مشتو مڕی بتپەرستان لەسەر زیندووبونەوەی پاش مردن و پەلەکردنیان بۆ داباریینی سزا بۆیان**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ﴾ ئەگـەر گوتیـشت: لەپاش مردن ئێوە زیندوو دەکرێنەوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەگەر بڵـێ ی بەو بتپەرستانە کە خودا زیندوویان دەکاتەوە دوای مردنیان، وەك چۆن یەکـەم جـار دروسـتی کـردن، خۆشیان چاك دەزانن کـە هـەر خـودا ئاسمانـەکان و زەمینـی وە دی هێنـاوە، وەك خـودای گـەورە لـە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾[1] واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ بکـەیت کـێ دروستی کردون بێگومان دەڵێن خوا. وە فەرموویـەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لەو (بێباوەڕانە) بکـەیت کـێ ئاسمـان و زەوی دروسـت کـردوە و ڕۆژ و مـانگی ڕام هێنـاوە بێگومـان دەڵـێن خـوا. لەگـەڵ ئـەوەدا هـەر ئینکـاری زیندووبوونەوە و سەرئەنجامی دەکەن لە ڕۆژی قیامەتا کە بە لای خوداوە زۆر ئاسانترە لـە وەدیهێنـانی یەکەم جار. وەك خودای گەورەفەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[3] واتە: ئەو زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردوە لە پاشان دوای مردن دووبارە دروسـتی دەکاتـەوە، ئـەم دروست کردنەوەی دووەم لای خوا ئاسـانترە.وە فەرموویـەتی: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾[4] واتـە: دروسـتکردنی هـەمووتان لـە سـەرەتاوە و زیندوکردنـەوەتان وەك (دروسـتکردن و زیندوکرنەوەی) تەنیا کەسێك وایە.پاشان خودای گەورە لەسەر زمانی ئەو خوا نەناسـانە فەرموویـەتی: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ دیارە خوا نەناسەکان ئەڵێن: ئەمە هـەر بـە ئاشـکرا جـادوە، هەر بە لاساری و بەدکاری خۆیان دەڵێن بڕوات پێ ناکـەین کەزیندووبوونـەوە ببـێ، ئەوانـەی کـە باسـی زیندووبوونەوە دەکەن، ئەو کەسانەن کە تۆ جادوت لێ کردون، شـوێنت دەکـەون و گـوێ بـۆ قـسەکانت دەگـرن. پاشـان خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەگەر بۆ ماوەیـەکی کەمیش سزایان لێ دوابخەین، دەڵێن چی ئەو سزایەی دواخستوە؟ بزانن ڕۆژێ ئازاریان بـۆ بـێ، ئـیتر

---

[1] الزخرف (٨٧).

[2] العنكبوت (٦١).

[3] الروم (٢٧).

[4] لقمان (٢٨).

لێیان ناگەڕێتەوە، ئەوەی گەمەیان لێدەهات دەوریان ئەدا، واتە: ئەگەر ئەو جەزرەبەو تۆڵەیە لەو بتپەرستانە دواخەین بۆ ماوەیەكی دیاریكراو كە بەڵێنمان پێداونو ماوەكەمان بۆ دیاری كردون، بڕوا ناكەنو پەلەیانە كە زوو بۆیان بێت دەڵێن: بۆچی ئەو سزایە نایەت؟ واتە: بۆچی بۆمان دوادەخرێ ئەوانە هەر لەسەر ئەو ڕەوشتە ناشیرینو گوماناویو خوانەناسیە ڕاهاتوونو بوەتە كاڵای باڵایان، بەڵام ئەوانە هەرگیز دەرباز نابنو ڕزگاریان نابێو هەر توشی ئەو سزایە دەبن.

## ماناكانی ووشەی ئوممەت (الأمة)

(الامة) بە چەند مانایەك بەكاردێ لە قورئانو فەرموودەدا، لەوانە: مەبەست پێی ماوەیە وەك خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعۡدُودَةٍ﴾ بۆ ماوەیەكی كەمی دیاریكراو. وە لە بارەی یوسفیشەوە (سەلامی خوای لێبێ) فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ﴾.[1] واتە: ئەوسا ئەوەیان كە ڕزگاری بوو لە دوو (بەند كراو) ەكە لەپاش چەند ساڵێك بیری كەوتەوەو وتی. بەكاریش هێنراوە بۆ پێشەوایە كە چاوی لێ بكرێ وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾[2] ئیبراهیم پێشەوایە بەرەو هەق چوو بوو، بەر فەرمانی خودا بوو، لە ڕیزی ئەوانەش نەبوو كە شەریكیان بۆ خودا دادەنا، بە مانای ئاینیش بەكارهێنراوە، وەك خودای مەزن باسی بتپەرستانی كردوەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ﴾[3] واتە: بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێك دیوە وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئایینی ئەوان دەڕۆین.وە بۆ كۆمەڵە كەسێكیش بەكارهێنراوە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ﴾[4] واتە: وە كاتێ گەیشتە سەر ئاوەكەی مەدیەن بینی لەسەر ئەو ئاوە كۆمەڵێك لە خەڵكی ئاژەڵو ماڵات ئاو دەدەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[5] واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەلو ئوممەتێكدا پێغەمبەرێكمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستنو دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر

---

[1] یوسف (٤٥).
[2] النحل (١٢٠).
[3] الزخرف (٢٣).
[4] القصص (٢٣).
[5] النحل (٣٦).

پەرستراوێکی تر.وە فەرموویەتی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾[1] واتە: وە بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێك هەبووە جا کاتێك پێغەمبەرەکەیان لە قیامەتدا هات بۆ لایان بڕیار دەدرێت لە نێوانیاندا بە دادو ڕاستی وە ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێ.مەبەست بە ئوممەت لێرەدا ئەوانەن کە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە کراوە خاوەنباوەڕو خوا نەناسان دەگرێتەوە. وەك لە سەحیحی موسلما هاتووە: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ کەسێ نیە هەواڵی منی بیستبێ لەم ئوممەتە جولەکە بێ یان گاور پاشان بڕوام پێ نەکاونەچێتە ناو ئاگر)[2]. بەڵام ئوممەتی پەیڕەویکەر ئەوانەن کە بڕوایان هەیە بە پێغەمبەران. وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾.[3] واتە: ئێوە (ئەی موسڵمانان) باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (من دەڵێم ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم)[4]. ئوممەت بەکاریش دەهێنرێ بۆ دەستەیەك یان گرۆیەك وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴾[5] واتە: وە لە هۆزەکەی موسادا تاقمێکی گەورە هەن کە ڕێنمونی خەڵکی دەکەن بە حەق‌و ڕاستی‌و هەر بە حەقیش دادوەری دەکەن. وەك ئەم ئایەتەیش خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ ﴾[6] واتە لەناو خاوەننامەکاندا دەستەیەکی ڕاست‌و ڕێك هەن. ئەهلی کتێبیش کۆمەڵی وەهایان تێدایە ڕوو بە خوا دەوەستن.

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾

---

[1] یونس (٤٧).
[2] مسلم (١/١٣٤).
[3] آل عمران (١١٠).
[4] مسلم (١/١٥٣).
[5] الاعراف (١٥٩).
[6] آل عمران (١١١).

### پاڕاپی مرۆڤ لە كاتی خۆشی و ناخۆشیدا

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَـٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ﴾ ئەگەر تامی خۆشیمان بە مرۆڤ چەشت و پاشان لێمان سەندەوە، نا ئومێدو سپڵە دەردەچێ خوای گەورە باسی مرۆڤو ڕەوشتە ناشیرینەكانی دەكا، مەگەر كەسێ خودا خۆی بەزەیی پێدا بێتەوە لە بەندە خاوەن باوەڕەكانی، ئەگەر توشی ناخۆشیەك هات دوای ئەو بەهرانەی خودا پێی داوەو دەستی كەوتوە، خێرا بێ هیواو دەستەئەژنۆ دادەنیشێ وبێئومێدی ڕووی تێدەكاو حاشایش لەو بەهرانەی پێشویش دەكا، وەك ئەوەی هەرگیز خۆشی بە خۆیەوە نەدیبێت، هیوای دەربازبوونیشی نامێنێ دوای ئەو ناخۆشیە، ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾ ئەگەر پاش لێقەومانیش، تووشی شادمانیمان كرد، دەڵێ ناخۆشیەكانم بەسەر چوو، زۆر دڵخۆشەو خۆی بە زل دەزانێ. واتە: دەڵێ: ئیتر لەمەوبەدوا تووشی هیچ دلگرانیو ناخۆشیەك نابم، زۆر كەیفی هەیە بەو ژیانەی كە تیایەتیو فیز دەكاو خۆی هەڵدەبڕێ بەسەر خەڵكیا. خودای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ ئەوانە نەبێت كە خۆڕاگرو ئاكار چاك بوون، بەشی ئەوانە لێبوردنو پاداشتی زۆر گەورە دەبێ. واتە: ئەوانەی كە خۆڕاگر بوون لەسەر گیروگرفتو ناخۆشیەكانو ئاكار چاك بوون لەكاتی دەوڵەمەندیو تەندروستیاندا، خودای گەورە بەهۆی ئەو بەڵانەوە توشیان بووە لە گوناهیان خۆشدەبێو پاداشتی چاكیش ئەدرێنەوە لەسەر ئەو كارە چاكانەی كردوویانە وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ خاوەنباوەڕێ تووشی داخو مەراقو دەردو ماندووبوونو پەژارەیە نابێ، تەنانەت دڕكێ كە پێدا دەچێ بێگومان خودا دەیكاتە كەفارەتی گوناهەكانی)[1]. وە لە فەرموودەی سەحیحی تردا هاتووە: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، خودا هیچ بڕیارێ نادا بۆ خاوەنباوەڕو ئەو بڕیارە زۆر چاكترە نەبێ بۆی. ئەگەر تووشی خۆشیەك هاتبێ سوپاسی خودای كردوە، ئەوە زۆر چاكە بۆی. وە ئەگەر تووشی ناخۆشیەك هاتبێ خۆی ڕاگرتوە، ئەوە زۆر چاكە بۆی، ئەمەیش بۆ هیچ كەسێ نیە جگە لە خاوەنباوەڕ)[2]. بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾[3] واتە: سوێند بە كات، بێگومان

---

[1] أحمد (٣/٤). فەرموودەیەكی سەحیحە.
[2] مسلم (٤/٢٢٩٥).
[3] العصر (١-٣).

هەموو خەڵکی لە زیاندایە، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ‌و کردەوە چاکەکانیان کردبێ بە ئایینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامگرتن. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ﴾[1] واتە: بێگومان مرۆڤ دروست کراوە بە چاوچنۆکی‌و شپرزەیی، هەرکات تووشی ناخۆشیەك هات هاوار دەکا، ئەگەر دەکەوێتە خۆشیش دەستی قوچاوە ئەوانەنەبێت کە نوێژ دەکەن.

﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقٌۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌ ۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾﴾

## دڵتەنگی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر قسەی بتپەرستان و دڵدانەوەی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقٌۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌ ۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴾ خەریکەلە هەندێ فەرمان کە بۆ تۆ دێت وازبێنی‌وئەوەش ببێتە مایەی دڵتەنگیت کە پێت دەڵێن: بۆچی گەنجینەی لەسەرەوە بۆ نەهاتوەتە خوارەوە، یان فریشتەیەکی لەگەڵ نەهات؟ تۆ تەنها ترسێنەرێکی و هەر خودایە چاودێری هەموو شتە، خودای گەورە دڵی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەداتەوە لەسەر ئەو لاساریەی بتپەرستان پێی هەڵدەسن‌و کۆڵی لێنادەن‌و ئەو قسانەی پێی دەڵێن. وەك خودای گەورە لەسەر زمانی ئەوانە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا﴾[2] گوتیان: ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خۆراك دەخواو بە بازاڕدا دەگەڕێ؟ ئایا چۆن فریشتەیەکی لەگەڵ نەهات، کە لە جێگای ئەو ترس وەبەر خەڵکی بێنێ. یان گەنجینەیەکی بۆ فڕێ بدرایەتە خوارێ، یان باغێکی ببوایە لێی بخواردایە، ستەمکاران ئەڵێن: ئێوە هەر شوێنی پیاوێ کەوتوون جادوی لێکراوە. خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی‌و (ﷺ) ڕێنمایی کرد کە دڵی تەنگ نەبێ بەو قسانەی ئەوانە دەیکەن باکۆڵی پێ نەداو ماندووی نەکا لەسەر

[1] المعارج (١٩-٢٢).
[2] الفرقان (٧-٨).

بانگکردنی خەڵکی بۆ لای خودای مەزن بە درێژایی شەوو ڕۆژ. وەك لە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴾[1] وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقٌۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُوا۟ ﴾ واتە: کە ئەو قسانە دەکەن، بێگومان تۆ تەنیا ترسێنەری بۆیان، تۆیش چاو لەو پێغەمبەرە پێشینانەی برات بکە، چونکە ئەوانیش زۆر ئازار دران‌و بڕوایان پێ نەکرا، بەڵام خۆیان ڕاگرت هەتا یارمەتی خودای گەورەیان بۆ هات.

**باسی موعجیزەی ئەم قورئانە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ یان دەڵێن هەڵیبەستوە بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، دەسا ئێوە بە یارمەتی هەر کەسێ دەستتان دەکەوێ (جگە لە خودا) دە سورەتی هەڵبەستراو وەك ئەمە بێنن. پاشان خودای گەورە باسی موعجیزەی قورئان دەکا کە هیچ کەسێ ناتوانێ وەك قورئان بێنێ، با دە سورەت یان سورەتێکیش بێ، چونکە قسەی خودا لە وێنەی قسەی دروستکراوەکانی ناچێ، وەك چۆن سیفەتەکانی لە سیفەتی دروستکراوەکانی ناچێ، وە خودا خۆیشی لە هیچ شتێ ناچێ، زۆر بەرزو پیرۆزەو پاك‌و بێعەیبە لە هەموو کەم‌و کوڕیەك، هیچ پەرستراوێ نیە جگەئەو، هەر خۆیشی پەروەدگارە، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ جا ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە، باش بزانن کە ئەم قورئانە ڕەوانە کراوەتە خوارەوە بە ئاگاداری خودا وە بشزانن هیچ پەرستراوێ نیە بێجگە لەو، ئاخۆ ئێوە دەیسەلمێنن؟ ئەگەر نەیانتوانی ئەوەی ئێوە داواتان لێ کردن بیهێنن، چاك بزانن ئەوانە ناتوانن‌و دەستەوسانن لەوەی شتی وا بکەن، چونکە ئەم قورئانە لەلایەن خوداوە نێرراوەتە خوارو زانست و فەرمان و قەدەغە کراوەکانی ئەوی لەخۆ گرتووە . ﴿وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ هەروەها بزانن هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە خوا ئایا ئێوە مل کەچ دەکەن.

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾﴾

[1] الحجر (٩٧). واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە دەزانین کە بەڕاستی تۆ دڵت تەنگ دەبێ بەوەی ئەوانە دەیڵێن.

**هەر کەسێ هەرئەم دنیای ویست لە ڕۆژی قیامەتدا بەشی نیە**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴾ هەر کەسێ ژینی ئەم دنیایەو زەرق و بەرقی ئەوی دەوێ، ئێمە پاداشتی کردەوەیان هەر لەم دنیایە ئەدەینێ هیچیشیان لێ کەم ناکرێتەوە. عەوفی ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتـەدا: خـەڵکی ڕیاباز هەر لە دنیادا پاداشتی ئەو چاکانەیان ئەدرێتـەوە. چونکە خـودا بـە ئەندازەی تـوێکڵی دەوری دەنکە خورمایە نامەقی لە کەس ناکا. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: هەر کەسـێ کارێکی چاکە بکا لەبەر ڕوپامایی و دنیا وەدەستهێنان ئیتر ئەو کارە ڕۆژو بێ، نوێژ بێ، شـەونوێژ بـێ، هـەر لەبـەر ئـەوە بیکا خەڵکی پێی بڵێن پیاوی چاکە، خودا هەر لە دنیادا پاداشتی ئەداتەوە، بەڵام ئەو کارەی کە لەبـەر خاتری خەڵکی کردوویەتی بە فیڕۆ دەچێ. لە ڕۆژی قیامەتا لە ڕیزی زیانبارانـە.[1] هـەر بـەو شـێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو زەححاکو کەسانی تریشەوە.[2] ئەنەسی کوڕی مالیکو حەسەن ئەڵێن: ئـەم ئایەتە لەسەر جولەکەو گاورەکان هاتوەتە خوار.[3] موجاهیدو کەسانی تریش گوتویانە: لەسـەر خـەڵکی ڕوپاماییکەر هاتوەتە خوار.[4] پاشان خـودای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ ئەوانە هەر ئەو کەسانەن ڕۆژی قیامەت جگە لە ئاگر بەشیان نیەو هەرچی لە دنیادا کردیان بە فیڕۆ چووە. قەتادەئەڵێ: هەر کەسـێ ئـاوات و هیواو مەبەستی هەر دنیا بێ، خودا هـەر لـە دنیـادا پاداشـتی چـاکەکانی ئەداتـەوە. پاشـان دەمـرێ و بـەرەو قیامـەت دەڕوا هـیچ چـاکەیەکی نیـە، پاداشـتی لەسـەر وەرگـرێ، بـەڵام خاوەنباوەڕ هـەر لـە دنیایشا پاداشت ئەدرێتەوەو لـە ڕۆژی دوایشا پاداشتو خـەڵات وەردەگـرێ.[5] خـودای گـەورە لـە ئایـەتی تـرا فەرموویـــــــــەتی: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ

---

[1] الطبري (١٥/٢٦٣).
[2] الطبري (١٥/٢٦٤-٢٦٥).
[3] الطبري (١٥/٢٦٥).
[4] الطبري (١٥/٢٦٦).
[5] الطبري (١٥/٢٦٤).

عَلَىٰ بَعْضٍۚ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾[1] واتە: هەرکەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێ لەم دنیادا زوو پێی دەدەین ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر کەسێك لە پاشان دۆزەخمان بۆ ساز داوەو دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی‌و دەرکراوی لە میهرەبانی خوا، هەر کەسێکیش ڕۆژی دوایی بوێت وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوەو باوەڕداریش بێت ئا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە، دەبەخشین بە هەموان ئەوانەی کە هەر دنیایان دەوێ و ئەوانەی ڕۆژی دواییان دەوێ لە بەخششی پەروەردگارت لەم دنیایەدا بێگومان ڕۆزی‌و بەخشراوی پەروەردگارت هەرگیز قەدەغە کراو نەبوە، (ئەی موحەممەد(ﷺ)) سەرنج بدە چۆن باوی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا وە بێگومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە هەروەها باودانەکانیش گەورەترە. وە فەرموویەتی: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾[2] واتــە: هەرکەس بەرهەمی دوا ڕۆژی بوێ ئێمە بەرهەمەکەی بۆ زیاد دەکەین وە هەر کەسێك بەرهەمی دونیای بوێ هەندێ لە دنیای پێ دەدەین بەڵام لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەشێکی نییە.

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةًۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾﴾

### کەسێ بڕوا بە قورئان دەکا کە بەڵگەی ڕوونی لەلایەن پەروەدگاریەوە پێدرابێ

خــودای مــەزن ئەفــەرموێت: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةًۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ئاخۆ کەسێ لە پەروەدگاری خۆیەوە بەڵگەی ڕوونی پێدراوە، شایەتێکیش لە خوداوە بە شوێنیا هاتووەو کتێبی موسایش (کە پێش ئەو پێشەواو جێی بەزەیی بوو) باسی دەکا لەگەڵ ئەوانەی بێبەڵگەن وەکوو یەکن؟ ئەوانە بەڵگەیان هەیە بەو قورئانە بڕوا دەکەن، هەر کەسیش لەو کۆمەڵانە حاشای لێ بکا، جێی لە ئاگر بۆ خۆش کراوە، سا تۆ لێی بە گومان مەبە، ئەمە ڕاستیەو لە پەروەدگاری تۆوەیە بەڵام زۆربەی ئەم خەڵکەباوەڕ ناکەن. خودای گەورە باسی ژیانی خاوەن باوەڕان دەکا، ئەوانەی لەسەر سروشتی خودایین، واتە: موسڵمانن

---

[1] الاسراء (۱۸–۲۱).

[2] الشوری (۲۰).

کە خودا هەر بە موسڵمانی هێناونیو دانیان ناوە بە خوایەتی خوادا: کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لـەو وەك خـودای گـەورە لـە ئایـەتی تـرا فەرموویـەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾[1] هەر تۆ ڕوو لەم دینە بکەو هەر بەرەو حەق هـەنگاو بنـێ، دینێکـی بنەڕەتیـەو هـەر لـە سروشتا خودا ئەو خەڵکەی هەر بۆ یەکتاپەرستی وەدیهێنـاوە. لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە ئەبوهورەیرەوەئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو لە دایك بوویـەك لەسـەر (فـیترەت) لە دایك دەبێ، دایكو باوكی دەیکەنـە جولەکـەو گـاورو ئـاگر پەرسـت، وەك چـۆن ئـاژەڵ، (بەچکە) ئاژەڵێکی تەواوی دەبێ، ئایا هیچ هەستی ناتەواوی-گوێبڕاوی- تیابەدی دەکەن؟)[2]. وە لە سـەحیحی موسلیمشدا هاتووە لە عـەیازی کـوڕی حیمـارەوە لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) فـەرمووی: (خـودای مەزن ئەفەرموێت من عەبدەکانم دروستکرد کە بەرەو هەق هەنگاو بنێن، شەیاتینەکان، هاتن بۆیانو لـە ئاینەکەیان وەریانگێڕان، ئەوەی حەڵاڵم کردبوو بۆیان حەرامیان کرد لێیان، فەرمانیان پێدا کە شەریکم بۆ دابنێن، کە هیچ بەڵگەیەك نەهاتوەتە خوار بۆیان لەو بارەیەوە)[3]. خاوەنباوەڕ هەر ماوەتەوە لەسەر ئـەو سروشـتـە، ﴿وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾ شـایەتیش لەلایـەن خـوداوە هـاتووە، ئـەویش ئەوەیـە کـە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران کە بریتیە لەو پـەیامو شـەریعەتە پاكو تـەواو و زۆر بەڕێزانـە کە کۆتاییـان هاتووە بە شەریعەتی موحەممەد(ﷺ). لەبەر ئەوە خاوەنباوەڕ ئەو سروشتەی لەگەڵ کە شایەتی بدا بۆ گشتی ئەو شەریعەتە،ئەو درێژیەیش لە شەریعەتەوە کە وەردەگیرێ. سروشت مـۆری دەکـاو بـڕوای پێ دەهێنێ، بۆیـە خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ ﴾ ئەوەش ئەو قورئانەیە کە جوبرەئیل گەیاندویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) گەیاندویـەتی بە ئوممەتەکەی پاشان خودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾ وە لـە پێش قورئاندا کتێبی موسایـشی نـاردووە کـە تەوراتـە، بـۆ ئـەو ئوممەتـە کردیـە پێشـەواو جێبـەزەیی خودای مەزن بۆیان، تا بیکەنە سەرمەشقی خۆیان، هەرکەسێ بڕوای پـێ کردبێ بەڕاستی ئـەو بڕوایـە پاڵی پێوەناوە بۆ بڕوا هێنان بەم قورئانـە، بۆیـە خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ واتە: ئەوانە بڕوا بەو قورئانە دەکەن، پاشان خودای گـەورە هەڕەشـە لـەو کەسانە دەکا کە بـڕوا بـە قورئـان ناکـەن یـان بـە شـتێکی نـاو قورئـان ناکـەن. ئەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ

---

[1] الروم (٣٠).

[2] فتح الباري (٣/٢٩٠)، مسلم (٤/٢٠٤٧).

[3] مسلم (٤/٢١٩٧).

مَوۡعِدُهُۥ﴾ واتە: هەرکەسێ لەو کۆمەڵانە حاشای لێ بکەن شوێنی ئەو کەسەناو ئاگرە. واتە: خەڵکی سەر زەمین بتپەرستو خوانەناسو ئەهلی کتێبو هەر کۆمەڵێکی تریش لە نەوەی ئادەم بە جیاوازی زمانو شێوەو نەژادیانەوە ئەوەی قورئانی پێ گەیشتبێ بڕوای پێ نەکا شوێنی ناو ئاگرە. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ﴾[1] تا بەهۆی قورئانەوە ترس وەبەر ئێوە بێنم و هەر کەسێکیش کە ئەم قورئانەی پێی دەگا. وە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾[2] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ﴾. لە سەحیحی موسلما هاتووە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ کەسێ نیە هەواڵی من ببیسێ لەم ئوممەتە جولەکە بێ یان گاور پاشان بڕوام پێ نەکا ونەچێتەئاگر)[3].

## پشتگیریکردنی هەموو فەرمودەیەك لەناو قورئاندا هەیە

ئەیوبی سەختیانی ئەڵێ: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوەئەڵێ: من هیچ فەرموودەیەکم لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) نەدەبیست بەو شێوەیەی کە فەرموویەتی و پشتگیریەکەیم یان ئەڵێ: جەخت کردنەوەکەیم لە قورئاندا نەدیبێ، پێم گەیشت لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەس نیە هەواڵی من ببیسێ لەم ئوممەتە جولەکە بێ یان گاور پاشان بڕوام پێ نەکا ونەچێتە ناو ئاگر). وام لێهات دەمگوت: پشتگیری ئەم فەرموودەیە لە قورئانا کامەیە؟ئەڵێ: کەم جار بووە فەرموودەیەکم بیستبێ لە پێغەمبەری خودا وپشتگیرییەکەیم نەدیبێتەوە لەناو قورئاندا، هەتا ئەم ئایەتەم دۆزیەوە کەئەفەرموێ ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ﴾ئەڵێ:یانی لەناو هەموو گەلەکاندا بەگشتی. ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُۚ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ تۆ لەم قورئانە بە گومان مەبە، ئەمە ڕاستەو لە پەروەردگاری تۆوەیە. وەك خودای گەورە لە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿الٓمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[4] واتە: (ئەلیف، لام، میم)، هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانی تێدا

[1] الانعام (١٩).
[2] الاعراف(١٥٨).
[3] مسلم (١/١٣٥).
[4] السجدة (١-٢).

نییە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە. وە فەرموویەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾[1] واتە: (ئەلیف، لام، میم)، ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾[2] واتە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سووربیت لەسەر موسڵمانبونیان هەرنابنە ئیماندار. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾[3] واتە: وە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خوا گومڕات دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[4] واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی شەیتان گومانی خۆی لەواندا بەدی هێنا بۆیە ئیمانداران نەبێت هەموویان شوێنی شەیتان کەوتن.

﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٨ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ۝١٩ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ ۝٢٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ۝٢١ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ۝٢٢﴾

**ئەوانەی بوختان بەدەم خوداوە دەکەن و دەبنە لەمپەر لە ڕێگەی خوادا، لە هەموو کەس دۆڕاوترن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە درۆ بۆ خوا هەڵبەستێ؟ گشت ئەمانە لە بەرانبەر پەروەردگاریاندا پیشان ئەدرێن، شایەتەکانیش شایەتی ئەدەن کە ئەمانە بەدەم پەروەردگاری خۆیانەوە ئەم درۆیانەیان هەڵبەستووە. دەبا ستەمکاران بەر لەعنەتی خودا کەوون. خودای مەزن باسی ژیانی ئەو کەسانە دەکا کە درۆیان

---

[1] البقرة (١-٢).

[2] يوسف (١٠٣).

[3] الانعام (١١٦).

[4] سبأ (٢٠).

بەدەم خوداوە هەڵدەبەست چۆن ئابڕوویان دەچێ لە ڕۆژی قیامەتا لەبەردەم ئەو هەموو کەسەدا لە فریشتەو پێغەمبەران‌و باقی ئەو خەڵکە لە مرۆڤ و جنۆکە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەفوانی کوڕی موحریزەوە ئەڵێ: من دەستم بە دەستی ئیبنوعومەرەوە بوو پیاوێ هاتە ڕێگەی‌و گوتی: چیت بیستووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەبارەی چپەوە لە ڕۆژی قیامەتافەرموویێتی؟ گوتی: لێم بیست ئەی فەرموو: (خودای گەورە خاوەنباوەڕ نزیك دەکاتەوەو دەیداتە پاڵ خۆی‌و دەیشارێتەوە لە خەڵکی،دانی پێدا دەنێ بە تاوانەکانیاو پێی دەڵێ: ئایا فلانە تاوانت لەبیرە؟ ئایا فلانە تاوانت لەبیرە؟ ئایا فلانە تاوانت لەبیرە؟ هەتا دانی بەگشت گوناهەکانیا پێ دەنێ، کە سەیری خۆی دەکا تیا چووە، خودای گەورە ئەفەرموێت: بێگومان من-ئەو گوناهانەم- بۆ داپۆشیوشیت لە دنیادا، وە من ئەمڕۆیش لەو گوناهانەت خۆش دەبم) پاشان کتێبی چاکەکانی پێئەدرێت، بەڵام خوانەناس‌و دووڕووەکان، شایەتەکان شایەتی ئەدەن دەڵێن: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[1]. بوخاری و موسلمیش لە هەردوو سەحیحەکەیانا هێناویانە.[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ هەر ئەمانەن ڕێی بەرەو خودا دەبەستن خەڵکی پێ لاڕێ دەکەن‌و خۆشیان بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیە. واتە: خەڵکی لە ڕێگەی ڕاست لائەدەن، ئەو ڕێگەی کە مەردم دەگەیەنێتە لای خودای گەورە، لە بەهەشت دوریان دەخەنەوە، دەیانەوێ ڕێگەی لارو چەوت بگرنە بەر هەرگیز نەکەونە سەر ڕاستەڕێ، بڕواشیان بە ڕۆژی قیامەت نیەو ئینکاری دەکەن‌و بەڕاستی نازانن کە هەر ببێ‌و ڕووبدا. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ ئەمانە لەم سەر زەمینە ناتوانن لە خودا ڕاکەن بێجگە لە خوایش کەسیان بۆ دۆست دەست ناکەوێ. بەڵکو ئەوانە وان لەژێر تواناو دەسەڵاتی خودای گەورەداو لە دەستی دەرناچن‌و هەر لە دنیادا خوای گەورە دەتوانێ تۆڵەیان لێبسێنێ پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٖ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾.[3] بەڵام دەیان هێڵێتەوە تا ئەو ڕۆژەی کە لەوێدا هەموو چاوەکان ئەبڵەق دەبن و لە جوڵە دەکەون، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. بێگومان خودا مۆڵەتی ستەمکار ئەدا، تا کاتێ کە دەیگرێ ئیتر لە دەستی دەرناچێ[4]. بۆیە خودای

---

[1] أحمد (٧٤/٢). فەرموودەیەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري (٢٠٤/٨)، مسلم (٢١٢٠/٤).
[3] إبراهيم (٤٢).
[4] فتح الباري (٢٠٥/٨)، مسلم (١٩٩٧/٤).

گــەورە فەرموویــەتی: ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ﴾ ئــەو کەسانە سزایان بۆ دووقـات دەکرێتـەوە توانـای بیـستنی ئـەو قورئانـەیان نـەبووە، نەشیان توانیـوە ببینن. واتە: خودای گەورە سزایان بۆ دووقات دەکاتەوە چونکە چاوو گوێو دڵی دانیێ، بـەلام هـیچ سودێکی بۆیان نەبوو، کەرو کوێر بووبوون بەرانبەر بە هەقو شوێنی نەدەکەوتن. وەك خـودای مـەزن لەسەر زمانی ئەوانـە فەرموویـەتی: ﴿وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] واتـە: وە وتیـان ئەگەر قسەی پێغەمبەران مان ببیستایە یا تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هـاوەڵی یـانی دۆزەخ نـەدەبوین. وە فەرموویــــــــــەتی: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابًا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ﴾[2] ئەوانەی خوایان نەناسیو ڕێگەی خوایان بەربەست ئەکرد، لەو بەدفەڕیەدا کە دەیـانکرد هەر ئازاریان زیاتر دەکەین. لەبەرئەوە جەرزەبە ئەدرێن لەسەر هەر فەرمانێ وازیان لێ هێناوەو وە هەر شتێ لێیان قەدەغەکراوە کردوویانـە. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ئەوانەن کە خۆیان دۆڕاند، هـەر درۆیـەکیش هـەڵیان بەست، بەفیڕۆ چـوو. واتـە: خۆیـان زیانبـار کـرد چونکە دەچنە ناو ئاگرێکی زۆر تیژو تاو دراو. تێیدا سزا ئەدرێن چاو تروکانێ لەسەریان سووك نـاکرێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرًا﴾[3] هـەرکاتێ ئاگرەکـە دامرکێ بڵێسەی ئاگرەکەیان بۆ زیاد دەکەین. ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ واتە: هەر درۆیەکیش هەڵیان بەست بە هیچ دەرچوو، لەو شتانەی دەیان پەرستو شتی تـر، هـیچ سـودێکیان لێ وەرنـەگرتن بەڵکو زیانێکی ئێجگار زۆریان لێدان. وەك خودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ﴾[4] واتە: کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە لە قیامـەت پەرستراوەکان دەبنـە دوژمنیـان وە بە پەرستنەکەی ئەوان باوەڕناکەن. وەك ئەم ئایەتەیش کـە فەرموویـەتی: ﴿إِذۡ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ﴿١٦٦﴾﴾.[5] واتــە: کاتێــك کــە پێــشەواکان یەخـە هەڵئەتـەکێنن لەوانـەی لـە دنیـادا دوایـان کـەوتوون وە سـزایان بـە چـاوی خۆیـان بینـی وە هـەموو

[1] الملك (١٠).

[2] النحل (٨٨).

[3] الاسراء (٩٧).

[4] الاحقاف (٦).

[5] البقرة (١٦٦).

پەیوەندیەکیان پچڕا. چەندەها ئایەتی تریش هاتووە لەم بارەیەوە لەسەر زیانباریی و تیاچوون و دۆڕاوی ئەمانە. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ ﴾ هیچ گومان لەوەدا نیە کە لەو دنیا لە هەموو کەس دۆڕاوترن. خودای مەزن باسی پاشەڕۆژیان دەکا کە ئەوانە دۆڕاوترین کەسن لەو مامەڵەیەدا لە ڕۆژی قیامەتا. چونکە ئەوانە ئەو پلە بەرزانەیان گۆڕیەوە بە نزمترین پلەو ئەو بەهەشتە خۆشەیان واز لێ هێنا بۆ ناو ئاوەکوڵی ناو جەهەنم خواردنی گوڵاوی سەرمۆریان گۆڕی بە کرەباو ئاوەکوڵ و چرە دوکەڵیش سێبەریانە، کیژی سپی چاوبەڵەکیان گۆڕی بە کێماوی برینداران و کۆشکە بەرزەکانیان گۆڕیوە بە ئاگرێکی زۆر توندو بەهێز، نزیک بوونەوە لە خوداو بینینی لە ڕۆژی دواییدا گۆڕیوەتەوە بە بەتوڕەیی خوداو تۆڵەی توندی، بەڕاستی دیارە هەر ئەمانە زۆر دۆڕاو زەرەرمەندن.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالْأَعْمَىٰ وَالْأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ ۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

**پاداشتی خەڵکی خاوەنباوەڕ**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ ئەوانەی خاوەنباوەڕو ئاکار چاک بوون و دڵیان بە پەروەندەیان ئارامی گرتوە، ئەوان دەچنە بەهەشت، ئاهەتایە تێیدا دەبن. دوای ئەوەی خودای گەورەباسی ژیانی بەدبەختانی کرد، لێرەدادێتەسەر باسی بەختەوەران، ئەوانەی کە خاوەنباوەڕ و ئاکار چاک بوون، بە دڵ بڕوایان هێنا بوو بە کرداریش و بە ئەندامەکانی لەشیان سەلماندیان کە بڕوادارن و هەڵسان بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوداو وازیان هێنا لەو شتانەی کە قەدەغەی کردبوو، بەو شێوەیە بەهەشتیان بۆ خۆیان دابین کرد کە پڕە لە کۆشکی زۆر بڵندو کورسیی و قەنەفەو چەرپای زۆر قەشەنگ و هەموو جۆرە میوەیەکی شۆڕبووەوەو نزیک و فەرشی نەرم و تۆکمەو کیژی سپی چاوبەڵەک و جوان و خواردن و خواردنەوەی بەتام و بەلەزەت و سەیرکردنی وەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەمین لەگەڵ ئەمانەیشا هەتاهەتایە لەو بەهەشتەدا هەر دەمێننەوەو نامرن و پیر نابن و نەخۆش ناکەون و خەویشیان لێ ناکەوێ و پیسایش ناکەن و تف و بەڵغەم و چڵمیان نیە، بەڵکو ئەو ئارەقەیش لێیان دەچۆڕێ بۆنی میسکی لێدێ.

## نمونەی خاوەنباوەڕان و خوانەناسان

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ ۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ نموونەی ئەم دوو دەستەیە وەك نمونەی کوێرو کەڕو چاوساغو بیسەرە ئاخۆ ئەمانە وەك یـەکن؟ دەی بۆچـی پەنـد وەرنـاگرن؟، پاشـان خـودای گـەورە نموونـەی ئـەو خـوا نـەناس‌و خاوەنباوەڕانەی بە دووتاقم هێناوەتەوە، یەکەمیان کە لە پێشەوە وەسفی کردن بـە بەدبـەختان نـاوی هێنان، خاوەنباوەڕانیشی بە بەختەوەران ناو هێنا، بەدبەختەکان وەك کوێرو کەڕ وان، بەختـەوەرانیش وە چاوساغ‌و بینەندە وان، چونکە خوانـەناس کوێرە بەرانبـەر بـە هـەق لـە دنیـاو لـە قیامـەتا، بـەرەو چاکەو چاکەخوازی ناڕواو شارەزایشی نابێ، کەڕە لە ئاستی بەڵگەکان‌و گوێ لەو شتە ناگرێ سودی لێ وەرگرێ. وەك خودای گەورە لـە ئایـەتی تـرا فەرموویـەتی: ﴿وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾[1] ئـەگـەر خودا بیزانیایە خێرێکیان تێدایە، کارێکی دەکرد ببیسن، بەڵام خاوەنباوەڕ زیـرەك‌و وریـاو هۆشمەنـدە، ڕاستی چاك دەبینێ‌و لە پڕوپوچ شتی ناڕاست جیـای دەکاتـەوە، شوێنی چـاکە دەکـەوێ‌و لـە خراپـە دووردەکەوێتەوە، زۆر چـاك بەڵگـەکان دەبیـسێ‌و جیـای دەکاتـەوە لـە شـتە گومانلێکراوەکـان، شـتی پڕوپـوچ بـرەو پێنـادا ئایـا ئەمــەو ئـەوە وەك یـەکن؟﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئایـا بۆچـی پەنـدو ئامۆژگـاری وەرناگرن؟ ئەم دوو دەستەیە لە یەکتری جیا ناکەنەوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتی ترا فەرمویەتی: ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾[2] واتـــە: دۆزەخیـــەکان و بەهەشتیەکان وەك یەك نین بەهەشتیەکان ڕزگارو سەرکەوتوون. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَـٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[3] واتە: کوێرو چاوساغ وەك یـەك نـین، تاریکـایی‌و ڕووناکیش وەك یـەك نین، بەر سێبەرو خۆرەتاویش وەك یەك نین، گیانلەبەران‌و بێگیانیش هـاو وێنـە نـین، خـودا حـەزکا، وا دەکا هەرکەس ببیسێ. تۆ ناتوانی دەنگت بگاتە ئەوانە کە خراونەتە ناو گۆڕەوە، تـۆ هـەر ئەوەنـدەت

---

[1] الانفال (٢٣).

[2] الحشر (٢٠).

[3] فاطر (١٩–٢٤).

لەسەرە ترس وەبەر خەڵکی بێنی، ئێمە بەڕاستی تۆمان نارد مژدەدەرو ترسێنەر بی، هیچ کۆمەڵێکیش نەبووە کە ترس وەبەر هێنەریان بۆ نەچووبێ.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾

**بەسەرهاتی نوح (سەلامی خوای لێبێ) و وتووێژی لەگەڵ هۆزەکەیا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ ﴾ نووحمان ناردە لای هۆزەکەی، خودای گەورە باسی نووح پێغەمبەرمان بۆ دەکا (سەلامی خوای لێبێ) کە یەکەم پەیامبەرێك بوو خودای مەزن ناردی بۆ سەر خەڵکی سەر زەمین، بۆ سەر ئەو موشریکانەی کە بتیان دەپەرست کە گوتی بە هۆزەکەی ﴿إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە. ئەگەر ئێوە جگەلەخوداتان پەرست، خودا جەرزەبەتان ئەدا بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴾ جگە لە خودا مەپەرستن، من ئەترسم ڕۆژێ تووشی ئازاری بەژان ببن، واتە: ئەگەر بەردەوام بوون لەسەر بتپەرستی‌و کوڵتان نەدا خودا سزایەکی زۆر توندو بەژان‌و گران‌و پڕ ئازارتان ئەدا لە ڕۆژی دوایدا، ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا ﴾ پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی کە خوا نەناس بوون گوتیان: وەك ئێمە دەت بینین، تۆش مرۆیەکی وەك خۆمان واتە: خۆ تۆ فریشتە نیت، تۆش وەك ئێمە مرۆڤی، چۆن تۆ نیگات بۆ دێ بەتەنیا لەناو ئێمەدا ﴿وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾ ئەمانەیش کە شوێنی تۆ کەوتوون، وەك ئێمە دەبینین ڕووتەو پووتەی بێناوەزن‌و فرۆشیاری گەڕۆك‌و کاری چنین‌و جۆرەها کاری تری وا دەکەن. پیاوماقوڵان‌و خاوەندەستەلات‌و گەورەکان نابینین لەناو ئێمەدا شوێنت کەون، ئەوانەیش کە شوێنت کەوتوون، لە وشیاری بیرتیژی‌و تێڕوانینەوە نەبووە دوات کەوتوون، تەنیا کاتێ کە تۆ بانگت کردوون خێرا وەڵامیان داویتەوەو شوێنت کەوتوون. ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ ﴾ نەشمان دیوە شتێکتان لە ئێمە زیاتر بێ، لە دروست بوونا، لە ڕەوشتا، لە بژێویدا، لە خۆش ڕابواردنا، کاتێ کە چوونەتە ناو ئەو ئاینەتان، ﴿بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴾ بەڵکو ئێمە وا دەزانین کە درۆ دەکەن. لەو قسەیەدا کە دەیکەن‌و دەڵێن: تووشی خێرو چاکەو خواناسی‌و خۆشبەختی دەبن لە ڕۆژی دوایدا، ئەگەر بەردەوام بوون‌و لاتان نەداوەر لەسەری ڕۆشتن، ئەمە ڕەخنەی خوانەناسان بوو بەرانبەر نووح

پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) و شوێنکەوتووەکانی، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر نەفامیو کەمزانستیو بێئاوەزیان، هیچ سوکایەتی نییە بۆ هەق کە ئەو کەسە هەژارانە شوێنی دەکەون، چونکە هەق خۆی بۆ خۆی ڕاستە، ئیتر پیاوماقوڵان شوێنی کەون یان هەژارانو بێدەستەڵات. بەڵکو ئەو هەقەی کە گومانی تێدا نیەو ئەوانەی شوێنی هەق دەکەون پیاو ماقوڵانن، با هەژاریش بن، ئەوانە کە قبوڵی هەق ناکەن سوكو بێڕێزن. با لە ڕیزەی دەوڵەمەندەکانیش بن. شتێکی سروشتیشە کە ئەوانەی لە چینی هەژاران زیاتر شوێنی هەق دەکەون، ئەوانەیش خاوەندەستەڵاتو خۆیان بە زل دەزانن دژایەتی هەق دەکەن، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ﴾[1] کاتێ هیرقل پاشای ڕۆم پرسی لە ئەبوسوفیان سەخری کوڕی حەرب لە بارەی ڕەوشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) یەکێ لە پرسیارەکانی ئەوە بوو پێیگوت: خەڵکە پیاو ماقوڵەکان شوێنی کەوتوون یان لاوازەکان؟ گوتی: لاوازەکان، هیرقل گوتی: ئا ئەوانە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن؟[2] کە گوتویانە (بادی الرأی) واتە: بێئاوەزو ساویلکەن. ئەمە شورەییو لەنگیەکی تێدا نییە، چونکە ئەو هەقە کاتێ ئاشکرا بوو هیچ دەرفەتێ نامێنێ بۆ بیرو بۆچونەکان، بەڵکو دەبێ دوای کەونو ئەو حاڵەتەیش بوارێکی چاکە بۆ هەموو زیرەكو هۆشمەندێ، بە پێچەوانەوە ئەوانەی کە گێژو بێئاوەزن لێرەدا وا بیر دەکەنەوە، پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) بە فەرمانێکی ڕوونو ئاشکرا هاتوون، خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ وە ئێمە نابینین ئێوە هیچ شتێکتان لە ئێمە زیاتر بێ، واتە: ئەوانە ئەو هەقە نابینن، چونکە کوێرن لە ئاستی هەق، نە دەبیننو نە دەبیسن، بەڵکو ئەوانە هەمیشە لە گوماندا ژیان بەسەر دەبەن، وە لە تاریکستانی نەفامیدا خول دەخۆن، ئەوانە زۆر بوختانچیو درۆزنو سوكو ڕسوان، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتیشا زۆر دۆڕاوو زیانبارن.

﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾﴾

---

[1] الزخرف (۲۳). واتە: هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە لە شارێکدا مەگەر خۆشگوزەرانەکان (دەوڵەمەندەکان)ی وتوویانە بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئایینێك دیوە وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئایینی ئەوان دەڕۆین.

[2] فتح الباري (۱/٤۲).

**وەلامی نووح پێغەمبەر( سەلامی خوای لێبێ )**

خودای مەزن باسی نووح پێغەمبەر دەکا کە وەلامی هۆزەکەی دایەوە لەبارەی ئەو بڕوبیانوو قسانەی دەیانکرد ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ﴾ گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەگەر بلێم پەروەردگارم حیسابی بۆ کردومو نیشانەی ئەوم لایەو بەزەیی بەمندا هاتووەو ئێوە ئاگاتان لێ نیە چۆن دەبینن؟ واتە: من زۆر دڵنیام و فەرمانێکی ئاشکراو پەیامێکی ڕاستم لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆ هاتووە، کە بەزەییەکی زۆر گەورەیە بۆ منو بە ئێوەیش، بەلام ئێوە ئاگاتان لێی نەبوو شارەزایش نەبوون لێی، ڕێزیشتان لێی نەگرت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بڕواتان پێی نەکردو دژایەتیتان کرد، ﴿أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ﴾ ئایا ئەگەر خۆتان حەز نەکەن دەکرێ ئێمە بەزۆر بەسەرتاندا بسەپێنین.

﴿وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ﴾ ئەی گەلەکەم ئەوەیش بزانن هیچ سامانێکم لە ئێوە ناوێ، پاداشتی من لەسەر خودایەو ئەوانەیش خاوەنباوەڕن دەریان ناکەم، بێگومان ئەوان دەگەن بە دیداری پەروەردگاریان، بەلام من دەبینم ئێوە کۆمەڵێکی بێئاوەزن. یانی: من هیچ ماڵو سامانێکم لە ئێوە ناوێ بەرانبەر ئەو ئامۆژگاریانەی کە دەتانکەم، بەڵکو من بە هیوای پاداشتی خودام، وە من ئەو خاوەنباوەڕانە دەرناکەم، وا دیارە داوایان لێکردوە کە ئەو خاوەنباوەڕانەی کە هەژارن، نووح پێغەمبەر دەریان بکات، چونکە نەفسیان ڕێگەی پێنەئەدان لەگەڵ ئەوانەدا دانیشن، خۆیان زۆر بە گەورە دەزانیو پێیان شورەیی بوو. وەك چۆن ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) داوایان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) کە موسڵمانە هەژارو لاوازەکان دەریکاو بەتەنیا لەگەڵ ئەواندا دانیشێ، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ﴾[1] واتە: هەروەها ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستن و هاواری لێ دەکەن بە بەیانیانو ئێوارانـدا.

پاشان خودای مەزن لەسەر زمانی نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) فەرمووی: ﴿وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ خزمەکانم: ئەگەر من لای خۆم دەریان کەم کێ لە خودا ڕزگارم

---

[1] الانعام (٥٢).

دەكات؟ ئایا هیچ بیر ناكەنەوە؟ خودای گەورە لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾[1] ئێمە ئاوا دەمانەوێ هێندێ بە هێندێكیان تاقی بكەینەوە هەتا بڵێن: چۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی وەبەر چاكەی خۆی خستووە؟ ئایا خودا لەوان باشتر سوپاس گوزاران ناناسێ؟

﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پێشتان ناڵێم من خاوەنی گەنجینەی خودام،من لە غەیبیش هیچ نازانم، ناڵێم فریشتەیەكم، ناشڵێم ئەوانەی كە ئێوە بەسوكی سەیریان دەكەن، خودا چاكەیان لەگەڵا ناكا، خوا چاكتر دەزانێ چیان لە دڵدایە، ئەگەر وابم، ئەوسا من یەكێكم لە ستەمكاران. نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) پێی گوتن كە ئەو راسپاردەیەكە لەلایەن خوداوە، بانگی مەردم دەكا بۆ ناسینی خودا بەتەنیا، كە شەریكی نیەو، ئەو كارەیش دەیكا بە فەرمانی خودایە، داوای هیچ پوڵو پارەیەكیان لێ ناكا لە بری ئەوەدا، بەڵكو هەركەسێكی پێكەیشت بانگی دەكا ئیتر ئەو كەسە پیاو ماقوڵ بێ یان هەژارو لاواز، هەركەسێ لێی وەرگرت ئەوە ئەو كەسە ڕزگاری بووە، وە پێشی گوتن: كە ئەو هیچ دەسەڵاتێكی نییە كە بەسەر گەنجینەكانی خوداداو ئاگاداری نهێنیەكانی خوداش نیە شتێ نەبێت كەخودا خۆی ئاگاداری بكات، فریشتەیەكیش نیە لە فریشتەكانی خودا. بەڵكو ئەو مرۆڤەو ڕەوانە كراوە بە موعجیزەوە، دیسان نووح پێغەمبەر ئەفەرموێت: ناشڵێم ئەوانەی كە ئێوە بە سوك سەیریان دەكەنو ڕێزیان لێ ناگرن لەلای خودا هیچ پاداشتێ وەرناگرن لەسەر كردارەكانیان، خودا خۆی دەزانێ چی لەناو دڵیاندایە ئەگەر ئەوانە وەك بە ئاشكرا خاوەنباوەڕن لە دڵیشا هەروابن، ئەوانە پاداشتی چاكەكانیان ئەداتەوە، هەركەسێ بە خراپ ناویان بەرێ، دوای ئەوەی بروایان هێنا ئەوە ئەو كەسە ستەمكارەو قسەیەكی نابەجێی كردوە.

﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾﴾

[1] الانعام (٥٣).

**داواکردنی هۆزی نوح کە سزایان بۆ بێت، وەڵامی نوحیش بۆیان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ قَالُوا۟ يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ گوتیان: ئەی نووح بێگومان دەمەقاڵەت کرد لەگەڵماندا، زۆریش دەمەقاڵەت کرد لەگەڵمان، ئەگەر ڕاست دەکەی، هەرچی دەڵێیت بەسەرتان دێ، پێمان بنوێنە. خودای گەورە باسی پەلەپەلی هۆزی نووح دەکا کە داوای دابارینی بەلاو تورەیی و جەزرەبەی خودا دەکەن. واتە: گوتیان: تۆ قسەی زۆرت لەگەڵا کردین ئێمە هەرگیز شوێنی تۆ ناکەوین، ئەو بەلاو سزایەی کە تۆ دەیڵێیت با بێت، هەرچەندێ دەتوانی نزامان لێبکە بەلکو زوو بێت، ئەگەر ڕاست دەکەی ﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ گوتی: بێگومان خودا بۆتان دەهێنێ. ئەگەر بیەوێ، ئێوە ناتوانن لە سزای خودا خۆتان ڕزگار بکەن. واتە: ئەو کەسەی کە سزاتان ئەداو پێشی دەخا بۆتان ئەو خودایە کە هیچ شتێ ناتوانێ لە دەستی دەرچێ ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ئامۆژگاری من سوودتان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر بمەوێ ئامۆژگاریتان بکەم ئەگەر خودا بیەوێ گومڕاتان بکا، خۆی پەروەردگاری هەمووتانە، هەر بۆلای ئەویش دەچنەوە. واتە: ئامۆژگاری و ترساندن و هەڕەشەی من هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێ ئەگەر خودا مەیلی لێبێ گومڕاتان بکاو لەناوتان بەرێ، ﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ئەو پەروەردگارتانەو هەموو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. واتە: خودا خۆی خاوەنی گشت شتێکە، کاربەدەستو فەرمانڕەواو دادپەروەرە، ئەو خودایەی کە ستەم لە کەس ناکا، بوون و نەبوون بەدەستی ئەوەو هەر خۆی لە سەرەتاوە وەدی هێنەر بووەو هەر خۆشی، دووبارە دروستی دەکاتەوە. فەرمانڕەوای دنیاو ڕۆژی قیامەتە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

**ڕێسایەك بۆ ڕوونكردنەوەی ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾ یان دەڵێن خۆی هەڵیبەست، ئەمە خۆی ڕستەیەکی موعتەرەزەیە لەناوەڕاستی ئەم بەسەرهاتەداو جەخت لەسەر ئەم ڕووداوە دەکاتەو پشتگیرییەکە بۆی، خودای گەورە ئەفەرموێت بە موحەممەد(ﷺ): یان ئەو خوانەناس و سپڵانە دەڵێن ئەمە موحەممەد(ﷺ) خۆی لە خۆیەوە هەڵیبەستووەو دروستی کردووە ﴿قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى﴾ بڵێ: ئەگەر ئەم قورئانەم هەڵبەستووە تاوانەکەی لەسەر خۆم، ﴿وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴾ واتە: منیش لە تاوانی ئێوە خۆم لائەدەم. واتە: هەرگیز ئەوە دروستکراو نیەو هەڵیش نەبەستراوە،

چونکە من چاك دەزانم چ تۆڵەیەك هەیە لەلایەن خوداوە بۆ ئەو کەسانەی کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن.

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾﴾

خودای گەورە باسی ئەوە دەکا، کاتێ هۆزەکەی نووح داوای بەڵاو سزای خودایان کرد کە دابارێ بەسەریاندا، خودای گەورە نووح پێغەمبەری ئاگادار کرد(سەلامی خوای لێبێ)، نووح پێغەمبەریش ئەو نزایەی لێکردن کە خودای گەورە لەسەر زمانی ئەو باسی کردووەو فەرموویەتی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾[1] پەروەردگارم، لەم سەر زەمینە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن گیانلەبەریان لێ مەهێڵە. وە فەرموویەتی: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ﴾[2] لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە: من شکستم خواردووە، هانام بە تۆ! ئا لەوێدا خودای گەورە ئاگاداری کرد ﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ نووح ئاگادار کرا کە: لەناو هۆزەکەی تۆدا، جگە لەوانەی تا ئێستا باوەڕیان بە خوا هێناوە، کەسی تر بڕوا ناهێنێ‌و لەو کارەی کە دەیکەن غەمگین مەبە. واتە: خەفەتیان بۆ مەخۆو گوێیان مەدەرێ. ﴿وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ لەژێر چاودێری ئێمەو هانای ئێمەدا کەشتی دروست کەو لەسەر ئەوانە قسەم لەگەڵ مەکە کە ستەمکار بوون، ئەوان دەبێ ژێرئاو بکەون. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق باسی کردووە، لە تەوراتەوە: خودای مەزن فەرمانی دا بە نووح ئەو کەشتیە لە تەختەی ساج دروست بکا، درێژی کەشتیەکە هەشتا باڵ و پانیەکەشی پەنجا باڵ بێ، بە قیریش دەرو ناوی کەشتیەکەوغ بدات، سنگێکی بەرزیشی بۆ دروست بکا هەتا باش ئاو لەت بکاو بیبڕێ، بەرزایەکەیشی بەرەو ئاسمان سی (٣٠) باڵ بێ‌و سێ قاتیش بێ، هەر قاتێکی دە باڵ بێ قاتی خوارەوەی کەشتیەکە بۆ زیندەوەرانی ماڵی‌و کێوی، ناوەڕاست بۆ مرۆڤ و قاتی سەرەوەیش بۆ باڵندەکان، دەرگای کەشتیەکەیش لە پانایی

---

[1] نوح (٢٦).

[2] القمر (١٠).

کەشتیەکەوە بێ، سەرقاپێکی هەبێ لەسەرەوە بتوانرێ پێی بگیرێ. ﴿وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ﴾ خەریکی کەشتی دروست کردن بوون، کاتێك خاوەن پلەو پایە دارەکان لە هۆزەکەی بەلایدا دەڕۆیشتن، گاڵتەی خۆیان پێدەکرد،ئەویش ئەیفەرموو: ئەگەر ئێوە گاڵتەمان پێ دەکەن، بەو زووانە ئێمەش وەك ئێوە گاڵتەتان پێدەکەین. واتە: گاڵتەیان پێدەکردو پێیان ڕادەبوارد بەوەی کە نووح پێی دەگوتن: لەناو ئاودا نوقم دەبن و دەخنکێن، نووحیش هەڕەشەی لێدەکردن دەیگوت: ﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ﴾ لەمە بەولاوە تێدەگەن، کێ تووشی ئازاری وادێ ئابڕووی بچێو جەزرەبەی لەبننەهاتووی بەسەردا بێ. واتە: هەر لە دنیادا ئابڕوویان دەچێ لە ڕۆژی قیامەتیشا بەردەوامو بێوچان سزا ئەدرێن.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٤٠﴾﴾

**سەرەتای دەستپێکردنی (تۆفان)ەکەوهەڵگرتنی نێرومێیەك لەناو کەشتیەکە دا لەهەموو شتەکان لەلایەن نووحەوە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ﴾ تا ئەو کاتەی کە فەرمانی ئێمە گەیی، ئاو بە تەوژم هاتە دەر لە وشکانی، گوتمان لە گشت نێرو مێیەك دوان هەڵگرە. ئەمە ئەو بەڵێنە بوو کە خودای مەزن بە نووح پێغەمبەری دا (سەلامی خوای لێبێ) فەرمانی خودا هاتە جێو بارانێکی بەلێزمەی بەردەوام دەستی پێکرد وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ﴿١١﴾ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾[1] ئەوسا هەموو دەرگاکانی ئاسمانمان بۆ بارانێکی (ڕەهێڵە) بە تەوژم خستە سەر پشت، ئەم زەمینەیش کانیەکانمان تەقاندن، ئاو گەینەیەك بەو ئەندازەی کە بڕیاری بۆ درابوو، ئەومان بە شتێ هەڵگرت، کە لە چەند تەختەو بزمار پێك هاتبوو، لەژێر چاودێری خۆمان بەڕێکەوت بۆ پاداشتدان بە کەسێ کە بە قسەکانی بێباوەڕبوون. ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾

---
[1] القمر (١١–١٤).

ئیبنوعەبباس ئەڵێ: (التنور) یانی ڕووی زەمین[1]. واتە زەمین وای لێهات بوو بـە کـانی هەڵدەقوڵا هـەتا وای لێهات لەو تەنورانەیشەوە کە شوێنی ئاگر بوون ئـاو هەڵدەقوڵا. ئەمـە قـسەی زانایـانی پێشینان و پاشینانیشە لەو کاتەدا خودا فەرمانی دا بە نـووح پێغەمبـەر(سـەلامی خـوای لێبـێ) لەگـەڵ خـۆی لـەو کەشتیەدا لە گشت نێرو مێیەك دوان هەڵگرێ لە هەموو جۆرە زیندەوەرێ خاوەنی گیان بـێ، گوتراوە: لە ڕووەکـیش دوو نێـرو مـێ، گـوتراوە یەکـەم گیانلەبـەرێك خرایـە نـاو کەشـتیەکە مێروولـەبوو، دوایـن زیندەوەریش خرایە ناو کەشتیەکە گوێدرێژ بوو، شەیتان خۆی هەڵواسی بە کلکـی کەرەکـەدا، کەرەکـە دەیویست هەڵسێ شەیتان قورسی دەکرد، هەتا نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) پێی گوت: چیتە ماڵوێران بچۆ ناوی، هەڵدەساو نەیدەتوانی، نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) فەرمووی بچۆرە ژوور ئەگـەر شەیتانیـشت لەگـەڵا بـێ، پاشـان چـوونە نـاو کەشـتیەکە. پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ﴾ لەگەڵ کەس و کارەکەت ئەوەنەبێت کە لـە پـێشا بڕیـاری بـۆ دراوە. لەو کەسانەی بڕوایان نەهێناوە، لەوانە کوڕەکەی بوو، کە ناوی یام بوو کە بـە تـەنیا کـەنارەگیری کـرد لەگەڵ ژنەکەی نووح کە بڕوای بە خوداو پێغەمبەرەکەی نەبوو، وە ئەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ هەرکەسـێ بـاوەڕی هێنـاوە، خـەڵکێکی کـەم نـەبێ لەگەڵیـدا بـڕوای نـەهێنا، لـەوماوە درێـژەش کـە نـۆ سـەدو پـەنجا سـاڵی خایانـد، ئیبنوعـەبباس ئـەڵێ: هەشـتا کـەس بـوون بـە ژنەکانیشیانەوە.[2]

﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا ۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ (٤١) وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ (٤٢) قَالَ سَآوِي إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ (٤٣)﴾

### سواربوونی کەشتیەکە و ڕۆشتنی لەناو ئەو شەپۆلە گەورانەدا

خودای مەزن باسی نووح پێغەمبەر دەکا (سەلامی خوای لێبێ) کە ئەڵێ بەو کەسـانەی کـە فـەرمان درا لەگـەڵ خـۆی هـەڵیان گـرێ ﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا ۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ نـووح گوتی: هەمووتان سوار بن لەو کەشتیەدا بەناوی خوداوە لـە کـاتی ڕۆشـتن و وەسـتانیدا، پـەروەردگاری

[1] الطبري(١٥/٣١٨).

[2] الطبري(١٥/٣٢٦).

من لێ بوردەو دلۆڤانە. واتە: ڕۆشتن بەناوی خودایەو لەسەر ئاوو بەناوی خودایش دەوەستێ‌و ڕوشتنەکەی کۆتایی پێ دێت، ئەبورەجائی عەتاریدی ئەم ئایەتەی بەم شێوەیەش خوێندەوە ﴿بسم الله مُجريها ومُرسيها﴾[1]، خودای مەزن لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾[2] هەرکاتێ خۆت‌و هاوڕێکانت لەسەر کەشتیەکە جێتان گرت، بڵێ: سوپاس بۆ خودایە کە لە کێشەی ستەمکاران ڕزگاری کردین، بشڵێ: ئەی پەروەردگارم! لە شوێنێکی بە پیت دامبەزێنەو تۆ لە هەموو میوانداران چاکتر میوان بەخێو دەکەی. بۆیە سونەتە ناوی خودا هێنان لە سەرەتای گشت شتێکاو لە سواربوونی کەشتی‌و ولاغی سواریشا. وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾[3] واتە: وە ئەو خوایەی کە هەموو جووتەکانی بەدیهێناوە وە کەشتی‌و ولاخی بۆ فەراهەم هێناون کە سواریان دەبن، بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن لەپاشان بیر لە بەهرەی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێ سواریان بوون وە بڵێن پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو، وە بەڕاستی ئێمە بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. فەرمووده لەم بارەیەوە هاتووە جەختی لەسەر دەکاتەوە، وەك لە سورەتی الزخرف باسی دێت خوا مەیلی لێبێ، ﴿إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارم زۆر لێبوردەو دلۆڤانە. ئەوە زۆر جێی خۆیەتی لەکاتی باسی سزادانی خوانەناساندا‌و جنکانی سەرلەبەریان، باسی لێبوردەیی‌و دلۆڤانی خودای کردووە، نموونەی ئەم ئایەتە لە قورئانا زۆر هاتووە وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[4] واتە: بەڕاستی پەروەردگارت تۆڵەی خێرایە بەڕاستی لێخۆشبوو میهرەبانیشە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾[5] واتە: وە بەڕاستی پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە بۆ خەڵکی گەرچی ستەمکاریش بن هەروەها بەڕاستی پەروەردگارت توندو تیژەلە تۆڵەسەندا. چەند ئایەتی تریش

---

[1] الطبري(١٥/٣٢٨).

[2] المؤمنون (٢٨-٢٩).

[3] الزخرف (١٢-١٤).

[4] الاعراف (١٦٧).

[5] الرعد (٦).

لەم جۆرە کە خودا باسی بەزەیی خۆی کردوە لەگەڵیدا باسی تۆڵە سەندنیشی کردوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾ کەشتیەکە ئەوانی دەبرد بەناو شەپۆلی وادا دەچوو وەك کێوەکان وابوو. واتە: کەشتیەکە دەیبردن بەسەر ئاوەکەدا کە ڕووی زەمینی هەموو گرتبوو، هەتا کەوتە سەر لوتکەی چیاکانیش بەبەرزی پانزە باڵ، وە هەندێ گوتویانە: لەسەری چیاکانەوە بوو بە بەرزی هەشتا میل، ئەم کەشتیە بە ئیزنی خودا بەسەر ئەم ئاوەدا دەڕۆشت، لەژێر چاودێری بەزەییو سۆزو پارێزگاری خودای مەزنا. وەك لە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئێمە کاتێك کە ئاو سەرکەوت ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا، تا ئەم کردەوەیە بکەینە بیر هێنەرەوە بۆ ئێوە تالە گوێی بگرێ گوێگرێکی تێگەیشتوو. وە فەرموویەتی: ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾[2] واتە: وە نوحمان (لەگەڵ شوێنکەوتووانی) هەڵگرت لەسەر کەشتی یەك کە بە چەند پارچە تەختەو بزمار دروست کرابوو، بە چاودێری ئێمە دەڕۆیشت، ئەمە پاداشت بوو بۆ ئەو کەسەی باوەڕی پێنەکرا (کە نووحە)، بێگومان ئەو ڕووداوەمان هێشتەوە تا ببێتە پەندێك جا ئایا کەسێك هەیە پەند وەرگرێ؟

## بەسەرهاتی خنکانی کوڕە خوانەناسەکەی نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾ نووح کوڕەکەی خۆی بانگ کرد کەلە شوێنێکی کەناردا بوو، گوتی: کوڕەکەم لەگەڵ ئێمەدا سواربەو خوانەناس مەبە. ئەم کوڕە چوارەم کوڕی نووح بوو ناوی یام بوو، خوانەناس بوو، باوکی لەکاتی سواربوونی کەشتیەکەدا داوای لێ کرد بڕوا بێنێو لەگەڵیاندا سواری کەشتیەکە ببێ، وەك چۆن ئەو خەڵکە خوانەناسە دەخنکێن ئەویش ئەخنکێ، ﴿قَالَ سَآوِي إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ﴾ گوتی: من پەنا بە چیایەك دەبەم کە لە ئاو دەمپارێزێ. ئەو کوڕە ئەوەندە نەفام بوو وایدەزانی ئەو تۆفانە ناگاتە سەر لوتکەی چیاکان ئەگەر هەڵگەڕێو خۆی بگەیەنێتە سەر لوتکەی کێوێ لە خنکان ڕزگاری دەکا ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾

---

[1] الحاقة (١١-١٢).

[2] القمر (١٣-١٥).

نووح پێی گوت: ئەمڕۆ هیچ پاراستن لە فەرمانی خودا نیە، کەسێ نەبێ کەخۆی بەزەیی پێدابێتەوە، شەپۆل کەوتە نێوانیان‌و خرایە ڕیزی خنکاوان.

﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾

**کۆتایی لافاوەکە**

خـــودای مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّ ﴾ پاشان گوترا: زەمین ئاوەکەت بخۆرەوە ئاسمان بەس ببارێنە، ئاو ڕۆچوو بە ناخی زەمیناو کار سەری گرت، (کەشتیەکە) لەسەر جوودی لەنگەری گرت. خودای گەورە لێرەدا باسی ئەوە دەکا،کاتێ کە خەڵکی سەر زەمین هەموو خنکان جگە لەوانەی کە لەناو کەشتیەکەدا بوون، فەرمان درا بە زەمین ئەو ئاوەی کە لێی هەڵدەقولا بیخواتەوە (هەڵی مژێتەوە). فەرمانیش درا بە ئاسمان کە باران نەبارێنێ، ئاوەکە کەم کەم نیشتەوە، هیچ کەسێ لەسەر زەمینا نەما لەوانەی کە خوانەناس بوون‌و تۆویان نەماو بنە بڕ بوون. کەشتیەکە لەسەر کێوی جوودی کەنارەی گرت. موجاهیدئەڵێ: (جوودی) چیایەك بوو لە(الجزيرة)ەدا لە چیاکانی تر بەرزتر بوو لەو کاتەدا نەبوویە ژێر ئاوەو مایەوە، ملکەچی فەرمانی خودا بوو، کەشتیەکەی نووح (سەلامی خوای لێبێ) لەسەر ئەو چیایە لەنگەری گرت.[1] قەتادەئەڵێ: کەشتیەکە مانگێ لەسەر چیاکە مایەوە هەتا ئەو خەڵکە لەسەری دابەزین. دیسان قەتادەئەڵێ: خودای مەزن کەشتیەکەی نووحی هێشتەوە لەسەر چیای جوودی لەسەر زەمینی جەزیرە بۆ ئەوە ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ دوای خۆی.[2] پێشینەکانی ئەم ئوممەتەیش چاویان پێی کەوت، زۆر کەشتی دوای ئەم کەشتیە دروست کراو بوو بە خۆڵەکەوەو کەس نەیبینی، ﴿وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هەر دوور بن ئەوانەی کە ستەمکارن. واتە: مردن‌و زەرەرمەندی‌و بۆ ئەو کەسانەی ناهەقی کارن، ئەوانە هەموو لەناوچوون‌و هیچیان نەماو بنەبڕ بوون.

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

[1] الطبري (٣٣٧/١٥).
[2] الطبري (٣٣٨/١٥).

**گەڕانەوە بۆ سەر بەسەرهاتی کوڕەکەی نووح و باسی ئەو وتووێژەی کە ڕوویدا لەنێوان نووح و خودای مەزنا لەبارەی کوڕەکەی نووحەوە**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ نووح لە پەروەردگاری پاڕایەوە، گوتی: ئەی پەروەردگاری من! کوڕەکەم لە کەس و کاری منە، بەڵێنی تۆیش هەر دێتە جێ و تۆ لە گشت فەرمانڕەوایەك فـەرمانڕەواتری، ئەمـە پرسیارێکە لە نووحەوە بۆ ڕوونکردنەوەو دەرکـەوتنی حاڵی کوڕەکـەی کە خنکا، دەڵێ ئەی پـەروەردگارم تـۆ بەڵێنت دامێ کەس و کارەکەم ڕزگاری دەبێ، بەڵێنی تۆش ڕاستەو دێتەجێ، چۆن کوڕەکەم خنکا، تـۆ لە گشت فەرمانڕەواکان دادوەرتری. خودای مەزن وەڵامی ئەداتەوەو ئەفـەرموێت: ﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ فــەرمووی: ئەی نووح، ئەم کوڕەت کەسی تۆ نیـە، ئاکاری ناپەسندی هەیە، هـەر شـتێ هیچی لێ نـەزانی، داوای مەکە، من ئامۆژگاریت دەکەم کە خۆت نەخەیتە ڕیزی نەزانان. واتە: ئەی نووح کوڕەکـەت لـەو کـەس و کارانـەت نـەبوو کـە بەڵێنمـدا ڕزگاریـان بکـەن، بێگومـان مـن بـەڵێنی ئەوانـەم دا ڕزگاریـان بکـەن کە خاوەنباوەڕ بوون ئەوانە نەبێ لە پێشا بڕیاریان بۆ دراوە بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ﴾ ئەم کوڕەیش یەکێ بوو لەوانەی کە لە پێشا بڕیاری بۆ درابوو کە بخنکێ لەبەر خوانەناس و دژایەتیکردنی باوکی کە نووح پێغەمبەر بوو (سەلامی خوای لێبـێ) ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٌۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ نــوح گــوتی: ئــەی پـەروەردگارم، هـەر خـۆم بـە تـۆ دەپـارێزم، کە داوای شـتێکت لێ بکـەم و نـەیزانم، ئەگـەر بـەزەییت پێمدانەیەتـەوەو لێمنـەبووری یـەکێکم لـە زیانبـاران، عەبـدوڕەزاق ڕیوایـەتی کـردوە لـە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێ: ئەوە کـوڕی بـوو، بـەڵام جیـاوازی هـەبوو لەگـەڵیا لـە کردارو نیازو مەبـەستیا، عیکریمە ئەڵێ لە هەندێ لەخوێندنەکاندا هاتووەکەئەڵێ ﴿إِنَّهُ عَمِلَ عَملاً غَيْرَ صالِح﴾[1].

﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٤٨﴾﴾

---

[1] الطبري (١٥/٣٤٣).

**فەرماندان بە دابەزین لە کەشتیەکە هاوڕێ لەگەڵ بەرەکەت وسەلامەتیدا**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ گوترا: ئەی نووح بە سـەلامەتیو بـەو پیتـەوە (کـە داومانـە بـە تۆو هاوسەفەرەکانت) دابەزە، چینو بەرەکانی دوایش، تا ماوەیەك، مۆڵەتی ژیانیان ئەدەینیو پاشان تووشی ئازاری بە ژانیان دەکـەین. خـودای مـەزن لێرەدا باسـی ئـەوە دەکا کـە چـی گـوترا بـە نـووح (سەلامی خوای لێبێ) کاتێ کە کەشتیەکە لەسـەر جـوودی لەنگەری گـرت، لـە سـڵاو لێکردنـیو سـڵاو لەوانەیش کە لەگەڵیا بـوون لـە خاوەنبـاوەڕان، وە لـە گـشت خاوەنبـاوەڕێ لـە نـەوەکانی هـەتا ڕۆژی قیامەت، وەك موحەممەدی کوڕی کەعب ئەڵێ: ئەم سڵاوە گشت خاوەنباوەڕێکی پیاوو ژن دەگرێتـەوە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە گشت خوانەناسێکیش دەگرێتەوە پیاو بێ یان ژن، ماوەیەك لە دنیـادا مۆڵـەتی ژیانیان پێ ئەدرێو پاشان تووشی سزا دەبن تـا ڕۆژی قیامـەت.[1] موحەممـەدی کـوڕی ئیـسحاق ئـەڵێ: کاتێ خودا ویستی لافاوەکە بوەستێنێ، بایەکی نارده سەر زەمین ئاوەکەی وەسـتاندو سەرچـاوەکانی سەر زەمینی داخست گرتەوە لەگەڵ دەرگاکانی ئاسماندا، خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ﴾ واتە: گوترا بە زەمین ئاو بخۆرەوە، ئاوەکـە بـە زەمینـا دەچـووە خـوارو کـەمی دەکـردو نەدەما، کەشتیەکەیش لەسەر جوودی لەنگەری گرت (وەك ئەهلی تەورات دەڵێن) لـە حەڤـدەی مـانگی حەوتدا، وە لـە یەکـەم ڕۆژی مـانگی دە دا لوتکـەی چیاکان بینـرا، پـاش ئـەوەیش چـل ڕۆژی تریـشی بەسەردا ڕۆشت، نـووح پێغەمبـەر(سـەلامی خـوای لێبـێ) دەلاقـەی کەشـتیەکەی کـردەوە، کـە لێیـەوە سواری کەشتیەکە بوون، پاشان قەلەڕەشی نارد تا سەیری بۆ بکا ئـاو چـی کـردووە، بـەلام قەلـەڕەش نەگەڕایەوە بۆلای، پاشان کۆتری نـارد گەڕایـەوە بـۆلای بـەلام هـیچ شـتێکی بـە قاچـەکانیەوە نـەدی، دەستی برد بۆ کۆترەکەو گرتیو خستیە نـاو کەشـتیەکە، دوای ئـەوەی حـەوت ڕۆژی بەسـەرا ڕۆشـت، پاشان ناردیەوە تا سەیری بۆ بکا، لە کاتی ئێوارە گەڕایەوە، گەڵای زەیتـونی بـە دەمـەوە بـوو، نـووح پێغەمبەر زانی کە ئاوەکە لەسەر زەمین کەم بووەتـەوە، پاشـان حـەوت ڕۆژی تـر مایـەوە، کۆترەکـەی نـاردەوە بـەلام کۆترەکـە نەگەڕایـەوە، نـووح زانـی کـە زەمـین دەرکـەوتووە، کـە سـاڵێك دوای هـاتنی لافاوەکە تەواو بوو، نووح کۆترێکی نارد، لە ڕۆژی یەکەمی مـانگی یـەکی سـاڵی دووهـەما ڕووی زەمـین دەرکەوتو وشکانی دیاری دا، نووح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) سەرقاپی کەشتیەکەی هەڵدایەوە،

[1] الطبري (١٥/٣٥٣).

لە بیستو شەشی مانگی دووی ساڵی دووەما گوترا: بە نووح دابەزە (لە کەشتیەکە بە سەلامەت لەلایەن ئێمەوە) ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا﴾[1].

﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ٤٩﴾

**باسی ئەم بەسەرهاتە بەڵگەیە لەسەر نیگای خودا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)**

خودای مەزن ئەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد(ﷺ) ئەم بەسەرهاتەو وێنەی ئەم بەسەرهاتە ﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ﴾ ئەمانەو ئەو هەواڵانەی نادیارن کە بۆ تۆی رادەگەیەنین لە شتە نادیارەکانی رابردووە کە لێرەدا بۆت باس دەکەین، وەك ئەوە وایە کە بە چاوی خۆت ببینی، ﴿مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَا﴾ لەمەوبەر نە تۆ دەتزانین نە هۆزەکەت، هەتا ئەوانەی کە بروات پێناکەن بڵێن لەوانەوە فێری بوویت، بەڵکو خودا ئەو رووداوەی وەك خۆی بۆ باسکردووی وەك کتێبە پێشینەکانی پێغەمبەران شایەتی لەسەر ئەدەن ﴿فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ خۆراگر بە، دواڕۆژ بۆ خودا ترسانە، واتە: خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی کە بروات پێناکەنو ئازارت ئەدەن، بێگومان ئێمە چاومان لێتەو بەو زووانە سەرت دەخەین، پاشەڕۆژیش وای لێ دەکەین کە بۆ تۆو شوێنکەوتووەکانت بێ لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا، وەك چۆن بۆ پێغەمبەرەکانی ترمان کردو سەرمانخستن بەسەر دوژمنەکانیانا، خودای گەورە لە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾.[2] واتە: بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٧١ إِنَّهُمۡ لَهُمُ ٱلۡمَنصُورُونَ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا بێگومان پێشتر بڕیارمان داوە بۆ بەندە نێردراوەکانمان، کە بێگومان هەر ئەوان سەردەخرێن. وە لێرەیشا فەرموویەتی: ﴿فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾.

---

[1] الطبري (١٥/٣٣٨).
[2] غافر (٥١).
[3] الصافات (١٧١-١٧٢).

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾
يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ
ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾

**بەسەرهاتی هوودو عاد**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ﴾ هودیشمان نارد بۆ لای عاد کە برایان بوو، گوتی: تەنیا خودا بپەرستن ئەی هۆزەکەم، بێجگە لەو ئەو خودایەکی ترتان نیە، ئێوە تەنیا هەر درۆ هەڵدەبەسن. خودای گەورە فەرمانی پێکردوون کە تەنیا خودا بپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن، بت پەرستی لێ قەدەغەکردن کە لە خۆیانەوە بە درۆوە ناوی خودایان لەو بتانە دەنا، وە فەرموویەتی: ﴿يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ هوود گوتی بە هۆزەکەی، بۆ ئەم کارە کرێم لە ئێوە ناوێ، پاداشتی من لەسەر داهێنەری خۆمە، ئایا بۆ دەبێ تێنەگەن؟ هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) هەواڵی دانێ کە هیچ ماڵو سامانێکی لەوان ناوێ لەسەر ئەو پەیامەی لەلایەن خوداوە بۆی هێناون‌و ئەو ئامۆژگاریەی کە دەیکا، بەڵکو بە هیوای پاداشتی ئەو خودایە کە دروستی کردووە ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ ئایا بۆ دەبێ تێنەگەن لە کەسێ کە بانگتان دەکا بۆ شتێ کە خێری دنیاو قیامەتی تێدایە بۆتان بێ ئەوەی داوای ماڵو سامانتان لێ بکا. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ﴾ ئەی هۆزەکەم داوای لێ بووردنیش هەر لەو بکەن‌و بۆلای ئەو بگەڕێنەوەتا لە ئاسمانەوە بە ڕێژنە بارانتان بۆ بنێرێ‌و هێزێ تر بدات بەهێزتان، هەروا بە تاوانباری ڕوو وەرمەگێڕن. پاشان خودای مەزن فەرمانیان پێدەکا کە داوای لێبووردن بکەن کە دەبێتە هۆی کەفارەتی گوناهە پێشووەکانیان‌و تەوبەیش بکەن لەو گوناهانەیش کە توشیان دێ، هەرکەسێ خۆی ڕابێنێ لەسەر ئەو سیفەتانە خودای مەزن ڕۆزی بۆ سانا دەکاو کارەکانی بۆ سوك دەکا بۆیە فەرموویەتی: ﴿يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾[1] واتە: (ئینجا گەر وابکەن) بارانی خوڕەم‌و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ.

[1] نوح (١١).

﴿قَالُوا۟ يَـٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن
نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ
فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى
عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾﴾

**وتووێژی نێوان هوود پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێبێ) هۆزی عاد**

خودای مەزن باسی هۆزی عاد دەکات وئەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ يَـٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ﴾ گوتیان ئەی هوود، تۆ هیچ بەڵگەیەکت لە خوداوە بۆ نەهێناوین (لەسەر ئەوشتانەبێ تۆ باسی دەکەی) ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ هەر بە قسەی تۆ ئێمە لەوەی پەرەستوومانە دەستبەرنادەین، بڕوایش بە تۆ ناهێنین (واتە: ئێمە هەر بەوەی تۆ بڵێی واز لەو پەرستوانە بێنن، ئێمە وازی لێ ناهێنین، بڕواشت پێ ناکەین)، ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ﴾ ئێمە هەر ئەوەندە دەڵێین: ڕەنگە هەندێك لەوانەی دەیانپەرستین،تۆی تووشی نەگبەتیەك کردبێ، واتە: تووشی شێتی کردبیو عەقڵی تێکدابێ، بەهۆی ئەوەی کە بەرگریمان دەکەی لە پەرستنیانو بە ناشیرن ناویان دەبەی. ﴿قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ هوود گوتی: خوا بە شایەت دەکرم، ئێوەش هەروەها شایەت بن،من لە ئەوەی ئێوە دەیپەرستن بەرکەنارم، واتە: من دوورم لە پەرستنی ئەو هەموو بتانەی ئێوە دەیپەرستن ﴿مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾ لە جگەلە خوا سا هەمووتان فێڵم لێ بکەنو مۆڵەتم مەدەن خۆشتانو پەرستووەکانتان ئەگەر ئەوەی گوتوتانە ڕاستە، ﴿إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ من خۆم سپارد بەو خودایە کە منی پەروەردەکردووەو پەروەردگاری ئێوەش هەرئەوە، هیچ شتێ ناجوڵێتەوە خودا دەستەڵات دارنەبێ بەسەریدا بە مووی پێش سەری دەیگرێ، دیارە ڕێگەی پەروەردگارم ڕاستە ڕێیە، واتە: لەژێر تواناو دەستەڵاتی خودا دەرناچێ ئەو خودایەی کە هەر خۆی فەرمانڕەواو دادپەروەرە کە هەرگیز لە فەرمانیا ستەم لەکەس ناکا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) بەڵگەی زۆر بەهێزی پێیە لەسەر ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون، پڕوپوچی ئەو کارەی ئەوان دەردەخا لە پەرستنی ئەو بتانە کە نە سوودیان هەیەو نە زیانیش بە کەس دەگەیەنن بەڵکو بێ گیانن. نە دەبیسنو نە دەبینن، نە یارمەتی کەس ئەدەنو نەدەشتوانن دژایەتی کەس بکەن. بەڵکو ئەو کەسەی شایەنی ئەوەیە کە بە پاکی عیبادەتی بکرێ تەنیا خودایە کە

شەریکی نیە، خاوەنی هەموو شتێکەو بەڕێوەیان دەبا، هیچ شتێك نیە لەژێر دەستەڵاتو توانای ئەودا نەبێ، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا پەروەردگاریش هەر ئەوە کەسی تر نیە.

﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ﴾ ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوەی پێم ڕاسپێرراوە بۆتان من پێمگەیاندن. واتە: هوود گوتی: ئەگەر ئەوەی من ڕەوانە کرام پێی بۆتان قەبوڵتان نەکرد، کە بریتیە لە پەرستنی پەروەردگارتان بەتەنیا کە شەریکی نیە، ئیتر ئێوە هیچ بیانوویەکتان نامێنێ دوای گەیاندنی ئەو پەیامەی خودا لەلایەن منەوە بۆتان ﴿وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا﴾ پەروەردگاری من، کەسانێکی تر لە شوێنی ئێوە دادەنێ‌و هیچ زیانیشی لێنادەن، واتە: کۆمەڵێ تر لە شوێنی ئێوە دادەنێ بەتەنیا ئەو دەپەرستن‌و شەریکی بۆ دانانێن، گوێش بە ئێوە نادەن‌و خوانەناسی ئێوە کار لە ئەوان ناکا بەڵکو ناکامی ئەو بێدینیە دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان، ﴿إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ﴾ پەروەردگارم چاودێری هەموو شتە، شایەت‌و ئاگاداری کردارو گفتاری عەبدەکانیەتی‌و پاداشتیان ئەداتەوە لەسەری، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندن لێیان.

## لەناوادنی هۆزی عادو سەرئەنجامی ئەوانەی خاوەنباوەڕ بوون لە ناویاندا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ کاتێ فەرمانی ئێمە هات لە بەزەیی خۆمانەوە هوودو ئەوانەی لەگەڵ ئەو هاوباوەڕ بوون، لە جەزرەبەی زۆر سەخت ڕزگارمان کردن. ﴿وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ ئەوەیش هۆزی عاد بوو، کە سەبارەت بە نیشانەکانی پەروەردگاریان حاشایان کردو لە فەرمانی پێغەمبەرەکانی خۆیان لایاندا، هەرکەسێ بێگوێ‌و لاسار بوو شوێنی دەکەوتن. واتە: کاتێ کە فەرمانی ئێمە هات کە بریتی بوو لە ڕەشەبایەکی توند، هۆزی عادی قڕ کردو هیچی نەهێشتن، هوودو ئەوانەی کە شوێنکەوتووی بوون ڕزگاریان بوو لەو سزا قورس‌و گرانەو، بەر سۆزو بەزەیی خودا کەوتن، چونکە هۆزی عاد بڕوایان نەکرد بە نیشانەکانی خوداو لاساریان کرد بەرانبەر پێغەمبەرەکانی، وە هەرکەسێ بڕوای بە پێغەمبەرێ نەبێ، ئەوە ئەو کەسە بڕوای نەبووە بە گشت پێغەمبەرەکان، چونکە

هیچ جیاوازیە نیە لەنێوان پێغەمبەرەکان، باوەڕهێنان پێیان وەك یەکە، هۆزی عاد کە بڕوایـان نـەهێنا بە هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) وەك ئەوە وایە کە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەرەکان نـەهێنابێ، پاشـان خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾ لەم دنیایەو لە ڕۆژی قیامەتیشا، نەفرینیان هـەر بـە شـوێنەوەیە، ئاگـادار بن کـە هۆزی عاد بڕوایان نەهێنا بە پەروەردگاریان، با دوورکەونەوە عادەکان کە هـۆزی هـوود بـوون. واتـە: بۆیـە هـەر لـە دنیـادا خـودا لەعنـەتی لێکـردن‌و هـەر کـاتێکیش باسیان بکرێ خاوەنبـاوەڕانیش هـەر لەعنەتیان لێدەکەن وە لە ڕۆژی قیامەتا لەبەر چاوی ئەو خەڵکە جاڕیان بۆ ئەدرێ پێیـان دەڵێن ﴿أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾.

﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ﴿٦١﴾﴾

### بەسەرهاتی پێغەمبەر صالح‌و (سەلامی خوای لێبێ) هۆزی سەمود

خـــوای مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ﴾ بۆلای سەمودیش سالْحی برایانمان نارد، گوتی: هۆزەکەم، هەر خودای تـاك بپەرستن، ئێـوە جگـە لـەو خودایەکتان نیە، خودای گەورە باسی هۆزی سەموود دەکا کە لـە شـارەکانی حیجـرا نیشتەجێ بـوون لەنێوان تەبوك‌و مەدینەدا، لەدوای هۆزی عاد هاتن، خودا پێغەمبەر سالْحی بۆ نـاردن (سـەلامی خـوای لێبێ) داوای لێکـردن کـە تـەنیا خـودا بپەرسـتن. بۆیـە فەرموویـەتی: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا﴾ ئەو لەم خاکە وەدی هێنان‌و ویستی ئاوەدانی بکەنەوە. واتـە: لـەم زەمینـە ئێـوەی دروسـتکرد، یەکەم جاریش ئادەمی بابتانی لەم زەمینە دروست کرد، وای دروست کـردوون کـە ئـاوەدانی بکەنـەوەو سودی لێوەربگرن بۆ خۆتان، ﴿فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾ داوای لێبوردنی لێبکەن‌و پاشان بەرەو خـۆی وەرگەڕێن، واتە داوای لێبوردنی لێبکەن لـەو گوناهانـەی کردووتانـە، لەمەوبـەدوایش هـەر بـەرەو خـودا بڕۆن‌و لامەدەن ﴿إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ﴾ پەروەردگاری من نزیکەو فریادتان دەکەوێ. وەك خـودای گـەورە لە ئایەتێکی ترا فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾[1]

---

[1] البقرة (١٨٦).

واتە: هەر کاتێ عەبدەکانم لە بارەی منەوە لە تۆ دەپرسن من نزیکم، هەرکەسێ هانام وەبەر بێنێ من وەڵامی ئەدەمەوە.

﴿قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ (٦٢) قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ (٦٣)﴾

**وتووێژی نێوان پێغەمبەر صالح و (سەلامی خوای لێبێ) هۆزی سەموود**

خودای مەزن باسی ئەو وتووێژە دەکات کە لەنێوان پێغەمبەر سالح و هۆزەکەیدا ڕوویدا، کە چەندە هۆزەکەی لاسارو نەفام بوون لەگەڵیدا وەك ئەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ﴾ گوتیان: پێش لە ئێستا تۆ جێی ئومێدی ئێمە بوویت، واتە: پێش ئەوەی ئەم قسانە بکەی ﴿أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ ئایا ڕێ نادەی ئەوانەی باب و باپیرمان دەیانپەرست ئێمەش بیانپەرستین؟ ئێمە لەوەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی زۆر بەگومانین، ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى﴾ سالح گوتی: کەسەکانم ئەگەر من لە پەروەردگارمەوە بەڵگەی ئاشکرام بۆ هێنرابێ و ﴿وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ﴾ وەبەر بەزەیی ئەو کەوتبم، ئەگەر لە فەرمانی دەرچم، کێ هەیە بە فریادم بکات؟ لە ئێوەش هیچم دەستناکەوێ جگە زەرەر. واتە: ئەگەر وازم هێنا لە ئێوەو بانگم نەکردن بۆ هەق و پەرستنی خودا بەتەنیا، لەلای ئێوەوە هیچ سودێکم پێناگات زەرەر نەبێ.

﴿وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ (٦٤) فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ (٦٥) فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ (٦٦) وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ (٦٧) كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ (٦٨)﴾

لەپێشەوە بە درێژی و بەتەواوی ئەم بەسەرهاتەمان باس کردووە لە سورەتی ئەعرافدا (الاعراف) لێرەدا پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکا، بەڵام مانای ئایەتەکان دەکەین خوا مەیلی لێبێ، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا

بِسُوٓءٍ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٍ ﴾ ئەی هۆزەکەم ئەمە وشتری خودایە نیشانەیەکە بۆ ئێوە وازی لێ بێنن با لە زەوی خوادا بلەوەڕێ، بەخراپ دەستی بۆ مەبەن، دەنا ئازارێکی نزیک دێ بەسەرتانا، کەچی لەتوپەتیان کرد، سالح گوتی: لەماڵی خۆتاندا سێ ڕۆژ ڕابوێرن، ئەمە بەڵێنی خودایەو بێ درۆیە، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴾ هەر کە فەرمانی ئێمە هات لە بەزەیی خۆمانەوە ساڵح و ئەو چەند کەسانەی لەگەڵیا هاوباوەڕ بوون، لە ڕسوا بوونی ئەو ڕۆژە ڕزگارمان کردن، پەروەردگارت خاوەنی هێزو دەستەڵاتە. ئەوانەش کە ناهەقیان کرد، دەنگێکی وایان بۆ هات، لەناو ماڵەکانی خۆیاندا دەمەو دەست گیانیان دەرچوو، دەتگوت هەر لەوێش نەژیاون، بزانن کە هۆزی سەموود لە پەروەردگاری خۆیان حاشایان کرد، هەی لەوەش بەولاوە تر چن.

﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴿٧٠﴾ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾

## هاتنی فریشتەکان بۆلای ئیبراهیمو (سەلامی خوای لێبێ) مژدە پێدانی بە ئیسحاق و یەعقوب (سەلامی خوایان لێبێ)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ ﴾ ڕاسپاردەکانی ئێمەشن مژدەیان دا بە ئیبراهیم، خودای گەورە باسی ئیبراهیم پێغەمبەر دەکا (سەلامی خوای لێبێ) کە فریشتەکان مژدەیان دایە، هەندێ گوتویانە: بە ئیسحاق، هەندێکی تر گوتویانە: بە قڕکردنی هۆزی لووت، ئەم ئایەتە شایەتە لەسەر ڕای یەکەم ﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ﴾[1] ئیبراهیم (کە ترسی شکاو مزگێنیەکەشی پێ گەیشت) لەسەر هۆزی لووت گفتوگۆی لەگەڵ

[1] هود (٧٤).

کردین، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ﴾ گوتیان: سەلامی خوات لێبێ، ئەویش گوتی: سەلامی خوایش لە ئێوە. زانایانی ڕەوانبێژی ئەڵێن: ئەمە چاکترین شێوەی وەلام دانەوەی سەلامە. چونکە ئەو مەرفوعیە بەڵگەیە لەسەر مانەوەو بەردەوامی، ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ﴾ زۆری پێ نەچوو گوێرەکەیەکی برژاوی هاورد. واتە: بەپەلە ڕۆشتو سفرەیەکی باشی بۆ ڕازاندنەوە کە گوێرەکەیەکی لەسەر بەرد برژاوی بۆ هێنان، ئەمە ئەو مانایە کە ڕیوایەت کراوە لە قەتادەو ئیبنوعەبباس و کەسانی تریشەوە.[1] وەك لەم ئایەتانەی تریشدا فەرموویەتی: ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ ٢٦ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ﴾[2] واتە: بە پرنامەکی خۆی گەیاندە خاوخێزانیو گوێرەکەیەکی قەڵەوی هێنا، وەختێ کە لێی نزیك کردنەوە گوتی: لەبەر چیە ناخۆن؟! ئەم ئایەتە چەند ئادابێکی میوانداری تێدایە لە چەند ڕووەوە ﴿فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ﴾ وەختێ دی دەستیانی بۆ درێژ ناکەن، کارەکەیانی بەلاوە سەیر بوو ترسی لێنیشت، چونکە فریشتە گوێیان لە خواردن نیەو حەزی لێناکەنو نایخۆن، بۆیە کە چاوی پێیان کەوت ڕوویان لە خواردنەکە نەکردو هیچ گرنگیەکیان پێنەدا، ئا لەو کاتەدا زۆر بەلایەوە سەیر بوو، ترسی لێنیشت، سودی ئەڵێ: وەختێ خودای مەزن فریشتەکانی نارد بۆ سەر هۆزی لووت، لە شێوەی کۆمەڵێ لاوی تازە پێگەیشتوودا بوون هاتن، چوونە مێوانداری ئیبراهیم، ئەویش زۆر چاك میوانداری لێ کردن، بەپەلە ڕۆشت بۆلای خاوخێزانیو گوێرەکەیەکی قەڵەوی هێناو سەری بڕی، پاشان لەسەر بەردی گەرم بۆی برژاندنو کردیە بریانیو بۆی هێنانو خۆیشی لەگەڵیاندا دانیشتو خواردنەکەی لێ نزیك کردنەوەو گوتی: بۆچی ناخۆن؟ فریشتەکان گوتیان: ئەی ئیبراهیم، ئێمە هیچ خواردنێك ناخۆین (بە نرخی) نەبێ، ئیبراهیمیش گوتی: ئەم خواردنە نرخی خۆی هەیە، گوتیان: نرخەکەی کامەیە؟ گوتی: ناوی خودا دەهێنن لەسەرەتای دەستپێکردنیەوەو سوپاسی خوداش دەکەن لە کۆتایەکەیدا، جوبرەئیل سەیری میکائیلی کردو گوتی: ئەمە هەقی خۆیەتی کە خودا کردوویەتی بە خەلیلی خۆی ﴿فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ﴾ وەختێ چاوی پێیان کەوت دەستیانی بۆ درێژ ناکەنو لێی ناخۆن ترسی لێنیشت، کاتێ (سارە) سەیری کرد کە ئیبراهیم چەندە ڕێزیان لێدەگرێ، خۆیشی خەریکی خزمەتکردنیانە، پێکەنیو گوتی: ئەم میوانانەمان سەیرن، ئێمە خەریکی خزمەت کردنیانین زۆر ڕێزیان

---

[1] الطبري (٣٨٢/٣٨٤).

[2] الذاريات (٢٦-٢٧).

لێ دەگرین کەچی خواردنەکەمان ناخۆن.[1] خودای مەزن باسی فریشتەکان دەکاو ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ﴾ گوتیان: تۆ مەترسە ئێمە بۆلای هۆزی لووت بەرێ کراوین تا لەناویان بەرین، سارە پێکەنی کە مژدەی لەناوچوونی هۆزی لووتی بیست، چونکە زۆر خراپەکارو خوانەناس بوون هەر بۆیەخوای گەورە ئەوپاداشتەی دایەوە بەوەی مژدەی منداڵێکی پێدا پاش ئەو بێئومێدبوونەی خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾ ژنەکەی کە بە پێوە وەستا بوو پێکەنی، ئەوسا مزگێنیمان پێدا بە ئیسحاقو دوای ئیسحاقیش بە یەعقوب، واتە مژدەمان دا بە ئیبراهیم بە منداڵێ کە ئەو منداڵە نەوەو وەچەی زۆری لێ دەبێتەوە، چونکە یەعقوب کوڕی ئیسحاق بوو. وەك خودای مەزن لە سورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِۦمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾[2] واتە: (ئەی خاوەن نامەکان) ئایا ئێوە ئامادە بوون کاتێ کە یەعقوب لە سەرە مەرگدا بوو کاتێ بە کوڕەکانی ووت دوای من کێ دەپەرستن؟ ئەوانیش وتیان: خوای تۆو خوای باوو باپیرانت دەپەرستین کە ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقە کە تاکە خوایە وە ئێمە فەرمانبەرداری ئەوین. ئا لێرەدا ئەوانەی کە بەڵگەیان هێناوەتەوە، ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە سەربڕاوەکە ئیسماعیل بووە، چونکە ناشێ ئەو سەربڕاوە ئیسحاق بێ، لەبەر ئەوەی مژدەی پێدراوە کە بەو زوانە یەعقوبی بۆ لەدایك دەبێ، کەوایە چۆن فەرمان دەکرێ بە ئیبراهیم کە سەری ببڕێ کە منداڵێکی بچوکەو کە هێشتا ئەو یەعقوبەی کە بەڵێن دراوە پێی، لەدایك نەبووە! خۆ بەڵێنی خودایش هەقەو گومانی تێدا نیە کە دێتە دی، ناشبێ فەرمان بدرێ بەسەر بڕینی ئەم منداڵە لەو کاتەدا، کەوا بوو دەبێ ئەو کەسە هەر ئیسماعیل بێ، ئەمەیش چاکترینو ڕاستترینو ئاشکراترین بەڵگەیە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ﴾ ژنەکە گوتی: ئۆی لە من، ئاخۆ منی پیرێژن منداڵم دەبێ لەکاتێکدا ئەم شوەشم پیرەمێردە؟ بەڕاستی شتێکی سەیرە لەم ئایەتەدا قسەی ژنەکە دەگێڕێتەوە، وەك چۆن لە ئایەتێکی تردا باسی هەڵوێستی دەکاو ئەفەرموێت: ﴿فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ

---

[1] الطبري (١٥/٣٨٩).

[2] البقرة (١٣٣).

﴿عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾[1] ژنەکەی بە هاوارەوە هات بەدەمو چاوی خۆیدا ئەکێشاو گوتی: من پیرێژنێکی نەزۆکم. وەك لە ژناندا ئەم حاڵەتە ڕوودەدات لە قسەو هەڵسو کەوتیاندا لەکاتی سەرسوڕماندابەخۆیاندا ئەکێشن، ﴿قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ﴾ گوتیان: کاری خواتان پێ سەیرە؟ واتە: فریشتەکان پێیان گوت: لەکاری خودا سەرتان سوڕ نەمێنێ، چونکە خودا مەیلی لە هەر شتێ بێ فەرمووی ببە! دەبێ، کە تۆ پیرێژنێکی زکو زا ناکەیو مێردەکەیشت پیر بووە سەرت سوڕ نەمێنێ، خودا هەر شتێکی بوێ دەتوانێ بیکا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ﴾ خێزانی ئەم ماڵە بەزەییو پیتی خوداتان بەرکەوێ، پایە بەرزیو ستایش هەر شایەنی خودایە. واتە: ئەو شایەنی سوپاسە لە هەموو کردارو گفتارێکیا پایە بەرزو سوپاس کراوە لە سیفاتو زاتیا، بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: کە گوتویانە: ئێمە زانیمان چۆن سڵاوت لێ بکەین بەڵام چۆن دووعات بۆ بکەین ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: بڵێن خودایە سڵاوات بدە لەسەر موحەممەدو ئەهلو بەیتی موحەممەد، وەك چۆن سڵاواتت داوە لەسەر ئیبراهیمو ئەهلو بەیتی ئیبراهیم، وە بەرەکەتی خۆت بڕێژە بەسەر موحەممەدو ئەهلو بەیتی موحەممەد وەك چۆن بەرەکەتی خۆت ڕێژاوە بەسەر ئیبراهیمو ئەهلو بەیتی ئیبراهیم، بەڕاستی تۆ پایە بەرزیو پیاهەڵدان هەر لە خۆت دەوەشێتەوە[2].

﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٞ مُّنِيبٞ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ ﴿٧٦﴾﴾

### مشتومڕی ئیبراهیم لەسەر هۆزی لووت

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ﴾ واتە: ئیبراهیم کە ترسی شکاو مزگێنیەکەشی پێگەیشت (لەسەر هۆزی لووت سکاڵای لەگەڵ کردین. خودای گەورە باسی ئیبراهیم دەکا، کاتێ کە ترسەکەی نەما، واتە: لە فریشتەکان ترسا کاتێ بینی دەست نابەن بۆ خواردنەوکەو لێی ناخۆن، پاشانیش مژدەی منداڵێکیشیان پێداو هەواڵی قڕ کردنی هۆزی لووتیان دایە، دەستی کردە گفتوگۆ لەگەڵ فریشتەکان لەبارەی هۆزی لووتەوە، وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا ئەڵێت: کاتێ جوبرەئیل لەگەڵ ئەو فریشتانەی لەگەڵی بوو هاتن بۆلای ئیبراهیم

[1] الذاريات (٢٩).

[2] فتح الباري (٤٦٩/٦)، مسلم (٣٠٥/١).

گوتیان: ﴿إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾[1] دەبێ خەڵکی ئەم شارە قڕ بکەین ئیبراهیم پێی گوتن: ئایا شارێ قڕ دەکەن کە سێ سەد موسوڵمانی تێدا بێ؟ گوتیان: نەخێر، ئایا شارێ قڕ دەکەن کە دوو سەد موسوڵمانی تێدابێ؟ گوتیان: نەخێر؟ گوتی: ئایا شارێ قڕ دەکەن کە چل موسوڵمانی تێدابێ؟ گوتیان: نەخێر، گوتی: ئەی(٣٠) سی موسوڵمان؟ گوتیان: نەخێر: هەتا گەیشتە پێنج موسوڵمان، گوتیان: نەخێر، ئایا ئەو شارە یەك موسوڵمانی تێدابێ قڕی دەکەن؟ گوتیان: نەخێر، ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ) ئا لەوێدا گوتی: ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ﴾[2] ئێمە باشتر دەزانین کێی لێیە، خۆیی و خاوخێزانی ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەی. پاشان وازی لێ هێنان و بێ دەنگ بوو لێیان[3]. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٞ مُّنِيبٞ﴾ بێگومان ئیبراهیم لەسەر خۆو دڵنەرم و ڕوو لە خودا بوو. خودای گەورە بەم سیفەتە جوانانە وەسفی ئیبراهیمی کرد. پاشان فەرمووی: ﴿يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ﴾ ئیبراهیم واز لەمە بێنە، فەرمانی خودات هاتووە بێ گومان بەلایەکی بێگەڕانەوەیان بۆ دێ. واتە: بڕیاری خودا دراوەو دەبێ هەر لەناو بچن و ئەو سزای خودایە بەسەر ئەو تاوانبارانەدا دابباری و گەڕانەوەی نیە.

﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَصِيبٞ ٧٧ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ٧٨ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ٧٩﴾

**هاتنی فریشتەکان بۆلای لووت و دۆژدامانی لووت و ئەو وتووێژەی لەنێوان لووت و هۆزەکەیا ڕوویدا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا﴾ کاتێ ڕاسپاردەکانمان گەینە لای لووت، بە گەیشتنیان (لووت) دۆژداما و پێیان کەوتە تەنگانەوە. خودای گەورە باسی گەیشتنی فریشتەکان دەکا، دوای ئەوەی کە ئیبراهیمیان ئاگادار کرد بە لەناوچوونی هۆزی لووت، ئیبراهیمیان بەجێهێشت و پێیان گوت کە ئەم شەو هۆزی لووت قڕ دەکرێن، لای ئەو هەڵسان و چوونە لای لووت (سەلامی خوایان لێبێ) وەك گوتراوە چوونە ئەو شوێنەی لووتی لێ بوو، هەندێکی تر

[1] العنکبوت (٣١).

[2] العنکبوت (٣٢).

[3] الطبري (١٥/٤٠٣).

گوتوویانە: لە ماڵەکەی خۆیدا چوونە لای لووت لە جوانترین لە شێوەی گەنجانێکی زۆر شێوە شیرینا، تاقیکردنەوەیەکی خودا بوو، کارەکانی پڕە لە کارزانی، بە بینینیان زۆر نیگەران بوو، دڵتەنگی ڕووی تێکرد ترسا لەوەی ئەگەر میوانداریان لێ نەکا، یەکێکی تر لە هۆزەکەی میواندایان لێ بکاو بە خراپە لەگەڵیاندا بجولێتەوە ﴿ وَقَالَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَصِيبٞ ﴾ گوتی: ئەمڕۆ کار دژوارە، ئیبنوعەبباس و کەسانی تریش ئەڵێن: بەلای ئەمڕۆژەزۆر سەخت و دژوارە.[1] چونکە زانی کە بەرگریان لێ دەکا، ئەوەی زۆر بەلاوە گران بوو، قەتادەئەڵێ: ئەوانە هاتن بۆلای ئەو لەناو زەویەکی خۆیدا بوو.[2] داوای میوانداریان کرد لێ ی،ئەویش شەرمی کرد لێیان وپێشیان کەوت ، لەکاتی ڕۆشتن بە ڕێدا وەك ناڕازی بوونی لێیان بۆ ئەوەی لە کۆڵی ببنەوەو بڕۆن، گوتی: سوێند بە خودای گەورە: وا نازانم لەسەر ڕووی زەمینا خەڵکی شارێ هەبێ پیس و خراپتر بێ لە خەڵکی ئەم شارە، پاشان کەمێکی تر ڕۆشت، دیسان ئەم قسەی دووبارە کردەوە لێیان و، تا چوار جار ئەم قسەی هەر دەگوتەوە. قەتادەئەڵێ: ئەو فریشتانە فەرمانیان پێکرا بوو کە ئەومیللەتە قڕ نەکەن تا پێغەمبەرەکەیان شایەتیان لێ نەدا لەسەر ئەوە[3].

﴿ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ هۆزەکەی بە پەلە لێی کۆبوونەوە، لە پێشا کاریان هەر بێناموسی بوو، لەسەر ئەو بێ ناموسیە هەر بەردەوام بوون هەتا خودا لەسەر ئەو حاڵە لەناوی بردن، ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ ﴾ ئەی هۆزەکەم! ئەو کچانەم ببەن بۆ خۆتان، پاکترن و حەڵاڵن بۆتان، ڕێنمایی کردن بۆلای ژنەکانی هۆزەکەی، چونکە پێغەمبەری هەر ئوممەتێك لە جێی باوکە بۆیان، بۆیە ڕێنمایی کردن بۆ شتێ کە زۆر چاکە بۆیان لە دنیاو لە قیامەتا، وەك لە ئایەتی ترا خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَتَأۡتُونَ ٱلذُّكۡرَانَ مِنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٥ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٌ عَادُونَ﴾[4] ئێوە بۆچی لەناو هەموو خەڵکی دنیا پەلاماری نێر ئەدەن؟ لە ژنەکانتان واز دێنن، کە خودا بۆ ئێوەی دروست کردوون، ئێوە هۆزێکی لە ئەندازە لادەرن. وە لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٠ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ٧١ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[5] گوتیان: ئەی پێمان نەگوتی، نابێ کەس نزیکت بکەوێ، (لووت)

---

[1] الطبري (١٥/٤١١).
[2] الطبري (١٥/٤٠٨).
[3] الطبري (١٥/٤٠٨).
[4] الشعراء (١٦٥-١٦٦).
[5] الحجر (٧٠-٧٢).

گوتی: ئەوە کچەکانم چیتان دەوێ وەرن لەگەڵ ئەوانا بیکەن، سوێند بە گیانی تۆ، ئەوانە لەبەر سەرخۆشی سەرگەردان بوون. موجاهیدئەڵێ: لەم ئایەتەدا ﴿هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡ﴾ ئەوانە کچی ئەو نەبوون، بەڵکو ئەوانە لە ئوممەتەکەی بوون، هەموو پێغەمبەرێ باوکی ئوممەتەکەیەتی.[1] هەر بەو شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە قەتادەو کەسانی تریشەوە.[2] پاشان خودای مەزن لەسەر زمانی لووت پێغەمبەر فەرموویەتی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ﴾ لە خوا بترسن‌و شەرمەزاری میوانەکانم مەکەن، ئایا پیاوێکی ئاقڵ وڕەشیدتان تێدا نیە؟. واتە: داواکەم قەبوڵ بکەن‌و واز بێنن‌و لەگەڵ ژنەکانتاندا ئەو کارە بکەن. ئایا پیاوێکی بە ئابڕووتان تێدا نیە ئەوەی من فەرمانتان پێدەکەم پێی هەڵسن‌و ئەوەیش دەڵێم وازی لێ بێنن نەیکەن. ﴿قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ گوتیان: خۆ ئەمەت زانیوە، هیچ کارێکمان بە کیژەکانی تۆ نیە، دیارە خۆت باش دەزانی چیمان دەوێ. واتە: ئێمە ئارەزووی ژنەکانمان نیە خۆت چاك دەزانی، کارمان پێیان نیە، تەنیا هەر حەزمان لە نێرینەیە، ئیتر پێویست بەوە ناکا ئەم قسانەمان لەگەڵا دووبارە بکەیتەوە!

﴿قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ٨٠ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ٨١﴾

## بێدەستەڵاتی لووت‌و خۆزگە خواستن بۆهێزێك‌و هەواڵی فریشتەکان پێی بە لەناوبردنیان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ﴾ (لووت) گوتی: خۆزگە هێزم بە ئێوە بشکایە، یان پەنام ببردایە بە شوێنێکی قایم، خودای گەورە باسی پێغەمبەرەکەی لووت دەکا (سەلامی خوای لێبێ) کە هەڕەشەی لە هۆزەکەی کردو گوتی: ﴿لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً﴾ واتە: ئەگەر چارم بکردنایە، خراپم بەسەر دەهێنان‌و بە خۆم‌و کەس‌وکارەکەمەوە کارێکم پێدەکردن بە هیچ کەسێ نەکرایە، بۆیە لەم فەرموودەیەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە لووت بێ، ئەو پەنای برد بۆ جێ پەنایەکی زۆر بەهێز یانی: خودای مەزنی باڵادەست، دوای ئەوە خواهیچ پێغەمبەرێکی نەئەناردبێکەس بوایەو لەناو نەتەوەکەیداپشتی نەبوایە)

---

[1] الطبري (١٥/٤١٤).

[2] الطبري (١٥/٤١٣).

، تا لەو کاتەدا فریشتەکان هەواڵیان دایە کە ئەوان ڕاسپاردەی خودان بۆ سەر هۆزەکەی‌و دەستی ئەوانەت پێ ناگا. ﴿قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَ﴾ گوتیان: ئەی لووت ئێمە ڕاسپاردەی پەروەردگاری تۆین، دەستی ئەمانەت پێ ناگا. فەرمانیان پێکرد کە لە کۆتایی ئەو شەوەدا بە خۆی‌و خاوخێزانیەوە بەڕێکەون‌و دەرچن، خۆی لە دوایانەوە بڕوات، ﴿وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ﴾ کەستان ئاوڕ نەداتەوە کاتێ کە گوێی لەو بەلایە بوو، بەسەریاندا دێت، ئەو دەنگانە هەراسانتان نەکا، بەردەوام هەر بڕۆن‌و مەوەستن ﴿إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡ﴾ جگە ژنەکەت، کە هەرچی تووشی ئەوان بێ، تووشی ئەویش دێ. زۆربەی زانایان گوتویانە: یانی: بە شەو نایەت‌و لەگەڵت ناڕوات، بەڵکو لە ماڵی خۆی دەمێنێتەوە‌و لەناو دەچێ، هەندێکیش گوتەیانە، یانی: ژنەکەت لادەکاتەوە. ئەمانە دەڵێن ژنەکەی لووت لەگەڵیاندا دەرچوو، کاتێ گوێی لە دەنگەکە بوو لای کردەوە‌و گوتی: ئەی هاوار بۆ هۆزەکەم، لەپڕ بەردێکی لە ئاسمانەوە بۆ هات‌و کوشتی، پاشان فریشتەکان قڕ بوونی هۆزەکەیان نزیك پیشان ئەدا، وەك مژدەیەك بۆلووت، چونکە لووت بە فریشتەکانی گوت هەر ئێستا لەناویان بەرن، فریشتەکان گوتیان وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ﴾ بێگومان کاتی لەناوبردنیان بەیانیە، ئایا بەیانی نزیك نیە ؟بەڵێ، کەس‌و کاری لووت لەبەردەرگای ماڵدا بوون‌و وەستا بوون، ئەو خەڵکەش بەپەلە لە هەموو لایەکەوە هاتن، لووت پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێبێ) لەبەر دەرگاکەی خۆیدا وەستا بوو، بەری گرتبوون‌و پاڵی پێوەدەنان‌و داوای لێدەکردن واز لەو کارە ناشیرینە بێنن، بەڵام ئەوان بە قسەکانی ڕازی نەدەبوون، بەڵکو هەڕەشەیان لێدەکرد،ئەوەبوو لەو کاتەدا جوبرەئیل هاتە دەرەوە بۆیان‌و بە باڵی دای بە دەم‌وچاویانداو کوێری کردن‌و گەڕانەوە‌و ڕێگایان لێ تێك چوو بوو. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾[2] ویستیان کاری خراپ لەگەڵ میوانەکانی بکەن، کوێرمان کردن، دە بچێژن ئازارو هەڕەشەکانم.

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾﴾

---

[1] الترمذي (٣١١٦). فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] القمر (٣٧).

## ژێرو بانكردنی شاری هۆزی لووت و لەناوبردنیان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ كە فەرمانی ئێمە گەیشت، لە كاتی گزنگی خۆردا ﴿جَعَلْنَا عَلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ئەو جێی سەدومەمان سەرەوخوار كرد. وە ئەم ئایەتە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ﴾[1] هەرچی دەبوو داپۆشریٚ داپۆشرا، واتە: بەردەبارانمان كردن بە وردە زیخی گڵێنی، ئیبنوعەبباس و كەسانی تریش دەڵێن: (السجّيل) بە فارسی یانی وردە بەردی گڵێنی[2]. هەندیٚ گوتویانە: (من سَنْك) یانی لەبەرد، (وكِلْ) یانی لە قوڕ[3]، وە لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿حِجَارَةً مِّن طِينٍ﴾[4] واتە: لە بەردی قوڕین. واتە: لە قوڕێكی ڕەقی توندو تۆڵ. هەندێكی تر گوتویانە: لە گڵی برژاو (سوركراوە)، بوخاری ئەڵیٚ: ﴿سِجِّيلٍ﴾ یانی بەردی ڕەق و گەورە(گابەرد) ،(سجيل) و (سجين)یەكشتن ونون ولام خوشكی یەكترین[5]،تەمیمی كوڕی موقبلیش ئەڵیٚ:

ورجلة يضربون البيض ضاحية ضرباًتواصت به الابطال سجيناً

﴿مَّنضُودٍ﴾ بە بەردەوامی دەباریٚ بەسەریاندا، هەندیٚ گوتوویانە: ﴿مَّنضُودٍ﴾ یانی: ئامادەكراو لە ئاسماندا بۆ ئەو مەبەستە، هەندێكی تریش گوتوویانە: ﴿مَّنضُودٍ﴾ یانی: بەدوای یەكا دەباریٚ بەسەریاندا، ﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾ بە دروشمی پەروەردگارت هەموو ئەو بەردانە نیشانە كرا بوون، بەلاّی ئاوا لە ستەمكاران هیچ دوور نیە، ﴿ مُّسَوَّمَةً ﴾ واتە: فێركراوە و ناوی خاوەنەكەی لەسەر مۆر كرابوو، هەر بەردیٚ ناوی ئەو كەسەی لەسەر نوسرا بوو كە بۆی دەهات. قەتادەو عیكرمە دەڵێن: ﴿ مُّسَوَّمَةً ﴾ هەڵقەیەكی لە ڕەنگی سوور پێوە بوو.[6] گێڕاویانەتەوە كە ئەو بەردانە داباریوە بەسەر خەڵكی ئەو شارەداو ئەوانەیش كە بڵاوەیان كردبوو بەو گوندانەی دەوروبەریا، كاتیٚ یەكیٚ لەوانە لەلای خەڵكیا قسەی دەكرد لەپڕ بەردێك لە ئاسمانەوە بۆی دەهات لە نێوان ئەو خەڵكەدا لێی ئەداو دەیكوشت، ئەو بەردانە بە شوێنیاندا دەگەڕا لە وڵاتەكانی تریشا هەتا هەمووی

---

[1] النجم (٥٤).
[2] الطبري (١٥/٤٣٤).
[3] سەنگ یانی (بەرد) و(گل) یش یانی قوور،بەلاّم دیارە(حافزئیبن كەسیر)فارسی نەزانیوەبۆیە ووشەكانی بەهەڵە نوسیوە(وەرگێڕ).
[4] الذاريات (٣٣).
[5] فتح الباري (٨/٢٠٢).
[6] الطبري (١٥/٤٣٨).

لەناوبردنو بنە بڕی کردن، تاقی لێ بڕین ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ وە ئەو (سزایە) دوور نیە لە ستەمکارانەوە. ئەوانەی کە هەڵدەسن بەو کارە ناشرینە. وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە ڕیوایەت کراوە لە سونەنەکاندا لە ئیبنوعەبباسەوە بە مەرفوعی: (هەر کەسێکتان بینی هەڵسا بە کاری هۆزی لووت، بکەرو بدەر بکوژن)[1].

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾﴾

**بەسەرهاتی مەدیەنو بانگەوازی شوعەیب بۆیان**

خـــودای مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ بۆ مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان نارد، گوتی: کەسەکانم! خودای تـەنیا بپەرسـتن، جگـە لـەو هیچ پەرستوویەکتان نیە. خودای گەورە فەرموویەتی: شوعەیبی ناردووە بۆ مەدیەن، کە هۆزێك بـوون لە عەرەب کە لە نێوان حیجازو شامدا نیشتەجێ بوون، لە شاری مەعانەوە نزیك بوون، ولاتێك بـوو کە پێی ناسرابوون پێی دەگوترا مەدیەن، خودا شوعەیب پێغەمبەری بۆ ناردن (سـەلامی خـوای لێبـێ) لـە بنەماڵەیەکی گەورە بوو لەناویاندا، بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ شوعەیبی برایـان، فەرمانی پێدەکردن کە بەتەنیا خودا بپەرسـتن کـە شـەریکی نیـە، ﴿وَلَا تَنقُصُوا ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ﴾ لە کێشانەو پێوانەدا گزی مەکەن، ژیانتان باش دەبینم.﴿وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ﴾ مـن لـەو ڕۆژە دەترسم ئـازاری گرانتـان بـۆ بـێ. واتـە: مـن دەترسـم خـودا ئـەو خۆشیەتان لێ تێك بدا، کە پێی داون لەسەر بەزاندنی ئەو سنورانەی لە دنیاداو ئازاری گرانیشتان بدا لە ڕۆژی دوایدا.

﴿وَيَـٰقَوْمِ أَوْفُوا ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾﴾

خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَيَـٰقَوْمِ أَوْفُوا ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ کەسەکانم! کێشانەو پێوانەت بـا بەرامبـەر بـێ، شـتیش کـەم مەدەن بە خەڵك، لە دنیادا لەسەر بەدفەڕی بەردەوام مەبن. یەکـەم جـار داوایـان لێ دەکـا کـە

[1] أبوداود (٤٤٦٢)، الترمذي (١٤٥٦)، إبن ماجة (٢٥٦١).

واز بێنن لە گزی کردن لە کێشانەو پێوانەداو دادپەروەربن، لە کاتی کڕینو فرۆشتنا لەگەڵ خەڵکیا، داوایشی لێ کردوون کە دەست نەدەنە خراپەکاریو بەدفەڕی لەسەر زەمینا، چونکە ئەوانە سەرە ڕێیان لە خەڵکی دەگرت، پاشان لەسەر زمانی شوعەیب خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕواتان بە خودا بێ، ئەوەی خودا بۆتان بهێڵێتەوە چاکترە بۆتان، ئیبنوجەریرئەڵێ: ئەوەی بۆتان دەهێڵێتەوەو بەدەستی دێنن لەو کێشانەو پێوانەدا زۆر چاکترە بۆ ئێوە لە گزیکردنو خواردنی ماڵی خەڵکی.[1] لە ئیبنوعەبباسیشەوە بە هەمان شێوە ڕیوایەت کراوە. منیش دەڵێم: ئەمە لەم فەرمودەی خوادەچێ[2] کە فەرموویەتی: ﴿قُل لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ﴾[3] بڵێ: پیسو پاك وەك یەك نین، با زۆرایی پیسیەکەیش سەرسوڕهێنەر بێت بۆت ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾ من چاودێر نیم بەسەرتانەوە، ناتوانم پارێزگاریتان لێ بکەم، خواتان لەبیر بێ لە کێشانەو پێوانەدا، گزی لە کەس مەکەن، بۆ ئەوەیش مەیکەن خەڵکی بتانبینێ ،لە خودا بترسن.

﴿ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُا۟ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ ﴾

### وەڵامی هۆزی شوعەیب

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ ﴾ کوتیان: ئەی شوعەیب، ئایا نوێژەکەت هانتئەدات ئێمە واز لەو شتە بێنین کە بابو باپیرانی ئێمە دەیانپەرست، هۆزی شوعەیب بە گاڵتە پێکردنەوە دەیانکوت بە شوعەیب ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ﴾ ئەعمەش ئەڵێ: خوێندنەوەکەت فەرمانت پێدەکا کە ئێمە واز لە پەرستنی بتەکانمان بێنین، ﴿أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُا۟﴾ یان وەك خۆمان دەمانەوێ لە سامانی خۆماندا دەسکاری نەکەین، واز لە ترازوبازی بێنینو بە ئارەزووی خۆمان کاروکاسپی نەکەین لەسەر قسەی تۆ، حەسەن ئەڵێ لەم ئایەتەدا ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ ﴾بەڵێ: سوێند بە خودا، نوێژەکەی فەرمانیان

---

[1] الطبري (١٥/٤٤٧).

[2] الطبري (١٥/٤٤٧).

[3] المائدة (١٠٠).

پێیەكات واز بێنن لەوەی كە باب‌و باپیرانیان دەیانپەرست.[1] سەوریش لەم ئایەتـەدا ﴿أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ﴾ئـەڵێ: مەبەستیان پێـی زەكاتـە. ﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴾ بەڕاستی تـۆ پیـاوێكی لەسـەرخۆو بـە سـەلیقەی. ئیبنوعـەبباس‌و مـەیمونی كـوڕی میهـران‌و ئیبنوجـورەیج‌و ئیبنوئەسلەف‌و[2] ئیبنوجەریرئەڵێن: ئەو قسەیان بە شێوەی گاڵتەجاڕی دەگوت بە شوعەیب خوا ڕوویان ڕەشكاو بێبەش بن لە بەزەیی خودا. بێگومان خودا ڕووی ڕەش كردن‌و بەر لەعنەتی خۆشی خستن.[3]

﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾

**وەڵامی شوعەیب بۆ هۆزەكەی**

خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗا﴾ شوعەیب گوتی: گەلەكەم، ئەگەر بڵێم بەڵگەیەكی بەهێزم لە پەروەردگارمـەوە لەلایە، هـەر ئەویشە ڕۆزی باشی پێ داوم چۆن دەبینن؟ واتـە: شـوعەیب پێیـان دەڵێ، ئەگـەر بڵێم بەڵگەیەكی زۆر ڕوونم لەلایەن خوداوە پێیە بۆتان، بە بەرچاو ڕوونیش ئێوەی بۆ بـانگ دەكـەم ﴿وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗا﴾ گـوتراوە مەبەسـت پێی پێغەمبەریەتییـە، گوتراویشە: مەبەست پێـی ڕۆزی حەڵاڵـە، هـەردوو ماناكـە هەڵدەگرێ، ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُ﴾ من هەرگیز نامەوێ پێچەوانەی ئێوە بكـەم لەو كارەی بەرگری ئێوەی لێ دەكەم. واتە:بەرگریتان لێناكەم لەكارێك كەخۆم بە پـەنهانی بیكـەم دوور لەچـاوی ئێـوە.هـەروەك قـەتادە لێـرەدا ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُ﴾ دەڵـێ: مـن بەرگریم نەكردووە لە كـارێ كـە خـۆم كـردبێتم.[4] ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُ﴾ نیـازی مـن هـەر ئەوەیە تا دەتوانم كاروبارتان بۆ ڕێك بخەم لەو شتانەی كە فـەرمانتان پـێ دەكـەم‌و داواتـان لێ دەكـەم وازی لێ بێـنن، ﴿وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ بـە ئـاوات گەیشتنیـشم هـەر بـە یارمـەتی

---

[1] الطبري (١٥/٤٥١).
[2] الطبري (١٥/٤٥٣).
[3] الطبري (١٥/٤٥٣).
[4] الطبري (١٥/٤٥٣).

خودایەو خۆیشم هەر بە ئەو سپاردوەو بەرەو خۆشی دەگەڕێمەوە. واتە: هەر بە هیوای یارمەتی خودام لە بەرەو هەق ڕۆشتنما لە هەموو ئیش‌و کارێکاو بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە[1].

﴿وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ۝٨٩ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ۝٩٠﴾

خودای مەزن لەسەر زمانی شوعەیب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) ئەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ﴾ دژایەتی ئێوە بەرانبەری من تووشی تاوانێکتان نەکا، کە ئەو بەڵای هۆزی نووح‌و هۆزی هودو هۆزی سالح بەسەریان هات بەسەرئێوەشدا بێ، بەسەر هاتی هۆزی لووتیش زۆر دوور نیەلێتانەوە. واتە: ڕق‌و کین‌و دوژمنایەتی واتان لێ نەکا کە بەردەوام بن لەسەر بەدفەڕی‌و خوانەناسی وەك هۆزی نووح‌و هوودو هۆزی سالح‌و هۆزی لووت تووشی سزاو تۆڵەی سەختی خودا ببن، قەتادەئەڵێ: ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ﴾ شوعەیب گوتی: جیابوونەوەتان لە من واتان لێ نەکا.[2] سوودی ئەڵێ: دوژمنایەتیکردنی من. واتان لێ بکا بەردەوام بن لەسەر گومڕایی‌و خوانەناسی کە تووشی بەڵا ببن وەك چۆن ئەوانە تووشی بەڵا بوون، لە دوایدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ﴾ گوتراوە: مەبەست پێی لەو کاتەدا. قەتادەئەڵێ: یانی بێگومان لەناوچوونی هۆزی لووت لەبەردەمتانایە دوێنێ ڕوویداوە. گوتراویشە: مەبەست پێی لەو شوێنەدا، هەردوو ماناکەش هەڵدەگرێ. ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ﴾ ئێوە لە پەروەردگارتان داوای لێبوردن بکەن، پاشان بەرەو خۆی بگەڕێنەوە پەروەردگارم دلۆڤان‌و میهرەبانە. واتە: داوای لێبوردن بکەن لە خودا لەو گوناهانەی لە پێشا کردووتانە، ئەو گوناهانەیش کە لەمەوبەدوا دەیکەن چونکە خودا زۆر دلۆڤان‌و میهرەبانە بەرانبەر ئەو کەسانەی پەشیمان دەبنەوە لە گوناه.

﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ۝٩١ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ۝٩٢﴾

---

[1] الطبري (١٥/٤٥٤).

[2] الطبري (١٥/٤٥٥).

**وەڵامی هۆزەکەی جارێکی تر بۆ شوعەیب**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ﴾ ئێمە زۆر لەو شتانە تێناگەین تۆ دەیلێیت، سەوری ئەڵێ: بە شوعەیب دەگوترا وتار بێژی پێغەمبەران.[1] ﴿وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾ لەناو خۆماندا بە بێدەستەڵاتت دەزانین. سودی ئەڵێ: یانی تۆ تەنیا کەسێکی، ئەبورەوق ئەڵێ: یانی: تۆداماوی. چونکە کەس‌وکارەکەت لەسەر ئایینی تۆ نین، ﴿وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَـٰكَ﴾ ئەگەر لەبەر خاتری خزمەکانت نەبوایە کە بەڕێزن لای ئێمە بەردەبارانمان دەکردی، هەندێ دەڵێن: بە بەرد، هەندێکی تر گوتوویانە: پڕ جوێنمان دەکردی. ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ تۆ چاری ئێمەو پێ ناکرێ.

**وەڵامی شوعەیب بۆ هۆزەکەی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ گوتی: هۆزەکەم! ئایا خزمەکانی منتان پێ لە خودا گرنگترە؟ ئایا لەبەر خزمەکانم وازم لێ دێننو (ئازارم نادەن) لەبەر خاتری خودای مەزن وازم لێ نایەنو ئازاری پێغەمبەرەکەیشی ئەدەن؟ ﴿وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا﴾ لە کاتێکا فەرمانەکانی خواتان پشتگوێ خستووەو بە گەورە سەیری ناکەن ﴿إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ بێگومان هەر کارێ ئێوە دەیکەن پەروەردگارم لێی ئاگادارە.

﴿وَيَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ ۖ وَٱرْتَقِبُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَـٰرِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾﴾

**هەڕەشەکردنی شوعەیب لە هۆزەکەی**

کاتێ کە پێغەمبەر شوعەیب بێ هیوا بوو لەوەی کە وەڵامی بدەنەوەو بڕوا بێنن گوتی پێیان ﴿وَيَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ ئەی هۆزەکەم! ئێوە ئەوەی لە دەستتان دێ بیکەن، ئەمە هەڕەشەیەك بوو شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ) لێی کردن ﴿إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ ۖ وَٱرْتَقِبُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ منیش خەریکی کاری خۆمم، بەو

[1] الطبري (٤٥٨).

زوانە دەزانن کێ ئازاری ئابڕووبەری دێتە سەرو کێ بە درۆزن دەردەچێ، چاوەڕوان بن، ئەوا منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕوانم، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ کە فەرمانی ئێمە گەیشت، لە بەزەیی خۆمانەوە شوعەیبو هاوەڵە باوەڕدارەکانیمان ڕزگار کرد ناهەقانیش نەعرەتەیەك وای گێژو وڕکردن کە هەموویان دەمو دەست هەناسەیان نەدا، واتە: هەموو مردنو دامرکانەوەو جوڵەیان لێبڕا، لێرەدا فەرموویەتی نەعرەتەیەکیان بۆ هات ﴿ٱلصَّيۡحَةُ﴾. لە سورەتی ئەعرافدا کە فەرموویەتی بە بومەلەرزە ﴿ٱلرَّجۡفَةُ﴾. وە لە سورەتی شوعەرادا فەرموویەتی: لە ڕۆژێکی هەورا گڕە بایەکمان لێهەڵکردن ﴿عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِ﴾ ئەمانە یەك کۆمەڵ بوون ئەو ڕۆژە ئەو هەموو بەڵایان بەسەرا دابەزی، بەڵام لە هەموو دەقەکاندا بەپێی ئەو باسەی کە بۆی بشێ هێناویەتی لە سورەتی ئەعرافدا کاتێ خودای مەزن لەسەر زمانی هۆزەکەی شوعەیب فەرموویەتی: ﴿لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ﴾[1] جێی خۆیەتی کە باسی بومەلەرزەی کردووە. ئەو زەمینەی لەرزاند کە ئەوان ناهەقیان تیا دەکردو دەیانویست پێغەمبەرەکەیانی لێ دەرکەن. لێرەیشا کە دەست ئەدەنە قسەی ناشیرنو بێئەدەبی بەرانبەر پێغەمبەرەکەیان، خودای مەزن باسی نەعرەتە (الصیحة) دەکا کە پێی کپکردنەوەو پێی لەناوبردن، وە لە سورەتی شوعەراشدا کاتێ کە هۆزەکەی گوتویانە ﴿فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[2] دەسا ئەگەر تۆ ڕاست دەڵێیت، چەند پارچەیەکمان لە ئاسمانەوە بەسەرا بخەرە خوارێ. خودایش فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾[3] بەو هۆیەوە سزای ڕۆژی هەور گرتنی، بەڕاستی ئەو سزایە، سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بوو. ئەمەیش یەکێکە لە نهێنیە زۆر وردەکان کە خودا خۆی باش دەزانێ سوپاسو ستایش هەر بۆ خودای مەزنە لە هەموو کاتێکا. پاشان فەرموویەتی: ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآ﴾ دەتگوت هەر لەوێشا نەبوونو لەو ماڵانەی خۆشیانا نەژیاون لەوەوپێش، ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ﴾ با بڕۆن خەڵکی مەدیەن وەك

[1] الاعراف (٨٨).
[2] الشعراء (١٨٧).
[3] الشعراء (١٨٩).

هۆزی سەموود ڕۆشتن. هۆزی سەموود هاوسێی هۆزی شوعەیب بوون، لە ماڵەکانیانەوە نزیك بوون، لە بێدینیو ڕێگریشدا لەوان دەچوون، وەك ئەوانیش عەرەب بوون.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ ۖ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾﴾

**بەسەرهاتی مووساو فیرعەون**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾ هـەروەها ئێمـە مووسـامان بـە چـەندین نیشانەی خۆمـانو بەڵگەیەکی ئاشکرا نارد، بۆ فیرعەونو پیاوانی لە دیوانی، ئـەوانیش هـەر گـوێ بـە فـەرمانی فیرعـەون بوون، کە فەرمانی فیرعەونیش دژی ڕاستی بوو. خودای گەورە لێرەدا باسی نـاردنی مووسا دەکـا بـەو نیشانە گەورانەوە بۆلای دارودەستەی فیرعەونو فیرعەون خۆی کە پاشای قیبتیەکان بـوو ﴿فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ﴾ دارودەستەکەی شوێنی بەرنامەو ڕێو شوێنی فیرعەون کەوتن، کەبریتی بـوو سـەر لێشێوانو گومڕایی، ﴿وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾ کە فەرمانو ڕێڕەوی فیرعەون ڕێكو ڕاست نەبوو، بەڵکو ڕێیـەکی خراپو چەوت بوو، بریتی بوو لە نەفامیو گومڕاییو لاساری خوانەناسی، وەك چۆن لـە دنیـادا شـوێنی کەوتبوونو فیرعەون پێشیان کەوتبوو لە ڕۆژی قیامەتیشا هەر پێشیان دەکەوێو سەرۆكو پێشڕەویانە بۆ ناو ئاگری جەهەنم، دەیانباتە ناو ئەو ئاگرەو سزای سەخت دەچێژن تێیدا، فیرعەون خۆیشیّ بەشـی زیاتری بەردەکەوێ لەو سزا سەختە، وەك خودای گەورە فەرموویـەتی: ﴿فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾[1] فیرعـەون بـە گـوێی پێغەمبەرەکـەی نـەکرد، ئەوسا ئێمـەش ئـازارێکی بـەژانمان دا، وە فەرموویـــەتی: ﴿فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِمَنْ يَخْشَىٰ﴾[2] واتـە: کەچـی بـە درۆی زانـیو سەرپێچی کـرد، لەپاشـان پشتی هەڵکردو ڕۆی بەپەلە، ئینجا جادوگەرانی کۆکردەوەو بـانگی کـردنو، ووتـی: مـن پـەروەردگاری هەرە گەورەتانم، ئینجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان، بەڕاستی لەم داستانەدا پەنـد هەیـە

---

[1] المزمل (١٦).

[2] النازعات (٢١-٢٦).

بۆ کەسێ کە لە خوا بترسێ. لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ﴾ لە ڕۆژی قیامەتا پێش دەستەی خۆی دەکەوێو هەموویان دەباتە ناو ئاگر چەند خراپە ئەو جێی ئەوانە تێی دەچن. ئەمە حاڵی ئەو کەسانەیە کە شوێنی فیرعەون کەوتونو ئەو هەموو سزایە دەچێژن، وە خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَـٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾.[1] بۆ هەمووان دوئەوەندەیە بەڵام ئێوە پێ نازانن. خودای مەزن باسی خوانەناسان دەکا کە لەناو ئاگر قسە دەکەنو دەڵێن ﴿رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾[2] دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئێمە دوای ئاغاکانو گەورەکانی خۆمان کەوتین، ئەوان ئێمەیان گومڕا کرد، ئەی پەروەردگاری هەموومان، دووسەرە ئازاریان بدەو زۆر بە لەعنەتیان بکە. لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَـٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ﴾ لەم دنیاو لە ڕۆژی دوایش لەعنەتیان بە شوێنەوەیە ئای لەو خەڵاتە ناشیرینە. واتە: دوای ئەو هەموو سزادانە زۆرەیش لەعنەتی بە دوادا ناردون لە دنیادا ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ﴾ موجاهیدئەڵێ: لە ڕۆژی قیامەتیشا لەعنەتێکی تریان بۆ زیاد کرا بوو بە دوو لەعنەت.[3] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ﴾ئەڵێ: لەعنەتی دنیاو لەعنەتی ڕۆژی دوایش.[4] زەححاکیش هەر وای گوتوە.[5] ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَـٰهُمْ فِى هَـٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ﴾[6] کردمانن بە پێشەوایانێك کە بانگ بۆ ناو ئاگر دەکەنو ڕۆژی قیامەتیش هیچ کەس بە هانایانەوە نایە، هەر لەم دنیایەدا لەعنەتمان بە دوادا ناردنو ڕۆژی قیامەتیش ڕووڕەشی یان بۆ دەمێنێتەوە، وە فەرموویەتی: ﴿ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] الاحزاب (٦٧–٦٨).

[3] الطبري (١٥/٤٦٨).

[4] الطبري (١٥/٤٦٩).

[5] الطبري (١٥/٤٦٩–٤٧٠).

[6] القصص (٤١–٤٢).

﴿فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾[1] هەموو بەیانیان و ئێواران دەیانبەنە سەر ئاگر، ڕۆژێ کە قیامەت دێت فەرمان ئەدرێ سا دەستەو بەستەی فیرعەون زۆر بە توندی ئازار بدرێن.

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾﴾

**پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لەو شارانەی کە تیاچوون**

دوای ئەوەی خودای گەورە باسی ئەو پێغەمبەرانەی کردو ئەو بەسەرهاتانەی کە لەنێوان ئەوان و گەلەکانیاندا ڕوویداو چۆن خوانەناسان لەناوچوون و خاوەنباوەڕان ڕزگاریان بوو، پاشان ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ﴾ ئەمانە چەند هەواڵێك بوون لەو شارانە کە بۆ تۆی دەگێڕینەوە، هێندێك لەوانە هەر ماون و هێندێکیشیان لەناوچوون. ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ ناهەقیمان لێنەکردن بەڵام ئەوان ناهەقیان لە خۆیان کرد، کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانمان نەکردو بە درۆیان خستنەوە ﴿فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ کاتێ کە فەرمان لە پەروەردگاری تۆوە هات، ئەوانەی پەرستبوویان جگە لە خودا هیچ کارێکیان بۆ نەکردن. واتە: ئەو بتانەی ئەوان دەیانپەرستن و هانایان بۆ دەبردن نەهاتن بە هانایانەوەو ڕزگاریان نەکردن کاتێ کە سزای خوایان بۆ هات و لەناوی بردن. ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ جگە لە زیان هیچ شتێکی تریان بۆ زیاد نەکردن. قەتادەو موجاهیدو کەسانی تریش گوتویانە ﴿غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ یانی: جگە لە زیان. چونکە هۆی لەناوچوون و قڕکردنیان ئەوە بوو کە شوێنی ئەو پەرستویانەیان کەوتبون، بۆیە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا توشی زەرەر بوون[2].

﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ ئاوایە غەزەبی پەروەردگاری تۆ، کاتێ شارانێ دەگرێ، کە خەڵکەکەیان ستەم کارن ئەو سزایەی خودا دەیدا، زۆر بە ژان و زۆر دژوارە. واتە: چۆن ئەو خەڵکە ستەمکارەی کە بڕوایان نەکرد بە پێغەمبەرەکانمان لەناومان بردن، هەر بەو شێوەیە ئەوانەیش کە وەك ئەوان دەکەن لەناویان دەبەین.

---

[1] غافر (٤٦).

[2] الطبري (١٥/٤٧٣).

﴿إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ ئەو تۆڵەی خودا لێیان دەسێنێ زۆر بە ژان و گرانە. لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوموساوە(ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا مۆڵەتی ستەم کار ئەدا تا کاتێ کە گرتی ئیترلە دەستی دەرناچێ)[1]. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ)ئەم ئایەتەی خوێند ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾.

﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾﴾

**لەناودانی شارەکان نیشانەی هاتنی ڕۆژی قیامەتە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئا لەمەدا ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی لە ئازاری ڕۆژی قیامەت بترسن. واتە: لەناودانی خوانەناسان و ڕزگار کردنی خاوەن باوەڕان پەندو ئامۆژگاری و بەڵگەیە لەسەر ئەو بەڵێنەی کە داومانە بۆ ڕۆژی قیامەت ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ﴾[2] بێگومانە ئێمە پێغەمبەران و ئەو کەسانەی کەوا بڕوایان هێناوە، لە ژیانی ئەم دنیایەداو لەو ڕۆژەش کە شایەتان ڕاست دەبنەوە یارمەتی ئەدەین. وە لە ئایەتێکی تـرا فەرموویەتی: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[3] پەروەردگاریان ئاگاداری کردن: ئێمە دەبێ ستەمکاران قڕ بکەین، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ﴾ کە ڕۆژێکە خەڵکی گشت لەوێ کۆدەکرێنەوە، لە یەکەم کەسەوە هەتا دوایین کەس. ئەم ئایەتە وەک ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾[4] هەموویان کۆ دەکەینەوە بێئەوە کەسیان جێ بمێنێ. ﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە. واتە: ڕۆژێکی زۆر گەورەیە فریشتەکان لەو ڕۆژەدا ئامادە دەبن، پێغەمبەرەکانیش کۆ دەکەینەوە لەوێدا، گشت دروست کراوەکانیش کۆ دەکرێنەوە لە مرۆڤ و جنۆکەو باڵندەو زیندەوەری کێوی و زیندەوەری تریش، دادپەروەر (واتە خوا) بڕیاری تێدا ئەدا، ئەو دادپەروەرەی کە بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەک ناهەقی ناکات. خۆ ئەگەر چاکەیەک هەبێ دووچەندانە پاداشتی لەسەر ئەداتەوە.

---

[1] فتح الباري (٨/٢٠٥)، مسلم (٤/١٩٩٧).

[2] غافر (٥١).

[3] إبراهيم (١٣).

[4] الكهف (٤٧).

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴾ ئەو ڕۆژە دوا ناخەین بۆ ماوەیەکی کەم نەبێت، واتە: بۆ ماوەیەکی دیاری کراو نەلێی کەم دەکرێتەوەو نە لێشی زیاد دەکرێ. ﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾ ڕۆژێ کە دێ هیچ کەس بەبێ ئیزنی خودا قسە ناکا. وەك خودای مەزن لە ئایەتی ترا فەرموویەتی: ﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾[١] قسە ناکەن کەسێ نەبێ خودا ئیزنی دابێ، ئەویش قسەیەکی چاك بکا. وە فەرموویەتی: ﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾[٢] لە ترسی خودا هەموو دەنگێك نەوی دەبێ، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەی تکا کردندا (الشفاعة): هیچ کەسێ قسە ناکا پێغەمبەران نەبێت، پاڕانەوەی پێغەمبەرانیش لەو ڕۆژەدا ئەوەیە کە دەڵێن: (ئەی خوایە سلّم سلّم).[٣] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴾ لەناویاندا بەدبەختو بەختەوەر هەیە. واتە: لەناو ئەو خەڵکەدا هەندێکی چارەڕەشەو هەندێکیشی بەختەوەرن، وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ﴾[٤] کۆمەڵێ لەناو بەهەشتانو کۆمەڵێ لەناو ئاگری بە کڵپەدان. حافیز ئەبویەعلا لە موسنەدەکەیا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەمەرەوە، لە عومەرەوە،ئەڵێ کە ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴾ هاتە خوارەوە، پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆچی کار بکەین؟ ئایا لەسەر شتێ کە تەواو بووەو براوەتەوە یان لەسەر شتێ تەواو نەبوەو (نەبراوەتەوە)؟ فەرمووی: لەسەر شتێ کە تەواو بووەو (براوەتەوە)! ئەی عومەر، قەڵەمیشی بە سەرا ڕۆشتوە، بەڵام هەموو کەسێ ئاسانکاری بۆ کراوە بۆ ئەوەی کە بۆی دروست کراوە[٥].

﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ﴾

---

[١] النبأ (٣٨).

[٢] طه (١٠٨).

[٣] فتح الباري (٢/٣٤١)، مسلم (١/١٦٩).

[٤] الشورى (٧).

[٥] الترمذي (٣١١١). تیرمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

## حاڵی بەدبەختان و چارەنوسیان

خودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴾ ئەوانـەی چارەڕەشـن لە ئاگردان هەر ئاخ و هەنسکیانە، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: زەفیر لە گەروو دایە، شەهیقیش لـەناو سنگایە، واتە: هەناسەدانەوەیان زەفیرە و هەناسە وەرگرتنیشیان شەهیقە.[1] واتـە: ئـاخ و داخ هەڵدەکێشن لـەناو ئەو سزایەی کە تێیدان، پەنا دەگرین بە خودا لەو سزایە. ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾ هەر لەوێدا دەمێننەوە، هەتا ئەم ئاسمان و زەمینە هەیە. ئیبنوجەریرئەڵێ: وا باوبوە لـەناو عـەرەبا کـە ویستبێتمان وەسفی شتێك بکەین کە هەر بمێنێتەوە هەرگیز تەواو نەبێ، گوتویانە: (ئەمە دەمێنێتـەوە هەتا ئاسمانەکان و زەمین بمێنێ). دیسان گوتویانە: (ئەوە دەمێنێ هەتا شەو و ڕۆژ بەدوای یەکا بڕۆن) چەندەها نمونەی تریش مەبەستیان بە ئەمانە هەموو ئەوە بووە کە هەرگیز دوایی نایەن (أبداً)، خودای مـەزنیش بـەو شێوەیە لەگەڵیانـدا دواوە کـە خۆیـان پێـی ئاشـنان و لێـی تێدەگـەن، فەرمویـەتی: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾[2] منـیش ئـەڵێم: هەڵـدەگرێ کـە مەبەسـت بـە ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾ جنس بێ چونکە گومانی تێدا نیە لە ڕۆژی دوایدا ئاسمانەکان و زەمین دەبێ هـەبێ، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴾[3] لەو ڕۆژەدا ئـەم زەمینـە دەگۆڕێ بە زەمینێکی تر و ئاسمانەکانیش هـەروەها. بۆیـە حەسـەنی بەسـری لـەم ئایەتـەدا ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾ ئـەڵێ: ئاسمانێکـە جگـە لـەم ئاسمانـە و زەمینێکـە جگـە لـەم زەمینـە، هـەتا ئـەو ئاسمان و ئەو زەمینە بەردەوام بێ هەر لەناو ئاگردان. ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ مەگـەر پەروەردگارت مەیلی لێ نەبێ، پەروەردگارت هەرچی خۆی بیەوێ دەیکا. ئـەم ئایەتـە وەك ئـەو ئایەتـە وایە کە خودای مەزن فەرموویـەتی: ﴿ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾[4]. دەسا جێگـەی هـەتا هـەتایتان جەهەنمە مەگـەر خـوا بـە مـەیلی خـۆی بۆتـان بگـۆڕێ، پـەروەردگارت کـارزان و ئاگـادارە. گـوتراوە: ئـەم ئیستیسـنایە دەگـەڕێتـەوە بـۆ تاوانبـارانی ئـەهلی یەکخواپـەرستی ئەوانـەی خـودا لـەناو ئـاگر دەریـان دەهێنـێ بـە تکـای تکاکـاران، لـە فریـشتەکان و پێغەمبـەران و

---

[1] الطبري (١٥/٤٨٠).
[2] الطبري (١٥/٤٨١).
[3] ابراهيم (٤٨).
[4] الانعام (١٢٨).

خاوەنباوەڕان، تەنانەت تکایش دەکەن بۆ خاوەن گوناهە گەورەکانیش، پاشان سۆزوبەزەیی لە هەموو کەس بەبەزەییتر کەپەروەردگارە دادەبارێ ئەوسۆزەکەسێك لە ئاگر دێنێتە دەر کە هەرگیز چاکەیەکی نەکردوە لە ژیانیدا، ئەوەنەبێ تەنها یەك ڕۆژ گوتەیەتی (لا إله إلا الله)، وەك لە فەرموودە سەحیحەکاندا هاتووە کە زۆرن، لە پێغەمبەری خوداوە هاتوە لەم مانایەدا لە فەرموودەی ئەنەس و جابیرو ئەبوسەعیدو ئەبوهورەیرەو کەسانی تریشەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرکە هیچ کەسێ نامێنێ لەناو ئاگرا کەسێ نەبێت کە مانەوەی هەتا هەتایی بۆبڕیار درابێ، هیچ ڕێیەکی دەرباز بوونی نەمابێ، ئەمە ڕای زۆرینەی زانایانە لە کۆن و تازەدا لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا.

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾﴾

**حاڵی بەختەوەران و چارەنوسیان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ ئەوانەش کە بەختەوەرن، هەر لە بەهەشتا دەبن، هەتا ئەم ئاسمانانەو ئەم زەمینە هەن، مەگین ئەوەی پەروەردگارت مەیلی لێبێ، مانای ئیستیسنا لێرەدا یانی بەردەوامیان لەو نازو نیعمەتەدا خۆی لە خۆیدا بڕیارێکی واجب نیە بەڵکو پەیوەندە بە مەیلی خودای گەورەوە، هەمیشەو بە بەردەوامی خودا منەت و چاکەی هەیە بەسەر عەبدەکانیەوە، لەبەر ئەوە فێری (سبحان الله و الحمدلله) دەبن وەك چۆن فێری هەناسەدان دەبن.[1] زەحجاك و حەسەنی بەسری ئەڵێن: ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە یەکخواپەرست بوون و سەرپێچیان کردوەو چونەتە ناو ئاگر پاشان لە ئاگر دەرهێنراون دوای ئەوە ئەفەرموێت: ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ بەخششێکە نابڕێتەوە. ئەمە قسەی موجاهیدو ئیبنوعەبباس و ئەبول عالیەو کەسانی تریشە.[2] جا بۆ ئەوەی هیچ کەسێ وا گومان نەبات، دوای ئەوی باسی مەیلی کردوە. لەوانەیە (گومانێ یان پچڕانێ یان شتێ) ڕووی بدات لەبەهەشتدا وکۆتایی بێت ،بۆیە بەڵکو بڕیاری بەردەوامی و نەبڕاوەی لەسەر دراوە! وەك چۆن لەوێدا ڕوونی کردوەتەوە کە سزای خەڵکی ناو ئاگر لەناو ئاگرا هەر بەردەوام دەبێ و ئەویش هەر دەگەڕێتەوە بۆ مەیلی خودا، چونکە خودای مەزن بە دادپەروەری و کارزانی خۆی سزای داون. بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾.[3] پەروەردگارت

---

[1] مسلم (٤/٢١٨١).

[2] الطبري (١٥/٤٩٠).

[3] هود (١٠٧).

هەرچی خۆی بیەوێ دەیکا، وەك لە ئایەتێکی تـرا فەرموویەتی: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾[1] هەرچی خودا بیکا ناشێ پرسیاری لێ بکرێو ئەوانن بەرپرسیارن. بێگومان لەوێدا دڵەکان باش کراونو نیەتەکانیش دامەزراون، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە (مردن دەهێنرێ لە وێنەی بەرانێکی قەڵەودا لە نێوان بەهەشتو جەهەنما سەر دەبڕێ، پاشان دەگوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشت مانەوەیەو مردن نیە، ئەی ئەهلی جەهەنم مانەوەیەو مردن نیە )[2]. دیسان لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە دەگوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشت بۆتان هەیە بژینو هەرگیز نەمرن، بۆتان هەیە لاوبنو هەرگیز پیر نەبن، بۆتان هەیە تەندروست بنو هەرگیز نەخۆش نەکەون، بۆتان هەیە ڕابوێرنو (خۆشگوزەران بن) هەرگیز توشی ئازارنەبن[3].

﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ ۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾﴾

## بتپەرستی گومراییە، هیچ گومانی تێدا نیە

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ﴾ سا تـۆ لـەبارەی ئەوانـەی ئـەوان دەپەرستن دوودڵ مەبە، هەر ئەوانە دەپەرستن کە باب‌و باپیرانی پێشویان پەرستویانن واتە: تۆ هیچ دوودڵی مەکە لەسەر ئەوەی کە ئەو بتپەرستانە دەیکەن، چونکە ئەو کارەی ئەوان پڕوپوچو نەفامی گومرایی نەبێ هیچی تر نیە، ئەوانە بۆیە ئەو بتانە دەپەرستن لەبەر ئەوەی بابو باپیرانیان لەپێشا پەرستویانە، هیچ بەڵگەیەکی ڕاستیان بەدەستەوە نیە لەسەر ئەو بتپەرستیە تەنیا شوێن کەوتنی بابو باپیرانیان نەبێ کە بەنەزانی دەیان کرد، خودای گەورە بە تەواوی پاداشتیان ئەداتەوە، سزایەکیان ئەدا هیچ کەسێ سزای وای نەدرابێ، خۆ ئەگەر چاکەیەکیشیان هەبێ خودای مەزن هەر لە دنیادا هەقیان بۆ دەکاتەوەو پاداشتیان ئەداتەوە لەپێش ڕۆژی قیامەتا، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ﴾ ئێمەش بەبێ کەموکوڕی بەشی خۆیانیان ئەدەینێ، عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێ: یانی بەبێ کەموکوڕی ئێمە بەشی خۆیانیان لە سزا ئەدەینێ[4] واتە: سزایەکی تەواویان ئەدەین. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت:

---

[1] الانبياء (٢٣).

[2] فتح الباري (٢٨٢/٨)، مسلم (٢١٨٨/٤).

[3] مسلم (٢١٨٢/٤).

[4] الطبري (٤٩٢/١٥).

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ﴾ ئێمە كتێبێكمان دا بە مووساو كێشەیان لەسەر دروست كرد، هەندێ بڕوایان پێ هێناو هەندێكیش بڕوایان پێ نەهێنا، تۆیش ئەی موحەممەد(ﷺ) چاو لەو پێغەمبەرە پێشوانە بكەو باوەڕنەهێنانی ئەوانە زۆر دڵگرانت نەكاو پشتت سارد نەكاتەوە ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ خۆ ئەگەر پەروەردگارت لەپێشا بڕیاری نەدایە، زوو كێشەكەیان دەبڕایەوە، كە ئێستەش سەبارەت بەمە، هەر دوودڵ و بە گومانن، ئیبنوجەریرئەڵێ: ئەگەر لەپێشا بڕیاری دواخستنی سزا نەدرایە بۆ كاتێكی دیاریكراو زوو لەناو دەبران، هەڵیش دەگرێ لێرەدا مەبەست بەو (الكلمة)یە ئەوەبێ كە: خودا هیچ كەسێ سزا نادا دوای هێنانی بەڵگە و ناردنی پێغەمبەر نەبێت بۆی.[1] وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾.[2] هەتا پێغەمبەریش نەنێرین، سزا لەلای ئێمەوە نیە. وە لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾.[3] ئەگەر بەڵێنێك لەپێش ئێستادا لە پەروەردگارتەوە نەدرایە، كاتێكیش دیاری نەكرایە، سزایان بەسەرا دەهات، لەسەر هەرچی ئەوان دەیڵێن، خۆڕاگریە، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگارت قەرەبووی كردەوەی هەموویان بە تەواوی دەكاتەوەو هەر خۆی لە هەر كارێ دەیكەن ئاگادارە. پاشان خودای گەورە باسی ئەوە دەكا كە بەو زووانە هەموو گەلەكان لە سەرەتاوە هەتا دوایی كۆدەكاتەوە لە ڕۆژی قیامەتا پاداشتی هەموویان ئەداتەوە، چاكە بە چاكەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندن. خودا هیچی لێ ون نابێ و ئاگاداری هەموو شتێكە لە گەورەو بچووك و وردو درشت. لەم ئایەتەدا چەند خوێندنەوەیەك هاتووە، بەڵام ماناكەی هەموو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە باسمان كرد، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾[4] بێگومان هەمووڵاشیان، هەر دەهێنینەوە لای خۆمان.

﴿فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾﴾

---

[1] الطبري (١٥/٤٩٣).

[2] الاسراء (١٥).

[3] طه (١٢٩-١٣٠).

[4] يس (٣٢).

**فەرماندان بە خۆڕاگری**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ وەك فەرمانت پێدراوە، خۆڕاگرە، ئەوانەش لەگەڵ تۆدا بۆلای خودا گەڕاونەتەوە با هەر وا بن، سەرپێچیش لە فەرمان مەکەن، هەرچی بکەن خودا دەیبینێ، خودای گەورە فەرمان دەکا بە پێغەمبەرەکەیی‌و بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆڕاگر بن لەسەر ئاینەکەیی‌و بەردەوام بن لەسەری، چونکە ئەو خۆڕاگرتنە گەورەترین یارمەتیە بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنا، دژی بێ ئارامی‌و ترسەنوکیە، سەرکەشیشی قەدەغەکردوە کە بریتیە لە ناهەقی کردن با لە موشریکیش بێ، چونکە ناهەقی دەبێتە هۆی لەناوچوون، چاك بزانە کە خودای مەزن هەموو کردارێکی عەبدەکانی دەبینێ، لە هیچی بێ ئاگا نیەو هیچیشی لێ ون نابێ. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ مەچن بەلای ئەوانەدا ناهەقی دەکەن، دەنا بە ئاگر دەسوتێن، عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: سازش مەکەن. ئیبنوجەریریش ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: مەچن بەلای ئەوانەدا ناهەقی دەکەن.[1] ئەم قسەیە باشترە، واتە: پشت مەدەن بەپشتی ستەمکارەوە وەك ئەوەی کە ڕازی بووبن بە کارەکانیان، ئەو کاتە ئاگر دەتان سوتێنێ. ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾ جگە لە خودا هیچ دۆستێکتان نیە، ئیتر کەسیش لە دوایدا یارمەتیتان نادا.

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ ﴾ نوێژ بکە لە ئەم سەرو ئەو سەری ڕۆژدا، عەلی کوڕی ئەبوتەلحەئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ ﴾فەرمویەتی: بەیانی‌و ئێوارە[2]. حەسەن‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان گوتووە.[3] حەسەن لە ڕیوایەتێکی قەتادەو زەححاك‌و کەسانی تریشەوەئەڵێ، ئەوە نوێژی بەیانی‌و عەسرە. موجاهید ئەڵێ: نوێژی بەیانیە لە سەرەتای ڕۆژەوە، نیوەڕۆو عەسریشە لە کۆتایی ڕۆژدا. موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و زەححاکیش هەر وایان گوتووە ﴿وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ﴾ وە لە سەرەتای شەودا ئیبن عەبباس و

---

[1] الطبري (١٥/٥٠١).
[2] الطبري (١٥/٥٠٣).
[3] الطبري (١٥/٥٠٣).

موجاهیدوحەسـەن وجگەلـەوانیش ئـەڵێن: یـانی مـەغریبو عیـشا،حەسەن وعەبـدوڵڵای کـوڕی موبـارەك لەموبارەکی کوڕی فەزالەوەئەگێڕنـەوە فەرمویـەتی﴿وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ﴾ یـانی مـەغریب وعیشا. پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوانـە سـەرەتای شـەون: مـەغریبو عیـشا ). موجاهیـدو موحەممـەدی کـوڕی کەعبو قەتادەو زەحاکیش گوتوویانـە: ئـەو نوێژانـە نوێـژی مـەغریبو عیشایە، هەڵـدەگرێ ئـەم ئایەتـە لەپێش فەرزبوونی پێنج نوێژەکە هاتبێتە خوار لـە شـەوی ئیسرادا، چـونکە لـەو کاتـەدا دوو نوێـژ واجـب بووە: نوێژێ لەپێش هەڵاتنی خۆرو نوێژێ لەپێش ئاوابوونی خۆرا، وە لە کاتی شەویشا، شـەونوێژ واجب بووە لەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) ئوممەتەکـەی، پاشـان لەسـەری ئوممەتەکـەی لابراوەو لەسـەر پێغەمبـەر خۆی واجب بووە. پاشان جارێکی تر لەسەر پێغەمبەریش (ﷺ) لابراوە. لە وتەیەکدا (والله أعلم).

## چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾ چونکە چاکەکان خراپەکان لەناودەبەن واتە: کردارە چاکەکان دەبێتە کەفارەتی تاوانە پێشوەکانو دەیـان سـڕێتەوە، وەك لـەم فـەرموودەی ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی کتێبەکانی تری فەرموودە ڕیوایـەتیان کـردووە لـە گـەورەی موسـوڵمانانەوە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوەئەڵێ: من کاتێ کـە فەرموودەیـەکم لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) دەبیـست، سودم لێ وەردەگرت بە ئەندازەی ئەوەی خوا ئارەزوی لێ بـوبێ سـودی لێ وەرگرم، هـەر کـاتێ کەسـێ لەلایەن پێغەمبەرەوە فەرمودەیەکی بۆ باس بکردمایە، سوێندم ئـەدا، ئەگـەر سـوێنی بخواردایـە بـڕوام پێدەکرد، ئەبوبەکریش بۆی گێڕاومەتەوە، ئەبوبەکریش ڕاستی ئەکات، کە بیستویەتی لـە پێغەمبـەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ موسوڵمانێ نیە کە گونـاهێ لـە گوناهـەکانی دەکـاو پاشـان دەسـت نوێژ دەگرێو دوو ڕکـات نوێـژ دەکاونەبەخـشرێت )[1]. وە لـە هـەردوو سـەحیەکەدا هـاتوە لـە گـەورەی موسـوڵمانانەوە عوسمـانی کـوڕی عەففانـەوە کـە دەسـتنوێژی بـۆ گرتـون وەك ئـەو دەسـتنوێژەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گرتویـەتی پاشـان فەرمویـەتی: مـن بـەم شـێوەیە پێغەمبـەری خـودام بینیـوە (ﷺ) دەستنوێژی گرتووەو فەرموویەتی: (هەر کەسێ دەستنوێژی گرتبێ وەك ئەم دەستنوێژەی مـن پاشان دوو ڕکات نوێژی کردبێ، خۆی سەرقاڵ نەکردبێ بە خۆیەوە لەو دوو ڕکاتەدا، لەو گوناهانەی لـە پێشا (کردویەتی)ئەبەخشرێت )[2]. واتە: خودا لەو گوناهانەی پێشوی خۆش ئەبێت. وەلە فەرمودەیەکی تری سەحیحا هاتوە، لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: (ئایا چۆن دەبینن ئەگەر بە بەردەگای یەکێکتانـدا ڕوویـارێکی گـەورە بـڕوا و هـەموو ڕۆژێ پێـنج جـار خـۆی تیا

---

[1] أحمد (٩/١)، أبوداود (١٨٠/٢)، تحفة الاحوذي (٣٥٧/٨)، النسائي في الكبرني (١٠٩/٦)، إبن ماجة (٤٤٦/١). حەسەنە.

[2] فتح الباري (٣٢٠/١)، مسلم (٢٦٠/١).

بـشوریّ ئایـامیچ چـلکێکی پێـوه دەمێنــیّ؟ گوتیـان: نـەخێر، ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەم پێنج نوێژەیش هەر بەو شێوەیە، خودای گەورە تاوان‌و گوناهەکانی پیّ لادەبا)[1]. موسلمیش ڕیوایەتی کردوه لە سەحیحەکەیا لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (ئەم پێنج نوێژەو ئەم( هەینی) بۆ ئەو هەینی‌و ڕەمەزان بۆ ئەو ڕەمەزان دەبنـە کـەفارەتی (گوناهی) ئەو نێوانەیان، ئەگەر دووره پەرێزی بووبیّ لە گوناهە گەورەکان)[2]. واتە: گوناهە گـەورەکانی تیا نەکرابیّ، بوخاری ڕیوایەتی کردوه لە ئیبنومەسعودەوە، پیاوێك ژنێکی ماچ کردبوو، هـات بـۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بۆی گێڕایەوە، خودای گـەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خـودا ئەمـە هـەر بۆ منه؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بۆ هەموو ئوممەتەکەمە بە گشتی)[3]. بوخـاری هـەر بـەم شـێوەیە ڕیوایەتی کـردوه لـە (کتـاب الـصلاة)دا، لـە تەفسیرەکەیـشیا هـەر بـەم شێوەیە هێناویـەتی.[4] ئیمـامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوه لە ئیبنوعەبباسەوە: پیاوێك هاتە لای عومەر گوتی: ژنێك هات شتی لیّ بکڕیّ بردیە ژوورەوەو خەریکی بـوو هـەموو شتێکی لەگـەڵا کـرد(کاری ژن‌و مێـردی نـەبیّ)، عومـەر گـوتی: داوەشێی، لەوانەیە ژنیّ بیّ (مێردەکەی لای نەبیّ) و ڕۆشـتبیّ بـۆ غـەزا لـە ڕێـی خـودا؟ گـوتی: بـەڵیّ، گوتی: بچۆ بۆ لای ئەبوبـەکر لێـی بپرسـە، ئـەڵیّ: هاتـە لای ئـەبوبوکرو لێـی پرسـی، ئەبوبـەکر گـوتی: لەوانەیە مێردەکەی لای نەبیّ (چووبیّ بۆ غەزا) لەڕێی خودا؟ هەر ئەو قسەی پیّ گوت کە عومـەر پێـی گوت، پاشان هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەریش هەر ئەوەی پیّ گوت: فـەرمووی: (لەوانەیـە ئـەو ژنە مێردەکەی لای نەبیّ (چووبیّ بۆ غەزا) لە ڕێـی خـوادا). پـاش کـەمێك ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ هـەتا کۆتـایی ئایەتەکـە. پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمە تەنیا بۆ منە یان بۆ خەڵکیشە بە گشتی؟ عومەر بە دەستی دای لە سنگی پیاوەکەو گوتی:نەخێر، ئەوەندەیش بەرچاو تەنگ مەبە، بەڵکو بۆ خەڵکیشە بـە گشتی، پێغەمبەر خودا(ﷺ) فەرمووی: (عومەر ڕاستی ئەکات)[5].

---

[1] البخاري (٥٢٨)، مسلم (٦٦٧).

[2] مسلم (٢٠٩/١).

[3] فتح الباري (١٢/٢).

[4] فتح الباري (٢٠٦/٨).

[5] أحمد (٢٤٥/١). سەنەدەکەی لاوازە.

﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ
وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ
وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾

**دەبێ کۆمەڵێ هەبێ بەربگرێت لە خراپە و بەدڕەوشتی**

خـودای مــەزن ئەفــەرموێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ ئەم هەموو گەلانەی بەر لـە ئێـوە هـاتن‌و چوون، لەبـەر ئـەوەی کەسێکی وایان نەبوو بەرگری بکەن لە بەدفەڕی لەسەر زەمینا تەنیا کەمێك نەبێ لەوانەی کە ڕزگارمـان کردن لە نێوانیاندا، واتە: چەندە باش بـوو کۆمـەڵێ لـە گەلـە پێشوەکان ببوایـە لـە خـەڵکی خێرخـواز بەرگریان بکردایە لەو کاتانەدا کە خەڵکی بەدفەڕ دەستیان ئەدایە خراپەو بەدڕەوشتی لەسـەر زەمینـا، بە دەگمەن کەسی وا هەبوو لە نێوانیانداو بـە پەنجـەی دەسـت دەژمێـران بـەرگریان لـە خراپـە دەکـرد ئەوانەیش، ئەو کەسانە بوون کە خودا لە غەزەبی کوتوپڕی خۆی ڕزگاری کـردن، بۆیـە خـودای مـەزن فەرمانی داوە بەم ئوممەتە بـەڕێزە کـە دەبـێ کۆمـەڵێ لـە نێوانیانـدا هـەبێ فـەرمان بکـات بـە چاکەو بـەرگری بکـات لـە خراپـە وەك لـە ئایـەتێکا فەرموویـەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1] دەبێ لـەنێو ئێـوەدا کۆمـەڵێ بـبن، فـەرمان بـە چاکە بدەن‌و ڕێ لە خراپە بگرن، هەر ئەوانـەش ڕزگـار دەبـن. وە لـەم فەرموودەیـەدا هـاتوە: (ئەگـەر کاتێ خەڵکی خراپەیان بینی ئەو خراپەیەیان نـەگۆڕی لەوانەیـە سـزای خـودا هـەموویان بگرێتـەوە)[2]، واتە: زۆر نزیکە خودا سزای هەموویان بدا. بۆیە خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ پاشـان ئەفـەرموێت: ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ ستەمکارانیش هـەر کەوتنـە شـوێنی خۆشگوزەرانی خۆیـان‌و تاوانبار بوون، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کاری خراپ‌و دەستیان دابووە لاساری‌و کاری ناشیرین، هیچ گوێیان لە تاوان‌و خراپەی ئەوانە نەبوو، دژایەتیشیان نەدەکردن، هەتا خودا لەپڕ سزای بۆ دەنـاردن، پاشـان خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ پەروەردگارت بە ناهەقی هەرگیز قڕانی نەخستە ئەو شارانەی ئاکار چاك بـوون، خـودای مـەزن لێـرەدا

---

[1] آل عمران (١٠٤).

[2] إبن ماجة (١٣٢٧/٢).

باسی ئەوە دەكات كە هەرگیز هیچ شارێكی لەناو نەداوە مەگین خەڵكەكەی ستەمی لە خۆی كردوە، وە بەڵاو سزای خۆی نەناردوە بۆ شارێك خەڵكەكەی چاكو خێرخوا بوونو نەچوبنە ڕیزی ستەمكارانەوە. وەك فەرموویەتی: ﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾.[1] ناهەقیمان لێ نەكردن، بەڵكو ئەوان ناهەقیان لە خۆیان كرد. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾[2] پەروەردگارت ناهەقی لە عەبدەكانی ناكا.

﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمۡۗ وَتَمَّتۡ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ پەروەردگارت ئەگەر مەیلی لێ بوایە، خەڵكی دنیای گشتی دەكردە یەك ئاین، خودای گەورە باسی ئەوە دەكا كە دەتوانێ خەڵكی هەموو وا لێ بكا پەیڕەوی یەك ئاین بن، یا هەموو خاوەنباوەڕ بن، یا هەموو خوانەناس بن. وەك لە ئایەتێكی تـرا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا﴾[3] ئەگەر پەروەردگارت حەزی لێ بوایە ئەوەی لەسەر زەمینایەو هەموو بەگشتی بڕوای دەهێنا. ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ﴾ بەڵام بە ناتەبایی ئەو خەڵكە هەر دەمێننەوەو ناكۆك دەبن لە بیروبۆچوونو ئاینو بڕواو پەیڕەوو پڕۆگرامیاندا، ﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾ جا مەگەر پەروەردگاری تۆ بەزەیی پێیاندا بێتەوە. لەوانەی كە شوێنی پێغەمبەران كەوتونو پابەند بوون بە فەرمانەكانی ئەو ئاینەوە كە پێغەمبەران پێیان ڕاگەیاندون، هەر بەردەوامیش بوون لەسەر ئاینەكەیان كاتێ كە پێغەمبەری خودا هاتوە كە دوایین پێغەمبەرە (ﷺ) شوێنی كەوتونو بڕوایان پێ هێناوەو یارمەتیان داوەو بەختەوەری دنیاو قیامەتیان وەدەستهێناوە، چونكە ئەوانە لە بەرەی ڕزگار بوانن، وەك لەم فەرمودەیا ڕیوایەت كراوە لە مەسانیدو سونەنەكاندا لە چەند ڕێگاوە كە یەكتری بەهێز دەكەن، جولەكە بەش بەش بوون، بونە حەفتاویەك دەستە، نەسارا بەش بەش بوون، بونە حەفتادوو دەستە، ئەم ئوممەتەیش بەو زوانە بەش بەش دەبێ، دەبێ بە حەفتاوسێ دەستە، هەموو لەناو ئاگردان یەك دەستەیان نەبێ، گوتیان: ئەونە كێن (ناچنە ناو ئاگر) ئەی پێغەمبەری خودا؟ (ﷺ) فەرمووی: ئەوەیە منو هاوەڵەكانمی لەسەرە[4].

---

[1] هود (١٠١).

[2] فصلت (٤٦).

[3] يونس (٩٩).

[4] أحمد (٣٣٢/٢)، أبوداود (٤/٥)، تحفة الاحوذي (٣٩٧/٧)، إبن ماجة (١٣٢٢/٢). فەرموودەیەكی سەحیحە.

حاكمیش ڕیوایەتی كردوە بەم زیادەیشەوە. لە موستەدرەكەیا.[1] پاشان خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾. كـە هـەر بـۆ ئـەوەش دروست كراوون، بڕیاری پەروەردگارت هەر دێتە جێ، كە جەهەنم لـە جنۆكەو بـەنی ئادەم هـەموو پـڕ دەكەم. خودای گـەورە باسـی ئـەوە دەكا كـە لەپێشا بڕیـاری داوەو بڕاوەتـەوە، چونكە خـودا چاك زانیویەتی لە كار بەجێیی خۆیەوە لەوانەی كە دروستی كردووە كێ شایستەی بەهەشتەو كێش لەوانـە شایستەی جەهەنمە، چونكە دەبێ جەهەنم پڕ ببـێ لـەو دووانـە: جنۆكـەو بنیـادەم، خـودا خـۆی بـاش دەزانـێو كارەكـانی پـڕە لـە كـارزانی، لـە هـەردوو سـەحیحەكەدا هـاتوە لـە ئـەبوهورەیرەوە ئـەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بەهەشتو جەهەنم مشتو مڕیان بـوو، بەهەشـت گـوتی: بۆچـی من لاوازو پەك كەوتە نەبێ نایەتە ناوم، ئاگریش گوتی: دانراوم بـۆ فیـز زلو خـۆ بەزلزانـەكان، خـودای مەزن فەرموی بە بەهەشت تۆ بەزەیی منی بە تـۆ ڕەحـم دەكـەم بـە كەسـێ مـەیلم لێبـێ، فـەرموی بـە ئاگریش: تۆ جەزرەبەی منی تۆڵە دەسێنم بە تۆ لـە كەسـێ مـەیلم لێبـێ، بـۆ هەریـەكێ لـە ئێـوە پـڕی خۆی، لەبارەی بەهەشتەوە بەردەوام لەناو بەهەشتا جێگا ماوە، هەتا خودا خەڵكێكی تری بۆ دروست دەكا لەو جێگایەدا نیشتەجێ دەبێ، بەڵام ئاگر بەردەوام دەڵێ: ئایا زیاتریش ماوە هەتا پـەروەردگاری خاوەن دەسەلات پێی لە سەری دادەنێ، دەڵێت: بەسمە بەسمە سوێند بێ بە خاوەنشكۆیی تۆ)[2].

﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾

**كۆتـایی ئەم باسە**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾ ئـەم هـەموو دەنگو باسانەی پێغەمبەرانت بۆ دەكرێن، كە دڵی تۆی پێ دامەزراو بكەین، واتـە: ئـەوەی بـۆت باسـی دەكـەین ئـەی موحەممـەد(ﷺ) لـە هـەواڵی پێغەمبـەرە پێشوەكان و گەلـەكانیان، كـە چـی ڕوویـدا لەنێوانیاندا كە مشتو مڕو ناكۆكی چەندە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون بەرانبەر ئەو ئەشكەنجەو ئـازارەی خوانەناسانو بڕوا نەهێنانیان، وە چۆن خودا كۆمەڵی خۆی سەرخست لـە خاوەنباوەڕانو دژمنـەكانی خۆشی سەر شۆڕ كرد لە خوانەناسان، ئەمانە هەموو بۆ ئەوانە بوو كـە دڵـی تـۆی پـێ دامـەزراو بكـەین ئەی موحەممەد(ﷺ) بۆ ئەوەی تۆش ئەو پێغەمبەرانەی پێشوو كە برای خۆتن بیانكەیتە سەرمەشقو

---

[1] الحاكم (١/١٢٩). سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٣/٤٤٤)، مسلم (٤/٢١٨٦).

چاویان لیٚ بکەی ﴿وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ﴾ لەم سورەتەدا هەقت بۆ هاتوە ئیبنوعەبباس‌و موجاهید کۆمەڵیٚ لە زانایانی پیٚشینە گوتویانە: کە ئەوەش زۆر ڕاستە، یانی: ئەوەی لەم سورەتەدا هاتوەهەمووی هەق وڕاستییە، کە پیٚك هاتووە لە بەسەرهاتی پیٚغەمبەران، کە چۆن خودا ئەو پیٚغەمبەرو خاوەنباوەڕانەی ڕزگار کردوەو خوانەناسانیشی قڕ کردوە، ئەو بەسەرهاتانەی لەم سورەتەدا بۆت باس کراوە هەقەو هەواڵیٚکی ڕاستە، پەندو ئامۆژگاریشە بۆ خودانەناسان کە وازبیٚنن، یادیٚکیشە بۆ خاوەنباوەڕان کە بەخۆیاندا بچنەوە.

﴿وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرمویٚت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾ بەو کەسانەشی کە باوەڕیان نیە، بڵیٚ: هەرچی لە دەستتان دیٚ بیکەن، وا ئیٚمەیش کاری خۆمان دەکەین خودای گەورە فەرمان دەکا بە پیٚغەمبەرەکەی کە بڵیٚ بە ئەوانە کە بڕوا ناکەن بەوەی کە پیٚی هاتووە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بە شیٚوەی هەڕەشە: ئیٚوە لەسەر ڕیٚگەو بەرنامەی خۆتان بڕۆن‌و ئیٚمەیش لەسەر ڕیٚگەو بەرنامەی خۆمان دەڕۆین، ﴿وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ چاوەڕوان بن، ئەوا ئیٚمەیش چاوەڕوانین واتە: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾.[1] بەمزووانە تیٚدەگەن پاشەڕۆژی ئەو دنیا بۆ کیٚ دەبیٚ. بیٚگومان خودا ناهەقی کاران ڕزگار ناکا. بەڕاستی خودا بەڵیٚنەکەی خۆی بۆ پیٚغەمبەرەکەی هیٚنایە دی، یارمەتی داو سەری خست‌و وای کرد کە وتەی خودا بەرز بیٚ‌و وتەی خوانەناسان بەرەو خوار بیٚ، بیٚگومان خودا خاوەن دەسەڵات‌و کارزانە.

﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرمویٚت: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ تەنیا خودا ئاگاداری نهیٚنیەکانی ئاسمانەکان‌و زەمینە، هەموو کاریٚ بۆلای ئەو دەگەڕیٚتەوە، سا تۆ هەر ئەو بپەرستەو چارەنووست بەو بسپیٚرە، خودای گەورە لیٚرەدا باسی ئەوە دەکا کە هەر خۆی شارەزای نهیٚنیەکانی ئاسمانەکان‌و زەمینە، هەموو شتیٚ لە دوایدا بۆلای ئەو دەگەڕیٚتەوەو دەچیٚتە لای ئەو، هەموو کار کەریٚ بەرهەمی کارەکەی وەردەگریٚ لە ڕۆژی لیٚپرسینەوەدا، هەرکەسیٚ خۆی بە خودا سپاردبیٚ‌و گەڕابیٚتەوە بۆلای‌و پەشیمان بوبیٚتەوە لە خراپەکاری، ئەوەی بەسە ﴿وَمَا

[1] الانعام (١٣٥).

رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴾ هەر کاریٚ ئێوە دەیکەن، پەروەردگارت لە هیچی بیٚ ئاگا نیە، واتە: هیچی لێناشارێتەوە لەو کارانەی خوانەناسان کردویانە ئەی موحەممەد(ﷺ) بەڵکو خودا ئاگاداری هەموو شتێکیانە، لەمەوبەدوا پاداشتیان ئەداتەوە بە توندترین شێوە لە دنیاو لە دوارۆژدا، بەو زوانەیش خۆتو کۆمەڵەکەت سەردەخا بەسەریاندا لە هەردوو دنیادا.

**تەفسیری سورەتی یوسف (سەلامی خوای لێبیٚ)**

**لە مەککەدا هاتوەتەخوارەوە**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾﴾

**وەسفەکانی ئەم قورئانە**

﴿الٓر﴾ الف، لام، را، لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا باسی ئەم پیتانەمان کرد ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ ئەمانە چەندین نیشانەن لە کتێبی ڕونکەرەوە، واتە ئەمە نیشانەکانی ئەم کتێبەن کە ئەو قورئانە ڕوونو ڕەوانەیە. واتە: ڕوونو ڕەوانە شتە ئاڵۆزو نادیارەکانی ئاشکرا دەکاو مانای دەکاو ڕوونی دەکاتەوە ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ قورئانێکە بە زمانی عەرەبی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بەڵکو ئێوە تێبگەن. چونکە زمانی عەرەبی ڕەوانترو ڕوونترو فراوانترەو زیاتر مانا بەخشەو کار لە دڵەکان دەکا، هەر لەبەر ئەوەیە (خودای مەزن) بەڕێزترین کتێبی ناردوە بە بەڕێزترین زمانداو بۆ بەڕێزترین پێغەمبەر(ﷺ) بە بەڕێزترین نایندەدا لە فریشتەکان، ئەوەیش لە بەڕێزترین پارچە زەمینا، دەست کرا بە ناردنی ئەم قورئانە لە بەڕێزترین مانگی ساڵدا کە مانگی ڕەمەزانە، وە ئەم قورئانە لە هەموو ڕوویەکەوە تێرو تەواوە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئێمە جوانترین بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە لە ڕێگەی ئەو قورئانەوە کە نیگامان بۆ کردووی.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە**

لەبارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر چیرۆکێکت بۆ بگێڕاینایەتەوە، ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾[1].

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾﴾

**خەوبینینی یوسف ( سەلامی خوای لێبێ )**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴾ وەختێ یوسف بە باوکی گوت: باوکە یانزە ئەستێرەو خۆرو مانگم بە خەو دی کە سەر بۆ من دادەنوێنن، خودای مەزن ئەفەرموێت: ئەی موحەممەد(ﷺ) بەسەرهاتی یوسف باس بکە بۆ هۆزەکەت، لەو چیرۆکانەی دەیگێڕیتەوە، باوکی یوسف یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێبێ) ئیبنوعەبباس ئەڵێ: خەوبینینی پێغەمبەران نیگایە[2]. زانایانی تەفسیر قسەیان کردوە لەسەر لەیەکدانەوەی ئەم خەو بینینە گوتویانە: مەبەست بە یانزە ئەستێرەکە براکانیەتی بێجگە لە خۆی، چونکە براکانی یانزە کەس بوون. مەبەست بە خۆرو مانگیش باوکو دایکیەتی، ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسو زەححاکو قەتادەو سوفیانی سەوریو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە کە دوای چل ساڵ مانای ئەم خەوە هاتوەتە دی، ڕوی داوە، گوتراویشە: دوای هەشتا ساڵ هاتوەتە دی. لە کاتێکا بووە کە باوکیو دایکی لەسەر تەختەکەی خۆی داناو براکانیشی لەبەر دەستیا بوون ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰيَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾[3] هەموویان کڕنوشیان بۆ برد. گوتی: بابە ئەمە خەونەکەی پێشومە، پەروەردگارم ئاکامەکەی وەدی هێنا[4].

---

[1] الطبري (١٥/٥٥٢).

[2] الطبري (١٥/٥٥٤).

[3] يوسف (١٠٠).

[4] الطبري (١٥/٥٥٧).

﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥﴾

**باوكی یوسف فەرمانی دا خەوەكە بشارێتەوەو ئاشكرای نەكا لە ترسی فرِوفێڵی شەیتان**

خودای گەورە باسی یەعقوب دەكا كە گوتی بە یوسفی كوڕی كە ئەو خەوەی بۆ گێڕایەوە كە بینیبووی، خەوەكەی ئەوەی گەیاندووە كە براكانی ملكەچیان بۆ دەربڕیوە زۆر ڕێزیان لێ گرتووە بەشێوەیەك كە كڕنوشیان بۆ بردوە، ئەوەندە بەڕێزو مەزن بووە لایان. یەعقوب دەترسا لەوەی ئەگەر ئەم خەوە بگێڕێتەوە بۆ یەكێ لە براكانی، حەسوودی پێ بەرنو تووشی بەسەرهاتێكی بكەنو لەناوی بەرن. بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ گوتی: ئەی كوڕەكەم ئەم خەونەت لای براكانت مەگێڕەوە، نەوەك گەڕێكت پێ بكەن، چونكە شەیتان بۆ بنیادەم دوژمنێكی ئاشكرایە. واتە: براكانت فێڵێت لێ بكەنو تووشی بەڵایەكت بكەن لەسەر ئەو خەونە. بۆیە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (كاتێ كەسێ لە ئێوە خەوێكی بینی كە پێی خۆش بوو با بیگێڕێتەوە، وە ئەگەر خەوێكی بینی پێی ناخۆش بوو، با بە لاكەی تریا هەڵگەڕێو سێ جار بەلای چەپیا تف لە زەوی كاو مانا بەرێ بۆ خودا لە خراپەی ئەو خەونە، لای كەسیش باسی نەكا بێگومان ئیترزیانی بۆی نابێ)[1]. وە لە فەرموودەیەكی ترا كە ئیمامی ئەحمەدو هەندێ لە خاوەنی سونەنەكان ڕیوایەتیان كردووە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خەو بینین لەسەر پێی باڵندەیە، ئەگەر لێك نەدرێتەوە، ئەگەر لێك درایەوە دەكەوێ)[2].

﴿وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦﴾

**خەونلێك دانەوەی یوسف**

خودای مەزن باسی ئەو قسەیە دەكا كە یەعقوب گوتی بە یوسفی كوڕی، وەك چۆن پەروەردگارت هەڵیبژاردووی، ئەو ئەستێرانەی لەگەڵ خۆرو مانگدا پێ بینیت كە كڕنوشیان بۆ دەبردی ﴿وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ﴾ ئەمە دیارە پەروەردگارت ویستویە هەڵتبژێرێو دەستنیشانت بكاو بتكاتە پێغەمبەری خۆی ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ﴾ فێرت بكا مانای خەوەكان لێك بدەیتەوە. موجاهیدو كەسانی

---

[1] مسلم (١٧٧٢/٤).

[2] أحمد (١٠/٤)، أبوداود (٢٨٣/٥)، إبن ماجة (١٢٨٨/٢). لاوازە بەڵام ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

تـریش گوتویانـە ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ یـانی: لێکدانـەوەی خەونـەکان.[1] ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ﴾ بەهرەی خۆی تەواو دەکا بۆت، بە ڕەوانە کردنتو ناردنی نیگا بۆ تـۆو ﴿وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ خانەوادەی یعقوب، ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وەك ئەو چاکەی سەبارەت بە ئیبراهیمو ئیسحاقی باوانی تۆی کرد، دیارە پەروەردگاری تۆ هەرە زانای کارزانە. واتـە: خودا خۆی چاك دەزانێ کە پەیامی خۆی بۆ کێو لە کوێ دەنێرێ. وەك لە ئایەتی تریشا فەرموویەتی.

﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾﴾

**بەسەرهاتی یوسف پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ﴾ لە ڕابوردوی ناو چیرۆکی یوسفو براکانی، پەندی زۆر هەیە، بۆ ئەو کەسانەی دەپرسن. خودای گەورە ئەفەرموێت: بێگومان سەرگوزشتەی یوسف لەگەڵ براکانیا پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە کە لەو بارەیەوە دەپرسن، دەیانەوێ هەواڵی یوسف بزانن، چونکە ئەو بەسەرهاتە، بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنەرە، جێگای خۆیەتی پرسیار لە بارەیەوە بکرێ: ﴿إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ کاتێ براکانی یوسف گوتیان: دیارە یوسفو براکەی لای باوکمان لە ئێمە خۆشەویستترن، خۆ ئێمەش دەستە پیاوێکین، بێگومان باوکی ئێمە بە ئاشکرا گومڕا بووە. واتە: براکانی یوسف سوێندیان خوارد کە باوکیان یوسفو براکەی (مەبەست پێی بنیامینە) چونکە ئەوبرای دایكو باوکی یوسف بوو. لە ئەوان زیاتر خۆشی دەوێ، ئەوانیش کۆمەڵێکن چۆن دەبێ باوکیان ئەو دوانەی لەوان زیاتر خۆش بوێ، بەڕاستی باوکمان دیارە زۆر گومڕا بووە، ﴿ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾ یوسف بکوژن یان لە شوێنێکا فڕێی دەن ئەو کاتە سەرنجی باوکتان تەنیا بۆ ئێوە دەبێ، ئەمەیش کە بووەتە ڕێگرو نایەڵێت باوکتان ئێوەی خۆش بوێ، لەبەر چاوی لایبەنو مەیهێڵن، بۆ ئەوەی باوکتان ڕوو لە ئێوە بکا، کەوایە بیکوژن یان بیبەنە سەر زەمینێکی ترو دووری

---

[1] الطبري (١٥/٥٦٠).

بخەنەوە تا ڕزگارتان ببێ لە دەستی، هەتا باوکتان ئیتر ئێوەی خۆش بوێ ﴿وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ﴾ لە دوای ئەو (واتە یوسف) ئێوە ببن بە کۆمەڵێکی چاك، لەپێش کردنی گوناهەکەدا نیازی تەوبەکردنیان هێنا بوو ﴿قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ﴾ یەکێ لەوان گوتی، قەتادەو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێن: لە هەموویان بە تەمەنتربوو ناوی ڕووبییل بوو[1]. سودی ئەڵێ: ئەوەی ئەم قسەی کرد ناوی یەهوزا بوو، موجاهیدئەڵێ: ناوی شەمعون بوو. ﴿لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ﴾ گوتی: یوسف مەکوژن بیخەنە بن بیرەکەوە، واتە: ڕقو کینتان لە یوسف واتان لێ نەکا کە یوسف بکوژن، بێگومان ئەوانە نەیان دەتوانی بیکوژن، چونکە خودای مەزن کارێکی بە یوسف هەبوو، دەبوایە هەر ڕووی بدایەو بهاتایەتە دیو بیکردایە بە پێغەمبەرو خاوەن دەسەڵاتی میسر لەوێدا جێگیری بکا، خودای مەزن بەو قسەی ڕووبییلە لەو کوشتنە ڕزگاری کرد، کە پێی گوتن: فڕێی بدەنە ناو بنی بیرێکەوە ﴿يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ﴾ هەندێ کاروانچی هەڵیگرنەوەو ڕزگارتان دەبێ لە دەستی، پێویست ناکا بیکوژن، ﴿إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ﴾ ئەگەر کارەکە هەر دەکەنو وازناهێنن لەو قسەتانە، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: ئەوانە لەسەر کارێکی زۆر گەورەوترسناك پێکهاتن ،کەبریتی بوو لە: بڕینی پەیوەندی خزمایەتی و ئازاردانی باوكو بەزەیی نەهاتنەوە بە منداڵێکی بچوکی شیرە خۆرا کە هیچ تاوانێکی نەبوو، وە باوکێکی بەساڵا چوو کە جێی ڕێزو خاوەن هەقە بەسەریانەوە، وە زۆر جێی مەترسیشە لەلای خودا لەگەڵ ئەو هەقەی باوك بەسەر کوڕەکەیەوە هەیەتی، جیاکردنەوەی کوڕێ لە باوکی خۆشەویستی لەو تەمەنە زۆرو ئێسك لاوازیەدا، لەگەڵ ڕێزو پلەی ئەو کەسەی خۆشی ویستوە کە منداڵێکی بچووك بووە، جیایان کردوەتەوە لێی لە کاتێکا کە زۆر لاوازو کەمتەمەن بوو، پێویستی بە سۆزی باوکی هەبوو لەژێر باڵیا ئارام بگرێ، خودا لێیان خۆش بێ، کە لە هەموو کەسێ بە بەزەیی ترە، بێگومان ئەوانە کارێکی زۆر گەورەیان کرد، ئیبنوئەبی حاتەم ئەمەی ڕیوایەت کردوە لە ڕێگەی سەلەمەی کوڕی فەزلەوە.

﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾﴾

[1] الطبري (١٥/٥٦٤-٥٦٥).

## ئیزن خواستنی براکان لە باوکیان کە یوسفیان لەگەڵ بنێرێ

دوای ئەوەی ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی یوسف ببەن‌و بیخەنە ناو بیر، وەك برا گەورەکەیان ڕوبیل ئاماژەی کرد بۆیان، هاتن بۆلای یەعقوب‌و داوایان لێ کرد یوسفیان لەگەڵ بنێرێ ﴿قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ﴾ گوتیان: ئەی باوکی بەڕێزمان لەبەر چی تۆ لێمان دڵنیا نیت لە بارەی یوسفەوە، لە کاتێکا ئێمە دڵسۆزو خەمخۆری ئەوین، ئەمە پیلان‌و قسەیەك بوو، ئەوان نیازیان خراپ بوو، چونکە ئەوان زۆر حەسوودیان بە یوسف دەبرد لەبەر ئەوەی باوکی خۆشی دەویست، گوتیان: ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ﴾ بەیانی لەگەڵ ئێمەی بنێرە بۆ گەشت بۆخۆی یاری بکاو چوست‌و چالاکی بنوێنێ، ئیبنوعەبباس ئەڵێ: بۆخۆی یاری بکاو چوست‌و چالاکی بنوێنێ.[1] قەتادەو زەححاك‌و سوودی کەسانی تریش هەر وایان گوتوە.[2] ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ﴾ خۆمان دەوری دەگرین و پارێزگاری لێ دەکەین. لەبەر خاتری تۆ.

﴿قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَـٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴿١٤﴾﴾

### وەڵامی باوکیان

خودای مەزن باسی پێغەمبەرەکەی یەعقوب دەکا، کاتێ کە کوڕەکانی داوایان لێ کرد یوسفیان لەگەڵ بنێرێ بۆ گەشت کردن لە بیاباندا، یەعقوب وەڵامی دانەوەو ﴿قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ﴾ باوکیان گوتی: من دڵگران‌و غەمگین دەبم ئەگەر یوسف بەرن، واتە: زۆرم بەلاوە سەختە ئەو ماوەیە ئێوە دەیبەن‌و لێم جیادەبێتەوە هەتا دەگەڕێتەوە، چونکە زۆری خۆش دەویست، لەبەر ئەوەی نیشانەی چاکەی زۆری لێوە بەدی دەکرد لە سیفەتەکانی پێغەمبەرایەتی لە شێوەو ڕەوشتیا(سەلامی خوایان لێبێ) پاشان گوتی: ﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَـٰفِلُونَ﴾ ترسیشم هەیە گورگ بیخواو ئێوە ئاگاتان لێ نەبێ، واتە: دەترسم ئێوە خەریکی ڕمبازی‌و گەشتی خۆتان بن‌و گورگ بێت بۆی‌و بیخوات، ئێوە پێی نەزانن، کوڕەکان ئەم قسەیان لە دەمی باوکیان وەرگرت، کردیانە بیانوو بۆ ئەو کارەی کە کردیان، بەڵام لەو کاتا دەیانویست باوکیان ڕازی بکەن ﴿قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ

---

[1] الطبري (١٥/٥٧٠).

[2] الطبري (١٥/٥٧١).

﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر گورگ خواردی لە کاتێکا ئێمە دەستەیەکی بەهێزین دیارە ئێمە زیانبارینو ڕوو زەردی تۆ دەبینو مردنمان چاکترە.

﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾﴾

**خستنە خوارەوەی یوسف بۆ ناو بیرەکە**

کاتێ براکانی یوسفیان لای باوکی بردە دەرێ، دوای ئەوەی قسەیان لەگەڵا کرد لەبارەی یوسفەوە، وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ﴾ کاتێ کە بردیانە دەرێ، هەموو بڕیاریان دا کە بیخەن بن بیرەکەوە، وایان نیشاندا لای باوکی، لەبەر خاتری ئەو کە دڵی خۆش بێو ئارامیو هێمنی ڕووی تێبکا، ئەو کارە دەکەن، گوتراوە: کاتێ یەعقوب یوسفی لەگەڵا ناردن گوشی بەخۆیەوەو ماچی کردو دووعای بۆ کرد، سوودیو کەسانی تریش گوتوویانە: هەر ئەوەندە بوو لەبەر چاوی دەریان کرد، ئەو ڕێزە نەماودەستیان کردە سزاو جەزرەبەدانی و، دەستیان کرد بە قسەی ناشیرین پێ گوتنو لێدانی، پاشان بردیانە لای ئەو بیرەی کە بڕیاریان دابوو بیخەنە ناوی، بە گوریسێ بەستیانەوەو شۆڕیان کردەوە ناو بیرەکە، کاتێ کە هانای بۆ هەر یەکێکیان ئەبرد لێی ئەداو قسەی پێ دەگوت، کاتێکیش کە دەستی ئەگرت بە لێواری بیرەکەوە ئەیان کێشا بەدەستیا پاشان شۆڕیان کردەوە ناو بیرەکە هەتا گەیشتە نیوەی بیرەکە گوریسەکەیان قرتاند یوسف کەوتە ناو ئاوەکەو نوقم بوو تێیدا، پاشان سەرکەوتە سەر بەردێ کە لە ناوەڕاستی بیرەکەدا بوو، ڕاغوفەی پێ دەگوترا لەسەری هەڵسایە سەر پێ.[1] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئێمەش ئەوەمان تێگەیاند کە: تۆ لەم کارە ئاگاداریان دەکەیتەوە کە خۆیان هەستی پێ ناکەن. خودای گەورە لێرەدا باسی سۆزو بەزەییو بەخششی خۆی دەکا بەرانبەر یوسف کە لەو کاتی تەنگانەو ناڕەحەتیا ئارامی خستوەتە دڵیو ئاسانکاری بۆ کردوە، ئاگاداری کردووە کە خەم مەخۆو دڵخۆشبەو خۆڕاگرە بەو کارەساتەی بەسەرت هاتووە، چونکە ئەمەی تووشت بووە دەبێتە هۆی ڕزگاربوونتو پاشەڕۆژێکی چاك بۆت، بەوزوانە خودا سەرت دەخات بەسەریاندا، پلەت بەرز دەکاتەوەو پایەداریشت دەکا. ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ کە خۆیان هەستی پێ ناکەن، ئیبنوعەبباس ئەڵێ:

---

[1] الطبري (١٥/٥٧٤).

زۆری پێ ناچێ تۆ هەواڵیان ئەدەیتێ بەو کارەیان بەرانبەرت کردیان، ئەوان نازانن کە تۆ یوسفی‌و هەستی پێ ناکەن[١].

﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَـٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾

**فڕوفێڵی براکانی یوسف لەگەڵ باوکیاندا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ﴾ لە تاریکی ئێوارەدا بە گریانەوە گەڕانەوە بۆلای باوکیان، خودای گەورە لێرەدا باسی براکانی یوسف دەکا کە چۆن خۆیان نارەحەت کردبوو، دوای ئەوەی یوسفیان خستە ناو بیرەکە، لە تاریکایی شەوا بە گریانەوە گەڕانەوەو داخ‌و کەسەری‌و.غەمباری خۆیان بۆ باوکیان دەردەبڕی. پاکانەیان بۆ دەکرد لەسەر ئەو کارەساتەی بەسەریاندا هاتووە ﴿قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَـٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ گوتیان بابە، چووین کێبەکێ بکەین‌و یوسفیشمان لای کەلوپەلەکانمان بەجێ هێشت، گورگ خواردی، ئەوەی باوکی یوسف لێی دەترساو ئارامی لێ بڕابوو دەترسا ڕوویدا، ڕوویدا، براکانی یوسف گوتیان ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ﴾ هەرچەندە ڕاستیشت پێ دەڵێین، تۆ بڕوا بە ئێمە ناکەی، سۆزێکی گەورەیان دەردەبڕی دەیانویست هەر چۆنێ بووە دڵی باوکیان بۆلای خۆیان ڕاکێشن، دەیان گوت: ئێمە دەزانین کە تۆ بڕوا بە قسەکانمان ناکەی، چۆن تۆ ئێمە تاوانبار دەکەی لەو بارەیەوە، خۆت دەترسای یوسف گورگ بیخوا، گورگ خواردی، تۆ هەقی خۆتە بڕوامان پێ نەکەی، چونکە ئەوەی ڕوویداوە زۆر نامۆیە لە عەقڵەوە دوورە، سەیریش لەوایە، لەم گەشتەی ئێمەدا ڕوویداوە ﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ﴾ براکانی یوسف کراسەکەیان هێنایەوە خوێنی درۆینەی پێوە بوو، ئەمەیش یەکێ بوو لەو فڕوفێڵانەی کە لەسەری ڕێکەوتن، ئەوان ویستیان مەڕەکەیان بکوژن‌و دایماڵن، موجاهیدو سوودی کەسانی تریش باسیان کردووە گوتوویانە: سەریان بڕی‌و کراسەکەی یوسفیان پێ خوێناوی کرد[٢]، وایان دەرخست ئەمە کراسەکەی یوسفە کە گورگەکە خواردی لەبەریا بوو هەندێ لە خوێنەکەیان پێوە دابوو، بەڵام لەبیریان چوو بوو کونی تێ بکەن، بۆیە ئەو کارەیان لای پێغەمبەر یەعقوب(سەلامی خوای لێبێ) جێی بڕوا نەبوو. گومانی لە دڵا بۆ پەیدابوو کە ڕاستی پێ ناڵێن بۆیە

---

[١] الطبري (١٥/٥٧٧).

[٢] الطبري (١٥/٥٨٠).

وەڵامی دانەوەو پێی گوتن: ﴿بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ دیارە دڵی خۆتان شتێکی لا جوان کردوون، جا ئارام دەگرم بە ئارام گرتنێکی چاك لەسەر ئەو کارەی کە بڕیارتان لەسەر داوە، هەتا خودا دەروویەکم لێ دەکاتەوە بە سۆزو یارمەتی خۆی ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ لەسەر ئەوانەش کە دەڵێن، خودا بە هانامەوە دێ، واتە: لەسەر ئەو درۆو فرۆفێڵانەی ئێوە دەیکەن.

﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾﴾

**دەرهێنانی یوسف لە بیرەکەو فرۆشتنی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ﴾ کاروانێ هات، ئاوکێشیان نارد، دۆڵچەی داهێشت گوتی ئەی خەڵکینە ئەمە کوڕێکی بچکۆلەیە، خودای گەورە باسی یوسف دەکا چی بەسەرهات کاتێ خستیانە ناو بیرەکەو بەتەنیا لەناو ئەو بیرەدا بەجێیان هێشت، یوسف سێ ڕۆژ لەناو ئەو بیرەدا مایەوە وەك ئەبوبەکری کوڕی عەیاش ئەڵێ، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق گوتوویەتی: کاتێ براکانی خستیانە ناو بیرەکە، بە دەوری بیرەکەدا ئەو ڕۆژانە دانیشتن تا بزانن چی دەکاو چی بەسەردێ، خودای گەورە کاروانیەکی بۆ نارد، لە نزیکی ئەو بیرە دابەزین و ئاوکێشێکی خۆیان نارد، کاتێ گەیشتە لای بیرەکە دۆڵچەکەی داهێشتە ناو بیرەکە، یوسف خۆیی پێوە هەڵواسی ئاوکێشەکە دەری هێناو مژدەی پێ دا، ﴿قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ﴾ گوتی: مژدە ئەمە کوڕێکی بچکۆلەیە. ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ﴾ ئەوان وەك کالای بازرگانی شاردیانەوە، عەوفی ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ﴾ یانی: براکانی یوسف هیچ باسی یوسفیان نەکردو نەیان گوت برای ئەوانە، یوسفیش خۆی ئاشکرا نەکرد، لەترسی ئەوەی نەوەك براکانی بیکوژن، فرۆشتنەکەی بەلاوە چاکتر بوو، باسی براکانی بۆ ئاو هەڵکێشەکە کرد، پیاوەکە بانگی لە هاوەڵەکانی کرد ﴿يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ﴾[1] مژدە ئەمە کوڕێکی بچوکە، دەفرۆشرێ، براکانی فرۆشتیان ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ خودا ئاگادارە بەوەی ئەوانە دەیکەن. واتە: خودا لە براکانی یوسفو ئەوانەیش کڕیان ئاگادارە، خودا دەیتوانی نەهێڵێ ئەو کارە بکەن یوسف ڕزگار بکا، بەڵام خودای گەورە لە پێشەوە بڕیاری خۆی داوەو دەبێ ئەوەی بڕیاری داوە بێتەجێو ڕووبدا، هەموو شتێکی پڕە لە کارزانی، ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ

[1] الطبري (٦/١٦).

ﭐللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[1] وەدی هێنان‌و فەرماندان هەر بۆ ئەوە پاك‌و بێ عەیبە خودایێ كە پەروەردگاری گشت جیهانە، ئەم ڕووداوە ڕوونكردنەوەو ئاگاداریەكی تیایە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) كە ئەفەرموێت من ئاگام لێیە كە هۆزەكەت ئازارت ئەدەن، وە من دەتوانم نەهێڵم ئازارت بدەن، بەڵام تا ماوەیەك مۆڵەتیان ئەدەم، لە دوایدا وا دەكەم پاشەڕۆژ بۆ تۆ بێ‌و ببیتە فەرمان ڕەوا بەسەریانەوە، وەك چۆن پاشەڕۆژی یوسفم وا لێ كردو بووە بەفەرمان ڕەوا بەسەر براكانیەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ ﴾ بە نرخێ كەم بە چەند درهەمێ فرۆشتیان، موجاهیدو عیكریمە گوتیان: خودا فەرموویەتی براكانی بە نرخێكی كەم فرۆشتیان، (البخس) یانی: كەم.[2] وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴾[3] نە لە كەم بوون دەترسێ‌و نە لە غەدر لێكردن. براكانی لە بری یوسفا بە نرخێكی كەم ڕازی بوون، ﴿وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾ بێ نیازیش بوون لەوە، نەشیان دەویست. خۆ ئەگەر داوایان بكردایە بە خۆڕایش پێیان ئەدان، ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو زەحجاك ئەڵێن: ئەو زەمیرە (واوەكە) كە لە ﴿ وَشَرَوْهُ﴾ دایە، دەگەڕێتەوە بۆ براكانی یوسف[4]. چونكە ئەوان بە كەمترین نرخ فرۆشتیان بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ ﴾ چەند درهەمێكی كەم، ئیبنومەسعودئەڵێ: بە بیست درهەم فرۆشتیان.[5] ئیبنوعەبباس‌و نەوفی بەكالی و سوودی‌و قەتادەو عەتیەی عەوفی ئەمەیان لێ زیاد كردووە: دوو درهەم، دوو درهەم بەشیان كردلەناو خۆیاندا،[6] زەححاك لەمەدا كە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾ بێ نیان بوون لەوە، چونكە ئەوان ئاگاداری پێغەمبەریەتی‌و پلەو پایەكەی نەبوون لەلای خودای گەورە.

---

[1] الاعراف (٥٤).

[2] الطبري (١٢/١٦).

[3] الجن (١٣).

[4] الطبري (١٦/١٤-١٧).

[5] الطبري (١٢/١٦).

[6] الطبري (١٤/١٦).

﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾﴾

**یوسف له میسردا**

خودای مەزن باسی سۆزو بەزەیی خۆی دەکا بەرانبەر بە یوسف (سەلامی خوای لێبێ) دڵی ئەو کەسەی کە لە میسر کڕی وا لێ کرد کە گرنگی پێبداو ڕێزی لێ بگرێ، بە خێزانەکەیشی گوت کە ئاگای لێبێ، چاکەو پیاوەتی تیا بەدی دەکرد، بۆیە بە ژنەکەی گوت وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ ئەو کەسەی لە میسر کڕی، بە ژنەکەی خۆی گوت، ڕێزی بگرە بەڵکو سوودی لێ وەرگرین، یان بیکەینە کوڕی خۆمان، ئەو کەسەی کڕی عەزیزی میسر بوو، واتە: وەزیر بوو لە وڵاتی میسر، ئەبوئیسحاق ئەڵێ لە ئەبوعوبەیدەوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوەئەڵێ: چاکترین پێشبینیکەر سێ کەس بوون: عەزیزی میسر کاتێ گوتی بە ژنەکەی ﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ﴾ واتە: ڕێزی یوسف بگرە، ئەو ژنەیش گوتی بە باوکی ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ﴾[1] ئەی باوکە بیگرە بە کرێ، یانی: مووسا بکە بە شوان و کرێی بدەرێ. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ بەم شێوەیە یوسفمان لەم سەر زەمینا زۆر باش دامەزراند، بۆ ئەوەی فێری بکەین چۆن خەونەکانیش لێك بداتەوە. موجاهیدو سوودی ئەڵێن: ﴿تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ یانی: خەون لێکدانەوە.[2] ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ﴾ خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە. واتە: مەیلی لە هەر شتێ بێ، ڕێی لێ ناگیرێو دژایەتی ناکرێو هیچ شت نابێتە لەمپەر لە ڕێیدا، بەڵکو زاڵە بەسەر هەموو شتێکا. سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ﴾ئەڵێ: هەرچی بوێ دەیکات.[3] ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەم خەڵکە نازانن، تێناگەن لە کارزانیو وەدیهێنانو سۆزو بەزەیی خودا، کە هەرچی ویست دەیکا.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ وەختێ بوو بە پیاوێکی تەواو فەرمانڕەواییو زانیاریمان پێدا، یانی: لەناو ئەو هۆزانەدا خودا هەڵی بژاردو کردی بە پێغەمبەر(سەلامی

---

[1] القصص (٢٦).

[2] الطبري (٢٠/١٦).

[3] الطبري (٢١/١٦).

خوای لێبێ) ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئێمە ئاوا پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە. واتە: یوسف چاکە خواز بوو لە کارەکەیاو فەرمانەکانی خودای مەزنی جێبەجێ دەکرد.

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣﴾

## خۆشەویستی ژنەکەی عەزیزی میسر بۆ یوسف و فێلکردن لێی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ﴾ ئەو ژنەی کە یوسف لەماڵی ئەوا بوو، تەمای تێ کرد، دەرگاکانی لەسەر داخست، خودای مەزن باسی ژنەکەی عەزیزی میسر دەکا کە یوسف لەماڵیا بوو لە میسر، ئەوە بوو مێردەکەی پێی گوت: ڕێز لە یوسف بگرێ، بەڵام ژنەکە شەیدای یوسف بوو، دەیویست دەستی لەگەڵا تێکەڵ بکا، چونکە زۆری خۆش دەویست، یوسف ئەوەندە جوان و ڕێ کەوتوو شێوە شیرین بوو، واکاریگەری خستەسەرئەو ژنە کە خۆی بۆ برازێنێتەوەو دەرگاکانی لەسەر دابخاتو داوای لێ بکا لەگەڵی ڕابوێرێ، ﴿وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَ﴾ گوتی: بەپەلە وەرە پێشەوە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە، یوسف بەوە ڕازی نەبوو، زۆر بە توندی بەرپەرچی دایەوەو ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَ﴾ ئەی پەنا بە خودا، ئەو خاوەنمە ڕێزی گرتووم، ئەوانە وتەی (الرب) یان بۆ گەورەو خاوەن پلەو پایە بەکاردەهێنا، واتە: مێردەکەت گەورەی منەو زۆر ڕێزی لێ گرتووم، من بە داوێنپیسی پاداشتی نادەمەوە لەگەڵ خێزانەکەیا، ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بێگومان ستەمکاران ڕزگار نابن، ئەمە قسەی موجاهیدو سوودیو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تریشە. قورئانخوێنەکان لەم ڕستەیەدا کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَيۡتَ لَكَ﴾ بۆچوونی جیاوازیان هەیە، زۆربەیان (ها) کەیان بە مەفتوحیو (یا)کەیان بە ساکنیو (تا)کەیان بە مەفتوحی خوێندووەتەوە، ئیبنوعەبباس و موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن، یانی: بانگی یوسفی کرد لەگەڵیا ڕابوێرێ.[1] بوخاری ئەڵێ: عیکرمە گوتوویەتی ﴿هَيۡتَ لَكَ﴾ یانی: زوو وەرە بۆت ئامادە کراوە. بە زمانی حۆرانی. هەر بەم شێوەیە بوخاری بە موعەلەقی باس کردووە.[2] هەندێکی تر بەم شێوەیە خوێندوویانەتەوە، (هِئتُ لك) بە کەسری (هاء)ەکەو دانانی همزە لە جێی (یا) ئەکەو بە زەمەی (تا) ئەکە یانی: بۆت ئامادەکراوە، ئەو کەسانەی ئەم خوێندنەوەیان لێ ڕیوایەت کراوە

---

[1] الطبري (٢٧/١٦).

[2] فتح الباري (٢١٤/٨).

ئیبنوعەبباس و ئەبوعەبدوڕەحمانی سویلەمی و ئەبووائل و عیکرمە و قەتادەیە، هەموو مانایان کردووە بە (تهیأتُ لك) بۆم ئامادەکردووی، عەبدوڵڵای کوڕی ئیسحاق بە (هَيْتُ) خوێندویەتەوە، بە فەتحەی هاو زەمەی (تا) یەکە. ئەبوعوبەیدە موعەمەری کوڕی موسەنائەڵێن: (هَيْتَ) نە دەکرێ بە موسەناو نەدەکرێ بە جەمع و نە بە موئەنەس بەڵکو بۆ هەموویان بە یەك شێوە بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (هَيْتَ لكَ، و هَيْتَ لكم، و هَيْتَ لكما، و هَيْتَ لكن، و هَيْتَ لهن).

﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾ ئەو ژنە پەلاماری ئەمی داو، ئەمیش ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەبوایە پەلاماری ژنەکەی ئەدا، گوتراوە: مەبەست بە ﴿وَهَمَّ بِهَا﴾ ئەو وردو کردانەیە کە بە دڵا دێ، بەغەویش گێڕاویەتەوە لە هەندێ زانایانی توێژەرەوە، پاشان بەغەوی فەرموودەکەی عەبدوڕەزاقی هێناوە لە موعەمەرەوە لە هەممامەوە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن ئەفەرموێت: وەختێ عەبدەکەم هات بە دڵیا چاکەیە بکا بە چاکە بۆی بنوسن، ئەگەر چاکەکەی کرد، بە دە ئەوەندەی چاکەکەی، چاکەی بۆ بنوسن، وە ئەگەر بە دڵیا هات خراپەیە بکات، ئەگەر نەی کرد، لەباتیا چاکەیەکی بۆ بنوسن، چونکە لەبەر خاتری من وازی لەو خراپەیە هێناوە، ئەگەر خراپەکەی کرد بە ئەندازەی خراپەکەی، خراپەی بۆ بنوسن)[1]. ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە بە چەند دەربڕین، ئەمە یەکێکە لەو وتانە[2]. گوتراویشە: هات بە دڵی یوسفا لە ژنەکە بدا، بەڵام ئەو بەڵگەی کە بینی قسەی زۆری لەسەرە، ئیبنوجەریرئەڵێ: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە بگوترێ: بێگومان یوسف نیشانەیە لە نیشانەکانی خودای بینی، سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەوەی کە بە دڵیا هات، دەگونجێ ئەو بەڵگەیە وێنەی یەعقوب بوو بێ، وە دەبێ وێنەی فریشتەیەك بووبێ، لەوانەیشە شتێکی بینیبێ نوسراو بوبێ تاواز بێنێ لەو کارە. هیچ بەڵگەیەکی تەواو نیە کە یەکێ لەو شتانە دیاری بکا. ڕاستیەکەی ئەوەیە، ئەوە بوترێ کە خودای مەزن فەرموویەتی، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ﴾ بۆ ئەوەی خراپەو داوێنپیسی لێدوور بخەینەوە. واتە: بەڵگەمان نیشانداو دوورمان خستەوە لەو شتەی خەریك بوو تێی بکەوێ، هەر بەو شێوەیە لە هەموو

[1] البغوي (٢/٤٢٠). فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٣/٤٧٣)، مسلم (١/١١٧).

کارەکانیا خودای گەورە دووری خستوەتەوە لە خراپەو کاری بەد، ﴿إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ ئەو یەکێ بوو لە عەبدە دڵپاکەکانمان. واتە: لە عەبدە هەڵبژێراوو پاکو بێگەردەکانمان (سەلامی خوای لێبێ)[1].

﴿وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ۚ قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى ۚ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ ۖ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ۚ وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ ۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ﴾ بە کێبەرکێ هەردوو گەینە لای دەرگاکە، کراسەکەی یوسفی لای پشتەوە دادڕی، خودای گەورە باسی حاڵی یوسفو ژنەکە دەکا کاتێ هەردووکیان بەرەو دەرگاکە ڕایان کرد، یوسف هەڵدەهاتو ژنەکەیش بە دوایدا ڕایدەکرد بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوەو لەماڵ دەرنەچێ، لە بەردەرگاکە پێی گەیشتو کراسەکەی لە دواوە گرتو دایدڕی، بەڵام چۆن دادڕینێ، گوتراوە: وا دای دڕی پارچەی لێ کردەوە، یوسف خۆی نەئەدا بە دەستەوەو هەر ڕای دەکرد، ئەویش هەر بە دوایەوە بوو، ﴿وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ﴾ هەردوویان (یوسفو ژنەکە) تووشی گەورەکەیان (مێردی ژنەکە) هاتن لەبەر دەرگاکەدا، ئا لەو کاتەدا ژنەکە هەرچی فێڵو فڕی هەبوو خستیە کارو گوتی بە مێردەکەی، ئەو دەردو نەخۆشیەی خۆی هەموو دایە پاڵ یوسف، یوسفی بە داوێنپیسی تاوانبار کرد ﴿قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ژنەکە گوتی: سزای کەسێ چیە لەگەڵ ماڵو خێزانی تۆ تەماداری داوێنپیسی بێ، جگە لە زیندان یا جەزرەبەیەکی بە ژان. واتە: دەبێ فەلاقەو تێهەڵدانێکی باش بکرێ، لەو کاتەدا یوسف بەڕاستی خۆی سەرکەوتو بێ تاوانی خۆی دەربڕی لەو تۆمەتی ناپاکیە کە ژنەکە دابویە پاڵی ﴿قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى﴾ یوسف گوتی: ئەو ژنە تەماعی کردبووە من، باسی کرد کە شوێنی کەوتوەو لە دواوە کراسەکەی ڕاکێشاوە دای دڕیوە، ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ یەکێ لە خزمەکانی ئەو ژنە هەڵیدایە: ئەگەر کراسی ئەم (یوسف) لەلای

---

[1] الطبري (١٦/٤٩).

پێشەوە دڕاوە، ژنەکە ڕاست دەکا ئەم درۆزنە، ویستویەتی داوێنپیسی لەگەڵا بکا، ئەوەی ژنەکە دەیلێت ڕاست دەکا، پاڵی پێوە ناوەو بەرگری لە خۆی کردووە کراسەکەی دڕاوە قسەی ژنەکە ڕاست دەردەچێ ﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر کراسەکەیش لە پشتەوە دادڕاوە، ژنەکە درۆی کردوە، ئەو (یوسف) ڕاست دەکا. هەر بەو شێوەیش دەرچوو کە یەکێ لە خزمەکانی گوتی، کاتێ لە دەستی ژنەکە هەڵدەهات، ئەویش شوێنی کەوتبوو لە پشتەوە کراسەکەی گرت بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوەو نەیەڵێ دەرچێ کراسەکەی یوسف لە دواوە دادڕا، ڕای جیاواز هەیە لە بارەی ئەم شایەتەوە: ئایا ئەو شایەتە گەورە بووە یان بچوك بووە؟ عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ﴾ئەڵێ: ڕیشی هەبوو، واتە: گەورە بووە، سەوری ئەڵێ: لە جابیرەوە لە ئیبنوئەبی مولەیکەوە لە ئیبنوعەبباسەوەئەڵێ: لە پیاوە تایبەتیەکانی پاشا بووە، موجاهیدو عیکرمەو حەسەنو قەتادەو سوودیو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق کەسانی تریش ئەڵێن: شایەتەکە پیاوێ بووە، عەوفی ئەڵێ لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ﴾وتویەتی: منداڵی بووە لە بێشکەدا.[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئەبوهورەیرەو هیلالی کوڕی یەسافو حەسەنو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاکی کوڕی موزاحیمەوەئەڵێن: منداڵێ بووە لە ماڵەکەدا.[2] ئیبنوجەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ﴾ کاتێ مێردەکەی بینی کراسەکەی یوسف لە پشتەوە دادڕاوە، واتە: کاتێ مێردەکەی بۆی دەرکەوت یوسف ڕاستی گوتوەو ژنەکەی درۆی کردووەو بوختانی بۆ هەڵبەستووە ﴿قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ﴾ گوتی: بەڕاستی ئەمە لە فروفێڵی ئێوە ئافرەتانە، دەتەوێ ناموسی ئەم لاوە لەکەدار بکەی ئەمەیش فێڵێکە لە فێڵەکانی ژنان، ﴿إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ بەڕاستی فروفێڵی ئێوە زۆر گەورەیە، پاشان فەرمانیدا بە یوسف (سەلامی خوای لێبێ) ئەوەی ڕوویداوە ئاشکرای نەکاو بیشارێتەوە ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ عەزیز گوتی: یوسف واز بێنە لەم کارەو باسی مەکە لای هیچ کەسێ، ﴿وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ﴾ ژنەکە تۆش بۆ گوناهەکەت داوای لێخۆش بوون بکە. مێردی ژنەکە (عەزیز) پیاوێکی زۆر نەرم و لەسەرخۆ بوو، چاوپۆشی لە ژنەکەی کرد، چونکە کەسێکی بینیوە لەلایدا هیچ کەسێ خۆی بۆ ناگیرێ، بۆیە گوتی بە خێزانەکەی داوای لێخۆش بوون بۆ گوناهەکەت بکە، واتە: ئەوەی بەسەرتا هاتوەو نیازی

---

[1] الطبري (١٦/٥٦).

[2] الطبري (١٦/٥٤-٥٥).

خراپەت بووە لەگەڵ ئەو لاوەدا بیکەی و پاشان بوختانێکیشت بۆ هەڵبەستووە کە ئەو ئاگای لێی نیە ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ﴾ بەڕاستی تۆ لە دەستەی تاوانبارانی.

﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِى ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾
فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا
رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى
لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ
رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾
فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾﴾

## گەیشتنی ئەو هەواڵە لە لای ژنانی ئەو شارەو فرۆفێڵیان بەرانبەر بە یوسف

خودای مەزن ئەفەرموێت: هەواڵی یوسف و ژنەکەی عەزیزی میسر بڵاوبووەوە بەناو شاری میسرا، هەتا وای لێ هات ئەو خەڵکە باسیان دەکرد، ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِى ٱلْمَدِينَةِ﴾ ژنانی شار بڵاویان کردەوە، وەك ژنانی سەرۆك و کاربەدەستان، ئەو کارەی خێزانی عەزیزیان پێناخۆش بوو بە شورەییان دەزانی و لۆمەیان دەکرد دەیان گوت ﴿ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ﴾ ژنی عەزیز حەز لە غولامەکەی خۆی دەکا، دەیەوێ داوێن پیسی لەگەلا بکا، ﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾ لە دڵداریدا سوتاوە وشەیدای بووە، واتە: وای لێهاتووە خۆشەویستیەکەی گەیشتوەتە پەڕەی دڵی زەحاك ئەڵێ: لە ئیبنوعەبباسەوە: (الشعف) خۆشەویستی کوشندە، (الشغف) کەمترە لەوە، (الشغاف) یانی: پەردەی (پۆشاکی) دڵ. ﴿إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ وادیارە تەواو لە ڕێگە (دەرچووە). واتە: لەو کارەیدا کە ئەوەندە غولامەکەی خۆشدەوێ ودەیەوێ داوێنپیسی لەگەلا بکا، ﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ دوای ئەوەی تیروتانەی ئەوانی بیست، هەندێ گوتوویانە: (بقولهنَّ) واتە: دوای ئەوەی قسەکەی ئەوانی بیست وتبویان: عەشق هۆشی بردووە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: هەواڵی جوانی یوسفیان پێ گەیشتبوو، حەزیان دەکرد چاویان پێی بکەوێ، ئەو قسەیان بۆیە کرد هەتا پێی بگەن و چاویان پێی بکەوێ و ببینن، لەو کاتەدا ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾ ناردی بە دوایانا و داوای لێکردن ببنە میوانی لە ماڵەکەی خۆی، ﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا﴾ شوێنی شان دادانی ئامادەکرد بۆیان لەگەڵ خواردەمەنیدا. ئیبنوعەبباس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو حەسەن و سوودی و کەسانی تریش ئەڵێن: (متكأ)یانی ئەو شوێنەی کە فەرشی تیا

ڕادەخرێو پاڵپشتی تێدایە، و خواردنێکی ئامادە کراوی وای تێدا ئەخورێ کە بە چەقۆ لەت دەکرێت وەك پرتەقاڵ و ئەو میوانەی وەك پرتەقاڵ وان[1]. بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ هەریەکەی چەقۆیەکی پێدان، ئەمەیش فێڵێ بوو ژنەکە کردی بەرانبەر ئەو فێڵەی ئەوان کردیان تا یوسف ببینن. ﴿وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ﴾ گوتی: بۆیان وەرە دەرێ، هەر کە بینیان حەپەسان، ژنەکەی عەزیز یوسفی لە شوێنێکی تر شاردبووەوە، کاتێ هاتو چاویان پێی کەوت، زۆر ڕێزیان لێ گرتو حەپەسان ﴿وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ دەستەکانی خۆیان بڕی، هۆشیان لای خۆیان نەما کە بینیان، وایان دەزانی بە چەقۆکەیان پرتەقاڵەکە دەبڕن، لەباتی پرتەقاڵەکەدەستی خۆیان دەبڕی. ئەمە قسەی زۆرێکە لە زانایان[2] هەندێکی تر لە زانایان وتویانە، دوای ئەوەی ژنەکان خواردنی باشیان خواردو حەسانەوە، میوەی پرتەقاڵی لەبەر دەستیاندا دانا یەکی چەقۆیەکی پێدانو گوتی: ئایا دەتانەوێ سەیری یوسف بکەن؟ گوتیان: بەڵێ، ناردی بە شوێنی یوسفاو فەرمانی پێکرد خۆی دەرخات بۆیان، کاتێ کە چاویان پێی کەوت دەستی خۆیان بڕی، پاشان گوتی بە یوسف کە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە پێشەوەو لەپاشیشەوە جوان ببینن، یوسف گەڕایەوەو ئەوان دەستی خۆیان لەت لەت کردبوو، کاتێ کەهەستیان کرد بە ئێشو ژانی دەستیان هاواریان لێبەرزبوویەوە، ژنەکەی عەزیز پێی گوتن: ئێوە بە بینینی جارێ ئەوەتان بەسەر خۆتان هێنا، ئیتر من چۆن لۆمە دەکرێم؟ ﴿وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ ژنەکان گوتیان: پاکیو بێ گەردی بۆ خودا ئەمە مرۆڤ نیە، بێگومان ئەمە فریشتەیەکی بەڕێزو خۆشەویستە. پاشان گوتیان بە ژنەکەی عەزیز: پاش ئەوەی ئێمە ئەمەمان بینی ئیتر لۆمەی تۆ ناکەین، چونکە هەرگیز لەناو ئادەمیا لە شێوەو نزیك لە شێوەی یوسفیان نەدیبوو، چونکە یوسف (سەلامی خوای لێبێ) نیوەی جوانی دونیای پێدرا بوو، وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە فەرموودەی شەو ڕەویەکەدا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆشت بەلای یوسفا (سەلامی خوای لێبێ) لە ئاسمانی سێهەمدا فەرمووی: کە بینی نیوەی جوانی پێدرا بوو[3]! موجاهیدو کەسانی تریش گوتیان: ئەی پەنا بە خوا ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾ ئەمە مرۆڤ نیە.[4] ﴿قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ﴾ گوتی: ئەمە ئەو کەسەیە کە لەسەر ئەو سەرزەنشتی منتان دەکرد، ئەمەی گوت

---

[1] الطبري (١٦/٧١-٧٢).

[2] الطبري (١٦/٧٦-٧٨).

[3] مسلم (١/١٤٦).

[4] الطبري (١٦/٨٤).

هەتا تێبگەن کە هەقی خۆیەتی کە یوسفی زۆر خۆش بوێ لەبەر جوانیی و ڕێکو پێکیەکەی، ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَ﴾ ویستم ببێتە دۆستمو دەستم لەگەڵ تێکەڵ بکا خۆی ڕاگرت و نەیکرد هەندێ لە زانایان گوتویانە: کاتێ ژنەکان جوانی دەرەوەیان بینی، ژنەکەی عەزیز باسی سیفەتە چاکەکانی یوسفی بۆ کردن کە ئەوان لێی ئاگادار نین کە بریتیە لە داوێن پاکی لەگەڵ ئەو هەموو جوانیەدا، پاشان گوتی: هەڕەشەی لە یوسف کردوەو پێی گوتوە ﴿وَلَئِن لَّمۡ يَفۡعَلۡ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسۡجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ ئەگەر ئەوەی من لەوم دەوێ بیکا، ئەو نەیکا، دەبێ بچێتە زیندانو لە پیسوایان دەبێت، لەو کاتەدا یوسف (سەلامی خوای لێبێ) پەنای بردە بەر خودای گەورە لە خراپەو فڕوفێڵی ژنان ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ﴾ گوتی: ئەی پەروەردگاری من، زیندانم پێ خۆشترە لەوەی ئەوان لێم داوا دەکەن، ئەگەر تۆ گەڕی ئەوانەم لێ لانەدەی دڵم دەچێ بۆلایانو ﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ یەکێك دەبم لە نەزانان. واتە: ئەگەر بمدەیتە دەستی نەفسی خۆم، توانام نیە بەسەریازاڵ ببم بە یارمەتی تۆ نەبێ، توانای هیچ سودو زیانێکم نیە، پەنا هەر بە تۆیەو داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکرێ، هەرگیز نەم سپێریتە نەفسی خۆم ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ پەروەردگاری نزاکەی قەبووڵ کرد، بۆیە خودای گەورە زۆر چاك یوسفی لاداو بەرگری لێکردو بە توندی پاراستی لەو ژنە، لەجێی ئەوە زیندانی هەڵبژارد، ئەمەیش بەرزترین پلەی داوێنپاکیە لەگەڵ ئەو لاوی و هەموو جوانیو ڕێكو پێکیەدا ژنەکەی عەزیزی میسر کە خاوەن دەسەڵاتو سامانو زۆر جوانو ڕێكو پێکیش بوو، داوای لێکرد کە دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا، نەی کردو زیندانی هەڵبژارد لەجێی ئەوە لە ترسی خوداو بە هیوای پاداشتی ئەو، بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (حەوت دەستەهەن خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی لە ڕۆژێکا هیچ سێبەرێ نیە تەنیا سێبەری ئەو نەبێ: پێشەوای دادپەروەر، وە لاوێ لە خوا پەرستیا گەورە بووبێ، وە پیاوێ دڵی پابەند بێ بە مزگەوتەوە کاتێ لە مزگەوت چووە دەرەوە هەتا دەگەڕێتەوە بۆی، وە دوو پیاو لەبەر ڕەزای خوا یەکیان خۆش ویستبێ، لەسەر ئەوە یەکیان گرتبێو لەسەر ئەوەیش جیا بووبنەوە، وە پیاوێکیش خێرێکی کردبێ وا ئەو خێرەی کردبێ، و شاردبێتیەوە لای چەپی نەی زانیبێ بەوەی لای ڕاستی بەخشیویەتی، وە پیاوێك ژنێکی خاوەن پلەو خاوەن جوانی داوای لێبکا (بۆ دەست تێکەڵ کردن لەگەڵیا)ئەویلێت: من لە خودا دەترسم، وە پیاوێ بەتەنیا یادی خودای کردبێ و چاوەکانی فرمێسکی پێدا هاتبێتە خوار)[1].

---

[1] فتح الباري (١٦٨/٢)، مسلم (٧١٥/٢).

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ ﴾

**بڕیاردان بە زیندانیکردنی یوسف و جێبەجێکردنی بڕیارەکە**

خـوداى مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴾ پاشـان بەرژەوەندییان لەوەدا بینی دواى ئەو هـەموو نیشانانەش تـا ماوەیـەك زیندانی بكـەن، ئـەوەیش دواى ئەوە بۆیان دەركەوت كە بێتاوانەو بەڵگەیش زۆر بوو لەسەر ڕاستی قسەكانی یوسف و (سەلامی خـواى لێبـێ) پاكداوێنی و بێگـەردی، وا دیاربوو (والله أعلم) لەبـەر ئـەوە زینـدانیان كـرد، لـەناو شـارا بـڵاو بووبووەوە كە ژنەكەى عەزیزی میسر حەز لـە یوسف دەكا، دەیـەوێ دەسـتی لەگـەڵا تێكـەڵ بكا، بۆ شاردنەوەى ئەو دەنگو باسە گوتیـان یوسـف (سـەلامی خـواى لێبـێ) نیـازى خراپـی بـووە بەرانبـەر ژنەكەى عەزیزی میسر، بۆیە زیندانیان كردوە!! هەر لەبەر ئەوە بوو كاتێ پاشـاى گـەورەى میسـر لـە كۆتایی ماوەكەدا، ناردی بە شوێنیا، بەڵام یوسف ڕازى نەبوو بێتـە دەرەوە لـە زینـدان هـەتا بێتـاوانی دەر نەكەوێ لەسەر ئەو تۆمەتە خراپەى بۆى هەڵبەسترا بوو. كاتێ بڕیـارى ئـەوە درا كـە بێتاوانـە، لـە زیندان هاتە دەرەوە، دەركەوت كە یوسف (سەلامی خواى لێبێ) زۆر پاك و بێگەرد بووە.

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾

**دوو زیندانی لە بارەى لێكدانەوەى خەونەكانیانەوە پرسیار لە یوسف دەكەن**

خـوداى مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ دوو لاو لەگەڵ ئەو چوونە زیندان، یەكێكیان گوتی: من خەونم دیوە تـرێم دەگوشـی، ئـەوى تـر گـوتی: مـن لـە خەوما نانم بەسەر سەرەوە بـوو، باڵنـدە لێیـان دەخـوارد، خـەوەكانمان بـۆ لێك دەرەوە، ئێمـە تـۆ وا دەبینین لە پیاو چاكان بی. قەتادە ئەڵێ: یەكێ لەو دوو لاوە مەیگێڕى ئەو پاشـایە بـوو، ئـەوى تریـان نانەواى ماڵی پاشا بوو.[1] پاشان هەردوو لاوەكە خەویان بینـی بـوو، داوایـان كـرد لـە یوسـف (سـەلامی خواى لێبێ) بۆیان لێكداتەوە.

﴿ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا

[1] الطبري (١٦/٩٥).

كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾﴾

**یوسف دوو زیندانیەكەی بانگ كرد بۆلای ئەوەی كە تەنیا خودا بناسن پێش لێكدانەوەی خەوەكەیان**

یوسف (سەلامی خوای لێبێ) گوتی بە دوو لاوەكە هەر خەوێ ببینن و هەر جۆرە خەوێ بێ ئەو دەزانێ مانای بكاو لێكی بداتەوە بۆیان، پێش ئەوەی ڕووبدا هەواڵیان بداتێ، بۆیە یوسف گوتویەتی، وەك خودای مەزن فەرموویەتی ﴿قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ﴾ گوتی: سبەینێ بەر لەوەی خواردنە كەتان بۆ بێت، من هەواڵی خواردنەكەتان ئەدەمێ ،هەرئاواش مانای خەونەكەتان پێ دەڵێم، مووجاهیدئەڵێ: یوسف دەڵێت: بەر لەوەی خواردنتان بۆ بێت، من هەواڵەكەیتان ئەدەمێ، سوودیش هەروای گوتوە[1]. ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ ئەمەیش لەو بەهرانەیە پەروەردگارم فێری كردووم من ناسینی ئەوانەم واز لێهێناوە كە بڕوایان بە خوا نیەو لاشیان وایە قیامەت نایەت، بە تەمای پاداشت و تۆڵەی ڕۆژی قیامەت نین ﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ من شوێنی ئاینی باوانی خۆم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب كەوتووم، یوسف (سەلامی خوای لێبێ) ئەڵێ: ڕێگای خوانەناسی و بتپەرستیم بەجێهێشتوەو كەوتومەتە سەر ڕێگای ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خودا لە هەموویان بێ) ژیانی ئەو كەسانەی كە ڕاستە ڕێ دەگرنە بەرو شوێنی ڕێڕەوی پێغەمبەران دەكەون و پشت دەكەنە ڕێگای گومڕایان هەر ئاوایە، خودای مەزن شارەزایی دەخاتە دڵی، شتی وای فێر دەكات كە نەیزانیوە، دەشیكاتە پێشەوا بۆ ئەوەی خەڵكی چاوی لێبكەن لەچاكەدا بانگی خەڵكیش دەكات بۆ سەر ڕێی ڕاست ﴿مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بە ڕەوامان نەزانیوە هیچ شت بە شەریكی خودا بزانین، ئەمەیش لە چاكەی خوداوەیە كە دەربارەی ئێمەو خەڵكی كردوویەتی، بەڵام بەشی زۆری خەڵكی هەر ناشكورن. واتە: ئەم یەكخواپەرستیەمان كە شایەتیدانە بەوەی جگە لە خودا هیچ پەرستراوێ نیە، خودا یەكەو شەریكی نیە، خودای مەزن فەرمانی بە ئەمە پێكردووین و پێویستە بانگخوازیش بین و ئەو خەڵكە بۆ ئەوەبانگ بكەین، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵكە سوپاسگوزاری خودا نین و ئاگاداری بەهرەكانی خودا نین، كە یەكێ لەو بەهرانە ناردنی پێغەمبەرانە

---

[1] الطبري (١٦/١٠٠).

بۆیان. بەلكو بە پێچەوانەوە ڕێگەی خوانەناسیو بتپەرستی دەگرنە بەر وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ﴾[1] ناشوكریان بەرانبەر چاكەی خودا كردوەو گەلی خۆیان بەرەو هەلدێر برد.

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾

پاشان یوسف (سەلامی خوای لێبێ) ڕووی كردە دوو لاوەكەو وتووێژی لەگەلا كردنو بانگی كردن كە تەنیا خودا بپەرستن كە شەریكی نیە، واز بێنن لەو بتو شتانەی جگە لە خودان كە هۆزەكەیان دەیانپەرستن، ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ ئەی هاوەلانی زیندانم، ئایا چەندین پەروەردگارتان پێ باشترە، یان خودای تاكو تەنیای زالْ بەسەر هەموو شتێكا، ئەو خودایەی كە هەموو شتێ سەرشۆڕ دەكا بۆ هێزو دەسەلاتو گەورەیی خۆی، پاشان یوسف (سەلامی خوای لێبێ) باسی نەفامی ئەوانە دەكا وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم﴾ ئەوانەی دەیانپەرستن چەند شتێكی جگەلەخودان، كە خۆتانو بابو باپیرانتان لە خۆتانەوە ناوتان لێ ناون. پاشینەكان لە پێشینەكان وەریان گرتوە، هیچ بەلگەیەك نیە لەلای خوداوە بۆ سەلماندنی ئەو كارەیان. بۆیە گوتی ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ﴾ هیچ بەلگەیەكی بتەویان لە خوداوە بە دەستەوە نیە، پاشان پێیان دەلێ كە هەموو شت بە دەستی خودایە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ فەرمانیش هەر هی خودایە، هەر ئەویش فەرمانی داوە كە جگەلەئەو مەپەرستن، ئاینێ كە ڕاستو دروستبێت هەر ئەمەیە، واتە: دەسەلاتو فەرمانڕەواییو هەموو شت هی خودایەو فەرمانی داوە كە گشت عەبدەكانی تەنیا ئەو نەبێ هیچ كەسی تر نەپەرستن ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئەوەی من ئێوەی بۆ بانگ دەكەم لە ناسینی خودا بە تەنیاو بە دلسۆزی كاری بۆ بكەن ئەم ئاینە ڕێكو ڕاستەیە كە خودا فەرمانی پێكردوە شوێنی كەون، ئەو بەلگەو نیشانەیشی لەگەلا ناردوە كە خۆشیدەوێو لێشی ڕازیە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەلام زۆربەی ئەم خەلكە نازانن. بۆیە زۆربەیان شەریكیان بۆ

---

[1] إبراهيم (٢٨).

خودا دانا. لە ئایەتێکی تـرا خـودای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴾[1] هەرچەندە زۆریش هەوڵ بدەی، ئەم خەڵکە زۆربەیان بڕوا ناهێنن. دوای ئـەوەی لێ بـوەوە لە بانگ کردنیان، دەستی کرد بە لێکدانەوەی خەونەکانیان.

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ ﴾

**لێکدانەوەی خەونەکە**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: یوسـف گـوتی بـە دوو هـاوەڵی بەندیخانەکـەی ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗا ﴾ ئەی دوو هاوەڵی بەندیخانەم، یەکێ لە ئێوە دەبێتە مەیگێڕی خاوەنەکەی، ئەوەیان لە خەویدا بینی ترێ دەگوشێ، بەڵام ئەو کەسەی دیاری نەکرد بۆ ئەوەی خەفەت نەخوا، بۆیە دیاری نەکردو وەك خودای گەورە لەسەر زمانی یوسف فەرموویـەتی: ﴿وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦ﴾ ئەوەکەی تر لە دار ئـەدرێ، ئەوسا باڵنـدەکان لـە سـەرو دەمو چاوی دەخـۆن، لـە ڕاستیشا ئەوەی کە خەوی بینـی نـان بەسـەر سـەریەوەیەو باڵنـدە لێـی دەخـوات، لـە دار دراو کوژرا، پاشـان پێـی گـوتن: ئەمـە بڕیارێکـەو دراوەو، ئـەبێ هـەر ڕوویـدا. چـونکە خـەو بیـنین بەسـەر قاچـی باڵندەوەیە هـەتا لێك نەدرێتـەوە، ئەگـەر لێکدرایـەوە ڕووئـەدات. سـەوری ئـەڵێ: لـە عـەمارەی کـوڕی قەعقاعـەوە لـە ئیبراهیمـەوە لـە عەبدوڵلاوە ئـەڵێ: کـاتێ ئـەوەی دوو هاوەڵەکـەی بەندیخانـەی یوسـف ئەوەی گوتیان لە بارەی خەوەکەیانەوە باسیان کرد بـۆ یوسـف، یوسفیش بـۆی لێکدانـەوە، گوتیـان: هیچ شتێکمان لە خەودا نەبینیوە، خودای مەزن لەسەر زمانی یوسـف فەرموویـەتی: ﴿قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ﴾ ئەو کارەی کە دەتانەویست لـە ئەنجامەکـەی بپرسـن، وا زانـراوەو هـەر وەدیش دێ.[2] سەرئەنجامی باسەکە ئەوەیە، ئەگەر کەسێ خەوێکی بـە درۆوە گێڕایـەوەو لێکدرایـەوەبۆی، ئـەوە ئـەو کەسە پەیوەسـت دەبـێ بـەو لێکدانـەوە، والله أعلـم.... لـە فەرموودەیـەکی پـیرۆزا هـاتوە کـە ئیمـامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە مەعاویەی کوڕی حیدەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (خەو بینین لەسەر قاچی باڵندەیە تا لێك نەدرێتەوە، وەختێ لێکدرایەوە ئیتردێتەدی)[3].

---

[1] یوسف (١٠٣).

[2] الطبري (١٦/١٠٨).

[3] أحمد (٤/١٠). لاوازە، بەڵام ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِّنْهُمَا اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾﴾

**یوسف گوتی بە مەیگێڕەکە لەلای پاشا باسم بکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِّنْهُمَا﴾ یوسف بە یەکێ لەو دوو کەسەی داینابوو ڕزگاری دەبێ کەبریتی بوولە مەیگێڕەکەی ماڵی پاشا، بە پەنهانیو بێ ئەوەی هاوەڵەکەی تری پێی بزانێ پێی گوت، والله أعلم.... ئەمەشی لەبەرئەوەبووتائەوی تریان تێنەگا کەلە سێدارە ئەدرێ، ﴿اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ کە دەچیە لای ئاغاکەت لە بیرت نەچێ ئەم بەسەرهاتەی منی بۆ باس بکە، بەڵام ئەو کەسە ڕاسپاردەکەی یوسفی لەبیر چوو لای پاشای باسی بکا، ئەمەیش یەکێکی تر لە فرۆفێڵەکانی شەیتان بوو، بۆ ئەوەی یوسف پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) لە بەندیخانە دەرنەچێ. هەر ئەم قسەیەش ڕاستە چونکە زەمیرەکە کە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی لە بەندیخانە ڕزگاری بوو، وەك موجاهیدو موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو کەسانی تریش گوتویانە.[1] ﴿فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾ تا چەند ساڵێ لە بەندیخانە مایەوە، موجاهیدو قەتادەئەڵێن: (بِضْع) یانی: چەند ساڵێ کە لەنێوان سێ تا نۆ ساڵە.[2] وەهەبی کوڕی مونەبیهەئەڵێ: ئەیووب لەو بەڵایەدا کەتووشی بوو حەوت ساڵ ماوە، یوسف لە بەندیخانەدا حەوت ساڵ ماوە، بوختەنسەریش حەوت ساڵ سزا درا[3].

﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ ۖ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِن كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ بِعَالِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ لَّعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا

---

[1] الطبري (١٦/١١٣).

[2] الطبري (١٦/١١٥).

[3] الطبري (١٦/١٨٤).

تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ
عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾﴾

**خەو بینینی پاشای میسر**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِنْ كُنْتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ ﴾ پاشا گوتی: لە خەوما دیم، حەوت مانگای قەڵەو حەوت مانگای لەڕ دەیانخواردن حەوت گوڵە دەخڵی شینیش حەوتی دیکەی وشکەڵاتووی تری ئەخوارد، ئەی پیاوماقوڵان ئەم خەونەم بۆ لێکدەنەوە، ئەگەر ئێوە مانای خەو لێکدانەوە دەزانن، خودای گەورە ئەم خەو بینینەی پاشای میسری کردە هۆکاریٚ، بۆ هاتنە دەرەوەی یوسف (سەلامی خوای لێبێ) لە بەندیخانە، بە سەربەرزی وڕێزەوە، چونکە پاشا ئەو خەونەی بینی، زۆر ئەو خەونەی بەلاوە گرنگ بوو سەرقاڵی کردبوو، دەیگوت ئاخۆ مانای ئەو خەونە چیە، فاڵچیو پیاوە گەورەکانی دەوڵەتو سەرکردەکانی کۆکردنەوە، ئەوەی لە خەوەکەیا دیتبووی بۆی گێڕانەوە، لێی پرسین کە لێکی بدەنەوە بۆی، نەیانزانی لێکی بدەنەوەو داوای لێبوردنیان لیٚ کرد کە نازانن لێکی بدەنەوە ﴿قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ بِعَالِمِينَ﴾ گوتیان: خەوی تێکەڵو پێکەڵە ئێمە لەم جۆرە خەونانە سەر دەرناکەین، واتە: ئەگەر خەونەکەیش ڕاست بیٚو تێکەڵو پێکەڵیشی تیادانە بیٚ، ئێمە هەر ناتوانین لێکی بدەینەوە، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ﴾ لەو دوو کەسە ئەوەیان کە ڕزگاری بوو، کە پاش ماوەیەك بیری کەوتەوە، دوای ئەوەی شەیتان لە بیری بردبووەوە، کە یوسف پێی گوتبوو لەلای ئاغات واتە (پاشا) باسم بکە، لەو کاتەداو بیری هاتەوە، کە ماوەیەکی زۆر بوو ڕاسپاردەکەی یوسفی لە بیر چووبووەوە، ﴿بَعْدَ أُمَّةٍ﴾ واتە: پاش ماوەیەك. هەنێکی تر بەم شێوەیە خوێندویانەتەوە (بعد أمهٍ) واتە: دوای لەبیر چوونەوەیەك، لەو کاتەدا کە پاشا ئەو خەوەی بینی ڕاسپاردەکەی یوسفی وەبیر هاتەوە، گوتی بە پاشاو ئەو کەسانەی پاشا کۆی کردبوونەوە بۆ لێکدانەوەی ئەو خەونە ﴿أَنَا أُنَبِّئُكُمْ بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ﴾ من بۆتان لێکدەدەمەوە بمنێرن بە دوای یوسفی ڕاستگۆدا بۆ بەندیخانە، باسەکە وا دەگەیەنیٚ کە ئەو کەسەیان ناردوە بۆلای یوسف، چووەتە لایو پێی گوتوە ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ لَعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ یوسف پیاوی هەمیشە ڕاست، حەوت مانگای قەڵەو حەوت مانگای لەڕ

ئەیانخواردن، حەوت گوڵە دەخڵی هێشتا شینو حەوتی تریش وشکەڵاتبوو دەخوران، ئەم خەونەمان بۆ لێکدەرەوە، کە من دەچمەوە لای خەڵکی بەڵکو ئەوانیش تێ بگەن لەم باسوخواستە.

یوسف (سەلامی خوای لێبێ) لەو کاتا خەونەکەی بۆ لێکدایەوە، بێئەوەی تورە ببێ لە لاوەکە لەسەر ئەوەی ڕاسپاردەکەی ئەوی لەبیر چوو بوو کە پێی گوتبوو، وە هیچ مەرجێکیشی لەپێش لێکدانەوەی خەونەکەدا دانەنا بۆ هاتنە دەرەوەی لە بەندیخانە، بەڵکو ﴿قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا﴾ گوتی: حەو ساڵ کشتوکاڵ دەکەن بێ وچان واتە: حەوت ساڵ زەویتان بە پیت دەبێو باران بە بەردەوامی دەبارێ، مانای مانگاکانی بەو ساڵانە لێکدایەوە چونکە مانگا زەوی ئەکێڵێت کەئامادە دەکرێ وبەکاردەهێنرێ بۆ بەروبومو کشتوکاڵ، کە بیتین لە گوڵە دەخڵە سەوزەکان، پاشان ڕێنمایی کردن کە پشت بەچی ببەستن لەو ساڵانەدا، پاشان گوتی: ﴿فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ﴾ هەرچیەکتان دوریەوە کەمێك نەبێ کە لێی دەخۆن لە گوڵی خۆیدا بیڵنەوە. واتە: هەرچیتان دوریەوە لە گوڵی خۆیدا بیهێڵنەوەو لەو حەوت ساڵەد ابەگوڵەکەیەوە هەڵی گرن، چونکە لە گوڵەکەیا باشتر دەمێنێتەوەو درەنگ خراپ دەبێ، ئەو بەشە نەبێ کە دەیخۆن، کەم کەمیش لێی بخۆن، دەست بڵاو مەبن تا لەو حەوت (ساڵە) قاتو قڕیەدا سوودی لێوەرگرن. حەوت ساڵی زۆر سەختە کە بە دوای ئەو حەوت ساڵە بە پیتەدا دێ، کە مانگا لەڕەکانە مانگا قەڵەوەکان دەخۆن، چونکە لە ساڵی قاتو قڕیدا ئەوەی لە ساڵە بە پیتەکاندا کۆکراوەتەوە دەخورێ، هەواڵیشی پێدان کە هەر شتێکیش دەچێننو دەیکەنە تۆو هیچی لێ هەڵنەگرنەوە بۆیە یوسف دەڵێ وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ﴾ لەپاش ئەمە حەوت ساڵی قاتو قڕییەکە دێت، هەرچیتان پاشەکەوت کردووە بۆ ئەم حەوت ساڵە سەختە دەیخۆن، کەمێ لەوەنەبێت کە قایم هەڵیدگرن. ﴿ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ﴾ لە دوای ئەم حەوت ساڵە سەختە ساڵێکی وا دێ، بۆ هەموو کەس بارانو ڕووەك زۆرەو تێیدا دۆشاوی میوە دەگرن. واتە: بارانی زۆریان لەو ساڵە بۆ دەبارێو وڵات بەروبومی زۆر دەبێو دەست دەکەنەوە بە میوە گوشینو زەیت گرتنو دۆشاوی ترێو شتی تریش.

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ
رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ
قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ
بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾﴾

**لێکۆڵینەوە لەو شتانەی لەنێوان یوسفو ژنەکەی عەزیزو ژنەکانی میسرا ڕوویدا**

خـودای مـەزن باسـی پاشـای میـسر دەکـا، کـاتێ بـە مانـای خەونەکەیـەوە گەڕانـەوە بـۆلای، لێکدانەوەکەی یوسفی بە لاوە سەرسوڕهێنەر بوو، بڕوای تـەواوی پێـی هـەبوو، لەوێدا ڕێـزو زانیـاریو چاك لێکدانەوەی یوسفی(سـەلامی خـوای لێبـێ) بـۆ دەرکـەوت، وە چـەندە یوسـف خـاوەن ڕەوشـتە بەرانبەر ولاتو خەڵکی ولاتەکەی، بۆیە پاشا گوتی وەك خودای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ﴾ پاشا گوتی: بۆم بهێنن، واتە: لە بەندیخانە دەریبهێنـنو بـۆم بێنن، ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ﴾ کـاتێ ڕاسپاردەکە هـات بـۆلای یوسـف لـە بەندیخانـە دەری بێنـێ، قـەبوڵی نـەکرد بێتـە دەرەوە تـا پاشـا لێکۆڵینەوە نەکاو خۆیو ژێر دەستەکانی بێتاوانیو پاکداوێنی ئەویان بـۆ ئاشـکرا نـەبێ، کە ژنەکەی عەزیز بۆی هەڵبەستبوو، ئەم بەند کردنەیشی لەسەر کارێکی ڕەوا نەبوە، بەڵکو ناهـەقیو دەسـتدرێژی بـووە کراوەتــە ســەری، ﴿قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ یوسف ئەڵێ: بگەڕێوە لای ئاغاتو لێی بپرسە، ئەو ژنانەی کە دەستی خۆیانیـان بـڕی، نیازیـان چی بوو؟ پەروەردگارم لە فڕوفێڵیان ئاگادارە. فەرموودە هاتوە وەسفی یوسف دەکـا (سـەلامی خـوای لێبێ) لەسەر ئەو قسانەیو باسی ڕێزو پلەو قەدرو خۆڕاگری ئەو دەکا، لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدو هـەردو سـەحیحەکەدا هـاتوە لـە ئـەبوهورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) ئـەڵێ: پێغەمبـەری خـودا فەرموویەتی: [ئێمە زیاتر هەقمانە بە گومان بین لـە ئیـبراهیم (سـەلامی خـوای لێبـێ) وەختـێ گـوتی: ﴿رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى﴾.[1] پـەروەردگارم تـۆ چـۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ نیشانم بدە، فەرمووی: ئایا تۆ هێشتا بـاوەڕت نیـە؟ ئیـبراهیم گـوتی: بـەڵێ بەڵام من دەمەوێ بە تەواوی دڵنیا بم. وە خودای گـەورە ڕەحـم بکـا بـە لـووت، ئـەو پـەنای ئـەبرد بـۆ شوێنێکی قایم، وە ئەگەر من ئەوەندەی یوسف لە بەندیخانەدا بمایامەوە، وەك یوسف تێیدا مـابوەوە، بە قسەی بانگکەرەکەم دەکرد[2]. وەك لـە وتەیـەکی ئیمـامی ئەحمەدا هـاتوە لـە ئـەبوهورەیرەوە لـە پێغەمبەرەوە لەم ئایەتـەدا ﴿فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئەوە مـن بومایـە، بەپەلـە قـەبوڵم دەکردو بەهانـەم نـەدەگرت)[3]. پاشـا گــوتی: وەك خــودای گــەورە فەرموویــەتی: ﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ یــانی:

---

[1] البقرة (٢٦٠).

[2] أحمد (٣٢٦/٢)، فتح الباري (٢١٦/٨)، مسلم (١٣٣/١).

[3] أحمد (٣٤٦/٢).

مەبەستتان چی بوو کاتێ ویستتان یوسف بخەڵەتێننو کاری خراپی پێ بکەن، خودای مەزن لێرەدا باسی پاشا دەکا، کاتێ ئەو ژنانەی کۆکردەوە کە دەستی خۆیان بڕی لەلای ژنەکەی عەزیز، ڕووی قسەی کردبوە ژنەکان بەڵام زیاتر مەبەستی ژنی وەزیرەکەی خۆی بوو، گوتی: مەبەستتان چی بوو کە ویستتان توشی خراپەی بکەن، لە ڕۆژی میوانداریەکەدا ﴿قُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ﴾ واتە: ئافرەتەکان وتیان پاکو بێگەردی بۆ خوا ئێمە کاری شورەیمان لێ نەدیوە. واتە: ژنەکان وەڵامیان داوە، پاکو بێ عەیبی هەر بۆ خوایە، یوسف هیچ تاوانێکی نەکردوەو سوێند بە خوا خراپەیەکمان لێ نەدیوە، ئا لەو کاتەدا وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ﴾ ژنەکەی عەزیز گوتی: ئا ئێستا ڕاستی دەرکەوت. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن: ژنەکەی عەزیز گوتی: ئا ئێستا ڕاستی ئاشکرا بوو.[1] ڕوون بووەو دەرکەوت. ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ ژنەکە گوتی من دەمویست دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکەم، هەرچی ئەو گوتی ڕاستە، وەك یوسف لە پێشا گوتی: ئەو ژنە دەیویست دەستم لەگەڵا تێکەڵ بکا، ﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ﴾ ژنەکە گوتی دانم نا بەو تاوانەدا هەتا مێردەکەم بزانێ من لە پاشەملە ناپاکیم لێ نەکردووەو ئەو کارە شورەییە گەورەیە ڕووی نەداوە، ویستم دڵی ئەو لاوە بۆلای خۆم ڕاکێشم، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، هەر بۆیە دانم پێدانا بۆ ئەوەی بزانن بێتاوانم، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ﴾ بەڕاستی خودا پیلانی تاوانباران سەرکەوتوو ناکا.

[1] الطبري (١٦/١٣٨).

# پێرست